بسم الله الرحمن الرحيم


ناسنامه تفسير

........................

- ناوى تفسير: تفسير ابن الكثير بەكوردى
- وەرگێرانى: على حاجى عبدالله پريسى
- نۆرەى چاپ: يەكەم ٢٠١٢
- شوێنى چاپ: تاران
- هەڵەچنى و ديزاين: ابراهيم معروف

بڵاوكار:

ناوەندى رۆشنبير بۆ چاپ و بڵاوكردنەوە

سليمانى

## تەفسیری سورەتی (الاحقاف)

## لەمەککە هاتووەتە خوارەوە

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿حمٓ ﴿١﴾ تَنزِيلُ ٱلْكِتَٰبِ مِنَ ٱللَّهِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَكِيمِ ﴿٢﴾ مَا خَلَقْنَا ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَآ إِلَّا بِٱلْحَقِّ وَأَجَلٍ مُّسَمًّى ۚ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ عَمَّآ أُنذِرُوا۟ مُعْرِضُونَ ﴿٣﴾ قُلْ أَرَءَيْتُم مَّا تَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَرُونِى مَاذَا خَلَقُوا۟ مِنَ ٱلْأَرْضِ أَمْ لَهُمْ شِرْكٌ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ ۖ ٱئْتُونِى بِكِتَٰبٍ مِّن قَبْلِ هَٰذَآ أَوْ أَثَٰرَةٍ مِّنْ عِلْمٍ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٤﴾ وَمَنْ أَضَلُّ مِمَّن يَدْعُوا۟ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَن لَّا يَسْتَجِيبُ لَهُۥٓ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ وَهُمْ عَن دُعَآئِهِمْ غَٰفِلُونَ ﴿٥﴾ وَإِذَا حُشِرَ ٱلنَّاسُ كَانُوا۟ لَهُمْ أَعْدَآءً وَكَانُوا۟ بِعِبَادَتِهِمْ كَٰفِرِينَ ﴿٦﴾﴾

ئەم قورئانە نێردراوە لەلایەن خوداوە و ئەم بونەوەرەش بەڕاستی وەدی هێنراوی ئەوە خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿حمٓ﴾ حامیم، ﴿تَنزِيلُ ٱلْكِتَٰبِ مِنَ ٱللَّهِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَكِيمِ﴾ ئەم کتێبە لە خودای بەدەسەلاتی لەکارزانەوە نێردراوە. خودای گەورە هەواڵمان دەداتێ کە ئەم قورئانەی ڕەوانە کردوە بۆ بەندەو پێغەمبەری خۆی محمد(ﷺ) بەردەوامیش دەبێ هەتا ڕۆژی قیامەتو وەسفی خۆشی کردوە بەخاوەنی دەسەلاتی هەتا هەتایی و کارزانی لەکردارو گفتاردا. پاشان فەرموویەتی: ﴿مَا خَلَقْنَا ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَآ إِلَّا بِٱلْحَقِّ وَأَجَلٍ مُّسَمًّى ۚ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ عَمَّآ أُنذِرُوا۟ مُعْرِضُونَ﴾ ئەم ئاسمانەو زەمینەو هەرچی لەناویاندا هەیە بۆ ڕاستوەدیمان هێنان‌ومەدایان دیاری کراوە، ئەو کەسانەش کە خودایان نەناسیوە لەوەی کە پێی ترسێنرابوون ڕوو وەردەگێڕن. واتە: بەبێ سودو بەبێ کەڵك وەدی نەهێناوە، ﴿وَأَجَلٍ مُّسَمًّى﴾ واتە: بۆ کاتێکی دیاری کراو بڕاوەتەوە نە لێی زیاد دەکرێ و نە لێی کەم دەکرێتەوە. ﴿وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ عَمَّآ أُنذِرُوا۟ مُعْرِضُونَ﴾ واتە: هەرچەندە ترسیان وەبیر بێنێ گوێی پێ نادەن. خوای مەزن کتێبی بۆ ناردن‌و پێغەمبەریشی بۆ ڕەوانە کردن کەچی هەر خۆیان لادەدەن‌و باوەڕ بە هیچیان ناکەن. واتە: بەو زووانە پاشە ڕۆژی خۆیان دەزانن.

### ولأمدانەوەی بت پەرستان

خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿قُلْ أَرَءَيْتُم مَّا تَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَرُونِى مَاذَا خَلَقُوا۟ مِنَ ٱلْأَرْضِ أَمْ لَهُمْ شِرْكٌ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ ۖ ٱئْتُونِى بِكِتَٰبٍ مِّن قَبْلِ هَٰذَآ أَوْ أَثَٰرَةٍ مِّنْ عِلْمٍ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ﴾ بڵێ: ئەو شتانەی ئێوە غەیری خودا هانایان دەبەنە بەری، چیان لەم زەویە دروست کردوە؟ یان ئەگەر لە ئاسمانەکان بەشدار

بوون. نیشانم بدەن. گەر ئێوە بەڕاستیتانە کتێبێك بەر لەم قورئانە هاتبێ یان قسەی دەربارەی زانست کە هەر لەکەو ناڕەوایە ماوە لەمێژینەکان بۆمی بێنن. پاشان خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿قُلْ﴾ واتە: بڵێ: بەو بت پەرستانەی کە لەگەڵ خودادا شتی تر دەپەرستن، ﴿أَرَءَيْتُم مَّا تَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَرُونِى مَاذَا خَلَقُوا۟ مِنَ ٱلْأَرْضِ﴾ بمبەن بۆ ئەو شوێنەی ئەوان نیشانم بدەن چیان لەم سەر زەمینە دروست کردوە. ﴿أَمْ لَهُمْ شِرْكٌ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ﴾ واتە: هیچ بەشداریەکیان نەبوو لەناو ئاسمانەکانو زەمیندا. وە خاوەنی توێکڵی ناوکە خورمایەك نین. خودای مەزن خاوەنی هەموو شتێکەو هەموو شتێ بەدەستی ئەوە. دەی سا چۆن کەسی تر لەگەڵیدا دەپەرستنو هاوەڵی بۆ دادەنێن؟ کێ ئەمەی نیشان داون؟ و کێ بانگی کردون بۆی؟ یا هەر شتێکە خۆتان داتان هێناوە لە خۆتانەوە؟ بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ٱئْتُونِى بِكِتَٰبٍ مِّن قَبْلِ هَٰذَآ﴾ واتە: کتێبێ بێنن لەو کتێبانەی کە خودا ناردویەتیە خوارەوە لە پێش ئەم قورئانە بۆ پێغەمبەرەکانی تر(سەلامی خوایان لێ بێت) فەرمانتان پێ بکات بە پەرستنی ئەم بتانە. ﴿أَوْ أَثَٰرَةٍ مِّنْ عِلْمٍ﴾ واتە: زانستێك کە ببێتە بەڵگە لەسەر ئەم ڕێگەیەی ئێوە گرتوتانەتە بەرو لەسەری دەڕۆن. ﴿إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ﴾ واتە: هیچ بەڵگەیەکتان بەدەستەوە نیە. نە لەلایەن خوداو پێغەمبەرەکانیەوە عەقڵیش ئەوەی ئێوە دەیڵێن نایسەلمێنێ، هەر لەبەر ئەوەیە هەندێ خوێندویانەتەوە(أو أثرة من علم) واتە: یا زانستێکی ڕاستکەرەوەیان وەرگرتبێ لە کەسێك لەوانەی پێش خۆیانەوە. وەك موجاهد دەڵێت: لەم ئایەتەدا کە خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿أَوْ أَثَٰرَةٍ مِّنْ عِلْمٍ﴾ یان کەسێك کە پاشماوەی زانستێك بهێنێ.[1] خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَمَنْ أَضَلُّ مِمَّن يَدْعُوا۟ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَن لَّا يَسْتَجِيبُ لَهُۥٓ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ وَهُمْ عَن دُعَآئِهِمْ غَٰفِلُونَ﴾ کێش لەو کەسە گومڕاترە هانا بۆ غەیری خوا دەبات؟ بۆ کەسێ کە هەتا قیامەت وەڵامی پێ ناداتەوەو هەر ئاگاشیان لە پاڕانەوەیان نیە. واتە: لەو کەسە سەر لێ شێواو تر نیە کە هاوار بۆ بتەکان دەبات لە باتی خودا داوای شتێکی لێ دەکات کە ناتوانێ جێ بەجێی بکات هەتا ڕۆژی قیامەت. چونکە ئەوە ئاگای لەو پاڕانەوەیە نیەو نە دەبیسێو نە دەبینێ نە دەشتوانێ شتێ بکرێ چونکە بەردێکی بێ گیانە و نابیسێ. خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَإِذَا حُشِرَ ٱلنَّاسُ كَانُوا۟ لَهُمْ أَعْدَآءً وَكَانُوا۟ بِعِبَادَتِهِمْ كَٰفِرِينَ﴾ هەرکاتێ مەردوم هەموویان کۆ دەکرێنەوە. ئەوان دەبنە دوژمنیانو حاشا دەکەن لەوانەی پەرستویان. ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە

---

[1] الطبري (٢٢/٩٤).

وایــە کــە ئەفــەرموێت: ﴿وَٱتَّخَذُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ ءَالِهَةً لِّيَكُونُواْ لَهُمْ عِزًّا ﴿٨١﴾ كَلَّا ۚ سَيَكْفُرُونَ بِعِبَادَتِهِمْ وَيَكُونُونَ عَلَيْهِمْ ضِدًّا﴾[1] واتە: ئەوانە بێجگە لە خوا بڕیاریان داوە بۆ خۆیان چەند پەرستراوێك بۆ ئـەوەی ئەو ئەوەی ئەو پەرستراوانە ببنە یارمەتی دەرو تکاکار بۆیان، نەخێر، بەڵکو پەرستراوەکان لە قیامەتدا ئینکاری پەرستنەکەی ئەوان دەکەنو دەبنە دژیانو بەرپەرچیان دەدەنەوە. واتە: لـە کاتێکدا کـە زۆر پێویستیان هەیە لەو کاتەدا خیانەتیان لێ دەکەنو دەست براویان دەکەن خودای مەزن لەسـەر زمـانی ئیبراهیمی خەلیل (سەلامی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: ﴿إِنَّمَا ٱتَّخَذْتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ أَوْثَٰنًا مَّوَدَّةَ بَيْنِكُمْ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ ثُمَّ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ يَكْفُرُ بَعْضُكُم بِبَعْضٍ وَيَلْعَنُ بَعْضُكُم بَعْضًا وَمَأْوَىٰكُمُ ٱلنَّارُ وَمَا لَكُم مِّن نَّٰصِرِينَ﴾[2] واتە: بێگومان ئەوەی ئێوە هەڵتان بژاردووە لە جیاتی خوا بتانێکن لەبەر خۆشەویستی لە نێوانتاندا لە ژیانی دونیادا دەیانپەرستن لە پاشان لە ڕۆژی دوایـی دا هەنـدێکتان بێزاری دەردەبڕن لە هەندێکی ترتـان دان نـانێن بەیەکتریـدا و نـەفرین لـە یـەکتری دەکـەن جێگاشـتان ئاگری دۆزەخەو هیچ یارمەتی دەرێکیشتان نیە.

﴿وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُنَا بَيِّنَٰتٍ قَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لِلْحَقِّ لَمَّا جَآءَهُمْ هَٰذَا سِحْرٌ مُّبِينٌ ﴿٧﴾ أَمْ يَقُولُونَ ٱفْتَرَىٰهُ ۖ قُلْ إِنِ ٱفْتَرَيْتُهُۥ فَلَا تَمْلِكُونَ لِى مِنَ ٱللَّهِ شَيْـًٔا ۖ هُوَ أَعْلَمُ بِمَا تُفِيضُونَ فِيهِ ۖ كَفَىٰ بِهِۦ شَهِيدًۢا بَيْنِى وَبَيْنَكُمْ ۖ وَهُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٨﴾ قُلْ مَا كُنتُ بِدْعًا مِّنَ ٱلرُّسُلِ وَمَآ أَدْرِى مَا يُفْعَلُ بِى وَلَا بِكُمْ ۖ إِنْ أَتَّبِعُ إِلَّا مَا يُوحَىٰٓ إِلَىَّ وَمَآ أَنَا۠ إِلَّا نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴿٩﴾﴾

## هەندێ قسەی بتپەرستان لە بارەی قورئان و پێغەمبەرەوەو (ﷺ) وڵام دانەوەیان

خودای گەورە ئەفـەرموێت: ﴿وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُنَا بَيِّنَٰتٍ قَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لِلْحَقِّ لَمَّا جَآءَهُمْ هَٰذَا سِحْرٌ مُّبِينٌ﴾ هەر کاتێ نیشانە ئاشکراکانی ئێمەیان بۆ دەخوێنن ئەوانە ی کاتێ قورئانیان بۆ هات حاشـایان لێکـرد، دەڵێن: ئەمە هەر بەئاشکرا جادوە. خودای مەزن باسی بێ دینوبـێ گـوێیی ئـەو بـت پەرسـتانەمان بـۆ دەکا کە وەختێ نیشانە ئاشکراکانی خودایـان بـۆ دەخوێنرێتـەوە واتـە: لـەکاتی ڕون کردنـەوە و بـاس کردنوتێکەیاندنیاندا دەڵێن ﴿هَٰذَا سِحْرٌ مُّبِينٌ﴾ ئەمـە هـەر بەئاشـکرا جـادوەو باوەڕیان پـێ نـەکردوەوە قسەیان بۆ هەڵبەستوەو گومڕاو خـوا نـەناس بـون. خـوای گـەورە ئەفـەرموێت: ﴿أَمْ يَقُولُونَ ٱفْتَرَىٰهُ ۖ قُلْ إِنِ ٱفْتَرَيْتُهُۥ فَلَا تَمْلِكُونَ لِى مِنَ ٱللَّهِ شَيْـًٔا ۖ هُوَ أَعْلَمُ بِمَا تُفِيضُونَ فِيهِ ۖ كَفَىٰ بِهِۦ شَهِيدًۢا بَيْنِى وَبَيْنَكُمْ ۖ وَهُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ﴾

---

[1] مریم (٨١-٨٢).

[2] العنكبوت (٢٥).

یان دەڵێن: هەر بۆ خۆی هەڵی بەستووە، بڵێ: ئەگەر بۆ خۆم هەڵم بەستبێ، پێتان ناکرێ لای خودا هیچ بۆ من بکەن، خوداش پتر ئاگادارە لەو توانجەی کە لە قورئانەکەی دەگرن، هەر ئەو بەسە بۆ شایەتی لە نێوان منو ئێوەدا، هەر ئەویشە گوناهبەخشی دلۆڤانە. ﴿أَمْ يَقُولُونَ افْتَرَاهُ﴾ مەبەستیان موحەممەدە (ﷺ). خوای گەورەش ئەفەرموێت: ﴿قُلْ إِنِ افْتَرَيْتُهُ فَلَا تَمْلِكُونَ لِي مِنَ اللَّهِ شَيْئًا﴾ واتە: بڵێ: ئەگەر خۆم هەڵم بەستبێ و گوتم خودا ڕەوانەی کردوم وانەبێ خودا تۆڵەی لێ دەسەندم بە توندترین تۆڵەو هیچ کەس لە خەڵکی سەر زەمینی و ئێوەشو کەسانی تریش نەیان دەتوانی ڕزگارم بکەنو پەنام بدەن وەك خوای مەزن ئەفەرموێت: ﴿قُلْ إِنِّي لَن يُجِيرَنِي مِنَ اللَّهِ أَحَدٌ وَلَنْ أَجِدَ مِن دُونِهِ مُلْتَحَدًا ﴿٢٢﴾ إِلَّا بَلَاغًا مِّنَ اللَّهِ وَرِسَالَاتِهِ﴾[1] واتە: بڵێ: بێگومان کەسێك نیە کە من بپارێزێ لە (سزای) خواوە بێجگە لەو پەناگەیەك شك نابەم، (وەهیچم بەدەست نیە) ڕاگەیاندن نەبێ لە خواوەو گەیاندنی پەیامانی ئەو نەبێ. وە فەرموویەتی: ﴿وَلَوْ تَقَوَّلَ عَلَيْنَا بَعْضَ الْأَقَاوِيلِ ﴿٤٤﴾ لَأَخَذْنَا مِنْهُ بِالْيَمِينِ ﴿٤٥﴾ ثُمَّ لَقَطَعْنَا مِنْهُ الْوَتِينَ ﴿٤٦﴾ فَمَا مِنكُم مِّنْ أَحَدٍ عَنْهُ حَاجِزِينَ﴾[2] واتە: ئەگەر موحەممەد (ﷺ) بەدەم ئێمەوە هەندێ وتانی هەڵ ببەستایە، بێگومان ئێمە بەدەستی خۆمان تۆڵەمان لێ دەسەند، لەپاشان ڕەگی دڵیمان دەبڕی، وە کەس لە ئێوە نەیدەتوانی بەرگری لێ بکات. بۆیە خودای گەورە لێرەدا فەرموویەتی: ﴿قُلْ إِنِ افْتَرَيْتُهُ فَلَا تَمْلِكُونَ لِي مِنَ اللَّهِ شَيْئًا هُوَ أَعْلَمُ بِمَا تُفِيضُونَ فِيهِ كَفَىٰ بِهِ شَهِيدًا بَيْنِي وَبَيْنَكُمْ﴾ ئەمە هەڕەشە و ترساندنێکی گەورەیەو بەڵێنێکی ڕاستە لەلایەن خوداوە. وە ئەفەرموێت: ﴿وَهُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ﴾ ئەمە دڵخۆش کەرێکە بۆ ئەوەی مەردوم پەشیمان ببنەوەو بگەڕێنەوە. واتە: لەگەڵ ئەو هەموو تاوانەتاندا هەر کاتێ پاشگەز بوونەوە خودا دەتانبەخشێو لە گوناهتان خۆش دەبێ لێبوردەو دلۆڤانە. ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە وایە کە لە سورەتی (الفرقان) فەرموویەتی: ﴿وَقَالُوا أَسَاطِيرُ الْأَوَّلِينَ اكْتَتَبَهَا فَهِيَ تُمْلَىٰ عَلَيْهِ بُكْرَةً وَأَصِيلًا ﴿٥﴾ قُلْ أَنزَلَهُ الَّذِي يَعْلَمُ السِّرَّ فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ إِنَّهُ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا﴾[3] واتە: وە بێ بڕوایان دەیانوت ئەم قورئانە بەسەرهاتو داستانی پێشوەکانە (موحەممەد ﷺ) داوای کردوە بۆی بنوسن ئینجا دەخوێندرێتەوە بەسەریدا بە بەیانیانو ئێواراندا، موحەممەد(ﷺ) بڵێ زاتێ ناردویەتیە خوارەوە کە هەموو نهێنی ئاسمانەکانو زەوی دەزانێت بەڕاستی ئەو لێبوردەی میهرەبانە. خوای

[1] الجن (٢٢-٢٣)

[2] الحاقة (٤٤-٤٧)

[3] الفرقان (٥-٦)

گەورە ئەفەرموێت: ﴿قُلۡ مَا كُنتُ بِدۡعٗا مِّنَ ٱلرُّسُلِ وَمَآ أَدۡرِي مَا يُفۡعَلُ بِي وَلَا بِكُمۡۖ إِنۡ أَتَّبِعُ إِلَّا مَا يُوحَىٰٓ إِلَيَّ وَمَآ أَنَا۠ إِلَّا نَذِيرٞ مُّبِينٞ﴾ بلێ: لەناو ئەو هەموو پێغەمبەرانە من یەکێکی نائاسایی نیم. ناشزانم لە من یا لە ئێوە چی دەقەومێ. من هەر ئەوەندەم لەسەرە پەیڕەوی ئەو فەرمانە بم کە پێم ڕادەگەیەندرێ. من هەر تەنیا بە ئاشکرا ترسێنەرم و چی تریش نیم. واتە: من یەکەم پێغەمبەر نیم کە هاتبێتمە ناو ئەم خەڵکە بەڵکو پێغەمبەرانی تر پێش من هاتونو من شتێکی بێ وێنە نیم کە ئەوەندە هاتنی من دوور کەوتبێتەوە کە نەزانن و باوەڕم پێ نەکەن. چونکە خودای گەورە هەموو پێغەمبەرانی(سەلامی خوایان لێ بێت) لە پێش منەوە ڕەوانە کردوە بۆ سەر گەلەکان. وە ئەفەرموێت: ﴿وَمَآ أَدۡرِي مَا يُفۡعَلُ بِي وَلَا بِكُمۡ﴾ عەلی کوڕی ئەبو تەلحە دەڵێت: لەئیبنو عەباسەوە. پاش ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە﴿لِّيَغۡفِرَ لَكَ ٱللَّهُ مَا تَقَدَّمَ مِن ذَنۢبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ﴾[1] واتە: تا خوا خۆش بێت لە تاوانەکانی ڕابردو و داهاتوت.[2] عیکریمەو حەسەنو قەتادەیش دەڵێن: کە ئەم ئایەتە نەسخ بۆتەوە بەم ئایەتەی کە خودا ئەفەرموێت: ﴿لِّيَغۡفِرَ لَكَ ٱللَّهُ مَا تَقَدَّمَ مِن ذَنۢبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ﴾ وتیان: کاتێ ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە. پیاوێکی موسوڵمان دەڵێت: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەوا خوای گەورە ڕوونی کردۆوە کە هیچت پێ ناکات. واتە لەگوناهەکانی پێشی و پاشیشت خۆش بووە. ئەی دەربارەی ئێمە چیمان لێ دەکات؟ خودای گەورە ئەم ئایەتەی ڕەوانە کرد: ﴿لِّيُدۡخِلَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ﴾[3] واتە: تا پیاوانو ئافرەتانی باوەڕدار بباتە بەهەشتانێك کە ڕووبارەکان بە ژێریاندا دەڕوات.[4] لە فەرموودەی سەحیحدا هاتووە کە خاوەن باوەڕان گوتیان: پیرۆزت بێ ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەی چی بۆ ئێمەیە؟ خودای گەورە ئەم ئایەتەی ڕەوانەکرد.[5] ئیمامی ئەحمد ڕیوایەتی کردوە لە خاریجەی کوڕی زەیدی کوڕی سابتەوە لە ئوممو عەلاوە ژنێك بوو لە ژنەکانیان کە بۆی باس کردووە. یەکێك بووە لەو ژنانەی کە پەیمانیدا بە پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەڵێت: وەختێ کە کۆچەریەکان دابەش کران بەسەرماڵە ئەنساریەکاندا ئێمە کەوتینە ماڵی عوسمانی کوڕی مەزعون(ڕەزای خوای لێ بێت) نەخۆش کەوت لای ئێمە تەداویان کردو (خزمەتمان کرد هەتا ئەو کاتەی مرد لەناو جل و بەرگەکەیدا دامانا. پێغەمبەری خودا(ﷺ) هات بۆ

---

[1] فتح (٢)

[2] الطبري (٢٢/٩٩)

[3] فتح (٥).

[4] الطبري (٢٢/٩٩/١٠٠)

[5] فتح الباري (٧/٥١٦)

لامان. منیش گوتم: ڕەحمەتی خوات لێ بێ ئەبو سائب من شایەتیت بۆ دەدەم کە خودای گەورە ڕێزی لێ ناوی. پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (تۆ چۆن دەزانی خودا ڕێزی لێ گرتوە؟ وتم: دایكو باوکم بەقوربانت بێ نازانم. پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (ئەوا ئەو مردن یەخەی گرت لەلایەن خوداوەو من داوام لە خودا وایە کە چاکەی لەگەڵ بکات. سوێند بە خوا من کە پێغەمبەری خودام نازانم چیم پێ دەکرێ). ژنەکە دەڵێت: سوێند بە خوا دوای ئەمە هەرگیز وەسفی کەس ناکەم ئەم کارەساتە زۆر غەمگینی کردم خەوم لێ کەوت کانیەکم بینی هی عوسمان بوو ئاوی لەبەر دەڕۆشت. چوم بۆ لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) خەونەکەم بۆ گێڕایەوە، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموی: (ئەوە کردارەکەیەتی)[1]. تەنها بوخاری ئەم فەرمودەی هێناوە موسلمی لەگەڵ نیە.[2] وە لە وتەیەکی تری بوخاریدا: (من کە پێغەمبەری خوام نازانم چی بەسەردێ).[3] لە نمونەی ئەمەو چەندین نمونەی تر بەڵگەن لەسەر ئەوە بە هیچ کەسێك ناگوترێ بەهەشتیت یان لەناو بەهەشتایت جگە لەو کەسانەی کە پێغەمبەر(ﷺ) ناوی بردون وەك دە کەسەکەو ئیبنو سەلام و غومەیصاو دایکی ئەنەسی کوڕی مالك و بیلال و سوڕاقەو عبدالله ی کوڕی عەمری کوڕی حەرام و (حرام) باوکی جابر). حەفتا قورئان خوێنەکە کە لە بیری مەعونە شەهید کراون و زەیدی کوڕی حاریسەو جەعفەرو ئیبنو ڕەواحەو لە نمونەی ئەمانە(ڕەزای خوایان لێ بێ) خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿إِنْ أَتَّبِعُ إِلَّا مَا يُوحَىٰٓ إِلَيَّ﴾ واتە: من شوێنی ئەوە دەکەوم کە خودای گەورە بۆم دەنێرێتە خوارەوە. ﴿وَمَآ أَنَا۠ إِلَّا نَذِيرٌ مُّبِينٌ﴾ من تەنها بەئاشکرا ترسێنەرم و بەس. کاری من دیارە بۆ هەموو خاوەن عەقل و پیرو بێ هۆشێ. والله أعلم.

﴿قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِن كَانَ مِنْ عِندِ ٱللَّهِ وَكَفَرْتُم بِهِۦ وَشَهِدَ شَاهِدٌ مِّنۢ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ عَلَىٰ مِثْلِهِۦ فَـَٔامَنَ وَٱسْتَكْبَرْتُمْ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٠﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لِلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَوْ كَانَ خَيْرًا مَّا سَبَقُونَآ إِلَيْهِ ۚ وَإِذْ لَمْ يَهْتَدُوا۟ بِهِۦ فَسَيَقُولُونَ هَٰذَآ إِفْكٌ قَدِيمٌ ﴿١١﴾ وَمِن قَبْلِهِۦ كِتَٰبُ مُوسَىٰٓ إِمَامًا وَرَحْمَةً ۚ وَهَٰذَا كِتَٰبٌ مُّصَدِّقٌ لِّسَانًا عَرَبِيًّا لِّيُنذِرَ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ وَبُشْرَىٰ لِلْمُحْسِنِينَ ﴿١٢﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ قَالُوا۟ رَبُّنَا ٱللَّهُ ثُمَّ ٱسْتَقَٰمُوا۟ فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿١٣﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلْجَنَّةِ خَٰلِدِينَ فِيهَا جَزَآءًۢ بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٤﴾﴾

---

[1] احمد (٤٣٦/٦)

[2] فتح الباري (٣١٠/٧)

[3] فتح الباري (١٣٧/٣).

**ئەم قورئانە گوفتاری (کلام) خودایەو هەقەو هەڵوێستی خوانەناسان و خاوەنباوەڕان لێی**

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِن كَانَ مِنْ عِندِ ٱللَّهِ وَكَفَرْتُم بِهِۦ وَشَهِدَ شَاهِدٌ مِّنۢ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ عَلَىٰ مِثْلِهِۦ فَـَٔامَنَ وَٱسْتَكْبَرْتُمْ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾ بڵێ ئاخۆ چ دەڵێن ئەگەر ئەم قورئانە لە خواوە بێت و ئێوە حاشای لێ بکەن ویەك لە تۆرمەی ئیسرائیلیش شایەتی بدا لەسەر وێنەکەی و بڕوا بێنیٚ و ئێوە هەر خۆ بەزل زان بن؟! خودا فێڵی غەدرکاران بەرەو خۆی شارەزا ناکات. خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ قُلْ ﴾ ئەی محمد(ﷺ) بڵێ بەو بتپەرستانەی کە باوەڕیان بە قورئان نیە. ﴿أَرَءَيْتُمْ إِن كَانَ﴾ ئەگەر ئەم قورئانە. ﴿مِنْ عِندِ ٱللَّهِ وَكَفَرْتُم بِهِۦ﴾ واتە: ئەو کاتە چی دەڵێن و خودا چیتان بەسەر دێنێ گەر ئەم قورئانەی کە من بۆم هێناون و خودا ڕەوانەی کردوە بۆم منیش پێم گەیاندبن کەچی ئێوە حاشاتان لێ کردبێ و باوەڕتان پێ نەهێنابێ. ﴿وَشَهِدَ شَاهِدٌ مِّنۢ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ عَلَىٰ مِثْلِهِۦ﴾ واتە: کتێبەکانی تری پێشەوە کە هاتوونەتە خوارەوە بۆ پێغەمبەرەکان(سەلامی خوایان لێ بێت) شایەتی دەدەن لەسەر ڕاستی و تەواوی ئەم قورئانەو موژدەیان داوە بەهاتنی و. وە ئەو باسانەی کە قورئان باسی کردوە ئەوانیش هەر بەو شێوەیە باسیان کردوە. ﴿فَـَٔامَنَ﴾ واتە: ئەوەی کە شایەتی داوە لە بەرەی ئیسرائیلیش لەسەر ڕاستی و لەبەر شارەزای لەم قورئانە. ﴿وَٱسْتَكْبَرْتُمْ﴾ ئێوە لەبەر خۆبەزل زانین شوێنی نەکەوتن. مەسروق دەڵێت: ئەم شایەتە باوەڕی هێنابێ بە پێغەمبەرەکەی و بەکتێبەکەی کەچی ئێوە باوەڕتان نەبێ بە پێغەمبەرەکەتان و بە کتێبەکەتان. ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ خودا گەلی ناهەقیکار شارەزا ناکات.[1] ئەم شایەتە ئیسمی جنسە عبدالله کوڕی سەلام دەگرێتەوە. غەیری عەبدوڵلایش دەگرێتەوە. چونکە ئەم ئایەتە پێش موسوڵمان بوونی عبدالله هاتۆتە خوارەوە(ڕەزای خوای لێ بێ) ئەم ئایەتە وەك ئەم ئایەتە وایە کە خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَإِذَا يُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ قَالُوٓا۟ ءَامَنَّا بِهِۦٓ إِنَّهُ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّنَآ إِنَّا كُنَّا مِن قَبْلِهِۦ مُسْلِمِينَ﴾[2] واتە: کاتێك قورئان) بخوێنرێتەوە بەسەریاندا دەڵێن باوەڕمان پێ هێناوە بێگومان ئەم قورئانە ڕاستەو لەلایەن پەروەردگارمانەوە هاتووە بەڕاستی ئێمە لەپێش (هاتنی) قورئان دا موسڵمان بووین. وە ئەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ مِن قَبْلِهِۦٓ إِذَا يُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ يَخِرُّونَ لِلْأَذْقَانِ سُجَّدًا ﴿١٠٧﴾ وَيَقُولُونَ سُبْحَٰنَ رَبِّنَآ إِن كَانَ وَعْدُ رَبِّنَا لَمَفْعُولًا﴾[3] واتە: ئەی

---

[1] الطبري (٢٢/١٠٣/١٠٤).

[2] قصص (٥٣).

[3] الاسراء (١٠٧-١٠٨).

موحەممەد(ﷺ) پێیان بڵێ باوەڕ بێنن بەم قورئانە یان باوەڕی پێ نەهێنن بەڕاستی ئەوانەی کە زانیاریان پێ بەخشراوە لەپێش ئەم قورئانەدا کاتێ قورئان بخوێنرێتەوە بەسەریاندا بە چەسپانی دەکەون بەڕوودا بەسوژدە بردن، وە دەڵێن پاکو بێگەردی بۆ پەروەردگارمان بەڕاستی هەمیشە بەڵێنی پەروەردگارمان بەدی دێت. سەعد دەڵێت: نەم بیستوە لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) گوتبێتی بەکەسێ کە دەڕوا بەسەر زەمیندا. کە ئەو کەسە ئەهلی بەهەشتە بێجگە لە عبدالله ی کوڕی سەلام (ڕەزای خوای لێ بێ) وەدەڵێت: ئەم ئایەتە لەسەر ئەو هاتۆتە خوارەوە کە ئەفەرموێت: ﴿وَشَهِدَ شَاهِدٌ مِّنۢ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ عَلَىٰ مِثۡلِهِۦ﴾[1]. بوخاری و موسلیم و نەسائیش ڕیوایەتیان کردوە[2]. هەروەها ئیبنو عەباس و موجاهیدو زەحاکو قەتادەو عیکریمەو یوسفی کوڕی عبدالله ی کوڕی سەلام و هیلالی کوڕی یەسافو سودی و سەوری مالکی کوڕی ئەنەسو ئیبنو زەید هەموویان گوتویانە: ئەو کەسە عبدالله ی کوڕی سەلامە[3]. خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَوۡ كَانَ خَيۡرٗا مَّا سَبَقُونَآ إِلَيۡهِۚ وَإِذۡ لَمۡ يَهۡتَدُواْ بِهِۦ فَسَيَقُولُونَ هَٰذَآ إِفۡكٞ قَدِيمٞ﴾ ئەوانە خوا نەناسن بەخاوەن باوەڕان دەڵێن: ئەگەر هیچ شتێکی باشی تێدا هەبوایە بەر لەئێمە بۆی نەدەچون، ئێستا کە نەیگەیشتونێ دەڵێن: ئەمە درۆیەکی لەمێژینەو کۆنە. واتە: ئەمانە دەیانوت بەو کەسانەی کە باوەڕیان هێناوە بەم قورئانە. گەر ئەوەی لەم قورئانە دایە باش بوایە، ئەمانە پێش ئێمە نەدەکەتن. مەبەستیان بیلال و عەمارو سوهەیب و خەبابو نمونەی ئەمانە بوو (ڕەزای خوایان لێ بێ) لە بێدەسەڵاتانو بەندەو کەنیزەکان. ئەم خوانەناسانە بە نیازی خۆیان وایان دەزانی کە لە لای خودا پلەی بەرزیان هەیەو خودا ئاگای لێیانە. ئەمانە هەڵەیەکی زۆر گەورەو قسەیەکی زۆر بێ جێیان کرد، وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَكَذَٰلِكَ فَتَنَّا بَعۡضَهُم بِبَعۡضٖ لِّيَقُولُوٓاْ أَهَٰٓؤُلَآءِ مَنَّ ٱللَّهُ عَلَيۡهِم مِّنۢ بَيۡنِنَآ﴾[4] واتە: وە بەو جۆرە هەندێکیانمان بەهەندێکی تریان تاقی کردەوە بۆ ئەوەی بڵێن ئایا ئەوانە خوا ڕێزو بەهرەی پێ بەخشیون لەناو ئێمەدا؟ واتە: سەریان سوڕدەمێنێ کە چۆن ئەوانە شارەزابوون بەر لە ئێمە بۆیە گوتیان: ﴿لَوۡ كَانَ خَيۡرٗا مَّا سَبَقُونَآ إِلَيۡهِ﴾ ئەهلی سونەو جەماعەت دەڵێن: هەر کردارو گفتارێك لە هاوەڵەکانی پێغەمبەرەوە(ﷺ) وەرنەگیرابێ لە خۆوە دروست کراوە و بیدعەیە ئەگەر چاك بوایە ئەوان

---

[1] الطبري (٢٢/١٠٤).

[2] فتح الباري (٧/١٦٠)، مسلم (٤/١٩٣٠)، النسائي فى الكبرى (٥/٧٠).

[3] الطبري (٢٢/١٠٤/١٠٥)، القرطبي (١٦/١٨٨).

[4] الانعام (٥٣).

پێش ئێمە دەکەوتن دەیانکرد. چونکە هیچ شتێکی چاکیان واز لیّ نەهێناوە بەڵکو بەپەلە بۆی ڕۆیشتون و کردوویانە. خوای هێژا ئەفەرموێت: ﴿وَإِذْ لَمْ يَهْتَدُوا بِهِ﴾ واتە: بە قورئان. ﴿فَسَيَقُولُونَ هَٰذَا إِفْكٌ قَدِيمٌ﴾ واتە: خوانەناسان دەڵێن: ئەمە درۆیەکی زۆر کۆنە. واتە: لە دێرزەمانەوە لە خەڵکی وەرگیراوە. قورئان و شوێنکەوتووانی بەسوك سەیر دەکەن. ئا ئەوە ئەو خۆبەزلزانینەیە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (وەرنەگرتنی هەق و بەسوك سەیرکردنی خەڵکی).[1] پاشان خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَمِن قَبْلِهِ كِتَابُ مُوسَىٰ إِمَامًا وَرَحْمَةً ۚ وَهَٰذَا كِتَابٌ مُّصَدِّقٌ لِّسَانًا عَرَبِيًّا لِّيُنذِرَ الَّذِينَ ظَلَمُوا وَبُشْرَىٰ لِلْمُحْسِنِينَ﴾ لە پێش ئەمیش کتێبی موسا پێشەواو بەزەیی بوو، ئەم قورئانە ئەویشی بەڕاست زانیوەو بە زمانی عەرەبیە، تاناهەقان بترسێنێت و مژدە بێ بۆ ئاکارچاکان). ﴿كِتَابُ مُوسَىٰ﴾ واتە: تەورات ﴿وَهَٰذَا كِتَابٌ﴾ واتە: قورئان، ﴿مُّصَدِّقٌ﴾ واتە: ئەم قورئانە پێش خۆی بەڕاست زانیوە. ﴿لِّسَانًا عَرَبِيًّا﴾ بە زمانی عەرەبیەو ڕەوان و ڕوون و ئاسانە. ﴿لِّيُنذِرَ الَّذِينَ ظَلَمُوا وَبُشْرَىٰ لِلْمُحْسِنِينَ﴾ واتە: پێك هاتووە لە هەڕەشەکردن لە خوانەناسان و مژدەدان بەئاکارچاکان. خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿إِنَّ الَّذِينَ قَالُوا رَبُّنَا اللَّهُ ثُمَّ اسْتَقَامُوا فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ﴾ ئەوکەسانەی وتویانە: پەروەردگارمان خودایەو لە دوایشدا هەر لەسەر قسەی خۆیان مان، نە ترسێکیان لەسەر هەیە نە خەم دەخۆن. ﴿إِنَّ الَّذِينَ قَالُوا رَبُّنَا اللَّهُ ثُمَّ اسْتَقَامُوا﴾ ماناکەی لەپێشەوە لە سورەتی (حم السجدة)دا کراوە. وە ئەفەرموێت: ﴿فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ﴾ هیچ ترسێکیان نیە لەوەی کە بەرەو ڕووی دەچن. ﴿وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ﴾ خەمیش ناخۆن بۆ ئەو شتانەی بەجێیان هێشتووە. خوای هێژا ئەفەرموێت: ﴿أُولَٰئِكَ أَصْحَابُ الْجَنَّةِ خَالِدِينَ فِيهَا جَزَاءً بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾ ئەو کەسانە لە قەرەبووی کارەکانیان بەهەشتین و هەتا سەر تێیدا دەبن. واتە: کردارەکانیان دەبێتە هۆی بەزەیی خودا بۆیان و پێیانەوە دیارە والله أعلم.

﴿وَوَصَّيْنَا الْإِنسَانَ بِوَالِدَيْهِ إِحْسَانًا ۖ حَمَلَتْهُ أُمُّهُ كُرْهًا وَوَضَعَتْهُ كُرْهًا ۖ وَحَمْلُهُ وَفِصَالُهُ ثَلَاثُونَ شَهْرًا ۚ حَتَّىٰ إِذَا بَلَغَ أَشُدَّهُ وَبَلَغَ أَرْبَعِينَ سَنَةً قَالَ رَبِّ أَوْزِعْنِي أَنْ أَشْكُرَ نِعْمَتَكَ الَّتِي أَنْعَمْتَ عَلَيَّ وَعَلَىٰ وَالِدَيَّ وَأَنْ أَعْمَلَ صَالِحًا

---

[1] مسلم (٩٣/١).

تَرْضَىٰهُ وَأَصْلِحْ لِي فِي ذُرِّيَّتِيٓ إِنِّي تُبْتُ إِلَيْكَ وَإِنِّي مِنَ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴿١٥﴾ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ نَتَقَبَّلُ عَنْهُمْ أَحْسَنَ مَا عَمِلُواْ وَنَتَجَاوَزُ عَن سَيِّـَٔاتِهِمْ فِيٓ أَصْحَٰبِ ٱلْجَنَّةِ وَعْدَ ٱلصِّدْقِ ٱلَّذِي كَانُواْ يُوعَدُونَ ﴿١٦﴾﴾

**سپاردەی خودا بە دایكو باوك**

کاتیّ خوای گەورە لە ئایەتی پێشەوە باسی دڵسۆزی و یەكتاپەرستیو خواناسی کردو مانەوەو بەردەوام بوون لەسەری پاشان فەرمانی داوە بەچاکەکردن لەگەڵ دایكو باوك. وەك لە چەندین ئایەتی تردا هاتووە وەك خوای گەورە ئەفەرمویّت: ﴿وَقَضَىٰ رَبُّكَ أَلَّا تَعْبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَٰنًا﴾[1] واتە: پەروەردگارت بڕیاری داوە کە هیچ شتیّ نەپەرستن جگە لە ئەوو لەگەڵ دایكو باوکتان چاکە بکەن. وە ئەفەرمویّت: ﴿ وَوَصَّيْنَا ٱلْإِنسَٰنَ بِوَٰلِدَيْهِ حَمَلَتْهُ أُمُّهُۥ وَهْنًا عَلَىٰ وَهْنٍ وَفِصَٰلُهُۥ فِي عَامَيْنِ أَنِ ٱشْكُرْ لِي وَلِوَٰلِدَيْكَ إِلَيَّ ٱلْمَصِيرُ ﴾[2] واتە: وە فەرمانمان بە ئادەمیدا کە سوپاسگوزاری من(خوا) و دایكو باوکت بکە تەنها بۆ لای منە گەڕانەوەتان. وە زۆر ئایەتی تر لەم بارەیەوە. خودای مەزن لێرەدا فەرموویەتی: ﴿وَوَصَّيْنَا ٱلْإِنسَٰنَ بِوَٰلِدَيْهِ إِحْسَٰنًا حَمَلَتْهُ أُمُّهُۥ كُرْهًا وَوَضَعَتْهُ كُرْهًا وَحَمْلُهُۥ وَفِصَٰلُهُۥ ثَلَٰثُونَ شَهْرًا حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ أَشُدَّهُۥ وَبَلَغَ أَرْبَعِينَ سَنَةً قَالَ رَبِّ أَوْزِعْنِيٓ أَنْ أَشْكُرَ نِعْمَتَكَ ٱلَّتِيٓ أَنْعَمْتَ عَلَيَّ وَعَلَىٰ وَٰلِدَيَّ وَأَنْ أَعْمَلَ صَٰلِحًا تَرْضَىٰهُ وَأَصْلِحْ لِي فِي ذُرِّيَّتِيٓ إِنِّي تُبْتُ إِلَيْكَ وَإِنِّي مِنَ ٱلْمُسْلِمِينَ﴾ ئێمە بە مرۆڤمان سپارد کە لەگەڵ دایكو باوکی خۆی چاکە بکات. دایکی بەکۆڵی هەڵی گرت. ڕەنجی کێشا، کە داشی نا، ڕەنجی کێشا هەڵگرتنو بڕینەوەشی سی مانگی برد، هەتا گەیشتە تەمەنی چل ساڵ، دەڵێت: ئەی پەروەردگاری من! خۆت ڕام هێنە، سوپاسی ئەو چاکە بکەم کە دەربارەی منو دایكو باوکمت کرد، کاری وا هێژام فێر بکە تۆ ڕازی بکات، تۆرمەشم لەکاری چاکە ڕابێنە، وا بەرەو تۆ گەڕامەوەو خۆم هەر بەتۆ سپاردوە. ﴿وَوَصَّيْنَا ٱلْإِنسَٰنَ بِوَٰلِدَيْهِ إِحْسَٰنًا﴾ واتە: خوای گەورە فەرمانمان پیّ دەکات کە چاکە بکەین لەگەڵ دایكو باوکمانداو بەسۆز بین لە بەرامبەریان، ئەبو داودی تەیالیسی ڕیوایەتی کردوە لە سەعدەوە(ڕەزای خوای لیّ بیّ) دەڵێت: دایکی سەعد دەڵێت بەسەعد: ئایا خودا فەرمانی نەداوە کە گوێڕایەڵی دایكو باوك بکەن. نە نان دەخۆم نە ئاو دەخۆم تا حاشا نەکەی لە خودای مەزن. وازی لە خواردنو خواردنەوە هێنا هەتا وای لیّ هات بە زۆر دەمیان دەکردەوە، پاش ماوەیەك ئەم ئایەتە هاتە

---

[1] الاسراء (٢٣).

[2] لقمان (١٤).

خوارەوە: ﴿وَوَصَّيۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ بِوَٰلِدَيۡهِ إِحۡسَٰنًا﴾[1] موسليم و زانايانى فەرموودەش ڕیوایەتیان کردوە بێجگە لە ئیبنو ماجە.[2] ﴿حَمَلَتۡهُ أُمُّهُۥ كُرۡهًا﴾ مەینەتى زۆرى چەشتووە بەهۆیەوە لەکاتى هەڵگرتنیدا ئازارى چەشتووەو ماندوو بووە بێزووى کردووە دڵى خاوبووەتەوە لە برساندا سکى قورس بووەو ناڕەحەتى کردووەو چەند نمونەى تر لەم نموونانە کە ژنى سکپڕ تووشى دەبێ لە ماندووبوونو ڕەنج کێشان. ﴿وَوَضَعَتۡهُ كُرۡهًا﴾ واتە: دانانیشێ هەر بە ڕەنج کێشان بەژانو گرانى ژان لێ هاتن. ﴿وَحَمۡلُهُۥ وَفِصَٰلُهُۥ ثَلَٰثُونَ شَهۡرًا﴾ هەڵگرتنو لە مەمك بڕینەوەش سى مانگى پێ چوو. عەلى (ڕەزاى خواى لێ بێ) ئەم ئایەتەو ئەو ئایەتەى کە لە سورەتى (لقمان)دایە: ﴿وَفِصَٰلُهُۥ فِي عَامَيۡنِ﴾[3] واتە: وە بڕینەوەى لە شیر لە دواى تەمەنى دوو ساڵییەوە. کردوە بە بەڵگەو ئەم ئایەتەى کە ئەفەرموێت: ﴿وَٱلۡوَٰلِدَٰتُ يُرۡضِعۡنَ أَوۡلَٰدَهُنَّ حَوۡلَيۡنِ كَامِلَيۡنِۖ لِمَنۡ أَرَادَ أَن يُتِمَّ ٱلرَّضَاعَةَ﴾[4] واتە: دایکان شیر دەدەن بە منداڵەکانیان دوو ساڵى تەواو، ئەمە بۆ کەسێکە کە بیەوێت شیرى تەواو بدات. لەسەر ئەوەى کە ماوەى هەڵگرتن. (حمل) کەمترینى شەش مانگە. ئەمیش لێوەرگرتنێکى ڕاستو بەهێزە و عوسمانیش هاوڕایە لەگەڵى و کۆمەڵێ لە هاوەڵانى پێغەمبەریش هەمان ڕایان بووە. محمدى کوڕى ئیسحاقى کوڕى یەسار ڕیوایەتى کردوە بەعجەى کوڕى عبدالله ى جوهەینەوە دەڵێت: پیاوێك لە ئێمە ژنێکى لە جوهەینە هێنا منداڵێکى بوو پاش شەش مانگ. مێردەکەى ڕۆشت بۆ لاى عوسمانو ئەوەى بۆ باس کرد، عوسمان ناردى بە شوێنى ژنەکەدا وەختێ هەڵساو پۆشاکەکەى لەبەر بکات خوشکەکەى گریا. ئەویش دەڵێت: بۆچى دەگریت؟ سوێند بەخوا هیچ کەسێ لە دروست کراوەکانى خودا نەهاتۆتە لام (کارى ژنو مێردى لەگەڵ نەکردوم) هەرگیز مێردەکەم نەبێ خوداى مەزن بەچى ڕازیە با بەسەرما جێ بەجێ بکرێ. وەختێ هێنایان بۆ لاى عوسمان(ڕەزاى خواى لێ بێ) فەرمانیدا بەردەبارانى بکەن ئەو هەواڵە گەیشتە عەلى (ڕەزاى خواى لێ بێ) هات بۆ لاى عوسمانو پێى گوت: چى دەکەى؟ دەڵێت: منداڵى بووە لە شەش مانگیدا. ئایا ئەوە دەبێ. عەلى پێى گوت! ئایا قورئان ناخوێنى؟ دەڵێت: بەڵێ. عەلى دەڵێت: ئایا نەتبیستوە لە خواى گەورەوە کە ئەفەرموێت: ﴿وَحَمۡلُهُۥ وَفِصَٰلُهُۥ ثَلَٰثُونَ شَهۡرًا﴾. وە فەرموویەتى: ﴿حَوۡلَيۡنِ كَامِلَيۡنِ﴾[5] واتە:

---

[1] مسند الطيالسي (٢٨) فەرمودەیەکى سەحیحە.

[2] مسلم (١٨٧٨/٤)، ابوداود (١٧٧/٣)، تحفة الاحوذي (٤٨/٩)، النسائي فى الكبرى (٣٤٨/٦).

[3] لقمان (١٤).

[4] البقرة (٢٣٣).

[5] البقرة (٢٣٣).

دوو ساڵی تەواو. شەش مانگ نەبێ هیچی تر نامێنێتەوە و دروستمان نەکردبێ. عوسمان دەڵێت: سوێند بەخوا بەم شێوەیە تێنەگەیشتوم. دەڵێت ئەو ژنەم بۆ بێنن کاتێ دۆزیانەوە ڕەجم کرابوو. محمدی کوڕی ئیسحاق دەڵێت: بعجە دەڵێت: قەلەڕەش چۆن لە قەلەڕەش دەچێ و هێلکە چۆن لە هێلکە دەچێ ئەو منداڵە زیاتر لەباوکی دەچوو وەختێ باوکی منداڵەکە منداڵکەی بینی دەڵێت: بەخوا کوڕی منەو هیچ گومانێکم لێی نیە. دەڵێت: خوا تووشی برینێکی کرد بەنیوچاوانیەوە توشی شێرپەنجە بوو بەردەوام برینەکەی زیادی ئەکرد تا کوشتی. ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردوە[1]. ئیبنو ئەبی حاتم دەڵێت: باوکم بۆی گێڕاینەوە فەروەی کوڕی ئەبی مەغراء بۆی گێڕاینەوە، عەلی کوڕی موسهیر بۆی گێڕاینەوە لە داودی کوڕی ئەبی هیندەوە لە عیکریمەوە لە ئیبنو عەباسەوە (ڕەزای خوایان لێ بێ) دەڵێت: وەختێ ژن منداڵی لە نۆ مانگدا بوو بیستو یەك مانگ بەسە بۆ شیردان. وە ئەگەر لە حەوت مانگدا بووی بیستو سێ مانگ بەسە بۆ شیردانی. خۆ ئەگەر لە شەش مانگیدا منداڵەکەی بوو. دوو ساڵی تەواو دەبێ شیری بداتێ چونکە خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَحَمۡلُهُۥ وَفِصَٰلُهُۥ ثَلَٰثُونَ شَهۡرًاۚ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ أَشُدَّهُۥ﴾[2] واتە: تا بەهێز دەبێ و خۆی دەگرێ و بەپێ دەڕوا. ﴿وَبَلَغَ أَرۡبَعِينَ سَنَةً﴾ واتە: عەقڵی دادەمەزرێ و بیروهۆشی تەواو دەبێ. گوتراوە کە تەمەن گەیشتە چل ساڵ بەزۆری کۆڕانی بەسەردا نایەت بە تەواوی دەمێنێتەوە. ﴿قَالَ رَبِّ أَوۡزِعۡنِيٓ﴾ واتە: ڕام بهێنە. ﴿أَنۡ أَشۡكُرَ نِعۡمَتَكَ ٱلَّتِيٓ أَنۡعَمۡتَ عَلَيَّ وَعَلَىٰ وَٰلِدَيَّ وَأَنۡ أَعۡمَلَ صَٰلِحٗا تَرۡضَىٰهُ﴾ واتە: سوپاسی ئەو چاکە بکەم کە دەربارەی منو دایكو باوکمت کردووە کاری وا گەورەش بکەم لەمەودواش کە تۆ ڕازی بکات. ﴿وَأَصۡلِحۡ لِي فِي ذُرِّيَّتِيٓ﴾ وەچەشم(کوڕم) وارابێنە. ﴿إِنِّي تُبۡتُ إِلَيۡكَ وَإِنِّي مِنَ ٱلۡمُسۡلِمِينَ﴾ ئەم ئایەتە ئیشارەتی تێدایە بۆ ئەو کەسانەی کە تەمەنیان دەگاتە چل ساڵ کە پەشیمانیان(توبة) تازە بکەنەوە و بگەڕێنەوە بۆ لای خوداو بەردەوام بن لەسەر ئەو پەشیمانیە. خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ نَتَقَبَّلُ عَنۡهُمۡ أَحۡسَنَ مَا عَمِلُواْ وَنَتَجَاوَزُ عَن سَيِّـَٔاتِهِمۡ فِيٓ أَصۡحَٰبِ ٱلۡجَنَّةِۖ وَعۡدَ ٱلصِّدۡقِ ٱلَّذِي كَانُواْ يُوعَدُونَ﴾ هەر کەسیش وەك ئەوانە بن ئێمە کارە باشەکانیان لێ وەردەگرینو لە گوناهیشیان خۆش دەبینو لەگەڵ بەهەشتیەکان دەبن. ئەو بەڵێنەی کە پێیان دراوە، ڕاستە. واتە: ئەوانە کە خاوەنی ئەم ڕەوشتانەن کەباسمان کرد ئەوانەی داوای لێ بوردنیان لە خودا کردو پاشگەزبوونەوە لە خەتاو خراپەو هەستیان

---

[1] أخرج ابن أبي حاتم وابن المنذر، الدر المنثور (٩/٦).

[2] البيهقي (٤٤٢/٧).

بە تاوانەکانیان کردو گەڕانەوەو پەشیمان بوونەوە. ئەوانە کارە باشەکانیان لێ وەردەگرین‌و چاوپۆشی لە گوناهەکانیان دەکەین‌و لە زۆر هەڵەیان دەبوورین‌و کارو چاکەکانیشیان وەردەگرین. ﴿فِيٓ أَصۡحَٰبِ ٱلۡجَنَّةِۖ﴾ واتە: ئەوانە وان لە ڕیزی ئەوانەی کە لەناو بەهەشتدان. ئەمە بڕیاری خودایە بۆیان‌و وەك خۆی بەڵێنی داوە بۆ ئەو کەسانەی کە پەشیمان دەبنەوەو دەگەڕێنەوە بۆ لای خودا. بۆیە خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَعۡدَ ٱلصِّدۡقِ ٱلَّذِي كَانُواْ يُوعَدُونَ﴾ واتە: ئەو بەڵێنەی کە پێیان دراوە ڕاستە.

﴿ وَٱلَّذِي قَالَ لِوَٰلِدَيۡهِ أُفّٖ لَّكُمَآ أَتَعِدَانِنِيٓ أَنۡ أُخۡرَجَ وَقَدۡ خَلَتِ ٱلۡقُرُونُ مِن قَبۡلِي وَهُمَا يَسۡتَغِيثَانِ ٱللَّهَ وَيۡلَكَ ءَامِنۡ إِنَّ وَعۡدَ ٱللَّهِ حَقّٞ فَيَقُولُ مَا هَٰذَآ إِلَّآ أَسَٰطِيرُ ٱلۡأَوَّلِينَ ﴿١٧﴾ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ حَقَّ عَلَيۡهِمُ ٱلۡقَوۡلُ فِيٓ أُمَمٖ قَدۡ خَلَتۡ مِن قَبۡلِهِم مِّنَ ٱلۡجِنِّ وَٱلۡإِنسِۖ إِنَّهُمۡ كَانُواْ خَٰسِرِينَ ﴿١٨﴾ وَلِكُلّٖ دَرَجَٰتٞ مِّمَّا عَمِلُواْۖ وَلِيُوَفِّيَهُمۡ أَعۡمَٰلَهُمۡ وَهُمۡ لَا يُظۡلَمُونَ ﴿١٩﴾ وَيَوۡمَ يُعۡرَضُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ عَلَى ٱلنَّارِ أَذۡهَبۡتُمۡ طَيِّبَٰتِكُمۡ فِي حَيَاتِكُمُ ٱلدُّنۡيَا وَٱسۡتَمۡتَعۡتُم بِهَا فَٱلۡيَوۡمَ تُجۡزَوۡنَ عَذَابَ ٱلۡهُونِ بِمَا كُنتُمۡ تَسۡتَكۡبِرُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ بِغَيۡرِ ٱلۡحَقِّ وَبِمَا كُنتُمۡ تَفۡسُقُونَ ﴿٢٠﴾ ﴾

**باسی ئەو منداڵانەی کە خەتا دەکەن لەگەڵ دایك‌و باوك‌و پاشە ڕۆژیان**

کاتێ خودای گەورە باسی ژیانی ئەو کەسانەی کرد پاڕانەوە بۆ دایك‌و باوکیان‌و چاکەیان لەگەڵ کردن‌و ئەوەی کە پێیان دەدرێ لە خۆشی و بەختەوەری و ئازادبوون لەلای خودا. دوای ئەوە باسی ژیان‌و پاشەڕۆژی ئەو کەسە بەدبەختانە دەکات لە خەتاو خراپەیان لەگەڵ باوك‌و دایکیان کردوە و فەرموویەتی: ﴿ وَٱلَّذِي قَالَ لِوَٰلِدَيۡهِ أُفّٖ لَّكُمَآ أَتَعِدَانِنِيٓ أَنۡ أُخۡرَجَ وَقَدۡ خَلَتِ ٱلۡقُرُونُ مِن قَبۡلِي وَهُمَا يَسۡتَغِيثَانِ ٱللَّهَ وَيۡلَكَ ءَامِنۡ إِنَّ وَعۡدَ ٱللَّهِ حَقّٞ فَيَقُولُ مَا هَٰذَآ إِلَّآ أَسَٰطِيرُ ٱلۡأَوَّلِينَ﴾ ئەو مرۆڤەش کە بەباوك‌و دایکی دەوت: ئۆف لەدەست ئێوە ئاخۆ بەڵێنم پێدەدەن جارێ تر زیندو دەبمەوەو لەگۆڕ دەرم دەهێننەوە؟ چەند بەرەو چین لەپێش مندا هاتوون‌و چوون. دایك‌و باوکیش هەر پەنایان بەخوا دەبرد و دەیانوت هەی ماڵ وێران بڕوا بێنە! بەڵێنی خودایەو ڕاستە ئەویش دەیوت: ئەو شتانە هەر چیرۆکی پێشینانەو چی تر نیە. ﴿ وَٱلَّذِي قَالَ لِوَٰلِدَيۡهِ أُفّٖ لَّكُمَآ ﴾ ئەم ئایەتە گشتگیرە بۆ هەموو کەسێ ئەمە بڵێ، وە هەر کەسێ وادەزانێ کە ئەم ئایەتە لەسەر عبدالرحمانی کوڕی ئەبوبەکر هاتووەتە خوارەوە قسەکەی لاوازەو وەرناگیرێ. چونکە عبدالرحمانی کوڕی ئەبوبەکر پاش هاتنی ئەم موسوڵمان بووە خەڵکی ئەو زەمانە باسیان کردووە کە موسڵمانێکی چاك‌و خاوەن باوەڕێکی باش بووە. بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە یوسفی کوڕی ماهەکەوە دەڵێت: مەروان کاربەدەستی حیجاز بوو مەعاویەی کوڕی ئەبوسوفیان (ڕەزای خوایان لێ بێ) دایناببوو. وتاری دەداو باسی یەزیدی کوڕی مەعاویەی دەکرد بۆ ئەوەی پەیمانی پێ

بدرێ دوای باوکی. عبدالرحمانی کوڕی ئەبوبەکر شتێکی پێ وت. مەروان دەڵێت: بیگرن. ڕۆشبتە ماڵی عائیشە(ڕەزای خوای لێ بێ) نەیان توانی بیگرن. مەروان دەڵێت: ئەمە ئەو کەسە بوو کە ئەم ئایەتەی لەسەر هاتە خوارەوە: ﴿ وَٱلَّذِى قَالَ لِوَٰلِدَيْهِ أُفٍّ لَّكُمَآ أَتَعِدَانِنِىٓ أَنْ أُخْرَجَ وَقَدْ خَلَتِ ٱلْقُرُونُ مِن قَبْلِى ﴾ عائیشە(ڕەزای خوای لێ بێ) لەپشت پەردەوە دەڵێت: خوای گەورە لەسەر ئێمە هیچ شتێکی نەناردوەتە خوارەوە لە قورئان هەرگیز ئەوە نەبێ لەسەر بێتاوانی من ڕەوانەی کرد[1]. ڕێگایەکی تر هاتووە. نەسائی ڕیوایەتی کردووە لە محمدی کوڕی زیادەوە دەڵێت: کاتێ کە پەیمانی وەرگرت بۆ یەزیدی کوڕی. مەروان دەڵێت: ئەمە ڕەوشتی ئەبوبەکرو عومەرە(ڕەزای خوایان لێ بێ) عبدالرحمانی کوڕی ئەبوبەکر دەڵێت: ڕەوشتی هەرقل و قەیسەرە مەراون دەڵێت: ئەمە ئەو کەسەیە کە ئەم ئایەتەی لەسەر هاتە خوارەوە: ﴿ وَٱلَّذِى قَالَ لِوَٰلِدَيْهِ أُفٍّ لَّكُمَآ ﴾ ئەم قسەیە گەیشتە عائیشە(ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێت: سوێند بەخوا مەروان درۆی کرد. ئەو ئایەتە بۆ ئەو نەبوو. ئەگەر بمەوێت ناوی ئەو کەسە بێنم ئەم ئایەتەی لەسەر هاتە خوارەوە ناوم دەبرد. بەڵام پێغەمبەری خودا(ﷺ) لەعنەتی کرد لە باوکی مەروان کە مەروان لەپشت باوکیدا بوو. پرشێ لەو لەعنەتەی خوای بەرکەوتووە.[2] خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿أَتَعِدَانِنِىٓ أَنْ أُخْرَجَ ﴾ واتە: ئاخۆ زیندوو دەبمەوە. ﴿وَقَدْ خَلَتِ ٱلْقُرُونُ مِن قَبْلِى﴾ واتە: خەڵکێکی زۆر هاتوون‌و چوون هیچ کەسێك لەوانە نەگەڕاوەتەوە، ﴿وَهُمَا يَسْتَغِيثَانِ ٱللَّهَ﴾ دەپاڕانەوە لە خودا کە ڕێی نیشانداو دەیانوت بە کوڕەکەیان: ﴿وَيْلَكَ ءَامِنْ إِنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ فَيَقُولُ مَا هَٰذَآ إِلَّآ أَسَٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ﴾ واتە: ماڵ وێران باوەڕ بێنەو بەڵێنی خوایەو ڕاستە کوڕەکەیش دەیوت: ئەو شتانە قسەی پێشینان نەبێ هیچی تر نیە. خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ حَقَّ عَلَيْهِمُ ٱلْقَوْلُ فِىٓ أُمَمٍ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِم مِّنَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ ۖ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ خَٰسِرِينَ﴾ ئەو کەسانەشی هەر بە دەردی کۆمەڵێك لە جنۆکەو مرۆڤەکان چوون، کە بەر لەوان فەوتان‌و تووشی جەزرەبەی ئێمە هاتن‌و زیانبار بوون. واتە: ئەوانەش چوونە ڕیزی هاوشێوەکانی خۆیان لە خوانەناسان‌و زیانباران ئەوانەی کە خۆیان‌و ماڵ و منداڵیان تووشی زیان‌و ڕەنجەڕۆیی کردوە لە ڕۆژی قیامەتدا. وە ئەفەرموێت: ﴿أُو۟لَٰٓئِكَ﴾ پاش﴿ وَٱلَّذِى قَالَ ﴾ بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە باسمان کرد، ناوێکە بۆ جنسە هەموو کەسێك دەگرێتەوە کە ئا بەو شێوەیە بێ حەسەن‌و قەتادە دەڵێن: ئەو خوانەناس و لە دین لادەرانەی کە خەتاو خراپە لەگەڵ باوك ودایك

---

[1] فتح الباري (٤٣٩/٨).

[2] النسائي فی الکبری (٤٥٨/٦) ئەم فەرمودەیە سەنەدەکەی لاوازە.

دەكەن‌و باوەڕیان بە زیندووبوونەوە نیە[1]. خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَلِكُلٍّ دَرَجَٰتٌ مِّمَّا عَمِلُواْۖ وَلِيُوَفِّيَهُمۡ أَعۡمَٰلَهُمۡ وَهُمۡ لَا يُظۡلَمُونَ﴾ ئێمە بۆ هەریەك لەوانە پلەو پایەمان داناوە. تا خوا هەركەس بە گوێرەی كارو كردەوەی پاداشت بدات، ناهەقیشیان لێ ناكرێت. واتە: هەركەسە بەپێی كردەوەی خۆی سزا دەدرێت. ﴿وَلِيُوَفِّيَهُمۡ أَعۡمَٰلَهُمۡ وَهُمۡ لَا يُظۡلَمُونَ﴾ واتە: خوای گەورە بە ئەندازەی مسقالە زەڕەیە ناهەقیان لەگەڵ ناكات كەمتریش لەوە. عبدالرحمانی كوڕی زەیدی كوڕی ئەسلەم دەڵێت: پلەكانی ئاگربەرەو ژێردەڕوات‌و. پلەكانی بەهەشت بەرەو ژوور دەڕوات[2]. خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَيَوۡمَ يُعۡرَضُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ عَلَى ٱلنَّارِ أَذۡهَبۡتُمۡ طَيِّبَٰتِكُمۡ فِي حَيَاتِكُمُ ٱلدُّنۡيَا وَٱسۡتَمۡتَعۡتُم بِهَا فَٱلۡيَوۡمَ تُجۡزَوۡنَ عَذَابَ ٱلۡهُونِ بِمَا كُنتُمۡ تَسۡتَكۡبِرُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ بِغَيۡرِ ٱلۡحَقِّ وَبِمَا كُنتُمۡ تَفۡسُقُونَ﴾ ئەو ڕۆژەی بەرەی خوانەناسان بەرامبەر ئاگر ڕادەگیرێن (پێیان دەڵێن: خۆشی دنیاتان بەسەر بردو بە باشی بەهرەتان لێ برد. ئەمڕۆش زۆر بەسوكایەتی ئازار دەدرێن، چونكە ئێوە لەسەر زەمین بەخۆڕایی خۆتان زۆر بەزل دەزانی‌و لە ڕێگەی ڕاست لاتان دابوو. واتە: لە ڕۆژی قیامەتدا كاتێ دەیانهێنن ئەمەیان پێدەوترێ: بۆ سوكایەتی پێ كردن‌و سەركوتانەوەیان. گەورەی موسوڵمانان عومەری كوڕی خەتاب (ڕەزای خوای لێ بێ) خۆی لا دەدا لە خواردن‌و خواردنەوەی چاك‌و خۆش‌و زۆری نەدەخوارد دەیوت: دەترسم وەك ئەوانە بم كە خوای مەزن سوكایەتی و سەرزەنشتی كردون‌و فەرموویەتی: ﴿أَذۡهَبۡتُمۡ طَيِّبَٰتِكُمۡ فِي حَيَاتِكُمُ ٱلدُّنۡيَا وَٱسۡتَمۡتَعۡتُم بِهَا﴾ ئەبو میجلەز دەڵێت: چەند كرۆیەك چاكەكانیان لە دنیا لە دەست دەدەن لەڕۆژی قیامەتدا پێیان ئەڵێت: ﴿أَذۡهَبۡتُمۡ طَيِّبَٰتِكُمۡ فِي حَيَاتِكُمُ ٱلدُّنۡيَا﴾ خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿فَٱلۡيَوۡمَ تُجۡزَوۡنَ عَذَابَ ٱلۡهُونِ بِمَا كُنتُمۡ تَسۡتَكۡبِرُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ بِغَيۡرِ ٱلۡحَقِّ وَبِمَا كُنتُمۡ تَفۡسُقُونَ﴾ واتە: پاداشتی خۆیان وەردەگرن لە شێوەی ئەو كردارانەی كە لە دنیا كردوویانە. وەك چۆن لە ژیانی دنیادا بەخۆشی ڕایانبواردو زۆر خۆیان بەزل دەزانی‌و شوێن ڕێی ڕاست نەدەكەوتن‌و خەریكی كاری خراپ‌و دوور لە خوایی بوون. خوای گەورەش پاداشیان دەداتەوە و زۆر بەسوكایەتی ئازاریان دەدات. ئەوەش بە سزادانی گورچك بڕ و شوێنی زۆر ناخۆش‌و ترسناك‌و هاوارو هەناسە هەڵكێشانی بەردەوامی بێ سوود. خوای گەورە لاماندا‌و بمانپارێزێ بەسۆزو بەزەیی خۆی.

[1] الطبري (٢٢/١١٨).

[2] الطبري (٢٢/١١٩).

﴿وَاذْكُرْ أَخَا عَادٍ إِذْ أَنذَرَ قَوْمَهُۥ بِالْأَحْقَافِ وَقَدْ خَلَتِ النُّذُرُ مِنۢ بَيْنِ يَدَيْهِ وَمِنْ خَلْفِهِۦٓ أَلَّا تَعْبُدُوٓا إِلَّا اللَّهَ إِنِّىٓ أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ ﴿٢١﴾ قَالُوٓا أَجِئْتَنَا لِتَأْفِكَنَا عَنْ ءَالِهَتِنَا فَأْتِنَا بِمَا تَعِدُنَآ إِن كُنتَ مِنَ الصَّٰدِقِينَ ﴿٢٢﴾ قَالَ إِنَّمَا الْعِلْمُ عِندَ اللَّهِ وَأُبَلِّغُكُم مَّآ أُرْسِلْتُ بِهِۦ وَلَٰكِنِّىٓ أَرَىٰكُمْ قَوْمًا تَجْهَلُونَ ﴿٢٣﴾ فَلَمَّا رَأَوْهُ عَارِضًا مُّسْتَقْبِلَ أَوْدِيَتِهِمْ قَالُوا هَٰذَا عَارِضٌ مُّمْطِرُنَا ۚ بَلْ هُوَ مَا اسْتَعْجَلْتُم بِهِۦ ۖ رِيحٌ فِيهَا عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٢٤﴾ تُدَمِّرُ كُلَّ شَىْءٍۭ بِأَمْرِ رَبِّهَا فَأَصْبَحُوا لَا يُرَىٰٓ إِلَّا مَسَٰكِنُهُمْ ۚ كَذَٰلِكَ نَجْزِى الْقَوْمَ الْمُجْرِمِينَ ﴿٢٥﴾﴾

## چیرۆكی برای عاد

خـــودای مـــەزن ئەفـــەرموێت: ﴿وَاذْكُرْ أَخَا عَادٍ إِذْ أَنذَرَ قَوْمَهُۥ بِالْأَحْقَافِ وَقَدْ خَلَتِ النُّذُرُ مِنۢ بَيْنِ يَدَيْهِ وَمِنْ خَلْفِهِۦٓ أَلَّا تَعْبُدُوٓا إِلَّا اللَّهَ إِنِّىٓ أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ﴾ برای (عاد)یش وەبیر بێنە. كە لە ئەحقاف ترسی وەبەر هۆزەكەی نا. ئێوە نابێ غەیری خودا بپەرستن، من لە ئێوە نیگەرانم كە لە ڕۆژی گەورەدا ئازار ببینن، بەر لە ئەو ولە پاش ئەویش ترسێنەران هاتن‌وچون. خوای گەورە دڵی پێغەمبەر(ﷺ) دەداتەوە لە مەڕ باوەڕنەهێنانی ئەوانەی لە هۆزەكەی كە بەڕاستی نازانن ئەفەرموێت: ﴿وَاذْكُرْ أَخَا عَادٍ﴾ كە هود پێغەمبەر(سەلامی خوای لێ بێتت) كە خوای گەورە ڕەوانەی كرد بۆ سەر عادی یەكەم كە لە ئەحقافدا نیشتەجێ بوون. ئەحقاف جەمعی حیقفە بریتیە لە كێوی لم ئیبنو زەید گوتویەتی[1]. عیكریمە دەڵێت: واتە كێوو ئەشكەوت، قەتادە دەڵێت: بۆمان باسكراوە كە ئەحقاف دێیەك بوون لە یەمەن خەڵكی ڕەملن لەسەر كەناری دەریا پێی گوتراوە: شیحر[2] ئیبنو ماجە دەڵێت: (لە بابێكا وەختێ كەسێ پاڕایەوە با یەكەم جار لە خۆیەوە دەست پێ بكات): پاشان ڕیوایەتی كردووە لە ئیبنو عەباسەوە دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (خودا بەزەیی بێتەوە بەئێمەو برای عادیشدا)[3] واتە: هود پێغەمبەر(سەلامی خوای لێ بێت)، خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَقَدْ خَلَتِ النُّذُرُ مِنۢ بَيْنِ يَدَيْهِ وَمِنْ خَلْفِهِۦٓ﴾ واتە: خودای گەورە پێغەمبەرانی ڕەوانە كرد بۆ ئەو كەسانەی كە لەو گوندانەی دەوروبەری ئەوان ئاگاداریان كردبوونەوەو هەڕەشەیان لێ كردبوون وەك خودا ئەفەرموێت: ﴿فَجَعَلْنَٰهَا نَكَٰلًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهَا وَمَا خَلْفَهَا وَمَوْعِظَةً لِّلْمُتَّقِينَ﴾[4] واتە: ئینجا ئەم سزایەمان كردە پەند بۆ خەڵكانی

---

[1] الطبري (٢٢/١٢٥).

[2] الطبري (٢٢/١٢٤).

[3] ابن ماجه (٢/١٢٦٦) فەرمودەیەكی حەسەنە.

[4] البقرة (٦٦).

ئەو سەردەمەو ئەوانەی دوای ئەوان. ئەم ئایەتەیش کە ئەفەرموێت: ﴿فَإِنْ أَعْرَضُوا فَقُلْ أَنذَرْتُكُمْ صَاعِقَةً مِّثْلَ صَاعِقَةِ عَادٍ وَثَمُودَ ﴿١٣﴾ إِذْ جَاءَتْهُمُ الرُّسُلُ مِن بَيْنِ أَيْدِيهِمْ وَمِنْ خَلْفِهِمْ أَلَّا تَعْبُدُوا إِلَّا اللَّهَ﴾[1] واتە: جا ئەگەر ڕوویان وەرگێڕا ئەوە بڵێ بەهەورە تریشقەیەك (بروسکەیەك) دەتانترسێنم وەك هەورە تریشقەی گەلی عادو سەموود، کاتێ پێغەمبەرەکانیان هاتنە لایان لەبەردەمیان و لەپشتیانەوە پێیان ووتن کە جگە لە خوا نەپەرستن. وە ئەفەموێت: ﴿إِنِّي أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ﴾ واتە: من زۆر پێم ناخۆشە کە لەڕۆژی گەورەدا ئازار ببینن. هود پێغەمبەر ئەمەی پێ گوتن. هۆزەکەی وەڵامیان دایەوەو گوتیان وەك خوا ئەفەرموێت: ﴿قَالُوا أَجِئْتَنَا لِتَأْفِكَنَا عَنْ آلِهَتِنَا فَأْتِنَا بِمَا تَعِدُنَا إِن كُنتَ مِنَ الصَّادِقِينَ﴾ گوتیان: ئاخۆ هەر بۆیە هاتوویە لامان، لامان بدەی لەوانەی کە دەیانپەرستین؟ گەر لە قسە ڕاستانی، ئەو هەڕەشەی لە ئێمەت کرد بەجێی بێنە. ﴿لِتَأْفِكَنَا﴾ لامان بدەی، ﴿عَنْ آلِهَتِنَا﴾ واتە: لەو خودایانەی کە دەیانپەرستین، ﴿فَأْتِنَا بِمَا تَعِدُنَا إِن كُنتَ مِنَ الصَّادِقِينَ﴾ واتە: ئادەی زوو ئەو سزاو تۆڵەمان بۆ بێنە. بڕوایان بەوە نەبوو کە ڕاست دەڵێت و سزایان بۆ دێت. وەك خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿يَسْتَعْجِلُ بِهَا الَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِهَا﴾[2] واتە: ئەوانەی باوەڕتان پێی نیە پەلەی هاتنی دەکەن. وە ئەفەرموێت: ﴿قَالَ إِنَّمَا الْعِلْمُ عِندَ اللَّهِ وَأُبَلِّغُكُم مَّا أُرْسِلْتُ بِهِ وَلَٰكِنِّي أَرَاكُمْ قَوْمًا تَجْهَلُونَ﴾ دەڵێت: ئەویش خودا دەیزانێ؟ من بەچی ڕاسپێراوم. بە ئێوەی ڕادەگەیەنم بەڵام وەك من دەتانبینم ئێوە کۆمەڵێ نەزانن. واتە: خودا چاکتر ئێوە دەناسێ. ئەگەر ئێوە شایستەی ئەو سزایە بن بەم زووانە سزاتان دەدات. وە من چیم پێ سپێراوە بە ئێوەی ڕادەگەیەنم، ﴿وَلَٰكِنِّي أَرَاكُمْ قَوْمًا تَجْهَلُونَ﴾ واتە: ئێوە عەقڵتان نیەو تێناگەن. خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿فَلَمَّا رَأَوْهُ عَارِضًا مُّسْتَقْبِلَ أَوْدِيَتِهِمْ قَالُوا هَٰذَا عَارِضٌ مُّمْطِرُنَا ۚ بَلْ هُوَ مَا اسْتَعْجَلْتُم بِهِ ۖ رِيحٌ فِيهَا عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ کاتێ لە لای شیوەکانیان هەورێکیان دی. گوتیان: ئەمە بارانمان بۆ دەبارێنێ. بەڵکو ئەمە هەر ئەوەیە کە ئێوە بۆی بەپەلە بوون، هەوری بایەو جەزرەبەدانی بەژانی لەگەڵدایە. واتە: کاتێ ئەو سزایەیان بینی کە بۆیان دەهات. وایان دەزانی کە هەورێکەو بارانیان بۆ دەبارێنێ. زۆر دڵخۆش بوون و مژدەیان بەیەك دەدا. چونکە زۆر پێویستیان بە باران بوو. خودای مەزن فەرموویەتی: ﴿بَلْ هُوَ مَا اسْتَعْجَلْتُم بِهِ ۖ رِيحٌ فِيهَا عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ واتە: ئەوە ئەو سزایە کە گوتیان بە هود ئەو هەڕەشەی کە

---

[1] فصلت (١٣ـ١٤).

[2] الشورى (١٨).

لە ئێمەت کرد بەجێی بێنە ئەگەر لە قسە ڕاستانی. وە ئەفـەرموێت: ﴿تُدَمِّرُ كُلَّ شَىۡءٍ بِأَمۡرِ رَبِّهَا فَأَصۡبَحُواْ لَا يُرَىٰٓ إِلَّا مَسَٰكِنُهُمۡۚ كَذَٰلِكَ نَجۡزِى ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡمُجۡرِمِينَ﴾بەفـەرمانی پـەروەردگاری، هـەموو شت تێکوپێك دەدا، ئیتر کارێکیان بەسەرهات تـەنیا هـەر جێ ماڵـەکانیان دەبینـرا ئێمـە پاداشـی کۆمـەڵی تاوانبـاران ئـاوا دەدەین. ﴿تُدَمِّرُ﴾ واتە: کاول دەکات. ﴿كُلَّ شَىۡءٍ﴾ هەرچیەکیان هـەبوو لـە وڵاتـدا بـەخۆیانو مـاڵ و سامانیانەوە هەمووی لەناوچوو تەنها شوێنی ماڵەکانیان مایەوە. ﴿بِأَمۡرِ رَبِّهَا﴾ واتە: ئەوەش بەفەرمانی خوای گەورە بوو. وەك ئەم ئایەتە کەئەفـەرموێت: ﴿مَا تَذَرُ مِن شَىۡءٍ أَتَتۡ عَلَيۡهِ إِلَّا جَعَلَتۡهُ كَٱلرَّمِيمِ﴾[1] واتـە: بەسەر هەر شتێکدا بڕۆشتایە وازی لێ نەدەهێنا هەتا وەك ڕزیوی لێ ئەکرد. واتە: وەك شتی پواو بۆیە خوای مەزن فەرموویەتی: ﴿فَأَصۡبَحُواْ لَا يُرَىٰٓ إِلَّا مَسَٰكِنُهُمۡ﴾ واتە: هەموو لەناوچوونو قڕ بـوون کەسیان نەما لەجێیان بمێنێتەوە. ﴿كَذَٰلِكَ نَجۡزِى ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡمُجۡرِمِينَ﴾ واتە: ئەوەیە بڕیاری ئێمە بۆ ئەو کەسانەی کە بـڕوا بـە پێغەمبـەرەکانمان ناکـەنو بـێ فـەرمانی ئێمـە دەکـەن. ئیمـامی ئەحمـد ڕیوایـەتی کـردوە لـە عائیشەوە(ڕەزای خـوای لـێ بـێ) کـە دەڵێـت: پێغەمبـەری خـودام نـەبینیوە(چـاو پـێ نەکـەوتوە) پـڕ بەدەمی پێ بکەنێ هەتا ناو دەمی ببینم. بـەڵکو زەردەخەنـەی دەکـرد وە دەڵێـت: کـاتێ پێغەمبـەری خودا هەورێ یا بایـەکی چـاو پـێ بکەوتایـە بـەناو چاویەوە دیـار بـوو هەسـتی پـێ دەکـرا. وتم: ئـەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) وەختێ خەڵکی هەور دەبینن دڵخۆش دەبنو بەتەمای باران بـارینن. کەچـی مـن تۆ دەبینم کاتێ هەور دەبینـی نارەحـەتیو گرانـی بەنێوچـاوانتەوە دەبینـرێ. پێغەمبـەری خـودا(ﷺ) فەرمووی: (ئەی عائیشە بێ خەم نیم کە سـزای نـەبێ. هۆزێـك بـەبا سـزا دراوە، هۆزێـك سزایان بینـی گوتیان: ئەوە هەورێکەو بارانمان بـۆ دەبارێنێـت).[2] بوخـاریو موسـلمیش هێناویانـە.[3] ئیمـامی ئەحمـد ڕیوایەتی کردوە لە عائیشەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) وەختێ هـەوری لـە کەنارێك لە کەنارەکانی (بەرزی) ئاسمان ببینیایە وازی لەو کارەی دەهێناو ئەگەر لـە نوێژیـشدا بووایـە پاشان ئەی فەرموو: (ئەی خودایە بارانێکی بەسود بێت).[4] موسلم ڕیوایەتی کردوە لە سەحیحەکەیدا لە عائیـشەوە (ڕەزای خـوای لـێ بـێ) دەڵێـت: پێغەمبـەری خـودا(ﷺ) وەختـێ ڕەشـەبا هـەڵی بکردایـە دەیفەرموو: (ئەی خودایـە مـن داوای خـەیرەکـەیت لێ دەکـەمو سـوودی ئـەوەی کـە تیایـەتی وەخێـری

[1] الذاريات (٤٢).

[2] احمد (٦٦/٦) فەرمودەیەکی سەحیحە.

[3] فتح الباری (٤٤١/٨)، مسلم (٦١٦/٢)

[4] احمد (١٩٠/٦) فەرمودەیەکی سەحیحە.

ئەوەی کە بۆی هاتووە. وەخۆ دەپارێزم بە تۆ لەزیان و لەزیانی ئەوەی کە لەناویایەتی و بەویش کە پێی هاتووە)، عائیشە وتی: وەختێ هەورە گرمەو بریسکەی ئاسمان ببوایە پێغەمبەری خودا(ﷺ) رەنگی دەگۆڕاو دەرو ماڵی دەکردو دەچووە ژوورەو دەهاتە دەرەوە. کاتێ کە بارانەکە دەباری رەنگی دەهاتەوە سەرخۆی. عائیشە کە ئەوەی پێوە بینی. پرسیاری لێ کرد! فەرمووی: (ئەی عائیشە لەوانەیە وەك ئەوە بێ کە هۆزی عاد گوتیان: ﴿فَلَمَّا رَأَوْهُ عَارِضًا مُّسْتَقْبِلَ أَوْدِيَتِهِمْ قَالُواْ هَٰذَا عَارِضٌ مُّمْطِرُنَا﴾[1] لەپێشەوە باسی چیرۆکی لەناوچوون و قڕبوونی هۆزی عادمان کرد لە سورەتی (الاعراف و هود)دا پێویست ناکات لێرەدا جارێکی تر باسی بکەینەوە. سوپاس و ستایش بۆ خوای گەورە.

﴿وَلَقَدْ مَكَّنَّٰهُمْ فِيمَآ إِن مَّكَّنَّٰكُمْ فِيهِ وَجَعَلْنَا لَهُمْ سَمْعًا وَأَبْصَٰرًا وَأَفْـِٔدَةً فَمَآ أَغْنَىٰ عَنْهُمْ سَمْعُهُمْ وَلَآ أَبْصَٰرُهُمْ وَلَآ أَفْـِٔدَتُهُم مِّن شَىْءٍ إِذْ كَانُواْ يَجْحَدُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُواْ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ ﴿٢٦﴾ وَلَقَدْ أَهْلَكْنَا مَا حَوْلَكُم مِّنَ ٱلْقُرَىٰ وَصَرَّفْنَا ٱلْـَٔايَٰتِ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿٢٧﴾ فَلَوْلَا نَصَرَهُمُ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ قُرْبَانًا ءَالِهَةًۢ بَلْ ضَلُّواْ عَنْهُمْ وَذَٰلِكَ إِفْكُهُمْ وَمَا كَانُواْ يَفْتَرُونَ ﴿٢٨﴾﴾

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ مَكَّنَّٰهُمْ فِيمَآ إِن مَّكَّنَّٰكُمْ فِيهِ وَجَعَلْنَا لَهُمْ سَمْعًا وَأَبْصَٰرًا وَأَفْـِٔدَةً فَمَآ أَغْنَىٰ عَنْهُمْ سَمْعُهُمْ وَلَآ أَبْصَٰرُهُمْ وَلَآ أَفْـِٔدَتُهُم مِّن شَىْءٍ إِذْ كَانُواْ يَجْحَدُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُواْ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ﴾ لەو شوێنەدا گوزەرێکمان دابوونێ، کە بە ئێوەمان نەداوە. گوێ و چاوو دڵیشمان بەوان دابوو، ئەوان لە گوێ و چاوو دڵیان هیچ بەهرەیان دەست نەکەوت، کە نرخێکیان بۆ نیشانەکانی خودا دانەدەناو ئەوەی گاڵتەیان پێدەکرد دەوری لێدان. واتە: ئەو هۆزانەی پێش ئێوە هاتن لە دنیا شوێن و گوزەرانێکی چاکمان دانێ لە سامان و ماڵ و منداڵ و ئەوەی بەوانمان دا بە ئێوەمان نەداوە لە هیچ ڕوویەکەوە کەچی ئەوان هیچ نرخێکیان بۆ ئەو نیشانانەی خودا دانەدەناو گاڵتەیان پێدەکرد. هەتا سزای خودا دەوری لێدان. ئەو سزاو تۆڵەی کە بڕوایان پێی نەبوو بە دووریان دەزانی کە ڕوویدات. واتە: ئەی ئەو کەسانەی کە ئەمەتان بۆ باس دەکرێ تا ئاگاتان لە خۆتان بێ با وەك ئەوانەتان بەسەر نەیەت ئەوەی ئەوان توشیان بوو ئێوەش وەك ئەوان تووشتان ببێ لەو سزاو جەزرەبەیە لە دنیاو لە ڕۆژی دوایدا. خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ أَهْلَكْنَا مَا حَوْلَكُم مِّنَ ٱلْقُرَىٰ وَصَرَّفْنَا ٱلْـَٔايَٰتِ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ﴾ فرە لەو بازێڕانەمان قڕ تێ خستوون کە هەر لە دەوری ئێوە بوون. هەموو جۆرە بەڵگەیەکمان نیشان دان کە بەشکو بگەڕێنەوە. ﴿وَلَقَدْ أَهْلَكْنَا مَا حَوْلَكُم مِّنَ ٱلْقُرَىٰ﴾ واتە: خەڵکی مەککە. خوای گەورە

[1] مسلم (٢/٦١٦).

گەلە پێشوەکانی قڕ تێ خست کە لە دەوری ئێوە بوون و باوەڕیان بە پێغەمبەرەکانیان نەبوو وەك گەلی عاد لە ئەحقاف نیشتەجێ بوون کە پێشی دەوترێ حەزەرەمەوت لەیەمەن. گەلی سەمودیش کە شوێنەکەیان لە نێوان ئەوان و شامدا بوو. وە هەروەها گەلی(سبأ) کە ئەوانیش خەڵکی یەمەن بوون. خەڵکی مەدیەنیش کە لەسەر ڕێگایاندا بوو بەرەو غەزە وە دیسان بوحەیرەی گەلی لوت کە بەلایدا تێ دەپەڕین. خودا ئەفەرموێت: ﴿وَصَرَّفۡنَا ٱلۡأٓيَٰتِ﴾ واتە: ئەم جۆرە نیشانانەمان بۆ دەهێنانەوەو ڕوونماندەکردەوە بۆیان. ﴿لَعَلَّهُمۡ يَرۡجِعُونَ﴾ بەڵکو پەشیمان ببنەوەو بگەڕێنەوە. وە ئەفەرموێت:

﴿فَلَوۡلَا نَصَرَهُمُ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ قُرۡبَانًا ءَالِهَةَۢۖ بَلۡ ضَلُّواْ عَنۡهُمۡۚ وَذَٰلِكَ إِفۡكُهُمۡ وَمَا كَانُواْ يَفۡتَرُونَ﴾

ئەی بۆچی ئەو شتانەی غەیرە خودا دەیانپەرست تا بەو هۆیە لە خوایان نزیك بکەنەوە هیچ بەهانایان نەهاتن؟ بەڵکو ئەوان لە دەستیان چوون ئەمەش لەو درۆیانە بوو کە بۆ خۆیان هەڵیان بەستوون. واتە: ئایا هاتن بە هانایانەوە لەکاتێکدا ئەوان پێویستیان هەبوو؟ ﴿بَلۡ ضَلُّواْ عَنۡهُمۡ﴾ واتە: لایان لێ نەکردنەوە لەکاتێکدا کەزۆر پێویستیان بە یارمەتیان هەبوو. ﴿وَذَٰلِكَ إِفۡكُهُمۡ﴾ ئەوەش لەو درۆیانەبوو. ﴿وَمَا كَانُواْ يَفۡتَرُونَ﴾ کە هەڵیان بەستوون ئەو شتانەیان کردبوو بەخوای خۆیان و دەیانپەرستن. ڕەنجەڕۆو هەناسەسارد بوون بەهۆی ئەو متمانەو پەرستنەی کە کردیان بۆ غەیری خوای گەورە. والله أعلم.

## چیرۆکی (باسی) گوێ گرتنی جنۆکە لە قورئان

﴿وَإِذۡ صَرَفۡنَآ إِلَيۡكَ نَفَرًا مِّنَ ٱلۡجِنِّ يَسۡتَمِعُونَ ٱلۡقُرۡءَانَ فَلَمَّا حَضَرُوهُ قَالُوٓاْ أَنصِتُواْۖ فَلَمَّا قُضِيَ وَلَّوۡاْ إِلَىٰ قَوۡمِهِم مُّنذِرِينَ ﴿٢٩﴾ قَالُواْ يَٰقَوۡمَنَآ إِنَّا سَمِعۡنَا كِتَٰبًا أُنزِلَ مِنۢ بَعۡدِ مُوسَىٰ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيۡنَ يَدَيۡهِ يَهۡدِيٓ إِلَى ٱلۡحَقِّ وَإِلَىٰ طَرِيقٖ مُّسۡتَقِيمٖ ﴿٣٠﴾ يَٰقَوۡمَنَآ أَجِيبُواْ دَاعِيَ ٱللَّهِ وَءَامِنُواْ بِهِۦ يَغۡفِرۡ لَكُم مِّن ذُنُوبِكُمۡ وَيُجِرۡكُم مِّنۡ عَذَابٍ أَلِيمٖ ﴿٣١﴾ وَمَن لَّا يُجِبۡ دَاعِيَ ٱللَّهِ فَلَيۡسَ بِمُعۡجِزٖ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَيۡسَ لَهُۥ مِن دُونِهِۦٓ أَوۡلِيَآءُۚ أُوْلَٰٓئِكَ فِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٍ ﴿٣٢﴾﴾

خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَإِذۡ صَرَفۡنَآ إِلَيۡكَ نَفَرًا مِّنَ ٱلۡجِنِّ يَسۡتَمِعُونَ ٱلۡقُرۡءَانَ فَلَمَّا حَضَرُوهُ قَالُوٓاْ أَنصِتُواْۖ فَلَمَّا قُضِيَ وَلَّوۡاْ إِلَىٰ قَوۡمِهِم مُّنذِرِينَ﴾ هێندێکیش لە جنۆکەکانمان ناردە لای تۆ، کە گوێ لەم قورئانە بگرن کاتێ هاتن. گوتیان: مات بن و گوێ بدەن. وەختێ بیستیان. هاتنەوە ناو خێڵەکەیان و ترسی خوایان وەبەرنان. ئیمامی ئەحمد ڕیوایەتی کردوە لە زوبەیرەوە: ﴿وَإِذۡ صَرَفۡنَآ إِلَيۡكَ نَفَرًا مِّنَ ٱلۡجِنِّ يَسۡتَمِعُونَ ٱلۡقُرۡءَانَ﴾ دەڵێت: لەنەخلە بوو کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) نوێژی خەوتنانی دەکرد.

خـودای مـەزن ئەفـەرموێت: ﴿كَادُواْ يَكُونُونَ عَلَيْهِ لِبَدًا﴾[1] واتـە: (بـێ بڕواكـانی مەككـە) نزیـك بـوو دایـان بەسەریدا. سوفیان دەڵێت: كەوتبوون بەسەر یەكتردا وەك خـوری چـۆن دەلكێـت بەیەكـەوەو دەكـەوێ بەسەریەكدا. تەنها ئەحمد هێناویەتی.[2] ئیمامی ئەحـمدو ئیمـام ئەبوبـەكری بەیهـەقی ڕیوایـەتی كـردوە لەكتێبەكەیدا (دلائل النبوة) لە ئیبنو عەباسەوە (ڕەزای خوایان لێ بێ) دەڵێت: پێغەمبەری خـودا(ﷺ) قورئـانی نەخوێندوەتـەوە بـۆ جنۆكـەو چاویـشی پێیـان نەكـەوتوە. پێغەمبـەری خـودا(ﷺ) لەگـەڵ دەستەیەك لە هاوەڵەكانی دەڕۆیشتن بۆ بازاڕی عوكاز لـەنێوان جنۆكـەو (الـشیاطین) هـەواڵی ئاسمانـدا گۆڕانكاریەك ڕوویدا. جنۆكەكان بروسكیان بـۆ ڕەوانـە دەكـرا. گەڕانـەوە نـاو خێڵەكـەیان. پێیـان وتـن: چیتانە. گوتیان: لـە نێـوان ئێمـەو هـەواڵی ئاسمانـدا گۆڕانكـاری ڕووی داوەو بروسـكمان بـۆ ڕەوانـەكرا وتیان: بێگومان ئەو گۆڕانكاریەی لە نێوان ئێوەو هەواڵی ئاسماندا پەیدا بـووە مەگـەر شـتێك ڕویـداوە. بگەڕێن لە خۆرهەڵاتی زەمینەوە هەتا خۆرئاوای. سەیركەنو بنـواڕن ئـەو شتە چیە بووەتـە ڕێگـر لـە نێوان ئێوەو هەواڵی ئاسماندا. دەرچوونو دەگەڕان بە خۆرهەڵاتو خۆرئاوای زەمیندا هەتا بـزانن ئـەوە چیە بووەتە ڕێگر لە نێوان ئەوانو هەواڵی ئاسماندا بیدۆزنەوە، هەندێك لەو جنۆكانـە كـە ڕووەو توهـام دەچوون تێپەڕین بەلای پێغەمبەری خوادا (ﷺ) كە ئەو لە نەخلە بوو. دەیویست بڕوا بۆ بازاڕی عوكـاز لەو كاتەدا نوێژی بەیانی دەكرد لەگەڵ هاوەڵەكانیـدا. كـاتێ گوێیـان لـە قورئـان بـوو. ماتـەیان كـردو گوێیان بۆ گرتو گوتیان: سوێند بەخوا ئەمە بووبووە ڕێگر لە نێوان ئێمەو هەواڵی ئاسماندا. كاتێ لـەو شوێنەوە گەڕانەوە بۆ لای خێڵەكەیان گوتیان: گەلۆ ئێمە گوێمـان لـە كتێبێـك بـوو بۆیـان خوێندینـەوە ئێمە قورئانێكی سەیرمان بیست بۆ ڕاستەڕێ ڕێبەرەو ئێمە باوەڕمان پێ هێناو هەرگیز كەسـێ ناكەینـە شەریكی خودا. خوای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خـوارەوە بـۆ پێغەمبـەر(ﷺ): ﴿قُلْ أُوحِيَ إِلَيَّ أَنَّهُ اسْتَمَعَ نَفَرٌ مِّنَ الْجِنِّ فَقَالُوا إِنَّا سَمِعْنَا قُرْآنًا عَجَبًا﴾[3] واتە: (ئەی موحەممەد (ﷺ) بلێ نیگـام بـۆ كـرا كـە بێگومـان چەند كەسێك لە جنۆكە گوێیان گرت لە قورئان خوێندنەوەم. ئەوەی كە پێی ڕاگەیەنرا قـسەی جنۆكـە بـوو[4]. بوخـاری ڕیوایـەتی كـردووە هـەر بـەو شـێوەیە. موسـلمیش هێناویـەتیو تیرمیـزی نەسـائیش ڕیوایەتیان كردوە لە تەفسیرا[5]. لە عبدالله ی كوڕی مەسعودەوە(ڕەزای خـوای لـێ بـێ) دەڵێـت: هاتنـە

---

[1] الجن (١٩).

[2] احمد (١٦٧/١) ئەم فەرمودەیە سەنەدەكانی لاوازن.

[3] الجن (١).

[4] احمد (٢٥٢/١)، دلائل النبوة (٢٢٥/٢) فەرمودەیەكی سەحیحە.

[5] البخاري (٣٣١/١)، تحفة الاحوذي (١٦٨/٩)، النسائي فی الكبری (٤٩٩/٦).

لای پێغەمبەر(ﷺ) قورئانی دەخوێند لەناو نەخلەدا، کاتێ گوێیان لێ بو گوتیان: قسەمەکەن نۆ جنۆکە بوون یەکێکیان ناوی زەوبەعە بوو خوای مەزن ئەم ئایەتانەی نارده خوارەوە: ﴿وَإِذْ صَرَفْنَا إِلَيْكَ نَفَرًا مِّنَ الْجِنِّ يَسْتَمِعُونَ الْقُرْآنَ فَلَمَّا حَضَرُوهُ قَالُوا أَنصِتُوا فَلَمَّا قُضِيَ وَلَّوْا إِلَىٰ قَوْمِهِم مُّنذِرِينَ﴾ هەتا دەگاتە ﴿ضَلَالٍ مُّبِينٍ﴾[1] ئەم فەرمودەیە لەگەڵ فەرمودەکەی یەکەم کە ئیبنو عەباس ڕیوایەتی کرد ئەوە دەگەیەنێ کە پێغەمبەی خودا (ﷺ) لە جاری یەکەمدا هەستی بە ئامادەبوونیان نەکردوە. بەڵام ئەوان گوێیان لە خوێندنەکەی پێغەمبەر بووە (ﷺ) پاشان گەڕاونەتەوە بۆ ناو خێڵەکەیان پاشان دوای ئەوە دەستە دەستەو کۆمەڵ کۆمەڵ ڕەوانە کراون بۆلای پێغەمبەر(ﷺ) لە هەموو تیرەکانیان.

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَلَّوْا إِلَىٰ قَوْمِهِم مُّنذِرِينَ﴾ واتە: وەختێ ئەوەیان بیست لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) هاتنەوە ناو خێڵەکەیانو ترسی خوایان وەبەرنان. وەك ئەو ئایەتەی کەخوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿لِّيَتَفَقَّهُوا فِي الدِّينِ وَلِيُنذِرُوا قَوْمَهُمْ إِذَا رَجَعُوا إِلَيْهِمْ لَعَلَّهُمْ يَحْذَرُونَ﴾[2] واتە: بۆ ئەوەی لە ئایینەکەیان تێ بگەنو شارەزابن بۆ ئەوەی هۆزەکەیان شارەزا بکەن و بترسێنن کاتێ گەڕانەوە بۆ لایان بۆ ئەوەی ئەوان بێدارببنەوە. ئەم ئایەتە کراوە بە بەڵگە لەسەر ئەوەی کە لە ناو جنۆکەدا پێغەمبەر نەبووە بەڵکو ترسێنەر هەبووە گومانیشی تێدا نیە کە پێغەمبەر لەناو جنۆکەدا ڕەوانە کراوە. خودای گەورەش ئەفەرموێت: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ إِلَّا رِجَالًا نُّوحِي إِلَيْهِم مِّنْ أَهْلِ الْقُرَىٰ﴾[3] واتە: وە ئێمە پێش تۆ پێغەمبەرمان نەناردوە جگە لە پیاوانێك کە نیگامان بۆ دەکردن لە خەڵکی شارەکان. وە ئەفەرموێت: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَا قَبْلَكَ مِنَ الْمُرْسَلِينَ إِلَّا إِنَّهُمْ لَيَأْكُلُونَ الطَّعَامَ وَيَمْشُونَ فِي الْأَسْوَاقِ﴾[4] واتە: ئێمە پێشی تۆ هەرکام لە پێغەمبەرانمان ناردبێت بێگومان ئەوان خواردنیان خواردووەو بەبازاڕدا ڕۆیشتوون. وە لە بارەی ئیبراهیمی خەلیلەوە(سەلامی خوای لێ بێت) ئەفەرموێت: ﴿وَجَعَلْنَا فِي ذُرِّيَّتِهِ النُّبُوَّةَ وَالْكِتَابَ﴾[5] واتە: وە پێغەمبەرێتیو کتێبمان بڕیاردا لە نەوەکانی (ئیبراهیم)دا. هەموو پێغەمبەران(سەلامی خوایان لێ بێت) پاش ئیبراهیم خۆی لە نەوەو

---

[1] الحاكم (٢/٤٥٦) فەرمودەیەکی مورسەلە.

[2] التوبة (١٢٢).

[3] يوسف (١٠٩).

[4] الفرقان (٢٠).

[5] العنكبوت (٢٧).

بنەماڵەی ئەون. بەلأم ئەو ئایەتەی کە خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿يَـٰمَعۡشَرَ ٱلۡجِنِّ وَٱلۡإِنسِ أَلَمۡ يَأۡتِكُمۡ رُسُلٌ مِّنكُمۡ﴾[١] واتە: ئەی دەستەو کۆمەڵی جنۆکەو ئادەمی ئایا پێغەمبەرانتان لەخۆتان بۆ نەهات. مەبەست پێی لێرەدا هەردوو گرۆی مرۆڤ و جنۆکەیە یەکێکیان بۆی رەوانە کراوەو راستە کە مرۆڤە. وەك ئەم ئایەتە وایە کە ئەفەرموێت: ﴿يَخۡرُجُ مِنۡهُمَا ٱللُّؤۡلُؤُ وَٱلۡمَرۡجَانُ﴾[٢] واتە: لەو دوو دەریایە مرواری‌و مەرجان دەردەهێنین. واتە: لە یەکێکیان، پاشان تەفسیری ترساندنی جنۆکە بۆ خێڵەکەیان دەکات. خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿قَالُواْ يَـٰقَوۡمَنَآ إِنَّا سَمِعۡنَا كِتَـٰبًا أُنزِلَ مِنۢ بَعۡدِ مُوسَىٰ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيۡنَ يَدَيۡهِ يَهۡدِيٓ إِلَى ٱلۡحَقِّ وَإِلَىٰ طَرِيقٍ مُّسۡتَقِيمٍ﴾ گوتیان: گەلۆ! ناوەرۆکی کتێبێکیان بۆ خوێندینەوە، کە پاش موسا ناردوە، بەکتێبەکانی پێشووش بڕوای هەیە، هان بۆ راستی دەدات‌و شارەزایی راستە ڕێ دەکات. لێرەدا باسی عیسا(سەلامی خوای لێ بێت) ناکات چونکە ئەو ئینجیلی بۆ رەوانە کراوە کە بریتیە لە ئامۆژگاری‌ونەرمی نواندن کەم تر باسی حەلاڵ و حەرامی کردووە. لە راستیدا وەك نەواوکەری شەریعەتی تەورات وایە و زۆرترین باسەکان لە تەوراتدا باس کراوە، لەبەر ئەوەیە گوتویانە: ﴿أُنزِلَ مِنۢ بَعۡدِ مُوسَىٰ﴾ بۆیە وەرەقەی کوڕی نەوفەل وەختێ پێغەمبەر(ﷺ) هەواڵی دایە بەهاتنە خوارەوەی یەکەم جار بۆلای. وەرەقە دەڵێت: بەخ بەخ! ئەوە جوبرەئیلە(النـاموس) کە دەهات بۆ لای موسا (سەلامی خوای لێ بێت) خۆزگە منیش تێیدا گەنج بومایە[٣] واتە لەکاتی گەیاندنی ئەم پەیامەی تۆدا گەنج بومایە ﴿مُصَدِّقًا لِّمَا بَيۡنَ يَدَيۡهِ﴾ واتە: بڕوای هەیە بەو کتێبانەیش کە لەپێشیەوە هاتوون بۆ پێغەمبەران ﴿يَهۡدِيٓ إِلَى ٱلۡحَقِّ﴾ ڕێ نیشاندەرە بۆ راستی لە بیرو باوەڕو دەنگ و باسدا ﴿وَإِلَىٰ طَرِيقٍ مُّسۡتَقِيمٍ﴾ شارەزایی راستەڕێتان بکات لە ئیشوکارەکاندا چونکە قورئان پێك هاتووە لە دووشت: هەواڵ دان‌و داواکاری، هەواڵەکانی راستەو داواکانیشی ڕێك‌و دادپەروەرانەیە. وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَتَمَّتۡ كَلِمَتُ رَبِّكَ صِدۡقًا وَعَدۡلًا﴾[٤] واتە: وە فەرمان‌و وتەی پەروەردگارت تەواو بووەو بە ئەنجام گەیشت بەراست‌و دروستی. وە ئەفەرموێت: ﴿هُوَ ٱلَّذِيٓ أَرۡسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلۡهُدَىٰ وَدِينِ ٱلۡحَقِّ﴾[٥] واتە: خوا ئەو

---

[١] الانعام (١٣٠).

[٢] الرحمن (٢٢) .

[٣] فتح الباري (١/٣٠).

[٤] الانعام (١١٥).

[٥] الصف (٩).

زاتەیە کە پێغەمبەری خۆی ناردووە بە ڕێنوێنیو ئاینێکی ڕاستو دروستەوە. (الهدی) زانیاری بەسودە ﴿وَدِينِ ٱلۡحَقِّ﴾ کرداری چاکەیە. جنۆکەیش هەروایان گوتوە. ﴿يَهۡدِيٓ إِلَى ٱلۡحَقِّ﴾ ڕێ نیشاندەرە بۆ سەر ڕاستی لە بیرو باوەڕا، ﴿وَإِلَىٰ طَرِيقٖ مُّسۡتَقِيمٖ﴾ کە کردارەکانە. پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿يَٰقَوۡمَنَآ أَجِيبُواْ دَاعِيَ ٱللَّهِ وَءَامِنُواْ بِهِۦ يَغۡفِرۡ لَكُم مِّن ذُنُوبِكُمۡ وَيُجِرۡكُم مِّنۡ عَذَابٍ أَلِيمٖ﴾ گەلۆ! وەرن بەدەنگ ئەو کەسەوە بچین کە بانگ بۆ خودا دەکاتو بڕوای پێ بکەن. لە گوناهانتان خۆش دەبێو لە ئازاردانی بەژانتان دەپارێزێ. ئەم ئایەتە ئەوە دەگەیەنێ کە خودای مەزن محمدی (ﷺ) ڕەوانە کردووە بۆ گرۆی مرۆڤو جنۆکە. بۆیە فەرموویەتی: ﴿أَجِيبُواْ دَاعِيَ ٱللَّهِ وَءَامِنُواْ بِهِۦ﴾ یان: بچن بەدەنگ ئەو کەسەوە کە بانگ بۆ لای خودا دەکا وە ئەفەرموێت: ﴿يَغۡفِرۡ لَكُم مِّن ذُنُوبِكُمۡ﴾ لە گوناهەکانتان خۆش دەبێ گوتویانە: ﴿مِّن﴾ لێرەدا زیادەیە. ئەمەیش قسەی لەسەرە. چونکە من لە ڕستەی موسبەتدا(فی الاثبات) کەم ڕێ دەکەوێ زیادبێ. گوتراویشە: ﴿مِّن﴾ لە شوێنی خۆیدا بۆ هەندە (للتبعیض). ﴿وَيُجِرۡكُم مِّنۡ عَذَابٍ أَلِيمٖ﴾ واتە: دەتان پارێزێ لە ئازاری بەژان. پاشان لە زمانی ئەوانەوە ئەفەرموێت: ﴿وَمَن لَّا يُجِبۡ دَاعِيَ ٱللَّهِ فَلَيۡسَ بِمُعۡجِزٖ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَيۡسَ لَهُۥ مِن دُونِهِۦٓ أَوۡلِيَآءُۚ أُوْلَٰٓئِكَ فِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٍ﴾ هەر کەسیش بەدەنگ ئەو کەسەوە نەچێ کە بەرەو خودا بانگ دەکا لەم سەر زەمینە دەرەتانی دەس ناکەوێ و غەیرە خودا هیچ کەس بەهانای نایە. کێش ئاوا بێ. دیارە ڕێ یان لێ گۆڕاوە. ﴿فَلَيۡسَ بِمُعۡجِزٖ فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ واتە: خودا توانای بەسەریدا هەیەو لە هیچ شوێنێکی ئەو سەر زەمینە دەرەتانی نیەو دەربازی نابێ ﴿وَلَيۡسَ لَهُۥ مِن دُونِهِۦٓ أَوۡلِيَآءُ﴾ لە غەیرە خودا هیچ پەنایەکی نیەو کەس بەهاواریەوە ناچێ، ﴿أُوْلَٰٓئِكَ فِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٍ﴾ هەر کەسیش ئاوابێ دیارە ڕێگای لێ ون بووە. ئەمە شوێنی هەڕەشەو ترساندنە بانگی خێڵەکەیان کردووە جارێ بەمژدە پێ دانو جارێکیش بە هەڕەشەو ترساندن لەبەر ئەوەی کە سوودی گەیاندبو بە زۆریان هاتبوون بۆ لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) پۆل پۆل و دەستە دەستە.

### بەلگە لەسەر ژیانەوە (زیندو بونەوە) پاش مردن

﴿أَوَلَمۡ يَرَوۡاْ أَنَّ ٱللَّهَ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ وَلَمۡ يَعۡيَ بِخَلۡقِهِنَّ بِقَٰدِرٍ عَلَىٰٓ أَن يُحۡـِۧيَ ٱلۡمَوۡتَىٰۚ بَلَىٰٓۚ إِنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ﴿٣٣﴾ وَيَوۡمَ يُعۡرَضُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ عَلَى ٱلنَّارِ أَلَيۡسَ هَٰذَا بِٱلۡحَقِّۖ قَالُواْ بَلَىٰ وَرَبِّنَاۚ قَالَ فَذُوقُواْ ٱلۡعَذَابَ بِمَا كُنتُمۡ تَكۡفُرُونَ ﴿٣٤﴾ فَٱصۡبِرۡ كَمَا صَبَرَ أُوْلُواْ ٱلۡعَزۡمِ مِنَ ٱلرُّسُلِ وَلَا تَسۡتَعۡجِل لَّهُمۡۚ كَأَنَّهُمۡ يَوۡمَ يَرَوۡنَ مَا يُوعَدُونَ لَمۡ يَلۡبَثُوٓاْ إِلَّا سَاعَةٗ مِّن نَّهَارِۭۚ بَلَٰغٞۚ فَهَلۡ يُهۡلَكُ إِلَّا ٱلۡقَوۡمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ ﴿٣٥﴾﴾

خودای مەزن ئەفـەرموێت: ﴿أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّ اللَّهَ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَلَمْ يَعْيَ بِخَلْقِهِنَّ بِقَادِرٍ عَلَىٰ أَن يُحْيِيَ الْمَوْتَىٰ ۚ بَلَىٰ إِنَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ ئاخۆ ئـەوان نـەیانزانی ئـەو خودایـە کـە زەمین‌وئاسمانـەکانی وەدی هێنـاو لـەوەی هێنـا نیـشاندا تووشـی هـیچ ناتـەوانی نـەبوو. دەتـوانێ زینـدووش کاتـەوەو بش مرێنیّ؟بەڵێ ئەو لەسەر هەموو شت توانای هەیە. واتە: ئایا ئەوانەی کە باوەڕیان بەزینـدو بونـەوە نیـە لە ڕۆژی قیامەتداو بەدووری دەزانن کە جەستەکان جارێکی تـر هەڵسنەوە لـەو ڕۆژەدا سـەیر ناکـەن، ﴿أَنَّ اللَّهَ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَلَمْ يَعْيَ بِخَلْقِهِنَّ﴾ واتـە: ئـەو خوایـە کـە ئـەم ئاسمانـەو زەمینـی وەدی هێناو وەدی هێنانی گران نـەبووە بەلایـەوە. تـەنها فەرموویـەتی: ببن‌وئـەوانیش بـون بـەبێ خـۆ لادان‌و لەمپەرێك بەڵکو گەردن کەچەو دەترسێ و وەلاّم دەداتەوە ئایا ئەو خودایە ناتوانێ مـردو زینـدو بکاتەوە؟ وەك خـوای گـەورە لـە ئایـەتێکی تـرا فەرموویـەتی: ﴿لَخَلْقُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ أَكْبَرُ مِنْ خَلْقِ النَّاسِ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ﴾[1] واتـە: بەڕاسـتی بـەدی هێنـانی ئاسمانـەکان‌و زەوی گەورەترە لە بەدی هێنانی خەڵکی بەلاّم زۆربەی مەردوم ئەمە نازانن. بۆیە خـوای مـەزن فەرموویـەتی: ﴿بَلَىٰ إِنَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ بەڵێ خـودا توانـای بەسـەر هـەموو شـتێکدا هەیـە. پاشـان خـوای گـەورە هەڕەشە لە خوانەناسان دەکات‌و دەیان ترسێنێ و ئەفـەرموێت: ﴿وَيَوْمَ يُعْرَضُ الَّذِينَ كَفَرُوا عَلَى النَّارِ أَلَيْسَ هَٰذَا بِالْحَقِّ ۖ قَالُوا بَلَىٰ وَرَبِّنَا ۚ قَالَ فَذُوقُوا الْعَذَابَ بِمَا كُنتُمْ تَكْفُرُونَ﴾ ئـەو ڕۆژەی ئەوانـەی کـە خـوا نـەناس بوون. لای ئاگر ڕایـان دەگـرن (پێیـان دەڵـێن): ئـاخۆ ئـەم شـتە ڕاسـت نیـە؟ دەڵـێن: ڕاسـتە. سـوێند بەپەروەردگارمان. ئەڵێ: ئێوە هەر حاشاتان لێکرد.دەسا ئەو ئازارە بـچێژن. واتـە: لـە ڕۆژی قیامەتـدا پێیان ئەڵێ: ئایا ئەم شتە ڕاست نەبوو؟ ئاخۆ ئەم جـادووە یـان ئێـوە چاوتـان نـابینێ و شـت نـابینن. ﴿قَالُوا بَلَىٰ وَرَبِّنَا﴾ دەڵـێن: سـوێند بـە پەروەرنـدەمان ڕاسـتە. دان پیانـان نـەبێ هـیچ توانـاو دەستەلاتێکیان نیە. ﴿قَالَ فَذُوقُوا الْعَذَابَ بِمَا كُنتُمْ تَكْفُرُونَ﴾ سا ئازار بچێژن چونکە ئێوە هـەر دانتـان پێدا نەدەناو حاشاتان دەکرد.

**فەرمان دان بە پێغەمبەر(ﷺ) بەخۆ ڕاگری**

پاشان خودای مەزن فەرمان دەکات بە پێغەمبەر(ﷺ) کەخۆ ڕاگر بێ بەرانبـەر ئـەو کەسـانەی کـە بـاوەڕی پـێ ناکـەن لـە گەلەکـەی ئەفـەرموێت: ﴿فَاصْبِرْ كَمَا صَبَرَ أُولُو الْعَزْمِ مِنَ الرُّسُلِ وَلَا تَسْتَعْجِل لَّهُمْ ۚ

[1] الغافر (٥٧).

كَأَنَّهُمْ يَوْمَ يَرَوْنَ مَا يُوعَدُونَ لَمْ يَلْبَثُوٓاْ إِلَّا سَاعَةً مِّن نَّهَارٍۭ بَلَٰغٌۚ فَهَلْ يُهْلَكُ إِلَّا ٱلْقَوْمُ ٱلْفَٰسِقُونَ ﴾ تۆش هەر وەكو پێغەمبەرە لێ براوو نەبەزەكان، سوربە لەسەر كارەكەتو خۆڕاگربە، وەك ئەوانیش خۆ ڕاگر بوون، بۆ ئەوانیش پەلەت نەبێ ئەو ڕۆژەی بڕیار دراوە بێنە لامان، وادەزانن مانەوەیان هەر سەعاتێ لە ڕۆژێكی خایاندوە. ئەمەش پەندێكی تەواوە، ئاخۆ كەسێك بێجگە لەڕێ لادەرەكان ( بەجەزرەبە لەبەین دەچێ؟). خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿فَٱصْبِرْ كَمَا صَبَرَ أُوْلُواْ ٱلْعَزْمِ مِنَ ٱلرُّسُلِ﴾ واتە: تۆش وەك پێغەمبەرە نەبەزە لێ براوەكان (اولوا العزم) خۆ ڕاگربە بەرانبەر گەلەكانیان كە بڕوایان پێ نەدەكردن. پێغەمبەرە لێ براوو نەبەزەكان (اولو العزم) ئەمانەن: نوحو ئیبراهیمو موساو عیساو دواین پێغەمبەری هەموویان محمدە(ﷺ) خودای گەورە ناوی هێناون لە نێوان هەموو پێغەمبەرەكاندا (سەلامی خوایان لێ بێ) لە دوو ئایەتدا لە سورەتی ئەحزاب و شورادا. ﴿وَلَا تَسْتَعْجِل لَّهُمْ﴾ واتە: پەلەت نەبێ لێیان لەسەر ئەو سزایەی كە بۆیان دێت. وەك خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَذَرْنِي وَٱلْمُكَذِّبِينَ أُوْلِي ٱلنَّعْمَةِ وَمَهِّلْهُمْ قَلِيلًا﴾[1] واتە: وازبێنە لە منو ئەو خاوەن نازونیعمەتانەی كە ئایینی من بەدرۆ دەزانن‌و كەمێك مۆڵەتیان بدە. ئەم ئایەتەیش كە ئەفەرموێت: ﴿فَمَهِّلِ ٱلْكَٰفِرِينَ أَمْهِلْهُمْ رُوَيْدًۢا﴾[2] واتە: ئینجا مۆڵەتی بێ بڕواكان بدە كەمێك لێیان بوەستە. وەئەفەرموێت: ﴿كَأَنَّهُمْ يَوْمَ يَرَوْنَ مَا يُوعَدُونَ لَمْ يَلْبَثُوٓاْ إِلَّا سَاعَةً مِّن نَّهَارٍ﴾ واتە: ئەو ڕۆژەی كە بڕیار دراوە بۆیان وا دەزانن مانەوەیان هەر سەعاتێ لەڕۆژێكی خایاندوە. وەك خوای گەورە لە ئایەتێكی ترا ئەفەرموێت: ﴿كَأَنَّهُمْ يَوْمَ يَرَوْنَهَا لَمْ يَلْبَثُوٓاْ إِلَّا عَشِيَّةً أَوْ ضُحَىٰهَا﴾[3] واتە: بێ بڕواكان كە ئەو ڕۆژە دەبینن وا دەزانن كە نەماونەتەوە ئێوارەیەك یا چێشتەنگاوێكی نەبێ لە دونیادا. وەك ئەم ئایەتەیش كە ئەفەرموێت: ﴿وَيَوْمَ يَحْشُرُهُمْ كَأَن لَّمْ يَلْبَثُوٓاْ إِلَّا سَاعَةً مِّنَ ٱلنَّهَارِ يَتَعَارَفُونَ بَيْنَهُمْ﴾[4] واتە: وە بیریان بخەوە ئەو ڕۆژەی كە (خوا) هەموویان كۆدەكاتەوە دەڵێن لە دنیادا نەماونەتەوە ساتێكی كەم نەبێت لە ڕۆژ خۆیان بەیەكتر دەناسێنن. خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿بَلَٰغٌ﴾ ئەم قورئانە ئامۆژگاریەكی تەواوە. ﴿فَهَلْ يُهْلَكُ إِلَّا ٱلْقَوْمُ ٱلْفَٰسِقُونَ﴾ واتە: لەناو ناچێ مەگەر كەسێ كە لەلای

---

[1] المزمل (١١).

[2] الطارق (١٧).

[3] النازيعات (٤٦).

[4] يونس (٤٥).

خوداوە لەناوچوبێ. ئەمەیش هەر لەدادپەروەری خوای گەورەیە کە ئازاری هیچ کەسێ نادا هەتا ئەو کەسە خۆی شایستەی ئەو ئازارە نەبێ. والله أعلم.

## تەفسیری سورەتی ( محمد )

## لە مەدینەدا هاتووەتە خوارەوە

### پاداشتی خوانەناسان وخاوەن باوەڕان

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

﴿الَّذِينَ كَفَرُوا وَصَدُّوا عَن سَبِيلِ اللَّهِ أَضَلَّ أَعْمَالَهُمْ (١) وَالَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ وَآمَنُوا بِمَا نُزِّلَ عَلَىٰ مُحَمَّدٍ وَهُوَ الْحَقُّ مِن رَّبِّهِمْ كَفَّرَ عَنْهُمْ سَيِّئَاتِهِمْ وَأَصْلَحَ بَالَهُمْ (٢) ذَٰلِكَ بِأَنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا اتَّبَعُوا الْبَاطِلَ وَأَنَّ الَّذِينَ آمَنُوا اتَّبَعُوا الْحَقَّ مِن رَّبِّهِمْ كَذَٰلِكَ يَضْرِبُ اللَّهُ لِلنَّاسِ أَمْثَالَهُمْ (٣)﴾

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿الَّذِينَ كَفَرُوا وَصَدُّوا عَن سَبِيلِ اللَّهِ أَضَلَّ أَعْمَالَهُمْ﴾ ئەوانەی دژی خوا بوون و لەمپەرێك بوون لە ڕێی خودا، هەموو کردەوەکانیانی لێ پوچەڵ کردن. ﴿الَّذِينَ كَفَرُوا﴾ ئەوانەی باوەڕیان نەبوو بە ئایەتەکانی خودا. ﴿وَصَدُّوا﴾ بوونە لەمپەر بۆ غەیرە خۆیان. ﴿عَن سَبِيلِ اللَّهِ أَضَلَّ أَعْمَالَهُمْ﴾ واتە: کردارەکانیانی بەتاڵ کردەوەو لەناوبردو هیچ خێرو پاداشێکی نەهێشتنەوە بۆیان. وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ وَقَدِمْنَا إِلَىٰ مَا عَمِلُوا مِنْ عَمَلٍ فَجَعَلْنَاهُ هَبَاءً مَّنثُورًا ﴾[1] واتە: هاتین هەر کردەوەیەکیان کردبوو هەموویمان وەکو تۆزی پرش و بڵاو لێ کرد. پاشان خوای مەزن فەرموویەتی:

﴿ وَالَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ وَآمَنُوا بِمَا نُزِّلَ عَلَىٰ مُحَمَّدٍ وَهُوَ الْحَقُّ مِن رَّبِّهِمْ كَفَّرَ عَنْهُمْ سَيِّئَاتِهِمْ وَأَصْلَحَ بَالَهُمْ ﴾

ئەوانەیش کە خوداناس و ئاکار چاك بوون و بەم قورئانەش کە ڕاستەو لە پەروەردگاریانەوە بۆ محەممەد بەخەڵات هاتۆتە خوارێ باوەڕیانکرد خودا هەموو گوناهەکانیانی پۆشی و کاروباری ژیانیانی بۆ ساماندان. ﴿ وَالَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ ﴾ واتە: باوەڕیان لەناو دڵیاندا هێناو پابەندی بەرنامەی خودا بون بەجەستەیان بە ئاشکراو پەنهانی. ﴿وَآمَنُوا بِمَا نُزِّلَ عَلَىٰ مُحَمَّدٍ﴾ ئەمە عەتفی خاسە بۆسەر عام ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە مەرجە بۆ تەواوی دامەزرانی باوەڕ دوای هاتنی پێغەمبەر(ﷺ) واتە: هەر کەسێ باوەڕی بە پێغەمبەر نەبێ بە خاوەن باوەڕ ناژمێرێ. خوای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَهُوَ الْحَقُّ مِن رَّبِّهِمْ﴾ ڕستەیەکی موعتەرەزەیە جوانە بۆیە خودا فەرموویەتی: ﴿كَفَّرَ عَنْهُمْ سَيِّئَاتِهِمْ وَأَصْلَحَ بَالَهُمْ﴾

---

[1] الفرقان (٢٣).

لەهەموو گوناهەکانیان خۆش بوە. ئیبنو عەباس دەڵێت: ﴿وَأَصْلَحَ بَالَهُمْ﴾ کارەکانی بۆ چاك کردوون.[١] موجاهد دەڵێت: کاروباری ژیانی بۆ ئاسان کردوون[٢] قەتادەو ئیبنو زەید گوتیان: لەدنیا حاڵی باش کردون[٣] وە لە فەرمودەی پڕمیندا هاتوە: (یهدیکم الله ویصلح بالکم)[٤] واتە: خودا ڕێگاتان نیشانداو کاروبارتان بۆ ساماندا. پاشان خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا اتَّبَعُوا الْبَاطِلَ وَأَنَّ الَّذِينَ آمَنُوا اتَّبَعُوا الْحَقَّ مِن رَّبِّهِمْ ۚ كَذَٰلِكَ يَضْرِبُ اللَّهُ لِلنَّاسِ أَمْثَالَهُمْ﴾ چونکە هەرچی دژایەتی خودایان کرد، شوێن کاری ناڕەوا کەوتن. ئەوەی خاوەن باوەڕیشن شوێن ئەو فەرمانە دەکەون کەبەڕاستی لە پەروەردگاریانەوە هاتووە ئاوا خودا چەند نموونە بۆ ئەم خەڵکە دێنێتەوە. واتە: بۆیە کردارەکانی خوانەناسەکانمان پوچەڵ کردەوەو چاو پۆشیشمان لە گوناهی پیاو چاکان کردو کارەکانمان بۆ ئاسان کردن، چونکە ئەوانەی کە خوانەناس بوون شوێنی ڕێی بەتاڵ کەوتبوون. واتە ڕێگای بەتاڵیان هەڵبژارد بو وازیان لە ڕێی ڕاست هێنابوو. ﴿وَأَنَّ الَّذِينَ آمَنُوا اتَّبَعُوا الْحَقَّ مِن رَّبِّهِمْ ۚ كَذَٰلِكَ يَضْرِبُ اللَّهُ لِلنَّاسِ أَمْثَالَهُمْ﴾ ئابەو شێوەیە خودا نمونەی زۆر بۆ ئەو خەڵکە دێنێتەوە واتە: ئەنجامی کردەوەکانیان بۆ ڕون دەکاتەوەو چیشیان توش دەبێ لە ڕۆژی قیامەتدا دەیخاتە بەر چاویان. والله سبحانه وتعالى اعلم.

**فەرمان دان بەلەمل دان وشەتەك دانی دوژمن پاشان یان بەچاکە ئازادیان بکەن یا بەر خوێنیان لێ بسێنن**

﴿فَإِذَا لَقِيتُمُ الَّذِينَ كَفَرُوا فَضَرْبَ الرِّقَابِ حَتَّىٰ إِذَا أَثْخَنتُمُوهُمْ فَشُدُّوا الْوَثَاقَ فَإِمَّا مَنًّا بَعْدُ وَإِمَّا فِدَاءً حَتَّىٰ تَضَعَ الْحَرْبُ أَوْزَارَهَا ۚ ذَٰلِكَ وَلَوْ يَشَاءُ اللَّهُ لَانتَصَرَ مِنْهُمْ وَلَٰكِن لِّيَبْلُوَ بَعْضَكُم بِبَعْضٍ ۗ وَالَّذِينَ قُتِلُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَلَن يُضِلَّ أَعْمَالَهُمْ ﴿٤﴾ سَيَهْدِيهِمْ وَيُصْلِحُ بَالَهُمْ ﴿٥﴾ وَيُدْخِلُهُمُ الْجَنَّةَ عَرَّفَهَا لَهُمْ ﴿٦﴾ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِن تَنصُرُوا اللَّهَ يَنصُرْكُمْ وَيُثَبِّتْ أَقْدَامَكُمْ ﴿٧﴾ وَالَّذِينَ كَفَرُوا فَتَعْسًا لَّهُمْ وَأَضَلَّ أَعْمَالَهُمْ ﴿٨﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ كَرِهُوا مَا أَنزَلَ اللَّهُ فَأَحْبَطَ أَعْمَالَهُمْ ﴿٩﴾﴾

خوای مەزن ئەفەرموێت: ﴿فَإِذَا لَقِيتُمُ الَّذِينَ كَفَرُوا فَضَرْبَ الرِّقَابِ حَتَّىٰ إِذَا أَثْخَنتُمُوهُمْ فَشُدُّوا الْوَثَاقَ فَإِمَّا مَنًّا بَعْدُ وَإِمَّا فِدَاءً حَتَّىٰ تَضَعَ الْحَرْبُ أَوْزَارَهَا ۚ ذَٰلِكَ وَلَوْ يَشَاءُ اللَّهُ لَانتَصَرَ مِنْهُمْ وَلَٰكِن لِّيَبْلُوَ بَعْضَكُم بِبَعْضٍ ۗ وَالَّذِينَ قُتِلُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَلَن يُضِلَّ أَعْمَالَهُمْ﴾ ئیتر هەرکاتێ تووشی ئەو بێ دینانە بوون. لە ملیان بدەن، پاش و نجڕ و نجڕ

[١] الطبري (١٥٢/٢٢).

[٢] الطبري (١٥٢/٢٢).

[٣] الطبري (١٥٢/٢٢).

[٤] تحفة الاحوذي (١١/٨).

کردنیان شەتەکیان بدەن. ئەوسا یان هەر بە چاکە ئازادیان بکەن یا بەرخوێنیان(فیدیە) لێ بستێنن هەتا شەڕ کۆتایی پێدێ. ئەگەر خودا بیویستایە بۆخۆی تۆڵەی لێ دەسەندن. بەلاّم ویستی بەیەکتری تاقیتان بکاتەوە ئەو کەسانەش کەلە ڕای خودا کوژراون کردەوەیان بەفیڕۆ نادا . خوای گەورە ڕێ نمونی خاوەن باوەڕان دەکات کە لەکاتی جەنگەکانیاندا لەگەڵ بت پەرستاندا دەبێ پشت بەچی ببەستن‌و دەفەرموێت: ﴿فَإِذَا لَقِيتُمُ الَّذِينَ كَفَرُوا فَضَرْبَ الرِّقَابِ﴾ هەرکاتێ تووشی ئەوز خوانەناسانە بوون بە شمشێر لە ملیان دەن‌و دروێنەیان کەن. ﴿حَتَّىٰ إِذَا أَثْخَنتُمُوهُمْ﴾ واتە: تا دەیان کوژن‌و پارچەپارچەیان دەکەن. ﴿فَشُدُّوا الْوَثَاقَ﴾ ئەوانەشی کە دیلیان دەکەن. پاش تەواوبوونی ئەو جەنگە جیابونەوە لە یەك ئارەزووی خۆتانە چیان لێ دەکەن. ئەگەر ویستتان هەر بەچاکە ئازادیان بکەن بەخۆڕایی یان فیدیەیان لێ وەر گرن‌و مەرجیان لەسەر دانێن وا دەردەکەوێ ئەم ئایەتە لەڕووداوی بەدردا هاتووەتە خوارەوە. خوای گەورە سەرزەنشتی موسوڵمانانی کردوە کە لەو ڕۆژەدا ئەوەندە دیلیان گرتوە بۆ ئەوەی کەفیدیەیان لێ وەرگرن‌وکوشتاری کەمیان لێ بکەن فەرموویەتی: ﴿مَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَكُونَ لَهُ أَسْرَىٰ حَتَّىٰ يُثْخِنَ فِي الْأَرْضِ ۚ تُرِيدُونَ عَرَضَ الدُّنْيَا وَاللَّهُ يُرِيدُ الْآخِرَةَ ۗ وَاللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ (٦٧) لَّوْلَا كِتَابٌ مِّنَ اللَّهِ سَبَقَ لَمَسَّكُمْ فِيمَا أَخَذْتُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ﴾[1] واتە: بۆ هیچ پێغەمبەرێك ڕەوانیە کە دیلی لە دوژمنان هەبێ هەتا کوشتاری زۆریان لێ نەکات لە زەویدا ئێوە ماڵی دونیاتان دەوێ(بەوەرگرتنی فیدیە) وە خواش پاداشتی ڕۆژی دوایی دەوێ بۆ ئێوە وەخوا تواناو زاڵی کار دروستە، ئەگەر نوسراوێك لەلایەن خواوە پێشی نەکەوتایە کە خۆش بووە لە گوناهەکانی بەشدارانی غەزای بەدر بێگومان لەبەر ئەو فیدیەیەی کە وەرتان گرت توشتان دەبوو سزایەکی گەورە. ئەوسا یان هەر بەچاکە ئازادیان دەکەن یا فیدیەیان لێ دەستێنن. ﴿حَتَّىٰ تَضَعَ الْحَرْبُ أَوْزَارَهَا﴾ هەتا شەڕ کۆتایی پێ دێ. موجاهد گوتی: تا عیسای کوڕی مەریەم دادەبەزێ (سەلامی خوای لێ بێ)[2] وەك ئەوەی ئەم بۆچوونەی لەم فەرمودەیەوە وەرگرتبێ کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (کۆمەڵێك لەئوممەتی من لەسەر هەق هەر دەمێننەوە هەتا دواین کەسیان شەڕلەگەڵ دەجال دەکات)[3]، لە جوبەیری کوڕی نوفەیرەوە دەڵێت: لە سەلەمەی کوڕی نوفەیلەوە هەواڵی دانێ کە چوەتە خزمەت پێغەمبەری خودا(ﷺ) گوتویەتی: من ئەسپەکەم (ولاغەکەم) بەرەلاّ کردوە چرکەکەیشم داناوەو شەڕیش کۆتایی هاتوە. شەڕ نەماوە. پێغەمبەر(ﷺ)

---

[1] الانفال (٦٧ـ٦٨).

[2] الطبري (٢٢/١٥٧).

[3] ابو داود (٣/١١) فەرمودەیەکی لاوازە فەرمودەیەکی تر پشتگیری دەکات.

پێی وت: (ئێستا کاتی جەنگ هاتوە. بەردەوام کۆمەڵێ لە ئوممەتی من سەرکەوتون بەسەر خەڵکا خوای گەورە دڵی چەند گرۆیەك دەگۆڕێ شەڕیان لەگەڵ دەکەن‌وخوای گەورە بژێویان لەسەر ئەوانە دابین دەکات هەتا ڕۆژی قیامەت ئەوانە هەر وادەمێننەوە ئەوسا بزانن شوێنی خاوەنباوەڕان شامە، وە ولآغیش خێرو بێر بەناوچاوانیەوەیە هەتا ڕۆژی قیامەت)[1] (مەبەست پێی ولآغێکە کە بۆ غەزا دانرابێت)، نەسائیش هەر بەم شێوەیە ڕیوایەتی کردوە.[2] ﴿ذَٰلِكَ وَلَوۡ يَشَآءُ ٱللَّهُ لَٱنتَصَرَ مِنۡهُمۡ﴾ خودا مەیلی لێ بوایە خۆی تۆڵەی لەو خوانەناسانە دەسەندو جەزرەبەی سەختی دەدان لەلایەن خۆیەوە ﴿وَلَٰكِن لِّيَبۡلُوَاْ بَعۡضَكُم بِبَعۡضٍ﴾ واتە: بۆیە جیهاد و شەڕکردنتان لەسەر دانراوە هەتا خوای گەورە تاقیتان بکاتەوەو بەراوردی دەنگ و باستان بکات وەك لە سورەتی (آل عمران و براءة) باسی حیکمەتی دانانی جیهادی کردوە و فەرموویەتی: ﴿أَمۡ حَسِبۡتُمۡ أَن تَدۡخُلُواْ ٱلۡجَنَّةَ وَلَمَّا يَعۡلَمِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ جَٰهَدُواْ مِنكُمۡ وَيَعۡلَمَ ٱلصَّٰبِرِينَ﴾[3] واتە: ئایا ئێوە واگومانتان دەبرد کە دەچنە بەهەشت لەکاتێکدا هێشتاخوا دەری نەخستوە ئەوانەی تێ دەکۆشن لەوێوە وە هێشتا دەری نەخستوە خۆ ڕاگرن. وە لە سورەتی بەرائەتا فەرموویەتی: ﴿قَٰتِلُوهُمۡ يُعَذِّبۡهُمُ ٱللَّهُ بِأَيۡدِيكُمۡ وَيُخۡزِهِمۡ وَيَنصُرۡكُمۡ عَلَيۡهِمۡ وَيَشۡفِ صُدُورَ قَوۡمٖ مُّؤۡمِنِينَ ﴿١٤﴾ وَيُذۡهِبۡ غَيۡظَ قُلُوبِهِمۡۗ وَيَتُوبُ ٱللَّهُ عَلَىٰ مَن يَشَآءُۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾[4] واتە: (باوەڕداران) بیانکوژن خوا بەدەستی ئێوە سزایان دەداتو ڕیسوایان دەکاتو سەرتان دەخات بەسەریانداو خوا سینەو دڵی کۆمەڵی بڕوادار خۆش دەکات، وەڕقو خەشمی دڵەکانیان دادەمرکێنێ‌وناهێڵێ وەخوای گەورە تەوبە وەردەگرێ لەهەرکەسێك کە بیەوێت‌وە خوا زانای دانایە.

## ڕێزی شەهیدان

لەدوایدا وەك ئاشکرایە کە جەنگ دەبێتە هۆی شەهید بونی زۆرێك لە موسوڵمانان بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَٱلَّذِينَ قُتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ فَلَن يُضِلَّ أَعۡمَٰلَهُمۡ﴾ یانە: ئەو کەسانەی کەلە ڕێی خودا شەهید کراون کردەوەیان بەفیڕۆ ناچێ بەڵکو فرەی دەکاو بەرەکەتی تێدەخاو دوجار زیاتر بۆی دەنوسێ‌وەهەشیانە کردەوەکان لەگەڵیایە بەرێژەی ماوەی بەرزەخ واتە هەتا ڕۆژی قیامەت. وەك ئەو فەرمودەیەی کە ئیمامی ئەحمد ڕیوایەتی کردوە لە کەسیری کوڕی مورەوە ئەویش لە قەیسی

---

[1] احمد (١٠٤/٤) فەرمودەیەکی سەحیحە.

[2] النسائی (٢١٤/٦) النسائي فی الکبری (٢١٨/٥) فەرمودەیەکی سەحیحە.

[3] ال عمران (١٤٢).

[4] التوبة (١٤ـ١٥)/

جوزامیەوە کەلە خزمەتی پێغەمبەرا (ﷺ) بوە دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (شەهید شەش تایبەت مەندی پێدەدرێت. کاتێ یەکەم دڵۆپەی خوێنەکەی دەڕژێ لەهەموو تاوانەکانی دەبورێ‌وشوێنی خۆی لەبەهەشتا دەبینێت‌و کیژی سپی چاو بەڵەکی لێ مارە دەکرێ و پارێزراو دەبێ لەترسە هەرە گەورەکەو سزای ناو گۆڕو جل و بەرگی بڕوای دەکرێ بەبەرا) تەنها ئەحمد ڕیوایەتی کردوە[1]، ئەبو دەرداء (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموی: (شەهید تکادەکات بۆحەفتا کەس لەکەس و کاری خۆی)، ئەبو داودیش ڕیوایەتی کردوە[2]. فەرمودە لەبارەی شەهیدو شەهیدەوە ئێجگار زۆرە لێرەدا هەمووی باس ناکرێ. خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ سَيَهْدِيهِمْ وَيُصْلِحُ بَالَهُمْ ﴾ بەم زوانە ڕێگەیان پێ نیشان دەداو کاروباری ژیانیان بۆ ساماندەدا. بەم نزیکانە دەیانخاتە بەهەشت. وەك خوای مەزن ئەفەرموێت: ﴿ إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ يَهْدِيهِمْ رَبُّهُم بِإِيمَانِهِمْ تَجْرِي مِن تَحْتِهِمُ الْأَنْهَارُ فِي جَنَّاتِ النَّعِيمِ ﴾[3] واتە: بەڕاستی ئەوانەی بڕوایان هێناوەو کردەوە چاکەکانیان کردوە پەروەردگاریان ڕێنمونیان دەکات بەهۆی باوەڕەکەیانەوە ڕوبارەکان دێن‌ودەچن بەژێریان دا لەباخ و بەهەشتای پڕ نازو نیعمەت دا. وەئەفەرموێت: ﴿وَيُصْلِحُ بَالَهُمْ ﴾ کارەکانی ژیانیان بۆ چاك دەکات. ﴿وَيُدْخِلُهُمُ الْجَنَّةَ عَرَّفَهَا لَهُمْ ﴾ دەشیانباتە ئەو بەهەشتەی کە پێشەکی بۆی باس کردون . واتە: لەو بەهەشتەدا دایان دەنێ کە بۆی باس کردوون‌و ڕێگاکەی نیشان داون. موجاهد دەڵێت: خەڵکی بەهەشت شوێن‌و جێگای خۆیان دەزانن. ئەو شوێنەی کەخوا بۆی داناون تێیدا لێیان ناگۆڕێ وەك ئەوەی لەو ڕۆژەوە خودا دروستی کردوون لەوێدا ژیاون. هیچ کەسیان ناوێت نیشانیان بدات.[4] بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو سەعیدی خودەریەوە(ڕەزای خوای لێ بێ) کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (کاتێ موسوڵمان ڕزگاری دەبێ لە ئاگر بەند دەکرێن بەبەر بەستێ لە نێوان بەهەشت‌و ئاگردا. ئەو هەقانەی کەلە دنیا بەسەر یەکەوە بویانە جێ بەجێ دەکەن‌و دەیدەنەوە. هەتا کاتێ پاك‌و خاوێن دەکرێنەوەو ڕێگا دەدرێن کە بچنە ناو بەهەشت. سوێند بەو

---

[1] احمد (٤/٢٠٠) فەرمودەیەکی حەسەنە.

[2] أبو داود (٢٥٢٢) فەرمودەیەکی حەسەنە.

[3] یونس (٩).

[4] الطبري (٢٢/١٦٠).

کەسەی گیانی منی بەدەستە هەریەکێ لەوانە شوێنی خۆی دەزانێ لەناو بەهەشتا چاکتر لەو شوێنەی کەلە دنیاژیاوە)[1].

## یارمەتی خودا بدەن خوایش یارمەتیتان دەدا

پاشان خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن تَنصُرُواْ ٱللَّهَ يَنصُرْكُمْ وَيُثَبِّتْ أَقْدَامَكُمْ﴾ ئەی گەلی خاوەن باوەڕان: ئەگەر یارمەتی خودا بکەن، خوداش یارمەتیتان دەداو لەبەر نەیاران نابەزن. وەك ئەم ئایەتە وایە کە ئەفەرموێ: ﴿وَلَيَنصُرَنَّ ٱللَّهُ مَن يَنصُرُهُۥٓ﴾[2] واتە: وە بێگومان خوا یارمەتی کەسانێك ئەدات کە یارمەتی دینی خوا دەدەن. چونکە پاداشت لەچەشنی ئەو کارەیە بۆیە خوای مەزن فەرموویەتی: ﴿وَيُثَبِّتْ أَقْدَامَكُمْ﴾ نابەزنو پێیەکانتان بەهێز دەکاو دادەمەزرێنێ وەك لەم فەرمودەدا هاتووە: (هەر کەسێ پێویستی کەسێك بگەیەنێتە لای خاوەن دەستەلاتی کە ئەو کەسە خۆی نەتوانێ پێی بگەیەنێ خوای گەورە هەردو پێی ڕاوەستاو دەکا لەسەر پردی سیرات لە ڕۆژی قیامەتدا)، پاشان خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فَتَعْسًا لَّهُمْ وَأَضَلَّ أَعْمَـٰلَهُمْ﴾ ئەوانەش کەخوا نەناسن بەشیان هەر نەگبەتی دەبێوکارەکانی لێ پووچ کردوون. ئەمانە بەپێچەوانەی خاوەن باوەڕانن ئەوانەی کە یارمەتی خوداو پێغەمبەریان دا (ﷺ) خودایش ڕاوەستاوی کردنوپێکانی بەهێز کردن. ئەم فەرمودەیە لەپێغەمبەری خوداوە (ﷺ) ڕیوایەت کراوە کە فەرموویەتی: (بەدبەختو ڕسوایە بەندەی دینار. بەدبەختە بەندەی درهەم. بەدبەختە بەندەی بەروبوم وەختێ ئەو نەخۆشیە وەك دڕك چوە ناو جەستەوە خوای گەورە شیفای ناداو چاك نابێتەوە)[3]، واتە: خوای گەورە بەزەیی پێیدا نایەتەوە. خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَأَضَلَّ أَعْمَـٰلَهُمْ﴾ واتە: کارەکانی پوچەڵ و بەتاڵ کردوەتەوە. بۆیە فەرموویەتی: ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ كَرِهُواْ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأَحْبَطَ أَعْمَـٰلَهُمْ﴾ چونکە ئەوان لەمەی کەخودا ناردوویەتی خۆشیان نایە. ئەوسا ئەویش کارەکانی لێ تێك داون.

## پەند و دەرس ئاگر بۆ خوانەناسان وبەهەشتیش بۆ پارێزەران

﴿أَفَلَمْ يَسِيرُواْ فِى ٱلْأَرْضِ فَيَنظُرُواْ كَيْفَ كَانَ عَـٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۖ دَمَّرَ ٱللَّهُ عَلَيْهِمْ ۖ وَلِلْكَـٰفِرِينَ أَمْثَـٰلُهَا ﴿١٠﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ مَوْلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَأَنَّ ٱلْكَـٰفِرِينَ لَا مَوْلَىٰ لَهُمْ ﴿١١﴾ إِنَّ ٱللَّهَ يُدْخِلُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ جَنَّـٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا

---

[1] البخاري (٦٥٣٥).

[2] الحج (٤٠).

[3] فتح الباري (٦/٩٥)، بن ماجه (٢/١٣٨٦).

ٱلۡأَنۡهَٰرُۖ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يَتَمَتَّعُونَ وَيَأۡكُلُونَ كَمَا تَأۡكُلُ ٱلۡأَنۡعَٰمُ وَٱلنَّارُ مَثۡوٗى لَّهُمۡ ﴿١٢﴾ وَكَأَيِّن مِّن قَرۡيَةٍ هِيَ أَشَدُّ قُوَّةٗ مِّن قَرۡيَتِكَ ٱلَّتِيٓ أَخۡرَجَتۡكَ أَهۡلَكۡنَٰهُمۡ فَلَا نَاصِرَ لَهُمۡ ﴿١٣﴾ ﴾

خـودای مـەزن ئەفـەرموێت: ﴿أَفَلَمۡ يَسِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَيَنظُرُواْ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡۖ دَمَّرَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِمۡۖ وَلِلۡكَٰفِرِينَ أَمۡثَٰلُهَا﴾ ئاخۆ ئەوان بەزەمیندا نەگەڕاون تا بڕوانن پێشینەکانی ئەوان چیان بەسەرهات؟ خـودا تەفرو تونای کردن بۆلەدین لادەرەکانیش هەرشتێکی ئاوا هەیە. ﴿أَفَلَمۡ يَسِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ واتە: ئایا ئـەو خوانەناسانەی کە بڕوایان بەپێغەمبەری خودا(ﷺ) نەکرد نەگـەڕاون بەسـەر زەمینـا. ﴿فَيَنظُرُواْ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡۖ دَمَّرَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِمۡۖ﴾ واتە: تـا بـڕوانن ئەوانـەی پـێش خۆیـان چیان بەسـەر هـات بـەهۆی خوانـەناس و بڕوانـەبونیان بـەخواو پێغەمبەرەکـەی خـودا چـۆن قـڕی تـێ خـستن‌وخاوەن بـاوەڕانی لەنێوانیاندا پاراست بۆیە خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَلِلۡكَٰفِرِينَ أَمۡثَٰلُهَا﴾ واتە: هەر بـەو شـێوەیەش وابـە خوا نەناس و بـێ دینـان دەکـات. پاشـان خـوای مـەزن فەرموویـەتی: ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ مَوۡلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَأَنَّ ٱلۡكَٰفِرِينَ لَا مَوۡلَىٰ لَهُمۡ﴾ چونکە خودا سەروەری ئەو کەسانەیە کە باوەڕیان پـێ هێنـاوە و ئەوانـەی خـودا نەناسن. بێ سەروەرن. بۆیە ئـەبو سـوفیان(سـەخری کـوڕی حـەرب) گـەورەی بـت پـەرستان لـە ڕۆژی ئوحودا دەڵێت: وەختێ هەواڵی پێغەمبەر(ﷺ) لە ئـەبو بـەکرو عومـەری پرسـی(ڕەزای خوایـان لێ بـێ) کەس جوابی نەدایەوە دەڵێت: دیارە ئەوانە کوژراون‌وتیاچوون، عومەری کوڕی خەتاب جوابی دایەوە و دەڵێـت: درۆت کـرد ئـەی دوژمنـی خـودا. بـەڵکو خـودا ئەوانـەی هێـشتوەتەوە کـەتۆ پێیـان دڵ گران‌ونارەحـەتتی. ئەوانـەی کـەتۆ نـاوت بـردن زینـدون، ئـەبو سـوفیان دەڵێـت: ئـەمڕۆ بـەڕۆژی بـەدر جـەنگیش بەتۆرەیـە ئەوسـا خـەڵکی دەبیـنن کـەلوت‌و گـوێی بـڕاوەو هەڵـدراوە مـن فـەرمانم پـێ نەداون‌وڕێگاشم لێ نەگرتون. پاشان دەڕۆشت ئەم هاواری دەکردو ئەی گوت: بڵند بـە هوبـەل، بڵنـد بـە هوبەل. پێغەمبەری خودا فەرموی: (ئایا وەڵامی نادەنەوە؟) گوتیان: ئەی پێغەمبەری خـودا(ﷺ) چـی وەڵام بدەینەوە؟ پێغەمبـەر(ﷺ) فـەرموی: بڵێن: (خـوا گـەورەتر و بڵنـدترە)، پاشـان ئـەبو سـوفیان دەڵێت: ئێمە عوزامان هەیە ئێوە عوزاتـان نیـە. پێغەمبـەر(ﷺ) فـەرمووی: (ئایـا وەڵامـی نادەنـەوە؟) گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) چی وەڵام بدەینەوە؟ فـەرموی: بڵێن: (خـودا سـەروەرمانە ئێـوە سەروەرتان نیە)[1]. پاشان خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُدۡخِلُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ جَنَّٰتٖ

[1] فتح الباري (٦/١٨٨).

تَجْرِي مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ ۖ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ يَتَمَتَّعُونَ وَيَأْكُلُونَ كَمَا تَأْكُلُ ٱلْأَنْعَٰمُ وَٱلنَّارُ مَثْوًى لَّهُمْ ﴾ خودا خاوەن باوەڕانی ئاكار پەسند دەنێرێتە ناو باغانێك ڕوباریان بەبەردا دەڕوا. ئەوانەی نەشیان ناسیوە لەدنیادا ڕای دەبوێرن ودەلەوەڕێن، وەك لەوەڕانی ئاژەڵ و جێگەیان لەئاگردایە. واتە لە ڕۆژی قیامەتدا. ﴿وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ يَتَمَتَّعُونَ وَيَأْكُلُونَ كَمَا تَأْكُلُ ٱلْأَنْعَٰمُ ﴾ واتە: ئەوانەی خودایان نەناسیوە دەخۆن ورادەبوێرن وەك ئاژەڵ دەبڕن ودەهاڕن لەدنیاداو هیچ ئاواتێكیان نیە ئەوە نەبێ بۆیە لەفەرمودەی سەحیحدا هاتووە: (خاوەن باوەڕ بەیەك ڕیخۆڵە دەخوا. خوانەناسیش بەحەوت ڕیخۆڵە)[1]، پاشان خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَٱلنَّارُ مَثْوًى لَّهُمْ ﴾ واتە: ڕۆژی پاداشت دانەوەیان جێگایان ناو ئاگرە. خوای مەزن ئەفەرموێت: ﴿ وَكَأَيِّن مِّن قَرْيَةٍ هِىَ أَشَدُّ قُوَّةً مِّن قَرْيَتِكَ ٱلَّتِىٓ أَخْرَجَتْكَ أَهْلَكْنَٰهُمْ فَلَا نَاصِرَ لَهُمْ ﴾ زۆر شاری وا هەبووە لەخەڵكی شارەكەی تۆ (ئەوەی تۆیان لێ وەدەرنا) گەلێك بەهێزو گوڕ تر بوون، قڕمان كردوون، كەسیش یەهانایانەوە نەهات. ئەمە هەڕەشەیەكی زۆر توندەو، گومانی تێدا نیەكە دێتە دی لەو خەڵكی مەككەیە بڕوایان نەدەكرد بەپێغەمبەری خودا(ﷺ) كە پێشەواو دوایینی پێغەمبەرانە. وەختێ خوای مەزن ئەو گەلە پێشوانەی كە باوەڕیان نەدەهێنا بە پێغەمبەرەكانیان لەبەر ئەوەی قڕی كردوون. كە ئەوانە زۆر بەهێزو توانا تر بون لەمانە. ئەگەر ئەمانەش لەدنیاو لەقیامەتدا وەك ئەوانەی پێی خۆیان لێ بكات چی دەڵێن؟ خۆ ئەگەر سزای لەسەر زۆریان لابردوە لەبەر بەرەكەتی پێغەمبەری خاوەن بەزەیی یە (ﷺ) لەناویاندا. سزای زۆری ئامادە كردوە بۆ ئەوانەی كەباوەڕیان پێی نەبوە لەڕۆژی دواییا. وەك خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿يُضَٰعَفُ لَهُمُ ٱلْعَذَابُ ۚ مَا كَانُوا۟ يَسْتَطِيعُونَ ٱلسَّمْعَ وَمَا كَانُوا۟ يُبْصِرُونَ ﴾[2] واتە: بۆیان دووقات دەكرێتەوە سزا توانای بیستنی ئەو قورئانە یان نەبوو هەقیشیان نەدەبینی.

وەئەفەرموێت: ﴿مِّن قَرْيَةٍ هِىَ أَشَدُّ قُوَّةً مِّن قَرْيَتِكَ ٱلَّتِىٓ أَخْرَجَتْكَ﴾ واتە: ئەوانەی كە وەدەریان نای لەنێوان خۆیاندا. ئیبنو ئەبی حاتم ڕیوایەتی كردووە لە ئیبنو عەباسەوە (ڕەزای خوایان لێ بێ) كاتێ پێغەمبەر(ﷺ) لەمەككەوە دەرچو بۆناو ئەشكەوتەكە كەخۆی بشارێتەوە لای كردەوەو سەیری مەككەی كردو فەرمووی: (تۆ خۆشەویست ترین وڵاتی خودای لای خودا. وەتۆ خۆشەویس ترین وڵاتی خوای لای منیش. وە ئەگەر بت پەرستان وەدەریان نەنامایە دەرنەدەچوم لێت).[3] دوژمن ترین كەس لای خودا ئەو كەسانەن كەلە حەرەمی خودادا دەست درێژی دەكەنە سەری، یا ئەو كەسەی

---

[1] فتح الباري (٤٤٦/٩).

[2] هود (٢٠).

[3] الطبري (١٦٥/٢٢).

یەکێك دەکوژێ کە کەس ئەوی نەکوشتوە. یان کەسێ بکوژێ بەکینەو حیقدی نەفامی. خوای مەزن ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە بۆ پێغەمبەر(ﷺ) ﴿ وَكَأَيِّن مِّن قَرْيَةٍ هِيَ أَشَدُّ قُوَّةً مِّن قَرْيَتِكَ ٱلَّتِيٓ أَخْرَجَتْكَ أَهْلَكْنَٰهُمْ فَلَا نَاصِرَ لَهُمْ ﴾.

**کەسێ شوێن ڕاستی دەکەوێ وکەسێ شوێن ئارەزو دەکەوێ وەك یەك نین**

﴿ أَفَمَن كَانَ عَلَىٰ بَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّهِۦ كَمَن زُيِّنَ لَهُۥ سُوٓءُ عَمَلِهِۦ وَٱتَّبَعُوٓاْ أَهْوَآءَهُم ﴿١٤﴾ مَّثَلُ ٱلْجَنَّةِ ٱلَّتِي وُعِدَ ٱلْمُتَّقُونَ فِيهَآ أَنْهَٰرٌ مِّن مَّآءٍ غَيْرِ ءَاسِنٍ وَأَنْهَٰرٌ مِّن لَّبَنٍ لَّمْ يَتَغَيَّرْ طَعْمُهُۥ وَأَنْهَٰرٌ مِّنْ خَمْرٍ لَّذَّةٍ لِّلشَّٰرِبِينَ وَأَنْهَٰرٌ مِّنْ عَسَلٍ مُّصَفًّى وَلَهُمْ فِيهَا مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ وَمَغْفِرَةٌ مِّن رَّبِّهِمْ كَمَنْ هُوَ خَٰلِدٌ فِي ٱلنَّارِ وَسُقُواْ مَآءً حَمِيمًا فَقَطَّعَ أَمْعَآءَهُمْ ﴿١٥﴾ ﴾

خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ أَفَمَن كَانَ عَلَىٰ بَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّهِۦ كَمَن زُيِّنَ لَهُۥ سُوٓءُ عَمَلِهِۦ وَٱتَّبَعُوٓاْ أَهْوَآءَهُم ﴾ ئاخۆ کەسێ لە پەروەرندەی خۆیەوە بەڵگەی ڕوونی بۆ هاتبێ. وەك کەسێکە کردەوە خراپەکەی خۆی بۆ خەملاندوەو شوێن ئارەزووی خۆیان کەوتوون. واتە: کەسێك لەسەر بەڵگە ڕوونو باوەڕی بتەوو ئاینی خودابێو باوەڕی هەبێ بەو ڕێنمایىو زانیاریانەی کە خودا لە قورئانەکەیدا ڕەوانەی کردووەو لەسەر ئەو سروشتە ڕێكو ڕاستەی کە خودای مەزن وەدی هێناوە لەسەری. ﴿ كَمَن زُيِّنَ لَهُۥ سُوٓءُ عَمَلِهِۦ ﴾ وەك ئەو کەسە وایە کە شوێن ئارەزوی خۆی کەوتوە؟ نەخێر وەك یەك نین. وەك ئەم ئایەتەی کەخودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿ أَفَمَن يَعْلَمُ أَنَّمَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ ٱلْحَقُّ كَمَنْ هُوَ أَعْمَىٰٓ ﴾[1] واتە: جا ئایا کەسێك کە بزانێ بەڕاستی ئەوەی نێرراوەتە خوار بۆ تۆ لە لایەن پەروەردگارتەوە هەقو ڕاستە وەك ئەو کەسەیە کە کوێر بێت. وەك ئەم ئایەتەیشی کە ئەفەرموێت: ﴿ لَا يَسْتَوِيٓ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ وَأَصْحَٰبُ ٱلْجَنَّةِ ۚ أَصْحَٰبُ ٱلْجَنَّةِ هُمُ ٱلْفَآئِزُونَ ﴾[2] واتە: دۆزەخیەکانو بەهەشتیەکان وەك یەك نین بەهەشتیەکان ڕزگارو سەرکەوتوون.

**باس و وەسفی بەهەشتو ڕوبارەکانی**

پاشان خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ مَّثَلُ ٱلْجَنَّةِ ٱلَّتِي وُعِدَ ٱلْمُتَّقُونَ فِيهَآ أَنْهَٰرٌ مِّن مَّآءٍ غَيْرِ ءَاسِنٍ وَأَنْهَٰرٌ مِّن لَّبَنٍ لَّمْ يَتَغَيَّرْ طَعْمُهُۥ وَأَنْهَٰرٌ مِّنْ خَمْرٍ لَّذَّةٍ لِّلشَّٰرِبِينَ وَأَنْهَٰرٌ مِّنْ عَسَلٍ مُّصَفًّى وَلَهُمْ فِيهَا مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ وَمَغْفِرَةٌ مِّن رَّبِّهِمْ كَمَنْ هُوَ خَٰلِدٌ فِي ٱلنَّارِ وَسُقُواْ مَآءً حَمِيمًا فَقَطَّعَ أَمْعَآءَهُمْ ﴾ ئەو بەهەشتەی خودا بەپارێزگارانی بەڵێن داوە چۆن

---

[1] الرعد (١٩).

[2] الحشر (٢٠).

چۆنیه؟ چەندین ڕوباری وای تێدایە ئاویان لێڵ نابێ. چەند ڕوباری شیری تێدایە هەرگیز تامی نەگۆڕاوە. چەندین ڕوباری شەرابی پێدا دەڕوا. تا دەیخۆن کەیفی پێدەکەن. چەند ڕوباری لە هەنگوینی پالأفتە هەن. هەر میوەیەکیش بیخوازن، تێیدا هەیە، خۆشبوونی پەروەردگاریشیان چۆن ئەمانە دەبنە هاوتای ئەو کەسانەی کە تا هەتایە هەر دەبێ لەئاگردا بنولەسەریانە ئاوە کولْ بخۆنوریخۆڵەیان لەتوپەت بکات. عیکریمە دەڵێت: ﴿مَّثَلُ الْجَنَّةِ﴾ نمونەی بەهرەو خۆشیەکانی بەهەشت. ﴿فِيهَا أَنْهَارٌ مِّن مَّاءٍ غَيْرِ آسِنٍ﴾، ﴿غَيْرِ آسِنٍ﴾ ئیبنو عەباس و حەسەنو قەتادە گوتیان: واتە: ڕەنگی نەگۆڕاوە[١] قەتادەو زەححاکو عەتای خۆراسانی دەڵێن: ﴿غَيْرِ آسِنٍ﴾ واتە: بۆنی نەکردووە[٢]، عەرەب ئەڵێت: (اسن الماء) واتە: کاتێ بۆنی بگۆڕێت. ﴿وَأَنْهَارٌ مِّن لَّبَنٍ لَّمْ يَتَغَيَّرْ طَعْمُهُ﴾ واتە: زۆر سپیو شیرینو چەورە لە فەرمودەیەکی مەرفوعدا هاتووە: (لەگوانی مەڕو مالأتو وشترەوە نەهاتوە).

﴿وَأَنْهَارٌ مِّنْ خَمْرٍ لَّذَّةٍ لِّلشَّارِبِينَ﴾ واتە: وەك شەرابی دنیا تام و بۆنی ناخۆش نیەو تام وبۆنوشێوەیەکی جوانی هەیە وە فەرموویەتی: ﴿لَا فِيهَا غَوْلٌ وَلَا هُمْ عَنْهَا يُنزَفُونَ﴾[٣] واتە: ئەو شەرابە نەمێشکیان تێك دەدات نەسەرخۆشو بێ ئاگایان دەکات. وە ئەفەرموێت: ﴿لَّا يُصَدَّعُونَ عَنْهَا وَلَا يُنزِفُونَ﴾[٤] واتە: نەسەریان پێی ئێشێ نەسەر خۆش دەبن پێی. ﴿بَيْضَاءَ لَذَّةٍ لِّلشَّارِبِينَ﴾[٥] واتە: زۆر سپیە وە بۆنەوانەی دەیخۆنەوە بەلەزەتە. لەفەرمودەیەکی مەرفوعا هاتووە: (پیاوان بەقاچەکانیان نەیان گوشیوە).

﴿وَأَنْهَارٌ مِّنْ عَسَلٍ مُّصَفًّى﴾ واتە: زۆر پالفتەو تام و بۆنوڕەنگی جوانە. لەفەرمودەیەکی مەرفوعا هاتووە: (لەسکی هەنگەوە نەهاتوەتە دەر).[٦] ئیمامی ئەحمد ڕیوایەتی کردوە لەحەکیمی کوڕی مەعاویەوە ئەویش لەباوکیەوە دەڵێت: بیستم لەپێغەمبەری خوداوە (ﷺ) دەیفەرموو: (لەناو بەهەشتا دەریای شیرو ئاو و دەریای هەنگوینودەریای شەراب هەیە. پاشان لەدوایدا ڕوبارەکان تێیدا دەڕوات[٧].

---

[١] الطبري (٢٢/١٦٦).

[٢] الطبري (٢٢/١٦٧).

[٣] الصافات (٤٧).

[٤] الواقعة (١٩).

[٥] الصافات (٤٦).

[٦] روى هذا ومعنى ما أقبله أبى المنذر عن سعيد بن جبير مرفوعاً عليه الدر المنثور (٦/٢٥) فەرمودەیەکی مەرفوعە.

[٧] احمد (٥/٥) فەرمودەیەکی حەسەنە.

تیرمیزیش ڕیوایەتی کردوە لە وەسفی بەهەشتا و دەڵێت چاكو ڕاستە[1] وە لەفەرمودەی سەحیحدا هاتووە: (کاتێ داواتان کرد لەخودا داوای فیردەوسی لێ بکەن چونکە ناوەڕاستی بەهەشتەو سەرەوەی سەرەوەی بەهەشتە لەوێوە ڕوبارەکانی بەهەشت هەڵدەقوڵێن سەرەوەیشی عەرشی ڕەحمانە[2] خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَلَهُمْ فِيهَا مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ﴾ لەهەموو میوەیەك ئارەزوو بکەن تێیدا هەیە وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿يَدْعُونَ فِيهَا بِكُلِّ فَٰكِهَةٍ ءَامِنِينَ﴾[3] واتە: لەوبەهەشتەدا هەموو جۆرە میوەیەك داوادەکەن بەئاسودەییوبێوەیی. وە ئەفەرموێت: ﴿فِيهِمَا مِن كُلِّ فَٰكِهَةٍ زَوْجَانِ﴾[4] واتە: هەیە لە ناویاندا لەهەر میوەیەك دوو جۆرە. پاشان ئەفەرموێت: ﴿وَمَغْفِرَةٌ مِّن رَّبِّهِمْ﴾ لەگەڵ ئەمانەیشدا هەمووی لێبوردنی پەروەردگاریشیان وە ئەفەرموێت: ﴿كَمَنْ هُوَ خَٰلِدٌ فِى ٱلنَّارِ﴾ واتە: ئەوانەی کەباسی پلەکانیانمان کردون لەناو بەهەشتا چۆن وەك ئەوانەن کە هەتا هەتایە هەر لەناو ئاگردا دەمێننەوە. هەرگیز ئەوانە وەك ئەمانە نینوبەهەشتیان وان لەپلەی بەرزداو جەهەنمیش وان لەنزمترین پلەدا لەدۆزەخدا ﴿وَسُقُوا۟ مَآءً حَمِيمًا﴾ ئاوێکی زۆر کوڵاو دەخۆن ئەوەندە گەرمە ناخورێتەوە ﴿فَقَطَّعَ أَمْعَآءَهُمْ﴾ واتە هەرچی ڕیخۆڵەیان لەناو سکیاندایە پارچە پارچەی دەکات. خودای گەورە بمان پارێزێ لێی.

**خوای گەورە باسی ژیانی دوو ڕووەکان (المنافیق) دەکاو فەرمان دەدابە یەکخوا پەرستی داوای لێ خۆشبون لێی**

﴿ وَمِنْهُم مَّن يَسْتَمِعُ إِلَيْكَ حَتَّىٰٓ إِذَا خَرَجُوا۟ مِنْ عِندِكَ قَالُوا۟ لِلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ مَاذَا قَالَ ءَانِفًا ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ طَبَعَ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ وَٱتَّبَعُوٓا۟ أَهْوَآءَهُمْ (١٦) وَٱلَّذِينَ ٱهْتَدَوْا۟ زَادَهُمْ هُدًى وَءَاتَىٰهُمْ تَقْوَىٰهُمْ (١٧) فَهَلْ يَنظُرُونَ إِلَّا ٱلسَّاعَةَ أَن تَأْتِيَهُم بَغْتَةً ۖ فَقَدْ جَآءَ أَشْرَاطُهَا ۚ فَأَنَّىٰ لَهُمْ إِذَا جَآءَتْهُمْ ذِكْرَىٰهُمْ (١٨) فَٱعْلَمْ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ وَٱسْتَغْفِرْ لِذَنۢبِكَ وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ ۗ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ مُتَقَلَّبَكُمْ وَمَثْوَىٰكُمْ (١٩) ﴾

خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ وَمِنْهُم مَّن يَسْتَمِعُ إِلَيْكَ حَتَّىٰٓ إِذَا خَرَجُوا۟ مِنْ عِندِكَ قَالُوا۟ لِلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ مَاذَا قَالَ ءَانِفًا ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ طَبَعَ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ وَٱتَّبَعُوٓا۟ أَهْوَآءَهُمْ ﴾ هەندێکیان دێن گوێت لێدەگرن، وەختێ لای تۆ دەردەچن، لەزانست پێدراوەکان دەپرسن: ئێستە چی وت؟ خودا مۆری بەسەر دڵیانەوە ناوەو شوێنی

---

[1] تحفة الاحوذي (٧/٢٨٧) فەرمودەیەکی حەسەنە.

[2] فتح الباري (٦/١٤).

[3] الدخان (٥٥).

[4] الرحمن (٥٢).

ئارەزووی خۆیان کەوتوون. خوای مەزن باسی دووڕووەکانمان بۆ دەکا کەچەند دەبەنگ و کەم ئاوەزن. کاتێ کەلە لای پێغەمبەر(ﷺ) دادەنیشن وگوێی لێ دەگرن هیچی لێ تێناگەن وەختێکیش لە لای دەڕۆن ﴿قَالُواْ لِلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡعِلۡمَ﴾ لەهاوەڵەکانی پێغەمبەر دەپرسن ﴿مَاذَا قَالَ ءَانِفًا﴾ ئێستە پێغەمبەر چی گوت. تێ نەگەیشتون کە پێغەمبەر(ﷺ) چی فەرمووەو گوێیان بۆ نەگرتوە. ﴿أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ طَبَعَ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ وَٱتَّبَعُوٓاْ أَهۡوَآءَهُمۡ﴾ خودا مۆری ناوە بەسەر دڵیاندا شوێن ئارەزوی خۆیان کەوتون. باش لەشت تێناگەن ومەبەستیشیان خراپەو چاك نیە. پاشان خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَٱلَّذِينَ ٱهۡتَدَوۡاْ زَادَهُمۡ هُدٗى وَءَاتَىٰهُمۡ تَقۡوَىٰهُمۡ﴾ ئەو کەسانەش کە هاتوونە سەر ڕاستەڕێ، پتر شارەزایان دەکاو ترسی خوایان پتر دەخاتە دڵەوە. واتە: ئەوانەی کەهاتونەتە سەر ڕاستەڕێ خوای گەورە سەرکەوتوی کردن وڕێی نیشاندان و دامەزراوی کردن لەسەری و ﴿وَءَاتَىٰهُمۡ تَقۡوَىٰهُمۡ﴾ واتە: ترس خوایان زیاتر دەخاتە دڵەوەو ڕێگایان بۆ ئاسان دەکا. خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿فَهَلۡ يَنظُرُونَ إِلَّا ٱلسَّاعَةَ أَن تَأۡتِيَهُم بَغۡتَةٗۖ فَقَدۡ جَآءَ أَشۡرَاطُهَاۚ فَأَنَّىٰ لَهُمۡ إِذَا جَآءَتۡهُمۡ ذِكۡرَىٰهُمۡ﴾ ئاخۆ ئەوان چاوەڕوانن کتوپڕ ئێستە قیامەتیان بەسەرابێ؟ ئەوا ئێستا نیشانەکانی پەیدا بوون، وەختێ قیامەتیشیان لێ ڕابوو، ئیتر کەی بیر دەکەنەوە؟ ﴿فَهَلۡ يَنظُرُونَ إِلَّا ٱلسَّاعَةَ أَن تَأۡتِيَهُم بَغۡتَةٗ﴾ واتە: ئەوان ئاگایان لێی نیە. ﴿فَقَدۡ جَآءَ أَشۡرَاطُهَا﴾ واتە: نیشانەکانی نزیك بوونەوەی هاتوە، وەك خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿هَٰذَا نَذِيرٞ مِّنَ ٱلنُّذُرِ ٱلۡأُولَىٰٓ ۝٥٦ أَزِفَتِ ٱلۡأٓزِفَةُ﴾[1] واتە: ئەم پێغەمبەرە ترسێنەرێکە لە ترسێنەرەکانی پێشوو، ڕۆژی دوایی زۆر نزیك بۆتەوە. وە ئەفەرموێت: ﴿ٱقۡتَرَبَتِ ٱلسَّاعَةُ وَٱنشَقَّ ٱلۡقَمَرُ﴾[2] واتە: ڕۆژی دوایی نزیك بویەوە وەمانگ لەت بوو. وە ئەفەرموێت: ﴿أَتَىٰٓ أَمۡرُ ٱللَّهِ فَلَا تَسۡتَعۡجِلُوهُ﴾[3] واتە: ئەوا فەرمانی خوا بەسزادانیان هات بۆیە پەلە مەکەن لەهاتنی. وە ئەفەرموێت: ﴿ٱقۡتَرَبَ لِلنَّاسِ حِسَابُهُمۡ وَهُمۡ فِي غَفۡلَةٖ مُّعۡرِضُونَ﴾[4] واتە: لێپرسینەوەی خەڵکی نزیك بۆتەوە بەڵام ئەوان لەبێ ئاگایی و غەفلەتدا پشت تێکەرو ڕوو وەردەگێڕن لەئایینی خوا. یەکێك لە نیشانەکانی ڕۆژی قیامەت هاتنی پێغەمبەر(ﷺ) کە خاتەمی هەموو پێغەمبەرانە کە خودا بەهۆی

---

[1] النجم (٥٦-٥٧).

[2] القمر (١).

[3] النحل (١).

[4] الانبياء (١).

ئەوەوە ئاینی تەواو کردو کردیە بەڵگە بەسەر هەموو جیهانیانەوە پێغەمبەر(ﷺ) باسی نیشانەکانی ڕۆژی قیامەتی کردوە زۆر بەجوانی ڕونی کردوەتەوە. هیچ پێغەمبەرێك بەو شێوەیە ڕونی نەکردوەتەوە لەپێش ئەمەوە وەك لەشوێنی خۆیدا باسمان کرد. بوخاری ڕیوایەتی کردوە لە سەهلی کوڕی سەعدەوە ( ڕەزای خوایان لێ بێ) دەڵێت: پێغەمبەری خودام بینی (ﷺ) ئیشارەتی کرد بە دو پەنجەی ئاوەها، پەنجەی ناوەڕاستو ئەو پەنجەی کە لەپاڵ ناوەڕاستایە فەرموی: (ڕەوانە کردنی من لەگەڵ هاتنی ڕۆژی قیامەتدا وەك ئەم دو پەنجەیە وایە).[1] پاشان خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَأَنَّىٰ لَهُمْ إِذَا جَآءَتْهُمْ ذِكْرَىٰهُمْ﴾ واتە: وەختێ قیامەت هەڵسا لەسەریان ئیتر ئامۆژگاری سودی چیە بۆیان؟ بێگومان هیچ سودێکی بۆیان نیە لەو کاتەدا. وەك خوای مەزن ئەفەرموێت: ﴿يَوْمَئِذٍ يَتَذَكَّرُ ٱلْإِنسَٰنُ وَأَنَّىٰ لَهُ ٱلذِّكْرَىٰ﴾[2] واتە: لەو ڕۆژەدا ئینسان کردەوەی خۆی بیردەکەوێتەوە بەڵام ئەو بیر کەوتنەوەیە چ سودێك بەو دەگەیەنێت؟.وە ئەفەرموێت: ﴿وَقَالُوٓا۟ ءَامَنَّا بِهِۦ وَأَنَّىٰ لَهُمُ ٱلتَّنَاوُشُ مِن مَّكَانٍۭ بَعِيدٍ﴾[3] واتە: لەو کاتەدا دەڵێن باوەڕمان هێنا بەو قورئانە چۆن باوەڕیان دەست دەکەوێ لە شوێنێکی دوورەوە.خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿فَٱعْلَمْ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ وَٱسْتَغْفِرْ لِذَنۢبِكَ وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ ۗ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ مُتَقَلَّبَكُمْ وَمَثْوَىٰكُمْ﴾ سا بزانە غەیرە خودا هیچ شت بۆ پەرستن نابێ، بۆ هەڵەی خۆتو پیاوانو ژنەکانی خاوەن باوەڕ، داوای لێ خۆشبونێ بکەن. خوا لە هەڵگێڕو وەرگێڕتانو لە شوێنی هەمیشەییتان ئاگادارە. ﴿فَٱعْلَمْ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ﴾ ئەمە هەواڵێکە بەوەی کە غەیرە خودا هیچ کەس بۆ پەرستن نابێ نەك فەرماندان بەئاگادار کردنەوە لێی لەبەر ئەوەیە عەتفی کردوەتە سەر ڕستەکەی دوایی ئەفەرموێت: ﴿وَٱسْتَغْفِرْ لِذَنۢبِكَ وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ﴾ وە لە فەرمودەی سەحیحدا هاتوە کەپێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (ئەی خودایە لەوهەڵەو نەزانیو زیادەڕویە کە کردومە لێم ببورە. وەلە وەیش کەتۆ لەخۆم زیاتر ئاگاداری لێی. ئەی خودایە لەو گوناهانەشم ببورە کەبە مەبەست نەم کردوە ئەویش کەکردوم وە ئەوەیش بەهەڵە کردومەو ئەویشی بەهەوەس کردومە وە ئەوانە هەمووی لەلایەن منەوەیە)[4]، هەمیسان لەفەرمودەی سەحیحدا هاتوە کە پێغەمبەر(ﷺ) لەدوایی

---

[1] فتح الباري (٥٦٠/٨).

[2] الفجر (٢٣).

[3] سبأ (٥٢).

[4] فتح الباري (٢٠٠/١١).

نوێژا دەیفەرموو: (ئەی خودایە لەگوناهی پێش‌و پاش‌و ئەوەیش بەپەنهانی‌و ئاشکرا و زیادە ڕەوی کردومە لێم ببورە. ئەو گوناهەیش کەتۆ زیاتر لەخۆم لێی ئاگاداری. تۆ خودای منی غەیرە تۆ هیچ شت بۆ پەرستن نابێ)[1]، وەهەر لەفەرمودەیەکی تری سەحیحدا هاتوە کەپێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (ئەی خەڵکینە بگەڕێنەوە بۆلای پەروەردگارتان. چونکە من داوای لێ خۆشبون‌وگەڕانەوە دەکەم بۆلای خودا زیاتر لەحەفتا جار لەڕۆژێکدا)[2]، خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ مُتَقَلَّبَكُمۡ وَمَثۡوَىٰكُمۡ﴾ واتە: خودا ئاگای لە هەڵس و کەوتتانە لەڕۆژەکانتانداو لەشوێنی هەمیشەیی تانە لەشەوەکانتاندا. وەك ئەفەرموێت: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِي يَتَوَفَّىٰكُم بِٱلَّيۡلِ وَيَعۡلَمُ مَا جَرَحۡتُم بِٱلنَّهَارِ﴾[3] واتە: وە هەر ئەو خوایەیە کە دەتان خەوێنێ (دەتان مرێنێ) لەشەودا وە ئەشزانێ (لەڕۆژدا) چ کارێکتان ئەنجام داوە.وە ئەفەرموێت: ﴿وَمَا مِن دَآبَّةٖ فِي ٱلۡأَرۡضِ إِلَّا عَلَى ٱللَّهِ رِزۡقُهَا وَيَعۡلَمُ مُسۡتَقَرَّهَا وَمُسۡتَوۡدَعَهَاۚ كُلّٞ فِي كِتَٰبٖ مُّبِينٖ﴾[4] واتە: هیچ گیان لەبەرێك نی یە لەزەویدا مەگەر لەسەر خوایە ڕزق‌و ڕۆزی یەکەی وە خوا دەزانێ شوێنی مانەوەی وە شوێنی لێ دەرچوونی هەمووی نوسراوە لە کتێبی ڕوون کەرەوە (لوح المحفوظ) دایە.

**ژیانی خاوەن باوەڕی ڕاست‌و حاڵی دڵ نەخۆشەکان لەکاتی دابەزینی فەرمان دان بەجیهاد کردن**

﴿وَيَقُولُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَوۡلَا نُزِّلَتۡ سُورَةٞۖ فَإِذَآ أُنزِلَتۡ سُورَةٞ مُّحۡكَمَةٞ وَذُكِرَ فِيهَا ٱلۡقِتَالُ رَأَيۡتَ ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٞ يَنظُرُونَ إِلَيۡكَ نَظَرَ ٱلۡمَغۡشِيِّ عَلَيۡهِ مِنَ ٱلۡمَوۡتِۖ فَأَوۡلَىٰ لَهُمۡ ﴿٢٠﴾ طَاعَةٞ وَقَوۡلٞ مَّعۡرُوفٞۚ فَإِذَا عَزَمَ ٱلۡأَمۡرُ فَلَوۡ صَدَقُواْ ٱللَّهَ لَكَانَ خَيۡرٗا لَّهُمۡ ﴿٢١﴾ فَهَلۡ عَسَيۡتُمۡ إِن تَوَلَّيۡتُمۡ أَن تُفۡسِدُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَتُقَطِّعُوٓاْ أَرۡحَامَكُمۡ ﴿٢٢﴾ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَعَنَهُمُ ٱللَّهُ فَأَصَمَّهُمۡ وَأَعۡمَىٰٓ أَبۡصَٰرَهُمۡ ﴿٢٣﴾﴾

خوای گەورە باسی ئەو موسوڵمانانە دەکات کە ئاواتیان دەخواست کەخودا ڕێگای جیهادیان بدات. کاتێکیش کە خوای گەورە جیهادی فەرز کردو فەرمانی پێدا زۆرینەی ئەو خەڵکە پاشەکشەیان کرد وەك خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ قِيلَ لَهُمۡ كُفُّوٓاْ أَيۡدِيَكُمۡ وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ فَلَمَّا كُتِبَ عَلَيۡهِمُ ٱلۡقِتَالُ إِذَا فَرِيقٞ مِّنۡهُمۡ يَخۡشَوۡنَ ٱلنَّاسَ كَخَشۡيَةِ ٱللَّهِ أَوۡ أَشَدَّ خَشۡيَةٗۚ وَقَالُواْ رَبَّنَا لِمَ كَتَبۡتَ عَلَيۡنَا ٱلۡقِتَالَ لَوۡلَآ أَخَّرۡتَنَآ

---

[1] فتح الباري (١٣/٤٧٣).

[2] فتح الباري (١١/١٠٤).

[3] الانعام (٦٠).

[4] هود (٦).

إِلَىٰٓ أَجَلٖ قَرِيبٖۗ قُلۡ مَتَٰعُ ٱلدُّنۡيَا قَلِيلٞ وَٱلۡأٓخِرَةُ خَيۡرٞ لِّمَنِ ٱتَّقَىٰ وَلَا تُظۡلَمُونَ فَتِيلًا ﴾[1] واتە: ئایا سەیری ئەو کەسانەت نەکردوە کەپێیان ووترا دەستتان بگێڕنەوە لەجەنگ و کوشتار و نوێژ بکەنو زەکات بدەن؟ کەچی کاتێك جەنگیان لەسەر پێویست کرا یەکسەر دەستەیەکیان لەخەڵکی دەترسان وەك ترسان لە خودا بگرە زیاتریش دەترسان دەیانگوت ئەی پەروەردگاری ئێمە بۆچی جەنگت لەسەرمان پێویست کردووە خۆزگە دوات دەخستین لەجەنگ کردن بۆ ماوەیەکی کەم، بڵێ خۆشیو لەزەتی دونیا زۆر کەمەو ڕۆژیی دوایی باشترە بۆ کەسێك لەخوا بترسێتوەستەمتان لێ ناکرێت بە ئەندازەی تاڵی ناوکە خورمایەك.

خوای مەزن لێرەشدا ئەفەرموێت: ﴿وَيَقُولُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَوۡلَا نُزِّلَتۡ سُورَةٞۖ فَإِذَآ أُنزِلَتۡ سُورَةٞ مُّحۡكَمَةٞ وَذُكِرَ فِيهَا ٱلۡقِتَالُ رَأَيۡتَ ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٞ يَنظُرُونَ إِلَيۡكَ نَظَرَ ٱلۡمَغۡشِيِّ عَلَيۡهِ مِنَ ٱلۡمَوۡتِۖ فَأَوۡلَىٰ لَهُمۡ ﴾ ئەوانەی خاوەنباوەڕن دەڵێن: بۆچی سوورەتێك نایێتە خوارەوە؟ ئەمجارە کە سوڕەتێکی پتەو هاتو لەبارەی غەزاوە باسی کرد. تۆ ئەوانەی غەرەزێکیان لەدڵدایە دەبینی وات لێ دەڕوانن. وەك کەسێ لەترسی مردن تووشی بێهۆشی یان فێداری هاتبێ. بۆ ئەوانە واباشترە. واتە: موسوڵمانان دەڵێن بۆچی سوڕەتێك لەبارەی غەزاوە نایەتە خوارەوە. ﴿فَإِذَآ أُنزِلَتۡ سُورَةٞ مُّحۡكَمَةٞ وَذُكِرَ فِيهَا ٱلۡقِتَالُ رَأَيۡتَ ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٞ يَنظُرُونَ إِلَيۡكَ نَظَرَ ٱلۡمَغۡشِيِّ عَلَيۡهِ مِنَ ٱلۡمَوۡتِ﴾ واتە: ئەوانەی دڵیان نەخۆشە بەشێوەیەك سەیرت دەکەن وەك کەسێ لە ترسی مردن توشی فێداری بوبێ. ئەوەندە دەترسن توشی دوژمن بن لەترسانا ئۆقرەیان نامێنێ وەختە دڵیان دەربێت. پاشان خوای گەورە هەڵیان دەنێ ئەفەرموێت: ﴿فَأَوۡلَىٰ لَهُمۡ ٢٠ طَاعَةٞ وَقَوۡلٞ مَّعۡرُوفٞۚ فَإِذَا عَزَمَ ٱلۡأَمۡرُ فَلَوۡ صَدَقُواْ ٱللَّهَ لَكَانَ خَيۡرٗا لَّهُمۡ﴾ بۆ ئەوانە بەفەرمانی و بەجێ و ڕێی یە هەرکاتێ غەزا بڕیار درا. ئەگەر ئەوسا بەرانبەر بەخودا ڕاست بن، هەر بەقازانجی خۆیانە. واتە: چاکتر وابو بۆیان کە گوێ ڕایەڵ بونایەو فەرمانەکانیان بەجێ بهێنانایە لەو کاتە نائاساییەدا. ﴿فَإِذَا عَزَمَ ٱلۡأَمۡرُ﴾ کە بڕیاری غەزا دراو غەزا دەستی پێکرد. ﴿فَلَوۡ صَدَقُواْ ٱللَّهَ﴾ واتە: بەدڵسۆزیەوە نیەتی غەزایان بهێنایە. ﴿لَكَانَ خَيۡرٗا لَّهُمۡ﴾ هەر ئەوە چاکتر بو بۆیان. خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ فَهَلۡ عَسَيۡتُمۡ إِن تَوَلَّيۡتُمۡ أَن تُفۡسِدُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَتُقَطِّعُوٓاْ أَرۡحَامَكُمۡ ﴾ ئاخۆ ئەگەر دەستەڵاتتان وەدەست کەوت، لەم زەمینە خراپ بەڕێوەی دەبەن پەیوەندی خزمایەتیتان دەپچڕێنن؟. واتە: خۆ هەرکاتێ توانیتان غەزا ناکەن پشتی تێ دەکەن. ﴿أَن تُفۡسِدُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ

---

[1] النساء (٧٧).

﴿ وَتُقَطِّعُوٓاْ أَرۡحَامَكُمۡ ﴾ دەگەڕێنەوە بۆ ئەو ژیانە خراپ و نەزانو نەفامییەی کە لە پێشەوە لەسەری بوون خوێنی یەکتری دەرێژنو پەیوەندی خزمایەتی دەپچڕێنن. بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَعَنَهُمُ ٱللَّهُ فَأَصَمَّهُمۡ وَأَعۡمَىٰٓ أَبۡصَٰرَهُمۡ ﴾ سا ئەوانە بەر نەعلەتی خستوون، کەڕو چاوەکانی لێ کوێر کردوون. ئەم فەرمانە بە وازهێنان لەخراپە کردن لەسەر زەمینا بەگشتی وە نەپچڕاندنی پەیوەندی خزمایەتی بەتایبەتی. بەڵکو فەرمان دانە بەچاکە خوازی لەسەر زەمیناو جێ بەجێ کردنی پەیوەندی خزمایەتیو چاکە کردن بەکردارو گفتار لەگەڵ خزماندا. لەزۆر فەرمودەی سەحیحدا هاتوە لەم بارەیەوە لەپێغەمبەری خوداوە (ﷺ) لەچەندین ڕێگاو شێوازی زۆرەوە. بوخاری ڕیوایەتی کردوە لە ئەبو هورەیرەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) ئەمیش لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرموویەتی: (خوای گەورە خەڵکی دروست کردو کاتێ لێ بووەوە لێی ڕەحم ڕاست بووەوە (هەڵسا) دامێنی خوای ڕەحمانی گرت خوای گەورە فەرموی: چیتە؟ ڕەحم دەڵێت: ئێوە شوێنی پەنا بردنە بەتۆ لەوانەی کە پەیوەندی خزمایەتی دەپچڕێنن. خوای گەورە فەرموی: ئایا ڕازی نابی کەهەرکەسێ تۆ بەسەر بکاتەوە منیش بەسەری بکەمەوە و هەرکەسیش پەیوەندی لەگەڵ تۆ دەپچڕێنێ منیش پەیوەندی لەگەڵ بپچڕێنم؟ ڕەحمیش دەڵێت: بەڵێ. خودا فەرموی ئەوەیش بۆ تۆ) ئەبو هورەیرە دەڵێت: ئەگەر حەزدەکەن ئەم ئایەتە بخوێنن: ﴿ فَهَلۡ عَسَيۡتُمۡ إِن تَوَلَّيۡتُمۡ أَن تُفۡسِدُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَتُقَطِّعُوٓاْ أَرۡحَامَكُمۡ ﴾[1] پاشان بوخاری ڕیوایەتی کردوە بەم وتەیە. کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (ئەگەر حەزتان کرد (مەیلتان لێ بوو) ئەم ئایەتە بخوێنن: ﴿ فَهَلۡ عَسَيۡتُمۡ إِن تَوَلَّيۡتُمۡ أَن تُفۡسِدُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَتُقَطِّعُوٓاْ أَرۡحَامَكُمۡ ﴾[2] موسلمیش ڕیوایەتی کردوە[3]. ئیمامی ئەحمد ڕیوایەتی کردوە لە ئەبو بەکرەتەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموی: (هیچ تاوانێ نیە ئەوەندەی زوو لە دنیا خودا تۆڵەی بۆ دابەزێنێ وە لە قیامەتیشدا تۆڵەی بۆ دانابێ وەك ستەم کاریو پچرانی پەیوەندی خزمایەتی)[4]. ئەبو داودو تیرمیزیو ئیبنو ماجە ڕیوایەتیان کردوە. تیرمیزی دەڵێت: ئەمە فەرمودەیەکی ڕاستە[5] ئیمامی ئەحمد ڕیوایەتی کردوە لە سەوبانەوە(ڕەزای خوای لێ بێ) ئەمیش لەپێغەمبەری خوداوە (ﷺ) کە

---

[1] فتح الباري (٤٤٣/٨).

[2] فتح الباري (٤٤٣/٨).

[3] مسلم (١٩٨٠/٤).

[4] احمد (٣٨/٥) فەرمودەیەکی سەحیحە.

[5] ابو داود (٢٠٨/٥) تحفة الاحوذي (٢١٣/٧)

ابن ماجة (١٤٠٨/٢) فەرمودەیەکی سەحیحە.

فەرموویەتی: (هەرکەسێ ئەمەن درێژی پێخۆشە لەگەڵ زیاد بونی ڕۆزیا با پەیوەندی خزمایەتی خۆی بەجێ بێنی). تەنها ئەحمد بەم شێوەیە هێناویەتی. شێوازی تری هەیە لەسەحیحەکاندا[1]. وەهەر ئیمامی ئەحمد ڕیوایەتی کردوە لە عبدالله ی کوڕی عەمرەوە(ڕەزای خوایان لێ بێ) دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (ڕەحم پەیوەستە بەعەرشەوە وە پەیوەندی خزمایەتی ئەوەنیەکە دوسەرەبێ (واتە هەردولا سەر لەیەکتر بدەن) بەڵکو ئەو کەسەیە کە وەختێ ئەو خزمایەتیەی پچڕا ئەو بەسەری دەکاتەوە وەنایبڕێ)[2]. بوخاریش ڕیوایەتی کردوە[3]. ئەحمد ڕیوایەتی کردوە لە عبدالله ی کوڕی عەمرەوە (ڕەزای خوایان لێ بێ) دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموی: (لە ڕۆژی قیامەتدا ڕەحم دادەنرێ سەرێکی چەماوەی هەیە وەك سەری تەشی بەزمانێکی سافو ڕەوان قسەدەکا، پەیوەندی دەپچڕێنێ لەگەڵ ئەوەی پەیوەندی لەگەڵ پچڕیوە. وە سەر دەدا لەوەی کە بەسەری کردوەتەوە).[4] وە ئیمامی ئەحمد ڕیوایەتی کردوە لە عبدالله ی کوڕی عەمرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ) کەبەو شێوەیە گەیشتۆتە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (ئەوانەی خاوەن بەزەین خودا خاوەن بەزەیی بەزەیی دێتەوە پێیاندا بەزەیتان بێتەوە بەخەڵکی سەر زەمینا خەڵکی ئاسمانیش بەزەیی دێتەوە بە ئێوەدا. ڕەحمیش پابەندە بەخودای ڕەحمانەوە هەرکەسێ بەسەری کردۆتەوە ئەویش بەسەری کردوەتەوە، هەر کەسیش پچڕیویەتی ئەویش پچڕیویەتی).[5] ئەبو داودو تیرمیزی ڕیوایەتیان کردووە. تیرمیزی دەڵێت: چاكو ڕاستە[6]، فەرمودە لەم بارەیەوە ئێجگار زۆرە.

**فەرمان دان بەتێ ڕامان (ورد بونەوە) لەقورئان**

﴿ أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ الْقُرْءَانَ أَمْ عَلَىٰ قُلُوبٍ أَقْفَالُهَا ﴿٢٤﴾ إِنَّ الَّذِينَ ارْتَدُّوا عَلَىٰ أَدْبَارِهِم مِّنۢ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ الْهُدَى ۙ الشَّيْطَانُ سَوَّلَ لَهُمْ وَأَمْلَىٰ لَهُمْ ﴿٢٥﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَالُوا لِلَّذِينَ كَرِهُوا مَا نَزَّلَ اللَّهُ سَنُطِيعُكُمْ فِي بَعْضِ الْأَمْرِ ۖ وَاللَّهُ يَعْلَمُ إِسْرَارَهُمْ ﴿٢٦﴾ فَكَيْفَ إِذَا تَوَفَّتْهُمُ الْمَلَائِكَةُ يَضْرِبُونَ وُجُوهَهُمْ وَأَدْبَارَهُمْ ﴿٢٧﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمُ اتَّبَعُوا مَا أَسْخَطَ اللَّهَ وَكَرِهُوا رِضْوَانَهُ فَأَحْبَطَ أَعْمَالَهُمْ ﴿٢٨﴾ ﴾

---

[1] احمد (٢٧٩/٥) فەرمودەیەکی سەحیحە.

[2] احمد (١٦٣/٢) فەرمودەیەکی سەحیحە.

[3] فتح الباري (٤٣٧/١٠).

[4] احمد (١٨٩/٢) فەرمودەیەکی سەحیحە.

[5] احمد (١٦٠/٢) فەرمودەیەکی سەحیحە.

[6] ابو داود (٢٣١/٥) تحفة الاحوذي (٥١/٦) فەرمودەیەکی سەحیحە.

خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ الْقُرْءَانَ أَمْ عَلَىٰ قُلُوبٍ أَقْفَالُهَآ ﴾ ئاخۆ ئەوان لەو قورئانە ڕانامێنن، یا دڵیان داخراوە. خودای مەزن فەرمان دەدا بە ڕامانو وردبونەوەو تێگەیشتن لە قورئانو داوا دەکات کە دوورنەکەوینەوە لێیو پشتی تێ نەکەی و ئەفەرموێت: ﴿ أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ الْقُرْءَانَ أَمْ عَلَىٰ قُلُوبٍ أَقْفَالُهَآ ﴾ واتە: بەڵکو دڵیان داخراوە و تەواو چەسپ بوە هیچی لێ وەر ناگرنولێی تێ ناگەن. ئیبنو جەریر ڕیوایەتی کردوە لە هیشامی کوڕی عوروەوە ئەویش لە باوکیەوە دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەم ئایەتەی خوێند: ﴿ أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ الْقُرْءَانَ أَمْ عَلَىٰ قُلُوبٍ أَقْفَالُهَآ ﴾ لاوێکی خەڵکی یەمەن دەڵێت: بەڵکو لەسەری داخراوە هەتا خوای گەورە دەرگای لێ دەکاتەوە یان دەروییەکی لێ دەکاتەوەو ڕزگاری دەبێ. بە بەردەوامی ئەو لاوە لەو تەمەنا هەتا ڕۆشتو نەما، پەنای پێدەبرد[1].

## باسی خراپی ئەو کەسانەی کە لەدین پاشگەز دەبنەوە

پاشان خودای مەزن فەرموویەتی: ﴿ إِنَّ الَّذِينَ ارْتَدُّوا عَلَىٰ أَدْبَارِهِم مِّن بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ الْهُدَى ۙ الشَّيْطَانُ سَوَّلَ لَهُمْ وَأَمْلَىٰ لَهُمْ ﴾ ئەو کەسانەی لە پاشی دین شارەزا بوونو وەرگەڕان، دیارە شەیتان دنەی داونو کارەکانی بۆ خەملاندوون). ﴿ إِنَّ الَّذِينَ ارْتَدُّوا عَلَىٰ أَدْبَارِهِم ﴾ واتە: ئەوانەی پاشگەز بونەوە لە ئاینوگەڕانەوە بۆ خوانەناسی. ﴿مِّن بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ الْهُدَى ۙ الشَّيْطَانُ سَوَّلَ لَهُمْ﴾ واتە: لە دوای ئەوەی کە شارەزابوون شەیتان ئەوەی بۆ جوان کردنوڕازانیەوە. ﴿وَأَمْلَىٰ لَهُمْ﴾ خەڵەتاندنی و بای هەوای کردن. ﴿ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَالُوا لِلَّذِينَ كَرِهُوا مَا نَزَّلَ اللَّهُ سَنُطِيعُكُمْ فِي بَعْضِ الْأَمْرِ ۖ وَاللَّهُ يَعْلَمُ إِسْرَارَهُمْ﴾ چونکە ئەوانە بەو کەسانەی کە حەزیان لەو شتە نیە کەخوا ناردوویەتە خوارێ. وتوویانە: ئێمە لەهەندێ کاردا بەقسەو دەکەین، خودایش لەوەی دەیشارنەوە ئاگادارە. واتە: ئەوانە بەپەنهانی دڵیان لای ئەو کەسانە بە کە حەزیان لە شوێن کەوتنی قورئان نەبو. مەبەست دو ڕوەکانە کە ئەوەی دەری دەخەن پێچەوانەی ناو دڵیانە. بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَاللَّهُ يَعْلَمُ إِسْرَارَهُمْ﴾ واتە: لەوەی دەیشارنەوە و دەری ناخەن خوای گەورە ئاگادارەو پێی دەزانێ وەك ئەفەرموێت: ﴿وَاللَّهُ يَكْتُبُ مَا يُبَيِّتُونَ﴾[2] واتە: وە خوا دەینوسێت ئەو پیلانانەی شەو کردویانە. پاشان خودای مەزن فەرموویەتی: ﴿ فَكَيْفَ إِذَا تَوَفَّتْهُمُ الْمَلَائِكَةُ يَضْرِبُونَ وُجُوهَهُمْ وَأَدْبَارَهُمْ ﴾ دەبێ چۆن بن ئەو

---

[1] الطبري (٢٢/١٨٠).

[2] النساء (٨١).

سەردەمەی فریشتە گیانیان دەکێشێ و لەڕوخسارو پشتەوەیان دەسرەوێنێ؟ دەکێشن زۆر بەناڕەحەتی گیانیان لەجەستەیان وەدەردێننوزۆر بەڕقو توڕەییەوە دەکێشن بە پشتو دەم و چاویانا. وەك خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذْ يَتَوَفَّى ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةُ يَضْرِبُونَ وُجُوهَهُمْ وَأَدْبَـٰرَهُمْ﴾[1] واتە: وە ئەگەر دەتبینی کاتێ فریشتەکان بە بێباوەڕاندا دەکێشن لەدەم و چاوو پاشیان دەدەن. وە فەرموویەتی: ﴿وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذِ ٱلظَّـٰلِمُونَ فِى غَمَرَٰتِ ٱلْمَوْتِ وَٱلْمَلَـٰٓئِكَةُ بَاسِطُوٓا۟ أَيْدِيهِمْ﴾[2] واتە: خۆزگە ستەمکارانت دەبینی کاتێ وان لە ناڕەحەتی و سەختی سەرەمەرگدا و فریشتەکان دەستیان بۆ درێژ دەکەن و پێیان دەڵێن خۆتان دەرباز کەن لەم ناڕەحەتی گیان کێشانە ئەمڕۆ پاداشتی ڕیسواکەر دەدرێتەوە بەهۆی ئەوەی کە قسەی ناڕاستتان هەڵەبەست بەدەم خواوەو خۆتان بەگەورە دەزانی لە بەرانبەر ئایەتەکانی خوادا. بۆیە لێرەدا خودای مەزن فەرموویەتی: ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمُ ٱتَّبَعُوا۟ مَآ أَسْخَطَ ٱللَّهَ وَكَرِهُوا۟ رِضْوَٰنَهُۥ فَأَحْبَطَ أَعْمَـٰلَهُمْ﴾ چونکە ئەوان وە شوێن شتێکی واکەوتوون کە خودای توڕە کردوەو بەڕەزای ئەو ڕازی نەبوون: ئەوسا ئەویش کارەکانی لێ پوچ کردون.

**ئەوەی دووڕووەکان دەیشارنەوە خودا ئاشکرای دەکات**

﴿أَمْ حَسِبَ ٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ أَن لَّن يُخْرِجَ ٱللَّهُ أَضْغَـٰنَهُمْ ﴿٢٩﴾ وَلَوْ نَشَآءُ لَأَرَيْنَـٰكَهُمْ فَلَعَرَفْتَهُم بِسِيمَـٰهُمْ ۚ وَلَتَعْرِفَنَّهُمْ فِى لَحْنِ ٱلْقَوْلِ ۚ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ أَعْمَـٰلَكُمْ ﴿٣٠﴾ وَلَنَبْلُوَنَّكُمْ حَتَّىٰ نَعْلَمَ ٱلْمُجَـٰهِدِينَ مِنكُمْ وَٱلصَّـٰبِرِينَ وَنَبْلُوَا۟ أَخْبَارَكُمْ ﴿٣١﴾﴾

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿أَمْ حَسِبَ ٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ أَن لَّن يُخْرِجَ ٱللَّهُ أَضْغَـٰنَهُمْ﴾ ئاخۆ ئەوانەی غەرەزیان لە دڵدایە،لایان وایە خودا ڕکو کینەکەیان ئاشکرا ناکات؟ واتە: دووڕووەکان وا دەزانن کە ئەو دەغەزەی کە لەدڵیاندایە ئاشکرای ناکات بۆ موسوڵمانان. نەخێر وانیە بەڵکو خوای مەزن ئەو کارەیان دەردەخاو ڕونی دەکاتەوە بۆ خەڵکی هەتا ئەو کەسانەی شارەزاو خاوەنی دەرونی پاکن ئاگایان لێیان بێ و بیانناسن. خوای گەورە سوڕەتی (التوبة)ی ڕەوانە کردوە لەو بارەیەوە هەرچی کارە ناشیرینەکانیان هەیە بەجوانی ڕونی کردوەتەوە. وە ئەو شتانەی کەپێی هەڵدەسن کە نیشانەیە لەسەر ئەو دوو ڕوییەیان. هەر لەبەر ئەوەیە ناو دەبرێ بە(الفاضحة) واتە: ئابڕو بەر

[1] الانفال (٥٠).

[2] الانعام (٩٣).

(الـضغان) جمعـی (ضـغن) ئـەوەی کەلـە دڵدایـە لەکینـەو ئیرەیـی و بـەغیلی بـردن بەئیـسلام و موسـوڵمانانوئەوانەی کـە یارمـەتی دەرو پـشتیوانی ئیـسلامن. خـوای گـەورە ئەفـەرموێت: ﴿وَلَوۡ نَشَآءُ لَأَرَيۡنَٰكَهُمۡ فَلَعَرَفۡتَهُم بِسِيمَٰهُمۡۚ وَلَتَعۡرِفَنَّهُمۡ فِي لَحۡنِ ٱلۡقَوۡلِۚ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ أَعۡمَٰلَكُمۡ﴾ ئەگـەر حـەزمان بکردایـە، دەمانهێنانـە بەرچاوتو ئـیتر هـەر بەوردبوونـەوە لـە بیـچمیان، بـاش دەتناسـین، بێگومـان بەڕاوێـژی ئاخـافتنیش دەیانناسـی، خـواش هـەموو کارەکانتـانی ئاگـا لێیـە. خـودای مـەزن ئەفـەرموێت: ئەگـەر مەیلمان لێبێ ئەی محمد (ﷺ) ئەو کەسانەمان دەخستە بەرچاوتو هەر بەسـەیر کردنیـان دەتناسـین، بەڵام خودای گەورە ئەوە ناکات لەناو هەموو دووڕووەکاندا بۆیان دادەپۆشێ لەلایـەن خۆیـەوە هـەتا کـار بەوەبکرێت کە دیارو ئاشکرایە و گەڕانەوەی شاراوەکانیش بۆ ڕۆژی خۆی کە قیامەتە. ﴿وَلَتَعۡرِفَنَّهُمۡ فِي لَحۡنِ ٱلۡقَوۡلِ﴾ واتـە: لـەو قـسەو باسـانەی کـە دەیکـەن مەبەسـتیان دەردەکـەوێ کەلەچـی حیـزبێکن (کۆمەڵێکن) دەیانناسی. پێشەوای موسوڵمانان عوسمانی کوڕی عـەفان (ڕەزای خـوای لێ بـێ) دەڵێت: هیچ کەسێ نیە کەشتێك داپۆشـێ و بیـشارێتەوە مـەگین خـودا ئاشـکرای دەکـا لـە نێوچاوانو لەسـەر زمانیـدا دەردەکـەوێ و دەردەچـێ. خـودای گـەورە ئەفـەرموێت: ﴿وَلَنَبۡلُوَنَّكُمۡ حَتَّىٰ نَعۡلَمَ ٱلۡمُجَٰهِدِينَ مِنكُمۡ وَٱلصَّٰبِرِينَ وَنَبۡلُوَاْ أَخۡبَارَكُمۡ﴾ وە تاقیتان دەکەینەوە تا بزانین، کێ لە ئێوە تێکۆشاوەو کێتان خۆ ڕاگـر تـر بوە بەراوردی دەنگ و باسی ئێوەش دەکەین. ﴿وَلَنَبۡلُوَنَّكُمۡ﴾ واتە: تاقیتان دەکەینەوە بەوشتانەی کە فـەرمانمان داوە بیکەنوبەوانـەیش کـە گوتومانـە وازی لێ بهێـنن. ﴿حَتَّىٰ نَعۡلَمَ ٱلۡمُجَٰهِدِينَ مِنكُمۡ وَٱلصَّٰبِرِينَ وَنَبۡلُوَاْ أَخۡبَارَكُمۡ﴾ هیچ گومانێك نیە لە ئاگادار بوونی خودای مەزن لەپێش بونی ئـەو شـتانە کـەبوون یـان دەبن لەمەو دوا، مەبەست پێی واتە هەتا ڕودانەکەی بزانینولەبەر ئەمەیە ئیبنـو عـەباس (ڕەزای خـوای لێ بێ) لە نمونەی ئەمانەدا ئەڵێ: (الا نعلم) واتە: تا ببینین.

**پوچەڵ کردنەوەی کاری خوانەناسان وفەرماندان بە ڕۆشتن بە دوایاندا**

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَصَدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَشَآقُّواْ ٱلرَّسُولَ مِنۢ بَعۡدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ ٱلۡهُدَىٰ لَن يَضُرُّواْ ٱللَّهَ شَيۡـٔٗا وَسَيُحۡبِطُ أَعۡمَٰلَهُمۡ ﴿٣٢﴾ ۞ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَلَا تُبۡطِلُوٓاْ أَعۡمَٰلَكُمۡ ﴿٣٣﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَصَدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ثُمَّ مَاتُواْ وَهُمۡ كُفَّارٞ فَلَن يَغۡفِرَ ٱللَّهُ لَهُمۡ ﴿٣٤﴾ فَلَا تَهِنُواْ وَتَدۡعُوٓاْ إِلَى ٱلسَّلۡمِ وَأَنتُمُ ٱلۡأَعۡلَوۡنَ وَٱللَّهُ مَعَكُمۡ وَلَن يَتِرَكُمۡ أَعۡمَٰلَكُمۡ ﴿٣٥﴾﴾

خـــوای گـــەورە ئەفــــەرموێت: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَصَدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَشَآقُّواْ ٱلرَّسُولَ مِنۢ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ ٱلْهُدَىٰ لَن يَضُرُّواْ ٱللَّهَ شَيْـًٔا وَسَيُحْبِطُ أَعْمَـٰلَهُمْ ﴾ ئەوانـەی خوانـەناس بوون‌وبوونـە لەمپـەر لـەڕای خـوداو لەدوای ئەوە زانیووشیانە ڕێگەی ڕزگـار بـوون کامەیـە. هـەر دژی پێغەمبـەر وەسـتان، هـەرگیز ئەوانـە نـاتوانن زیـان بـەخوا بگەیەنن‌وبـەم زوانـە کارەکانیـان پوچـەڵ دەکـات. خـوای گـەورە هـەواڵی ئـەو کەسانەمان دەداتێ کە خوانەناس بون‌وبونـە ڕێگـر لـەڕێی خـواو دژایـەتی پێغەمبـەریان (ﷺ) دەکـردو پاشگەز بونەوە لە ئاین دوای ئەوەی کە ڕێگـای خودایـان بـۆ دەرکـەوت‌و زانیـان کامەیـە. ئەوانـە هـیچ زیانێك بە خوا ناگەیەنن بەڵکو زەرەر لەخۆیان دەدەن‌وخۆیان ڕەنجەڕۆ دەبن لە ڕۆژی قیامـەت‌و زینـدو بونەوە. وە بەم نزیکانە هەموو کارەکانیان بەتاڵ دەبێتەوە. وەهیچ پاداشتێ لەسەر ئەو کارانەی کەلـە پێشەوە کردویانە لەپاش ئەو پاشگەز بونەوەیە وەرناگرن بەئەندازەی مسقالە زەڕەیـە بـەڵکو هـەمووی پوچەڵ و بەتاڵ دەکاتەوە بەتەواوی لەناوی دەبا وەك چۆن چاکەکان خراپەکان لادەبـاو دەیسرێتەوە. ئیمام محمدی کوڕی نەسری مەرزەوی لەکتێبی (الصلاة)دا لە ئەبو عالیەوە ڕیوایـەتی کـردووە دەڵێـت: هاوەڵەکانی پێغەمبەر(ﷺ) وایان دەزانـی کـە گونـاه زواتـە نیـە پـاش وتـەی (لا الـه الا الله) وەك چـۆن لەگەڵ بتپەرستا هیچ شتێ سودی نیە. ئەم ئایەتە هاتـە خـوارەوە: ﴿أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَلَا تُبْطِلُوٓاْ أَعْمَـٰلَكُمْ﴾ پاشان دەترسان کە گوناه کارەکانیان پوچەڵ بکاتەوە.[1] هـەروەها ڕیوایـەت کـراوە لـەئیبنو عومەرەوە (ڕەزای خوایـان لێ بـێ) دەڵێـت: ئێمـە هـاوەڵانی پێغەمبـەر(ﷺ) وامـان دەزانـی کەهەرچـی کردەوەی چاکە هەیە هـەمووی وەرگـیراوە لـەلای خـودا هـەتا ئـەم ئایەتـە هاتـەخوارەوە: ﴿أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَلَا تُبْطِلُوٓاْ أَعْمَـٰلَكُمْ﴾ گوتمان ئەو شتانە چین کە کارەکانمان پوچـەڵ دەکاتـەوە؟ گوتمـان: تاوانە گەورەکان‌و بەدڕەوشتی هەتا ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِۦ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُ ﴾[2] واتە: بەڕاستی خوا خۆش نابێت گەر هاوبەشی بۆ دابنرێ بێجگە لـەوە خـۆش ئـەبێت لەهەر گوناهێکی تر بۆ هەر کەسێك کە بیەوێت.وەختێ ئەم ئایەتـە هاتـە خـوارەوە وازمـان لـەو قـسانە هێناو دەترساین لەو کەسانەی کە تووشی تاوانە گەورەکان‌و بەدڕەوشتی دەبـوو وە داوامـان وابـوو کـە ئەوانەی تووشی تاوانە گەورەکان نەبووە کارەکانی لێ وەر گیرابێ.[3] خوای گەورە ئەفـەرموێت: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا

---

[1] الصلاة للمرزوي (٢/٦٤٥).

[2] النساء (٤٨).

[3] الصلاة للمرزوي (٢/٦٤٦).

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ اللَّهَ وَأَطِيعُواْ الرَّسُولَ وَلَا تُبْطِلُوٓاْ أَعْمَٰلَكُمْ﴾ ئەی گەلی خاوەنباوەڕان لە فەرمانی خوداو پێغەمبەر(ﷺ) دەرمەچنو کارتان پوچەڵ مەکەنەوە. پاشان خودای گەورە فەرمان دەدا بە بەندە خاوەنباوەڕەکانی کە گوێ ڕایەڵی فەرمانی خوداو پێغەمبەر بن (ﷺ) کە دەبێتە هۆی خۆشبەختی بۆیان لە دنیاو قیامەتدا وە داوای لێ کردون کە پاشگەز نەبنەوە کە دەبێتە هۆی پوچەڵ کردنەوەی کارەکانیان بۆیە خوای مەزن فەرموویەتی: ﴿وَلَا تُبْطِلُوٓاْ أَعْمَٰلَكُمْ﴾ واتە: بەپاشگەز بونەوە. بۆیە دوای ئەمە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُواْ وَصَدُّواْ عَن سَبِيلِ اللَّهِ ثُمَّ مَاتُواْ وَهُمْ كُفَّارٌ فَلَن يَغْفِرَ اللَّهُ لَهُمْ﴾ ئەوانەی کەلە دین لایانداو بوونە لەمپەر لەڕێی خوداو دوایی بە بێدینی مردن. هەرگیز خوا لێیان خۆش نابێ. ئەم ئایەتە وەك ئەم ئایەتە وایە: ﴿إِنَّ اللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِۦ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُ﴾[1] واتە: بەڕاستی خوا خۆش نابێت گەر هاوبەشی بۆ دابنرێ بێجگە لەوە خۆش ئەبێت لەهەر گوناهێکی تر بۆ هەرکەسێك کەبیەوێت. پاشان خودای مەزن بەبەندە خاوەن باوەڕەکانی دەفەرمووێت: ﴿فَلَا تَهِنُواْ وَتَدْعُوٓاْ إِلَى السَّلْمِ وَأَنتُمُ الْأَعْلَوْنَ وَاللَّهُ مَعَكُمْ وَلَن يَتِرَكُمْ أَعْمَٰلَكُمْ﴾ سست مەبنەوە داوای شەڕ وەستانێ مەکەن، هەر ئێوە بەسەر ئەواندان، ئێوە خوتان لەگەڵەو هەرگیز پاداشی خەیانەتەکەتان لێ کەم ناکاتەوە. ﴿فَلَا تَهِنُواْ﴾ واتە: سارد مەبنەوە لە بەرەنگاربونەوەی دوژمن. ﴿وَتَدْعُوٓاْ إِلَى السَّلْمِ﴾ داوای ئاشتی و شەڕ وەستان بکەن چەکەکانتان دانێنو بەرانبەر خوانەناسان وەختێ ئێوە بەهێزبوونو زۆر بوونو چەکی باشتان هەبوو. بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَلَا تَهِنُواْ وَتَدْعُوٓاْ إِلَى السَّلْمِ وَأَنتُمُ الْأَعْلَوْنَ﴾ واتە: کاتێ ئێوە سەرکەتو زاڵ بون بەسەر دوژمنەکانتاندا. بەڵام ئەگەر خوانەناسان بەهێزو زۆر تر بون لەکۆمەڵی موسوڵمانان ئەو کاتە ئاشتی دروستە. پێشەوای موسوڵمانان بۆی هەیە ئاشتی بکاو شەڕ بوەستێنن ئەگەر بەباشی زانی. وەك پێغەمبەری خودا(ﷺ) کاتێ خونەناسانی قوڕەیشی ڕێیان لێ گرت کەبچنە ناو مەککە داوای ئاشتیان لێ کرد و شەڕ بوەستێنرێ لەنێوانیاندا تا دە ساڵ پێغەمبەر(ﷺ) داواکەی قەبوڵ کردن. وە ئەفەرموێت: ﴿وَاللَّهُ مَعَكُمْ﴾ خودا لەگەڵ ێوەیە ئەمە مژدەیەکی زۆر گەورەبو لەسەر سەرکەوتنوزاڵ بونیان بەسەر دوژمنت. ﴿وَلَن يَتِرَكُمْ أَعْمَٰلَكُمْ﴾ واتە: کارەکانتان پوچەڵ و بەتاڵ ناکاتەوە و کەمیشی ناکاتەوە بەڵکو پاداشی ئەو چاکانەتان دەداتەوە هیچی لەناو ناچێ نافەوتێ و بۆتان هەڵدەگرێ. والله اعلم.

---

[1] النساء (٤٨).

﴿إِنَّمَا ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا لَعِبٌ وَلَهْوٌ ۚ وَإِن تُؤْمِنُوا۟ وَتَتَّقُوا۟ يُؤْتِكُمْ أُجُورَكُمْ وَلَا يَسْـَٔلْكُمْ أَمْوَٰلَكُمْ ﴿٣٦﴾ إِن يَسْـَٔلْكُمُوهَا فَيُحْفِكُمْ تَبْخَلُوا۟ وَيُخْرِجْ أَضْغَٰنَكُمْ ﴿٣٧﴾ هَٰٓأَنتُمْ هَٰٓؤُلَآءِ تُدْعَوْنَ لِتُنفِقُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ فَمِنكُم مَّن يَبْخَلُ ۖ وَمَن يَبْخَلْ فَإِنَّمَا يَبْخَلُ عَن نَّفْسِهِۦ ۚ وَٱللَّهُ ٱلْغَنِىُّ وَأَنتُمُ ٱلْفُقَرَآءُ ۚ وَإِن تَتَوَلَّوْا۟ يَسْتَبْدِلْ قَوْمًا غَيْرَكُمْ ثُمَّ لَا يَكُونُوٓا۟ أَمْثَٰلَكُم ﴿٣٨﴾﴾

**باسی سوکی و بێ نرخی دنیاو هەڵنان بۆ ماڵ بەخشین**

خودای مەزن باسی بێ نرخی و سوکی و بێبایەخی دنیا دەکات‌و ئەفەرموێت: ﴿إِنَّمَا ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا لَعِبٌ وَلَهْوٌ ۚ وَإِن تُؤْمِنُوا۟ وَتَتَّقُوا۟ يُؤْتِكُمْ أُجُورَكُمْ وَلَا يَسْـَٔلْكُمْ أَمْوَٰلَكُمْ﴾ هەرچی ژیانی دنیایە، هەموو هەر گاڵتەوگەپێکە. ئەگەر ئێوە برواتان هەبێ و خۆپارێزبن، پاداشی خۆتان دەداتێ و هیچ ماڵیشتان لێ ناخوازێ. ﴿إِنَّمَا ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا لَعِبٌ وَلَهْوٌ﴾ ئەنجامی ژیانی دنیا گەمەو گاڵتە نەبێ هیچی تر نیە جگە ئەوەی کە تەنها بۆ خودا بوبێ‌و لەبەر ڕەزامەندی ئەو کرابێ. بۆیە خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَإِن تُؤْمِنُوا۟ وَتَتَّقُوا۟ يُؤْتِكُمْ أُجُورَكُمْ وَلَا يَسْـَٔلْكُمْ أَمْوَٰلَكُمْ﴾ واتە: خوای گەورە بێ نیازە لەئێوەو داوای هیچ شتێکتان لێ ناکات بەڵکو زەکات‌و سەدەقەی لەسەر ماڵ و سامانتان داناوەو فەرزی کردوە بۆ یارمەتی دانی برا هەژارەکانتان قازانج و پاداشتەکەی هەر بۆ خۆتانە. پاشان خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِن يَسْـَٔلْكُمُوهَا فَيُحْفِكُمْ تَبْخَلُوا۟ وَيُخْرِجْ أَضْغَٰنَكُمْ﴾ هەرچەندە زۆر بەقیرسیچمەیش(بەپێ داگرتنەوە) داوای ماڵێکتان لێ بکات، ڕژدی دەکەن‌و قین‌و ڕق دەردەخات. واتە: ئەگەر زۆریشتان لێ بکرێت ڕژدی دەکەن. ﴿وَيُخْرِجْ أَضْغَٰنَكُمْ﴾ قەتادە دەڵێت: خودای گەورە زانیویەتی کە لە دەرکردنی ماڵ و ساماندا زۆر پێتان گرانە[1] قەتادە ڕاستی گوتوە ماڵ زۆر خۆشەویستە خەرج ناکرێ لە شتێکدا نەبێ لەو ماڵە خۆشەویست تربێ ئینجا ئەو کەسە سەرفی دەکات. خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿هَٰٓأَنتُمْ هَٰٓؤُلَآءِ تُدْعَوْنَ لِتُنفِقُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ فَمِنكُم مَّن يَبْخَلُ ۖ وَمَن يَبْخَلْ فَإِنَّمَا يَبْخَلُ عَن نَّفْسِهِۦ ۚ وَٱللَّهُ ٱلْغَنِىُّ وَأَنتُمُ ٱلْفُقَرَآءُ ۚ وَإِن تَتَوَلَّوْا۟ يَسْتَبْدِلْ قَوْمًا غَيْرَكُمْ ثُمَّ لَا يَكُونُوٓا۟ أَمْثَٰلَكُم﴾ با هەمووتان ئاگاداربن. بانگتان دەکەن کە ماڵ لە ڕای خوا بەخت کەن. واشتان لەناودا هەیە ڕژدی دەکات، هەر کەسێکیش ڕژدی دەکات، ڕژدی دەربارەی خۆی دەکات، خوا لە گشت کەس بێ نیازە، ئێوە هەژارو بەستەزمان‌و

[1] عبدالرزاق (٣/٢٢٤).

بێچارەن ئەگەر پشتیشی تێ بکەن، چینێکی تر بەئێوە دەگۆڕێتەوە، کەهەگیز وەك ئێوە نابن. واتە: کەس واتان لەناودایە کە ڕژدی دەکاو وەلامی ئەو بانگە ناداتەوە. ﴿وَمَن يَبْخَلْ فَإِنَّمَا يَبْخَلُ عَن نَّفْسِهِۦ﴾ واتە: هەرکەسێ ڕژدی بکات ئەوە ئەو کەسە زیانی لە خۆی داوە لەپاداشتی خۆی کەم کردوەتەوە. ﴿وَٱللَّهُ ٱلْغَنِىُّ﴾ خودا بێ نیازە لە هەموو شتێ و ئێوەو هەموو شتێکی تر هەژارن وهەموو کاتێ پێویستیتان بە خودا هەیە. بۆیە خوای مەزن فەرموویەتی: ﴿وَأَنتُمُ ٱلْفُقَرَآءُ﴾ بەتایبەتی ئێوە زۆر پێویستیتان بەخودای گەورە هەیە. باسی خۆی کردووە بەبێ نیاز. ﴿ٱلْغَنِىُّ﴾ کە ئەم وەسفە تایبەتە بەخۆیەوە. وە باسی دروست کراوەکانی کردوە کە هەژارن کە ئەمیش وەسفێکە تایبەتە بە دروست کراوەکانیەوە کە هەرگیز بێ نیاز نابن هەمیشە پێویستیان بەخودا دەبێ. وە ئەفەرموێت: ﴿وَإِن تَتَوَلَّوْا﴾ واتە: ئەگەر پشتیان هەڵ کرد خواپەرستی و شوێنی شەریعەتەکەی نەکەوتن. ﴿يَسْتَبْدِلْ قَوْمًا غَيْرَكُمْ ثُمَّ لَا يَكُونُوٓا۟ أَمْثَٰلَكُم﴾ واتە: گەلێکی تر دێنێ لەجێی ئێوە دایدەنێ کە ئەوان وەك ئێوە نابن بەڵکو گەلێکی گوێ ڕایەڵ و فەرمانەکانی خودا بەجێ دێننولەڕێ لانادەن.

## تەفسیری سورەتی (الفتح)

## لەمەدینەدا هاتوەتەخوارەوە

### ڕێزی سورەتی فتح

ئیمامی ئەحمد ڕیوایەتی کردوە لەعبدالله ی کوڕی مەغفەلەوە دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) سورەتی فەتحی ئەخوێند لەساڵی ئازاد کردنی مەککەدا لەکاتی ڕۆشتنیدا بەسەر ولأغەکەیەوە دووبارەی دەکردەوە مەعاویە دەڵێت: لەبەر ئەوە نەبوایەکە پێم ناخۆشە خەڵکی لێمان کۆببێتەوە. پێغەمبەری خودا(ﷺ) چۆن دەیخوێند بۆم دەخوێندن[1]، بوخاری و موسلمیش لەفەرمودەکەی شوعەیبەوە بەو شێوەیە ڕیوایەتیان کردوە[2].

### هۆی هاتنە خوارەوەی سورەتی فەتح

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿إِنَّا فَتَحْنَا لَكَ فَتْحًا مُّبِينًا ﴿١﴾ لِّيَغْفِرَ لَكَ ٱللَّهُ مَا تَقَدَّمَ مِن ذَنۢبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ وَيُتِمَّ نِعْمَتَهُۥ عَلَيْكَ وَيَهْدِيَكَ صِرَٰطًا مُّسْتَقِيمًا ﴿٢﴾ وَيَنصُرَكَ ٱللَّهُ نَصْرًا عَزِيزًا ﴿٣﴾﴾

---

[1] احمد (٥٤/١) فەرمودەیەکی سەحیحە.

[2] فتح الباري (٤٤٧/٨) مسلم (٥٤٧/١).

ئەم سورەتە هاتە خوارەوە کاتێ کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە حودەیبیە گەڕایەوە لەمانگی زیلقعدەی ساڵی شەشی کۆچی وەختێ بت پەرستەکان ڕێیان لێ گرت کە بڕواتە مەککە (مسجد الحرام) بۆ ئەوەی عەمرەی تێدا بکات. نەیان هێشتو پاشان ڕازی بون بەئاشتی و شەڕ وەستان. بەو مەرجەی ئەم ساڵ بگەڕێتەوە و ساڵی دوایی بێتەوە. پێغەمبەر(ﷺ) داواکەی قەبوڵ کردن هەرچەندە هەندێ لەهاوەڵەکانی زۆر دڵ گران بون بەو ڕێکەوتن نامەیە لەوانە عومەری کوڕی خەتاب (ڕەزای خوای لێ بێ) کەبەم زوانە بەدرێژی لەشوێنی خۆیدا باسی دەکەین لەتەفسیری ئەم سورەتەدا، انشاء الله وتعالى. وەختێ کە هەدیەکەی سەر بڕی لەو شوێنەی کەڕێی لێ گیراو گەڕایەوە خوای گەورە ئەم ئایەتەی ڕەوانە کرد لەبارەی ئەوەی کە ڕویدا لەنێوان پێغەمبەرو (ﷺ) ئەوانەدا. وە خوای گەورە ئەو ئاشتیەی گەڕان بەسەرکەوتن چونکە بەرژەوەندی و خێری زۆری بە دوایدا هێنا. وەك ڕیوایەت کراوە لە ئیبنو مەسعودو کەسانی تریشەوە کە گوتویانە: ئێوە فەتحی مەککە بەسەرکەوتن دادەنێن بەڵام ئێمە پەیمان نامەی ئاشتی حودەیبیە بەسەرکەوتن دەزانین، لەجابیرەوە ڕیوایەت کراوە دەڵێت: ئێمە ئەو سەرکەوتنەمان تەنها بەڕۆژی حودەیبیە دانابوو.[1] بوخاری ڕیوایەتی کردوە لە بەرائەوە ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێت: ئێوە سەرکەوتنی مەککە بەسەرکەوتن دادەنێن کە گوایە فەتحی مەککە سەرکەوتنی بوە. ئێمەیش ئەو سەرکەوتنە بە بەیعەتو ڕزوانو ڕۆژی حودەیبیە دادەنێن ئێمە لەگەڵ پێغەمبەر بووین (ﷺ) کە چوارسەد کەسی بووین حودەیبیە بیرێك بوو هەموو ئاوەکەیمان تەواو کرد دڵۆپەیەکمان تێدا نەهێشت. ئەو هەواڵە گەیشتە پێغەمبەری خودا(ﷺ) هات بۆ لامانو لە کەناری چاوانەکەدا دانیشتو پاشان داوای ئاوی کرد لە دەفرێکدا و دەست نوێژی پێ گرتو ڕایدا بەدەمیداو دوعای کرد و پاشان ڕژاندیە ناو بیرەکە جێمان هێشتو لێی دوورکەوتینەوە. پاشان چەندێ ئاومان بۆ خۆمانو ولاغەکانمان پێویست بوو تێی هات بۆمان[2]. ئیمامی ئەحمد ڕیوایەتی کردوە لە عومەری کوڕی خەتابەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێت: لەسەفەرێکا لەخزمەت پێغەمبەردا بووین (ﷺ) دەڵێت: سێ جار پرسیارم لێ کرد لەشتێکی پێغەمبەر(ﷺ) وڵامی نەدامەوە. دەڵێت: لەدڵی خۆمدا گوتم: لەبارەی دایکت چی ئەی کوڕی خەتاب. وازت نەهێناو سێ جار داوات کرد لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) هەر وڵامی نەدایتەوە؟ دەڵێت: سواری ولاغەکەم بوم ڕۆیشتم و دەرکەوتمەوە و پێشی کەوتم لەترس ئەوەی نەوەك شتێك لەسەرم بێتە خوارەوە. دەڵێت: کاتێکم زانی یەکێك بانگی کردو دەڵێت: ئەی عومەر گەڕامەوە وام زانی قورئان لەبارەی منەوە دابەزیوە. دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموی: (دوێنێ سورەتێك هاتە خوارەوە بۆم کە

---

[1] الطبري (٢٠١/٢٢).

[2] فتح الباري (٥٠٥/٧).

خۆشەویست تره لام لەدنیاو لەوەی لەدنیادا هەیە ﴿إِنَّا فَتَحۡنَا لَكَ فَتۡحٗا مُّبِينٗا ① لِّيَغۡفِرَ لَكَ ٱللَّهُ مَا تَقَدَّمَ مِن ذَنۢبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ﴾.[1] بوخاری و تیرمیزی و نەسائیش ڕیوایەتیان کردوە لەچەند ڕێگاوە لە مەلکەوە.[2] (خوای لێ ڕازی بێ) عەلی کوڕی مەدینی ووتی ئەم ئیسنادێکی مەدینیەو زۆر چاکەو لەمانەوە نەبێ نەمان دیوە. ئیمامی ئەحمد ڕیوایەت کردوە لەئەنەسی کوڕی مالکەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێت: ﴿لِّيَغۡفِرَ لَكَ ٱللَّهُ مَا تَقَدَّمَ مِن ذَنۢبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ﴾ هاتە خوارەوە بۆ پێغەمبەر لەکاتی گەڕانەوەیا لە حودەیبیە. پێغەمبەر(ﷺ) فەرموی: (ئەم شەو ئایەتێك هاتە خوارەوە بۆم لام خۆشەویست ترە لەوەی لەسەر زەمینایە). پاشان پێغەمبەر(ﷺ) خوێندیەوە بەسەریانا. ئەوانیش گوتیان: پیرۆزو عافیێتت بێ ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) خوای گەورە بۆی ڕون کردیتەوە کەچیت لەگەڵ دەکا ئەی چی بەئێمە دەکا؟ ئەم ئایەتەیشی بۆ هاتە خوارەوە: ﴿لِّيُدۡخِلَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا وَيُكَفِّرَ عَنۡهُمۡ سَيِّـَٔاتِهِمۡۚ وَكَانَ ذَٰلِكَ عِندَ ٱللَّهِ فَوۡزًا عَظِيمٗا﴾[3] واتە: تا پیاوان وئافرەتانی باوەڕدار بباتە بەهەشتانێك کە ڕووبارەکان بەژێریاندا دەڕوات بەهەمیشەیی تیایدا دەمێننەوە وەتا لەگوناهەکانیان خۆش ببێتو ئەم بەڵێنەلای خوا سەرکەوتنێکی گەورەیە[4]. بوخاری و موسلمیش ڕیوایەتیان کردوە[5]. وە ئیمامی ئەحمدیش ڕیوایەتی کردوە لە موغەیرەی کوڕی شوعبەوە دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) نوێژی دەکرد هەتا هەردو پێی هەڵ ئاوسا. پێیان گوت: ئایا خوای گەورە لەگوناهی پاشو پێشت خۆش نەبوە؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرموی: (ئایا من بەندەیەکی سوپاس گوزار نەبم؟)[6] بوخاری و مسلم و زانایانی فەرموودە هەمویان ڕیوایەتیان کردوە بێجگە لە ئەبو داود[7]. خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿إِنَّا فَتَحۡنَا لَكَ فَتۡحٗا مُّبِينٗا﴾ ئێمەین کە وەسەرمان خست، بەو سەرخستنە بەرچاوە . واتە: سەرکەوتنێکی دیارو ئاشکرا مەبەست پێی ئاشتی حودەیبیە یە کەخێرو بێرێکی زۆری وەدی هێناو خەڵکی ترسیان نەماو لەگەڵ یەکتری کۆ دەبونەوەو موسوڵمان قسەی بۆ خوانەناس دەکردو زانیاری بەسودو خواناسی بڵاو

---

[1] احمد (٣١/١) فەرمودەیەکی سەحیحە.

[2] فتح الباري (٦٧٥/٨) وتحفة الاحوذي (٤٧/٩) النسائي فی الکبری (٤٦١/٦).

[3] الفتح (٥).

[4] احمد (١٩٧/٣) فەرمودەیەکی سەحیحە.

[5] فتح الباري (٥١٦/٧) مسلم (١٤١٣/٣).

[6] احمد (٥٥/٤) فەرمودەیەکی سەحیحە.

[7] البخاري (٤٨٣٦)، مسلم (٢٨١٩)، الترمزي (٤١٢) النسائي (٢١٩/٣) ابن ماجه (١٤١٩)

بووەوە لەناو خەڵکیدا. پاشان خوای گەورە فەرموی: ﴿لِيَغْفِرَ لَكَ اللَّهُ مَا تَقَدَّمَ مِن ذَنبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ وَيُتِمَّ نِعْمَتَهُ عَلَيْكَ وَيَهْدِيَكَ صِرَاطًا مُّسْتَقِيمًا﴾ هەتا خودا لەهەڵەکانی پێشووتو لەو هەڵانەی لەوەبەو لاوە توشیان دێی عافوت بکات و چاکەی تەواوت لەگەڵ بکاو ڕێگەی ڕاستت نیشان بدا. ئەمە لەتایبەت مەندیەکانی پێغەمبەر(ﷺ) خۆیەتی هیچ کەس نابێتە هاوەڵی تێیدا. لەفەرمودەی سەحیحدا نەهاتوە کە کەس بەهۆی کار چاکیەوە لەهەڵەی پاش و پێش عەفو کرابێ. ئەمە ڕێزو گەورەییەکە تەنها بۆ پێغەمبەری خودایە (ﷺ) چونکە ئەو لەهەموو کارێکیا بەردەوام خواناس و چاکەی کردوە. هیچ کەسێ ئەوەی پێ نەدراوە و دەستی نەکەوتوە لەمرۆڤ ئەو نەبێ. پێغەمبەر(ﷺ) تەواو ترین کەسە بۆ خوداە (الله) وە زۆر ترو زیاتر فەرمانەکانی خودای بەجێ هێناوە و وازی لە قەدەغەکانی هێناوە. کاتێ وشترەکەی خۆی خستو نەڕۆیشت فەرموی: (ئەو کەسەی فیلەکەی بەندکرد هەر ئەو کەسە ئەمیشی بەند کردوە). پاشان فەرموی: (سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە، پرسیاری شتێکم لێ ناکەن کە ڕێزی قەدەغەکانی خودای تێدا بگرن مەگین وەڵامەکەیتان دەدەمەوە).[1] کاتێ فەرمانی خودای بەجێ هێناو ڕازی بو بەئاشتی خودای مەزن فەرموی پێی: ﴿إِنَّا فَتَحْنَا لَكَ فَتْحًا مُّبِينًا ① لِّيَغْفِرَ لَكَ اللَّهُ مَا تَقَدَّمَ مِن ذَنبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ وَيُتِمَّ نِعْمَتَهُ عَلَيْكَ﴾ واتە: بەوەی کە خودا پێی بەخشیوی لەو بەرنامە گەورەو ئاینە ڕێكو ڕاستە. ﴿وَيَنصُرَكَ اللَّهُ نَصْرًا عَزِيزًا﴾ خودا یارمەتیت بدا بە تەرزێ وا کەببیە خاوەن دەستەڵات . واتە: بەهۆی ئەو گەردن کەچی و گوێ ڕایەڵیەتەوە بۆ فەرمانی خودا. خودای مەزن. پلەت بەرز دەکاتەوەو سەرت دەخات بەسەر دوژمنەکانتا وەك لە فەرمودەی سەحیحدا هاتووە: (خودای گەورە بەندەی لێ بوردە زیاتر دەکاتە خاوەندەستەڵات. وەهیچ کەسێ نیە لەبەر ڕەزامەندی خوا خۆی بەکەم بزانێ مەگەر خودا پلەی بەرز دەکاتەوە).[2] لە عومەری کوڕی خەتابەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرموویەتی: هیچ کەسێکت سزا نەداوە کە نافەرمانی خودای کردبێ بەرانبەر خۆت بەئەندازەی ئەوو نەبێ کە فەرمانی خودات تیا بەجێ هێناوە.

### ئارامی خستنە نێو دڵی خاوەن باوەڕان

﴿هُوَ الَّذِي أَنزَلَ السَّكِينَةَ فِي قُلُوبِ الْمُؤْمِنِينَ لِيَزْدَادُوا إِيمَانًا مَّعَ إِيمَانِهِمْ ۗ وَلِلَّهِ جُنُودُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ۚ وَكَانَ اللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا ④ لِّيُدْخِلَ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا وَيُكَفِّرَ عَنْهُمْ سَيِّئَاتِهِمْ ۚ وَكَانَ

---

[1] فتح الباري (٥/٣٨٨).

[2] مسلم (٤/٢٠٠١).

ذَٰلِكَ عِندَ ٱللَّهِ فَوۡزًا عَظِيمًا ﴿٥﴾ وَيُعَذِّبَ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ وَٱلۡمُنَٰفِقَٰتِ وَٱلۡمُشۡرِكِينَ وَٱلۡمُشۡرِكَٰتِ ٱلظَّآنِّينَ بِٱللَّهِ ظَنَّ ٱلسَّوۡءِۚ عَلَيۡهِمۡ دَآئِرَةُ ٱلسَّوۡءِۖ وَغَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِمۡ وَلَعَنَهُمۡ وَأَعَدَّ لَهُمۡ جَهَنَّمَۖ وَسَآءَتۡ مَصِيرًا ﴿٦﴾ وَلِلَّهِ جُنُودُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا ﴿٧﴾ ﴾

خـــوای گـــەورە ئەفـــەرموێت: ﴿ هُوَ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ ٱلسَّكِينَةَ فِي قُلُوبِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ لِيَزۡدَادُوٓاْ إِيمَٰنًا مَّعَ إِيمَٰنِهِمۡۗ وَلِلَّهِ جُنُودُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴾ هـەر ئەویشە ئـۆقرەو ئـارامی دا بـەدڵی ئەوانـەی خـاوەن باوەڕ بوون، تا وێڕای ئەو بڕوای هەیانە، بڕوایان بەقەوەت تربێ، لەشـكر گـەلی ئاسمانـەكانوزەمینیش، هەموو بەر فەرمانی خوان، خودا زانای لەكارزانـە . خـوای مـەزن ئەفـەرموێت: ﴿ هُوَ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ ٱلسَّكِينَةَ ﴾ واتە: ئەو خوایەی ئارامی وەدی هێناوە، قـەتادە دەڵێـت: واتـە ئـۆقرەو لەسـەر خـۆی خـستوەتە دڵـی خاوەن باوەڕان كە (ئەوانیش هاوەڵەكانی پێغەمبـەرن) لـە ڕۆژی حودەیبییـەدا ڕۆشـتن بـەدەم فـەرمانی خوداو پێغەمبەرەكەیەوە و سەریان نەوی كرد بۆ بڕیاری خوای گەورە. وەختـێ دڵیـان ئـارامی بەسـەرا هاتو جێگای خـۆی گـرت خـوای مـەزنیش بڕواكەواتـە بـەهێزتر كـرد. بوخـاری و كەسـانی تـریش ئـەم ئایەتەیان كردوەتە بەڵگە لەسەر زیادوكەم كردنی باوەڕ پاشان خوای مەزن فەرموویەتی: ئەگەر مـەیلی لێ بوایـە سـەر دەكـەوت بەسـەر خـوا نەناسـاندا وەك ئەفـەرموێت: ﴿ وَلِلَّهِ جُنُودُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ ﴾ لەشكرەكانی ئاسمانەكان زەمینیش هەموو بەفەرمانی خودان ئەگەر تەنها یەك فریشتەی بناردایە بۆیان هەمووی لەناو دەبردن. بەڵام خودای گەورە غەزاو جەنگی داناوە بـۆ بەنـدە خـاوەن باوەڕەكانی، كە ئەویش پڕە لەكارزانی و نیشانەی گەورەو بەڵگەی بەهێز كە خودا خۆی دەیزانـێ و لێـی ئاگادارە بۆیـە ئەفـەرموێت: ﴿ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴾ واتـە: خـودا زانـای كارزانـە. پاشـان خـودای مـەزن فەرموویـەتی: ﴿ لِّيُدۡخِلَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا وَيُكَفِّرَ عَنۡهُمۡ سَيِّـَٔاتِهِمۡۚ وَكَانَ ذَٰلِكَ عِندَ ٱللَّهِ فَوۡزًا عَظِيمًا ﴾ هەروەها پیاوانو ژنانی خاوەنباوەڕ بەرێ دەكاتە نـاو باغانێك، ڕوباریـان بەبـەردا دەڕواو هەتا سەر هەر لەوێ دەبنوخەتاو نالەبارەكانیان عەفوو بكات لەلای خـودا ئـەم ڕووداوە سـەركەوتنێكی مەزن بوو . لەپێشەوە فەرمودەكەی ئەنەس باس كرا كاتێ گوتیان: پیرۆزت بێ ئەی پێغەمبـەری خـودا ئەوە بۆ تۆیە. ئەی چی بۆ ئێمەیە؟ خوای گەورە ئەم ئایەتەی ڕەوانە كـردە خـوارەوە: ﴿ لِّيُدۡخِلَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا ﴾[1] واتـە: هـەتا هەتایـە تێیـدا دەمێننـەوە. ﴿ وَيُكَفِّرَ

[1] فتح الباري (٧/٥١٦).

عَنْهُمْ سَيِّئَاتِهِمْ ﴾ واتە: لەخەتاو خراپەکانیان خۆش دەبێ تۆڵەیان لێ ناسێنێ لەسەری بەڵکو لێیان دەبورێ و عەفویان ئەکات و گوناهەکانیان دادەپۆشێ و بەزەیی دێتەوە پیاندا ڕێزیشیان لێ دەنێ.

﴿وَكَانَ ذَٰلِكَ عِندَ ٱللَّهِ فَوۡزًا عَظِيمٗا ﴾ ئەم ڕوداوەیش لای خودا سەرکەوتنێکی گەورە بوو. وەك ئەم ئایەتەی کە ئەفەرموێت: ﴿فَمَن زُحۡزِحَ عَنِ ٱلنَّارِ وَأُدۡخِلَ ٱلۡجَنَّةَ فَقَدۡ فَازَۗ وَمَا ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَآ إِلَّا مَتَٰعُ ٱلۡغُرُورِ ﴾[1] واتە: ئینجا هەرکەس دور بخرێتەوە لەئاگری دۆزەخ و بخرێتە بەهەشتەوە ئەوە بەڕاستی ئەو کەسە سەرکەوتووە ژیانی دونیاشی هیچ شتێك نیە بێجگە لە بەهرەو ئارەزوویەکی فریودەر. خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَيُعَذِّبَ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ وَٱلۡمُنَٰفِقَٰتِ وَٱلۡمُشۡرِكِينَ وَٱلۡمُشۡرِكَٰتِ ٱلظَّآنِّينَ بِٱللَّهِ ظَنَّ ٱلسَّوۡءِۚ عَلَيۡهِمۡ دَآئِرَةُ ٱلسَّوۡءِۖ وَغَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِمۡ وَلَعَنَهُمۡ وَأَعَدَّ لَهُمۡ جَهَنَّمَۖ وَسَآءَتۡ مَصِيرٗا﴾ هەتاوەکوو ڕوو بینانی پیاو ژنو بتپەرستانی پیاو ژن کە دەربارە بەخوا گومانی خراپیان دەبرد ئازار بدا. زۆر خراپیان لێ قەوماوەو خوا غەزەبی لێ گرتوونو نەعلەت لە هەموویان دەکاو جەهەندەمی بۆ داناونودوا ڕۆژێکی ڕەشیان هەیە . واتە: گومانی خراپ دەبەن بەخوا لەفەرمانەکانیاو وادەزانن کە پێغەمبەرو هاوەڵەکانی دەکوژرێنویەتەواوی لەناو دەچن. بۆیە خوای مەزن ئەفەرموێت: ﴿عَلَيۡهِمۡ دَآئِرَةُ ٱلسَّوۡءِۖ وَغَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِمۡ وَلَعَنَهُمۡ﴾ واتە: خودا غەزەبی لێ گرتونولەبەزەیی خۆی وەدەری خستون. ﴿وَأَعَدَّ لَهُمۡ جَهَنَّمَۖ وَسَآءَتۡ مَصِيرٗا﴾ جەهەنمی بۆ ئامادە کردوونو پاشەڕۆژێکی ڕەشیان هەیە پاشان خوای گەورە باسی دەسەلاتو تۆڵەی خۆی دەکات لە دوژمنانی ئیسلام لەخوا نەناس و دووڕووەکانو ئەفەرموێت: ﴿وَلِلَّهِ جُنُودُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمٗا﴾.

﴿إِنَّآ أَرۡسَلۡنَٰكَ شَٰهِدٗا وَمُبَشِّرٗا وَنَذِيرٗا ﴿٨﴾ لِّتُؤۡمِنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَتُعَزِّرُوهُ وَتُوَقِّرُوهُ وَتُسَبِّحُوهُ بُكۡرَةٗ وَأَصِيلًا ﴿٩﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُبَايِعُونَكَ إِنَّمَا يُبَايِعُونَ ٱللَّهَ يَدُ ٱللَّهِ فَوۡقَ أَيۡدِيهِمۡۚ فَمَن نَّكَثَ فَإِنَّمَا يَنكُثُ عَلَىٰ نَفۡسِهِۦۖ وَمَنۡ أَوۡفَىٰ بِمَا عَٰهَدَ عَلَيۡهُ ٱللَّهَ فَسَيُؤۡتِيهِ أَجۡرًا عَظِيمٗا ﴿١٠﴾﴾

**سیفاتەکانی پێغەمبەری خودا(ﷺ)**

خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿إِنَّآ أَرۡسَلۡنَٰكَ شَٰهِدٗا وَمُبَشِّرٗا وَنَذِيرٗا ﴾ ئێمە تۆمان ناردوە ئاگادارو مژدەدەرو ترسێنەربی. خوای مەزن ئەفەرموێت: بە پێغەمبەرەکەی محمد (ﷺ) ﴿إِنَّآ أَرۡسَلۡنَٰكَ

[1] ال عمران (١٨٥).

شَٰهِدٗا ﴾ واتـە: ئێمـە تۆمـان ناردوە لەسـەر خـەڵك. ﴿وَمُبَشِّرٗا ﴾ مژدەبـدە بـەخاوەن بـاوەڕان. ﴿وَنَذِيرٗا ﴾ ترسێنەربی بۆ خوانەناسان لـە سورەتی (الاحزاب) لـە پێشەوە تەفسیر کراوە. خـوای گـەورە ئەفـەرموێت: ﴿لِّتُؤۡمِنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَتُعَزِّرُوهُ وَتُوَقِّرُوهُ وَتُسَبِّحُوهُ بُكۡرَةٗ وَأَصِيلًا ﴾ ئەشـێ ئێوە بڕوا بێنن بە خواو پێغەمبەری خوداو لە یاریدەی دریخی نەکەنوڕێزی شایستەی لێبگرنوهـەموو بەیانی و ئێواران پەسنی بدەن. ﴿وَتُعَزِّرُوهُ ﴾ ئیبنـو عـەباس و کەسانی تـریش ئـەڵێن: زۆر بەگـەورە سـەیری بکـەن[1] ﴿وَتُوَقِّرُوهُ ﴾ لەتـەوقیرەوە هـاتووە واتـە: ڕێزگرتنو بە گـەورەو مـەزن سـەیر کردن، ﴿وَتُسَبِّحُوهُ ﴾ پەسەنی خودا بدەن. ﴿بُكۡرَةٗ وَأَصِيلًا ﴾ بەیانیان‌وئێواران.

**پە یمان نامەی ڕیزوان ( بيعة الرضوان )**

خـوای گـەورە فـەرموویـەتی: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يُبَايِعُونَكَ إِنَّمَا يُبَايِعُونَ ٱللَّهَ يَدُ ٱللَّهِ فَوۡقَ أَيۡدِيهِمۡۚ فَمَن نَّكَثَ فَإِنَّمَا يَنكُثُ عَلَىٰ نَفۡسِهِۦۖ وَمَنۡ أَوۡفَىٰ بِمَا عَٰهَدَ عَلَيۡهُ ٱللَّهَ فَسَيُؤۡتِيهِ أَجۡرًا عَظِيمٗا ﴾ ئـەو کەسـانەی پـەیمان لەگـەڵ تـۆ دەبەستن. با بزانن پەیمان لەگەڵ خوا دەبەستن، دەسـتی خـوا لەسـەر دەسـتی ئەوانەوەیە. سا هـەر کەسێ پـەیمانی بـەجێ نـەهێنێ، هـەر خۆی لـە پـەیمان شکێنی زەرەر دەکات هـەر کەسێکیش ئـەو پەیمانەی کەلە گەڵ خودا بەستوویەتی بەجێ بێنێ لەدوا ڕۆژا پاداشی گەورەی دەداتێ. پاشـان خـوای مەزن فەرموویەتی: بە پێغەمبەرەکەی (ﷺ) بۆ ڕێز لێ نانو گـەورە سـەیرکردنی: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يُبَايِعُونَكَ إِنَّمَا يُبَايِعُونَ ٱللَّهَ ﴾ ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە وایە کە ئەفەرموێت: ﴿مَّن يُطِعِ ٱلرَّسُولَ فَقَدۡ أَطَاعَ ٱللَّهَ ﴾[2] واتە:هەر کەسێ گوێڕایەڵی پێغەمبەر(ﷺ) بکات ئەوە بەڕاستی گوێڕایـەڵی خـوای کـردوە. ﴿يَدُ ٱللَّهِ فَوۡقَ أَيۡدِيهِمۡ ﴾ واتە: خودا لەگەڵیانە حازرەو گوێی لەقسەیانەو شوێنەکەشیا دەبینـێ وە ئاگاداری ئاشکراو پەنهانیانەو وەخودا خۆی پەیمانی لەگەڵ بەستون بەهۆی پێغەمبەرەکەیەوە (ﷺ) ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتـە وایـە کەئەفــەرموێت: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ ٱشۡتَرَىٰ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ أَنفُسَهُمۡ وَأَمۡوَٰلَهُم بِأَنَّ لَهُمُ ٱلۡجَنَّةَۚ يُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ فَيَقۡتُلُونَ وَيُقۡتَلُونَۖ وَعۡدًا عَلَيۡهِ حَقّٗا فِي ٱلتَّوۡرَىٰةِ وَٱلۡإِنجِيلِ وَٱلۡقُرۡءَانِۚ وَمَنۡ أَوۡفَىٰ بِعَهۡدِهِۦ مِنَ ٱللَّهِۚ فَٱسۡتَبۡشِرُواْ بِبَيۡعِكُمُ ٱلَّذِي بَايَعۡتُم بِهِۦۚ وَذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ ﴾[3] واتـــــە:

---

[1] الطبري (٢٢/٢٠٧).

[2] النساء (٨٠).

[3] التوبة (١١١).

بەڕاستی خوا کڕیویەتی لە باوەڕداران گیانو ماڵیان بەوەی کە بەهەشتیان دەداتێ جەنگ دەکەن لەڕێی خوادا ئینجا بێ باوەڕان دەکوژن و خۆشیان دەکوژرێن ئەمە بەڵێنێکی ڕاستە و خوا بڕیاری داوە لەسەر خۆی لە تەوراتو ئینجیل و قورئاندا جاکێ بە بەڵێنوپەیمانی خۆی وەفادارترە لەخوا؟ کەواتە مژدە بەخشو شادمان بن بەو فرۆشتنەتان کە مامەڵەتان پێ کرد بەڕاستی هەر ئەوەیە گەیشتن بەئامانجی زۆر گەورە. ﴿فَمَن نَّكَثَ فَإِنَّمَا يَنكُثُ عَلَىٰ نَفْسِهِۦ﴾ سا هەر کەسێ پەیمانی بەجێ بەجێ نەهێنێ، هەر خۆی لەپەیمان شکێنی زەرەر دەکات. ﴿وَمَنْ أَوْفَىٰ بِمَا عَـٰهَدَ عَلَيْهُ ٱللَّهَ فَسَيُؤْتِيهِ أَجْرًا عَظِيمًا﴾ هەر کەسیش ئەو پەیمانەی بەجێ بێنێ کە لەگەڵ خودا بەستویەتی لە ڕۆژی دوایدا پاداشتی گەورەی دەدرێتێ.ئەم پەیمانە، پەیمانی ڕیزوان نە کە لە ژێر دەرەختی سەمرەدا بو لە حودەیبیە، هاوەڵەکانی پێغەمبەر(ﷺ) پەیمانیان دا بەپێغەمبەری خودا(ﷺ) لەو ڕۆژەدا وتراوە کە هەزارو سێ سەد کەس بوونو وتراویشە کە هەزارو چوار سەد کەس بون دیسان وتراوە کە هەزارو پێنج سەد کەس بوون. هەزارو چوار سەدەکە ڕاست ترە.

### باسی ئەو فەرمودانەی کەلەو بارەیەوە هاتووە

بوخاری ڕیوایەتی کردوە لە جابیرەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێت: ئێمە لەڕۆژی حودەیبیەدا هەزارو چوار سەد کەس بوین[١]. موسلمیش ڕیوایەتی کردوە[٢]، بوخاری و مسلم هەردوکیان ڕیوایەتیان کردووە لەجابیرەوە(ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێت:ئێمە ئەو ڕۆژە هەزارو چوارسەد کەس بوین. پێغەمبەر(ﷺ) دەستی دانا لە ناو ئەو ئاوەدا، ئاوەکە لەنێوان پەنجەکانیەوە هەڵدەقوڵی هەتا هەمووی تێر ئاویان خوارد[٣]. ئەمە کورتەی باسێکی تر بو کاتێ باسی ئەو تینوبونەی خۆواتە دەکرد لەڕۆژی حودەیبیەدا کەپێغەمبەری خودا(ﷺ) تیرێکی خۆی دانێ لەناو بیری حودەیبیا دایان نا،ئەوەندە ئاوی تێ هات تەواو بەشی کرد. وتیان بەجابیر (ڕەزای خوای لێ بێ) ئێوە ئەو ڕۆژە چەند کەس دەبون؟ دەڵێت: ئێمە هەزارو چوارسەد کەس دەبوین. خۆ ئەگەر سەد هەزاریش بوینایە هەربەشی دەکردین[٤]. وە لە ڕیوایەتێکی تردا لەهەر دو سەحیحەکەدا هاتوە لە جابیرەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێت: کەئەوان پانزە سەد کەس بون. [٥] بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە قەتادەوە کە دەڵێت: گوتم بەسەعیدی

---

[١] فتح الباري (٨/٤٥١).

[٢] مسلم (٣/١٤٨٤).

[٣] فتح الباري (٧/٥٠٥) مسلم (٣/١٤٨٤).

[٤] فتح الباري (٧/٥٠٤).

[٥] فتح الباري (٧/٥٠٧) مسلم (٣/١٤٨٤).

کوڕی موسەیب ئەوانەی ئامادەی پەیمانی ڕەزامەندی(بیعة الرضوان) بوون ژمارەیان چەند بوو؟ دەڵێت:پانزە سەدکەس بوون. گوتم: جابیری کوڕی عبدالله(ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێت: ئەوانە چواردە سەد کەس بوون. دەڵێت: لێی تێك چووە ئەو بۆمنی باس کردوە کە ئەوانە پانزە سەد کەس بوون.[1] بەیهەقی دەڵێت: ئەم ڕیوایەتە بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە لەپێشوە گوتویەتی: پانزە سەد کەس بوون، پاشان باسی ئەو لێ تێك چونەی کردوە کە گوتویەتی: چواردە سەد کەس بوون[2].

**باسی هۆکاری ئەو پەیمانە مەزنە**

محمدی کوڕی ئیسحاقی کوڕی یەسار لەسیرەتدا دەڵێت: پاشان پێغەمبەری خودا(ﷺ) عومەری کوڕی خەتابی بانگ کرد (ڕەزای خوای لێ بێ) بۆ ئەوەی بینێرێ بۆ مەککە، بۆ ئەوەی پیاو ماقوڵانی قورەیش ئاگادار بکا لەو مەبەستەی کە پێغەمبەر(ﷺ) بۆی هاتوە. عومەر دەڵێت: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) من دەترسم قورەیش کەلەناوم بەرن، چونکە من کەسێ شك نابەم لەبنەماڵەی عەدی کوڕی لەعب کە پارێزگاریم لێ بکەن، قورەیشی دەزانن کەمن چەندێ دژایەتیم کردون وچەندێ ڕق و کینەم لێیانە. بەلام من دەست نیشانی پیاوێکت بۆ دەکەم کە زۆر چاکترە لەمن بۆ ئەو کارە ئەوەیش عوسمانی کوڕی عەفانە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەینێرین بۆ لای ئەبو سوفیان وگەورە پیاوانی قورەیش هەواڵیان بداتێ کە بۆ جەنگ نەهاتوە. بەڵکو هاتوە بۆ سەردانی (کعبە) و ڕێز لێ نانی کەعبە. عوسمان ڕۆشت بۆ مەککە. لەڕێگا ئەبانی کوڕی سعدی کوڕی عاس پێ گەیشت. کاتێ کەچووە مەککە یان پێش ئەوەی بچێتە ناو شاری مەککە.لەگەڵ خۆی بردیە ناو مەککەو پەنای داو هەتا ئەو پەیامەی پێغەمبەریان پێ بگەیەنێ. عوسمان ڕۆشت هەتا گەیشتە ئەبو سوفیان و گەورە پیاوانی قورەیش. ئەوەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموبوی پێی ڕاگەیاندن. قورەیشیەکان گوتیان: بەعوسمان (ڕەزای خوای لێ بێ) کاتێ پەیامەکەی پێغەمبەری بۆ باس کردن ئەگەر حەز دەکەی تەوافی کەعبە بکەی تەوافی خۆت بکە. عوسمان دەڵێت: من تەواف ناکەم هەتا پێغەمبەری خودا(ﷺ) تەواف نەکا بەدەوریا. قورەیشیەکان بەندیان کرد لەوێ. هەواڵ گەیشتە پێغەمبەرو (ﷺ) موسوڵمانان کە عوسمان (ڕەزای خوای لێ بێ) کوژراوە. ئیبنو ئیسحاق دەڵێت: عبدالله ی کوڕی ئەبوبەکر بۆی گێرامەوە پێغەمبەری خودا(ﷺ) کاتێ هەواڵی پێ گەیشت کە عوسمان کوژراوە فەرموی: (واز ناهێنین هەتا جەنگ لەگەڵ ئەو هۆزە نەکەین)، واتە: قورەیشیەکان. پێغەمبەری خودا خەڵکەکەی بانگ کرد بۆ پەیمانی دان ئەو پەیمانی ڕیزوانە لەژێر ئەو درەختە دابو. ئەو خەڵکە دەیان گوت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) پەیمانی لێ وەرگرتن لەسەر مردن. جابیری کوڕی عبدالله ئەی گوت: کەپێغەمبەری

---

[1] فتح الباري (٧/٥٠٧).

[2] دلائل النبوة (٤/٩٧) فەرمودەیەکی سەحیحە.

خودا(ﷺ) پەیمانی لێ وەرنەدەگرتن لەسەر مردن بەڵکو پەیمانی لێ وەر دەگرتین لەسەر ئەوەی کە ڕانەکەین خەڵکی هەموو پەیمانیان دا ئامادە بون هیچ کەس دوانەکەوت جگە لە جەدی کوڕی قەیس برای بەنو سەلیحە جابیر دەڵێت: سوێند بەخوا وەك ئەوەی ئێستا چاوم لێی بێ خۆی دابووە پاڵ وشترەکەیەوە خۆی چەماندبوەوە وشترەکەی کردبوە پەنا هەتا خەڵکی چاوی پێی نەکەوێ. پاشان هەواڵ گەیشتە پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەوەی لەبارەی عوسمانەوە وترا (واتە کوژراوە) ڕاست نەبوو[1].

حافیز ئەبو بەکری بەیهەقی ڕیوایەتی کردوە لەئەنەسی کوڕی مالکەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێت: کاتێ پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمانی دا بە پەیمانی دانی ڕیزوان عوسمانی کوڕی عەفان (ڕەزای خوای لێ بێ) پەیام بەری پێغەمبەر بو بۆ خەڵکی مەککە. خەڵکی پەیمانیان دا. پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموی: (ئەی خودایە عوسمانی کوڕی عەفان بۆ کاری خوداو پێغەمبەرەکەی (ﷺ) ڕۆیشتوە). بەدەستێکی دای بەسەر ئەو دەستەکەیان دەستی پێغەمبەری خودا(ﷺ) بۆ عوسمان لەدەستی خۆیان چاکتر بو بۆیان. بوخاری ڕیوایەتی کردوە لەنافیعەوە دەڵێت: خەڵکی دەیان گوت کە عبدالله ی کوڕی عومەر پێش عومەر موسوڵمان بوە بەلام ئەو قسە وانیە. بەڵکو عومەر (ڕەزای خوای لێ بێ) لەڕۆژی حودەیبیەدا عبدالله ی نارد بۆ ئەسپێکی خۆی کە لەلای پیاوێکی ئەنساری بو. کەلەشەڕدا سواری ببێ، لەو کاتەدا پێغەمبەری خودا(ﷺ) لەژێر درەختەکەدا پەیمانی وەردەگرت لە خەڵکی عومەر بەوەی نەزانی و ئاگادارنەبو عبدالله یش پەیمانی پێدابو پاشان چوبو بۆ ئەسپەکەو هێنابوی بۆ عومەر (ڕەزای خوای لێ بێ) خۆی ئامادە دەکرد بۆ شەڕ، هەواڵی دایە کە پێغەمبەری خودا پەیمانی وەردەگرێ لەژێر درەختەکەدا هەڵساو ڕۆشت لەگەڵی هەتا پەیمانی دا بەپێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەمە ئەوەیە کەخەڵکی باسی دەکەنودەڵێن: کەئیبنو عومەر لەپێش عومەر موسوڵمان بوە (خوایان لێ ڕازی بێ)[2] هەمیسان بوخاری ڕیوایەتی کردوە لە ئیبنو عومەرەوە (ڕەزای خوایان لێ بێ) کە دەڵێت: ئەو خەڵکەی کە لەگەڵ پێغەمبەری خودابون (ﷺ) لەبن سێبەری درەختەکاندا بڵاوەیان کردبو. وەختێکمان زانی خەڵکەکە دەوری پێغەمبەریان دا (ﷺ) عومەر دەڵێت:عبدالله سەیرکە بزانە ئەو خەڵکە بۆچی دەوری پێغەمبەریان داوە (ﷺ) عبدالله چاوی پێیان کەوت پەیمانیان دەدا ئەویش پەیمانی دا. پاشان گەڕایەوە بۆلای عومەر (ڕەزای خوای لێ بێ) عومەریش ڕۆشتو پەیمانی دا[3]، لەجابیرەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێت: ئێمە ڕۆژی حودەیبیە هەزارو چوارسەد کەس بووین پەیمانماندا بەپێغەمبەر(ﷺ) عومەر (ڕەزای خوای لێ بێ) دەستی گرتبو لەژێر درەختەکەدا کە درەختی سەمرە بو دەڵێت: پەیمانمان

---

[1] ابن هشام (٣/٣٢٩/٣٣٠) فەرمودەیەکی لاوازە.

[2] فتح الباري (٧/٥٢١).

[3] فتح الباري (٧/٥٢١).

داوەتیٚ کەڕانەکەین پەیمانمان پیٚ نەداوە لەسەر مردن، موسلم ڕیوایەتی کردوە.[1] هەمیسان موسلم ڕیوایەتی کردوە لە مەعقەلی کوڕی یەسارەوە (ڕەزای خوای لیٚ بیٚ) دەڵیٚت: خۆم دەبینی ڕۆژی درەختەکە پیٚغەمبەر(ﷺ) پەیمانی وەر دەگرت لەو خەڵکە منیش چڵیٚك لە چڵەکانی ئەو درەختەم بەرز کرد بوە لەلای سەری پیٚغەمبەرەوە (ﷺ) ئیٚمە چواردە سەدی بوین‌وپەیمانمان نەدابویە لەسەر مردن، بەڵکو پەیمانمان پیٚ دابوکە ڕانەکەین.[2] بوخاریش ڕیوایەتی کردوە لەسەلەمەی کوڕی ئەکوەعەوە (ڕەزای خوای لیٚ بیٚ) دەڵیٚت: پەیمانم دا بەپیٚغەمبەری خوا (ﷺ) لەژیٚر درەختەکەدا. یەزید دەڵیٚت: گوتم ئەی ئەبو سەلەمە لەسەر چی شتیٚ لەو ڕۆژەدا ئیٚوە پەیمانتان دەدا؟ دەڵیٚت: لەسەر مردن.[3] دیسان بوخاری ڕیوایەتی کردوە لەسەلەمەوە (ڕەزای خوای لیٚ بیٚ) دەڵیٚت: پەیمانم دا بەپیٚغەمبەری خودا(ﷺ) ڕۆژی حودەیبیە پاشان چومە لاوەو وەستام.پیٚغەمبەر(ﷺ) فەرموی: ئەی سەلەمە پەیمان نادەی؟) گوتم: پەیمانمدا. پیٚغەمبەر(ﷺ) فەرموی: (وەرە پەیمانبدە)، هاتم و نزیك بومەوە پەیمانمدا، پیٚم گوت لەسەر چی پەیمانتدا ئەی سەلەمە؟ دەڵیٚت: لەسەر مردن[4]. موسلمیش هیٚناویەتی[5]. هەر بەم شیٚوەیە بوخاریش ڕیوایەتی کردوە لەعەببادی کوڕی تەمیمەوە ئەوان پەیمانیان داوە بەپیٚغەمبەر(ﷺ) لەسەر مردن[6]. بەیهەقی ڕیوایەتی کردوە لە سەلەمەی کوڕی ئەکوەعەوە دەڵیٚت: لەگەڵ پیٚغەمبەری خوادا گەیشتینە حودەیبیە کەئیٚمە چواردە سەدی بوین. پەنجا سەر مەڕیشی لیٚ بو کەئاوەکە بەشی نەدەکردو ئاوی نەئەدان. پیٚغەمبەری خوا (ﷺ) لەکەناری بیرەکە دانیشت، یان دوعای کرد یا تفی مبارەکی تیٚ کرد پڕ بو لەئاو ئاومان لیٚ خواردەوەو مەڕەکانیشمان ئاودا. دەڵیٚت پاشان پیٚغەمبەری خودا(ﷺ) بانگی کردین بۆ پەیمان دان لەبنی درەختەکەدا، یەکەم کەس بوم پەیمانم دایە، پاشان یەکە یەکە خەڵکی پەیمانیان دەدا هەتا کاتیٚ کە لەناو خەڵکەکەدا بوم، پیٚغەمبەر(ﷺ) فەرموی: (ئەی سەلەمە پەیمانم بدەریٚ). دەڵیٚت: وتم: ئەی پیٚغەمبەری خوا (ﷺ) یەکەم کەس پەیمانم پیٚدای، پیٚغەمبەر(ﷺ) فەرموی: (جاریٚکی تر پەیمان بدە) دەڵیٚت: پیٚغەمبەری خودا(ﷺ) چاوی پیٚم کەوت هیچ شتیٚکم پیٚ نەبو جەحەفەیەك یادەرەقەیەکی دامیٚ (چەرمیٚکە بەبیٚ تەختە) قەڵغانیشی پیٚ دەڵیٚن. لەکاتی شەڕا بەکاردیٚ. پاشان پەیمانی وەر دەگرت هەتا وەختیٚ گەیشتە دواین کەس. پیٚغەمبەر(ﷺ)

---

[1] مسلم (١٤٨٣/٣).

[2] مسلم (١٤٨٥).

[3] فتح الباري (١٣٦/٦).

[4] فتح الباري (٢١١/١٣).

[5] مسلم (١٤٨٦/٣).

[6] فتح الباري (١٣٦/٦).

فەرمووی: (ئایا سەلەمە پەیمان نادەی؟) دەڵێت: وتم: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) پەیمانم پێ دایت لەپێشەوە لەناوەڕاستیشا. پێغەمبەر(ﷺ) فەرموی: سێ هەم جاریش پەیمانم دایە. پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموی: (سەلەمە جەحەفەیان دەرەقەکەی پێم دایت (کوانێ؟) دەڵێت: گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) عامرم پێگەیشت فەرموی: (تۆ وەك ئەو کەسەی کەدەڵێت: ئەی خودایە بمگەیەنیتە لای کەسێ کە ئەو کەسە خۆشەویس ترە لەخۆم). دەڵێت: پاشان بتپەرستەکانی قورەیشی لەخەڵکی مەککە نامەیان بۆ ناردین هەتا هەندێکمان لەگەڵ یەکتری دەهاتینو دەچوینورێکەوتین. دەڵێت: من ڕەنجبەری تەلحەی کوڕی عبدالله بوم (ڕەزای خوای لێ بێ) وولاغەکەم بۆ ئاو دەداو لەگەڵی بوم و لەخواردنەکەیشم دەخوارد. ماڵ و منداڵم بەجێ هێشتو هاتم بۆلای خوداو پێغەمبەری خودا(ﷺ) کاتێ ئێمەو خەڵکە مەککە ڕێکەوتینو تێکەڵاوی یەکتری بوین. چوومە لای درەختێكو پاکم کردەوەو پاشان لەژێر سێبەرەکەیدا پاڵ کەوتم چوار بت پەرستی خەڵکی مەککە هاتنە لام باسی پێغەمبەریان ئەکرد (ﷺ) بەخراپی و زۆر ڕقم هەڵسا ڕۆیشتم بۆ ژێر درەختێکی تر. چەکەکانیان هەڵواسی بەدرەختەکەداو پاڵ کەوتن. لەو کاتەدا کە ئەوان ئاوەها بون. بانگ کەرێ بانگی کرد لەدامێنی شیوەکەوە ئەی کۆچەریەکان ئیبنو زونەیم کوژرا. شمشێرەکەم هەڵگرتو پەلاماری ئەو چوار کەسەم دا کەپاڵ کەوتبون چەکەکانم کۆکردنەوەو هەڵم گرتن بەدەستم و پاشان گوتم: سوێند بەو کەسەی کە ڕێزی لەنێو چاوانی پێغەمبەر(ﷺ) گرتوە. هەر کەسێکتان سەر بەرزکاتەوە دەکێشم بەنێ چاوانیا دەڵێت: پاشان لەگەڵ خۆم هێنامن بۆ لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەڵێت: مامەیشم عامر لە عەبەلات پیاوێکی لەعەبەلاتەوە هێنا پێیان ئەگوت میکرەز لەبتپەرستەکان هەتا چوینە لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) لەناو حەفتا بتپەرستا پێغەمبەری خودا(ﷺ) سەیری کردنوفەرموی: (وازیان لێ بێنن هەتا تاوانوخراپەکاری لەوانەوە دەست پێ بکات). پێغەمبەری خودا(ﷺ) عەفوی کردن خوای گەورەیش ئەم ئایەتەی ڕەوانە کرد ﴿وَهُوَ ٱلَّذِي كَفَّ أَيۡدِيَهُمۡ عَنكُمۡ وَأَيۡدِيَكُمۡ عَنۡهُم بِبَطۡنِ مَكَّةَ مِنۢ بَعۡدِ أَنۡ أَظۡفَرَكُمۡ عَلَيۡهِمۡ﴾[1]،[2]. هەر بەم شێوەیەو نزیك لەمە موسلمیش ڕیوایەتی کردوە.[3] لەهەردو سەحیحەکەدا هاتوە لەسعیدی کوڕی موسەیبەوە دەڵێت: باوکم لەو کەسانە بو کە پەیمانی دابە پێغەمبەری خودا(ﷺ) لەژێر درەختەکا دەڵێت: دەرچوین لەقابیلەوە بەنیازی حەجەوە شوێنەکەمان لێ ون بوو ئەگەر دیار

---

[1] الفتح (٢٤).

[2] دلائل النبوة (١٣٦/٤) فەرمودەیەکی سەحیحە.

[3] مسلم (١٨٠٧).

بوایە ئێوە باشتر شارەزا بون لە شوێنەکەی[1]. ئەبو بەکری حەمیدی ڕیوایەتی کردوە لەجابیرەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێت:وەختێ پێغەمبەری خودا(ﷺ) بانگی خەڵکی کرد بۆ پەیمان دان. پیاوێکمان بینی پێیان ئەگوت: جەدی کوڕی قەیس لەژێر سکی وشترەکەیدا خۆی شاردبوەوە[2]. موسلمیش ڕیوایەتی کردوە[3]. دیسان حەمیدی ڕیوایەتی کردوە لە عەمرەوە کە بیستویەتی لەجابیرەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێت: ئێمە لەڕۆژی حودەیبیەدا هەزارو چوارسەد کەس بوین. پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموی پێمان: (ئێوە چاکترین خەڵکی سەر زەمینن ئەمڕۆ)، جابیر(ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێت: ئەگەر بم بینیایە شوێنی درەختەکەم نیشان دەدان)[4]، سوفیان دەڵێت: ئەوانە یەك ڕانەبون لەسەر شوێنەکەی. بوخاری و مسلم ڕیوایەتیان کردوە[5]. ئیمامی ئەحمەدیش ڕیوایەتی کردوە لە جابیرەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) ئەویش لەپێغەمبەری خوداوە (ﷺ) کەفەرموویەتی: (ناچێتە ناو ئاگر هیچ کەسێك لەوانەی کەلەژێر درەختەکەدا پەیمانی داوە)[6]، عبدالله ی کوڕی ئەحمد ڕیوایەتی کردوە لەجابیرەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) ئەمیش لەپێغەمبەرەوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: (هەر کەسێ سەر کەوتە سەر سەنیە سەنیەی مەرار لێی لادەچێ لەوەی کە نەوەی ئیسرائیل لەسەری لاچوە)، یەکەم کەسێ کە سەرکەوت سوارەکانی (نەوەی خەزرەج بو) پاشان خەڵکی تریش دوای ئەوان پەلەیان کرد. پێغەمبەر(ﷺ) فەرموی: (هەمووتان خودا عەفوی کردون جگە لەخاوەنی وشترە سورەکە)، وتمان: وەرە هەتا پێغەمبەری خودا(ﷺ) داوای عەفوت بۆ بکا. دەڵێت: سوێند بەخوا ئەگەر وشترەکەم بدۆزمەوە ئەوەم پێ خۆشترە لەوەی کە هاوەڵەکەتان داوای عەفوم بۆ بکا. وەختێك کە دەگەڕا بەشوێن وشترەکەیا کەون بوبو. موسلم ڕیوایەتی کردوە لە عبدالله وە بەو شێوەیە[7]. وە لە ئەبو زوبەیرەوە کەلە جابیرەوە بیستویەتی (ڕەزای خوای لێ بێ) ئەی گوت: ئوممو بەشیر هەواڵی داوەتێ کە بیستویەتی لەپێغەمبەری خوداوە (ﷺ) لەلای حەفسە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەی گوت: (ناچێتە ناو ئاگر ان شاء الله تعالی هیچ کەس لەوانەی ژێر درەختەکە کە پەیمانیاندا لەژێریدا) دەڵێت:بەڵێ ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) زۆر سەرزەنشتی کرد. حەفسە(ڕەزای خوای لێ بێ) ووتی: ﴿وَإِن مِّنكُمْ إِلَّا

[1] فتح الباري (٥١٢/٧) مسلم (١٤٨٥/٣).

[2] مسند الحميدي (٥٣٧/٢) فەرمودەیەکی سەحیحە.

[3] مسلم (١٤٨٣/٣).

[4] مسند الحميدي (٥١٤/٢) فەرمودەیەکی سەحیحە.

[5] فتح الباري (٥٠٧/٧) مسلم (١٤٨٤/٣).

[6] احمد (٣٥٠/٣) فەرمودەیەکی سەحیحە.

[7] مسلم (٢١٤٤/٤).

وَارِدُهَا﴾[1] واتە: کەس نیە لە ئێوە نەڕوات و تێ نەپەڕێت بەسەر دۆزەخ دا. پێغەمبەر(ﷺ) فەرموی خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ثُمَّ نُنَجِّي الَّذِينَ اتَّقَوا وَّنَذَرُ الظَّالِمِينَ فِيهَا جِثِيًّا﴾[2] واتە: دواتر ئەوانە ڕزگار دەکەین خواناس و پارێزکار بوون وستەمکاران بە چۆکا هاتوویی لەناو دۆزەخ دا دەهێڵینەوە. موسلم ڕیوایەتی کردوە.[3] هەمیسان لە جابیرەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێت: بەندەیەکی حاتبی کوڕی ئەبو بەلتەعە هات و ناڕەزایی دەربڕی لەحاتەب و دەڵێت: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) حاتەب دەچێتە ناو ئاگر. پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموی: (درۆت کرد حاتەب ناچێتە ناو ئاگر. چونکە ئامادەی ڕۆژی بەدر وحودەیبیە بوە).[4] لەبەر ئەوە خوای گەورە لە وەسفیاندا ئەفەرموێت: ﴿لَّقَدْ رَضِيَ اللَّهُ عَنِ الْمُؤْمِنِينَ إِذْ يُبَايِعُونَكَ تَحْتَ الشَّجَرَةِ فَعَلِمَ مَا فِي قُلُوبِهِمْ فَأَنزَلَ السَّكِينَةَ عَلَيْهِمْ وَأَثَابَهُمْ فَتْحًا قَرِيبًا﴾[5] واتە:سوێند بەخوا بێگومان خوا ڕازی بوو لەو ئیماندارانەی کە پەیمانیان پێ دایت لەژێر درەختەکەدا جا خوا ئاگادار بوو بەوەی لە دڵیاندایە بۆیەدڵنیایی و ئارامی بۆناردن و پاداشتی دانەوە بەسەرکەوتنێکی نزیک کەئازادکردنی خەیبەربوو.

**بڕوبیانو هێنانەوەی ئەو کەسانەی لە حودەیبیە دواکەوتن وهەڕەشەی خودا لەسەر ئەو دواکەوتنە**

﴿ سَيَقُولُ لَكَ الْمُخَلَّفُونَ مِنَ الْأَعْرَابِ شَغَلَتْنَا أَمْوَالُنَا وَأَهْلُونَا فَاسْتَغْفِرْ لَنَا ۚ يَقُولُونَ بِأَلْسِنَتِهِم مَّا لَيْسَ فِي قُلُوبِهِمْ ۚ قُلْ فَمَن يَمْلِكُ لَكُم مِّنَ اللَّهِ شَيْئًا إِنْ أَرَادَ بِكُمْ ضَرًّا أَوْ أَرَادَ بِكُمْ نَفْعًا ۚ بَلْ كَانَ اللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرًا ﴿١١﴾ بَلْ ظَنَنتُمْ أَن لَّن يَنقَلِبَ الرَّسُولُ وَالْمُؤْمِنُونَ إِلَىٰ أَهْلِيهِمْ أَبَدًا وَزُيِّنَ ذَٰلِكَ فِي قُلُوبِكُمْ وَظَنَنتُمْ ظَنَّ السَّوْءِ وَكُنتُمْ قَوْمًا بُورًا ﴿١٢﴾ وَمَن لَّمْ يُؤْمِن بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ فَإِنَّا أَعْتَدْنَا لِلْكَافِرِينَ سَعِيرًا ﴿١٣﴾ وَلِلَّهِ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ۚ يَغْفِرُ لِمَن يَشَاءُ وَيُعَذِّبُ مَن يَشَاءُ ۚ وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿١٤﴾ ﴾

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ سَيَقُولُ لَكَ الْمُخَلَّفُونَ مِنَ الْأَعْرَابِ شَغَلَتْنَا أَمْوَالُنَا وَأَهْلُونَا فَاسْتَغْفِرْ لَنَا ۚ يَقُولُونَ بِأَلْسِنَتِهِم مَّا لَيْسَ فِي قُلُوبِهِمْ ۚ قُلْ فَمَن يَمْلِكُ لَكُم مِّنَ اللَّهِ شَيْئًا إِنْ أَرَادَ بِكُمْ ضَرًّا أَوْ أَرَادَ بِكُمْ نَفْعًا ۚ بَلْ كَانَ اللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرًا﴾ ئەو عەرەبە کۆچەریانەی دواکەوتبوون، بەتۆ دەڵێن: دارایی و ماڵ و خێزانمان

---

[1] مريم (٧١).

[2] مريم (٧٢).

[3] مسلم (١٩٤٢/٤).

[4] مسلم (١٩٤٢/٤).

[5] الفتح (١٨).

نەیانهێشت بگەینە ئێوە، داوای بەخشینمان بۆ بکە. سەر زارەکی شتێ دەڵێن، کە لە دڵیانەوە نایە. بڵێ: ئەگەر خوا زیانێك لەئێوە با، یان بەهرەیەکتان پێ بدا، کێ دەتوانێ دەست لەکاری خودا بدا؟ بەڵکو خودا لە هەر کردەوەیێ دەیکەین، ئاگادارە. خوای گەورە پێغەمبەرەکەی خۆی (ﷺ) ئاگادار دەکاتەوە لەوانەی کە دواکەوتبون لەعەرەب کۆچەریەکان کەمانەوەیان هەڵبژارد لەناو ماڵ و منداڵیاندا نەڕۆشتن لەگەڵ پێغەمبەری خوادا (ﷺ) بیانویان بەوە دەهێنایەوە داوایان دەکرد کە پێغەمبەر داوای لێ بوردنیان بۆ بکات. ئەو داوایەشیان سەرزارەکی و خۆ پەڕانەوە بو لە بیروباوەڕیانەوە نەبو بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ سَيَقُولُ لَكَ ٱلۡمُخَلَّفُونَ مِنَ ٱلۡأَعۡرَابِ شَغَلَتۡنَآ أَمۡوَٰلُنَا وَأَهۡلُونَا فَٱسۡتَغۡفِرۡ لَنَاۚ يَقُولُونَ بِأَلۡسِنَتِهِم مَّا لَيۡسَ فِي قُلُوبِهِمۡۚ قُلۡ فَمَن يَمۡلِكُ لَكُم مِّنَ ٱللَّهِ شَيۡـًٔا إِنۡ أَرَادَ بِكُمۡ ضَرًّا أَوۡ أَرَادَ بِكُمۡ نَفۡعَۢا ﴾ واتە: کەس ناتوانێ کەشتێ خودا کردی بیگێڕێتەوە نەهێڵێ بەسەرتان بێ ئەو ئاگادارترە لەوەی کەدەی شارنەوەو لە دڵتاندایە. با لە ئێمەش بشارنەوە.بە دوو ڕوویی و سەرزارەکی. بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿بَلۡ كَانَ ٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرًا﴾ بەڵکو خودا لە هەر کردەوەیە دەیکەن ئاگادارە پاشان خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ بَلۡ ظَنَنتُمۡ أَن لَّن يَنقَلِبَ ٱلرَّسُولُ وَٱلۡمُؤۡمِنُونَ إِلَىٰٓ أَهۡلِيهِمۡ أَبَدًا وَزُيِّنَ ذَٰلِكَ فِي قُلُوبِكُمۡ وَظَنَنتُمۡ ظَنَّ ٱلسَّوۡءِ وَكُنتُمۡ قَوۡمَۢا بُورًا ﴾ نەخێر ئێوە پێتان وابوو پێغەمبەرو (ﷺ) باوەڕداران هەرگیز تازە نایەنەوە ناو ماڵ و خێزانی خۆیان. هەر بەدڵیش ئەم خەیاڵەتان بەشتێکی باش دەزانی.گومانێکی بێجاو خراپتان دەبرد. دیارە ئێوە کۆمەڵێکی زۆر بێخێر بوون. واتە: ئەو دواکەوتنەی ئێوە لەبەر دارایی و ماڵ و خێزان نەبوو یان لەبەر یاخی بون نەبو بەڵگە لەبەر دوو ڕوویی بوو واتان دەزانی کە هەموویان دەکوژرێن. بنەبڕدەبنو هیچمان لێ دەرناچێ و نامێنێ و ناگەڕێتەوە جارێکی ترو نایەتەوە ناو ماڵ و خێزانی خۆی. ﴿وَظَنَنتُمۡ ظَنَّ ٱلسَّوۡءِ وَكُنتُمۡ قَوۡمَۢا بُورًا ﴾ گومانێکی زۆر خراپتان دەبرد دیارە ئێوە کۆمەڵێکی زۆر بێ خێر بوون. ﴿قَوۡمَۢا بُورًا ﴾ کۆمەڵێکی زیانبار بون. ئیبنو عەباس و موجاهد و کەسانی تریش ئەڵێن.[1] قەتادە دەڵێت: خراپەکاران.[2] وتراویشە: ﴿بُورًا ﴾ زمانی عومانیەکانە، پاشان خودای مەزن فەرموویەتی: ﴿لَّمۡ يُؤۡمِنۢ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ فَإِنَّآ أَعۡتَدۡنَا لِلۡكَٰفِرِينَ سَعِيرًا﴾ هەر کەسێکیش بڕوای نەبێ بەخواو پێغەمبەری خودا(ﷺ)، ئێمە بۆ ئەو بێدینانە ئاگرێکی هەڵگیرساومان ئامادە کردوە. واتە: هەرکەسێ کار نەکا بەدڵسۆزی بەئاشکراو پەنهانی بۆ خودا، خوای

[1] الطبري (٢٢/٢١٤).

[2] الطبري (٢٢/٢١٤).

گەورە بەو زوانە بەئاگری بەکڵپە جەزرەبەی دەدا. هەر چەندە بەسەر زارەکی بڕوا داری خۆی دەرخستبێ بەلاّم لەڕاستیدا بە پێچەوانەی ئەوەوە کاردەکا کە دەڵێت. پاشان خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَلِلَّهِ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ يَغْفِرُ لِمَن يَشَآءُ وَيُعَذِّبُ مَن يَشَآءُ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴾ دەستەڵاتی ئەم ئاسمانانو زەمینە بەدەس خوایە کێ حەز بکا عەفووی دەکاو کێشی حەزکا جەزرەبەی دەداو خوداش لەگوناه دەبووریٚ و دلۆڤانە. پاشان خوای گەورە ڕونی دەکاتەوە کەهەر خۆی فەرمان ڕەواو خاوەنی دەستەڵاتە بەمەیلی خۆی کاروباری ئاسمانەکانوزەمین هەڵدەسوڕێنیٚ.

﴿يَغْفِرُ لِمَن يَشَآءُ وَيُعَذِّبُ مَن يَشَآءُ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴾ کێی ئارەزووی لیٚ بیٚ لێی دەبوریٚ کێشی ئارەزووی نەبیٚ سزای دەداو لیٚ بوردەیە بۆ ئەوانەی پەشیمان دەبنەوە لە گوناه و دەگەڕێنەوەو مل کەچی خۆیان بۆ خودا دەردەخەن.

**ڕێگا نەدان بەو عەرەبە کۆچەریانەی کە دواکەوتن لە حودەیبیە کەبچن بۆ ئازاد کردنی خەیبر لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ)**

﴿ سَيَقُولُ ٱلْمُخَلَّفُونَ إِذَا ٱنطَلَقْتُمْ إِلَىٰ مَغَانِمَ لِتَأْخُذُوهَا ذَرُونَا نَتَّبِعْكُمْ ۖ يُرِيدُونَ أَن يُبَدِّلُوا۟ كَلَٰمَ ٱللَّهِ ۚ قُل لَّن تَتَّبِعُونَا كَذَٰلِكُمْ قَالَ ٱللَّهُ مِن قَبْلُ ۖ فَسَيَقُولُونَ بَلْ تَحْسُدُونَنَا ۚ بَلْ كَانُوا۟ لَا يَفْقَهُونَ إِلَّا قَلِيلًا ﴿١٥﴾ ﴾

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿ سَيَقُولُ ٱلْمُخَلَّفُونَ إِذَا ٱنطَلَقْتُمْ إِلَىٰ مَغَانِمَ لِتَأْخُذُوهَا ذَرُونَا نَتَّبِعْكُمْ ۖ يُرِيدُونَ أَن يُبَدِّلُوا۟ كَلَٰمَ ٱللَّهِ ۚ قُل لَّن تَتَّبِعُونَا كَذَٰلِكُمْ قَالَ ٱللَّهُ مِن قَبْلُ ۖ فَسَيَقُولُونَ بَلْ تَحْسُدُونَنَا ۚ بَلْ كَانُوا۟ لَا يَفْقَهُونَ إِلَّا قَلِيلًا ﴾ هەر ئەوانەی دوا کەوتبوون، ئێستا دەڵێن:هەرکاتیٚ بەرەو دەسکەوتێك چوون، لێمان گەڕێن ئێمەش بەشوێن ئێوەدا بێین، دەیانەوێت قسەکەی خودا بگۆڕن. بڵێ هەرگیز ئێوە لەشوێن ئێمە نایەن. خودا لەپێشدا هەروای فەرموە ئەوسا دەڵێن نەخێر دیارە لەئاست ئێمە چاو چنۆکن. نەخێر ئەوان کەم تێدەگەن. خوای مەزن باسی ئەو عەرەبە کۆچەریانەمان بۆ دەکاکە دواکەوتن لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە ڕۆیشتن بۆ عەمرەی حودەیبیە. وەختیٚ پێغەمبەرو (ﷺ) هاوەڵەکانی ڕۆیشتن بەرەو خەیبەر ئازادی بکەن. ئەوانیش داوایان کرد کە بچن لەگەڵیان بۆ تالاّنی کردن. کاتی خۆی دواکەوتبوون لەبەربەرەکانی دوژمنو دژایەتی کردنو ئارامی بەخۆدان لە حودەیبیەدا. خوای گەورە فەرمانی دا بەپێغەمبەر کەڕێگایان نەدا وەك سزایەك بۆیان بەهۆی ئەو تاوانەی کە کردیانولە حودەیبیە دواکەوتن. چونکە خوای مەزن بەڵێنی دابە ئەو کۆمەڵەی حودەیبیە کە تەنها ئەو دەسکەوتە بۆ ئەوان بیٚ. هیچ عەرەبێکی دەشتەکی ئەوانەی کە دواکەوتن بۆی نیە

شەریکیان بکات. غەیرە ئەوە ئەبێ دروست نیەو نابێ و ڕونادا بەفەرمانوشەرعی خوای گەورە. بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿يُرِيدُونَ أَن يُبَدِّلُوا كَلَامَ اللَّهِ﴾ قەتادەو موجاهدو جوەیبیرئەڵێن: ئەو بەڵێنەیە کەخوای مەزن دای بەخەڵکی حودەیبیە، ئیبنو جەریریش هەمان ڕای هەڵبژاردوە.[1] ﴿قُل لَّن تَتَّبِعُونَا كَذَٰلِكُمْ قَالَ اللَّهُ مِن قَبْلُ﴾ واتە :بەڵێنی خودایە کەدای بەو کەسانەی کە ئامادەی حودەیبیە بوون،پێش ئەوەی ئێوە داوای دەرچون بکەن کە لەگەڵیان برۆن. ﴿فَسَيَقُولُونَ بَلْ تَحْسُدُونَنَا﴾ واتە: دەڵێن: ئەوانە چاوچنۆکن حەزناکەن ئێمە ببینە هاوبەش لەو دەسکەوتەدا لەگەڵیان. ﴿بَلْ كَانُوا لَا يَفْقَهُونَ إِلَّا قَلِيلًا﴾ واتە: بەڵکو تێگەیشتنیان نیەو بەو شێوەیەش نیە کە ئەوان وا دەزانن.

## هەواڵدان بەڕوداني غەزای زۆر کەدێتە هۆی جیا بونەوەی خاوەنباوەڕان لە دوڕوەکان

﴿قُل لِّلْمُخَلَّفِينَ مِنَ الْأَعْرَابِ سَتُدْعَوْنَ إِلَىٰ قَوْمٍ أُولِي بَأْسٍ شَدِيدٍ تُقَاتِلُونَهُمْ أَوْ يُسْلِمُونَ فَإِن تُطِيعُوا يُؤْتِكُمُ اللَّهُ أَجْرًا حَسَنًا وَإِن تَتَوَلَّوْا كَمَا تَوَلَّيْتُم مِّن قَبْلُ يُعَذِّبْكُمْ عَذَابًا أَلِيمًا ﴿١٦﴾ لَّيْسَ عَلَى الْأَعْمَىٰ حَرَجٌ وَلَا عَلَى الْأَعْرَجِ حَرَجٌ وَلَا عَلَى الْمَرِيضِ حَرَجٌ وَمَن يُطِعِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ يُدْخِلْهُ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ وَمَن يَتَوَلَّ يُعَذِّبْهُ عَذَابًا أَلِيمًا ﴿١٧﴾﴾

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿قُل لِّلْمُخَلَّفِينَ مِنَ الْأَعْرَابِ سَتُدْعَوْنَ إِلَىٰ قَوْمٍ أُولِي بَأْسٍ شَدِيدٍ تُقَاتِلُونَهُمْ أَوْ يُسْلِمُونَ فَإِن تُطِيعُوا يُؤْتِكُمُ اللَّهُ أَجْرًا حَسَنًا وَإِن تَتَوَلَّوْا كَمَا تَوَلَّيْتُم مِّن قَبْلُ يُعَذِّبْكُمْ عَذَابًا أَلِيمًا﴾ بەو عەرەبە کۆچەریانەی کە پێشترخۆیان دزیەوە بڵێ: هەر لەم بەیتانەدا بانگتان دەکەن، بچنە سەر گەلێکی ئازا لەشەڕا یان هەر شەڕتان لەگەڵ دەکەن، یان خۆ بەدەستەوە دەدەن. جا ئەگەر ئێوە بەفەرمان بن، لەخوداوە پاداشێکی باش وەردەگرن، ئەگەر خۆشتان بدزنەوە، وەك پێشو خۆتان دزیەوە دەتانخاتە بەر سزایەکی بەژان. زانایانی تەفسیر ڕایان جیاوازە لەسەر ئەو گەلەی کەئەم عەرەبە کۆچەرانەی بۆ بانگ دەکرێ کە گەلێکی شەڕانی و ئازار و نەترسن بەچەند ڕایەك: یەکەم هەوازینن ئەوانە. کە شوعبە ڕیوایەتی کردوە لە ئەبو بیشرەوە ئەمیش لەسەعدی کوڕی جوبەیرەوە یالە عیکریمەوە یا لە هەمویانەوە[2]. وە هەشیم ڕیوایەتی کردوە لە ئەبو بیشرەوە لەهەردوکیانەوە[3] قەتادەیش هەروای ووتوە لەڕیوایەتێکیدا[4]. دوهەم: سەقیف زەححاك ئەڵێت. سێ هەم: بەنو حەنیفە جوەیبیر ووتویەتی و محمدی

---

[1] الطبري (٢٢/٢١٥).

[2] الطبري(٢٢/٢٢٠).

[3] الطبري (٢٢/٢٢٠).

[4] الطبري (٢٢/٢٢٠).

کوڕی ئیسحاقیش ڕیوایەتی کردوە لە زەهەریەوە[1] هەر بەو شێوەیە لەسعیدو عیکریمەوە ڕیوایەت کراوە.[2] چوارەم: ئەوانە خەڵکی فارسن. عەلی کوڕی ئەبو تەلحە ڕیوایەتی کردوە لە ئیبنو عەباسەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) وەلەیەکێ لەڕیوایەتەکاندا عەتاو موجاهیدو عیکریمەیش هەر بەو شێوەیە ڕیوایەتیان کردوە لە ئیبنو عەباسەوە[3]. کەعبی ئەحبار دەڵێت: ئەو گەلە ڕۆمە[4] وەلە کوڕی ئەبو لەیلاو (عەتاو حەسەنوقەتادەوە ڕیوایەت کراوە ئەڵێن: ئەوانە فارسیو ڕۆمن.[5] وەلە موجاهیدەوە دەڵێت: ئەوانە کۆمەڵی بتپەرستانن.[6] وە هەر لە موجاهیدەوە. ئەوانە کەسانێکن زۆر ئازاو شەڕانین. دەستەیەکی تایبەتی دیاری نەکراون ئیبنو جورەیجیش هەروای گوتوەو ئیبنو جەریریش هەمان ڕای هەڵبژاردوە. خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿تُقَٰتِلُونَهُمۡ أَوۡ يُسۡلِمُونَ﴾ واتە:خوای گەورە بڕیاری غەزاو شەڕی داوە کەبیکەن لەگەڵیان بەبەردەوامی و بێ ماندوبون لەگەڵیانوسەرکەوتنیش بۆ ئێوەیە یا خۆیان دەدەن بەدەستەوە دێنە سەر ئاینی ئێوە بەبێ شەڕ بە ئارەزوی خۆیان. پاشان خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَإِن تُطِيعُواْ﴾ واتە: ئەگەر بەر فەرمان بونوچون بۆ غەزا بەباشی ئەوەی لەسەرتانە بەجێتان هێنا لەو جەنگەدا. ﴿يُؤۡتِكُمُ ٱللَّهُ أَجۡرًا حَسَنٗاۖ وَإِن تَتَوَلَّوۡاْ كَمَا تَوَلَّيۡتُم مِّن قَبۡلُ﴾ واتە: ئەگەر خۆتان دزیەوە وەك لە حودەیبیە خۆتان دزیەوە لەپێشەوە. ﴿يُعَذِّبۡكُمۡ عَذَابًا أَلِيمٗا﴾ خوای گەورە سزاتان دەدا سزایەکی بەژان.

**ئەو هۆکارانەی دەبێتە ڕێگر لەچون بۆ غەزا کردن بە مەرجێ کە گوێ ڕایەڵی فەرمانی خوداو پێغەمبەرەکەی تێدا بێ (ﷺ)**

پاشان خودای مەزن باسی ئەو مۆڵەتە شەرعیانە دەکا بۆ غەزا نەکردنو وازهێنان لێی یەکێ لەو مۆڵەتە پێویستانە کە بەردەوامە وەك کوێری و شەلی. مۆڵەتێکی تر کە کاتیەو بەردەوام نیەو لەناکاو ڕودەداو پاشان نامێنێ وەك نەخۆشی لەکاتی نەخۆشیەکەدا پێویستە پاش چاك بونەوە مۆڵەتەکە نامێنێ. پاشان خوای گەورە موسوڵمانان هەڵدەنێ بۆ غەزا کردنوگوێڕایەڵی خوداو پێغەمبەرەکەی (ﷺ) ئەفەرموێت: ﴿لَّيۡسَ عَلَى ٱلۡأَعۡمَىٰ حَرَجٞ وَلَا عَلَى ٱلۡأَعۡرَجِ حَرَجٞ وَلَا عَلَى ٱلۡمَرِيضِ حَرَجٞۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ

---

[1] الطبري (٢٢/٢٢٠).

[2] الطبري (٢٢/٢٢٠).

[3] الطبري (٢٢/٢١٩) القرطبي (١٦/٢٧٢).

[4] الطبري (٢٢/٢٢١).

[5] الطبري (٢٢/٢١٩).

[6] الدر المنثور (٧/٥٢٠).

﴿يُدْخِلْهُ جَنَّٰتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ ۖ وَمَن يَتَوَلَّ يُعَذِّبْهُ عَذَابًا أَلِيمًا﴾ گازندە لە کوێر ناکرێ، گلەیش لەسەر شەل نیە، لەشی بە باریش قەیدی ناکات. هەر کەسێکیش بەفەرمانی خوداو پێغەمبەری (ﷺ) ئەو بکات. دەینێرێتە ناو باغاتێك ڕوباریان بەبەردا دەڕوات. هەر کەسێکیش خۆ ببوێرێ جەزرەبەی بەژانی دەدا. ﴿وَمَن يَتَوَلَّ﴾ هەر کەسێ خۆی بدزێتەوەو ڕوو بکاتە ژیانی دنیا. ﴿يُعَذِّبْهُ عَذَابًا أَلِيمًا﴾ لەدنیا سەر شۆڕی دەکاتو لەدوا ڕۆژیشدا جەزرەبەی بەژانی دەدا. خوای گەورە خۆشی دەزانێ.

**مژدە بەڕەزامەندی خوداو گرتنی تالانی بۆ ئەو خەڵکەی پەیمانیان دا لەژێر دارەکەدا بە پێغەمبەر(ﷺ)**

﴿لَّقَدْ رَضِيَ ٱللَّهُ عَنِ ٱلْمُؤْمِنِينَ إِذْ يُبَايِعُونَكَ تَحْتَ ٱلشَّجَرَةِ فَعَلِمَ مَا فِي قُلُوبِهِمْ فَأَنزَلَ ٱلسَّكِينَةَ عَلَيْهِمْ وَأَثَٰبَهُمْ فَتْحًا قَرِيبًا ﴿١٨﴾ وَمَغَانِمَ كَثِيرَةً يَأْخُذُونَهَا ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا ﴿١٩﴾﴾

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿لَّقَدْ رَضِيَ ٱللَّهُ عَنِ ٱلْمُؤْمِنِينَ إِذْ يُبَايِعُونَكَ تَحْتَ ٱلشَّجَرَةِ فَعَلِمَ مَا فِي قُلُوبِهِمْ فَأَنزَلَ ٱلسَّكِينَةَ عَلَيْهِمْ وَأَثَٰبَهُمْ فَتْحًا قَرِيبًا﴾ ئەو دەستە خاوەن باوەڕەی کەوا لەژێر دارەکەدا لەگەڵتدا بوونە هاوپەیمان خودایان لێ ڕازی بووە، دەیزانێ چیان لە دڵدایە. سا ئۆقرەو دڵنیایی ناردە سەریان وبەسەرکەوتنێکی نزیك پاداشتی دان. خوای مەزن باسی ڕازی بوونی خۆی دەکات لەگەڵ ئەوانەی کە پەیمانیان دابە پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە ژێر دارەکەدا لە پێشەوە باسی ژمارەیان کرا کە هەزارو چوارسەد کەس بوون. درەختەکەیش سەمرە بو لە حودەیبیە بوخاری ڕیوایەتی کردوە لە تاریقی کوڕی عبدالرحمانەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێت: ڕۆیشتم بۆ حەج دام بەلای کۆمەڵێکا نوێژیان دەکرد گوتم: ئەم مزگەوتە کامەیە؟ گوتیان ئەو درەختەیە کە لێرەدا پێغەمبەری خوا (ﷺ) پەیمانی تیا وەرگرت پەیمانی ڕازی بون (بیعة الرضوان) چومە لای سعیدی کوڕی موسەیب هەواڵم دایە. سەعید دەڵێت: باوکم بۆی گێڕامەوە کەکێ بو لەوانەی پەیمانی بەپێغەمبەردا (ﷺ) لەژێر ئەو دارەدا. دەڵێت: کاتێ ساڵی دوایی ڕۆیشتین درەختەکەمان ون کرد نەمان دەزانی لەکوێ دایە. سەعید دەڵێت: هاوەڵەکانی محمد(ﷺ) نەیان دەزانی.ئێوە پیشانیان دەدەن. ئێوە باشتر دەزانن[1] خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿فَعَلِمَ مَا فِي قُلُوبِهِمْ﴾ واتە: خودا دەیزانێ چیان لەدڵدایە لەڕاستی و بەوەفایی و گوێ ڕایەڵی و بەرفەرمانی. ﴿فَأَنزَلَ ٱلسَّكِينَةَ﴾ ئارامی خستە دڵیان. ﴿عَلَيْهِمْ وَأَثَٰبَهُمْ فَتْحًا قَرِيبًا﴾ پاداشی دانەوە بەوەی کە خودا لەسەر دەستی ئەواندا ئاشتی و ڕێکەوتنی وەدی هێنا لەنێوان

[1] فتح الباری (٥١٢/٧) ص (١٢٩٠)

ئەوان‌ودوژمنەكانياندا. وە ئەو هەموو خێرو بێرە زۆرو بەردەوامەی بۆ فەراهەم هێنان لەسەرکەوتنی خەیبەرو سەرکەوتنی مەککە لەدوای یەكو پاشان ئازادکردنی ولآتو هەرێمەکانی تر وە ئەوی کەوەدەستیان هێنا لەسەر بەرزی و سەرکەوتن‌وپایەبەرزی لەدنیاو دوا ڕۆژدا. بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ وَمَغَانِمَ كَثِيرَةً يَأْخُذُونَهَا ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا ﴾ دەسکەوتی زۆریشیان دەست دەکەوێ خودا خاوەندەستەلآتی کارزانە.

### مژدەی دەست کەوتنی دەسکەوتی زۆر

﴿ وَعَدَكُمُ ٱللَّهُ مَغَانِمَ كَثِيرَةً تَأْخُذُونَهَا فَعَجَّلَ لَكُمْ هَٰذِهِۦ وَكَفَّ أَيْدِىَ ٱلنَّاسِ عَنكُمْ وَلِتَكُونَ ءَايَةً لِّلْمُؤْمِنِينَ وَيَهْدِيَكُمْ صِرَٰطًا مُّسْتَقِيمًا ﴿٢٠﴾ وَأُخْرَىٰ لَمْ تَقْدِرُوا۟ عَلَيْهَا قَدْ أَحَاطَ ٱللَّهُ بِهَا ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرًا ﴿٢١﴾ وَلَوْ قَٰتَلَكُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَوَلَّوُا۟ ٱلْأَدْبَٰرَ ثُمَّ لَا يَجِدُونَ وَلِيًّا وَلَا نَصِيرًا ﴿٢٢﴾ سُنَّةَ ٱللَّهِ ٱلَّتِى قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلُ ۖ وَلَن تَجِدَ لِسُنَّةِ ٱللَّهِ تَبْدِيلًا ﴿٢٣﴾ وَهُوَ ٱلَّذِى كَفَّ أَيْدِيَهُمْ عَنكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ عَنْهُم بِبَطْنِ مَكَّةَ مِنۢ بَعْدِ أَنْ أَظْفَرَكُمْ عَلَيْهِمْ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرًا ﴿٢٤﴾ ﴾

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ وَعَدَكُمُ ٱللَّهُ مَغَانِمَ كَثِيرَةً تَأْخُذُونَهَا فَعَجَّلَ لَكُمْ هَٰذِهِۦ وَكَفَّ أَيْدِىَ ٱلنَّاسِ عَنكُمْ وَلِتَكُونَ ءَايَةً لِّلْمُؤْمِنِينَ وَيَهْدِيَكُمْ صِرَٰطًا مُّسْتَقِيمًا ﴾ خودا بەڵێنی گەلێ دەسکەوتی(پێتان داوە کەدەیگرن، بەلآم زووتر ئەمەی داپێتان‌ونەیهێشت دەستی خەڵکیتان بگاتێ و تا نیشانەیەكیش بێ بۆ خاوەنباوەڕەکان‌وبۆ ڕاستەڕێ زۆرتر شارەزاتان بکات. موجاهید لەم ئایەتەدا: ﴿ وَعَدَكُمُ ٱللَّهُ مَغَانِمَ كَثِيرَةً تَأْخُذُونَهَا ﴾ خوای گەورە بەڵێنی دەسکەوتی زۆری پێداون کەدەستتان دەکەوێ. واتە هەموو دەسکەوتێك تا ئەمڕۆ، ﴿فَعَجَّلَ لَكُمْ هَٰذِهِۦ﴾ واتە: سەرکەوتنی خەیبەر[1]، عەوفی ڕیوایەتی کردوە لەئیبنو عەباسەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) ﴿فَعَجَّلَ لَكُمْ هَٰذِهِۦ﴾ واتە ڕێکەوتن نامەی حودەیبیە[2].

﴿وَكَفَّ أَيْدِىَ ٱلنَّاسِ عَنكُمْ﴾ واتە: نەیهێشت دوژمنەکانتان زیانتان پێ بگەیەنن لەوەی کەلەدڵیاندا دەریان نەدەخست لە دژایەتی و شەڕکردن لەگەڵتاندا. هەروەها نەشی هێشت دەستیان بگاتە ئەوانەی کە بەجێتان هێشتبون لەماڵو منداڵ و خێزانەکانتان. ﴿وَلِتَكُونَ ءَايَةً لِّلْمُؤْمِنِينَ﴾ واتە: بۆ ئەوەی پەندو نیشانەش بێ بۆ خاوەنباوەڕان کە خوای گەورە پاراستنی‌و سەری خستن بەسەر هەموو دوژمنەکاندا

[1] الطبري (٢٢/٢٣٠).

[2] الطبري (٢٢/٢٣٠).

لەگەڵ کەمی ژمارەشیاندا. وە هەر ئەوەش باشە کە خودا دایناوە بۆ بەندە خاوەنباوەڕەکانی هەرچەندە بە لاشیانەوە ناخۆش و گران بێ لە ڕواڵەتدا. وەك خوای مەزن ئەفەرمێت: ﴿وَعَسَىٰٓ أَن تَكۡرَهُواْ شَيۡـًٔا وَهُوَ خَيۡرٞ لَّكُمۡ﴾[1] واتە: وە ئەگونجێ شتێکتان پێ ناخۆش بێت و باش بێ بۆتان.وە ئەفەرموێت: ﴿وَيَهۡدِيَكُمۡ صِرَٰطٗا مُّسۡتَقِيمٗا﴾ شارەزای ڕاستەڕێتان دەکت بەهۆی گوێ ڕایەڵیتان بۆ فەرمانی خواو لانەدان لەفەرمانی و شوێن کەوتنی پێغەمبەرەکەی (ﷺ).

## مژدەدان بەسەرکەوتنی زۆر هەتا ڕۆژی قیامەت

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَأُخۡرَىٰ لَمۡ تَقۡدِرُواْ عَلَيۡهَا قَدۡ أَحَاطَ ٱللَّهُ بِهَاۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٗا﴾ تدەسکەوتێکی تریش هەیە.هێشتا دەستان پێ نەگەیوەو، خودا باش ئاگای لێیەو، خوا هەموو کاری پێدەکرێت. واتە: دەسکەوتێکی ترو سەرکەوتنێکی تر کەدیاری کراوە کە ئێوە هێشتا دەستان پێی نەگەیوە،خوای گەورە بۆتان ئاسان دەکاو نامێڵێ لەدەستان دەربچێ. چونکە خوای مەزن بژێوی بەندە پارێزەرەکانی خۆی دەدا بەشێوەیەك کە خۆیان هەر بەخەیاڵیشیاندا نەهاتوە. زانایانی تەفسیر جیاوازیان هەیە لەڕاو بۆچوندا لەبارەی ئەم دەسکەوتەوەو مەبەست پێی کامەیە. عەوفی دەڵێت لەئیبنو عەباسەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەسکەوتی خەیبەرە[2]، ئەمە لەسەر ئەو قسەیەی کە وتی لەو فەرمودەی خودا ﴿فَعَجَّلَ لَكُمۡ هَٰذِهِۦ﴾ واتە ڕێکەوتن نامەی حودەیبیە. زەحاك و ئیبنو ئیسحاق و عبدالرحمانی کوڕی زەیدی کوڕی ئەسلەمیش هەر وایان وتوە[3]. قەتادە دەڵێت: مەککەیە ئیبنو جەریر هەمان ڕای هەڵبژاردوە[4]. ئیبنو ئەبی لەیلاو حەسەنی بەسری ئەڵێن: فارس و ڕۆمە[5]. موجاهید دەڵێت: هەموو تالآنی و سەرکەوتنێکە تا ڕۆژی قیامەت.[6] ئەبو داودی تیالیسی ڕیوایەتی کردوە لەئیبنو عەباسەوە (ڕەزای خوایان لێ بێ) ﴿وَأُخۡرَىٰ لَمۡ تَقۡدِرُواْ عَلَيۡهَا قَدۡ أَحَاطَ ٱللَّهُ بِهَا﴾ دەڵێت: ئەم سەرکەوتنانەیە کەبەدەست دێن تا ئەمڕۆ[7].

---

[1] البقرة (٢١٦).

[2] الطبري (٢٢/٢٣٣).

[3] الطبري (٢٢/٢٣٣/٢٣٤).

[4] الطبري (٢٢/٢٣٤).

[5] الطبري (٢٢/٢٣٣).

[6] الطبري (٢٢/٢٣٣).

[7] عند الطبري بهذا الطريق قال: فارس والروم وعن مجاهد: فافتحر حتى اليوم (٢٢/٢٣٣/٠).

## ئەگەر خوانەناسنی مەککە شەڕیان بکردایە لە حودەیبییەدا ڕایان دەکردو خۆیان پێ نەدەگیرا

خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ وَلَوْ قَٰتَلَكُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَوَلَّوُا۟ ٱلْأَدْبَٰرَ ثُمَّ لَا يَجِدُونَ وَلِيًّا وَلَا نَصِيرًا ﴾ ئەگەر ئەو خوانەناسانە شەڕیان لەگەڵتان بکردایە، سور بزانن پشتیان دەکردە مەیدانو ڕایان دەکرد. لەپاشانیش نە دۆستێکیان دەس دەکەوتو نەکەس بەهانایان دەهات. خوای گەورە مژدە دەدا بەبەندە خاوەنباوەڕەکانی ئەگەر بتپەرستەکان شەڕیان بکردایە، خوداو پێغەمبەکەی و (ﷺ) خاوەنبڕوایان سەردەکەوتن بەسەریاندا. سوپای خوانەناسان دەشکاو بەرەو دوا ڕایان دەکرد نەدۆستێکیان دەست دەکەوت یارمەتیان بدات و نەکەسیش دەهات بەهاواریانەوە. پاشان خودای گەورە دەفەرمێت: ﴿ سُنَّةَ ٱللَّهِ ٱلَّتِى قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلُ ۖ وَلَن تَجِدَ لِسُنَّةِ ٱللَّهِ تَبْدِيلًا ﴾. یاسایەکە لەخوداوەو لەپێشووشدا هەر وابوەو لەو یاسای خودا دایناوە هەرگیز گۆڕانێك نابینی واتە: ئەم یاسای خوایە کاری خۆیەتی لەناو دروست کراوەکانیا هەرکاتێ خوانەناس و خاوەن بڕوایان لەهەر شوێنێکا ڕوبەڕوی یەك بوبونەوە بێ گومان خوای گەورە باوەڕی زاڵ کردوە بەسەر بێ دینیدا هەق سەر کەوتوەو بەتاڵیش ژێر کەوتوەو پوچەڵ بوەتەوە.وەك چۆن خوای گەورە خاوەنباوەڕان لەجەنگی بەدردا زاڵ کرد بەسەر دوژمنەبتپەرستەکانداو لەگەڵ کەمی ژمارەی موسوڵمانانوزۆری ژمارەی بتپەرستەکاندا.خوای گەورە ئەفەرمووێت: ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى كَفَّ أَيْدِيَهُمْ عَنكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ عَنْهُم بِبَطْنِ مَكَّةَ مِنۢ بَعْدِ أَنْ أَظْفَرَكُمْ عَلَيْهِمْ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرًا ﴾ هەر ئەویش بوو لە دەست ئەوانی پاراستنو ئەوانیش لەدەست ئێوە. وەختێ لە دەروازەی مەککە خودا کردی و ئێوە بەسەریاندا زاڵ بوون.ئێوە هەر کارێکتان دەکرد.خودا دەیدیت. ئەمە منەت کردنی خودایە کە دەیکات بەسەر بەندە خاوەنباوەڕەکانیدا کاتێ لە دەستی بتپەرستان ڕزگاری کردن نەیهێلا دەستی دوژمنانیان پێ بگات. وە نەشی هێشت موسوڵمانان لەگەڵیاندا شەڕ بکەن لە مەککەی پیرۆز خوای گەورە هەردوولای پاراستو ڕێکەوتن نامەی خستە نێوانیان کە خێری تێدابوو بۆ موسوڵمانان لە پاشەڕۆژدا. لە دنیاو ڕۆژی دوایدا. لە پێشەوە لە فەرموودەکەی سەلەمەی کوڕی ئەکوەعدا باس کرا کاتێ کە هاتن بەو حەفتا دیلەوە کە لەبەر دەستی پێغەمبەردا (ﷺ) قۆڵ بەستیان کردبون، پێغەمبەری خودا(ﷺ) سەیری کردنوفەرموی: (بەرەلایان بکەن با بەدکاری و کینەبازی لەوانەوە دەست پێبکاو دەرکەوێ). دەڵێت: لەبەر ئەوە ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە: ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى كَفَّ أَيْدِيَهُمْ عَنكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ عَنْهُم ﴾ ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لەئەنەسی کوڕی مالکەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) لەڕۆژی حودەیبیەدا بو هەشتا پیاو دابەزینە سەر پێغەمبەرو (ﷺ) هاوەڵەکانی بەچەکەوە لەڕوی کێوی تەنعیمەوە دەیان ویست لەناکاو بدەن بەسەر پێغەمبەری

خودا(ﷺ)پێغەمبەر(ﷺ) دوعای لێ کردن‌وهەموویان دەست گیر کران عەفان دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) عەفوی کردن‌وئەم ئایەتە هاتە هاتە خوارەوە﴿وَهُوَ ٱلَّذِي كَفَّ أَيۡدِيَهُمۡ عَنكُمۡ وَأَيۡدِيَكُمۡ عَنۡهُم بِبَطۡنِ مَكَّةَ مِنۢ بَعۡدِ أَنۡ أَظۡفَرَكُمۡ عَلَيۡهِمۡ﴾[1] موسلم ڕیوایەتی کردوەو ئەبو داودو تیرمیزی و نەسائیش ڕیوایەتیان کردوە لە سوننەکەیاندا[2].

**پەیماننامەی حودەیبیە بەرژەوەندی زۆری تێدابو لەگەڵ ئەوەشدا موسوڵمانان خاوەنی حەق بوون‌وزاڵیش دەبون**

﴿هُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَصَدُّوكُمۡ عَنِ ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡحَرَامِ وَٱلۡهَدۡيَ مَعۡكُوفًا أَن يَبۡلُغَ مَحِلَّهُۥۚ وَلَوۡلَا رِجَالٞ مُّؤۡمِنُونَ وَنِسَآءٞ مُّؤۡمِنَٰتٞ لَّمۡ تَعۡلَمُوهُمۡ أَن تَطَـُٔوهُمۡ فَتُصِيبَكُم مِّنۡهُم مَّعَرَّةُۢ بِغَيۡرِ عِلۡمٖۖ لِّيُدۡخِلَ ٱللَّهُ فِي رَحۡمَتِهِۦ مَن يَشَآءُۚ لَوۡ تَزَيَّلُواْ لَعَذَّبۡنَا ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنۡهُمۡ عَذَابًا أَلِيمًا ﴿٢٥﴾ إِذۡ جَعَلَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فِي قُلُوبِهِمُ ٱلۡحَمِيَّةَ حَمِيَّةَ ٱلۡجَٰهِلِيَّةِ فَأَنزَلَ ٱللَّهُ سَكِينَتَهُۥ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ وَعَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ وَأَلۡزَمَهُمۡ كَلِمَةَ ٱلتَّقۡوَىٰ وَكَانُوٓاْ أَحَقَّ بِهَا وَأَهۡلَهَاۚ وَكَانَ ٱللَّهُ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٗا ﴿٢٦﴾﴾

خودای مەزن فەرموویەتی: ﴿هُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَصَدُّوكُمۡ عَنِ ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡحَرَامِ وَٱلۡهَدۡيَ مَعۡكُوفًا أَن يَبۡلُغَ مَحِلَّهُۥۚ وَلَوۡلَا رِجَالٞ مُّؤۡمِنُونَ وَنِسَآءٞ مُّؤۡمِنَٰتٞ لَّمۡ تَعۡلَمُوهُمۡ أَن تَطَـُٔوهُمۡ فَتُصِيبَكُم مِّنۡهُم مَّعَرَّةُۢ بِغَيۡرِ عِلۡمٖۖ لِّيُدۡخِلَ ٱللَّهُ فِي رَحۡمَتِهِۦ مَن يَشَآءُۚ لَوۡ تَزَيَّلُواْ لَعَذَّبۡنَا ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنۡهُمۡ عَذَابًا أَلِيمًا﴾ هەر ئەوان بوون کەلەڕێگای دین لایانداو بوونە لەمپەرو نەیانهێشت بچنە کەعبە، ڕێشیان نەدا قوربانیەکەتان بگاتە شوێنی خۆی (ئەگەر ئیزنمان بدایە لەمەککە بچن بەگژیاندا) لەوانە بوو زۆر مێردو ژنی باوەڕدار لەبەر پێ یاندا لەناو بچن‌وبێ ئەوەی خۆتان بزانن توشی ئەوان ببن خودا هەرکێ خۆی حەز دەکا دەیخاتە بەر بەزەیی خۆی. ئەگەر لەو شوێن لاچوبان، بێ گومان خوا نەناسەکانمان بەئازارێکی بەژان دوچار دەکردن. خودای مەزن باسی خوا نەناسەکانمان بۆ دەکا لەبت پەرستە عەرەبەکانی قورەیشی و ئەوانەی کە حەز دەکەن یارمەتیان بدەن لەدژی پێغەمبەرو (ﷺ) ئەفەرموێت: ﴿هُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ واتە:ئەو خوانەناسانەی کەتەنها ئەوان ﴿وَصَدُّوكُمۡ عَنِ ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡحَرَامِ﴾ بوونە لەمپەرو ڕێیان لێ گرتن برۆنە ماڵی خودا کە ئێوە دەبوو تێیدا بن چونکە لە ڕاستیدا ئێوە خەڵکی ئەو شوێنەن ﴿وَٱلۡهَدۡيَ مَعۡكُوفًا أَن

---

[1] احمد (٣/١٢٢) فەرمودەیەکی سەحیحە.

[2] مسلم (٣/١٤٤٢/٣/١٣٧). تحفة الاحوذی (٩/١٤٩) النسائي فی الكبری (٦/٤٦٤).

﴿يَبۡلُغَ مَحِلَّهُۥ﴾ وە نەیانهێشت کە قوربانیەکە بگاتە شوێنی خۆی. ئەمەیش لەستەمکاری و لاساریانەوە بوە ئەو قوربانیانەی کە گلیان دابوەوە حەفتا وشتر بو. کە بەم زوانە باسیان دێ انشاالله تعالی.

خودای مەزن ئەفەرمووێت: ﴿وَلَوۡلَا رِجَالٞ مُّؤۡمِنُونَ وَنِسَآءٞ مُّؤۡمِنَٰتٞ﴾ ئەگەر پیاوو ژنانی خاوەن باوەڕ نەبوونایە لە ناویاندا کە باوەڕەکەی ئاشکرا نەکردبوو لە ترسی ئەوانو لەبەر گیانی خۆیان. زاڵمان دەکردن بەسەریاندا دەتان کوشتنو هەمووتان لەناو دەبردن بەلاَم لە نێوان ئەواندا پیاوانو ژنانی موسوڵمان هەبوون لەو کاتی شەڕو کوشتنەکەدا نەتان دەناسین بۆیە خوای مەزن فەرموویەتی: ﴿لَّمۡ تَعۡلَمُوهُمۡ أَن تَطَـُٔوهُمۡ فَتُصِيبَكُم مِّنۡهُم مَّعَرَّةُۢ﴾ واتە: ئێوە نەتان ناسیونو دەبوون بەژێر پێتانەوەو تووشی گوناه و تاوان دەبون ﴿بِغَيۡرِ عِلۡمٖ﴾ بەبێ ئەوەی خۆتان ئاگاداربن. ﴿لِّيُدۡخِلَ ٱللَّهُ فِي رَحۡمَتِهِۦ مَن يَشَآءُ﴾ واتە: خودا تۆڵەکەی دواخستن بۆ ئەوەی خاوەن باوەڕەکان ڕزگاریان ببێ لەناویانداو زۆریشیان بگەڕێنەوەو موسوڵمان ببن.پاشان خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿لَوۡ تَزَيَّلُواْ﴾ خۆ ئەگەر خاوەن باوەڕەکان جیابونایەتەوە لەخوانەناسەکان کەتێکەلاَو بون. ﴿لَعَذَّبۡنَا ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنۡهُمۡ عَذَابًا أَلِيمًا﴾ زاڵمان دەکردن بەسەریانداو دەتان کوشتن بەشێوەیەك کە قڕتان تێ دەخستنو کوشتارێکی زۆرتان لێ دەکردن. خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿إِذۡ جَعَلَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فِي قُلُوبِهِمُ ٱلۡحَمِيَّةَ حَمِيَّةَ ٱلۡجَٰهِلِيَّةِ فَأَنزَلَ ٱللَّهُ سَكِينَتَهُۥ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ وَعَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ وَأَلۡزَمَهُمۡ كَلِمَةَ ٱلتَّقۡوَىٰ وَكَانُوٓاْ أَحَقَّ بِهَا وَأَهۡلَهَاۚ وَكَانَ ٱللَّهُ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٗا﴾ ئەوساخوانەناسەکان بادی هەوایی نەزانانەیان نواند، خودا ئۆقرەو هێمنایەتی ناردە خوارێ بۆ ناو دڵی پێغەمبەری و باوەڕدارانی و وای کرد کە خۆپارێزبنو بۆ ئەم کارەش لە هەموو کەس شیاوترو شایستەتر بوون.خودا بۆ هەمووشت زانایە. واتە: ئەوە وەختێك بەکە خوانەناسەکان بادی هەواییان دەنواندو خۆیان هەڵدەبڕی و ڕازی نەدەبون کە (بسم الله الرحمن الرحيم) بنوسن. وە ڕازی نەبوون بنوسن کە ئەمە ئەو پەیمانەیە کە محمد پێغەمبەری خودا(ﷺ) داویەتی. ﴿فَأَنزَلَ ٱللَّهُ سَكِينَتَهُۥ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ وَعَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ وَأَلۡزَمَهُمۡ كَلِمَةَ ٱلتَّقۡوَىٰ﴾ خودا ئارامی ناردە سەر دڵی پێغەمبەرەکەی و خاوەنباوەڕان. ﴿وَأَلۡزَمَهُمۡ كَلِمَةَ ٱلتَّقۡوَىٰ﴾ موجاهید دەڵێت:واتە: دڵسۆزی (الاخلاص)[1] عەتای کوڕی ئەبو ریباح دەڵێت (كلمة التقوى) واتە: (لا اله الا الله وحده لاشريك له لهُ

[1] الطبری (٢٢/٢٥٥) ص (١٢٩٢)

الملك ولە الحمد وهو علی كل شی و قدیر)[1]، یونسی كوڕی بوكەیر دەڵێت: لەئیبنو ئیسحاقەوە لەزەهەریەوە لەعورووەوە لە میسوەرەوە دەڵێت ﴿وَأَلْزَمَهُمْ كَلِمَةَ التَّقْوَىٰ﴾ واتە: (لا الە الا الله وحدة لاشریك لە، لە ُالملك ولەُ الحمد وهوعلی كل شیء قدیر).

## ئەمە باسی ئەو فەرمودانەیە كەهاتوە لەسەر حودەیبییەو ڕوداوی ڕێكەوتن نامەك

بوخاری لەسەحیحەكەیدا ڕیوایەتی كردوە لەكتێبی مەرجەكاندا لە میسوەری كوڕی مەغرەمەوە مەروانی كوڕی حەكەمەوە هەردوكیان قسەی یەكتریان پەسەند كردوە گوتیان: پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە وەختی حودەیبییەدا بەهەزارو چوارسەد كەسەوە لە هاوەڵەكانی، كاتێ گەیشتنە زول حەلیفە ئیحرامی عەمرەیان بەستو وشتری قوربانیان پێش خۆداو دەستیان كرد بەكارەكانی عەمرەكردن پیاوێكی خوزاعەیی نارد تا هەواڵی مەككەییەكانی بۆ بێنێتەوە.خۆیشیان ڕۆیشتن تا چونە غەدیرل ئەشتات پیاوەكە هاتەوە بۆلای پێغەمبەرو (ﷺ) دەڵێت:قورەیش سوپایەكی زۆری كۆكردوەتەوە بۆتو كۆمەڵێ ئەحابیشیشی بۆ هێناون (ئەحابیش لەهۆزی بەنی حارسی كوڕی عبدومەنامی كوڕی كینانە بوون ولەدەرەوەی مەككەدا دەژیان وهاوپەیمانی قورەیشی بوون) شەڕت لەگەڵ دەكەن ودەبنە لەمپەر و ڕێگات نادەن بچیتە مەككەوە. پێغەمبەر(ﷺ) فەرموی: (خەڵكینە ڕاتان چیە؟ بەلاتانەوە چۆنە پەلاماری ماڵ و منداڵی ئەوانە بدەین دەیانەوێ ببنە ڕێگرمان كە بچینە ناو ماڵی خودا؟) ئەبو بەكر (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێت: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەرچوویت نیازت كردوە بچیتە ئەم ماڵە (ئەم كەعبەیە) ناتەوێ كەس بكوژی و شەڕیش بكەی. بەرەو ئەوێ بڕۆ هەركەسێ بوە لەمپەر شەڕی لەگەڵ دەكەین.لەوتەیەكی ترا هاتوە:ئەبوبەكر (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێت: خوداو پێغەمبەری خودا دەزانن، ئێمە تەنها بۆ عەمرە هاتوین نەهاتوین شەڕ لەگەڵ هیچ كەس بكەین، بەلام هەركەسێ بووە لەمپەر لەنێوان ئێمەو كەعبەدا شەڕی لەگەلا دەكەین. پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموی: (كەوابو بڕۆن)، وەلە ووتەیەكی تردا هاتوە: (بەناوی خوای گەورە بڕۆن)، هەتا كاتێ كەهەندێ ڕێیان بڕیبوو پێغەمبەر(ﷺ) فەرموی: (خالدی كوڕی وەلید بەچەند سوارێكەوە هاتون بۆ هەواڵ زانینی بەرەو لای ڕاست بڕۆن وئاگاداری ئەو ناوچەیەبن. سوێند بەخوا خالد پێی نەزانی هەتا كاتێ چونە نزیك سوپاكەی قوریش.بەپەلە ڕایان كردو گەرانەوە بۆلای قورەیشیەكان وئاگاداریان كردن.پێغەمبەری خودا(ﷺ) ڕۆیشت تاگەیشتە شوێنێك كە پێی دەڵێن: (نیەتل موران) كەلەوێوە دەچیتە خوارەوە بۆیان. لەوێدا وشترەكەی پێغەمبەر(ﷺ) خەوتو هەرچی تێ یان خوڕی هەڵ نەسا. خەڵكەكە گوتیان: فێرە خەو بوە، فێرەخەو بوە.پێغەمبەر(ﷺ) فەرموی: (نەخێر فێرە خەو نەبوەو ئەم خەوەیش نەبوە. بەلام

---

[1] الطبری (٢٢/٢٥٦) ص (١٢٩٢)

بەند کەری فیل بەندی کردوە.پاشان پێغەمبەر(ﷺ) فەرموی:سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە قورەیشی داوای هەرچیم لێ بکەن کەڕێزی کەعبەی تیابێت ئەیاندەمێ)، پاشان خوڕی لە وشترەکەی و هەڵساو خۆی لادا لێیان‌وڕۆیشت تاگەیشتە نزیك حودەیبیە لەسەر تۆزە ئاوێك خستیان‌وزۆری نەبرد ئاوەکە تەواو بوو کەوتنە هاوار بۆ ئاو. پێغەمبەریش (ﷺ) تیرێکی دەرهێناو فەرموی: بیخەنە ناو چاڵەکەوە. سوێند بەخوا هەموو سوپاکە ئاوی خواردەوە بەتەواوی تالەو کاتەدا بۆ بودەیلی کوڕی وەرقائی خوزاعی لەگەڵ چەند کەسێکا هاتن. کەجێی متمانەی پێغەمبەربون (ﷺ) لەخەڵکی توهام بودەیل دەڵێت:من کاتێ کە هاتم کەعبی کوڕی لوئەی و عامری کوڕی لوئەیم) لەنزیك ئاوی حودەیبیە بەجێ هێشتووە عەوزول متافیلیان پێیە شەڕت لەگەڵ دەکەن‌ونایەڵن بچیتە ناو کەعبە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموی: (ئێمە نەهاتوین بۆ شەڕ کردن لەگەڵ کەس.بەڵکو بۆ عەمرە هاتوین.قورەیش جەنگ ماندووی کردوون‌وزواتە زۆری پێکەیاندون.ئەگەر حەزیان کرد ماوەیەك مۆڵەتیان ئەدەم لێمان گەڕێن بۆ خەڵکی تر. ئەگەر خودا سەری خستم،مەیلیان لێ بو وەك چۆن خەڵکی دێن ئەوانیش بێن‌وموسوڵمان ببن. یان بحەسێنەوە خۆ ئەگەر وایان نەکرد سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە شەڕیان لەگەڵ ئەکەم لەسەر ئەم کارەم و واز ناهێنم تالەناو ئەچم یاخود فەرمانی خۆی بەجێ دەهێنێ.بودەیل دەڵێت: باشە تۆ چی ئەڵێی پێیان دەگەیەنم.هەڵساو ڕۆشت بۆناو قورەیشیەکان‌وپێی گوتن:ئێمە لەلای ئەم پیاوەوە هاتوین گوێمان لێ گرتوە یەك قسە دەکا،ئەگەر پێتان باشە هەتا بۆتان باس بکەم. هەرزووکەم فامەکانیان وتیان: پێویستمان بەهیچ شتێ نیە لەلایەن ئەوەوە بۆمان باس کەیت.ئەوانەی کەخاوەنی فام و ڕەئی بوون گوتیان: فەرمو ئەوەی کەبیستوتە لێی بیلێ.دەڵێت: ئەم قسەیەو ئەو قسەیەم لێ بیستوە.ئەوەی کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموبوی بۆی گێڕانەوە. عوروەی کوڕی مەسعود هاڵساو دەڵێت: ئەی خەڵکینە ئایا ئێوە وەك باوك نین؟ گوتیان: بەلێ.دەڵێت: ئەی من وەك کوڕتان نیم؟ گوتیان: بەڵێ.دەڵێت: ئایا هیچ خراپەیەکتان لەمن دیوە؟ گوتیان: نەخێر.ئایا ئێوە ئاگاداری ئەوەن کەمن داوام کرد لەخەڵکی عوکاز کاتێ هاتن بۆلام منیش بەخۆم و کەس و کارمەوە ئەوەیشی بەقسەی کردم لەگەڵ خۆم هێنام؟ گوتیان: بەلێ. دەڵێت: ئەمەی ئەم پیاوە خستویەتیە بەر دەستان‌وداوای لێ کردون قسەیەکی چاکەو قەبوڵی بکەن. لێم گەڕێن بچمە لای.گوتیان: برۆ بۆلای.هات بۆلای پێغەمبەر(ﷺ) قسەی لەگەڵ پێغەمبەر کرد(ﷺ) پێغەمبەر(ﷺ) ئەوقسانەی بۆ کرد کە فەرموی بە بودەیل کوڕی وەرقاء لەو کاتا عوروە دەڵێت: ئەی محمد(ﷺ) ئایا تۆ ئەم کەس و کارەی خۆت قڕ کردو لەناو برد. ئاخۆ بیستوتە لەهیچ کەسێکی عەرەب کەلەپێش تۆ دابێتی بەسەر کەس و کاریدا؟ تا جارێکی تریش وایان بەسەر بێت. بەخودا لەبەر چاومە هەر جەنگ ڕووی دا ئەمانە هەموو ڕادەکەن خەیانەتت لێ دەکەن‌وبەجێت دەهێڵن. ئەبوبەکر دەڵێت: دەستت بە گونی (لات) ئێمە ڕادەکەین بەجێت دەهێڵین؟

دەڵێت: ئەوە کێ یە؟ گوتیان: ئەبوبەکرە. دەڵێت: بەخوا ئەگەر پیاوەتیت بەسەرمەوە نەبوایە وەڵامم ئەدایتەوە. دەڵێت: بەردەوام قسەی لەگەڵ پێغەمبەر دەکرد(ﷺ) هەرکاتێ قسەی لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) دەکرد دەستی دەگرت بەڕیشی پێغەمبەرەوە (ﷺ) موغەیرەی کوڕی شوعبە (ڕەزای خوای لێ بێ) لەلای سەری پێغەمبەرا (ﷺ) وەستابو شمشێرێکی بەدەستەوە بو بەچەرم داپۆشرابو هەرکاتێ عوروە دەی ویست دەست بەرێ بۆ ڕیشی پێغەمبەر(ﷺ) بەقۆناغی شمشێرەکەدەی کێشابەدەستیا ئەی گوت دەستت لابە بەڕیشی پێغەمبەرەوە(ﷺ) عوروە سەری بەرز کردەوەو دەڵێت: ئەمە کێ یە؟ گوتیان: موغەیرەی کوڕی شوعبەیە دەڵێت:ئەی ستەم کار ئایا من نەبوم کەخراپەکانی تۆم چارەسەر کرد؟ کاتی خۆی موغەیرەی کوڕی شوعبە لەگەڵ کۆمەڵێکا دەبێ لەپێش موسوڵمان بونیا دەیان کوژێ وماڵەکەشیان دەبات(عوروە خوێنیان ئەدا تاجەنگ ڕوونەدات) پاشان هاتو موسوڵمان بو. پێغەمبەر(ﷺ) فەرموی: (موسوڵمان بونەکەی قەبوڵ دەکەم. بەڵام سامان من هیچ پەیوەندیەکم پێوەی نیە)، پاشان عوروە بەچاوی خۆی هاوەڵەکانی پێغەمبەری (ﷺ) دەبینی دەڵێت: سا بەخودا پێغەمبەری خودا(ﷺ) کە تفێ لەدەمی مبارەکی بکەوتایە ئەگەر بکەوتایەتە ناو دەستی یەکێك لەهاوەڵەکانی دەم و چاو پێستی لەشی پێ دەهەنوی. هەرکاتێ فەرمانێکی بدایە بەسەریانا بەپەلە جێ بەجێیان دەکرد. کاتێ دەست نوێژی بگرتایە خەریك بو شەر بکەن لەسەر ئاوی دەست نوێژەکەی. کاتێ پێغەمبەر(ﷺ) قسەی دەکرد دەنگیان نزم دەکردەوە لەخزمەتیا لەبەر هەیبەتو بەڕێزی پێغەمبەر لایان زۆر بۆیان نەدەڕوانی. عوروە گەڕایەوە لای هاوەڵەکانی دەڵێت: ئەی خەڵکینە. بەخودا بەخودا بەوەفد چومەتە لای پاشاکانوچومەتە لای کیسراو قەیسەرو نەجاشی بەخوا هیچ پاشایەکم نەدیوە ئەوانەی لەگەڵیان ئەوەندە ڕێزی لێ بگرن وەك هاوەڵەکانی محمد ڕێز لەمحمد (ﷺ) دەگرن. بەخودا ئەگەر تفێ لەدەمی بکەوێ ئەگەر بکەوێتە ناو لەپی دەستی هەریەکێکیان دەی سرێ بەدەم و چاوو پێستی لەشیا.هەر فەرمانێکیان پێ بکات بەپەلە جێ بەجێی دەکەن.کاتێ دەست نوێژ دەگرێ لەوانەیە شەڕ بکەن لەسەر ئاوی دەست نوێژەکەی. کاتێ قسە دەکا دەنگیان نزم دەکەنەوە لەخزمەتیا. زۆر بۆی ناڕوانن لەبەر هەیبەتی لەلایان. شتێکی باشی پێ گوتون خستویەتیە بەر دەمتان لێی وەرگرن پیاوێکیان لەبەنی کەنانە دەڵێت: لێم گەڕێن بابچم بۆلای. گوتیان: بچۆ بۆلای. کاتێ نزیك بووە لەپێغەمبەرو (ﷺ) هاوەڵەکانیەوە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموی: (ئەم فلانە کەسە لەهۆزێکە ڕێز لە وشتری قوربانی(البدن) دەگرن قوربانیەکانی بۆ ببەن)، بردیان خەڵکی پێش وازیان لێ کردبە(الله اکبر) کاتێ ئەمەی چاو پێکەوت دەڵێت: سبحان الله ناکرێ ئەمانە ڕێگایان لێ بگیرێ کەبچن بۆ کەعبە وەختێ گەڕانەوە بۆلای هاوەڵەکانی دەڵێت: وشترم بینی پەتی لەملدابو ئامادە کرابو بۆ کاتی بەجێ هێنانی مەناسیکەکانی بەچاکی نازانم ڕێگای کەعبەیان لێ بگیرێ. پیاوێکیان هەڵسا

کەپێیان ئەگوت: مکرز کوڕی حەفس دەڵێت: وازم لێ بێنن بامن بڕۆم بۆلای. گوتیان: باشە بڕۆ بۆلای. کاتێ کەنزیك بوەوە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموی: (ئەمە کرەزە پیاوێکی خراپەکارە)، دەستی کرد بەقسەکردن لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) لەوکاتا کەقسەی لەگەڵ پێغەمبەر دەکرد (ﷺ) سوهەیلی کوڕی عەمر هات. موعەمەر دەڵێت: ئەیوب بۆی گێڕامەوە لە عیکریمەوە کە دەڵێت: کاتێ سوهەیلی کوڕی عەمر هات پێغەمبەر(ﷺ) فەرموی: (سوهەیل کارەکەی بۆ ئاسان کردون)، موعەمەر دەڵێت: بەپێغەمبەر(ﷺ) ئادەی نامەیەك لەنێوان ئێمەو ئێوەدا بنوسە. پێغەمبەر(ﷺ) عەلی بانگ کرد(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرموی: (بنوسە: بسم الله الرحمن الرحيم) سوهەیلی کوڕی عەمر دەڵێت: بەخودا من نازانم ڕەحمان کامەیە. بەڵکو بنوسە (باسمك اللهم) واتە: بەناوی تۆوە ئەی خودایە. لەباتی ئەوەی کە دەینوسی. موسوڵمانەکان گوتیان. بەخودا بسم الله الرحمن الرحيم نەبێ نای نوسی. پێغەمبەر(ﷺ) فەرموی: (بنوسە بسمك اللهم) پاشان فەرموی: ئەمە ئەو پەیمانەیە کە محمد پێغەمبەری خوداو (ﷺ) سوهەیلی کوڕی عەمر لەسەری پێك هاتن)، سوهەیل دەڵێت: بەخوا ئەگەر بمانزانیایە کەتۆ پێغەمبەری خودایت. ڕێمان لێ نەدەگرتی بێیتە کەعبە شەڕیشمان لەگەڵ نەدەکردی. بەڵکو بنوسە محمدی کوڕی عبدالله. پێغەمبەر(ﷺ) پێی گوت: (بەخودا من پێغەمبەری خودام (ﷺ) هەرچەندە ئێوە بڕواتان پێ نەکردم. بنوسە محمدی کوڕی عبدالله) زوهەری دەڵێت: ئەمەیش لەبەر ئەوەبو کە فەرموی: (بەخوا قورەیش داوای هەرچیم لێ بکەن کەڕێزی کەعبەی تێدا بێت ئەیاندەمێ) پێغەمبەر(ﷺ) پێی گوت:بەو مەرجەی کەڕێمان بدەن تەوافی کەعبە بکەین. سوهەیل دەڵێت:بەخوا لەبەر ئەوەی عەرەبەکان دەڵێن زۆرمان لێ کراوە. بەڵکو ئەوە دەبێ ساڵێکی تر بێنەوە. نوسی و سوهەیل دەڵێت: وەهەرکەسێك لەلای ئێمەوە هات بۆ لات بالەسەر ئاینی تۆیش بێ بیگێڕیتەوە بۆمان. موسوڵمانەکان گوتیان: سبحانه الله چۆن کەسێ دەگەڕێنرێتەوە بۆلای بتپەرستەکان بەموسوڵمانی هاتبێ؟ لەوکاتەدا کە خەریکی پەیمان نامەکە بون ئەبو جەندەلی کوڕی سوهەیلی کوڕی عەمر کەبەسترا بوەوە زنجیرکرابو لەخواری مەککەوە لەدەست دوژمنەکانی دەرچو بو خۆی گەیاندەوە ناو موسوڵمانەکان. سوهەیل دەڵێت: کاتێ کەپەیمان نامەکەیان دەنوسی. ئەمە یەکەم بڕیارە کە داوات لێ دەکەم جێ بەجێی بکەی ئەم پیاوەم پێ بدەیتەوە. پێغەمبەر(ﷺ)فەرموی: (هێشتا پەیمانەکەمان تەواو نەکردوە)، واتە: پەیمانەکەمان مۆر نەکردوە.دەڵێت: سابەخودا لە سەر هیچ شتێکی تر هەرگیز ئاشتیت لەگەڵ ناکەم. پێغەمبەر(ﷺ) فەرموی: (وازی لێ بێنە بۆمن) دەڵێت: من ئەوە واز لێ ناهێنم بۆ تو پێغەمبەر(ﷺ) فەرموی: (بەڵێ بیکە)، دەڵێت: من شتی واناکەم. مەکرز دەڵێت: باشە ئەوا وازمان لێ هێنا بۆت. ئەبو جەندەل دەڵێت: ئەی موسوڵمانینە دەگەڕێمەوە بۆلای خوانەناسان کاتێ من هاتوم بۆلای ئێوە بەموسوڵمانی. نابینن کەچیم بەسەر هاتوە؟ چونکە ئەبو جەندەل سزاو ئازارێکی زۆری چەشتبو بەدەست ئەو

خوانەناسانەوە، لەرێی خودادا. عومەر دەڵێت: (ڕەزای خوای لێ بێ) چومە لای پێغەمبەر(ﷺ) گوتم: ئایا تۆ بەڕاستی پێغەمبەری خودا نیت؟ فەرموی: (بەڵێ)، ئایا ئێمە لەسەر هەق نین‌ودوژمنەکەمان لەسەر ناهەقی نیە؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرموی: (بەڵێ)، گوتم: سا بۆچی لەسەر ئەم ئاینەمان سەر شۆڕی قەبوڵ کەین؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرموی: (من پێغەمبەری خودام و بێ گوێی ناکەم و ئەو یارمەتی دەرمە)، گوتم: ئایا تۆ قسەت بۆ نەکردین‌ونەت گوت کە ئێمە بەم زوانە دێین بۆ ماڵی خودا تەواف دەکەین بەدەوریا؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرموی: (بەڵێ. ئایا پێم دەڵێت ئێمە ئەم ساڵ دێین؟) گوتم: نەخێر. فەرموی: (بێ گومان تۆ دێیت‌و تەواف دەکەی بەدەوریا). عومەر دەڵێت: چومە لای ئەبو بەکرو. گوتم: ئەبو بەکر ئایا ئەمە پێغەمبەرێکی بەهەقی خودا نیە؟ دەڵێت: بەڵێ. گوتم: ئایا ئێمە لەسەر هەق نین‌ودوژمنەکەمان لەسەر ناهەق نیە؟ دەڵێت: بەڵێ. گوتم: دەی بۆچی ئەم سەر شۆڕیە قەبوڵ بکەین لەسەر ئاینەکەمان؟ دەڵێت: هەی پیاوەکە. ئەو پێغەمبەری خودایە (ﷺ) هەرگیز بێ فەرمانی خودا ناکات و خودا یارمەتی دەریەتی و خۆی داوەتە دەست خوداو لەسەر هەقە. گوتم: ئەی ئەو قسەی بۆ نەکردین کە بەم زوانە دێین بۆ ماڵی خوداو تەواف دەکەین بەدەوریدا؟ دەڵێت: بەڵێ. ئایا پێت دەڵێت کەتۆ ئەم ساڵ دەچیتە ناوی؟ گوتم: نەخێر. دەڵێت: بێ گومان دێیتە ناوی و تەوافیش دەکەی بەدەوریدا. زوهەری دەڵێت: عومەر (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێت: لەو بارەیەوە زۆر هەوڵم دا. دەڵێت: کاتێ کەلە مۆرکردنی پەیمان نامەکە لێ بونەوە. پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموی بەهاوەڵەکانی (هەڵسن مەڕو ماڵاتەکەتان سەربڕن‌وسەرتان بتاشن)، دەڵێت: سوێند بەخودا پیاوێك لەوانە هەڵ نەسا هەتا سێ جار پێغەمبەر(ﷺ) فەرموی. کاتێ کەکەسیان هەڵ نەسان. پێغەمبەر(ﷺ) چوە لای ئومو سەلەمە ئەوەی کەتوشی بوبو لەلایەن ئەو خەڵکەوە بۆی باس کرد. ئوموسەلەمە پێی گوت: ئەی پێغەمبەری خودا ئەگەر پێت خۆشە بڕۆ دەرەوە لەگەڵ کەسا مەدوێ هەتا وشترەکەت سەر دەبڕی و دیسان بانگی سەرتاش بکە سەرت بتاشێ. پێغەمبەر(ﷺ) هاتە دەرەوە بەبێ دەنگ بەدەستی خۆی سەری بڕی و بانگی سەرتاشی کرد سەری تاشی. کە یارەکانی ئەمەیان بینی یەکسەر هەڵسان‌ووشترەکانیان سەر بڕی و کەوتنە سەر تاشینی یەکتری. لەوانە بوو لەخەفەتا یەکتری سەربڕن پاشان چەند ژنێکی خاوەنباوەڕ هاتن بۆلای پێغەمبەر(ﷺ)، عومەر(ڕەزای خوای لێ بێ) دوو ژنی خۆی تەڵاقدا کەلەکاتی بتپەرستیا ژنی بوون. یەکێکیان مەعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان مارەی کردو. ئەوی تریان سەفوانی کوڕی ئومەیە مارەی کرد. پاشان پێغەمبەر(ﷺ) گەڕایەوە بۆ مەدینە ئەبو بەسیر کە قوڕەیشیش بوو موسوڵمان بو هات بۆلای پێغەمبەر(ﷺ) قوڕەیشیەکان دوو پیاویان نارد بەشوێنیا گوتیان (بەپێی ئەو پەیمانەی کەپێت داوین ئەو پیاوەمان بۆ بنێرەوە. پێغەمبەریش دایەوە دەست دوو پیاوەکە. هێنایانەوە تاگەیشتنە زول حەلیفە دانیشتن هەندێ خورمایان پێ بو دەیان خوارد ئەبو

بەسیر دەڵێت بەیەکێ لەپیاوەکان. کامەیە ئەم شمشێرەی تۆ؟ بەخوا لەشمشێرێکی زۆر چاك دەچێ. ئەوی تریان هەڵی گرتو دەڵێت:بەڵێ بەخوا شمشێری چاکە زۆر جار تاقیم کردوەتەوە. ئبو بەسیر دەڵێت: بێنە با سەیری کەم لێی دورگرتو دای لەیەکێکیان کوشتی ئەوی تریان ڕای کرد هەتا چوە مەدینە. بەپەلە چووە مزگەوت. پێغەمبەر(ﷺ) کاتێ بینی فەرموی: (ئەم پیاوەتوشی ترس و نارەحەتی بوە)، وەختێ گەیشتە لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەڵێت: بەخوا هاوەڵەکەمی کوشتو خەریك بو منیش بکوژێ. ئەبو بەسیر هات دەڵێت: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) بەخوا تۆ پەیمانی خۆتت بەجێ هێنا منت دایەوە دەست قورەیش. پاشان خوای گەورە ڕزگاری کردم لەدەستیان. پیغەمبەر (ﷺ) فەرموی: (دایك نەبینێ، ئەم ئەگەر هاوڕێی ببوایە جەنگی هەڵ ئەگیرسان). کاتێ ئەبو بەسیر ئەمەی بیست زانی کەدەینێرێتەوە بۆیان. ڕوەو کەناری دەریا کەوتەڕێ. هەواڵ گەیشت کە ئەبو جەندەلی کوڕی سوهەیلیش لەدەستیان ڕای کردوە پەیوەندی کردوە بە ئەبو بەسیرەوە وای لێ هات هەرکەسێ کە موسوڵمان دەبو لای قورەیشیەکان ڕای دەکردو پەیوەندی ئەکرد بە ئەبو بەسیرەوە. هەتا ژمارەیان زۆر بو وای لێ هات سوێند بەخوا بیان بیستایە کاروانێك لەلایەن قورەیشیەکانەوە دەڕوا بەرەو شام ڕێگایان لێ دەگرتو شەریان لەگەڵەکردنوماڵەکانیان بەتاڵانی دەبردن. بۆیە قورەیشیەکان بەناچاری ناردیان بۆ لای پێغەمبەرو (ﷺ) کەوتنە تکاە پاڕانەوە کە ئیتر کەس نەنێرێتەوە بۆ لایان. هەر کەسێ لەوان هات بۆلای کەس دەست ناداتە ڕێی. پێغەمبەری خودا(ﷺ) ناردی بەشوێنیاندا کە بگەڕێنەوە بۆ مەدینە. خودای گەورەش ئەم ئایەتانەی نارده خوارەوە، چونکە ئەوەندە بادی هەواو نەزان بوون دانیان دەنا بەوا کە محمد(ﷺ) پێغەمبەری خودایەو دانیان بە (بسم الله الرحمن الرحيم) یشا نەدەنا. نەیان هێشت بچن بۆ ماڵی خودا.[1] هەر بەم شێوەیە بوخاریش لەوێدا هێناویەتی لەتەفسیرەکەیا باسی کردوە[2].

وەلە عومرەی حودەیبیەوە[3] وەلە باسی حەج و لەشوێنی تریشدا[4]. بوخاری لەتەفسیرەکەیا ڕیوایەتی کردوە لە حەبیبی کوڕی ئەبو سابتەوە دەڵێت: چومەلای ئەبو وائل پرسیارم لێ کرد. دەڵێت: ئێمە لە سیفین بوین. پیاوێك دەڵێت: نەت دی ئەوانەی کەبانگ دەکرێن بۆ لای کتێبی خوا؟ عەلی کوڕی ئەبوتالب (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێت: بەڵێ. سەهلی کوڕی حەنیف دەڵێت: لۆمەی خۆتان بکەن. لەڕۆژی حودەیبیەدا بینیمان واتە ڕۆژی ئاشت کردن لەنێوان پێغەمبەرو بتپەرستەکانا. ئەگەر شەڕ

---

[1] فتح الباری (٣٨٨/٥).

[2] فتح الباری (٤٥١/٨).

[3] فتح الباری (٥١٨/٧).

[4] فتح الباری (٦٣٤/٣).

ببوایە شەڕمان دەکرد. کاتێ عومەر هاتو دەڵێت: ئایا ئێمە لەسەر هەق نین‌وئەوان لەسەر بەتاڵ؟ ئایا ئێمە کوژراومان لەبەهەشتا نیەو کوژراوی ئەوان لەناو ئاگرا؟ پێغەمبەر فەرموی: (بەڵێ). دەڵێت: باشە بۆچی لەسەر ئاینەکەمان سەر شۆڕی قەبوڵ بکەین‌وبگەڕێنەوە هەتا خودا فەرمانی خۆی دەدا لە نێوانیاندا؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرموی (ئەی کوڕی خەتاب من پێغەمبەری خودام، خودا هەرگیز زایەم ناکات) عومەر بەدڵ گرانیەوە گەڕایەوە و خۆی نەگرت هەتا چووە لای ئەبوبەکر (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێت: ئەی ئەبوبەکر ئێمە لەسەر هەق نین‌وئەوان لەسەر بەتاڵ؟ ئەبوبەکر دەڵێت: ئەی کوڕی خەتاب ئەو پێغەمبەری خودایەو خودا هەرگیز زایەی ناکاو نای فەوتێنێ لەو کاتەدا سورەتی فەتح هاتە خوارەوە. بوخاری دووبارە ڕیوایەتی کردوە لەشوێنێکی تردا. موسلم و نەسائیش لەڕێگای ترەوە ڕیوایەتیان کردوە لەئەبو وائلەوە.سوفواتە کوڕی سەلەمە لەسەهلی کوڕی حەنیفەوە هەر بەو شێوەیە ڕیوایەتی کردوە. وەلە هەندێ لە ووتەکانیا ئەی خەڵکینە! لۆمەم دەکەن خۆ ئێوە ئەو ڕۆژەی ئەبو جەندەل منتان بینی ئەگەر بمتوانیایە وەڵامی پێغەمبەر بدەمەوە (ﷺ) لەسەر ئەو بڕیارەی وەڵامم ئەدایەوە. لەڕیوایەتێکی ترا هاتوە. لەو کاتا سورەتی فەتح هاتە خوارەوە. پێغەمبەری خودا(ﷺ) عومەری کوڕی خەتابی بانگ کردو خوێندیەوە بەسەریا.[1] ئیمامی ئەحمد ڕیوایەتی کردوە لە ئەنەسەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێت: قوڕەیش سوڵحیان لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) کرد. سوهەیلی کوڕی عەمر یەکێك بو لەو کەسانەی کەهاتبو بۆ ڕێکەوتن نامەکە. پێغەمبەر(ﷺ) فەرموی بەعەلی (ڕەزای خوای لێ بێ) بنوسە( بسم الله الرحمن الرحيم) سوهەیل دەڵێت: ئێمە نازانین بسم الله الرحمن الرحيم کامەیە. بەڵکو ئەوە بنوسە کەئێمە دەیزانین (باسمك اللهم) پێغەمبەر(ﷺ) فەرموی: (بنوسە لەمحمد (ﷺ) پێغەمبەری خوداوە) دەڵێت: ئەگەر بمانزانیبا تۆ پێغەمبەری خودای شوێنت دەکەوتین. بەڵکو بەناوی خۆت‌و بابت بنوسە.پێغەمبەر(ﷺ) فەرموی: (بنوسە لەمحمدی کوڕی عبدالله وە) کردیانە مەرج بەسەر پێغەمبەرەوە (ﷺ) ئەگەر یەکێ لەموسوڵمانان هات بۆلامان نای گێڕینەوە. وە ئەگەر کەسێ لای ئێمەوە هات بۆلای ئێوە ڕەوانەی بکەنەوە بۆمان. دەڵێت ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئایا ئەمە بنوسین؟ فەرموی: (بەڵێ هەر کەسێ لای ئێمە ڕۆشت بۆلای ئەوان خودا دوری خستوەتەوە)[2] موسلمیش ڕیوایەتی کردوە[3]. ئیمامی ئەحمد هەمیسان ڕیوایەتی کردوە لەعبدالله ی کوڕی عەباسەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێت: کاتێ حەروریەکان چونە دەرەوەو وازیان هێنا پێم گوتن: پێغەمبەری خودا(ﷺ) لەڕۆژی حودەیبیەدا کە لەگەڵ بت پەرستەکانا ڕێکەوت، دەڵێت بەعلی (ڕەزای خوای لێ بێ)

---

[1] الفتح الباری (٤٥١/٨).

[2] احمد (٢٦٨/٣) فەرمودەیەکی سەحیحە.

[3] مسلم (١٤١١/٣).

(ئەی علی بنوسە ئەمە ئەو ڕێکەوتن نامەیە کەمحمد پێغەمبەری خودا(ﷺ) لەسەری ڕێ کەوتوە)، گوتیان: ئەگەر بمان زانیایە تۆ پێغەمبەری خودای شەڕمان نەدەکرد لەگەڵتا. پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموی: (ئەی علی بیسڕەوە، ئەی خودایە تۆ خۆت دەزانی کەمن پێغەمبەری تۆم، بیسڕەوە و بنوسە: ئەمە ئەو ڕێکەوتنەیە کە محمدی کوڕی عبدالله لەسەری ڕێکەوتوە) سوێند بەخودا کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) چاکترە لەعلی کەناوی خۆی کوژاندەوە وەئەو ناو سڕینەوەش لەپێغەمبەریەکەی کەم نەکردوەو لای نەبرد لەمە دەرچوم؟گوتیان: [1] بەڵێ ئەبو داودیش بەم شێوەیە ڕیوایەتی کردوە. [2] وە ئیمامی ئەحمد ڕیوایەتی کردوە لەئیبنو عەباسەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێت: پێغەمبەری خودا لەڕۆژی حودەیبیەدا حەفتا وشتری سەربڕی یەکێك لەو وشترانە، وشتری ئەبو جەهل بو کاتێ ڕێی ماڵی خودای لێ گیرا ئارەزوی مەککەی دەکرد وەك چۆن ئارەزوی بێچوەکانی دەکا. [3]

**باسی ڕاست بینینی خەوی پێغەمبەر(ﷺ)**

﴿لَّقَدْ صَدَقَ ٱللَّهُ رَسُولَهُ ٱلرُّءْيَا بِٱلْحَقِّ ۖ لَتَدْخُلُنَّ ٱلْمَسْجِدَ ٱلْحَرَامَ إِن شَآءَ ٱللَّهُ ءَامِنِينَ مُحَلِّقِينَ رُءُوسَكُمْ وَمُقَصِّرِينَ لَا تَخَافُونَ ۖ فَعَلِمَ مَا لَمْ تَعْلَمُوا۟ فَجَعَلَ مِن دُونِ ذَٰلِكَ فَتْحًا قَرِيبًا ﴿٢٧﴾ هُوَ ٱلَّذِىٓ أَرْسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلْهُدَىٰ وَدِينِ ٱلْحَقِّ لِيُظْهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦ ۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدًا ﴿٢٨﴾﴾

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿لَّقَدْ صَدَقَ ٱللَّهُ رَسُولَهُ ٱلرُّءْيَا بِٱلْحَقِّ ۖ لَتَدْخُلُنَّ ٱلْمَسْجِدَ ٱلْحَرَامَ إِن شَآءَ ٱللَّهُ ءَامِنِينَ مُحَلِّقِينَ رُءُوسَكُمْ وَمُقَصِّرِينَ لَا تَخَافُونَ ۖ فَعَلِمَ مَا لَمْ تَعْلَمُوا۟ فَجَعَلَ مِن دُونِ ذَٰلِكَ فَتْحًا قَرِيبًا﴾ خوا ئەو خەونەی کە پێغەمبەرەکەی دیبووی، وەڕاست گێڕا، خوا حەزکات بەبێ هیچ ترسێك دەچنە ناو ماڵی کەعبەوە مووی سەری. خۆی کورت دەکەنەوە، یان دەیتاشن، ئەو شتانەی ئەوو زانیبوو ئەو دەیزانێ جگە لەمەش بەو زوانە تووشی سەرکەوتنێك دەبن. پێغەمبەری خودا(ﷺ) لەخەونیدا بینیبوی کەچوبوە ناو مەککەو تەوافی ماڵی خودای کردبو، ئەم هەواڵەی دا بەهاوەڵەکانی کاتێ کە لەمەدینەدابو. وەختێ کە ساڵی حودەیبیە کەوتنەڕێ هەندێکیان بێ گومان بون کەئەم خەونە دێتە دی ئەو ساڵە کاتێ ئەوەی کەڕوی داو پەیمان نامەی ئاشتی مۆرکرا ئەو ساڵە گەڕانەوەو دەبوایە ساڵی داهاتو بێنەوە. لەدڵی هەندێ لەهاوەڵەکانیدا شتێك پەیدا بوو. ئەوە بو عومەری کوڕی خەتاب لەو بارەیەوە پرسیاری کردو دەڵێت: تۆ هەواڵت نەداینێ کەبەم زوانە تەواف دەکەین بەدەوری ماڵی

[1] أحمد (٣٤٢/١) فەرمودەیەکی سەحیحە.

[2] ابو داود (٣١٧/٣) فەرمودەیەکی سەحیحە.

[3] احمد (٣١٤/١) ئەم فەرمودەیە سەنەدەکانی لاوازە.

خوادا؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرموی: (بەڵێ ئایا پێم دەڵێت کەتۆ ئەم ساڵ دەچیتەناوی؟) عومەر دەڵێت: نەخێر. پێغەمبەر(ﷺ) فەرموی: (بێ گومان دەچیتەناوی و تەوافیش بەدەوریا دەکەی) ئەبو بەکریش هەمان وەڵامی عومەری دایەوە بێ زیادو کەم[1]. بۆیە خودای مەزن فەرموی: ﴿لَّقَدْ صَدَقَ ٱللَّهُ رَسُولَهُ ٱلرُّءْيَا بِٱلْحَقِّ ۖ لَتَدْخُلُنَّ ٱلْمَسْجِدَ ٱلْحَرَامَ إِن شَآءَ ٱللَّهُ﴾ ئەمە بۆ ڕاستی هەواڵەکەی پێغەمبەر(ﷺ) هاتە خوارەوە و بۆپشت گیری ئەو بەبێ کەم و زیاد وەئەفەرموێت: ﴿ءَامِنِينَ﴾ بەبێ ترس دەچنە ناوی. ﴿مُحَلِّقِينَ رُءُوسَكُمْ وَمُقَصِّرِينَ﴾ هەندێکیان موی سەریان کورت کردەوەو هەندێکیشیان موی سەریان تاشی. لەهەردوو سەحیحەکەدا هاتووە کە پێغەمبەری خودا فەرموی: (ڕەحمەتی خوا لەو کەسانەی موی سەریان تاشی) گوتیان: ئەی ئەوانەی کورتیان کردەوە ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) پێغەمبەر(ﷺ) فەرموی: (ڕەحمەتی خوا لەو کەسانەی موی سەریان تاشی)، گوتیان: ئەی ئەوانەی کورتیان کردەوە ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) پێغەمبەر(ﷺ) فەرموی: (ڕەحمەتی خوا لەو کەسانەی موی سەریان تاشی) گوتیان: ئەی ئەوانەی کەموی سەریان کورت کردەوە ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) لەسێ هەم یا لەچوارەم جارا فەرموی: (ڕەحمەتی خوا لەوانەش کەموی سەریان کورت کردەوە)[2]، وەئەفەرموێت: ﴿لَا تَخَافُونَ﴾ دڵنیای کردن لەچونە ناوەوەیان‌ونیشتە جێ بونیان لەو شارا بەبێ ترس لەهیچ کەسێ ئەمە لەکاتی عومرەی قەزادا بو لە مانگی ذولقە عدە لەساڵی حەوتەمدا. کاتێ پێغەمبەر لەحودەیبیە گەڕایەوە بۆ مەدینە ذولحیجة و موحەڕەم مایەوە تیاو لەمانگی سەفەرا دەرچو لەمەدینەو بەرەو خەیبەر چو ئازادی کرد هەندێکی بەزۆر هەندێکیشی بەئاشتی ناوچەیەکی گەورەو پڕ دارخورماو شوێنی کشتوکاڵ بو جولەکەکانی کردە کاریگەر بەسەر ئەو دارخورماو کشتو کاڵەوەو دابەشی کرد لەنێوان ئەو خەڵکی حودەیبیەدا بەتەنها. کەسی تری تێکەڵ نەکردن جگە لەو کەسانەی لەحەبەشە گەڕابونەوە کە جەعفەری کوڕی ئەبو تالب و هاوەڵەکانی بون. وە ئەبو موسای ئەشعەری و هاوەڵەکانی کەکەسیان لێ بەجێ نەمابو. ئیبنو زەید دەڵێت: جگە لەئەبو دوجانە کەسەماکی کوڕی خەرەشە[3]، گەڕایەوە بۆ مەدینە وەك چۆن بڕیار بو. کاتێ مانگی ذولقەعدە بو لەساڵی حەوتەما پێغەمبەر(ﷺ) لەمەدینە دەرچو بەرەو مەککە بەنیازی عومرە خۆی و ئەوانەی کەلە حودەیبیە ئامادە بون. لەذیل حەلیفە ئیحرامیان بەستو قوربانیەکانیان لەگەڵ خۆیاندا بردو دەڵێن: شەستوشتر بووە.

---

[1] فتح الباری (٥/٣٩٠).

[2] فتح الباری (٣/٦٥٦) مسلم (٢/٤٩٦).

[3] الطبری (٢٢/٢٥٩).

پێغەمبەر(ﷺ) (لبيك)ی دەست پێ کردو هاوەڵەکانیشی لەگەڵیدا دەیان گوت. کاتێ نزیکی (مر الظهران) بونەوە محمدی کوڕی سەلەمەی لەگەڵ چەند سوارێکدا ڕەوانە کرد کەچەکەکان لەپێشیەوە بو. کاتێ موشریکەکان ئەوەیان بینی زۆر ترسان وایان دەزانی کەپێغەمبەری خودا ئەدا بەسەریاناو داگیریان دەکاو ئو پەیمانەی کەلەگەڵیاندا بەستبوی هەڵی وەشاندوەتەوە کەبڕیاربو دەساڵ شەڕ بوەستێ لەنێوانیاندا. ڕۆشتن هەواڵیان دا بەخەڵکی مەککە. کاتێ پێغەمبەری خودا(ﷺ) هاتو لە (مر الظهران) دابەزی کەدی ڕوانی بەسەر ماڵی خودادا. چەکەکانی کەشمشێرو تیرو تیرکەوان بوون ناردیە شوێنێك کەپێی دەڵێن (بطن يأجج) و بەرەو مەککە کەوتەڕێ و شمشێرەکانیان لەکێلا نابو وەك بەمەرج گیرابو لەپەیمان نامەکەدا لەکاتێکدا کە بەڕێوە بون قورەیشیەکان مەکرەزی کوڕی حەفسیان نارد دەڵێت: ئەی محمد تۆمان وانەناسیوەکە پەیمان شکێن بی. پێغەمبەر(ﷺ) فەرموی: (چی ڕوی داوە؟) دەڵێت: بەچەكو شمشێرو تیروکەوانەوە هاتویتە سەرمان. پێغەمبەر(ﷺ) فەرموی: (ئەوە وانیە چەکەکانمان ناردوە بۆ (يأجج) دەڵێت: ئێمە تۆمان بەکەسێکی بەوەفاو چاکە خواز ناسیوە. پیاوە گەورەکانی مەککە لەمەککە چونە دەرەوە بۆ ئەوەی سەیری پێغەمبەرو (ﷺ) یارەکانی نەکەن لەبەر ئەوەی چاویان بەرایی نەئەدا ئەوەندە دڵ گران بوون بەبینینیان چاویان پێیان بکەوێ. بەڵام خەڵکەکەی تری مەککە لەژن‌وپیاو و منداڵان لەلای ڕێگاکەدا دانیشتبون‌ولەسەر بانەکانیان سەیری پێغەمبەرو (ﷺ) یارەکانیان دەکرد. پێغەمبەر چووە ناوماڵی خودا لەگەڵ یارەکانیدا (لبيك) یان ئەگوتو قوربانیەکانیشی ڕەوانە کرد بۆ (ذی طوی) وخۆشی سواری وشترەکەی بو (ناقة القصواء) کەلە ڕۆژی حودەیبیەدا سواری بوبو. عبدالله ی کوڕی ڕەواحەی ئەنساری جڵەوی وشترەکەی پێغەمبەری گرتبو ڕای دەکێشاو ئەی گوت:

باسم الذي لا دين الا دينه    باسم الذي محمد رسوله

فلو بني الكفار عن سبيله    اليوم بضربكم على تأويله

كما ضربناكم على تنزيله    ضربنا يزيل الهام من مقيلة

ويذهل الخليل عن خليله    قد أنزل الرحمن من تنزيله

في صحف تتلى على رسوله    بأن خير القتل في سبيله

ئەحمد ڕیوایەتی کردوە لەئیبنو عەباسەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) لەگەڵ هاوەڵەکانیا گەیشتنە مەککە تاو لەرزی مەدینە لاوازو بێ هێزی کردبون‌وتوشی نارەحەتی بوبون. بت پەرستەکان ئەیان گوت ئێستا خەڵکێك دێن بۆلاتان تاو لەرزی مەدینە کزو لاوازی کردون‌ونارەحەت بوون لەوێ. بت پەرستەکان لەو شوێنەوە دەچێ بۆلای بەردەڕەش (حجر الاسود) دانیشتوان. خوای گەورە پێغەمبەرەکەی ئاگادار کرد لەوقسانەی کەبت پەرستەکان دەیان گوت.

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی دابە هاوەڵەکانی کەلەهەر سێ جارەکەدا بەهەروەلە (بەقونە) بڕۆن بۆ ئەوەی موشریکەکان بیان بینن کە چەند گورج و گۆڵ و بەهێزن. دەڵێت سێ جار بەهەروەلە ڕۆیشتن فەرمانی دانێ کەلە نێوان دوو ڕوکنەکەدا بەهێواشی بڕۆن بەڕێوە کاتێ کە بت پەرستەکان چاویان پێیان ناکەوێ. پێغەمبەر(ﷺ) ڕێی ی لێ نەگرتن کەهەموو جارێ بەهەروەلە بڕۆن مەگەر لەبەر ئەوەی کەلە سەریان دابنرێ. بت پەرستەکان: گوتیان: ئەمە ئەو کەسانەن کەئێوە واتان دەزانی کەتاو لەرزی یەسریب (واتە مەدینە) کزو لاوازی کردون. ئەوانە زۆر بەتوانا ترن لەئەم و ئەو[1] لەهەردوو سەحیحەکەدا هاتوە.[2] وەلە وتەیەکی ترا هاتوە کە پێغەمبەرو (ﷺ) هاوەڵەکانی بەواتە چواری زولقەعدە گەیشتن. بتپەرستەکان گوتیان: گرۆیەك دێن بۆلاتان کە لەرزو تای یەسریب کزو لاوازی کردون، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی پێدان کە لەهەرسێ جارەکەدا کەتەواف دەکەن بەڕاکردن بڕۆن. هیچ شتێ ڕێی لێ پێغەمبەر نەدەگرت کەفەرمانیان پێ بکا کەهەر سێ جارەکە بەڕاکردن بڕۆن مەگەرئەوەی کەلەسەریان بمێنێتەوە[3]. بوخاری ڕیوایەتی کردوە لەئیبنو عەباسەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێت: کاتێ پێغەمبەر(ﷺ) ئەو ساڵە کەبێ ترس هاتە مەککە فەرموی: بەڕاکردن بڕۆن بۆ ئەوەی بت پەرستەکان هێزیان ببینن بت پەرستەکان کەلە بەردەم بەرزایەکدا بون[4]. دیسان لەئیبنو عەباسەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێت: بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) بەڕاکردن تەوافی کرد بەدەوری ماڵی خوداو سەفاو مەروەدا بۆ ئەوەی بتپەرستەکان هێزی و توانای پێغەمبەر ببینن.[5] جارێکی تربوخاری ڕیوایەتی کردوە لەئیبنو عومەرەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) چووە دەرەوە بۆ عەمرە بت پەرستەکان بونە ڕێ گرو نەیان هێشت بچێ بۆ ماڵی خودا قوربانیەکان سەر بڕی و موی سەرتاشێ لە حودەیبیە لەگەڵیان ڕێکەوت لەساڵی دوایی بچێت بۆ عەمرە. چەك لەگەڵ خۆیان هەڵ نەگرن شمشێر نەبێ و ئەوەندەش بمێننەوە کەپێیان خۆشە. پێغەمبەر(ﷺ) لەساڵی دوایدا عەمرەی کردو بەو شێوەیەش چووە ناو مەککە کەبڕیاری دابو لەگەڵیان کاتێ کەسێ ڕۆژ مانەوە لە مەککەدا بت پەرستەکان داوایان کرد کە دەرچن (پێغەمبەریش (ﷺ) لێی دەرچوو.[6] وە ئەفەرموێت: ﴿فَعَلِمَ مَا لَمْ تَعْلَمُوا فَجَعَلَ مِن دُونِ ذَٰلِكَ فَتْحًا قَرِيبًا﴾ واتە: خودا دەیزانی چی باشە بۆ ئێوەو لەبەرژەوەندیتانەو

---

[1] احمد (٢٩٤/١) فەرمودەیەکی سەحیحە.

[2] فتح الباری (٥٨١/٧) مسلم (٩٢٣/٢).

[3] فتح الباری (٥٤٨/٣).

[4] فتح الباری (٥٨١/٧).

[5] فتح الباری (٥٨١/٧).

[6] فتح الباري (٥٧١/٧)

نەی هێشت بچنە ناو مەککە لەو ساڵەدا ئێوە نەتان دەزانی ﴿فَجَعَلَ مِن دُونِ ذَٰلِكَ فَتْحًا قَرِيبًا﴾ واتە: پێش چونتان بۆ ناو مەککە کەبەڵێنتان پێ درابو لەو خەونەی پێغەمبەردا (ﷺ) بینیبوی کە تووشی سەرکەوتنێك دەبن. ئەو سەرکەوتنەش پەیمانی ئاشتی حودەیبیە بو لەنێوان ئێوەو بتپەرستەکانی قورەیشا.

## مژدەی سەرکەوتنی موسوڵمانان بەسەر جیهاندا

خودای مەزن فەرموویەتی: ﴿هُوَ الَّذِي أَرْسَلَ رَسُولَهُ بِالْهُدَىٰ وَدِينِ الْحَقِّ لِيُظْهِرَهُ عَلَى الدِّينِ كُلِّهِ ۚ وَكَفَىٰ بِاللَّهِ شَهِيدًا﴾ هەر خودایە کەپێغەمبەری خۆی نارد بەڕێنموونی و ئایینی ڕاستەوە تا بەسەر هەموو دینێکا زاڵی بکا، خواش بۆ ئاگا لێبوون بەسە. پاشان خوای گەورە مژدەی سەرکەوتنی پێغەمبەرەکەی (ﷺ) بەسەر دوژمنەکانیدا بەهەموو خەڵکی سەر زەمین‌وموسڵمانان ڕادەگەیەنێت‌و ئەفەرموێت: ﴿هُوَ الَّذِي أَرْسَلَ رَسُولَهُ بِالْهُدَىٰ وَدِينِ الْحَقِّ﴾ واتە ئەو خودایەی کەپێغەمبەری خۆی نارد بەڕێ نیشاندەرو ئاینی ڕاستیشی پێدا ڕەوانە کرد کە بریتیە لە زانیاری بەسودو کرداری چاك‌و جوان. چونکە زانستی شەرعی تەواوە کرداری شەرعی چاك‌و وەرگرتنی و کارپێ کردنی هەق‌و ڕاستە. ﴿الْحَقِّ لِيُظْهِرَهُ عَلَى الدِّينِ كُلِّهِ﴾ واتە: بەسەر ئاینی هەموو گەلەکانی ترا لەسەر زەمیندا لەعەرەب و عەجەم و هەموو گەلانی تر خاوەن ئاین بن یان بتپەرست. ﴿وَكَفَىٰ بِاللَّهِ شَهِيدًا﴾ خوداش بەسەو ئاگای لێیە کە ئەو پێغەمبەریەتی وەهەر خوداش یارمەتی دەریەتی.

## سیفاتی خاوەنباوەڕان وشێوازی گەشەکردنیان

﴿مُّحَمَّدٌ رَّسُولُ اللَّهِ ۚ وَالَّذِينَ مَعَهُ أَشِدَّاءُ عَلَى الْكُفَّارِ رُحَمَاءُ بَيْنَهُمْ ۖ تَرَاهُمْ رُكَّعًا سُجَّدًا يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِّنَ اللَّهِ وَرِضْوَانًا ۖ سِيمَاهُمْ فِي وُجُوهِهِم مِّنْ أَثَرِ السُّجُودِ ۚ ذَٰلِكَ مَثَلُهُمْ فِي التَّوْرَاةِ ۚ وَمَثَلُهُمْ فِي الْإِنجِيلِ كَزَرْعٍ أَخْرَجَ شَطْأَهُ فَآزَرَهُ فَاسْتَغْلَظَ فَاسْتَوَىٰ عَلَىٰ سُوقِهِ يُعْجِبُ الزُّرَّاعَ لِيَغِيظَ بِهِمُ الْكُفَّارَ ۗ وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ مِنْهُم مَّغْفِرَةً وَأَجْرًا عَظِيمًا ﴿٢٩﴾﴾

خودای گەورەئەفەرموێت: ﴿مُّحَمَّدٌ رَّسُولُ اللَّهِ ۚ وَالَّذِينَ مَعَهُ أَشِدَّاءُ عَلَى الْكُفَّارِ رُحَمَاءُ بَيْنَهُمْ ۖ تَرَاهُمْ رُكَّعًا سُجَّدًا يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِّنَ اللَّهِ وَرِضْوَانًا ۖ سِيمَاهُمْ فِي وُجُوهِهِم مِّنْ أَثَرِ السُّجُودِ ۚ ذَٰلِكَ مَثَلُهُمْ فِي التَّوْرَاةِ ۚ وَمَثَلُهُمْ فِي الْإِنجِيلِ كَزَرْعٍ أَخْرَجَ شَطْأَهُ فَآزَرَهُ فَاسْتَغْلَظَ فَاسْتَوَىٰ عَلَىٰ سُوقِهِ يُعْجِبُ الزُّرَّاعَ لِيَغِيظَ بِهِمُ الْكُفَّارَ ۗ وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ مِنْهُم مَّغْفِرَةً وَأَجْرًا عَظِيمًا﴾ محەممەد (ﷺ) پێغەمبەری خودایە، ئەوانەش کەلە

گەڵ ئەون لە بەرانبەر خوانەناسان توندو تیژو لەناو خۆدا دلۆڤانن. لە کڕنۆش و سوژدە چاوت پێیان دەکەوێ هەر ئاواتی ڕەزامەندی و چاکەی خودان. دروشمی سوژدە بردنیان بەناو چاوانەوە هەیە، وێنەشیان لەتەورات دایەو نموونەشیان لەئینجیلدا وەك کشتوکاڵێك وایە چەکەرەی دەرکردبێ ئینجا چەکەرەی بەهێز کردبێ و قاییم بوبێ جالەسەر لاسکی خۆی ڕێك وەستابێ، ئەوەندە جوان بێ جوتیارەکانی سەرسام کردبێ و چاوچنۆکانی سپڵەی پێی قەڵس بکات. ئەوانەی خاوەن باوەڕو ئاکار چاکن، خوا بەڵێنی لێ بووردن و پاداشتی گەورەی پێداون. خودای مەزن باسی پێغەمبەر دەکا(ﷺ) کەئەو ڕەوانەی کردوە پێغەمبەرێکی ڕاستەو گومانی تێدانیە ﴿مُّحَمَّدٌ رَّسُولُ ٱللَّهِ﴾ ئەم ڕستەیە موبتەداو خەبەرە هەرچی وەسفی جوان و چاکە . تیایەتی پاشان وەسفی هاوەڵەکانی دەکا (ڕەزای خوایان لێ بێ) ئەفەرموێت: ﴿وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ أَشِدَّآءُ عَلَى ٱلْكُفَّارِ رُحَمَآءُ بَيْنَهُمْ ﴾ واتە: زۆر توندو تیژن بەرانبەر دوژمن و بەبەزەین لەناو خۆیانا وەك خودای گەورە فەرموویەتی: لەئایەتێکی ترا ﴿فَسَوْفَ يَأْتِى ٱللَّهُ بِقَوْمٍ يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُۥٓ أَذِلَّةٍ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ أَعِزَّةٍ عَلَى ٱلْكَـٰفِرِينَ ﴾[1] واتە: ئەوە بە زوویی خوا لەجیاتی ئەوان گەل و کۆمەڵێکی تر ئەهێنێ خوا ئەوانی خۆش ئەوێ و ئەوانیش خوایان خۆش ئەوێ بەسۆزو بەزەیین بەرانبەر برواداران بەهێزو توند بەرانبەر بێ بروایان.ئەم سیفەتی خاوەن باوەڕانە کەبەرانبەر دوژمن زۆر بەهێزەو لەگەڵ خوانەناسان زۆر بەسۆزو دلۆڤانە. زۆر بەرق و ناوچاو گرژە بەڕوی خوانەناساو دەم بەخەندەو ڕوخۆشە بەرانبەر برا موسوڵمانەکەی وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ قَـٰتِلُوا۟ ٱلَّذِينَ يَلُونَكُم مِّنَ ٱلْكُفَّارِ وَلْيَجِدُوا۟ فِيكُمْ غِلْظَةً﴾[2] واتە: ئەی ئەوانەی کە ئیمانتان هێناوە بجەنگن لەدژی ئەوانەی کە نزیکین لێتانەوە لەبێ بروایان وەبا بێ باوەڕان لەئێوەدا توندوتیژی ببینن. وەپێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (نمونەی خاوەنباوەڕان لەخۆش ویستن و دلۆڤانیاندا بۆ یەکتری وەك نمونەی یەك لاشە وان. هەرکاتێ بەشێ لەو لاشەیە ئێشی گرد هەموو بەشەکانی تری لەش ئارام ناگرێ و تاو لەرز دەیگرێ)[3]، وە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (خاوەنباوەڕ بۆ خاوەنباوەڕ وەك نمونەی خانو وایە کەیەکتری دەبەستێ بەیەکەوە، وەپێغەمبەر(ﷺ) پەنجەکانی خستە ناویەك)[4]، ئەم دوو فەرمودەیە لە بوخاری و موسلما هاتون. خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿تَرَىٰهُمْ رُكَّعًا سُجَّدًا يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضْوَٰنًا﴾

---

[1] المائدة (٥٤).

[2] التوبة (١٢٣).

[3] مسلم (١٩٩٩/٤).

[4] فتح الباري (١١٩/٥).

خودای گەورەباسیان دەکا کەزۆر چاکە خوازنونوێژ زۆر دەکەن لەبەر ڕەزامەندی خوداو تەنها بە تەمای ئەون کە پاداشی باشیان بداتەوە بەبەهەشت کەپڕە لەنازو نیعمەت لەوەش زیاتر کەڕەزامەندی خوای گەورەیە وەك خودا ئەفەرموێت: ﴿وَرِضْوَانٌ مِّنَ ٱللَّهِ أَكْبَرُ﴾[1] واتە: وەڕەزامەندیش لەلایەن خواوە کەگەورەترە لەهەموو شتێك. وەئەفەرموێت: ﴿سِيمَاهُمْ فِى وُجُوهِهِم مِّنْ أَثَرِ ٱلسُّجُودِ﴾ واتە: ڕەنگ دانەوەی سوژدە بردنیان بەنیو چاوانیانەوە دیارە. عەلی کوڕی ئەبو تەلحە دەڵێت: لەئیبنو عەباسەوە (ڕەزای خوایا لێ بێ) ﴿سِيمَاهُمْ فِى وُجُوهِهِم﴾ واتە: نیشانەی چاك[2]، موجاهیدو کەسانی تریش گوتویانە: واتە: گەردن کەچی وخۆبەکەم زانینی[3] هەندێ دەڵێن: چاکی و چاکەخوازی: ڕوناکیەکە لەناو دڵاو ڕۆشنایە لەنیوچاواناو ڕۆزی فراوانی و خۆشەویستیە لەناو دڵی خەڵکیدا. گەورەی موسوڵمانان عوسمانی کوڕی عەفان (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرموویەتی: هیچ کەسێك نیە کەپەنهانیەك بشارێتەوە مەگین خودا دەری دەخا لەنیو چاوان و قسەکردنیدا. ئیمامی ئەحمد ڕیوایەتی کردوە لەئیبنو عەباسەوە (ڕەزای خوایان لێ بێ) ئەویش لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) کەئەفەرموێت: (ڕەوشتی جوان وئاکاری چاك وزیادە ڕەوی نەکردن بەشێکە لەبیستو پێنج بەشی پێغەمبەریەتی)[4]، ئەبو داودیش ڕیوایەتی کردوە[5].

یارەکانی پێغەمبەرو (ﷺ) نیەتیان پاك بووەو کرداریان چاك بووە هەرکەسێ سەیری کردبن سەرنجی ڕاکێشاوە بەڕەوشتی جوان وچاکیان. مالك دەڵێت(ڕەزای خوای لێ بێ): ئاگادار کراوم لەگاورەکان کاتێ کەچاویان کەوتوە بەئەسحابەکان کەشامیان ڕزگار کرد ئەیان گوت: بەخوا وەك ئاگادار کراوین ئەمانە لەحەواریەکان چاکترن. بێ گومان ڕاستیان وتوە چونکە ئەم ئوممەتە بەڕێزترە وەك لەکتێبە پێشوەکاندا هاتوە لەئوممەتەکانی تر لەم ئوممەتەیشا گەورەترو بەڕێزتر هاوەڵەکانی پێغەمبەرە (ﷺ) چونکە خودای مەزن لەو کتێبانەی کەڕەوانەی کردوە بۆ گەلە پێشوەکان ئیشارەتی بۆ داون وباس کراوە بۆیە خوای گەورە لێرەدا ئەفەرموێت: ﴿ذَٰلِكَ مَثَلُهُمْ فِى ٱلتَّوْرَىٰةِ﴾ پاشان فەرموویەتی: ﴿وَمَثَلُهُمْ فِى ٱلْإِنجِيلِ كَزَرْعٍ أَخْرَجَ شَطْـَٔهُۥ﴾ وەك کشتوکاڵێ کەوەچی زۆری لێ دابێ. ﴿فَـَٔازَرَهُۥ﴾ بەهێزو توندی کردبێ ﴿فَٱسْتَغْلَظَ﴾ گەورەو بەرز هەڵچوبێ ﴿فَٱسْتَوَىٰ عَلَىٰ سُوقِهِۦ يُعْجِبُ

---

[1] التوبة (٧٢).

[2] الطبري (٢٢/٢٦٣).

[3] الطبري (٢٢/٢٦٣).

[4] احمد (١/٢٩٦) فەرمودەیەکی حەسەنە.

[5] ابو داود (٥/١٣٦) فەرمودەیەکی حەسەنە.

ٱلزُّرَّاعَ ﴾ خاوەن کشتوکاڵەکان سەیر بمێنن لێی. هەر بەوشێوەیە هاوەڵەکانی پێغەمبەر(ﷺ) یارمەتی و پشت گیری پێغەمبەریان کردوە وەك لقوپۆپی کشتوکاڵ لەگەڵی بوون. ﴿لِيَغِيظَ بِهِمُ ٱلْكُفَّارَ﴾ واتە: هەتا سپڵەو چاوچنۆکەکانی پێ دڵگران بکات. ئیمامی مالك (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) لە ڕیوایەتێکدا لێی وەرگیراوە کە بەپێی ئەم ئایەتە کۆمەڵی ڕافیزە دینیان نیە و کافرن ئەوانەی کەڕقیانە لە هاوەڵەکانی پێغەمبەرو (ﷺ) پێیان قەڵسن. چونکە ئەوانە زۆر قین لە دڵن بۆهاوەڵەکانی پێغەمبەر(ﷺ) وە هەر کەسێ کینەی لە هاوەڵەکانی پێغەمبەر(ﷺ) ببێ بەپێی ئەم ئایەتە موسوڵمان نیە هەندێ لە زانایانیش هەمان ڕایان هەبوە لەم بارەیەوە. فەرموودە زۆر هاتووە لەبارەی ڕێزی هاوەڵەکانەوە ڕێگری لەباس کردنیان کراوە بەخراپە. وەسفو ڕێزی خودای گەورە بەسە بۆیان کە لە زۆر ئایەتدا باسی هێناون. پاشان خودای مەزن فەرموویەتی: ﴿وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ مِنْهُم مَّغْفِرَةً وَأَجْرًا عَظِيمًۢا﴾ واتە: ئەوانەی خاوەن باوەڕو ئاکار چاکن بەڵێنی لێ بووردنی لە تاوانەکانیان پێداونو پاداشتی گەورەو ڕۆزی زۆریشیان دەداتێ. بەڵێنی خودا ڕاستەو بەجێی دێنێو هەرکەسیش بەڕێگەو ڕێبازی ئەواندا بروا هەمان پاداشی هەیە. چونکە هاوەڵەکانی پێغەمبەر(ﷺ) پێشینەییو ڕێزو پلەو پایەیەکی وایان هەیە لای خودا کەهیچ کەسێ لەم ئوممەتە پێیان ناگات خوای گەورە لێیان ڕازی بێ و بەهەشتو فیردەوس جێیان بێ وەك خودا خۆی بەڵێنی لێ بوردنو پاداشی گەورەی پێداون. موسلم ڕیوایەتی کردوە لە سەحیحەکەیدا لەئەبو هورەیەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (قسە مەڵێن بەهاوەڵەکانم سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە. ئەگەر یەکێك لەئێوە بەئەندازەی کێوی ئوحود ماڵی سەرف بێ ناگاتە موددی یەکێك یا نیوەی موددی یەکێك لەوانە)[1] موددێك بەرانبەرە بە (١٨) هەژدە لیرەی تەفرەنجی وەك لە مونجیدا هاتووە.

---

[1] مسلم (١٩٦٧/٤).

## تەفسیری سورەتی (الحجرات)

## لەمەدینەدا هاتووەتە خوارەوە

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تُقَدِّمُوا بَيْنَ يَدَيِ اللَّهِ وَرَسُولِهِ وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ۝١ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَرْفَعُوا أَصْوَاتَكُمْ فَوْقَ صَوْتِ النَّبِيِّ وَلَا تَجْهَرُوا لَهُ بِالْقَوْلِ كَجَهْرِ بَعْضِكُمْ لِبَعْضٍ أَنْ تَحْبَطَ أَعْمَالُكُمْ وَأَنْتُمْ لَا تَشْعُرُونَ ۝٢ إِنَّ الَّذِينَ يَغُضُّونَ أَصْوَاتَهُمْ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ أُولَٰئِكَ الَّذِينَ امْتَحَنَ اللَّهُ قُلُوبَهُمْ لِلتَّقْوَىٰ لَهُمْ مَغْفِرَةٌ وَأَجْرٌ عَظِيمٌ ۝٣﴾

### نەهی لە پێش کەوتنی خوداو پێغەمبەرەکەی و، فەرمان دان بەڕێز لێ گرتن وڕەوشت جوانی لەگەڵی

خودای گەورەئەفـەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تُقَدِّمُوا بَيْنَ يَدَيِ اللَّهِ وَرَسُولِهِ وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾ ئەی گەلی خاوەنباوەڕان! نەچن وەپێش خواو پێغەمبەرەکەی (ﷺ) بکەون، با ترستان لـە خـودا بـێ، خودا بیسەرو زانایە. خودای گەورە بەم ئایەتە ئامۆژگاری خاوەنباوەڕان دەکات کە چۆن هەڵس وکەوت بکەن لەخزمەت پێغەمبەرا (ﷺ) لەڕێزو حورمـەت گرتن ومـەزن سـەیرکردنی فەرموویەتی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تُقَدِّمُوا بَيْنَ يَدَيِ اللَّهِ وَرَسُولِهِ﴾ ئـەی ئەوانـەی باوەڕتـان هێنـاوە پەلـە مەکـەن لەوشـتانەی کەپێغەمبەر(ﷺ) دەیەوێت بیکا. واتە پێشی مەکەون. بەڵکو ئێوە شوێنی ئـەو کـەون لەهـەموو ئیش و کارێکدا ئەو ئەیکات. عەلی کوڕی ئـەبو تەلحە دەڵێت لـەئیبنو عەباسـەوە (ڕەزای خـوای لێ بێ). ﴿لَا تُقَدِّمُوا بَيْنَ يَدَيِ اللَّهِ وَرَسُولِهِ﴾ واتە: شتێ مـەڵێن لەگـەڵ قورئـان و فـەرموودەی پێغەمبـەرا ڕێ نەکـەوێ[1]. قەتادە دەڵێت: بۆمان باس کراوە کە هەندێ کەس گوتویانە: گەر ئایەت بهاتایە لەم بارەو لـەو بـارەوە یان ئەوشتە ڕاست بوایە. خودای گەورە ئەوەی پێ ناخۆش بوە[2]. و پـێش کەوتن بـوە تیایدا، ﴿وَاتَّقُوا اللَّهَ﴾ واتە: لەخودا بترسن لەو فەرمانانـەی ئەیدا بەسـەرتاندا. ﴿إِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ﴾ واتـە: خـودا قسەکانتان دەبیسێ و﴿عَلِيمٌ﴾ بەوەی لەدڵتانایە دەزانێ. هەمیسان خودای گەورە ئەفـەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَرْفَعُوا أَصْوَاتَكُمْ فَوْقَ صَوْتِ النَّبِيِّ وَلَا تَجْهَرُوا لَهُ بِالْقَوْلِ كَجَهْرِ بَعْضِكُمْ لِبَعْضٍ أَنْ تَحْبَطَ أَعْمَالُكُمْ وَأَنْتُمْ لَا

---

[1] الطبري (٢٢/٢٧٥).

[2] الطبري (٢٢/٢٧٦).

تَشۡعُرُونَ ﴾ ئەی گەلی خاوەن باوەڕان! ناشیٚ دەنگتان سەر دەنگی پێغەمبەر کەویٚ (ﷺ) دەنگیش هێندە بەرز مەکەن، وەك لەگەڵ یەکترا قسەبکەن) کەکارتان لیٚ پووچەڵ ببیٚ و خۆتان بەخۆتان نەزانن . ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَرۡفَعُوٓاْ أَصۡوَٰتَكُمۡ فَوۡقَ صَوۡتِ ٱلنَّبِيِّ﴾ ئەمەیش ڕەوشتیٚ ترە لەو ڕەوشتانەی کەخودای گەورە داوادەکا لەخاوەن باوەڕان لەبەر چاوی بگرن کەلەکاتی قسەکردنا لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) دەنگیان بەرز نەکەنەوە بەسەر دەنگی ئەوا، ڕیوایەت کراوە کەئەم ئایەتە لەسەر دوو پیاوە مەزنەکە ئەبوبەکرو عومەر هاتە خوارەوە (ڕەزای خوای لیٚ بیٚ) بوخاری ڕیوایەتی کردوە لە ئیبنو ئەبی مولەیکەوە دەڵێت: وەخت بو دوو پیاوە چاکەکە لەناو بچن (ڕەنجە ڕۆ ببن) ئەبو بەکرو عومەر (ڕەزای خوایان لیٚ بیٚ) دەنگیان بەرز کردوە لەخزمەت پێغەمبەرا (ﷺ) وەختیٚ کۆمەڵیٚ لەخەڵکی بەنی تەمیم هاتن بۆلای پێغەمبەر(ﷺ) یەکێکیان دەڵێت ئەقرەعی کوڕی حابس (ڕەزای خوای لیٚ بیٚ) برای بەنی مەجاشع بکەرە لێپرسراویان، ئەوی تریان پیاوێکی تری گوت. نافیع دەڵێت: ناوەکەم لەبیرنیە کیٚ بو. ئەبو بەکر دەڵێت بەعومەر (ڕەزای خوایان لیٚ بیٚ) تۆ هەر ئەتەویٚ دژایەتی من بکەی. عومەر دەڵێت: من مەبەستم دژایەتی تۆ نەبوە لەو کاتەدا دەنگیان بەرز بووەوە، خودای گەورەئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَرۡفَعُوٓاْ أَصۡوَٰتَكُمۡ فَوۡقَ صَوۡتِ ٱلنَّبِيِّ وَلَا تَجۡهَرُواْ لَهُۥ بِٱلۡقَوۡلِ كَجَهۡرِ بَعۡضِكُمۡ لِبَعۡضٍ أَن تَحۡبَطَ أَعۡمَـٰلُكُمۡ وَأَنتُمۡ لَا تَشۡعُرُونَ﴾ ئیبنو زوبەیر (ڕەزای خوایان لیٚ بیٚ) دەڵێت: دوای ئەوە عومەر ئەوەندە دەنگی بەرز نەدەکردەوە هەتا پێغەمبەر(ﷺ) لێی تیٚ بگات، ئەمەی لەبارەی باوکیەوە باس نەکرد واتە: ئەبوبەکر (ڕەزای خوای لیٚ بیٚ)[1] بە تەنها بوخاری ئەم فەرمودەی ڕیوایەت کردووە موسلمی لەگەڵ نیە. وەلە ڕیوایەتێکی ترا لەبوخاریەوە هاتوە کە دەستەیەك لەبەنی تەمیم هات بۆلای پێغەمبەر(ﷺ) ئەبوبەکر دەڵێت: قەعقاعی کوڕی مەعبەد بکە بەئەمیریان، عومەر دەڵێت: ئەقرەعی کوڕی حابس بکە بەئەمیریان، هەتا کۆتایە فەرمودەکە.[2] دیسان بوخاری ڕیوایەتی کردوە لەئەنەسی کوڕی مالکەوە (ڕەزای خوای لیٚ بیٚ) کەپێغەمبەر(ﷺ) هەواڵی سابتی کوڕی قەیس دەپرسی کەدیار نەبو. پیاوێك دەڵێت: من هەواڵت ئەدەمیٚ لەکوێیە. چو بۆماڵوەیان بینی سەری داخستوە پێی گوت: چیت بەسەر هاتوە؟ دەڵێت: خراپم بەسەر هاتوە چونکە دەنگی بەرز کردبو بەسەر دەنگی پێغەمبەرا (ﷺ) کارەکانی پوچەڵ بوەتەوەو بوە بەیەکێك لەخەڵکی ناو ئاگر. پیاوەکە هات بۆلای پێغەمبەر(ﷺ) هەواڵەکەی بۆ گێڕایەوە کە ئاواو ئاوا ئەڵیٚ. موسا دەڵێت: جاری دووهەم گەڕایەوە بۆلای مژدەیەکی زۆر گەورەوە پێغەمبەر فەرموی: (بچۆ بۆلای پێی بڵیٚ: تۆ لەخەڵکی ناو ئاگر نیت

---

[1] فتح الباري (٨/٤٥٤).

[2] فتح الباري (٨/٤٥٧).

بەڵکو تۆ لەخەڵکی ناو بەهەشتی). بەم شێوەیە تەنها بوخاری ڕیوایەتی کردوە.[1] ئیمامی ئەحمد ڕیوایەتی کردوە لەئەنەسی کوڕی مالکەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێت: کاتێ ئەم ئایەتە دابەزیە خـوارەوە: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَرْفَعُوٓاْ أَصْوَٰتَكُمْ فَوْقَ صَوْتِ ٱلنَّبِيِّ وَلَا تَجْهَرُواْ لَهُۥ بِٱلْقَوْلِ كَجَهْرِ بَعْضِكُمْ لِبَعْضٍ أَن تَحْبَطَ أَعْمَٰلُكُمْ وَأَنتُمْ لَا تَشْعُرُونَ ﴾ سابتی کوڕی قەیسی کوڕی شەمماس دەنگی بەرز بو دەڵێت: من بووم ئەو کەسەی کە دەنگم بەرز دەکردەوە لەخزمەت پێغەمبەری خوادا (ﷺ) وەمن لەخەڵکی ناو ئاگرم و کردەوەکانم پوچەڵ بوەتەوە. بەدڵ تەنگی لەماڵەوە دانیشتبو. پێغەمبەری خودا(ﷺ) هەواڵی پرسی. هەندێ لەخەڵکی چون بۆ لای پێیان وت: کەپێغەمبەری خودا(ﷺ) هەواڵت ئەپرسێ چیتە؟ دەڵێت من بوم ئەو کەسە کە دەنگم بەرز کردەوە بەسەر دەنگی پێغەمبەردا (ﷺ) دەنگیشم هێندە بەرزکردوە کردەوەکانم پوچەڵ بووە وەو من لەخەڵکی ناو ئاگرم. پیاوەکان هاتنەوە لای پێغەمبەر(ﷺ) ئەوەی کەسابت دەڵێت بۆیان گێڕایەوە. پێغەمبەر(ﷺ) فەرموی: (نەخێر بەڵکو ئەو لەخەڵکی ناو بەهەشتە). ئەنەس دەڵێت: کاتێ ئێمە چاومان پێی دەکەوت لەناوماندابو دەمان زانی کەلە ئەهلی بەهەشتە. کاتێ کەڕۆژی یەمام هات هەندێ ترس و سستیمان پێوە دیار بو. سابتی کوڕی قەیسی کوڕی شەحماس هاتو بۆنی خۆشی لەخۆی دابو کفنی لەبەر کردبو دەڵێت: خراپ دەچن بەدەم هاوەڵەکانتانەوە، شەڕی کرد هەتا شەهید کرا(ڕەزای خوای لێ بێ)[2] خودای مەزن فەرمانی داوە کە هێندە دەنگ بەرزنەکەنەوە بەسەر پێغەمبەردا (ﷺ) وەك چۆن لەگەڵ یەکتری قسە دەکەن و دەنگ بەرزدەکەنەوە. بەڵکو دەبێ زۆر بەئارامی و ڕێزەوە لەخزمەت پێغەمبەردا(ﷺ) بدوێن بۆیە خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَلَا تَجْهَرُواْ لَهُۥ بِٱلْقَوْلِ كَجَهْرِ بَعْضِكُمْ لِبَعْضٍ﴾ وەك لەئایەتێکی ترا فەرموویەتی: ﴿ لَّا تَجْعَلُواْ دُعَآءَ ٱلرَّسُولِ بَيْنَكُمْ كَدُعَآءِ بَعْضِكُم بَعْضًا ﴾[3] واتە: بانگ کردنی پێغەمبەر(ﷺ) لەناو خۆتاندا دامەنێن، نابێ وەك بانگ کردنی خۆتان لە یەکتری (دەبێ بەڕێزەوە بانگ بکرێتوەك ئەی پێغەمبەر یارسول الله (ﷺ). وەئەفەرموێت: ﴿أَن تَحْبَطَ أَعْمَٰلُكُمْ وَأَنتُمْ لَا تَشْعُرُونَ ﴾ واتە: بۆیە دەنگ بەرز کردنەوەمان لێ قەدەغەکردن لەلای پێغەمبەردا (ﷺ) لەترسی ئەوەی نەکا پێغەمبەر(ﷺ) توڕەببێ لێتانوخودایش لەبەر ئەو لێتان نیگەران ببێ و کردەوەی ئەو کەسە پوچەڵ ببێتەوە بەخۆی نەزانێ. وەك لەفەرمودەی سەحیحدا هاتوە ئەفەرموێت: (پیاوی واهەیە قسەیەك دەکا لەڕەزامەندی

---

[1] فتح الباري (٨/٤٥٤).

[2] احمد (٣/١٣٧) فەرمودەیەکی سەحیحە.

[3] النور (٦٣).

خوادا هیچ گرنگی پێنادا بەهۆی ئەو قسەوە بەهەشتی بۆ دەنوسرێ. پیاوی واش هەیە قسەیەك دەكا كەخودا پێی ناخۆشە هیچ گرنگی پێنادا دەكەوێتە خوارەوە بەناو ئاگرا بەئەندازەی دووری نێوان ئاسمانو زەمین)[1]. پاشان خودای مەزن هانی ئەو موسوڵمانانە دەدانو وەسفیان دەكات كە لە خزمەت پێغەمبەرا (ﷺ) دەنگیان نزم دەكەنەوە ئەفەرمووێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَغُضُّونَ أَصۡوَٰتَهُمۡ عِندَ رَسُولِ ٱللَّهِ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ ٱمۡتَحَنَ ٱللَّهُ قُلُوبَهُمۡ لِلتَّقۡوَىٰۚ لَهُم مَّغۡفِرَةٞ وَأَجۡرٌ عَظِيمٌ﴾ ئەو كەسانەی لەخزمەت پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەنگیان نزم دەكەنەوە ئەو كەسانەن خوا دەربارەی پارێزگاری، دڵی تاقی كردوونەتەوە لێ خۆشبوونوپاداشی مەزن بۆ ئەوانە . واتە: ئەوانەی دەنگیان نزم دەكەنەوە لەخزمەت پێغەمبەری خوادا (ﷺ) خودای گەورە دڵی پاك كردونەتەوەو وای لێ كردون كەشیاوی لێ خۆش بونوپاداشی مەزنی خودا بن. ئیمامی ئەحمد ڕیوایەتی كردوە لەكتێبی زوهدا لەموجاهیدەوە دەڵێت: نامەیەك نوسرا بۆ گەورەی موسوڵمانان عومەر. ئەی گەورەی موسوڵمانان: پیاوێك ئارەزوی گوناە ناكاو پێی هەڵناسێ چاكترە یان پیاوێك ئارەزوی گوناە دەكاو گوناە ناكات؟ عومەر (ڕەزای خوای لێ بێ) نوسی ئەوانەی ئارەزوی گوناە دەكەنوپێی هەڵناسن چاكترن ﴿أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ ٱمۡتَحَنَ ٱللَّهُ قُلُوبَهُمۡ لِلتَّقۡوَىٰۚ لَهُم مَّغۡفِرَةٞ وَأَجۡرٌ عَظِيمٌ﴾.

**باسی خراپی ئەوانەی لەدەرەوەی ژورەكانەوە بانگی پێغەمبەر دەكەن (ﷺ)**

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يُنَادُونَكَ مِن وَرَآءِ ٱلۡحُجُرَٰتِ أَكۡثَرُهُمۡ لَا يَعۡقِلُونَ ﴿٤﴾ وَلَوۡ أَنَّهُمۡ صَبَرُواْ حَتَّىٰ تَخۡرُجَ إِلَيۡهِمۡ لَكَانَ خَيۡرٗا لَّهُمۡۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿٥﴾﴾

خودای مەزن فەرموویەتی: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يُنَادُونَكَ مِن وَرَآءِ ٱلۡحُجُرَٰتِ أَكۡثَرُهُمۡ لَا يَعۡقِلُونَ﴾ ئەو كەسانەی لەو دیوی هۆدەكانەوە بانگت دەكەن، زۆر بەیان ئاوەزیان نیە . پاشان خودای گەورە باسی خراپی ئەو كەسانە دەكات لەو دیوی ژوورەكانەوە بانگی پێغەمبەر(ﷺ) دەكەن. وەك ئەو عەرەبە زبرو بێ ئاوەزانە لە دەرەوەی ژووری خێزانەكانی بانگیان دەكرد ﴿أَكۡثَرُهُمۡ لَا يَعۡقِلُونَ﴾ واتە: زۆربەیان ئاوەزیان نیە. پاشان خوای گەورە ئامۆژگاریان دەكات و نیشانیان دەدا كەچۆن ڕێز لە پێغەمبەر(ﷺ) بگرن، ئەفەرمووێت: ﴿وَلَوۡ أَنَّهُمۡ صَبَرُواْ حَتَّىٰ تَخۡرُجَ إِلَيۡهِمۡ لَكَانَ خَيۡرٗا لَّهُمۡۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ﴾ ئەگەر خۆیان ڕاگرتایە هەتا دەردەچووی بۆ لایان، بێ شك بۆ ئەوان باشتر بوو، خوا دەشبوورێ و دلۆڤانە . واتە: ئەگەر خۆیان بگرتایە لەدنیاو قیام تا ئەوە بۆ ئەوان چاكتر بو پاشان خودای مەزن

---

[1] فتح الباري (١١/٣١٢).

داوایان لیٚ دەکات کەپەشیمان ببنەوە بگەڕێنەوە بۆلای خودا. ﴿وَاللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ لە زۆر کەسەوە باس کراوە کە ئەم ئایەتە لەسەر ئەقرەعی کوڕی حابسی تەمیمی(ڕەزای خوای لیٚ بیٚ) هاتوەتە خوارەوە. ئیمامی ئەحمد ڕیوایەتی کردوە لەئەقرەعی کوڕی حابسەوە(ڕەزای خوای لیٚ بیٚ) کەبانگی پێغەمبەری خوای کردوە (ﷺ) لەدەرەوەی ژورەکان گوتویەتی: ئەی محمد ئەی محمد. ولەڕیوایەتێکی ترا گوتویەتی: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) پێغەمبەریش وەلامی نەداوەتەوە. پاشان گوتویەتی: سوپاس کردنم زۆر چاکەو زەم کردنیشم زۆر خراپە. پێغەمبەر(ﷺ) فەرموی: (ئەوەی تۆ ئەیلێی، خوای گەورەیە)[1]. واتە: ئەوە خوای مەزنە سوپاس کردنی زۆر چاکەو زەم کردنیسی بۆ هەر کەسیٚ زۆر خراپە.

**فەرمان دان بە زۆر وردبونەوە لە کەسێکی لەڕیٚ دەرچوو (لادەر) کە دەنگ و باسێك دێنیٚ**

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِن جَآءَكُمْ فَاسِقٌۢ بِنَبَإٍ فَتَبَيَّنُوٓا۟ أَن تُصِيبُوا۟ قَوْمًۢا بِجَهَـٰلَةٍ فَتُصْبِحُوا۟ عَلَىٰ مَا فَعَلْتُمْ نَـٰدِمِينَ ﴿٦﴾ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ فِيكُمْ رَسُولَ ٱللَّهِ ۚ لَوْ يُطِيعُكُمْ فِى كَثِيرٍ مِّنَ ٱلْأَمْرِ لَعَنِتُّمْ وَلَـٰكِنَّ ٱللَّهَ حَبَّبَ إِلَيْكُمُ ٱلْإِيمَـٰنَ وَزَيَّنَهُۥ فِى قُلُوبِكُمْ وَكَرَّهَ إِلَيْكُمُ ٱلْكُفْرَ وَٱلْفُسُوقَ وَٱلْعِصْيَانَ ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلرَّٰشِدُونَ ﴿٧﴾ فَضْلًا مِّنَ ٱللَّهِ وَنِعْمَةً ۚ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿٨﴾﴾

خودای مەزن فەرمان دەدا بەورد بونەوە لەهەواڵ هێنانی کەسێکی لەڕیٚ لادەرو پەلە نەکردن لیٚی هەتا ڕون دەبێتەوە نەك درۆ بیٚ یان بەهەڵە هەواڵەکەی هێنابیٚ، بۆ ئەوەی ئەو کەسە یا ئەو دادوەرە بڕیار نەدا لەسەر قسەکەی و ئەویش وەك ئەو بکەوێتە هەڵەوە. خوای گەورە داوای کردوە کەشوێنی قسەو ڕێی خراپەکاران نەکەوین. ئالێرەدا هەندیٚ لەزانایان ڕیوایەتی کەسیٚ قەبوڵ ناکەن کەناسراو نەبیٚ و هەڵس و کەوتی نەزانریٚ لەبەر ئەوەی نەوەك لەڕیٚ لادەربیٚ (لەبارەی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتەوە بەسەر هاتێك هەیە لەچەند ڕێگاوە باس کراوە چاکترین ڕیوایەتیان ئەم یەکە ئیمامی ئەحمد ڕیوایەتی کردوە لەموسنەدەکەیا لەڕیوایەتی مالکی بەنی موستەلەقەوە لەحارسی کوڕی ئەبی زیرارەوە باوکی جویریەی کچی حارسی دایکی موسوڵمانان (ڕەزای خوای لیٚ بیٚ) حارسی کوڕی زیراری خوزاعی (ڕەزای خوای لیٚ بیٚ) دەڵێت: چومە لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) بانگی کردم بۆ ئیسلام. منیش موسوڵمان بوم و باوەڕم هێنا فەرموی پێم کەزەکات بدەم گوتم باشەو گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا بگەڕێمەوە بۆناو هۆزەکەم بانگیان بکەم کە موسوڵمان بن‌وزەکات بدەن هەرکەسیٚ بەگوێی کردم زەکاتەکەی لیٚ وەردەگرم و کۆی دەکەمەوە کەسێکم بۆ ڕاسپێرە لەکاتێکی دیاری کراودا هەتا ئەوەی کەکۆم کردوەتەوە بۆت ڕەوانە بکەم. کاتیٚ حارس زەکاتەکەی کۆکردەوە لەو کەسانەی کوموسوڵمان

---

[1] احمد (٣/٤٨٨) فەرمودەیەکی سەحیحە.

بون ئەوكاتەش هات کەپێغەمبەری خودا(ﷺ) دیاری کردبو. ڕاسپێراوەکە ڕەوانە بکا. ڕاسپێراوەکە دواکەوت نەچو بۆلای. حارس واتێگەیشت کەخوای گەورەو پێغەمبەر تورە بوون لێی پیاو ماقوڵانی هۆزەکەی بانگ کردو پێی گوتن: کەپێغەمبەری خودا(ﷺ) کاتێکی بۆ دیاری کردوە کە ڕاسپێراوی خۆی بۆ دەنێری ئەو زەکاتەی کۆی کردوەتەوە لێی وەردەگری، وەپێغەمبەری خودا هەرگیز بەڵێن ناشکێنێ و بەجێی دێنێ وادەزانم ئەگەر تورە نەبوبێ ئەو ڕاسپاردەی دوا نەدەخست وەرن لەگەڵم بچین بۆلای پێغەمبەری خودا(ﷺ) پێغەمبەریش (ﷺ) وەلیدی، کوڕی عوقبەی ناردبو بۆلای حارس بۆ ئەوەی ئەو زەکاتەی لایەتی کۆی کردوەتەوە لێی وەرگرێ. وەختێ وەلید چوەو نزیك بوەتەوە ترساوە و گەڕاوەتەوە بۆلای پێغەمبەر(ﷺ) گوتویەتی: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) حارس زەکاتی نەدامێ و ویستی بمکوژێ، پێغەمبەری خودا(ﷺ) تورەبو کۆمەڵێکی نارد بەدوای حارسدا (ڕەزای خوای لێ بێ) حارس و هاوەڵەکانی لەدەرەوەی شاری مەدینە گەیشتنە ئەو کەسانە گوتیان: ئەوە حارسە. حارس چووە لایان دەڵێت: ئێوە بۆلای کێ نێرراون؟ گوتیان: بۆلای تۆ. دەڵێت: بۆچی؟ گوتیان: پێغەمبەری خودا(ﷺ) ولیدی کوڕی عوقبەی بۆ ناردی. دەڵێت تۆ زەکاتت نەداوەتێ و ویستوتە بیکوژی. حارس (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێت: نەخێر سوێند بەو کەسەی کەمحمدی بەهەق ڕەوانە کردوە هەرگیز چاوم پێی نەکەوتوەو نەهاتۆتە لام. کاتێ حارس چووە لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموی: (زەکاتت نەداوەو ویستوتە ڕاسپێراوەکەشم بکوژی؟) حارس دەڵێت: نەخێر سوێند بەوکەسەی تۆی ڕەوانە کردوە بەهەق چاوم پێی نەکەوتوەو نەهاتوتە لام. وەنەهاتم هەتا کاتێ کەپێغەمبەر(ﷺ) ڕاسپێراوەکەی گل دایەوە (ڕەوانە نەکرد بۆلام) ترسام خوداو پێغەمبەری خودا(ﷺ) ڕازی نەبوبن لێم. دەڵێت: لەو کاتا سورەتی (الحجرات) هاتە خوارەوە: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن جَآءَكُمْ فَاسِقُۢ بِنَبَإٖ فَتَبَيَّنُوٓاْ أَن تُصِيبُواْ قَوۡمَۢا بِجَهَٰلَةٖ فَتُصۡبِحُواْ عَلَىٰ مَا فَعَلۡتُمۡ نَٰدِمِينَ ٦ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ فِيكُمۡ رَسُولَ ٱللَّهِۚ لَوۡ يُطِيعُكُمۡ فِي كَثِيرٖ مِّنَ ٱلۡأَمۡرِ لَعَنِتُّمۡ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ حَبَّبَ إِلَيۡكُمُ ٱلۡإِيمَٰنَ وَزَيَّنَهُۥ فِي قُلُوبِكُمۡ وَكَرَّهَ إِلَيۡكُمُ ٱلۡكُفۡرَ وَٱلۡفُسُوقَ وَٱلۡعِصۡيَانَۚ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلرَّٰشِدُونَ ٧ فَضۡلٗا مِّنَ ٱللَّهِ وَنِعۡمَةٗۚ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٞ﴾[1] ئیبنو ئەبی حاتەم و تەبەرانیش ڕیوایەتیان کردوە[2]. خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن جَآءَكُمْ فَاسِقُۢ بِنَبَإٖ فَتَبَيَّنُوٓاْ أَن تُصِيبُواْ قَوۡمَۢا بِجَهَٰلَةٖ فَتُصۡبِحُواْ عَلَىٰ مَا فَعَلۡتُمۡ نَٰدِمِينَ﴾ ئەی گەلی خاوەنباوەڕان! هەر کاتێ لەفەرمان لادەرێك دەنگ وباسێکتان

---

[1] احمد (٢٧٩/٤) فەرمودەیەکی حەسەنە.

[2] الطبراني (٢٧٤/٢٢) فەرمودەیەکی حەسەنە.

بۆ دێنیٚ، بەوردی لێی وردبنەوە، نەکا لەڕوی نەزانیەوە گەلێکتان تووشی زیان کەنولەکردەتان پەشیمان بن.

**هەر ڕاو بڕیاری پێغەمبەر(ﷺ) چاکترە**

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ فِيكُمۡ رَسُولَ ٱللَّهِۚ لَوۡ يُطِيعُكُمۡ فِي كَثِيرٖ مِّنَ ٱلۡأَمۡرِ لَعَنِتُّمۡ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ حَبَّبَ إِلَيۡكُمُ ٱلۡإِيمَٰنَ وَزَيَّنَهُۥ فِي قُلُوبِكُمۡ وَكَرَّهَ إِلَيۡكُمُ ٱلۡكُفۡرَ وَٱلۡفُسُوقَ وَٱلۡعِصۡيَانَۚ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلرَّٰشِدُونَ﴾ پێویستە ئەمەش بزانن کە پێغەمبەری خوداتان لەناودایە، ئەگەر لە زۆر کاراندا شوێنتان کەوتبووایە، توشی نارەحەتی دەبوون بەڵام خودا خۆشەویستی بڕوا بەدینی دایە ئەوەی لە دڵتاندا خەملاند. بێباوەڕی لەڕیٚ لادانو سەرپێچی لە لاتان ناشرین (کردوە. لەڕیٚ شارەزا ئەوانەن. واتە: زۆر باش بزانن کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەنێوانتاندایە زۆر بەڕێزو گەورە سەیری بکەنولەخزمەتیابن لە فەرمانی دەرنەچن هەرچی ئەفەرموێت: گویٚ ڕایەڵی بەکەن. چونکە ئەو باشتر دەزانیٚ چ شتیٚ بۆئێوە چاکەو لەبەرژەوەندیتانە. وەلە خۆتان بەسۆزترە بۆتانوهەر بڕیارێك دەدا لەڕاو بڕیاری خۆتان چاکترە بۆتان.

وەك خودای گەورەفەرموویەتی: ﴿ٱلنَّبِيُّ أَوۡلَىٰ بِٱلۡمُؤۡمِنِينَ مِنۡ أَنفُسِهِمۡ﴾[1] واتە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە خودی بڕواداران بۆ خۆیان لە پێشترە.پاشان ڕوونی دەکاتەوە کە ئەوان عەقڵیان بۆ زۆرشت ناچیٚ کە لە بەرچەوەندی خۆیانەو ئەفەرموێت: ﴿لَوۡ يُطِيعُكُمۡ فِي كَثِيرٖ مِّنَ ٱلۡأَمۡرِ لَعَنِتُّمۡ﴾ واتە: ئەگەر لەزۆر شتا شوێنی ڕاو بۆچونی ئێوە بکەوتایە تووشی زەحمەتو نارەحەتی دەبون وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَلَوِ ٱتَّبَعَ ٱلۡحَقُّ أَهۡوَآءَهُمۡ لَفَسَدَتِ ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلۡأَرۡضُ وَمَن فِيهِنَّۚ بَلۡ أَتَيۡنَٰهُم بِذِكۡرِهِمۡ فَهُمۡ عَن ذِكۡرِهِم مُّعۡرِضُونَ﴾[2] واتە: وەئەگەر حەقو ڕاستی شوێن هەواو ئارەزوی ئەوان بکەوتایە ئاسمانەکانو زەوی و هەموو ئەوانەی تیایاندایە دەشێوانوتێك دەچون بەسەریەکدا بەڵکو ئێمە قورئانێکمان بۆ هێناون کەهۆی یادخستنەوە یە بۆ ئەوان بەڵام ئەوان لەبیرخستنەوە و سەربەرزی خۆیان پێشترن. خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ حَبَّبَ إِلَيۡكُمُ ٱلۡإِيمَٰنَ وَزَيَّنَهُۥ فِي قُلُوبِكُمۡ﴾ بەڵام خودا خۆشەویستی باوەڕی خستە دڵتانەوە شیرینوجوانی کرد لاتان.

---

[1] الأحزاب (٦).

[2] المؤمنون (٧١).

**جیاوازی لەنێوان ئیسلام و باوەڕ (الایمان)**

خـودای مـەزن ئەفـەرموێت: ﴿وَكَرَّهَ إِلَيْكُمُ ٱلْكُفْرَ وَٱلْفُسُوقَ وَٱلْعِصْيَانَ﴾ واتـە: بـێ دینـی و لـەڕێ لادان‌وگوناهی لەلا ناشرین کردون بەگەورەو بچوکەوە وردە وردەو بەپێی تواناتان ئەمەیش بەهرەیەکە کـەخودا داویـەتی بەبەنـدە خـاوەن باوەڕەکـان. ﴿أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلرَّٰشِدُونَ﴾ ئەوانـەی کـە خۆیـان ڕازاندوەتەوە بـەم سیفەتانە شـارەزای ئـەو ڕێیـەن‌وخودای گـەورە ڕێـی نیـشان داون. ئیمامی ئەحمد ڕیوایەتی کردوە لەئەبی ڕیفاعەی زورەقیەوە ئـەویش لەباوکیـەوە دەڵێت: کـاتێ ڕۆژی جـەنگی ئوحـود ڕویدا بتپەرستەکان تێشکان‌وڕایان کرد پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (ڕێك بوەستن هەتا سوپاس و ستایشی پەروەردگاری مەزنم بکەم. لەدوایەوە بەچەند ڕیزێك وەسـتاو فـەرمووی: (خودایە سـوپاس و ستایشی هەموو بۆتۆمە. خودایە: ئـەوەی تـۆ ڕۆزیت داوە کـەس لێ ناگرێتـەوە. ئـەوەیش لێت گرتـوە کەس نیە بیداتێ. ڕێ نیشاندەر نیە بۆ ئەوەی تۆ ڕێت لێ ون کردبێ وەهەر کەس تۆ ڕێت نیشان دابێ کەس نیە گومڕای بکا وەئەوەی تۆ لێت گرتەوە کەس نیە پێی ببەخشێ. ئەوەیش تۆ پێت داوە ڕێگری نیە. ئەوەی دوورت خستوەتەوە کەس نیە نزیکی کاتەوە ئەوەیش نزیکت کردوەتەوە کـەس نیـە دوری بخاتەوە. خودایە: بەرەکەت‌و بەزەیی ڕێزو ڕۆزی خۆتمان بۆ فراوان بکە. خودایە من داوای ئەو بـەهرەو خۆشیە بەردەوامت لێ دەکەم کە ناگۆڕێ و تـەواو نـابێ. خودایـە داوای خۆشـگوزەرانیت لێدەکـەم لـەو ڕۆژە تەنگانەدا، وەداوای دڵنیایت لێدەکەم لـەو ڕۆژە ترسـەدا. خودایـە مـن پـەنات پێدەگرم لەشـەڕی ئەوەی کەپێت داوین. وەلەشەڕی ئەوەی کەپێت نەداوین. خودایە: خۆشەویستی باوەڕ بەئاین لە لامـان شیرن کەو بیرازێنەوە لە دڵمانداو بێ دینی و لەڕێ لادان‌و سەرپێچی لـەلامان دزێوکـە. بمانخـەرە ڕیـزی شارەزایانەوە خودایە بەموسوڵمانی بمان مرێنەو بە موسوڵمانیش بمانژێنە. بمان گەیەنە بە پیاو چاکان سـەرمان لێ تێـك مـەدەو شـەرمەزارمان مەکـە. خودایـە ئـەو بـێ دینانـە لەناوبـەرە کـەبڕوا ناکـەن بـە پێغەمبەرەکانت‌و دەبنە لەمپەر لەڕێی تۆدا سزاو جەزرەبەی خۆت بدە بەسەریانا، ئەی خودا لەناوبەری ئەو خوانەناسانەی کە کتێبیان بۆهات‌و خودایەکی حـەقی)[١]. نەسـائیش ڕیوایـەتی کـردوە لەپاڕانـەوەی ڕۆژو شەودا.[٢] پاشان فەرمووی: ﴿فَضْلًا مِّنَ ٱللَّهِ وَنِعْمَةً﴾ واتە: ئەم بەهرەو بەخششە کەپێی داون ئەمـە ڕێزێکـی خودایـە بۆتـان لـە لایـەن خۆیـەوە. ﴿وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾ واتـە: ئاگـادارە کـەکێ شـایەنی ڕێ

---

[١] أحمد (٣/٤٢٤) ئەم فەرمودەیە سەنەدەکانی بەهێز نیە.

[٢] النسائي في الكبرى (٦/١٥٦) سەنەدەکانی بەهێز نیە.

نیشاندانەو کێش شایەنی گومڕاییە لەکارزانە لەکردارو گفتارو بەرنامەو بڕیاریدا. ﴿فَضۡلٗا مِّنَ ٱللَّهِ وَنِعۡمَةٗۚ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٞ﴾ ئەمەش بەخشش‌و چاکەیە لەخوداوەو، خودا زانای لەکارزانە.

**فەرمان دان بەئاشت کردنەوەی دووگرۆی دژیەك لەنێوان موسوڵماندا. وەستان دژی ئەوەی کەدەست درێژی کەرە**

﴿وَإِن طَآئِفَتَانِ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ٱقۡتَتَلُواْ فَأَصۡلِحُواْ بَيۡنَهُمَاۖ فَإِنۢ بَغَتۡ إِحۡدَىٰهُمَا عَلَى ٱلۡأُخۡرَىٰ فَقَٰتِلُواْ ٱلَّتِي تَبۡغِي حَتَّىٰ تَفِيٓءَ إِلَىٰٓ أَمۡرِ ٱللَّهِۚ فَإِن فَآءَتۡ فَأَصۡلِحُواْ بَيۡنَهُمَا بِٱلۡعَدۡلِ وَأَقۡسِطُوٓاْۖ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُقۡسِطِينَ ٩ إِنَّمَا ٱلۡمُؤۡمِنُونَ إِخۡوَةٞ فَأَصۡلِحُواْ بَيۡنَ أَخَوَيۡكُمۡۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمۡ تُرۡحَمُونَ ١٠﴾

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَإِن طَآئِفَتَانِ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ٱقۡتَتَلُواْ فَأَصۡلِحُواْ بَيۡنَهُمَاۖ فَإِنۢ بَغَتۡ إِحۡدَىٰهُمَا عَلَى ٱلۡأُخۡرَىٰ فَقَٰتِلُواْ ٱلَّتِي تَبۡغِي حَتَّىٰ تَفِيٓءَ إِلَىٰٓ أَمۡرِ ٱللَّهِۚ فَإِن فَآءَتۡ فَأَصۡلِحُواْ بَيۡنَهُمَا بِٱلۡعَدۡلِ وَأَقۡسِطُوٓاْۖ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُقۡسِطِينَ﴾ هەرکە لەناو باوەڕداران دوو گرۆ بەگژیەك داچون، ئێوە ئاشتیان بکەنەوە، ئەگەر یەکیان ویستی ناهەقی لەوی تر بکا. ئێوە بەگژ ئەوەدا بچن کەهەر دەیەوێ شەڕبکا، هەتا بۆ فەرمانی خودا مل کەچ دەکا ئەوسا بەبێ لایەنگیری پێکیان بێنن‌و بەیەکسانی بەکێشەکەیان ڕابگەن. لەو کەسانەی بەیەکسانی پێ ڕادەگەن، خوا خۆشی دێ. خوای گەورە فەرمان ئەدا بەئاشتەوایی کردن لەنێوان دوو گرۆی دژ بەیەك لە نێوان یەکدا ئەفەرموێت: ﴿وَإِن طَآئِفَتَانِ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ٱقۡتَتَلُواْ فَأَصۡلِحُواْ بَيۡنَهُمَا﴾ ناوی هێناون بەخاوەن بڕوا لەگەڵ ئەوەشدا کە دژی یەك شەڕ دەکەن. بۆیە بوخاری و کەسانی تریش ئەمەیان کردوەتە بەڵگە کەکەس لەباوەڕ بون وەدەر ناچێ بەهۆی تاوان‌وسەر پێچیەوە هەر چەند تاوانەکەی گەورە بێ. بە پێچەوانەی ڕاوبۆچونی خەوارج و ئەوانەی شوێنی خەوارج کەوتون لەموعتەزیلەو نمونەی ئەوان. وەدیسان لەسەحیحی بوخاریدا هاتوە لەفەرمودەی حەسەنەوە لەئەبی بەکرەتەوە(ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێت: ڕۆژێ پێغەمبەری خودا(ﷺ) وتاری دا. حەسەنی کوڕی عەلی لەگەڵا بو لەسەر منبەرەکە ڕەزای خوایان لێ بێ) جارێ دەیڕوانی بۆحەسەن‌وجارێکیش بۆ خەڵکەکەو دەیفەرموو: (ئەم کوڕەی من گەورەیە(سیدە) بەڵکو خوای گەورە ئاشتی بخاتە نێوان دوو گرۆی گەورەوە لەموسوڵمانان بەهۆی ئەوەوە)[1]، وەك ئەوەی کەپێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (خوای مەزن ئاشتی خستە نێوان خەڵکی شام و خەڵکی عێراق دوای چەند جەنگی درێژ خایەن‌وکارەساتی دڵ تەزێن بەهۆی ئەوەوە(واتە حەسەن). خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿فَإِنۢ بَغَتۡ إِحۡدَىٰهُمَا عَلَى ٱلۡأُخۡرَىٰ فَقَٰتِلُواْ ٱلَّتِي

---

[1] فتح الباري (٣٦١/٥).

﴿تَبۡغِي حَتَّىٰ تَفِيٓءَ إِلَىٰٓ أَمۡرِ ٱللَّهِۚ﴾ وە ئەگەر گرۆیەكیان ویستی ناهەقی بەوی تر بكات. ئێوە بچن بەگژ ئەوەدا كەدەیەوێت شەڕبكا. هەتا سەر دادەنوێنێ بۆ فەرمانی خوداو پێغەمبەرەكەی و گوێیان بۆ ڕاستی دەگرێ و شوێنی دەكەوێ. وەك لەفەرمودەی سەحیحدا هاتووە لە ئەنەسەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێت: كەپێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (یارمەتی براكەت بدە ستەم كاربێ یان ستەم لێ كراو؟ گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا) ئەمە یارمەتی ئەدەم ستەم لێ كراوە ئەی چۆن یارمەتی بدەم كەستەم كارە؟) پێغەمبەر(ﷺ) فەرموی: (دەستی بگرە لەو ستەم كاریە(مەهێڵە ناهەقی بكات) ئەوە یارمەتی دانی تۆیە بۆی)[1]. سەعیدی كوڕی جوبەیر باسی كردوە كە ئەوس و خەزرەج بوە بەشەڕیان بەنەعل و پەڵە دارخورما لەیەكیان داوە خودای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە فەرمانی دا ئاشتی بكرێت لە نێوانیاندا[2]. سودی دەڵێت: پیاوێك لەپشتیوانان كە عیمرانیان پێ ئەگوت، ژنێكی هەبو بانگ دەكرا بەدایكی زەید ئەم ژنە ویستی سەردانی كەس وكاری بكات. مێردەكەی بەندی كرد لەشوێنێكی بەرزی نزیك خۆیا نەی دەهێشت هیچ كەس لەخزمەكانی بێتە لای. ژنەكە ناردی بەشوێن خزمەكانیاو دایان گرت لەگەڵ خۆیان بیبەن. پیاوەكەش لەماڵ چوبوە دەرەوە. خزمی پیاوەكە هانایان بردبوە لای كەس وكاری پیاوەكە. ئامۆزاكانی هاتبون بۆئەوەی كە نەهێڵن ژنەكە ببەن. پەلاماری یەكیان دابوبەنەعل هاتبون بەیەكا. ئەم ئایەتە لەسەرئەوان هاتە خوارەوە. پێغەمبەری خودا(ﷺ) ناردی بەدوایاناو ئاشتی كردنەوە ملیان كەچ كرد بۆ فەرمانی خوای گەورە[3]. خوای مەزن ئەفەرموێت: ﴿فَإِن فَآءَتۡ فَأَصۡلِحُواْ بَيۡنَهُمَا بِٱلۡعَدۡلِ وَأَقۡسِطُوٓاْۖ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُقۡسِطِينَ﴾ واتە: بەبێ لایەنگیری و بەیەكسانی كێشەكەیان چارەسەر بكەن چونكە ئەوان هاوەڵی یەكتر بون، (بالقسط) واتە: بەیەكسانی. ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُقۡسِطِينَ﴾ خودا ئەو كەسانەی خۆشی دەوێ كە بەیەكسانی مامەڵە دەكەن لەگەڵ مەردوما بەبێ لایەنگیری. ئیبنو ئەبی حاتم ڕیوایەتی كردوە لە عبدالله ی كوڕی عەمرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ) دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (ئەوانەی بەیەكسانی و بێ لایەنگیری كێشەكان چارەسەر دەكەن لەدنیادا وان لەسەر چەند مینبەرێك لەمرواری لەبەر دەستی خودای ڕەحمانی مەزنا بەهۆی ڕەچاو كردنیان لەیەكسانی لەنێوان خەڵكیا لەدنیادا) نەسائیش ڕیوایەتی كردوە[4]. خودای مەزن ئەفەرموێت:

---

[1] فتح الباري (١١٨/٥).

[2] الدر المنثور (٥٦٠/٧).

[3] الطبري (٢٩٤/٢٢).

[4] النسائي فی الكبری (٥٩١٧) ئەم فەرمودەیە سەنەدەكانی سەحیحە.

﴿إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ فَأَصْلِحُوا۟ بَيْنَ أَخَوَيْكُمْ ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ﴾ خاوەن باوەڕ هەموویان برای یەکن. براکانتان پێکەوە ئاشت بکەنەوە ئەشێ لەخودا بترسن، بەشکو بەر بەزەیی کەون. ﴿إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ﴾ واتە: هەموو موسوڵمانان برای یەکن. وەك پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (موسوڵمان برای موسوڵمانە، ناهەقی پێناکاو پشتیشی بەر نادا)[1]، واتە: کۆمەکی دەکا لەکاتی لێ قەوماناو دەچێت بەدەمیەوە. وە لەفەرمودەیەکی سەحیحی ترا ئەفەرموێت: (خودا یارمەتی دەری بەندەی خۆیەتی تا ئەو بەندەیە یارمەتی برای خۆی بدا)[2]، مەبەست پێی برای موسوڵمانە. وەلە فەرمودەیەکی تری سەحیحدا هاتوە.(کاتێ موسوڵمان لەپاش ملە دوعای کرد بۆ برای خۆی فریشتە دەڵێن: ئامین وەبۆ تۆیش وەك ئەو)[3]، واتە: تۆ چیت گوتوە لەدوعاکەتا بۆ ئەو کەسە خودایش بیدا بەتۆ. فەرمودە لەم بارەیەوە زۆرە. وەلەفەرمودەیەکی تری سەحیحدا هاتوە: (نموونەی خاوەنباوەڕ لەخۆشەویستی و بەزەیی بەیەکا هاتنوپەیوەندی بەیەکەوە بونیان وەك نمونەی یەك جەستە وان. وەختێ هەر ئەندامێ لەو جەستەیە ژان بکات، هەموو ئەندامەکانی تری لەش لەرزو تاو نارەحەتی ڕوی تێدەکات).[4] وەدیسان لەفەرمودەیەکی ترا هاتوە: (خاوەنباوەڕان بۆیەکتری وەك خانو وان یەکتری دەبەستن بەیەکەوە)، پەنجەکانی هەڵپێکا بەناویەکا)[5]، وە ئەفەرموێت: ﴿فَأَصْلِحُوا۟ بَيْنَ أَخَوَيْكُمْ﴾ واتە: براکانتان ئەوانەی کەدژ بەیەك بوون ئاشت بکەنەوە. ﴿وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ﴾ لەخوا بترسن لەهەموو کارو فەرمانێکتاندا. ﴿لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ﴾ ئەمەیش بەڵێنی خودای گەورەیە کەهەر کەسێ لێی بترسێ بەر بەزەیی ئەو دەکەوێ.

**ڕێ گرتن (قەدەغەکردنی) گاڵتەو گەپ بەیەکتری**

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا يَسْخَرْ قَوْمٌ مِّن قَوْمٍ عَسَىٰٓ أَن يَكُونُوا۟ خَيْرًا مِّنْهُمْ وَلَا نِسَآءٌ مِّن نِّسَآءٍ عَسَىٰٓ أَن يَكُنَّ خَيْرًا مِّنْهُنَّ ۖ وَلَا تَلْمِزُوٓا۟ أَنفُسَكُمْ وَلَا تَنَابَزُوا۟ بِٱلْأَلْقَٰبِ ۖ بِئْسَ ٱلِٱسْمُ ٱلْفُسُوقُ بَعْدَ ٱلْإِيمَٰنِ ۚ وَمَن لَّمْ يَتُبْ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿١١﴾﴾

خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا يَسْخَرْ قَوْمٌ مِّن قَوْمٍ عَسَىٰٓ أَن يَكُونُوا۟ خَيْرًا مِّنْهُمْ وَلَا نِسَآءٌ مِّن نِّسَآءٍ عَسَىٰٓ أَن يَكُنَّ خَيْرًا مِّنْهُنَّ ۖ وَلَا تَلْمِزُوٓا۟ أَنفُسَكُمْ وَلَا تَنَابَزُوا۟ بِٱلْأَلْقَٰبِ ۖ بِئْسَ ٱلِٱسْمُ ٱلْفُسُوقُ بَعْدَ ٱلْإِيمَٰنِ ۚ وَمَن لَّمْ يَتُبْ

---

[1] فتح الباري (١١٦/٥).

[2] مسلم (٢٠٧٤/٤).

[3] مسلم (٢٠٩٤/٤).

[4] مسلم (١٩٩٩/٤).

[5] فتح الباري (١١٩/٥.

﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ﴾ ئەی گەلی خاوەنباوەڕان! با هێندێکتان گاڵتە بەهێندێکتان نەکەن، لەوانەیە ئەوانەی گەپیان پێدەدەن لەگەپ دەرەکان باشتربن، ژنیش هەروا، لەوانەیە ئەوانەی دەبنە گاڵتە جاڕ لەوی گاڵتەیان پێدەکەن پەسند ترین. لەگۆشەی (چاو داگرتن‌وتەشەر لەیەکتری گرتن‌وناو ناتۆرە لێک هەڵدان، دەس هەڵگرن، چونکە لەپاش بڕوا هێنان لەڕێی لادان بەدناوی یەو ناپەسەندە. کێشی پەشیمان نەبێتەوە لەڕیزی ناهەقەکانە. خوای گەورە نەهی کردوە لەگاڵتە کردن بەخەڵکی کەبریتیە لەبەسوک سەیر کردن‌وپێکەنین پێیان. وەك لەفەرمودەی سەحیحدا هاتوە لەپێغەمبەری خوداوە(ﷺ) کەفەرموویەتی: (خۆ بەزل زانی، واتە: دان نەنان بەهەقداو بەسوك سەیر کردنی خەڵکی)[1]. (وغمط الناس) واتە: بەکەم وسوك سەیرکردنی خەڵکی. کەشتێکی خراپ و حەرامە چونکە لەوانەیە ئەو کەسەی بەسوك سەیر دەکرێ لەلای خوای گەورە بەڕێز تربێ و خۆشەویست تربێ لەو کەسەی کە ئەو بەسوك‌و کەم سەیری خەڵکی دەکا. بۆیە خوای مەزن فەرموویەتی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا يَسۡخَرۡ قَوۡمٞ مِّن قَوۡمٍ عَسَىٰٓ أَن يَكُونُواْ خَيۡرٗا مِّنۡهُمۡ وَلَا نِسَآءٞ مِّن نِّسَآءٍ عَسَىٰٓ أَن يَكُنَّ خَيۡرٗا مِّنۡهُنَّۖ﴾ ئەمە دەقێکە کە نەهی دەکا لەپیاوان کەنابێ هێندێککیان گاڵتە بەهێندێکی تریان بکەن بەچاوی کەم ڕێزیەوە سەیری یەکتری بکەن وە بەپێتی عەتفیش ڕێگری کردوە لەژنانیش کە گاڵتە جاڕی بەیەکتری بکەن چونکە لەوانەیە ئەوانە لەوان چاکترو پەسەند ترین وە ئەفەرموێت: ﴿وَلَا تَلۡمِزُوٓاْ أَنفُسَكُمۡ﴾ واتە: لەناو ناتۆرەو تەشەردان لەیەکتری دەست هەڵگرن. چونکە ئەوانەی تانەو تەشەر لەخەڵکی دەدەن پیاو خراپن‌ودورن لەبەزەیی خوداوە. وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَيۡلٞ لِّكُلِّ هُمَزَةٖ لُّمَزَةٍ﴾[2] واتە: سزاو لەناوچون بۆ هەموو نەنگ گرێکی بەدگۆ (عەیب گرێکی تانەدەر). هومەزە بەکردار لەمزیش بەقسە وتن. وەك خودای گەورە ئەفەرمووێت: ﴿هَمَّازٖ مَّشَّآءِۭ بِنَمِيمٖ﴾[3] واتە: پێك گری ئامشۆکەر بۆ قسە هێنان‌وبردن. واتە: گاڵتە بەخەڵك دەکاو تانەو تەشەریان لێ دەدا قسە بۆ ئەم و ئەو دەبا. بۆیە خودای مەزن لێرەدا فەرموویەتی: ﴿وَلَا تَلۡمِزُوٓاْ أَنفُسَكُمۡ﴾ وەك چۆن فەرموویەتی: ﴿وَلَا تَقۡتُلُوٓاْ أَنفُسَكُمۡ﴾ واتە: یەکتری مەکوژن. ئیبنو عەباس و موجاهیدو سەعیدی کوڕی جوبەیرو قەتادەو موقاتلی کوڕی حبان ئەڵێن﴿وَلَا تَلۡمِزُوٓاْ أَنفُسَكُمۡ﴾یانی: تانەو تەشەر لەیەکتری مەدەن. وەخوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَلَا تَنَابَزُواْ

---

[1] مسلم (٩٣/١).

[2] الهُمزة (١).

[3] القلم (١١).

﴿بِٱلۡأَلۡقَٰبِ﴾ ناو ناتۆرە بەیەکا هەڵ مەدەن. کە ئەو کەسەی گوێی لێ بێ پێی دڵ گران ببێ. ئیمامی ئەحمد ڕیوایەتی کردوە لەجەبیرەی کوڕی زەححاکەوە دەڵێت: ئەم ئایەتە لە سەر ئێمە هاتە خوارەوە. واتە لەسەر بەنی سەلەمە﴿وَلَا تَنَابَزُواْ بِٱلۡأَلۡقَٰبِ﴾ وە دەڵێت: کاتێ پێغەمبەری خودا(ﷺ) هات بۆ لامان بۆ مەدینە. هیچ پیاوێ نەبو لەناوماندا دوو ناو یاسێ ناوی هەبوو. هەر کاتێ کەسێ بەیەکێ لەو ناوانە بانگ بکرایە. دەیان گوت: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەو کەسە بەو ناوە بانگی بکەی تورە دەبێ. ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە: ﴿وَلَا تَنَابَزُواْ بِٱلۡأَلۡقَٰبِ﴾[1] ئەبو داودیش ڕیوایەتی کردوە[2]. خودای مەزن ئەفەرموێت:﴿بِئۡسَ ٱلِٱسۡمُ ٱلۡفُسُوقُ بَعۡدَ ٱلۡإِيمَٰنِ﴾ واتە: چەند خویەکی خراپ و ناپەسەندە پاشی باوەڕ هێنان لەڕێ لادان و گەڕانەوە بۆ ڕەوشتی کاتی نەفامی و ناو ناتۆرە بەیەکتری گوتن: ﴿وَمَن لَّمۡ يَتُبۡ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ﴾ هەر کەسێ پەشیمان بێتەوە لەم ڕەوشتە ناشرینە لەڕیزی ستەم کارانە.

**ڕێگری کردن لەگومان بردن**

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱجۡتَنِبُواْ كَثِيرٗا مِّنَ ٱلظَّنِّ إِنَّ بَعۡضَ ٱلظَّنِّ إِثۡمٞۖ وَلَا تَجَسَّسُواْ وَلَا يَغۡتَب بَّعۡضُكُم بَعۡضًاۚ أَيُحِبُّ أَحَدُكُمۡ أَن يَأۡكُلَ لَحۡمَ أَخِيهِ مَيۡتٗا فَكَرِهۡتُمُوهُۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ تَوَّابٞ رَّحِيمٞ ﴿١٢﴾﴾

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱجۡتَنِبُواْ كَثِيرٗا مِّنَ ٱلظَّنِّ إِنَّ بَعۡضَ ٱلظَّنِّ إِثۡمٞۖ وَلَا تَجَسَّسُواْ وَلَا يَغۡتَب بَّعۡضُكُم بَعۡضًاۚ أَيُحِبُّ أَحَدُكُمۡ أَن يَأۡكُلَ لَحۡمَ أَخِيهِ مَيۡتٗا فَكَرِهۡتُمُوهُۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ تَوَّابٞ رَّحِيمٞ﴾ ئەی گەلی خاوەنباوەڕان! لەزۆرێك لەگومان خۆ بپارێزن. چونکە هێندێك گومانی وا هەن گوناهن، لە کاروباری یەکتریش مەکۆڵنەوە. پاشەملەش خراپەی یەکتر مەڵێن. ئاخۆ کەستان حەزی لێیە گۆشتی برای خۆی بەمردویی بخوا؟ دیارە قێزتان لێ دێتەوە ئەشێ لەخودا بترسن. خوا پەشیمانی قبووڵەو دلۆڤانە. خوای گەورە قەدەغەی کردوە لەبەندە خاوەنباوەڕەکانی کەزۆر بەگومان بن، لەماڵ و منداڵ و کەس و کارو خەڵکی بەبێ بەڵگەی تەواو چونکە ئەو گومان بردنە تاوانو گوناهە. وەدور کەوتنەوە لەگومانی زۆر بردن کارێکی باشە بۆ خۆلادان لە گوناه. ڕیوایەت کراوە لە گەورەی موسوڵمانان عومەری کوڕی خەتاب (ڕەزای خوای لێ بێ) کە گوتویەتی: گومان مەبە بەقسەیەك کەلە برایەکی موسوڵمانتەوە دەرچووە غەیرە لەچاکە. کاتێ تۆ شوێنێکی چاکت دەست کەوێ جێی قسەکەی تیا

---

[1] أحمد (٤٦٠/٤) ئەم فەرمودەیە سەنەدەکانی سەحیحە.

[2] ابو داود (٢٤٦/٥) سەنەدەکانی سەحیحە.

بکەیتـەوە[١]. مالـك ڕیوایـەتی کـردوە لەئـەبو هـورەیرەوە(ڕەزای خـوای لێ بـێ) دەڵێـت: پێغەمبـەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (دورکەونەوە لەگومان بردن چونکە گومـان بـردن درۆتـرین قـسەیە جاسوسـی مەکەنومەگـەڕێن بـەدوای قـسەدا پـێش بڕکـێی یـەکتری مەکـەن (دیـارە لەچاکە کردنـا خـراپ نیـە) و حەسودی بەیەك مەبەنو ڕقەبەرایەتی یەکتری مەکەنوپشت لە یـەکتری هـەڵ مەکـەن. بەنـدەی خـوداو برابن)[٢] بوخاری و موسلم و ئەبوداودیش ڕیوایەتیان کردوە[٣]. لەئەنەسەوە(ڕەزای خوای لێ بـێ) دەڵێـت: پێغەمبـەری خـودا(ﷺ) ئەفـەرموێت: (پەیوەنـدی مەپچڕێنوپـشت لەیـەکتری هـەڵ مەکەنوکینـەتان لەیەکتری نەبێ و حەسودی بەیەکتری مەبەن بەندەی خوداو وبرابن. دروست نیە خاوەنباوەڕ لەسێ ڕۆژ زیاتر دەنگ لەبرای خۆی وەرگرێت)، واتـە قـسەی لەگـەڵا نـەکات. موسـلم ڕیوایـەتی کـردوە ترمیـزیش بەسەحیحی داناوە[٤]. ﴿وَلَا تَجَسَّسُوا۟﴾ واتە: جاسوسی لەسەر یەکتری مەکەن. ووتـەی جاسـوس بـەزۆری بۆ کاری خراپ بەکار دەهێنرێ بەڵام تەحەسسی بۆ کاری چاك بەکار دەهێنرێ وەك خوای مەزن باسی یەعقوب دەکا کە دەڵێـت بـەکوڕەکانی: ﴿يَـٰبَنِىَّ ٱذْهَبُوا۟ فَتَحَسَّسُوا۟ مِن يُوسُفَ وَأَخِيهِ وَلَا تَا۟يْـَٔسُوا۟ مِن رَّوْحِ ٱللَّهِ﴾[٥] واتە: ئەی کوڕەکانم برۆن جا بگەڕێنوەواڵی یوسفـو براکەی بزانن نائومێدیش مـەبن لەبـەزەیی و میهرەبانی خوا.ئەی ڕۆڵەکانم سۆراغێکی یووسفـو براکەی بکەن ناهومێدیش مـەبن لەبـەزەیی خـودا. وەلەوانەشـە هـەر دوو ووتەکـە بـۆ خێـرو بەشـەڕیش بـەکاربهێنرێ وەك پێغەمبـەری خـودا(ﷺ) فەرموویەتی: (جاسوسی یەکتری مەکەنوبەشوێن سۆراغی یەکتریا مەگەڕێن، کینەتان لەیەکتری نەبێ و پشت مەکەنە یەکتری. بەندەی خوداو برابن)[٦]. ئـەوزاعی دەڵێـت: جاسوسـی گـەڕان بەشوێنی شتایە، بەڵام تەحەسی واتـە: گـوێ گـرتن لەقـسەی خـەڵك یـان: گـوێ گـرتن لەپـشت دەرگـاوە لـەو کەسانەی کەپێیان ناخۆشە. (والتدابر) واتە: پەیوەندی بڕین لەگەڵ یەکتری ئیبنو حاتم ڕیوایەتی کـردوە لێیـەوە.

خودای مەزن ئەفـەرموێت: ﴿وَلَا يَغْتَب بَّعْضُكُم بَعْضًا﴾ واتـە: غەیبـەتی یـەکتری مەکەنوبەخراپـە باسـی یەکتری مەکەن. پێغەمبەری خودا(ﷺ) بەجوانی ڕونی کردوەتـەوە وەك ئـەو فـەرمودەی کـە ئـەبوداود ڕیوایەتی کردوە لەئەبو هورەیرەوە دەڵێت: گوترا: ئەی پێغەمبەری خـودا غەیبـەت کامەیە؟ فـەرموی:

---

[١] أخرجه احمد فی (الزهد) الدر المنثور/٦/٩٩).

[٢] الموطأ (٢/٩٠٧) فەرمودەیەکی سەحیحە.

[٣] فتح الباری (١٠/٤٩٩).

[٤] مسلم (٤/١٩٨٣) تحفة الاحوذی (٦/٦٤).

[٥] یوسف (٨٧).

[٦] فتح الباری (١٠/٤٩٦).

(تۆ باسی برایەکی خۆت بکەی کەپێی ناخۆش بێ)، گوترا: ئەی ئەوەی کەئەیڵێی تێیدابێ؟ فەرموی: (ئەگەر ئەوەی تۆ ئەیڵێی تێیدا بێ ئەوە غەیبەتت کردوە. وە ئەگەر ئەوەی تۆ ئەیڵێیت تێیدا نەبێ ئەوە بوختیانت بۆ کردوە)[1]. تیرمیزیش ڕیوایەتی کردوە گوتویەتی فەرمودەیەکی(حسن صحيح)[2].
خودای گەورە نەهی کردوە لەغەیبەت کردنوهەڕەشەی کردوە لەو کەسانەی کەباسی خەڵکی دەکەن بۆیە فەرموویەتی: ئەو کەسانەی غەیبەتی خەڵکی دەکەن وەك ئەوە وایە کە گۆشتی برای خۆی بخوا بە مردویی. وەك ئەفەرموێت: ﴿أَيُحِبُّ أَحَدُكُمْ أَن يَأْكُلَ لَحْمَ أَخِيهِ مَيْتًا فَكَرِهْتُمُوهُ﴾ واتە: چۆن پێتان ناخۆشە بەمردویی گۆشتی برای خۆتان بخۆن ئاواش لەبەر ڕەزامەندی خودا پێتان ناخۆش بێ کە باسی خراپەی بکەن. چونکە تۆڵەو سزاکەی گەورەترو زیاترە لەوە. ئەوەندە خراپو ناشیرینە، وەك ئەو کەسەی کە شتێك دەبەخشێت بە کەسێكو پەشیمان دەبێتەوە لێی پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (وەك سەگێك وایە دەڕشێتەوە پاشان ڕشانەوەکەی خۆی دەخواتەوە)، وە فەرموویەتی: (نموونەی خراپو ناشیرین لای ئێمە نییە).[3] وە لە فەرموودەی سەحیحو چاكو چەند موسنەدو بە چەند شێوە هاتووە کە پێغەمبەر(ﷺ) لە وتاریماڵئاواییدا فەرموویەتی: (خوێنو ماڵو شەرەفو ناموستان لە یەکتری قەدەغەیە وەك لەم ڕۆژەو لەم مانگەو لەم شارەتاندا)[4]، واتە: وەك چۆن لەم ڕۆژو مانگو وڵاتەدا کوشتن قەدەغەو حەرامە هەر بەو شێوەیە: خوێنو ماڵو شەرەفتان لە یەکتری قەدەغەو حەرامە، ئەبو داود ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو هورەیرەوە دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (هەموو شتێکی موسڵمان لەسەر موسڵمان حەرامە سامانو شەرەفو خوێن، بەسە بۆ خراپی کەسێك کە برای موسڵمانی خۆی بە کەمو بە سوك سەیر بکات)[5]. تیرمیزیش ڕیوایەتی کردووەو دەڵێت فەرموودەیەکی (حسن غريب)ە[6]، (الحافظ أبو يعلى) ڕیوایەتی کردووە لە کوڕی مامێکی ئەبو هورەیرەوە کە ماعیز هات بۆ لای پێغەمبەری خوا(ﷺ) و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) من زینام کردووە، پێغەمبەر(ﷺ) گوێی بۆ نەگرتو ڕووی لێ وەرچەرخاند هەتا چوار جار ئەو قسەی کرد، لە جاری پێنجەمدا فەرمووی: (زینات کردووە؟) ماعیز وتی: بەڵێ، فەرمووی: (دەزانی زینا چییە؟) وتی: بەڵێ، ئەوەم لەگەڵیدا کرد بە حەرامی کە پیاو لەگەڵ ژنی خۆیدا دەیکات بە حەڵاڵی، فەرمووی:

---

[1] ابو داود (١٩١/٥) فەرمودەیەکی سەحیحە.
[2] تحفة الاحوذي (٦٣/٦) فەرمودەیەکی سەحیحە.
[3] فتح الباري (٢٧٨/٥).
[4] فتح الباري (٦٧٠/٣)، مسلم (١٣٠٦/٣)، تحفة الأحوذي (٤٨١/٨)، أحمد (٢٣٠/١).
[5] ابو داود (١٩٥٠/٥)، فەرموودەیەکی سەحیحە.
[6] تحفة الأحوذي (٥٤/٦)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

(مەبەست چییە لەم قسەیە؟) وتی: دەمەوێت پاکم بکەیتەوە، وتی: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: (ئەی ئەوەی خۆتت خستە ناو ئەوەی ئەو وەك چۆن میلێ لەناو کلداندا گوم دەبێتو دەشاردرێتەوەو پەتی دۆلچەی ئاو لەناو بیری ئاودا دەچێتەخوار؟) وتی: بەلێ ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانیدا بە بەردبارانکردنیو بەردباران کرا. پێغەمبەر(ﷺ) دوو پیاو یەکێکیان دەیوت بە هاوەڵەکەی خۆی: ئایا سەیری ئا ئەوە ناکەی کە خوا بۆی داپۆشی، نەفسی وازی لێ نەهێنا هەتا بەردباران کرا وەك چۆن سەگ بەردباران دەکرێت، پاشان پێغەمبەر(ﷺ) ڕۆیشت هەتا تێپەڕی بە لای لاکی بۆن کردووی کەرێکدا فەرمووی: (فلانو فلان کوان بچن لاکی ئەو کەرە بۆن کردوو بخۆن). وتیان: خوا لێت خۆش بێت ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئایا ئەوە دەخورێت؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (ئەوەی کە وتتان بەو برایەتان کەمێك لەمەوپێش خراپتر بوو لە خواردنی ئەوە، سوێند بە کەسەی گیانی منی بە دەستە ئەو ئێستا لەناو ڕووبارەکانی بەهەشتدایەو خۆی تیا دەشۆرێت)[1]. سەنەدێکی ڕاستە. وە ئیمامیئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە جابیری کوڕی عەبدولاوە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: لە خزمەت پێغەمبەردا بووین (ﷺ) بۆنی کەلاکێکی مردارەوە بووی زۆر پیس بەرز بووەوەو هات. پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (ئایا دەزانن ئەم بۆنە چییە؟ ئەمە بۆنی ئەو کەسانەیە کە غەیبەتی خەڵکی دەکەن)[2].

## شێوازو چۆنیەتی پەشیمان بوونەوەی ئەو کەسەی کە قسەی ناشیرینو غەیبەتی کردووە

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ﴾ دەشێ لە خوا بترسن لەوەی کە فەرمانی پێ کردوونو لەوەش لێتانی قەدەغە کردووە خوا بکەنە شایەت بەسەر خۆتانەوەو لێی بترسن. ﴿إِنَّ ٱللَّهَ تَوَّابٌ رَّحِيمٌ﴾ واتە: زۆر لێبوردەیە لەو کەسەی پەشیمان دەبێتەوەو زۆر دلۆڤانە بەرانبەر ئەوەی دەگەڕێتەوە بۆ لایو متمانەی بەوە. کۆمەڵێك لە زانایان وتوویانە: ڕێگای ئەو کەسانەی کە غەیبەتی خەڵکیان کردووە لە پەشیمانبوونەوەکەیدا واز لەو غەیبەتە بێنێتو نیازیشی وابێت جارێکی تر ناگەڕێتەوە بۆی. وە ئایا پەشیمان بوونەوە بە مەرج دەگیرێت لەوەی کە ڕۆیشتووە؟ ناکۆکی لەسەرە. وە دەبێت گەردنی خۆی ئازاد بکات لای ئەو کەسەی کە غەیبەتی کردووە، هەندێکی تر لە زانایان وتوویانە: مەرج نییە بچێت گەردنی خۆی ئازاد بکات لایان، چونکە کاتێك ئەو کەسە بزانێت بەوە زۆرتر دلگران دەبێت لەوەی کاتێك کە نەیزانییوە پێی وتراوە. کەوابوو باشترین ڕێگا ئەوەیە کە باسی چاکەکانی بکات لەو

---

[1] مسند أبي يعلى (٦/٥٢٤)، ئەم فەرموودەیە لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە بەڵام باسی (الجيفة)ی تێدا نیە.

[2] أحمد (٣/٣٥١)، ئەم فەرموودەیە سەنەدەکانی لاوازە.

شـوێنانەی کـە باسـی خراپـەی کـردووە. وە بـە پێـی توانـاو لێهـاتنی خـۆی بـەرگری لێ بکـات لـە غەیبەتکردنی بۆ ئەوەی ئەمەی پێی هەڵدەسێت بچێتە جێی ئەوەی پێشووی.

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَـٰكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَىٰ وَجَعَلْنَـٰكُمْ شُعُوبًا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓا۟ ۚ إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ ٱللَّهِ أَتْقَىٰكُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ ﴿١٣﴾﴾

**هەموو خەڵکی نەوەی ئادەمو حەوان**

خـوای مـەزن دەفـەرمووێت: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَـٰكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَىٰ وَجَعَلْنَـٰكُمْ شُعُوبًا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓا۟ ۚ إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ ٱللَّهِ أَتْقَىٰكُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ﴾ ئەی خەڵکینە هەر لەنێرو مێیەکەوە ئێوەمان وەدی هێنـاوەو کردوومـانن بـە چـەند گـەلێكو چـەند هۆزێـك، هـەتا یـەکتری بناسـن، بـەڕێزترینتان لای خـودا پارێزگارترەکانتـانن، خـودا زانایەو ئاگادارە. خـوای گـەورە خـەڵکی ئاگـادار دەکاتـەوە کـە دروسـتی کردوون لە یەك گیانو لەو گیانەش هاوتاکەی وەدی هێناوە کە بریتین لـە ئـادەمو حـەواو کردوونـی بـە چەند گەلو هۆزێك دوای هۆزیش تیرەو بنەماڵەو بەرەبابو کوڕو کوڕەزا دێت. وتراویشە: مەبەسـت بـە گەل ڕەچەڵەکی فارسەو بە هۆزیش ڕەچەڵەکی عەرەبەو ئەسباتیش ڕەچەڵەکی نـەوەی ئیسرائیلە ئـەم باسەم کورت کردووەتەوەو لە پێشەکیەکدا کۆم کردووەتـەوە لـە کتێبـی (الإنبـاه) ی (ئـەبو عومـەری کوڕی عبدالبر) دا. وە لە کتێبی (القصد والأمم في معرفة أنساب العرب والعجم)یشدا هـەموو خـەڵکی لـە لایەنی ئەوەوە کە لە ئادەمو حـەواوەو لـە خـۆڵو قـوڕ پەیدا بـوون. هـیچ جیاوازیـەکیان نییـە. بـەڵکو جیاوازیو ڕێزیان بە هۆی ئاینەوەیە کە بریتیە لە ملکەچی بۆ خـوداو شـوێنکەوتنی پێغەمبەرەکەیـەتی (ﷺ) بۆیە خوای گەورە دوای ئەوەی کە نەهی کردووە لە غەیبەتکردنو بـە کـەم سـەیرکردنی خـەڵکی لەناو یەکدا ئاگاداری کـردوون کـە هـەموو وەك یـەکن لـە مرۆڤایەتیدا. دەفـەرمووێت: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَـٰكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَىٰ وَجَعَلْنَـٰكُمْ شُعُوبًا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓا۟﴾ واتە: ئەی خەڵکینە ئێوەمان وەدی هێناوە لە نێـرو مێیەكو کردوومانن بە چەند گەلو هۆزێك بـۆ ئـەوەی یـەکتری بناسـن هـەر کەسـەو دەگەڕێتـەوە سـەر هۆزی خۆی. موجاهید دەڵێت: ﴿لِتَعَارَفُوٓا۟﴾ واتە: وەك دەوترێت فلانی کوڕی فلان لە هۆزی فلانو هۆزی فلان.[1] سوفیانی سەوری دەڵێـت: حەمیریـەکان دەچـنەوە سـەر ئەوانـەی ماونەتـەوە لـە حەمیریـەکانو عەرەبی حیجازیش دەچنەوە سەر هۆزەکانیان.

---

[1] الطبري (٢٢/٣١٢).

**ڕێزگرتن بە خواناسیە (بە لەخواترسانە)**

خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ﴾ واتە: بەڕێزترینتان لای خوای مەزن پارێزگارترینتانە، نەك بەهۆی بنەماڵەوە. فەرموودەی زۆر لەو بارەیەوە هاتووە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو هورەیرەوە دەڵێت: پرسیار کرا لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) کام مرۆڤ بەڕێزترە؟ فەرمووی: (بەڕێزترینتان لای خوا پارێزگارترینتانە (لەخواترسترینتانە). وتیان: پرسیاری ئەوەت لێ ناکەین. فەرمووی: (بەڕێزترین خەڵك یوسفە کە پێغەمبەری خودایەو کوڕی پێغەمبەری خودایەو کوڕی پێغەمبەری خودایەو کوڕی خەلیلی خودایە). وتیان: پرسیاری ئەوەت لێ ناکەین، فەرمووی: (لە ڕەچەڵەکی عەرەب –معادن العرب– پرسیارم لێ دەکەن؟) وتیان: بەڵێ، فەرمووی: (چاکترینتان لە کاتی نەفامیدا (الجاهلية) چاکترینتانە لە کاتی موسڵمان بوونیدا، کاتێك کە تێگەیشتوو زانا بووبن).[1] بوخاریش ڕیوایەتی کردووە لە چەند شوێنی تردا،[2] نەسائیش لە تەفسیرەکەیدا ڕیوایەتی کردووە.[3]

فەرموودەیەکی تر: موسلیم ڕەحمەتی خوای لێ بێت ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو هورەیرەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەفەرموویت: (خودا سەیری وێنەکانتانو سامانەکانتان ناکات، بەڵکو سەیری دڵو کردارەکانتان دەکات)،[4] ئیبنو ماجەش ڕیوایەتی کردووە.[5]

فەرموودەیەکی تر: ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عومەرەوە (ڕەزای خوایان لێ بێت) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە ڕۆژی سەرکەوتنی مەککەدا بەسەر وشترەکەیەوە لەقەسوا تەوافی دەکرد گاچۆنێکی بە دەستەوەبوو دەیهێنا بە ڕوکنەکاندا شوێنێکی دەست نەکەوت وشترەکەی بخات تێیدا لە مزگەوتدا هەتا لەسەر دەستی خەڵکی دابەزی وشترەکەیان برد بۆ شوێنێك پێیان دەوت (بطن المَسيل) لەوێ خرا. پاشان پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەسەر شوێنەکەی خۆی وتارێکی بۆ دانو سوپاسو ستایشی خوای گەورەی کرد پاشان فەرمووی: (ئەی خەڵکینە خوای گەورەناتەواوییەکانی کاتی نەفامیو خۆهەڵبڕینو خۆبەگەورەزانین بە بابو باپیرانی لەناودا لابردوون. خەڵکی دوو پیاون پیاوی چاكو لەخواترسو بەڕێز لای خوداو پیاوی لادەرو بەدبەختو بێ ڕێز لای خودا. خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَٰكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَىٰ وَجَعَلْنَٰكُمْ شُعُوبًا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓا۟ إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ ٱللَّهِ

---

[1] فتح الباري (٨/٢١٢).

[2] فتح الباري (٦/٤٧٧/٤٨١).

[3] النسائي في الكبرى (٦/٣٦٧)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[4] مسلم (٤/١٩٨٧).

[5] ابن ماجه (٢/١٣٨٨)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

أَتۡقَىٰكُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٞ﴾ پاشان فەرمووی: (أقول قولي هذا واستغفرالله لي ولكم) هەر بەو شێوەیە (عبد بن حُميد) ڕیوایەتی کردووە[1]. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٞ﴾ واتە: خوا پێتان دەزانێتو ئاگای لە کارەکانتانە، مەیلی هەر کەسی بوێت ڕێی نیشان دەداتو سەریش دەشێوێنێت لە کەسێك مەیلی لێ بێت. بەزەیی دێتەوە بە کەسێکدا مەیلی لێ بێتو جەزرەبەی کەسێکیش دەدات مەیلی لێ بێت. وە هەر خۆی لە کارزانو زاناو ئاگارە لەو شتانە هەمووی. هەندێ لە زانایان ئەم ئایەتەو ئەم فەرموودە پیرۆزانە دەکەنە بەڵگە لەسەر ئەوەی کە یەکسانی مەرج نییە لە ژن مارەبڕیندا هیچ مەرجێکی تر نییە بۆ ژن مارە بڕین غەیری ئاین بە پێی ئەم ئایەتە کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ أَكۡرَمَكُمۡ عِندَ ٱللَّهِ أَتۡقَىٰكُمۡ﴾.

﴿قَالَتِ ٱلۡأَعۡرَابُ ءَامَنَّاۖ قُل لَّمۡ تُؤۡمِنُواْ وَلَٰكِن قُولُوٓاْ أَسۡلَمۡنَا وَلَمَّا يَدۡخُلِ ٱلۡإِيمَٰنُ فِي قُلُوبِكُمۡۖ وَإِن تُطِيعُواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ لَا يَلِتۡكُم مِّنۡ أَعۡمَٰلِكُمۡ شَيۡـًٔاۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٌ (١٤) إِنَّمَا ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ثُمَّ لَمۡ يَرۡتَابُواْ وَجَٰهَدُواْ بِأَمۡوَٰلِهِمۡ وَأَنفُسِهِمۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِۚ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلصَّٰدِقُونَ (١٥) قُلۡ أَتُعَلِّمُونَ ٱللَّهَ بِدِينِكُمۡ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۚ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٞ (١٦) يَمُنُّونَ عَلَيۡكَ أَنۡ أَسۡلَمُواْۖ قُل لَّا تَمُنُّواْ عَلَيَّ إِسۡلَٰمَكُمۖ بَلِ ٱللَّهُ يَمُنُّ عَلَيۡكُمۡ أَنۡ هَدَىٰكُمۡ لِلۡإِيمَٰنِ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ (١٧) إِنَّ ٱللَّهَ يَعۡلَمُ غَيۡبَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ وَٱللَّهُ بَصِيرُۢ بِمَا تَعۡمَلُونَ (١٨)﴾

### جیاوازی نێوان خاوەن باوەڕو موسڵمان

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قَالَتِ ٱلۡأَعۡرَابُ ءَامَنَّاۖ قُل لَّمۡ تُؤۡمِنُواْ وَلَٰكِن قُولُوٓاْ أَسۡلَمۡنَا وَلَمَّا يَدۡخُلِ ٱلۡإِيمَٰنُ فِي قُلُوبِكُمۡۖ وَإِن تُطِيعُواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ لَا يَلِتۡكُم مِّنۡ أَعۡمَٰلِكُمۡ شَيۡـًٔاۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٌ﴾ عەرەبە دەشتەکییەکان وتیان: باوەڕمان هێنا. بڵێ: هێشتا باوەڕتان نەهێناوە، بەڵام بڵێن: خۆمان بە دەستەوە داوە هێمای بڕوای ئیسلامەتی نەچووەتە ناو دڵتانەوە. ئەگەر ئێوە بەرفەرمانی خوداو پێغەمبەری ئەو بن، لە پاداشتی کردەوەکانتان هیچ شتێك کەم ناکاتەوە، خودا لە گوناه دەبوورێتو دلۆڤانە. خوای گەورەوەڵامی عەرەبە دەشتەکییەکان دەداتەوە ئەوانەی کە هەر لە یەکەم جارەوە کە موسڵمان بوون خۆیان بە خاوەن باوەڕ دەزانی بەڵام باوەڕ بە تەواوی لە دڵیاندا هێشتا جێگیر نەبووبوو بۆیە دەفەرموێت: ﴿قَالَتِ ٱلۡأَعۡرَابُ ءَامَنَّاۖ قُل لَّمۡ تُؤۡمِنُواْ وَلَٰكِن قُولُوٓاْ أَسۡلَمۡنَا وَلَمَّا يَدۡخُلِ ٱلۡإِيمَٰنُ فِي قُلُوبِكُمۡۖ﴾ لەم ئایەتە پیرۆزەوە

---

[1] المنتخب لعبد بن حُميد (٧٩٣)، فەرموودەیەکی لاوازەو فەرموودەی تر پشتگیری دەکات.

وه‌رده‌گیردرێت كه باوه‌ڕ(الایمان) تایبه‌تمه‌ندتره له ئیسلام وه‌ك له مه‌زهه‌بی ئه‌هلی سونه‌و جه‌ماعه‌دا دانی پیا نراوه‌و هاتووه. فه‌رمووده‌كه‌ی جوبره‌ئیل (سه‌لامی خوای لێ بێت) ده‌كه‌نه به‌ڵگه له‌سه‌ری. كاتێك پرسیاری كرد له باره‌ی ئیسلامه‌وه‌و پاشان له باوه‌ڕو دواتریش له ئیمان پرسیاره‌كه‌ی له گشتگیریه‌وه به‌ره‌و ژوور كرده‌وه بۆ تایبه‌تو تایبه‌تتر. ئیمامی ئه‌حمه‌د ڕیوایه‌تی كردووه له عامری كوڕی سه‌عدی كوڕی ئه‌بی وه‌قاسه‌وه (ڕه‌زای خوای لێ بێت) ده‌ڵێت: پێغه‌مبه‌ری خوا (ﷺ) یارمه‌تی به‌خشی به چه‌ند پیاوێكو هیچی نه‌دا به پیاوێك كه له‌گه‌ڵ ئه‌واندا بوو، سه‌عد (ڕه‌زای خوای لێ بێت) وتی: ئه‌ی پێغه‌مبه‌ری خوا (ﷺ) یارمه‌تی فلانو فلانت دا هیچت نه‌دا به فلانه كه‌س. كه خاوه‌ن باوه‌ڕه، پێغه‌مبه‌ر(ﷺ) فه‌رمووی: موسڵمانه؟ پاشان پێغه‌مبه‌ر(ﷺ) فه‌رمووی: (من ماڵ ده‌به‌خشم به كه‌سانێكو نایده‌م به كه‌سێك كه خۆشه‌ویستتره له لام له ئه‌وانه، له ترسی ئه‌وه‌ی نه‌كا به‌سه‌ر ده‌مو چاودا له‌ناو ئاگردا بیانبه‌ن)[1]. بوخاریو موسلیمیش ڕیوایه‌تیان كردووه.[2] پێغه‌مبه‌ر(ﷺ) جیاوازی خست له نێوان (مؤمن و مسلم)دا ئه‌مه به‌ڵگه‌یه له‌سه‌ر ئه‌وه‌ی كه ئیمان تایبه‌تتره له ئیسلام. وه‌ك له ئه‌وه‌ڵی شه‌رحی كتێبی ئیماندا له سه‌حیحی بوخاریدا باسمان كردو بڕیارمان دا. سوپاسو ستایش بۆ خوای مه‌زن. ئه‌مه به‌ڵگه‌یه بوو له‌سه‌ر ئه‌و عه‌ره‌بانه‌ی كه باس كراون له‌م ئایه‌ته‌دا كه دووڕوو نه‌بوون. به‌ڵكو موسڵمان بوون به‌ڵام باوه‌ڕ له دڵیاندا به ته‌واوی دانه‌مه‌زرابوو. داوای پله‌و پایه‌ی به‌رزتریان ده‌كرد له‌وه‌ی كه پێی گه‌یشتوون. له‌به‌ر ئه‌وه ئامۆژگاری كران، ئه‌مه قسه‌ی ئیبنو عه‌باسو ئیبراهیمی نه‌خه‌عیو قه‌تاده‌یه‌و ئیبنو جه‌ریریش هه‌مان بۆچوونی هه‌بووه. بۆیه ئه‌مه‌یان پێ وتراوه هه‌تا په‌ندو ئامۆژگاری لێ وه‌رگرن. ﴿قُل لَّمْ تُؤْمِنُوا وَلَٰكِن قُولُوا أَسْلَمْنَا وَلَمَّا يَدْخُلِ الْإِيمَانُ فِي قُلُوبِكُمْ﴾ واته: هێشتا بڕوای ته‌واو نه‌چووه‌ته ناو دڵتانه‌وه. پاشان خوای گه‌وره ده‌فه‌رموێت: ﴿وَإِن تُطِيعُوا اللَّهَ وَرَسُولَهُ لَا يَلِتْكُم مِّنْ أَعْمَالِكُمْ شَيْئًا﴾ واته: ئه‌گه‌ر ئێوه به گوێی خوداو پێغه‌مبه‌ره‌كه‌ی ئه‌و بكه‌ن له پاداشتی كرده‌وه‌تان هیچ شتێك كه‌م ناكاته‌وه. وه‌ك ئه‌م ئایه‌ته كه خوای گه‌وره ده‌فه‌رموێت: ﴿وَمَا أَلَتْنَاهُم مِّنْ عَمَلِهِم مِّن شَيْءٍ﴾[3] واته: وه هیچ له كرده‌وه‌ی باوكه‌كانیان كه‌م ناكه‌ینه‌وه. وه ده‌فه‌رموێت: ﴿إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ واته: لێبورده‌و دلۆڤانه بۆ ئه‌و كه‌سانه‌ی په‌شیمان ده‌بنه‌وه‌و ده‌گه‌ڕێنه‌وه بۆ لای خودا. خوای گه‌وره ده‌فه‌رموێت: ﴿إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ الَّذِينَ آمَنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ ثُمَّ لَمْ يَرْتَابُوا وَجَاهَدُوا بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فِي

---

[1] أحمد (١٧٦/١)، فه‌رمووده‌یه‌كی سه‌حیحه.

[2] فتح الباري (٩٩/١)، مسلم (١٣٢/١).

[3] الطور (٢١).

سَبِيلِ ٱللَّهِۚ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلصَّٰدِقُونَ ﴾ خاوەنباوەڕ ئەو کەسانەن کە بڕوایان بە خواو پێغەمبەری هەیەو تووشی دوو دڵی نەبوون‌و بە گیان‌و ماڵ لە ڕێی خوادا تێکۆشاون‌و هەر ئەمانە بە ڕاستیانە.

﴿إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ﴾ خاوەنباوەڕی تەواو، ﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ثُمَّ لَمْ يَرْتَابُواْ ﴾ تووشی گومان‌و دوو دڵی نەبوون‌و بەردەوام بڕوایان بتەوە بە خواو پێغەمبەر(ﷺ)، ﴿وَجَٰهَدُواْ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ واتە: سامان‌و گیانیان لە ڕێی خوادا بەخشیوەو بەخت کردووە هەتا لێیان ڕازی بێت‌و عەفویان بکات. ﴿أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلصَّٰدِقُونَ ﴾ واتە: هەر ئەوانە ڕاست دەکەن کە دەڵێن خاوەنباوەڕن نەك وەك هەندێ لەو عەرەبانەی کە باوەڕیان تەواو نیەو هەریقسە دەڵێن خاوەنباوەڕین. خوای مەزن دەفـــــــەرموویت: ﴿ قُلْ أَتُعَلِّمُونَ ٱللَّهَ بِدِينِكُمْ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِۚ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴾ بلێ ئاخۆ دەتانەوێت خودا لەو دینەی هەتانە ئاگاداری بکە؟ کەچی خوداش لە هەر شتێك لە ئاسمانان‌و زەمیندان ئاگادارەو خودا بۆ هەموو شت زانایە. ﴿ قُلْ أَتُعَلِّمُونَ ٱللَّهَ بِدِينِكُمْ ﴾ واتە: ئاخۆ ئێوە دەتانەوێت خودا ئاگادار بکەن لەوەی کە لەناو دڵتاندایە، ﴿وَٱللَّهُ يَعْلَمُ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ﴾ واتە: هیچ شتێك لە خوا بزر نابێت نە لە ئاسمانەکان‌و نە لە ناو سەر زەمیندا با بە قورسایی مێرووله هەرە وردیلەکانیش بێت، بچووکتریش بێت یان گەورەتر، ﴿وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴾ خودا ئاگادارە بەسەر هەموو شتێکدا. پاشان خوای مەزن فەرموویەتی: ﴿ يَمُنُّونَ عَلَيْكَ أَنْ أَسْلَمُواْۖ قُل لَّا تَمُنُّواْ عَلَىَّ إِسْلَٰمَكُمۖ بَلِ ٱللَّهُ يَمُنُّ عَلَيْكُمْ أَنْ هَدَىٰكُمْ لِلْإِيمَٰنِ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴾هەر چونکە بوونە موسڵمان منەت بەسەر تۆدا دەکەن، بلێ: ئەگەر ڕاست دەکەن خاوەنباوەڕن لە موسڵمان بوونی خۆتان، منەت بەسەر مندا مەکەن، بەڵام خودا منەت لەسەر ئێوە دەکات، کە ڕێگای بڕواهێنانی نیشان داون. ﴿ يَمُنُّونَ عَلَيْكَ أَنْ أَسْلَمُواْۖ قُل لَّا تَمُنُّواْ عَلَىَّ إِسْلَٰمَكُم ﴾ واتە: ئەو عەرەبانەی کە منەت دەکەن بەسەر پێغەمبەری خوادا (ﷺ) شوێنی کەوتوون‌و یارمەتی دەدەن خوای گەورە ڕەدیان دەداتەوە دەفەرموێت: ﴿قُل لَّا تَمُنُّواْ عَلَىَّ إِسْلَٰمَكُم ﴾ بلێ ئەگەر ڕاست دەکەن منەت مەکەن بەسەر مندا چونکە سوودەکەی بۆ خۆتان دەگەڕێتەوە، بەڵکو خودا منەت بەسەر ئێوەدا دەکات، ﴿بَلِ ٱللَّهُ يَمُنُّ عَلَيْكُمْ أَنْ هَدَىٰكُمْ لِلْإِيمَٰنِ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴾ واتە: ئەگەر ڕاست دەکە لەو قسەدا کە دەیکەن. وە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی بە یارمەتی دەرەکان لە ڕۆژی حونەیندا: (ئەی گرۆی یارمەتیدەران ئایا ئێوە گومڕا نەبوون خودا بەهۆی منەوە

ڕێی نیشان دان؟ پارچە پارچەو پەرتەوازە نەبوون خودا بە خەڵکی منەوە کردنیەوە بە یەك و کۆی کردنەوە؟ هەژار نەبوون خودا بە هۆی منەوە دەوڵەمەندی کردوون؟)، هەر کاتێك شتێکی بفەرموایە دەیانوت: خوداو پێغەمبەری خوا (ﷺ) منەتیان ئێجگار زۆرە[1]. حافیز ئەبو بەکری بەززار دەڵێت: لە ئیبنو عەباسەوە (ڕەزای خوایان لێ بێت) بەنی ئەسەد هاتن بۆ لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (تێگەیشتنیان کەمەو شەیتان لەسەر زمانی ئەوانە قسە دەکات). ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە: ﴿يَمُنُّونَ عَلَيْكَ أَنْ أَسْلَمُوا قُل لَّا تَمُنُّوا عَلَيَّ إِسْلَامَكُم بَلِ اللَّهُ يَمُنُّ عَلَيْكُمْ أَنْ هَدَاكُمْ لِلْإِيمَانِ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ﴾[2]. پاشان خوای گەورە باسی زانایی خۆی دەکات کە ئاگاداری هەموو بوونەوەرەو هەرچی دەکەن دەیبینێت فەرموویەتی: ﴿إِنَّ اللَّهَ يَعْلَمُ غَيْبَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ۚ وَاللَّهُ بَصِيرٌ بِمَا تَعْمَلُونَ﴾ هەر نهێنیەك لە ئاسمانانو زەمیندان، خودا دەیزانێتو هەرچی دەیکەن ئەو دەیبینێت.

## تەفسیری سورەتی (ق)

## لە مەککەدا هاتووەتە خوارەوە

### سەرەتای موفەسەلەکان (المفصل)

ڕاست وایە کە ئەم سورەتە یەکەم بەشی موفەسەلەکانە (المفصل) وتراویشە لە سورەتی (الحجرات)ەوە دەست پێدەکات. بەڵام ئەوەی کە عەوامەکان دەڵێن لە سورەتی (عم) دەست پێدەکات. ڕاست نییەو هیچ کەس لە زانا باوەڕپێکراوەکان نەیانوتووە. ئەوەی ئێمە ئاگادار بین، کاتێك ئەمە زانرا کە چلو هەشت سورەتت ژمارد دوای ئەمانە سورەتی (ق) دێت. بەم شێوەیە، سێ سورەتەکان: (البقرة)و (ال عمران)و (النساء). پێنجەکان: (المائدة)و (الانعام)و (الاعراف)و (الانفال)و (البراءة)و حەوتەکان: (یونس)و (هود)و (یوسف)و (الرعد)و (ابراهیم)و (الحجر)و (النحل). نۆیەکان: (سبحان–الاسراء–)و (الکهف)و (مریم)و (طه)و (الانبیاء)و (الحج)و (المؤمنون)و (نور)و (الفرقان)و یانزەکان: (الشعراء)و (النمل)و (القصص)و (العنکبوت)و (الروم)و (لقمان)و الف لامی (الم)ی (السجدة)و (الاحزاب)و (سبأ)و (فاطر)و (یس). یانزەکان: (الصافات)و (ص)و (الزمر)و (غافر)و حامیم (حم)ی (السجدة)و حامیم (حم)ی (عسق)و (الزخرف)و (الدخان)و (الجاثیة)و (الاحقاف)و (القتال)و (الفتح)و (الحجرات). پاشان دوای ئەمانە بەشی موفەسەل دێت وەك هاوەڵەکانی پێغەمبەر(ﷺ) وتیان بەو شێوەیە دەردەکەوێت کە ئەوەڵی موفەسەلەکان سورەتی (ق)ە، سوپاسو ستایش بۆ خوای گەورە.

---

[1] فتح الباري (٦٤٤/٧).

[2] النسائي في الكبرى (١١٥١٩)، ئەم فەرموودەیە سەنەدەکانی حەسەنەو پیاوەکانی جێی متمانەن.

**ڕێز ( فەزڵی ) سورەتی ( ق )**

ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە عومەری کوڕی خەتابەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) پرسیاری کردووە لە ئەبو واقدی لەیسی (أبو واقد اللّيثي) ئایا پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە جەژندا چی دەخوێند؟ وتی: (ق)و (إقترب)ەی دەخوێند، موسلیمو خاوەنی چوار سەنەدەکەیش ڕیوایەتیان کردووە[1].

فەرموودەیەکی تر: ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئوموهیشامی کچی حارسەوە دەڵێت: تەنووری ئێمەو تەنووری پێغەمبەر(ﷺ) دوو ساڵ یان ساڵێك زیاتر تەنوور بووە ﴿قٓ وَٱلۡقُرۡءَانِ ٱلۡمَجِيدِ﴾م لە زمانی پێغەمبەر نەبێت (ﷺ) وەرنەگرتووە. هەموو ڕۆژێکی هەینی لەسەر مینبەر کاتێك وتاری بدایە بۆ خەڵکی دەخوێند.[2] موسلیمیش ڕیوایەتی کردووە.[3] ئەبو داود ڕیوایەتی کردووە لە کچی حارس کوڕی نوعمانەوە دەڵێت: سورەتی (ق)م لەبەر نەکردووە لە زمانی پێغەمبەری خواوە (ﷺ) نەبێت هەموو هەینیەك وتاری بەو دەدا وتی تەنووری ئێمەو تەنووری پێغەمبەری خوا (ﷺ) یەك تەنوور بوو.[4] هەر بەو شێوەیە موسلیمو نەسائی ڕیوایەتیان کردووە،[5] مەبەست ئەوەیە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەو شوێنانەی کە خەڵکی تیا کۆدەبووەوە وەك هەینیو جەژنەکان ئەم سورەتەی دەخوێند چونکە ئەم سورەتە باسی دروستبوونی خەڵكو زیندووبوونەوەو وەستان لە ڕۆژی قیامەتداو لێپرسینەوەو بەهەشتو جەهەنەمو پاداشتو سزاو مژدەو ترساندن دەکات بە فراوانی. والله أعلم.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿قٓ وَٱلۡقُرۡءَانِ ٱلۡمَجِيدِ ﴿١﴾ بَلۡ عَجِبُوٓاْ أَن جَآءَهُم مُّنذِرٞ مِّنۡهُمۡ فَقَالَ ٱلۡكَٰفِرُونَ هَٰذَا شَيۡءٌ عَجِيبٌ ﴿٢﴾ أَءِذَا مِتۡنَا وَكُنَّا تُرَابٗاۖ ذَٰلِكَ رَجۡعُۢ بَعِيدٞ ﴿٣﴾ قَدۡ عَلِمۡنَا مَا تَنقُصُ ٱلۡأَرۡضُ مِنۡهُمۡۖ وَعِندَنَا كِتَٰبٌ حَفِيظُۢ ﴿٤﴾ بَلۡ كَذَّبُواْ بِٱلۡحَقِّ لَمَّا جَآءَهُمۡ فَهُمۡ فِيٓ أَمۡرٖ مَّرِيجٍ ﴿٥﴾﴾

﴿قٓ وَٱلۡقُرۡءَانِ ٱلۡمَجِيدِ﴾ قاف، سوێند بەم قورئانە بەڕێزە. قاف پیتێکە لە پیتەکانی هیجاء کە لە پێش سورەتەکانەوە هاتووە وەك: صاد (ص)و نون (ن)و الف لام میم (الم)و حامیم (حم)و تاسین

---

[1] أحمد (٢١٧/٥)، مسلم (٦٠٧/٢)، أبو داود (٦٨٣/١)، تحفة الأحوذي (٧٩/٣)، النسائي (١٨٣/٣)، ابن ماجه (٤٠٨/١).

[2] احمد (٤٣٥/٦)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[3] مسلم (٥٩٥/٢).

[4] ابو داود (٦٦٠/١)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[5] مسلم (٥٩٥/٢)، النسائي (١٠٧/٣).

(طس)و ئەو پیتانەی تر. موجاهید دەڵێت: لە پێشەوە لە سورەتی (البقرة)دا باسمان کرد کە پێویست ناکات لێرەدا باسی بکەینەوە.

## سەرسوڕمانی خوانەناسان لە هاتنی پەیامو زیندووبوونەوەو وەڵامدانەوەیان

خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿وَٱلۡقُرۡءَانِ ٱلۡمَجِيدِ﴾ واتە: سوێند بەم قورئانە بەڕێزو گەورەیە کە ﴿لَّا يَأۡتِيهِ ٱلۡبَٰطِلُ مِنۢ بَيۡنِ يَدَيۡهِ وَلَا مِنۡ خَلۡفِهِۦۖ تَنزِيلٞ مِّنۡ حَكِيمٍ حَمِيدٖ﴾[1] واتە: پڕوپوچ لە ڕووی ناوەستێت، چ ڕووبەڕوو چ پاشملە ئەمە کارزانێك ناردوویەتی کە هەر دەبێت ستایش بکرێت. وەڵامی سوێندەکە ئەو باسەیە کە دوای سوێندەکە دێت. کە بریتیە لە سەلماندنی پێغەمبەریەتیو زیندووبوونەوەو هاتنیو ڕوودانیان. یا سوێندەکەیش بە وتە نەوتراوە. ئەم سوێندانە زۆرن لە قورئاندا وەك لە پێشەوە کە خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿صٓۚ وَٱلۡقُرۡءَانِ ذِي ٱلذِّكۡرِ ۝١ بَلِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فِي عِزَّةٖ وَشِقَاقٖ﴾[2] واتە: ساد، سوێند بە قورئانی خاوەنڕێزو پەندو ئامۆژگاری، بەڵام ئەوانەی بێباوەڕن ڕۆچوون لە خۆبەگەورەزانینو دژایەتیدا (بەرانبەر ئیسلامو شوێنکەوتووانی). وە هەر لێرەشدا فەرموویەتی: ﴿قٓۚ وَٱلۡقُرۡءَانِ ٱلۡمَجِيدِ ۝١ بَلۡ عَجِبُوٓاْ أَن جَآءَهُم مُّنذِرٞ مِّنۡهُمۡ فَقَالَ ٱلۡكَٰفِرُونَ هَٰذَا شَيۡءٌ عَجِيبٌ﴾ دیارە سەریان سوڕما لەوەی کە ترس وەبەرهێنێکیان لە خۆیان بۆ پەیدا بووە، ئەوانەی خودانەناس بوون وتیان: ئەمە شتێکی سەیرە. واتە: سەریان سوڕدەما کە پێغەمبەریان بۆ ڕەوانە دەکرێت لە خۆیان. وەك ئەم ئایەتە کە خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿أَكَانَ لِلنَّاسِ عَجَبًا أَنۡ أَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰ رَجُلٖ مِّنۡهُمۡ أَنۡ أَنذِرِ ٱلنَّاسَ﴾[3] واتە: ئاخۆ مەردم سەیر ماون، پاوێکمان هەر لەناو خۆیان ڕاسپاردووە کە ترس وەبەر خەڵك بنێت؟ واتە: ئەمە جێی سەرسوڕمان نیە. چونکە خودا لە فریشتەکان ڕاسپاردە دەنێرێتو لە مرۆڤیش. پاشان خوای گەورە دیسان باسیان دەکات کە چۆن باوەڕیان بە زیندووبوونەوە نیەو بە لایانەوە سەیرە زۆر بە دەری دەزانن ڕوویداتو دەفەرموێت: ﴿أَءِذَا مِتۡنَا وَكُنَّا تُرَابٗاۖ ذَٰلِكَ رَجۡعُۢ بَعِيدٞ﴾ ئاخۆ ئەگەر مردینو بووینە مشتێك خۆڵ دەژێینەوە؟) ئەم گەڕانەوەیە دوورە، واتە: دەڵێن: ئایا مردینو لاشەمان ڕزاو پووکایەوە جومگەکانمان لە یەك ترازاو بووین بە خۆڵ چۆ جارێکی تر دروست دەبینەوەو وەك خۆمانمان لێ دێتەوە؟ ﴿ذَٰلِكَ رَجۡعُۢ بَعِيدٞ﴾ ئەمە گەڕانەوەیەکی زۆر دوورە. واتە: باوەڕیان وایە کە شتی وا ڕوونادات و

---

[1] فصلت (٤٢).

[2] ص (١ـ٢).

[3] یونس (٢).

نابێـت، خـوای گـەورە وەڵامـی داونەتـەوەو فەرموویـەتی: ﴿قَدْ عَلِمْنَا مَا تَنقُصُ ٱلْأَرْضُ مِنْهُمْ ۖ وَعِندَنَا كِتَٰبٌ حَفِيظٌۢ﴾ ئێمە هەر زوو زانیومانە زەوی چەندیان لێ کەم دەکات کتێبێکیشمان لـە لایـە هـەموو شتێکی تێدایە. واتە: زانیومانە کە چەندێ لە لەشیان تێکـەڵاوی زەوی بـووەو هیچمان لێ ون نابێـت. وە چۆن جەستەیان لێك ترازاوەو بۆ کوێ چووەو چی بەسەر هاتووە؟ ﴿وَعِندَنَا كِتَٰبٌ حَفِيظٌۢ﴾ واتـە: کتێبێکمـان لایە هەموو شتێکی تیایە نووسراوەو پارێزراوە. عەوفی دەڵێت: لە ئیبنـو عەباسـەوە(ڕەزای خوایـان لێ بێـت) دەڵێـت: ﴿قَدْ عَلِمْنَا مَا تَنقُصُ ٱلْأَرْضُ مِنْهُمْ﴾ واتـە: زانیومانـە زەوی چـەندێ لـە گۆشـتو پێـستو ئێسكو مومان دەخواو کەم دەکاتەوە.[1] موجاهیدو قەتادەو زەحاکو کەسانی تریش هەر وایان وتووە.[2] پاشان خوای گەورە هۆی ئەو بێ دینیو ڕکیو ئـەو بـەدوور زانینـەیان بـاس دەکـات کـە ئەمـە قـسەی خوانەناسـانەو پیشەیانەو هـەر وان. وە دەفـەرموێت: ﴿بَلْ كَذَّبُوا۟ بِٱلْحَقِّ لَمَّا جَآءَهُمْ فَهُمْ فِىٓ أَمْرٍ مَّرِيجٍ﴾ بەڵکو ئەوان کە ئـەم ڕاستیەیان هاتـەلا هـەر باوەڕیـان پـێ نـەکردو کارەکـەیان لێ ئـاڵۆزا. واتـە: ئەمـە پیشەی هەموو کەسێکە لە ڕاستی لادەدا دوای ئـەوە هەرچی بڵـێ قسەی پڕوپووچـەو لێـی شـێواوە. (المريج) واتە: سەرلێ تێکچووو لێشێواوو ڕكو خەڵەفاو. وەك ئەم ئایەتە کە خوای مەزن دەفـەرموێت: ﴿إِنَّكُمْ لَفِى قَوْلٍ مُّخْتَلِفٍ ۝٨ يُؤْفَكُ عَنْهُ مَنْ أُفِكَ﴾[3] واتـە: بێگومـان ئێـوە لـە قـسەی جیـاوازدان، ئـەو کەسـە لادەدرێت لە ئیمان کـە لادراوە چونکە خـۆی گومڕایـە، واتـە: قـسەیان یـەکتر ناگرێتـەوەو لـە قورئـان دەتەکێتەوە هەرکێ تەکێنراوەتەوە.

﴿أَفَلَمْ يَنظُرُوٓا۟ إِلَى ٱلسَّمَآءِ فَوْقَهُمْ كَيْفَ بَنَيْنَٰهَا وَزَيَّنَّٰهَا وَمَا لَهَا مِن فُرُوجٍ ۝٦ وَٱلْأَرْضَ مَدَدْنَٰهَا وَأَلْقَيْنَا فِيهَا رَوَٰسِىَ وَأَنۢبَتْنَا فِيهَا مِن كُلِّ زَوْجٍۭ بَهِيجٍ ۝٧ تَبْصِرَةً وَذِكْرَىٰ لِكُلِّ عَبْدٍ مُّنِيبٍ ۝٨ وَنَزَّلْنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً مُّبَٰرَكًا فَأَنۢبَتْنَا بِهِۦ جَنَّٰتٍ وَحَبَّ ٱلْحَصِيدِ ۝٩ وَٱلنَّخْلَ بَاسِقَٰتٍ لَّهَا طَلْعٌ نَّضِيدٌ ۝١٠ رِّزْقًا لِّلْعِبَادِ ۖ وَأَحْيَيْنَا بِهِۦ بَلْدَةً مَّيْتًا ۚ كَذَٰلِكَ ٱلْخُرُوجُ ۝١١﴾

**باسی تواناى خودا کە چەندە زۆرو بێ پایانە لە چاو زیندووکردنەوەدا**

خـوای مـەزن دەفـەرموێت: ﴿أَفَلَمْ يَنظُرُوٓا۟ إِلَى ٱلسَّمَآءِ فَوْقَهُمْ كَيْفَ بَنَيْنَٰهَا وَزَيَّنَّٰهَا وَمَا لَهَا مِن فُرُوجٍ﴾ ئـاخۆ ئـەوان بـۆ ئاسمانیـان نـەڕوانیوە، کـە بەسـەریانەوەیە چـۆن وەدیمـان هێنـاوەو چـۆنمان

[1] الطبري (٢٢/٣٢٨).

[2] الطبري (٢٢/٣٢٩).

[3] الذاريات (٨ـ٩).

ڕازاندووەتەوەو هیچ کەلێنی تێدا نیە؟ خوای گەورە بەندەکانی خۆی ئاگادار دەکاتەوە لە دەسەلاتو توانای گەورەو بێپایانی خۆی گەورەترە لەوەی کە ئەوانە سەریان لێی سوڕدەمێنێتو باوەڕی پێ ناکەنو بە دووری دەزانن ڕووبدات، ﴿أَفَلَمْ يَنظُرُوٓا۟ إِلَى ٱلسَّمَآءِ فَوْقَهُمْ كَيْفَ بَنَيْنَٰهَا وَزَيَّنَّٰهَا﴾ واتە: سەیری ئاسمان نەکەن لەسەری خۆیانەوە کە چۆن دروستی کردووەو ڕازاندوویەتیەوە بە چراو چراخان. ﴿وَمَا لَهَا مِن فُرُوجٍ﴾ موجاهید دەڵێت: درزی تیا نیە.[1] کەسانی تریش وتوویانە: واتە: لەت نەبووە. نەشکاوە ماناکان نزیکن لە یەکەوە وەك خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿ٱلَّذِى خَلَقَ سَبْعَ سَمَٰوَٰتٍ طِبَاقًا ۖ مَّا تَرَىٰ فِى خَلْقِ ٱلرَّحْمَٰنِ مِن تَفَٰوُتٍ ۖ فَٱرْجِعِ ٱلْبَصَرَ هَلْ تَرَىٰ مِن فُطُورٍ ۝٣ ثُمَّ ٱرْجِعِ ٱلْبَصَرَ كَرَّتَيْنِ يَنقَلِبْ إِلَيْكَ ٱلْبَصَرُ خَاسِئًا وَهُوَ حَسِيرٌ﴾[2] واتە: ئەو زاتەی کە حەوت ئاسمانی دروست کردووە یەك لەسەر یەك، تۆ نابینیت لە دروستکردنی خوای میهرەباندا هیچ ناڕێکیەك چاو بگێڕەو وردبەرەوە و بزانە هیچ ناتەواوییەك دەبینیت، دووبارە چاو بگێڕە یەك لە دوای یەك چاوت بە ڕیسوایی‌و نائومێدی دەگەڕێتەوە بۆ لای خۆتو ئەو چاوەت ماندووەو تاقەتی چووە. واتە: چاوت بە داماوی‌و ڕاماری دەگەڕێتەوە هیچ کەمو کورییەك نابینی. وە دەفەرموویت: ﴿وَٱلْأَرْضَ مَدَدْنَٰهَا وَأَلْقَيْنَا فِيهَا رَوَٰسِىَ وَأَنۢبَتْنَا فِيهَا مِن كُلِّ زَوْجٍۭ بَهِيجٍ﴾ ئەم زەویەشمان ڕاخستووەو کێومان تێخستووەو جووتەی هەموو ڕووەکێکی بەردڵمان لەناودا ڕواند. ﴿وَٱلْأَرْضَ مَدَدْنَٰهَا﴾ واتە: ئەم زەویەمان فراوان کردووەو ڕامانخستووە. ﴿وَأَلْقَيْنَا فِيهَا رَوَٰسِىَ﴾ کێویشمان تیا داناوە بۆ ئەوەی نەڕواتو نەجولێت بەو خەڵکەوە لەسەریەتی، ﴿وَأَنۢبَتْنَا فِيهَا مِن كُلِّ زَوْجٍۭ بَهِيجٍ﴾ واتە: لە هەموو ڕووەکێکمان بە (نێرو مێ) تیا ڕواندووە وەك کشتوکاڵو دارودرەختو گیاوگژە لە هەمەڕەنگ. وەك خوای مەزن لە ئایەتێکی تردا دەفەرموویت: ﴿وَمِن كُلِّ شَىْءٍ خَلَقْنَا زَوْجَيْنِ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ﴾[3] واتە: وە لە هەموو شتێك نێرو مێ مان دروست کردووە بۆ ئەوەی بیر بکەنەوەو پەندی لێ وەربگرن. ﴿بَهِيجٍ﴾ واتە: دڵگیرو جوان. ﴿تَبْصِرَةً وَذِكْرَىٰ لِكُلِّ عَبْدٍ مُّنِيبٍ﴾ تا چاوی دڵ ڕۆشن بکاتو ببێتە هۆی بیرەوەری بۆ هەر بەندەیەك حەز بکات بگەڕێتەوە. واتە: سەیرکردنی ئاسمانەکانو زەمینو ئەو هەموو بەڵگە گەورانەی کە تیایەتی ببێتە هۆی چاوڕۆشن کردنەوەو

---

[1] الطبري (٢٢/٣٣٢).

[2] الملك (٣ـ٤).

[3] الذاريات (٤٩).

بیرەوەری بۆ هەموو بەندەیەکی لەخواترس و گوێڕایەڵ و خاوەنباوەڕ کە دەیەوێت بگەڕێتەوە بۆ لای خودای گەورە. خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَنَزَّلْنَا مِنَ السَّمَاءِ مَاءً مُّبَارَكًا فَأَنبَتْنَا بِهِ جَنَّاتٍ وَحَبَّ الْحَصِيدِ﴾لەو بەرزەوە ئاوێکی بە پیت و بەهرەمان بەرەو ژێر نارد، زۆر باغاتمان پێ ڕواند، ئەو دانەش کە دەرەو دەکرێت، واتە: لە ئاسمانەوە ئاوی بەسوودمان باراند. ﴿فَأَنبَتْنَا بِهِ جَنَّاتٍ﴾ باغ و باغچە و چەندەها هاوشێوەی ترمان پێ ڕواند، ﴿وَحَبَّ الْحَصِيدِ﴾ کشتوکاڵی زۆر کە بە دانەوە دەڕنێتەوە و کۆدەکرێتەوە. ﴿وَالنَّخْلَ بَاسِقَاتٍ لَّهَا طَلْعٌ نَّضِيدٌ﴾ دارخورمای بەرز و باڵاش بە هێشوی بزمار کوتیوە. واتە: دارخورمای هەڵچووی فرە بەرزە ئیبنو عەباس و موجاهیدو عیکریمە و حەسەن و قەتادە و سودی و کەسانی تریش وتوویانە: (الباسقات) واتە: درێژ.[1] ﴿لَّهَا طَلْعٌ نَّضِيدٌ﴾ کە بە هێشووی پڕی دانە بەسەر یەکەوە. ﴿رِّزْقًا لِّلْعِبَادِ وَأَحْيَيْنَا بِهِ بَلْدَةً مَّيْتًا كَذَٰلِكَ الْخُرُوجُ﴾بژێوە بۆ عەبدەکان و سەر زەمینی مردوویشمان پێ بووژاندەوە، دەرکەوتنیش هەر وەهایە. ﴿رِّزْقًا لِّلْعِبَادِ﴾ واتە: بژێویە بۆ خەڵکی ﴿وَأَحْيَيْنَا بِهِ بَلْدَةً مَّيْتًا﴾ واتە: ئەو زەمینە مردووەش کاتێك باران بەسەریدا دەبارێت و نەرم دەبێتەوە و دەجولێت و گیاو گژە و هەموو جۆرە ڕووەکێکی تیا دەڕوێت بە جووتە زۆر جوان و دلگیرو سەرنج ڕاکێشە. کە کاتێك بووە هیچی تیا نەبووە زەمینێکی وشك و ڕووت بووە هیچی تیانەبووە کەچی ئێستا بەرگی سەوزی پۆشیوە. ئا ئەمە نموونەیە بۆ زیندووبوونەوە پاش مردن و لەناوچوون. هەر بەو شێوەیە خوای گەورە مردوویش زیندوو دەکاتەوە. ئەمەیش باشترین و چاکترین بەڵگەیە کە بە چاو دەبینرێت لەسەر تواناو دەستەڵاتی خوای گەورەو باڵادەست بۆ ئەو کەسانەی کە باوەڕیان بە زیندووبوونەوە نییە و ئینکاری دەکەن. وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿لَخَلْقُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ أَكْبَرُ مِنْ خَلْقِ النَّاسِ﴾[2] واتە: بە ڕاستی بەدیهێنانی ئاسمان و زەوی گەورەترە لە بەدیهێنانی خەڵکی. وە دەفەرمووێت: ﴿أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّ اللَّهَ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَلَمْ يَعْيَ بِخَلْقِهِنَّ بِقَادِرٍ عَلَىٰ أَن يُحْيِيَ الْمَوْتَىٰ بَلَىٰ إِنَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾[3] واتە: ئایا ئەوانەیان زانیوە بە ڕاستی ئەو خوایەی ئاسمانەکان و زەوی دروست کردووە و لە دروستکردنیان ناتەوان و دەستەپاچە نەبووە بە توانایە مردووانیش

[1] الطبري (٢٢/٣٣٥).

[2] غافر (٥٧).

[3] الاحقاف (٣٣).

زیندووبکاتەوە، بەڵێ بێگومان خوا بەسەر هەموو شتێکدا بە توانایە. وە دەفەرموویت: ﴿وَمِنۡ ءَايَٰتِهِۦٓ أَنَّكَ تَرَى ٱلۡأَرۡضَ خَٰشِعَةً فَإِذَآ أَنزَلۡنَا عَلَيۡهَا ٱلۡمَآءَ ٱهۡتَزَّتۡ وَرَبَتۡۚ إِنَّ ٱلَّذِيٓ أَحۡيَاهَا لَمُحۡيِ ٱلۡمَوۡتَىٰٓۚ إِنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٌ﴾[1] واتە: لە نیشانەکانی دەسەڵاتی خودایە کە زەوی دەبینی وشكو ماتە کەچی کاتێك بارانمان باراند بەسەریدا بە ڕوانی ڕووەك دەکەوێتە جوڵەو دەبوژێتەوەو بەرزدەبێتەوە بێگومان ئەوەی زەوی وشك دەبوژێنێتەوەو زیندووکەرەوەی مردووەکانیشە بە ڕاستی خوا بەسەر هەموو شتێکدا بە توانایە.

﴿كَذَّبَتۡ قَبۡلَهُمۡ قَوۡمُ نُوحٖ وَأَصۡحَٰبُ ٱلرَّسِّ وَثَمُودُ ١٢ وَعَادٞ وَفِرۡعَوۡنُ وَإِخۡوَٰنُ لُوطٖ ١٣ وَأَصۡحَٰبُ ٱلۡأَيۡكَةِ وَقَوۡمُ تُبَّعٖۚ كُلّٞ كَذَّبَ ٱلرُّسُلَ فَحَقَّ وَعِيدِ ١٤ أَفَعَيِينَا بِٱلۡخَلۡقِ ٱلۡأَوَّلِۚ بَلۡ هُمۡ فِي لَبۡسٖ مِّنۡ خَلۡقٖ جَدِيدٖ ١٥﴾

## ئاگادارکردنەوەی قورەیش بە لەناوبردن و قڕکردنی گەلە پێشووەکان

خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿كَذَّبَتۡ قَبۡلَهُمۡ قَوۡمُ نُوحٖ وَأَصۡحَٰبُ ٱلرَّسِّ وَثَمُودُ﴾ بەر لەوانەش هۆزی نوحو خاوەنی ئاوی بیرەکە و سەمودیش هەر بێباوەڕ بوون. خوای گەورە هەڕەشە دەکات لە خوانەناسانی قورەیش بەوەی کە چی هێنا بەسەر هۆزەکانی پێش ئەوان کە بێباوەڕ بوون لە سزاو تۆڵەو قڕکردنی لە دنیادا وەك هۆزی نوح کە چۆن هەمووی نوقم کردن لەناو ئاودا هیچی نەهێشتن لەسەر زەمینداو خاوەنی ئاوی بیرەکانیشی (أصحاب الرّس) لەناو برد کە لە پێشەوە بەسەرهاتەکەیان لە سورەتی (الفرقان)دا باس کرا. وە دەفەرموویت: ﴿وَعَادٞ وَفِرۡعَوۡنُ وَإِخۡوَٰنُ لُوطٖ﴾ هۆزی عادو دەستەو دابەرەی فیرعەونو هۆزی لووتیش. مەبەست بە ﴿وَإِخۡوَٰنُ لُوطٖ﴾ واتە هۆزەکەی کە خەڵکی سەدوم بوون کارەکانیان لەناو زەمیندا بوو کە چۆن خوای گەورە بەناو زەمیندا بردنیە خوارەوەو زەویەکەی لێ کردنە دەریاچەیەکی بۆگەنو پیس بە هۆی بێ دینیو سەرکەشیو لادانیان لە هەق، ﴿وَأَصۡحَٰبُ ٱلۡأَيۡكَةِ وَقَوۡمُ تُبَّعٖۚ كُلّٞ كَذَّبَ ٱلرُّسُلَ فَحَقَّ وَعِيدِ﴾ گرۆی خاوەن بێشەکانو ژێردەستەکانی توببەعیش هیچیان بە پێغەمبەرانیان باوەڕیان نەدەکرد ئەوسا هەڕەشەکانی من بەڕاست گەڕا. ﴿وَأَصۡحَٰبُ ٱلۡأَيۡكَةِ﴾ واتە: هۆزی شوعەیب (سەلامی خوای لێ بێت)، ﴿وَقَوۡمُ تُبَّعٖ﴾ واتە: یەمەنیەکان. کە لە سورەتی (الدخان)دا باسمان کردن کە پێویست ناکات لێرەدا جارێکی تر باسی بکەین، ﴿كُلّٞ كَذَّبَ ٱلرُّسُلَ﴾ واتە: هەموو یەکێك لەم گەلانەو گەلەکانی تریش بڕوایان نەکرد بە پێغەمبەرەکانیان. وە هەر کەسێك باوەڕی بە پێغەمبەرێك نەکردبێت وەك ئەوە وایە کە باوەڕی بە هەموو ئەو پێغەمبەرانە نەکردبێت وەك خوای

---

[1] فصلت (٣٩).

مەزن دەفەرموویّت: ﴿كَذَّبَتۡ قَوۡمُ نُوحٍ ٱلۡمُرۡسَلِينَ﴾[1] واتە: گەلی نوح (سەلامی خوای لیّ بیّت) پیّغەمبەرانیان بە درۆزن دانا و بڕوایان پیّ نەکردن. ئەمە لە کاتیّکدا کە یەك پیّغەمبەریان بۆ هاتووە. خۆ ئەگەر هەموو پیّغەمبەرەکانیشیان بۆ ڕەوانە بکرایە هەر باوەڕیان پیّ نەدەکردن، ﴿فَحَقَّ وَعِيدِ﴾ واتە: ئەوسا ئەو بەڵیّنو هەڕەشەی کە خودا بڕیاری دابوو بۆیان لە جەزرەبەی بە ژانو تۆڵەی سەخت دەهاتەدی بە هۆی ئەو خوانەناسو باوەڕ نەکردنەیانەوە. با ئەو کەسانەی کە ئەم باسەیان بۆ دەکریّت ئاگایان لە خۆیان بیّتو بترسن لەوەی کە تووشی ئەوانە بووە. خۆ ئەگەر ئەمانیش وەك ئەوان بڕوا نەکەن بە پیّغەمبەرەکەیان بە تەمای هەمان سزاو جەزرەبە بن کە ئەوانەی پیّش خۆیان تووشیان بوو.

**سەرلەنویّ هیّنانەوە (الإعادة) ئاسانترە**

خـوای گەورەدەفـەرموویّت: ﴿أَفَعَيِينَا بِٱلۡخَلۡقِ ٱلۡأَوَّلِۚ بَلۡ هُمۡ فِي لَبۡسٍ مِّنۡ خَلۡقٍ جَدِيدٍ﴾ ئـاخۆ ئیّمـە لـە وەدیهیّنانی پیّشین مانـدوو بوویـووین؟ بـەڵکو ئـەوان بـە گومـان بـوون کـە دەتـوانین سـەرلەویّ وەدی بهیّنین. ﴿أَفَعَيِينَا بِٱلۡخَلۡقِ ٱلۡأَوَّلِ﴾ واتە: ئایا ئەوەل جار ماندوو بووین کە دروستمان کردن، هـەتا ئـەوان گومانیان هەبیّت کە جاریّکی تر دروست ناکریّنـەوە؟ ﴿بَلۡ هُمۡ فِي لَبۡسٍ مِّنۡ خَلۡقٍ جَدِيدٍ﴾ واتـە: وەدیهیّنـانی یەکەم ماندووی نەکردین، سەرلەویّ دروستکردنەوە زۆر ئاسانترە لەوە وەك خوای گەورە دەفەرموویّت: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِي يَبۡدَؤُاْ ٱلۡخَلۡقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ وَهُوَ أَهۡوَنُ عَلَيۡهِ﴾[2] واتـە: ئـەو (خـوا) زاتیّکـە بـەدیهیّنانی دەست پیّکردووە لە پاشان (دوای مردن) دووبارە دروستی دەکاتەوە ئەم (دروستکردنەوەی دووەم) لای خـوا ئاسـانترە. وە هەمیـسان دەفـەرموویّت: ﴿وَضَرَبَ لَنَا مَثَلٗا وَنَسِيَ خَلۡقَهُۥۖ قَالَ مَن يُحۡيِ ٱلۡعِظَٰمَ وَهِيَ رَمِيمٞ ۝٧٨ قُلۡ يُحۡيِيهَا ٱلَّذِيٓ أَنشَأَهَآ أَوَّلَ مَرَّةٖۖ وَهُوَ بِكُلِّ خَلۡقٍ عَلِيمٌ﴾[3] واتـە: وە نموونـەمان بـۆ دیّنیّتـەوەو بەدیهیّنانی خۆی لە بیرچووەتەوە (ئەو بیّباوەڕە) دەڵیّت کیّ ئیّسکەکان زیندوو دەکاتـەوە لـە کاتیّکدا کـە ڕزیـون، (ئـەی موحەممـەد(ﷺ)) بلّـیّ ئـەو زاتـە زینـدوویان دەکاتـەوە کـە لـە یەکـەم جارەوە بەدیهیّناونو ئەو بە هەموو دروستکراویّك زاناو ئاگایە. لە فەرموودەیەکی سـەحیحدا لـە پیّشەوە هـات: (خوای مەزن دەفەرموویّت نەوەی ئادەم ئازارم دەدات، دەڵیّت: وەدیم ناهیّنیّتەوە وەك چۆن دروستی

[1] الشعراء (١٠٥).

[2] الروم (٢٧).

[3] یس (٧٨ـ٧٩).

کردووم، دروستکردنی یەکەمی خەڵکی ئاسانتر نیە لە لام لە وەدیهێنانەوەی).[1] بۆ خوا هیچ جیاوازییەکی نیە کە بفەرمووێت بە هەر شتیّ (کن فیکون) واتە: ببە دەبێت.

﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ وَنَعْلَمُ مَا تُوَسْوِسُ بِهِۦ نَفْسُهُۥ ۖ وَنَحْنُ أَقْرَبُ إِلَيْهِ مِنْ حَبْلِ ٱلْوَرِيدِ ﴿١٦﴾ إِذْ يَتَلَقَّى ٱلْمُتَلَقِّيَانِ عَنِ ٱلْيَمِينِ وَعَنِ ٱلشِّمَالِ قَعِيدٌ ﴿١٧﴾ مَّا يَلْفِظُ مِن قَوْلٍ إِلَّا لَدَيْهِ رَقِيبٌ عَتِيدٌ ﴿١٨﴾ وَجَآءَتْ سَكْرَةُ ٱلْمَوْتِ بِٱلْحَقِّ ۖ ذَٰلِكَ مَا كُنتَ مِنْهُ تَحِيدُ ﴿١٩﴾ وَنُفِخَ فِى ٱلصُّورِ ۚ ذَٰلِكَ يَوْمُ ٱلْوَعِيدِ ﴿٢٠﴾ وَجَآءَتْ كُلُّ نَفْسٍ مَّعَهَا سَآئِقٌ وَشَهِيدٌ ﴿٢١﴾ لَّقَدْ كُنتَ فِى غَفْلَةٍ مِّنْ هَٰذَا فَكَشَفْنَا عَنكَ غِطَآءَكَ فَبَصَرُكَ ٱلْيَوْمَ حَدِيدٌ ﴿٢٢﴾﴾

## خوای گەورە ئاگاداری هەموو شتێکی مەردمە و نووسراوەو دانراوە

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ وَنَعْلَمُ مَا تُوَسْوِسُ بِهِۦ نَفْسُهُۥ ۖ وَنَحْنُ أَقْرَبُ إِلَيْهِ مِنْ حَبْلِ ٱلْوَرِيدِ﴾ دیارە ئێمە مرۆڤمان دروست کردووەو دەشزانین چۆن خەیاڵاتی بە دڵدا دێت. ئێمە بۆ ئەو لە شادەماری ملی نزیکترین. خوای گەورە باسی دەسەڵات و توانای خۆی دەکات بەسەر مرۆڤدا کە ئەو دروستی کردووەو ئاگاداری هەموو شتێکیەتی ئەوەش بە خەیاڵ بە دڵیدا دێت پێی دەزانێت لە چاکەو لە خراپە. لە فەرموودەی سەحیحدا هاتووە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کەئەفەرمووێت: (خوای مەزن خۆش بووە لەو شتانەی کە بە خەیاڵدا دێت بە دڵی ئوممەتەکەمدا ئەگەر بە دەم نەیڵێ یان بە کردەوە نەیکات)[2]. وە دەفەرمووێت: ﴿وَنَحْنُ أَقْرَبُ إِلَيْهِ مِنْ حَبْلِ ٱلْوَرِيدِ﴾ واتە: فریشتەکانی خوا نزیکترن لە خەڵکی لە ڕەگی لاملی. بەڵام ئەوەی لێکی داوەتەوە بە زانین بۆیە وای کردووە هەتا خۆی نەبەستێت بە حلول و ئیتحادەوە کە خودا پاک و بێگەردە شتی وا نیە بە پێی ڕاوبۆچوونی زانایان. بەڵکو وتەکە ئەو مانایە ناگرێتەوە چونکە خوای گەورە نەیفەرمووە: (وأنا أقرب إليه من حبل الوريد) بەڵکو فەرموویەتی: ﴿وَنَحْنُ أَقْرَبُ إِلَيْهِ مِنْ حَبْلِ ٱلْوَرِيدِ﴾ وەك چۆن ئەفەرمووێت بۆ هەر کەسێك لە کاتی مردندا بێت (مردن قورقوڕاگەی گرتبێت): ﴿وَنَحْنُ أَقْرَبُ إِلَيْهِ مِنكُمْ وَلَٰكِن لَّا تُبْصِرُونَ﴾[3] واتە: لەو کاتەدا ئێمە لە ئێوە نزیکترین لەو (کەسەی لە سەرەمەرگدایە). واتە: فریشتەکانی. وەك لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا ٱلذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ﴾[4] واتە: بێگومان هەر ئێمە قورئانمان ناردووەتە

---

[1] فتح الباري (٨/٦١١).

[2] فتح الباري (١١/٥٥٧).

[3] الواقعة (٨٥).

[4] الحجر (٩).

خوارەوەو بەڕاستی هەر ئێمەش دەیپارێزین. چونکە فریشتە بە فەرمانی خودا هاتەخوارەوەو قورئانی هێنا. هەر بەو شێوەیە فریشتەکان نزیکترن لە خەڵکەوە لە شادەماری لاملیان بە ئیزنی خوای گەورە هەڵدەستن بەو کارە. فریشتەکان نزیک دەبنەوە لە مرۆڤ وەك چۆن شەیتان نزیك دەبێتەوە کاردەکاتە مرۆڤ هەر بەو شێوەیە شەیتان دەڕوات و دەگەڕێت بە هەر شوێنێکدا خوێن دەڕوات و دەگەڕێت پێیدا.

وەك پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی و ئاگاداری کردووین. بۆیە خوای گەورەلێرەدا فەرموویەتی: ﴿إِذْ يَتَلَقَّى الْمُتَلَقِّيَانِ عَنِ الْيَمِينِ وَعَنِ الشِّمَالِ قَعِيدٌ﴾ ئەو کاتەی لە لای ڕاست و چەپیشەوە جووتێك فریشتە دانیشتوون (بۆی دەنووسن). ﴿إِذْ يَتَلَقَّى الْمُتَلَقِّيَانِ﴾ واتە: ئەو دوو فریشتەی کە کردەوەی مرۆڤ دەنووسن، ﴿عَنِ الْيَمِينِ وَعَنِ الشِّمَالِ قَعِيدٌ﴾ واتە: دانیشتوون و چاوەڕوانن. ﴿مَا يَلْفِظُ مِن قَوْلٍ إِلَّا لَدَيْهِ رَقِيبٌ عَتِيدٌ﴾ هەر ورتەی لە دەم دەربچێت چاودێرێکی لا هەیە. واتە: ﴿مَا يَلْفِظُ مِن قَوْلٍ﴾ مەردم هەر قسەیەك بکات. ﴿إِلَّا لَدَيْهِ رَقِيبٌ عَتِيدٌ﴾ واتە: مەگین چاودێرێکی لایەو لەگەڵیەتی لەسەری دەنووسێت هیچی لە یاد ناچێت قسە بێت یان کردار. وەك خوای گەورەفەرموویەتی: ﴿وَإِنَّ عَلَيْكُمْ لَحَافِظِينَ ﴿١٠﴾ كِرَامًا كَاتِبِينَ ﴿١١﴾ يَعْلَمُونَ مَا تَفْعَلُونَ﴾[1] واتە: بێگومان چەند چاودێرێکتان بە سەرەوەیە، کە بەڕێزو نووسەرن، هەرچی بکەن دەیزانن. فریشتەکان هەموو شتێك دەنووسن کە دەوترێت. ئەمە قسەی حەسەن و قەتادەیە.[2] لە ئایەتەکەیشەوە وا دەردەکەوێت. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە بیلالی کوڕی حارسی مەزەنیەوە(ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەفەرمووێت: (پیاوی وا هەیە قسەیەکی لە دەم دەردەچێت لە ڕەزامەندی خودا هەست ناکات کە قسەکەی چەندە چاکە. خوای گەورە بەو قسەیە ڕەزامەندی خۆی بۆ دەنووسێت هەتا ڕۆژێك کە دەچێتەوە خزمەتی. کەسی واش هەیە قسەیەکی لە دەم دەردەچێت لە ناڕەزایی خودا هەستی پێ ناکات کە قسەکەی چەندە خراپە، خوای گەورە بەو قسەیە ناڕەزایی خۆی بۆ دەنووسێت هەتا ڕۆژێك کە دەچێتەوە خزمەتی). دەڵێت: عەلقەمە دەیوت: کە فەرموودەکەی بیلالی کوڕی حارس لە چەند قسە منی گێڕایەوە[3]. تیرمیزی و نەسائی و ئیبنو ماجەیش ڕیوایەتیان کردووە.تیرمیزی دەڵێت: فەرموودەکەی چاك و ڕاستە (حسن صحيح).[4] ئەم فەرموودە نموونەی تری هەیە لە کتێبە سەحیحەکاندا.

---

[1] الانفطار (١٠ـ١٢).

[2] الطبري (٢٢/٣٤٥).

[3] احمد (٣/٤٦٩، فەرموودەیەکی حەسەنی سەحیحە.

[4] تحفة الأحوذي (٦/٦٠٠)، تحفة الاشراف (٢/٥٥٥)، ابن ماجه (٢/١٣١٢)، فەرموودەیەکی حەسەنی سەحیحە.

**وەبیرهێنانەوەی بورانەوەی گیان کەنشتو فوو بە کەڵەشاخداکردن و زیندووبوونەوەو کۆبوونەوە بە دوایدا**

خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿وَجَآءَتْ سَكْرَةُ ٱلْمَوْتِ بِٱلْحَقِّ ذَٰلِكَ مَا كُنتَ مِنْهُ تَحِيدُ﴾ بوورانەوەی گیانەڵا وا دیاریدا، هەر ئەمەشە تۆ نەتدەویست تووش ببیت. ﴿وَجَآءَتْ سَكْرَةُ ٱلْمَوْتِ بِٱلْحَقِّ﴾ واتە: ئەی مەردم کاتێك لەسەرخۆچوونی مردن یەخەت دەگرێتو بە تەواوی بۆت دەردەکەوێتو دەربازبوونت نییە، ﴿ذَٰلِكَ مَا كُنتَ مِنْهُ تَحِيدُ﴾ واتە: ئەمە ئەوەیە کە تۆ هەڵدەهاتی لێی. وا هاتو هیچ پەناو شوێنو جێگەیەك نییە خۆتی تێدا بشاریتەوەو ڕزگارت بکات. لە فەرموودەی سەحیحدا هاتووە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) کاتێك مردن هات ئارەقی لەناوچەوانی دەسڕیو دەیفەرموو: (پەسەنی بۆ خوایە ـسبحان اللهـ گیان کێشانو مردن ناڕەحەتی زۆری هەیە).[1] خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ذَٰلِكَ مَا كُنتَ مِنْهُ تَحِيدُ﴾ دوو بۆچوون هەیە: یەکەم: (ما) لێرەدا مانای مەوسولە (موصولة) واتە: ئەوەی کە تۆ خۆت لێ لادەدا. واتە: ڕات دەکردو دووردەکەوتیتەوە لێی، ئەوا تووشت بووو یەخەی گرتی. دووەم: (ما) مای نافیەیە واتە: ئەمە ئەوەیە کە تۆ ناتوانی لێی ڕابکەیو خۆتی لێ دەرباز بکەی. تەبەرانی ڕیوایەتی کردووە لە (معجم الكبير)دا لە سەمورەوە دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەفەرموێت: (نموونەی ئەو کەسەی کە لە مردن هەڵدێتو ڕادەکات وەك ئەو ڕێویە وایە زەوی داوای قەرزی لێ دەکات ڕادەکات هەتا ماندووو هەراسان دەبێتو دەچێتە کونەکەی خۆی زەمین پێی دەڵێت: ئەی ڕێوی قەرزەکەم، ڕێویش دەرچووەو ڕای کردووەو بای لێ بووەتەوە بە بەردەوامی تا ملی شکاوەو قرتاوە مردووە).[2] ئەم نموونەیە ئەوە دەگەیەنێت. چۆن ئەم ڕێویە ناتوانێت لە زەمین ڕابکاتو خۆی دەرباز بکات، ئا بەو شێوەیەش مرۆڤ ناتوانێت خۆی لە مردن لابداتو ڕزگار بکات. خوای گەورەدەفەرموێت: ﴿وَنُفِخَ فِى ٱلصُّورِ ذَٰلِكَ يَوْمُ ٱلْوَعِيدِ﴾ فوو بە کەڵەشاخدا کرا ئەوە ڕۆژی هەڕەشەیە دێتەدی. لە پێشەوە قسەکرا لە بارەی فووکردن بە کەڵەشاخو ترسو لەرزو لە هۆشچوونو زیندووبوونەوە کە لە ڕۆژی قیامەتدا ڕوودەدات. لە فەرموودەیەکدا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (چۆن دڵم خۆش بێت خاوەنی کەڵەشاخ، کەڵەشاخی گرتووە بە دەمەوەو سەری نەوی کردووە چاوەڕوان دەکات کە ئیزن بدرێت فووی پیا بکات). وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) چی بڵێین؟ فەرمووی: (قولوا حسبنا الله ونعم

---

[1] فتح الباري (٣٦٩/١١).

[2] الطبراني (٢٢٢/٧)، فەرموودەیەکی لاوازە.

الوكيل). بلێن: خوامان بەسەو چاكترین وەكیلە، خەڵكەكە وتیان: (حسبنا الله ونعم الوكيل).[1] خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَجَآءَتۡ كُلُّ نَفۡسٖ مَّعَهَا سَآئِقٞ وَشَهِيدٞ﴾ هەر كەسێك دێت، یەكێك وەپێشی خۆی داوەو یەكێكیش شایەت دەدات. واتە: فریشتەیەك دەیبات بۆ مەحشەر فریشتەیەكیش شایەتی دەدات لەسەر كردەرەكانی. وەك لە ئایەتەكەوە دەردەكەوێتو دیارە ئیبنو جەریر ئەم رایەی هەڵبژاردووە.[2] پاشان ڕیوایەت كراوە لە یەحیای كوڕی ڕافیعەوە كە مەولای سەقیفیەكان بووە دەڵێت: گوێم لە عوسمانی كوڕی عەفان بوو وتاری دەداو ئەم ئایەتەی خوێند: ﴿وَجَآءَتۡ كُلُّ نَفۡسٖ مَّعَهَا سَآئِقٞ وَشَهِيدٞ﴾ دەڵێت: فریشتەیەكیش دەیبات بۆ خوداو فریشتەیەكیش شایەتی دەدات لەسەر ئەوەی كە كردوویەتی.[3] خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿لَّقَدۡ كُنتَ فِي غَفۡلَةٖ مِّنۡ هَٰذَا فَكَشَفۡنَا عَنكَ غِطَآءَكَ فَبَصَرُكَ ٱلۡيَوۡمَ حَدِيدٞ﴾ تۆ لەمانە بێ هەواڵ بووی، وا سەرپۆشمان لەسەر لادای، چاوت ئەمڕۆ زۆر بڕ دەكات. ئەم قسەیە لەگەڵ مرۆڤە بە تایبەتیو مەبەست لەم ئایەتە كە خودا دەفەرموێت: ﴿لَّقَدۡ كُنتَ فِي غَفۡلَةٖ مِّنۡ هَٰذَا﴾ واتە: ئاگات لەم ڕۆژە نەبوو لە بیرت چووبوو، ﴿فَكَشَفۡنَا عَنكَ غِطَآءَكَ فَبَصَرُكَ ٱلۡيَوۡمَ حَدِيدٞ﴾ واتە: چاوت بەهێزە ئەمڕۆ چونكە هەموو كەسێك لە ڕۆژی قیامەتدا چاوی زۆر بەهێزە، هەتا خوانەناسیش لە ڕۆژی قیامەتدا لەسەر ڕاستیە بەڵام بەهرەیەكی پێ ناگەیەنێتو بێ سوودە. خوای مەزن فەرموویەتی: ﴿أَسۡمِعۡ بِهِمۡ وَأَبۡصِرۡ يَوۡمَ يَأۡتُونَنَا﴾[4] واتە: زۆر چاویان تیژەو گوێیان سووكە ڕۆژێك كە دێنە لامان. ﴿وَلَوۡ تَرَىٰٓ إِذِ ٱلۡمُجۡرِمُونَ نَاكِسُواْ رُءُوسِهِمۡ عِندَ رَبِّهِمۡ رَبَّنَآ أَبۡصَرۡنَا وَسَمِعۡنَا فَٱرۡجِعۡنَا نَعۡمَلۡ صَٰلِحًا إِنَّا مُوقِنُونَ﴾[5] واتە: ئەگەر دەبینی كاتێك لە قیامەتدا تاوانباران لە حوزوری پەروەردگاریاندا لە خەجاڵەتیدا سەریان داخستووە، دەڵێن: ئەی پەروەردگاری ئێمە ئەوەی بەڵێنت پێ دابووین دیمانو بیستمان دەی بمانگێڕەوە بۆ دنیا تا كردەوەی چاك بكەین بە ڕاستی ئێمە دڵنیاین لە قیامەت.

---

[1] تحفة الأحوذي (١١٧/٧)، فەرموودەیەكی حەسەنە.

[2] الطبري (٣٤٧/٢٢).

[3] الطبري (٣٤٧/٢٢).

[4] مريم (٣٨).

[5] السجدة (١٢).

﴿ وَقَالَ قَرِينُهُۥ هَٰذَا مَا لَدَيَّ عَتِيدٌ ﴿٢٣﴾ أَلْقِيَا فِى جَهَنَّمَ كُلَّ كَفَّارٍ عَنِيدٍ ﴿٢٤﴾ مَّنَّاعٍ لِّلْخَيْرِ مُعْتَدٍ مُّرِيبٍ ﴿٢٥﴾ ٱلَّذِى جَعَلَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ فَأَلْقِيَاهُ فِى ٱلْعَذَابِ ٱلشَّدِيدِ ﴿٢٦﴾ ۞ قَالَ قَرِينُهُۥ رَبَّنَا مَآ أَطْغَيْتُهُۥ وَلَٰكِن كَانَ فِى ضَلَٰلٍۭ بَعِيدٍ ﴿٢٧﴾ قَالَ لَا تَخْتَصِمُوا۟ لَدَيَّ وَقَدْ قَدَّمْتُ إِلَيْكُم بِٱلْوَعِيدِ ﴿٢٨﴾ مَا يُبَدَّلُ ٱلْقَوْلُ لَدَيَّ وَمَآ أَنَا۠ بِظَلَّٰمٍ لِّلْعَبِيدِ ﴿٢٩﴾ ﴾

## شایەتی دانی فریشتەو فەرمانی خودا بە فڕێدانی خوانەناسان بۆ ناو جەهەنەم

خوای گەورەدەفەرموێت: ﴿وَقَالَ قَرِينُهُۥ هَٰذَا مَا لَدَيَّ عَتِيدٌ﴾ فریشتەکەی هاوڕێی دەڵێت: وا لە لای من ئامادەیە. خوای گەورە باسی ئەو فریشتە دەکات کە کاری ئەو کەسەی پێ سپێردراوەو شایەتی دەدات لە ڕۆژی قیامەتدا ئەو شتانەی کە کردوویەتی دەڵێت: ﴿هَٰذَا مَا لَدَيَّ عَتِيدٌ﴾ لای من ئامادەیە بێ کەمو زیاد. ئا لەوێدا خوای گەورە بڕیاری خۆی دەدا بە سەریاندا بە دادپەروەری خۆیو دەفەرموێت: ﴿أَلْقِيَا فِى جَهَنَّمَ كُلَّ كَفَّارٍ عَنِيدٍ﴾ بە هەردووکتان هەموو سپڵەیەکی لاسار، بیهاوێژنە ناو دۆزەخەوە. وا دەردەکەوێت ئەم قسەیە لەگەڵ فریشتەی شایەتو بەڕێکەرە ﴿سَآئِقٌ وَشَهِيدٌ﴾ بەڕێکەرە ئامادەی دەکاتو دەیبات بۆ گۆڕەپانی لێپرسینەوەو فریشتەی شایەتیش شایەتی خۆی دەدات لەسەر ئەو شتانەی کە کردوویەتی. خوای گەورەیش فەرمان دەدات کە بیهاوێژنە ناو جەهەنەم. کە پاشەڕۆژێکی زۆر خراپە. ﴿أَلْقِيَا فِى جَهَنَّمَ كُلَّ كَفَّارٍ عَنِيدٍ﴾ واتە: هەموو سپڵەیەکی بێباوەڕو لاسارو بێ گوێ کە دژایەتی هەق دەکەن بە شتی پڕوپوچ خۆشیان دەزانن وانیە، ﴿مَّنَّاعٍ لِّلْخَيْرِ مُعْتَدٍ مُّرِيبٍ﴾ کە بەری لە چاکە گرتو لە ڕێی لاداو خەڵکیشی وەگومان دەخست. ﴿مَّنَّاعٍ لِّلْخَيْرِ﴾ واتە: ڕێی لە چاکە گرتووە ئەو مافانەی کە لەسەریەتی بەجێی ناهێنێت پەیوەندی خزمایەتی دەپچڕێنێتو چاکەو خێروبێر ناکات. ﴿مُعْتَدٍ﴾ ئەوەیش دەیبەخشێتو سەرفی دەکات لە شوێنی خۆیدا سەرفی ناکات، قەتادە دەڵێت: لە قسەو هەڵسوکەوتو کالاو فەرمانیدا ڕاست نیەو لارە.[1] ﴿مُّرِيبٍ﴾ بە گومانە لە کارەکانیداو خەڵکیش دەخاتە گومانەوە. ﴿ٱلَّذِى جَعَلَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ فَأَلْقِيَاهُ فِى ٱلْعَذَابِ ٱلشَّدِيدِ﴾ کەسێك بوو وێڕای خودا، شتی دیکەشی دەپەرست، سا بە توندی بیانخەنە بەر سزاوە. ﴿ٱلَّذِى جَعَلَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ﴾ واتە: ئەوەی کە هاوەڵی بۆ خودا دادەنا وەك خودا دەیپەرست، ﴿فَأَلْقِيَاهُ فِى ٱلْعَذَابِ ٱلشَّدِيدِ﴾ واتە: فڕێیان بدەنە ناو سزای توندەوە. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو سەعیدی خودەریەوە(ڕەزای خوای لێ بێت) لە

[1] الطبري (٢٢/٣٥٦).

پێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرموویەتی: (ملێك لەناو ئاگرەوە سەر دەردێنێتو قسە دەكاتو دەڵێت: ئەمڕۆ من سێ جۆر كەسم دراوەتەدەست هەموو زۆردارێكی لاسارو كەسێك كە لەگەڵ خودا شتی تریشی پەرستبێتو كەسێك یەكێك بكوژێت كەس نەیكوشتبێت(هەقێكی بە لایەوە نەبێت). دەیانگرێتو دەیانخاتە ناو قوڵایی جەهەنەمەوە[1].

## كێشەو دەمەقاڵێی مرۆڤو شەیتان لە خزمەت خوای گەورەدا

خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿قَالَ قَرِينُهُۥ رَبَّنَا مَآ أَطْغَيْتُهُۥ وَلَٰكِن كَانَ فِى ضَلَٰلٍۭ بَعِيدٍ﴾ ئەوەی هاوڕێیەتی دەڵێت: ئەی پەروەردەی هەموومان: دنەی سەرپێچیم نەداوە، بەلام هەر خۆی لەوپەڕی گومڕاییدا بوو. ﴿قَالَ قَرِينُهُۥ﴾ ئیبنو عەباسو موجاهیدو قەتادەو كەسانی تریش(ڕەزای خوایان لێ بێت) ئەڵێن: ئەو شەیتانەی كە هاوڕێیەتی.[2] ﴿رَبَّنَا مَآ أَطْغَيْتُهُۥ﴾ واتە: لەبارەی ئەو كەسەوە كە لەگەڵی بووە بەبێ بینی مردووە لە ڕۆژی قیامەتدا دەڵێت من دوورم لەمەو هیچ پەیوەندییەكم پێوەی نییە. ﴿مَآ أَطْغَيْتُهُۥ﴾ من گومڕام نەكردووە. ﴿وَلَٰكِن كَانَ فِى ضَلَٰلٍۭ بَعِيدٍ﴾ واتە: بەڵكو ئەو هەر خۆی گومڕابووەو شوێنی پڕوپووچ كەوتووەو لە ڕاستی لایداوە. وەك خوای گەورەلە ئایەتێكی تردا باسی كردووەو دەفەرمووێت: ﴿ وَقَالَ ٱلشَّيْطَٰنُ لَمَّا قُضِىَ ٱلْأَمْرُ إِنَّ ٱللَّهَ وَعَدَكُمْ وَعْدَ ٱلْحَقِّ وَوَعَدتُّكُمْ فَأَخْلَفْتُكُمْ ۖ وَمَا كَانَ لِىَ عَلَيْكُم مِّن سُلْطَٰنٍ إِلَّآ أَن دَعَوْتُكُمْ فَٱسْتَجَبْتُمْ لِى ۖ فَلَا تَلُومُونِى وَلُومُوٓا۟ أَنفُسَكُم ۖ مَّآ أَنَا۠ بِمُصْرِخِكُمْ وَمَآ أَنتُم بِمُصْرِخِىَّ ۖ إِنِّى كَفَرْتُ بِمَآ أَشْرَكْتُمُونِ مِن قَبْلُ ۗ إِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴾[3] واتە: جا شەیتان دەڵێت كاتێك كە كار تەواو دەبێت بێگومان خوا بەڵێنی پێدان بە بەڵێنێكی هەقو ڕاستو منیش بەڵێنم پێدان بەلام درۆم كرد لەگەڵتانو من نەمبوو بەسەرتاندا هیچ زۆرو دەسەلاتێك تەنها ئەوە نەبێت بانگم كردن بۆ گومڕایی، ئیتر ئێوەش بە دەنگمەوە هاتن و بە گوێتان كردم، كەواتە لۆمەی من مەكەن بەڵكو لۆمەی خۆتان بكەن بە ڕاستی من ناتوانم بێم بە هاواری ئێوەوەو ئێوەش ناتوانن بێن بە هاواری منەوە بە ڕاستی من بڕوام نەبوو بەوەی كە پێشتر لە دنیادا منتان كردبوو بە هاوبەش بۆ خوا بە ڕاستی ستەمكاران سزای سەختیان دەبێت. خودا دەفەرمووێت: ﴿قَالَ لَا تَخْتَصِمُوا۟ لَدَىَّ﴾ خوای گەورە دەفەرمووێت بەو كەسەو بە هاوەڵە جنۆكەكەی كاتێك كە لە خزمەتیدا كێشە دەكەن، مرۆڤەكە

---

[1] احمد (٣/٤٠)، فەرموودەیەكی حەسەنی سەحیحی غەریبە.

[2] الطبري (٢٢/٣٥٧).

[3] ابراهیم (٢٢).

دەڵێت: ئەی پەروەردگارم ئەمە سەری لێ شێواندم دوای ئەوەی کە قورئان هاتەخوار. شەیتانەکەش دەڵێت: ﴿رَبَّنَا مَآ أَطۡغَيۡتُهُۥ وَلَٰكِن كَانَ فِي ضَلَٰلِۭ بَعِيدٖ﴾ واتە: من سەرم لێ نەشێواندووە بەڵکو خۆی لە ڕێی ڕاست لایداوەو لەوپەڕی گومڕاییدا بوو. خوای گەورەش دەفەرموێت: ﴿لَا تَخۡتَصِمُواْ لَدَيَّ وَقَدۡ قَدَّمۡتُ إِلَيۡكُم بِٱلۡوَعِيدِ﴾ دەڵێت: لای من کێشە مەکەن، من پێشەکی هەڕەشەم پێ ڕاگەیاندوون. ﴿لَا تَخۡتَصِمُواْ﴾ لای من دەمەقاڵێ مەکەن، ﴿وَقَدۡ قَدَّمۡتُ إِلَيۡكُم بِٱلۡوَعِيدِ﴾ لەسەر زمانی پێغەمبەران(سەلامی خوایان لێ بێت) ئاگادارم کردنو هەڕەشەم لێ کردنو کتێبم ناردو هەموو شتێکم بۆ ڕوون کردنەوە بە بەڵگەوە. ﴿مَا يُبَدَّلُ ٱلۡقَوۡلُ لَدَيَّ وَمَآ أَنَا۠ بِظَلَّٰمٖ لِّلۡعَبِيدِ﴾ بەڵێنی من گۆڕانی بەسەردا نایەتو ناهەقی بە عەبدان ناکەم. ﴿مَا يُبَدَّلُ ٱلۡقَوۡلُ لَدَيَّ﴾ موجاهید دەڵێت: ئەوەی کە بڕیارم دا دواین گۆڕانی بە سەردا نایەت.[1] ﴿وَمَآ أَنَا۠ بِظَلَّٰمٖ لِّلۡعَبِيدِ﴾ واتە: هیچ کەس سزانادەم بە تاوانو گوناهی خۆی نەبێت دوای ڕوونکردنەوەو بەڵگەی تەواو لەسەری.

﴿يَوۡمَ نَقُولُ لِجَهَنَّمَ هَلِ ٱمۡتَلَأۡتِ وَتَقُولُ هَلۡ مِن مَّزِيدٖ ﴿٣٠﴾ وَأُزۡلِفَتِ ٱلۡجَنَّةُ لِلۡمُتَّقِينَ غَيۡرَ بَعِيدٍ ﴿٣١﴾ هَٰذَا مَا تُوعَدُونَ لِكُلِّ أَوَّابٍ حَفِيظٖ ﴿٣٢﴾ مَّنۡ خَشِيَ ٱلرَّحۡمَٰنَ بِٱلۡغَيۡبِ وَجَآءَ بِقَلۡبٖ مُّنِيبٍ ﴿٣٣﴾ ٱدۡخُلُوهَا بِسَلَٰمٖۖ ذَٰلِكَ يَوۡمُ ٱلۡخُلُودِ ﴿٣٤﴾ لَهُم مَّا يَشَآءُونَ فِيهَا وَلَدَيۡنَا مَزِيدٞ ﴿٣٥﴾﴾

## باسی جەهەنەمو بەهەشتو خەڵکەکەیان

خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿يَوۡمَ نَقُولُ لِجَهَنَّمَ هَلِ ٱمۡتَلَأۡتِ وَتَقُولُ هَلۡ مِن مَّزِيدٖ﴾ ڕۆژێک دەبێت کە بە جەهەنەم دەڵێین ئایا پڕبووی؟ دەڵێت: ئایا زیاتریش هەیە؟ خوای گەورە باسی ئەوەمان بۆ دەکات کە لە ڕۆژی قیامەتدا دەفەرموێت بە جەهەنەم ئایا پڕ بووی؟ چونکە بەڵێنی داوە کە جەهەنەم پڕ دەکات لە مرۆڤو جنۆکە. فەرمان دەکات کە بیانهاوێژنە ناوی ئەویش دەڵێت: ئایا زیاتریش هەیە؟ واتە ئایا هیچی تر ماوە بۆم بنێرن؟ شێوازو دەقی ئایەتەکە وا دەگەیەنێت. فەرموودەکانیش وا دەگەیەنن. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئەنەسەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەفەرموێت: (بەردەوام جەهەنەم تێی دەهاوێژرێت دەڵێت: ئایا زیاتریش ماوە؟ هەتا پەروردگاری خاوەن دەسەڵات پێی دەخاتە ناویو دەچێتەوە یەك و دەڵێت: بەسمە بەسمە سوێند بە گەورەییو کەرەمی تۆ. لە بەهەشتدا شوێنی زیاد هەر دەمێنێتەوە هەتا خودای گەورەخەڵکێکی تری بۆ دروست دەکاتو لەو شوێنانەی کە ماوە نیشتەجێیان دەکات)[2]، موسلیمیش ڕیوایەتی کردووە[1].

---

[1] الطبري (٢٢/٣٥٩).

[2] احمد (٣/٢٣٤)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

فەرموودەیەکی تر: بوخاری ڕیوایەتی کردووە لـە ئـەبو هـورەیرەوە(ڕەزای خـوای لێ بێـت) دەڵێـت: پێغەمبەر(ﷺ) ئەفەرمووێت: (دەوترێت بـە جەهەنـەم ئایا پڕبووی؟ جەهەنـەم دەڵێت: هـەمی تـریش ماوە؟ خوای گەورە پێی دەخاتە ناوی. جەهەنەمیش دەڵێت بەسمە بەسمە)[٢].

ڕێگایـەکی تـر: بوخـاری ڕیوایـەتی کـردووە لـە ئـەبو هـورەیرەوە (ڕەزای خـوای لێ بێـت) دەڵێـت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەفەرمووێت: (بەهەشتو ئاگر کێشەیانە ئاگر وتی: گرنگیو ڕێزم پێدراوە بە فیز زل و زۆردارەکان، خوای گەورە فەرموویەتی: بە بەهەشت تـۆ بـەزەیی منـی دەیکـەم بـە هـەر کەسـێك مەلیم لێ بێت لە بەندەکانم. وە فەرموویەتی بە ئاگر تۆ سزای منی سزات پـێ دەدەم بـە هـەر کەسـێك مەیلم لێ بێت لە بەندەکانم. هەر یەکێك لە ئێوە پـڕ دەکرێـت، بـەڵام ئـاگر پـڕ نابێـت هـەتا خـودا پێـی دەخاتـە نـاوی. ئـاگریش دەڵێـت: بەسمـە بەسمـە. ئـەو کاتـە پـڕ دەبێـتو لـە هـەموو لایەکـەوە دەچێتەوەیەكو خوای گەورە ناهەقی بە کەس ناکات لە دروستکراوەکانی، بەڵام بەهەشت خوای گەورە خـەڵکێکی تـری بـۆ دروسـت دەکـات).[٣] خـوای گـەورە دەفـەرمووێت: ﴿وَأُزْلِفَتِ ٱلْجَنَّةُ لِلْمُتَّقِينَ غَيْرَ بَعِيدٍ﴾ بەهەشتیش لە خۆپارێزان نزیك کراوەتەوەو دوور نییە. قەتادەو ئەبو مالكو سودی دەڵێن: ﴿وَأُزْلِفَتِ﴾ واتە: نزیك خرایەوەو هێنرایە لای خۆپـارێزان.[٤] ﴿غَيْرَ بَعِيدٍ﴾ ئەمـەیش لـە ڕۆژی قیامەتدایـە، دوور نیـەو بێگومان هەر ڕوودەدات چونکە هەر شتێك کە بێت نزیکـە. ﴿هَٰذَا مَا تُوعَدُونَ لِكُلِّ أَوَّابٍ حَفِيظٍ﴾ کە ئەمـە بۆ ئەو کەسانەی بەرەو خودا گەڕانەوەو خۆپارێزبوون، بەڵێن دراوە. واتە: کە ئەمە هـەر ئەوەیـە وا بـە ئێوە بەڵێن دراوە، بۆ هەر تۆبەکارێکە وا سنووری خـوای پاراسـتووە، ﴿هَٰذَا مَا تُوعَدُونَ لِكُلِّ أَوَّابٍ﴾ واتـە: بۆ هەر کەسێك کە گەڕابێتەوەو تەوبەی کردبێت، وازی هێنابێـت لـە گونـاه ﴿حَفِيظٍ﴾ واتـە: خـاوەنی بەڵێنی خۆی بێتو نەیشکێنێتو پەشیمان نەبێتەوە. ﴿مَّنْ خَشِيَ ٱلرَّحْمَٰنَ بِٱلْغَيْبِ وَجَآءَ بِقَلْبٍ مُّنِيبٍ﴾ ئەوانەی کە بە نهێنی لە خوای خۆیان ترساونو بە دڵێکی پاکەوە هاتوونەتە لای. واتە کەسێك لەخواترسـابێت لـە پەنهانیـدا کـە هـیچ کـەس چـاوی لێـی نـەبووە خـوای گـەورە نـەبێت. وەك پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) فەرموویەتی: (پیاوێك کە یادی خـوای گـەورەی کـردووەو ئـاو هاتووەتـەخوار بـە چـاوەکانیدا).[٥] واتـە:

---

[١] مسلم (٤/٢١٧٨/٢١٨٨).

[٢] فتح الباري (٨/٤٦٠).

[٣] فتح الباري (٨/٤٦٠).

[٤] الطبري (٢٢/٣٦٣).

[٥] فتح الباري (٢/١٦٨).

چاوەکانی پڕبووە لە ئاو. ﴿وَجَآءَ بِقَلۡبٍ مُّنِيبٍ﴾ واتە: بە دڵێکی پاکو ساغو ڕێکەوە هاتووەتەوە بۆ لای خودای مەزن لە ڕۆژی قیامەتدا، ﴿ٱدۡخُلُوهَا بِسَلَٰمٖۖ ذَٰلِكَ يَوۡمُ ٱلۡخُلُودِ﴾ هەمووتان بچنە ژوورەوەو بێ ترس بن، ئەمەیە ڕۆژی هەر مانەوە. ﴿ٱدۡخُلُوهَا﴾ هەمووتان بچنە ناو بەهەشت بێ ترس، قەتادە دەڵێت: ترسیان لە سزای خودا نیەو فریشتەکان سەلامیان لێ دەکەن.[1] خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ذَٰلِكَ يَوۡمُ ٱلۡخُلُودِ﴾ واتە: دەمێننەوە لەناو بەهەشتداو هەرگیز نامرنو نیی دەرناچن. وە دەفەرمووێت: ﴿لَهُم مَّا يَشَآءُونَ فِيهَا وَلَدَيۡنَا مَزِيدٞ﴾ هەرچی ئارەزووش بکەن تێیدا هەیە زێدە لەویشمان لا هەیە. ﴿لَهُم مَّا يَشَآءُونَ فِيهَا﴾ هەرچی حەز لێ بکەن لەبەر دەستیاندایەو ئارەزووی بکەن بۆیان ئامادە دەکرێت. ﴿وَلَدَيۡنَا مَزِيدٞ﴾ زیاد لەوەشمان هەیە. وەك ئەم ئایەتە کە دەفەرمووێت: ﴿لِّلَّذِينَ أَحۡسَنُواْ ٱلۡحُسۡنَىٰ وَزِيَادَةٞ﴾[2] واتە: بۆ ئەوانەی چاکە دەکەن چاکەیان لەگەڵ دەکەینو زیاتریش. لە سەحیحی موسلیمدا هاتووە لە سوهەیبی کوڕی سینانی ڕۆمیەوە مەبەست بە ﴿وَزِيَادَةٞ﴾ ڕوانینە بۆ (ڕووی) خوای گەورە[3].

﴿وَكَمۡ أَهۡلَكۡنَا قَبۡلَهُم مِّن قَرۡنٍ هُمۡ أَشَدُّ مِنۡهُم بَطۡشٗا فَنَقَّبُواْ فِي ٱلۡبِلَٰدِ هَلۡ مِن مَّحِيصٍ ﴿٣٦﴾ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَذِكۡرَىٰ لِمَن كَانَ لَهُۥ قَلۡبٌ أَوۡ أَلۡقَى ٱلسَّمۡعَ وَهُوَ شَهِيدٞ ﴿٣٧﴾ وَلَقَدۡ خَلَقۡنَا ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ وَمَا بَيۡنَهُمَا فِي سِتَّةِ أَيَّامٖ وَمَا مَسَّنَا مِن لُّغُوبٖ ﴿٣٨﴾ فَٱصۡبِرۡ عَلَىٰ مَا يَقُولُونَ وَسَبِّحۡ بِحَمۡدِ رَبِّكَ قَبۡلَ طُلُوعِ ٱلشَّمۡسِ وَقَبۡلَ ٱلۡغُرُوبِ ﴿٣٩﴾ وَمِنَ ٱلَّيۡلِ فَسَبِّحۡهُ وَأَدۡبَٰرَ ٱلسُّجُودِ ﴿٤٠﴾﴾

**هەڕەشەکردن لە خوانەناسان بە سزادانو فەرماندان بە پێغەمبەر(ﷺ) بە خۆگری و نوێژکردن**

خوای گەورەدەفەرمووێت: ﴿وَكَمۡ أَهۡلَكۡنَا قَبۡلَهُم مِّن قَرۡنٍ هُمۡ أَشَدُّ مِنۡهُم بَطۡشٗا فَنَقَّبُواْ فِي ٱلۡبِلَٰدِ هَلۡ مِن مَّحِيصٍ﴾ ئێمە گەلێك چینو بەرەمان کە لەپێش ئەواندا بوون قڕ تێخستوون لەمانەش بەهێزتر بوونو زۆر وڵاتیان پشکنیوە، ئاخۆ ئەوان هیچ دەرەتانیان بۆ ڕەخسا؟. واتە: ئێمە زۆرێك لەوانەی کە خوانەناس بوون لە پێش ئەوانەوە بوون، ﴿مِّن قَرۡنٍ هُمۡ أَشَدُّ مِنۡهُم بَطۡشٗا﴾ واتە: لەوان بەهێزترو زیاتر لەوان سەرزەمینیان ئاوەدان کردەوە تێیدا ژیان بۆیە لێرەدا دەفەرمووێت: ﴿فَنَقَّبُواْ فِي ٱلۡبِلَٰدِ هَلۡ مِن

---

[1] الطبري (٢٢/٣٦٦).

[2] يونس (٢٦).

[3] مسلم (١/١٦٣).

مَّحِيصٍ ﴾ ئیبنو عەباس(ڕەزای خوایان لێ بێت) دەڵێت: جێگای خۆیان تیا دیاری کرد.[1] قەتادە دەڵێت: بە زۆر وڵاتدا گەڕاون. واتە: گەڕاون بە وڵاتدا بۆ بژێوی وەدەستهێنان و ئیشوکارو بازرگانی زیاتر لە ئێوە. ﴿هَلۡ مِن مَّحِيصٍ ﴾ واتە: ئاخۆ هیچ دەرەتانێکیان وەدەست هێنا بۆ ئەوەی خۆیان لادەن لە بڕیارو فەرمانی خودا. وە ئایا ئەوەی کۆیان کردبووەوە هیچ بەهرەیەکی پێدان و لە سزای خودا لایدان کاتێك تووشی بوون کاتێك بڕوایان بە پێغەمبەرەکان نەکرد. ئێوەش هیچ پەناو دەرەتان و شوێنێك نیە خۆتانی تیا بپارێزن ئەگەر وەك ئەوان بن. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَذِكۡرَىٰ لِمَن كَانَ لَهُۥ قَلۡبٌ أَوۡ أَلۡقَى ٱلسَّمۡعَ وَهُوَ شَهِيدٌ ﴾ ئەم وتارە بۆ هەر کەسێك دڵ زیندەیە یان باش گوێی لێ دەگرێت و بیریشی هەر لە لای ئەوە، دەبێتە هۆی پەندگرتن و بیرکردنەوە. ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَذِكۡرَىٰ ﴾ ئا ئەمە دەبێتە پەندو ئامۆژگاری، ﴿لِمَن كَانَ لَهُۥ قَلۡبٌ ﴾ بۆ هەر کەسێك دڵی وریایە، موجاهید دەڵێت: خاوەن عەقڵە. ﴿أَوۡ أَلۡقَى ٱلسَّمۡعَ وَهُوَ شَهِيدٌ ﴾ واتە: باش گوێ دەگرێت لەو قسەیەو لێی تێدەگات و بیری لە لایەنی. موجاهید دەڵێت: ﴿أَوۡ أَلۡقَى ٱلسَّمۡعَ ﴾ واتە: باش گوێ دەگرێت و بیر لە هیچ شتێکی تر ناکاتەوە[2]. زەحەاك دەڵێت: عەرەب دەڵێت: فڵانە کەس گوێی هەڵخستووە. کاتێك بە هەردوو گوێی گوێبیست بێت و بە دڵیش ئامادەو ئاگادار بێت.[3] سەوری و زۆر کەسی تریش هەر وایان وتووە[4]. خوای گەورەدەفەرموێت: ﴿ وَلَقَدۡ خَلَقۡنَا ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ وَمَا بَيۡنَهُمَا فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ وَمَا مَسَّنَا مِن لُّغُوبٍ ﴾ ئەم ئاسمانان و زەمینەو هەرچی لەناویاندا هەیە، بە شەش ڕۆژ وەدیمان هێناو هیچ ماندوێتیشمان تووش نەهات. خوای گەورە لەم ئایەتەوە بۆمان ڕوون دەکاتەوە دەری دەخات کە کەسێك ئەم ئاسمانانەو زەمین و هەرچی لە نێوانیاندا هەیە وەدی بهێنێت، ئاسانترە بە لایەوەو چاکتر دەتوانێت مردوویش زیندوو بکاتەوە. قەتادە دەڵێت: جولەکەکان(لەعنەتی خوایان لێ بێت) وتیان: خودا ئاسمانەکان و زەمینی لە شەش ڕۆژدا دروست کردو پاشان لە ڕۆژی حەوتەمدا پشووی دا کە ڕۆژی شەممەیە کە ئەوان ناوی دەبەن بە ڕۆژی پشوودان. خوای گەورەش ئەمەی نارده خوارەوە بە

---

[1] الطبري (٣٧١/٢٢).

[2] الطبري (٣٧٣/٢٢).

[3] الطبري (٣٧٤/٢٢).

[4] الطبري (٣٧٤/٢٢).

درۆی خستنەوە لەسەر ئەو قسەی کە کردبوویان وەك ئەفەرمووێت: ﴿وَمَا مَسَّنَا مِن لُّغُوبٍ﴾[1] واتە: تووشی ناڕەحەتی‌و گرانی‌و ماندووبوون نەهاتین. وەك خوای گەورەلە ئایەتێکی تردا ئەفەرمووێت: ﴿أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّ اللَّهَ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَلَمْ يَعْيَ بِخَلْقِهِنَّ بِقَادِرٍ عَلَىٰ أَن يُحْيِيَ الْمَوْتَىٰ ۚ بَلَىٰ إِنَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾[2] واتە: ئایا ئەوانە نەیانزانیوە بە ڕاستی ئەو خودایەی ئاسمانەکان‌و زەوی دروست کردووەو لە دروستکردنیاندا ناتەوان‌و دەستەپاچە نەبووە بە توانایە مردوانیش زیندووبکاتەوە بەڵێ بێگومان خوا بەسەر هەموو شتێکدا بە توانایە. وە دەفەرمووێت: ﴿لَخَلْقُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ أَكْبَرُ مِنْ خَلْقِ النَّاسِ﴾[3] واتە: بە ڕاستی بەدیهێنانی ئاسمان‌و زەوی گەورەترە لە بەدیهێنانی خەڵکی. وە دەفەرمووێت: ﴿أَأَنتُمْ أَشَدُّ خَلْقًا أَمِ السَّمَاءُ ۚ بَنَاهَا﴾[4] واتە: ئایا دروستکردنی ئێوە گرانترە یان ئاسمان؟ دروستی کرد. خوای گەورەدەفەرمووێت: ﴿فَاصْبِرْ عَلَىٰ مَا يَقُولُونَ وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ قَبْلَ طُلُوعِ الشَّمْسِ وَقَبْلَ الْغُرُوبِ﴾ سا خۆگر بە بەرانبەر ئەو شتانەی ئەوان دەیڵێن هەر پەسنی‌و پاکی پەروەردگاری خۆت بدە، لە پێش گزنگی هەتاوداو بە لە دەمی ڕۆژئاوابوون. ﴿فَاصْبِرْ عَلَىٰ مَا يَقُولُونَ﴾ واتە: خۆت بگرە لەسەر ئەو قسەو بەرخوردەی خوانەناسان دەیکەن لەگەڵت. خۆت لادە لێیان بە لادانێکی جوان‌و پەسەند. ﴿وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ قَبْلَ طُلُوعِ الشَّمْسِ وَقَبْلَ الْغُرُوبِ﴾ واتە: هەر پەسەنی‌و پاکی پەروەردگاری خۆت بدە لە پێش دەرکەوتنی خۆرو بەر لە وەختی خۆرئاوابوون. نوێژە فەرزەکان بەر لە شەوڕەویەکەی پێغەمبەر(ﷺ) دوو ڕکات پێش خۆرکەوتن بووە لە بەرەبەیانداو دوو ڕکات لە پێش خۆرئاوابووندا بووە لە کاتی عەسرداو شەونوێژ فەرزبووە لەسەر پێغەمبەر(ﷺ)و ئومەتەکەی هەتا ساڵێك پاشان لەسەر ئومەتەکەی لاچووەو نەماوە. پاشان دوای ئەوە ئەوانە هەموو لاچووەو نەسخ بووەتەوە. لە شەوڕەوییەکەیدا بووە بەم پێنج فەرزە بەڵام نوێژی بەیانی‌و نوێژی عەسر لە شوێن خۆیاندا ماونەتەوە لە پێش گزنگی هەتاوداو لە پێش ڕۆژئاوابووندا. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە جەریری کوڕی عەبدوڵلاوە (ڕەزای خوایان لێ بێت) دەڵێت: لە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ)دا دانیشتبووین سەیری مانگی کرد کە مانگی چواردە بوو فەرمووی: (ئەوسا ئێوە نیشانی خوای گەورە

---

[1] الطبري (٣٧٦/٢٢).

[2] الاحقاف (٣٣).

[3] غافر (٥٧).

[4] النازعات (٢٧).

دەدرێن چاوتان پێی دەکەوێتو دەیبینن وەك چۆن چاوتان بە مانگی چواردە دەکەوێت، ناڕەحەت نابن لە بینینیداو بێگومانن، ئەگەر توانیتانو گەرەکتان بوو شەیتان زاڵ نەبێت بەسەرتاندا واز لە نوێژی بەیانیو نوێژی عەسر مەهێننو دوای مەخەن). پاشان ئەم ئایەتەی خوێند: ﴿وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ قَبْلَ طُلُوعِ الشَّمْسِ وَقَبْلَ الْغُرُوبِ﴾.[1] بوخاریو موسلیمیش ڕیوایەتیان کردووە. خاوەنی سوننەکانی تریش ڕیوایەتیان کردووە لە فەرموودەکەی ئیسماعیلەوە هەر بەم شێوەیە.[2] خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَمِنَ اللَّيْلِ فَسَبِّحْهُ وَأَدْبَارَ السُّجُودِ﴾ لە شەویشدا هەرپەسنیو پاکی ئەو بدەو دوای هەموو سوژدەبردنیش. ﴿وَمِنَ اللَّيْلِ فَسَبِّحْهُ﴾ واتە: لە شەودا نوێژ بکە بۆ خودا. وەك ئەم ئایەتە دەفەرمووێت: ﴿وَمِنَ اللَّيْلِ فَتَهَجَّدْ بِهِ نَافِلَةً لَكَ عَسَى أَنْ يَبْعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامًا مَحْمُودًا﴾[3] واتە: وە (ئەی موحەممەد(ﷺ)) لە بەشێکی شەودا هەستە شەونوێژ بکە بە قورئان خوێندن تێیدا ئەوە زیادە نوێژی تایبەت بە تۆیە ئومێد وایە پەروەردگارت بتگەیەنێتە پلەو جێگایەکی پەسەندکراو. وە دەفەرمووێت: ﴿وَأَدْبَارَ السُّجُودِ﴾ واتە: ئیبنو ئەبی نەجیح دەڵێت: لە موجاهیدەوە لە ئیبنو عەبباسەوە(ڕەزای خوایان لێ بێت) ئەڵێن: واتە: تەسبیحات کردن لە دوای نوێژ.[4] ئەو فەرموودەیەی کە لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە پشتگیری ئەم فەرموودەیە دەکەن کە ئەبو هورەیرە ڕیوایەتی کردووە(ڕەزای خوای لێ بێت) کە دەڵێت: هەژارە کۆچەریەکان هاتن بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) خاوەن ماڵو سامانەکان چەند پلەی بەرزو بەهەشتی هەتاهەتاییان بەدەست هێناوە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (کامەیە ئەوە؟) وتیان: وەك ئێمە نوێژ دەکەنو وەك ئێمە ڕۆژوو دەگرنو خێروخێرات دەکەنو ماڵ دەبەخشن ئێمە نایکەین. بەندە ئازاد دەکەن ئێمە ئازادی ناکەین، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (ئایا شتێکتان پێ بڵێم ئەگەر کردتان پێش ئەوانەی دوای خۆتان بکەونو هیچ کەسیش لە ئێوە چاکتر نەبێت مەگەر کەسێك ئەو شتە بکات کە ئێوە دەیکەن؟ سبحان الله والحمد لله والله أكبر بکەن لەپاش هەموو نوێژێك سیو سێ (٣٣) جار). دەڵێت: وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) برا خاوەن ماڵەکان گوێیان لێ بوو (بیستیان) کە ئێمە چیمان کردووە ئەوانیش وەك ئێمەیان کرد، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: (ئەوە

---

[1] احمد (٣٦٥/٤)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[2] فتح الباري (٤٦٢/٨)، مسلم (٤٣٩/١)، ابو داود (٩٧/٥)، تحفة الاحوذي (٢٦٥/٧)، النسائي (٤٦٩/٦)، ابن ماجه (٦٣/١).

[3] الاسراء (٧٩).

[4] الطبري (٣٨١/٢٢).

ڕزی خودایە دەیدات بە هەر کەسێك مەیلی لێ بێت).[1] ڕای دووەم مەبەست بەم ئایەتە ﴿وَأَدْبَـٰرَ ٱلسُّجُودِ﴾ دوو ڕکاتی دوای مەغریبە ئەمە ڕیوایەت کراوە لە عومەرو عەلیو حەسەنی کوڕی ئیبنو عەباسو ئەبو هورەیرەو ئەبو ئومامەوە (ڕەزای خوایان لێ بێت) وە موجاهیدو عیکریمەو شەعبیو نەخەعیو حەسەنو قەتادەو کەسانی تریش هەر وایان وتووە.

﴿وَٱسۡتَمِعۡ يَوۡمَ يُنَادِ ٱلۡمُنَادِ مِن مَّكَانٖ قَرِيبٖ ﴿٤١﴾ يَوۡمَ يَسۡمَعُونَ ٱلصَّيۡحَةَ بِٱلۡحَقِّۚ ذَٰلِكَ يَوۡمُ ٱلۡخُرُوجِ ﴿٤٢﴾ إِنَّا نَحۡنُ نُحۡيِۦ وَنُمِيتُ وَإِلَيۡنَا ٱلۡمَصِيرُ ﴿٤٣﴾ يَوۡمَ تَشَقَّقُ ٱلۡأَرۡضُ عَنۡهُمۡ سِرَاعٗاۚ ذَٰلِكَ حَشۡرٌ عَلَيۡنَا يَسِيرٞ ﴿٤٤﴾ نَّحۡنُ أَعۡلَمُ بِمَا يَقُولُونَۖ وَمَآ أَنتَ عَلَيۡهِم بِجَبَّارٖۖ فَذَكِّرۡ بِٱلۡقُرۡءَانِ مَن يَخَافُ وَعِيدِ ﴿٤٥﴾﴾

## وەبیرهێنانەوەی هەندێ شت کە لە ڕۆژی قیامەتدا ڕوودەدات

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَٱسۡتَمِعۡ يَوۡمَ يُنَادِ ٱلۡمُنَادِ مِن مَّكَانٖ قَرِيبٖ﴾ هەر دەمێکیش بانگ ڕاهێڵێك لە جێگەیەکی نزیکدا بانگ دەکات گوێی بۆ بگرە. ﴿وَٱسۡتَمِعۡ﴾ واتە: ئەی موحەممەد (ﷺ) گوێی بۆ بگرە، ﴿يَوۡمَ يُنَادِ ٱلۡمُنَادِ مِن مَّكَانٖ قَرِيبٖ﴾ واتە: کاتێك کە بانگکەرێك لە جێگایەکی نزیکەوە بانگی کرد بۆ کۆبوونەوە بۆ دادوەری خەڵکیو فەرمان دان بۆ جیابوونەوەیان، ﴿يَوۡمَ يَسۡمَعُونَ ٱلصَّيۡحَةَ بِٱلۡحَقِّۚ ذَٰلِكَ يَوۡمُ ٱلۡخُرُوجِ﴾ لەو ڕۆژەدا کە نەعرەتە ڕاستەکەیان گوێ لێ دەبێت، ئەمە ڕۆژی دەرکەوتنە. واتە لەو ڕۆژەدا کە فوو دەکرێت بە کەڵەشاخدا کە بە ڕاستی دێت کە زۆریان بە گومانن لە هاتنی. ﴿ذَٰلِكَ يَوۡمُ ٱلۡخُرُوجِ﴾ ئەمە ڕۆژی هاتنە دەرەوەیە لە گۆڕ. ﴿إِنَّا نَحۡنُ نُحۡيِۦ وَنُمِيتُ وَإِلَيۡنَا ٱلۡمَصِيرُ﴾ ئێمە خۆمان ژیان دەبەخشینو دەمرێنین، وە گەڕانەوەش بۆ لای ئێمەیە. واتە: هەر خودایە خەڵکی وەدی هێناوەو پاش مردنیش زیندوویان دەکاتەوە. لای خودا ئاسانترەو گەڕانەوەی هەموو خەڵکیش هەر بۆ لای ئەوە. هەمووی پاداشتی خۆی وەردەگرێت چاکە بە چاکەو خراپەش بە سزادان. خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿يَوۡمَ تَشَقَّقُ ٱلۡأَرۡضُ عَنۡهُمۡ سِرَاعٗاۚ ذَٰلِكَ حَشۡرٌ عَلَيۡنَا يَسِيرٞ﴾ ئەو ڕۆژەی کە زەمین دەقەڵەشێتەوەو بە پەلە دەریاندەهاوێژێت، ئەم کۆبوونەوەیە لامان شتێکی ئاسانە. بۆیە خوای مەزن بارانێك لە ئاسمانەوە دەبارێنێت لاشەی هەموو خەڵکی زیندوو (سەوز) دەبێتەوە لەناو گۆڕەکانیاندا. وەك چۆن دانە سەوز دەبێتەوە لەناو خۆڵدا بە ئاو. کاتێك لاشەکان تەواو وەك خۆیان لێ هاتەوە خوای گەورە فەرمان دەدا بە ئیسرافیل فوو دەکات بە کەڵەشاخدا گیانەکان وان لەناو کونێکی کەڵەشاخدا. کاتێك ئیسرافیل فووی

---

[1] فتح الباري (٢/٣٧٨).

پیا کرد هەموو گیانەکان دێنە دەرو لەنێوان ئاسمانەکانو زەمیندا دەدرەوشێنەوە. خوای گەورە دەفەرمووێت: بە گەورەیی‌و مەزنیم (بعزتي وجلالي) دەبێت هەموو گیانەکان بگەڕێنەوە بۆ ئەو لاشەی کاتی خۆی تێیدا بووە، هەموو گیانەکان دەچنەوە ناو لاشەکانی خۆیان. دەچنەوە ناوی وەك چۆن زەهری مار دەگەڕێت بەناو لەشی مارگەستەدا زەوی درز دەبێت بۆیان هەڵدەسنەوە بۆ لێپرسینەوە بە پەلەو بە گورجی دەچن بۆ بەجێهێنانی فەرمانی خوای هێژا. وەك خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿مُّهْطِعِينَ إِلَى ٱلدَّاعِ يَقُولُ ٱلْكَـٰفِرُونَ هَـٰذَا يَوْمٌ عَسِرٌ﴾[1] واتە: خێرا دوای جاڕدەرەکە دەکەون بێباوەڕان دەڵێن ئەمڕۆ ڕۆژێکی زۆر دژوارو سەختە. وە دەفەرمووێت: ﴿يَوْمَ يَدْعُوكُمْ فَتَسْتَجِيبُونَ بِحَمْدِهِۦ وَتَظُنُّونَ إِن لَّبِثْتُمْ إِلَّا قَلِيلًا﴾[2] واتە: ئەو ڕۆژەی کە بانگتان دەکەن (لە گۆڕەکانتانەوە) جا ئێوەش دەستبەجێ دێن بە دەم بانگکردنەکەوە بە سوپاسو سەناکردنەوەو وا دەزانن نەماونەتەوە (لە دنیادا) ماوەیەکی کەم نەبێت. وە لە سەحیحی موسلیمدا هاتووە لە ئەنەسەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەفەرمووێت: (من یەکەم کەسم کە زەویم بۆ لەت دەبێت).[3] وە دەفەرمووێت: ﴿ذَٰلِكَ حَشْرٌ عَلَيْنَا يَسِيرٌ﴾ واتە: ئەمە زیندووکردنەوەیەکی سوکو ئاسانە لای ئێمە. وەك خودای گەورە لەئایەتێکی تردا دەفەرمووێت: ﴿وَمَآ أَمْرُنَآ إِلَّا وَٰحِدَةٌ كَلَمْحٍۭ بِٱلْبَصَرِ﴾[4] واتە: وە فەرمانی ئێمە تەنها یەك جارە وەك چاوترووکاندنێك. وە دەفەرمووێت: ﴿مَّا خَلْقُكُمْ وَلَا بَعْثُكُمْ إِلَّا كَنَفْسٍ وَٰحِدَةٍ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌۢ بَصِيرٌ﴾[5] واتە: دروستکردنی هەمووتان (لە سەرەتاوە)و زیندووکردنەوەتان وەك دروستکردنەو زیندووکردنەوەی تەنها کەسێك وایە بە ڕاستی خوا بیسەری بینایە.

**دڵدانەوەی پێغەمبەر(ﷺ)**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿نَّحْنُ أَعْلَمُ بِمَا يَقُولُونَ ۖ وَمَآ أَنتَ عَلَيْهِم بِجَبَّارٍ ۖ فَذَكِّرْ بِٱلْقُرْءَانِ مَن يَخَافُ وَعِيدِ﴾ ئێمە باشتر دەزانین ئەوان چی دەڵێن، تۆ زۆردارێك نیت لەسەریان هەر کەسێك لە هەڕەشە ترسی هەیە، بەم قورئانە تۆ وەبیری بخەرەوە. ﴿نَّحْنُ أَعْلَمُ بِمَا يَقُولُونَ﴾ واتە: زانیاری ئێمە ئەوەندە زۆرە

---

[1] القمر (٨).
[2] الاسراء (٥٢).
[3] مسلم (٤/١٧٨٢).
[4] القمر (٥٠).
[5] لقمان (٢٨).

ئاگاداری ئەو قسانەین کە بتپەرستان دەیکەنو بڕوا ناکەن. ئەوە دڵگرانیو مەترسیت بۆ دروست نەکات. وەك ئەم ئایەتانەدا خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿وَلَقَدْ نَعْلَمُ أَنَّكَ يَضِيقُ صَدْرُكَ بِمَا يَقُولُونَ ﴿٩٧﴾ فَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ وَكُن مِّنَ السَّاجِدِينَ ﴿٩٨﴾ وَاعْبُدْ رَبَّكَ حَتَّىٰ يَأْتِيَكَ الْيَقِينُ﴾[1] واتە: سوێند بە خوا بێگومان ئێمە دەزانین کە بە ڕاستی تۆ دڵتەنگ دەبیت بەوەی ئەوانە دەیڵێن، کەواتە پەروەردگارت بە پاکی ڕابگرەو سوپاسی بکەو لە سوژدەبەران بە، وە پەروەردگارت بپەرستە هەتا مردن یەخەت پێ دەگرێت. وە دەفەرموویت: ﴿وَمَا أَنتَ عَلَيْهِم بِجَبَّارٍ﴾ واتە: تۆ زۆردار نیت بەسەریانەوە هەتا بە زۆر ڕێیان نیشان بدەی. بۆ ئەوەیش ڕانەسپێردراوی. پاشان دەفەرموویت: ﴿فَذَكِّرْ بِالْقُرْآنِ مَن يَخَافُ وَعِيدِ﴾ واتە: دەسا تۆ پەیامی پەروەردگاری خۆت ڕابگەیەنە، چونکە ئەوانەی کە لە هەڕەشەی خودا دەترسنو بە تەمای بەزەیی ئەون پەندو ئامۆژگاری وەردەگرن. وەك ئەم ئایەتە کە دەفەرموویت: ﴿فَإِنَّمَا عَلَيْكَ الْبَلَاغُ وَعَلَيْنَا الْحِسَابُ﴾[2] واتە: بێگومان تۆ هەر ڕاگەیاندنت لەسەرەو لێپرسینەوەش لەسەر ئێمەیە. وە دەفەرموویت: ﴿فَذَكِّرْ إِنَّمَا أَنتَ مُذَكِّرٌ ﴿٢١﴾ لَّسْتَ عَلَيْهِم بِمُصَيْطِرٍ﴾[3] واتە: کەواتە ئامۆژگاری بکە تۆ هەر ئامۆژگاریت، تۆ دەسەڵاتدار نیت بەسەریاندا. وە دەفەرموویت: ﴿لَّيْسَ عَلَيْكَ هُدَاهُمْ وَلَٰكِنَّ اللَّهَ يَهْدِي مَن يَشَاءُ﴾[4] واتە: لەسەر تۆ نیە ئەی موحەممەد(ﷺ) ڕێنموونی و موسڵمانکردنی خەڵکی بەڵکو خوا هەر کەسێکی بوێ هیدایەتی دەدات. وە دەفەرموویت: ﴿إِنَّكَ لَا تَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ وَلَٰكِنَّ اللَّهَ يَهْدِي مَن يَشَاءُ﴾[5] واتە: بە ڕاستی تۆ ناتوانی ئەو کەسەی خۆشت بوێت ڕێنموونی بکەیت بەڵام خوا هەرکەسی بوێت هیدایەتی دەدات. بۆیە لێرەدا خوای گەورە ئەفەرموویت: ﴿وَمَا أَنتَ عَلَيْهِم بِجَبَّارٍ ۖ فَذَكِّرْ بِالْقُرْآنِ مَن يَخَافُ وَعِيدِ﴾ قەتادەئەڵێت: خودایە وەك ئەو کەسانەمان لێ بکەی لە هەڕەشەکانت دەترسنو بە تەمای ئەو ڕۆژەی تۆن کە ڕۆژی قیامەتە ئەی خاوەن چاکەی دلۆڤان[6].

[1] الحجر (٩٧ـ٩٩).

[2] الرعد (٤٠).

[3] الغاشية (٢١ـ٢٢).

[4] البقرة (٢٧٢).

[5] القصص (٥٦).

[6] القرطبي (٢٩/١٧).

## تەفسیری سورەتی (الذاريات)

## لە مەککەدا هاتووەتە خوارەوە

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

﴿وَالذَّارِيَاتِ ذَرْوًا ﴿١﴾ فَالْحَامِلَاتِ وِقْرًا ﴿٢﴾ فَالْجَارِيَاتِ يُسْرًا ﴿٣﴾ فَالْمُقَسِّمَاتِ أَمْرًا ﴿٤﴾ إِنَّمَا تُوعَدُونَ لَصَادِقٌ ﴿٥﴾ وَإِنَّ الدِّينَ لَوَاقِعٌ ﴿٦﴾ وَالسَّمَاءِ ذَاتِ الْحُبُكِ ﴿٧﴾ إِنَّكُمْ لَفِي قَوْلٍ مُخْتَلِفٍ ﴿٨﴾ يُؤْفَكُ عَنْهُ مَنْ أُفِكَ ﴿٩﴾ قُتِلَ الْخَرَّاصُونَ ﴿١٠﴾ الَّذِينَ هُمْ فِي غَمْرَةٍ سَاهُونَ ﴿١١﴾ يَسْأَلُونَ أَيَّانَ يَوْمُ الدِّينِ ﴿١٢﴾ يَوْمَ هُمْ عَلَى النَّارِ يُفْتَنُونَ ﴿١٣﴾ ذُوقُوا فِتْنَتَكُمْ هَٰذَا الَّذِي كُنْتُمْ بِهِ تَسْتَعْجِلُونَ ﴿١٤﴾﴾

### تەئکیدکردن لەسەر ڕاستی ڕۆژی قیامەت و لێپرسینەوە تێیدا

خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿وَالذَّارِيَاتِ ذَرْوًا﴾ بەو بایانەی دەتوانن بڵاویکەنـەوە. ﴿فَالْحَامِلَاتِ وِقْرًا﴾ بـەو هەورانـەی گرانبـارن. ﴿فَالْجَارِيَاتِ يُسْرًا﴾ بەوانـەی کـە بـە ئاسمـان ڕێ دەپێـون. ﴿فَالْمُقَسِّمَاتِ أَمْرًا﴾ بەوانەی کار دابـەش دەکـەن. ﴿إِنَّمَا تُوعَدُونَ لَصَادِقٌ﴾ هـەر بـەڵێنێك کـە پێتـان دەدەن ڕاسـتە. ﴿وَإِنَّ الدِّينَ لَوَاقِعٌ﴾ ڕۆژی جەزا هـەر ڕوودەدات. لـە گـەورەی موسـڵمانانەوە عـەلی کوڕی ئـەبو تالـب (ڕەزای خـوای لێبێت) کە ڕۆژێك ڕۆیشتنە سەر دوانگەی کوفەو وتی: هیچ پرسیارێکم لێ ناکەن لە ئایەتێك لە قورئانداو لە فەرموودەیەك لە پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) بێگومان وەڵامتان دەدەمەوەو پێتان دەڵێم. لەو کاتـەدا ئیبنولکواء هەڵساو وتی: ئەی گـەورەی موسـڵمانان ﴿وَالذَّارِيَاتِ ذَرْوًا﴾ واتـا چـی؟ عـەلی (ڕەزای خـوای لێبێت) وتی: واتە: با، وتـی: ﴿فَالْحَامِلَاتِ وِقْرًا﴾ عـەلی (ڕەزای خـوای لێبێـت) وتـی: واتـە: هـەور. وتـی: ﴿فَالْجَارِيَاتِ يُسْرًا﴾ واتـە: کەشـتیەکان. وتـی: ﴿فَالْمُقَسِّمَاتِ أَمْرًا﴾ عـەلی (ڕەزای خـوای لێبێـت) وتـی: فریشتەکان.[1] هەندێ لە زانایانی تەفسیر وتوویانە: ﴿فَالْجَارِيَاتِ يُسْرًا﴾ واتە: ئەو ئەستێرانەی بە ئاسـانی ڕێ دەکەن لە خولگەی خۆیاندا. ئەمەش چەند پلەیەکە لە خوارەوە بۆ سـەرەوەو لـە سـەرەوە بـەرەو ژوورتر. وەك با کە هـەور لـە سـەریەوەیە و ئەستێرەش لـە سـەری هەورەوەیـە. ﴿فَالْمُقَسِّمَاتِ أَمْرًا﴾ کـە فریشتەکانە لە ژوور ئەمانەوەیە بە فەرمانی خودا دادەبەزن بۆ ئەو کارانەی کە پێیان دەسپێردرێت لـە گەیاندنی پەیامی شەرعی یان کاروباری بوونەوەر. وە ئەمە سوێندێکە لە لایەن خوای گـەورەوە لەسـەر

---

[1] الطبري (٢٢/٣٨٩/٣٩٢)، عبدالرزاق (٣/٢٤١).

هاتنی قیامەتو زیندووبوونەوەو لێپرسینەوە. بۆیە خوای مەزن فەرموویەتی: ﴿إِنَّمَا تُوعَدُونَ لَصَادِقٌ﴾ واتە: بە تەئکید هەواڵێکی ڕاستو دروستە. ﴿وَإِنَّ الدِّينَ﴾ ڕۆژی جەزا ﴿لَوَاقِعٌ﴾ هەر ڕوودەداتو گومانی تێدا نیە. پاشان خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَالسَّمَاءِ ذَاتِ الْحُبُكِ﴾ بەو ئاسمانەی ڕێ ڕێیە(شەپۆل دەدات). ئیبنو عەباس دەڵێت: واتە: خاوەنی جوانیو ڕازاوەییو درەوشاوەییو ڕێکو پێکیە.[1] موجاهیدو عیکریمەو سەعیدی کوڕی جوبەیرو ئەبو مالکو ئەبو سالحو سودیو قەتادەو عەتیەی عەوفیو ڕەبیعی کوڕی ئەنەسو کەسانی تریش وایان وتووە.[2] زەححاکو مەنهالی کوڕی عەمرو کەسی تریش وتوویانە: وەك كۆبوونەوەی ئاوو لمو كشتوكاڵو گیاو وەختێك با لێی دەدات دەیاندات بەسەر یەكدا ڕێ ڕێیان دەكاتو شەپۆل دەدەن ئەوە پێی دەڵێن: ﴿الْحُبُكِ﴾ ئەم هەموو ڕاوبۆچوونە دەگەڕێتەوە بۆ یەك شت كە بریتیە لە جوانیو ڕازاوەیی. ئەوەندە جوانو بەرزو ناسكو ڕێكوپێكو تونوتۆڵو چواردەور فراوانەو ڕازاوەتەوە بە ئەستێرەی وەستاوو گەڕۆكو كە لەگەڵ مانگو خۆرو ئەستێرەكانی تردا لەناو یەكدا دێنو دەچن.

## جیاوازی قسەو یەك نەگرتنەوەی قسەی بتپەرستان

خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿إِنَّكُمْ لَفِي قَوْلٍ مُخْتَلِفٍ﴾ قسەتان یەكتر ناگرێتەوە. واتە: ئەی بتپەرستان ئێوە باوەڕ ناكەن بە پێغەمبەران (سەلامی خوایان لێبێت) لەناو خۆتاندا هەریەكەو قسەیەك دەكاتو قسەتان یەك ناگرێت. قەتادە دەڵێت: ئێوە قسەتان یەك نیە یان ئەمەیە: باوەڕتان بە قورئان ببێت یان باوەڕتان پێی نەبێت.[3] ﴿يُؤْفَكُ عَنْهُ مَنْ أُفِكَ﴾ لە قورئان دەتەكێنەوە هەركێ تەكێنراوەتەوە. واتە: كەسێك دەتەكێتەوە لە قورئان كە خۆی گومڕاو سەرلێشێواو بووە. چونكە قسەیەكی پڕوپووچ شوێنی كەوتووە بەهۆی ئەو قسەوە سەری لێ تێك چووەو كەسێك لە قورئان لادەدات كە خۆی لادەرو لەوپەڕی نەفامیو سەرلێ شێواویدا چووبێتە خوارەوە لە هیچ تێنەگات. وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَإِنَّكُمْ وَمَا تَعْبُدُونَ ﴿١٦١﴾ مَا أَنْتُمْ عَلَيْهِ بِفَاتِنِينَ ﴿١٦٢﴾ إِلَّا مَنْ هُوَ صَالِ الْجَحِيمِ﴾[4] واتە: ئینجا بە ڕاستی ئێوە ئەو (بتانە)یش كە دەیپەرستن، ئێوە ناتوانن لە بەرامبەری خوادا گومڕاكەری (كەس) بن، بێجگە ئەو كەسەی (خوا دەزانێت) دەچێتە دۆزەخەوە. ئیبنو عەباسو سودی دەڵێن: كەسێك لە قورئان لادەدات

---

[1] الطبري (٢٢/٣٩٥/٣٩٦).

[2] الطبري (٢٢/٣٩٦/٣٩٧).

[3] عبدالرزاق (٤/٢٤٢).

[4] الصافات (١٦١_١٦٣).

کە سەری لێ تێك چووبێت. ﴿قُتِلَ ٱلْخَرَّٰصُونَ﴾ دەك بە کوشت بچن ئەو کەسانەی درۆ نەخشێنن. موجاهید دەڵێت: درۆزنەکان. ئەمە وەك نموونەی ئەو ئایەتەی عەبەسە وایە کە دەفەرمووێت: ﴿قُتِلَ ٱلْإِنسَٰنُ مَآ أَكْفَرَهُۥ﴾[1] واتە: بە کوشت بچێت (خراپترین نەفرینی لێبێت) ئادەمی چەند نەزانە. درۆزنەکان ئەوانەن کە دەڵێن: زیندوو نابینەوەو باوەڕیان پێی نیە.[2] عەلی کوڕی ئەبو تەلحە دەڵێت: لە ئیبنو عەباسەوە (ڕەزای خوای لێبێت) ﴿قُتِلَ ٱلْخَرَّٰصُونَ﴾ واتە: نەفرین کراوە لە بەدگومانان.[3] وە هەروەها مەعاز (ڕەزای خوای لێبێت) لە وتاریدا دەیوت: بەدگومانان لەناوچوون. قەتادە دەڵێت: درۆزنان ئەوانەی خەڵەتاوو بەدگومانن.[4] خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ٱلَّذِينَ هُمْ فِى غَمْرَةٍ سَاهُونَ﴾ ئەوانەی کەوتوونەتە گێژاوی نەزانیو ئاگایان لە هیچێك نیە. ئیبنو عەباسو کەسانی تریش وتوویانە: لە خوانەناسیو بەدگومانیدا ئاگایان لە خۆیان نیەو مەستن.[5] ﴿يَسْـَٔلُونَ أَيَّانَ يَوْمُ ٱلدِّينِ﴾ پرس دەکەن کەی ڕۆژی جەزا دێت. ئەمەی کە دەیڵێن باوەڕ پێ نەکردنو دژایەتی کردنو گومانو بە دوور زانینی ئەو ڕۆژەیە. خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿يَوْمَ هُمْ عَلَى ٱلنَّارِ يُفْتَنُونَ﴾ ئەو ڕۆژەی کە دەیانخەنە سەر ئاگر. ئیبنو عەباسو موجاهیدو حەسەنو کەسانی تریش وتوویانە: ﴿يُفْتَنُونَ﴾ واتە: سزا دەدرێن.[6] موجاهید دەڵێت: دەخرێنە ناو ئاگر وەك چۆن ئاڵتوون دەخرێتە سەر ئاگر بۆ پاككردنەوە.[7] کۆمەڵێکی تر وەك موجاهید دیسانو عیکریمەو ئیبراهیمی نەخەعیو زەیدی کوڕی ئەسلەمو سوفیانی سەوریو (الثوري) وتوویانە: ﴿يُفْتَنُونَ﴾ دەسوتێنرێن. ﴿ذُوقُوا۟ فِتْنَتَكُمْ هَٰذَا ٱلَّذِى كُنتُم بِهِۦ تَسْتَعْجِلُونَ﴾ بچێژن ئەو ئازارەتان کە ئێوە بۆی بە پەلە بوون. موجاهید دەڵێت: ﴿ذُوقُوا۟ فِتْنَتَكُمْ﴾ ئەو سوتاندنەتان بچێژن.[8] کەسانی تر

---

[1] عبس (١٧).
[2] الطبري (٢٢/٤٠٠).
[3] الطبري (٢٢/٣٩٩).
[4] الطبري (٢٢/٤٠٠).
[5] الطبري (٢٢/٤٠٠/٤٠١).
[6] الطبري (٢٢/٤٠٢).
[7] الطبري (٢٢/٤٠٢).
[8] الطبري (٢٢/٤٠٣).

بێجگە لە ئەو وتوویانە: سزاکەتان بچێژن. ﴿هَٰذَا ٱلَّذِى كُنتُم بِهِۦ تَسْتَعْجِلُونَ﴾ واتە: پێیان دەوترێت: بۆ زیاتر داخ و خەفەت پێدان و ڕسواکردن و بە سوك سەیرکردنیان، والله أعلم.

﴿إِنَّ ٱلْمُتَّقِينَ فِى جَنَّٰتٍ وَعُيُونٍ ﴿١٥﴾ ءَاخِذِينَ مَآ ءَاتَىٰهُمْ رَبُّهُمْ ۚ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ قَبْلَ ذَٰلِكَ مُحْسِنِينَ ﴿١٦﴾ كَانُوا۟ قَلِيلًا مِّنَ ٱلَّيْلِ مَا يَهْجَعُونَ ﴿١٧﴾ وَبِٱلْأَسْحَارِ هُمْ يَسْتَغْفِرُونَ ﴿١٨﴾ وَفِىٓ أَمْوَٰلِهِمْ حَقٌّ لِّلسَّآئِلِ وَٱلْمَحْرُومِ ﴿١٩﴾ وَفِى ٱلْأَرْضِ ءَايَٰتٌ لِّلْمُوقِنِينَ ﴿٢٠﴾ وَفِىٓ أَنفُسِكُمْ ۚ أَفَلَا تُبْصِرُونَ ﴿٢١﴾ وَفِى ٱلسَّمَآءِ رِزْقُكُمْ وَمَا تُوعَدُونَ ﴿٢٢﴾ فَوَرَبِّ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ إِنَّهُۥ لَحَقٌّ مِّثْلَ مَآ أَنَّكُمْ تَنطِقُونَ ﴿٢٣﴾﴾

## پاداشتی لەخواترسان و خوڕەوشتیان

خوای مەزن فەرموویەتی: ﴿إِنَّ ٱلْمُتَّقِينَ فِى جَنَّٰتٍ وَعُيُونٍ﴾ ئەو کەسانەی خۆپارێزن، شوێنیان باغات و کانیاون. خوای مەزن باسی خۆپارێزان دەکات ئەوانەی لەبەر ڕەزامەندی خوا خۆدەپارێزن لە ڕۆژی زیندووبوونەوەیاندا لەناو باغات و کانیاودان بە پێچەوانەی ئەو بەدبەختانەی کە تێیدان لە سزاو ئازارو ئەشکەنجە و زنجیری ئاگرین لە ملداو سوتاندن. وە دەفەرموێت: ﴿ءَاخِذِينَ مَآ ءَاتَىٰهُمْ رَبُّهُمْ ۚ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ قَبْلَ ذَٰلِكَ مُحْسِنِينَ﴾ هەرچی پەروەردگاری ئەوان بۆی داناون، وەری دەگرن، ئەوان لە پێشوو ئاکار چاك بوون. ﴿ءَاخِذِينَ﴾ حاڵە لە وتەی: ﴿جَنَّٰتٍ وَعُيُونٍ﴾ واتە لە خواترسان ژیانیان لەناو باغات و کانیاودایە. ئەوەی خودا پێی داون وەری دەگرن لە خۆشگوزەرانی و ڕابواردن و ﴿إِنَّهُمْ كَانُوا۟ قَبْلَ ذَٰلِكَ﴾ لە ژیانی دنیادا ﴿مُحْسِنِينَ﴾ وەك ئەم فەرموودەی خوای گەورە وایە کە دەفەرموێت: ﴿كُلُوا۟ وَٱشْرَبُوا۟ هَنِيٓـًٔۢا بِمَآ أَسْلَفْتُمْ فِى ٱلْأَيَّامِ ٱلْخَالِيَةِ﴾[1] واتە: (پێیان دەوترێت) بخۆن و بخۆنەوە و نۆشتان بێت بە هۆی ئەو چاکانەوە کە لە ڕۆژانی ڕابردوودا کردووتانە. پاشان خوای مەزن باسی ئاکارە چاکەکانیان دەکات و فەرموویەتی: ﴿كَانُوا۟ قَلِيلًا مِّنَ ٱلَّيْلِ مَا يَهْجَعُونَ﴾ شەوانە کەمتر دەخەوتن. زانایانی تەفسیر دوو بۆچوونی جیاوازیان هەیە لەو بارەیەوە. یەکەم: بە لایەوە ئەو مایە (مَا) مای نافیەیە واتە: کەمێك لە شەو ناخەون. ئیبنو عەباس دەڵێت: هیچ شەوێك تێناپەڕێت و ناڕوات مەگین هەڵدەسن بۆ خواپەرستی تێیدا با کەمێکیش بێت[2] قەتادە دەڵێت: لە میترەفی کوڕی عەبدوڵڵاوە کەم شەو هەیە کە دێت مەگین نوێژی

---

[1] الحاقة (٢٤).

[2] الطبري (٢٢/٤٠٧).

تێدا دەكەن بۆ خوای گەورە. یان لە ئەوەڵی شەوەوە یان لە نیوە شەودا.[1] موجاهید دەڵێت: كەم شەو هەیە كە دەخەون هەتا بەیانی هەڵنەسن بۆ شەونوێژ تێیدا.[2] قەتادەیش هەر وای وتووە.[3] ئەنەسی كوڕی مالیكو ئەبول عالیە دەڵێن: لە نێوان مەغریبو عیشادا نوێژیان دەكرد.[4] بۆچوونی دووەم: ئەو مایە (مَا) مای مەسدەریەیە واتە: كەمێك لە شەو پاڵ دەكەوتنو دەخەوتن. ئیبنو جەریریش ئەم بۆچوونەی هەڵبژاردبوو، حەسەنی بەسری دەڵێت: ﴿كَانُوا۟ قَلِيلًا مِّنَ ٱلَّيْلِ مَا يَهْجَعُونَ﴾ ماندوو دەبوون لە شەونوێژدا زۆر كەمێك نەبێت لە شەودا نەدەخەوتن. بە ئارەزووەوە لە نزیك بەرەبەیاندا دەستیان دەكرد بە پاڕانەوە لە خوای گەورە.[5] عەبدوڵڵای كوڕی سەلام دەڵێت: كاتێك پێغەمبەری خودا(ﷺ) گەیشتە مەدینە مەردم بە پەلە هاتن بۆ خزمەتی. منیش یەكێك بووم لەو كەسانەی بە پەلە چوومە خزمەتی، چاوم پێی كەوت زانیم كە ئەم ڕووو دەمو چاوە دەمو چاوی پیاوی درۆزن نیەو یەكەم شتێك كە لێم بیست دەیفەرموو: (ئەی خەڵكینە، میوانداری بكەن لە مەردم ـ واتە خواردنیان بدەنێ ـ پەیوەندی خزمایەتی بەجێ بهێنن، لە شەودا نوێژ بكەن كە خەڵكی نوستوون دەچنە بەهەشت بە سەلامەت).[6] ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی كردووە لە عەبدوڵڵای كوڕی عومەرەوە (ڕەزای خوایان لێبێت) دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (لە بەهەشتدا ژووری زۆر هەیە لە ناوەوەی دەرەوەی دەبینرێتو لە دەرەوەی ناوەوەی دەبینرێت). ئەبو موسای ئەشعەری وتی: ئەو بەهەشتە بۆ كێیە ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ))؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (بۆ ئەو كەسەیە كە قسە نەرمەو خواردن دەدات بە خەڵكیو بە شەو هەڵدەسێت شەونوێژ دەكاتو خەڵكی نوستوون).[7] وە خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿وَبِٱلْأَسْحَارِ هُمْ يَسْتَغْفِرُونَ﴾ بەری بەیان داوای لێبوردنیان دەكرد. موجاهیدو كەسانی تریش دەڵێن: واتە: نوێژ دەكەن.[8] زۆر كەسیش وتوویانە: واتە شەونوێژیان دەكردو بەرەبەیان داوای لێبوردنیان دەكرد لە خوا. وەك خوای مەزن فەرموویەتی: ﴿وَٱلْمُسْتَغْفِرِينَ بِٱلْأَسْحَارِ﴾[9] واتە: ئەوانەی داوای لێخۆشبوون

[1] الطبري (٢٢/٤٠٧).
[2] الطبري (٢٢/٤٠٨).
[3] الطبري (٢٢/٤٠٨).
[4] الطبري (٢٢/٤٠٧/٤٠٨).
[5] الطبري (٢٢/٤٠٨/٤٠٩).
[6] تحفة الأحوذي (٧/١٨٧)، فەرموودیەكی سەحیحە.
[7] احمد (٢/١٧٣)، ئیبنو لەهیعەی تێدا فەرموودەیەكی لاوازە.
[8] الطبري (٢٢/٤١٣).
[9] ال عمران (١٧).

دەکەن لە پێش بەیانیاندا. خۆ ئەگەر پاڕانەوەش لە کاتی نوێژدا بووبێت چاکترە. لە کتێبە سەحیحەکانو کتێبەکانی تریشدا هاتووە لە کۆمەڵێك لە هاوەڵەکانی پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) وتوویانە: کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (خوای مەزن هەموو شەوێك دێتە خوارەوە بۆ ئاسمانی دنیاو کاتێك سێیەکی دوایی شەو دەمێنێت، دەفەرموێت: ئایا کەسێك هەیە داوای لێبوردن بکات تا لێی ببوورم، ئایا کەسێك هەیە داوای لێخۆشبوونم لێ بکات تا لێی خۆش ببم، ئایا کەسێك هەیە داوام لێ بکات تا داواکەی پێ بدرێت؟ هەتا بەری بەیانی).[1] واتە تا خۆر هەڵدێت. وە زۆرێك لە زانایانی تەفسیر وتوویانە لەو ئایەتەی کە باسی یەعقوب پێغەمبەر دەکات (سەلامی خوای لێبێت) کاتێك بە کوڕەکانی وت وەك خودا دەفەرموێت: ﴿سَوۡفَ أَسۡتَغۡفِرُ لَكُمۡ رَبِّيٓۚ﴾[2] واتە: دواتر داوای لێبوردنتان بۆ دەکەم لە پەروەردگارم. واتە: دوعاکەی دواخستوون بۆ بەری بەیانی. وە دەفەرموێت: ﴿وَفِيٓ أَمۡوَٰلِهِمۡ حَقّٞ لِّلسَّآئِلِ وَٱلۡمَحۡرُومِ﴾ لە ماڵیاندا بەشێك هەبوو بۆ گەداکانو بێ بەشان. وەك چۆن وەسفی کردن بە نوێژکردن هەروەها وەسفیان دەکات بەوەی کە زەکات دەدەنو چاکەخوازنو خزم بەسەر دەکەنەوە، ﴿وَفِيٓ أَمۡوَٰلِهِمۡ حَقّٞ﴾ بەشێکی دیاریکراو کە دەریان کردووەو دایانناوە بۆ گەداو بێ بەشان. سواڵکەر ئەوانەن کە داوا دەکەن دیارە ئەویش حەقی خۆی هەیە. بەڵام بێبەش ئیبنو عەباسو موجاهید دەڵێن: ئەو هەژارو کەم دەستانەن کە لە ئیسلامدا بەشیان بۆ دیاری کراوە، واتە: لە خەزێنەی دەوڵەتی ئیسلامیدا پشکی بۆ دانەنراوە[3]. واتە لە خەزێنەی دەوڵەتی ئیسلامی بێ بەشی نییەو بێ کاریشەو هیچ پیشەیەکیش نازانێت هەتا بژێوی خۆی پێ بەدەست بهێنێت. دایکی موسڵمانان عائیشە دەڵێت: ئەو کەم دەستەیە کە ناتوانێتبە ئاسانی بژێوی خۆی بە دەست بهێنێت. قەتادەو زوهەری دەڵێن: بێ بەشو کەم دەست (المحروم) ئەو کەسەیە کە داوای هیچ شتێك لە خەڵکی ناکات[4]. زوهەری دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (هەژار ئەو کەسە نیە کە دەگەڕێتو تیکەیەك یان دو تیکە یان دەنکە خورمایەك یان دوو دەنکە خورمای دەدرێتێ، بەڵکو هەژار ئەو کەسەیە هیچی نییە پێی بژێتو

---

[1] فتح الباري (٣/٣٥/١١/١٣٣ و١٣/٤٧٣)، مسلم (١/٥٢١/٥٢٣)، ابو داود (٢/٧٧ و ٥/١٠١)، وتحفة الأحوذي (٩/٤٧١)، والنسائي في الكبرى (٤/٢٤)، وابن ماجه (١/٤٣٥).

[2] يوسف (٩٨).

[3] الطبري (٢٢/٤١٤).

[4] الطبري (٢٢/٤١٦).

بێ نیازی بکات لە هەژاریو ناشتوانێت وا بکات لە خۆی کە خەڵکی خێری پێ بکەن)[1]. وە ئەم فەرموودەیە بوخاریو موسلیم بە شێوازێکی تر هێناویانە لە هەردوو سەحیحەکەدا[2].

## نیشانەو بەڵگەکانی خودا لە زەمینو لەناو مەردم خۆیاندا

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَفِي ٱلْأَرْضِ ءَايَٰتٌ لِّلْمُوقِنِينَ﴾ لە زەمینـدا بەڵگە زۆرن بۆ ئەوانەی لە بڕوادا بێگومانن. واتە: لە زەمیندا نیشانەی زۆر گەورە هەیە کە بەڵگەیە لەسەر مەزنیو دەسەڵاتی بێ پایانی خوای گەورە کە لە ناویدا هەموو جۆرە شتێکی تیا پەرژو بڵاوکردووەتەوە لە ڕووەكو زیندەوەرو کەژو کێوو دەشتو چەمو دۆڵو ڕووبارو دەریاو جیاوازی زمانو شێوەو شکڵی مرۆڤو ئەو تواناو هێزو دەسەڵاتەی کە خودا پێی داوەو ئەو هەموو جیاوازییە لە بیرو هۆشو جوڵانو هەڵسوکەوتدا. وە بەختەوەریو بەدبەختی لە ژیاندا. وە لە ڕێکوپێکی بەژنو باڵاو دانانی هەموو پارچەکانی لەش لەو جێگایانەی کە لە شوێنی خۆیەتیو پێویستی پێیەتی بۆ درێژەدان بە ژیان. بۆیە خوای مەزن فەرموویەتی: ﴿وَفِيٓ أَنفُسِكُمْۚ أَفَلَا تُبْصِرُونَ﴾ هەروەها لەناو خۆشتاندا، ئاخۆ لە خۆتان ناڕوانن. قەتادە دەڵێت: هەرکەسێك بیر لە دروستبوونی خۆی بکاتەوە دەزانێت کە جومگەو ماسولکەکانی نەرم کراوەو وەدی هێنراوە بۆ خواناس.[3] پاشان خودا فەرموویەتی: ﴿وَفِي ٱلسَّمَآءِ رِزْقُكُمْ وَمَا تُوعَدُونَ﴾ ڕۆزیتانو هەرچی بەڵێنتان پێ دەدرێت لە ئاسمانە. واتە: باران، ﴿وَمَا تُوعَدُونَ﴾ واتە: بەهەشت. ئیبنو عەباسو موجاهیدو کەسانی تریش وتوویانە.[4] وە دەفەرمووێت: ﴿فَوَرَبِّ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ إِنَّهُۥ لَحَقٌّ مِّثْلَ مَآ أَنَّكُمْ تَنطِقُونَ﴾ سا سوێند بە پەروەرێنی ئاسمانو زەمین ئەمە ڕاستە، هەر وەك خۆتان قسە بکەن. خودا سوێند بە گەورەیی خۆی دەخوات کە ئەوەی بەڵێنی پێدابوون لە ڕۆژی قیامەتو زیندووبوونەوەو پاداشتدانەوە بێگومان ڕاستەو دێتەدی وەك چۆن گومان ناکەن کە قسە بکەن لەناو خۆتانجا. کاتێك مەعاز (معاذ) باسی شتێکی بکردایە دەیوت بە هاوەڵەکەی: ئەمە ڕاستە وەك چۆن تۆ ئێستا لێرەدای.

﴿هَلْ أَتَىٰكَ حَدِيثُ ضَيْفِ إِبْرَٰهِيمَ ٱلْمُكْرَمِينَ ﴿٢٤﴾ إِذْ دَخَلُوا۟ عَلَيْهِ فَقَالُوا۟ سَلَٰمًاۖ قَالَ سَلَٰمٌ قَوْمٌ مُّنكَرُونَ ﴿٢٥﴾ فَرَاغَ إِلَىٰٓ أَهْلِهِۦ فَجَآءَ بِعِجْلٍ سَمِينٍ ﴿٢٦﴾ فَقَرَّبَهُۥٓ إِلَيْهِمْ قَالَ أَلَا تَأْكُلُونَ ﴿٢٧﴾ فَأَوْجَسَ مِنْهُمْ خِيفَةًۖ قَالُوا۟ لَا تَخَفْۖ وَبَشَّرُوهُ

[1] النسائي (٥/٨٥)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[2] فتح الباري (٢/٣٩٩)، مسلم (٢/٧١٩).

[3] القرطبي (١٧/٤٠).

[4] الطبري (٢٢/٤٢٠).

بِغُلَٰمٍ عَلِيمٍ ﴿٢٨﴾ فَأَقْبَلَتِ ٱمْرَأَتُهُۥ فِى صَرَّةٍ فَصَكَّتْ وَجْهَهَا وَقَالَتْ عَجُوزٌ عَقِيمٌ ﴿٢٩﴾ قَالُوا۟ كَذَٰلِكِ قَالَ رَبُّكِ ۖ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْحَكِيمُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٣٠﴾ ﴾

خـوای مـەزن دەفـەرمووێت: ﴿هَلْ أَتَىٰكَ حَدِيثُ ضَيْفِ إِبْرَٰهِيمَ ٱلْمُكْرَمِينَ﴾ ئـاخۆ باسـی میوانـە بەڕێزەکانی ئیبراهیمت بۆ نەهاتووە؟ ئەم چیرۆکە لە سورەتی (هود و الحجر) دیسان لە پێشەوە خـوای گەورە باسی کردووە. لێرەشدا دەفەرمووێت: ﴿هَلْ أَتَىٰكَ حَدِيثُ ضَيْفِ إِبْرَٰهِيمَ ٱلْمُكْرَمِينَ﴾ واتـە: ئەوانـە کـە خـودا ڕێـزی لێ نـاون. وە دەفـەرمووێت: ﴿إِذْ دَخَلُوا۟ عَلَيْهِ فَقَالُوا۟ سَلَٰمًا ۖ قَالَ سَلَٰمٌ قَوْمٌ مُّنكَرُونَ﴾ کاتێـك کەچـوونە ژوورەوە بـۆ لای وتیـان: سـەلام، وتـی: سـەلام، دەسـتەیەکی نەناسـراون. مـەرفوع کردنـی ﴿سَلَٰمٌ﴾ بەهێزترو ڕێكو تەواوترە لە مەنسوب کردنی(سلام)، چونکە وەلامدانـەوە بـە ﴿سَلَٰمٌ﴾ چاکترە لە (سلاماً) بۆیە خـوای گـەورە فەرموویـەتی: ﴿وَإِذَا حُيِّيتُم بِتَحِيَّةٍ فَحَيُّوا۟ بِأَحْسَنَ مِنْهَآ أَوْ رُدُّوهَآ﴾[1] واتـە: هـەر کاتێـك سـڵاوێکتان لێ کـرا ئـەوە بـە چاکتر لـەو سـڵاو بکـەن یـان وەكو خۆی بیسەننەوە. بۆیـە ئیبراهیمی خەلیل (سەلامی خوای لێبێت) چاکتری هەڵبـژارد. وە دەفـەرمووێت: ﴿قَوْمٌ مُّنكَرُونَ﴾ چـونکە ئەو فریشتانە کە بریتی بوون لە جوبرەئیل و میکائیـل و ئیسرافیل هاتبوونـە لای لـە شـێوەی کۆمـەڵێك لاودا کـە زۆر پێکـەوتوو ئێجگـار بـە سـام بـوون. بۆیـە خـودا فەرموویـەتی: ﴿قَوْمٌ مُّنكَرُونَ﴾. وە دەفەرمووێت: ﴿فَرَاغَ إِلَىٰٓ أَهْلِهِۦ فَجَآءَ بِعِجْلٍ سَمِينٍ﴾ پەنامەکی خۆی گەیاندە ناو خێزانی و گوێرەکەیـەکی چاکی هاورد. واتە بە پەلەو بە پەنامەکی ڕۆیشت بۆ لای خێزانـی و گوێرەکەیـەکی زۆر چـاکی هێنـا. لـە ئایـەتێکی تـردا دەفـەرمووێت: ﴿فَمَا لَبِثَ أَن جَآءَ بِعِجْلٍ حَنِيذٍ﴾[2] واتـە: ئینجـا ئەوەنـدەی نـەبرد (ئیبراهیم) خێرا گوێرەکەیەکی برژاوی هێنا. واتـە: بـرژاو لەسـەر بـەردی گـەرم. ﴿فَقَرَّبَهُۥٓ إِلَيْهِمْ قَالَ أَلَا تَأْكُلُونَ﴾ کاتێك کە لێی نزیك کـردن، وتـی لەبەرچـی نـاخۆن. واتـە: لێـی نزیـك کردنـەوە بـە وتـەیەکی پرسۆزو ڕێزەوە پێی وتن: بۆچی ناخۆن. ئەم ئایەتە ڕەوشتی میوانداری تەواو دەردەخات کە چۆن بە پەنامەکی ڕۆیشت و خواردنی ئامادەکردو بە پەلە بۆی هێنان بەبێ ئەوەی میوانەکان هەستی پێ بکەن. لە پێشەوە پێی نەوتن دەڕۆم خواردنتان بۆ ئامادە دەکەم بەڵکو بە پەلەو بـە پەنامـەکی بـۆی هێنـان و چاکترین خواردنی لە ماڵی خۆی بۆ هێنان کە گوێرەکەیەکی قەڵەوی برژاو بوو. لێی نزیك کردنەوە. دای

[1] النساء (٨٦).

[2] هود (٦٩).

نەنا لەبەر دەميان، وتی: فەرموون: يان داينا لەبەر دەميان بەڵام بە شێوەيە پێی نەوتن كە داوايان لێ بكاتو بە لايانەوە گران بێ وتی: ﴿أَلَا تَأْكُلُونَ﴾ بەرێزەوە پێشكەشی كردن. خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿فَأَوْجَسَ مِنْهُمْ خِيفَةً قَالُوا لَا تَخَفْ وَبَشَّرُوهُ بِغُلَامٍ عَلِيمٍ﴾ ئەوسا ترسێكی لێ نيشتو وتيان: تۆ نيگەران مەبەو بوونی لاوێكی زانايان مژدە پێدا. ئەمە وەك ئەو چيرۆكە وايە كە باسكرا لە پێشەوە كە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿فَلَمَّا رَءَا أَيْدِيَهُمْ لَا تَصِلُ إِلَيْهِ نَكِرَهُمْ وَأَوْجَسَ مِنْهُمْ خِيفَةً قَالُوا لَا تَخَفْ إِنَّا أُرْسِلْنَا إِلَىٰ قَوْمِ لُوطٍ ﴿٧٠﴾ وَامْرَأَتُهُ قَائِمَةٌ فَضَحِكَتْ﴾[1] واتە: جا كە بينی دەستيان درێژ ناكەن بۆی و (لێی ناخۆن) نائاسايی هاتنە بەرچاویو لە دەروونی خۆيدا مەترسی لێكردن (كە نيازی خراپيان هەبێت) وتيان مەترسە بە ڕاستی ئێمە نێردراوين بۆ سەر گەلی لوط، لەو كاتەدا خێزانەكەی وەستابوو پێكەنی. واتە: خێزانی خۆشحاڵی دەربڕی بە قڕبوونيان لەبەر ياخيبووو لاساريان بەرانبەر بە خودا. ئا لەو كاتەدا فريشتەكان مژدەی ئيسحاقيان پێداو لە پاش ئيسحاقيش يەعقوب. ﴿قَالَتْ يَٰوَيْلَتَىٰٓ ءَأَلِدُ وَأَنَا۠ عَجُوزٌ وَهَٰذَا بَعْلِى شَيْخًا ۖ إِنَّ هَٰذَا لَشَىْءٌ عَجِيبٌ ﴿٧٢﴾ قَالُوٓا۟ أَتَعْجَبِينَ مِنْ أَمْرِ ٱللَّهِ ۖ رَحْمَتُ ٱللَّهِ وَبَرَكَٰتُهُۥ عَلَيْكُمْ أَهْلَ ٱلْبَيْتِ ۚ إِنَّهُۥ حَمِيدٌ مَّجِيدٌ﴾[2] بۆيە خوای مەزن لێرەدا فەرموويەتی: ﴿وَبَشَّرُوهُ بِغُلَامٍ عَلِيمٍ﴾ مژدە بە ئيبراهيم (سەلامی خوای لێبێت)و مژدەيشە بە خێزانی. چونكە منداڵەكە هی هەردووكيانەو مژدە بە هەردووكيان دراوە. وە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿فَأَقْبَلَتِ امْرَأَتُهُ فِي صَرَّةٍ فَصَكَّتْ وَجْهَهَا وَقَالَتْ عَجُوزٌ عَقِيمٌ﴾ ژنەكەی بە هاوارەوە هاتو چۆمەڵەيەكی لە خۆی ناو وتی: من پيرێژنێكم بێ زكو ز. بە دەنگێكی بەرز خێزانی هاواری كرد بە گريانەوە، ئيبنو عەباسو موجاهيدو عيكريمەو ئەبو سالحو زەحاكو زەيدی كوڕی ئەسلەمو سەوریو سودی وتوويانە.[3] ﴿يَٰوَيْلَتَىٰٓ﴾ قسەی ژنەكەيە. ﴿فَصَكَّتْ وَجْهَهَا﴾ واتە: دای بەنێوچاوانی خۆيدا. موجاهيدو ئيبنو سابت وتوويانە.[4] ئيبنو عەباس دەڵێت: بە ڕوومەتی خۆيادا واتە: سەری سوڕما وەك چۆن ژنان كاتێك شتێكی چاوەڕوان نەكراوو سەير ببينن سەريان سوڕدەمێنێت.[5] ﴿وَقَالَتْ عَجُوزٌ عَقِيمٌ﴾ واتە: من كە پيرەژنێكم چۆن زكو زا

---

[1] هود (٧٠_٧١).

[2] هود (٧٢_٧٣).

[3] الطبري (٢٢/٤٢٦)، القرطبي (١٧/٤٦).

[4] الطبري (٢٢/٤٢٨).

[5] الطبري (٢٢/٤٢٧).

دەکـەم. کـە بـەلاوی سـکم نـەبووەو وجـاخم کـوێر بـووە؟ ﴿قَالُواْ كَذَٰلِكِ قَالَ رَبُّكِۖ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلۡحَكِيمُ ٱلۡعَلِيمُ﴾ وتیان: پەروەردگاری تۆ ئاوایەنەی وتووە. ئەو خۆی کاربزان و زانایە. واتـە: خـودا دەزانـێ کـە ئێوە شایەنی ئەو ڕێزەن، کارزانە لە کردارو گفتاریدا.

﴿قَالَ فَمَا خَطۡبُكُمۡ أَيُّهَا ٱلۡمُرۡسَلُونَ (٣١) قَالُوٓاْ إِنَّآ أُرۡسِلۡنَآ إِلَىٰ قَوۡمٖ مُّجۡرِمِينَ (٣٢) لِنُرۡسِلَ عَلَيۡهِمۡ حِجَارَةٗ مِّن طِينٖ (٣٣) مُّسَوَّمَةً عِندَ رَبِّكَ لِلۡمُسۡرِفِينَ (٣٤) فَأَخۡرَجۡنَا مَن كَانَ فِيهَا مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ (٣٥) فَمَا وَجَدۡنَا فِيهَا غَيۡرَ بَيۡتٖ مِّنَ ٱلۡمُسۡلِمِينَ (٣٦) وَتَرَكۡنَا فِيهَآ ءَايَةٗ لِّلَّذِينَ يَخَافُونَ ٱلۡعَذَابَ ٱلۡأَلِيمَ (٣٧)﴾

## فریشتەکان کاریان لەناوبردن و قڕکردنی گەلەکەی لوطە

خوای گەورە باسـی ئیبراهیم پێغەمبـەری کـردووەو (سـەلامی خـوای لێبێـت) فەرموویـەتی: ﴿فَلَمَّا ذَهَبَ عَنۡ إِبۡرَٰهِيمَ ٱلرَّوۡعُ وَجَآءَتۡهُ ٱلۡبُشۡرَىٰ يُجَٰدِلُنَا فِي قَوۡمِ لُوطٍ (٧٤) إِنَّ إِبۡرَٰهِيمَ لَحَلِيمٌ أَوَّٰهٞ مُّنِيبٞ (٧٥) يَٰٓإِبۡرَٰهِيمُ أَعۡرِضۡ عَنۡ هَٰذَآۖ إِنَّهُۥ قَدۡ جَآءَ أَمۡرُ رَبِّكَۖ وَإِنَّهُمۡ ءَاتِيهِمۡ عَذَابٌ غَيۡرُ مَرۡدُودٖ﴾[1] واتـە: ئینجا کاتێـك تـرس و بیمـی ئیبراهیم لاچوو نەماو مژدەکەشی بۆ هـات لـە بـارەی گەلەکـەی لـووط دەمەتـەقێی لەگـەڵ دەکـردین، (چونکە) بە ڕاستی ئیبراهیم لەسەرخۆو دڵ نەرمو ڕوو لە خوا بوو، ئـەی ئیبـراهیم واز بهێنـە لـەم کـارە بەڕاستی بێگومان دەرچووە (بۆ ئەو کارە فەرمانی پەروەردگارت و بەڕاستی بـۆ ئەوانـە دێـت سـزایەکی نەگەڕاوە. وە لێرەشدا فەرموویەتی: ﴿قَالَ فَمَا خَطۡبُكُمۡ أَيُّهَا ٱلۡمُرۡسَلُونَ﴾ وتـی: ئـەی ڕاسپاردەکان، کارتـان چیە. واتە ئیشتان چیەو بۆچی هاتوون. ﴿قَالُوٓاْ إِنَّآ أُرۡسِلۡنَآ إِلَىٰ قَوۡمٖ مُّجۡرِمِينَ﴾ ئێمە ڕەوانـەکراوین بـۆ سـەر هـۆزی تاوانبـاران. مەبەسـتیان هـۆزی لوتـە. ﴿لِنُرۡسِلَ عَلَيۡهِمۡ حِجَارَةٗ مِّن طِينٖ﴾ قـوڕی (گلـە قـوڕی خـڕی) ڕەقبووی وەك بەردیان لێ ببارێنین. ﴿مُّسَوَّمَةً عِندَ رَبِّكَ لِلۡمُسۡرِفِينَ﴾ پەروەردگارت هەموو نیشانەی لێ داون، بۆ ئەوانەی لە ئەندازە لایانداوە. واتە: شارەزاکراوە لای خودا ناویان لێدراوە هەموو بەردێك بەناوی ئەو کەسە خۆیەوە دێت. وە لە سورەتی (العنكبوت)دا فەرموویـەتی: ﴿قَالَ إِنَّ فِيهَا لُوطٗاۚ قَالُواْ نَحۡنُ أَعۡلَمُ بِمَن فِيهَاۖ لَنُنَجِّيَنَّهُۥ وَأَهۡلَهُۥٓ إِلَّا ٱمۡرَأَتَهُۥ كَانَتۡ مِنَ ٱلۡغَٰبِرِينَ﴾[2] واتـە: (ئیبـراهیم) وتـی بێگومـان لـوت لەو (شارە) دایە وتیان ئێمە چاك دەزانین کێی لێیە سوێند بە خـوا ئێمـە لـوت و ئەندامانی خێزانەکـەی ڕزگار دەکەین جگە لە ژنەکەی کە لە جێماوان و تیاچووان دەبێت. خـوای گـەورە لێـرەدا فەرموویـەتی:

---

[1] هود (٧٤ـ٧٦).

[2] العنكبوت (٣٢).

﴿فَأَخۡرَجۡنَا مَن كَانَ فِيهَا مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾ ئەوسا باوەڕدارەكانمان لێ وەدەرنا. واتە: لوتو ماڵو منداڵەكەی بێجگە لە ژنەكەی. ﴿فَمَا وَجَدۡنَا فِيهَا غَيۡرَ بَيۡتٖ مِّنَ ٱلۡمُسۡلِمِينَ﴾ ئێمە غەیری تەنها ماڵێك، خواناسمان دەست نەكەوت. وە دەفەرمووێت: ﴿وَتَرَكۡنَا فِيهَآ ءَايَةٗ لِّلَّذِينَ يَخَافُونَ ٱلۡعَذَابَ ٱلۡأَلِيمَ﴾ لەو شوێنەشدا نیشانەیەكمان بەجێ هێشت، بۆ ئەوانەی كە لە ئازاردانی بەژان ترسیان هەیە. واتە: ئەو ئازارو سزاو بەردبارانەمان بەسەرهێنانو شوێنەكانیشمان كردە دەریایەكی بۆگەنی پیس. تا ببێتە ئامۆژگاری بۆ خاوەن باوەڕان.

﴿مُوسَىٰٓ إِذۡ أَرۡسَلۡنَٰهُ إِلَىٰ فِرۡعَوۡنَ بِسُلۡطَٰنٖ مُّبِينٖ ﴿٣٨﴾ فَتَوَلَّىٰ بِرُكۡنِهِۦ وَقَالَ سَٰحِرٌ أَوۡ مَجۡنُونٞ ﴿٣٩﴾ فَأَخَذۡنَٰهُ وَجُنُودَهُۥ فَنَبَذۡنَٰهُمۡ فِي ٱلۡيَمِّ وَهُوَ مُلِيمٞ ﴿٤٠﴾ وَفِي عَادٍ إِذۡ أَرۡسَلۡنَا عَلَيۡهِمُ ٱلرِّيحَ ٱلۡعَقِيمَ ﴿٤١﴾ مَا تَذَرُ مِن شَيۡءٍ أَتَتۡ عَلَيۡهِ إِلَّا جَعَلَتۡهُ كَٱلرَّمِيمِ ﴿٤٢﴾ وَفِي ثَمُودَ إِذۡ قِيلَ لَهُمۡ تَمَتَّعُواْ حَتَّىٰ حِينٖ ﴿٤٣﴾ فَعَتَوۡاْ عَنۡ أَمۡرِ رَبِّهِمۡ فَأَخَذَتۡهُمُ ٱلصَّٰعِقَةُ وَهُمۡ يَنظُرُونَ ﴿٤٤﴾ فَمَا ٱسۡتَطَٰعُواْ مِن قِيَامٖ وَمَا كَانُواْ مُنتَصِرِينَ ﴿٤٥﴾ وَقَوۡمَ نُوحٖ مِّن قَبۡلُۖ إِنَّهُمۡ كَانُواْ قَوۡمٗا فَٰسِقِينَ ﴿٤٦﴾﴾

## پەندو ئامۆژگاری لە چیرۆكی فیرعەونو عادو سەمودو هۆزی نوح

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿مُوسَىٰٓ إِذۡ أَرۡسَلۡنَٰهُ إِلَىٰ فِرۡعَوۡنَ بِسُلۡطَٰنٖ مُّبِينٖ﴾ وە لە بەسەرهاتی موساشدا، كە بە بەڵگەی ئاشكراوە بەڕێمان كردە لای فیرعەون. واتە: بە نیشانەی دیارو ئاشكراو بەڵگەی تەواو. ﴿فَتَوَلَّىٰ بِرُكۡنِهِۦ وَقَالَ سَٰحِرٌ أَوۡ مَجۡنُونٞ﴾ بەو نیازە كە خاوەنی هێزو پێزە بایەخی بە موسا نەداو وتی: جادوگەرێكە شێت بووە. واتە: فیرعەون هیچ بایەخێكی بەو پەیامە نەدا كە موسا هێنابووی دژی وەستا خۆی بە زیاتر دەزانی لەوەی كە گوێ لە موسا بگرێت. وەك ئەم ئایەتە كە دەفەرمووێت: ﴿ثَانِيَ عِطۡفِهِۦ لِيُضِلَّ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾[1] واتە: (كەسێكە) ڕوو وەردەگێڕێت (حەق وەرناگرێت) بۆ ئەوەی خەڵك لە ڕێگەی خودا لابدات. واتە پشتی كردە ڕاستی بە فیزێكەوە دەیوت ئەمەی تۆ باسی دەكەیو هێناوتە بۆ لای من جادووە یان شێت بوویت. خوای گەورەیش فەرموویەتی: ﴿فَأَخَذۡنَٰهُ وَجُنُودَهُۥ فَنَبَذۡنَٰهُمۡ فِي ٱلۡيَمِّ وَهُوَ مُلِيمٞ﴾ ئەوسا خۆیو لەشكرەكەیمان گرتو فڕێمان دانە ناو دەریاوەو گلەیش لە خۆی كرا. واتە خستمانە ناو دەریا لەبەر ئەوەی خوانەناسو بێ گوێیو یاخیو كەللەڕەقو لەدین لادەر بوو. پاشان خوای مەزن فەرموویەتی: ﴿وَفِي عَادٍ إِذۡ أَرۡسَلۡنَا عَلَيۡهِمُ ٱلرِّيحَ ٱلۡعَقِيمَ﴾ لەسەر عادیش گرەبامان ناردە سەریان. واتە: بایەكی وا خراپ كە هیچ بەرووبوومو سوودێكی نەدا زەححاكو قەتادەو كەسانی تریش

[1] الحج (٩).

وتوویانە.[1] بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿مَا تَذَرُ مِن شَيْءٍ أَتَتْ عَلَيْهِ إِلَّا جَعَلَتْهُ كَالرَّمِيمِ﴾ هەر شتێك کە هاتە بەری وەك پێشەی پواوی لێکرد. واتە: وەك شتی ڕزاوی لەناوچوو. سەعیدی کوڕی موسەیب و کەسانی تریش وتوویانە لەم ئایەتەدا: ﴿إِذْ أَرْسَلْنَا عَلَيْهِمُ الرِّيحَ الْعَقِيمَ﴾ واتە: بای باشوور[2]. وە لە فەرموودەی سەحیحدا هاتووە لە شوعبەوە ڕیوایەتی کردووە لە حەکیمەوە لە موجاهیدەوە لە ئیبنو عەباسەوە (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (یارمەتی درام بە بای خۆرهەلات عادیش تیاچوون بە بای ڕۆژئاوا).[3] ﴿وَفِي ثَمُودَ إِذْ قِيلَ لَهُمْ تَمَتَّعُوا حَتَّىٰ حِينٍ﴾ دەربارەی هۆزی سەمودیش، کە پێیان ڕاگەیەندرا، هەتا ماوەیەك ڕابوێرن. ئەم ئایەتە وەك ئەم ئایەتە وایە کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَأَمَّا ثَمُودُ فَهَدَيْنَاهُمْ فَاسْتَحَبُّوا الْعَمَىٰ عَلَى الْهُدَىٰ فَأَخَذَتْهُمْ صَاعِقَةُ الْعَذَابِ الْهُونِ﴾[4] واتە: وە (هۆزی) سەمودمان ڕێنموونی کرد بەڵام ئەوان زیاتر حەزیان لە کوێری کرد تا شارەزایی و ڕێنموونی جا بۆیە هەورە بروسکەی سزای ڕیسواکەر لێی دان. وەهەروەها لێرەشدا فەرموویەتی: ﴿وَفِي ثَمُودَ إِذْ قِيلَ لَهُمْ تَمَتَّعُوا حَتَّىٰ حِينٍ ﴿٤٣﴾ فَعَتَوْا عَنْ أَمْرِ رَبِّهِمْ فَأَخَذَتْهُمُ الصَّاعِقَةُ وَهُمْ يَنظُرُونَ﴾ لە فەرمانی پەروەردگاریان لایاندا، هەتا دیتیان وەبەر هەورەتریشقەیێ کەوتن. لەبەر ئەوە کە ئەوانە سێ ڕۆژ چاوەڕوانی ئەو سزایە بوون. لە بەرەبەیانی ڕۆژی چوارەمدا سزاکەیان بۆ هات. ﴿فَمَا اسْتَطَاعُوا مِن قِيَامٍ وَمَا كَانُوا مُنتَصِرِينَ﴾ نەیانکرا ڕاست بنەوەو کەسیش بەهانایان نەهات. واتە: نەیانتوانی ڕابکەن یان ڕاست بنەوە، وە نەشیاندەتوانی لەو وەختەدا داوای یارمەتی لە کەس بکەن و کەسیش بە هانایانەوە نەهات. پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَقَوْمَ نُوحٍ مِّن قَبْلُ إِنَّهُمْ كَانُوا قَوْمًا فَاسِقِينَ﴾ هۆزی نوحیش لە پێشوودا (بەر غەزەبی ئێمە کەوتن) کە گەلێکی نافەرمان بوون. واتە: پێش ئەمانە هۆزی نوحمان لەناو برد چونکە گەلێکی لادەرو نافەرمان بوون. ئەم چیرۆکانە لە پێشەوە لە زۆر شوێنداو زۆر سورەتدا باس کراوە، والله أعلم.

---

[1] الطبري (٢٢/٤٣٤).

[2] الطبري (٢٢/٤٣٣).

[3] فتح الباري (٢/٦٠٤)، وسلم (٢/٦١٧).

[4] فصلت (١٧).

﴿وَٱلسَّمَآءَ بَنَيۡنَٰهَا بِأَيۡيْدٖ وَإِنَّا لَمُوسِعُونَ ﴿٤٧﴾ وَٱلۡأَرۡضَ فَرَشۡنَٰهَا فَنِعۡمَ ٱلۡمَٰهِدُونَ ﴿٤٨﴾ وَمِن كُلِّ شَيۡءٍ خَلَقۡنَا زَوۡجَيۡنِ لَعَلَّكُمۡ تَذَكَّرُونَ ﴿٤٩﴾ فَفِرُّوٓاْ إِلَى ٱللَّهِۖ إِنِّي لَكُم مِّنۡهُ نَذِيرٞ مُّبِينٞ ﴿٥٠﴾ وَلَا تَجۡعَلُواْ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَۖ إِنِّي لَكُم مِّنۡهُ نَذِيرٞ مُّبِينٞ ﴿٥١﴾﴾

**بەڵگەكانی تەنهایی خوای گەورە لە وەدیهێنانی ئاسمانەكان و زەمین و لە وەدیهێنانی هەر شتێك بە جووت**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَٱلسَّمَآءَ بَنَيۡنَٰهَا بِأَيۡيْدٖ وَإِنَّا لَمُوسِعُونَ﴾ ئەم ئاسمانەشمان بە هێزی خودی خۆمان وەدی هێناو بێگومان پەرەشی پێ دەدەین. خوای مەزن ئاگادارمان دەكات لە وەدیهاتنی بوونەوەر لە سەرەوەو لە خوارەوە دەفەرموێت: ﴿وَٱلسَّمَآءَ بَنَيۡنَٰهَا﴾ واتە: ئەو ئاسمانەمان وەدی هێناوە بەرزو بە حەواوە (بە سەرەوە) وەستانومانە ﴿بِأَيۡيْدٖ﴾ بەهێزو توانای خۆمان ئیبنو عەباس‌و موجاهیدو قەتادەو سەوری‌و كەسانی تریش وتوویانە.[1] ﴿وَإِنَّا لَمُوسِعُونَ﴾ واتە: لە هەموو لایەكیەوە فراوانمان كردووەو بەبێ ستوون بەرزمان كردووەتەوە بەو شێوەیە كە وەستاوە. ﴿وَٱلۡأَرۡضَ فَرَشۡنَٰهَا فَنِعۡمَ ٱلۡمَٰهِدُونَ﴾ زەمینیش ئێمە ڕامانخست! ئای كە چەند ڕاخەری باشین. واتە: كردوومانە بە فەرشێك بۆ دروستكراوەكان (گیانلەبەرەكان)، ﴿فَنِعۡمَ ٱلۡمَٰهِدُونَ﴾ كردوومانە بە شوێنی حەوانەوە بۆ ئەوانەی تێیدا دەژین. وە دەفەرموێت: ﴿وَمِن كُلِّ شَيۡءٍ خَلَقۡنَا زَوۡجَيۡنِ لَعَلَّكُمۡ تَذَكَّرُونَ﴾ وە لە هەر شتێك جووتێكمان وەدی هێناوە، بەشكو بیری لێ بكەنەوە. واتە لە هەموو دروستكراوەكاندا جوتێكمان وەدی هێناوە وەك ئاسمان‌و زەمین‌و شەوو ڕۆژو خۆرو مانگ‌و دەریاو وشكایی‌و ڕۆشنایی‌و تاریكی‌و باوەڕدارو بێباوەڕو مردن‌و ژیان‌و بەدبەختی‌و بەختەوەری‌و بەهەشت‌و جەهەنەم‌و هەتا لەناو زیندەوەرو ڕووەكیشدا. بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿لَعَلَّكُمۡ تَذَكَّرُونَ﴾ بۆ ئەوەی بیری لێ بكەنەوە كە وەدیهێنەرتان تاك‌و تەنهایەو هاوەڵی نییە. وە خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿فَفِرُّوٓاْ إِلَى ٱللَّهِۖ إِنِّي لَكُم مِّنۡهُ نَذِيرٞ مُّبِينٞ﴾ سا هەمووتان بە ڕاكردن بەرەو خوا بڕۆن كە لەوەوە من بە ئاشكرا ترس وەبەر ئێوە دێنم. واتە: پەنا بۆ خودا بەرن‌و پشت تەنها بە ئەو ببەستن لە هەموو كارو فەرمانێكتاندا. وە دەفەرموێت: ﴿وَلَا تَجۡعَلُواْ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَۖ إِنِّي لَكُم مِّنۡهُ نَذِيرٞ مُّبِينٞ﴾ وێڕای خودایش هیچ شتێكی تر

[1] الطبري (٢٢/٤٣٨).

مەپەرستن، ئەو بە منی سپاردووە، بە ئاشكرا ترسی ئەوەتان وەبەر بێنم. واتە: لە هیچ شتێكدا هاوەڵ بۆ خودا دامەنێن.

﴿كَذَٰلِكَ مَآ أَتَى ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِم مِّن رَّسُولٍ إِلَّا قَالُوا۟ سَاحِرٌ أَوْ مَجْنُونٌ ﴿٥٢﴾ أَتَوَاصَوْا۟ بِهِۦ ۚ بَلْ هُمْ قَوْمٌ طَاغُونَ ﴿٥٣﴾ فَتَوَلَّ عَنْهُمْ فَمَآ أَنتَ بِمَلُومٍ ﴿٥٤﴾ وَذَكِّرْ فَإِنَّ ٱلذِّكْرَىٰ تَنفَعُ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٥٥﴾ وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ﴿٥٦﴾ مَآ أُرِيدُ مِنْهُم مِّن رِّزْقٍ وَمَآ أُرِيدُ أَن يُطْعِمُونِ ﴿٥٧﴾ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلرَّزَّاقُ ذُو ٱلْقُوَّةِ ٱلْمَتِينُ ﴿٥٨﴾ فَإِنَّ لِلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ ذَنُوبًا مِّثْلَ ذَنُوبِ أَصْحَٰبِهِمْ فَلَا يَسْتَعْجِلُونِ ﴿٥٩﴾ فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِن يَوْمِهِمُ ٱلَّذِى يُوعَدُونَ ﴿٦٠﴾﴾

## هەموو گەلە پێشینەكان وەك یەك و بەیەك شێواز باوەڕیان بە پێغەمبەرەكانیان نەهێناوە

خوای گەورە پێغەمبەرەكەی ئاگادار دەكاتەوە كە زۆر دڵگران مەبە بەو قسانەی كە بتپەرستەكان پێت دەڵێن. چونكە گەلە پێشووەكانیش هەر بەم شێوەیە باوەڕیان بە پێغەمبەرەكانیان نەكردووەو درۆیان بۆ هەڵبەستووە وەك دەفەرمووێت: ﴿كَذَٰلِكَ مَآ أَتَى ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِم مِّن رَّسُولٍ إِلَّا قَالُوا۟ سَاحِرٌ أَوْ مَجْنُونٌ﴾ بەر لەمانەش هەر وابووە، هەر كاتێك پێغەمبەرێكیان بۆ هاتووە، وتوویانە: یان جادووگەرە یان شێتە. خوای مەزنیش دەفەرمووێت: ﴿أَتَوَاصَوْا۟ بِهِۦ ۚ بَلْ هُمْ قَوْمٌ طَاغُونَ﴾ مەگەر ئەوان یەكترینیان بۆ ئەو قسە ڕاسپاردووە؟ (نە وانیە) بەڵكو ئەوان هەر بۆ خۆیان گەلانێكی نافەرمان بوون. ئاخۆ ئەوانە یەكریان ئاگادار كردووە لەم قسانە؟ نەخێر یەكتریان ئاگادار نەكردووە بەڵكو ئەمانە گرۆیەكی یاخی لە فەرمان دەرچوون دڵەكانیان لە یەك دەچێت و ئەمانەیش هەر ئەوە دەڵێن كە پێشووەكان وتوویانە: خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَتَوَلَّ عَنْهُمْ فَمَآ أَنتَ بِمَلُومٍ﴾ سا تۆ واز لەوانە بێنە، كەسیش لۆمەی تۆ ناكات. واتە ئەی موحەممەد(ﷺ) وازیان لێ بێنە كەس لۆمەی تۆ ناكات لەسەر ئەوە. وە دەفەرمووێت: ﴿وَذَكِّرْ فَإِنَّ ٱلذِّكْرَىٰ تَنفَعُ ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾ تۆ هەر وەبیریان بخەوە، بیرەوەری بەهرە دەدات بەوانەی خاوەن باوەڕن. واتە: دڵە خاوەن باوەڕەكان سودی لێ وەردەگرن.

## جنۆكە و مرۆڤ دروست نەكراوە بۆ خواناسی نەبێت

پاشان خوای مەزن فەرموویەتی: ﴿وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ﴾ من هەر بۆیە جنۆكەو مرۆڤم دروست كرد، بمپەرستن. واتە بۆیە دروستم كردوون كە فەرمانیان پێ بكەم بمپەرستن نەك لەبەر ئەوەی كە پێویستم بە ئەوانە. عەلی كوڕی ئەبو تەلحە دەڵێت لە ئیبنو عەباسەوە ﴿لِيَعْبُدُونِ﴾ واتە: هەتا بەهۆی ئەو پەرستنەی منەوە نزیك بنەوە بە ئارەزوو بێت یان بێ ئارەزوو.[1] خوای گەورە

[1] الطبري (٢٢/٤٤٤).

دەفەرمووێت: ﴿مَآ أُرِيدُ مِنۡهُم مِّن رِّزۡقٖ وَمَآ أُرِيدُ أَن يُطۡعِمُونِ﴾ من هیچ ڕۆزیم لەوان ناوێتو نامەوێت ئەوانە خۆراکم بدەنێ. ﴿إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلرَّزَّاقُ ذُو ٱلۡقُوَّةِ ٱلۡمَتِينُ﴾ هەر خودا ڕۆزی دەنێرێتو خاوەن هێزێکی بتەوە. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودەوە (ڕەزای خوایان لێبێت) دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) ﴿إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلرَّزَّاقُ ذُو ٱلۡقُوَّةِ ٱلۡمَتِينُ﴾ی پێ خوێندم.[1] ئەبو داودو تیرمیزیو نەسائیش ڕیوایەتیان کردووە. تیرمزی دەڵێت: چاكو ڕاستە (حسن صحيح).[2] مانای ئایەتەکە ئەمەیە خوای گەورە بەندەکانی خۆی دروست کردووە بۆ ناسینی خۆی بە تەنها کە کەس نەکەن بە هاوەڵی. هەر کەسێك گوێڕایەڵی فەرمانەکان ببێت پاداشتی بە چاکی دەداتەوە. هەر کەسیش نافەرمانی بکات زۆر بە توندی سزای دەداتو فەرموویەتی کە پێویستی بەوان نیەو بەڵکو ئەوان هەژارنو لە هەموو کاتێکدا پێویستیان بە خودا هەیەو چونکە خۆی وەدیهێنەری ئەوانەو ڕۆزی دەریانە. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو هورەیرەوە (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (ئەی نەوەی ئادەم خۆت یەکلایی بکەرەوە بۆ پەرستنی من سینەت (دڵت) پڕ دەکەم لە دەوڵەمەندیو هەژاریت لەسەر لادەبەم، ئەگەر وا نەکەیت سینەت پڕ دەکەم لە سەرقاڵیو هەژاریشت لەسەر لانابەم).[3] تیرمزیو ئیبنو ماجەیش ڕیوایەتیان کردووە. تیرمزی دەڵێت: فەرموودەیەکی چاكو غەریبە (حسن غريب).[4] وە دەفەرمووێت: ﴿فَإِنَّ لِلَّذِينَ ظَلَمُواْ ذَنُوبٗا مِّثۡلَ ذَنُوبِ أَصۡحَٰبِهِمۡ فَلَا يَسۡتَعۡجِلُونِ﴾ بەهرەی ئەو غەدرکەرانەش وەك بەهرەی ئەوانە دەبێت. کە هاوباوەڕی خۆیان بوون. ئیتر لێم بە پەلە نەبن. واتە بەشی ئەوانەش کە ناهەقیکارن وەك هاوەڵەکانیان دەبێت. پەلەی لێ نەکەن چونکە دێتو ڕوودەداتو گومانی تێدا نیە. وە دەفەرمووێت: ﴿فَوَيۡلٞ لِّلَّذِينَ كَفَرُواْ مِن يَوۡمِهِمُ ٱلَّذِي يُوعَدُونَ﴾ واوەیلا بۆ خوانەناسان، لەو ڕۆژەدا کە بەڵێنیان پێدراوە. واتە: ڕۆژی قیامەت.

---

[1] احمد (٤١٦/١)، فەرموودەیەکی حەسەنی سەحیحە.

[2] ابو داود (٢٩٠/٤)، وتحفة الأحوذي (٢٦١/٨)، النسائي في الكبرى (٤٦٩/٦)، فەرموودەیەکی حەسەنی سەحیحە.

[3] احمد (٣٥٨/٢)، فەرموودەیەکی حەسەنە.

[4] تحفة الاحوذي (١٦٦/٧)، وابن ماجه (١٣٧٦/٢)، فەرموودەیەکی حەسەنە.

# تەفسیری سورەتی ( طور )

## لە مەککە هاتووەتە خوارەوە

### ڕێزی سورەتی ( طور )

مالك ڕیوایەتی کردووە لە جوبەیری کوڕی موتعیمـەوە گـوێم لێ بـوو لـە پێغەمبـەرەوە(ﷺ) لـە نوێـژی مەغریبدا سورەتی (الطور)ی دەخوێند. گوێم لە کەس نەبووە دەنگی ئەوەندە چاك بێت (خۆش بێـت) یـان ئەوەندە باش بیخوێنێت لە ئەو.[1] لە ڕێگای مالکەوە هێناویانـە.[2] وە بوخـاریش ڕیوایـەتی کـردووە لـە ئومـو سەلەمەوە دەڵێت: هاوارم بردە لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) وتم: ئازارم زۆرە، فەرمووی: (لە دوای خەڵکەوە تەواف بکە بە سواری ـ یان سواری ولاغ ـ وتی تەوافم دەکرد لەو کاتەدا پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە تەنیشت ماڵی خودادا (کەعبەدا) نوێژی دەکردو ﴿وَٱلطُّورِ ۝١ وَكِتَٰبٖ مَّسۡطُورٖ﴾ی دەخوێند.[3]

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿وَٱلطُّورِ ۝١ وَكِتَٰبٖ مَّسۡطُورٖ ۝٢ فِي رَقّٖ مَّنشُورٖ ۝٣ وَٱلۡبَيۡتِ ٱلۡمَعۡمُورِ ۝٤ وَٱلسَّقۡفِ ٱلۡمَرۡفُوعِ ۝٥ وَٱلۡبَحۡرِ ٱلۡمَسۡجُورِ ۝٦ إِنَّ عَذَابَ رَبِّكَ لَوَٰقِعٞ ۝٧ مَّا لَهُۥ مِن دَافِعٖ ۝٨ يَوۡمَ تَمُورُ ٱلسَّمَآءُ مَوۡرٗا ۝٩ وَتَسِيرُ ٱلۡجِبَالُ سَيۡرٗا ۝١٠ فَوَيۡلٞ يَوۡمَئِذٖ لِّلۡمُكَذِّبِينَ ۝١١ ٱلَّذِينَ هُمۡ فِي خَوۡضٖ يَلۡعَبُونَ ۝١٢ يَوۡمَ يُدَعُّونَ إِلَىٰ نَارِ جَهَنَّمَ دَعًّا ۝١٣ هَٰذِهِ ٱلنَّارُ ٱلَّتِي كُنتُم بِهَا تُكَذِّبُونَ ۝١٤ أَفَسِحۡرٌ هَٰذَآ أَمۡ أَنتُمۡ لَا تُبۡصِرُونَ ۝١٥ ٱصۡلَوۡهَا فَٱصۡبِرُوٓاْ أَوۡ لَا تَصۡبِرُواْ سَوَآءٌ عَلَيۡكُمۡۖ إِنَّمَا تُجۡزَوۡنَ مَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ۝١٦﴾

### سوێندی خودا لەسەر ڕوودانی ئازارو سزا

خـوای گـەورە سـوێند دەخـوات بـە دروسـتکراوەکانی کـە نیشانەی توانـای گـەورەیی‌و دەسـەڵاتی خۆیـەتی کـە تۆڵـەو ئـازاری ئـەو هـەر ڕوودەدات‌و دێت بەسـەر دوژمنانیـداو بێگومـان کـەس ناتوانێـت بەرهەڵستی بکات لێیان. وە دەفەرموێت: ﴿وَٱلطُّورِ﴾ بە کێوی تور. تور ئەو کێوەیە کـە دارودرەختـی تێدایە وەك ئەو کێوەی کە خوای گەورە لەسەری قسەی لەگەڵ موسا کردو عیساشی هەر لەوێدا نـارد. وە هەر کێوێك دارودرەختی لێ نەبێت پێی ناوترێت تور. بەڵکو پێـی دەوترێـت کێـو (الجبـل). ﴿وَكِتَٰبٖ مَّسۡطُورٖ﴾ بە کتێبێك کە نووسراوە. وتراوە ئەوە (لوح المحفوظ)ە، وە وتراویشە: ئەو کتێبە نوسـراوانەن

---

[1] الموطأ (٧٨/١)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[2] فتح الباري (٢٨٩/٢)، مسلم (٣٣٨/١).

[3] فتح الباري (٤٦٨/٨).

کە هاتوونەتە خوارەوە کە بە ئاشکرا دەخوێنرێتەوە بەسەر مرۆڤدا. بۆیە خودا فەرموویەتی: ﴿فِي رَقٍّ مَّنشُورٍ﴾ لە کەوڵ (پێست) بڵاوبووەتەوە. ﴿وَالْبَيْتِ الْمَعْمُورِ﴾ بە ماڵە ئاوەدانەکە. لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە فەرموودەی شەورەویدا فەرموویەتی دوای تێپەڕبوونی بۆ ئاسمانی حەوتەم: (پاشان بەرزکرامەوە بردمیان بۆ ماڵە ئاوەدانەکە (البيت المعمور) کە هەموو ڕۆژێك حەفتا هەزار دەچنە ناوی کە لێی دەردەچێت جارێکی تر ناگەڕێتەوە ناوی).[1] واتە: خواپەرستی تێدە دەکەن‌و بە دەوریدا دەسوڕێنەوە وەك چۆن خەڵکی زەوی بە دەوری کەعبەدا دەسوڕێنەوە. وە هەر بەو شێوەیە ئەو ماڵە ئاوەدانە کەعبەی خەڵکی ئاسمانی حەوتەمە. هەر لەبەر ئەوەیە کە ئیبراهیمی خەلیل دەبینرێت (عليه الصلاة والسلام) کە پاڵی داوە بەو ماڵە ئاوەدانەوە چونکە ئەو دروستکەری ئەم کەعبەی سەر زەمینە بوو. چونکە پاداشت لە شێوەو جۆری کردارە کە ئەو لە تەنیشت ئەم کەعبەیشە. وە لە هەموو ئاسمانێکدا ماڵێك هەیە کە خەڵکەکەی خواناسی تێدا دەکەن‌و لە نوێژدا ڕووی تێ دەکەن، ئەو ماڵەی کە لە ئاسمانی دنیادایە پێی دەوترێت (بيت العزة) والله أعلم.

خودا دەفەموێت: ﴿وَالسَّقْفِ الْمَرْفُوعِ﴾ بەو بانەی بڵندکراوە. سوفیانی سەوری‌و شوعبەو ئەبول ئەحوەس (ابو الاحوص) لە سەماکەوە ئەویش لە خالدی کوڕی عەرعەرەوە (عرعرة) لە عالیەوە وتوویانە: (السقف المرفوع) واتە: ئاسمان. سوفیان دەڵێت: پاشان ئەم ئایەتەی خوێدن: ﴿وَجَعَلْنَا السَّمَاءَ سَقْفًا مَّحْفُوظًا ۖ وَهُمْ عَنْ آيَاتِهَا مُعْرِضُونَ﴾[2] واتە: وە ئاسمانمان کردووە بە سەقفێکی پارێزراو بەڵام ئەوانە سەبارەت بە ئایەتەکانی ئاسمان پشتتێکەرو ڕوو وەرگێڕ بوون.[3] موجاهیدو قەتادەو سودی‌و ئیبنو جورەیج‌و ئیبنو زەیدیش هەر وایان وتووە. ئیبنو جەریریش هەمان ڕای هەڵبژاردووە.[4]

﴿وَالْبَحْرِ الْمَسْجُورِ﴾ بەو دەریایەی بڵق دەداتو دەکوڵێت. کۆمەڵی زانایان وتوویانە ئەوە ئەم دەریایەیە. وە مەبەستیش بە ﴿الْمَسْجُورِ﴾ واتە: لە ڕۆژی قیامەتدا دادەگیرسێت دەبێت بە ئاگر. وەك ئەم ئایەتە وایە کە دەفەرموێت: ﴿وَإِذَا الْبِحَارُ سُجِّرَتْ﴾[5] واتە: وە دەمێك کە دەریاکان هەڵگیرسێنران

[1] فتح الباري (٦/٣٤٩)، مسلم (١/١٥٠).

[2] الانبياء (٣٢).

[3] الطبري (٢٢/٢٥٧/٢٥٨).

[4] الطبري (٢٢/٤٥٨).

[5] التكوير (٦).

(تێکەڵکران). واتە: دادەگیرسێت و هەڵدەگیرسێت، دەبێت بە ئاگر بڵێسەی دێت بە دەوری ئەو خەڵکەدا لەو ڕۆژەدا کە ڕۆژی قیامەتـە. سـەعیدی کـوڕی موسـەییبیش ڕیوایـەتی کـردووە لـە عـەلی کـوڕی ئـەبو تالیبەوە هەر بەو شێوەیە.[1] وە لە ئیبنو عەباسیشەوە ڕیوایەت کراوە. وە هەر بەو شێوەیە سـەعیدی کوڕی جوبەیرو موجاهیدو عەبدوڵلای کوڕی عوبەیدی کوڕی عومەیر و کەسانی تریش وتوویانە. قـەتادە دەڵێـت: ﴿ٱلْمَسْجُورِ﴾ یـانی: پـڕ (لێـوان لێـو)، ئیبنـو جـەریر هـەمان ڕای هەیـە دەڵێـت چـونکە ئێـستا دانەگیرسـاوە بـەڵکو پـڕە لـە ئـاو. خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿إِنَّ عَذَابَ رَبِّكَ لَوَٰقِعٌ﴾ ئـازاری پەروەردگاری تۆ هەر ڕوودەدات. ئەمە ئەوەیە کە سوێندی لەسەر خوراوە واتـە: دێتـەدی و ڕوودەدات، دێت بەسەر خوانەناساندا وەك خوای مەزن لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿مَّا لَهُۥ مِن دَافِعٍ﴾ کەسیش پێشی پێ ناگرێت. واتـە: هـیچ پارێزەرێك ناتوانێـت پارێزگاریـان لێ بکات. کـە خـوای گـەورە ویـستی ئازاریان بدات. حافیز ئەبو بـەکری کـوڕی ئـەبو دونیـا ڕیوایـەتی کـردووە لـە جەعفـەری کـوڕی زەیـدی عەبدیەوە دەڵێت: شەوێك عومەر چووە دەرەوە دەگەڕا بەسەر خەڵکدا لـە مەدینـە بـە تەنیـشت مـاڵی پیاوێکی موسـڵماندا تێپـەڕی لـەو کاتـەدا بـە پێـوە نوێـژی دەکـرد عومـەر وەسـتاو گـوێی لـە قورئـان خوێندنەکـەی دەگـرت ﴿وَٱلطُّورِ﴾ی خوێنـد هـەتا گەیـشتە ﴿إِنَّ عَذَابَ رَبِّكَ لَوَٰقِعٌ ۝٧ مَّا لَهُۥ مِن دَافِعٍ﴾ وتی: سوێند بـە پـەروەردگاری کەعبـە ڕاستە. دابـەزی لـە گوێدرێژەکـەی و شانی دایە سـەر دیوارێك ماوەیەك بێدەنگ مایەوە پاشان گەڕایەوە بۆ ماڵەوە. مانگێك لە ماڵدا نەخۆش کەوت. خـەڵکی سـەریان لێ دەداو سەرخۆشیان لێ دەکرد. نەیاندەزانی نەخۆشیەکەی چیەو بۆچی نەخۆشە[2].

## باسی ڕۆژی ئازار کە ڕۆژی قیامەتە

خـوای مـەزن دەفـەرموێت: ﴿يَوْمَ تَمُورُ ٱلسَّمَآءُ مَوْرًا﴾ لـەو ڕۆژەدا کـە ئاسمـان دەکەوێتـە جووڵـەو هاتوچۆ. ئیبنو عـەباس و قـەتادە دەڵێـت: دەجولێت و دەچێت بەناو یەکدا.[3] ئیبنـو عـەباس دەڵێـت: لەتبوونی ئاسمـان و پارچەپارچەبوونیەتی. موجاهیـد دەڵێـت: واتـە: سـوڕانەوەیەك دەکـات. زەحـحاك دەڵێت: سوڕان و جوڵانیەتی لەبەر فەرمانی خوداو تێکەڵاو دەبێت بەناو یەکدا.[4] ئیبنو جەریریش هـەمان بۆچوونی هەیە کە جوڵانە بە سوڕخواردنەوە. ﴿وَتَسِيرُ ٱلْجِبَالُ سَيْرًا﴾ هـەموو چیا لـە ڕۆیشتندا پەلـە

---

[1] الطبري (٢٢/٤٥٨).

[2] ذكره المؤلف في مسند عمر (٢/٦٠٨).

[3] الطبري (٢٢/٤٦٢).

[4] الطبري (٢٢/٣٦٢).

دەكەن. واتە دەڕۆن دەبن بە تۆزو دەچن لەناو زەمیندا. ﴿ فَوَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴾ ئیتر ئەو ڕۆژە هاوارە لەو كەسانەی بێباوەڕ بوون. واتە: هاوار بۆ ئەوانە لەو ڕۆژەدا لەبەر ئازارو ئەشكەنجەو تۆڵەی خودا بۆیان. وە دەفەرمووێت: ﴿ الَّذِينَ هُمْ فِي خَوْضٍ يَلْعَبُونَ ﴾ ئەوانە كە چووبوونە ناو پڕوپوچ و گەپیان دەدات. واتە: ئەوانە لە دنیا خەریكو سەرقاڵی شتی پڕوپوچ بوون. گاڵتەو لاقرتیان بە ئاینەكەیان دەكرد. خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ يَوْمَ يُدَعُّونَ إِلَىٰ نَارِ جَهَنَّمَ دَعًّا ﴾ لەو ڕۆژەدا بە پاڵپێوەنان بەرەو ئاگری دۆزەخیان ڕادەكێشن. واتە: پاڵیان پێوەدەنرێتو ڕادەكێشرێت بۆ ناو ئاگری جەهەنەم. موجاهدو شەعبیو موحەممەدی كوڕی كەعبو زەححاكو سودی سەوری دەڵێن: واتە: بە پاڵپێوەنان بەناو جەهەنەمدا دەیانبەن.[1] ﴿ هَٰذِهِ النَّارُ الَّتِي كُنتُم بِهَا تُكَذِّبُونَ ﴾ ئەوەتانێ ئەو ئاگرەی بڕواتان نەدەكرد هەبێت. گزیرەكانی جەهەنەم ئەم قسەیان پێ دەڵێن وەك هەڕەشەلێكردنو زیاتر ترساندنیان. خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿أَفَسِحْرٌ هَٰذَا أَمْ أَنتُمْ لَا تُبْصِرُونَ ﴾ ئاخۆ ئەم جادووە، یان ئێوە كوێربوونو نابینن؟ ﴿ اصْلَوْهَا فَاصْبِرُوا أَوْ لَا تَصْبِرُوا سَوَاءٌ عَلَيْكُمْ إِنَّمَا تُجْزَوْنَ مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ بچنە ناوی، هەڵ بكەن یاخود هەڵ نەكەن، وەكو یەكەو هەر بەهۆی ئەو كارانەی كە كردووتانە سزا دەدرێن. واتە: بچنەن ناوی وەك ئەوانەی كە دەچنە ناوی لە هەموو لایەكیەوە دایاندەپۆشێت. ﴿فَاصْبِرُوا أَوْ لَا تَصْبِرُوا سَوَاءٌ عَلَيْكُمْ ﴾ واتە خۆتان بگرن لەناو سزای جەهەنەمدا یان خۆتان نەگرن وەك یەكە هیچ پەنایەكتان نیە لەوێداو هەرگیز ڕزگارتان نابێت. ﴿إِنَّمَا تُجْزَوْنَ مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ واتە: خوای گەورە ناهەقی بە كەس ناكات بەڵكو هەموو كەسێك بە هۆی ئەو كردارانەی كە كردوویەتی سزا دەدرێتو تۆڵەی لێ دەسەنرێت.

﴿إِنَّ الْمُتَّقِينَ فِي جَنَّاتٍ وَنَعِيمٍ ﴿١٧﴾ فَاكِهِينَ بِمَا آتَاهُمْ رَبُّهُمْ وَوَقَاهُمْ رَبُّهُمْ عَذَابَ الْجَحِيمِ ﴿١٨﴾ كُلُوا وَاشْرَبُوا هَنِيئًا بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿١٩﴾ مُتَّكِئِينَ عَلَىٰ سُرُرٍ مَّصْفُوفَةٍ وَزَوَّجْنَاهُم بِحُورٍ عِينٍ ﴿٢٠﴾﴾

### باسی ژیانو پاشەڕۆژی بەختەوەران

خوای مەزن باسی ژیانی ئەو كەسانەمان بۆ دەكات كە بەختەوەرن لە ڕۆژی دوایداو دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ الْمُتَّقِينَ فِي جَنَّاتٍ وَنَعِيمٍ﴾ ئەوانەی وا خودا ترسی بوون، وان لە بەهەشتو خۆشیدا. ئەمە بە پێچەوانەی ئەوانەی كە لە ناو ئازارو سزادا بوون. وە دەفەرمووێت: ﴿ فَاكِهِينَ بِمَا آتَاهُمْ رَبُّهُمْ وَوَقَاهُمْ

[1] الطبري (٢٢/٢٦٤)، الدر المنثور (٧/٦٣١).

رَبُّهُمۡ عَذَابَ ٱلۡجَحِيمِ﴾ بەختەوەرن لەو شتانەی پـەروەرێنیان پێی بەخشیون، لـە ئـازاری جەهـەنمیش پاراستنی. واتە: خۆشحاڵن بەو شتانەی خودا پێی داون لەو هەموو خۆشییو شادیە جۆری خواردنو خواردنەوەو جلوبەرگی جوانو شوێنی خۆشو هـەموو جۆرە هـۆی گواستنەوەو شتی تـریش جگە لەمانەیش. ﴿وَوَقَىٰهُمۡ رَبُّهُمۡ عَذَابَ ٱلۡجَحِيمِ﴾ واتە: لـە ئـاگری جەهەنـەمیش ڕزگاری کـردنو پاراسـتنی. ئەمە خۆی بۆ خۆی بەهرەیەکی تایبەتیە لەگەڵ ئەوەش چوونە ناو ئەو بەهەشتەی کە پـڕە لـە هـەموو خۆشیەك کە تا ئەو کاتە نە چاو بینیویـەتیو نـە گـوێ بیستوویەتیو نـە بـە خـەیاڵیش بـە دڵـی هیچ کەسـێکدا هـاتووە. خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿كُلُواْ وَٱشۡرَبُواْ هَنِيٓـَٔۢا بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ﴾ لەبـەر کردەوەکانتان بخۆنو بخۆنەوە، نۆشتان بێت. ئەم ئایەتە وەك ئەم ئایەتە وایە کە دەفەرموێت: ﴿كُلُواْ وَٱشۡرَبُواْ هَنِيٓـَٔۢا بِمَآ أَسۡلَفۡتُمۡ فِي ٱلۡأَيَّامِ ٱلۡخَالِيَةِ﴾[1] واتە: (پێیان دەوترێت) بخـۆنو بخۆنـەوە نۆشـتان بێـت بـە هۆی ئەو چاکانەوە کە لە ڕۆژانی ڕابردوودا کردووتانـە. واتـە: بـەهۆی ئـەو کردارانـەی کردووتانـە خـودا ڕێزی لێ گرتـوونو چـاکەی لەگـەڵ کـردوون. وە دەفـەرموێت: ﴿مُتَّكِـِٔينَ عَلَىٰ سُرُرٖ مَّصۡفُوفَةٖۖ وَزَوَّجۡنَٰهُم بِحُورٍ عِينٖ﴾ لەسەر تـەختی لە پەنای یەك. پاڵ کـەوتوونو کیـژی سپی چاو بەڵـەکمان پـێ بەخـشیون. سەوری دەڵێت لە حوسەینەوە (حُصین) حوسـەینیش لـە موجاهیـدەوە ئـەمیش لـە ئیبنـو عەباسـەوە دەڵێت: لەسەر تەختی قوببە واتە خڕ، (مصفوفة) واتە: ڕووبەڕووی یـەك ئـەم ئایەتـە وەك ئـەم ئایەتـە وایە کە دەفـەرموێت: ﴿عَلَىٰ سُرُرٖ مُّتَقَٰبِلِينَ﴾[2] واتـە: لەسـەر تـەختو کورسیە ڕازاوەکـان بەرانبـەر یـەکتر دانیشتوون. وە دەفەرموێت: ﴿وَزَوَّجۡنَٰهُم بِحُورٍ عِينٖ﴾ واتـە: هـاودەمی چـاكو خێزانـی جوانمـان پـێ بەخشیون لە کیژی سپیو چاو بەڵەك. موجاهد دەڵێت: ﴿وَزَوَّجۡنَٰهُم﴾ کردوومانن بە هاوسـەری کیـژی سپیو چاوبەڵەك، لە زۆر شوێندا باسمان کردوون پێویست ناکات لێرەدا دووبارەی بکەینەوە.

﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَٱتَّبَعَتۡهُمۡ ذُرِّيَّتُهُم بِإِيمَٰنٍ أَلۡحَقۡنَا بِهِمۡ ذُرِّيَّتَهُمۡ وَمَآ أَلَتۡنَٰهُم مِّنۡ عَمَلِهِم مِّن شَيۡءٖۚ كُلُّ ٱمۡرِيِٕۭ بِمَا كَسَبَ رَهِينٞ (٢١) وَأَمۡدَدۡنَٰهُم بِفَٰكِهَةٖ وَلَحۡمٖ مِّمَّا يَشۡتَهُونَ (٢٢) يَتَنَٰزَعُونَ فِيهَا كَأۡسٗا لَّا لَغۡوٞ فِيهَا وَلَا تَأۡثِيمٞ (٢٣) ۞ وَيَطُوفُ عَلَيۡهِمۡ غِلۡمَانٞ لَّهُمۡ كَأَنَّهُمۡ لُؤۡلُؤٞ مَّكۡنُونٞ (٢٤) وَأَقۡبَلَ بَعۡضُهُمۡ عَلَىٰ بَعۡضٖ يَتَسَآءَلُونَ (٢٥) قَالُوٓاْ إِنَّا كُنَّا قَبۡلُ فِيٓ أَهۡلِنَا

---

[1] الحاقة (٢٤).

[2] الصافات (٤٤).

مُشۡفِقِينَ ﴿٢٦﴾ فَمَنَّ ٱللَّهُ عَلَيۡنَا وَوَقَىٰنَا عَذَابَ ٱلسَّمُومِ ﴿٢٧﴾ إِنَّا كُنَّا مِن قَبۡلُ نَدۡعُوهُۖ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلۡبَرُّ ٱلرَّحِيمُ ﴿٢٨﴾﴾

**خاوەنباوەڕان تۆرمەو نەوەكانیان موچە دەچنە لایان (ئەگەر خاوەن باوەڕ بن) بەو پلەیەی كە خۆیان تێیدان لە بەهەشتدا**

خوای مەزن باسی ڕێزو منەتو چاكەو سۆزو بەزەیی خۆی دەكات بەرانبەر بەندەكانی كە كاتێك خاوەن باوەڕ وەچەكانی خاوەن باوەڕ بن دەیانگەیەنێت بە باوەكانیان لە پلەدا با كرداریشیان كەمتر بێت لەوانە بۆ ئەوەی چاوو دڵی باوكیان ڕوون بێتەوە بە بینینی كوڕەكانیان بە جوانترین شێوە یەك دەبینن لەگەڵ یەك كۆدەبنەوە ئەوانەی كە كردەوەیان كەمترە بەرزیان دەكاتەوە بۆ پلەی ئەوانەی كە كردەوەیان لەوان زیاترەو هیچ لە پلەی ئەمانیش كەم ناكاتەوە بۆ ئەوەی كە بەرانبەری یەكتربن. بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَٱتَّبَعَتۡهُمۡ ذُرِّيَّتُهُم بِإِيمَٰنٍ أَلۡحَقۡنَا بِهِمۡ ذُرِّيَّتَهُمۡ وَمَآ أَلَتۡنَٰهُم مِّنۡ عَمَلِهِم مِّن شَيۡءٖۚ كُلُّ ٱمۡرِيِٕۭ بِمَا كَسَبَ رَهِينٞ﴾ ئەوانەی باوەڕیان هێناو نەوەكانیشیان چوونە سەر باوەڕی ئەوان، نەوەی ئەمانیش وەك خۆیان دەبەینە بەهەشتو پاداشتی كردەوەیان هیچ شتێك كەم ناكەینەوە، هەموو كەسێك بارمتەی كاری خۆیەتی. سەوری ڕیوایەتی كردووە لە ئیبنو عەباسەوە دەڵێت: خودا پلەی وەچەو منداڵی موسڵمان بەرز دەكاتەوە لەو پلەی كە تێیدان با كردارەكانیشیان كەمتر بێت بۆ ئەوەی چاودڵی ڕوون بكاتەوە پێیان پاشان ئەم ئایەتەی خوێند: ﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَٱتَّبَعَتۡهُمۡ ذُرِّيَّتُهُم بِإِيمَٰنٍ أَلۡحَقۡنَا بِهِمۡ ذُرِّيَّتَهُمۡ وَمَآ أَلَتۡنَٰهُم مِّنۡ عَمَلِهِم مِّن شَيۡءٖۚ كُلُّ ٱمۡرِيِٕۭ بِمَا كَسَبَ رَهِينٞ﴾[1]. ئیبنو جەریرو ئیبنو ئەبی حاتەمیش ڕیوایەتیان كردووە هەر بەو شێوەیە لە فەرموودەی سوفیانی سەوریەوە.[2] وە دیسان ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی كردووە لە ئیبنو عەباسەوە لەم ئایەتەدا كە دەفەرموێت: ﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَٱتَّبَعَتۡهُمۡ ذُرِّيَّتُهُم بِإِيمَٰنٍ أَلۡحَقۡنَا بِهِمۡ ذُرِّيَّتَهُمۡ﴾ دەڵێت: ئەوانە وەچەو منداڵی موسڵمانانن كە بە باوەڕەوە دەمرن هەرچەندە پلەی بابیان لەوان زیاتر بێت دەگەیەنرێن بە پلەی بابیانو لە كرداری هیچ كەم ناكرێتەوە، عەبدوڵڵای كوڕی ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی كردووە لە عەلیەوە كە دەڵێت: خەدیجە پرسیاری كرد لە پێغەمبەر(ﷺ) لە بارەی دوو منداڵیەوە كە لە كاتی نەفامیدا مردبوون، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (ئەوانە لەناو ئاگردان). كاتێك نیگەرانی بە نێوچاوانیەوە بینی فەرمووی: (ئەگەر

---

[1] تفسیر الثوري (٢٨٣)، فەرموودەیەكی مەوقوفە.

[2] الطبري (٢٢/٤٦٧).

شوێنەکانیانت ببینیایە خۆشت نەدەویستن و قینت لێیان بوو)، خەدیجە وتی: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەی منداڵەکەم لە تۆ؟ فەرمووی: (لەناو بەهەشتدایە)، عەلی دەڵێت: پاشان پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (خاوەن باوەڕو منداڵەکانی لەناو بەهەشتدان بتپەرستان و منداڵەکانیان لەناو ئاگردان)، پاشان پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەم ئایەتەی خوێند: ﴿وَالَّذِينَ ءَامَنُوا وَاتَّبَعَتْهُمْ ذُرِّيَّتُهُم بِإِيمَٰنٍ﴾[1].

ئەمە ڕێزی خوای گەورەیە بەسەرە منداڵەوە بەهۆی بەرەکەتی باوانەوە. وە ڕێزو فەزڵی خوایش بەسەر باوکانەوە ئەوەیە کە بە بەرەکەتی دوعای منداڵەکانیان پلەیان بەرزدەکاتەوە. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو هورەیرەوە (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (خوای گەورە پلەی بەندەی چاکی خۆی بەرز دەکاتەوە لەناو بەهەشتدا بەندەچاکەکە دەڵێت: ئەی پەروەردگارم ئەم پلەیەم لە کوێ بوو؟ خوای مەزنیش دەفەرمووێت: بە داوای لێبوردنی منداڵەکەت بووە بۆت).[2] سەنەدەکانی ڕاستن بەڵام بەم شێوەیە نەیانهێناوە، بەڵام نموونەی ئەمە لە سەحیحی مُوسلیمدا هەیە لە ئەبو هورەیرەوە ئەویش لە پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) فەرموویەتی: (کاتێك نەوەی ئادەم مرد کرداریش دەوەستێت و دەبڕێت مەگین لە سێ شتدا نەبێت: خێرێکی بەردەوام و نەبڕاوە، یان زانیاریەك سودی لێ وەربگیردرێت، یان منداڵێکی چاك دوعای بۆ بکات)[3].

## دادپەروەری خودا لەگەڵ گرۆی تاوانباران

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿كُلُّ امْرِئٍ بِمَا كَسَبَ رَهِينٌ﴾ کاتێك خوای گەورە باسی ڕێزی خۆی دەکات لەسەر بەندە چاکەکانی بە بەرزکردنەوەی پلەی منداڵەکانیان بۆ لایان بەبێ ئەوەی لە کرداری و پلەی ئەوان کەم بکاتەوە، باسی دادپەروەری خۆی دەکات کە کەس لە تۆڵە و تاوانی کەسی تردا ناگرێت و وەك فەرموویەتی: ﴿كُلُّ امْرِئٍ بِمَا كَسَبَ رَهِينٌ﴾ واتە هەموو کەسێك بارمتەی کاری خۆیەتی و تاوان و گوناهی کەسی تری نادرێت بەسەردا، با ئەو کەسە کوڕی بێت یان باوکی. وەك خودای مەزن فەرموویەتی: ﴿كُلُّ نَفْسٍ بِمَا كَسَبَتْ رَهِينَةٌ ۝٣٨ إِلَّا أَصْحَٰبَ الْيَمِينِ ۝٣٩ فِي جَنَّٰتٍ يَتَسَاءَلُونَ ۝٤٠ عَنِ الْمُجْرِمِينَ﴾[4] واتە: هەموو کەسێك بارمتەی کردەوەی خۆیەتی، مەگەر هاوەڵانی دەستی ڕاست(چاکەکاران)، کە لە باخاتی بەهەشتدا پرسیار لە یەکتری دەکەن، لە (حاڵی) تاوانباران.

---

[1] أحمد (١/١٣٥).

[2] احمد (٢/٥٠٩)، ئەم فەرموودەیە سەنەدەکانی حەسەنە.

[3] مسلم (٣/١٢٥٥).

[4] المدثر (٣٨ـ٤١).

## باسی شەرابی بەهەشت و خۆشگوزەرانی خەڵکی بەهەشت

خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿وَأَمْدَدْنَٰهُم بِفَٰكِهَةٍ وَلَحْمٍ مِّمَّا يَشْتَهُونَ﴾ هەر میوەیەكو هەر گۆشتێك بۆ خۆیان ئارەزووی دەكەن، پێمان داون. واتە: هەموو جۆرە میوەو گۆشتێك كە حەزی لێ بكەنو مەیلیان لێی بێت لە لایانەو پێمان داون. وە دەفەرمووێت: ﴿يَتَنَٰزَعُونَ فِيهَا كَأْسًا لَّا لَغْوٌ فِيهَا وَلَا تَأْثِيمٌ﴾ پیاڵە پێكتر دەگۆڕنەوە نە هەرزەوێژی تێدایەو نە هۆی تووشی گوناه بوونێك. واتە: پیاڵەی بادە(عارەق) دەدەن بە یەكتری لە بەهەشتدا زەحداك وتوویەتی: ﴿لَّا لَغْوٌ فِيهَا وَلَا تَأْثِيمٌ﴾ قسەی بێ ماناو بێ كەڵكی تێدا ناكەنو قسەی ناشیرینیش ناڵێن وەك ئەوانەی كە لە دنیادا سەرخۆش دەبن. ئیبنو عەباس دەڵێت: (اللغو) واتە: قسەی پڕوپوچ، (التأثیم) واتە: قسەی درۆ.[1] موجاهید دەڵێت: قسە ناڵێنو گوناهباریش نابن. قەتادە دەڵێت: كاتی خۆی كە لەگەڵ شەیتاندا بوون لە دنیا. خوای گەورە ئەو بادەیەی (عارەق) بەهەشتی پاك كردووەتەوە لەو بادە پیسو پڕ ئازارەی دنیا.[2] وەك لە پێشەوە باس كرا سەر پێی نایەشێتو سك ئازاری نیە پیچیو بەو شێوەیە نیە كە ئاگا لە خۆ نەمێنێت هەموو ئەمانەی تێدا لادەبرێت. وایان لێ ناكات كە قسەی بێ ماناو سوك بڵێن یان لە دەمیان دەرچێتو باسی جوانی شێوەو تامی خۆشو شوێنەكەی كردووەو فەرموویەتی: ﴿بَيْضَآءَ لَذَّةٍ لِّلشَّٰرِبِينَ ﴿٤٦﴾ لَا فِيهَا غَوْلٌ وَلَا هُمْ عَنْهَا يُنزَفُونَ﴾[3] واتە: زۆر سپیەو بۆ ئەوانەی دەیخۆنەوە بە لەزەتە، (ئەو شەرابە) نە مێشكیان تێك دەدات نە سەرخۆشو بێ ئاگایان دەكات. وە فەرموویەتی: ﴿لَّا يُصَدَّعُونَ عَنْهَا وَلَا يُنزِفُونَ﴾[4] واتە: نە سەریان پێی دێشێت نە سەرخۆش دەبن پێی. وە لێرەدا فەرموویەتی: ﴿يَتَنَٰزَعُونَ فِيهَا كَأْسًا لَّا لَغْوٌ فِيهَا وَلَا تَأْثِيمٌ﴾. خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَيَطُوفُ عَلَيْهِمْ غِلْمَانٌ لَّهُمْ كَأَنَّهُمْ لُؤْلُؤٌ مَّكْنُونٌ﴾ تازە لاوانی خۆیان دەگەڕێن بەسەریاندا دەڵێی مرواری ناو سەدەفن (لە جوانیو پاكیدا). ئەمە هەواڵە لە بەردەستو خزمەتكا لەناو بەهەشتدا كە وەك مرواری لەناو سەدەفدا وان لە چاكیو شیرینیو پاكو خاوێنیو جوانیو جلوبەرگدا. وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿يَطُوفُ عَلَيْهِمْ وِلْدَٰنٌ مُّخَلَّدُونَ ﴿١٧﴾ بِأَكْوَابٍ وَأَبَارِيقَ

---

[1] الطبري (٢٢/٤٧٤).

[2] الطبري (٢٢/٤٧٤).

[3] الصافات (٤٦-٤٧).

[4] الواقعة (١٩).

﴿وَكَأْسٍ مِّن مَّعِينٍ﴾[1] واتە: تازە لاوی هەمیشەیی بەسەریاندا دەگەڕێن، بە پەرداخ و سوراحیو گەلاسی پڕ لە شەرابی سەرچاوەی ڕەوان. وە دەفەرمووێت: ﴿وَأَقْبَلَ بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ يَتَسَاءَلُونَ﴾ ڕوو لە یەکتری دەکەنو پێکەوە وتووێژیانە. واتە: بەرەو ڕووی یەك دەچنو پرسیار وتووێژ لەگەڵ یەکتر دەکەن لە بارەی کارو ژیانی دنیاوە. ئەمە وەك ئەوانەی کە بادەخۆران چۆن وتوێژ دەکەنو بادەکە کاریان لێ دەکاتو باسی ڕابوردووی خۆیان دەکەن. ﴿قَالُوا إِنَّا كُنَّا قَبْلُ فِي أَهْلِنَا مُشْفِقِينَ﴾ دەڵێن: ئێمە لە پێشوودا لەناو کەسوکاری خۆیان نیگەران بووین. واتە: ئێمە لە ژیانی دنیادا لەناو کەسوکاری خۆماندا دەترساین لە پەروەردگارمانو زۆر لە سزاو ئازاری ئەو نیگەران بووین. ﴿فَمَنَّ اللَّهُ عَلَيْنَا وَوَقَانَا عَذَابَ السَّمُومِ﴾ ئیتر خودا خۆی چاکەی لەگەڵ کردینو لە ئازاری گڕەو هالاوی پاراستینی. واتە: خودا چاکەی لەگەڵ کردینو بەخشینیو پاراستینی لەو ئاگرە ترسناکە. ﴿إِنَّا كُنَّا مِن قَبْلُ نَدْعُوهُ ۖ إِنَّهُ هُوَ الْبَرُّ الرَّحِيمُ﴾ ئێمە لە پێشدا هاوارمان هەر لەو کردووە، هەر ئەویشە خاوەن چاکەی دلۆڤانە. واتە: ئێمە هەر لەو دەپاڕاینەوە خودایش پاڕانەوەکەی لێ وەرگرتین. پاداشتی داینەوەو بەخشینی. هەر ئەویشە خاوەن چاکەی دلۆڤانە.

﴿فَذَكِّرْ فَمَا أَنتَ بِنِعْمَتِ رَبِّكَ بِكَاهِنٍ وَلَا مَجْنُونٍ ﴿٢٩﴾ أَمْ يَقُولُونَ شَاعِرٌ نَّتَرَبَّصُ بِهِ رَيْبَ الْمَنُونِ ﴿٣٠﴾ قُلْ تَرَبَّصُوا فَإِنِّي مَعَكُم مِّنَ الْمُتَرَبِّصِينَ ﴿٣١﴾ أَمْ تَأْمُرُهُمْ أَحْلَامُهُم بِهَٰذَا ۚ أَمْ هُمْ قَوْمٌ طَاغُونَ ﴿٣٢﴾ أَمْ يَقُولُونَ تَقَوَّلَهُ ۚ بَل لَّا يُؤْمِنُونَ ﴿٣٣﴾ فَلْيَأْتُوا بِحَدِيثٍ مِّثْلِهِ إِن كَانُوا صَادِقِينَ ﴿٣٤﴾﴾

## باسی پاکیەتی پێغەمبەر(ﷺ) لەو تاوانانەی کە بتپەرستان دەیانخستە پاڵیو هەڕەشەلیکردنو تەحەدداکردنیان

خوای مەزن فەرمان دەدات بە پێغەمبەرەکەی (ﷺ) کە پەیامی خودا بگەیەنێت بە بەندەکانیو ئاگاداریان بکات لەو قورئانەی کە خودا بۆی ڕەوانە کردووە. پاشان ئەو قسانەی کە ئەو خەڵکە ناوناتۆرەچیو بەدخوانە هەڵیانبەستبوو بۆی بەتاڵی کردەوەو فەرمووی: ﴿فَذَكِّرْ فَمَا أَنتَ بِنِعْمَتِ رَبِّكَ بِكَاهِنٍ وَلَا مَجْنُونٍ﴾ سا وەبیریان بخەرەوە -لە سایەی پەروەردگارتدا- تۆ نە فاڵبینی نە شێتی. واتە: سوپاس بۆ خوا تۆ جادوگەر نیت وەك نەفامو خوانەناسەکانی قورەیش دەیڵێن. جادوگەر: ئەو کەسەیە کە جنۆکە دێتە لایو ئەو هەواڵانەی کە لە ئاسمان وەری دەگرێتو گوێی لێیە بۆی دێنێت. ﴿وَلَا مَجْنُونٍ﴾ شێتیش نیە. شێت: ئەو کەسەیە کە شەیتان دەستی لێ دەوەشێنێتو ئاگای لە خۆی

---

[1] الواقعة (١٧-١٨).

نامێنێت. پاشان خوای گەورە ڕەدی ئەو قسانەیان دەداتەوە کە لە بارەی پێغەمبەرەوە (ﷺ) وتوویانەو هەڵیانبەستووە دەفەرمووێت: ﴿أَمْ يَقُولُونَ شَاعِرٌ نَّتَرَبَّصُ بِهِۦ رَيْبَ ٱلْمَنُونِ﴾ یان پێت دەڵێن: بوێژێکەو چاوەڕوانین هاکا شتێکی لێ هات. واتە: لە کارەساتی دنیادا، ﴿ٱلْمَنُونِ﴾ واتە: مردن. ڕزگارمان دەبێت لە خۆی و ئەو کارەیش دەستی داوەتێ. خودای مەزنیش فەرموویەتی: ﴿قُلْ تَرَبَّصُوا۟ فَإِنِّى مَعَكُم مِّنَ ٱلْمُتَرَبِّصِينَ﴾ بڵێ: ئێوە چاوەڕوان بن ئەوا ئێمەیش وەك ئێوە چاوەڕوانین. واتە: چاوەڕوان بن منیش لەگەڵتان چاوەڕوانی دەکەم. سا بەم زووانە دەزانن و بۆتان دەردەکەوێت کە پاشەڕۆژو سەرکەوتن لە دنیادا بۆ کێ دەبێت. موحەممەدی کوڕی ئیسحاق دەڵێت: لە عەبدوڵلای کوڕی ئەبو نەجیحەوە لە موجاهدەوە لە ئیبنو عەباسەوە (ڕەزای خوایان لێبێت) کاتێك قورەیشیەکان لە دارونەدوە کۆبوونەوە بۆ بڕیاردان لەسەر لەنابردنی پێغەمبەر(ﷺ) یەکێك لەوانە وتی: لە شوێنێکی زۆر قایمدا بەندی بکەن و چاوەڕوانی بکەن هەتا دەمرێت و لەناو دەچێت وەك بوێژەکانی تری پێش ئەم وەك زوهەیرو نابیغە. ئەمیش هەر وەك ئەوان وایە. خوای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە کە دەفەرمووێت: ﴿أَمْ يَقُولُونَ شَاعِرٌ نَّتَرَبَّصُ بِهِۦ رَيْبَ ٱلْمَنُونِ﴾[1] پاشان خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿أَمْ تَأْمُرُهُمْ أَحْلَٰمُهُم بِهَٰذَآ ۚ أَمْ هُمْ قَوْمٌ طَاغُونَ﴾ ئاخۆ لە ڕووی خەونەکانیانەوە دەڵێن، یان هەر خۆیان کۆمەڵێکی لاسارن؟ واتە ئاخۆ ئاوەزیان فەرمانیان پێدەکات ئاوا بڵێن لە بارەی تۆوە لەم قسە پڕوپوچ و بێکەڵکانە کە خۆیان چاك دەزانن کە درۆیەو هەڵی دەبەستن. ﴿أَمْ هُمْ قَوْمٌ طَاغُونَ﴾ واتە: بەڵام ئەوانە گرۆیەکی لاسارو بێ گوێن. سەریان لێ تێکچووەو دان بە ڕاستیدا نانێن و هەر ئەو لاساریەیە وای لێکردوون ئەو قسانەت پێ بڵێن. وە دەفەرمووێت: ﴿أَمْ يَقُولُونَ تَقَوَّلَهُۥ ۚ بَل لَّا يُؤْمِنُونَ﴾ واتە: دەڵێن هەڵی بەستووە. نەخێر ئەوان بێباوەڕن. واتە: دەڵێن ئیشی خۆیەتی و خۆی بە درۆوە هەڵی بەستووە. مەبەستیان ئەم قورئانەیە. خوای گەورەیش فەرموویەتی: ﴿بَل لَّا يُؤْمِنُونَ﴾ واتە: نەخێر بێ دینیەکەیان وای لێکردوون کە ئەم قسانە بڵێن. خودایش دەفەرمووێت: ﴿فَلْيَأْتُوا۟ بِحَدِيثٍ مِّثْلِهِۦٓ إِن كَانُوا۟ صَٰدِقِينَ﴾ ئەگەر ئەوانە ڕاست دەکەن، با وتارێك وەکو ئەم قورئانە بێنن. واتە: ئەگەر ڕاستگۆن لەو قسانەی کە دەیکەن و هەڵیانبەستووە با وەك ئەوەی کە موحەممەد (ﷺ) هێناویەتی لەم قورئانە ئەوانیش بیهێنن. بێگومان ئەگەر ئەوانەو هەموو خەڵکی سەر زەمینیش بە جنۆکەو مرۆڤەوە کۆببنەوە کە وەك نموونەی ئەم قورئانە بێرن ناتوانن بێرنی با دە سورەتیش بێت یان هەر سورەتێکیش بێت هەر ناتوانن بێرنی.

[1] الطبري (٢٢/٤٧٩).

﴿ أَمْ خُلِقُوا۟ مِنْ غَيْرِ شَىْءٍ أَمْ هُمُ ٱلْخَٰلِقُونَ ﴿٣٥﴾ أَمْ خَلَقُوا۟ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ ۚ بَل لَّا يُوقِنُونَ ﴿٣٦﴾ أَمْ عِندَهُمْ خَزَآئِنُ رَبِّكَ أَمْ هُمُ ٱلْمُصَيْطِرُونَ ﴿٣٧﴾ أَمْ لَهُمْ سُلَّمٌ يَسْتَمِعُونَ فِيهِ ۖ فَلْيَأْتِ مُسْتَمِعُهُم بِسُلْطَٰنٍ مُّبِينٍ ﴿٣٨﴾ أَمْ لَهُ ٱلْبَنَٰتُ وَلَكُمُ ٱلْبَنُونَ ﴿٣٩﴾ أَمْ تَسْـَٔلُهُمْ أَجْرًا فَهُم مِّن مَّغْرَمٍ مُّثْقَلُونَ ﴿٤٠﴾ أَمْ عِندَهُمُ ٱلْغَيْبُ فَهُمْ يَكْتُبُونَ ﴿٤١﴾ أَمْ يُرِيدُونَ كَيْدًا ۖ فَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ هُمُ ٱلْمَكِيدُونَ ﴿٤٢﴾ أَمْ لَهُمْ إِلَٰهٌ غَيْرُ ٱللَّهِ ۚ سُبْحَٰنَ ٱللَّهِ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٤٣﴾ ﴾

## چەند پرسیارێك بۆ جێگیرکردنی یەکتا پەرستی (ناسینی خوا بە تەنها)و پوچەڵکردنەوەی فڕوفێڵی بتپەرستان

ئەم ئایەتانە لێرەدا باسی سەلماندنی وەدیهێنان‌و یەکتاپەرستی (ناسینی خوای بە تەنها) کردووەو خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ أَمْ خُلِقُوا۟ مِنْ غَيْرِ شَىْءٍ أَمْ هُمُ ٱلْخَٰلِقُونَ ﴾ ئاخۆ ئەوان هەر لە نەبوو نەهاتوونەتەدی؟ یان خۆیان خۆیان دروست کردووە؟ واتە: ئاخۆ ئەوان پەیدابوون بەبێ ئەوەی کەسێك دروستیان بکات؟ یان خۆیان خۆیانیان وەدی هێناوە. نە لە خۆیانەوە پەیدابوون‌و نە خۆشیان خۆیان دروست کردووە. بەڵکو خوای گەورە دروستی کردوون‌و وەدی هێناون. پاش ئەوەی کە هیچ نەبوون تا باسیان بکرێت بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە جوبەیری کوڕی موتعیمەوە دەڵێت: لە پێغەمبەرم (ﷺ) بیست لە نوێژی مەغریبدا سورەتی (الطور)ی دەخوێند کاتێك گەیشتە ئەم ئایەتانە: ﴿ أَمْ خُلِقُوا۟ مِنْ غَيْرِ شَىْءٍ أَمْ هُمُ ٱلْخَٰلِقُونَ ﴿٣٥﴾ أَمْ خَلَقُوا۟ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ ۚ بَل لَّا يُوقِنُونَ ﴿٣٦﴾ أَمْ عِندَهُمْ خَزَآئِنُ رَبِّكَ أَمْ هُمُ ٱلْمُصَيْطِرُونَ ﴾ دەڵێت لەترساندا وەخت بوو دڵم بفڕێت‌و دەرچێت.[1] ئەم فەرمودەیە لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە لە چەند ڕێگاوە.[2] جوبەیری کوڕی موتعیم هاتبوو بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) دوای ڕوودانی غەزای بەدر بۆ بارتەقادانی (فداء الاسرى) دیل کە لە بەدردا دەستبەسەر کرابوون لەو کاتەدا بتپەرست بوو وە بە بیستنی ئەم ئایەتانە لەم سورەتەدا یەکێك لەو هۆکارانە بوو کە پاڵی پێوەنا تا بێتە ناو ئاینی ئیسلام‌و موسڵمان ببێت لە دوایدا. پاشان خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ أَمْ خَلَقُوا۟ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ ۚ بَل لَّا يُوقِنُونَ ﴾ یان ئەوانن ئاسمانەکان‌و زەمینیان وەدی هێنا؟ نەخێر دیارە ناسەلمێنن. واتە: ئایا ئەوان ئاسمانەکان‌و زەمینیان دروست کرد؟ واتە ئەوان شتی وا ناتوانن ئیتر چۆن هاوەڵ بۆ خوا دادەنێن‌و خۆشیان چاك دەزانن کە هەر خودا وەدیهێنەرەو هاوەڵی نیە بەڵام بێ ئاوەزیان‌و تێ نەگەیشتنیان وای لێ کردوون بەو شێوەیە بکەن. ﴿ أَمْ عِندَهُمْ خَزَآئِنُ رَبِّكَ أَمْ هُمُ

---

[1] فتح الباري (٨/٤٦٩).

[2] فتح الباري (٢/٢٨٩ و ٦/١٩٤ و ٧/٣٧٥)، ومسلم (٣/٣٣٨/٣٣٩).

ٱلۡمُصَيۡطِرُونَ ﴾ یان گەنجینەی پەروەردگارت وا لای ئەوان؟ یان هەر خۆیان هەمەکارەن. واتە: ئایا هەر خۆیان کاربەدەستن‌و هەموو شت‌و دەرگای گەنجینەکان بە دەستی خۆیان؟ ﴿أَمۡ هُمُ ٱلۡمُصَيۡطِرُونَ ﴾ واتە: ئایا ئەوان دەپرسنەوە لە دروستکراوەکان. نەخێر کارەکە بەو شێوەیە نیە بە پێچەوانەوە بەڵکو خوای گەورە خاوەن دەسەڵات‌و کاربەدەستە هەر کارێك بیەوێت‌و مەیلی لێبێت دەیکات. وە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ أَمۡ لَهُمۡ سُلَّمٞ يَسۡتَمِعُونَ فِيهِۖ فَلۡيَأۡتِ مُسۡتَمِعُهُم بِسُلۡطَٰنٖ مُّبِينٍ ﴾ یان پەیژەیێ وایان هەیە گوێی لێوە ڕابگرن؟ کێ لەوان گوێی ڕاگرتووە با بەڵگەیەکی ڕوون بێنێت. واتە: پەیژەیان هەیە بەرز بینەوە بۆ لای مەلەئی ئەعلا، ﴿فَلۡيَأۡتِ مُسۡتَمِعُهُم بِسُلۡطَٰنٖ مُّبِينٍ ﴾ با ئەو کەسانەی کە گوێیان ڕاخستووە بۆیان بەڵگەی ئاشکرا بێنن لەسەر ئەو قسەو کردارانەی کە دەیکەن. واتە: نەخێر هیچ بەڵگەو ڕێگایەکیان نیە بۆ ئەو مەبەستەو نەشیانبووە. پاشان خوای مەزن وەڵامیان دەداتەوە لە بارەی ئەوەی کە کیژیان بۆ خودا بڕیارداوە فریشتەکانیان بە مێیینە داناوەو کوڕەکانیشیان بۆ خۆیان داناوە لە باتی کیژ. بە شێوەیەکی وا ئەگەر هەر یەکێکیان هەواڵی پێ بدرایە بە کیژێك ڕووی ڕەش هەڵدەگەڕاو زۆر دڵگران دەبوو. لەگەڵ ئەوەیشدا فریشتەکانیان بە کیژی خودا دادەناو لەگەڵ خودادا دەیانپەرستن. وەك خودا فەرموویەتی: ﴿ أَمۡ لَهُ ٱلۡبَنَٰتُ وَلَكُمُ ٱلۡبَنُونَ ﴾ ئاخۆ کیژەکان بۆ خودان‌و کوڕەکانیش بەشی ئێوەن؟ ئەمە هەڕەشەیەکی زۆر توندوتیژەو دەبێ وەدی بێت. ﴿أَمۡ تَسۡـَٔلُهُمۡ أَجۡرٗا فَهُم مِّن مَّغۡرَمٖ مُّثۡقَلُونَ ﴾ یان بۆ کرێ داوای شتێکیان لێ دەکەی کە ئەوان لە ژێری دەرنەچن بۆیان زۆر گران بوەستێت؟ واتە: داوای کرێی گەیاندنی ئەو پەیامەی خودایان لێدەکەی کە پیچیان دەگەیەنی، واتە: نەخێر تۆ داوای شتی وایان لێ ناکەیت، ﴿فَهُم مِّن مَّغۡرَمٖ مُّثۡقَلُونَ ﴾ واتە: ئەوانە بە کەمترین شت ناتوانن یارمەتی بدەن‌و زۆر قورس‌و گرانە بە لایانەوە، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ أَمۡ عِندَهُمُ ٱلۡغَيۡبُ فَهُمۡ يَكۡتُبُونَ ﴾ یان نهێنی وایان لایە؟ ئەوانە لەبەری دەنووسنەوە. واتە: ئەو کارە بەو شێوەیە نیە چونکە هیچ کەسێك لە خەڵکی ئاسمانەکان‌و زەمین ئاگاداری نهێنیەکان نین خوای گەورە نەبێت وە دەفەرمووێت: ﴿ أَمۡ يُرِيدُونَ كَيۡدٗاۖ فَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ هُمُ ٱلۡمَكِيدُونَ ﴾ یان ئەوانە دەیانەوێت فێڵێ بکەن؟ خوانەناسان خۆیان فێڵیان لێکراوە. خوای گەورە دەفەرمووێت ئاخۆ ئەوانە بەو قسانەی کە بەرانبەر پێغەمبەر(ﷺ)و ئایینی ئیسلام دەیکەن دەیانەوێت خەڵکی فریو بدەن‌و فێڵ لە پێغەمبەرو (ﷺ) هاوەڵەکانی بکەن هەموو کاتێك فێڵەکانیان بەسەر خۆیاندا دەشکێتەوە بتپەرستان خۆیان فێڵیان لێکراوە. ﴿أَمۡ لَهُمۡ إِلَٰهٌ غَيۡرُ ٱللَّهِۚ سُبۡحَٰنَ ٱللَّهِ عَمَّا يُشۡرِكُونَ ﴾ یان بێجگە خوا پەرستوویەکی تریان هەیە؟ خوا

پاکترە لەو شتانەی کە بە شەریکی دادەنێن. ئەمەی کە بتپەرستان بت دەپەرستن‌و هاوەڵ بۆ خودا دادەنێن خوای گەورە زۆر پێی ناخۆشەو نیگەرانە لێیان. پاشان خوا پاکیەتی خۆی دەردەخات‌و لەو درۆیانەی هەڵیٚ دەبەستن‌و لەو شتانەی کە بە شەریکی ئەویان داناوەو فەرموویەتی: ﴿سُبۡحَٰنَ ٱللَّهِ عَمَّا يُشۡرِكُونَ﴾ واتە: خودا پاکترە لەو شتانە کە بە شەریکی دادەنێن.

﴿وَإِن يَرَوۡاْ كِسۡفٗا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ سَاقِطٗا يَقُولُواْ سَحَابٞ مَّرۡكُومٞ ﴿٤٤﴾ فَذَرۡهُمۡ حَتَّىٰ يُلَٰقُواْ يَوۡمَهُمُ ٱلَّذِي فِيهِ يُصۡعَقُونَ ﴿٤٥﴾ يَوۡمَ لَا يُغۡنِي عَنۡهُمۡ كَيۡدُهُمۡ شَيۡـٔٗا وَلَا هُمۡ يُنصَرُونَ ﴿٤٦﴾ وَإِنَّ لِلَّذِينَ ظَلَمُواْ عَذَابٗا دُونَ ذَٰلِكَ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَهُمۡ لَا يَعۡلَمُونَ ﴿٤٧﴾ وَٱصۡبِرۡ لِحُكۡمِ رَبِّكَ فَإِنَّكَ بِأَعۡيُنِنَاۖ وَسَبِّحۡ بِحَمۡدِ رَبِّكَ حِينَ تَقُومُ ﴿٤٨﴾ وَمِنَ ٱلَّيۡلِ فَسَبِّحۡهُ وَإِدۡبَٰرَ ٱلنُّجُومِ ﴿٤٩﴾﴾

**باسی لاساری بتپەرستان‌و ئازاردانیان**

خوای گەورە باسی لاساریو فیزو خۆبەزلزانینی بتپەرستانمان بۆ دەکات. ئەگەر شت بە چاوی خۆشیان ببینن باوەڕی پیٚ ناکەن‌و دەفەرمووێت: ﴿وَإِن يَرَوۡاْ كِسۡفٗا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ سَاقِطٗا يَقُولُواْ سَحَابٞ مَّرۡكُومٞ﴾ ئەگەر بشبینن پارچەیەك لەم ئاسمانە دادەکەوێت، دەڵێن: هەورێکی پڕ پشتە. واتە: ئەگەر پارچەیەك لەم ئاسمانە بکەوێت بەسەریانداو ئازاریان بدات باوەڕ ناکەن‌و بە ڕاستی نازانن‌و دەڵێن ئەمە هەورێکی چڕوپڕە بەسەر یەکدا کەوتووە. ئەم ئایەتە وەك ئەم ئایەتە وایە کە خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿ وَلَوۡ فَتَحۡنَا عَلَيۡهِم بَابٗا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ فَظَلُّواْ فِيهِ يَعۡرُجُونَ ﴿١٤﴾ لَقَالُوٓاْ إِنَّمَا سُكِّرَتۡ أَبۡصَٰرُنَا بَلۡ نَحۡنُ قَوۡمٞ مَّسۡحُورُونَ﴾[1] واتە: ئەگەر بۆمان بکردنایەتەوە دەرگایەك لە ئاسمانەوەو ئەوان پیایدا بڕۆنە سەرەوە، ئەوسا دەیانوت بێگومان ئێمە چاومان بەستراوە بەڵکو ئێمە کۆمەڵێکین جادوومان لێکراوە. وە دەفەرمووێت: ﴿فَذَرۡهُمۡ حَتَّىٰ يُلَٰقُواْ يَوۡمَهُمُ ٱلَّذِي فِيهِ يُصۡعَقُونَ﴾ سا تۆ لەوانە واز بێنە تا ئەوانە تووشی ڕۆژی خۆیان دەبن، کە ئەو ڕۆژە هەستیان لەبەردا نامێنێت. ئەو ڕۆژەیش ڕۆژی قیامەتە. ﴿يَوۡمَ لَا يُغۡنِي عَنۡهُمۡ كَيۡدُهُمۡ شَيۡـٔٗا وَلَا هُمۡ يُنصَرُونَ﴾ ئەو ڕۆژە فێڵەکەیان هیچ بەهرەیەکیان ناداتیٚ‌و کەسیش بە هانایان نایەت. واتە ئەو فێڵ‌و تەڵەکەبازیەیان سودێکیان پیٚ ناگەیەنێت کە لە دنیادا بەکاریان دەهێنا، هیچ شتێك فریایان ناکەوێت لە ڕۆژی قیامەتدا. ﴿وَلَا هُمۡ يُنصَرُونَ﴾ کەسیش نایەت بە هاواریانەوە. پاشان خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَإِنَّ لِلَّذِينَ ظَلَمُواْ عَذَابٗا دُونَ ذَٰلِكَ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَهُمۡ لَا يَعۡلَمُونَ﴾ بۆ ئەوانەی پیشەیان ناهەقی بووە، جگە لەمەش جەزرەبەی تریان هەیە، بەڵام زۆربەیان نازانن. واتە: پێش جەزرەبەی ڕۆژی

---

[1] الحجر (١٤ــ١٥).

قیامەت لە دنیاشدا جەزرەبە دەدرێن. وەك خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَلَنُذِيقَنَّهُم مِّنَ ٱلْعَذَابِ ٱلْأَدْنَىٰ دُونَ ٱلْعَذَابِ ٱلْأَكْبَرِ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴾[1] واتە: وە بە ڕاستی ئێمە سزای دنیایان پێ دەچێژین جگە لە سزای هەرە گەورەیی دۆزەخ تا بگەڕێنەوە بۆ لای خودا. لەبەر ئەمەیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ﴾ واتە: ئازاریان دەدەین لە دنیاداو تاقیان دەکەینەوە بە زۆر کارەساتی ناخۆش بەڵکو وازبێننو تەوبە بکەنو بگەڕێنەوە، کەچی تێناگەنو بیرناکەنەوە، بەڵکو هەر ئەوەندە سزاکەیان لەسەر نەماو لاچوو دەڕۆنەوە سەر ئەو بارەی کە لەسەری بوون بەڵکو خراپتریش وە لە ئەسەردا هاتووە چەندجار نافەرمانی تۆم کردوو کەچی تۆ لێم ناسێنی؟ خوای گەورەیش فەرموویەتی: ئەی بەندەی خۆم چەندجار تۆم تەندروست کردووە تۆ پێی نازانی؟

**فەرماندان بە پێغەمبەر(ﷺ) بە خۆڕاگریو پەسەندی دانی خودا**

خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿وَٱصْبِرْ لِحُكْمِ رَبِّكَ فَإِنَّكَ بِأَعْيُنِنَا ۖ وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ حِينَ تَقُومُ﴾ بۆ فەرمانی پەروەردگارت خۆڕاگر بە، تۆ بەبەر چاوی ئێمەوەی هەر کاتێك لە جێ ڕادەبی، پەسنی پەروەردەت بدە. واتە: خۆڕاگربە لەمەڕ ئازاردانیانو گوێیان مەدەرێ تۆ بەبەر چاوی ئێمەوەیو لە ژێر چاودێری ئێمەدایوخوا دەتپارێزێت لە خەڵکیو دەفەرمووێت: ﴿وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ حِينَ تَقُومُ﴾ زەححاك دەڵێت: هەڵسە بۆ نوێژ. (سبحانك اللهم وبحمدك وتبارك اسمك وتعالى جدك ولا إله غيرك).[2] موسلیم ڕیوایەتی کردووە لە عومەرەوە لە سەحیحەکەیدا کە پێغەمبەر(ﷺ) ئەمەی لە سەرەتای نوێژدا دەفەرموو.[3] وە ئیمامی ئەحمەدو ئەهلی سوننەکانیش لە ئەبو سەعیدو کەسانی تریشەوە ڕیوایەتیان کردووە کە پێغەمبەر(ﷺ) ئەم دوعایەی دەفەرموو.[4] ئەبو جەوزا دەڵێت: ﴿وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ حِينَ تَقُومُ﴾ واتە: هەڵسای لە خەو یان لە جێگای خەوتن.[5] ئیبنو جەریریش هەر ئەمەی هەڵبژاردووە.[6] وە ئەم فەرمودەیەی کە ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە عوبادەی کوڕی سامتەوە ئەویش لە پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) پشتگیری ئەو ڕایەی پێشەوە دەکات کە فەرموویەتی: هەر کەسێك لە شەودا خەبەری

---

[1] السجدة (٢١).

[2] الطبري (٢٢/٤٨٩).

[3] مسلم (١/٢٩٩).

[4] احمد (٣/٥٠)، ابو داود (١/٤٩٠)، تحفة الاحوذي (٢/٤٧/٥٠)، النسائي (٢/١٣٢)، ابن ماجه (١/٢٦٤/٢٦٥)، لە پێشەوە لە سورەتی فاتیحەدا پلەکەی دیاری کراوە.

[5] القرطبي (١٧/٧٩).

[6] الطبري (٢٢/٤٨٨).

بووەوە و وتی: ((لا إله إلا الله وحده لا شريك له، له الملك وله الحمد، وهو على كل شيء قدير، سبحان الله والحمد لله ولا إله إلا الله والله أكبر ولا حول ولا قوة إلا بالله))، پاشان وتی: (ربي اغفر لي)، يان فەرمووی: پاشان پاڕایەوەو دوعای کرد، دوعاکەی لێ وەردەگیردرێتو قەبوڵ دەبێت ئەگەر هەڵساو دەستنوێژی گرت پاشان نوێژی کرد نوێژەکەی لێ وەردەگیرێت).[1] بوخاری لە سەحیحەکەیداو ئەهلی سوننەیش ڕیوایەتیان کردووە.[2] وە ئیبنو ئەبی نەجیجیش دەڵێت: لە موجاهدەوە: ﴿وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ حِينَ تَقُومُ﴾ واتە: لە هەموو دانیشتنێکی بە کۆمەڵدا. سەوری دەڵێت: لە ئەبو ئیسحاقەوە ئەویش لە ئەبو ئەحوەصەوە: ﴿وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ حِينَ تَقُومُ﴾ واتە کاتێك کەسێك ویستی لەناو کۆمەڵێکدا هەڵسێت بڵێ: سبحانك اللهم وبحمدك.[3] وە لە ئەبو هورەیرەوە ئەویش لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: (هەر کەسێك دانیشت لەناو کۆمەڵێکدا قسەی زۆری کردبوو پێش ئەوەی لەناو ئەو کۆمەڵە هەڵسێت وتی: (سبحانك اللهم وبحمدك أشهد أن لا إله إلاّ أنت أستغفرك وأتوب إليك)، حەتمەن خودای گەورە لێی خۆش بووە لەوەی کە لەو مەجلیسەدا وتوویەتی). تیرمیزی ڕیوایەتی کردووەو قسەی ئەوە. وە نەسائیی لە زیکری شەوو ڕۆژدا هێناویەتی، تیرمیزی دەڵێت: فەرموودەیەکی چاكو ڕاستە[4]. حاکمیش لە موستەدرەکەکەیدا هێناویەتیو دەڵێت سەنەدەکانی لەسەر شەرتی موسلیمە.[5] پاشان خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَمِنَ اللَّيْلِ فَسَبِّحْهُ وَإِدْبَارَ النُّجُومِ﴾ لە شەویشدا شوکری بکەو پەسنی بدەو لەو دەمەشدا کە هەسارە ئاوا دەبن. واتە: یادی خوا بکەو خواپەرستی بکە بە قورئان خوێندنو نوێکردن لە وەختی شەودا. وەك خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَمِنَ اللَّيْلِ فَتَهَجَّدْ بِهِ نَافِلَةً لَكَ عَسَىٰ أَنْ يَبْعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامًا مَحْمُودًا﴾[6] واتە: وە (ئەی موحەممەد(ﷺ)) لە بەشێکی شەودا هەستە شەونوێژ بکە بە قورئان خوێندن تێیدا ئەوە زیادە نوێژی تایبەت بە تۆیە ئومێد وایە پەروەردگارت بتگەیەنێتە پلەو جێگایەکی پەسەندکراو. وە دەفەرمووێت: ﴿وَإِدْبَارَ النُّجُومِ﴾ لە فەرموودەکەی ئیبنو عەباسدا. ئەوە ئەو دوو ڕکاتەیە کە لە پێش نوێژی بەیانیدا دەکرێت. لەبەر ئەوەی ئەو دوو ڕکاتە کاتێك ئەستێرەکان

---

[1] احمد (٣١٣/٥)، فەرموودەیەکی سەحیحە.
[2] فتح الباري (٤٧/٣)، ابو داود (٣٠٥/٥)، تحفة الأحوذي (٣٥٩/٩)، النسائي في الكبرى (٢١٥/٦)، ابن ماجه (١٢٧٦/٢).
[3] القرطبي (٧٨/١٧).
[4] تحفة الأحوذي (٣٩٢/٩)، النسائي في الكبرى (١٠٥/٦)، فەرموودەیەکی سەحیحە.
[5] الحاكم (٥٣٦/١)، سەحیحە.
[6] الاسراء (٧٩).

نامێنن‌و بەرەو ئاوابوون دەچن دەست پێدەکات‌و دەکرێت.[1] وە لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە لە عائیشەوە (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) لەسەر هیچ سونەتێك ئەوەندە توندو بەردەوام نەبووە بە ئەندازەی ئەوەی کە لەسەر دوو ڕکاتی بەیانی بەردەوام بوە.[2] وە لە وتەی موسلیمدا هاتووە: (دوو ڕکاتی بەیانی لە دنیاو لەوەیشی کە تیایەتی)[3].

## تەفسیری سورەتی (النجم)

## لە مەککە هاتووەتە خوارەوە

### یەکەم سورەت کە سوجدەی تێدا هاتە خوارەوە

بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە عەبدوڵلاوە دەڵێت: یەکەم سورەتێك کە سوجدەی تێدا هاتە خوارەوە سورەتی (النجم) بوو دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) سوژدەی بردو ئەوانەش لە دوایەوە بوون هەموو سوژدەیان برد پیاوێك نەبێت کە مشتێك خۆڵی هەڵگرت‌و سوژدەی لەسەر برد. لە پاشان بینیم بە بێباوەڕی کوژرا کە ئومەییەی کوڕی خەلەف بوو.[4] وە بوخاری دیسان لە چەند شوێنێکدا ڕیوایەتی کردووە، موسلیم‌و ئەبو داودو نەسائیش ڕیوایەتیان کردووە لە چەند ڕێگاوە لە ئەبو ئیسحاقەوە هەر بەو شێوەیە[5].

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿وَٱلنَّجۡمِ إِذَا هَوَىٰ ﴿١﴾ مَا ضَلَّ صَاحِبُكُمۡ وَمَا غَوَىٰ ﴿٢﴾ وَمَا يَنطِقُ عَنِ ٱلۡهَوَىٰٓ ﴿٣﴾ إِنۡ هُوَ إِلَّا وَحۡيٞ يُوحَىٰ ﴿٤﴾﴾

### خودا سوێندی خوارد کە ئەم پێغەمبەرە (ﷺ) ڕاستەو بە ئارەزووی خۆی قسە ناکات

شەعبی‌و کەسانی تریش وتوویانە: خودا بە مەیلی خۆی سوێند دەخوات بە هەر دروستکراوێکی خۆی بەڵام دروستکراوەکانی بۆیان نیە سوێند بخۆن بە شتی تر بێجگە لە خودا ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە. خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَٱلنَّجۡمِ إِذَا هَوَىٰ﴾ بە ئەستێرە کاتێك کە ئاوا دەبێت. ئیبنو ئەبی نەجیح دەڵێت: لە موجاهدەوە واتە بە ئەستێرەی سورەیا (ثريا) کاتێك ئاوا دەبێت لە کاتی بەرەبەیاندا.[6] زەححاك دەڵێت: ﴿وَٱلنَّجۡمِ إِذَا هَوَىٰ﴾ واتە: کاتێك شەیتانی پێ ڕەجم دەکرێت وە ئەم

---

[1] الطبري (٣٧٩/٢٢).

[2] فتح الباري (٥٥/٣)، مسلم (٥٠١/١).

[3] مسلم (٥٠١/١).

[4] فتح الباري (٤٨٠/٨).

[5] فتح الباري (٢/٦٤١/٦٤٣/ ٧/٢٠٢٠/ ٣٤٨)، ومسلم (٤٠٥/١)، وابو داود (١٢٢/٢)، النسائي (١٦٠/٢).

[6] الطبري (٤٩٥/٢٢).

ئایەتە وەك ئەم ئایەتە وایە كە دەفەرموێت: ﴿فَلَآ أُقْسِمُ بِمَوَٰقِعِ ٱلنُّجُومِ ﴿٧٥﴾ وَإِنَّهُۥ لَقَسَمٌ لَّوْ تَعْلَمُونَ عَظِيمٌ ﴿٧٦﴾ إِنَّهُۥ لَقُرْءَانٌ كَرِيمٌ ﴿٧٧﴾ فِى كِتَٰبٍ مَّكْنُونٍ ﴿٧٨﴾ لَّا يَمَسُّهُۥٓ إِلَّا ٱلْمُطَهَّرُونَ ﴿٧٩﴾ تَنزِيلٌ مِّن رَّبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾[1] واتە: جا سوێند بێت بە شوێنی (هەڵاتن و ئاوابوونی) ئەستێرەكان، بە ڕاستی ئەم سوێندە ئەگەر بزانن سوێندێكی زۆر گەورەیە، كە بێگومان ئەمە قورئانێكی گەورەو بەڕێزە، لەناو كتێبێكی شاراوەدایە (كە لەوحول مەحفوزە)، جگە لە (فریشتەی) پاكان كەس دەستی لێ نادات، نێردراوەتە خوارەوە لە لایەن پەروەردگاری جیهانیانەوە. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿مَا ضَلَّ صَاحِبُكُمْ وَمَا غَوَىٰ﴾ هاوڕێكەتان بە گوم بووە نە ڕێشی هەڵە كردووە. ئەمە ئەوەیە كە سوێندی لەسەر خوراوە. ئەمەش شایەتیە بۆ پێغەمبەر(ﷺ) كە لەسەر ڕاستەڕێیەو ڕێی لێ هەڵە نەبووەو گومیش نەبووە. وەك ئەو نەفامەی (بێ ئاوەزەی) كە ڕێی لێ تێك دەچێت و ڕێگا دەرناكات و نازانێت، (الغاوی) ئەو زانایە كە ڕاستی دەزانێت و لێی لادەدات بە ئارەزوو ڕێگایەتی تر دەگرێتەبەر. خوای گەورە پێغەمبەرەكەی و ئایینەكەی پاراستووەو پاك ڕاگرتووە لە نموونەی ئەوانەی كە ڕێیان لێ گوم بووە وەك گاورەكان و چەند دەستەیەكی جولەكە. كە شت زانین و شاردنەوەیەو بە پێچەوانەوە كارپێكردنیەتی بەڵام ئەو پێغەمبەرەو (ﷺ) ئەو ئاینە پیرۆزو گەورەیە كە ناردوویەتی بە ئەودا ڕێگایەكی زۆر ڕاست و تەواو ڕێك و ڕەوانە.

## خاوەنی بەزەیی بۆ هەموو جیهانیان لە خۆیەوە قسە ناكات

بۆیە خوای مەزن فەرموویەتی: ﴿وَمَا يَنطِقُ عَنِ ٱلْهَوَىٰٓ﴾ بە ئارەزووی خۆی قسە ناكات. واتە: لە خۆیەوەو بۆ مەبەستێكی تایبەتی خۆی قسە ناكات. ﴿إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْىٌ يُوحَىٰ﴾ هەرچی دەڵێت لە خواوە تێگەیەنراوە. واتە: ئەوە دەڵێت كە خودا فەرمانی پێداوە كە بیگەیەنێت بە مەردم بە تێرو تەواوی و بەبێ زیادو كەم. وەك ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی كردووە. لە ئەبو ئومامەوە كە بیستوویەتی لە پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) دەیفەرموو: (بێگومان دەچنە بەهەشت بە دوعاو لاڵانەوەی پیاوێك كە پێغەمبەر نیە وەك خەڵكی ئەم دوو شوێنە یان وەك خەڵكی یەكێك لەم دوو شوێنە (ڕەبیعەو موزەر)، پیاوێك وتی: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئاخۆ ڕەبیعە لە موزەرنیە؟ فەرمووی: (بێگومان ئەوەی كە دەڵێم هەر ئەوەیە كە دەیڵێم)،[2] ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی كردووە لە عەبدوڵڵای كوڕی عەمرەوە دەڵێت: من هەر شتێكم لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) دەبیست دەمنووسی دەمویست لەبەری بكەم.

---

[1] الواقعة (٧٥ـ٨٠).

[2] احمد (٢٥٧/٥)، ئەم فەرموودەیە سەنەدەكانی حەسەنە.

قورەیشیەکان نەیاندەهێشت بینووسم. وتیان: تۆ هەموو شتێك دەنووسی کە لە پێغەمبەری دەبیستی (ﷺ)، پێغەمبەریش (ﷺ) مرۆڤێکەو لە کاتی توورەبووندا قسە دەکات. وازم هێنا لە نووسینەوە. ئەوەم گێڕایەوە بۆ پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (بنووسەو بەردەوام بە لە نووسین سوێندم بەو کەسەی گیانی منی بە دەستە، غەیری ڕاستی لە منەوە دەرناچێت).[1] ئەبو داودیش ڕیوایەتی کردووە[2].

﴿عَلَّمَهُۥ شَدِيدُ ٱلْقُوَىٰ ﴿٥﴾ ذُو مِرَّةٍ فَٱسْتَوَىٰ ﴿٦﴾ وَهُوَ بِٱلْأُفُقِ ٱلْأَعْلَىٰ ﴿٧﴾ ثُمَّ دَنَا فَتَدَلَّىٰ ﴿٨﴾ فَكَانَ قَابَ قَوْسَيْنِ أَوْ أَدْنَىٰ ﴿٩﴾ فَأَوْحَىٰٓ إِلَىٰ عَبْدِهِۦ مَآ أَوْحَىٰ ﴿١٠﴾ مَا كَذَبَ ٱلْفُؤَادُ مَا رَأَىٰٓ ﴿١١﴾ أَفَتُمَٰرُونَهُۥ عَلَىٰ مَا يَرَىٰ ﴿١٢﴾ وَلَقَدْ رَءَاهُ نَزْلَةً أُخْرَىٰ ﴿١٣﴾ عِندَ سِدْرَةِ ٱلْمُنتَهَىٰ ﴿١٤﴾ عِندَهَا جَنَّةُ ٱلْمَأْوَىٰٓ ﴿١٥﴾ إِذْ يَغْشَى ٱلسِّدْرَةَ مَا يَغْشَىٰ ﴿١٦﴾ مَا زَاغَ ٱلْبَصَرُ وَمَا طَغَىٰ ﴿١٧﴾ لَقَدْ رَأَىٰ مِنْ ءَايَٰتِ رَبِّهِ ٱلْكُبْرَىٰٓ ﴿١٨﴾﴾

**مامۆستای پێغەمبەری ئەمین جوبرەئیل بووە (روح الامین)**

خوای مەزن باسی بەندەو پێغەمبەری خۆی موحەممەد (ﷺ) دەکات کە فریشتەیەکی زۆر زاناو بە توانا هاتووەتە لای فێری ئەو قورئانەی کردووە کە جوبرەئیل بوو. ﴿عَلَّمَهُۥ شَدِيدُ ٱلْقُوَىٰ﴾ فریشتەی فرە توانا فێری کرد. وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِنَّهُۥ لَقَوْلُ رَسُولٍ كَرِيمٍ ﴿١٩﴾ ذِى قُوَّةٍ عِندَ ذِى ٱلْعَرْشِ مَكِينٍ ﴿٢٠﴾ مُّطَاعٍ ثَمَّ أَمِينٍ﴾[3] واتە: بێگومان ئەو قورئانە گوفتاری ڕەوانەکراوێکی پایەبەرزە، بەهێزە لای خاوەنی عەرش (خوای گەورە) خاوەن پایەیە، قسە ڕەوایە لەناو فریشتەدا دەست پاکە. خوای گەورە لێرەیشدا دەفەرموێت: ﴿ذُو مِرَّةٍ فَٱسْتَوَىٰ﴾ فریشتەیەکی بە ئاوەزو فرە زانا کە بە شکڵی خۆی ڕاوەستا. موجاهدو حەسەنو ئیبنو زەید دەڵێن: واتە: زۆر بە توانا.[4] لە فەرموودەی سەحیحدا هاتووە کە ئیبنو عومەرو ئەبو هورەیرە ڕیوایەتیان کردووە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (خێرکردن دروست نیە بکرێت بە دەوڵەمەندو پیاوی زۆر بە تواناو تەندروستو لەش ساغ).[5] ﴿فَٱسْتَوَىٰ﴾ واتە جوبرەئیل (سەلامی خوای لێبێت) حەسەنو موجاهدو قەتادەو ڕەبیعی کوڕی ئەنەس وتوویانە.[6] وە

---

[1] احمد (١٦٢/٢)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[2] ابو داود (٦٠/٤) ، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[3] التكوير (١٩ـ٢١).

[4] الطبري (٤٩٩/٢٢)، القرطبي (٨٥/١٧).

[5] ابو داود (٢٨٦/٢)، النسائي (٩٩/٥) ، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[6] الطبري (٥٠١/٢٢).

دەفـەرمووێت: ﴿وَهُوَ بِٱلْأُفُقِ ٱلْأَعْلَىٰ﴾ لـە کاتێکدا ئـەو بـە ئاسـۆی هەرەبـەرزی ئاسمانـەوە بـوو. واتـە: جوبرەئیل بە شکڵی خۆی لە ئاسۆی هـەرە بـەرزەوە ڕاوەستا. عیکریمـەو کەسانی تـریش وتوویانـە. عیکریمە دەڵێت: ئەو ئاسۆ بەرزەی کە بەیانی لێوەدێتو خۆری لێوە هەڵدێت، موجاهـد دەڵێت: واتـە: خۆرهەڵات[1]. قەتادە دەڵێت: ئەو شوێنەیە کە ڕۆژی لێوە دێت.[2] ئیبنو زەیدو کەسانی تریش هەر وایان وتووە. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لـە عەبدوڵای کوڕی مەسعودەوە کە دەڵێت: پێغەمبـەری خودا(ﷺ) جوبرەئیلی بینی لە شێوەی خۆیدا، شەش سەد باڵی هەبوو هەر یـەکێك لـەو باڵانـە ئاسۆی داپۆشیبوو وە لـە باڵی هـەموو جۆرە مرواریو یاقوتێك دەکەوتـە خـوارەوە کـە خـوای خـۆی لێـی ئاگادارە.[3] تەنها ئەحمەد ئەم فەرموودەیەی هێناوە. وە دیسان ئەحمـەد ڕیوایـەتی کردووە لـە ئیبنـو عەباسەوە دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) داوای کرد لە جوبرەئیل کە لـە شـکڵی خۆیدا چاوی پێی بکـەوێت. جوبرەئیل وتی: داوای لـە خـودا بکـە. پێغەمبـەر(ﷺ) داوای کـرد لـە پـەروەردگاری. لـە ڕۆژهەڵاتـەوە تاریکاییەکی بۆ دەرکەوتو بەرزدەبووەوەو بڵاوبووەوە کاتێك کە پێغەمبەر(ﷺ) چاوی پێی کەوت. لـە هۆش خـۆی چـوو، هاتـە لای پێغەمبـەر(ﷺ) ڕاستی کردەوەو تفەکـەی سـڕی لـەناو دەمیدا.[4] تـەنها ئەحمەد هێناویەتی.

## تەفسیری قاب قوسین

خوای مەزن دەفـەرمووێت: ﴿ثُمَّ دَنَا فَتَدَلَّىٰ﴾ لـە پاشـان نزیـك کەوتـەوەو شـۆڕ دەبـوو. ﴿فَكَانَ قَابَ قَوْسَيْنِ أَوْ أَدْنَىٰ﴾ بە قەد ماڵی (ما بەینی هەردوو سەری کەوان) دوو کەوانان یان نزیکتر. واتە: جوبرەئیل نزیك کەوتەوە لە پێغەمبەر(ﷺ) کاتێك دابەزیە سەر زەمـین بـە ئەنـدازەی نێـوانی دوو سـەری کـەوان، یانی بە ئەندازەی دوو کەوان کاتێك ڕاخرێن موجاهدو قەتادە وتوویانـە.[5] وە وتراویـشە: مەبەسـت پێـی دووری نێوان وەتەری کەوانە تا ئەلاوئەولای کەوانەکە، وە دەفەرمووێت: ﴿أَوْ أَدْنَىٰ﴾ لە پێشەوە باسمان کـرد کـە ئـەم شـێوە بەکارهێنانـە لـە زمـانی عەرەبیـدا بـۆ ئیـسپاتی ئەوەیـە کـە خەبـەری لێ دراوەو زیادنەکردنی بە هیچ شێوەیەك. وەك خـوای گـەورە دەفـەرمووێت: ﴿ثُمَّ قَسَتْ قُلُوبُكُم مِّنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ فَهِيَ

---

[1] القرطبي (۸۸/۱۷).

[2] الطبري (۵۰۱/۲۲).

[3] احمد (۳۹۵/۱)، فەرموودەیەکی حەسەنە.

[4] احمد (۳۲۲/۱)، فەرموودەیەکی مونکەرە.

[5] الطبري (۵۰۳/۲۲)، عبدالرزاق (۲۵۰/۳).

كَٱلْحِجَارَةِ أَوْ أَشَدُّ قَسْوَةً ﴾[1] واتە: لە پاشان دڵتان ڕەق بوو دوای ئەم (هەموو) موعجیزانە دڵتان وەك بەردە بەڵكو زۆر ڕەقترە. وە ئەم ئایەتەیش وەك ئەم ئایەتەی پێش وایە كە دەفەرموێت: ﴿يَخْشَوْنَ ٱلنَّاسَ كَخَشْيَةِ ٱللَّهِ أَوْ أَشَدَّ خَشْيَةً ﴾[2] واتە: لە خەڵكی دەترسان وەك ترسان لە خودا بگرە زیاتریش دەترسان. وە ئەم ئایەتەیش كە دەفەرموێت: ﴿وَأَرْسَلْنَٰهُ إِلَىٰ مِاْئَةِ أَلْفٍ أَوْ يَزِيدُونَ ﴾[3] واتە: ئەوسا بە پێغەمبەرێتی ناردمان بۆ لای سەد هەزار كەس یان زیاتر. واتە: كەمتر نەبوون لەو ژمارەیە بەڵكو ئەوانە سەد هەزاری تەواو بوون یان زیاتر بوون لەو ژمارەیە. ئەمە ڕاستی ئەو ژمارەیە دەگەیەنێتو هیچ گومانیو دوو دڵیەكی تێدا نیەو نەگونجاویشە ئا لێرەدا وە هەروەها ئەم ئایەتەیش: ﴿فَكَانَ قَابَ قَوْسَيْنِ أَوْ أَدْنَىٰ ﴾ تا ئەوەی كە وتمان ئەوەی نزیك بووەتەوە ڕوویدا لە نێوان ئەوو پێغەمبەردا (ﷺ) جوبرەئیل بوو (سەلامی خوای لێبێت) ئەوە قسەی دایكی موسڵمانان عائیشەو ئیبنو مەسعودو ئەبو زەڕو ئەبو هورەیرەیە.[4] كە ئێستا خودا مەیلی لێبێت فەرموودەكانیان دێنینو باسیان دەكەین. ئیبنو جەریر ڕیوایەتی كردووە لە عەبدوڵلای كوڕی مەسعودەوە لەم ئایەتەدا: ﴿فَكَانَ قَابَ قَوْسَيْنِ أَوْ أَدْنَىٰ ﴾ دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (جوبرەئیلم بینی شەش سەد باڵ هەبوو)،[5] بوخاریش ڕیوایەتی كردووە لە تەلقی (طلق) كوڕی غەننامەوە (غنّام) لە زائدەوە ئەمیش لە شەیبانیەوە (الشيباني) دەڵێت: پرسیارم لە زیڕ (زراً) كرد لەم ئایەتە: ﴿فَكَانَ قَابَ قَوْسَيْنِ أَوْ أَدْنَىٰ ۝٩ فَأَوْحَىٰٓ إِلَىٰ عَبْدِهِۦ مَآ أَوْحَىٰ ﴾ دەڵێت: عەبدوڵلا بۆی گێڕاینەوە كە موحەممەد (ﷺ) جوبرەئیلی بینی كە شەش سەد باڵی هەبوو.[6] خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَأَوْحَىٰٓ إِلَىٰ عَبْدِهِۦ مَآ أَوْحَىٰ ﴾ ئەوسا خودا هەر مەبەستێك كەوا ویستی بە عەبدی خۆی ڕایگەیەنێت، ڕایگەیاند. واتە: جوبرەئیل ئەوەی كە ویستی ڕایگەیاند بە بەندەی خودا موحەممەد(ﷺ) یان خودای گەورە ڕایگەیاندە لای بەندەی خۆی موحەممەد(ﷺ) بە هۆی جوبرەئیلەوە هەردوو ماناكە ڕاستە. لە سەعیدی كوڕی جوبەیرەوە وەرگیراوە

[1] البقرة (٧٤).

[2] النساء (٧٧).

[3] الصافات (١٤٧).

[4] الطبري (٢٢/٥٠٤).

[5] الطبري (٢٢/٥٠٣).

[6] فتح الباري (٨/٤٧٦).

کە لەم ئایەتەدا: ﴿فَأَوۡحَىٰٓ إِلَىٰ عَبۡدِهِۦ مَآ أَوۡحَىٰ﴾ دەڵێت: خودا ڕایگەیاندە لای موحەممەد (ﷺ). وە فەرموویەتی: ﴿أَلَمۡ يَجِدۡكَ يَتِيمٗا﴾[1] واتە: ئایا تۆی نەدی بە هەتیوی. وە دەفەرمووێت: ﴿وَرَفَعۡنَا لَكَ ذِكۡرَكَ﴾[2] واتە: وە ناوو ناوبانگتمان بۆ بەرز کردیتەوە.[3] غەیری ئەمیش وتوویانە: خودانیگای کردووەتە لای کە بەهەشت قەدەغەیە لەسەر پێغەمبەران (سەلامی خوایان لێبێت) هەتا تۆ دەچیتە ناوی‌و قەدەغەیە لەسەر هەموو ئومەتەکان (گەلەکان) هەتا ئوممەتەکەی تۆ دەچنەناوی.

### ئایا پێغەمبەر(ﷺ) پەروەردگاری بینی لە شەوی ئیسرادا (الاسراء)

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿مَا كَذَبَ ٱلۡفُؤَادُ مَا رَأَىٰٓ﴾ دڵی ئەو هەرچی دیوە بە درۆ نەبووە. ﴿أَفَتُمَٰرُونَهُۥ عَلَىٰ مَا يَرَىٰ﴾ ئاخۆ لەسەر ئەوەی دیویە کێشەی لەگەڵ دەکەن؟ موسلیم ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەباسەوە دەڵێت: ﴿مَا كَذَبَ ٱلۡفُؤَادُ مَا رَأَىٰٓ ۝١١ أَفَتُمَٰرُونَهُۥ عَلَىٰ مَا يَرَىٰ ۝١٢ وَلَقَدۡ رَءَاهُ نَزۡلَةً أُخۡرَىٰ﴾ سوێند بە خوا بێگومان جارێکی تر جوبرەئیلی بینیوە. واتە: خودای بە دڵی دووجار بینیوە.[4] هەر بەم شێوەیە سەمماك ڕیوایەتی کردووە لە عیکریمەوە ئەویش لە ئیبنو عەباسەوە دیسان بەو شێوەیە.[5] ئەبو سالح‌و سودی‌و کەسانی تریش وتوویانە: پێغەمبەر(ﷺ) دوو جار بە دڵی خودای بینیوە.[6] مەسروق دەڵێت: چوومە لای عائیشە وتم: ئایا پێغەمبەر(ﷺ) پەروەردگاری خۆی بینیوە. عائیشە وتی: تۆ قسەیەکت کردووە موی سەرمی ڕاست کردەوە. وتم: لەسەرخۆبەو ناڕەحەت مەبە، پاشان ئەم ئایەتەی خوێند: ﴿لَقَدۡ رَأَىٰ مِنۡ ءَايَٰتِ رَبِّهِ ٱلۡكُبۡرَىٰٓ﴾ وتی: کەی ئەمە قسەی تۆیە. بەڵکو ئەوە جوبرەئیلە، هەر کەسێك پێی وتی موحەممەد (ﷺ) پەروەردگاری خۆی بینیوە یان شتێکی شاردووەتەوە لەوەی خودا فەرمانی پێکردووە یان ئەو پێنجە دەزانێت کە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥ عِلۡمُ ٱلسَّاعَةِ وَيُنَزِّلُ ٱلۡغَيۡثَ﴾[7] واتە: بە ڕاستی تەنها لای خودایە زانیاری (کاتی هاتنی) ڕۆژی دوایی وە هەر خودا باران دەبارێنێت. ئەوە درۆیەکی گەورەیە بە دەم خوداوە. بەڵکو پێغەمبەر(ﷺ) جوبرەئیلی

---

[1] الضحى (٦).

[2] الشرح (٤).

[3] القرطبي (٥٢/١٧).

[4] مسلم (١٥٨/١).

[5] الطبري (٥٠٧/٢٢).

[6] الطبري (٥٠٨/٢٢).

[7] لقمان (٣٤).

بینیوە، جوبرەئیلیش لە شێوەی خۆیدا دوو جار نەبێت نەیبینوە. جارێك لە (سدرة المنتهی) جارێکی تریش لەسەر ئەسپێکی تیژ کە شەش سەد باڵی هەبوو کەناری ئاسمانی گرتبوو.[1] وە لە سەحیحی موسلیمدا هاتووە لە ئەبو زەڕەوە دەڵێت: پرسیارم کرد لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئایا پەروەردگارت بینیوە؟ فەرمووی: (من دەیبینم نوورێکە) یان (نورێکم بینی).[2] خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَلَقَدْ رَءَاهُ نَزْلَةً أُخْرَىٰ ﴿١٣﴾ عِندَ سِدْرَةِ ٱلْمُنتَهَىٰ﴾ لە لای دارە کنارەکەی ئەو پەڕەوە. ﴿عِندَهَا جَنَّةُ ٱلْمَأْوَىٰٓ﴾ کە لە پاڵ شوێنی بەهەشتە. ئەمە دووهەم جارە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) جوبرەئیلی تێدا بینیوە لەو شێوەیەی کە خودا دروستی کردووە لەسەری کە لە شەوی ئیسرا بوو وە لە ئەوەڵی سورەتی (الاسراء) باسی ئەو فەرموودانەمان کرد کە لەو بارەیەوە هاتبوو بە ڕێگاو وتەکانیشیەوە پێویست ناکات لێرەدا دووبارەی بکەینەوە. ئیمامی ئەحمەدیش ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو مەسعودەوە لەم ئایەتەدا: ﴿وَلَقَدْ رَءَاهُ نَزْلَةً أُخْرَىٰ ﴿١٣﴾ عِندَ سِدْرَةِ ٱلْمُنتَهَىٰ﴾ دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (جوبرەئیلم بینی شەش سەد باڵی هەبوو، لە پەڕەکانی هەموو جۆرە مرواریو یاقوتێکی لێ دەکەوەتە خوارەوەو دەپرژا کە خودا خۆی ئاگادارە پێی).[3] ئەم فەرموودەیە سەنەدەکانی چاکو بەهێزن. دیسان ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە عەبدوڵلای کوڕی مەسعودەوە دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) جوبرەئیلی بینی لە شێوەی خۆیدا کە شەش سەد باڵی هەبوو هەر یەکێك لە باڵەکانی کەنارەی ئاسمانی داپۆشیبوو. هەموو جۆرە مرواریو یاقوتێکی لە باڵی دەباری کە خودا خۆی ئاگادارترە لێی.[4] ئەم فەرموودەیش سەنەدەکانی چاکە. دیسان ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو مەسعودەوە دەیوت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (جوبرەئیلم بینی لەسەر (سدرة المنتهی) کە شەش سەد باڵی هەبوو). پرسیارم کرد لە عاسم لە باڵەکانی نەیدەویست باسی بکات بۆم. وتی: هەندێ لە هاوەڵەکانی بۆیان باس کردم کە باڵی بە ئەندازەی نێوانی ڕۆژهەڵات تا ڕۆژئاوایە.[5] ئەم فەرموودەیەش سەنەدەکانی باشن. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو مەسعودەوە دەیوت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (جوبرەئیل (سەلامی خوای لێبێت) هات بۆ لام بە جلوبەرگێکی هوزەوە مرواری پیا

---

[1] تحفة الأحوذي (٩/١٦٧).

[2] مسلم (١/١٦١).

[3] أحمد (١/٤٦٠)، ئەم فەرموودەیە سەنەدەکانی حەسەنە.

[4] احمد (١/٣٩٥) ، ئەم فەرموودەیە سەنەدەکانی حەسەنە.

[5] احمد (١/٤٠٧) ، فەرموودەیەکی حەسەنە.

هەڵواسرابوو).[١] ئەم فەرموودەیەش دیسان سەنەدەكانی چاكن. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی كردووە لە عامرەوە دەڵێت: مەسروق هاتە لای عائیشە وتی: ئەی دایكی موسڵمانان، ئایا پێغەمبەر(ﷺ) خوای گەورەی بینیوە؟ عائیشە وتی: سبحان الله، مووی سەرم ڕاست بووەوەو وەستا لەو قسەی كردت. تۆ لە كوێی لەو سێ شتەی هەر كەسێك بۆی باس كردی بێگومان درۆی كردووە، هەر كەسێك پێی وتی موحەممەد (ﷺ) خودای خۆی بینیوە درۆی كردووە، پاشان ئەم ئایەتەی خوێند: ﴿لَّا تُدْرِكُهُ ٱلْأَبْصَـٰرُ وَهُوَ يُدْرِكُ ٱلْأَبْصَـٰرَ﴾[٢] واتە: چاوەكانی پەی پێ نابەن‌و ناتوانن ببینن بەڵام ئەو هێزی بینین‌و چاوەكان دەبینێت. ﴿وَمَا كَانَ لِبَشَرٍ أَن يُكَلِّمَهُ ٱللَّهُ إِلَّا وَحْيًا أَوْ مِن وَرَآىِٕ حِجَابٍ﴾[٣] واتە: بۆ هیچ كەس نەبووە كە خوا قسەی لەگەڵدا بكات مەگەر بە سروش یان لە پشت پەردەوە. وە هەر كەسێك هەواڵی دایتێ كە دەزانێت سبەی چی دەبێت بێگومان درۆی كردووە. پاشان ئەم ئایەتەی خوێند: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥ عِلْمُ ٱلسَّاعَةِ وَيُنَزِّلُ ٱلْغَيْثَ وَيَعْلَمُ مَا فِى ٱلْأَرْحَامِ﴾[٤] واتە: بە ڕاستی تەنها لای خودایە زانیاری (كاتی هاتنی) ڕۆژی دواییو هەر خودا باران دەبارێنێت تەنها خودا دەزانێت بەوەی لە منداڵدانی (دایكان)دایە. وە هەر كەسێك هەواڵی دایتێ موحەممەد (ﷺ) شتێكی شاردووەتەوەو نەیگەیاندووە بێگومان درۆی كردووە. پاشان ئەم ئایەتەی خوێند: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ بَلِّغْ مَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ﴾[٥] واتە: ئەی پێغەمبەر(ﷺ) ڕایگەیەنە (بە خەڵك) ئەوەی هێنراوەتەوە خوارەوە بۆت لە لایەن پەروەردگارتەوە. بەڵكو ئەو جوبرەئیلی بینیوە لە شێوەو شكڵی خۆیدا دووجار.[٦] وە ئیمامی ئەحمەد دیسان ڕیوایەتی كردووە لە مەسروقەوە دەڵێت: من لە لای عائیشە بووم وتم: ئایا خوای گەورە نەیفەرمووە: ﴿وَلَقَدْ رَءَاهُ بِٱلْأُفُقِ ٱلْمُبِينِ﴾[٧] واتە: سوێند بە خوا بێگومان (فریشتەی سروشی) دیبوە لە ئاسۆی ڕووندا. ﴿وَلَقَدْ رَءَاهُ نَزْلَةً أُخْرَىٰ﴾ عائیشە دەڵێت: من یەكەم كەسێكی ئەم ئوممەتە بووم كە پرسیارم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) كردوو لەو بارەیەوە. فەرمووی: (بێگومان ئەوە جوبرەئیل بوو).

---

[١] احمد (٤٠٧/١) ، فەرموودەیەكی حەسەنە.

[٢] الانعام (١٠٣).

[٣] الشورى (٥١).

[٤] لقمان (٣٤).

[٥] المائدة (٦٧).

[٦] احمد (٤٩/٦)، ئەم فەرموودەیە سەنەدەكانی لەسەر مەرجی بوخاریو موسلیمە.

[٧] التكوير (٢٣).

نەیبینیوە لە شێوەی خۆیدا کە خودا دروستی کردبوو لەسەری دوو جار نەبێت. چاوی پێی کەوت وەختێك لە ئاسمانەوە دابەزی بۆ سەر زەمین ئەوەندە شێوەی گەورە بوو نێوانی ئاسمان‌و زەمینی گرتبوو[1]. لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە لە فەرموودەی شەعبیەوە بەو شێوەیە[2].

**دا پۆشینی فریشتەکان‌و ڕۆشنایی (النور) ڕەنگەکان‌و داری کەنار (نەبەگ)**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿إِذۡ يَغۡشَى ٱلسِّدۡرَةَ مَا يَغۡشَىٰ﴾ لە کاتێکدا کەنارەکە داپۆشیوە، ئەوەی کە دەبێ داپۆشێت. لە پێشەوە لە فەرموودەکانی ئیسرادا باس کرا کە فریشتەکان داپانپۆشیوە وەك غربان (جۆرە باڵندەیەکە) نوری پەروەردگاریش داپۆشیوەو بە ڕەنگی جۆراوجۆریش داپۆشراوە. من نازانم ئەوانە چیە؟ ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە عەبدوڵلای کوڕی مەسعودەوە دەڵێت: کاتێك شەوڕەوی کرا بە پێغەمبەری خودا(ﷺ) هەتا گەیاندیانە کەنارەکەی ئەو پەڕەوە (سدرة المنتهی) کە لە ئاسمانی حەوتەمە. هەرچی لە زەمینەوە بەرزببێتەوە دەچێتە ئەوێ لەوێ وەردەگیرێت لێی‌و لەوێ لە سەرەوە بێتە خوارەوە تێیدا دەمێنێتەوەو لێی وەردەگیرێت، ﴿إِذۡ يَغۡشَى ٱلسِّدۡرَةَ مَا يَغۡشَىٰ﴾ دەڵێت: پەپولەی لە ئاڵتوون وە دەڵێت: سێ شت بەخشراوە بە پێغەمبەری خودا(ﷺ) پێنج نوێژەکەی پێ بەخشراوە وە کۆتایی سورەتی (البقرة)یشی پێ بەخشراوەو لەو کەسانە بووراوە لە هیچ شتێکدا هاوەڵ بۆ خودا دانانێن لە ئوممەتەکەی کە زۆر لە نارەحەتی‌و لەناوچووندان.[3] تەنها موسلیم ئەم فەرموودەی هێناوە.[4] خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿مَا زَاغَ ٱلۡبَصَرُ وَمَا طَغَىٰ﴾ سۆمای لێ نەگواستووەتەوەو هیچ ڕەشکەو پێشکەشی نەکردووە. ئیبنو عەباس دەڵێت: چاوی بە لای ڕاست‌و چەپدا نەڕۆیشتووە.[5] ﴿وَمَا طَغَىٰ﴾ لای نەداوە لەوەی کە فەرمانی پێکراوە. ئەمەیش ڕەوشتێکە لە ڕەوشتە گەورەکانی کە بریتیە لە خۆڕاگری‌و گوێڕایەڵی چونکە پێغەمبەر(ﷺ) هەڵنەساوە بە هیچ کردارێك مەگەر فەرمانی پێ نەکرابێت. وە زیاد لەوەیشی داوا نەکردووە کە پێی بەخشراوە. وە دەفەرمووێت: ﴿لَقَدۡ رَأَىٰ مِنۡ ءَايَٰتِ رَبِّهِ ٱلۡكُبۡرَىٰٓ﴾ دیارە زۆریش لە نیشانە گەورەکانی پەروەردگاری خۆی دیتوە. ئەم ئایەتە وەك ئەم

---

[1] احمد (٢٤١/٦)،فەرموودەیەکی سەحیحە.

[2] فتح الباري (٤٧٢/٨)، مسلم (٣٥٩/١).

[3] احمد (٤٢٢/١)،فەرموودەیەکی سەحیحە.

[4] مسلم (١٥٧/١).

[5] الطبري (٥٢١/٢٢).

ئایەتە وایە کە دەفەرمووێت: ﴿لِنُرِيَكَ مِنْ ءَايَٰتِنَا ٱلْكُبْرَى﴾[1] واتە: بۆ ئەوەی هەندێ لە موعجیزەو بەڵگە گەورەکانی خۆمانت نیشان بدەین. واتە: ئەوانەی کە نیشانەن لەسەر تواناو گەورەیی ئێمە. زانایانی ئەهلی سوننە ئەم دوو ئایەتە دێننەوەو دەیکەنە بەڵگە لەسەر ئەوە کە ئەو بینینە لەو شەوەدا نەبووەو ڕووی نەداوەچونکە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿لَقَدْ رَأَىٰ مِنْ ءَايَٰتِ رَبِّهِ ٱلْكُبْرَىٰٓ﴾ ئەگەر خودای ببینیایە باسی ئەو بینینەی دەکردو دەیگەیاند بە خەڵکی.

﴿ أَفَرَءَيْتُمُ ٱللَّٰتَ وَٱلْعُزَّىٰ ﴿١٩﴾ وَمَنَوٰةَ ٱلثَّالِثَةَ ٱلْأُخْرَىٰٓ ﴿٢٠﴾ أَلَكُمُ ٱلذَّكَرُ وَلَهُ ٱلْأُنثَىٰ ﴿٢١﴾ تِلْكَ إِذًا قِسْمَةٌ ضِيزَىٰٓ ﴿٢٢﴾ إِنْ هِىَ إِلَّآ أَسْمَآءٌ سَمَّيْتُمُوهَآ أَنتُمْ وَءَابَآؤُكُم مَّآ أَنزَلَ ٱللَّهُ بِهَا مِن سُلْطَٰنٍ ۚ إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّ وَمَا تَهْوَى ٱلْأَنفُسُ ۖ وَلَقَدْ جَآءَهُم مِّن رَّبِّهِمُ ٱلْهُدَىٰٓ ﴿٢٣﴾ أَمْ لِلْإِنسَٰنِ مَا تَمَنَّىٰ ﴿٢٤﴾ فَلِلَّهِ ٱلْءَاخِرَةُ وَٱلْأُولَىٰ ﴿٢٥﴾ ۞ وَكَم مِّن مَّلَكٍ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ لَا تُغْنِى شَفَٰعَتُهُمْ شَيْـًٔا إِلَّا مِنۢ بَعْدِ أَن يَأْذَنَ ٱللَّهُ لِمَن يَشَآءُ وَيَرْضَىٰٓ ﴿٢٦﴾ ﴾

## وەڵامدانەوەی بتپەرستان و باس و ڕوونکردنەوە لەسەر لات و عوززا و هوبەل

خوای گەورە سەرزەنشتی بتپەرستان دەکات لەسەر ئەوەی کە کڕنووش بۆ بتەکان دەبەن و دەیانکەن بە هاوەڵی خوداو دەیانپەرستن، خانوویان لەسەر دروست دەکەن و لە شێوەو شکڵی ئەو کەعبەی کە ئیبراهیمی خەلیل (سەلامی خوای لێبێت) دروستی کرد دەفەرمووێت: ﴿أَفَرَءَيْتُمُ ٱللَّٰتَ وَٱلْعُزَّىٰ﴾ ئاخۆ ئێوە هەر لات و عوززاتان دیوە؟ لات بەردێکی سپی بەخش کراوبوو خانوویەکی لەسەر دروست کرابوو لە تایف لە هەموو لاوە داپۆشرابوو دەرگاوانی هەبوو گۆڕەپانێکی هەبوو زۆر بەڕێزبوو لای خەڵکی تایف. کە بریتی بوو لە هۆزی سەقیف و ئەوانەی کە نزیکی سەقیف بوون شانازیان پێوە دەکردو خۆیان بە گەورەتر دەزانی لە هۆزەکانی تری عەرەب بێجگە لە هۆزی قورەیش. ئیبنو جەریر دەڵێت: ناوی (لات) یان لە ناوی خوداوە (الله) دەرهێنابوو دەیانوت پێی: لات، مەبەستیان مێینەیە لە ئەو، خودا پاک و پیرۆزەو دوورە لەو قسانەی ئەوان. گێڕاویانەتەوە لە ئیبنو عەباس و موجاهدو ڕەبیعی کوڕی ئەنەسەوە کە (اللاّت) بە تەشدیدی تاکە (ت) خوێندوویانەتەوەو وتوویانە: لات پیاوێک بووە لە کاتی نەفامیدا گەنم و جۆی کردووە بە ئارد بۆ حاجییەکان، کاتێک مرد لەسەر گۆڕەکەی دەمانەوە دەیانپەرست.[2] بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەباسەوە (ڕەزای خوای لێبێت) لەم ئایەتەدا:

---

[1] طه (٢٣).

[2] الطبري (٥٢٣/٢٢).

﴿ أَفَرَءَيْتُمُ ٱللَّٰتَ وَٱلْعُزَّىٰ ﴾ دەڵێت: پیاوێك بووە گەنمو جۆی دەهاڕی‌و دەیكرد بە ئارد، ئارد بۆ حاجی.[1] ئیبنو جەریر دەڵێت: هەر بەو شێوەیەش عوززا لە عەزیزەوە هاتووە، درەختێك بوو خانوویەكی بە سەرەوە كرابوو چواردەورەی خانووەكە داپۆشرابوو لە شوێنێك بوو پێیان دەوت نەخلە لە نێوان مەككەو تایفدا بوو، قورەیشیەكان زۆر ڕێزیان لێ دەگرت.[2] وەك ئەبو سوفیان لە غەزای ئوموحددا وتی: ئێمە عوززامان هەیە ئێوە عوززاتان نیە. پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (ئێوەش بڵێن خودا دۆستو یاوەری ئێمەیە ئێوە دۆستو یاوەرتان نیە).[3] بەڵام مەنات لە موشەللەل لە شوێنێك بوو پێیان دەوت قەدیر لە نێوان مەككەو مەدینەدابوو، لە كاتی نەفامیدا خوزاعەو ئەوس‌و خەزرەج زۆر ڕێزیان لێ دەنا لەو شوێنەوە هاواریان دەكرد بۆ حەج هەتا دەگەیشتە مەككە. بوخاریش هەر بەم شێوەیە ڕیوایەتی كردووە لە عائیشەوە.[4] جگە لەم سیانە كە قورئان باسی كردووە بتی تریش هەبوو بەڵام ئەو سیانە بەناوبانگ بوون لە بتەكانی تر بۆیە خودا باسی كردوون. نەسائی ڕیوایەتی كردووە لە ئەبو تومەیلەوە دەڵێت: كاتێك پێغەمبەری خودا(ﷺ) مەككەی ئازاد كرد خالدی كوڕی وەلیدی نارد بۆ نەخلە كە عوززای لێیە. خالد چوو بۆی كە لە سێ درەخت پێكهاتبوو، درەختی تەلح درەختەكانی بڕی ئەو خانووەش كە لەسەری دروست كرابوو ڕوخاندی. پاشان هاتە خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ) هەواڵی دایە. پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (بگەڕێوە بۆ ئەو شوێنە تۆ هیچ شتێكت نەكردووە)، خالد گەڕایەوە كاتێك دەرگاوانەكان چاویان پێی كەوت كە خزمەتی ئەو شوێنەیان دەكرد بۆ فێڵ‌و چەواشەكردن هاواریان دەكردو دەیانوت: عوززا عوززا، خالد لەو كاتەدا هات ژنێكی ڕووتی بینی قژی بەردابووەوەو خۆڵی دەكرد بەسەر خۆیدا خالد دایە بەر شمشێر هەتا كوشتی، پاشان گەڕایەوە بۆ لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) هەواڵی دایە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (ئەوە عوززا بوو).[5] ئیبنو ئیسحاق دەڵێت: لات بتی سەقیف بوو لە تائیف خزمەتچی‌و دەرگاوانی بەنی موعەتیب بوون.[6] منیش دەڵێم: پێغەمبەری خودا(ﷺ) موغیرەی كوڕی شوعبەو ئەبو سوفیانی سەخری كوڕی حەربی بۆ نارد ڕووخاندیان‌و لە شوێنەكەیدا مزگەوتێكیان دروست كرد لە تایف. ئیبنو ئیسحاق دەڵێت: مەنات بتی ئەوس‌و خەزرەج‌و ئەو كەسانەیش كە وەك ئەوان بتپەرست بوون لە یەسریب(مەدینە) لەسەر كەناری دەریا لە موشەللەل لە ناوچەی قودەیە،

---

[1] فتح الباري (٨/٤٧٨).

[2] الطبري (٢٢/٥٢٣).

[3] فتح الباري (٦/١٨٨).

[4] فتح الباري (٨/٤٧٩).

[5] النسائي في الكبرى (٦/٤٧٤)، فەرموودەیەكی غەریبە.

[6] ابن هشام (١/٨٧).

پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەبو سوفیانی سەخری کوڕی حەربی بۆ نارد ڕووخاندی‌و هەندێکیش دەڵێن: عەلی کوڕی ئەبو تالیبی بۆ نارد ڕووخاندی. دەڵێت: زول خەلصەو خەسعەم‌و بجیلەش بتی دەوس‌و ئەو کەسانەی کە لەو وڵاتەدا بوون لە عەرەبەکانلە تەباله.[1] منیش وتوومە: ئەوەی کە لەو شوێنە بوو پێیان دەوت کەعبەی یەمانی وە بەو کەعبەیەش کە لە مەککە بوو پێیان دەوت کەعبەی شامی. پێغەمبەری خودا(ﷺ) جەریری کوڕی عەبدوڵلای بەجەلی بۆ ناردو ڕوخاندی. وە فەلس (فلس ويتن وطيء) ئەوانەی لەو ناوچەیە بوون لە نێوان هەردوو کێوی تەیئی لە نێوان سەلماو ئەجا (ئیبنو هیشام دەڵێت: هەندێ لە زانایان بۆیان گێڕامەوە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) عەلی کوڕی ئەبو تالیبی نارد بۆی‌و ڕووخاندی. دوو شمشێری هەڵبژارد: کە ڕەسوب‌و میخزەمیان پێ دەوتن (الرَّسُوب والمِخزَم) پێغەمبەر(ﷺ) بەخشینی بە عەلی هەردووکیان شمشێری عەلی بوون. ئیبنو ئیسحاق دەڵێت: حومەیر خەڵکی یەمەن خانوویەکیان هەبوو لە صەنعا پێیان دەوت: ڕەییام باسیان دەکرد دەیانوت: سەگێکی ڕەش بووە، ئەو دوو زانا ئایینیەی کە لەگەڵ توبەع پێش هاتنی ئایینی ئیسلام ڕۆیشتن دەریان هێناو کوشتیان. ئیبنو ئیسحاق دەڵێت: ڕەزاء خانووی بەنی ڕەبیعەی کوڕی کەعبی کوڕی سەعدی کوڕی زەیدی مەناتی کوڕی تەمیم بوو.[2] بۆیە مستەوغەری کوڕی ڕەبیعەی کوڕی کەعبی کوڕی سەعدی لە کاتی موسڵمانیدا کە ڕووخاندی دەیوت:

لقد شددت على رضاء شدة    فتركتها قفراً بقاع أسمحا

ئیبنو ئیسحاق دەڵێت: زول کەعابیش بتی بەکروتەغلەب بوو کەکوڕانی وائل‌و ئەیاد بوون لە سەنداد بۆیە ئەعشای کوڕی قەیسی کوڕی سەعلەبە پیایدا هەڵدەدات‌و دەڵێت:

بين الخورنق والسدير وبارق    والبيت ذوالكعاب من سنداد

**وەڵامدانەوەی بتپەرستان لەسەر بیروڕایان لە هاوەڵ دانان بۆ خوداو دانانی نێرینە بۆ خۆیان‌و فریشتەکانیش بە مێینە بۆ خودا**

بۆیە لێرەدا خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ أَفَرَءَيْتُمُ ٱللَّٰتَ وَٱلْعُزَّىٰ ﴿١٩﴾ وَمَنَوٰةَ ٱلثَّالِثَةَ ٱلْأُخْرَىٰٓ ﴾ سێهەمیان کە (مەنات)ەو یەکێکی تر لە بتەکانە؟ پاشانیش فەرموویەتی: ﴿ أَلَكُمُ ٱلذَّكَرُ وَلَهُ ٱلْأُنثَىٰ ﴾ ئاخۆ زاڕۆی ئێوە نێرەو خودایش کیژی هەیە؟ واتە: ئاخۆ ئێوە منداڵی بۆ دادەنێن‌و منداڵەکەیش کیژە. نێرینەش بۆ خۆتان هەڵدەبژێرن‌و دادەنێن. خۆ ئەگەر ئەو دابەشکردنە لە نێوان کەسێکی تری وەک خۆتان بووایە ناڕەوابوو وەک خودا دەفەرموێت: ﴿ تِلْكَ إِذًا قِسْمَةٌ ضِيزَىٰٓ ﴾ ئەگەر وابێت

---

[1] ابن هشام (٨٧/١).
[2] ابن هشام (٨٩/١).

بەشكردنێكی ناڕەوایە. واتە دابەشكردنێكی ناڕەواو خراپە. باشە چۆن ئەو بەشە بۆ خودا بە ڕەوا دەبینن خۆ ئەگەر لە نێوان خەڵكیشدا بكرێت شتێكی ناڕەواو خراپو نەفامانەیە. پاشان خوای گەورە وەڵامیان دەداتەوە نیگەرانە لێیان لەسەر ئەو شتانەی كە لە نێوان خۆیانەوە هێناویانەو ئەو هەموو درۆو قسە هەڵبەستنو خوانەناسیەیان لە بتپەرستنو ناوی خودایان لێ ناوە دەفەرمووێت: ﴿إِنْ هِيَ إِلَّآ أَسْمَآءٌ سَمَّيْتُمُوهَآ أَنتُمْ وَءَابَآؤُكُم مَّآ أَنزَلَ ٱللَّهُ بِهَا مِن سُلْطَٰنٍ ۚ إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّ وَمَا تَهْوَى ٱلْأَنفُسُ ۖ وَلَقَدْ جَآءَهُم مِّن رَّبِّهِمُ ٱلْهُدَىٰٓ﴾ تەنها ئەوانە چەند ناون كە ئێوەو بابو باپیرانتان، ئەوانەتان پێ ناو ناونو خودایش هیچ بەڵگەی پتەوی لە مەڕ ئەوانەوە نەنارد، هەر بەدوای گومان دەكەونو ئەوەی كە دڵیان دەخوازێت، كەچی لای پەروەردگاری خۆشیانەوە ڕێگەیان نیشان دراوە. ﴿إِنْ هِيَ إِلَّآ أَسْمَآءٌ سَمَّيْتُمُوهَآ﴾ واتە: ئەوانە چەند ناوێكن بە ئارەزووی خۆتان هەڵتانبەستوون، ﴿مَّآ أَنزَلَ ٱللَّهُ بِهَا مِن سُلْطَٰنٍ﴾ كە خودا هیچ بەڵگەیەكی نەناردووە لە بارەی ئەوانەوە. ﴿إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّ وَمَا تَهْوَى ٱلْأَنفُسُ﴾ واتە: هیچ بەڵگەیەكیان نیە جگە لەوەی كە شوێنی بابو باپیرانیان نەكەون لەو شتە پڕوپوچانەی كە ئەوان لە پێش ئەمانەوە كردوویانەو پێی هەڵساون. بە ئارەزووی خۆیان بۆ ڕێزلێنان لە بابو باپیرە پێشینەكانیانو مانەوەی دەسەڵات بە دەستیانەوە بەو هۆیەوە. ﴿وَلَقَدْ جَآءَهُم مِّن رَّبِّهِمُ ٱلْهُدَىٰٓ﴾ واتە: وە ئەوانە خوای گەورە پێغەمبەرانی (سەلامی خوای لێبێت) بۆ ناردوون ڕشێگای ڕاستی بۆ ڕۆشن كردوونەتەوە بەو پەیامە ڕاستو ڕۆشنانەو ئەو بەڵگە تێرو تەواوانە. كەچی لەگەڵ ئەمەیشدا شوێنی ناكەونو ملی بۆ دانانەوێنن.

## چاكە وەدەست نایەت بە ئاوات خواستن

پاشان خوای مەزن فەرموویەتی: ﴿أَمْ لِلْإِنسَٰنِ مَا تَمَنَّىٰ﴾ ئاخۆ مرۆڤ چی ئارەزوو بكات بۆی پێك دێت؟ واتە: هیچ كەسێك بە ئاوات خواستن چاكە وەدەست ناهێنێت. خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿لَّيْسَ بِأَمَانِيِّكُمْ وَلَآ أَمَانِيِّ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ﴾[1] واتە: (بەرزیو پاداشت) نە بە ئارەزووی ئێوەیەو نە بە ئارەزووی خاوەن كتێبەكانە.بە ئارەزووی هیچ كەس نیە وا دەزانێت لەسەر ڕاستەڕێیە قسەكەی ڕاست بێتو هەر كەچیش ئارەزوو بكاتو پێی خۆش بێت بۆی بێتەدی. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی كردووە لە ئەبو هورەیرەوە دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (كاتێك یەكێك لە ئێوە

[1] النساء (١٢٣).

ئاواتێکی خواست با سەیر بکات بزانێت ئاوات لەچی دەخوازێت، چونکە نازانێت چی بۆ دەنووسرێت لەو ئاواتەخواریەدا).[1] تەنها ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە. خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿فَلِلَّهِ ٱلْآخِرَةُ وَٱلْأُولَىٰ﴾ ئاخرینو ئەوەلینیش هەر بۆ خودان. واتە: هەرچی فەرمانە هەمووی بە دەستی خودایە خاوەنی دنیاو قیامەتە هەموو شتێك لە دنیاو قیامەتدا بە ئیزنو بڕیاری ئەو دەبێت. هەرچی مەیلی لێی بێت دەبێتو هەرچیش مەیلی لێ نەبێت نابێت.

## تکاکردن نیە بە ئیزنی خودا نەبێت

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَكَم مِّن مَّلَكٍ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ لَا تُغْنِي شَفَٰعَتُهُمْ شَيْـًٔا إِلَّا مِنۢ بَعْدِ أَن يَأْذَنَ ٱللَّهُ لِمَن يَشَآءُ وَيَرْضَىٰٓ﴾ لەو هەموو ئاسمانانەدا، چەند بە چەند فریشتە هەیە، کەسیان تکای لێ وەرناگیرێت مەگین کەسێك دوای خودا ئیزنی بداتو تکا بۆ کەسێکی بکات کە خۆی حەز بکاتو پێی ڕازی بێت. وەك خودای گەورە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿مَن ذَا ٱلَّذِي يَشْفَعُ عِندَهُۥٓ إِلَّا بِإِذْنِهِۦ﴾[2] واتە: کێیە ئەو کەسەی لەو ڕۆژەدا بتوانێ تکات لە لای بکات مەگەر بە ڕێپێدانی خۆی . وە فەرموویەتی: ﴿وَلَا تَنفَعُ ٱلشَّفَٰعَةُ عِندَهُۥٓ إِلَّا لِمَنْ أَذِنَ لَهُۥ﴾[3] واتە: وە تکاکردن لای خوا سودی نییە مەگەر بۆ کەسێك ئەو (خوا) ڕێگە بدات. کاتێك فریشتە ڕێزدارو نزیکەکان توانای تکاکردنیان نەبێت بە ئیزنی خودا نەبێت ئەی نەفامینە ئێوە چۆن بە تەمای تکاکردن لەو بتو هاوەڵانەن لە لای خودای گەورە کە خودا بڕیاری نەداوەو ڕازی نییە کە ئەو بتانە بپەرستن بەڵکو لەسەر زمانی هەموو پێغەمبەران پێی وتوون کە بتپەرستی نەکەنو دوور بکەونەوە لە بتپەرستیو لە هەموو کتێبەکانیشدا کە ناردوویەتی داوای کردووە کە دوور بکەونەوە لە بتپەرستیو وازی لێ بێنن.

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْآخِرَةِ لَيُسَمُّونَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةَ تَسْمِيَةَ ٱلْأُنثَىٰ ﴿٢٧﴾ وَمَا لَهُم بِهِۦ مِنْ عِلْمٍ ۖ إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّ ۖ وَإِنَّ ٱلظَّنَّ لَا يُغْنِي مِنَ ٱلْحَقِّ شَيْـًٔا ﴿٢٨﴾ فَأَعْرِضْ عَن مَّن تَوَلَّىٰ عَن ذِكْرِنَا وَلَمْ يُرِدْ إِلَّا ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا ﴿٢٩﴾ ذَٰلِكَ مَبْلَغُهُم مِّنَ ٱلْعِلْمِ ۚ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن سَبِيلِهِۦ وَهُوَ أَعْلَمُ بِمَنِ ٱهْتَدَىٰ ﴿٣٠﴾﴾

[1] احمد (٢/٣٥٧)، فەرموودەیەکی حەسەنە.

[2] البقرة (٢٥٥).

[3] سبأ (٢٣).

### وەڵام دانەوەی بتپەرستان لەسەر ئەوەی کە وا دەزانن فریشتەکان کیژی خودان

خوای مەزن ناڕەزایی خۆی دەردەبڕێت لەوەی کە بتپەرستەکان فریشتەکان بە مێینە دەزانن‌و کردوویانن بە کیژی خودا. خودا پاك‌و پیرۆزە‌و دوورە لەو شتانە. خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ الَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِالْآخِرَةِ لَيُسَمُّونَ الْمَلَائِكَةَ تَسْمِيَةَ الْأُنْثَىٰ﴾ ئەو کەسانەی بڕوا بە پاشەڕۆژ ناکەن، فریشتەکان بە ناوی کچان ناو دەبەن. وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ وَجَعَلُوا الْمَلَائِكَةَ الَّذِينَ هُمْ عِبَادُ الرَّحْمَٰنِ إِنَاثًا ۚ أَشَهِدُوا خَلْقَهُمْ ۚ سَتُكْتَبُ شَهَادَتُهُمْ وَيُسْأَلُونَ﴾[1] واتە: وە ئەو فریشتانەی کە بەندەی خوای بەخشندەن بە مێینەیان دادەنان ئایا ئەوان بە دیاری دروستکردنیانەوە بوون بێگومان ئەو شایەتیانەیان دەنووسرێت‌و پرسیاریان لێ دەکرێت. بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَمَا لَهُمْ بِهِ مِنْ عِلْمٍ ۖ إِنْ يَتَّبِعُونَ إِلَّا الظَّنَّ ۖ وَإِنَّ الظَّنَّ لَا يُغْنِي مِنَ الْحَقِّ شَيْئًا﴾ کە هیچیشیان لێ نازانن، هەر وە شوێن گومان دەکەون‌و گومانیش جێی ڕاست ناگرێت. واتە: هیچ زانیارێکی ڕاستیان لا نیە کە ببێتە پاڵپشتی ئەو قسانەی کە کردوویانە بەڵکو هەمووی درۆو بوختان‌و قسەی هەڵبەستراوو بێ دینیەکی ئاشکرایە. ﴿إِنْ يَتَّبِعُونَ إِلَّا الظَّنَّ ۖ وَإِنَّ الظَّنَّ لَا يُغْنِي مِنَ الْحَقِّ شَيْئًا﴾ واتە: گومانیش هیچ سودێکی نیەو هیچ دەردێك دەرمان ناکات، لەگەڵ ڕاستیدا لە یەکەوە دوورن هەرگیز جێگای ڕاستی ناگرێتەوە. لە فەرموودەی سەحیحدا هاتووە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (خۆ بپارێزن لە گومان بردن چونکە گومان بردن درۆترین قسەیە)[2]. واتە درۆیەکی ئێجگار گەورەیە.

### فەرماندان بە وازهێنان لە کۆمەڵی نادروست‌و دنیا پەرست

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ فَأَعْرِضْ عَنْ مَنْ تَوَلَّىٰ عَنْ ذِكْرِنَا وَلَمْ يُرِدْ إِلَّا الْحَيَاةَ الدُّنْيَا ﴾ تۆ لەو مرۆڤە واز بێنە کە لە یادی ئێمە کردن خۆ دەبوێرێت‌و بە دەر لە ژینی دنیایە هیچی تری نەویستووە. واتە واز لەوانە بێنە کە پشتی کردووەتە ڕاستی‌و لێی دوورکەوتووەتەوە. ﴿وَلَمْ يُرِدْ إِلَّا الْحَيَاةَ الدُّنْيَا﴾ واتە: هەموو هەوڵ‌و خۆماندووکردنێکی تەنها بۆ ژیانی دنیایەو هەر ئەوەندەی لێ دەزانێت کە ئەمەیش خواست‌و بەهرەیەکی بێ خێرو بێرە. بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ ذَٰلِكَ مَبْلَغُهُمْ مِنَ الْعِلْمِ﴾ واتە: هەوڵدان بۆ دنیاو گەڕان بە شوێنی دنیا هەموو ئاوات‌و مەبەستێکیان بووە. وە لە دوعایەکی (المأثور)دا هاتووە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەفەرمووێت: (ئەی خودایە وامان لێ نەکەی کە هەر خەریکی دنیا

---

[1] الزخرف (١٩).

[2] فتح الباري (٥/٤٤١).

بین‌و وابزانین دنیا هەموو شتێکە).[1] وە دەفەرمووێت: ﴿ ذَٰلِكَ مَبْلَغُهُم مِّنَ ٱلْعِلْمِ ۚ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن سَبِيلِهِۦ وَهُوَ أَعْلَمُ بِمَنِ ٱهْتَدَىٰ ﴾ هەر ئەوەندەی لێ دەزانن،پەروەردگارت زاناترە کە کێ ڕێگەی لێ تێکچووەو کێش لەسەر ڕێگەی ئەو چووە. واتە: خودا وەدیهێنەری هەموو دروستکراوەکانیەتی. وە هەر ئەویش باش دەزانێت چی چاکە بۆ بەندەکانی. ئەو خودایەی کە مەیلی لە هەر کەسێك بێت ڕێی نیشان دەدات‌و مەیلیشی لێبێت گومڕای دەکات. ئەمانە هەموو لە زانیاری‌و تواناو لە کارزانی خۆیەتی. ئەو خودایەکی دادپەروەرە کە هەرگیز ستەم لە کەس ناکات لەوەی کە دەیکات‌و دایدەنێت.

﴿ وَلِلَّهِ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ لِيَجْزِىَ ٱلَّذِينَ أَسَٰٓـُٔوا۟ بِمَا عَمِلُوا۟ وَيَجْزِىَ ٱلَّذِينَ أَحْسَنُوا۟ بِٱلْحُسْنَى (٣١) ٱلَّذِينَ يَجْتَنِبُونَ كَبَٰٓئِرَ ٱلْإِثْمِ وَٱلْفَوَٰحِشَ إِلَّا ٱللَّمَمَ ۚ إِنَّ رَبَّكَ وَٰسِعُ ٱلْمَغْفِرَةِ ۚ هُوَ أَعْلَمُ بِكُمْ إِذْ أَنشَأَكُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ وَإِذْ أَنتُمْ أَجِنَّةٌ فِى بُطُونِ أُمَّهَٰتِكُمْ ۖ فَلَا تُزَكُّوٓا۟ أَنفُسَكُمْ ۖ هُوَ أَعْلَمُ بِمَنِ ٱتَّقَىٰٓ (٣٢) ﴾

**خودا ئاگای لە هەموو شتێکە گەورەو بچووك‌و پاداشت‌و سزای هەموو دەداتەوە هەر کەسەو بە پێی خۆی**

خوای گەورە باسی خۆی دەکات کە هەر ئەوە خاوەنی ئاسمانەکان‌و زەمین‌و بێ نیازە لە هەموو شتێك‌و فەرمانڕەواو دادپەروەرە بەسەر بەندەکانیداو هەر ئەویشە دروستکراوەکانی بە ڕاستی وەدی هێناوە. وە دەفەرمووێت: ﴿ وَلِلَّهِ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ لِيَجْزِىَ ٱلَّذِينَ أَسَٰٓـُٔوا۟ بِمَا عَمِلُوا۟ وَيَجْزِىَ ٱلَّذِينَ أَحْسَنُوا۟ بِٱلْحُسْنَى ﴾ هەرچی لە ئاسمانەکان‌و زەمیندان، گشتی بۆ خودان، تا سزای ئەوانە بدات کە خراپەیان کردووەو چاکەی باشیش دەربارەی کارچاکان بکات. واتە: پاداشت‌و سزای هەموو کەسێك بە کردەوەی خۆی بداتەوە ئەگەر چاکەی کردووە بە چاکەو ئەگەر خراپەیشی کردووە بە خراپە.

**ڕەوشتی پیاوچاکان‌و لێبوردنی تاوانی بچووك بەڵام تاوانی گەورە نابورێت**

پاشان خوای گەورە باسی کارچاکان دەکات کە ئەو کەسانەن دووردەکەونەوە لە تاوانە گەورەکان‌و ناشیرینەکان. واتە: تاوانە قەدەغەو گەورەکان ناکەن‌و با هەندێ تاوانی بچووکیش بکەن‌و ڕووبدات لێیان، خوای گەورە لێیان دەبوورێت‌و بۆیان دادەپۆشێت، وەك خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿ إِن تَجْتَنِبُوا۟ كَبَآئِرَ مَا تُنْهَوْنَ عَنْهُ نُكَفِّرْ عَنكُمْ سَيِّـَٔاتِكُمْ وَنُدْخِلْكُم مُّدْخَلًا كَرِيمًا ﴾[2] واتە: ئەگەر دوور بکەونەوە لەو تاوانە گەورانەی کە لێتان قەدەغەکراوە ئەوە تاوانە

---

[1] تحفة الأحوذي (٩/٤٧٦)، فەرموودەیەکی حەسەنە.

[2] النساء (٣١).

بچووکەکانتان بۆ دەپۆشێن و دەتانخەینە شوێنێکی چاک و ڕێزدارەوە. وە لێرەشدا فەرموویەتی:

﴿ ٱلَّذِينَ يَجْتَنِبُونَ كَبَٰٓئِرَ ٱلْإِثْمِ وَٱلْفَوَٰحِشَ إِلَّا ٱللَّمَمَ ۚ إِنَّ رَبَّكَ وَٰسِعُ ٱلْمَغْفِرَةِ ۚ هُوَ أَعْلَمُ بِكُمْ إِذْ أَنشَأَكُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ وَإِذْ أَنتُمْ أَجِنَّةٌ فِى بُطُونِ أُمَّهَٰتِكُمْ ۖ فَلَا تُزَكُّوٓا۟ أَنفُسَكُمْ ۖ هُوَ أَعْلَمُ بِمَنِ ٱتَّقَىٰٓ ﴾ ئەوانەی خۆیان دوور دەگرن لە گوناهە مەزنەکان و کاری پیس و خراپ، مەگەر گوناهی وردیلە نەبێت، پەروەردگارت بەخشینی زۆر بەرفراوانە و پان و بەرینە. ئەویش ئێوە لە خۆتان باشتر دەناسێت، کاتێك ئێوەی لەم زەوییە پەیدا کردووە. کە لە پێشدا کۆرپەلەیەك بوون لەناو سکی دایکتان.هیچ پاکانەی خۆتان مەکەن. بۆ خۆی باشترتان دەناسێت کە کێ لە خودا ترساوترە. ﴿إِلَّا ٱللَّمَمَ﴾ ئەمە لێرەدا ئیستیسنای مونقەتیعە چونکە ﴿ٱللَّمَمَ﴾ بریتیە لە تاوانە بچووك و کردارە ناشیرین و بێزراوەکان. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەباسەوە دەڵێت: هیچ شتێکم نەبینیوە و چاو پێ نەکەوتووە کە لە ﴿ٱللَّمَمَ﴾ بچێت لەو فەرموودەیە نەبێت کە لە ئەبو هورەیرەوە دەڵێت: کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (خودای مەزن لەسەر گرۆی ئادەمی بەشی خۆیانی لە زینا نوسیووە دەبێت هەر توش ببن ڕزگاریان نابێت لێی. زینای چاو ڕوانینە زینای زمان قسەکردنە و زینای نەفسیش ئاوات خواستن و ئارەزووکردنە، عەیبیش دەیهێنێتە دی یان بە درۆی دەخاتەوە).[1] لە هەردوو سەحیحەکەدا هێناویانە.[2] ئیبنو جەریر ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو مەسعودەوە دەڵێت: زینای چاو سەیرکردنە، زینای هەردوو لێو ماچکردنە، زینای هەردوو دەست، دەست لێدانە، زینای هەردوو پێ ڕۆیشتنە بۆی عەیبیش بەجێی دێنێت یان بە درۆی دەخاتەوە. ئەگەر بە عەیب (الفرج) بەجێی هێناو کردی ئەوە زیناو داوێن پیسیە، ئەگەر بەجێی نەهێنا بە عەیب ئەوە لەمەمە (گوناهی بچووکە).[3] مەسروق و شەعبیش هەر وایان وتووە.[4] عبدالرحمنی کوڕی نافیع دەڵێت: کە پێیان دەوت: ئیبنو لەبابەی تائفی پرسیارم کرد لە ئەبو هورەیرە لەم فەرموودەی خوای گەورە ﴿إِلَّا ٱللَّمَمَ﴾ ئەبو هورەیرە وتی: ماچ کردن و چاوهەڵتەکاندن و سەیرکردن و هەڵسان لەو ئیشەیە، کاتێك جێ خەتەنە گەیشت بەجێ خەتەنەی خۆشۆردن واجب دەبێت ئەوەیش زینایە[5].

---

[1] احمد (٢/٢٧٦)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[2] فتح الباري (١١/٢٨)، مسلم (٤/٢٠٤٦).

[3] الطبري (٢٢/٥٣٧).

[4] الطبري (٢٢/٥٣٧).

[5] الطبري (٢٢/٥٣٧).

## هەڵنان بۆ گەڕانەوە لە گوناهو نەهی کردن لە پاکانە لەخۆکردن

خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿إِنَّ رَبَّكَ وَاسِعُ الْمَغْفِرَةِ﴾ واتە: بەزەیی خودا هەموو شتێك دەگرێتەوەو لێبوردنی هەموو تاوانەکان دادەپۆشێت بۆ کەسێك کە بیەوێت واز بێنێت لە گوناهەو بگەڕێتەوە. وەك خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿قُلْ يَا عِبَادِيَ الَّذِينَ أَسْرَفُوا عَلَى أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا مِن رَّحْمَةِ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ جَمِيعًا إِنَّهُ هُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ﴾[1] واتە: (ئەی موحەممەد(ﷺ)) بڵێ: ئەی بەندەکانم ئەی ئەواتنەی کە خۆتان زۆر گوناهبار کرلادووە نائومێد مەبن لە میهرەبانیو بەزەیی خودا بێگومان خوا لە هەموو گوناهەکانتان خۆش دەبێت بە ڕاستی هەر ئەوە لێبوردەی بەبەزەییە. وە دەفەرموویت: ﴿هُوَ أَعْلَمُ بِكُمْ إِذْ أَنشَأَكُم مِّنَ الْأَرْضِ﴾ ئەو چاك دەتانبینێتو ئاگاداری ژیانو هەموو کردارو گفتارێکتانە کە دەیکەنو لێتان ڕوودەدات لەو کاتەوە کە بابتانی دروست کرد لە زەمینو وەچەکانی لە پشتی ئەو وەدی هێنا وەك تۆرمەکانی زەمین (الذّر) پاشان دابەشی کردوون بە دوو دەستە: دەستەیەك بۆ بەهەشتو دەستەیەکیش بۆ ناو ئاگر. وەك دەفەرموویت: ﴿وَإِذْ أَنتُمْ أَجِنَّةٌ فِي بُطُونِ أُمَّهَاتِكُمْ﴾ ئەو فریشتەی کە پێی سپێردراوە ڕۆزیو ژیانو مردنو کرداریو بەدبەختە یان بەختەوەرە؟ هەمووی نووسیووە. وە دەفەرموویت: ﴿فَلَا تُزَكُّوا أَنفُسَكُمْ﴾ واتە: پاکانە بۆ خۆتان مەکەنو وەسفو سوپاسی خۆ بکەنو بە کردارەکانتان خۆتان هەڵبڕن، ﴿هُوَ أَعْلَمُ بِمَنِ اتَّقَى﴾ وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ يُزَكُّونَ أَنفُسَهُم بَلِ اللَّهُ يُزَكِّي مَن يَشَاءُ وَلَا يُظْلَمُونَ فَتِيلًا﴾[2] واتە: ئایا سەیری ئەوانەت نەکردووە کە خۆیان بە پاكو چاك دەزانن (وا نییە) بەڵکو هەر کەسێکی بوێت پاكو خاوێنی دەکاتو کەمترین ستەمیان لێ ناکرێت (با بە ئەندازەی ئەو دەزووە باریکەی ناوکی خورمایش بێت). موسلیم ڕیوایەتی کردووە لە سەحیحەکەیدا لە موحەممەدی کوڕی عەمری کوڕی عەتائەوە دەڵێت: کچێکی خۆم ناونا بەڕڕە زەینەبی کچی ئەبو سەلەمە پێی وتم: پێغەمبەری خودا(ﷺ) نەهی کردووە لەم ناوە. منیش ناو نرام بەڕڕە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (پاکانە مەکەن بۆ خۆتان خودا ئاگادارترە بە ئەهلی چاکە لەناو ئێوەدا)، وتیان: ئەی ناو بنێین چی؟ فەرمووی: (ناوی بنێن زەینەب).[3] وە لە فەرموودەدا هاتووە کە ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە عبدالرحمنی کوڕی ئەبی بەکرەتەوە

---

[1] الزمر (٥٣).

[2] النساء (٤٩).

[3] مسلم (١٦٨٧/٣).

ئـەویش لـە بابیـەوە دەڵێـت: پیاوێـك وەسـفی پیـاوێكی لـە لای پێغەمبـەردا كـرد (ﷺ)،پێغەمبـەری خودا(ﷺ) فـەرمووی: (هـاوار بـۆ تـۆ ملـی هاوەڵەكـەت قرتانـد چـەندجار فـەرمووی كاتێـك یـەكێكتان وەسفی هاوەڵەكەی خۆی كردو ناچار بوو با بڵێ فلانەكەس بە باش دەزانم خودایش دەزانێت پاكانە بۆ كەس ناكەم بەسەر خودادا، وادەزانم ئاواو ئاوایـە ئەگـەر ئـەو شـتەی دەزانـی وایـە).[1] واتـە ئەگـەر بـەو شێوەیە بوو. وە هەر بەم شێوەیە بوخاریو موسلیمو ئـەبو داودو ئیبنـو ماجـە ڕیوایـەتیان كـردووە.[2] ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی كردووە لە هەممامی كوڕی حارسەوە دەڵێت: پیاوێـك هـات بـۆ لای عوسمـان وەسفی كرد لە لای خۆیدا. وتی میقدادی كـوڕی ئەسـوەد خـۆڵی هەڵپژانـد بـە دەمو چاوی پیاوەكـەدا دەیوت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمانی پێ كردین كاتێك كە تووشی ئـەو كەسـانە بـووین كـە وەسـفی خەڵكیان ڕووبەڕوو دەكرد خۆڵ بكەین بە دەموچاویاندا.[3] موسـلیمو ئـەبو داودیـش ڕیوایـەتیان كـردووە بەو شێوەیە[4].

﴿ أَفَرَءَيْتَ ٱلَّذِى تَوَلَّىٰ ﴿٣٣﴾ وَأَعْطَىٰ قَلِيلًا وَأَكْدَىٰٓ ﴿٣٤﴾ أَعِندَهُۥ عِلْمُ ٱلْغَيْبِ فَهُوَ يَرَىٰٓ ﴿٣٥﴾ أَمْ لَمْ يُنَبَّأْ بِمَا فِى صُحُفِ مُوسَىٰ ﴿٣٦﴾ وَإِبْرَٰهِيمَ ٱلَّذِى وَفَّىٰٓ ﴿٣٧﴾ أَلَّا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ ﴿٣٨﴾ وَأَن لَّيْسَ لِلْإِنسَٰنِ إِلَّا مَا سَعَىٰ ﴿٣٩﴾ وَأَنَّ سَعْيَهُۥ سَوْفَ يُرَىٰ ﴿٤٠﴾ ثُمَّ يُجْزَىٰهُ ٱلْجَزَآءَ ٱلْأَوْفَىٰ ﴿٤١﴾ ﴾

## باسی خراپی ئەو كەسانەی كە پشت دەكەنە فـەرمانی خـوداو چـرووكنو مـاڵ كـەم دەبەخـشنو ڕەددانەوەیان

خوای گـەورە باسـی خراپـی ئەوكەسـانەدەكات كـە پـشت دەكەنـە فـەرمانی خـوداو دەفـەرموێت: ﴿ أَفَرَءَيْتَ ٱلَّذِى تَوَلَّىٰ ﴾ ئـاخۆ تـۆ ئـەو مرۆڤـەت دی كـە پـشتی هـەڵكردو ڕۆیـی. وەك خـوای گـەورە لـە سورەتی قیامەتـدا فەرموویـەتی: ﴿فَلَا صَدَّقَ وَلَا صَلَّىٰ ﴿٣١﴾ وَلَٰكِن كَذَّبَ وَتَوَلَّىٰ﴾[5] واتـە: جـا (كـافر) نـە بـڕوای هێناو نە نوێژی كرد، بەڵكو ئایینی بە درۆ دەزانیو پـشتی تێـدەكرد. وە دەفـەرموێت: ﴿ وَأَعْطَىٰ قَلِيلًا وَأَكْدَىٰٓ﴾ كەمی بەخشیو چروكی كـرد. ئیبنـو عـەباس دەڵێـت: كـەمێكی بەخـشیو پاشـان بـڕی ئـیتر

---

[1] احمد (٥/٤٦/٤١)، فەرموودەیەكی سەحیحە.

[2] فتح الباري (٥/٣٢٤/ ١٠/٤٩١/٥٦٧)، مسلم (٤/٢٢٩٦)، ابو داود (٥/١٥٤)، ابن ماجە (٢/١٢٣٣).

[3] احمد (٦/٥)، فەرموودەیەكی سەحیحە.

[4] مسلم (٤/٢٢٩٧)، ابو داود (٥/١٥٣).

[5] القیامة (٣١ـ٣٢).

نەیبەخشی. موجاهدو سەعیدی کوڕی جوبەیرو عیکریمەو قەتادەو کەسانی تریش هەر وایان وتووە.[1]

عیکریمەو سەعید دەڵێن: وەك ئەو کەسانە وایە کە بیرێکیان لێدەدا (چاوەنەیەکیان هەڵدەکەند) لەو کاتەدا بەردێك ڕێگای پێگرتن کە بیرەکە تەواو هەڵکەنن لەو کاتەدا دەڵێن: (أكْدَينا) واز لە کارکردن دێنن.

وە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿أَعِندَهُۥ عِلْمُ ٱلْغَيْبِ فَهُوَ يَرَىٰٓ﴾ ئاخۆ بە نەدیار دەزانێتو خۆی دەیبینێت. واتە ئاخۆ ئەو کەسەی کە دەستی دەگرێتەوەو ماڵ نابەخشێتو دەیبڕێتو دەترسێت لە هەژاری بە نەدیار دەزانێت کە ئەوەی دەیبەخشێت تەواو دەبێتو نامێنێت؟ واتە: بەو شێوەیە نیە ئەوەی ئەو دەزانێت، بەڵکو لەبەر چروکیو چاوچنۆکی ئەو خێرو چاکەو پەیوەندی خزمایەتیە دەبڕێتو پێی هەڵناسێت. بۆیە لە فەرموودەیەکدا هاتووە: (ماڵ ببەخشە لە خاوەنی عەرش مەترسە کەمی بکاتەوە).[2]

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَمَآ أَنفَقْتُم مِّن شَىْءٍ فَهُوَ يُخْلِفُهُۥ ۖ وَهُوَ خَيْرُ ٱلرَّٰزِقِينَ﴾[3] واتە: وە ئێوە هەر شتێك ببەخشن ئەوە خوا جێگەی پڕ دەکاتەوەو ئەو (خوا) چاکترینی ڕۆزی دەرانە.

## باسی ڕوو پەڕەکانی (صحف) موسا و ئیبراهیم

خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿ أَمْ لَمْ يُنَبَّأْ بِمَا فِى صُحُفِ مُوسَىٰ ﴾ یان لەوە ئاگا نەکراوە لە ڕووپەڕەکانی موسا چی نووسراون؟ ﴿ وَإِبْرَٰهِيمَ ٱلَّذِى وَفَّىٰٓ ﴾ یان ئیبراهیم، کە ئەرکی خۆی بە تەواوی بەجێ هێنا. سەعیدی کوڕی جوبەیرو سەوری دەڵێن: ئەوەی کە فەرمانی پێکرابوو هەمووی گەیاند.[4] ئیبنو عەباس دەڵێت: ﴿وَفَّىٰٓ﴾ ئەوەی خودا فەرمانی پێکرد بەجێی هێنا.[5] سەعیدی کوڕی جوبەیر دەڵێت: ﴿وَفَّىٰٓ﴾ ئەوەی کە فەرمانی پێکرابوو پێی.[6] قەتادە دەڵێت: ﴿وَفَّىٰٓ﴾ فەرمانی خودای بەجێ هێناو پەیامەکەی گەیاند بە بەندەکانی ئەم قسەیە قسەی ئیبنو جەریریشە. قسەکانی پێش خۆشی دەگرێتەوە ئەم ئایەتەیش شایەتی دەدات: ﴿وَإِذِ ٱبْتَلَىٰٓ إِبْرَٰهِۦمَ رَبُّهُۥ بِكَلِمَٰتٍ فَأَتَمَّهُنَّ ۖ قَالَ إِنِّى جَاعِلُكَ لِلنَّاسِ إِمَامًا﴾[7] واتە: (بیربکەنەوە) کاتێك خوا ئیبراهیمی تاقی کردەوە بە چەند بڕیارو فەرمایشتێك کە

---

[1] الطبري (٥٤١/٢٢). الطبري (٥٤٢/٢٢).

[2] الطبراني (١٩١/١٠)، ئەم فەرموودەیە سەنەدەکانی لاوازە.

[3] سبأ (٣٩).

[4] الطبري (٥٤٤/٢٢).

[5] الطبري (٥٤٣/٢٢).

[6] الطبري (٥٤٤/٢٢).

[7] البقرة (١٢٤).

ئـەویش بـەجێی هێنـان، (خـوا) فـەرمووی: بێگومـان مـن تـۆ دەکـەم بـە پێـشەوای خـەڵکی. هەڵـسا بەبەجێهێنانی هەموو فەرمانەکانو وازی لە هەموو قەدەغەکراوەکان هێنا. پەیامەکەی بە تێرو تـەواوی گەیاندو شایستەی ئەو بوو کە ببێتە پێشەواو شوێن پێی هەڵگیرێت (کە مەردم بـە شـوێنیدا بـڕۆن) لـە هەموو بـارێکی ژیـانو کـرداروو گفتاریـدا. خـوای گـەورە فەرموویـەتی: ﴿ ثُمَّ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ أَنِ ٱتَّبِعْ مِلَّةَ إِبْرَٰهِيمَ حَنِيفًاۖ وَمَا كَانَ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴾[1] واتـە: پاشـانا نیگامـان بـۆ کـردی کـە پـەیڕەوی ئـایینی ئیـبراهیم بکـە چـونکە پـاکو ڕاسـت بـوو بـە هـیچ جۆرێـك لـە هاوبـەش دانـەران نـەبوو. تیرمیـزی لـە جامیعەکەیدا ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو دەرداو ئەبو زەڕەوە. لە پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) ئەمیش لە خوای گەورە کە فەرموویەتی: ((ئەی بنی ادم چوار ڕکات نوێژم بۆ بکـە لـە ئـەوەڵی ڕۆژەوە مـن بەسـم بۆت –قەرەبووت بۆ دەکەمەوە– لە کۆتاییەکەیدا))[2].

## هیچ کەس ئۆباڵی کەس لە ڕۆژی قیامەتدا وە ئەستۆ ناگرێت

پاشان خوای گـەورە باسـی ئـەو فـەرمانو بڕیارانـە دەکـات کـە لـە ڕووپـەڕاوی سـوحفی ئیبراهیمو موسادا هاتووەو ڕوونی کردووەتەوەو فەرموویەتی: ﴿أَلَّا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ﴾کە کەس ئۆباڵی کەسی تر وەئەستۆ ناگرێت. واتە: هەر کەس ناهەقی لە خۆی کرد بە خوانەناسی بێت یان بـە هـەر تاوانێك بێت ئۆباڵەکەی لەسەر شانی خۆیەتی ناکەوێتە سەر شانی کەسێکی تـرو کەسـی تـر ئۆباڵەکـەی هـەڵناگرێت وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَإِن تَدْعُ مُثْقَلَةٌ إِلَىٰ حِمْلِهَا لَا يُحْمَلْ مِنْهُ شَيْءٌ وَلَوْ كَانَ ذَا قُرْبَىٰٓ﴾[3] واتـە: وە ئەگەر بارگرانی (گوناهبارێك) بانگی کەسێك تر بکات بۆ هەڵگرتنی (بارە گوناهەکەی) هیچ لەو (بارە گوناهە) هەڵناگرێت هەرچەندە (داوالێکراوەکە) خزمیـشی بێـت. وە دەفـەرموێت: ﴿ وَأَن لَّيْسَ لِلْإِنسَٰنِ إِلَّا مَا سَعَىٰ ﴾ مرۆڤ بۆ خۆی خەبات دەکات. هیچ پاداشتێکی پێ ناگات. واتە: وەك چۆن ئۆبـاڵی کـەس نادرێت بەسەریدا هـەر بـەو جـۆرە هـیچ پاداشـتێکیش وەرناگرێـت مەگـەر ئـەوەی کـە خـۆی بـۆ خـۆی وەدەستی دێنێت. بەڵام ئـەو فەرموودەیـە کـە موسـلیم ڕیوایـەتی کـردووە لـە سـەحیحەکەیدا لـە ئـەبو هورەیرەوە کە دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (کاتێـك مـرۆڤ مـرد کردارەکـانی دەبڕێـتو نامێنێت لە سێ شتدا نەبێت: لە منـداڵێکی چـاك کـە دوعـای خێـری بـۆ بکـات یـان خێرێکـی بـەردەوام

---

[1] النحل (١٢٣).

[2] تحفة الاحوذي (٢/٥٨٥)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[3] فاطر (١٨).

(ماوە) لە دوای خۆی یان زانیاریەك كە سودی لێ وەربگیرێت).[1] ئەم سێ شتە لە ڕاستیدا هەوڵو كۆشش‌و ماندووبوون‌و بەرهەمی كرداری خۆیەتی وەك لەم فەرموودەیەدا هاتووە: (چاكترین‌و پاكترین شتێك كە پیاو خواردبێتی لە ڕەنجەشانی خۆیەتی (خۆی پەیدای كردبێت)و منداڵەكەشی ڕەنجی خۆیەتی).[2] خێری بەردەوامیش بریتیە لە وەقف‌و ئەو شتانەی لە شێوەی وەقفن.هەموو ئەوانە شوێنەواری ڕەنجی ئەو كەسەن. خودای مەزن فەرموویەتی: ﴿ إِنَّا نَحْنُ نُحْيِ ٱلْمَوْتَىٰ وَنَكْتُبُ مَا قَدَّمُوا۟ وَءَاثَـٰرَهُمْ ﴾[3] واتە: بە ڕاستی هەر ئێمە مردووان زیندوودەكەینەوەو هەرچی پێشتر كردوویانەو شوێنەواری پاش خۆشیان دەنووسین. ئەو زانستەی كە بڵاوی كردووەتەوە لە نێوان مەردومداو دوای خۆی ئەم مەردمە سودمەندبوون پێی چاویان لێ كردووە ئەو زانستەش دیسان لە كارو ڕەنجی خۆیەتی. وە لە فەرموودەی سەحیحدا هاتووە: (كەسێك مەردم بانگ بكات بۆ سەر ڕاستەڕێ پاداشت وەردەگرێت بە ئەندازەی ئەو كەسانەی كە شوێنی دەكەون بەبێ ئەوەی كە هیچ لە پاداشتی ئەوانە كەم بێتەوە).[4] خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَأَنَّ سَعْيَهُۥ سَوْفَ يُرَىٰ ﴾ بۆ هەر كارێكیش ماندووبێت، پاداشتی خۆی هەر پێدەگات. واتە لە ڕۆژی قیامەتدا، وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَقُلِ ٱعْمَلُوا۟ فَسَيَرَى ٱللَّهُ عَمَلَكُمْ وَرَسُولُهُۥ وَٱلْمُؤْمِنُونَ ۖ وَسَتُرَدُّونَ إِلَىٰ عَـٰلِمِ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَـٰدَةِ فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴾[5] واتە: (ئەی موحەممەد(ﷺ) بەوانە) بڵێ كردەوە بكەن جا بێگومان خواو فرستادەكەی‌و بڕواداران كردەوەكانتان دەبینن لە پاشان دەگەڕێنرێنەوە بۆ لای (خوای) زانای هەموو نهێنی‌و ئاشكراكان ئینجا هەواڵتان دەداتێ بە هەرچی كە ئێوە لە جیهاندا دەتانكرد. واتە پاداشت وەردەگرن لەسەری‌و تۆڵەشتان لێ دەسێنرێت بە تەواوی گەر چاك بوو بە چاكەو گەر خراپیش بوو بە خراپە. هەروەك لێرەدا فەرموویەتی: ﴿ ثُمَّ يُجْزَىٰهُ ٱلْجَزَآءَ ٱلْأَوْفَىٰ ﴾ لە پاشانیش (بە باشترین شێوە) پاداشتی پێ دەدرێت. واتە: پاداشتی زۆر دەدرێتەوە.

﴿ وَأَنَّ إِلَىٰ رَبِّكَ ٱلْمُنتَهَىٰ ﴿٤٢﴾ وَأَنَّهُۥ هُوَ أَضْحَكَ وَأَبْكَىٰ ﴿٤٣﴾ وَأَنَّهُۥ هُوَ أَمَاتَ وَأَحْيَا ﴿٤٤﴾ وَأَنَّهُۥ خَلَقَ ٱلزَّوْجَيْنِ ٱلذَّكَرَ وَٱلْأُنثَىٰ ﴿٤٥﴾ مِن نُّطْفَةٍ إِذَا تُمْنَىٰ ﴿٤٦﴾ وَأَنَّ عَلَيْهِ ٱلنَّشْأَةَ ٱلْأُخْرَىٰ ﴿٤٧﴾ وَأَنَّهُۥ هُوَ أَغْنَىٰ وَأَقْنَىٰ ﴿٤٨﴾ وَأَنَّهُۥ هُوَ رَبُّ ٱلشِّعْرَىٰ

---

[1] مسلم (١٢٥٥/٣).

[2] النسائي (٢٤١/٧)، فەرموودەیەكی سەحیحە.

[3] یس (١٢).

[4] مسلم (٢٠٦/٤).

[5] التوبة (١٠٥).

﴿٤٩﴾ وَأَنَّهُۥٓ أَهۡلَكَ عَادًا ٱلۡأُولَىٰ ﴿٥٠﴾ وَثَمُودَاْ فَمَآ أَبۡقَىٰ ﴿٥١﴾ وَقَوۡمَ نُوحٖ مِّن قَبۡلُۖ إِنَّهُمۡ كَانُواْ هُمۡ أَظۡلَمَ وَأَطۡغَىٰ ﴿٥٢﴾ وَٱلۡمُؤۡتَفِكَةَ أَهۡوَىٰ ﴿٥٣﴾ فَغَشَّىٰهَا مَا غَشَّىٰ ﴿٥٤﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكَ تَتَمَارَىٰ ﴿٥٥﴾﴾

**هەندێ لە سیفەتەکانی پەروەردگار (الرّب) مەردم دەهێنێتەوە وەك چۆن لە ئەوەڵەوە هێنای، وە هەندێ لەو شتانەی کە بە بەندەکانی کردووە**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَأَنَّ إِلَىٰ رَبِّكَ ٱلۡمُنتَهَىٰ﴾ گەڕانەوەش هەر بۆ لای پەروەردگارتە. واتە: گەڕانەوە لە ڕۆژی قیامەتدا. ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە لە عەمری کوڕی مەیمونی ئەودیەوە دەڵێت: مەعازی کوڕی جەبەل لە نێوانماندا هەڵساو وتی: ئەی بنەماڵەی ئەوەد من پەیامنێری پێغەمبەری خودام (ﷺ) بۆ لای ئێوەو ئێوەش دەزانن کە گەڕانەوە بۆ لای خودا یان بۆ بەهەشتە یان بۆ جەهەنەم.[1] خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَأَنَّهُۥ هُوَ أَضۡحَكَ وَأَبۡكَىٰ﴾ هەر ئەو دەخاتە خەنین و دەگرینێت. واتە: پێکەنین و گریانی دروست کردووە وە هەریەکەو هۆیەکی تایبەتی خۆی هەیەو جیاوازە لەوی تر، ﴿وَأَنَّهُۥ هُوَ أَمَاتَ وَأَحۡيَا﴾ هەر ئەویشە ژیان دەدات و دەمرێنێت. وەك ئەم ئایەتە کە دەفەرموێت: ﴿ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلۡمَوۡتَ وَٱلۡحَيَوٰةَ﴾[2] واتە: ئەو زاتەی کە مردن و ژیانی داهێناوە. وە دەفەرموێت: ﴿وَأَنَّهُۥ خَلَقَ ٱلزَّوۡجَيۡنِ ٱلذَّكَرَ وَٱلۡأُنثَىٰ﴾ وە هەر ئەویش جوتی نێرو مێیینەی وەدی هێناوە. ﴿مِن نُّطۡفَةٍ إِذَا تُمۡنَىٰ﴾ لەو تنۆکەی کە ڕژاوە. وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿أَيَحۡسَبُ ٱلۡإِنسَٰنُ أَن يُتۡرَكَ سُدًى ﴿٣٦﴾ أَلَمۡ يَكُ نُطۡفَةٗ مِّن مَّنِيّٖ يُمۡنَىٰ ﴿٣٧﴾ ثُمَّ كَانَ عَلَقَةٗ فَخَلَقَ فَسَوَّىٰ ﴿٣٨﴾ فَجَعَلَ مِنۡهُ ٱلزَّوۡجَيۡنِ ٱلذَّكَرَ وَٱلۡأُنثَىٰٓ ﴿٣٩﴾ أَلَيۡسَ ذَٰلِكَ بِقَٰدِرٍ عَلَىٰٓ أَن يُحۡـِۧيَ ٱلۡمَوۡتَىٰ﴾[3] واتە: ئایا مرۆڤ وادەزانێت کە هەروا بەرەڵا دەکرێت و پشتگوێ دەخرێت، ئایا نوتفەیەك نەبوو لە تۆو کە دەڕژێنرا یە مندالدانەوە، لە پاشان بوو بە پارچەیەك خوێن ئینجا دروستی کردو ڕێکی خست، ئینجا لەو تۆوە دوو جۆری دروست کرد نێرو مێ، ئایا ئەو زاتە توانای نیە بەسەر ئەوەدا کە مردووان زیندوو بکاتەوە. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَأَنَّ عَلَيۡهِ ٱلنَّشۡأَةَ ٱلۡأُخۡرَىٰ﴾ لەسەریەتی دیسان دروستی بکاتەوە. واتە: وەك چۆن یەکەمجار دروستی کرد ئەو خودایە دەتوانێت جارێکی تر دووبارەی بکاتەوەو ڕۆژی قیامەت وەدی بهێنێت، ﴿وَأَنَّهُۥ هُوَ أَغۡنَىٰ وَأَقۡنَىٰ﴾ هەر ئەویشە کە خەڵکی دەوڵەمەندو هەژار دەکات. واتە: هەر ئەوە سامانی داوەتە دەست بەندەکانی و کردوویەتیە دەستمایە

---

[1] الحاکم (٨٣/١).

[2] الملك (٢).

[3] القيامة (٣٦ـ٤٠).

بۆیان کە پێویستیان بە فرۆشتن نەبێت ئەمەیش بەهرەیەکی تەواوو گەورەیە بۆیان. لەسەر ئەم باسە قسەیەکی زۆر هەیە لە نێوان زانایانی تەفسیردا لەو زانایانە ئەبو سالحو ئیبنو جەریرو کەسانی تریش.[1]

موجاهید دەڵێت: ﴿أَغۡنَىٰ﴾ دەستمایەی پێداون ﴿وَأَقۡنَىٰ﴾ دەیشی برێت. قەتادەیش هەر وای وتووە. ئیبنو عەباسو موجاهد دیسان دەڵێن: ﴿أَغۡنَىٰ﴾ بەخشی ﴿وَأَقۡنَىٰ﴾ ڕازی بوو، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَأَنَّهُۥ هُوَ رَبُّ ٱلشِّعۡرَىٰ﴾ هەر بۆ خۆشی پەروەردگاری گەلاوێژە. ئیبنو عەباسو موجاهدو قەتادەو ئیبنو زەیدو کەسانی تریش دەڵێن: ئەوە ئەو ئەستێرە ڕۆشنو بریسکەدارەیە (گەلاوێژ) کە پێی دەوترێت (مِرزم الجوزاء) دەستەیەك لە عەرەبەکان دەیانپەرست.[2] ﴿وَأَنَّهُۥٓ أَهۡلَكَ عَادًا ٱلۡأُولَىٰ﴾ وە هەر ئەویشە ئاسەواری عادی یەکەمی بڕیەوە. ئەوانە هۆزی هود بوون پێیان وتراوە: عادی کوڕی ئیرەمی کوڕی سامی کوڕی نوح وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿أَلَمۡ تَرَ كَيۡفَ فَعَلَ رَبُّكَ بِعَادٍ ٦ إِرَمَ ذَاتِ ٱلۡعِمَادِ ٧ ٱلَّتِي لَمۡ يُخۡلَقۡ مِثۡلُهَا فِي ٱلۡبِلَٰدِ﴾[3] واتە: ئایا نابینیت کە پەروەردگاری تۆ چی کرد بە گەلی عاد، ئیرەم؟ خاوەنی پایەو دەسەلات، کە وێنەیان دروست نەکرابوو لە هەموو وڵاتدا. ئەوانە بەهێزترینو بەتواناترینو لاسارو خراپترین کەس بوون بەرانبەر بە خوداو پێغەمبەرەکەی (ﷺ) خودایش قڕی کردنو لەناوی بردن، ﴿بِرِيحٖ صَرۡصَرٍ عَاتِيَةٖ ٦ سَخَّرَهَا عَلَيۡهِمۡ سَبۡعَ لَيَالٖ وَثَمَٰنِيَةَ أَيَّامٍ حُسُومٗا﴾[4] واتە: بە بایەکی سەختی ساردی بەتینی بە گرمە، (خوا) زاڵی کرد بەسەریاندا حەوت ئەوو هەشت ڕۆژ بەبێ وچان (لەناوی بردن). بە ڕەشەبایەکی بەردەوام. وە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَثَمُودَاْ فَمَآ أَبۡقَىٰ﴾ لە سەمودیش گیانداری نەهێشتووە. واتە: تێکی شکاندنو قڕی کردن هیچ کەسی لێ نەهێشتن. ﴿وَقَوۡمَ نُوحٖ مِّن قَبۡلُۖ إِنَّهُمۡ كَانُواْ هُمۡ أَظۡلَمَ وَأَطۡغَىٰ﴾ هۆزی نوحیش (لە پێشدا) کە لەوانە ناهەقترو لاسارتر بوون، ﴿وَٱلۡمُؤۡتَفِكَةَ أَهۡوَىٰ﴾ ئاوایی لوتیشی سەرەوژێر کرد. واتە: مەدائین پێغەمبەر لوتی بەسەردا هەڵگێڕانەوەو سەرەوژێری کردو بەردبارانی کردن بە گزمۆڵە قوڕی وەك بەرد. بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَغَشَّىٰهَا مَا غَشَّىٰ﴾ هەرچی دەبوو بەرخۆبدرێت، وەبن خۆی دا. لەو بەردانەی کە

[1] الطبري (٢٢/٥٤٨/٥٤٩).
[2] الطبري (٢٢/٥٥١).
[3] الفجر (٦ـ٨).
[4] الحاقة (٦ـ٧).

بۆی ڕەوانە کردە سەریان (کە باراندی بەسەریاندا)، ﴿وَأَمۡطَرۡنَا عَلَيۡهِم مَّطَرٗاۖ فَسَآءَ مَطَرُ ٱلۡمُنذَرِينَ﴾[1] واتە: وە بارانێکمان (لە بەرد) بەسەریاندا باراند ئینجا ئای چ خراپ بوو بارانی ترسێنراوان. وە دەفەرمووێت: ﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكَ تَتَمَارَىٰ﴾ پەروەردگارت کە ئەو هەموو چاکەیەی هەیە، تۆ لە کامیان بە گومانی. واتە: لە کام بەهرەی کە خودا بە تۆی داوە ئەی مرۆڤ بە گومانی؟ قەتادە وتوویەتی.[2] ئیبنو جورەیج دەڵێت: ﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكَ تَتَمَارَىٰ﴾ واتە: ئەی موحەممەد (ﷺ) مانای یەکەم چاکترە کە ئیبنو جەریریش هەمان ڕای هەڵبژاردووە.

﴿هَٰذَا نَذِيرٞ مِّنَ ٱلنُّذُرِ ٱلۡأُولَىٰٓ ﴿٥٦﴾ أَزِفَتِ ٱلۡأٓزِفَةُ ﴿٥٧﴾ لَيۡسَ لَهَا مِن دُونِ ٱللَّهِ كَاشِفَةٌ ﴿٥٨﴾ أَفَمِنۡ هَٰذَا ٱلۡحَدِيثِ تَعۡجَبُونَ ﴿٥٩﴾ وَتَضۡحَكُونَ وَلَا تَبۡكُونَ ﴿٦٠﴾ وَأَنتُمۡ سَٰمِدُونَ ﴿٦١﴾ فَٱسۡجُدُواْۤ لِلَّهِۤ وَٱعۡبُدُواْ۩ ﴿٦٢﴾﴾

### ترساندن و ئاگادارکردنەوەو فەرمان دان بە سوژدەبردن و سەرشۆڕکردن

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿هَٰذَا نَذِيرٞ مِّنَ ٱلنُّذُرِ ٱلۡأُولَىٰٓ﴾ ئەمە یەکێك لە ترس وەبەرهێنەرانە، وەك ترسێنەرانی پێشوو. واتە: موحەممەد (ﷺ) هەروەك ئەو پێغەمبەرانەیە کە ڕەوانەکراو لە پێشەوە. وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿قُلۡ مَا كُنتُ بِدۡعٗا مِّنَ ٱلرُّسُلِ﴾[3] واتە: بڵێ من یەکەم پێغەمبەر نیم نێردرابم. ﴿أَزِفَتِ ٱلۡأٓزِفَةُ﴾ ڕابوونی قیامەت نزیکە. واتە: ئەوەی نزیکە دێت کە ڕۆژی قیامەتە، ﴿لَيۡسَ لَهَا مِن دُونِ ٱللَّهِ كَاشِفَةٌ﴾ غەیری خودا کەس پەردەی لەسەر لانادات. واتە بێجگە لە خودا کەس ناتوانێت بیگێڕێتەوەو خودا خۆی نەبێت کەس ئاگاداری نیە. ترسێنەر ئەو کەسەیە کە ئاگای لەو ڕووداوە سامناکەیە کە دەترسێت بێت بەسەر ئەوانەدا کە ئاگاداریان دەکاتەوە دەیانترسێنێت وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِنۡ هُوَ إِلَّا نَذِيرٞ لَّكُم بَيۡنَ يَدَيۡ عَذَابٖ شَدِيدٖ﴾[4] واتە: ئەو (پێغەمبەر(ﷺ) تەنها ترسێنەرە بۆ ئێوە لە پێش هاتنی سزای سەختی قیامەت. وە لە فەرموودەیەکدا هاتووە: (أنا النذير العريان)[5]، واتە: ئەو کەسەی کە ئاگای لەو کارەساتە گران و ناڕەحەتانەیەو پەلەی کردووە کە نەیشارێتەوە، هەتا بە زوویی هۆزەکەی ئاگادار بکاتەوە پێش ڕوودانی ئەو کارەساتە دڵسۆزانەو بە

---

[1] الشعراء (١٧٣).

[2] الطبري (٢٢/٥٥٦).

[3] الاحقاف (٩).

[4] سبأ (٤٦).

[5] فتح الباري (١١/٣٢٣).

پەلە چووە بە دەمیانەوە. ئەم فەرموودەیەی کە باسمان کرد زۆر نزیکە لە مانای ئەم ئایەتەوە کە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿أَزِفَتِ ٱلۡأٓزِفَةُ﴾ واتە: هاتنی ڕۆژی قیامەت زۆر نزیکە. وەك خوای گەورە لە یەکێکی سورەتی (القمر)دا فەرموویەتی: ﴿ٱقۡتَرَبَتِ ٱلسَّاعَةُ﴾[1] واتە: ڕۆژی دوایی نزیك بوویەوە. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە سەهلی کوڕی سەعدەوە دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (دەتانترسێنمو ئاگاداری گوناهە هەرە بچووکەکان بن چونکە وێنەی گوناهە وردیلەکان وەك نموونەی هۆزێك وایە کە بچنە ناو شیوێك یەکێك شوڵێك بێنێتو یەکێکی تر شوڵێك هەتا نانی خۆیانی پێ دروست دەکەن، گوناهە وردیلەکانیش هەر کاتێك خاوەنەکەی گوێی پێنەداو کردی لە ناوی دەباتو داماوی دەکات).[2] پاشان خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿أَفَمِنۡ هَٰذَا ٱلۡحَدِيثِ تَعۡجَبُونَ﴾ خوای گەورە نیگەرانی خۆی لە بتپەرستان دەردەبڕێت کە کاتێك گوێ لە قورئان دەگرن سەیر ماون پشتی تێدەکەنو خۆیانی لێ بێ ئاگا دەکەن ﴿تَعۡجَبُونَ﴾ سەیریان لێ دێتو بە ڕاستی نازانن. ﴿وَتَضۡحَكُونَ وَلَا تَبۡكُونَ﴾ ناگرین وەك ئەوانەی کە باوەڕیان پێی هەیە کە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ وَيَخِرُّونَ لِلۡأَذۡقَانِ يَبۡكُونَ وَيَزِيدُهُمۡ خُشُوعًا﴾[3] واتە: وە دەکەون بەسەر ڕوودا دەگرینو (قورئان) هەمیشە ملکەچیان بۆ زیاد دەکات. وە دەفەرمووێت: ﴿وَأَنتُمۡ سَٰمِدُونَ﴾ هەر بە گاڵتە ڕای دەبوێرن. سوفیانی سەوری دەڵێت: لە باوکیەوە ئەمیش لە ئیبنو عەباسەوە دەڵێت: گۆرانی. بە مانای گۆرانی وتنە واتە: گۆرانیمان بۆ بڵێ، عیکریمەیش هەر وای وتووە.[4] وە لە ڕیوایەتێکی تردا لە ئیبنو عەباسەوە ﴿سَٰمِدُونَ﴾ واتە: دژایەتی دەکەن.[5] موجاهدو عیکریمەیش هەر وایان وتووە. پاشان خوای گەورە فەرمان دەکات بە بەندەکانی کە سوژدەی بۆ بەرنو بەو شێوەیە بیپەرستن کە پێغەمبەرەکەی (ﷺ) دەیپەرستێت بە تەنها دڵسۆزیەوە. وە دەفەرمووێت: ﴿فَٱسۡجُدُواْ لِلَّهِۤ وَٱعۡبُدُواْ﴾ دەسا بۆ خوا سوژدە دەبەرنو بیپەرستن. واتە: سەری بەندایەتی بۆ دانەوێننو بە دڵسۆزیو بە تەنها بیپەرستن. بوخاری دەڵێت: ئەبو موعەمەر (معمر) بۆی گێڕاینەوە (عبدالوارث) بۆی گێڕاینەوە، ئەیوب بۆی گێڕاینەوە لە عیکریمەوە لەئیبنو عەباسەوە

---

[1] القمر (١).

[2] أحمد (٥/٣٣١)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[3] الاسراء (١٠٩).

[4] الطبري (٢٢/٥٥٩).

[5] عبدالرزاق (٣/٢٥٥).

دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) سوژدەی بردو موسڵمانان‌و بتپەرستان‌و جنۆکەو مرۆڤیش سوژدەیان برد.[1] بوخاری لەم فەرموودەیە موسلمی لەگەڵ نیە. هەر خۆی هێناویەتی. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە موتەلبی کوڕی ئەبو وەداعەوە دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) سورەتی (النجم)ی لە مەککە خوێند سوژدەی برد ئەوانەیش لەوێ بوون سوژدەیان برد. من سەرم هەڵبڕی‌و نەمویست سوژدە ببەم، لەو کاتێك موتەلب موسڵمان نەبوو، پاشان کە موسڵمان بوو گوێی لە هەر کەسێك بووایە بیخوێندایە سوژدەی دەبرد.[2] نەسائیش ڕیوایەتی کردووە لە باسی نوێژدا.[3] کۆتایی تەفسیری سورەتی (النجم). سوپاس‌و ستایش بۆ خوای گەورە.

## تەفسیری سورەتی (القمر) ﴿ٱقۡتَرَبَتِ ٱلسَّاعَةُ﴾

## لە مەککەدا هاتووەتە خوارەوە

لە پێشەوە لە فەرموودەی (ابو واقد) باس کرا، کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە نوێژی جەژنی ڕەمەزان‌و قوربانیدا سورەتی (ق)و ﴿ٱقۡتَرَبَتِ ٱلسَّاعَةُ﴾ی دەخوێند،وە لەو شوێنانەیشدا کە خەڵکی بە زۆری کۆدەبوونەوە دەیخوێندن لەبەر ئەوەی پێکهاتوون لە بەڵێن‌و هەڕەشەو وەدیهێنانی مرۆڤو پاشان هێنانەوەی جارێکی تر لە ڕۆژی قیامەتداو ناسینی خودا بە تەنهاو بەڵگەو نیشانە لەسەر بەڕاستی هاتنی پێغەمبەران (سەلامی خوایان لێبێت) چەند مەبەستی تری گەورەو گرنگ.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿ٱقۡتَرَبَتِ ٱلسَّاعَةُ وَٱنشَقَّ ٱلۡقَمَرُ ﴿١﴾ وَإِن يَرَوۡاْ ءَايَةً يُعۡرِضُواْ وَيَقُولُواْ سِحۡرٌ مُّسۡتَمِرٌّ ﴿٢﴾ وَكَذَّبُواْ وَٱتَّبَعُوٓاْ أَهۡوَآءَهُمۡۚ وَكُلُّ أَمۡرٍ مُّسۡتَقِرٌّ ﴿٣﴾ وَلَقَدۡ جَآءَهُم مِّنَ ٱلۡأَنۢبَآءِ مَا فِيهِ مُزۡدَجَرٌ ﴿٤﴾ حِكۡمَةُۢ بَٰلِغَةٌۖ فَمَا تُغۡنِ ٱلنُّذُرُ ﴿٥﴾﴾

### نزیککەوتنەوەی قیامەت‌و دووکەرتبوونی مانگ (هەیڤ)

خوای مەزن باسی نزیك بوونەوەی قیامەت‌و چۆڵ بوون‌و کۆتایی هاتنی دنیا دەکات‌و وەك فەرموویەتی: ﴿أَتَىٰٓ أَمۡرُ ٱللَّهِ فَلَا تَسۡتَعۡجِلُوهُ﴾[4] واتە: ئەوا فەرمانی خودا (بە سزادانیان) هات بۆیە پەلە

---

[1] فتح الباري (٨/٤٨٠).

[2] احمد (٦/٣٩٩)، ئەم فەرموودەیە سەنەدەکانی لاوازە.

[3] النسائي (٢/١٦٠)، سەنەدەکانی لاوازە.

[4] النحل (١).

مەکـەن (لـە هـاتنی). وە فـەرموویـەتی: ﴿اقْتَرَبَ لِلنَّاسِ حِسَابُهُمْ وَهُمْ فِي غَفْلَةٍ مُّعْرِضُونَ ﴾[1] واتـە: لێپرسینەوەی خەڵکی نزیك بووەتەوە بەڵام ئەوان لە بێ ئاگاییو غەفڵەتدا پشت تێکەرو ڕوو وەرگێڕن (لە ئایینی خودا). وە فەرموودەی زۆریش لەو بارەیەوە هاتووە. حافیز (الحافظ) ئـەبو بـەکری بـەزار ڕیوایەتی کردووە لە ئەنەسەوە کە پێغەمبـەری خـودا(ﷺ) ڕۆژێك وتـاری بـۆ هاوەڵـەکانی دەدا نزیکی خۆرئاوا بوو زۆر کەمی مابوو تەواو ئاوا بێت فـەرمووی: (سوێند بـەو خوایـەی گیانی منی بـە دەستـە ئەوەندە لە دنیا نەماوە بە ئەندازەی ئەوەی کە لێی ڕۆیشتووە وەك ئەو ڕۆژە وایە تێیدان کە چەندی ماوە بە نیسبەت ئەو ماوەیەی کە لێی ڕۆیشتووە، خۆرمان نـەبینی کـەمێکی نـەبێت).[2] فەرموودەیـەکی تر پشتگیری ئەو فەرموودەی پێش خۆی دەکاتو مانای دەکات... ئیمامی ئەحمـەد ڕیوایـەتی کـردووە لە ئیبنو عومەرەوە دەڵێت: ئێمە لای پێغەمبەر(ﷺ) دانیشتبووین لەو کاتـەدا خـۆر لەسـەر (قُعَيقِعان) بوو (کێوێکە لە مەککە) دوای عەسر فـەرمووی: (تەمـەنی ئێـوە لـە چاو تەمـەنی ئەوانـەی پـێش ئێـوە ڕۆیشتوون مەگین وەك ئەندازەی ئەم ڕۆژەیە کـە ماوەتـەوە لـەوەی کـە ڕۆیشتووە).[3] دیسان ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە سەهلی کوڕی سـەعدەوە دەڵێت: بیستم لـە پێغەمبـەری خـوداوە (ﷺ) دەیفەرموو: (من ڕەوانـە کـراوم لەگـەڵ قیامەتـدا وەك ئـەم دووانـە)، ئیشارەتی کـرد بـە دوو پـەنجەی (السبابة) ئـەو پـەنجـەی کـە لـە نێوان پـەنجە گـەورەو پـەنجەی ناوەڕاستدایەو پـەنـدەی ناوەڕاست.[4] بوخاریو موسلیمیش هێناویانـە.[5] ئیمـامی ئەحمـەد ڕیوایـەتی کـردووە لـە وەهـەبی سـەوائیەوە (وهب السّوائي) دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: ( من ڕەوانە کراوم لەگـەڵ قیامەتـدا وەك ئەمـە لـە ئەمەوە نزیکـە پێـشم داوەتـەوە)، ئەعمـەش پـەنجـەی ناوەڕانستو شـایەتمانی خستە پـاڵ یـەك.[6] وە دیسان ئیمامی ئەحمـەد ڕیوایـەتی کـردووە لـە ئەوزاعیـەوە دەڵێت: ئیسماعیلی کـوڕی عەبدوڵڵا بـۆی گێڕانەوە وتی: ئەنەسی کوڕی مالك هات بۆ لای وەلیدی کـوڕی عبدالملك، عبدالملك پرسـیاری لێ کـرد: چیت بیستووە لە پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) کە باسی قیامەتی پێ بکات؟ وتی: بیستم لـە پێغەمبـەری خوداوە (ﷺ) دەیفەرموو: (ئێوەو قیامەت وەك ئەم دووانە وان).[7] تەنها ئەحمەد هێناویەتی، شـایەتو

---

[1] الانبياء (١).

[2] مجمع الزوائد (٣١١/١٠)، فەرموودەیەکی حەسەنە.

[3] احمد (١١٥/٢)، فەرموودەیەکی حەسەنە.

[4] احمد (٣٣٨)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[5] فتح الباري (٣٥٥/١١)، مسلم (٢٢٦٨/٤).

[6] احمد (٣٠٩/٤)، فەرموودەیەکی حەسەنە.

[7] احمد (٢٢٣/٣)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

بەڵگە لەسەر ئەوە دیسان لە فەرموودەی سەحیحدا هاتووە لە ناوەکانی پێغەمبەردا(ﷺ) کە ئەو کۆکەرەوەیە(الحاشر) کە مرۆڤ کۆدەکرێتەوە لەبەر پێیدا[1]. خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿ٱقۡتَرَبَتِ ٱلسَّاعَةُ وَٱنشَقَّ ٱلۡقَمَرُ﴾ وا قیامەت نزیك کەوتەوەو مانگ بوو بە دوو کەرتەوە. ئەم دووکەرت بوونە لە وەختی پێغەمبەری خودا بووە (ﷺ)وەك لە فەرموودە موتەواتیرەکاندا هاتووە. بە چەند سەنەدی سەحیح. ئەم قسەیە هەموو زانایان لە نێوان خۆیاندا کۆن لەسەری‌و یەك ڕان کە دووکەرتبوونی مانگ لە زەمانی پێغەمبەردا (ﷺ) ڕوویداوەو یەکێك بووە لە موعجیزە ئاشکراو دیارەکانی پێغەمبەر(ﷺ).

**باسی ئەو فەرموودانەی کە لەو بارەیەوە هاتووە**

ئەنەسی کوڕی مالك ڕیوایەتی کردووە: ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەڵێت: خەڵکی مەککە دوو جار لە مەککەدا پرسیاریان لە پێغەمبەر کرد (ﷺ) لە ئایەتی: ﴿وَٱنشَقَّ ٱلۡقَمَرُ﴾ فەرمووی: ﴿ٱقۡتَرَبَتِ ٱلسَّاعَةُ وَٱنشَقَّ ٱلۡقَمَرُ﴾.[2] موسلیمیش ڕیوایەتی کردووە.[3] هەروەها بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە ئەنەسی کوڕی مالکەوە، کە خەڵکی مەککە پرسیاریان کرد لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) کە ئایەتێکیان (موعجیزە) نیشان بدات. مانگی نیشاندان کە بوو بە دوو کەرتەوە بە شێوەیەك کە حەرایان لە نێوانیاندا دەبینی.[4] بوخاری‌و موسلیم دیسان هێناویانە لە چەند ڕێگای ترەوە.

جوبەیری کوڕی موتعیم ڕیوایەتی کردووە: ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە جوبەیری کوڕی موتعیمەوە دەڵێت: مانگ بوو بە دوو کەرتەوە لە زەمانی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) کەرتێکی لەسەر ئەم کێوو کەرتێکی تری لەسەر ئەم کێوە. وتیان: موحەممەد (ﷺ) جادووی لێ کردووین. دیسان وتیان: ئەگەر جادووی لە ئێمە کردبێت خۆ ناتوانێت جادوو لە هەموو خەڵکی بکات.[5] تەنها ئیمامی ئەحمەد بەم شێوەیە ڕیوایەتی کردووە. بەیهەقی ڕیوایەتی کردووە لە دەلائیلەوە لە ڕێگای ترەوە[6].

---

[1] فتح الباري (٦/٦٤١).

[2] احمد (٣/١٦٥)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[3] مسلم (٤/٢١٥٩).

[4] فتح الباري (٧/٢٢١/٨/٤٨٤)، مسلم (٤/٢١٥٩).

[5] احمد (٤/٨١)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[6] دلائل النبوة (٢/٢٦٨).

عەبدوڵلای کوڕی عەباس ڕیوایەتی کردووە: بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەباسەوە دەڵێت: لە زەمانی پێغەمبەردا (ﷺ) مانگ بوو بە دوو کەرتەوە.[1] دیسان بوخاری‌و موسلیم ڕیوایەتیان کردووە.[2] وە ئیبنو جەریر ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەباسەوە لەم ئایەتەدا: ﴿ٱقْتَرَبَتِ ٱلسَّاعَةُ وَٱنشَقَّ ٱلْقَمَرُ ۝١ وَإِن يَرَوْا۟ ءَايَةً يُعْرِضُوا۟ وَيَقُولُوا۟ سِحْرٌ مُّسْتَمِرٌّ﴾ دەڵێت: ئەو دووکەرتبوونە تێپەڕی. مانگ دووکەرت بوو پێش کۆچکردن بۆ مەدینە بە شێوەیەك کە هەردوو کەرتەکەیان بینی[3] (واتە لە مەککە).

عەبدوڵلای کوڕی عومەر ڕیوایەتی کردووە: حافیز ئەبو بەکری بەیهەقی ڕیوایەتی کردووە لە عەبدوڵلای کوڕی عومەرەوە لەم ئایەتەدا: ﴿ٱقْتَرَبَتِ ٱلسَّاعَةُ وَٱنشَقَّ ٱلْقَمَرُ﴾ دەڵێت: ئەوە لە زەمانی پێغەمبەری خوادا بوو (ﷺ) بوو بە دوو کەرتەوە، کەرتێکی لە پێش ئەم کێوەوە کەرتێکی تری لە دوای ئەم کێوەوە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (اللهم أشهد).[4] هەر بەم شێوەیە موسلیم‌و تیرمیزی ڕیوایەتیان کردووە.[5] تیرمیزی دەڵێت چاك‌و ڕاستە (حسن صحيح).[6]

عەبدوڵلای کوڕی مەسعود ڕیوایەتی کردووە: ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە عەبدوڵلای کوڕی مەسعودەوە دەڵێت: مانگ لەت بوو لە زەمانی پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو بە دوو کەرتەوە. بە شێوەیەکی وا کە سەیرمان کرد. پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (اشهدوا).[7] هەر بەم شێوەیە بوخاری‌و موسلیم ڕیوایەتیان کردووە.[8] ئیبنو جەریر دیسان ڕیوایەتی کردووە لە عەبدوڵلای کوڕی مەسعودەوە دەڵێت: کێوم بینی لە نێوانی مانگدا کاتێك کە لەت بوو بوو بە دوو کەرتەوە.[9] ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە عەبدوڵلاوە دەڵێت: مانگ لەت بوو لە زەمانی پێغەمبەری خودا(ﷺ) بە شێوەیەك کە کێوم بینی لە نێوان بۆشایی دوو کەرتەکەیدا[10].

---

[1] فتح الباري (٤٨٤/٨).

[2] فتح الباري (٢٢١/٧)، مسلم (٢١٥٩/٤).

[3] الطبري (٥٦٩/٢٢).

[4] دلائل النبوة (٢٦٧/٢)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[5] مسلم (٢١٥٩/٤)، تحفة الأحوذي (١٧٥/٩).

[6] مسلم (٢١٥٨/٤)، تحفة الأحوذي (١٧٥/٩).

[7] احمد (٣٧٧/١)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[8] فتح الباري (٤٨٣/٨)، مسلم (٢١٥٨/٤).

[9] الطبري (٥٦٧/٢٢).

[10] احمد (٤١٣/١)، ئەم فەرموودەیە سەنەدەکانی بەهێز نیە.

## لاساری بتپەرستان و هەڵوێستی خراپ و نالەباریان

خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿ وَإِن يَرَوْاْ ءَايَةً يُعْرِضُواْ وَيَقُولُواْ سِحْرٌ مُّسْتَمِرٌّ ﴾ هەر نیشانەیەك ببینن بڕوا ناکەن و دەڵێن: ئەمە جادووەو هەر هەیە. ﴿ وَإِن يَرَوْاْ ءَايَةً ﴾ واتە: نیشانەیەك، بەڵگەیەك، سەلماندنێك. ﴿يُعْرِضُواْ﴾ واتە: ملی بۆ دانانەوێنن بەڵکو دژایەتی دەکەن و پشتگوێی دەخەن. ﴿وَيَقُولُواْ سِحْرٌ مُّسْتَمِرٌّ﴾ واتە: جادوویەکە، جادوومان لێ دەکات پێی. ﴿مُّسْتَمِرٌّ﴾ واتە: دەڕوات، موجاهدو قەتادە وتوویانە.[1] هەندێکیش وتوویانە: واتە: بەتاڵەو لەناو دەچێت و بەردەوام نابێت. خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَكَذَّبُواْ وَٱتَّبَعُوٓاْ أَهْوَآءَهُمْ وَكُلُّ أَمْرٍ مُّسْتَقِرٌّ ﴾ ئیتر بڕوایان نەهێناو شوێن ئارەزووی خۆیان کەوتن، هەر کارەش شوێنی خۆی هەیە. ﴿ وَكَذَّبُواْ وَٱتَّبَعُوٓاْ أَهْوَآءَهُمْ﴾ واتە: باوەڕیان نەکرد بەو ڕاستیەی کە بۆیان هات، شوێنی ئارەزووو هەواو هەوەسی خۆیان کەوتن بە هۆی نەزانی و کەم بیرو هۆشیانەوە. ﴿وَكُلُّ أَمْرٍ مُّسْتَقِرٌّ﴾ قەتادە دەڵێت: چاکەخوازان هەر تووشی چاکە دەبن و شەڕخوازانیش تووشی خراپە دەبن.[2] ئیبنو جورەیج دەڵێت: هەر کارەش بە شوێن خاوەنەکەیەوەیە.[3] موجاهد دەڵێت: لە ڕۆژی قیامەتدا. خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ وَلَقَدْ جَآءَهُم مِّنَ ٱلْأَنۢبَآءِ مَا فِيهِ مُزْدَجَرٌ ﴾ ئەوەندەیان دەنگو باسی پێشوو بیستووە، کە دەبوو ترسیان بێتەبەر. واتە: ئەوەندەیان لە دەنگوباس و چیرۆکی ئەو گەلانەی پێشوو کە باوەڕیان نەدەهێنا بە پێغەمبەرەکانیان بۆ باس کراوە ئا لەم قورئانەدا لەو هەموو بەڵاو سزاو ئازارو ناڕەحەتیەی کە تووشیان بووە، ﴿مَا فِيهِ مُزْدَجَرٌ ﴾ واتە: کە دەبوو لەو ئامۆژگاریانە سوودمەند بوونایەو وازیان لە بتپەرستی و ئەو بێباوەڕیە بهێنایە. خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿حِكْمَةٌۢ بَٰلِغَةٌ فَمَا تُغْنِ ٱلنُّذُرُ﴾ ئەمە کارزانی تەواوە، بەڵام ئەم ترسێنەرانە بەهرە نادەن. واتە: ئەمە کارزانی تەواوە لە ڕێ نیشاندانی خودا بۆ ئەوەی کە ڕێی نیشانداوە. وە لە ڕێ ونکردنی ئەو کەسەش کە ڕێی لێ ون کردووە، ﴿فَمَا تُغْنِ ٱلنُّذُرُ﴾ واتە: چی شتێك بەهرەو کەڵك دەگەیەنێت بەو کەسەی کە خوای گەورە بەدبەختی کردبێت و مۆری نابێت بەسەر دڵیدا، کێ دەتوانێت پاش خودا ڕێگا نیشاندا؟ ئەم ئایەتە وەك ئەم ئایەتە وایە کە

---

[1] الطبري (٢٢/٥٧٠).

[2] الطبري (٢٢/٥٧٢).

[3] الدر المنثور (٧/٦٧٣).

خودا دەفەرموێت: ﴿وَمَا تُغْنِي ٱلْآيَٰتُ وَٱلنُّذُرُ عَن قَوْمٍ لَّا يُؤْمِنُونَ﴾[1] واتە: کەچی نیشانەو ترسێنەرەکان هیچ سوود ناگەیەنن بە کەسانێك بڕوا نەهێنن.

﴿فَتَوَلَّ عَنْهُمْ يَوْمَ يَدْعُ ٱلدَّاعِ إِلَىٰ شَيْءٍ نُّكُرٍ ۝٦ خُشَّعًا أَبْصَٰرُهُمْ يَخْرُجُونَ مِنَ ٱلْأَجْدَاثِ كَأَنَّهُمْ جَرَادٌ مُّنتَشِرٌ ۝٧ مُّهْطِعِينَ إِلَى ٱلدَّاعِ يَقُولُ ٱلْكَٰفِرُونَ هَٰذَا يَوْمٌ عَسِرٌ ۝٨﴾

**خراپی ژیانی بتپەرستان لە ڕۆژی قیامەتدا**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَتَوَلَّ عَنْهُمْ يَوْمَ يَدْعُ ٱلدَّاعِ إِلَىٰ شَيْءٍ نُّكُرٍ﴾ سا تۆ لەوانە واز بێنە، ڕۆژێك بانگدەر بانگیان دەکات بۆ ڕووداوێکی زۆر ناخۆش. خوای گەورە فەرمان دەدات بە پێغەمبەر(ﷺ) کە گوێ نەدات بەو کەسانەی کە هەر نیشانەیەکی خودا دەبینن پشتی تێدەکەن‌و دژی دەوەستن دەڵێن ئەمە جادوویەکەو دەڕوات‌و نامێنێت. تۆش چاوەڕوانیان بەو وازیان لێ بێنە. ﴿يَوْمَ يَدْعُ ٱلدَّاعِ إِلَىٰ شَيْءٍ نُّكُرٍ﴾ واتە: بۆ ڕووداوێکی زۆر گران‌و ناخۆش کە وەستانە بۆ لێپرسینەوە کە چەند سامدارو گران‌و زەمین لەرزەو هاوارێکە. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿خُشَّعًا أَبْصَٰرُهُمْ يَخْرُجُونَ مِنَ ٱلْأَجْدَاثِ كَأَنَّهُمْ جَرَادٌ مُّنتَشِرٌ﴾ چاوشۆڕو کز لە گۆڕستان دەردەکەون، دەڵێی کوللەی بڵاوەبوون. چاویان داخستووەو داماون، ﴿يَخْرُجُونَ مِنَ ٱلْأَجْدَاثِ﴾ لە گۆڕستان دێنەدەر، ﴿كَأَنَّهُمْ جَرَادٌ مُّنتَشِرٌ﴾ وەها بڵاو دەبنەوەو بە پەلە دەچن بۆ شوێنی لێپرسینەوە بۆ بەدەمەوەچوونی بانگدەر دەڵێی کوللەن بە هەموو لایەکدا بڵاوبوونەتەوە. بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿مُّهْطِعِينَ إِلَى ٱلدَّاعِ يَقُولُ ٱلْكَٰفِرُونَ هَٰذَا يَوْمٌ عَسِرٌ﴾ هەڵەداوان بەرەو بانگدەرەکە دەچن، خوانەناسەکان دەڵێن: ئەمە ڕۆژێکی چەتوونە. ﴿مُّهْطِعِينَ﴾ بە پەلە دەچن، ﴿إِلَى ٱلدَّاعِ﴾ بێ گوێی ناکەن‌و دواناکەون بەرەو بانگدەر، ﴿يَقُولُ ٱلْكَٰفِرُونَ هَٰذَا يَوْمٌ عَسِرٌ﴾ واتە: ڕۆژێکی زۆر گران‌و چەتوون‌و ڕەش‌و سامدارە. وەك لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿فَذَٰلِكَ يَوْمَئِذٍ يَوْمٌ عَسِيرٌ ۝٩ عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ غَيْرُ يَسِيرٍ﴾[2] واتە: ئەو ڕۆژە ڕۆژێکی سەخت‌و گرانە، لەسەر کافران سووك‌و ئاسان نیە.

---

[1] یونس (۱۰۱).

[2] المدثر (۹ـ۱۰).

﴿كَذَّبَتۡ قَبۡلَهُمۡ قَوۡمُ نُوحٖ فَكَذَّبُواْ عَبۡدَنَا وَقَالُواْ مَجۡنُونٞ وَٱزۡدُجِرَ ﴿٩﴾ فَدَعَا رَبَّهُۥٓ أَنِّي مَغۡلُوبٞ فَٱنتَصِرۡ ﴿١٠﴾ فَفَتَحۡنَآ أَبۡوَٰبَ ٱلسَّمَآءِ بِمَآءٖ مُّنۡهَمِرٖ ﴿١١﴾ وَفَجَّرۡنَا ٱلۡأَرۡضَ عُيُونٗا فَٱلۡتَقَى ٱلۡمَآءُ عَلَىٰٓ أَمۡرٖ قَدۡ قُدِرَ ﴿١٢﴾ وَحَمَلۡنَٰهُ عَلَىٰ ذَاتِ أَلۡوَٰحٖ وَدُسُرٖ ﴿١٣﴾ تَجۡرِي بِأَعۡيُنِنَا جَزَآءٗ لِّمَن كَانَ كُفِرَ ﴿١٤﴾ وَلَقَد تَّرَكۡنَٰهَآ ءَايَةٗ فَهَلۡ مِن مُّدَّكِرٖ ﴿١٥﴾ فَكَيۡفَ كَانَ عَذَابِي وَنُذُرِ ﴿١٦﴾ وَلَقَدۡ يَسَّرۡنَا ٱلۡقُرۡءَانَ لِلذِّكۡرِ فَهَلۡ مِن مُّدَّكِرٖ ﴿١٧﴾﴾

**چیرۆكی هۆزی نوح و هۆزەكانی تریش، وە پەندو ئامۆژگاری وەرگرتن لێیان**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿كَذَّبَتۡ قَبۡلَهُمۡ قَوۡمُ نُوحٖ فَكَذَّبُواْ عَبۡدَنَا وَقَالُواْ مَجۡنُونٞ وَٱزۡدُجِرَ﴾ بەر لەمانەش هۆزی نوح باوەڕیان نەبوو، عەبدی ئێمەیان لەناو بوو درۆزنو هەڕەشەیان لێكرد. واتە: بە ئاشكرا پێیان دەوت تۆ درۆزنیو شێتیت. ﴿وَقَالُواْ مَجۡنُونٞ وَٱزۡدُجِرَ﴾ موجاهد دەڵێت: ﴿وَٱزۡدُجِرَ﴾ بە شێت سەیر كراوە.[1] وە وتراویشە: ﴿وَٱزۡدُجِرَ﴾ واتە: تانەو قسەی ناشیرینیان پێ وتووەو هەڕەشەیان لێ كردووەو پێیان وتووە ئەی نوح گەر واز نەهێنی بەربارانت دەكەین، ئیبنو زەید وتوویەتی. ئەمە داوایەكی چاكو بەجێیە.[2] كە لە خوا پاڕاوەتەوە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ فَدَعَا رَبَّهُۥٓ أَنِّي مَغۡلُوبٞ فَٱنتَصِرۡ﴾ لە پەروەردگاری پاڕایەوە كە من شكستم خواردووە، هانام بە تۆ. واتە: من توانای ئەمانەم نیەو بەرگریم پێ ناكرێت لێیان ئەی خودایە تۆ خۆت پشتگیری ئایینەكەت بكە. خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ فَفَتَحۡنَآ أَبۡوَٰبَ ٱلسَّمَآءِ بِمَآءٖ مُّنۡهَمِرٖ﴾ ئەوسا دەرگاكانی بەرزایمان بۆ بارانێكی بە خوڕ خستە سەر پشت. سودی دەڵێت: ﴿مُّنۡهَمِرٖ﴾ واتە: ئاوی زۆر.[3] ﴿ وَفَجَّرۡنَا ٱلۡأَرۡضَ عُيُونٗا فَٱلۡتَقَى ٱلۡمَآءُ عَلَىٰٓ أَمۡرٖ قَدۡ قُدِرَ﴾ لەم زەمینەش چاوەكانیمان تۆقاندن. ئاو گەینە یەك، بەو ئەندازەی كە بڕیاری بۆ درابوو. هەموو سەر زەمین بووە سەرچاوەو ئاوی لێ هاتە دەرەوە هەتا تەنوورەكانیش كە ئاگردان بوون بوونە كانیاو ﴿فَٱلۡتَقَى ٱلۡمَآءُ﴾ ئاو گەینە یەك لە ئاسمانو زەمیندا، ﴿عَلَىٰٓ أَمۡرٖ قَدۡ قُدِرَ﴾ بەو ئەندازەی كە بۆی دانرابوو. ئیبنو جورەیج دەڵێت لە ئیبنو عەباسەوە: ﴿ فَفَتَحۡنَآ أَبۡوَٰبَ ٱلسَّمَآءِ بِمَآءٖ مُّنۡهَمِرٖ﴾ بە شێوەیەكی وا زۆر باری كە ئاسمان نە پێش ئەو ڕۆژە نە دوای ئەو ڕۆژە بەبێ هەور بارانی وای لێ نەباریوەو ناشبارێت. وە ئەو ڕۆژە دەرگاكانی ئاسمان كرایەوە بارانێكی زۆر باری بەبێ هەور. ئاوەكانیش دایان لە یەك بەو ئەندازەی كە

---

[1] الطبري (٢٢/٥٧٦).

[2] الطبري (٢٢/٥٧٦).

[3] القرطبي (١٧/١٣١).

بۆیان دیاری کرابوو.[١] خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿وَحَمَلْنَٰهُ عَلَىٰ ذَاتِ أَلْوَٰحٍ وَدُسُرٍ﴾ ئەومان بە ئامێرێك هەلگرت کە لە چەند تەختەو بزماران لێك درابوو. ئیبنو عەباس‌و سەعیدی کوڕی جوبەیرو قەرەزی‌و قەتادەو ئیبنو زەید دەڵێن: ﴿وَدُسُرٍ﴾ واتە: بزماری زۆر.[٢] ئیبنو جەریریش هەمان ڕای هەڵبژاردووە، دەڵێت: تاکەکەی (دسار)و (دسیر)ە وەك وتراوە: (حباك)و (حبيك) کە جەمعەکەی (حُبك)ە.[٣] خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿تَجْرِى بِأَعْيُنِنَا جَزَآءً لِّمَن كَانَ كُفِرَ﴾ لە ژێر چاودێری خۆمان وەگەڕ کەوت، بۆ پاداشتدان بە کەسێك کە بە قسەکانی بێباوەڕ بوون. ﴿تَجْرِى بِأَعْيُنِنَا﴾ واتە: بە فەرمان‌و چاودێری‌و پاراستنی ئێمە، ﴿جَزَآءً لِّمَن كَانَ كُفِرَ﴾ لە تۆڵەی ئەوەی کە خوانەناس بوون‌و بۆ پشتگیری‌و سەرخستنی نوح (سەلامی خوای لێبێت)، وە دەفەرموویت: ﴿وَلَقَد تَّرَكْنَٰهَآ ءَايَةً فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ﴾ بەجێمان هێشت کە ببێتە نیشانەیەك، ئاخۆ بیرەوەرێك هەیە؟ قەتادە دەڵێت: خوای گەورە کەشتی نوحی هێشتەوە هەتا پێشینەکانی ئەم ئوممەتە پێی گەیشتن.[٤] وا دەردەکەوێت مەبەس بەوە جۆری کەشتی بێت، وەك خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿وَءَايَةٌ لَّهُمْ أَنَّا حَمَلْنَا ذُرِّيَّتَهُمْ فِى ٱلْفُلْكِ ٱلْمَشْحُونِ ﴿٤١﴾ وَخَلَقْنَا لَهُم مِّن مِّثْلِهِۦ مَا يَرْكَبُونَ﴾[٥] واتە: وە بەڵگەیەکی ئاشکرای تر بۆ ئەوان ئەمەیە کە بێگومان ئێمە نەوەکانی ئەوانمان لە کەشتی پڕکراو (لە خۆیان‌و کەلوپەلیان)دا هەلگرتووە، وە بە وێنەی کەشتی شتانێکی تریشمان بۆ دروست کردوون کە سواری بن. وە فەرموویەتی: ﴿إِنَّا لَمَّا طَغَا ٱلْمَآءُ حَمَلْنَٰكُمْ فِى ٱلْجَارِيَةِ ﴿١١﴾ لِنَجْعَلَهَا لَكُمْ تَذْكِرَةً وَتَعِيَهَآ أُذُنٌ وَٰعِيَةٌ﴾[٦] واتە: بە ڕاستی ئێمە: کاتێك کە ئاوی تۆفان سەرکەوت (باپیرەکانی) ئێوەمان هەلگرت لە کەشتیدا (ئەی بێبڕوایانی مەککە)، تا ئەم کردەوەیە بکەینە بیرهێنەرەوە بۆ ئێوەو لە گوێگرێك گوێگرێکی تێگەیشتوو. بۆیە لێرەدا دەفەرموویت: ﴿فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ﴾ واتە: ئاخۆ کەس هەیە پەندو ئامۆژگاری لێ وەربگرێت؟ ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو

---

[١] الدر المنثور (٦٧٥/٧).
[٢] الطبري (٥٨٠/٢٢)، القرطبي (١٣٢/١٧).
[٣] الطبري (٥٧٨/٢٢).
[٤] الطبري (٥٨٢/٢٢).
[٥] يس (٤١_٤٢).
[٦] الحاقة (١١_١٢).

مەسعودەوە دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) پێی خوێندم بە ﴿فَهَلۡ مِن مُّدَّكِرٖ﴾.[١] هەر بەم شێوەیە بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە عەبدوڵڵاوە دەڵێت: لای پێغەمبەردا (ﷺ) خوێندمەوە ﴿فَهَلۡ مِن مُّذَّكِرٖ﴾ پێغەمبەریش فەرمووی: ﴿فَهَلۡ مِن مُّدَّكِرٖ﴾.[٢] خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿فَكَيۡفَ كَانَ عَذَابِي وَنُذُرِ﴾ دەسا چۆن بوو جەزرەبەو هەڕەشەکانم؟ واتە: سزای من چۆن بوو بۆ ئەو کەسانەی کە نەیان ناسیمو باوەڕیان بە پێغەمبەرەکانم نەکردو پەندو ئامۆژگاریان وەرنەگرت بەو هەڕەشانەی کە بەواندا ناردوومەتە سەریان. وە چۆن سەرم خستنو تۆڵەم بۆ سەندن. وە دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدۡ يَسَّرۡنَا ٱلۡقُرۡءَانَ لِلذِّكۡرِ فَهَلۡ مِن مُّدَّكِرٖ﴾ ئەم قورئانەشمان ئاسان کرد کە بیری لێ بکرێتەوە، ئاخۆ بیرەوەرێك هەیە؟ واتە: وتەکانیمان سووك کردووەو ماناکەشمان ئاسان کردووە بۆ هەر کەسێك حەز بکات ئامۆژگاری خەڵکی پێ بکات. وە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿كِتَٰبٌ أَنزَلۡنَٰهُ إِلَيۡكَ مُبَٰرَكٞ لِّيَدَّبَّرُوٓاْ ءَايَٰتِهِۦ وَلِيَتَذَكَّرَ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ﴾[٣] واتە: (ئەم قورئانە) کتێبێکی پیرۆزە ناردوومانەتە خوارەوە بۆ تۆ بۆ ئەوەی بیربکەنەوە لە ئایەتەکانیو خاوەنانی بیرو ژیری پەندی لێ وەربگرن. وە فەرموویەتی: ﴿فَإِنَّمَا يَسَّرۡنَٰهُ بِلِسَانِكَ لِتُبَشِّرَ بِهِ ٱلۡمُتَّقِينَ وَتُنذِرَ بِهِۦ قَوۡمٗا لُّدّٗا﴾[٤] واتە: جا بە ڕاستی ئێمە قورئانمان لەسەر زمانی تۆ ئاسان کردووە تا مژدەی پێ بدەیت بە پارێزکارانو لەخواترسانو ئەو کەسانەی پێ بترسێنیت کە بە سەختی دژایەتیت دەکەن. وە فەرموویەتی: ﴿فَهَلۡ مِن مُّدَّكِرٖ﴾ واتە: ئاخۆ کەسێك هەیە ئامۆژگاری وەرگرتبێت بەم قورئانە کە خودا ماناو لەبەرکردنی ئاسان کردووە؟. موحەممەدی کوڕی کەعبی قەرەزی دەڵێت: ئاخۆ کەسێك پەندی لێ وەرگرتووە کە دووربکەوێتەوە لە تاوانو خراپە[٥]؟

﴿كَذَّبَتۡ عَادٞ فَكَيۡفَ كَانَ عَذَابِي وَنُذُرِ ١٨ إِنَّآ أَرۡسَلۡنَا عَلَيۡهِمۡ رِيحٗا صَرۡصَرٗا فِي يَوۡمِ نَحۡسٖ مُّسۡتَمِرّٖ ١٩ تَنزِعُ ٱلنَّاسَ كَأَنَّهُمۡ أَعۡجَازُ نَخۡلٖ مُّنقَعِرٖ ٢٠ فَكَيۡفَ كَانَ عَذَابِي وَنُذُرِ ٢١ وَلَقَدۡ يَسَّرۡنَا ٱلۡقُرۡءَانَ لِلذِّكۡرِ فَهَلۡ مِن مُّدَّكِرٖ ٢٢﴾

---

[١] فتح الباري (٨/٤٨٥).

[٢] فتح الباري (٨/٤٨٤).

[٣] ص (٢٩).

[٤] مريم (٩٧).

[٥] الدر المنثور (٧/٦٧٦).

**بەسەرهاتی ( چیرۆكی ) عاد**

خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿كَذَّبَتۡ عَادٞ فَكَيۡفَ كَانَ عَذَابِي وَنُذُرِ﴾ عادیش باوەڕیان نەهێنا. دەسا چۆن بوو جەزرەبەو هەڕەشەكانم. خوای گەورە باسی عادمان بۆ دەكات كە هۆزی هود پێغەمبەرە (سەلامی خوای لێبێت) كە ئەوانیش باوەڕیان بە پێغەمبەرەكەیان نەكرد. وەك هۆزی نوح كە باوەڕیان نەهێنا لە پێشەوە خوای گەورەیش بایەكی ساردو بەهێزی بۆ ناردن وەك دەفەرموویت: ﴿إِنَّآ أَرۡسَلۡنَا عَلَيۡهِمۡ رِيحٗا صَرۡصَرٗا فِي يَوۡمِ نَحۡسٖ مُّسۡتَمِرّٖ﴾ ئێمە لە ڕۆژێكی شوومدا بایەكی ساردو بەهێزی بێ وچانمان ناردە سەریان. ﴿رِيحٗا صَرۡصَرٗا﴾ ساردێكی زۆر سارد. ﴿فِي يَوۡمِ نَحۡسٖ﴾ واتە: لە ڕۆژێكی شوومو ناهەمواردا. ناردە سەریان زەحاكو (ضحاك) قەتادەو سودی وتوویانە[1]. ﴿مُّسۡتَمِرّٖ﴾ شومو قركەر چونكە ئەو ڕۆژە ڕۆژێك بوو كە جەزرەبەی دنیای بەست بە جەزرەبەو سزای ڕۆژی دواییەوە. خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿تَنزِعُ ٱلنَّاسَ كَأَنَّهُمۡ أَعۡجَازُ نَخۡلٖ مُّنقَعِرٖ﴾ خەڵكەكەی لەجێ دەرهێنان، دەتوت كۆتەرەی دارخورمان بە ڕیشەوە هەڵكێشراون. ئەو بایەی كە دەهات بۆ هەریەكێكیانو لێی دەدا بەرزی دەكردەوە هەتا لە چاو ون دەبوو پاشان بە تەوقی سەردا دەیدا بە زەمیندا سەری پان دەبووەوەو لاشەكەی بەبێ سەر دەمایەوە. بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿كَأَنَّهُمۡ أَعۡجَازُ نَخۡلٖ مُّنقَعِرٖ ٢٠ فَكَيۡفَ كَانَ عَذَابِي وَنُذُرِ﴾ دەسا چۆن بوو جەزرەبەو هەڕەشەكانم. ﴿وَلَقَدۡ يَسَّرۡنَا ٱلۡقُرۡءَانَ لِلذِّكۡرِ فَهَلۡ مِن مُّدَّكِرٖ﴾ ئەم قورئانەشمان سانا كرد كە بیری لێ بكرێتەوە ئاخۆ بیرەوەرێك هەیە؟

﴿كَذَّبَتۡ ثَمُودُ بِٱلنُّذُرِ ٢٣ فَقَالُوٓاْ أَبَشَرٗا مِّنَّا وَٰحِدٗا نَّتَّبِعُهُۥٓ إِنَّآ إِذٗا لَّفِي ضَلَٰلٖ وَسُعُرٍ ٢٤ أَءُلۡقِيَ ٱلذِّكۡرُ عَلَيۡهِ مِنۢ بَيۡنِنَا بَلۡ هُوَ كَذَّابٌ أَشِرٞ ٢٥ سَيَعۡلَمُونَ غَدٗا مَّنِ ٱلۡكَذَّابُ ٱلۡأَشِرُ ٢٦ إِنَّا مُرۡسِلُواْ ٱلنَّاقَةِ فِتۡنَةٗ لَّهُمۡ فَٱرۡتَقِبۡهُمۡ وَٱصۡطَبِرۡ ٢٧ وَنَبِّئۡهُمۡ أَنَّ ٱلۡمَآءَ قِسۡمَةُۢ بَيۡنَهُمۡۖ كُلُّ شِرۡبٖ مُّحۡتَضَرٞ ٢٨ فَنَادَوۡاْ صَاحِبَهُمۡ فَتَعَاطَىٰ فَعَقَرَ ٢٩ فَكَيۡفَ كَانَ عَذَابِي وَنُذُرِ ٣٠ إِنَّآ أَرۡسَلۡنَا عَلَيۡهِمۡ صَيۡحَةٗ وَٰحِدَةٗ فَكَانُواْ كَهَشِيمِ ٱلۡمُحۡتَظِرِ ٣١ وَلَقَدۡ يَسَّرۡنَا ٱلۡقُرۡءَانَ لِلذِّكۡرِ فَهَلۡ مِن مُّدَّكِرٖ ٣٢﴾

**بەسەرهاتی ( چیرۆكی ) هۆزی سەمود ( ثمود )**

خوای گەورە باسی هۆزی سەمود دەكات كە باوەڕیان بە پێغەمبەرەكەیان سالح (سەلامی خوای لێبێت) نەكردو دەفەرموویت: ﴿كَذَّبَتۡ ثَمُودُ بِٱلنُّذُرِ﴾ سەمودیش بە ترسێنەران بێباوەڕ بوون. ﴿فَقَالُوٓاْ أَبَشَرٗا مِّنَّا وَٰحِدٗا نَّتَّبِعُهُۥٓ إِنَّآ إِذٗا لَّفِي ضَلَٰلٖ وَسُعُرٍ﴾ وتیان جا چۆن وەشوێن مرۆڤێك دەكەوین لە خۆمان؟

---

[1] الطبري (٢٢/٥٨٧).

ئەگەر وابێت، ئەوسا ئێمە لە گومڕایی‌و دەبەنگی داین. دەڵێن: بێگومان ئێمە داماوو ڕەنجەڕۆین ئەگەر هەموو خۆمان وەدەستەوە بدەین بە یەکێك لە خۆمان، پاشان سەرسام بوون لەو نیگایەی بۆی هات بە تەنهاو ئەوان هیچیان بۆ نەدەهات. پاشان تاوانباریان کرد بەوەی کە درۆ دەکات وتیان: ﴿أَءُلْقِيَ الذِّكْرُ عَلَيْهِ مِن بَيْنِنَا بَلْ هُوَ كَذَّابٌ أَشِرٌ﴾ چۆن لەناو هەموو ئێمەدا فەرمانی خودا هەر بۆ ئەو دێت؟ بەڵکو پیاوێکی درۆزن‌و خۆپەسەندە. ﴿بَلْ هُوَ كَذَّابٌ أَشِرٌ﴾ بەڵکو ئەو درۆزنێکی لە ئەندازە بە دەرەو خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿سَيَعْلَمُونَ غَدًا مَّنِ الْكَذَّابُ الْأَشِرُ﴾ سبەی ڕۆژێك پێدەزانن کێ درۆزنی خۆپەسەندە. ئەمە هەڕەشەیەکی زۆر توندو بەڵێنێکی ڕاستە. پاشان خوای مەزن فەرموویەتی: ﴿إِنَّا مُرْسِلُوا النَّاقَةِ فِتْنَةً لَّهُمْ فَارْتَقِبْهُمْ وَاصْطَبِرْ﴾ ئێمە وشترێکیان بۆ دەنێرین کە تاقیان بکەینەوە سا تۆ هەر چاودێریان بەو خۆت ڕاگرە. واتە: ئێمە وشترێکیان بۆ دەنێرین بۆ ئەوەی کە تاقیان بکەینەوە، خوای گەورە وشترێکی گەورەی ئاوسی لە بەردێکی ڕەق بۆ وەدەرهێنان بەو شێوەیەی کە خۆیان داوایان کردبوو، بۆ ئەوەی ببێتە بەڵگەیەکی خودا لەسەریان بۆ ئەوەی کە باوەڕ بێنن بەو پەیامەی کە پێغەمبەرەکەی سالح (سەلامی خوای لێبێت) کە ﴿فَارْتَقِبْهُمْ وَاصْطَبِرْ﴾ ئاگای لێیان بێت‌و پەلە نەکات‌و خۆڕابگرێت، چونکە پاشەڕۆژو سەرکەوتن لە دنیاو لە ڕۆژی دواییدا هەر بۆ ئەوە. خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَنَبِّئْهُمْ أَنَّ الْمَاءَ قِسْمَةٌ بَيْنَهُمْ كُلُّ شِرْبٍ مُّحْتَضَرٌ﴾ پێیان بڵێ کە ئاوەکە لە ناویاندا بەش کراوە، هەر کەس لە نۆرە ئاوی خۆی ئامادەبێت. واتە: بە نۆرەیە ڕۆژێك بۆ ئەوان‌و ڕۆژێکیش بۆ وشترەکەیە وەك خودا دەفەرموێت: ﴿قَالَ هَٰذِهِ نَاقَةٌ لَّهَا شِرْبٌ وَلَكُمْ شِرْبُ يَوْمٍ مَّعْلُومٍ ﴿١٥٥﴾﴾[1] واتە: (صالح -سەلامی خوای لێبێت-) وتی ئەم وشترە مێینە (موعجیزە)یەو ئاو خواردنەوە ڕۆژێك بۆ ئەوەو ڕۆژێکیش بۆ ئێوەیە. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿كُلُّ شِرْبٍ مُّحْتَضَرٌ﴾ موجاهد دەڵێت: کاتێك وشترەکە نەهاتایەو ئامادە نەبووایە ئەوان دەهاتن بۆ سەر ئاوەکە کاتێکیش وشترەکە دەهات، دەهاتن بۆ شیرەکەی.[2] پاشان خوای مەزن فەرمووی: ﴿فَنَادَوْا صَاحِبَهُمْ فَتَعَاطَىٰ فَعَقَرَ﴾ بانگی هاوەڵی خۆیان کرد، ئەویش هات بە دەنگیانەوەو پەلی وشترەکەی بڕی. زانایانی تەفسیر دەڵێن ئەو کەسەی دەست‌و پێی وشترەکەی بڕی. ناوی قوداری (قُدَار) کوڕی سالیف (سالف) بوو کە بەدبەختترین کەسی هۆزەکەی

---

[1] الشعراء (١٥٥).

[2] الطبري (٢٢/٥٩٢).

بوو. وەك خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿إِذِ ٱنۢبَعَثَ أَشۡقَىٰهَا﴾[1] واتە: کاتێك کە خراپترینیان هەستانەوە (بۆ سەربڕینی وشترەکە). ﴿فَتَعَاطَىٰ﴾ واتە: ڕاست بووەوەو دەستی چووە وشترەکەو ﴿فَعَقَرَ﴾ دەستو پای بڕی. ﴿فَكَيۡفَ كَانَ عَذَابِي وَنُذُرِ﴾ دەسا چۆن بوو جەزرەبەو هەڕەشەکانم؟ واتە: جەزرەبەم دان چۆن جەزرەبەیەك لەسەر ئەو خوانەناسو باوەڕنەکردنەیان بە پێغەمبەرەکەم. خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿إِنَّآ أَرۡسَلۡنَا عَلَيۡهِمۡ صَيۡحَةٗ وَٰحِدَةٗ فَكَانُواْ كَهَشِيمِ ٱلۡمُحۡتَظِرِ﴾ نەعرەتەیەکمان بۆ ناردن وەك پووشی ژێر پێی ئاژەڵ یان بۆن گرتوو کە ئاژەڵ نایخوات (لێ بەسەرهات). واتە: قڕیان کردو هەموو تیاچوون و نەمانو کوژانەوەو دامرکانەوە وەك چۆن گیاوگژەو دارو درەخت وشك دەبێتو نامێنێت. زۆر لە زانایانی تەفسیر وایان مانا کردووە. سودی دەڵێت: ئەو لەوەڕگەیە کە لە دەشتدا کاتێك کە وشك دەبێتو دەسووتێتو بلا دەبیات، ئیبنو زەید دەڵێت: عەرەبەکان ئەوسا خواردنیان بۆ وشترو ئاژەڵەکانی تر کۆکردەوە کاتێك کە ئەو درکە وشك دەبوو، مەبەست بەم ئایەتە کە دەفەرمووێت: ﴿كَهَشِيمِ ٱلۡمُحۡتَظِرِ﴾ ئەمە بووە.

﴿كَذَّبَتۡ قَوۡمُ لُوطِۭ بِٱلنُّذُرِ ﴿٣٣﴾ إِنَّآ أَرۡسَلۡنَا عَلَيۡهِمۡ حَاصِبًا إِلَّآ ءَالَ لُوطٖۖ نَّجَّيۡنَٰهُم بِسَحَرٖ ﴿٣٤﴾ نِّعۡمَةٗ مِّنۡ عِندِنَاۚ كَذَٰلِكَ نَجۡزِي مَن شَكَرَ ﴿٣٥﴾ وَلَقَدۡ أَنذَرَهُم بَطۡشَتَنَا فَتَمَارَوۡاْ بِٱلنُّذُرِ ﴿٣٦﴾ وَلَقَدۡ رَٰوَدُوهُ عَن ضَيۡفِهِۦ فَطَمَسۡنَآ أَعۡيُنَهُمۡ فَذُوقُواْ عَذَابِي وَنُذُرِ ﴿٣٧﴾ وَلَقَدۡ صَبَّحَهُم بُكۡرَةً عَذَابٞ مُّسۡتَقِرّٞ ﴿٣٨﴾ فَذُوقُواْ عَذَابِي وَنُذُرِ ﴿٣٩﴾ وَلَقَدۡ يَسَّرۡنَا ٱلۡقُرۡءَانَ لِلذِّكۡرِ فَهَلۡ مِن مُّدَّكِرٖ ﴿٤٠﴾﴾

### بەسەرهاتی هۆزی لوت ( لوط )

خوای گەورە باسی هۆزی لوت دەکات کە چۆن باوەڕیان نەبوو بە پێغەمبەرەکەیانو دژایەتیان کردو هەڵدەسان بەو کارە خراپە (نێربازی) کە تاوانێك بوو پێش ئەوان هیچ کەسێك لە دنیادا نەیکردبوو، بۆیە خوای گەورە قڕی کردنو بە شێوەیەك لەناوی بردن هیچ گەلێکی بەو شێوەیە لەناو نەبردووە. خوای گەورە فەرمانی دا بە جوبرەئیل (سەلامی خوای لێبێت) شارەکانی (مدائن)ی هەڵگرتو بەرزی کردەوە بۆ ئاسمانو هەڵی گەڕاندەوەو دای بەسەریانداو بەردبارانیشی کردن، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿كَذَّبَتۡ قَوۡمُ لُوطِۭ بِٱلنُّذُرِ﴾ هۆزی لوتیش بەرانبەر بە ترسێنەرەکان بێباوەڕ بوون. بۆیە خوای گەورە لێرەدا فەرموویەتی: ﴿إِنَّآ أَرۡسَلۡنَا عَلَيۡهِمۡ حَاصِبًا إِلَّآ ءَالَ لُوطٖۖ نَّجَّيۡنَٰهُم بِسَحَرٖ﴾ گێژەلوکەی

[1] الشمس (١٢).

زیخو چەومان نارده سەریان جگە لـە کەسوکاری لـوت بـەیانی زوو ڕزگارمـان کـردن. ﴿نَّجَّيۡنَٰهُم بِسَحَرٖ﴾ واتە: لە کۆتایی شەودا دەرچوون ڕزگاریان بوو لەو بەلایەی کە تووشی هۆزەکەیان بوو. هـیچ کـەس لـە هۆزی لوت باوەڕیان بە لوت نەهێنا هەتا ژنەکەیشی تووشی ئەو بەلایە بوو کە هۆزەکـەی تووشـی بـوو. لوت پێغەمبەر(سەلامی خوای لێبێت)و کچەکانی خـۆی دەرچـوون بـە سـەلامەتیو تووشـی ئـەو بەلایـە نەبوون. بۆیە خوای گـەورە فەرموویـەتی: ﴿نِّعۡمَةٗ مِّنۡ عِندِنَاۚ كَذَٰلِكَ نَجۡزِي مَن شَكَرَ﴾ لـە چـاکەو بـەزەیی خوداوەیە، ئاوا چاکەی سوپاسکاران دەدەینەوە. ﴿وَلَقَدۡ أَنذَرَهُم بَطۡشَتَنَا فَتَمَارَوۡاْ بِٱلنُّذُرِ﴾ترسـاندنی لـە زەبری هەڵمەتی ئێمە (بەڵام ئەوان) لەو قسانە بە گومان بوون. واتە: ئەوانە پێش هاتنی ئەو سزایە کـە تووشـیان بێـت کـە دەیترسـاندن لـەو جەزرەبـەو تۆڵـەی خودایـە گوێیـان پـێ نـەدەداو لاشیان لێ نەدەکردەوە بەڵکو لەو قسانەش بە گومان بوون کە لوت پێغەمبەر(سەلامی خوای لێبێت) پێی دەوتـن. خـوای گـەورە دەفـەرمووێت: ﴿وَلَقَدۡ رَٰوَدُوهُ عَن ضَيۡفِهِۦ فَطَمَسۡنَآ أَعۡيُنَهُمۡ فَذُوقُواْ عَذَابِي وَنُذُرِ﴾ دەیانەویست کاری خراپ لەگەڵ میوانانی بکەن، سۆمای چـاوانم لێ سـاندن. دەبچێژن ئـازارو هەڕەشـەکانم. ﴿وَلَقَدۡ رَٰوَدُوهُ عَن ضَيۡفِهِۦ﴾ ئەو شەوە بوو کە فریشتەکان هاتبوون بۆ لای لوت پێغەمبەر(سەلامی خوای لێبێت) کە جوبئەیلو میکائیلو ئیسرافیل بوون لە وێنەی گەنجێکی زۆر جوانو کە موویان لێ نەهاتبوو بەلایەك بوو لە لایەن خوداوە بۆ سەریان. لوت پێغەمبەر(سـەلامی خـوای لێبێـت) زۆر ڕێـزی لێ گـرتن. ژنەکـەی لوت ناردی بۆ لای هۆزەکەیو هەواڵی میوانەکانی لوتی دانێ (سەلامی خوای لێبێت) بە پەلە لـە هـەموو لایەکەوە بەرەو ماڵی لوت پێغەمبەر(سەلامی خوای لێبێت) هاتن لوت پێغەمبەر(سەلامی خـوای لێبێـت) دەرگای ماڵی داخست لەسەریان گەرەکیان بوو (دەیانویست) دەرگاکە بـشکێنن لـەو ئێوارەیـەدا. لـوت پێغەمبەریش (سەلامی خوای لێبێت) نەیدەهێشت بەرەو ڕوویان وەستابوو پێـی دەوتـن: ﴿هَٰٓؤُلَآءِ بَنَاتِيٓ إِن كُنتُمۡ فَٰعِلِينَ﴾[1] واتە: ئا ئەوانە کچانی منن (مارەیان بکەن) ئەگەر ئێوە (ئـەو کـارە) ئـەنجام دەدەن. ﴿قَالُواْ لَقَدۡ عَلِمۡتَ مَا لَنَا فِي بَنَاتِكَ مِنۡ حَقّٖ وَإِنَّكَ لَتَعۡلَمُ مَا نُرِيدُ﴾[2] واتە: وتیان سوێند بێت بێگومان تۆ ئاگاداری ئێمە هیچ هەق (و ئارەزوو)یەکمان لە کچەکانتدا نیەو بە ڕاستی تۆ دەزانی ئێمە چیمان دەوێت. کاتێك وەزعەکە زۆر خراب بوو هـەر دەیانویـست بـچنە ژوورەوە، جوبرەئیـل چـووە دەرەوە بۆیـان (سـەلامی خوای بێت) بە لاباڵی دای بە چاویاندا سۆمای چاوی بردنو کـوێری کـردن گـەڕانـەوە بـەرەو ماڵـەکانیان

---

[1] الحجر (٧١).

[2] هود (٧٩).

دەستیان بە دیوارەوە دەگرت، هەڕەشەیان دەکرد دەیسانوت با ڕۆژ ببێتەوە، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ وَلَقَدْ صَبَّحَهُم بُكْرَةً عَذَابٌ مُّسْتَقِرٌّ ﴾ ئەوسا لە بەرەبەیاندا ئازاری لە بن نەهاتوو هات بەسەیاندا. کە ڕزگاریان نەبوو لەو ئازارەو دەبوو هەر تووشیان ببێت، ﴿فَذُوقُوا عَذَابِي وَنُذُرِ ﴾ سا بچێژن ئازارو هەڕەشەکانم. ﴿ وَلَقَدْ يَسَّرْنَا الْقُرْآنَ لِلذِّكْرِ فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ ﴾ ئەم قورئانەمان ساناو ئاسان کرد کە بیری لێ بکرێتەوە، ئاخۆ بیرەوەرێك هەیە؟

﴿وَلَقَدْ جَاءَ آلَ فِرْعَوْنَ النُّذُرُ ﴿٤١﴾ كَذَّبُوا بِآيَاتِنَا كُلِّهَا فَأَخَذْنَاهُمْ أَخْذَ عَزِيزٍ مُّقْتَدِرٍ ﴿٤٢﴾ أَكُفَّارُكُمْ خَيْرٌ مِّنْ أُولَٰئِكُمْ أَمْ لَكُم بَرَاءَةٌ فِي الزُّبُرِ ﴿٤٣﴾ أَمْ يَقُولُونَ نَحْنُ جَمِيعٌ مُّنتَصِرٌ ﴿٤٤﴾ سَيُهْزَمُ الْجَمْعُ وَيُوَلُّونَ الدُّبُرَ ﴿٤٥﴾ بَلِ السَّاعَةُ مَوْعِدُهُمْ وَالسَّاعَةُ أَدْهَىٰ وَأَمَرُّ ﴿٤٦﴾﴾

## بەسەرهاتی هۆزی فیرعەون

خوای گەورە باسی فیرعەون و گەلەکەی دەکات، کە پێغەمبەری خودا موسایان (سەلامی خوای لێبێت) بۆ ڕەوانەکرا، لەگەڵ هارونی برای وتیان بە گەلەکەیان گەر باوەڕبێنن خۆشبەخت دەبن، بەڵام ئەگەر خوانەناس بن تووشی سزا دەبن خوای گەورە بە موعجیزەی گەورەو بەڵگەی بەهێز یارمەتی دان، باوەڕیان بە هیچی نەکرد، خوای مەزنیش بە توندترین شێوە. سزای دان و تۆڵەی لێ سەندن و قڕی کردن و کەسی نەهێشتن و ئاسەواری بڕینەوە. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ جَاءَ آلَ فِرْعَوْنَ النُّذُرُ﴾ ترسێنەران هاتیشنە لای دەستەو دایەرەکەی فیرعەون. ﴿كَذَّبُوا بِآيَاتِنَا كُلِّهَا فَأَخَذْنَاهُمْ أَخْذَ عَزِيزٍ مُّقْتَدِرٍ﴾ سەر لە بەیانی نیشانەکانی ئێمەیان بە درۆ زانی، ئەوسا ئێمە گرتمانن بە گرتنی دەسەڵاتداری توانا.

## ئامۆژگاری قورەیش و هەڕەشە لێ کردنیان

پاشان خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ أَكُفَّارُكُمْ خَيْرٌ مِّنْ أُولَٰئِكُمْ أَمْ لَكُم بَرَاءَةٌ فِي الزُّبُرِ ﴾ ئاخۆ خوانەناسی ئێوە لەوەکانی تر چاکترن، یان لەناو کتێبەکاندا پاکانەیان بۆ هاتووە. ﴿ أَكُفَّارُكُمْ ﴾ واتە: ئەی بتپەرستان و بێ دینەکانی قورەیش. خوانەناسی ئێوە، ﴿خَيْرٌ مِّنْ أُولَٰئِكُمْ﴾ واتە: لەوانەی پێش خۆتان کە لەناوچوون بە هۆی باوەڕنەبوونیان بە پێغەمبەرەکان و (سەلامی خوایان لێبێت) کتێبەکانیان لەوان چاکترە؟ ﴿أَمْ لَكُم بَرَاءَةٌ فِي الزُّبُرِ﴾ یان لە لایەن خوداوە لێخۆشبوونتان بۆ دەرکراوە کە تووشی سزاو تۆڵە نابن؟ پاشان خوای گەورە باسیان دەکات و دەفەرموێت: ﴿ أَمْ يَقُولُونَ نَحْنُ جَمِيعٌ مُّنتَصِرٌ ﴾ یان دەڵێن: ئێمە گشتمان پێکەوەین و سەردەکەوین. واتە: وا دەزانن یارمەتی یەکتر دەدەن، ئەو

پێکەوەبوونەیان. بێخەمییان دەکات لە هەر کەسێك بیەوێت تووشی ئازاریان بکات. خودای مەزنیش فەرموویەتی: ﴿ سَيُهۡزَمُ ٱلۡجَمۡعُ وَيُوَلُّونَ ٱلدُّبُرَ ﴾ هەر ئەوەندەت زانیئەو کۆمەڵە لە شەڕ شکاو پشت بکەنەوەو ڕابکەن. واتە: کۆمەڵەکەیان پەرتەوازە ببێتو لە شەڕ بشکێن. بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەباسەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) لە قوبەیەکدا لە ڕۆژی (جەنگی) بەدردا فەرمووی: ( ئەی خودایە داوات لێ دەکەم بەو بەڵێنو پەیمانەی کە پێت داوم، خودایە ئەگەر ئەمانە سەر بخەی لەسەر زەمیندا ناپەرستریێت هەرگیز)، ئەبو بەکر دەستی پێغەمبەری گرت (ﷺ) وتی: بەستە ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) زۆر داوات کرد لە خودا پاڕایتەوە، پێغەمبەر(ﷺ) لەناو درعەکەیدا هەڵسا چووە دەرەوەو دەیفەرموو: ﴿ سَيُهۡزَمُ ٱلۡجَمۡعُ وَيُوَلُّونَ ٱلدُّبُرَ ۝٤٥ بَلِ ٱلسَّاعَةُ مَوۡعِدُهُمۡ وَٱلسَّاعَةُ أَدۡهَىٰ وَأَمَرُّ ﴾[1]، واتە: بەڵکو بەڵێنیان ڕۆژی دواییەو (سزای) ئەو ڕۆژە زۆر سەختترو تاڵترە. بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە یوسفی کوڕی ماهەکەوە دەڵێت: من لای عائیشەی دایکی موسڵمانان بووم وتی: ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە بۆ موحەممەد (ﷺ) لە مەککە من کیژێکی منداڵ بووم یاریم دەکرد: ﴿ بَلِ ٱلسَّاعَةُ مَوۡعِدُهُمۡ وَٱلسَّاعَةُ أَدۡهَىٰ وَأَمَرُّ ﴾[2]. هەر بەم شێوەیە ڕیوایەتی کردووە لێرەدا بە کورتی. وە بە درێژیش ڕیوایەتی کردووە لە فەزائیلی قورئاندا (في فضائل القرآن).[3] موسلیم ئەم فەرموودەی نەهێناوە.

﴿ إِنَّ ٱلۡمُجۡرِمِينَ فِي ضَلَٰلٖ وَسُعُرٖ ۝٤٧ يَوۡمَ يُسۡحَبُونَ فِي ٱلنَّارِ عَلَىٰ وُجُوهِهِمۡ ذُوقُواْ مَسَّ سَقَرَ ۝٤٨ إِنَّا كُلَّ شَيۡءٍ خَلَقۡنَٰهُ بِقَدَرٖ ۝٤٩ وَمَآ أَمۡرُنَآ إِلَّا وَٰحِدَةٞ كَلَمۡحِۭ بِٱلۡبَصَرِ ۝٥٠ وَلَقَدۡ أَهۡلَكۡنَآ أَشۡيَاعَكُمۡ فَهَلۡ مِن مُّدَّكِرٖ ۝٥١ وَكُلُّ شَيۡءٖ فَعَلُوهُ فِي ٱلزُّبُرِ ۝٥٢ وَكُلُّ صَغِيرٖ وَكَبِيرٖ مُّسۡتَطَرٌ ۝٥٣ إِنَّ ٱلۡمُتَّقِينَ فِي جَنَّٰتٖ وَنَهَرٖ ۝٥٤ فِي مَقۡعَدِ صِدۡقٍ عِندَ مَلِيكٖ مُّقۡتَدِرِۭ ۝٥٥ ﴾

### پاشەڕۆژی تاوانباران

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ إِنَّ ٱلۡمُجۡرِمِينَ فِي ضَلَٰلٖ وَسُعُرٖ ﴾ تاوانباران لە دەبەنگیو بێ ئاوەزیو گومڕایی دان. خوای مەزن باسی تاوانبارانمان بۆ دەکات کە چەندە لە گومڕاییو نەفامیدا دەژین هەمیشە لە گومانو دڵەڕاوکەدان لە ڕاوبۆچوونیاندا ئەمەیش هەموو ئەو کەسانە دەگرێتەوە کە ئەم خوڕەوشتەیان هەیە، وەك خوانەناسو ئەوانەی کە بە ئارەزووی خۆیان دەستکاری ئاینەکان دەکەن لە

[1] فتح الباري (٨/٤٨٥و ٤٨٦).

[2] فتح الباري (٨/٤٨٦).

[3] فتح الباري (٨/٦٥٥).

هەموو کۆمەڵگاکان. پاشان خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿يَوۡمَ يُسۡحَبُونَ فِي ٱلنَّارِ عَلَىٰ وُجُوهِهِمۡ ذُوقُواْ مَسَّ سَقَرَ﴾ ئەو ڕۆژە کە دەمەوڕوو لە ئاگردا ڕاکێش دەکرێت. دە بچێژن کڵپەی ئاگری جەهەنەم. واتە: وەك چۆن لە دنیادا لە بێ ئاوەزیو گومانو دڵەڕاوکەدا بوون، هەر بەو شێوەیە لە قیامەتدا دەڕۆنە ناو ئاگر. وەهەروەها چۆن لە دنیادا گومڕابوون بە ڕوودا ڕادەکێشرێن لە جەهەنەمدا نازانن بۆ کوێ دەچن. بۆ زیاتر خەفەت پێدانو سوکایەتی پێکردن پێیان دەڵێن: ﴿ذُوقُواْ مَسَّ سَقَرَ﴾ بچێژن کڵپەی ئاگری جەهەنەم.

## هەموو شتێك بە ئەندازە وەدی هاتووە

خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿إِنَّا كُلَّ شَيۡءٍ خَلَقۡنَٰهُ بِقَدَرٖ﴾ ئێمە هەموو بوونەوەرمان بە ئەندازە ئافەراندووە. وەك دەفەرمووێت: ﴿وَخَلَقَ كُلَّ شَيۡءٖ فَقَدَّرَهُۥ تَقۡدِيرٗا﴾[1] واتە: وە هەموو شتێکی دروست کردووەو ئەندازەی بۆ دیاری کرد (لە هەموو ڕوویەکەوە) بە چاکی. وە دەفەرمووێت: ﴿سَبِّحِ ٱسۡمَ رَبِّكَ ٱلۡأَعۡلَى ۝١ ٱلَّذِي خَلَقَ فَسَوَّىٰ ۝٢ وَٱلَّذِي قَدَّرَ فَهَدَىٰ﴾[2] واتە: بە پاکی یادی پەروەردگاری هەرەبڵندت بکە، ئەوەی (هەموو شتێکی) دروست کردووەو ڕێکوپێکی کردووە، وە ئەوەی کە نەخشەی کێشاوە (بۆ هەموو شتێك) ئینجا شارەزای کردووە. واتە: وەدیهێناوە بە ئەندازەو پاشان هەمووی ڕێ نیشان داوە بۆی. بۆیە زانایانو پێشەوایانی ئەهلی سوننەت ئەم ئایەتەیان کردووە بە بەڵگە لەسەر ئەوەی کە خودا هەموو شتێکی لە پێشدا بە ئەندازە داناوەو ئاگاداری هەموویەتی پێش هاتنیو نووسیوویەتی پێش ڕوودانی ئەو شتە. وە بەم ئایەتەو چەند ئایەتی تریش لەم شێوەیەو ئەو فەرموودانەی کە لەسەر مانای ئەم ئایەتانە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی وەڵامی قەدەریەکانیان داوەتەوە. ئەوانەی کە لە کۆتایی چەرخی هاوەڵانی پێغەمبەردا سەریان هەڵدا. لەم بارەیەوە بە درێژی قسەمان کرد، ئەو فەرموودانەیش لەم بارەیەوە هاتبوو هێنامان لە شەرحی (كتاب الايمان) لە سەحیحی بوخاریدا (خودا لێی خۆش بێت) لێرەدا تەنها ئەو فەرموودانە باس دەکەین کە پەیوەندی بەم ئایەتە پیرۆزەوە هەیە. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو هورەیرەوە وتی: بتپەرستەکان هاتن بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) گفتوگۆیان (موناقەشەیان) دەکرد لەگەڵی لەسەر قەدەر ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە: ﴿يَوۡمَ يُسۡحَبُونَ فِي ٱلنَّارِ عَلَىٰ وُجُوهِهِمۡ ذُوقُواْ مَسَّ سَقَرَ ۝٤٨ إِنَّا كُلَّ شَيۡءٍ خَلَقۡنَٰهُ بِقَدَرٖ﴾[3]. هەر بەم شێوەیە موسلیم و تیرمیزیو ئیبنو ماجە ڕیوایەتیان کردووە. وە هەروەها بەزار ڕیوایەتی کردووە لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە

---

[1] الفرقان (٢).

[2] الاعلى (١-٣).

[3] احمد (٤٤٤/١)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

ئەمیش لە باوکیەوە باوکیشی لە باپیریەوە دەڵێت: ئەم ئایەتانە دانەبەزیوە لەسەر قەدەریەکان نەبێت، واتە لەسەر ئەوان دابەزیوە، کە دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ ٱلْمُجْرِمِينَ فِى ضَلَٰلٍ وَسُعُرٍ ﴿٤٧﴾ يَوْمَ يُسْحَبُونَ فِى ٱلنَّارِ عَلَىٰ وُجُوهِهِمْ ذُوقُوا۟ مَسَّ سَقَرَ ﴿٤٨﴾ إِنَّا كُلَّ شَىْءٍ خَلَقْنَٰهُ بِقَدَرٍ﴾[1]. وە کوڕی ئەبو حاتەمیش ڕیوایەتی کردووە لە زورارەوە ئەویش لە باوکیەوە، باوکیشی لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) کە ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿ذُوقُوا۟ مَسَّ سَقَرَ ﴿٤٨﴾ إِنَّا كُلَّ شَىْءٍ خَلَقْنَٰهُ بِقَدَرٍ﴾ فەرمووی: (هاتە خوارەوە لەسەر کەسانێك لە ئوممەتی من لە ئاخرزەماندا دێن باوەڕیان بە قەدەری خودا نیە).[2] لە عەتای ئەبو ڕیباحەوە دەڵێت: هاتم بۆ لای ئیبنو عەباس لە زەمزەم دەهاتە دەرەوە لای خواری جلەکانی تەڕ بوو پێم وت باسی قەدەر دەکەن. وتی: ئایا ئەوەیان کرد؟ وتم: بەڵێ، وتی: سا سوێند بە خوا ئەم ئایەتە لەسەر ئەوانە هاتووەتە خوارەوە: ﴿ذُوقُوا۟ مَسَّ سَقَرَ ﴿٤٨﴾ إِنَّا كُلَّ شَىْءٍ خَلَقْنَٰهُ بِقَدَرٍ﴾ ئا ئەوانە خراپترین مەردمی ئەم ئوممەتەن. سەر لە نەخۆشیان مەدەن و نوێژ لەسەر مردوویان مەکەن و نوێژ لەسەر مردوویان مەکەن. گەر یەکێك لەو کەسانەم چاو پێ بکەوتایە چاوم هەڵدەکۆڵی بە ئەم دوو پەنجەیەم.[3] ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە نافیعەوە دەڵێت: ئیبنو عومەر هاوەڵێکی لە شام هەبوو نامەی بۆ نووسی، عەبدوڵلای کوڕی عومەر نامەیەکی بۆ نووسی پێی وت هەواڵم پێ گەیشتووە کە تۆ هەندێ قسەت لە قەدەر کردووە. نەکەی نامەم بۆ بنوسی (واتە جارێکی تر نامەمە بۆ مەنووسە) چونکە من گوێم لێ بووە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەیفەرموو: (پەیدا دەبن باوەڕیان بە قەدەر نیە)[4]. ئەبو داودیش لە ئەحمەدی کوڕی حەنبەلەوە ڕیوایەتی کردووە.[5] ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عومەرەوە دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (هەموو شتێك بە قەدەرە هەتا کەم فامی و زیریش).[6] موسلیمیش ڕیوایەتی کردووە لە مالکەوە بە تەنها بەو شێوەیە.[7] لە فەرموودەی سەحیحدا هاتووە: (داوای یارمەتی بکە لە خوداو ماندوو مەبە، ئەگەر تووشی شتێك بوویت بڵێ: قەدەری خودایە هەر شتێکی بوێت دەیکات. مەڵێ گەر من ئەوەم بکردایە وا دەبوو یان ئەمە دەبوو چونکە ئەوە کاری شەیتان ئاسان

---

[1] مسلم (٢٠٤٦/٤)، تحفة الأحوذي (١٧٦/٩)، ابن ماجه (٣٢/١).

[2] کشف الاستار (٧٢/٣)، پیاوەکانی ئەم فەرموودەیە جێی متمانەن.

[3] الطبراني (٢٧٦/٥)، ئەم فەرموودەیە زۆر لاوازە.

[4] احمد (٩٠/٢)، ئەم فەرموودەیە ئەلبانی بە حەسەنی داناوە.

[5] ابو داود (٢٠/٥)، ئەم فەرموودەیە ئەلبانی بە حەسەنی داناوە.

[6] احمد (١١٠/٢)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[7] مسلم (٢٠٤٥/٤).

دەکات‌و ڕێگای دەکاتەوە).[1] وە لە فەرموودەکەی ئیبنو عەباسەوە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی پێی: (بزانە کە هەموو ئوممەت کۆببووەوە لەسەر ئەوەی سوودی شتێکت پێ بگەیەنێت خودا بۆی نەنووسیبی سودت پێ ناگەیەنن، وە ئەگەر هەموو کۆببووەوە لەسەر ئەوەی کە زیانی شتێکت لێ بدەن، کە خودا لەسەری نەنووسیبی زیانت پێ ناگەیەنن، قەلەم وشک بووەتەوەو پەڕاویش پێچراوەتەوە).[2] ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە عوبادەی کوڕی وەلیدی کوڕی عوبادەوە دەڵێت: باوکم بۆی گێڕامەوە وتی: چوومە لای عوبادە نەخۆش بوو وای، بۆ دەچووم (وام دەزانی) کە نەخۆشی مردنی بوو وتم: ئەی بابە ئامۆژگاریەکی چاکم بکە وتی: دامنیشێنن، کاتێك دایان نیشاند وتی: ئەی کوڕی خۆم لەزەتی باوەڕ ناچێژی‌و بە تەواوی‌و ڕاستیش خودا ناناسی هەتا باوەڕ نەهێنی بە قەدەر بە چاکی‌و خراپی. وتم: ئەی باوکە من چۆن وام لێ دێت کە بزانم خێر کامەیەو شەڕ کامەیە؟ وتی: دەزانی ئەو شتەی لێی نەداوی توشت نابێت، ئەوەیش تووشت بووە، بە هەڵە لێی نەداوی. ئەی کوڕی خۆم من بیستوومە لە پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) دەیفەرموو: (یەکەم شتێك خودا دروستی کرد قەلەم بوو پاشان پێی وت بنووسە لەو کاتەدا ئەوەی کە دەبێت هەتا ڕۆژی قیامەت هەمووی پیا هات). واتە هەمووی نووسی. ئەی کوڕی خۆم گەر کردی‌و لەسەر ئەم باوەڕە نەمردی ڕۆیشتوویتەتە ناو ئاگر. واتە بێگومان دەچیتە ناو ئاگر.[3] تیرمیزیش ڕیوایەتی کردووەو دەڵێت: فەرموودەیەکی چاك‌و غەریبە (حسن صحيح غريب).[4] وە لە سەحیحی موسلیمدا هاتووە لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (خودا ئەندازەی دروستکراوەکانی نوسیوە پێش ئەوەی ئاسمانەکان‌و زەمین وەدی بهێنێت بە پەنجا هەزار ساڵ لەوەوپێش). ئیبنو وەهەب ئەمەی زیاد کردووە (وكان عرشه على الماء)[5]. واتە: عەرشی خوا لەسەر ئاو بووە. تیرمیزیش ڕیوایەتی کردووەو دەڵێت فەرموودەیەکی چاك و غەریبە[6].

## هەڕەشە لێکردن بۆ هاتن‌و جێبەجێکردنی فەرمانی خودا بۆیان

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَآ أَمۡرُنَآ إِلَّا وَٰحِدَةٞ كَلَمۡحِۭ بِٱلۡبَصَرِ﴾ کاری ئێمە یەکجارەیەو هەر لە چاو تروکانێکدا کۆتایی دێت. ئەمە هەواڵێکە لە بەجێهێنانی مەیلی خودا لە دروستکراوەکانیدا، وەك چۆن

[1] مسلم (٢٠٥٢/٤).

[2] تحفة الاحوذي (٢١٩/٧)، لە ئایەتی (٣٨)ی زومەردا پلەکەی دیاری کراوە.

[3] احمد (٣١٧/٥)، فەرموودەیەکی حەسەنە.

[4] تحفة الأحوذي (٣٦٨/٦) ، فەرموودەیەکی حەسەنە.

[5] مسلم (٢٠٤٤/٤).

[6] تحفة الأحوذي (٣٧٠/٦) ، فەرموودەیەکی سەحیحە.

هەواڵی پێداوین لە جێبەجێکردنی قەدەری خۆی تێیانداو دەفەرموێت: ﴿وَمَآ أَمۡرُنَآ إِلَّا وَٰحِدَةٞ كَلَمۡحِۭ بِٱلۡبَصَرِ﴾ واتە: کاتێك فەرمان دەدەین بە شتێك پێویست بە دووبارەکردنەوە ناکات. چونکە ئەو فەرمانەی ئێمە بەجێ هاتووەو بووە لە چاوتروکانێکدا کۆتایی هاتووە. خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿ وَلَقَدۡ أَهۡلَكۡنَآ أَشۡيَاعَكُمۡ فَهَلۡ مِن مُّدَّكِرٖ ﴾ پێشووش زۆری وەك ئێوەمان قڕ تێخستوون، ئاخۆ کەس وەبیریدا دێت؟ واتە: زۆری وەك ئێوەمان لە پێشەوە لەناوبرد لە گەلەکانی تر کە باوەڕیان نەبوو بە پێغەمبەران (سەلامی خوایان لێبێت)، ﴿فَهَلۡ مِن مُّدَّكِرٖ﴾ ئاخۆ کەس پەندو ئامۆژگاری لەوانە وەرگرتووە کە چۆن خودا سەرشۆڕی کردنو جەزرەبەی دان. وەك خودا خۆی دەفەرموێت: ﴿ وَحِيلَ بَيۡنَهُمۡ وَبَيۡنَ مَا يَشۡتَهُونَ كَمَا فُعِلَ بِأَشۡيَاعِهِم مِّن قَبۡلُ﴾[1] واتە: بەریەست دەخرێتە نێوان ئەوانو ئەوەی ئارەزووی دەکەن (کە بڕوا هێنانو تەوبەکردنە) هەروەکو بە هاوشێوەکانیان کرا لە پێشو ئەماندا. وە دەفەرموێت: ﴿ وَكُلُّ شَيۡءٖ فَعَلُوهُ فِي ٱلزُّبُرِ﴾ هەر کارێکی کردوویانە وا لەناو دەفتەراندایە. واتە: نووسراوە لەسەریان لەو کتێبانەی وا بەدەست فریشتەکانەوە (سەلامی خوای گەورەیان لێبێت)، ﴿ وَكُلُّ صَغِيرٖ وَكَبِيرٖ مُّسۡتَطَرٌ﴾ کەمو زۆری خەت دراوە. واتە: هەرچیان کردووە کۆکراوەتەوە لەسەریان لە نامەی کردارییاندا نووسراوە لە کەمو زۆر هیچی لە بیر نەچووەو ژمێردراوە، ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە عائیشەوە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەیفەرموو: (ئەی عائیشە، ئاگات لە خۆت بێت لە تاوانە بچووکەکان، چونکە داوالێکراوی (پرسیارلێکراوی) لەوانە لە لایەن خوداوە).[2] نەسائیو ئیبنو ماجەش ڕیوایەتیان کردووە[3].

## پاشەڕۆژی خۆپارێزان هەر چاکەیە

خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿ إِنَّ ٱلۡمُتَّقِينَ فِي جَنَّٰتٖ وَنَهَرٖ﴾ خۆپارێزان لە باغاتو ڕووبارەکاندان. واتە: بە پێچەوانەی ئەو شوێنەی کە بەدبەختانی تێدان لە گومڕاییو لەڕێ شێواوی بە دەمدا ڕاکێشراون لەناو ئاگرداو لەگەڵ ئەو هەموو هەڕەشەو بە سوكو ڕیسوا سەیرکردنەدا، ﴿ فِي مَقۡعَدِ صِدۡقٍ عِندَ مَلِيكٖ مُّقۡتَدِرِۭ﴾ لە نشیمەنی پەسەندان لای پاشایەکی بە دەسەڵاتی توانا. واتە لە کۆشکی پەسەندی خوداو

---

[1] سبأ (٥٤).

[2] احمد (١٥١/٦)، ئەم فەرموودەیە سەنەدەکانی لەسەر مەرجی بوخارییە.

[3] تحفة الاشراف (٢٥٠/١٢)، ابن ماجه (١٤١٧/٢)، سەنەدەکانی لەسەر مەرجی بوخارییە.

ڕێزو چاکەو بەهرەو بەخشش ئەودا، ﴿عِندَ مَلِيكٍ مُّقْتَدِرٍ﴾ واتە: لای خاوەن دەسەڵاتی مەزنو وەدیهێنەری هەموو شتێكو بە ئەندازە دانەری. ئەو خودایەی كە دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێكدا هەیە، لەوەی كە داوای دەكەنو دەیانەوێت. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی كردووە لە عەبدوڵڵای كوڕی عومەرەوە كە پێغەمبەر فەرموویەتی پێی: (دادپەروەران لەسەر چەند مینبەرێكن لە ڕووناكی لە لای خودا، لە لای ڕاستی ئەو خودایەی كە ڕەحمانە وە هەردوو دەستی لای ڕاستی ئەوانەن كە بە دادپەروری ڕەفتار دەكەن لە بڕیاریانداو لەناو كەسو كاریانداو لەوانەی كە ئەو سەرپەرشتیان دەكات[1]. موسلیمو نەسائیش ڕیوایەتیان كردووە[2].

## تەفسیری سورەتی (الرحمن)

## لە مەككەدا هاتووەتە خوارەوە

### ڕوونكردنەوەیەك لەسەر سورەتی (الرحمن)

ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی كردووە لە زیڕە كە پیاوێك وتی: چۆن ئەم پیتە دەناسی (ماء غير ياس، او آسن) وتی: هەموو قورئانت خوێندووەتەوە؟ وتی: من موفەسەلەكان لە ڕەكاتدا دەخوێنم وتی: ئەوەندە بە پەلە دەیخوێنیت وەك شیعر هەی باوكت نەمێنێت؟ من ئاگاداری قەرائینەكانی پێغەمبەر بووم (ﷺ) كە دوو دوو قەرینەی دەخستە پاڵی یەك لە یەكەم موفەسەلەكاندا وە یەكەم موفەسەلی ئیبنو مەسعودیش (الرحمن)ە[3]. ئەبو عیسای تیرمیزی ڕیوایەتی كردووە لە جابیرەوە دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) ڕۆیشت بۆ لای هاوەڵەكانی سورەتی (الرحمن)ی بۆ خوێندن لە سەرەتاوە هەتا كۆتاییەكەی ئەوانیش بێدەنگ بوون، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (ئەم سورەتەی (الرحمن)م خوێند بەسەر جنۆكەدا شەوی جنۆكەكان ئەوان لە ئێوە وەڵامیان چاكتر بوو، من هەر كاتێك دەچوومە سەر ئەم ئایەتە (واتە ئەم ئایەتەم دەخوێند): ﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾ دەیانوت: لە هیچ چاكەیەكی پەروەردگارمان حاشا ناكەین سوپاس بۆ تۆ خودایە). پاشان وتی: ئەم فەرموودەیە غەریبە (هذا حديث غريب).[4] حافیز ئەبو بەكری بەزاریش ڕیوایەتی كردووە.[5] وە لە ئەبو جەعفەری كوڕی جەریر ڕیوایەتی كردووە لە ئیبنو عومەرەوە كە پێغەمبەری خودا(ﷺ) سورەتی (الرحمن)ی خوێند یان سورەتی (الرحمن)ی لە لای خوێندرا فەرمووی: (ئەوە چیە گوێم لە جنۆكەیە وەڵامیان لە ئێوە چاكترە

---

[1] احمد (۲/۱٦۰) ، فەرموودەیەكی سەحیحە.

[2] مسلم (۳/۱٤٥۸)، النسائي (۸/۲۲۱).

[3] احمد (۱/٤۱۲)، ئەم فەرموودەیە سەنەدەكانی حەسەنە.

[4] تحفة الأحوذي (۹/۱۷۷)، فەرموودەیەكی غەریبە.

[5] الحاكم (۲/٤۷۳)، فەرموودەیەكی غەریبە.

بۆ پەروەردگاریان). وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەو وەڵامە کامەیە؟ فەرمووی: (نەگەیشتووم بەم فەرمودەی خوای گەورەیە: ﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾ مەگین جنۆکە وتوویانە؟ لە هیچ چاکەیەکی پەروەردگارمان حاشا ناکەین.[1] حافیزی بەزاریش ڕیوایەتی کردووە[2].

﴿ٱلرَّحْمَٰنُ ﴿١﴾ عَلَّمَ ٱلْقُرْءَانَ ﴿٢﴾ خَلَقَ ٱلْإِنسَٰنَ ﴿٣﴾ عَلَّمَهُ ٱلْبَيَانَ ﴿٤﴾ ٱلشَّمْسُ وَٱلْقَمَرُ بِحُسْبَانٍ ﴿٥﴾ وَٱلنَّجْمُ وَٱلشَّجَرُ يَسْجُدَانِ ﴿٦﴾ وَٱلسَّمَآءَ رَفَعَهَا وَوَضَعَ ٱلْمِيزَانَ ﴿٧﴾ أَلَّا تَطْغَوْا۟ فِى ٱلْمِيزَانِ ﴿٨﴾ وَأَقِيمُوا۟ ٱلْوَزْنَ بِٱلْقِسْطِ وَلَا تُخْسِرُوا۟ ٱلْمِيزَانَ ﴿٩﴾ وَٱلْأَرْضَ وَضَعَهَا لِلْأَنَامِ ﴿١٠﴾ فِيهَا فَٰكِهَةٌ وَٱلنَّخْلُ ذَاتُ ٱلْأَكْمَامِ ﴿١١﴾ وَٱلْحَبُّ ذُو ٱلْعَصْفِ وَٱلرَّيْحَانُ ﴿١٢﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿١٣﴾﴾

### خوای دڵاوا ئەم قورئانەی ناردووەو فێریشی کردووە

خوای مەزن باسی ڕێزو دلۆڤانی خۆی دەکات بەسەر بەندەکانیەوە کە قورئانی بۆ ناردوونو لەبەرکردنو تێگەیشتنی سوکو ئاسان کردووە بۆ ئەوانەی کە بەر بەزەییو ڕەحمی خۆی خستوون فەرموویەتی: ﴿ٱلرَّحْمَٰنُ﴾ خوای دڵاوا. ﴿عَلَّمَ ٱلْقُرْءَانَ﴾ ئەم قورئانەی دەرس داوە. ﴿خَلَقَ ٱلْإِنسَٰنَ﴾ مرۆڤی ئافەراندو دروست کرد. ﴿عَلَّمَهُ ٱلْبَيَانَ﴾ لە اخافتنی تێگەیاند، ﴿ٱلْبَيَانَ﴾ حەسەن دەڵێت: واتە: قسەکردن. چونکە ئەم باسە، باسی چۆنیەتی فێرکردنی قورئانە لە لایەن خودای گەورەوە. کە خوێندنەوەیەتی، ئەم خوێندنەوەش بە ئاسانی قسەی (ئاخافتنی) مرۆڤو بەکارهێنانی پیتەکان بە سوکو بە ئاسانی لە شوێنی خۆیدا لە گەرو (حلق) زمانو هەردوو لێودا بەو هەموو جۆری بەکارهێنانو ئەو جیاوازیانەی کە لە نێوانیاندا هەیە.

### نیشانەکانی دەسەڵاتی خودا لە خۆرو مانگو ئاسمانەکانو زەمین

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ٱلشَّمْسُ وَٱلْقَمَرُ بِحُسْبَانٍ﴾ خۆرو مانگیش بە ئەندازە دێنو دەچن. واتە: دەچن بە دوای یەکدا زۆر بە ڕێکوپێکی پاشو پێشو لەرە ناکەن وەك خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿لَا ٱلشَّمْسُ يَنۢبَغِى لَهَآ أَن تُدْرِكَ ٱلْقَمَرَ وَلَا ٱلَّيْلُ سَابِقُ ٱلنَّهَارِ ۚ وَكُلٌّ فِى فَلَكٍ يَسْبَحُونَ﴾[3] واتە: خۆر بۆی نیە (ناتوانێت) بگات بە مانگو شەویش ناتوانێت پێش بکەوێت لە ڕۆژو هەریەکەیان

---

[1] الطبري (٢٣/٢٣).

[2] كشف الاستار (٣/٧٤)، ئەم فەرموودەیە سەنەدەکانی لاوازە، ئەلبانی هێناویەتی لە سەحیحەکەیدا نەیپێکاوە لە لاپەڕە (٢١٥٠).

[3] يس (٤٠).

(خۆرو مانگ) لە خولگەیەکدا مەلە دەکەنو دەسوڕێنەوە. وە دەفەرموێت: ﴿فَالِقُ ٱلْإِصْبَاحِ وَجَعَلَ ٱلَّيْلَ سَكَنًا وَٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ حُسْبَانًاۚ ذَٰلِكَ تَقْدِيرُ ٱلْعَزِيزِ ٱلْعَلِيمِ﴾[1] واتە: (خوا) بەدیهێنەری شەبەقو ڕووناکی ڕۆژوونەوەیەو شەوی کردووە بە کاتو هۆی ئارامگرتنو خۆرو مانگی کردووەتە هۆی حساب دیاریکردنو زانینی کات ئەوەش ئەندازەگرتنی خوای بە دەسەڵاتی زانایە. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَٱلنَّجْمُ وَٱلشَّجَرُ يَسْجُدَانِ﴾ گیا وردیلەو درەخت (بۆ خودا) سوژدە دەبەن. ئیبنو جەریر دەڵێت: زانایانی تەفسیر بۆچوونی جیاوازیان هەیە لە مانای ﴿وَٱلنَّجْمُ﴾ دای ئەوەی کە هەموو کۆن لەسەر ئەوەی کە درەخت ئەوەیە کە لەسەر قەد وەستاوە.[2] عەلی کوڕی ئەبو تەلحە ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەباسەوە دەڵێت: (النجم) ئەوەیە کە بڵاوبووەتەوە بەسەر زەمیندا لە ڕووەك.[3] سەعیدی کوڕی جوبەیرو سودیو سوفیانی سەوریش هەر وایان وتووە.[4] ئیبنو جەریریش هەمان ڕای هەڵبژاردووە. موجاهد دەڵێت: (النجم) ئەو ئەستێرەیە کە لە ئاسماندایە.[5] حەسەنو قەتادەیش هەر وایان وتووە.[6] ئەم ڕایە دیارو ئاشکراترە خودا خۆشی دەزانێت. چونکە فەرموویەتی: ﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ يَسْجُدُ لَهُۥ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِى ٱلْأَرْضِ وَٱلشَّمْسُ وَٱلْقَمَرُ وَٱلنُّجُومُ وَٱلْجِبَالُ وَٱلشَّجَرُ وَٱلدَّوَآبُّ وَكَثِيرٌ مِّنَ ٱلنَّاسِ﴾[7] واتە: ئایا نەتدی کە بە ڕاستی سوژدە بۆ خودا دەبات ئەوەی لە ئاسمانەکانو ئەوەی لە زەویدایە، هەروەها ڕۆژو مانگو ئەستێرەکانو چیاکانو درەختو گیانلەبەرانو زۆرێکیش لە خەڵکی (هەموو ئەمانەی باسکرا سوژدە دەبەن). خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَٱلسَّمَآءَ رَفَعَهَا وَوَضَعَ ٱلْمِيزَانَ﴾ ئاسمانی بەرزکردووەتەوەو تەراووی دامەزراندووە. واتە: بە ڕاستو ڕێکی. وەك خوای مەزن فەرموویەتی: ﴿لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِٱلْبَيِّنَٰتِ وَأَنزَلْنَا مَعَهُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْمِيزَانَ لِيَقُومَ ٱلنَّاسُ بِٱلْقِسْطِ﴾[8] واتە: سوێند بە خوا بە ڕاستی ئێمە پێغەمبەرانی خۆمانمان ناردووە بە بەڵگەو موعجیزەی ڕوونەو کتێبی ئاسمانی و

---

[1] الانعام (٩٦).

[2] الطبري (١١/٢٣).

[3] الطبري (١٩/٢٣).

[4] الطبري (١١/٢٣).

[5] الطبري (١١/٢٣).

[6] الطبري (١٢/٢٣).

[7] الحج (١٨).

[8] الحديد (٢٥).

تەرازووی دادمان لەگەڵدا ناردن بۆ ئەوەی خەڵکی بە دادگەری ڕەفتار بکەن لەناو خۆیاندا. وە هەر لێرەشدا فەرموویەتی: ﴿أَلَّا تَطْغَوْا فِي الْمِيزَانِ﴾ کە لە ئەندازە دەرنەچن. واتە: ئاسمانەکانو زەمینی وەدی هێناوە بە ڕاستو ڕێکی بۆ ئەوەی هەموو شتەکانیش هەر بە ڕاستیو ڕێکو پێکی بن وەك ئەوان. بۆیە خودا فەرموویەتی: ﴿وَأَقِيمُوا الْوَزْنَ بِالْقِسْطِ وَلَا تُخْسِرُوا الْمِيزَانَ﴾ کێشانەتان بەرامبەر بێتو نەکات تەرازووتان سەر بکات. واتە با تەرازووتان سوك نەبێتو سەر نەکات بەڵکو با کێشانەتان ڕاستو ڕێك بێت. وەك خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَزِنُوا بِالْقِسْطَاسِ الْمُسْتَقِيمِ﴾[1] واتە: وە بە تەرازوویەکی ڕێك کێشانە بکەن. وە دەفەرموێت: ﴿وَالْأَرْضَ وَضَعَهَا لِلْأَنَامِ﴾ ئەم زەویەمان بۆ مەردم وەدی هێناوە. واتە: وەك چۆن ئاسمانی بەرزکردووەتەوە، زەمینیشی وەدی هێناوەو ڕای خستووەو بە کێوە بەرزو بڵندەکانیش دایکوتاوە بۆ ئەوەی ئەوانەی کە لەسەرین نیشتەجێ ببنو لەسەری دانیشن، لە هەموو جۆرەکانی مرۆڤ بە جیاوازی شێوەو ڕەنگو زمان لە هەموو پارچەو بەشەکانی سەر زەمیندا. ئیبنو عەباسو موجاهدو قەتادەو ئیبنو زەید دەڵێن: ﴿لِلْأَنَامِ﴾ واتە: مەردم.[2] خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فِيهَا فَاكِهَةٌ وَالنَّخْلُ ذَاتُ الْأَكْمَامِ﴾ میوەی تێدایەو دارخورمای خاوەن پشکۆش. واتە: پڕە لە میوەی هەمەڕەنگو تامو بۆن، ﴿وَالنَّخْلُ ذَاتُ الْأَكْمَامِ﴾ بە تایبەتی ناوی خورمای هێناوە لەبەر ڕێزو کەڵکی زۆری بە تەڕیو بە وشکی. ئیبنو جورەیج دەڵێت: لە ئیبنوعەباسەوە ﴿الْأَكْمَامِ﴾ واتە: شوێنی گۆپکەی دارخورما.[3] وە زۆر لە زانایانی تەفسیریش هەر وایان وتووە. ئەوەیە کە خونچەی لێ دەردێتو دەپشکوێتو پاشان لەت دەبێتو لە پۆشکەکەی جیادەبێتەوە پاشان دەبێت بە بوسروپاشان دەبێت بە ڕوتەب پاشان پێدەگاتو بە تەواوی سوورو ڕەش دەبێت لێی دەکرێتەوەو دەڕنێت. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَالْحَبُّ ذُو الْعَصْفِ وَالرَّيْحَانُ﴾ وە دانەوێڵەی خاوەن کاو پەلو پۆدارو ڕەیحانە. عەلی کوڕی ئەبو تەلحە لە ئیبنوعەباسەوە دەڵێت: ﴿وَالْحَبُّ ذُو الْعَصْفِ﴾ واتە: کا.[4] وەك کای گەنمو جۆو نۆك. عەوفی دەڵێت: لە ئیبنوعەباسەوە گەڵای

---

[1] الشعراء (١٨٢).

[2] الطبري (٢٣/١٥و ١٦).

[3] الدر المنثور (٧/٦٩٣).

[4] الطبري (٢٣/١٨).

کشتوکاڵ کە سەر قرت کرابێت ئەوە پێی دەوترێت (عصف) کاو پوش کاتێك وشك دەبێت.[1] هەروەها قەتادەو زەححاكو ئەبو مالك وتوویانە: (عصف) واتە: کردیە کاو پوش.[2] ئیبنوعەباسو موجاهدو کەسانی تریش وتوویانە: ﴿وَٱلرَّيۡحَانُ﴾ واتە: گەڵا.[3] حەسەن دەڵێت: (الريحان) ئەمە گەڵای خۆتانە واتە شینگەی بۆن خۆش.[4] عەلی کوڕی ئەبو تەلحە دەڵێت: لە ئیبنوعەباسەوە (الريحان) واتە: کشتوکاڵی سەوز.[5] خودا خۆشی دەزانێ (الحب) وەك گەنمو جۆ بۆ ئەوەی وەك ئەمانە لە کاتی سەوزبوونیدا کە بە گوڵەکەوەیە. (الريحان) ئەو گەڵایە کە بە دەوری قەدەکەدایە، وتراویشە ﴿ٱلۡعَصۡفِ﴾ ئەو گەڵایە کە یەکەمجار دەردێت لە تۆوەکەوە، (الريحان) واتە: گەڵا، یان ئەو توێکڵەی کە دانەکە لەناویدایە.

## مرۆڤ بە چاکەکانی خودا داپۆشراوە

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾ دەیسا ئێوە لە کام چاکەی پەروەردگارتان حاشا دەکەن؟ واتە: بە کام چاکەی خودا دەی گرۆی مرۆڤو جنۆکە باوەڕ ناکەنو حاشا دەکەن؟ ئەمە قسەی موجاهدو کەسانی تریشە. ئایەتەکانی دوای ئەم ئایەتە تەواو نیشانی دەدات ئەم هەموو چاکە دیارو ئاشکرایە بەسەرتانەوەیەو داپۆشیون لەناویدا نقوم بوون ناتوانن دانی پێدا نەنێنو ئینکاری بکەن، ئێمەش دەڵێین وەك جنۆکە خاوەن باوەڕەکان وتیان: ئەی خودایە لە هیچ چاکەیەکی پەروەردگارمان حاشا ناکەینو سوپاس هەر بۆ تۆیە. ئیبنو عەباس دەیوت: نا لە هیچی حاشا ناکەین ئەی پەروەردگار. واتە لە هیچێك لەو چاکانە حاشا ناکەین[6].

﴿خَلَقَ ٱلۡإِنسَٰنَ مِن صَلۡصَٰلٖ كَٱلۡفَخَّارِ ﴿١٤﴾ وَخَلَقَ ٱلۡجَآنَّ مِن مَّارِجٖ مِّن نَّارٖ ﴿١٥﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿١٦﴾ رَبُّ ٱلۡمَشۡرِقَيۡنِ وَرَبُّ ٱلۡمَغۡرِبَيۡنِ ﴿١٧﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿١٨﴾ مَرَجَ ٱلۡبَحۡرَيۡنِ يَلۡتَقِيَانِ ﴿١٩﴾ بَيۡنَهُمَا بَرۡزَخٞ لَّا يَبۡغِيَانِ ﴿٢٠﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٢١﴾ يَخۡرُجُ مِنۡهُمَا ٱللُّؤۡلُؤُ وَٱلۡمَرۡجَانُ ﴿٢٢﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٢٣﴾ وَلَهُ ٱلۡجَوَارِ ٱلۡمُنشَـَٔاتُ فِي ٱلۡبَحۡرِ كَٱلۡأَعۡلَٰمِ ﴿٢٤﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٢٥﴾﴾

---

[1] الطبري (٢٣/١٨).
[2] الطبري (٢٣/١٨).
[3] الطبري (٢٣/١٩).
[4] البغوي (٤/٢٦٨).
[5] الطبري (٢٣/٢١).
[6] الطبري (٢٣/٢٣).

**باس و ڕوونکردنەوەی دروستکردنی ئادەم و جنۆکە**

خـوای گـەورە فەرموویـەتی: ﴿خَلَقَ ٱلْإِنسَٰنَ مِن صَلْصَٰلٍ كَٱلْفَخَّارِ﴾ مرۆڤـی لـە قـوڕی وشکەوەبووی (چەشنی دەفری گڵێن) وەدی هێنا. خوای مەزن باسی وەدیهێنانی مـرۆڤ دەكات كە لـە قـوڕی وشـكەوەبووی وەك دەفـری گڵـێن شـكاو وەدی هێنـاوە. ﴿وَخَلَقَ ٱلْجَآنَّ مِن مَّارِجٍ مِّن نَّارٍ﴾ جنۆكەشی لە بڵێسەی بێ دووكەڵ وەدیهێنا. جنۆكەشی دروست كردووە لە بڵێسەو ئاگری بـێ دوكـەڵ، كە كۆتـایی گڕی ئـاگرە. زەححـاك وتوویـەتی: لـە ئیبنوعەباسـەوە.[1] وە هـەر بـەو شـێوەیە عیكریمـەو موجاهدو حەسەن و ئیبنو زەید وتوویانە.[2] عەوفی (العوفي) لـە ئیبنوعەباسـەوە دەڵێـت: ﴿مِن مَّارِجٍ مِّن نَّارٍ﴾ لە چاكترینی گڕی ئاگر.[3] ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی كـردووە لـە عائیـشەوە دەڵێـت: پێغەمبـەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (فریشتەكان وەدی هاتوون لە ڕووناكی جنۆكەیش وەدی هـاتووە لـە بڵێـسەی ئاگر. ئادەمیش لەوەی كە بۆتان باس كراوە).[4] واتە: لە قوڕی وشكەوەبووی گڵێنی شكاو. موسـلیمیش ڕیوایـەتی كـردووە.[5] وە دەفـەرمووێت: ﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾ دەیـسا ئێـوە لـە كـام چـاكەی پەروەردگارتان حاشا دەكەن؟

**خوای گەورە منەت دەكات بەسەر بەندەكانیـدا دەكـات بـەوەی كـە هـەردوو شـوێنی خۆرهـەڵات و خۆرنشینی ڕاهێناوە بۆیان**

خـوای مـەزن دەفـەرمووێت: ﴿رَبُّ ٱلْمَشْرِقَيْنِ وَرَبُّ ٱلْمَغْرِبَيْنِ﴾ هـەردوو شـوێنی خۆرهـەڵات و خۆرنـشینی ڕاهێناوە. واتە: دوو خۆرهەڵات: خۆرهەڵاتی هاوین و خۆرهەڵاتی زستان، وە دوو خۆرنشین: خۆرنـشینی هاوین و خۆرنشینی زستان. وە لە ئایەتێكی تردا فەرموویـەتی: ﴿فَلَآ أُقْسِمُ بِرَبِّ ٱلْمَشَٰرِقِ وَٱلْمَغَٰرِبِ إِنَّا لَقَٰدِرُونَ﴾[6] واتە: جا سوێند بە پەروەردگاری ڕۆژهەڵاتەكان و ڕۆژئاواكان. ئەمەیش بە دەركـەوتنی گزنگی خـۆر بـە جیاجیـاو گـۆڕانی ئـەو گزنگـە لـە هـەموو ڕۆژێكدا دیـارە مـەردم دەیبیـنن. وە لـە ئایـەتێكی تریـشدا

---

[1] الطبري (٢٣/٢٦).

[2] الطبري (٢٣/٢٧).

[3] الطبري (٢٣/٢٦).

[4] احمد (٦/١٦٨)، فەرموودەیەكی سەحیحە.

[5] مسلم (٤/٢٢٩٤).

[6] المعارج (٤٠).

فەرموویەتی: ﴿رَّبُّ ٱلْمَشْرِقِ وَٱلْمَغْرِبِ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ فَٱتَّخِذْهُ وَكِيلًا﴾[1] واتە: ئەو خودای ڕۆژهەلاتو ڕۆژئاوایە هیچ پەرستراوێکی بە ڕاستی نیە تەنها ئەو نەبێت کەوابوو بیکە بە بریکاری خۆت. لێرەدا مەبەست پێی جنسی خۆرهەلاتەکانو خۆرنشینەکانە، چونکە جیاوازی ئەم خۆرهەلاتو خۆرنشینانە لە بەرژەوەندی دروستکراوەکانی بووە لە مرۆڤو جنۆکە، وە فەرموویەتی: ﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾ دەیسا ئێوە لە کام چاکەی پەروەردگارتان حاشا دەکەن؟

**منەتکردنی خودا بەسەر بەندەکانیدا کە دەریاو کەشتی ڕاهێناوە بۆیان**

خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿مَرَجَ ٱلْبَحْرَيْنِ يَلْتَقِيَانِ﴾ دوو دەریای بەرەڵا کردووە کە دەگەن بەیەك. ئیبنوعەباس دەڵێت: بەری داوەتەوە.[2] ئیبنو زەید دەڵێت: ﴿يَلْتَقِيَانِ﴾ واتە: نەیهێڵاوەو نەیهێشتووە بچنە ناو یەك بە هۆی ئەو بەرزەخەی کە لە نێوانیاندایە کە جیای کردوونەتەوە.[3] وە مەبەست بە ﴿ٱلْبَحْرَيْنِ﴾ واتە: سوێرو شیرین. شیرینەك ئەم ڕووبارانەیە کە دێنو دەچن لە نێوان ئەم مەردمەدا وە دەفەرموێت: ﴿بَيْنَهُمَا بَرْزَخٌ لَّا يَبْغِيَانِ﴾ بەرزەخێکیان (بڵندایی نێوان تەختایی) لە نێواندایە کە بەسەر یەکتردا نایەن. لەم بارەیەوە دوایین لە سورەتی (الفرقان)دا لەم ئایەتانەدا کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِى مَرَجَ ٱلْبَحْرَيْنِ هَٰذَا عَذْبٌ فُرَاتٌ وَهَٰذَا مِلْحٌ أُجَاجٌ وَجَعَلَ بَيْنَهُمَا بَرْزَخًا وَحِجْرًا مَّحْجُورًا﴾[4] واتە: ئەو زاتێکە دوو دەریای بەرەڵا کردووە لە پاڵ یەکدا ئەمەیان شیرینو سازگارە ئەوی تریان زۆر سوێرو تاڵو تفتە (ئاوی دەریاکانە) وە لە نێوان ئەو دوو ئاوەدا بەربەستێکی داناوەو بەرگریکەرێکی ئەستوور (تا ئەو دوو ئاوە تێکەڵ بە یەك نەبن). وە دەفەرموێت: ﴿بَيْنَهُمَا بَرْزَخٌ لَّا يَبْغِيَانِ﴾ واتە: بەرزەخی لە نێوانیان داناوە. کە ئەوەیش بەربەستێکە لە زەمین بۆ ئەوەی نەچن بەسەر یەکترداو یەکتری خراپ بکەنو ئەو سیفەتەی هەریەکە بۆ خۆی هەیەتی نەمێنێتو لەناو بچێت، ﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾ دەیسا ئێوە لە کام چاکەی پەروەردگارتان حاشا دەکەن؟. وە دەفەرموێت: ﴿يَخْرُجُ مِنْهُمَا ٱللُّؤْلُؤُ وَٱلْمَرْجَانُ﴾ لە هەردووکیان مرواریو مەرجان دەردەچن. ﴿ٱللُّؤْلُؤُ﴾ ناسراوە واتە:

---

[1] المزمل (٩).

[2] الطبري (٢٣/٢٩).

[3] الطبري (٢٣/٣١).

[4] الفرقان (٥٣).

مرواری. بەڵام ﴿وَٱلْمَرْجَانُ﴾ واتە: مرواری بچووك‌و وردیلە. موجاهدو قەتادەو ئەبو زەزین (أبو رزین) زەححاك وتوویانە: ڕیوایەتیش کراوە لە عەلیەوە.[١] ئیبنو جەریر گێڕاویەتیەوە لە هەندێ لە زانایانی سەلەفەوە کە وتوویانە: واتە: مرواریە گەورەکان.[٢] ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەباسەوە دەڵێت: کاتێك کە باران لە ئاسمانەوە باری سەدەفەکان دەمیان دەکەنەوە هەرچی تێکەوت. واتە: هەرچی لە دڵۆپەی باران کەوتە ناوی دەبێتە مرواری.[٣] سەنەدەکەی ڕاستە. لەبەر ئەوەی بەکارهێنانی ئەم خشڵە بەهرەیەکی خودایە بۆ خەڵکی سەر زەمین. خوای گەورە کردوویەتی بە منەت بەسەریانەوەو فەرموویەتی: ﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾ دەیسا ئێوە لە کام چاکەی پەروەردگارتان حاشا دەکەن؟ وە دەفەرمووێت: ﴿وَلَهُ ٱلْجَوَارِ ٱلْمُنشَـَٔاتُ فِى ٱلْبَحْرِ كَٱلْأَعْلَـٰمِ﴾ کەشتیەکان بە بادەوەی چیائاسا (لە دەریادا) کاری ئەوە. ﴿ٱلْجَوَارِ ٱلْمُنشَـَٔاتُ﴾ واتە: ئەو کەشتیانەی کە هاتوچۆ دەکەن لە دەریادا، موجاهد دەڵێت: ئەوەی چارۆکەی پێوەیە لە کەشتی پێی دەوترێت: ﴿ٱلْمُنشَـَٔاتُ﴾ کەشتی چارۆکەدار، ئەوەی کە چارۆکەی پێوە نیە پێی ناوترێت ﴿ٱلْمُنشَـَٔاتُ﴾.[٤] قەتادە دەڵێت: ﴿ٱلْمُنشَـَٔاتُ﴾ واتە: دروستکراوەکان.[٥] بێجگە لەم کەسانی تر وتوویانە: (المُنْشِئات) بە کەسرەی شینەکە، واتە: (البادئات) ئەوانەی دەست دەکەن بە ڕۆیشتن. ﴿كَٱلْأَعْلَـٰمِ﴾ واتە: وەك کێوەکان لە گەورەییدا لەو شتانەی کە تیایەتی لە کەلوپەلی بازرگانی‌و پێویستیەکانی تر دەگوێزرێتەوە لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی تر یان لە کیشوەرێکەوە بۆ کیشوەرێکی تر لە هێنانی ئەو شتومەکانەی کە پێویستە بۆ بژێوی خەڵکی لە دنیادا، بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾ دەیسا ئێوە لە کام چاکەی پەروەردگارتان حاشا دەکەن؟

﴿كُلُّ مَنْ عَلَيْهَا فَانٍ ﴿٢٦﴾ وَيَبْقَىٰ وَجْهُ رَبِّكَ ذُو ٱلْجَلَـٰلِ وَٱلْإِكْرَامِ ﴿٢٧﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٢٨﴾ يَسْـَٔلُهُۥ مَن فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ كُلَّ يَوْمٍ هُوَ فِى شَأْنٍ ﴿٢٩﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٣٠﴾﴾

---

[١] الطبري (٢٣/٣٣)، القرطبي (١٧/١٦٣).

[٢] الطبري (٢٣/٣٤).

[٣] الطبري (٢٣/٣٥).

[٤] الطبري (٢٣/٣٧).

[٥] القرطبي (١٧/١٦٤).

**باسی بوون و مانەوەو بێ نیازی خودا**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿كُلُّ مَنْ عَلَيْهَا فَانٍ﴾ هەرکێ ژینی لەسەر زەمینە نامێنێت. ﴿وَيَبْقَىٰ وَجْهُ رَبِّكَ ذُو الْجَلَالِ وَالْإِكْرَامِ﴾ هەر خودای خاوەن شکۆی بەرزو بەرێزت دەمێنێت. خوای مەزن هەواڵمان دەداتێ کە هەموو خەڵکی سەر زەمین دەڕۆن و دەمرن هەروەها کەس نامێنێت بێجگە لە خۆی کە خاوەنی شکۆو رێزە. چونکە ئەو پەروەردگاری بەرزو پیرۆزە هەر دەمێنێتو هەرگیز نامرێت. قەتادە دەڵێت: هەواڵی داوە بەوەی وەدی هێناوە، پاشانیش هەواڵی داوە کە ئەمانە هەموو نامێنێتو لەناو دەچێت کە وەدی هێناوە، لە دوعایەکی مەئسوردا هاتووە: (ئەی ئەو کەسەی زیندووە، ئەی ئەو کەسەی بەسەر هەموو شت ڕادەگات، ئەی وەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەمین، ئەی ئەو کەسەی خاوەنی شکۆو ڕێزیت، هەموو کاروبارەکانمان بۆ چاك بکە، نەماندەیتە دەستی نەفسی خۆمان چاوتروکانێك وە نەماندەیتە دەست هیچ کەسێك لە دروستکراوەکانت)، شەعبی دەڵێت: کاتێك ﴿كُلُّ مَنْ عَلَيْهَا فَانٍ﴾ت خوێند مەوەستە و بێدەنگ مەبە هەتا ﴿وَيَبْقَىٰ وَجْهُ رَبِّكَ ذُو الْجَلَالِ وَالْإِكْرَامِ﴾ دەخوێنیت[1] ئەم ئایەتە وەك ئەم ئایەتە وایە کە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿كُلُّ شَيْءٍ هَالِكٌ إِلَّا وَجْهَهُ﴾[2] واتە: هەموو شتێك لەناو دەچێت جگە لە زاتی خوا. خوای گەورە باسی پیرۆزی خۆی کردووە لەم ئایەتەدا کە خاوەنی شکۆو ڕێزە دەبێت بێ فەرمانی نەکرێتو گوێڕایەڵی بکرێتو لە بڕیاری لانەدرێت. وەك دەفەرمووێت: ﴿وَاصْبِرْ نَفْسَكَ مَعَ الَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُم بِالْغَدَاةِ وَالْعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجْهَهُ﴾[3] واتە: خۆت ڕابگرە لەگەڵ ئەوانەی لە پەروەردگاریان دەپاڕێنەوە بەیانیان و ئێواران کە مەبەستیان ڕەزامەندی خودایە. وەك ئەم ئایەتەی کە باسی ئەو کەسانە دەکات کە ماڵ دەبەخشن لەبەر ڕەزامەندی خودا فەرموویەتی: ﴿إِنَّمَا نُطْعِمُكُمْ لِوَجْهِ اللَّهِ﴾[4] واتە: بە ڕاستی ئێمە خواردەمەنیتان دەدەینێ هەر لەبەر خودا. ئیبنوعەباس دەڵێت: ﴿ذُو الْجَلَالِ وَالْإِكْرَامِ﴾ واتە: خاوەنی شکۆو مەزنی.[5] کاتێك خوای گەورە باسی یەکسانی هەموو خەڵکی سەر زەمینی کرد لە مردندا وە بەو زووانە هەموو دەڕۆن بەرەو ڕۆژی دوایی خوای خاوەن شکۆو مەزن فەرمانڕەوایی دەکات لە نێوانیاندا بەو دادپەروەرییەی خۆی. دەفەرمووێت:

---

[1] الدر المنثور (٧/٦٩٨).

[2] القصص (٨٨).

[3] الكهف (٢٨).

[4] الانسان (٩).

[5] الطبري (٢٣/٨٦).

﴿ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾ دەیسا ئێوە لە کام چاکەی پەروەردگارتان حاشا دەکەن؟ وە دەفەرمووێت: ﴿يَسْـَٔلُهُۥ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ كُلَّ يَوْمٍ هُوَ فِى شَأْنٍ﴾ هەرکێ لەناو ئاسمانەکانو زەمین، هەموو کارێکیان هەر بەرەو ئەوە گشت ڕۆژێك بە کارێکەوە خەریکە. ئەمە هەواڵ لەوەی کە خوا بێ نیازە لە هەموو شتێك غەیری خۆیو هەموو وەدیهێنراوەکان دەستەوخوارو هەژارن پێویستیان بەو هەیە لە هەموو کارو هەڵسوکەوتێکیاندا وە بە زمانی حاڵیانو گفتاریان داوای لێ دەکەنو هەموو ڕۆژێك بە کارێکەوە خەریکە. ئەعمەش لە موجاهدەوە دەڵێت لە عوبەیدی کوڕی عومەیرەوە: ﴿كُلَّ يَوْمٍ هُوَ فِى شَأْنٍ﴾ دەڵێت: هەر ئەوە وەڵامی هەر کەسێك بداتەوە کە هاواری لێ بکات یان ببەخشێت بە هەر کەسێك کە داوای لێ بکاتو لە تاوانبارێك ببوورێتو دەردەدارێك چاك بکاتەوەو شیفای بدات.[1] ﴿ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾ دەیسا ئێوە لە کام چاکەی پەروەردگارتان حاشا دەکەن.

﴿سَنَفْرُغُ لَكُمْ أَيُّهَ ٱلثَّقَلَانِ ﴿٣١﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٣٢﴾ يَٰمَعْشَرَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ إِنِ ٱسْتَطَعْتُمْ أَن تَنفُذُوا۟ مِنْ أَقْطَارِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ فَٱنفُذُوا۟ ۚ لَا تَنفُذُونَ إِلَّا بِسُلْطَٰنٍ ﴿٣٣﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٣٤﴾ يُرْسَلُ عَلَيْكُمَا شُوَاظٌ مِّن نَّارٍ وَنُحَاسٌ فَلَا تَنتَصِرَانِ ﴿٣٥﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٣٦﴾﴾

**هەڕەشە لە گرۆی جنۆکە و مرۆڤو باسی ئەو ناڕەحەتیو ئێشو ئازارەی کە تووشیان دەبێت**

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿سَنَفْرُغُ لَكُمْ أَيُّهَ ٱلثَّقَلَانِ﴾ ئێمە بە کارتان ڕادەگەین ئەی گرۆی مرۆڤو جنۆکە. ئیبنو جورەیج دەڵێت: ﴿سَنَفْرُغُ لَكُمْ﴾ واتە: بەم زووانە کارتان تەواو دەکەینو بڕیارت لەسەر دەدەین. بوخاری دەڵێت: واتە: بەم زووانە لێتان دەپرسینەوە هیچ شتێك بەری ئەوی تر ناگرێت لێمان.[2] ئەمە لە قسەی عەرەبدا باوە وتراوە: ئەمپەرژێتەوە بۆت کارم بەوە نیە. دەوترێت: ڕاتدەکێشم بە ڕوودا (بە دەموچاودا) خودا دەفەرمووێت: ﴿أَيُّهَ ٱلثَّقَلَانِ﴾، ﴿ٱلثَّقَلَانِ﴾ مرۆڤو جنۆکەیە وەك لە فەرموودەی سەحیحدا هاتووە دەفەرمووێت: (هەموو شتێك دەیبیستێتو گوێی لێیە بێجگە لە مرۆڤو جنۆکە).[3] وە لە ڕشیوایەتێکی تریشدا فەرموویەتی: (بێجگە لە مرۆڤو جنۆکە)، وە لە فەرموودەکەی

---

[1] الطبري (٢٣/٣٩).

[2] فتح الباري (٨/٤٨٧).

[3] فتح الباري (٣/٢٤٤).

کەڵەشاخدا هاتووە: ﴿ٱلثَّقَلَانِ﴾ واتە: مرۆڤو جنۆکە.[1] ﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾ دەیسا ئێوە لە کام چاکەی پەروەردگارتان حاشا دەکەن؟ پاشان خوای مەزن فەرموویەتی: ﴿يَٰمَعۡشَرَ ٱلۡجِنِّ وَٱلۡإِنسِ إِنِ ٱسۡتَطَعۡتُمۡ أَن تَنفُذُواْ مِنۡ أَقۡطَارِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ فَٱنفُذُواْۚ لَا تَنفُذُونَ إِلَّا بِسُلۡطَٰنٖ﴾ ئەی گرۆی جنۆکەو مرۆڤ گەر توانیتان لە گشت ئاسۆی ئاسمانەکانو زەمین دەرباز بن، دەسا بچن، ناشتوانن لێیان دەربچن، مەگین بە دەسەڵاتەوە. واتە: ناتوانن لە فەرمانو بڕیاری خوای گەورە دەربچنو ڕابکەن، بەڵکو دەوری داون هەرگیز ناتوانن خۆتان ڕزگار بکەن لە فەرمانیو دەربازبوونتان نیە بۆ هەر شوێنێك بڕۆن دەوری داون ئەم ڕووداوی ڕووداوی ڕۆژی حەشرە (ڕۆژی قیامەت) فریشتەکان دەوری هەموو خەڵکیان داوە بە حەوت ڕیز لە هەموو لایەکەوە، هیچ کەس ناتوانێت ڕابکات. ﴿إِلَّا بِسُلۡطَٰنٖ﴾ مەگەر بە فەرمانی خودا. ﴿يَقُولُ ٱلۡإِنسَٰنُ يَوۡمَئِذٍ أَيۡنَ ٱلۡمَفَرُّ ١٠ كَلَّا لَا وَزَرَ ١١ إِلَىٰ رَبِّكَ يَوۡمَئِذٍ ٱلۡمُسۡتَقَرُّ﴾[2] واتە: ئەو کاتە مرۆڤ دەڵێت: دەربازگە لە کوێوەیە، نەخێر هیچ پەناگەیەك نیە، لەو ڕۆژەدا ئارامگا هەر لای پەروەردگاری تۆیە. وە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَٱلَّذِينَ كَسَبُواْ ٱلسَّيِّـَٔاتِ جَزَآءُ سَيِّئَةِۭ بِمِثۡلِهَا وَتَرۡهَقُهُمۡ ذِلَّةٞۖ مَّا لَهُم مِّنَ ٱللَّهِ مِنۡ عَاصِمٖۖ كَأَنَّمَآ أُغۡشِيَتۡ وُجُوهُهُمۡ قِطَعٗا مِّنَ ٱلَّيۡلِ مُظۡلِمًاۚ أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ﴾[3] واتە: ئەوانەش کە کردەوەی خراپیان کردووە تۆڵەی هەر خراپەیەك بە ئەندازەی ئەو (خراپەیە تۆڵەی لێ دەسێنرێت)و ڕیسوایی دایان دەگرێت بۆیان نیە هیچ پەنادەرێك لە سزای، (بە ڕاددەیەك ڕوویان ڕەش بووە) دەڵێی دەمو چاویان داپۆشراوە بە چەند بەشێك لە شەوەزەنگ ئەوانەی هاوڕێی ئاگری دۆزەخن ئەوان تێیدا دەمێننەوە بە هەمیشەیی. وە دەفەرمووێت: ﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾ دەیسا ئێوە لە کام چاکەی پەروەردگارتان حاشا دەکەن؟ لەبەر ئەمەیە فەرموویەتی: ﴿يُرۡسَلُ عَلَيۡكُمَا شُوَاظٞ مِّن نَّارٖ وَنُحَاسٞ فَلَا تَنتَصِرَانِ﴾ گڕی بە دوکەڵو بێ دوکەڵی ئاگر دەتانگرێت، ئەوسا کەس بە هاناتانەوە نایەت. عەلی کوڕی ئەبو تەلحە دەڵێت: لە ئیبنوعەباسەوە: (الشواظ) گڕی ئاگر.[4] ئەبو سالح دەڵێت: (الشواظ) ئەو گڕەی لەسەری ئاگرەکەوەیە کە دوکەڵی نیە، زەححاك دەڵێت: ﴿شُوَاظٞ مِّن نَّارٖ﴾ لافاوێك لە ئاگر.

---

[1] الطوال للطبراني (٢٧٣)، لە پێشەوە باس کراوە.

[2] القيامة (١٠ـ١٢).

[3] يونس (٢٧).

[4] الطبري (٢٣/٤٥).

﴿وَنُحَاسٌ﴾ عەلی کوڕی ئەبو تەلحە دەڵێت: لە ئیبنوعەباسەوە واتە: دوکەڵی ئاگر.[1] هەر بەم شێوەیە ڕیوایەت کراوەلە ئەبو ساڵحو سەعیدی کوڕی جوبەیرو ئەبو سینانەوە[2]. ئیبنو جەریر دەڵێت عەرەب بە دوکەڵ دەڵێن نوحاس بە زەمەی نونو کەسرەیش (بضم النون وكسرها) بەڵام قورئان خوێنەکانی کۆن لەسەر زەممە[3]. موجاهد دەڵێت: (النحاس) زێڕ (مس) دەتوێنرێتەوەو دەبێت بە ئاو، دەکرێت بەسەر سەریاندا.[4] قەتادەیش هەر وای وتووە.[5] زەحهاك دەڵێت: (النحاس) لافاوێك لە زێڕ یان مس ماناکەی ئەوەیە گەر لە ڕۆژی قیامەتدا بڕۆنو ڕابکەن فریشتەو گزیرەکانی بۆ ئەوەی بگەڕێنەوە گرشی ئاگرو مسو زێڕی تواوە دەکەن بەسەرتاندا، بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴾ دەیسا ئێوە لە کام چاکەی پەروەردگارتان حاشا دەکەن؟

﴿ فَإِذَا ٱنشَقَّتِ ٱلسَّمَآءُ فَكَانَتْ وَرْدَةً كَٱلدِّهَانِ ﴿٣٧﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٣٨﴾ فَيَوْمَئِذٍ لَّا يُسْـَٔلُ عَن ذَنۢبِهِۦٓ إِنسٌ وَلَا جَآنٌّ ﴿٣٩﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٤٠﴾ يُعْرَفُ ٱلْمُجْرِمُونَ بِسِيمَٰهُمْ فَيُؤْخَذُ بِٱلنَّوَٰصِى وَٱلْأَقْدَامِ ﴿٤١﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٤٢﴾ هَٰذِهِۦ جَهَنَّمُ ٱلَّتِى يُكَذِّبُ بِهَا ٱلْمُجْرِمُونَ ﴿٤٣﴾ يَطُوفُونَ بَيْنَهَا وَبَيْنَ حَمِيمٍ ءَانٍ ﴿٤٤﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٤٥﴾ ﴾

**باسی گرانیو نارەحەتی ڕۆژی قیامەتو ژیانی تاوانباران**

خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿ فَإِذَا ٱنشَقَّتِ ٱلسَّمَآءُ فَكَانَتْ وَرْدَةً كَٱلدِّهَانِ﴾ سا هەرکاتێك ئەم ئاسمانە قلیشی بردو بە ڕەنگی گوڵو چەرمی سور هاتە بەرچاو. ﴿ فَإِذَا ٱنشَقَّتِ ٱلسَّمَآءُ ﴾ لە ڕۆژی قیامەتدا. وەك ئەم هەموو ئایەتانەو نموونەی ئەم ئایەتانە کە لەم مانایەدا هاتووە بەڵگەیە لەسەری، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَٱنشَقَّتِ ٱلسَّمَآءُ فَهِىَ يَوْمَئِذٍ وَاهِيَةٌ﴾[6] واتە: وە ئاسمان لەت دەبێتو ئەو لەو ڕۆژەدا سستو بێ کەڵکە. وە دەفەرموێت: ﴿إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنشَقَّتْ ﴿١﴾ وَأَذِنَتْ لِرَبِّهَا وَحُقَّتْ﴾[7] واتە: کاتێك کە ئاسمان لەت بوو، وە ملکەچی کرد بۆ پەروەردگاریو دەبێت واش بێت. وە دەفەرموێت:

---

[1] الطبري (٢٣/٤٧).
[2] الطبري (٢٣/٤٧).
[3] الطبري (٢٣/٤٨).
[4] الطبري (٢٣/٤٨).
[5] الطبري (٢٣/٤٨).
[6] الحاقة (١٦).
[7] الانشقاق (١ـ٢).

﴿فَكَانَتْ وَرْدَةً كَالدِّهَانِ﴾ واتە: دەتوێتەوە وەك چۆن كەرێ و (ڕۆن و زێڕو ئالتون) دەتوێتەوەو دەكرێتە قالبو ڕەنگاوڕەنگ دەبێت وەك ئەو بۆیانەی بۆیەی پێ دەكرێتو ڕەنگی سورو زەردو شینو سەوز، ئەوەیش لەبەر گرانیو ناڕەحەتی ڕۆژی قیامەتە. سودی دەڵێت: وەك ڕەنگی گوڵو خڵتەی ڕۆنی زەیتون. موجاهد دەڵێت: ﴿كَالدِّهَانِ﴾ وەك ڕەنگەكانی ڕۆن.[1] ﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾ دەیسا ئێوە لە كام چاكەی پەروەردگارتان حاشا دەكەن؟ خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿فَيَوْمَئِذٍ لَّا يُسْئَلُ عَن ذَنبِهِۦٓ إِنسٌ وَلَا جَآنٌّ﴾ لەو ڕۆژەدا هیچ كەس (لە مرۆڤو جنۆكە) بۆ گوناهی كە كردوویەتی، نایەتە بەر پرسینەوە. ئەم ئایەتە وەك ئەم ئایەتە وایە كە دەفەرمووێت: ﴿هَٰذَا يَوْمُ لَا يَنطِقُونَ ۝ وَلَا يُؤْذَنُ لَهُمْ فَيَعْتَذِرُونَ﴾[2] واتە: ئەمڕۆ ڕۆژێكە (بێباوەڕان) ناتوانن قسەی تێدا بكەن، وە مۆڵەت نادرێن كە بروبیانوو بهێننەوە. ئەمە لە حاڵێكداو پاشان لە حاڵێكی تردا پرسیار لە كرداری هەموو كەسێك دەكرێت هیچی لەبیر ناكرێت. خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَوَرَبِّكَ لَنَسْـَٔلَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ ۝ عَمَّا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ﴾[3] واتە: جا سوێند بە پەروەردگارت پرسیار لە هەموویان دەكەین، لەوەی كە دەیانكرد (لە دنیادا). بۆیە قەتادە وتوویەتی: ﴿فَيَوْمَئِذٍ لَّا يُسْئَلُ عَن ذَنبِهِۦٓ إِنسٌ وَلَا جَآنٌّ﴾ لە پێشەوە پرسیاركردنو پاشان مۆركردنی دەمیانو دەست قاچیان قسە دەكەنو هەرچیان كردووە دەیڵێنو باسی دەكەن[4]. ﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾ دەیسا ئێوە لە كام چاكەی پەروەردگارتان حاشا دەكەن؟ وە دەفەرمووێت: ﴿يُعْرَفُ ٱلْمُجْرِمُونَ بِسِيمَٰهُمْ فَيُؤْخَذُ بِٱلنَّوَٰصِى وَٱلْأَقْدَامِ﴾ تاوانباران بە شێوەو چروچاو دەناسرێن، ئیتر قژی سەرو لە قاچەكانیان دەنەون. واتە: بەو نیشانانەی كە پێیانەوە دیارە، حەسەنو قەتادە دەڵێن: دەیانناسنەوە بە ڕووی ڕەشو چاوی شینیاندا[5]. منیش دەڵێم: ﴿فَيُؤْخَذُ بِٱلنَّوَٰصِى وَٱلْأَقْدَامِ﴾ واتە: وەك چۆن موسڵمانان بە ڕووو قاچی سپیاندا دەناسرێنەوە كە بۆ دەستنوێژ شۆردوویانە. قژیان دەگرن لەگەڵ قاچیان بە یەكەوەو فڕێیان دەدەنە ناو ئاگر بەو شێوەیە ئەعمەش دەڵێت لە ئیبنوعەباسەوە:

---

[1] الطبري (٢٣/٥٠).

[2] المرسلات (٣٥ـ٣٦).

[3] الحجر (٩٢ـ٩٣).

[4] الطبري (٢٣/٥٢).

[5] الطبري (٢٣/٥٢).

بە قژو قاچ هەڵدەگیرێتو دەشکێنرێتو ورد دەکرێت وەك چۆن دار بۆ ناو تەنوور وردەکرێت.[1] خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾ دەیسا ئێوە لە کام چاکەی پەروەردگارتان حاشا دەکەن؟ پاشان دەفەرموێت: ﴿هَٰذِهِۦ جَهَنَّمُ ٱلَّتِي يُكَذِّبُ بِهَا ٱلْمُجْرِمُونَ﴾ ئەمە هەر ئەو دۆزەخەیە تاوانباران بڕوایان وانەبوو هەیە. واتە: ئەم ئاگرەی کە ئێوە باوەڕتان پێی نەبوو، ئەوەتا ئامادەیەو لەبەرچاوتانە بە ئاشکرا دەیبینن، ئەمە بۆ سوکایەتی پێکردنو بێ نرخیو سوك سەیرکردن پێیان دەوترێت. ﴿يَطُوفُونَ بَيْنَهَا وَبَيْنَ حَمِيمٍ ءَانٍ﴾ لەناویداو لەناو ئاوێکی کوڵاو دەخولێنەوە. واتە: جارێك جەزرەبە دەدرێن لەناو جەهەنەمداو جارێکیش ئاوی کوڵاویان دەدرێتێ دەیخۆنەوە خوردنەوەیەکە وەك مسو ئاڵتونی تواوە وایە. گەدەو ڕیخۆڵەیان پارچەپارچە دەکات. ئەم ئایەتە وەك ئەم ئایەتە وایە کە دەفەرموێت: ﴿ إِذِ ٱلْأَغْلَٰلُ فِيٓ أَعْنَٰقِهِمْ وَٱلسَّلَٰسِلُ يُسْحَبُونَ ﴿٧١﴾ فِي ٱلْحَمِيمِ ثُمَّ فِي ٱلنَّارِ يُسْجَرُونَ ﴾[2] واتە: کاتێك زنجیرو تەوقیان لە گەردندایە پێی ڕادەکێشرێن، لەناو ئاوی زۆر گەرمدا پاشان لە دۆزەخدا دەسوتێنرێن. وە دەفەرموێت: ﴿ءَانٍ﴾ واتە: گەرمێکی وەها کە لە تواناداا نیەو بەرگەی ناگیرێت لەبەر زۆر گەرمی. ئیبنو عەباس دەڵێت: ﴿يَطُوفُونَ بَيْنَهَا وَبَيْنَ حَمِيمٍ ءَانٍ﴾ واتە: تا ئاخر پلە کوڵاوەو زۆر گەرم بووە.[3] موجاهدو سەعیدی کوڕی جوبەیرو زەحاکو حەسەنو سەوریو سودیش هەر وایان وتووە.[4] قەتادە دەڵێت: لەو کاتەوە کە ئاسمانەکانو زەمین دروست کراوە گەرم کراوە دەکوڵێت.[5] موحەممەدی کوڕی کەعبی قەرەزی دەڵێت: ئەو کەسە دەگیرێتو بە قژی ڕادەوەشێنرێت لەناو ئەو ئاوە کوڵاوەدا هەتا گۆشتەکەی دەتوێتەوەو پێشەکەی دەمێنێتەوەو هەردوو چاوی لە سەریدا. ئەمە وەك ئەم ئایەتە وایە کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فِي ٱلْحَمِيمِ ثُمَّ فِي ٱلنَّارِ يُسْجَرُونَ ﴾[6] واتە: لە ناو ئاوی زۆر گەرمدا پاشان لە دۆزەخدا دەسوتێنرێت. ﴿حَمِيمٍ ءَانٍ﴾ واتە: گەرمو لە قەرەزیەوە ڕیوایەتێکی تر کراوە ﴿حَمِيمٍ ءَانٍ﴾ واتە: ئامادە ئەمە قسەی ئەبو زەیدیشە.[7] وتەی (ئامادە) هیچ جیاوازیەکی نیە لەوەی کە

---

[1] الدر المنثور (٧/٧٠٤).
[2] الغافر (٧١ـ٧٢).
[3] الطبري (٢٣/٥٤).
[4] الطبري (٢٣/٥٤و ٥٥)، القرطبي (١٧/١٧٥).
[5] الطبري (٢٣/٥٤).
[6] الغافر (٧٢).
[7] الطبري (٢٣/٥٥).

ڕیوایەت کراوە لە قەرەزیەوە لە سەرەتاوە کە وتی: ئاوی گەرمە. وەك ئەم ئایەتە کە دەفەرمووێت: ﴿تُسۡقَىٰ مِنۡ عَيۡنٍ ءَانِيَةٖ﴾[1] واتە: ئاو دەدرێن لە سەرچاوەی لە کوڵو هەرە گەرم. واتە: گەرمە گەرمێکی وەها کە بەرگەی ناگیرێت وەك ئەم ئایەتە کە دەفەرمووێت: ﴿غَيۡرَ نَٰظِرِينَ إِنَىٰهُ﴾[2] واتە: بێ ئەوەی چاوەڕوانی پێگەیشتنی بکەن. پێگەیشتن‌و ئامادەکردن. وە دەفەرمووێت: ﴿حَمِيمٍ ءَانٖ﴾ واتە: کوڵاوی زۆر گەرم. لەبەر ئەوەی کە تۆڵە سەندن لە تاوانبارو چاکەکردن لەگەڵ پارێزگاراندا لە فەزڵ‌و بەزەیی‌و سۆزو دادپەروەریەتی پێیان هەر بەو شێوەیە ترساندنیان لە تۆڵەو سزاو سەرزەنشتکردنیان لەو گوناهو بتپەرستیەی تێیدان ئەمانە هەمووی منەتی خودایە لەسەر بەندەکانی، بۆیە دەفەرمووێت: ﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾ دەیسا ئێوە لە کام چاکەی پەروەردگارتان حاشا دەکەن؟

﴿وَلِمَنۡ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِۦ جَنَّتَانِ ﴿٤٦﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٤٧﴾ ذَوَاتَآ أَفۡنَانٖ ﴿٤٨﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٤٩﴾ فِيهِمَا عَيۡنَانِ تَجۡرِيَانِ ﴿٥٠﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٥١﴾ فِيهِمَا مِن كُلِّ فَٰكِهَةٖ زَوۡجَانِ ﴿٥٢﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٥٣﴾﴾

## ژیانی پارێزگاران‌و ئەو هەموو بەهرەو خۆشیەی تێیدان لەناو ئەو باغانەدا لە بەهەشتدا

خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿وَلِمَنۡ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِۦ جَنَّتَانِ﴾ بۆ هەر کەسیش لە پەروەردگاری ترساوە، دوو باغ هەیە. لە لای خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا، وە لە ئایەتێکدا دەفەرمووێت: ﴿وَنَهَى ٱلنَّفۡسَ عَنِ ٱلۡهَوَىٰ﴾[3] واتە: بەرگری نەفسی خۆی کردبێت لە ئارەزووی خراپە. واتە: یاخی نەبووەو ژیانی دنیای بە گرنگتر نەگرتووەو زانیویەتی کە ژیانی دواڕۆژ زۆر چاکترەو هەر دەمێنێتەوەو هەرگیز تەواو نابێت. لەبەر ئەوە فەرزەکانی بەجێ هێناوە. ئەو شتانەی قەدەغە کراوە لێی دوور کەوتووەتەوە، ئەو کەسە لە ڕۆژی قیامەتدا لە لای پەروەردگاری دوو باغی دەدرێتێ، وەك بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە عەبدوڵای کوڕی قەیسەوە، کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (دوو باغ کە دەفرەکانی لە زیوە ئەوەیش کە تێیاندایە هەر لە زیوە، دوو باغیش کە دەفرەکانی لە ئاڵتونە ئەوەیش کە تێیاندایە هەر لە ئاڵتونە لە نێوان ئەو خەڵکەو لە نێوان ئەو سەیرکردنەی بۆ خوای گەورە تەنها جبەی کیبریایە لەسەر ڕووی لە

---

[1] الغاشية (٥).

[2] الاحزاب (٥٣).

[3] النازعات (٤٠).

بەهەشتی لەدندا.[1] زانایانی فەرمووده ئەم فەرموودەیان هێناوە جگە لە ئەبو داود نەبێت. لە فەرموودەکەی (عبدالعزین)دا بەو شێوەیە.[2] ئەم ئایەتە بۆ هەموو مرۆڤو جنۆکەیە ئەمە بەهێزترین بەڵگەیە جنۆکە دەچنە بەهەشت، گەر خاوەن باوەڕو پارێزگار بن، بۆیە خوای گەورە منەت دەکات بەسەر مرۆڤو جنۆکەدا بەم پاداشتە گەورەیەو فەرموویەتی: ﴿وَلِمَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِ جَنَّتَانِ ﴿٤٦﴾ فَبِأَيِّ آلَاءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾ دەیسا ئێوە لە کام چاکەی پەروەردگارتان حاشا دەکەن؟. پاشان وەسفی ئەو دوو باغەی کردووەو فەرموویەتی: ﴿ذَوَاتَا أَفْنَانٍ﴾ هەردوو خاوەن درەختی بە پەلکو پۆن. واتە: گەڵای چاکو جوانو هەموو جۆرە بەرهەمێکی باشو پێگەیوی پێوەیە. وە دەفەرمووێت: ﴿فَبِأَيِّ آلَاءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾ دەیسا ئێوە لە کام چاکەی پەروەردگارتان حاشا دەکەن؟ هەر بەم شێوەیە عەتای خۆراسانیو کۆمەڵێکی تریش وتوویانە: ﴿أَفْنَانٍ﴾ واتە: گەڵای درەخت لە پاڵ یەکو چووبن بەناو یەکدا. خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿فِيهِمَا عَيْنَانِ تَجْرِيَانِ﴾ وە لە هەردوودا دوو سەرچاوەی ڕەوان هەیە. واتە: دەڕۆن بۆ ئەوەی ئەو درەختو گەڵانە ئاو بدرێن هەموو جۆرو ڕەنگێك بەرهەم بهێنن. حەسەنی بەسری دەڵێت: ئاوێکیان پێی دەوترێت تەسنیم ئەوی تریان پێی دەوترێت سەلسەبیل[3] عەتیەدەڵێت: یەکێکیان ڕوونەو لیڵ نیەو ئەوی تریشیان ڕووباری شەرابە تا بیخۆن کەیفی پێ دەکەن.[4] ﴿فَبِأَيِّ آلَاءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾ دەیسا ئێوە لە کام چاکەی پەروەردگارتان حاشا دەکەن؟ پاشان دوایی فەرمووێت: ﴿فِيهِمَا مِن كُلِّ فَاكِهَةٍ زَوْجَانِ﴾ هەموو میوەیەکیان تێدایە، کە هەموو جووتی یەکترن. واتە: لە هەموو جۆرە میوەو بەرێکی پێوەیەو تێدایە لەوەی کە دەیناسنو چاکترە لەوەیش، وە تێشی تێدایە نە چاو دیویەتیو نە گوێ بیستوویەتیو نە بە خەیاڵیش بە دڵی کەسدا هاتووە. ﴿فَبِأَيِّ آلَاءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾ دەیسا ئێوە لە کام چاکەی پەروەردگارتان حاشا دەکەن؟ ئیبراهیمی کوڕی حەکەمی (حكم) کوڕی ئەبان دەڵێت: لە باوکیەوەو لە عیکریمەوە لە ئیبنو عەباسەوە دەڵێت: هیچ میوەیەکی (بەرهەمێکی) شیرینو تاڵ نیە لە دنیادا مەگین لە بەهەشتدا هەیە. هەتا گوژاڵکەیش[5]. ئیبنو عەباس دەڵێت: ئەوەی

---

[1] فتح الباري (٨/٤٩١).

[2] مسلم (١/١٦٣)، تحفة الأحوذي (٧/٢٣١٢)، النسائي في الكبرى (٤/٤١٩)، ابن ماجه (١/٦٦).

[3] القرطبي (١٧/١٧٨).

[4] القرطبي (١٧/١٧٨).

[5] القرطبي (١٧/١٧٩).

له دنیا هەیە لەچاو ڕۆژی دوایدا هەر ناوەکانیان وەك یەکە. واتە: جیاوازیەکی زۆرو ئێجگار گەورە هەیە لە نێوانیاندا لە چاکیدا.

﴿مُتَّكِـِٔينَ عَلَىٰ فُرُشٍۭ بَطَآئِنُهَا مِنْ إِسْتَبْرَقٍۚ وَجَنَى ٱلْجَنَّتَيْنِ دَانٍ ﴿٥٤﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٥٥﴾ فِيهِنَّ قَـٰصِرَٰتُ ٱلطَّرْفِ لَمْ يَطْمِثْهُنَّ إِنسٌ قَبْلَهُمْ وَلَا جَآنٌّ ﴿٥٦﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٥٧﴾ كَأَنَّهُنَّ ٱلْيَاقُوتُ وَٱلْمَرْجَانُ ﴿٥٨﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٥٩﴾ هَلْ جَزَآءُ ٱلْإِحْسَـٰنِ إِلَّا ٱلْإِحْسَـٰنُ ﴿٦٠﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٦١﴾﴾

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿مُتَّكِـِٔينَ عَلَىٰ فُرُشٍۭ بَطَآئِنُهَا مِنْ إِسْتَبْرَقٍۚ وَجَنَى ٱلْجَنَّتَيْنِ دَانٍ﴾ لەسەر ڕایەخێك پاڵ کەوتوون، کە بەرەکانیان لە ئاوریشمی ئەستوورەو بەری گەیشووی هەردوو باغ لەوان نزیك کەوتووەتەوە. ﴿مُتَّكِـِٔينَ﴾ واتە: خەڵکی ناو بەهەشت لەسەر فەرش پاڵکەوتوون. وتراویشە: واتە: دانیشتن بە شێوەی چوارمشقی، ﴿عَلَىٰ فُرُشٍۭ بَطَآئِنُهَا مِنْ إِسْتَبْرَقٍ﴾ لەناو ئاوریشمی ئەستوور، عیکریمەو زەححاكو قەتادە وتوویانە.[1] ئەبو عیمرانی جونی (عمران الجوني) دەڵێت: واتە: ئاوریشمی ڕازاوە بە زێڕ، لێرەدا ئیشارەت دەدات بە بەرەکانیان کە ئاوریشمە. فەرشێك بەرەکەی ئەوەندە چاك بێت. دەبێ دەرەوەی چۆن بێت، بێگومان زۆر چاکترە، ئەبو ئیسحاق دەڵێت لە هوبەیرەی کوڕی یەریم ئەویش لە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودەوە دەڵێت: ئەمە بەرەکەیەتی ئەی ئەگەر دەرەوەتان ببینیایە بەو کاتە چۆن دەبوو.[2] ﴿وَجَنَى ٱلْجَنَّتَيْنِ دَانٍ﴾ واتە: میوەو بەرهەمەکەیشی نزیکە لێیانەوە هەرکاتێك ئارەزووی بکەن بە هەر شێوەیەك بیانەوێت دێتە بەردەستیان، وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿قُطُوفُهَا دَانِيَةٌ﴾[3] واتە: کە میوەی نزیکە دەستە. وە دەفەرمووێت: ﴿وَدَانِيَةً عَلَيْهِمْ ظِلَـٰلُهَا وَذُلِّلَتْ قُطُوفُهَا تَذْلِيلًا﴾[4] واتە: وە سێبەری درەختانی بەهەشت بەسەر سەریانەوەیەو هێشووی میوەکانی نزیکە دەستو ئاسان کراوە. واتە: ڕێ ناگیرێت لە هەر کەسێك دەستی بۆ ببات بەڵکو لەناو کڵاکانیەوە دێتەدەرو دەکەوێتە بەردەستی. ﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾ دەیسا ئێوە لە کام چاکەی پەروەردگارتان حاشا دەکەن؟

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿فِيهِنَّ قَـٰصِرَٰتُ ٱلطَّرْفِ لَمْ يَطْمِثْهُنَّ إِنسٌ قَبْلَهُمْ وَلَا جَآنٌّ﴾ کیژۆڵەی هێند داوێن پاکیان لەناودایە، کە بەرلەوان کەسێك هەرگیز دەستی بۆ نەبردوون. کاتێك باسی ئەو فەرشانەی

---

[1] الطبري (٢٣/٦١)، القرطبي (١٧/١٧٩).

[2] الطبري (٢٣/٦٢).

[3] الحاقة (٢٣).

[4] الانسان (١٤).

کرد کە چەند بە نرخن پاشان دەفەرموێت: ﴿فِيهِنَّ﴾ لەسەر ئەو فەرشانە. ﴿قَٰصِرَٰتُ ٱلطَّرْفِ﴾ واتە: کیژانێك هێندە داوێن پاکن هیچ شتێك لە بەهەشتدا نابینن لە مێردەکانیان چاکترو جوانتر بێت، ئەمە قسەی ئیبنوعەباس‌و قەتادەو عەتای خۆراسانی‌و ئیبنو زەیدە.[1] لە فەرموودەیەکدا هاتووە کە کیژێك لەو کیژانە دەڵێت بە مێردەکەی: سوێند بە خوا لەناو بەهەشتدا شتێکی تر نابینم لە تۆ جوانتر بێت‌و لە تۆ خۆشەویستتر بێت لە بەهەشتدا لە لای من. سوپاس بۆ ئەو خودایەی کە تۆی بۆ من داناوەو منیشی بۆ تۆ داناوە. ﴿لَمْ يَطْمِثْهُنَّ إِنسٌ قَبْلَهُمْ وَلَا جَآنٌّ﴾ واتە: ئەوان کچن‌و شوخۆشەویستن‌و هاوتەمەنن، داوێن پاکن کەس نزیکیان نەبووەتەوە پێش مێردەکانیان لە مرۆڤو جنۆکە. وە ئەمەیش بەڵگەیەکی ترە لەسەر ئەوەی کە جنۆکە دەچنە بەهەشت، ئەرتاتی کوڕی (منذر) دەڵێت: پرسیار لە زەمرەی کوڕی حەبیب کرا ئایا جنۆکە دەچنە بەهەشت؟ وتی: بەڵێ ژنیش دێنن. پیاوی جنۆکە بۆ ژنی جنۆکەو بەنیادەمی پیاو بۆ بەنیادەمی ژن.[2] لەبەر ئەوەیە کە فەرموویەتی: ﴿لَمْ يَطْمِثْهُنَّ إِنسٌ قَبْلَهُمْ وَلَا جَآنٌّ﴾. وە دەفەرمووێت: ﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾ دەیسا ئێوە لە کام چاکەی پەروەردگارتان حاشا دەکەن؟ پاشان وەسفیان دەکات‌و دەفەرمووێت: ﴿كَأَنَّهُنَّ ٱلْيَاقُوتُ وَٱلْمَرْجَانُ﴾ هێندە جوانن دەڵێی یاقوت‌و مەرجانن. پاکە وەك یاقوت‌و سپیشە وەك مەرجان کە بە مرواری ناویان بردووە، ئەمە قسەی موجاهدو حەسەن‌و ئیبنوزەیدو سودی‌و کەسانی تریشە.[3] موسلیم ڕیوایەتی کردووە لە موحەممەدی کوڕی سیرینەوە، دەڵێت: یان باسی خۆ دەکەن یان باسی یادەوەریەکانیان دەکەن. وتی: پیاو زۆرترن یان ژن؟ ئەبو هورەیرە وتی: ئەی ئەبول قاسم نەیفەرمووە: (یەکەم دەستە کە دەچنە بەهەشت لە شێوەی مانگن لە شەوی چواردەدا بەدوای ئەواندا لە شێوەی ئەستێرەی ڕووناکن لە ئاسماندا هەر یەکێك دوو ژنی هەیە کە مۆخی هەردوو ڕانی لەناو گۆشتەکەیدا دەبینرێت ئەوەی لە بەهەشتدایە کوڕی ژنی نەهێناوە[4]. ئەم فەرموودەیە لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە.[5] ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئەنەسەوە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (بەیانی‌و ئێوارەیەك دەرچوون لە ڕێی خودا چاکترە لە دنیاو ئەوەیشی کە تیایەتی بە ئەندازەی دوو سەری کەوان یان شوێنی شوڵەکەی لە بەهەشتدا چاکترە لە دنیاو ئەوەی کە تیایەتی. گەر ژنێك لە ژنەکانی ئەهلی بەهەشت

---

[1] الطبري (٢٣/٦٣/٢١/٤١).

[2] الطبري (٢٣/٦٥).

[3] الطبري (٢٣/٦٦و٦٧).

[4] مسلم (٤/٢١٧٨).

[5] فتح الباري (٦/٣٦٧ و٤١٧)، مسلم (٤/٢١٧٩ و٢١٨٠).

لەسەر زەمین دەربکەوێت نێوانیان پڕ دەکاتلە بۆنی خۆش‌و نیوەی ئەوەیشی کە بە سەریەوەیە چاکترە لە دنیاو ئەوەی کە تیایەتی).[1] بوخاریش هەر بەو شێوەیە ڕیوایەتی کردووە.[2] ﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾ دەیسا ئێوە لە کام چاکەی پەروەردگارتان حاشا دەکەن؟ خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿هَلْ جَزَآءُ ٱلْإِحْسَٰنِ إِلَّا ٱلْإِحْسَٰنُ﴾ ئاخۆ پاداشتی کاری چاك، غەیری چاکە دانەوەیە؟ واتە: هەر کەسێك ئاکار چاکە لە دنیادا مەگەر چاکە نیە لە ڕۆژی دوایدا لەگەڵی. وەك خوای مەزن فەرموویەتی: ﴿لِّلَّذِينَ أَحْسَنُوا۟ ٱلْحُسْنَىٰ وَزِيَادَةٌ﴾[3] واتە: بۆ ئەوانەی چاکەیان کردووە دوو پاداشتی چاکتر (بەهەشت) و زیاتریان هەیە (کە بینینی خودایە). کاتێك خوای گەورە باسی ئەو چاکە مەزنانەی دەکات لەگەڵ بەندەکانی خۆی کردوویەتی کە هیچ ئاکارێکی چاك هەرگیز نایگاتێ بەڵکو تەنها ڕێزو منەتی خۆیەتی بەسەریانەوەو دوای ئەمانە هەمووی فەرموویەتی: ﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾ دەیسا ئێوە لە کام چاکەی پەروەردگارتان حاشا دەکەن؟

﴿وَمِن دُونِهِمَا جَنَّتَانِ ﴿٦٢﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٦٣﴾ مُدْهَآمَّتَانِ ﴿٦٤﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٦٥﴾ فِيهِمَا عَيْنَانِ نَضَّاخَتَانِ ﴿٦٦﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٦٧﴾ فِيهِمَا فَٰكِهَةٌ وَنَخْلٌ وَرُمَّانٌ ﴿٦٨﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٦٩﴾ فِيهِنَّ خَيْرَٰتٌ حِسَانٌ ﴿٧٠﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٧١﴾ حُورٌ مَّقْصُورَٰتٌ فِى ٱلْخِيَامِ ﴿٧٢﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٧٣﴾ لَمْ يَطْمِثْهُنَّ إِنسٌ قَبْلَهُمْ وَلَا جَآنٌّ ﴿٧٤﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٧٥﴾ مُتَّكِـِٔينَ عَلَىٰ رَفْرَفٍ خُضْرٍ وَعَبْقَرِىٍّ حِسَانٍ ﴿٧٦﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٧٧﴾ تَبَٰرَكَ ٱسْمُ رَبِّكَ ذِى ٱلْجَلَٰلِ وَٱلْإِكْرَامِ ﴿٧٨﴾﴾

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَمِن دُونِهِمَا جَنَّتَانِ﴾ غەیری ئەمان دوو بەهەشتی تریش هەیە. ئەم دوو بەهەشتەی تر جگە لەو دوو بەهەشتەی پێشەوەن لە پلەو ڕێزو شوێندا بە دەقی قورئان. وە دەفەرمووێت: ﴿وَمِن دُونِهِمَا جَنَّتَانِ﴾ لەو فەرموودەی پێغەمبەرەوە (ﷺ) لە پێشەوە کە فەرموودەی بەهەشت لە زێڕو ئەوەش کە تیایەتی هەر ئاڵتونە بۆ نزیکەکان و ئەو دوانەکەی تریش بۆ خاوەنی دەستی ڕاست[4]. بەڵگەیە لەسەر ڕێزی پێشینەکان لەسەر ئەوانەی دوای ئەوان لە چەند ڕوویەکەوەیە، یەکەم: چونکە وەسفی یەکەمەکان لە پێش دوایەکانەوە هاتووە. دووهەم: پێش خستنیش بەڵگەیە

---

[1] احمد (١٤١/٣)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[2] فتح الباري (١٩/٦).

[3] يونس (٢٦).

[4] فتح الباري (٤٩١/٨).

لەسەر گرنگی پێدان پێیان. پاشان فەرموویەتی: ﴿وَمِن دُونِهِمَا جَنَّتَانِ﴾ ئەمەیش دیارو ئاشکرایە لە ڕێزی پێشکەوتنو بەرزیان لە دواییەکان. ﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾ دەیسا ئێوە لە کام چاکەی پەروەردگارتان حاشا دەکەن؟ لە پێشەوە فەرمووی: ﴿ذَوَاتَآ أَفْنَانٍ﴾ دوو خاوەن درەختی بە پەلكو پۆپن. لێرەشدا دەفەرمووێت: ﴿مُدْهَآمَّتَانِ﴾ کەسکی تۆخن (یەکجار سەوز) بە ڕواڵەت ڕەش دەنوێنن. واتە: ڕەش دەنوێنن لە تێرئاوداو ئەوەندە ئاو دراون ئیبنوعەباس دەڵێت: ﴿مُدْهَآمَّتَانِ﴾ ئەوەندە ئاو دراون کە سەوز یان ڕەش دەنوێنن.[1] موحەممەدی کوڕی کەعب دەڵێت: ﴿مُدْهَآمَّتَانِ﴾ زۆر تۆخو ڕەشن. گومانی تێدا نیە کە درەخت گەڵاکانی چوو بە ناو یەکدا زۆر جوانو سەرنج ڕاکێشە. ﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾ دەیسا ئێوە لە کام چاکەی پەروەردگارتان حاشا دەکەن؟ لە پێشەوە فەرموویەتی: ﴿فِيهِمَا عَيْنَانِ تَجْرِيَانِ﴾[2] واتە: وە لە هەردووودا دوو سەرچاوەی ڕەوان هەیە. لێرەشدا دەفەرمووێت: ﴿فِيهِمَا عَيْنَانِ نَضَّاخَتَانِ﴾ جووتێك کانی لە ناواندا هەن. عەلی کوڕی ئەبو تەلحە دەڵێت لە ئیبنوعەباسەوە: واتە: هەڵدەقوڵێن، بە گوڕ ڕۆیشتن لە تیژی فیچقەکردنیەوەیە.[3] زەحاك دەڵێت: ﴿نَضَّاخَتَانِ﴾ واتە: پڕ لە ئاونو لێیان نابڕێت.[4] ﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾ دەیسا ئێوە لە کام چاکەی پەروەردگارتان حاشا دەکەن؟. لە پێشەوە فەرموویەتی: ﴿فِيهِمَا مِن كُلِّ فَاكِهَةٍ زَوْجَانِ﴾[5] واتە: هەموو میوەیەکیان تێدایە، کە هەموو جووتی یەکترن. لێرەدا دەفەرمووێت: ﴿فِيهِمَا فَاكِهَةٌ وَنَخْلٌ وَرُمَّانٌ﴾ لە ناویاندا میوەجاتو دارەخورماو هەنار هەیە. گومانی تێدا نیە کە ئایەتی پێشەوە گشتگیرترو زۆرترە لە بەتاك ناوهێنانیو باسی جۆری میوەکان. وە ئەمە نەکیرەیەو لە شێوەی ئیسپاتدا هاتووە گشتگیر نیە. بۆیە ئەم ئایەتە: ﴿فِيهِمَا فَاكِهَةٌ وَنَخْلٌ وَرُمَّانٌ﴾ لە بابی عەتفی خاسە لەسەر عەتفی عام. وەك بوخاریو کەسانی تریش بڕیاریان داوە. بەڵکو بە تەنها ناوهێنانی خورماو هەنار لەبەر ڕێزیانە لەسەر میوەکانی تر. ﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾ دەیسا ئێوە لە کام چاکەی پەروەردگارتان حاشا دەکەن؟

---

[1] الدر المنثور (٧/٧١٦).

[2] الرحمن (٥٠).

[3] الدر المنثور (٧/٧١٦).

[4] الطبري (٢٣/٣٥٧).

[5] الرحمن (٥٢).

پاشان فەرموویەتی: ﴿فِيهِنَّ خَيْرَٰتٌ حِسَانٌ﴾ لەناویاندا گەلێك کیژی ئاکار چاك‌و بە دیمەن جوان. قەتادە دەڵێت: مەبەست بە ﴿خَيْرَٰتٌ﴾ واتە: خاوەن چاکەی زۆر لە بەهەشتدا، کۆمەڵی زانایان وتوویانە: ﴿خَيْرَٰتٌ﴾ جەمعی (خيرة) واتە: ژنی چاك‌و ڕەوشت چاك‌و بە دیمەن جوان. ڕیوایەتیش کراوە لە ئوممو سەلەمەوە بە مەرفوعی.[1] لە فەرموودەیەکی تردا کە لە سورەتی (الواقعة)دا دەیهێنین (إنشاء الله) کەکیژە سپی‌و چاو بەلەکەکان (حور العين) گۆرانی دەڵێن: دەڵێن: ئێمە خورەوشت جوانین وەدی هێنراوین بۆ مێردە بەڕێزەکانمان.[2] ﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾ دەیسا ئێوە لە کام چاکەی پەروەردگارتان حاشا دەکەن؟ پاشان فەرموویەتی: ﴿حُورٌ مَّقْصُورَٰتٌ فِى ٱلْخِيَامِ﴾ بانی: جوانی سپی پێست، چاوڕەش لەناو خێچوەتاندا دەژین. لە پێشەوە فەرموویەتی: ﴿فِيهِنَّ قَٰصِرَٰتُ ٱلطَّرْفِ﴾[3] واتە: لەناو ئەو باغانەدا هەن حۆریانێك کەتەنها چاویان لە مێردی خۆیانە. گومانی تێدا نیە کە ئەوانەی بە ئارەزووی خۆی تەنها چاوی لە مێردەکەیەتی ڕێزدارترن لەوانەی کە لە ناو خێوەتاندا دەژین هەرچەندە هەموویان داپۆشراون، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فِى ٱلْخِيَامِ﴾ بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە عەبدوڵڵای کوڕی قەیسەوەکە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (لەناو بەهەشتدا خیوەتێك هەیە لە مرواری ناوبۆش پانتاییەکەی شەست میلە لە هەموو لایەکیدا کەسوکاری تێدایە، یەکتری نابینن‌و خاوەن باوەڕان بەسەریاندا دەگەڕێن).[4] دووبارە ڕیوایەتی کردووە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: سی میلە[5]. موسلیم ڕیوایەتی کردووە بەم شێوەیە: (خاوەن لە بەهەشتدا خێمەیەکی هەیە لە مرواری ناوەکەی بۆشە درێژیەکەی شەست میلە کەسوکاری خاوەن باوەڕەکەی تێدایە، موسڵمانەکە دەگەڕێت بەسەریاندا کەسیان چاویان بە یەکتری ناکەوێت).[6] ﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾ دەیسا ئێوە لە کام چاکەی پەروەردگارتان حاشا دەکەن؟ خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿لَمْ يَطْمِثْهُنَّ إِنسٌ قَبْلَهُمْ وَلَا جَآنٌّ﴾ کە بەر لەوان هیچ مرۆڤ‌و هیچ جنۆکەیەك هەرگیز دەستی بۆ نەبردوون. لە پێشەوە ئایەتێکمان هەروەك

---

[1] الطبري (٢٣/٧٥).

[2] الطبراني في الاوسط (٧/٢٥٧).

[3] الرحمن (٥٦).

[4] فتح الباري (٨/٤٩١).

[5] فتح الباري (٦/٣٦٦).

[6] مسلم (٤/٢١٨٢).

ئەم ئایەتە مانا کرد بەڵام ئەوەی پێشوو ئەم وەسفە زیادەی هەبوو کە دەفەرمووێت: ﴿كَأَنَّهُنَّ ٱلْيَاقُوتُ وَٱلْمَرْجَانُ﴾. وە دەفەرمووێت: ﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾ دەیسا ئێوە لە کام چاکەی پەروەردگارتان حاشا دەکەن؟. خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿مُتَّكِـِٔينَ عَلَىٰ رَفْرَفٍ خُضْرٍ وَعَبْقَرِيٍّ حِسَانٍ﴾ لەسەر ڕایەخی سەوز جوان پاڵ دەکەون. لە وێنەیان لە دنیادا نەبینراوە. عەلی کورشی ئەبو تەلحە دەڵێت: لە ئیبنو عەباسەوە: فەرشی داپۆشراو بە پەردەی جوان.[1] موجاهدو عیکریمەو حەسەنو قەتادەو زەححاكو کەسانی تریش هەر وایان وتووە. واتە: پەردەی جوان.[2] عەلای کوڕی بەدر دەڵێت: پارچەی جوان لەسەر فەرش لە شێوەی پەردەی شۆڕبووەوە. وە دەفەرمووێت: ﴿وَعَبْقَرِيٍّ حِسَانٍ﴾ ئیبنو عەباسو قەتادەو زەححاكو سودی دەڵێن: (العبقري) واتە: ئەو فەرشەی کە ڕادەخرێتو شانی لەسەر دادەنرێت[3]. وە دەفەرمووێت: ﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾ دەیسا ئێوە لە کام چاکەی پەروەردگارتان حاشا دەکەن؟ پاشان فەرموویەتی: ﴿تَبَٰرَكَ ٱسْمُ رَبِّكَ ذِى ٱلْجَلَٰلِ وَٱلْإِكْرَامِ﴾ موبارەکە ناوی پاکی پەروەردگارت، خاوەن شکۆو شایانی ڕێزلێگرتنە. واتە: ئەو خودایە خاوەن شکۆیەو بێ گوێیی ناکرێت. خاوەنی ڕێزەو بەندایەتی دەکرێتو سوپاسی دەکرێتو چاکەی لەبەر چاوەو یاد دەکرێتو لەبیرناچێت. ئیبنو عەباس دەڵێت: ﴿ذِى ٱلْجَلَٰلِ وَٱلْإِكْرَامِ﴾ خاوەن شکۆو زۆر مەزنە.[4] وە لە فەرموودەیەکی تردا فەرموویەتی: (لە مەزن سەیرکردنی خودا ڕشێزگرتنی مووی سپی موسڵمانو خاوەن دەسەڵاتو هەڵگری قورئان کە زیادەڕەوی تێدا نەکاتو لێشی دوورنەکەوێتەوەو پشتی تێ نەکات).[5] ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ڕەبیعەی کوڕی عامرەوە دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەری خودا بوو (ﷺ) دەیفەرموو: (خۆتان ببەستن بە خاوەن شکۆو شایانی ڕێزەوە).[6] نەسائیش ڕیوایەتی کردووە.[7] جەوهەری (الجوهري) دەڵێت: کاتێك کە دەستی پێوە گرتووە. ئیبنومەسعود دەڵێت: واتە: خۆتانی پێوە ببەستن، وتراوە: (الظاظ) واتە: کۆڵ نەدان. ئیبنو کەسیریش دەڵێت: قسەکان لە یەکەوە

---

[1] الطبري (۲۳/۸۳).

[2] الطبري (۲۳/۸٤).

[3] الطبري (۲۳/۸٥).

[4] الطبري (۲۳/۸٦).

[5] ابو داود (٥/۱۷٤)، فەرموودەیەکی حەسەنە.

[6] احمد (٤/۱۷۷)، فەرموودەیەکی باشە (جيد).

[7] النسائي في الكبرى (٦/٤۷۹)، فەرموودەیەکی باشە (جيد).

نزیکن (والله أعلم) واته: بەردەوام بوونو کۆڵ نەدانو پەیوەست بوونو دەست پێوەگرتن. لە سەحیحی موسلمو چوار سونەنەکەی تردا هاتووە لە عائیشەوە وتوویەتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) کاتێك سەلامی دەدایەوە، دانەدەنیشت دوای نوێژ مەگین بە ئەندازەی ئەوەی کە دەیفەرموو: (اللهم أنت السّلام ومنك السلام تباركت يا ذا الجلال والإكرام)[1].

## تەفسیری سورەتی (الواقعة)

## لە مەککەدا هاتووەتە خوارەوە

### رێزی سورەتی (الواقعة)

ئیبنو ئیسحاق لە عیکریمەوە لە ئیبنو عەباسەوە دەڵێت: ئەبو بەکر وتی: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) سەرت سپی بووە، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (هود و واقعة ومرسلات وعم يتساءلون وإذا الشمس كورت پیریان کردمو سەریان سپی کردم). تیرمیزی ڕیوایەتی کردووەو دەڵێت: چاكو ڕاستە (حسن غريب).[2] وە ئیمامی ئەحمەدیش ڕیوایەتی کردووە لە جابری سەمرەوە دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) نوێژەکانی دەکرد وەك چۆن ئێوە ئەمڕۆ نوێژەکانتان دەکەن. بەڵام زوو لێدەبووەوە نوێژی ئەو کەمتری دەخایاند لە نوێژی ئێوە. لە نوێژی بەیانیدا واقیعەو هاوشێوەی واقیعەی دەخوێند لە سورەتەکاندا[3].

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿إِذَا وَقَعَتِ ٱلۡوَاقِعَةُ ﴿١﴾ لَيۡسَ لِوَقۡعَتِهَا كَاذِبَةٌ ﴿٢﴾ خَافِضَةٞ رَّافِعَةٌ ﴿٣﴾ إِذَا رُجَّتِ ٱلۡأَرۡضُ رَجّٗا ﴿٤﴾ وَبُسَّتِ ٱلۡجِبَالُ بَسّٗا ﴿٥﴾ فَكَانَتۡ هَبَآءٗ مُّنۢبَثّٗا ﴿٦﴾ وَكُنتُمۡ أَزۡوَٰجٗا ثَلَٰثَةٗ ﴿٧﴾ فَأَصۡحَٰبُ ٱلۡمَيۡمَنَةِ مَآ أَصۡحَٰبُ ٱلۡمَيۡمَنَةِ ﴿٨﴾ وَأَصۡحَٰبُ ٱلۡمَشۡـَٔمَةِ مَآ أَصۡحَٰبُ ٱلۡمَشۡـَٔمَةِ ﴿٩﴾ وَٱلسَّٰبِقُونَ ٱلسَّٰبِقُونَ ﴿١٠﴾ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلۡمُقَرَّبُونَ ﴿١١﴾ فِي جَنَّٰتِ ٱلنَّعِيمِ ﴿١٢﴾﴾

### باسی ڕووداوەکانی ڕۆژی قیامەت

خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿إِذَا وَقَعَتِ ٱلۡوَاقِعَةُ﴾ هەرکا ڕووداوەکە ڕوویدا. ﴿ٱلۡوَاقِعَةُ﴾ ناوێکە لە ناوەکانی ڕۆژی قیامەت. ناوبراوە بەو ناوە لەبەر بێگومان بوون لە ڕوودانیو هاتنی ئەو بەسەرهاتە لەو ڕۆژەدا وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَيَوۡمَئِذٖ وَقَعَتِ ٱلۡوَاقِعَةُ﴾[4] واتە: سا ئەو ڕۆژە بەسەرهاتەکە

---

[1] مسلم (٤١٤/١)، أبو داود (١٧٩/٢)، تحفة الأحوذي (١٩٢/٢)، النسائي (٦٩/٣)، ابن ماجه (٢٩٨/١).

[2] تحفة الأحوذي (١٨٤/٩).

[3] احمد (١٠٤/٥).

[4] الحاقة (١٥).

ڕوودەدات. وە دەفـەرموێت: ﴿لَيۡسَ لِوَقۡعَتِهَا كَاذِبَةٌ﴾ کـەس ناتوانێـت لـەو ڕووداوە حاشـا بکـات. کـاتی ڕوودانـی کـە خـودا مـەیلی لێ بـوو ڕووبـدات کـەس ناتوانێـت لای بـداتو کەسـیش ناتوانێـت لەبەریـدا بوەستێت نەهێڵێت ڕوویدات. وەك خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿ٱسۡتَجِيبُواْ لِرَبِّكُم مِّن قَبۡلِ أَن يَأۡتِيَ يَوۡمٞ لَّا مَرَدَّ لَهُۥ مِنَ ٱللَّهِ﴾[1] واتە: بە فەرمانی پەروەردگاری خۆتان بکەن، پێش ئەوەی ڕۆژێك بێت کە لـە لای خوداوە هـیچ گەڕانـەوەی نیـە. وە فەرموویـەتی: ﴿سَأَلَ سَآئِلُۢ بِعَذَابٖ وَاقِعٖ ۝١ لِّلۡكَٰفِرِينَ لَيۡسَ لَهُۥ دَافِعٞ﴾[2] واتە: کەسێك داوای کرد ئازارێك بێت، بۆ خوانەناسەکان هیچ ڕێگرێك بێتەبەر. وە فەرموویـەتی: ﴿وَيَوۡمَ يَقُولُ كُن فَيَكُونُۚ قَوۡلُهُ ٱلۡحَقُّۚ وَلَهُ ٱلۡمُلۡكُ يَوۡمَ يُنفَخُ فِي ٱلصُّورِۚ عَٰلِمُ ٱلۡغَيۡبِ وَٱلشَّهَٰدَةِۚ وَهُوَ ٱلۡحَكِيمُ ٱلۡخَبِيرُ﴾[3] واتە: هەر ڕۆژێك بۆ دروستبوونی هـەر شتێ فـەرمان بـدات: ببـە دەبێـت قسـەی ڕاسـتەو لاری نیـەو ئـەوێ، ڕۆژێـك بـە کەڵەشـاخدا دەکرێـت تـەنها خـۆی دەسـەڵاتدارەو دیـارو نـەدیار دەزانێتو هەر خۆیەتی لە کارزانو ئاگادارە. مانای ﴿كَاذِبَةٌ﴾ وەك موحەممـەدی کـوڕی کـەعب دەڵێـت: دەبێ هەر ڕوو بدات، قەتادە دەڵێت: نەخۆ لادانی تێدایەو نە دوەربازبوونو نە گەڕانەوە.[4] ئیبنو جەریر دەڵێـت: ﴿كَاذِبَةٌ﴾ مەسـدەرە وەك (العاقبـة والعافيـة).[5] خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿خَافِضَةٞ رَّافِعَةٌ﴾ بەرزدەکاتو نزم دەکات. واتە: گرۆیەك نزم دەکاتەوە بۆ هەرە نزمترین پلە بۆ جەهەنەم، بـا لـە دنیـادا زۆر بەڕێزیش بوون. گرۆیەکیش بەرز دەکاتەوە بۆ هەرە بەرزترین پلە بۆ بەهەشتی هەتاهـەتایی بـا لـە دنیاشـدا لاوازو بـێ دەسـەڵات بـوون. حەسـەنو قـەتادەیش هـەر وایـان وتـووە.[6] عـەوفی دەڵێـت: لـە ئیبنوعەباسـەوە: ﴿خَافِضَةٞ رَّافِعَةٌ﴾ وای لێـدەکات کـە دوورو نزیـك گـوێی لێبێـت. عیکریمـە دەڵێـت: (خفضت) وای لێکردووە نزیك گوێی لێبێـتو ببیسـتێت، (ورفعت) وای لێکـردووە دوور گـوێی لێبێـت. زەححاكو قەتادەیش وایان وتووە. خوای مـەزن دەفـەرموێت: ﴿إِذَا رُجَّتِ ٱلۡأَرۡضُ رَجّٗا﴾ کاتێـك زەمـین دەجوڵێت بە توندی. واتـە: کاتێـك زەمـین دەجوڵێـت بـە جـوڵانێکی تونـدو دەلەرێتـەوە تێـك دەچێت

---

[1] الشورى (٤٧).

[2] المعارج (١ـ٢).

[3] الانعام (٧٣).

[4] الطبري (٢٣/٨٩).

[5] الطبري (٢٣/٨٩).

[6] الطبري (٢٣/٩٠).

بەیانیو بە درێژی، بۆیە ئیبنوعەباسو موجاهدو قەتادەو کەسانی تریش وتوویانە. ﴿إِذَا رُجَّتِ ٱلْأَرْضُ رَجًّا﴾ واتە: بە بومەلەرزەکەی هاتە لەرزین.[1] ڕەبیعی کوڕی ئەنەس دەڵێت: کاتێك زەمین گێچی داو سوڕایەوە بەوەیش کە تیایەتی وەك گێچی بێژنگ ئەمە وەك ئەو ئایەتە وایە کە خودا دەفەرمووێت: ﴿إِذَا زُلْزِلَتِ ٱلْأَرْضُ زِلْزَالَهَا﴾[2] واتە: کاتێك زەمین بومەلەرزە توندەکەی هاتە لەرزین. وە فەرموویەتی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمْۚ إِنَّ زَلْزَلَةَ ٱلسَّاعَةِ شَيْءٌ عَظِيمٌ﴾[3] واتە: ئەی خەڵکینە، لەپەروەردگارتان بترسن، بوومەلەرزەی ڕۆژی قیامەت ڕووداوێکی زۆر گرنگە. وە دەفەرمووێت: ﴿وَبُسَّتِ ٱلْجِبَالُ بَسًّا﴾ کەژیش دەهاڕین بە هاڕین. واتە: وردو خاش دەبن ئیبنوعەباسو موجاهدو عیکریمەو قەتادەو کەسانی تریش وتوویانە.[4] ئیبنو زەید دەڵێت: کێوەکان وایان لێ دێت وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿كَثِيبًا مَّهِيلًا﴾[5] واتە: کێوەکان دەبنە گردۆلکەی لمی خزۆك.[6] وە دەفەرمووێت: ﴿فَكَانَتْ هَبَآءً مُّنۢبَثًّا﴾ لە چەشنی تۆز بڵاودەبن. ئەبو ئیسحاق دەڵێت: لە حارس کوڕی عەلیەوە ﴿هَبَآءً مُّنۢبَثًّا﴾ وەك تۆز کە هەڵدەکاتو دێت پاشان دەڕواتو هیچی نامێنێت. عەوفی دەڵێت: لە ئیبنوعەباسەوە لەم ئایەتەدا کە دەفەرمووێت: ﴿فَكَانَتْ هَبَآءً مُّنۢبَثًّا﴾، (الهباء) واتە: ئەوەی کە بەرز دەبێتەوە لە ئاگر کاتێك گڕ دەگرێت بزوزکی لێ بەرزدەبێتەوە دەچێت بە ئاسمانداو کاتێك دەکەوێتە سەر زەمین هیچ شتێك نیەو نامێنێت.[7] عیکریمە دەڵێت: (المنبث) ئەو خاکەیە کە با دەیباتو بڵاوی دەکاتەوە. قەتادە دەڵێت: ﴿هَبَآءً مُّنۢبَثًّا﴾ وەك بەرهەمی درەخت کاتێك کە وشك دەبێتەوەو با دەیبات. ئەم ئایەتەو ئایەتەکانی تر وەك ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر نەمانی ئەم کێوانە لە شوێنی خۆیاندا لە ڕۆژی قیامەتداو دەهەژێنو تێك دەڕوخێنو دەڕۆن وەك خوری شیکراوەیان لێ دێت.

---

[1] الطبري (٢٣/٩١).

[2] الزلزلة (١).

[3] الحج (١).

[4] الطبري (٢٣/٩٢/٩٣).

[5] المزمل (١٤).

[6] الطبري (٢٣/٩٣).

[7] الطبري (٢٣/٩٤).

**مرۆڤ دەبن بە سێ تیرەوە لە ڕۆژی قیامەتدا**

خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿ وَكُنتُمْ أَزْوَٰجًا ثَلَٰثَةً ﴾ ئێوە دەکرێنە سێ تیرە. خەڵکی لە ڕۆژی قیامەتدا دەکرێنە سێ تیرە، بەشێك لای ڕاستی عەرشەوە ئەوانەی لای ڕاستی ئادەمەوە هاتوونەتە دەرەوەو نامەکانیان بە دەستی ڕاست دەدرێتە دەستیان. دەیانبەنە لای ڕاستەوە. سودی دەڵێت: ئەمانە زۆرینەی خەڵکی بەهەشتن. ئەوانەیش لە لای چەپی عەرشەوەن ئەو کەسانەن کە لە لای چەپی ئادەمەوە هاتوونەتە دەرەوە. نامەکانیان بە دەستی چەپ دەدرێتە دەستیان. دەیانبەنە لای چەپەوە ئەمانەیش زۆرینەی خەڵکی ئاگرن (پەنا بە خوا لێیان). ئەوانەیش کە لە پێشەوەن لەبەردەم خوای گەورەدان. ئەو تیرەیەن کە بەڕێزترونزیکترو شایستەترن لە تیرەی لای ڕاست، ئەو کەسانەن کە گەورەی ئەوانن کە بریتین لە پێغەمبەران(سەلامی خوایان لێبێت) پیاوچاکانو شەهیدان. ئەمانە ژمارەیان کەمترە لە تیرەی دەستی ڕاست. بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَأَصْحَٰبُ ٱلْمَيْمَنَةِ مَآ أَصْحَٰبُ ٱلْمَيْمَنَةِ ﴾ تیرەیەکیان دەستی ڕاستیو بەختیارن. ﴿وَأَصْحَٰبُ ٱلْمَشْـَٔمَةِ مَآ أَصْحَٰبُ ٱلْمَشْـَٔمَةِ ﴾ تیرەی تریان دەستی چەپیو نەگبەتبارن. ﴿وَٱلسَّٰبِقُونَ ٱلسَّٰبِقُونَ ﴾ تیرەیەکیش لە پێشەوەن، وە پێش کەوتوون. وە هەر بەم شێوەیە خوای گەورە لە کۆتایی سورەتەکەدا دابەشی کردوون بە سێ تیرەوە لە کاتی گیان دەرچوونیاندا. وە لەم ئایەتەشدا هەر بەم شێوەیە باسیان دەکاتو دەفەرمووێت: ﴿ ثُمَّ أَوْرَثْنَا ٱلْكِتَٰبَ ٱلَّذِينَ ٱصْطَفَيْنَا مِنْ عِبَادِنَا ۖ فَمِنْهُمْ ظَالِمٌ لِّنَفْسِهِۦ وَمِنْهُم مُّقْتَصِدٌ وَمِنْهُمْ سَابِقٌۢ بِٱلْخَيْرَٰتِ بِإِذْنِ ٱللَّهِ ﴾[1] واتە: لە پاشان ئەم قورئانەمان بەخشی بە کەسانێك کە لەناو بەندەکانماندا هەڵمانبژاردن ئینجا هەندێکیان ستەمکارن لە خودی خۆیانو هەندێکیان مامناوەندینو هەندێکی تریان بە فەرمانی خودا پێشکەوتوون بەهۆی چاکەکانیانەوە. موحەممەدی کوڕی کەعبو ئەبو حەزرەو یەعقوبی کوڕی موجاهد وتوویانە: ﴿وَٱلسَّٰبِقُونَ ٱلسَّٰبِقُونَ ﴾ واتە: پێغەمبەران (سەلامی خوایان لێبێت).[2] سودی دەڵێت: ئەوانە ئەهلی علیینن. مەبەستیش لە پێشکەوتووان ئەوانەن کە پەلە دەکەن لە کاری چاکدا بەو شێوەیەی کە فەرمانیان پێکراوە وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَسَارِعُوٓا۟ إِلَىٰ مَغْفِرَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ وَجَنَّةٍ عَرْضُهَا ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلْأَرْضُ ﴾[3] واتە: پێشبڕکێ بکەن بۆ لێبوردنێکی گەورە لە لایەن

---

[1] فاطر (٣٢).

[2] القرطبي (١٧/١٩٩).

[3] ال عمران (١٣٣).

پەروەردگارتانەوەو بۆ بەهەشتێك كە پانیەكەی بە ئەندازەی ئاسمانەكانو زەویە. وە دەفەرمووێت: ﴿سَابِقُوٓاْ إِلَىٰ مَغۡفِرَةٖ مِّن رَّبِّكُمۡ وَجَنَّةٍ عَرۡضُهَا كَعَرۡضِ ٱلسَّمَآءِ وَٱلۡأَرۡضِ﴾[1] واتە: پێشبڕكێ بكەن بۆ دەستخستنی لێخۆشبوون لە لایەن پەروەردگارتانەوە بۆ بەهەشتێك كە پانتاییەكەی بە وێنەی پانتایی ئاسمانو زەویە. وە دەڵێت: هەر كەسێك پێشكەوت لەم دنیاداو پەلەی كرد لە كاری خێردا ئەوە ئەو كەسە لە ڕۆژی دوایشدا هەر لە پێشكەوتووانە بۆ ڕێزلێنان. چونكە پاداشتی لە جۆری ئیشەكەیەتی. وەك وتراوە: چی بكێڵی ئەوە دەدوریتەوە، بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ ٱلۡمُقَرَّبُونَ﴾ كە ئەوانە لە ئێمەوە نزیك كەوتوون. ﴿فِي جَنَّٰتِ ٱلنَّعِيمِ﴾ لە باغاتی پڕ لە خۆشیدا دەژین.

﴿ثُلَّةٞ مِّنَ ٱلۡأَوَّلِينَ ﴿١٣﴾ وَقَلِيلٞ مِّنَ ٱلۡأٓخِرِينَ ﴿١٤﴾ عَلَىٰ سُرُرٖ مَّوۡضُونَةٖ ﴿١٥﴾ مُّتَّكِـِٔينَ عَلَيۡهَا مُتَقَٰبِلِينَ ﴿١٦﴾ يَطُوفُ عَلَيۡهِمۡ وِلۡدَٰنٞ مُّخَلَّدُونَ ﴿١٧﴾ بِأَكۡوَابٖ وَأَبَارِيقَ وَكَأۡسٖ مِّن مَّعِينٖ ﴿١٨﴾ لَّا يُصَدَّعُونَ عَنۡهَا وَلَا يُنزِفُونَ ﴿١٩﴾ وَفَٰكِهَةٖ مِّمَّا يَتَخَيَّرُونَ ﴿٢٠﴾ وَلَحۡمِ طَيۡرٖ مِّمَّا يَشۡتَهُونَ ﴿٢١﴾ وَحُورٌ عِينٞ ﴿٢٢﴾ كَأَمۡثَٰلِ ٱللُّؤۡلُوِٕ ٱلۡمَكۡنُونِ ﴿٢٣﴾ جَزَآءَۢ بِمَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴿٢٤﴾ لَا يَسۡمَعُونَ فِيهَا لَغۡوٗا وَلَا تَأۡثِيمًا ﴿٢٥﴾ إِلَّا قِيلٗا سَلَٰمٗا سَلَٰمٗا ﴿٢٦﴾﴾

## پێشكەوتووان (السابقون)و پاداشتیان

خوای گەورە باسی ئەو كەسانە دەكات كە لە پێشەوەن و نزیكن لە خۆیەوە دەفەرمووێت: ﴿ثُلَّةٞ مِّنَ ٱلۡأَوَّلِينَ﴾ بەشێك لەوانی پێشینە. ﴿وَقَلِيلٞ مِّنَ ٱلۡأٓخِرِينَ﴾ كەمێكیش لەوانی پاشین. واتە: كۆمەڵێك لە پێشینەكانو كەمێكیش لەوانەی كە لە دوای ئەوانەوە دێن. وتراوە: مەبەست بە پێشینەكان گەلە ڕابوردووەكانو بە دواینەكانیش ئەم ئوممەتەیە. ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی كردووە لە موجاهدو حەسەنی بەسریەوە. ئیبنو جەریریش هەمان ڕای هەڵبژاردووە.[2] پاشان ئەم فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ) دەبینی كە دەیفەرموو: (ئێمە پاشینانی لە پێشەوەین لە ڕۆژی قیامەتدا).[3] جگە لەم كەسی تر نەیگێڕاوەتەوە لە كەسیشەوە ڕیوایەتی نەكردووە. وە ئەوەی كە دڵ پێی خۆش دەبێت بۆ ئەم فەرموودەیە ئەم فەرموودەیە كە ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی كردووە لە ئەبو هورەیرەوە دەڵێت: كاتێك ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە: ﴿ثُلَّةٞ مِّنَ ٱلۡأَوَّلِينَ ﴿١٣﴾ وَقَلِيلٞ مِّنَ ٱلۡأٓخِرِينَ﴾ هاوەڵەكانی پێغەمبەر(ﷺ) زۆر بە لایانەوە گران بوو. پاشان ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە: ﴿ثُلَّةٞ مِّنَ ٱلۡأَوَّلِينَ ﴿٣٩﴾ وَثُلَّةٞ مِّنَ

---

[1] الحديد (٢١).

[2] الطبري (٢٣/٩٨).

[3] فتح الباري (١١/٥٢٦).

ٱلۡأٓخِرِينَ ﴾[1] واتە: کۆمەڵێکی زۆرن لە پێشینان، کۆمەڵێکی زۆرن لە پاشینان (ئوممەتی موحەممەد (ﷺ)). پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (من ڕجام وایە کە ئێوە چواریەکی خەڵکی بەهەشت بن وە سێیەکی خەڵکی بەهەشت بن. بەڵکو نیوەی خەڵکی بەهەشت بن یان بەشێکی خەڵکی بەهەشت بن. وە بەشی دووهەمیش لەگەڵیان بەش بکەن). ئیمامی ئەحمەدیش ڕیوایەتی کردووە.[2] ئەم ڕایەی کە ئیبنو جەریر هەڵیبژاردووە لێرەدا ڕایەکی لاوازە قسەی لەسەرە. چونکە ئەم ئوممەتە چاکترین ئوممەتە بە دەقی قورئان زۆر دوورە کە نزیکەکان(المقربين) لە گەلە پێشووەکاندا لە ئەم زیاتر بن. وایش دەردەکەوێت کە نزیکەکان لەم ئوممەتەدا لە گەلەکانی تر زیاتر بێت والله أعلم. ڕای دووهەم بەهێزترەو تەواوترە لەم شوێنەداو مەبەستیش لەم ئایەتە کە دەفەرموێت: ﴿ ثُلَّةٌ مِّنَ ٱلۡأَوَّلِينَ ﴾ واتە: لە ئەوەڵی ئەم ئوممەتەو ﴿وَقَلِيلٌ مِّنَ ٱلۡأٓخِرِينَ ﴾ واتە:هەر لەم ئوممەتە. ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە لە سریی (السري) کوڕی یەحیاوە دەڵێت: حەسەن ئەم ئایەتانەی خوێندەوە: ﴿وَٱلسَّٰبِقُونَ ٱلسَّٰبِقُونَ ﴿١٠﴾ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلۡمُقَرَّبُونَ ﴿١١﴾ فِي جَنَّٰتِ ٱلنَّعِيمِ ﴿١٢﴾ ثُلَّةٌ مِّنَ ٱلۡأَوَّلِينَ ﴿١٣﴾ وَقَلِيلٌ مِّنَ ٱلۡأٓخِرِينَ﴾ دەڵێت: تیرەیەك لەو گەلانەی کە ڕابوردن و ڕۆیشتن. وە ڕیوایەت کراوە لە موحەممەدی کوڕی سیرینەوە کە لەم ئایەتەدا: ﴿ ثُلَّةٌ مِّنَ ٱلۡأَوَّلِينَ ﴿١٣﴾ وَقَلِيلٌ مِّنَ ٱلۡأٓخِرِينَ﴾ دەڵێت: لە پێشمانەوە وتوویانەو ڕجایان وابووە کە هەموویان لەم ئوممەتە بێت. وە حەسەن و ئیبنو سیرینیش هەر ڕایان وایە کە هەمووی لەم ئوممەتەیە. گومانی تێدا نیە کە ئەوەڵی هەموو ئوممەتێك لە کۆتاییەکەی چاکترە. وە هەڵیشدەگرێت کە هەموو ئوممەتەکان بگرێتەوە، هەر ئوممەتەی بە پێی بوونی خۆی. بۆیە لە کتێبە سەحیحەکان و کتێبەکانی تریش لە چەند ڕێگاوە هاتووە. کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (چاکترین چەرخ چەرخی منە پاشان ئەوانەی لە دوای ئەمان دێن و پاشان ئەوانش دوای ئەوانە دێن).[3] تا کۆتایی فەرموودەکە. دیسان فەرموویەتی: (بەردەوام تیرەیەك لە ئوممەتی من لەسەر هەق دەمێننەوە، ئەوانەی کە لێیان دەتەکنەوەو دەوریان چۆڵ دەکەن و ئەوانەیش کە لەگەڵیان نین و لێیان جیادەبنەوە هیچ زیانێکیان لێ نادەن هەتا ڕۆژی قیامەت)، وە لە فەرموودەیەکی تردا هاتووە: (هەتا فەرمانی خودای گەورە دێت ئەوانە بەو شێوەیە دەمێننەوە).[4] مەبەست لێرەدا ئەوەیە کە ئەم ئوممەتە لە هەموو ئوممەتەکانی تر بەڕێزترە. وە

---

[1] الواقعة (٣٩-٤٠).

[2] احمد (٢/٣٩١)، ئەم فەرموودەیە سەنەدەکانی لاوازە.

[3] البخاري (٣٦٥١).

[4] البخاري (٧١، ٣١١٦، ٣٦٤٠، ٣٦٤١، ٧٣١١، ٧٣١٢، ٧٤٥٩، ٧٤٦٠ وغير ذلك).

نزیکەکانیش لە خوداوە زۆرترو پلەیان بەرزترە لە ئومەتەکانی تر لەبەر ڕێزی ئاینەکەی و گەورەیی پێغەمبەرەکەی (ﷺ) بۆیە لە فەرموودەی متەواتردا هاتووە لە پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) هەواڵی داوە کە لەم ئومەتەدا حەفتا هەزار دەچنە بەهەشت بەبێ لێپرسینەوە. وە لە فەرموودەیەکی تردا فەرموویەتی: (لەگەڵ هەموو هەزار کەسێکدا حەفتا هەزار)، وە لە فەرموودەیەکی تریشدا فەرموویەتی: (لەگەڵ هەموو کەسێکدا حەفتا هەزار). خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿عَلَىٰ سُرُرٍ مَّوْضُونَةٍ﴾ لەسەر تەختی جەواهیرەیەند. ئیبنو عەباس دەڵێت: ڕازاوە بە ئاڵتون واتە: چنراو بە ئاڵتون[1]. موجاهدو عیکریمەو سەعیدی کوڕی جوبەیرو زەیدی کوڕی ئەسلەم و قەتادەو زەححاکو کەسانی تریش هەر وایان وتووە.[2]

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿مُّتَّكِـِٔينَ عَلَيْهَا مُتَقَـٰبِلِينَ﴾ بەرامبەر بە یەك پاڵ دەکەون. واتە: ڕوویان لە یەکترەو کەس لە دوای کەسەوە نییە. ﴿يَطُوفُ عَلَيْهِمْ وِلْدَٰنٌ مُّخَلَّدُونَ﴾ تازە لاوی هەمیشە لاو، لە دەوریان دێنو دەچن. واتە: لەسەر یەك شێوە دەمێننەوە گەورە نابنو پیر نابنو ناشگۆڕێن. ﴿بِأَكْوَابٍ وَأَبَارِيقَ وَكَأْسٍ مِّن مَّعِينٍ﴾ بە پەرداخو سوراحیو پیاڵە بادەی ڕەوان لە سەرچاوەیان دەدەنێ. مەبەست بە (أکواب) ئەو سوراحیانەیە کە لوتو گوێدار نین، (أباریق)یش ئەوەیە کە هەردوو وەسفەکەی تێدایە واتە: لوتو گوێچکەی هەیە. (الکؤو)یش واتە: پیاڵەکانی هەمووی لە بادەیە لە سەرچاوەی ڕەوان. کە نابڕێتو تەواو نابێت بەڵکو بە بەردەوامی دەڕواتو ناوەستێت. خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿لَّا يُصَدَّعُونَ عَنْهَا وَلَا يُنزِفُونَ﴾ نە سەریان پێی دێشێت نە سەرخۆشیش دەبن پێی. واتە: سەریان نایەشێتو عەقڵیش لە دەست نادەن. بەڵ:, ناگۆڕێت لەگەڵ ئەو هێزە زۆرو تامو چێژەی کە هەیەتی. زەححاك ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەباسەوە کە وتوویەتی: بادە چوار سیفەتی هەیە: سەرخۆشیو سەرئێشەو ڕشانەوەو میزکردن. خوای گەورە باسی بادەی بەهەشت دەکات کە ئەم سیفەتانەی تیا نیەو دوورە لێیانەوە.[3] موجاهدو عیکریمەو سەعیدی کوڕی جوبەیرو عەتیەو قەتادەو سودی دەڵێن: ﴿لَّا يُصَدَّعُونَ عَنْهَا﴾ واتە: سەریان پێی ژان ناکاتو نایەشێت.[4] وە وتوویانە: ﴿وَلَا يُنزِفُونَ﴾ واتە: لەسەر خۆیان ناچنو ئاوەز لە دەست نادەن.[5] خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَفَـٰكِهَةٍ

---

[1] الطبري (۲۳/۹۹).

[2] الطبري (۲۳/۹۹/۱۰۰).

[3] القرطبي (۱۷/۲۰٤).

[4] الطبري (۲۳/۱۰۳/۱۰٤).

[5] الطبري (۲۳/۱۰٤/۱۰٥).

﴿مِّمَّا يَتَخَيَّرُونَ﴾ میوەجاتیش هەر کامێك هەڵی دەبژێرن. واتە: میوە دەگێڕن بەسەریاندا لە هەر کامێك هەڵدەبژێرن ئارەزووی خۆیانە. ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر دروستی هەڵبژاردنی میوە لە هەر لایەکەوە ئارەزوو بکرێت. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە سابتەوە دەڵێت: ئەنەس وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) خەو بینینی پێ خۆش بوو، هەر کەسێك خەونی ببینیایە هەواڵی دەپرسی گەر (وختی) نەیناسیایەو ئەگەر باسی چاکەیشی بکردایە لە خەونەکەی زیاتر پێی خۆش بوو. ژنێك هات بۆ لای وتی: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) خەونم بینی وەك ئەوەی کە من هێنرامو دەرکرام لە مەدینەو خستمیانە (خرامە) بەهەشت گوێم لە کۆمەڵێك بوو کە بەهەشت دەلەرزی بۆیان کاتێك سەیرم کرد فڵانو فڵانەو، فڵانی کوڕی فڵانە، ناوی دوانزە کەسی هێنا. پێغەمبەر(ﷺ) تیپێکی ناربوو پێش ئەمە، ژنەکە وتی: هێنانیان جلوبەرگی تولسیان لەبەردابوو، دەمارەکانیان بڕابوو خوێنی لێ دەڕژیشت. وترا: بیانبەن بۆ ڕووباری بەیدەخ یان بەیزاخ خرانە ناویەوەو هاتنە دەرەوە، دەمو چاویان وەك شەوی چواردە وابوو تەشتێکی لە زێڕیان هێنا کە بوسری تێدابوو، لەو بوسرەیان خوارد (خورمای تازە کە ڕەنگی گرتووەو تەواو پێ نەگەیشتووە) چەندەیان توانی بە ئارەزووی خۆیان بە هەر لایەکدا هەڵیاندەگێڕایەوە مەگین لەو میوەیان دەخوارد کە دەیانویست. منیش خواردم لەگەڵیان هەوالگری ئەو تیپە لەو کاتەدا هاتو وتی: ئێمە ئاواو ئاوامان بەسەرهات. فڵانو فڵان پێکرانو لێیان درا هەتا دوانزە کەسی ژمارد. پێغەمبەری خودا(ﷺ) ژنەکەی بانگ کرد فەرمووی: خەونەکەتم بۆ بگێڕەرەوە، بۆی گێڕایەوە. ژنەکە دەیوت: فڵانو فڵانە کەسیان هێنا. وەك ئەو وتی ئەمە قسەی ئەبو یەعلایە[1]. (حافظ الضیاء) دەڵێت: ئەمە لەسەر مەرجی موسلیمە. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَحْمِ طَيْرٍ مِّمَّا يَشْتَهُونَ﴾ گۆشتی مەلیش لەوانەی ئارەزووی دەکەن. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئەنەسەوە دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (مەلی بەهەشت وەك وشتری بەرزی مێینە وایە لە درەختی بەهەشت دەلەوەڕێتو دەخوات). ئەبو بەکر وتی: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە مەلە ناسکەکانن. پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (ئەوەی دەیخوات لەو ناسکترە)، سێ جار ئەمەی فەرموو، وە من داوام وایە تۆ لەو کەسانە بیت کە لێی دەخوات.[2] ئیمامی ئەحمەد بە تەنها ئەم فەرموودەی هێناوە بەم شێوەیە. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَحُورٌ عِينٌ﴾ کیژی سپی چاو بەلەکیش. ﴿كَأَمْثَالِ اللُّؤْلُؤِ الْمَكْنُونِ﴾ هەموو دەڵێی مروارین لەناو سەدەفدا. واتە: وەك مرواری لوس وان ئەوەندە سپین وەك لە سورەتی

[1] احمد (٣/١٣٥) ومسند ابي يعلى (٦/٤٤)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[2] احمد (٣/٢٢١)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

(الصافات)دا لە پێشەوە باس کراوەو خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿كَأَنَّهُنَّ بَيْضٌ مَّكْنُونٌ﴾[1]، واتە: وەك هێلکەی ناو هێلانەن (یان دەڵێی مرواری ناو سەدەفن). وە دیسان لە سورەتی (الرحمن)یشدا هەر باسکراوە. بۆیە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿جَزَآءَۢ بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ﴾ پاداشتی کردەوەیانە. واتە: ئەمەی کە پێمان داون پاداشتی ئەو کردارە چاکانەیە کە کردوویانە. پاشان خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿لَا يَسْمَعُونَ فِيهَا لَغْوًا وَلَا تَأْثِيمًا﴾ کە لەوێدان نە قسەی هەرزە دەبیستن، نە وتارێکی ناڕەوا. ﴿إِلَّا قِيلًا سَلَٰمًا سَلَٰمًا﴾ مەگەر درووود لە یەکتری بکەنو وەڵامی پێ بدەنەوە. واتە: لە بەهەشتدا قسەی بێ ماناو هەرزە نابیستن. قسەیەك کە بۆنی سوکایەتی لێبێتو خراپ بێت وەك فەرموویەتی: ﴿لَّا تَسْمَعُ فِيهَا لَٰغِيَةً﴾[2] واتە: قسەی هیچو پوچی تێدا نابیستن. واتە قسەی هەرزەو بێ سود. ﴿وَلَا تَأْثِيمًا﴾ واتە: نە قسەی ناشیرین. ﴿إِلَّا قِيلًا سَلَٰمًا سَلَٰمًا﴾ واتە: بێجگە لە سەلام کردن لە یەکتریو وەڵامدانەوەی. وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَتَحِيَّتُهُمْ فِيهَا سَلَٰمٌ﴾[3] واتە: سڵاوکردن لێیان لەو (بەهەشتە)دا بە وشەی سەلامە. هەروەها گفتوگۆشیان قسەی هەرزەو ناشیرینی تێدا نیە.

﴿وَأَصْحَٰبُ ٱلْيَمِينِ مَآ أَصْحَٰبُ ٱلْيَمِينِ ﴿٢٧﴾ فِى سِدْرٍ مَّخْضُودٍ ﴿٢٨﴾ وَطَلْحٍ مَّنضُودٍ ﴿٢٩﴾ وَظِلٍّ مَّمْدُودٍ ﴿٣٠﴾ وَمَآءٍ مَّسْكُوبٍ ﴿٣١﴾ وَفَٰكِهَةٍ كَثِيرَةٍ ﴿٣٢﴾ لَّا مَقْطُوعَةٍ وَلَا مَمْنُوعَةٍ ﴿٣٣﴾ وَفُرُشٍ مَّرْفُوعَةٍ ﴿٣٤﴾ إِنَّآ أَنشَأْنَٰهُنَّ إِنشَآءً ﴿٣٥﴾ فَجَعَلْنَٰهُنَّ أَبْكَارًا ﴿٣٦﴾ عُرُبًا أَتْرَابًا ﴿٣٧﴾ لِّأَصْحَٰبِ ٱلْيَمِينِ ﴿٣٨﴾ ثُلَّةٌ مِّنَ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿٣٩﴾ وَثُلَّةٌ مِّنَ ٱلْآخِرِينَ ﴿٤٠﴾﴾

### تیرەی دەستەڕاستو پاداشتیان

کاتێك خوای گەورە باسی پاشەڕۆژی ئەو تیرەیەی کرد کە لە پێشەوەنو لە خۆیەوە نزیکن پاشان تیرەی دەستەڕاستیش باس دەکاتو لە ڕیزی ئەواندا باسیان دێنێتو بە ئاکارچاك ناویان دەبات. وەك مەیمونی کوڕی مەهران دەڵێت: تیرەی دەستەڕاستپلەیان لە دوای پلەی تیرەی پێشکەوتوانن وە دەڵێت: ﴿وَأَصْحَٰبُ ٱلْيَمِينِ مَآ أَصْحَٰبُ ٱلْيَمِينِ﴾ ئەوەی تیرەی دەستەڕاستن، ئەوان چۆن بەختەوەرێکن؟ واتە: تیرەی دەستەڕاست چینو ژیانیان چۆنەو.پاشەڕۆژیان بەچی دەبێت؟ پاشان مانای کردووە بەم ئایەتەی کە خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿فِى سِدْرٍ مَّخْضُودٍ﴾لای دەرکەناری بێ درکن. ئیبنوعەباسو

---

[1] الصافات (٤٩).

[2] الغاشية (١١).

[3] يونس (١٠).

عیکریمەو موجاهدو ئیبنول ئەحوەس و قەسامەی کوڕی زوهەیرو سەفەری کوڕی نوسەیر و حەسەن و قەتادەو عەبدوڵڵای کوڕی کەسیر و سودی و ئەبو حەزرەو کەسانی تریش وتوویانە: ئەو دارەی کە دڕکی پێوە نیە.[1] ئیبنوعەباس دەڵێت: ﴿فِي سِدۡرٖ مَّخۡضُودٖ﴾ داری پڕ بەرهەم. وە لە عیکریمەو موجاهدیشەوە دیسان ڕیوایەت کراوە قەتادەیش هەر وای وتووە کە ئێمە قسەمان لەو درەختە پڕ بەرهەمە دەکرد کە دڕکی پێوە نیە. وا دەردەکەوێت کە مەبەست لەو درەختەی دنیاو ئەوەی ڕۆژی دوایی. ئەو دارکەنارەی دنیا دڕکی پێوەیەو بەرهەمی زۆر نیە. بەڵام دارکەناری بەهەشت بەرهەمی زۆرەو دڕکی پێوە نیە. درەختەکەی قورس کردووە. خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿وَطَلۡحٖ مَّنضُودٖ﴾ مۆزی پاڵ پێکەوەدراویش. عوتبەی کوڕی عەبدی سەلەمی دەڵێت: من لە خزمەتی پێغەمبەری خودا(ﷺ) دانیشتبووم. عەرەبێکی دەشتەکی هات و وتی: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) گوێم لێتە باسی درەختێك دەکەی لە بەهەشتدا. ئاگام لە هیچ دڕکێکی تر نیە ئەوەندەی ئەوە دڕکی زۆر بێت. واتە: (طلح)، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (خودا لە جێگای هەر دڕکێك بەرێکی داناوە وەك مەمکی کیژە، حەفتا ڕەنگ خواردنی تێدایە، هیچ ڕەنگێکیان لە یەك ناچن و وەك یەك نین).[2] ﴿وَطَلۡحٖ﴾ درەختێکی گەورەیە لەسەر زەمینی حیجازدا دەڕوێت لە درەختە دڕکینیەکانە. موفرەدەکەی درەختێکی زۆر دڕکاویە. موجاهد دەڵێت: ﴿مَّنضُودٖ﴾ واتە: پڕ بەرە ئەوەندە سێبەری زۆر بوو قورەیشیەکان بە نموونە دەیانهێنایەوە زۆر بە لایانەوە عەجایب بوو، سێبەرەکەی لە سێبەری مۆز و دارکەنار دەچوو.[3] ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو سەعیدەوە دەڵێت: ﴿وَطَلۡحٖ مَّنضُودٖ﴾ واتە: مۆز. ڕیوایەتیش کراوە لە ئیبنو عەباس و ئەبو هورەیرەو حەسەن و عیکریمەو قەسامەی کوڕی زوهەیرو قەتادەو ئەبو حەزرە هەر بەو شێوەیە.[4] واتە: مۆز. موجاهدو ئیبنو زەیدیش هەمان ڕایان هەبووەو وتوویانە خەڵکی یەمەن بە مۆز دەڵێن (طلح).[5] ئیبنو جەریر جگە لەم قسەیەی نەگێڕاوەتەوە. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَظِلّٖ مَّمۡدُودٖ﴾ سێبەرێکی بێ بڕانەوەش. بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو هورەیرەوە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (لەناو بەهەشتدا درەختێك هەیە سوار بە ژێر سێبەرەکەیدا

---

[1] الطبري (٢٣/١١٠).

[2] البع لإبن أبي داود (٥٩)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[3] الطبري (٢٣/١١٤).

[4] الطبري (٢٣/١١٢/١١٣).

[5] الطبري (٢٣/١١٣).

سەد ساڵ دەڕوات نایبڕێت). ئەگەر حەز دەکەن ئەم ئایەتە بخوێنن: ﴿وَظِلٍّ مَّمْدُودٍ﴾.[1] موسلیمیش ڕیوایەتی کردووە.[2] ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو هورەیرەوە دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ):(لەناو بەهەشتدا درەختێك هەیە سوار بە ژێر سێبەرەکەیدا سەد ساڵ دەڕوات نایبڕێت. ئەگەر حەز دەکەن ئەم ئایەتە بخوێنن: ﴿وَظِلٍّ مَّمْدُودٍ﴾).[3] هەر بەم شێوەیەش موسلیم ڕیوایەتی کردووە.[4] بوخاری دیسان بەم شێوەیە ڕیوایەتی کردووە.[5] (عبدالرزاق)یش ڕیوایەتی کردووە بە هەمان شێوە.[6] خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَمَآءٍ مَّسْكُوبٍ﴾ ئاویش هەروە هەر ڕەوانە. ﴿وَفَٰكِهَةٍ كَثِيرَةٍ﴾ میوەش زۆرو زەبەندەیە. ﴿لَّا مَقْطُوعَةٍ وَلَا مَمْنُوعَةٍ﴾ نە دوایی دێتو نە پاوانە قەدەغەیە. واتە: میوەی زۆریان لایە هەرەجۆرو هەمەڕەنگ نە چاوی بینیویەتیو نە گوێچکەش بیستوویەتی. نە بە خەیاڵیش بە دڵدا هاتووە. وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿كُلَّمَا رُزِقُوا۟ مِنْهَا مِن ثَمَرَةٍ رِّزْقًا ۙ قَالُوا۟ هَٰذَا ٱلَّذِى رُزِقْنَا مِن قَبْلُ ۖ وَأُتُوا۟ بِهِۦ مُتَشَٰبِهًا﴾[7] واتە: هەر کاتێك لەوێ خواردەمەنیەکیان بدرێتێ لە میوەهات دەڵێن: ئەمە ئەوەیە کە لەمەوپێش پێمان درا ئێستا وێنەیان هێناوە. واتە: ئەم نموونەیە لەو نموونەیەی پێشوو دەچێت بەڵام تامیان وەك یەك نیە. وە لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە لە باسی سیدرەتول مونتەها واتە: (گەڵاکانی وەك گوێچکەی فیل وایەو بەرەکەیشی وەك تلالی هەجر وایە).[8] وە دیسان لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە لە ئیبنو عەباسەوە دەڵێت: خۆر گیرا پێغەمبەری خودا(ﷺ) نوێژی کردو مەردمیش لەگەڵیدا نوێژیان کرد. باسی نوێژەکەی کرد کە مەردم وتیان ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) تۆمان بینی دەستت بۆ شتێك برد لەم شوێنەی کە تێیدای. پاشان وەستای. فەرمووی: (من بەهەشتم چاو پێکەوت دەستم بۆ بوشکێ برد تێیدا گەر بمهێنایە لەو بۆشکەتان دەخوارد تا دنیا بەردەوام بووایەو بمایە).[9] ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە عوتبەی کوڕی عبدینی

---

[1] فتح الباري (٨/٤٩٥).

[2] مسلم (٤/٢١٧٥).

[3] احمد (٢/٤٨٢)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[4] مسلم (٤/٢١٧٥).

[5] فتح الباري (٦/٣٦٨).

[6] عبدالرزاق (١١/٤١٧)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[7] البقرة (٢٥).

[8] فتح الباري (٦/٣٤٩)، مسلم (١/١٤٦).

[9] فتح الباري (٢/٦٢٧)، مسلم (٢/٦٢٦).

سەلمیەوە دەڵێت: عەرەبێکی دەشتەکی هات بۆ لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) باسی حەوزی لێ پرسی. پێغەمبەر(ﷺ) باسی بەهەشتی دەکرد. پاشان عەرەبەکە وتی: میوەی تیایە؟ فەرمووی: (بەڵێ درەختێکی تیایە پێی دەڵێن (طوبی)) وتی: باسی شتێکی کرد نەمدەزانی چیە. وتی: کام درەختی سەر زەمینی ئێمە لەو دەچێت؟ فەرمووی: (هیچ شتێك لە درەختی سەر زەمینی تۆ لەو ناچێت)، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ڕۆیشتویتە شام؟ وتی: نەخێر، فەرمووی: (لە درەختێك دەچێت لە شام پێی دەڵێن گوێز لەسەر یەك قەد دەڕوێت لە سەرەوە بڵاودەبێتەوە)، وتی: بۆشێکی بە ئەندازەی چەندێکە؟ بانی چەندێ گەورەیە؟ فەرمووی: (بە ئەندازەی ڕۆیشتنی مانگێکی قەلەڕەشێکی ڕەش‌و سپی کە بەردەوام بفرێت و سارد نەبێتەوە). وتی: بنی دارەکە چەندێك گەورەیە؟ فەرمووی: (ئەگەر بەچکە وشترێك لە وشترەکانی خرتا بڕوا ناتوانێت بە چواردەوریدا بگەڕێت هەتا ئەوەندە پیر دەبێت‌و لە پیریدا ملی دەشکێت‌و ورد دەبێت)، وتی: ترێی تێدایە؟ فەرمووی: بەڵێ، وتی: دەنکی ترێکە چەندێ گەورەیە؟ فەرمووی: (ئایا باوکت سابرێنی گەورەی لەناو ئاژەڵەکەتاندا سەربڕیوە) وتی: بەڵێ، فەرمووی: (کەوڵی کردبێت‌و پێستەکەی لێ کردبێتەوەو دابێتی بە دایکت‌و پێی وتبێت ئەم پێستە بکە بە کونە بۆمان) وتی: بەڵێ. عەرەبەکە وتی: ئەو دەنکە منیش‌و کەس‌و کاریم تێر دەکات؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (بەڵێ هەموو عەشرەتەکەیشت تێر دەکات).[1] خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿لَّا مَقْطُوعَةٍ وَلَا مَمْنُوعَةٍ﴾ واتە: لە زستان‌و هاویندا نابڕێت‌و هەمیشە خواردنی بەردەوامەو هەر کاتێك داوای بکەن دەست دەکەوێت. هیچ شتێکیان بە مەیلی خودا لێ قەدەغە ناکرێت. قەتادە دەڵێت: دڕك‌و شوڵ‌و دووری نابێتە ڕێگر بۆ وەدەستهێنان‌و خواردنی.[2] لە فەرموودەیەکدا لە پێشەوە باسکرا کاتێك کەسێك میوەیەکی لێکردەوە دانەیەکی تر دەڕواتەوە شوێنەکەی. خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَفُرُشٍ مَّرْفُوعَةٍ﴾ نوێن‌و بانی بەرزو نزم. واتە: جێگەوبانی بەرزو ناسك. وە دەفەرمووێت: ﴿إِنَّآ أَنشَأْنَٰهُنَّ إِنشَآءً﴾ ئێمە خۆمان کیژەکانمان بە تایبەتی بەرهەم هێنا. ﴿فَجَعَلْنَٰهُنَّ أَبْكَارًا﴾ بڕیارمان بۆ دان هەر کچ بن. ﴿عُرُبًا أَتْرَابًا﴾ شوخۆشەویستی هاوتەمەنن. ﴿لِّأَصْحَٰبِ ٱلْيَمِينِ﴾ بەشی دەستەڕاستەکانن. زەمیرەکە هاتووە کەسی دیاری نەکردووە. بەڵام کاتێك شێوازی ئایەتەکە بووەتە بەڵگە کە باسی نوێن‌و شوێنی بەرز دەکات بۆ ئەو ژنانەی کە لەسەری پاڵ دەکەون. بەوە وازی هێناتوە لە ناوبردنیان‌و زەمیرەکەی (الضمیر) گەڕاندووەتەوە بۆیان. وەك ئەم ئایەتانە کە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿إِذْ عُرِضَ عَلَيْهِ

---

[1] احمد (١٨٣/٤)، ئەم فەرموودەیە سەنەدەکانی لاوازە.

[2] الطبري (١١٨/٢٣).

بِٱلْعَشِيِّ ٱلصَّٰفِنَٰتُ ٱلْجِيَادُ ﴿٣١﴾ فَقَالَ إِنِّيٓ أَحْبَبْتُ حُبَّ ٱلْخَيْرِ عَن ذِكْرِ رَبِّي حَتَّىٰ تَوَارَتْ بِٱلْحِجَابِ ﴾[1] واتە: سەر لە ئێوارە کاتێك ئەسپانی ڕەسەنو خێرا نیشانی سولەیمان درا. جا (سولەیمان) وتی خۆشەویستی ئەم ئەسپانەم یادی خودای لەبیر بردم. واتە: خۆر. وەك لە قسەی زانایانی تەفسیرەوە دەرکەوتووەو دیارە. ئەخفەش لەم ئایەتەدا: ﴿إِنَّآ أَنشَأْنَٰهُنَّ إِنشَآءً﴾ دەڵێت: دەری نەخسوونو باسی نەکردوون لە پێش ئەمە.[2] ئەبو عوبەیدە (أبو عُبَيدة) دەڵێت: لەم ئایەتانەدا باسی کردوون کە فەرموویەتی: ﴿وَحُورٌ عِينٌ ﴿٢٢﴾ كَأَمْثَٰلِ ٱللُّؤْلُوِ ٱلْمَكْنُونِ﴾[3] کە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿إِنَّآ أَنشَأْنَٰهُنَّ﴾ ئێمە خۆمان وەدیمان هێناون لەوەدیهێنانێکی تردا. پاش ئەوەی کە پیربوونو چلکی سپی بە چاویانەوە بوو کردمانەوە بە کیژ. واتە: دای ئەوەی کە ژنی میردار بوون، بوونەوە بە کیژی شوخۆشەویست دەچنە لای مێردەکانیان بەو خۆشیو پاکیو جوانیەوە. ئەبو داودی تیالیسی ڕیوایەتی کردووە لە ئەنەسەوە دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (خاوەن باوەڕ توانای ئەوەندەو ئەوەندەی دەدرێتێ بۆ چوونە لای ژنان)، وتم: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەوەندە دەتوانێت؟ فەرمووی: (توانای سەد کەسنی پێ دەدرێت).[4] تیرمیزیش ڕیوایەتی کردووەو دەڵێت: ڕاستو غەریبە[5] ئەبول قاسمی تەبەرانی ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو هورەیرەوە دەڵێت: وتیان ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئاخۆ لە بەهەشتدا دەگەین بە ژنەکانمان؟ فەرمووی: (پیاو لە یەك ڕۆژدا پەیوەندی دەکات بە سەد کچەوە).[6] دەچێتە لای سەد کچ. حافیز ئەبو عەبدوڵلای مەقدیسی دەڵێت: ئەم فەرموودەیە لای من لەسەر مەرجی سەحیحە والله أعلم. ﴿عُرُبًا﴾ سەعیدی کوڕی جوبەیر دەڵێت: لە ئیبنوعەباسەوە واتە: شەیدان بۆ گەیشتن بە مێردەکانیان. سەیری وشترت نەکردووە کاتێك بە پەلە دەڕواتو دەست بەرز دەکاتەوە ئەمیش هەر وایە. زەحاك دەڵێت: (العرب) واتە: ئەمان شەیداو عاشقی مێردەکانیانن مێردەکانیشیان شەیدای ئەوانن.[7] هەروەها عەبدوڵلای کوڕی سەرجسی و موجاهدو عیکریمەو ئەبو

---

[1] ص (٣١-٣٢).

[2] الطبري (١١٨/٢٣).

[3] الطبري (١١٨/٢٣).

[4] مسند الطيالسي (٢٦٩)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[5] تحفة الأحوذي (٢٤١/٧)، فەرموودەیەکی سەحیحی غەریبە.

[6] الطبراني الصغير (٦٨/٢)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[7] الدر المنثور (١٦/٨).

عالیەو یەحیای کوڕی ئەبو کەسیروعەتیەو حەسەنو قەتادەو زەححاکو کەسانی تریش وتوویانە.[1]

﴿أَتۡرَابٗا﴾ زەححاك دەڵێت لە ئیبنوعەباسەوە: لە یەك تەمەندان، لە تەمەنی سی‌و سێ ساڵی دان.[2] موجاهد دەڵێت: (الاتراب) واتە: هاوتەمەن. لە ڕیوایەتێکی تردا دەڵێت: وەك یەکن.[3] عەتیە دەڵێت: هاوتەمەن. خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿لِّأَصۡحَٰبِ ٱلۡيَمِينِ﴾ واتە: دروستکراونو بەشی دەستەڕاستەکانن. وان: هەڵگیراون بۆیان یان کراون بە هاوسەریان. زۆر چاك دیارە کە ئەم ئایەتە پەیوەندە بەم ئایەتانەوە کە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿إِنَّآ أَنشَأۡنَٰهُنَّ إِنشَآءٗ ﴿٣٥﴾ فَجَعَلۡنَٰهُنَّ أَبۡكَارًا ﴿٣٦﴾ عُرُبًا أَتۡرَابٗا ﴿٣٧﴾ لِّأَصۡحَٰبِ ٱلۡيَمِينِ﴾ ماناکەی ئەوە دەگەیەنێت کە ئێمە خۆمان ئەم کیژانەمان بە تایبەتی وەدی هێنا بۆ تیرەی دەستەڕاستەکان، ئەمە ڕاوبۆچوونی ئیبنو جەریرە.[4] منیش دەڵێم: دەشێ ئەم ئایەتە: ﴿لِّأَصۡحَٰبِ ٱلۡيَمِينِ﴾ پەیوەندی ببێت بە پێشی خۆیەوە کە دەفەرمووێت: ﴿أَتۡرَابٗا ﴿٣٧﴾ لِّأَصۡحَٰبِ ٱلۡيَمِينِ﴾ واتە: هاوتەمەنی تیرەی دەستەڕاستەکان. وەك لەو فەرموودەی کە بوخاریو موسلیم ڕیوایەتیان کردووە لە ئەبو هورەیرەوە دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (یەکەم کۆمەڵێك کە دەچنە بەهەشت لە شێوەی مانگی چواردەدان، ئەوانەی دوای ئەوان دێن شەوقیان لە ئەستێرە تروسکەدارترو ڕووناکترە لە ئاسماندا. میزو پیسی ناکەنو تف ناکەنەوەو مشیش ناکەنو چڵمیان نیە، شانەکانیان ئاڵتوونە ئارەقیان میسکە بە خۆشی بەیەك دەگەنو ژنەکانیان کیژی سپی چاو بەڵەکەو خوڕەوشتیان وەك یەکەو لەسەر شێوەو شکڵی بابیانن ئادەم (سەلامی خوای لێبێت) کە شەست باڵە لە ئاسماندا).[5] خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ثُلَّةٞ مِّنَ ٱلۡأَوَّلِينَ﴾ هێندێك لەوانی پێشینە. ﴿وَثُلَّةٞ مِّنَ ٱلۡأٓخِرِينَ﴾ هێندێکیش لە پاشینەکان. واتە: کۆمەڵێك لە پێشینەکانو کۆمەڵێك لە پاشینەکان. ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە لە عەبدوڵلای کوڕی مەسعودەوە دەڵێت: هەندێکی لە هەندێکی وەرگرتووە. دەڵێت: شەوێکمان بە خواپەرستی لە لای پێغەمبەر(ﷺ) بردەسەر پاشان بەیانی هاتینەوە خزمەتی. فەرمووی: (پێغەمبەرانیانو (سەلامی خوایان لێبێت) شوێنکەوتوانیانو گەلەکانیان پێشان دام، پێغەمبەر دەڕۆیشتو تێدەپەڕی بە لامدا، پێغەمبەری وا هەبوو یەك کەسی

---

[1] الطبري (٢٣/١٢١/١٢٢/١٢٣).
[2] الدر المنثور (٨/١٦).
[3] الطبري (٢٣/١٢٤).
[4] الطبري (٢٣/١٢٥).
[5] فتح الباري (٦/٤١٧)، مسلم (٤/٢١٧٩).

لەگەڵ نەبوو، پێغەمبەری واش هەبوو سێ کەسی لەگەڵ بوو، پێغەمبەری واش هەبوو کەسی لەگەڵ نەبوو، قەتادە ئەم ئایەتەی خوێند: ﴿أَلَيْسَ مِنكُمْ رَجُلٌ رَّشِيدٌ﴾[1] واتە: ئاخۆ پیاوێکی ژیرو تێگەیشتووتان تێدا نیە. فەرمووی: هەتا موسای کوڕی عیمران بە لامدا ڕۆیشت لەگەڵ کۆمەڵێك لە بەرەی ئیسرائیل فەرمووی: وتم: ئەی پەروەردگارم ئەمە کێیە؟ فەرمووی: ئەمە موسای کوڕی عیمرانی براتەو شوێنکەوتووانی لە نەوەی بەنی ئیسرائیل. فەرمووی: وتم: پەروەردگارم ئوممەتەکەی من لە کوێیە؟ فەرمووی: (سەیری لای ڕاستی خۆت بکە لای ئەو کێوەوە، فەرمووی: لەو کاتەدا دەمو چاوی خەڵکم بینی (چاو پێکەوت) فەرمووی: ئایا ڕازیت؟ وتی: وتم: بەڵێ ئەی پەروەردگارم ڕازی بووم. فەرمووی: لەگەڵ ئەمانەدا حەفتا هەزار دەچنە بەهەشت بێ لێپرسینەوە. فەرمووی: سەیری ئەو ئاسۆیە بکە لای چەپتەوە خەڵکێکی زۆرم بینی فەرموو: ئایا ڕازی بوویت؟ وتم: پەروەردگارم ڕازی بووم، فەرمووی: لەگەڵ ئەمانەشدا حەفتا هەزار دەچنە بەهەشت بێ لێپرسینەوە) پاشان وتی: عوکاشە دەست پێ بکە. وتی: عوکاشەی کوڕی موحسەن لە تیرەی بەنی ئەسد هەڵسا. سەعید وتی: لە ئەو کەسانە بوو کە ئامادەی جەنگی بەدر بوو، وتی: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) داوام بۆ بکە لە خوا منیش یەکێك بم لەوانە. پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (خودایە بە یەکێك لەوانی دانێ) واتە: حیسابی بکە. وتی: پیاوێکی تریش هەڵساو وتی: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) دوعام بۆ بکە منیش یەکێك بم لەوانە: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (عوکاشە پێشت کەوت). وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (دایكو بابم بە فیداتان بێت ئەگەر توانیتان یەکێك بن لەو تیرەی هەفتایە ئەگەر لەوانیش نەبوون لە تیرەی لای کێوەکە بن، ئەگەر لەمانیش نەبوون لە تیرەی ئاسۆکان بن من خەڵکێکی زۆرم بینی بە کۆمەڵ لە دەوری کۆبووبوونەوە (پاشان فەرمووی) من داوام وایە کە ئێوە چواریەکی خەڵکی بەهەشت بن)، الله أکبرمان کرد پاشان فەرمووی: (من داوام وایە کە ئێوە سێیەکی خەڵکی بەهەشت بن)، وتی: الله أکبرمان کرد، فەرمووی: (داوام وایە کە نیوەی خەڵکی بەهەشت بن)، وتی: الله أکبرمان کرد. پاشان وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەم ئایەتەی خوێند: ﴿ثُلَّةٌ مِّنَ الْأَوَّلِينَ ﴿٣٩﴾ وَثُلَّةٌ مِّنَ الْآخِرِينَ﴾ وتی: لەناو خۆماندا وتمان: ئەو حەفتا هەزارە کێن؟ وتمان: ئەوانە بە موسڵمانی لە دایك بوونو هاوەڵیان بۆ خودا دانەناوە. وتی: ئەم قسەیە گەیشتەوە بە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (بەڵکو ئەوانەن کە ئەستێرە ناگێڕن (ناژمێرنو قسە بە پەنامەکی نابەنو نادزن) موتەشائیم نین (بەدقومی نادەنە پاڵ هیچ شتێك) پەنا بە خوای خۆیان دەبەن).[2] ئەم فەرموودەیە ڕێگای زۆرە لە کتێبە سەحیحەکانداو کتێبەکانی تریشدا[1].

---

[1] هود (٧٨).

[2] الحاكم (٤/٤٧٧)، فەرموودەیەکی حەسەنە.

﴿وَأَصۡحَٰبُ ٱلشِّمَالِ مَآ أَصۡحَٰبُ ٱلشِّمَالِ ﴿٤١﴾ فِي سَمُومٖ وَحَمِيمٖ ﴿٤٢﴾ وَظِلّٖ مِّن يَحۡمُومٖ ﴿٤٣﴾ لَّا بَارِدٖ وَلَا كَرِيمٍ ﴿٤٤﴾ إِنَّهُمۡ كَانُواْ قَبۡلَ ذَٰلِكَ مُتۡرَفِينَ ﴿٤٥﴾ وَكَانُواْ يُصِرُّونَ عَلَى ٱلۡحِنثِ ٱلۡعَظِيمِ ﴿٤٦﴾ وَكَانُواْ يَقُولُونَ أَئِذَا مِتۡنَا وَكُنَّا تُرَابٗا وَعِظَٰمًا أَءِنَّا لَمَبۡعُوثُونَ ﴿٤٧﴾ أَوَءَابَآؤُنَا ٱلۡأَوَّلُونَ ﴿٤٨﴾ قُلۡ إِنَّ ٱلۡأَوَّلِينَ وَٱلۡأٓخِرِينَ ﴿٤٩﴾ لَمَجۡمُوعُونَ إِلَىٰ مِيقَٰتِ يَوۡمٖ مَّعۡلُومٖ ﴿٥٠﴾ ثُمَّ إِنَّكُمۡ أَيُّهَا ٱلضَّآلُّونَ ٱلۡمُكَذِّبُونَ ﴿٥١﴾ لَأٓكِلُونَ مِن شَجَرٖ مِّن زَقُّومٖ ﴿٥٢﴾ فَمَالِـُٔونَ مِنۡهَا ٱلۡبُطُونَ ﴿٥٣﴾ فَشَٰرِبُونَ عَلَيۡهِ مِنَ ٱلۡحَمِيمِ ﴿٥٤﴾ فَشَٰرِبُونَ شُرۡبَ ٱلۡهِيمِ ﴿٥٥﴾ هَٰذَا نُزُلُهُمۡ يَوۡمَ ٱلدِّينِ ﴿٥٦﴾﴾

## تیرەی دەستی چەپو ژیان و پاداشتیان

کاتێك خوای مەزن باسی کۆمەڵی دەستەڕاستی کرد دوای ئەوان دێتە سەر باسی کۆمەڵی دەستەی چەپو فەرموویەتی: ﴿وَأَصۡحَٰبُ ٱلشِّمَالِ مَآ أَصۡحَٰبُ ٱلشِّمَالِ﴾ ئەوانەی کە دەستەی چەپن، تووشی چ نەگبەتیەك هاتوون. واتە: لە چ ژیانێك دان ئەوانەی لە کۆمەڵی دەستەی چەپن؟ پاشان مانای کردووەو فەرموویەتی: ﴿فِي سَمُومٖ وَحَمِيمٖ﴾ وان لەناو گڕەباو ئاوەکوڵدا. ﴿فِي سَمُومٖ﴾ لەناو هەوای گەرم. ﴿وَحَمِيمٖ﴾ ئاوی گەرم دان. ﴿وَظِلّٖ مِّن يَحۡمُومٖ﴾ چڕە دوکەڵ سێبەریانە. ئیبنوعەباس دەڵێت: ﴿وَظِلّٖ﴾ واتە: دوکەڵ.[2] قەتادەو موجاهدو عیکریمەو ئەبو ساڵحو سودیو کەسانی تریش هەر وایان وتووە.[3] ئەم ئایەتە وەك ئەم ئایەتە وایە کە دەفەرمووێت: ﴿ٱنطَلِقُوٓاْ إِلَىٰ مَا كُنتُم بِهِۦ تُكَذِّبُونَ ﴿٢٩﴾ ٱنطَلِقُوٓاْ إِلَىٰ ظِلّٖ ذِي ثَلَٰثِ شُعَبٖ ﴿٣٠﴾ لَّا ظَلِيلٖ وَلَا يُغۡنِي مِنَ ٱللَّهَبِ ﴿٣١﴾ إِنَّهَا تَرۡمِي بِشَرَرٖ كَٱلۡقَصۡرِ ﴿٣٢﴾ كَأَنَّهُۥ جِمَٰلَتٞ صُفۡرٞ ﴿٣٣﴾ وَيۡلٞ يَوۡمَئِذٖ لِّلۡمُكَذِّبِينَ﴾[4]. بۆیە لێرەدا فەرموویەتی: ﴿وَظِلّٖ مِّن يَحۡمُومٖ﴾ دوکەڵی ڕەش سێبەریانە. ﴿لَّا بَارِدٖ وَلَا كَرِيمٍ﴾ نە فێنکایی تێدا هەیەو نە لەبەری دەحەسێنەوە. واتە: نە باکەی چاکەو نە شێوەشی جوانە وەك حەسەنو قەتادە وتوویانە: ﴿وَلَا كَرِيمٍ﴾ جێگاکەشی شوێنی حەوانەوە نیە.[5] زەححاك دەڵێت هەر خواردنەوەیەك سازگارو شیرین نەبێت ئەوە بۆ حەوانەوە نیە.[6] پاشان خوای گەورە باسی پاداشتیان

---

[1] فتح الباري (١٠/١٦٤/٢٢٤) و(١١/٣١٢/٤١٣)، مسلم (١/١٩٨/١٩٩)، تحفة الأحوذي ٧/١٣٩)، أحمد (١/٤٠١).
[2] الطبري (٢٣/١٢٩).
[3] الطبري (٢٣/١٢٩/١٣٠).
[4] المرسلات (٢٩ـ٣٤).
[5] الطبري (٢٣/١٣١).
[6] الطبري (٢٣/١٣١).

دەکات لەسەر ئەو کردارە خراپەیان کە کردوویانەو فەرموویەتی: ﴿إِنَّهُمْ كَانُوا۟ قَبْلَ ذَٰلِكَ مُتْرَفِينَ﴾ چونکە ئەوان لە دنیادا خۆشگوزەران بوون. واتە: ئەوان لە ژیانی دنیادا خۆشگوزەران بوون ڕوویان کردبووە خۆشیو ئارەزووی هەواو هەوەس لایان نەدەکردەوە بە لای ئەوەی کە پێغەمبەرەکانیان بۆیان هێنابوون. ﴿وَكَانُوا۟ يُصِرُّونَ عَلَى ٱلْحِنثِ ٱلْعَظِيمِ﴾ لەسەر گوناهی گەورە پێداگر بوون. گوناهی گەورەیان دەکردو پەشیمان نەدەبوونەوەو وازیان نەدەهێنا. ﴿عَلَى ٱلْحِنثِ ٱلْعَظِيمِ﴾ کە باوەڕیان نەبوو بە خوداو بتو هاوەڵیان بۆ دادەنا بێجگە لە خودا خۆی. ئیبنوعەباس دەڵێت: ﴿ٱلْحِنثِ ٱلْعَظِيمِ﴾ واتە: هاوەڵ بۆ خوا دانان. موجاهدو عیکریمەو زەححاکو قەتادەو سودیو کەسانی تریش هەر وایان وتووە.[1] وە دەفەرموویت: ﴿وَكَانُوا۟ يَقُولُونَ أَئِذَا مِتْنَا وَكُنَّا تُرَابًا وَعِظَٰمًا أَءِنَّا لَمَبْعُوثُونَ﴾ دەشیان وت: ئاخۆ ئەگەر ئێمە بووینە خۆڵو چەند پێشەیەك دیسان زیندوو دەکرێینەوە؟ واتە: ئەمانە ئەم قسانە دەکەن باوەڕیان بە زیندوو- بوونەوە نیەو دوورە بە لایانەوە کە ڕووبدات. ﴿أَوَءَابَآؤُنَا ٱلْأَوَّلُونَ﴾ یاخود بابو باپیرانمان زیندوو دەکرێنەوە؟ خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿قُلْ إِنَّ ٱلْأَوَّلِينَ وَٱلْءَاخِرِينَ﴾ بەڵێ: بێ شك ئەوەی لە پێشوودابوونو ئەوانی لە دوایین هاتوون. ﴿لَمَجْمُوعُونَ إِلَىٰ مِيقَٰتِ يَوْمٍ مَّعْلُومٍ﴾ بە کۆمەڵ کۆدەکرێنەوە لە ژوانگەی ڕۆژێك کە دیاری کراوە. واتە: هەواڵیان بدەرێ ئەی موحەممەد (ﷺ) ئەوانەی پێشوو ئەمانەی دوایش لە بەرەی ئادەم بەم نزیکانە کۆدەکرێنەوە لە گۆڕەپانی قیامەتدا هیچ کەسیان لێ دەرناچێت. وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ذَٰلِكَ يَوْمٌ مَّجْمُوعٌ لَّهُ ٱلنَّاسُ وَذَٰلِكَ يَوْمٌ مَّشْهُودٌ ﴿١٠٣﴾ وَمَا نُؤَخِّرُهُۥٓ إِلَّا لِأَجَلٍ مَّعْدُودٍ ﴿١٠٤﴾ يَوْمَ يَأْتِ لَا تَكَلَّمُ نَفْسٌ إِلَّا بِإِذْنِهِۦ ۚ فَمِنْهُمْ شَقِىٌّ وَسَعِيدٌ﴾[2] واتە: ئەو ڕۆژە ڕۆژێکە کە ئادەمی بۆ کۆدەکرێتەوەو ئەوە ڕۆژێکی دیارو بەرچاوە (هەمووان ئامادەن تێیدا)، وە ئێمە دوای ناخەین مەگەر بۆ کاتێکی دیارو بەرچاو، ئەو ڕۆژە کە دێت هیچ کەس قسە ناکات مەگەر بە مۆڵەتی خوا ئەوسا لەناویاندا هەیە بێ بەخت و هەیە بەختەوەر. بۆیە لێرەدا فەرموویەتی: ﴿لَمَجْمُوعُونَ إِلَىٰ مِيقَٰتِ يَوْمٍ مَّعْلُومٍ﴾ واتە: دەستنیشان کراوە بۆ ڕۆژێم کە دیاری کراوە. نە پێش دەکەوێتو نە پاشو نە زیاد دەکرێتو نە کەم. خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿ثُمَّ إِنَّكُمْ أَيُّهَا ٱلضَّآلُّونَ ٱلْمُكَذِّبُونَ﴾ ئەوسا ئێوە ئەی گومڕایانی بێباوەڕ. ﴿لَءَاكِلُونَ مِن شَجَرٍ مِّن زَقُّومٍ﴾ دەبێت بەری داری

---

[1] الطبري (٢٣/١٣٢).

[2] هود (١٠٣_١٠٥).

ژەقنەبووت بخۆن. ﴿فَمَالِـُٔونَ مِنْهَا ٱلْبُطُونَ﴾ کەدەتانی لێ پڕ بکەن. لەبەرئەوە دەگیرێن و ڕادەکێشرێن هەتا لە بەری داری ژەقنەبون بخۆن. هەتا سکیانی لێ پڕ دەکەن. ﴿فَشَـٰرِبُونَ عَلَيْهِ مِنَ ٱلْحَمِيمِ﴾ ئەوسا ئاوی گەرم بەسەر ئەودا دەخۆن. ﴿فَشَـٰرِبُونَ شُرْبَ ٱلْهِيمِ﴾ وەکو چۆن وشتری تینوو بێتە سەر ئاو. ﴿ٱلْهِيمِ﴾ وشتری زۆر تینوو. موفرەدەکەی (آهيم)ە و موئەنەسەکەی (مێینەکەی) (هيماء)و (هائم و هائمەیش) وتراوە. ئیبنوعەباس و موجاهدو سەعیدی کوڕی جوبەیرو عیکریمە وتوویانە: ﴿ٱلْهِيمِ﴾ واتە: وشتری زۆر تینوو.[1] سودی دەڵێت: ﴿ٱلْهِيمِ﴾ نەخۆشیەکە تووشی وشتر دەبێت و هەرگیز تێرئاو نابێت حەتا دەمرێت. هەروەها خەڵکی جەهەنەمیش هەرگیز تێرئاو ناخۆنەوە لەو ئاوە گەرمە. پاشان خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿هَـٰذَا نُزُلُهُمْ يَوْمَ ٱلدِّينِ﴾ ڕۆژی قیامەت وایان میوانداری دەکرێت. واتە: ئەوەی کە بۆمان باس کردوون بەو شێوەیە میوانداریان لێ دەکرێت لە لای پەروەردگاریان لە ڕۆژی لێپرسینەوەیاندا. وەك خوای گەورە لە بارەی خاوەن باوەڕانەوە فەرموویەتی: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ كَانَتْ لَهُمْ جَنَّـٰتُ ٱلْفِرْدَوْسِ نُزُلًا﴾[2] واتە: بە ڕاستی ئەوانە کە ئیمان و باوەڕیان هێناوە و کردەوەی چاکیان کردووە بەهەشتەکانی فیردەوس جێگای (میوانداری) ئەوانە. میوانداریان لێ دەکرێت و ڕێزیان لێ دەگیرێت.

﴿نَحْنُ خَلَقْنَـٰكُمْ فَلَوْلَا تُصَدِّقُونَ ﴿٥٧﴾ أَفَرَءَيْتُم مَّا تُمْنُونَ ﴿٥٨﴾ ءَأَنتُمْ تَخْلُقُونَهُۥٓ أَمْ نَحْنُ ٱلْخَـٰلِقُونَ ﴿٥٩﴾ نَحْنُ قَدَّرْنَا بَيْنَكُمُ ٱلْمَوْتَ وَمَا نَحْنُ بِمَسْبُوقِينَ ﴿٦٠﴾ عَلَىٰٓ أَن نُّبَدِّلَ أَمْثَـٰلَكُمْ وَنُنشِئَكُمْ فِى مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٦١﴾ وَلَقَدْ عَلِمْتُمُ ٱلنَّشْأَةَ ٱلْأُولَىٰ فَلَوْلَا تَذَكَّرُونَ ﴿٦٢﴾﴾

**سەلماندنی ڕۆژی قیامەت و بەڵگە لەسەر زیندووبوونەوە**

خوای مەزن باسی سەلماندنی ڕۆژی قیامەت دەکات و وەڵامی ئەوانە دەداتەوە کە باوەڕیان پێی نیە لەو خەڵکە بێ دین و گومڕایە کە دەیان وت وەك خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿أَئِذَا مِتْنَا وَكُنَّا تُرَابًا وَعِظَـٰمًا أَءِنَّا لَمَبْعُوثُونَ﴾ ئەو قسەیان بۆیە کردووە چونکە باوەڕیان بە زیندووبوونەوە نەبووە و زۆر بە دووریان زانیوە. خودایش دەفەرمووێت: ﴿نَحْنُ خَلَقْنَـٰكُمْ فَلَوْلَا تُصَدِّقُونَ﴾ ئێمە ئێوەمان دروست کرد، سا بۆچی باوەڕتان نەبوو. واتە: ئێمە لە ئەوەل جارەوە ئێوەمان دروست کرد شتێك نەبوو کە ناوتان بوو بێت. ئاخۆ کەسێك توانای بووبێت لە یەکەم جارەوە دروستی کردبن ناتوانێت جارێکی تر، بە

---

[1] الطبري (٢٣/١٣٦).

[2] الكهف (١٠٧).

شێوەیەکی چاکترو جوانتر وەدیتان بهێنێتەوە؟. بۆیە فەرموویەتی: ﴿فَلَوْلَا تُصَدِّقُونَ﴾ واتە: بۆچی باوەڕتان نەبووە بە زیندووبوونەوە، پاشان بەڵگەیان بۆ هێناونەتەوەو فەرموویەتی: ﴿أَفَرَءَيْتُم مَّا تُمْنُونَ﴾ ئاخۆ ئێوە ئەو ئاوی شاوەتەوە دیوە، کە دەیڕێژن. ﴿ءَأَنتُمْ تَخْلُقُونَهُۥٓ أَمْ نَحْنُ ٱلْخَـٰلِقُونَ﴾ ئاخۆ ئێوە وەدی دێنن، یان ئێمە وەدی دێنین. واتە: ئێمە لەناو ڕەحمدا دای دەنێین و دروستی دەکەن یان خوای وەدیهێنەر؟ پاشان خوای مەزن فەرموویەتی: ﴿نَحْنُ قَدَّرْنَا بَيْنَكُمُ ٱلْمَوْتَ وَمَا نَحْنُ بِمَسْبُوقِينَ﴾ ئێمە بڕیاری مەرگمان بۆتان داوەو کەس وەپێش ئێمە ناکەوێت. واتە: ئێمە مردنمان بۆ داناون. زەحاك دەڵێت: خەڵکی ئاسمان و زەمین وەك یەك دەمرێت.[1] واتە: هەموو دەمرێت. ﴿نَحْنُ بِمَسْبُوقِينَ﴾ واتە: ئێمە بێ توانا نین. ﴿عَلَىٰٓ أَن نُّبَدِّلَ أَمْثَـٰلَكُمْ وَنُنشِئَكُمْ فِى مَا لَا تَعْلَمُونَ﴾ کە بە چینێکی وەك ئێوە دەتانگۆڕین و تەرزێکتان ساز یدەینەوە، کە ئێوە ئاگاتان لێ نیە. واتە: جەستەتان دەگۆڕین لە ڕۆژی قیامەتدا. ﴿وَنُنشِئَكُمْ فِى مَا لَا تَعْلَمُونَ﴾ واتە: لە شێوەو شکڵێکی تردا سازتان دەدەینەوە. پاشان خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَلَقَدْ عَلِمْتُمُ ٱلنَّشْأَةَ ٱلْأُولَىٰ فَلَوْلَا تَذَكَّرُونَ﴾ خۆ ئێوە لە دروستبوونی یەکەم جارتان ئاگادارن، دەی بۆ هیچ بیر ناکەنەوە. واتە: خۆ ئێوە ئاگاداربوون کە خودا دروستی کردن کە شتێك نەبوون باس بکرێت، دروستی کردن و چاوو دڵی پێدان. بۆچی بیرتان نەکردەوەو بزانن کە خودایە یەکەم جار توانی دروستتان بکات باشتر دەتوانێت جارێکی تر دروستتان بکاتەوە بە شێوەیەکی چاکترو جوانتر؟. وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِى يَبْدَؤُا۟ ٱلْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ وَهُوَ أَهْوَنُ عَلَيْهِ﴾[2] واتە: خوا زاتێکە بەدیهێنانی دەست پێکردووە لە پاشان (دوای مردن) دووبارە دروستی دەکاتەوە ئەم (دروستکردنەوەی دووەم) لای خودا ئاسانترە. وە فەرموویەتی: ﴿أَوَلَا يَذْكُرُ ٱلْإِنسَـٰنُ أَنَّا خَلَقْنَـٰهُ مِن قَبْلُ وَلَمْ يَكُ شَيْـًٔا﴾[3] واتە: ئەوە ئادەمیزاد بۆ بیر ناکاتەوە کە بێگومان ئێمە لەسەرەتاوە ئەومان دروست کردووە کە ئەو شتێك نەبوو. ﴿أَوَلَمْ يَرَ ٱلْإِنسَـٰنُ أَنَّا خَلَقْنَـٰهُ مِن نُّطْفَةٍ فَإِذَا هُوَ خَصِيمٌ مُّبِينٌ ﴿٧٧﴾ وَضَرَبَ لَنَا مَثَلًا وَنَسِىَ خَلْقَهُۥ ۖ قَالَ مَن يُحْىِ ٱلْعِظَـٰمَ وَهِىَ رَمِيمٌ ﴿٧٨﴾ قُلْ يُحْيِيهَا ٱلَّذِىٓ أَنشَأَهَآ أَوَّلَ

---

[1] القرطبي (١٧/٢١٦).

[2] الروم (٢٧).

[3] مريم (٦٧).

مَرَّةٍ وَهُوَ بِكُلِّ خَلْقٍ عَلِيمٌ ﴾[1] واتە: ئایا ئادەمی نەیزانیوە کە ئەومان لە نوتفەیەك دروست کردووە کەچی یەکسەر دەبێتە دوژمنێکی دیار، وە نموونەمان بۆ دێنێتەوەو بەدیهێنانی خۆی لەبیرچووەتەوە (ئەو بێبڕوایە) دەڵێت کێ ئێسکەکان زیندوو دەکاتەوە لە کاتێکدا کە ڕزیون، (ئەی موحەممەد(ﷺ)) بڵێ: ئەو زاتە زیندوویان دەکاتەوە کە لە یەکەم جارەوە بەدی هێناون و ئەو بە هەموو دروستکراوێك زاناو ئاگایە. وە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿أَيَحْسَبُ الْإِنسَانُ أَن يُتْرَكَ سُدًى ﴿٣٦﴾ أَلَمْ يَكُ نُطْفَةً مِّن مَّنِيٍّ يُمْنَىٰ ﴿٣٧﴾ ثُمَّ كَانَ عَلَقَةً فَخَلَقَ فَسَوَّىٰ ﴿٣٨﴾ فَجَعَلَ مِنْهُ الزَّوْجَيْنِ الذَّكَرَ وَالْأُنثَىٰ ﴿٣٩﴾ أَلَيْسَ ذَٰلِكَ بِقَادِرٍ عَلَىٰ أَن يُحْيِيَ الْمَوْتَىٰ ﴾[2] واتە: ئایا مرۆڤ وا دادەنێ کە هەروا بەرەڵا دەکرێت و پشتگوێ دەخرێت، ئایا نوتفەیەك نەبوو لە تۆو کە دەڕژێنرایە منداڵدانەوە، لە پاشان بوو بە جەڵتە خوێن ئینجا دروستی کردو ڕێکی خست ئینجا لەو تۆوە دوو جۆری دروست کرد نێرو مێ. ئایا ئەو زاتە توانای نیە بەسەر ئەوەدا کە مردووان زیندوو بکاتەوە.

﴿أَفَرَأَيْتُم مَّا تَحْرُثُونَ ﴿٦٣﴾ أَأَنتُمْ تَزْرَعُونَهُ أَمْ نَحْنُ الزَّارِعُونَ ﴿٦٤﴾ لَوْ نَشَاءُ لَجَعَلْنَاهُ حُطَامًا فَظَلْتُمْ تَفَكَّهُونَ ﴿٦٥﴾ إِنَّا لَمُغْرَمُونَ ﴿٦٦﴾ بَلْ نَحْنُ مَحْرُومُونَ ﴿٦٧﴾ أَفَرَأَيْتُمُ الْمَاءَ الَّذِي تَشْرَبُونَ ﴿٦٨﴾ أَأَنتُمْ أَنزَلْتُمُوهُ مِنَ الْمُزْنِ أَمْ نَحْنُ الْمُنزِلُونَ ﴿٦٩﴾ لَوْ نَشَاءُ جَعَلْنَاهُ أُجَاجًا فَلَوْلَا تَشْكُرُونَ ﴿٧٠﴾ أَفَرَأَيْتُمُ النَّارَ الَّتِي تُورُونَ ﴿٧١﴾ أَأَنتُمْ أَنشَأْتُمْ شَجَرَتَهَا أَمْ نَحْنُ الْمُنشِئُونَ ﴿٧٢﴾ نَحْنُ جَعَلْنَاهَا تَذْكِرَةً وَمَتَاعًا لِّلْمُقْوِينَ ﴿٧٣﴾ فَسَبِّحْ بِاسْمِ رَبِّكَ الْعَظِيمِ ﴿٧٤﴾﴾

**ئاگاداری لەسەر ئەوەی کە تەنها خودا دانەوێڵە دەڕوێنێت و باران دەبارێنێت و ئاگری دروست کردووە کە لە زۆر پێویستەیکانی مرۆڤە**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿أَفَرَأَيْتُم مَّا تَحْرُثُونَ﴾ ئاخۆ ئەو تۆمەی دەیچێنن دیتوتانە؟. لەتکردنی زەمین و نەرم بوونەوەی و تۆم چاندن تیایدا. ﴿أَأَنتُمْ تَزْرَعُونَهُ أَمْ نَحْنُ الزَّارِعُونَ﴾ پێتان وایە کە ئێوە بەرهەمی دێنن یان ئێمە بۆتان دەڕوێنین. ﴿أَأَنتُمْ تَزْرَعُونَهُ﴾ ئاخۆ ئێوە دەیڕوێنن، ﴿أَمْ نَحْنُ الزَّارِعُونَ﴾ واتە: بەڵکو ئێمە لە شوێنی خۆیدا دایدەنێیت لەناو زەمیندا دەیڕوێنین. ئیبنو جەریر ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو هورەیرەوە دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: مەڵێ ڕواندم بەڵکو بڵێ چاندم، ئەبو هورەیرە دەڵێت: گوێت لەم ئایەتە نەبووە کە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿أَفَرَأَيْتُم مَّا تَحْرُثُونَ ﴿٦٣﴾ أَأَنتُمْ تَزْرَعُونَهُ أَمْ نَحْنُ الزَّارِعُونَ﴾[3]. وە دەفەرمووێت: ﴿لَوْ نَشَاءُ لَجَعَلْنَاهُ حُطَامًا فَظَلْتُمْ تَفَكَّهُونَ﴾ ئەگەر

---

[1] يس (٧٧-٧٩).

[2] القيامة (٣٦-٤٠).

[3] الطبري (٢٣/١٣٩).

ئێمە بمانویستایە، دەمانکردە پووشی بەر با، ئەوسا ئێوە سەیرتان دەکرد. واتە: ئێمە ڕواندمان بە سۆزو بەزەیی خۆمان وە هێشتمانەوە بۆتان هەر بە بەزەیی خۆمان. گەر بمانوینستایە دەمانکرد بە پوش. واتە: وشکمان دەکرد پێش ئەوەی درەوی بکەنو بیبڕن. وە دەفەرمووێت: ﴿فَظَلْتُمْ تَفَكَّهُونَ﴾ پاشان مانای کردووەو دەفەرمووێت: ﴿إِنَّا لَمُغْرَمُونَ﴾ دەتوت: ئێمە دۆڕاندمان. ﴿بَلْ نَحْنُ مَحْرُومُونَ﴾ بەڵکو بێبەش ماوینەوە. واتە: دەمانکردە پوش ئەوسا دەستتان دەکردە قسەکردن جارێك دەتان وت: دۆڕاندمان، واتە: تووشی زیان بووین. موجاهدو عیکریمە دەڵێن: ئێمە دڕۆمان لەگەڵ خۆمان کرد.[1] قەتادە دەڵێت: واتە: ئازارمان چەشت یان جارێکی تر دەڵێت: ئێمە بێبەش ماینەوە.[2] عیکریمە دەڵێت: ئەوسا دەڕوانن‌و سەرزەنشتی یەکتر دەکەن.[3] حەسەن‌و قەتادەو سودی دەڵێن: ئەوسا دەڕوانن‌و پەشیمان دەبنەوە.[4] ماناکەی. یان لەبەر ئەوەی کە ماڵی زۆریان تێدا سەرف کردووە یان لەبەر ئەو تاوانانەی کە لە پێشەوە کردوویانە. کەسائی دەڵێت: (تَفَكَّهَ) کە پێیان دەڵێن: ئەزداد(أضداد) یەك کەلیمەیە دوو مانای دژ بەیەکیان هەیە.

عەرەب دەڵێت: (تفکهت) واتە: خۆشبەخت بووم، (تفکهت) دڵگران بووم، پاشان خوای مەزن فەرموویەتی: ﴿أَفَرَءَيْتُمُ ٱلْمَآءَ ٱلَّذِى تَشْرَبُونَ﴾ ئاخۆ ئەو ئاوەتان دیوە دەیخۆنەوە؟. ﴿ءَأَنتُمْ أَنزَلْتُمُوهُ مِنَ ٱلْمُزْنِ أَمْ نَحْنُ ٱلْمُنزِلُونَ﴾ ئاخۆ ئێوە لەو هەورەوە ناردووتانە، یان ئێمە بۆمان باراندوون؟ ﴿ٱلْمُزْنِ﴾ واتە: هەور. ئیبنوعەباس‌و موجاهدو کەسانی تریش وتوویانە.[5] ﴿أَمْ نَحْنُ ٱلْمُنزِلُونَ﴾ بەڵکو ئێمە بۆمان باراندوون. ﴿لَوْ نَشَآءُ جَعَلْنَٰهُ أُجَاجًا فَلَوْلَا تَشْكُرُونَ﴾ گەر ئێمە بمانویستایە دەنامکرد بە ئاوێکی تاڵ. دەیسا بۆ شوکرانە ناکەن. بۆچی ستایشی چاکەی خودا ناکەن کە بارانی بۆ باراندوون کە خۆشی سازکارە. ﴿لَكُم مِّنْهُ شَرَابٌ وَمِنْهُ شَجَرٌ فِيهِ تُسِيمُونَ ⑩ يُنۢبِتُ لَكُم بِهِ ٱلزَّرْعَ وَٱلزَّيْتُونَ وَٱلنَّخِيلَ وَٱلْأَعْنَٰبَ وَمِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ ۗ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ﴾[6] واتە: ئاو خواردنەوەتان لەو (بارانە)یەو بە هۆی سەوزبوونی ڕووەکیشە کە مەڕو ماڵاتی لێ دەلەوەڕێنن، بەو

---

[1] الطبري (٢٣/١٤١).

[2] الطبري (٢٣/١٤١).

[3] الطبري (٢٣/١٤٠).

[4] الطبري (٢٣/١٤٠).

[5] الطبري (٢٣/١٤٣).

[6] النحل (١٠ـ١١).

ئاوە،خوا بۆتان دەڕوێنێت کشتوکاڵو زەیتونو دارخورماو مێوو ڕەزو هەموو بەرو میوەیەك بە ڕاستی لەوەدا (باس کرا) بەڵگەیەکی ڕوون هەیە بۆ ئەو کەسانەی بیر دەکەنەوە. پاشان خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿أَفَرَءَيْتُمُ ٱلنَّارَ ٱلَّتِى تُورُونَ﴾ ئاخۆ ئەو ئاگرەتان دیوە هەڵی دەکەن؟. واتە: ئاگر هەڵ دەکەن بە هۆی ئاسنەوە (چەرخ یان هەر شتێك ئاگر دەکاتەوە) دەری دێنن لە سەرچاوەکەیەوە. ﴿ءَأَنتُمْ أَنشَأْتُمْ شَجَرَتَهَآ أَمْ نَحْنُ ٱلْمُنشِـُٔونَ﴾ ئێوە داری ئاگرەکەتان دروست کرد، یان ئێمە وەدیمان هێنا؟. واتە: بەڵکو ئێمە دامانناوە لە شوێنی خۆیدا. عەرەبەکان دوو دار یان درەختیان هەبووە. یەکێکیان پێیان وتووە مەرخ (المرخ) ئەوی تریان پێیان وتووە عەفار کاتێك لەو درەختانە دوو چڵی سەوزیان لەو دوو دارە لە یەك بخزاندایە لە نێوانیاندا بزوزکی ئاگریان لێ دەکەوتەوە. خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿نَحْنُ جَعَلْنَٰهَا تَذْكِرَةً وَمَتَٰعًا لِّلْمُقْوِينَ﴾ ئێمە ئەوەمان کردە هۆی بیرەوەریو بەڕێوەچوونی ژیانی گەشتیارانو چولگەردان. ﴿نَحْنُ جَعَلْنَٰهَا تَذْكِرَةً﴾ موجاهدو قەتادە دەڵێن: بۆ یادەوەری ئاگرە هەرە گەورەکە.[1] قەتادە دەڵێت: بۆمان باس کرا کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (ئەو ئاگرەی ئێوە هەڵی دەکەن بەشێکە لە حەفتا بەش لە ئاگری جەهەنەم)، وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەو ئاگرە بەس بوو. فەرمووی: (ئەو ئاگرە دوو کەرت بوو (دووجار) کێشراوە بە دەوریدا هەتا نەوەی ئادەم سودی لێ وەربگرنو لێی نزیك ببنەوە).[2] ئەم فەرموودەی کە قەتادە هێناویەتی. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە موسنەدەکەیدا لە ئەبو هورەیرەوە. ئەویش لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: (ئەم ئاگرەی ئێوە بەشێکە لە حەفتا بەش لە ئاگری جەهەنەم. دوو جاریش کێشراوە بە دەوریادا گەر وا نەبووایە خودا خێری بۆ کەس دانەدەنا تێیدا).[3] ئیمامی مالکیش ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو هورەیرەوە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (ئەو ئاگرەی نەوەی ئادەم هەڵی دەگیرسێنن بەشێکە لە حەفتا بەش لە ئاگری جەهەنەم). وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەو ئاگرە بەس بوو. فەرمووی: (ئەو ئاگرە شەستو نۆ بەش زیاترە لەم ئاگرە).[4] بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە فەرموودەکەی مالکەوە موسلیمیش لە فەرموودەکەی ئەبو زینادەوە[5]. خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَمَتَٰعًا لِّلْمُقْوِينَ﴾ ئیبنوعەباسو قەتادەو موجاهدو زەحاکو

---

[1] الطبري (٢٣/١٤٤).

[2] الطبري (٢٣/١٤٤).

[3] احمد (٢/٢٤٤)، فەرموودەیەکی سەحیحە جگە لەم زیادەیە کە (ضربت)ە.

[4] الموطأ (٢/٩٩٤)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[5] فتح الباري (٦/٣٨٠)، مسلم (٤/٢١٨٤).

نەزری کوڕی عەرەبی (النضر بن عربي) دەڵێن: مەبەست بە (المقوین) واتە: ڕێبواران.[١] ئیبنو جەریریش هەمان ڕای هەڵبژاردووەو دەڵێت: ئەو قسانەی کە وتوویانە: (أقوات) ئەو خانووەیەکە خەڵکەکەی بەجێیان هێشتبێتو چۆڵ کرابێت[٢].عبدالرحمن ی کوڕی زەیدی کوڕی ئەسلەم دەڵێت: (المقوین) لێرەدا مەبەست پێی برسیە، لەیسی کوڕی ئەبو سەلیم لە موجاهدەوە دەڵێت: ﴿وَمَتَٰعًا لِّلۡمُقۡوِينَ﴾ بۆ نیشتەجێو ڕێبوار، چونکە هەموو خۆراکێك بەبێ ئاگر چاك ناکرێتو باش نابێت. ئیبنو ئەبی نەجیح دەڵێت: لە موجاهدەوە: ﴿لِّلۡمُقۡوِينَ﴾ واتە: سودمەندان لە هەموو مرۆڤ بە گشتی لە ئاگر.[٣] هەر بەو شێوەیە لە عیکریمەوە بیسراوەو باسکراوەو ئەم تەفسیرە گشتگیرترە لەوانی تر. چونکە دانیشتووو ڕێبوار لە دەوڵەمەندو هەژار هەموو پێویستیان بە ئاگر هەیە بۆ چێشت لێنانو خۆگەرمکردنەوەو ڕۆشناییو چەندەها سودی تر بێجگە لەمانە. هەروەها لە سۆزو بەزەیی خودایە بە مرۆڤ لە بەردو ئاسنی چاکدا ئاگری داناوە کە ڕێبواران دەتوانن لەگەڵ خۆیان هەڵی بگرنو لەناو کەلوپەلی خۆیاندا دایبنێن. هەرکاتێك پێویستیان پێی بوو دەری دێنن هەڵیدەکەنو ئاگری پێ دەکەنەوە بۆ چێشت لێنانو خۆگەرم کردنەوەو گۆشت برژاندن. سودی تری زۆر لێ وەردەگرن لەبەر ئەوەیە ڕێبواری بە تەنها هێناوە. هەرچەندە ئەو ئاگرە گشتگیرەو پێویستی هەموو خەڵکە بە گشتی. خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿فَسَبِّحۡ بِٱسۡمِ رَبِّكَ ٱلۡعَظِيمِ﴾ سا تۆ ناوی پەروەردگاری مەزنی خۆت هەر بە پاکیو دوورە کەمایەتی بێنە. واتە: ئەو خوایەی کە بە توانای خۆی ئەم هەموو شتە جیاوازو دژیەکەی وەدی هێناوە: ئاوی پاکی ساردی سازگارو گەر بیویستایە دەیکردە خوێنی تاڵ وەك دەریا پڕ لە خوێکان. وە ئاگر کە سوتێنەرە وەدی هێناوە بۆ خۆشبەختیو بەختەوەری مەردم لە دنیاداو بۆ سزادانو تۆڵە تۆڵەسەندن لە بەندە تاوانبارەکان لە قیامەتدا.

﴿فَلَآ أُقۡسِمُ بِمَوَٰقِعِ ٱلنُّجُومِ ﴿٧٥﴾ وَإِنَّهُۥ لَقَسَمٞ لَّوۡ تَعۡلَمُونَ عَظِيمٌ ﴿٧٦﴾ إِنَّهُۥ لَقُرۡءَانٞ كَرِيمٞ ﴿٧٧﴾ فِي كِتَٰبٖ مَّكۡنُونٖ ﴿٧٨﴾ لَّا يَمَسُّهُۥٓ إِلَّا ٱلۡمُطَهَّرُونَ ﴿٧٩﴾ تَنزِيلٞ مِّن رَّبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٨٠﴾ أَفَبِهَٰذَا ٱلۡحَدِيثِ أَنتُم مُّدۡهِنُونَ ﴿٨١﴾ وَتَجۡعَلُونَ رِزۡقَكُمۡ أَنَّكُمۡ تُكَذِّبُونَ ﴿٨٢﴾﴾

---

[١] الطبري (١٤٥/٢٣).

[٢] الطبري (١٤٦/٢٣).

[٣] الطبري (١٤٥/٢٣).

**سوێندی خودا لەسەر زۆر مەزنی قورئان**

خوای گەورە سوێند خەتوان دەفەرموویت: ﴿فَلَآ أُقۡسِمُ بِمَوَٰقِعِ ٱلنُّجُومِ﴾ دەسا سوێند بەو شوێنانەی ئەستێرەیان لێ هەڵدێن و ئاوا دەبن. ئەم (لا)یە زیادە نیە کە مانای نەبێت وەك هەندێ لە زانایانی تەفسیر وتوویانە بەڵکو دەهێنرێت لە پێش سوێندەوە کاتێك سوێندی پێ دەخورێت بۆ وەلامدانەوەی قسەیەك کە وتراوە و وانەبووە. وەك ئەو قسەی عائیشە (ڕەزای خوای لێبێت) وتی: (لا والله) واتە: نەخێر سوێند بە خوا هەرگیز دەستی پێغەمبەری خودا(ﷺ) نەکەوتووە لە دەستی هیچ ژنێك.[1] هەر بەم شێوەیە لێرەدا: ﴿فَلَآ أُقۡسِمُ بِمَوَٰقِعِ ٱلنُّجُومِ﴾ دادەنرێت. واتە: نەخێر بەو شێوەیە نیە کە ئێوە واتان دەزانی کە قورئان جادووە یان قسەی فاڵچیە بەڵکو ئەوە قورئانی پیرۆزە. ئیبنو جەریر دەڵێت: هەندێ لە زانایانی زمانی عەرەبی وتوویانە: واتە: نەخێر بەو شێوەیە نیە کە ئێوە دەیڵێن: مەبەست خوانەناسانە، پاشان سوێندەکە دەستی پێکردووە و وتراوە ﴿أُقۡسِمُ﴾.[2] وە دەفەرموویت: ﴿فَلَآ أُقۡسِمُ بِمَوَٰقِعِ ٱلنُّجُومِ﴾ موجاهد دەڵێت: شوێنی ئەستێرەکان لە ئاسمانە. وتراویشە: شوێنی هەڵهاتنی یان ڕۆژهەلاتی ئەستێرەکان.[3] قەتادەو حەسەنیش هەر وایان وتووە. ئیبنو جەریریش هەمان ڕای هەڵبژاردووە.[4] قەتادە دەڵێت: (مواقعها) واتە: شوێنەکانی ئەستێرە.[5] خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿وَإِنَّهُۥ لَقَسَمٌ لَّوۡ تَعۡلَمُونَ عَظِيمٌ﴾ بێگومان ئەگەر بیزانن ئەمە سوێندێکی گەورەیە. واتە: بلە ڕاستی ئەو شوێنەی کە سوێندم پێ خوارد سوێندێکی زۆر گەورەیە ئەگەر بیزانن. ﴿إِنَّهُۥ لَقُرۡءَانٌ كَرِيمٌ﴾ بێگومان ئەمە قورئانی بەڕێزە. واتە: ئەم قورئانەی کە ڕەوانەکراوە بۆ موحەممەد (ﷺ) پەراوێکی زۆر گەورەیە. ﴿فِي كِتَٰبٍ مَّكۡنُونٍ﴾ لەناو کتێبێکی شاراوەدایە. بەڕێزەو لە پەراوێکی بەڕێزدایەو بەڕێزەوە پارێزراوە. ئیبنو جەریر دەڵێت: ئیسماعیلی کوڕی موسا بۆی گێڕامەوە وتی: شورەیك هەواڵی دامێ لە حەکیمەوە کە ئیبنو جەریرە لە سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە ئەمیش لە ئیبنو عەباسەوە. ﴿لَّا يَمَسُّهُۥٓ إِلَّا ٱلۡمُطَهَّرُونَ﴾ غەیری پاکان کەس ناتوانێت دەستی لێبدات. دەڵێت: ئەو

[1] فتح الباري (٨/٥٠٤).
[2] الطبري (٢٣/١٤٧).
[3] الطبري (٢٣/١٤٨).
[4] الطبري (٢٣/١٤٨).
[5] الطبري (٢٣/١٤٨).

پەرانەوەی کە لە ئاسمانەوە.[1] عەوفی دەڵێت: لە ئیبنوعەباسەوە: ﴿لَّا يَمَسُّهُۥٓ إِلَّا ٱلْمُطَهَّرُونَ﴾ واتە: فریشتەکان.[2] ئەنەس و موجاهدو عیکریمەو سەعیدی کوڕی جوبەیرو زەححاکو ئەبو شەعساء جابری کوڕی زەیدو ئەبو نەهیك و سودیو عەبدوڕڕەحمانی کوڕی زەیدی کوڕی ئەسلەمو کەسانی تریش هەر وایان وتووە.[3] ئیبنو جەریر دەڵێت: ئیبنو ئەبو یەعلا بۆی گێڕاینەوە. ئیبنو سەور بۆی گێڕاینەوە. موعەمەر بۆی گێڕاینەوە لە قەتادەوە دەڵێت: ﴿لَّا يَمَسُّهُۥٓ إِلَّا ٱلْمُطَهَّرُونَ﴾ واتە: کەس دەستی لێ نادات لە لای خوای گەورە غەیری پاکان. چونکە لە دنیا ئاگرپەرستی پیس و دووڕووی کردار ناشیرین دەستیان لێ دەدات وە دەڵێت: لە خوێندنەوەی ئیبنو مەسعوددا: ﴿لَّا يَمَسُّهُۥٓ إِلَّا ٱلْمُطَهَّرُونَ﴾.[4] ئەبول عالیە (أبو العالية) دەڵێت: ﴿لَّا يَمَسُّهُۥٓ إِلَّا ٱلْمُطَهَّرُونَ﴾ واتە: ئێوە نا. ئێوە کۆمەڵی تاوانبارانن.[5] ئیبنو زەید دەڵێت: خوانەناسانی قورەیش وایان دەزانی کە شەیتانەکان ئەم قورئانەیان هێناوەتە خوارەوە، خوی مەزنیش هەواڵی داوە کە غەیری پاکان کەس دەستی لێ نادات. وەك دەفەرموێت: ﴿وَمَا تَنَزَّلَتْ بِهِ ٱلشَّيَٰطِينُ ﴿٢١٠﴾ وَمَا يَنۢبَغِى لَهُمْ وَمَا يَسْتَطِيعُونَ ﴿٢١١﴾ إِنَّهُمْ عَنِ ٱلسَّمْعِ لَمَعْزُولُونَ﴾[6] واتە: شەیتانەکان ئەو (قورئانە)یان نەهێناوەتە خوارەوە، نە شیاوی ئەوەن و نە دەشتوانن، بە ڕاستی شەیتانەکان لە گوێگرتنی هەواڵی ئاسمان بەرگری کراون.[7] ئەم قسەیە قسەیەکی چاکەو لە قسەکانی پێشوو دەرناچێت و وەك ئەوانەی پێشەوەیە. خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿تَنزِيلٌ مِّن رَّبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾ لە داهێنەری دنیاوە ناردراوە. واتە: ئەم قورئانە هاتووەتە خوارەوە لە لایەن خودای پەروەردگاری جیهان و جیهانیانەوە. بەو شێوەیە نیە کە خوانەناسان دەڵێن. جادووە یان قسەی فاڵچیە یان شیعرە. بەڵکو ڕاستیەکە هیچ گومانی تێدا نیە بێجگە لەم قورئانە هیچ شتێکی ڕاست و بەسوود نیە. وە دەفەرموێت: ﴿أَفَبِهَٰذَا ٱلْحَدِيثِ أَنتُم مُّدْهِنُونَ﴾ ئاخۆ ئێوە بەم قسە کەمەتان دێت؟

---

[1] الطبري (٢٣/١٤٩).

[2] الطبري (٢٣/١٥٠).

[3] الطبري (٢٣/١٥٠/١٥١)، القرطبي (١٧/٢٣٥).

[4] الطبري (٢٣/١٥٢).

[5] الطبري (٢٣/١٥١).

[6] الشعراء (٢١٠-٢١٢).

[7] الطبري (٢٣/١٤٩) عن الضحاك.

عەوفی دەڵێت: لە ئیبنو عەباسەوە، واتە: باوەڕی پێ ناکەن‌و بە ڕاستی نازانن.[1] زەحاک‌و ئەبو حەزرە سودیش وایان وتووە.[2] موجاهد دەڵێت: ﴿مُّدۡهِنُونَ﴾ واتـە: دەتانـەوێت لێیـان نزیـك ببنـەوەو بـڕۆن بـە لایانەوە.[3] ﴿وَتَجۡعَلُونَ رِزۡقَكُمۡ أَنَّكُمۡ تُكَذِّبُونَ﴾ دەیکەنە بژێوی خۆتان. کە باوەڕی پێ ناهێنن. هەندێکیان وتیان: ﴿وَتَجۡعَلُونَ رِزۡقَكُمۡ﴾ واتە: شوکرانە بژێویەکەتان ئەوەیە کە بـاوەڕی پـێ نـاهێنن. واتـە لـە بـاتی شـوکرانەبژێری باوەڕتـان پێـی نیـە. ڕیوایـەت کـراوە لـە عـەلی‌و ئیبنوعەباسـەوە کـە ئـەم ئایەتـەیان خوێندووەتەوە: ﴿وَتَجۡعَلُونَ رِزۡقَكُمۡ أَنَّكُمۡ تُكَذِّبُونَ﴾.[4] ئیبنو جەریر دەڵێـت: موحەممـەدی کـوڕی بەشـشار بۆی گێڕاینەوە لە ئەبو بەشیرەوە لە سەعیدی کوڕی جوبـەیرەوە لـە ئیبنوعەباسـەوە وتوویـەتی: هـیچ گەلێك هەرگیز بارانی بۆ نەباریوە مەگین هەندێکیان بـێ دیـن بـوون دەڵـێن: بارانمـان بـۆ بـاری بـەهۆی ئەسـتێرەوە ئـەم ئایەتـەی خوێنـدەوە: ﴿وَتَجۡعَلُونَ رِزۡقَكُمۡ أَنَّكُمۡ تُكَذِّبُونَ﴾.[5] ئـەم ئیـسنادە ڕاسـتە هـەتا ئیبنوعەباس. مالك دەڵێت لە (الموطأ) لە سالحی کوڕی کەیسانەوە لـە عەبەیـدوڵڵای کـوڕی عەبـدوڵڵای کوڕی عوتبەی کوڕی مەسعودی کوڕی زەیدی کوڕی خالدی جوهەنیـەوە وتـی: پێغەمبـەری خـودا(ﷺ) نوێژی بەیانی بۆ کردین لە حودەیبیە لەو شەوەدا باران باریبو، کاتێك نوێژەکەی تەواو کرد ڕووی کردە خەڵکەکـەو فـەرمووی: (ئـاخۆ دەزانـن پـەروەردگارتان چـی فـەرمووە؟). وتیـان خـوداو پێغەمبـەری خـودا(ﷺ) دەزانـن. فـەرمووی: (فەرموویـەتی بـەیانی هەنـدێ لـە بەنـدەکانم خـاوەن بـاوەڕن بـە مـن هەندێکی تریان باوەڕیان بە من نیە. ئەوانەی کە وتیان بارانمان بۆ باری بە ڕێـزۆ بـەزەیی خـودا ئەوانـە خاوەن باوەڕن. ئەوەیش وتی بارانمان بۆ باری بە هۆی ئەستێرەوە ئـەو کەسـە بـێ دینـەو بـاوەڕی بـە ئەستێرەکان هەیە).[6] بوخاری‌و موسلیم لە هەردوو سەحیحەکەیاندا هێناویانـەو ئـەبو داودو نەسـائیش ڕیوایـەتیان کـردووە هـەموویان لـە فەرموودەکـەی مالکـەوە بـەو شێوەیە.[7] قـەتادە دەڵێـت: حەسـەن وتوویەتی: ئەو خەڵکە شـتێکی خراپیـان بـۆ خۆیـان هەڵبـژاردووە، لـەباتی شـوکرانەبژێریان بـۆ کتێبـی

---

[1] الطبري (٢٣/١٥٣).

[2] الطبري (٢٣/١٥٣).

[3] الطبري (٢٣/١٥٣).

[4] الطبري (٢٣/١٥٤/١٥٥).

[5] الطبري (٢٣/١٥٤).

[6] الموطأ (١/١٩٢)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[7] فتح الباري (٢/٣٨٨)، مسلم (١/٨٣)، أبو داود (٤/٢٢٧)، النسائي (٣/١٦٥).

باوەڕی پێ ناهێنن، مانای قسەکەی حەسەن: بەشی خۆتان لە کتێبی خودا ئەوەیە کە باوەڕی پێ ناهێنن. بۆیە خوای گەورە لە پێش ئەم ئایەتەوە فەرموویەتی: ﴿أَفَبِهَٰذَا ٱلۡحَدِيثِ أَنتُم مُّدۡهِنُونَ﴾.

﴿فَلَوۡلَآ إِذَا بَلَغَتِ ٱلۡحُلۡقُومَ ﴿٨٣﴾ وَأَنتُمۡ حِينَئِذٖ تَنظُرُونَ ﴿٨٤﴾ وَنَحۡنُ أَقۡرَبُ إِلَيۡهِ مِنكُمۡ وَلَٰكِن لَّا تُبۡصِرُونَ ﴿٨٥﴾ فَلَوۡلَآ إِن كُنتُمۡ غَيۡرَ مَدِينِينَ ﴿٨٦﴾ تَرۡجِعُونَهَآ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ﴿٨٧﴾﴾

## نەتوانایی گەڕانەوەی گیان (روح) لە قوڕقوڕاگە لە کاتی مردندا بەڵگەیە لەسەر لێپرسینەوە

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿فَلَوۡلَآ إِذَا بَلَغَتِ ٱلۡحُلۡقُومَ﴾ ئەدی ساتێك مردن قوڕقوڕاگەی گرتن. واتە: کاتێ گیان گەیشتە قوڕقوڕاگە لە کاتی مردندا. وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿كَلَّآ إِذَا بَلَغَتِ ٱلتَّرَاقِيَ ﴿٢٦﴾ وَقِيلَ مَنۡۜ رَاقٖ ﴿٢٧﴾ وَظَنَّ أَنَّهُ ٱلۡفِرَاقُ ﴿٢٨﴾ وَٱلۡتَفَّتِ ٱلسَّاقُ بِٱلسَّاقِ ﴿٢٩﴾ إِلَىٰ رَبِّكَ يَوۡمَئِذٍ ٱلۡمَسَاقُ﴾[1] واتە: پەشیمان ببنەوە ! کاتێك کە گیان گەیشتە قوڕقوڕاگە (گەروو)، جا دەوترێت: کێیە چارەکەر، وە (نەخۆشەکە) دڵنیایە ئەوە (ی تووشی بووە مردنو) جیابوونەوەیە، وە قاچو لاقی لوت بەیەکدا ئاڵا، ڕاپێچ کردن لەو ڕۆژەدا بۆ لای پەروەردگارتە. بۆیە لێرەشدا فەرموویەتی: ﴿وَأَنتُمۡ حِينَئِذٖ تَنظُرُونَ﴾ ئێوەش چاوەڕوانی مەرگن. واتە: بۆ ئەو کەسەی خەریکە گیانی دەردەچێتو ئەو ناڕەحەتیەی بەسەر دێت لە کاتی مردندا. خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَنَحۡنُ أَقۡرَبُ إِلَيۡهِ مِنكُمۡ وَلَٰكِن لَّا تُبۡصِرُونَ﴾ ئێمە ئەوسا لە ئێوە زۆر لێی نزیکترین، بەڵام ئێوە هەر نابینن. واتە: فریشتەکانمان، ﴿وَلَٰكِن لَّا تُبۡصِرُونَ﴾ بەڵام ئێوە فریشتەکانمان نابینن. وەك خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿وَهُوَ ٱلۡقَاهِرُ فَوۡقَ عِبَادِهِۦۖ وَيُرۡسِلُ عَلَيۡكُمۡ حَفَظَةً حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَ أَحَدَكُمُ ٱلۡمَوۡتُ تَوَفَّتۡهُ رُسُلُنَا وَهُمۡ لَا يُفَرِّطُونَ ﴿٦١﴾ ثُمَّ رُدُّوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ مَوۡلَىٰهُمُ ٱلۡحَقِّۚ أَلَا لَهُ ٱلۡحُكۡمُ وَهُوَ أَسۡرَعُ ٱلۡحَٰسِبِينَ ﴿٦٢﴾﴾[2] واتە: ئەو (خوا) زاڵو دەسەڵاتدارە بەسەر بەندەکانیداو فریشتانێکتان بۆ دەنێرێت (کە چاودێرو پارێزەرو نووسەری کردەوەکانتانن) تا کاتی مردنی یەکێکتان دێت نێردراوەکانمان گیانی دەکێشن کە هیچ سستیو کەمتەرخەمیەك ناکەن (لە کارەکانیادا)، پاشان دەگەڕێنرێنەوە بۆ لای خودا کە سەروەری ڕاستەقینەیانە ئاگادار بن فەرمانڕەواییو بڕیار هەر بۆ ئەوە هەر خوایشە لێپرسینەوەی خێراترە لە هەموو. وە دەفەرمووێت: ﴿فَلَوۡلَآ إِن كُنتُمۡ غَيۡرَ مَدِينِينَ﴾ ئەوسا ئەگەر پێتان وایە ناکەونە بەر پرسینەوە. ﴿تَرۡجِعُونَهَآ إِن كُنتُمۡ

---

[1] القيامة (٢٦-٣٠).

[2] الانعام (٦١-٦٢).

صَٰدِقِينَ﴾ ئەگەر لاتان وایە ڕاستن. لە مردن ڕزگاری بکەن. واتـە: ئەگـەر وادەزانـن ڕاسـت دەکـەن ئـەو کەسە لە مردن ڕزگار بکەن ئەو گیانە بگێڕنەوە شوێنی پێشووی خۆی لـەو جەسـتەیەدا. ئەگـەر پێتـان وایە ناکەونە بەر پرسینەوە. سەعیدی کوڕی جوبەیرو حەسەنی بەسری وتوویانـە: ﴿فَلَوْلَآ إِن كُنتُمْ غَيْرَ مَدِينِينَ﴾ بە ڕاستی نازانن کە پرستان لێ دەکرێتو زیندوو دەکرێنەوەو تۆڵـەتان لێ دەسـێنرێت. دەیسا ئەو گیانە بگێڕنەوە بۆ ئەو جەسەدە. موجاهد دەڵێت: ﴿غَيْرَ مَدِينِينَ﴾ بێگومان نینو بە ڕاستی نازانن.

﴿فَأَمَّآ إِن كَانَ مِنَ ٱلْمُقَرَّبِينَ ﴿٨٨﴾ فَرَوْحٌ وَرَيْحَانٌ وَجَنَّتُ نَعِيمٍ ﴿٨٩﴾ وَأَمَّآ إِن كَانَ مِنْ أَصْحَٰبِ ٱلْيَمِينِ ﴿٩٠﴾ فَسَلَٰمٌ لَّكَ مِنْ أَصْحَٰبِ ٱلْيَمِينِ ﴿٩١﴾ وَأَمَّآ إِن كَانَ مِنَ ٱلْمُكَذِّبِينَ ٱلضَّآلِّينَ ﴿٩٢﴾ فَنُزُلٌ مِّنْ حَمِيمٍ ﴿٩٣﴾ وَتَصْلِيَةُ جَحِيمٍ ﴿٩٤﴾ إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ حَقُّ ٱلْيَقِينِ ﴿٩٥﴾ فَسَبِّحْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلْعَظِيمِ ﴿٩٦﴾﴾

**ئەحواڵی مەردم لە کاتی گیان دەرچووندا و پاشەڕۆژی هەموو دەستەیەك لەو تیرانە**

ئەم سێ جۆرە ژیانە ژیانی مەردمە لە کاتی گیـان دەرچوونیاندا. یـان لـە نزیکەکانـە یـان لـە دوای ئەوانەوەیـە کـە بریتیـە لـە دەستەڕاسـتەکان یـان لـەو کەسـانەن کـە باوەڕیـان نـەهێناوە بـە هـەقو گومڕابوونو لە ڕاستەڕێ لایانداوەو بێ ئاگان لە فەرمانی خودا بۆیە خوای گـەورە فەرموویـەتی: ﴿فَأَمَّآ إِن كَانَ مِنَ ٱلْمُقَرَّبِينَ﴾ بەڵام ئەوەی نزیکی ئێمەیەو دەمرێت. واتە: ئەوانەی دەمـرن لـە نزیکـەکان کـاری چاکیان کردووەو وازیان لە کارە خراپو مەکروهو هەنـدێ لـە شـتە ڕەواکـانیش هێنـاوە. ﴿فَرَوْحٌ وَرَيْحَانٌ وَجَنَّتُ نَعِيمٍ﴾ لە پاشدا دەحەسێتەوەو دەچێتە بەهەشـتی پڕ خۆشـی. واتـە ئەوانـە وان لـە خۆشـیو کامەرانیـدا. فریـشتەکان لـە کـاتی مردنـدا مـژدەیان دەدەنـێ بـەو خۆشـیەو وەك لـە پێـشەوە لـە فەرموودەکەی بەڕائدا باسکرا کە فریشتەکانی ڕەحمەت دەڵێن: ئەی گیانی پاك لە جەستەی پاکدا کە ئاوەدانت کردووەتەوە دەرچۆ بڕۆ بۆ شوێنی بەختەوەریو خۆشیو بۆ لای پەروەرێنێك کە تووڕە نیە.[1] عەلی کوڕی ئەبو تەلحە دەڵێت: لـە ئیبنـو عەباسـەوە ﴿فَرَوْحٌ﴾ دەحەسـێنەوە، ﴿وَرَيْحَانٌ﴾ دڵخۆشـن.[2] موجاهدیش هەر وای وتووە: حەسانەوە.[3] ئەبو حەزرە دەڵێت: حەسانەوە لـە دنیـادا. سـەعیدی کـوڕی جوبەیرو سودی دەڵێن: (الروح) واتە: خۆشی. موجاهد دەڵێت: ﴿فَرَوْحٌ وَرَيْحَانٌ﴾ باغو خۆشـگوزەرانی.

---

[1] الطوال (٢٣٨)، لە سورەتی (ابراهیم) لە ئایەتی (٢٧)دا پلەکەی دیاری کراوە.

[2] الطبري (٢٣/١٥٩).

[3] الطبري (٢٣/١٦٠).

قەتادە دەڵێت: ﴿فَرَوۡحٞ﴾ بەزەیی. ئیبنوعەباس‌و موجاهدو سەعیدی کوڕی جوبەیر وتوویانە: ﴿وَرَيۡحَانٞ﴾ بژێوی ئەم قسانە هەمووی نزیکن لە یەکەوەو ڕاستن چونکە هەر کەسێك مردو نزیك بوو لە خوداوە ئەمانەی هەموو هەیە لە بەزەیی خوداو لە خۆشیو بەختەوەریو خۆشگوزەرانیو بژێوی زۆر چاكو جوان، ﴿وَجَنَّتُ نَعِيمٖ﴾ ئەبول عالیە دەڵێت: (هیچ گیانێك جیا نابێتەوە لە جەستەی خۆی لە نزیکەکان هەتا چڵێك لە ڕەیحانی بەهەشت دێننو گیانی لە ناویدا دەکێشن).[1] موحەممەدی کوڕی کەعب دەڵێت: هیچ کەسێك لە مەردم نامرێت هەتا دەزانێت لە خەڵکی بەهەشتە یان لە خەڵکی ئاگرە. لە فەرموودەی سەحیحدا هاتووە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (گیانی شەهیدەکان وان لە چێڵانی باڵندە سەوزەکاندا دەگەڕێن لەناو باخچەکانی بەهەشتدا بە ئارەزووی خۆیان هەر کاتێك بیانەوێت. پاشان دەچنەوە بۆ ناو ئەو قەنادیلانەی کە هەڵواسراوە لە بەهەشتدا).[2] ئیمامی ئەحمەدیش ڕیوایەتی کردووە لە عەتای کوڕی سائبەوە دەڵێت: یەکەم ڕۆژ بوو عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ئەبو لەیلام تیا ناسیبوو چاوم پێی کەوت پیاوێکی سەرو ریش سپی بوو سواری کەرێك بوو شوێنی جەنازەیەك کەوتبوو (لەگەڵ مردوویەکدا دەچوو بۆ گۆڕستان) دەیوت: فلانو فلانەکەس بۆیان گێڕامەوە کە بیستبوویان لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) کە دەیفەرموو: (کەسێك پێی خۆش بووبێت بگاتە خزمەتی خودای گەورە. خودایش پێی خۆش بووە پێی بگات، وە هەر کەسیش پێی ناخۆش بووبێت بگاتە خزمەتی خودا، خودایش پێی ناخۆش بووە پێی بگات). خەڵکی هاتن بە چۆکداو دەگریان. پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (بۆچی دەگرین؟)، یان چیە دەتانگرێنێت، وتیان: ئێمە حەزمان لە مردن نیە، فەرمووی: (ئەوە بەو شێوەیە نیە، بەڵکو ئەو کاتەیە کە گیان دەردەچێت (کاتی مردنە)). ﴿فَأَمَّآ إِن كَانَ مِنَ ٱلۡمُقَرَّبِينَ ۝٨٨ فَرَوۡحٞ وَرَيۡحَانٞ وَجَنَّتُ نَعِيمٖ﴾ کاتێك مژدەی بە مردن پێ دراوە پێی خۆش بووە بچێتە خزمەت خودای گەورە. خوای گەورەیش زیاتر لەو کەسە پێی خۆش بووە بچێتە لای. ﴿وَأَمَّآ إِن كَانَ مِنَ ٱلۡمُكَذِّبِينَ ٱلضَّآلِّينَ ۝٩٢ فَنُزُلٞ مِّنۡ حَمِيمٖ ۝٩٣ وَتَصۡلِيَةُ جَحِيمٍ﴾ کاتێك مژدەی دەدرێتێ بە گیان دەرچوون. پێی ناخۆشە بگاتە خزمەتی خوای گەورە خوای گەورەیش پێی ناخۆشە بچێتە لای).[3] هەر بەم شێوەیە ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە. وە لە فەرموودەی سەحیحیشدا هاتووە لە عائیشەوە

---

[1] الطبري (٢٣/١٦٠).

[2] مسلم (٣/١٥٠٢).

[3] احمد (٤/٢٥٩)، فەرموودەیەکی سەحیحە بەبێ باسکردنی ئایەتەکان.

(ڕەزای خوای لێبێت) بەم مانایە.[1] خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَأَمَّآ إِن كَانَ مِنَ أَصۡحَٰبِ ٱلۡيَمِينِ﴾ ئەگەریش لەو کەسانە بوو لەگەڵ دەستەڕاستاندا. واتە: ئەگەر کاتێك ئەو کەسانە لە تیرەی دەستەڕاستان بوون. ﴿فَسَلَٰمٞ لَّكَ مِنۡ أَصۡحَٰبِ ٱلۡيَمِينِ﴾دروود بۆ تۆ لەو کەسانەی دەستەڕاستن. واتە: فریشتەکان مژدەیان دەدەنێ دەڵێت بە یەکێکیان سڵاوت لێبێت. واتە: مەترسە تۆ بۆ شوێنێکی هێمن‌و بێ ترس دەچی تۆ لە تیرەی دەستەڕاستانی. وەك عیکریمە دەڵێت: فریشتەکان سڵاویان لێ دەکەن‌و هەواڵیان دەدەنێ‌و لە تیرەی دەستەڕاستن. ئەمەیش مانایەکی چاکە. ئەوە وەك ئەم ئایەتە وایە کە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ قَالُواْ رَبُّنَا ٱللَّهُ ثُمَّ ٱسۡتَقَٰمُواْ تَتَنَزَّلُ عَلَيۡهِمُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ أَلَّا تَخَافُواْ وَلَا تَحۡزَنُواْ وَأَبۡشِرُواْ بِٱلۡجَنَّةِ ٱلَّتِي كُنتُمۡ تُوعَدُونَ ﴿٣٠﴾ نَحۡنُ أَوۡلِيَآؤُكُمۡ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَفِي ٱلۡأٓخِرَةِۖ وَلَكُمۡ فِيهَا مَا تَشۡتَهِيٓ أَنفُسُكُمۡ وَلَكُمۡ فِيهَا مَا تَدَّعُونَ ﴿٣١﴾ نُزُلٗا مِّنۡ غَفُورٖ رَّحِيمٖ﴾[2] واتە: بە ڕاستی ئەوانەی وتیان خوا پەروەردگارمانە‌و لە پاشان ڕاست (لەسەر ئایین) بەردەوام بوون فریشتەکان پۆل پۆل دێنە لایان (کاتی مردن یان زیندووبوونەوە) (پێیان دەڵێن) مەترسن‌و خەفەت مەخۆن‌و مژدەبێت لێتان ئەو بەهەشتەی کە بەڵێنتان پێ درابوو، ئێمە لە ژیانی دنیاو لە ڕۆژی دوایدا دۆستی ئێوەین‌و لەو (بەهەشتەدا) هەرچی حەزی لێ بکەی بۆتان ئامادەیە‌و هەرچی داوا بکەن لەوێدا لە خزمەتتاندایە، ڕێزلێنان‌و میوانداریە لە لایەن خودای لێبوردەی میهرەبانەوە. بوخاری دەڵێت: ﴿فَسَلَٰمٞ لَّكَ﴾ واتە: بۆت دەردەکەوێت‌و ڕوونە کە تۆ لە تیرەی دەستەی ڕاستی. (؟؟؟) لابراوە ماناکەی ماوەتەوە وەك دەڵێت: (أنت مصدق مسافر) واتە: تۆ بڕوات بە پێ کراوە ڕێبواری. هەرچەندە سەفەرێکی زۆر کەمیش بووبێت. ئەگەر ئەو کەسە لە پێشدا وتی من ڕێبوارم با کەمیش ڕۆیشتبێت. یان وەك پاڕانەوە بۆی. وەك تۆ دەڵێی: (فيا لك من الرجال)،ئەگەر سەلامەکە مەرفوع بکەی. ئەوە لە شێوەی دوعاکردنە.[3] ئەمە باسە ئیبنو جەریر گێڕاویەتیەوە بەم شێوەیە لە هەندێ زانای زمان‌و ئارەزوومەندانی زمانی عەرەبی والله أعلم.[4] خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَأَمَّآ إِن كَانَ مِنَ ٱلۡمُكَذِّبِينَ ٱلضَّآلِّينَ﴾ بەڵام ئەگەر لەوانە بوو کە باوەڕیان نەهێناوە‌و گومڕابوون. ﴿فَنُزُلٞ مِّنۡ حَمِيمٖ﴾ لە ئاوەکوڵا

---

[1] فتح الباري (١١/٣٦٤)، مسلم (٤/٢٠٦٥).

[2] فصلت (٣٠ـ٣٢).

[3] البخاري، تفسير سورة الواقعة.

[4] الطبري (٢٣/١٦٢).

میوانن. ﴿وَتَصۡلِيَةُ جَحِيمٍ﴾ دەشیبەنە دۆزەخەوە. واتە: ئەگەر ئەوە لەو کەسانە بوو کە گیانی دەردەچوو (دەمرد) کە باوەڕیان نەهێناوەو گومڕا بوونو لە ڕاستەڕێ لایاندابوو ﴿فَنُزُلٌ﴾ میوانداریان لێ دەکرێت ﴿مِّنۡ حَمِيمٍ﴾ لە ئاوی کوڵاو کە پێستو ورگو گەدەیان پێ دەتوێنرێتەوە، ﴿وَتَصۡلِيَةُ جَحِيمٍ﴾ واتە: بڕیاری ئاگرێکی بۆ دەدرێت دەیخەنە ناوی لە هەموو لایەکەوە دایدەپۆشێت. خوای مەزن فەرموویەتی: ﴿إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ حَقُّ ٱلۡيَقِينِ﴾ بێگومان ڕاستە هەر ئەمەیە. واتە: ئەم هەواڵە ڕاستەو هیچ گومانی تێدا نیەو کەس بۆی نیە لێی لابدات. ﴿فَسَبِّحۡ بِٱسۡمِ رَبِّكَ ٱلۡعَظِيمِ﴾ سا تۆ ناوی پەروەردگاری مەزنی خۆت هەر بە پاکیو دووره کەمایەس بێنە. جابر دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (هەر کەسێك وتی: سبحان الله العظیم وبحمده لە بەهەشتدا درەختێکی دارخورمای بۆ دەڕوێنێت). تیرمیزیو نەسائیش ڕیوایەتیان کردووە. تیرمیزی دەڵێت: حەسەنی غەریبە[1].بوخاریش ڕیوایەتی کردووە لە کۆتایی کتێبەکەیدا لە ئەبو هورەیرەوە دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (دوو وتە لەسەر زمان سوکنو لە تەرازوودا قورسن، خۆشەویستن لە لای ڕەحمان: (سبحان الله وبحمده سبحان الله العظیم).[2] زانایانی تری فەرموودە ڕیوایەتیان کردووە بێجگە لە ئەبو داود[3].

## تەفسیری سورەتی (الحدید)

## لە مەدینەدا هاتووەتە خوارەوە

### ڕێزی سورەتی (الحدید)

ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە عیربازی کوڕی ساریەوە بۆی باس کردوون کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) مسەحەکان دەخوێند پێش ئەوەی پاڵ بکەوێت بۆ خەوتنو دەیفەرموو: (ئایەتێکیان تێدایە چاکترە لە هەزار ئایەت)[4]. هەر بەو شێوەیە ئەبو داودو تیرمیزیو نەسائی ڕیوایەتیان کردووە لە چەند ڕێگاوە لە کەسانی ترەوە. تیرمیزی دەڵێت چاكو غەریبە[5]؟ئەم ئایەتەی هێمای بۆ کراوە لەم فەرموودەیەدا والله أعلم ئەم ئایەتەیە کە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿هُوَ ٱلۡأَوَّلُ وَٱلۡأٓخِرُ وَٱلظَّٰهِرُ وَٱلۡبَاطِنُۖ﴾

---

[1] تحفة الأحوذي (٩/٤٣٤)، النسائي في الكبرى (٦/٢٠٧)، فەرموودەیەکی حەسەنە.

[2] فتح الباري (١٣/٥٤٧).

[3] مسلم (٤/٢٠٧٢)، تحفة الأحوذي (٩/٤٣٢)، النسائي في الكبرى (٦/٢٠٧)، ابن ماجه (٢/١٢٥١).

[4] احمد (٤/١٢٨)، فەرموودەیەکی لاوازە.

[5] ابو داود (٥/٣٠٤)، تحفة الأحوذي (٨/٢٣٨/٩٣٥١)، لاوازە.

﴿وَهُوَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ﴾ کە بەم زووانە دێتو باسی دەکەین بە یارمەتی خوای گەورە، کە هەر ئەو پشتو پەنایەو تەنها ئەومان بەسەو چاکترین وەکیلە.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

﴿سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ ﴿١﴾ لَهُ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ يُحْيِي وَيُمِيتُ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴿٢﴾ هُوَ الْأَوَّلُ وَالْآخِرُ وَالظَّاهِرُ وَالْبَاطِنُ وَهُوَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ ﴿٣﴾﴾

**هەموو بوونەوەر پەسەندی خودا دەدەنو باسی هەندێ لە سیفەتەکانی**

خوای گەورە هەواڵمان دەداتێ کە هەرچی لە ئاسمانەکانو زەمیندا هەیە هەمووی پەسنی خودا دەدەن. لە گیاندارو لە بێگیانو لە ڕووەك وەك لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿تُسَبِّحُ لَهُ السَّمَاوَاتُ السَّبْعُ وَالْأَرْضُ وَمَن فِيهِنَّ وَإِن مِّن شَيْءٍ إِلَّا يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ وَلَٰكِن لَّا تَفْقَهُونَ تَسْبِيحَهُمْ إِنَّهُ كَانَ حَلِيمًا غَفُورًا﴾[1] واتە: ستایشی خوا دەکەن هەر حەوت ئاسمانەکانو زەویو هەرچی لەناویاندایەو هیچ شتێك نیە بە سوپاسی ئەو ستایش نەکات بەڵام ئێوە تێ ناگەن لە تەسبیحاتەکەیان بە ڕاستی خوا هەمیشە پەلە نەکەری لێبوردەیە. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ﴾ هەرچی هەیە لە ئاسمانەکانو زەمین، گشتی پەسنی خوا دەدەن ئەویش خاوەن دەسەڵاتی لە کارزانە. ﴿وَهُوَ الْعَزِيزُ﴾ هەموو شتێك گوێڕایەڵی ئەوە (بەرفەرمانی ئەوە). ﴿الْحَكِيمُ﴾ کارزانە لە دروست کردنیداو لە فەرمانو دانانی بەرنامەیداو زیندوو دەکاتەوەو دەمرێنێت. دەبەخشێت بە هەر کەسێك مەیلی لێبێتو بیەوێت. وەك دەفەرموێت: ﴿لَهُ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ يُحْيِي وَيُمِيتُ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ ئەو ئاسمانانەو زەمینە هەموو بەرفەرمانی ئەون. زیندوو دەکاتەوەو دەشمرێنێتو لەسەر هەموو شت توانایە. هەر ئەوە خاوەن شتو فەرمانڕەوا زیندوو دەکاتەوەو دەمرێنێت بە مەیلی خۆی دەبەخشێت، ﴿وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ هەرچی مەیلی لێبێت دەبێتو هەرچیش مەیلی نەبێت نابێت. وە دەفەرموێت: ﴿هُوَ الْأَوَّلُ وَالْآخِرُ وَالظَّاهِرُ وَالْبَاطِنُ وَهُوَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ﴾ پێشوو ئەوەو دوایی ئەوەو لەبەرچاوەو نادیارەو لە هەموو شت ئاگادارە. ئەم ئایەتەیە کە ئیشارەتی بۆ کرا لە فەرموودەکەی عیربازی کوڕی ساریەدا کە لە هەزار ئایەت بەڕێزترە. ئەبو داود ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو زومەیلەوە دەڵێت: پرسیارم کرد لە ئیبنو عەباس پێم وت: شتێك لەناو دڵمدا هەست پێ دەکەم؟ وتی: ئەو شتە

[1] الاسراء (٤٤).

چیە؟ وتم: بە خودا بە دەممدا نایەت وتـی: ئیبنـو عـەباس پێـی وتم: ئـاخۆ شـتێکە لـە گومانەوەیە؟ دەڵێت: ئیبنوعەباس پێکەنی‌و وتی: هیچ کەس لەو گومانە ڕزگاری نەبووە. هـەتا خـودا ئـەم ئایەتـەی نـاردە خـوارەوە: ﴿فَإِن كُنتَ فِي شَكٍّ مِّمَّآ أَنزَلْنَآ إِلَيْكَ فَسْـَٔلِ ٱلَّذِينَ يَقْرَءُونَ ٱلْكِتَٰبَ مِن قَبْلِكَ ۚ لَقَدْ جَآءَكَ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ﴾[1] واتە: جا ئەگەر تۆ لە گوماندای لەوەی کە ناردوومانەتە خوارەوە بۆت ئـەوە پرسیار لەوانە بکە کە کتێبی ئاسمانی شارەزان‌و دەیخوێننەوە لە پێش تۆ سوێند بـە خـوا بـە ڕاسـتی بۆت هاتووە هەق‌و ڕاستی لە پەروەردگارتەوە. دەڵێت: پاشان پێی وتم: هەر کاتێك شـتێکت لـە دڵتـدا بینی‌و هەستت پێ کرد بڵـێ: ﴿هُوَ ٱلْأَوَّلُ وَٱلْـَٔاخِرُ وَٱلظَّٰهِرُ وَٱلْبَاطِنُ ۖ وَهُوَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ﴾.[2] جیاوازیـەکی زۆر هەیە لە نێوان زانایانی تەفسیردا لە بۆچوون‌و قسەکانیاندا کـە زیـاتر لـە (١٠)دە ڕاوبۆچـوونە. بوخـاری دەڵێت: یەحیا دەڵێت: زانیاری خودا لەسەر هەموو شتێك دیارە‌و لەبەرچاوە‌و زانیـاریش لەسـەر هـەموو شتێك نادیارە‌و نابینرێت.[3] شێخ حافیزی مەزی وتوویەتی: ئەم یەحیایە کوڕی زیادی فەڕڕایە کتێبێکـی هەیـە نـاوی نـاوە مـەعانی قورئـان لـەو بارەیـەوە فـەرموودەی زۆر هـاتووە. لـەو فەرموودانـە، ئـەم فەرموودەیەی ئیمامی ئەحمەدە ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو هورەیرەوە، کـە پێغەمبـەری خـودا(ﷺ) لـە کاتی خەوتندا دوعای دەکرد دەیفـەرموو: (ئـەی خودایـە پـەروەرینی حـەوت ئاسمانەکـە، پـەروەرینی عەرشی مەزن، پەروەرینی ئێمە‌و پەروەرینی هەموو شتێك، ڕەوانەکەری تەورات‌و ئینجیل‌و قورئان، تـۆ دانەوێڵە‌و دەنکە خورما لەت دەکەی (فالق الحب والنوی) بێجگە لـە تـۆ هـیچ خودایـە نیـە، پـەنات پـێ دەگرم لە زیـانلا هـەموو شـتێك کـە تـۆ ڕایدەکێشی بـە پێـشی سـەردا، پێـشوو تـۆی‌و هـیچ شـتێك لـە پێشتەوە نیە‌و دوایی تۆی دوای تۆ هیچ شتێك نیە، دیار تۆی هیچ شتێك لە سەرتەوە نیە، نادیـار تـۆی هیچ شتێك لە خوارتەوە نیە. قەرزەکانمان بۆ بدەرەوە، بـێ نیازمـان بکـە لـە هـەژاری).[4] موسلیمیش ڕیوایەتی کردووە لە سـەحیحەکەیدا لـە سـەهلەوە دەڵێت: ئـەبو سـاڵح فـەرمانی پـێ دەکردین کاتێك یـەکێکمان ویـستی بخـەوێت لەسـەر لای ڕاسـتی پاڵکـەوێت‌و پاشـان بڵـێ: ئـەی خودایـە پـەروەرێنی ئاسمانەکان‌و پەروەرێنی زەمین‌و پەروەرێنی عەرشی مەزن، پەروەرێنمان‌و پـەروەرێنی هـەموو شـتێك، لەتکەری دانەوێڵە‌و دەنکە خورما، ڕەوانەکەری تەورات‌و ئینجیل‌و قورئان، پەنا بە تۆ دەگرم لـە زیـانی هەموو خاوەن زیانێك کە تۆ بە پێشی سەردا ڕایدەکێشیت. ئـەی خودایـە پێـشوو تـۆی هـیچ کـەس لـە

---

[1] یونس (٩٤).

[2] ابو داود (٣٣٥/٥).

[3] فتح الباري (٣٧٤/١٣)، ئەم فەرموودەیە سەنەدەکانی سەحیحە.

[4] احمد (٤٠٤/٢).

پێشتەوە نیە، دوایی تۆی دوای تۆ هیچ شتێك نیە. دیار تۆی هیچ كەس لە سەرتەوە نیـە، نادیـار تـۆی هیچ كەس لە خوارتەوە نیە. قەرزەكانمان بۆ بدەرەوە، بێ نیازمان بكە لـە هـەژاری، ئـەم فـەرموودەی ڕیوایەت كردووە لە ئەبو هورەیرەوە ئەمیش لە پێغەمبەرەوە(ﷺ)[١].

﴿هُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ ۚ يَعْلَمُ مَا يَلِجُ فِى ٱلْأَرْضِ وَمَا يَخْرُجُ مِنْهَا وَمَا يَنزِلُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ وَمَا يَعْرُجُ فِيهَا ۖ وَهُوَ مَعَكُمْ أَيْنَ مَا كُنتُمْ ۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿٤﴾ لَّهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ وَإِلَى ٱللَّهِ تُرْجَعُ ٱلْأُمُورُ ﴿٥﴾ يُولِجُ ٱلَّيْلَ فِى ٱلنَّهَارِ وَيُولِجُ ٱلنَّهَارَ فِى ٱلَّيْلِ ۚ وَهُوَ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴿٦﴾﴾

**فراوانی زانیاری خوداو تواناو دەسەلاتی**

خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿هُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ ۚ يَعْلَمُ مَا يَلِجُ فِى ٱلْأَرْضِ وَمَا يَخْرُجُ مِنْهَا وَمَا يَنزِلُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ وَمَا يَعْرُجُ فِيهَا ۖ وَهُوَ مَعَكُمْ أَيْنَ مَا كُنتُمْ ۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ﴾ئـەم گـشت ئاسمـانو زەویـەی بـە شـەش ڕۆژان وەدیهێنـاو لـە پـاش ئـەوە لەسـەر تـەختی فەرمانڕەوایی دامەزرا هەرچی بە زەویدا ڕۆبچێتو هەرچی لێی وەدەربكەوێتو هەرچی لە ئاسمان دێتـە خوار. هەرچـی پیـا سـەر دەكـەوێت. ئـەو دەیزانێـتو لـە هـەركوێ بن، لەگەڵتانـەو خـودا كردەوەتـان دەبینێت. خوای گەورە هەواڵ دروسـتكردنی ئاسمانـەكانو زەمـینو ئەوەیـشی كـە لـە نێوانیاندایـە بـۆ دەكات لە شەش ڕۆژدا پاشان هەواڵی دامەزراندنی فەرمانڕەوایی خۆیمان بۆ دەكات لەسەر تەخت پـاش دروست كردنیان. لە پێشەوە باسی ئەم ئایەتـەو شـێوەی ئـەم ئایەتـەمان لـە سـورەتی (الأعـراف) بـە درێژی كردووە پێویست ناكات لێرەدا دووبـارەی بكەینـەوە. وە دەفـەرموێت: ﴿يَعْلَمُ مَا يَلِجُ فِى ٱلْأَرْضِ﴾ واتە: ئاگاداری ژمارەی هـەرچی دانەوێڵەو تۆو دڵۆپەی بارانـە دەچـێتە نـاو زەوی، ﴿وَمَا يَخْرُجُ مِنْهَا﴾ وە هەرچیش لێی دێتە دەرەوە لە ڕووەكو كشتوكاڵو میوە. وەك فەرموویەتی: ﴿وَعِندَهُۥ مَفَاتِحُ ٱلْغَيْبِ لَا يَعْلَمُهَآ إِلَّا هُوَ ۚ وَيَعْلَمُ مَا فِى ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ ۚ وَمَا تَسْقُطُ مِن وَرَقَةٍ إِلَّا يَعْلَمُهَا وَلَا حَبَّةٍ فِى ظُلُمَٰتِ ٱلْأَرْضِ وَلَا رَطْبٍ وَلَا يَابِسٍ إِلَّا فِى كِتَٰبٍ مُّبِينٍ﴾[٢] واتە: وەكلیلی هەموو نهێنیەكان هەر لای خودایە كەس نایزانێت بێجگە ئەو(خوا)، وە(خوا) دەزانێ چی لە وشكانیو دەریادا هەیەو هەر گەڵایەك بكەوێتە خوارەوە خـوا پێی دەزانێتو هەر دانەوێڵەیەك لە تاریكیەكانی زەویدا بێتو هەر تەڕو وشكێك هـەبێت هـەر هـەموویان

[١] مسلم (٤/٢٠٨٤).

[٢] الانعام (٥٩).

لە کتێبی ئاشکرادان (لوح المحفوظ). وە دەفەرموویێت: ﴿وَمَا يَنزِلُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ﴾ واتە: بارانو بەفرو تەرزەو بڕیارو فەرمانەکانی لەگەڵ فریشتە بەڕێزەکان لە ئاسمان دێتە خوار، ﴿وَمَا يَعۡرُجُ فِيهَا﴾ هەرچی پیا سەردەکەوێت لە فریشتەکانو کردارەکان وەك لە فەرموودەی سەحیحدا هاتووە: (کردەوەی شەو بەرز دەکرێتەوە بۆ لای خودا پێش ڕۆژبوونەوەو کردەوەی ڕۆژیش پێش شەو داهاتن).[1] خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿وَهُوَ مَعَكُمۡ أَيۡنَ مَا كُنتُمۡۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ بَصِيرٞ﴾ واتە: خودا ئاگای لە خۆتانو هەموو کردارێکتانە لە هەر کوێ بن لەگەڵتانە لەسەر زەمین یان لەناو دەریا لە شەودا بێت یان لە ڕۆژدا لە ماڵی خۆتاندا بێت یان لە چۆڵەوانیدا هەمووی ئاگادارەو دەیزانێت وەك یەکە دەیبینێتو دەیبیستێت قسەکانتان دەبیستێتو شوێنەکان دەبینێت. ئاگای لە پەنامەکیو سرتەکانتانە (چپەکانتانە). وەك دەفـــەرموویێت: ﴿أَلَآ إِنَّهُمۡ يَثۡنُونَ صُدُورَهُمۡ لِيَسۡتَخۡفُواْ مِنۡهُۚ أَلَا حِينَ يَسۡتَغۡشُونَ ثِيَابَهُمۡ يَعۡلَمُ مَا يُسِرُّونَ وَمَا يُعۡلِنُونَۚ إِنَّهُۥ عَلِيمُۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ﴾[2] واتە: ئاگادار بن بێگومان ئەوان سنگیان دەپێچنەوە (لە سەر کینەو دژایەتی) بۆ ئەوەی خۆیان بشارنەوە لە خوا بێدار بن کاتێك ئەوانە خۆیان دادەپۆشن بە پۆشاکەکانیان، خوا دەزانێت بەوەی دەیشارنەوەو ئەوەی ئاشکرای دەکەن بێگومان ئەو بە ئاگاو زانایە بەوەی لە سینەو دڵەکاندایە. وە فەرموویەتی: ﴿أَلَآ إِنَّهُمۡ يَثۡنُونَ صُدُورَهُمۡ لِيَسۡتَخۡفُواْ مِنۡهُۚ أَلَا حِينَ يَسۡتَغۡشُونَ ثِيَابَهُمۡ يَعۡلَمُ مَا يُسِرُّونَ وَمَا يُعۡلِنُونَۚ إِنَّهُۥ عَلِيمُۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ﴾[3] واتە: یەکسانە (بۆ خودا) ئەوەتان بە نهێنی قسە بکاتو ئەوەتان بە ئاشکرا قسە بکاتو ئەوەی کە لە شەودا خۆی دەشارێتەوەو ئەوەی کە لە ڕۆژدا دەردەکەوێت. غەیری ئەو خودایە نیەو بێجگە لە ئەو پەروەرینیش نیە بە جوبرەئیل کاتێك پرسیاری لێکرد لە بارەی ئیحسانەوە: (خوا بپەرستە وەك ئەوەی کە چاوت لێیەتی ئەگەر تۆ ئەو نابینی بێگومان ئەو تۆ دەبینێت).[4] خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿لَّهُۥ مُلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ وَإِلَى ٱللَّهِ تُرۡجَعُ ٱلۡأُمُورُ﴾ لە ئاسمانانو زەمیندا دەسەلات هەر بە دەست ئەوەو هەموو کارێك دەبرێتەوە بۆ لای خودا. واتە: خودا خاوەنی دنیاو ڕۆژی دواییە. وەك فەرموویەتی: ﴿وَإِنَّ لَنَا

---

[1] مسلم (١/١٦٢).

[2] هود (٥).

[3] الرعد (١٠).

[4] فتح الباري (١/١٤٠).

لَلْآخِرَةَ وَالْأُولَىٰ ﴾[1] واتە: وە هەردوو جیهان هی ئێمەیە. ستایش کراوە لەسەری وەك فەرموویەتی: ﴿ وَهُوَ اللَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ لَهُ الْحَمْدُ فِي الْأُولَىٰ وَالْآخِرَةِ ﴾[2] واتە: وە ئەو خودایەکە هیچ پەرستراوی تری نیە جگە لەو هەموو سوپاس تەنها بۆ خودا لە دنیاو لە ڕۆژی دوایشدا. دیسان فەرموویەتی: ﴿الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي لَهُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ وَلَهُ الْحَمْدُ فِي الْآخِرَةِ وَهُوَ الْحَكِيمُ الْخَبِيرُ ﴾[3] واتە: هەموو حەمدو سوپاس بۆ خودایە کە هەرچی لە ئاسمانەکانو زەویدایە تەنها هی ئەوەو لەو دنیاش ستایش هەر بۆ ئەوە و ئەو دروستکاری وردبینە. هەرچی لە ئاسمانانو زەمیندا هەیە هەمووی ئەو خاوەنیەتی. خەڵکەکەیش هەموو بەندەو کۆیلەی داماوو بێ دەسەلاتن لە خزمەتیدا. وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِن كُلُّ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ إِلَّا آتِي الرَّحْمَٰنِ عَبْدًا ﴿٩٣﴾ لَّقَدْ أَحْصَاهُمْ وَعَدَّهُمْ عَدًّا ﴿٩٤﴾ وَكُلُّهُمْ آتِيهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فَرْدًا ﴾[4] واتە: هەموو ئەوانەی لە ئاسمانەکانو زەویدان بە بەندەیی دێنە لای خودای میهرەبان (هیچ کەسێك لەوانە نیە بەندەی خوای میهرەبان نەبێت)، سوێند بە خوا بە ڕاستی هەموویانی سەرژمێری کردووە بە ژماردن، هەر هەموویان بە تاكو تەنها دێنەوە بۆ لای خودا لە ڕۆژی قیامەتدا.

بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَإِلَى اللَّهِ تُرْجَعُ الْأُمُورُ﴾ واتە: هەموو کارێك دەبرێتەوە بۆ لای خودا لە ڕۆژی قیامەتداو فەرمانڕەوایی دەکات لە نێوان دروستکراوەکانیدا بە ویستو مەیلی خۆی خودایەکی دادپەروەرە، بە ئەندازەی وردیلەترین شت ناهەقیو ستەم لە کەس ناکات، ئەگەر یەکێکیان چاکەیەکی هەبێت دە ئەوەندەی چاکەکەی پاداشتی دەداتەوە، ﴿وَيُؤْتِ مِن لَّدُنْهُ أَجْرًا عَظِيمًا ﴾[5] واتە: وە دەیبەخشێت لە لایەن خۆیەوە پاداشتێکی گەورە. وەك خودا خۆی فەرموویەتی: ﴿ وَنَضَعُ الْمَوَازِينَ الْقِسْطَ لِيَوْمِ الْقِيَامَةِ فَلَا تُظْلَمُ نَفْسٌ شَيْئًا وَإِن كَانَ مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِّنْ خَرْدَلٍ أَتَيْنَا بِهَا وَكَفَىٰ بِنَا حَاسِبِينَ﴾[6] واتە: وە ئێمە دادەنێین تەرازووەکانی دادپەروەری (کە کردەوەی پێ دەکێشرێت) لە ڕۆژی قیامەتدا ئینجا هیچ کەس کەمترین ستەمی لێ ناکرێت با قورسی یەکەشی بە قەدەر تۆوە

---

[1] الليل (١٣).
[2] القصص (٧٠).
[3] سبأ (١).
[4] مريم (٩٣_٩٥).
[5] النساء (٤٠).
[6] الانبياء (٤٧).

خەرتەلەیەکیش بێت، ئێمە دەیهێنینو بەسە کە ئێمە ژمێریاری (کردەوەی بەندەکانی) بین. خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿ يُولِجُ ٱلَّيْلَ فِى ٱلنَّهَارِ وَيُولِجُ ٱلنَّهَارَ فِى ٱلَّيْلِ ۚ وَهُوَ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴾ ئەو دەبات بەناو ڕۆژدا وە ڕۆژ دەبات بەناو شەودا (لە زستانو بەهادا) وە ئەو ئاگادارە بە نیازی ناو دڵان. واتە: ئەو کاربەدەستو کارسازە بەسەر دروستکراوەکانیدا شەوو ڕۆژ دەگۆڕێتو ئەندازەی بۆ دادەنێت بە ویستی خۆی چۆنی بوێت. جارێك شەو درێژ دەکاتەوە ڕۆژ کورت جارێکی تر بە پێچەوانەوە هەندێ جاریش وەك یەکن. کاتێك زستانەو کاتێك هاوینەو کاتێك بەهارەو کاتێکیش پایزە. ئەمانە هەمووی بە بڕیارو لە کارزانیەتی بۆ دروستکراوەکانی، ﴿وَهُوَ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴾ واتە: ئاگاداری هەموو پەنهانیەکانە هەرچەندە وردیلەو بچووكو شاراوە بێت.

﴿ ءَامِنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَأَنفِقُوا۟ مِمَّا جَعَلَكُم مُّسْتَخْلَفِينَ فِيهِ ۖ فَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مِنكُمْ وَأَنفَقُوا۟ لَهُمْ أَجْرٌ كَبِيرٌ ﴿٧﴾ وَمَا لَكُمْ لَا تُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ ۙ وَٱلرَّسُولُ يَدْعُوكُمْ لِتُؤْمِنُوا۟ بِرَبِّكُمْ وَقَدْ أَخَذَ مِيثَـٰقَكُمْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٨﴾ هُوَ ٱلَّذِى يُنَزِّلُ عَلَىٰ عَبْدِهِۦٓ ءَايَـٰتٍۭ بَيِّنَـٰتٍ لِّيُخْرِجَكُم مِّنَ ٱلظُّلُمَـٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ ۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ بِكُمْ لَرَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿٩﴾ وَمَا لَكُمْ أَلَّا تُنفِقُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلِلَّهِ مِيرَٰثُ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ لَا يَسْتَوِى مِنكُم مَّنْ أَنفَقَ مِن قَبْلِ ٱلْفَتْحِ وَقَـٰتَلَ ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ أَعْظَمُ دَرَجَةً مِّنَ ٱلَّذِينَ أَنفَقُوا۟ مِنۢ بَعْدُ وَقَـٰتَلُوا۟ ۚ وَكُلًّا وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلْحُسْنَىٰ ۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴿١٠﴾ مَّن ذَا ٱلَّذِى يُقْرِضُ ٱللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا فَيُضَـٰعِفَهُۥ لَهُۥ وَلَهُۥٓ أَجْرٌ كَرِيمٌ ﴿١١﴾ ﴾

## فەرمان دان بە باوەڕهێنانو هەڵنان لەسەر ماڵ بەخت کردن

خوای مەزن داوای کردووە کە باوەڕ بێنن بە خۆیو پێغەمبەرەکەی (ﷺ) بە چاکیو تەواویو بەردەوام لەسەری ڕاوەستنو پەلە بکەن لە بەخشینی ئەو ماڵو سامانەی خودا پێی داونو کردوونی بە خاوەنی واتە: وەك ئەمانەتێك لە لاتانە. چونکە ئەو سامانە بە دەستی پێشووەکانتانەوە بوو پاش ئەوان بووە بە ماڵی ئێوە. خودای گەورە ڕێنمایی بەندەکانی دەکات لە ئەو سامانەی پێی بەخشیون لە ڕەزامەندی ئەودا بیدەنو سەرفی بکەن. ئەگەر وا بکەن چاکە خۆ ئەگەر واتان نەکرد پرسیارتان لێ دەکرێت لەسەریو تۆڵەتان لێ دەسێنرێت لەسەر بەجێ نەهێنانی ئەو شتانەی کە پێتان سپێردرابوو لە سەرفکردنی ئەو سامانەی خودا پێی دابوون. خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ ءَامِنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَأَنفِقُوا۟ مِمَّا جَعَلَكُم مُّسْتَخْلَفِينَ فِيهِ ۖ فَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مِنكُمْ وَأَنفَقُوا۟ لَهُمْ أَجْرٌ كَبِيرٌ ﴾ بڕوا بێنن بە خوداو پێغەمبەری خوداو لەو ماڵەی بۆی هێوونەتەوە، لە ڕای خودا بەختی بکەن ئەو کەسانەی لە ئێوە خاوەن باوەڕنو ماڵ لە ڕای خودا دەبەخشن، پاداشتی مەزنیان هەیە. ئەم ئایەتە ئەوە دەگەیەنێت کە ئەو ماڵەی لە دواتەوە

بەجێ دەمێنێت لەوانەیە کەس‌و کارت لە ڕەزامەندی خودا سەرفی بکەن بیبەخشن لە تۆ بەختەوەرتر بن بەو سامانە کە خودا پێی داون. یان لە تاوان‌و خراپەکاریدا بەکاری بێنن‌و سەرفی بکەن ئەو کاتە تۆ هەوڵت داوەو خۆت ماندوو کردووەو یارمەتیت داون لەسەر ئەو تاوان‌و خراپەیە. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە عەبدوڵلای کوڕی شخیرەوە (چخیر) ئەمیش لە باوکیەوە دەڵێت خۆم گەیاندە لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەیفەرموو: (﴿أَلْهَىٰكُمُ التَّكَاثُرُ﴾[1] واتە: ئێوەی بێ ئاگا کردووە شانازیتان بە زۆری سەروەت‌و سامانەوە. خەڵکی دەڵێن: سامانەکەم، سامانەکەم، ئاخۆ سامانت هەیە جگە لەوەی خواردووتەو لەناوت داوە یان پۆشاوتەو ڕزاندووتە یان بەخشیوتە لە ڕێی خواداو هێشتووتەوە[2]؟ موسلیمیش ڕیوایەتی کردووە ئەمەی لێ زیاد کردووە: (غەیری ئەمانە کە باس کرا ڕۆیشتووەو بۆ خەڵکی بەجێ دەهێڵی).[3] خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿فَالَّذِينَ ءَامَنُوا مِنكُمْ وَأَنفَقُوا لَهُمْ أَجْرٌ كَبِيرٌ﴾ هەڵنانە بۆ باوەڕهێنان‌و ماڵ بەخت کردن لە ڕەزامەندی خوادا. پاشان خوای مەزن فەرموویەتی: ﴿وَمَا لَكُمْ لَا تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ ۙ وَالرَّسُولُ يَدْعُوكُمْ لِتُؤْمِنُوا بِرَبِّكُمْ وَقَدْ أَخَذَ مِيثَاقَكُمْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ﴾ ئەوە چیتانە باوەڕ ناکەن بە خوا؟ کەچی پێغەمبەریش داواتان لێ دەکات، تا بە پەروەردگاری خۆتان بڕوا بێنن، ئەگەر باوەڕتان هەبێت، ئێوە پەیمانتان پێداوە. واتە: چی شتێك ڕێتان لێ دەگرێت کە باوەڕ نەهێنن لە کاتێکدا پێغەمبەر وا لەناوتانداو داواتان لێ دەکات کە موسڵمان بن‌و بەڵگەو نیشانەی زۆرتان بۆ دەهێنێتەوە لەسەر ڕاستی ئەو پەیامەی کە بۆی هێناون. لە فەرموودەیەکدا ڕیوایەتمان کرد لە چەند ڕێگاوە لە ئەوەلی شەرحی (کتاب الایمان) لە سەحیحی بوخاریدا کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) ڕۆژێك فەرمووی بە هاوەڵەکانی: (کام لە خاوەن باوەڕان باوەڕەکەیان بە لای ئێوەوە سەرسوڕهێنەرترە، وتیان: فریشتەکان، فەرمووی: چیانە باوەڕ ناهێنن کە ئەوان لە خزمەت خوای گەورەدان؟ وتیان: پێغەمبەران. فەرمووی: چیانە باوەڕ ناهێنن کە نیگایان بۆ دێت؟ وتیان: ئێمە، فەرمووی: چیتانە باوەڕ ناهێنن کە من وام لەناوتاندا؟ بەڵکو سەرسوڕهێنەرترین باوەڕ باوەڕی کۆمەڵێکە دوای ئێوە دێن پەڕاوێکیان (قورئان) چاو پێ دەکەوێت باوەڕ دەهێنن بەوەی کە تێیدا هاتووە).[4] لە چەند ڕێگاوە ئەم ڕیوایەتەمان هێناوە لە پێشەکی سورەتی (البقرة)دا لەم ئایەتەدا: ﴿الَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِالْغَيْبِ﴾[5] واتە: ئەوانەی کە باوەڕ

---

[1] التكاثر (١).

[2] احمد (٤/٢٩)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[3] مسلم (٤/٢٢٧٣).

[4] مجمع (١٠/٦٥)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[5] البقرة (٣).

دەهێنن بە شتە پەنهان و نادریارەکان. خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَقَدْ أَخَذَ مِيثَٰقَكُمْ﴾ وەك دەفەرمووێت: ﴿وَٱذْكُرُواْ نِعْمَةَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَمِيثَٰقَهُ ٱلَّذِى وَاثَقَكُم بِهِۦٓ إِذْ قُلْتُمْ سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا﴾[1] واتە: یادی بەهرەو چاکەی خوا بکەنەوە بەسەرتانەوەو ئەو پەیمانەی کە دایمەزراندن پێی کاتێك کە وتتان بیستمان و گوێڕایەڵ بووین. مەبەست پێی پەیمانەکەی پێغەمبەری خودایە (ﷺ) ئیبنو جەریر دەڵێت: مەبەست پێی ئەو پەیمانەیە کە وەرگیراوە لە پشتی ئادەمدا (پێش ئەوەی پەیدا ببن) ئەمە ڕای موجاهدیشە والله أعلم.[2] خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿هُوَ ٱلَّذِى يُنَزِّلُ عَلَىٰ عَبْدِهِۦٓ ءَايَٰتٍۭ بَيِّنَٰتٍ لِّيُخْرِجَكُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ ۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ بِكُمْ لَرَءُوفٌ رَّحِيمٌ﴾ هەر ئەویشە چەند نیشانەی ڕوونی بۆ سەر بەندەی خۆی ناردە خوار، تا لە تاریکی دەتان بێنێت و بەرەو ڕووناکیتان بەرێت. کە خودا سەبارەت بە ئێوە دلسۆزێکی دلۆڤانە. واتە: خودا نیشانەی ڕوون و بەڵگە زۆر مەزنی بۆ ناردوون، ﴿لِّيُخْرِجَكُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ﴾ واتە: تا لە تاریکی و نەفامی و بێ دینی و ڕاوبۆچوونی نادروست و دژ بەیەك لاتان بدات و بەرەو ڕێی ڕاست و ڕووناکی و باوەڕی تەواو بڕۆن. ﴿وَإِنَّ ٱللَّهَ بِكُمْ لَرَءُوفٌ رَّحِيمٌ﴾ واتە: خوای گەورە دڵسۆزو دلۆڤانە سەبارەت بە ئێوە کە کتێبەکانی بۆ ناردوون و پێغەمبەرانی بۆ ڕەوانە کردون بۆ ڕێ نیشاندانی مەردم و سڕینەوەو لابردنی ئەو نەخۆشی و گومانەی کە لە دڵیاندایە، کاتێك لەوەڵەوە داوایان لێ دەکات کە باوەڕ بهێنن و ماڵ ببەخشن و هەڵی نان لەسەر باوەڕو ئەو لەمپەرانەی کە بووبوونە ڕێگرو نەیهێشت دووبارە هەڵیان دەنێت کە ماڵ بەخت بکەن و دەفەرمووێت: ﴿وَمَا لَكُمْ أَلَّا تُنفِقُواْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلِلَّهِ مِيرَٰثُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ لَا يَسْتَوِى مِنكُم مَّنْ أَنفَقَ مِن قَبْلِ ٱلْفَتْحِ وَقَٰتَلَ ۚ أُوْلَٰٓئِكَ أَعْظَمُ دَرَجَةً مِّنَ ٱلَّذِينَ أَنفَقُواْ مِنۢ بَعْدُ وَقَٰتَلُواْ ۚ وَكُلًّا وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلْحُسْنَىٰ ۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ﴾ دەی چیتانە ماڵی خۆتان لە ڕای خودا بەخت ناکەن؟ کە هەر شتێك لە ئاسمانان و زەویدان. هەر بۆ خودا دەمێنێتەوە. ئەو کەسانەی لە پێش گرتنی مەککەدا ماڵی خۆیان بەخت کردو بە گژ نەیارەکاندا چوون، پایەی هەرە بەرزیان هەیە. لەگەڵ ئەو کەسە وەك یەك نین کە لە پاشانن ماڵی خۆی بەخت کردووەو بە گژ دوژمناندا چووە. کە هەمووشیان خودا بەڵێنی پێداون چاکەیان دەربارە دەکات. خودا لەسەر کارێك کە دەیکەن ئاگادارە. واتە: ماڵ بەخت بکەن و لە هەژاری و کەمکردنی مەترسن چونکە ئەو کەسەی کە ماڵتان لە ڕێی ئەودا بەخشیوە خاوەنی ئاسمانان و زەمینە هەموو کارەکانتان بە دەستی ئەوەو

---

[1] المائدة (٧).

[2] الطبري (٢٣/١٧٢).

گەنجینەکانیشتان هەر لای ئەوە. ئەو خاوەنی عەرشو چواردەوریەتی هەر ئەویش فەرموویەتی: ﴿وَمَآ أَنفَقْتُم مِّن شَىْءٍ فَهُوَ يُخْلِفُهُۥ ۖ وَهُوَ خَيْرُ ٱلرَّٰزِقِينَ﴾[1] واتە: وە ئێوە هەر شتێك ببەخشن ئەوە خوا جێگەی پڕدەکاتەوەو ئەو چاکترینی ڕۆزیدەرانە. وە فەرموویەتی: ﴿مَا عِندَكُمْ يَنفَدُ ۖ وَمَا عِندَ ٱللَّهِ بَاقٍ﴾[2] واتە: هەرچی لای ئێوەیە تەواو دەبێتو نامێنێت بەڵام ئەوەی لای خودایە هەردەمێنێت. هەر کەسێك پشتی بە خودا بەستبێتو ماڵی بەخت کردووە نەترساوە لە خاوەنی عەرش کەمی بکاتەوە، چونکە زانیویەتی چەندێ ببەخشێت خوای گەورە بە زوویی پێی دەداتەوە.

## ڕێزی ماڵ بەختکردنو جەنگ کردن پێش گرتنی مەککە

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿لَا يَسْتَوِى مِنكُم مَّنْ أَنفَقَ مِن قَبْلِ ٱلْفَتْحِ وَقَٰتَلَ﴾ واتە: ئەوەی ماڵ بەخت دەکاتو ئەوەش بەختی ناکات وەك یەك نین چونکە پێش ڕزگارکرنی مەککە ژیانی موسڵمانان زۆر تەنگو گران بوو لەو کاتەدا هەر کەسێك لە ڕاستگۆیان نەبووایە باوەڕی نەدەهێنا. بەڵام پاش ڕزگارکردنی مەککە ئیسلام بڵاوبووەوە. بڵاوبوونەوەیەکی زۆر گەورە خەڵکی پۆل پۆلو دەستەدەستە موسڵمان دەبوون، بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿أُو۟لَٰٓئِكَ أَعْظَمُ دَرَجَةً مِّنَ ٱلَّذِينَ أَنفَقُوا۟ مِنۢ بَعْدُ وَقَٰتَلُوا۟ ۚ وَكُلًّا وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلْحُسْنَىٰ﴾ کۆمەڵی زانایان وتوویانە: کە مەبەست بە ﴿ٱلْفَتْحِ﴾ لێرەدا ڕزگارکردنی مەککەیە. شەعبیو کەسانی تریش وتوویانە: مەبەست بە ﴿ٱلْفَتْحِ﴾ لێرەدا ڕێککەوتننامەی حودەیبیەیە.[3] ئەوەی کە ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئەنەسەوە دەبێتە بەڵگەو پشتگیری قسەکەی شەعبی کە دەڵێت: مەبەست بە ﴿ٱلْفَتْحِ﴾ ڕێکەوتننامەی حودەیبیەیە، ئەنەس دەڵێت: ناکۆکیو قسە کەوتە نێوان خالدی کوڕی وەلیدو عبدالرحمنی کوڕی عەوف. خالد وتی بە بەعدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف: خۆتان بە چاکترو بەڕێزتر دەزانن لەبەر چەند ڕۆژێك کە پێش ئێمە کەوتوون. هەواڵیان دایێ کە ئەو قسەیە باس کراوە بۆ پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (هاوەڵەکانم واز لێ بێنن بۆ خۆم، سا سوێند بەو کەسەی گیانی منی بە دەستە ئەگەر بە ئەندازەی کێوی ئوحود زێڕتان ببەخشیایە نەدەگەیشتە کردارەکانی ئەوان).[4] ئاشکرایە موسڵمان بوونی خالدی کوڕی وەلیدو ئەو قسەی کە کردوویەتی لە نێوان پەیماننامەی حودەیبیەو ڕزگارکردنی مەککەدایە. وە ئەو قسەو ناکۆکیە

---

[1] سبأ (٣٩).

[2] النحل (٩٦).

[3] الطبري (٢٣/١٧٥).

[4] احمد (٣/٢٦٦)، فەرموودەیەکی.

کە لە نێوانیاندا ڕوویدا لە بەنی جەزیمەدا بوو کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) خالدی کوڕی وەلیدی نارد بۆ لایان دوای ڕزگارکردنی مەککە، کاتێك خالد گەیشتە لایان دەیانوت: (صبأنا، صبأنا)، نەیاندەزانی بڵێن: موسڵمان بووین خالد فەرمانی کوشتنی دان‌و ئەوانەی کە بە دیلیش گیران هەر کوشتنی. عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف‌و عەبدوڵڵای کوڕی عومەرو خەڵکی تریش ڕازی نەبوون بە کوشتنیان. خالدو عەبدوڕڕەحمان بوو بە مشتومڕیان لەسەری. لە فەرموودەی سەحیحدا هاتووە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (قسە مەڵێن بە هاوەڵەکانم سوێند بەو کەسەی گیانی منی بە دەستە ئەگەر یەکێك لە ئێوە بە ئەندازەی کێوی ئوحود زێڕ ببەخشێت ناگاتە مودێکی ئەوان، وە ناگاتە نیوەی مودێکی ئەوان)[1]. مود (١٨)هەرژدە لیترە. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَكُلًّا وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلْحُسْنَىٰ﴾ واتە: هەموویان خودا بەڵێنی پێداون چاکەیان لەگەڵ بکات ئەوانەی پێش فەتحی مەککەو ئەوانەیش دوای فەتحی مەککە ماڵیان بەخشیوە، هەموویان پاداشتیان هەیە لەسەر ئەو کارانەی کە کردوویانە.

هەرچەندە جیاوازی‌و ڕێزی زیاتر هەیە لە نێوانیاندا وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿لَّا يَسْتَوِي ٱلْقَٰعِدُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ غَيْرُ أُوْلِي ٱلضَّرَرِ وَٱلْمُجَٰهِدُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ ۚ فَضَّلَ ٱللَّهُ ٱلْمُجَٰهِدِينَ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ عَلَى ٱلْقَٰعِدِينَ دَرَجَةً ۚ وَكُلًّا وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلْحُسْنَىٰ ۚ وَفَضَّلَ ٱللَّهُ ٱلْمُجَٰهِدِينَ عَلَى ٱلْقَٰعِدِينَ أَجْرًا عَظِيمًا﴾[2] واتە: یەکسان نین دانیشتوان (لە جیهادی ڕێی خودا) لە باوەڕداران جگە لە خاوەن عوزرەکان (نەخۆش، کوێر، شەل) لەگەڵ تێکۆشەرانی ڕێگەی خوادا خوا ڕێزی داوە بە تێکۆشەران بە ماڵ‌و گیانیان بەسەر دانیشتواندا بە پلەیەك وە هەریەك لەو دوو تاقمە خوا بەڵێنی پاداشتی زۆر چاکی پێ داون (کە بەهەشتە) وە خوا ڕێزی ڕێزی تێکۆشەرانی داوە بەسەر دانیشتووەکاندا بە پاداشتێکی گەورە. وە هەروەها لەم فەرموودە سەحیحەشدا پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: خاوەن باوەڕی بەهێز چاکتر و خۆشەویسترە لە خاوەن باوەڕی لاواز وە خێر لە هەموویاندا هەیە).[3] بۆیە فەرموویەتی: (وفي كل خير) بۆ ئەوەی لایەنێك وەسف نەکرێت‌و لایەنەکەی تر پشتگوێ بخرێت‌و کەسێك بیەوێت باسی بە خراپە بکات. لەبەر ئەوە وەسفی ئەمیش کراوە لەگەڵ ڕێزی زیاتری یەکەم بەسەر ئەمی تردا. بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ﴾ واتە: لە زانایی خۆیەتی کە پلەی هەرە بەرزی داوە بەو کەسانەی کە لە پێش فەتحی مەککەدا ماڵی بەخت کردووەو بە گژ دوژمندا چووە. ئەوەیش

[1] مسلم (٤/٢٥).

[2] النساء (٩٥).

[3] مسلم (٤/٢٠٥٢).

ماڵی دوای فەتحی مەککە بەخت کردووەو بە گژ دوژمندا چووە چونکە خۆی ئاگادارەو زانیویەتی بە نیەتی ئەوانەی پێش فەتحی مەککەو دڵسۆزیو لێبڕانی تەواویانو ماڵ بەختکردنیان لەو کاتی برسیەتیو تەنگانەو نەبوونیەدا. لە فەرموودەیەکدا هاتووە: (درهەمێك بە سەد هەزار درهەم لە پێشە لە خێردا).[1] خواناسان بێگومانن کە ئەبو بەکر بەشی هەرە گەورەی هەیە لەم ئایەتەدا چونکە ئەبوبەکر پێشەوای ئەو کەسانەیە کە ماڵی بەخت کردووە لەناو ئوممەتی پێغەمبەراندا (سەلامی خوایان لێبێت) چونکە هەرچی سامانی بوو لەبەر ڕەزامەندی خودای مەزن بەخشیو هیچی نەهێشتەوە. بە تەمای کەسیش نەبوو لەو کاتەدا پاداشتی بداتەوە غەیری خوای گەورە.

## هەڵنان بۆ قەرزی باشو ڕەوا دان بە خودا

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿مَّن ذَا ٱلَّذِى يُقْرِضُ ٱللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا فَيُضَٰعِفَهُۥ لَهُۥ وَلَهُۥٓ أَجْرٌ كَرِيمٌ﴾ کێی وا هەیە قەرزی ڕەوا بدات بە خودا تا چەند قاتی بداتەوەو پاداشتی باشیشی هەبێت؟ عومەری کوڕی خەتاب دەڵێت: واتە: مالچ بەخشین لە ڕێی خوادا. وتراویشە: واتە: ماڵ بەخت کردن بۆ ماڵو منداڵ ڕاستیەکەی ئەوەیە کە ئەم ئایەتە گشتگیرتر لەمە. چونکە هەر کەسێك ماڵی بەخشی لە ڕێی خوادا بە نیەتێکی پاك بە ڕاستی لێبڕا ئەم ئایەتە دەیگرێتەوە بۆیە خوای مەزن فەرموویەتی: ﴿مَّن ذَا ٱلَّذِى يُقْرِضُ ٱللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا فَيُضَٰعِفَهُۥ لَهُۥ﴾. وەك لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿أَضْعَافًا كَثِيرَةً﴾[2] واتە: بە زیادکردنێکی زۆر. لە پاداشتی جوانو چاكو ڕۆژی زۆر. کە ئەوەیش بەهەشتە لە ڕۆژی قیامەتدا. ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە لە عەبدوڵلای کوڕی مەسعودەوە دەڵێت: کاتێك ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە: ﴿مَّن ذَا ٱلَّذِى يُقْرِضُ ٱللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا فَيُضَٰعِفَهُۥ لَهُۥ﴾ ئەبو دەحداحی ئەنساری وتی: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) خودا قەرزی دەوێت لە ئێمە؟ فەرمووی: بەڵێ ئەی ئەبو دەحداح. وتی: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەستتم نیشاندە وتی: دەستی بۆ ڕاکێشا ئەبودەحداح وتی: ئەوا من ئەم دیوارەم بە قەرز دا بە پەروەردگاری خۆم، باغێکی هەبوو شەش سەد دارخورمای تێدابوو ئوممو دەحداحو منداڵەکانی تێدا بوون. وتی: ئەبو دەحداح هات بانگی کرد ئەی ئومو دەحداح. خێزانی وتی: ئەوا هاتم دەرچۆ لەو باغە داومە بە قەرز بە خوای گەورە. لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە خێزانی پێی وت: فرۆشتنەکەت قازانجی زۆری کردووە ئەی ئەبو دەحداح. ماڵو منداڵەکەی گواستەوەو باری کرد لە باغەکە. پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (چەندێ لە دارخورمای گەورە هەیە لە بەهەشتدا بۆ ئەبو

[1] النسائي (٥/٥٩)، فەرموودەیەکی حەسەنە.

[2] البقرة (٢٤٥).

دەحداح)، وە لە ڕیوایەتێکی تردا فەرموویەتی: (خورمایەکی زۆر ڕیشکی بڵاوبووەتەوە وەك مرواریو یاقوت دانراوە (دەدرێت) بۆ ئەبو دەحداح لە بەهەشتدا)[1].

﴿يَوۡمَ تَرَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ يَسۡعَىٰ نُورُهُم بَيۡنَ أَيۡدِيهِمۡ وَبِأَيۡمَٰنِهِم بُشۡرَىٰكُمُ ٱلۡيَوۡمَ جَنَّٰتٞ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَاۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ ﴿١٢﴾ يَوۡمَ يَقُولُ ٱلۡمُنَٰفِقُونَ وَٱلۡمُنَٰفِقَٰتُ لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱنظُرُونَا نَقۡتَبِسۡ مِن نُّورِكُمۡ قِيلَ ٱرۡجِعُواْ وَرَآءَكُمۡ فَٱلۡتَمِسُواْ نُورٗاۖ فَضُرِبَ بَيۡنَهُم بِسُورٖ لَّهُۥ بَابُۢ بَاطِنُهُۥ فِيهِ ٱلرَّحۡمَةُ وَظَٰهِرُهُۥ مِن قِبَلِهِ ٱلۡعَذَابُ ﴿١٣﴾ يُنَادُونَهُمۡ أَلَمۡ نَكُن مَّعَكُمۡۖ قَالُواْ بَلَىٰ وَلَٰكِنَّكُمۡ فَتَنتُمۡ أَنفُسَكُمۡ وَتَرَبَّصۡتُمۡ وَٱرۡتَبۡتُمۡ وَغَرَّتۡكُمُ ٱلۡأَمَانِيُّ حَتَّىٰ جَآءَ أَمۡرُ ٱللَّهِ وَغَرَّكُم بِٱللَّهِ ٱلۡغَرُورُ ﴿١٤﴾ فَٱلۡيَوۡمَ لَا يُؤۡخَذُ مِنكُمۡ فِدۡيَةٞ وَلَا مِنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْۚ مَأۡوَىٰكُمُ ٱلنَّارُۖ هِيَ مَوۡلَىٰكُمۡۖ وَبِئۡسَ ٱلۡمَصِيرُ ﴿١٥﴾﴾

**خاوەن باوەڕان تیشکیان دەدرێتی لە ڕۆژی قیامەتدا بە پێی کردەوەیان**

خوای گەورە باسی ئەو خاوەن باوەڕانە دەکات کە چاکەیان کردووەو ماڵیان لە ڕێی خوادا بەخشیوە دەفەرمووێت: ﴿يَوۡمَ تَرَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ يَسۡعَىٰ نُورُهُم بَيۡنَ أَيۡدِيهِمۡ وَبِأَيۡمَٰنِهِم بُشۡرَىٰكُمُ ٱلۡيَوۡمَ جَنَّٰتٞ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَاۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ﴾ ڕۆژێك دێت کە تۆ دەبینی مێردو ژنی خاوەن باوەڕ، تیشك دانەوەی کردەوەیان پێشکەوتووەو لە لای ڕاستیانەوە دەڕوات، خۆش لە خۆتان ئەمڕۆکە دەچنە ناو باغاتێکەوە جۆباریان بەبەردا دەڕواتو تاهەتایە هەر تیایدا دەبن، ئەمەیە بەهرەی هەرە گرنگ. واتە: ئەوانە لە ڕۆژی قیامەتدا لە ساحەی مەحشەردا تیشکەکانیان لەبەر دەمیانەوە دەڕوات هەر کەسەو بە پێی کردەوەی خۆی وەك عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود لەم ئایەتەدا: ﴿يَسۡعَىٰ نُورُهُم بَيۡنَ أَيۡدِيهِمۡ﴾ دەڵێت هەر کەسەو بە پێی کردەوەی خۆی دەڕۆن بەسەر سیراتدا تێیاندا هەیە تیشکەکەی وەك کێو وایە. هی واش هەیە تیشکەکەی وەك دارخورما وایە. هی تر هەیە وەك پیاوێك بە پاوە وەستابێت. کەمترین تیشك لەسەر پەنجە وایە دادەگیرسێتو دەکوژێتەوە. ئیبنو ئەبی حاتەمو ئیبنو جەریریش ڕیوایەتیان کردووە.[2] زەححاك دەڵێت: هیچ کەس نیە ئەو تیشکەی پێ نەدرێت لە ڕۆژی قیامەتدا کاتێك گەیشتنە سەرسیرات تیشکی دووڕووەکان دەکوژێتەوە. کاتێك خاوەن باوەڕان ئەوە دەبینن دەترسن کە تیشکی ئەوانیش بکوژێتەوە وەك چۆن تیشکی دووڕووەکان کوژایەوە لەوکاتەدا

[1] جزء الحسن بن عرفة (٩٢)، سەنەدەکەی لاوازە لەبەر لاوازی حەمیدی ئەعرەج کە ئیبنو عەمارە، بەڵام فەرموودەکەی ئەبو دەحداح سەحیحە کە لەم ئایەتەدا خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿لن تنالوا البر حتى تنفقوا مما تحبون﴾ کە لە پێشدا باسکراوە.

[2] الطبري (٢٣/١٧٩).

دەڵێن: ئەی پەروەرێنمان تیشکەکەمان بۆ بەردەوام بکە. واتە: بۆمان بهێڵەرەوە. وە دەفەرمووێت: ﴿وَبِأَيْمَٰنِهِم﴾ زەححاك دەڵێت: واتە: نامەکانیان لە لای ڕاستیانەوەیە.[1] وە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَمَنْ أُوتِيَ كِتَٰبَهُۥ بِيَمِينِهِۦ﴾[2] واتە: جا هەر کەسێك نامەی کردەوەکەی بدرێت بە دەستی ڕاستیەوە. وە دەفەرمووێت: ﴿بُشْرَىٰكُمُ ٱلْيَوْمَ جَنَّٰتٌ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ﴾ واتە: پێیان دەوترێت: خۆشی لە خۆتان لەناو ئەوباغانەدا، واتەمژدەتان لێبێت بەو باغانەی کە جۆباریان بەبەردا دەڕوات. ﴿خَٰلِدِينَ فِيهَا﴾ هەتاهەتایە تێیدان‌و دەمێننەوەلەناویدا. ﴿ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ﴾ ئائەمەیە سەرکەوتنی زۆرمەزن.

**ژیانی دووڕووەکان (المنافقين) لە ڕۆژی قیامەتدا**

خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿يَوْمَ يَقُولُ ٱلْمُنَٰفِقُونَ وَٱلْمُنَٰفِقَٰتُ لِلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱنظُرُونَا نَقْتَبِسْ مِن نُّورِكُمْ قِيلَ ٱرْجِعُوا۟ وَرَآءَكُمْ فَٱلْتَمِسُوا۟ نُورًا فَضُرِبَ بَيْنَهُم بِسُورٍ لَّهُۥ بَابٌۢ بَاطِنُهُۥ فِيهِ ٱلرَّحْمَةُ وَظَٰهِرُهُۥ مِن قِبَلِهِ ٱلْعَذَابُ﴾ ئەو ڕۆژە دووڕووەکانی پیاوو ژن، بە خاوەن باوەڕان دەڵێن: ئێوە لامان لێ بکەنەوە تا تروسکێك لە ڕووناکیتان وەربگرین. پێیان دەڵێن: بەرەودوای خۆتان بگەڕێنەوە لەوێ ڕووناکی پەیدا بکەن، ئیتر ئەوسا شورەیەکیان لە نێوان دەبێتە لەمپەر، دەرگای هەیە، لە ژوورەوەی بەزەییەو لە دەرەوەی جەزرەبەیە. لێرەدا خوای گەورە باسی ئەو شتانە دەکات کە لە ڕۆژی قیامەتدا ڕوودەدات لە ساحەی مەحشەردا لەو ناڕەحەتی‌و هەراسانی‌و ئەو زەمین لەرزە گەورەیەو کارەساتە سامناکانە کە ڕوودەدات. کەس ڕزگاری نابێت لەو ڕۆژەدا مەگین یەکێك کە باوەڕی بە خوداو پێغەمبەری خودا(ﷺ) بووبێت، کاری کردبێت بەوەی کە خودا فەرمانی پێداوەو وازی هێنابێت لەو شتانەی کە قەدەغە کراوەو تۆڵەی لەسەر بووە، عەوفی و زەححاك دەڵێن: لە ئیبنو عەباسەوە: لەو کاتەی کە خەڵکی لە تاریکی دان خوای گەورە تێشکێکی بۆ ناردوون. کاتێك خاوەن باوەڕان تیشکەکەیان بینی بەرەو تیشکەکە دەڕۆن. ئەو تیشکە ڕێ نیشاندەرێکە بۆ بەهەشت. کاتێك دووڕووەکان خاوەن باوەڕەکانیان بینی ڕۆیشتن شوێنیان کەوتن، خوای گەورە تاریکی کرد، لەسەر دووڕووەکان. دووڕووەکان لەو کاتەدا دەڵێن: ﴿ٱنظُرُونَا نَقْتَبِسْ مِن نُّورِكُمْ﴾ لامان لێ بکەنەوە تا تروسکەیەك لەو ڕووناکیتانە وەربگرین خۆ ئێمە لە دنیا لەگەڵ ئێوە بووین. خاوەن باوەڕان دەڵێن: ﴿ٱرْجِعُوا۟ وَرَآءَكُمْ فَٱلْتَمِسُوا۟ نُورًا﴾ لە کوێوە هاتوون لەو شوێنە تاریکەوە داوای

---

[1] الطبري (٢٣/١٧٩).

[2] الاسراء (٧١).

تیشك بكەن.[1] خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿فَضُرِبَ بَيْنَهُم بِسُورٍ لَّهُۥ بَابٌۢ بَاطِنُهُۥ فِيهِ ٱلرَّحْمَةُ وَظَٰهِرُهُۥ مِن قِبَلِهِ ٱلْعَذَابُ﴾ حەسەنو قەتادە دەڵێن: ئەو دیوارەیە كە لە نێوان بەهەشتو جەهەنەمدایە.[2] عەبدوڕڕەحمانی كوڕی زەیدی كوڕی ئەسلەم دەڵێت: ئا ئەوەیە كە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وبينهما حجاب﴾[3] واتە: هەر بەم شێوەیە ڕیوایەت كراوە لە موجاهدو كەسانی تریشەوە.[4] ئەوە ڕاستە ﴿بَاطِنُهُۥ فِيهِ ٱلرَّحْمَةُ﴾ واتە: بەهەشتو ئەوەی كە تیایەتی، ﴿وَظَٰهِرُهُۥ مِن قِبَلِهِ ٱلْعَذَابُ﴾ واتە: ئاگر. قەتادەو ئیبنو زەیدو كەسانی تریش وتوویانە.[5] ﴿يُنَادُونَهُمْ أَلَمْ نَكُن مَّعَكُمْ﴾ دووڕووەكان بانگی خاوەن باوەڕەكان دەكەن دەڵێن ئێمە لە دنیا لەگەڵ ئێوە نەبووین لە هەینیەكان بە یەكەوە ئامادە نەدەبووین نوێژی جەماعەتمان نەدەكردو لە عەرەفات پێكەوە نەدەوەستاینو لە غەزاكانیشدا بە یەكەوە نەبووین هەموو فەرمانەكانی تریشمان بە یەكەوە بەجێ دەهێنا؟ ﴿قَالُوا۟ بَلَىٰ﴾ واتە: خاوەن باوەڕان وەڵامی دووڕووەكانیان دەدایەوە دەیانوت: بەڵێ ئێوە لەگەڵمان بوون وەك خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿يُنَادُونَهُمْ أَلَمْ نَكُن مَّعَكُمْ قَالُوا۟ بَلَىٰ وَلَٰكِنَّكُمْ فَتَنتُمْ أَنفُسَكُمْ وَتَرَبَّصْتُمْ وَٱرْتَبْتُمْ وَغَرَّتْكُمُ ٱلْأَمَانِىُّ حَتَّىٰ جَآءَ أَمْرُ ٱللَّهِ وَغَرَّكُم بِٱللَّهِ ٱلْغَرُورُ﴾ بانگیان دەكەن: ئاخۆ ئێمە هەر لەگەڵ ئێوەدا نەبووین؟ دەڵێن: بەڵێ، بەڵام ئێوە خۆتان تووشی بەڵا كردو چاوەڕوان بوون دودڵی لێتان نەدەگەڕاو بە ئارەزوو فریوتان خوارد هەتا فەرمانی خودا هات، شەیتان ئێوەی بە خودا بادی هەوا كرد. واتە: دووڕووەكان خاوەن باوەڕەكان بانگ دەكەنو دەڵێن: ئێمە لەگەڵ ئێوە پێكەوە نەبووین. ئەوانیش وەڵامیان دەدەنەوە، بەڵێ پێكەوە بووین، ﴿وَلَٰكِنَّكُمْ فَتَنتُمْ أَنفُسَكُمْ وَتَرَبَّصْتُمْ وَٱرْتَبْتُمْ وَغَرَّتْكُمُ ٱلْأَمَانِىُّ﴾ واتە: بەڵام ئێوە خۆتان تووشی دەردی سەری كردو چاوەڕوانی دوودڵیو ئارەزووەكانتان خەڵەتاندنی. قەتادە دەڵێت: ﴿وَتَرَبَّصْتُمْ﴾ چاوەڕوانیتان بۆ ئەو ڕاستیەو خەڵكەكەی كە چیان بەسەر دێت. ﴿وَٱرْتَبْتُمْ﴾ واتە: گومانتان بوو بە زیندووبوونەوە پاش مردن. ﴿وَغَرَّتْكُمُ ٱلْأَمَانِىُّ﴾ واتە: وتتان: خودا لێمان دەبوورێت. وتراویشە: دنیا فریوی دان. ﴿حَتَّىٰ جَآءَ أَمْرُ ٱللَّهِ﴾ بەردەوام لەسەر ئەو ڕێگایە بوون هەتا مردن یەخەی گرتن، ﴿وَغَرَّكُم

---

[1] الطبري (١٨٢/٢٣).

[2] الطبري (١٨٢/٢٣)، ابن أبي شيبة (١٧٥/١٣).

[3] الطبري (١٨٣/٢٣).

[4] الطبري (١٨٢/٢٣).

[5] الطبري (١٨٤/٢٣).

بِٱللَّهِ ٱلْغَرُورُ﴾ واتە: شەیتان[1] بایی هەوای کردن بە خودا. قەتادە دەڵێت: ئەوانە شەیتان فریوی دابوون سوێند بە خوا هەر لەسەر ئەو ڕەوشتە بەردەوام بوون هەتا خودای گەورە فرێی دانە ناو ئاگر.[2] ئەو قسەی کە خاوەن باوەڕان وتیان بە دووڕووەکان ئەوەبوو واتە ئێوە لە گومانو دوو دڵیدابوون. ڕیابازبوونو کەمێك نەبێت یادی خوداتان نەدەکرد. موجاهد دەڵێت: دووڕووەکان لەگەڵ خاوەن باوەڕەکان لە دنیادا پێکەوە ژیاونو ژنیان بەیەك داوەو یارمەتی یەکتریان داوە بە یەکیشەوە مردوونو لە ڕۆژی قیامەتدا هەموویان تیشکیان پێ دەدرێت. بەڵام تیشکی دووڕووەکان دەکوژێتەوە. کاتێك گەیشتە دیوارەکە لەو کاتەدا جیادەکرێنەوە لە یەك.[3] خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿مَأْوَىٰكُمُ ٱلنَّارُ﴾ واتە: جێگەتان ناو ئاگرەو هەر دەگەڕێنەوە بۆ ئەوێ. ﴿هِىَ مَوْلَىٰكُمْ﴾ واتە: هەر ئەوێ شایانی ئێوەیە لە هەر شوێنێکی تر لەسەر ئەو بێ دینیو بەدگومانیەتان بە ڕاستی پاشەڕۆژێکی زۆر خراپە. خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿فَٱلْيَوْمَ لَا يُؤْخَذُ مِنكُمْ فِدْيَةٌ وَلَا مِنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ۚ مَأْوَىٰكُمُ ٱلنَّارُ ۖ هِىَ مَوْلَىٰكُمْ ۖ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ﴾ئیتر ئەمڕۆ نە لە ئێوەو نە لەوانەی خوانەناس بوون، سەرانەتان لێ وەرناگیرێت، جێتان ئاگرەو هەر ئەویشتان پێ ڕەوایەو چارەنووستان زۆر خراپە. واتە: ئەگەر هەر یەکێك لە ئێوە پڕ بە زەمینو ئەوەندەی تریش زێڕ بدات بۆ ئەوەی خۆی ڕزگار بکات لە تۆڵەو سزای خودا لێی وەرناگیرێت دەبێت هەر ئەو جەزرەبەیە بچێژێت.

﴿أَلَمْ يَأْنِ لِلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَن تَخْشَعَ قُلُوبُهُمْ لِذِكْرِ ٱللَّهِ وَمَا نَزَلَ مِنَ ٱلْحَقِّ وَلَا يَكُونُوا۟ كَٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَـٰبَ مِن قَبْلُ فَطَالَ عَلَيْهِمُ ٱلْأَمَدُ فَقَسَتْ قُلُوبُهُمْ ۖ وَكَثِيرٌ مِّنْهُمْ فَـٰسِقُونَ ﴿١٦﴾ ٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ يُحْىِ ٱلْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا ۚ قَدْ بَيَّنَّا لَكُمُ ٱلْـَٔايَـٰتِ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴿١٧﴾﴾

## هەڵنان بۆ خوشوع (ئامادەبوونی دڵ)و دوورکەوتنەوە لە چاولێکەری گاورو جوولەکە

خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿أَلَمْ يَأْنِ لِلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَن تَخْشَعَ قُلُوبُهُمْ لِذِكْرِ ٱللَّهِ وَمَا نَزَلَ مِنَ ٱلْحَقِّ وَلَا يَكُونُوا۟ كَٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَـٰبَ مِن قَبْلُ فَطَالَ عَلَيْهِمُ ٱلْأَمَدُ فَقَسَتْ قُلُوبُهُمْ ۖ وَكَثِيرٌ مِّنْهُمْ فَـٰسِقُونَ﴾ بۆ کەسانی خاوەن باوەڕ، ئاخۆ ئەو دەمە نەگەیشتووە کە لە پاش ماوەیەکی زۆر، تووشی دڵڕەقی هاتنو زۆربەیان لەڕێ لایاندا؟ خوای گەورە دەفەرمووێت: ئاخۆ کاتی ئەوە نەهاتووە کە خاوەن باوەڕان دڵیان

---

[1] الطبري (٢٣/١٨٥).

[2] الطبري (٢٣/١٨٥).

[3] الطبري (٢٣/١٨٤).

ڕاچڵەكێتو یادی خودا بكەن، واتە: دڵەكانیان بە یادی خودا نەرم بێتەوەو ئامۆژگاریو گوێگرتن لە قورئانو تێگەیشتن لێی وایان لێ بكات كە گوێڕایەڵی فەرمانی خودا بنو شوێنی بكەونو لێی لانەدەن. موسلیم ڕیوایەتی كردووە لە ئیبنو مەسعودەوە دەڵێت: لە نێوان موسڵمان بوونمانو ئەم ئایەتەی كە خودای گەورە سەرزەنشتی كردین، ﴿أَلَمْ يَأْنِ لِلَّذِينَ آمَنُوا أَن تَخْشَعَ قُلُوبُهُمْ لِذِكْرِ اللَّهِ﴾ تەنها چوار ساڵ بوو. موسلیمیش لە كۆتایی كتێبەكەیدا هەر بەو شێوەیە ڕیوایەتی كردووە.[1] نەسائیش هێناویەتی لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا.[2] وە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَا يَكُونُوا كَالَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ مِن قَبْلُ فَطَالَ عَلَيْهِمُ الْأَمَدُ فَقَسَتْ قُلُوبُهُمْ﴾ خوای گەورە قەدەغەی كردووە كە خاوەن باوەڕان بچنە سەر ڕەوشتو شێوەو شكڵی گاورو جولەكە كە ماوەیەك بەسەر ئاینەكانیاندا تێپەڕیو ڕۆیشت كتێبەكانی خودایان گۆڕی كە لەبەر دەستی خۆیاندا بوو بە نرخێكی كەمو هەرزان فرۆشتیانو پشتگوێیان خستو ڕوویان كردە قسەی ئەمو ئەو شوێنی پیاوانی ئاین كەوتنو كە بەناو شوێنی ئایینی خودا كەوتبوون. قەشەو ڕوهبانەكانیان كردبوو بەخوای خۆیان غەیری خوای مەزن لەبەرئەوە دڵیان ڕەق بوو نە ئامۆژگاریان وەردەگرتو نە دڵیشیان ڕادەچڵەكا بە بەڵێنیو هەڕەشەی خودا. ﴿وَكَثِيرٌ مِّنْهُمْ فَاسِقُونَ﴾ واتە: زۆرینەیان لایانداوەو دڵیان پیسو خراپەو كرداریان پوچو بێ سودە. وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَبِمَا نَقْضِهِم مِّيثَاقَهُمْ لَعَنَّاهُمْ وَجَعَلْنَا قُلُوبَهُمْ قَاسِيَةً يُحَرِّفُونَ الْكَلِمَ عَن مَّوَاضِعِهِ وَنَسُوا حَظًّا مِّمَّا ذُكِّرُوا بِهِ﴾[3] واتە: ئینجا بە هۆی پاشگەزبوونەوەیان لە پەیمانەكەیان نەفرەتمان لێ كردنو دڵەكانیانمان گێڕا بە دڵێكی ڕەقو وشك وتەو فەرموودەی خودا لادەدەن لە شوێنەكانی خۆیو لەبیریان كرد بەشێكی زۆر لەوەی كە ئامۆژگاری كرابوون پێی. واتە: دڵیان خراپ بوو پاشانیش ڕەق بوو دەستیان كرد بە گۆڕینی كتێبەكانی خوداو وازیان لەو كردارانە هێنا كە فەرمانیان پێ كرابوو ئەو شتانەی كە خودا قەدەغەی كردبوو شكاندیان دەستیان دایە تاوانو خراپەكاری. بۆیە خوای گەورە داوای كردووە لە خاوەن باوەڕەكان كە وەك ئەوانە نەكەن لە شتە بنەڕەتیو فەرعیەكانیشدا، پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿اعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ يُحْيِي الْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا ۚ قَدْ بَيَّنَّا لَكُمُ الْآيَاتِ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ﴾ ئەوە بزانن، كە خودایە زەمین زیندوو دەكاتەوە پاش مردنی، زۆر نیشانەی ئاشكرامان بۆ ئێوە ڕوون كردووەتەوە، بەڵكو ئێوە تێ بگەن. ئەم ئایەتە ئیشارەتی تێدایە كە خوداغی گەورە دڵەكان نەرم

---

[1] مسلم (٢٣١٩/٤).

[2] النسائي في الكبرى (٤٨١/٦)، فەرموودەیەكی سەحیحە.

[3] المائدة (١٣).

دەكات دوای ڕەقبوونی. وە ڕێ نیشانی سەرلێشێواو دەدات دوای گومڕابوونی. وە دەرگای ناڕەحەتی دەكاتەوە پاش داخستنیو گرانی. وەك چۆن زەوی مردوو وشك بە بارانی زۆرو لێزمە زیندوو دەكاتەوە. هەر بەو شێوەیە ڕێگا نیشانی دڵە ڕەقەكان دەداتو بەو هەموو بەڵگەو نیشانانەی كە لە قورئاندایە، ڕۆشنایی‌و دەخاتە ناویەوە پاش ئەوەی كە داخرابوو هیچ شتێكی تێ نەدەچوو. پەسەنی هەر بۆ ئەو خودایە كە ویستی هەر كەسێك شارەزا بكات لە گومڕایی دەیكات. وە هەر كەسیش ویستی لێ بێ گومڕای دەكات پاش ڕێكی‌و تەواوی. ئەو خودایەی كە مەیلی لە هەر شتێك بێت دەیكات لە هەموو كارێكدا دادپەروەرو كارزانەو دڵسۆزو زاناو بەرزو مەزنە.

﴿إِنَّ ٱلْمُصَّدِّقِينَ وَٱلْمُصَّدِّقَـٰتِ وَأَقْرَضُوا۟ ٱللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا يُضَـٰعَفُ لَهُمْ وَلَهُمْ أَجْرٌ كَرِيمٌ ﴿١٨﴾ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦٓ أُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلصِّدِّيقُونَ ۖ وَٱلشُّهَدَآءُ عِندَ رَبِّهِمْ لَهُمْ أَجْرُهُمْ وَنُورُهُمْ ۖ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَكَذَّبُوا۟ بِـَٔايَـٰتِنَآ أُو۟لَـٰٓئِكَ أَصْحَـٰبُ ٱلْجَحِيمِ ﴿١٩﴾﴾

**پاداشتی ئەوانە ماڵ بەخت دەكەن و ئەوانەیش لە ڕاستی لایان نەداوەو ئەوانەیش لە ڕێی خودا كوژراون و پاشەڕۆژی خوانەناسانیش**

خوای گەورە باسی پاداشتی پیاوانو ژنانی خاوەن باوەڕان دەكات كە سامانی خۆیان بەخشیوە لە ڕێی خوداو داویانە بە هەژارو نەبووانو دەست كورتانو فەرموویەتی: ﴿إِنَّ ٱلْمُصَّدِّقِينَ وَٱلْمُصَّدِّقَـٰتِ وَأَقْرَضُوا۟ ٱللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا يُضَـٰعَفُ لَهُمْ وَلَهُمْ أَجْرٌ كَرِيمٌ﴾ بێگومان پیاوانو ژنانی خێرومەندو ئەوانەیش كە قەرزی ڕەوا دەدەن بە خودا چەند قاتیان پێدەگاتەوەو پاداشتی باشیشیان دەبێت. واتە: بە نیەتێكی پاكو لەبەر ڕەزامەندی خوای گەورە هیچ پاداشتو سوپاسێكیان ناوێت لەو كەسەی كە ماڵەكەیان داوەتێ، بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿يُضَـٰعَفُ لَهُمْ﴾ واتە: لە باتی ئەو چاكەیە خودا بە دە قات پاداشتیان دەداتەوە و زیادیشی دەكات هەتا دەگاتە حەوت سەد قاتو زیاتریش لەوە. ﴿وَلَهُمْ أَجْرٌ كَرِيمٌ﴾ واتە: پاداشتی گەورەو چاكو پاشەڕۆژی باشو شوێنو پلەی بەرزیان هەیە. وە دەفەرمووێت: ﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦٓ أُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلصِّدِّيقُونَ ۖ وَٱلشُّهَدَآءُ عِندَ رَبِّهِمْ لَهُمْ أَجْرُهُمْ وَنُورُهُمْ ۖ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَكَذَّبُوا۟ بِـَٔايَـٰتِنَآ أُو۟لَـٰٓئِكَ أَصْحَـٰبُ ٱلْجَحِيمِ﴾ ئەو كەسانەی بە خوداو پێغەمبەرەكەی باوەڕ دەكەن، لە ڕاستی لایان نەداوە ئەو كەسانەش كە لە ڕای خودا كوژراون، وان لە لای پەروەردگاریانو پاداشتی خۆیان پێدەگاتو ڕۆشنایی خۆیان هەیە، ئەوانەیش كە ناسوپاسنو بە نیشانەكانی ئێمە باوەڕ ناكەن، ئەوان یارانی ئاگرن. ئەمە تەواوكەری ڕستەیەكە كە وەسفی خاوەن باوەڕ دەكات بە خوداو بە پێغەمبەرانی كە لە ڕاستی لایان نەداوە كە بریتین لە ڕاستگۆیان، عەوفی

دەڵێت: لە ئیبنو عەباسەوە: ﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦٓ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلصِّدِّيقُونَ﴾ ئەم ڕستەیە جیابووەتەوە لە: ﴿وَٱلشُّهَدَآءُ عِندَ رَبِّهِمۡ لَهُمۡ أَجۡرُهُمۡ وَنُورُهُمۡ﴾.[1] ئەبو زوحا دەڵێت: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلصِّدِّيقُونَ﴾ پاشان قسەکە دەستی پێ کردووەتەوە فەرموویەتی: ﴿وَٱلشُّهَدَآءُ عِندَ رَبِّهِمۡ﴾.[2] مەسروق و زەحاك‌و موقاتلی کوڕی حەیان‌و کەسانی تریش هەر وایان وتووە. ئەعمەش دەڵێت: لە ئەبو زوحاوە ئەمیش لە مەسروقەوە لە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودەوە لەم ئایەتەدا: کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلصِّدِّيقُونَۖ وَٱلشُّهَدَآءُ عِندَ رَبِّهِمۡ﴾ دەڵێت ئەمانە سێ تیرەن: واتە: خێرومەندان‌و ڕاستگۆیان‌و شەهیدان. وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ فَأُوْلَٰٓئِكَ مَعَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِم مِّنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ وَٱلصِّدِّيقِينَ وَٱلشُّهَدَآءِ وَٱلصَّٰلِحِينَ﴾[3] واتە: وە هەر کەسێك گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەر بکات جا ئەوانە لەگەڵ کەسانێکن کە خودا بەهرەی ڕشتووە بەسەریاندا لە پێغەمبەران‌و ڕاستگۆیان‌و شەهیدان‌و پیاوچاکان. لێرەدا جیاوازی کردووە لە نێوان ڕاستگۆیان و شەهیداندا ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە دوو دەستەن‌و گومانیشی تێدا نیە کە پلەی سیدیق لە شەهیدان بەرزترە وەك ئیمامی مالکی کوڕی ئەنەس ڕیوایەتی کردووە لە کتێبەکەیدا(الموطأ) لە ئەبو سەعیدی خدریەوە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (خەڵکی بەهەشت سەیری ئەهلی کۆشکەکان لەسەری خۆیانەوە دەکەن وەك چۆن سەیری ئەو ئەستێرە پڕشنگدارانە دەکەن لە ئاسۆی ڕۆژهەڵات‌و ڕۆژئاوادا دیارن‌و مانەتەوە لەبەر جیاوازی نێوانیان)، وتی: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەوانە شوێنی پێغەمبەرانن (سەلامی خوایان لێبێت) بێجگە لەوان کەسی تر نایگاتێ؟ فەرمووی: (بەڵێ، سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە پیاوانێك بوون باوەڕشیان بە خودا هەبوو پێغەمبەرانیشیان بە ڕاست زانی). بوخاری‌و موسلیم یەك ڕان لەسەر ئەم فەرمودە.[4] خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَٱلشُّهَدَآءُ عِندَ رَبِّهِمۡ﴾ واتە: شەهیدان لای خودا لەناو بەهەشت‌و خۆشیدان وەك لە فەرموودەی سەحیحدا هاتووە: (کە گیانی شەهیدەکان لەناو چێڵانەی باڵندەیەکی سەوزدان دەگەڕێن لەناو بەهەشتدا بە ئارەزووی خۆیان پاشان دەڕۆنە ناو ئەو قەنادیلانە جارێك بە سەری کردوونەتەوە (سەری لێ داون) فەرموویەتی: چیتان دەوێت؟ وتیان: حەز دەکەین بمانگێڕیتەوە بۆ دنیا تا لە ڕێی تۆدا بجەنگین‌و بکوژرێین وەك چۆن یەکەم جار کوژراین. خوای

[1] الطبري (٢٣/١٩١).
[2] الطبري (٢٣/١٩١).
[3] النساء (٦٩).
[4] فتح الباري (٦/٣٦٨)، مسلم (٤/٢١٧٧).

گەورە فەرموویەتی: ((من بڕیارم داوە ئەوانە جارێکیتر ناگەڕێنەوە بۆ دنیا)).[١] وە دەفەرمووێت: ﴿لَهُمۡ أَجۡرُهُمۡ وَنُورُهُمۡ﴾ واتە: ئەوانە لای خودا پاداشتی چاكو ڕۆشنایی خۆیان هەیە لەبەر دەمیانەوە دەڕواتو ڕۆشنایەكەشیان لە یەكتری جیاوازە هەر كەسەو بە پێی كرداری خۆی كە لە دنیا كردوویەتی وەك ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی كردووە لە عومەری كوڕی خەتابەوە دەڵێت: بیستم لە پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) فەرموویەتی: (شەهید چوار جۆرە، پیاوێكی موسڵمان باوەڕێكی چاكی هەیە گەیشتووە بە دوژمنو ڕاستی كردووە لەگەڵ خواداو كوژراوە ئەوە ئەو كەسەیە كە خەڵكی بۆی دەڕوانن ئا بەو شێوەیە، وا سەری مێزەرەكەی لەسەری كەوتە خوارەوە یان مێزەرەكەی عومەر كەوتە خوارەوە، دووهەم موسڵمانێكە گەیشتووە بە دوژمن وەك ئەوەی كە بە دڕكی تەلح لێی بدرێت تیرێكی وێڵ لە دوور هاتو لێیداو كوشتی ئەوە لە پەی دووهەمدایە، سێیەم پیاوێكی خاوەن باوەڕە كاری چاكو خراپی تێكەڵاو كردووەو گەیشتووە بە دوژمن ڕاستی كردووە لەگەڵ خوادا هەتا كوژراوە ئەوەیش لە پلەی سێهەمدایە. چوارەم پیاوێكی خاوەن باوەڕە زۆر بە گوێی ئارەزووی خۆی كردووە لە ئەندازە بەدەر گەیشتووە بە دوژمن ڕاستی كردووە لەگەڵ خوادا هەتا كوژراوە ئەوەیش لە پلەی چوارەمدایە).[٢] هەر بەم شێوەیە عەلی كوڕی مەدینی ڕیوایەتی كردووەو دەڵێت ئەمە ئیسنادی میسریەو باشە[٣]. تیرمیزیش ڕیوایەتی كردووەو دەڵێت: چاكو غەریبە (حسن غریب).[٤] خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَكَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَآ أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَحِيمِ﴾ ئەوانەی بە نیشانەكانی ئێمە باوەڕ ناكەن ئەوانە هاوەڵانی ئاگرن. كاتێك باسی ژیانو پاشەڕۆژی بەختەوەرانی باس كرد بە دوای ئەواندا باسی ژیانو پاشەڕۆژی خوانەناسانیش باس كردووە.

﴿ٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّمَا ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَا لَعِبٞ وَلَهۡوٞ وَزِينَةٞ وَتَفَاخُرُۢ بَيۡنَكُمۡ وَتَكَاثُرٞ فِي ٱلۡأَمۡوَٰلِ وَٱلۡأَوۡلَٰدِۖ كَمَثَلِ غَيۡثٍ أَعۡجَبَ ٱلۡكُفَّارَ نَبَاتُهُۥ ثُمَّ يَهِيجُ فَتَرَىٰهُ مُصۡفَرّٗا ثُمَّ يَكُونُ حُطَٰمٗاۖ وَفِي ٱلۡأٓخِرَةِ عَذَابٞ شَدِيدٞ وَمَغۡفِرَةٞ مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضۡوَٰنٞۚ وَمَا ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَآ إِلَّا مَتَٰعُ ٱلۡغُرُورِ ﴿٢٠﴾ سَابِقُوٓاْ إِلَىٰ مَغۡفِرَةٖ مِّن رَّبِّكُمۡ وَجَنَّةٍ عَرۡضُهَا كَعَرۡضِ ٱلسَّمَآءِ وَٱلۡأَرۡضِ أُعِدَّتۡ لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦۚ ذَٰلِكَ فَضۡلُ ٱللَّهِ يُؤۡتِيهِ مَن يَشَآءُۚ وَٱللَّهُ ذُو ٱلۡفَضۡلِ ٱلۡعَظِيمِ ﴿٢١﴾﴾

---

[١] مسلم (١٥٠٢/٣).

[٢] احمد (٢٣/١)، فەرموودەیەكی لاوازە.

[٣] علل الحدیث (٣٤٩/١)، فەرموودەیەكی لاوازە.

[٤] تحفة الأحوذي (٢٧٤/٥)، فەرموودەیەكی لاوازە.

## ژیانی دنیا گەمەو گاڵتەو خۆهەڵبڕنیە

خوای گەورە باسی بێ بایەخیو سوك سەیرکردنی دنیا دەکاتو فەرموویەتی: ﴿ٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّمَا ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا لَعِبٌ وَلَهْوٌ وَزِينَةٌ وَتَفَاخُرٌۢ بَيْنَكُمْ وَتَكَاثُرٌ فِى ٱلْأَمْوَٰلِ وَٱلْأَوْلَٰدِ كَمَثَلِ غَيْثٍ أَعْجَبَ ٱلْكُفَّارَ نَبَاتُهُۥ ثُمَّ يَهِيجُ فَتَرَىٰهُ مُصْفَرًّا ثُمَّ يَكُونُ حُطَٰمًا وَفِى ٱلْءَاخِرَةِ عَذَابٌ شَدِيدٌ وَمَغْفِرَةٌ مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضْوَٰنٌ وَمَا ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَآ إِلَّا مَتَٰعُ ٱلْغُرُورِ﴾ بزانن، ژیان لە دنیادا هەر گەمەو بادەی هەوایەو خۆ بە جوان نیشاندانو خۆ لەسەر یەکتر ڕانانو فرەبوونی ئەولادو داراییتانەو وەك تۆمی وەشاو بە هۆی بارانەوە شین بووەو جوتیاری پێ دڵخۆشن بووەو بەرەبەرە وشك دەبێتو دەبینی زەرد هەڵگەڕاوەو لە دواییدا بووەتە کاو کوتی بەربا، لەولاش ئازاری دژوارو لێخۆشبوونو ڕەزامەندی خودا هەیە، ژینی دنیا هەر مایەی خەڵەتاندنەو چی تر نیە. واتە: ژیانی دنیا لەوە زیاتر نیە کە خەڵکەکەی وەدەستی دێنێت ئا بەو شێوەیەی کە خوای گەورە باسی کردووە. وەك لێرەشدا فەرموویەتی: ﴿زُيِّنَ لِلنَّاسِ حُبُّ ٱلشَّهَوَٰتِ مِنَ ٱلنِّسَآءِ وَٱلْبَنِينَ وَٱلْقَنَٰطِيرِ ٱلْمُقَنطَرَةِ مِنَ ٱلذَّهَبِ وَٱلْفِضَّةِ وَٱلْخَيْلِ ٱلْمُسَوَّمَةِ وَٱلْأَنْعَٰمِ وَٱلْحَرْثِ ذَٰلِكَ مَتَٰعُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَٱللَّهُ عِندَهُۥ حُسْنُ ٱلْمَـَٔابِ﴾[1] واتە: جوان کراوە بۆ خەڵکی (دنیاپەرست) خۆشیو ئارەزواتی نەفسی لە ئافرەتانو کوڕانو دارایی زۆری کەڵەکەکراو لە ئاڵتونو زێڕو زیوو ئەسپو ماینانی نیشانەدار (بە سپێتی ناوچەوانیانو هەرچوار پەلی) هەورەها ئاژەڵو چوارپێ یانو کشتوکاڵ ئەمانە بەهرەو کەلوپەلی زیندەگانیی ژیانی دنیان و لای خوا هەیە خۆشترین جێی پاشەڕۆژ. پاشان خوای مەزن نموونەی ژیانی دنیا دێنێتەوە وەك گوڵێك چۆن لەناو دەچێتو خۆشیەك چۆن دەڕواتو بەسەر دەچێت فەرموویەتی: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِى يُنَزِّلُ ٱلْغَيْثَ مِنۢ بَعْدِ مَا قَنَطُوا۟﴾[2] واتە: وە خوا ئەو زاتەیە کە باران دەبارێنێت لە پاش ئەوەی کە خەڵکی نائومێد بوون. وە دەفەرمووێت: ﴿أَعْجَبَ ٱلْكُفَّارَ نَبَاتُهُۥ﴾ وەك چۆن جوتیار دڵخۆش دەبێت بە کشتوکاڵەکەی هەر بەو شێوەیە خوانەناسان بە ژیانی دنیا دڵخۆش دەبن چونکە ئەوانە هەمیشە خەریکی دنیانو بەردەوام دڵیان لایەتی. ﴿ثُمَّ يَهِيجُ فَتَرَىٰهُ مُصْفَرًّا ثُمَّ يَكُونُ حُطَٰمًا﴾ پاشان کەم کەم وشك دەبێت دەبینی زەرد دەبێت. دوای ئەوەی کە سەوزو جوان بوو پاشانیش دەبێت بە پوش، واتە: دەبێت بە کاو کوتی بەر با. ژیانی دنیاش هەر وایە لە سەرەتاوە لاویەو پاشان تەمەنی پیاوەتیو پاشانیش پیریو لاوازەو داماوی. مرۆڤ لە سەرەتای تەمەنیەوەو لە

---

[1] ال عمران (١٤).

[2] الشوری (٢٨).

کاتی لاویدا جوان‌و ڕێك‌و پێك بەژن‌و باڵا ڕێك هاوکاری ناو خەڵکەو هەمیشە دەم بە زەردەخەنەیە. پاشان کەم کەم دەچێت بە ساڵەوەو بەرەو پیری دەڕوات‌و هەڵسوکەوتی دەگۆڕێت‌و جەستەی بەرەو لاوازبوون دەچێت. دەبێتە پیاوێکی بە تەمەن‌و ڕیش سپی‌و بێ هێز توانای جوڵانی کەم دەبێتەوە توانای هیچ شتێکی نامێنێت. وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن ضَعْفٍ ثُمَّ جَعَلَ مِنۢ بَعْدِ ضَعْفٍ قُوَّةً ثُمَّ جَعَلَ مِنۢ بَعْدِ قُوَّةٍ ضَعْفًا وَشَيْبَةً يَخْلُقُ مَا يَشَآءُ وَهُوَ ٱلْعَلِيمُ ٱلْقَدِيرُ﴾[1] واتە: خوا زاتێکە ئێوەی دروست کردووە لە لاوازی (لاوازی نوتفەو بێچوو منداڵی شیرەخۆرە) پاشان دوای لاوازی بەهێزی کردوون لە دوای بەهێزکردنتان لاوازی‌و پیری بۆ دانان خوا هەرچی بوێت دروستی دەکات‌و هەر ئەوە زانای بە دەستەڵات. لە کاتێکدا ئەم نموونەیە بەڵگە بێت لەسەر نەمانی دنیاو تەواوبوون‌و چۆڵ بوونی. گومانی تێدا نیە کە ڕۆژی دوایی دێت. بۆیە خوای گەورە ئاگاداری داوە لە بارەیەوەو مرۆڤیشی هەڵناوە بۆ ئەو شتە چاکانەی کە تیایەتی‌و خوا دایناوە بۆ خاوەن باوەڕان‌و فەرموویەتی: ﴿وَفِى ٱلْـَٔاخِرَةِ عَذَابٌ شَدِيدٌ وَمَغْفِرَةٌ مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضْوَٰنٌ وَمَا ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَآ إِلَّا مَتَٰعُ ٱلْغُرُورِ﴾ واتە: لەو ڕۆژی دوایەدا کە دێت‌و زۆر نزیکە یان بەملایە یان بە ئەو لادا (یان جەزرەبەی زۆر بەهێز یان لێخۆشبوون‌و ڕەزامەندی لە لایەن خوای گەورەوە). خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿وَمَا ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَآ إِلَّا مَتَٰعُ ٱلْغُرُورِ﴾ واتە: ژیانی دنیا فریودەرە بۆ کەسێك کە زۆر خۆی خەریك بکات پێیەوە. وای لێ دەکات کە لە خۆی بایی دەبێت زۆر دڵی پێی خۆش دەبێت‌و هەتا وا دەزانێت کە ژیان لەمە خۆشتر نیەو پاش ژیانی دنیا ژیانێکی تر نیەو زیندوو نابێتەوە. ئەم دنیایە زۆر کەم‌و بێ بایەخە لەچاو ڕۆژی قیامەتدا. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە عەبدوڵلاوە دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (ئەوسا بەهەشت نزیکترە لە هەر یەکێك لە ئێوەوە لە پەتی (قەیتانی) نەعلەکەیەوە ئاگریش هەر بەو شێوەیە).[2] بوخاری بە تەنها هێناویەتی لە (الرقائق)دا لە فەرموودەکەی سەوریدا[3]. لەم فەرموودەیەدا بەڵگە هەیە لەسەر نزیك بوونەوەی چاکەو خراپە لە خەڵکەوە. کاتێك کارەکە ئا بەو شێوەیە ئەوەندە ترسناکە لەبەر ئەوەیە خوای گەورە داوا دەکات کە بەندەکانی پەلە بکەن بۆ چاکەکردن‌و خواپەرستی‌و وازبێنن لە خراپەو تاوان کردن کە دەبێتە مایەی لێخۆشبوونی خوای گەورەو وەرگرتنی پاداشت‌و پلەی بەرز. خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿سَابِقُوٓا۟ إِلَىٰ مَغْفِرَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ وَجَنَّةٍ عَرْضُهَا كَعَرْضِ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ أُعِدَّتْ لِلَّذِينَ

---

[1] الروم (٥٤).

[2] احمد (٣٨٧).

[3] فتح الباري (١١/٣٢٨).

ءَامَنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ ۚ ذَٰلِكَ فَضْلُ ٱللَّهِ يُؤْتِيهِ مَن يَشَآءُ ۚ وَٱللَّهُ ذُو ٱلْفَضْلِ ٱلْعَظِيمِ﴾ پەلە بکەن بۆ بەخشینی پەروەردگارو ئەو بەهەشتەش کە پانایی بە پانایی ئەم ئاسمانو زەمینەیەو بۆ ئەوانە ئامادەیە کە باوەڕیان بە خواو پێغەمبەرانی خودا هەیە. ئەم چاکەیە لە خواوەیەو دەربارەی کەسێکی دەکات کە بۆ خۆی مەیلی لەسەر بێت، چاکەی خودا زۆر گەورەیە. مەبەست پێی جنسی ئاسمانو زەمینە وەك خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿وَسَارِعُوٓا۟ إِلَىٰ مَغْفِرَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ وَجَنَّةٍ عَرْضُهَا ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلْأَرْضُ أُعِدَّتْ لِلْمُتَّقِينَ﴾[1] واتە: پێشبڕکێ بکەن بۆ لێبوردنێکی گەورە لە لایەن پەروەردگارتانەوەو بۆ بەهەشتێك کە پانییەکەی بە ئەندازەی ئاسمانەکانو زەویە کە ئامادەکراوە بۆ لەخواترسان. لێرەدا فەرموویەتی: ﴿أُعِدَّتْ لِلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ ۚ ذَٰلِكَ فَضْلُ ٱللَّهِ يُؤْتِيهِ مَن يَشَآءُ ۚ وَٱللَّهُ ذُو ٱلْفَضْلِ ٱلْعَظِيمِ﴾ واتە: ئەوەی کە خودا بۆی ئامادە کردوونو دایناوە بۆیان لە ڕێزو منەتو چاکەی خۆیەتی بۆ بەندەکانی وەك لە پێشەوە باسمان کرد لە فەرموودەی سەحیحدا کە هەژارە کۆچەریەکان وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەوڵەمەندەکان گەیشتنە بە پلەی بەرزو پاداشتی زۆر خۆشو هەتاهەتایی. پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەوە کامەیە؟ وتیان: وەك ئێمە نوێژ دەکەنو وەك ئێمە ڕۆژو دەگرنو ماڵ بەخت دەکەن ئێمە نایکەینو کۆیلە ئازاد دەکەن ئێمە نایکەین، فەرمووی: (ئایا شتێکتان پیشان بدەم ئەگەر کردتان پێش ئەوانەی پاش خۆتان بکەون و هیچ کەس لە ئێوە بەڕێزتر نەبێت مەگین کەسێك هەڵسێت بەو کارەی ئێوە دەیکەن، پاش هەموو نوێژێك سیو سێ (٣٣) جار (سبحان الله)و (الله أكبر)و (الحمد لله) بکەن)، دەڵێت: گەڕانەوەو وتیان: خاوەن ماڵەکان لە براکانمان بیستیان ئەوەی ئێمە کردمان ئەوانیش کردیان وەك ئێمە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (ئەوە ڕێزێکی خودایە دەیدات بە هەر کەسێك خۆی مەیلی لێبێت)[2].

﴿مَآ أَصَابَ مِن مُّصِيبَةٍ فِى ٱلْأَرْضِ وَلَا فِىٓ أَنفُسِكُمْ إِلَّا فِى كِتَٰبٍ مِّن قَبْلِ أَن نَّبْرَأَهَآ ۚ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٌ ﴿٢٢﴾ لِّكَيْلَا تَأْسَوْا۟ عَلَىٰ مَا فَاتَكُمْ وَلَا تَفْرَحُوا۟ بِمَآ ءَاتَىٰكُمْ ۗ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ كُلَّ مُخْتَالٍ فَخُورٍ ﴿٢٣﴾ ٱلَّذِينَ يَبْخَلُونَ وَيَأْمُرُونَ ٱلنَّاسَ بِٱلْبُخْلِ ۗ وَمَن يَتَوَلَّ فَإِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْغَنِىُّ ٱلْحَمِيدُ ﴿٢٤﴾﴾

---

[1] ال عمران (١٣٣).

[2] مسلم (٤١٦/١).

## هەر بەڵایەك تووشی مرۆڤ دەبێت هەمووی نووسراوە

خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿مَآ أَصَابَ مِن مُّصِيبَةٍ فِى ٱلْأَرْضِ وَلَا فِىٓ أَنفُسِكُمْ إِلَّا فِى كِتَـٰبٍ مِّن قَبْلِ أَن نَّبْرَأَهَآ ۚ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٌ﴾ هەر بەڵایەك ڕوودەدات لەم سەر زەمینەو هەر بەڵایەك کە بەسەر خودی خۆتان دێت لە دەفتەرێکدا نوسراوەو ئەمە لای خودا ئاسانە. خوای گەورە باسی ئەوەمان بۆ دەکات کە پێش ئەوەی دروستکراوەکان وەدی بهێنێت هەموو شتێکی نووسیوەو دایناوە فەرموویەتی: ﴿مَآ أَصَابَ مِن مُّصِيبَةٍ فِى ٱلْأَرْضِ وَلَا فِىٓ أَنفُسِكُمْ﴾ واتە: لەسەر زەمینو بەسەر خۆشتان هەر بەڵایەك ڕوودەدات، ﴿إِلَّا فِى كِتَـٰبٍ مِّن قَبْلِ أَن نَّبْرَأَهَآ﴾ واتە: پێش ئەوەی دروستکراوەکان وەدی بهێنینو گیانی بکەین بەبەردا هەموو شتێکمان داناوەو نووسیومانە. قەتادە دەڵێت: هەر بەڵایەك کەڕوودەدات لە وشکەساڵی، واتە: لە ساڵی بێ بارانی، ﴿وَلَا فِىٓ أَنفُسِكُمْ﴾ هەر بەڵایەکیش تووشی خۆتان دەبێت لە نەخۆشیو ئازار، وە هەواڵیشمان پێ گەیشتووە کە هیچ کەسێك نیە چڵەداری ڕووکاندبێتیو پێی هەڵکەوتبێتو ئێشێکی پێسکی بیەشێت لە ڕۆیشتن یان لە ماندووبوون مەگین بە هۆی تاوانەوە، نوسراوە بەڵام لێبوردنی خودا زیاترە.[1] ئەم ئایەتە گەورەترین بەڵگەیە لەسەر قەدەریەکان ئەوانەی کە باوەڕیان بە ئاگاداربوونی خودا نیە پێش ڕوودانی شتەکان (خوای گەورە ڕوویان ڕەش بکات) ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە عەبدوڵلای کوڕی عەمری کوڕی عاسەوە دەڵێت: بیستم لە پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) دەیفەرموو: (خوای گەورە ڕوودانی شتەکانی دیاری کردووە (داناوەو نووسیویەتی) پێش دروستکردنی ئاسمانەکانو زەمین بە پەنجا هەزار ساڵ).[2] واتە: پەنجا هەزار ساڵ پێش دروستکردنی ئاسمانەکانو زەمین خوای گەورە هەمووشتێکی داناوەو نووسیویەتی. لە کتێبێکدا. ئیمامی موسلیمیش لە سەحیحەکەیدا هەر بەم شێوەیە ڕیوایەتی کردووە ئەمەیش لێ زیادکردووە ﴿وَكَانَ عَرْشُهُۥ عَلَى ٱلْمَآءِ﴾ کاتێك کە عەرشەکەی لەسەر ئاو بوو. تیرمیزیش ڕیوایەتی کردووەو دەڵێت: چاكو ڕاستە[3]. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٌ﴾ واتە: ئاگاداری خودا لەسەر هەموو شتەکان پێش دروست بوونیو نووسینی بە پێی ڕوودانی لە کاتی خۆیدا زۆر ئاسانە بۆ خودای گەورە. چونکە خودا ئاگای لەو شتانەیە کە بوون وە ئەوانەی کە نەبوونو ئەوانەش کە نابنو ئەگەر بوونی چۆن بوون.

---

[1] الطبري (٢٣/١٩٦).

[2] احمد (٢/١٦٩)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[3] مسلم (٤/٢٠٤٤)، تحفة الأحوذي (٦/٣٧٠).

**فەرماندان بە خۆڕاگری و شوکرانەبژێری**

خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿لِّكَيْلَا تَأْسَوْا عَلَىٰ مَا فَاتَكُمْ وَلَا تَفْرَحُوا بِمَا آتَاكُمْ ۗ وَاللَّهُ لَا يُحِبُّ كُلَّ مُخْتَالٍ فَخُورٍ﴾ هەتا ئێوە بۆ شتێك لە دەسستان دەچێت، خەم نەخۆن و بە دەسکەوتووتان و دڵخۆش نەبن. خوای هەر ئەوانەی خۆش ناوێت کە بە فیزن و شانازی بە خۆیان دەکەن. واتە: ئاگادارمان کردن کە زانیمان بە هەموو شتێك هەیە و لە پێشەوە هەموو شتێکمان نووسیوە پێش ئەوەی ببێت و ئەندازەمان بۆ هەموو شتێك داناوە پێش ئەوەی بێتەدی. بۆ ئەوەی بزانن ئەوەی کە توشتان بووە بە هەڵە نەبووە دەبوو هەر توشتان ببووایە، وە ئەوەیش کە تووشی نەبوو دەبوو هەر بەسەرتان نەیەت. دڵگران مەبن بەوەی کە لە دەستتان چووە. چونکە خوای گەورە هەر شتێکی نووسی دەبێت هەر ببێت. ﴿وَلَا تَفْرَحُوا بِمَا آتَاكُمْ﴾ واتە: دڵخۆشیش مەبن بەوەی کە دەستتان کەوتووە. ماناى ﴿آتَاكُمْ﴾ واتە: پێی بەخشیون. هەردوو ماناکە وەك یەکن، واتە: فیز مەکەن بەسەر مەردمدا بەوەی خودا پێی داون. چونکە ئەو شتە بە هەوڵ و ماندووبوونی ئێوە نەبووە بەڵکو بە قەدەری خودا بووە و ئەو بەهرانەی کە خودا داویەتی فیزو شانازی ئێوە مەکەن بەسەر خەڵکیدا. بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَاللَّهُ لَا يُحِبُّ كُلَّ مُخْتَالٍ فَخُورٍ﴾ واتە: فیز بە خۆیەوە بکات و شانازیش بەسەر خەڵکیدا بکات. عیکریمە دەڵێت: هیچ کەسێك نیە کە خەم نەخوات و دڵخۆشیش نەبێت. بەڵام بە خۆشیەکە سوپاسی خودا بکەن و لە خەم خواردنەکەشدا خۆڕاگر بن[1].

**باسی خراپیی ڕژد (بەخیل)**

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿الَّذِينَ يَبْخَلُونَ وَيَأْمُرُونَ النَّاسَ بِالْبُخْلِ ۗ وَمَن يَتَوَلَّ فَإِنَّ اللَّهَ هُوَ الْغَنِيُّ الْحَمِيدُ﴾ ئەوانەی ڕژدی دەکەن و خەڵکیش بۆ ڕژدی هان دەدەن هەر کەسیش لاساری دەکات. خودا ئەوسا بێ نیازە و هەر شیاوی تارف کردنە. واتە: خراپەکاری دەکەن و خەڵکیش هەڵدەنێن بۆ خراپە و تاوانکردن. ﴿وَمَن يَتَوَلَّ﴾ هەر کەسیش لە فەرمانی خودا لادەدات، ﴿فَإِنَّ اللَّهَ هُوَ الْغَنِيُّ الْحَمِيدُ﴾ وەك موسا پێغەمبەر(سەلامی خوای لێبێت) فەرموویەتی: ﴿إِن تَكْفُرُوا أَنتُمْ وَمَن فِي الْأَرْضِ جَمِيعًا فَإِنَّ اللَّهَ لَغَنِيٌّ حَمِيدٌ﴾[2] واتە: ئەگەر ئێوە ناسوپاسی (بەهرەکانی خودا) بکەن و هەموو ئەو کەسانەش لە زەویدان ئەوە بە ڕاستی خوا بێ نیازی سوپاسکراوە.

---

[1] الطبري (٢٣/١٩٨).

[2] ابراهيم (٨).

﴿لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِالْبَيِّنَاتِ وَأَنزَلْنَا مَعَهُمُ الْكِتَابَ وَالْمِيزَانَ لِيَقُومَ النَّاسُ بِالْقِسْطِ ۖ وَأَنزَلْنَا الْحَدِيدَ فِيهِ بَأْسٌ شَدِيدٌ وَمَنَافِعُ لِلنَّاسِ وَلِيَعْلَمَ اللَّهُ مَن يَنصُرُهُ وَرُسُلَهُ بِالْغَيْبِ ۚ إِنَّ اللَّهَ قَوِيٌّ عَزِيزٌ ﴿٢٥﴾﴾

**پێغەمبەران (سەلامی خوایان لێبێت) ڕەوانەکراون بە هەق و چەندەها موعجیزەو بۆ داد پەروەری**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِالْبَيِّنَاتِ وَأَنزَلْنَا مَعَهُمُ الْكِتَابَ وَالْمِيزَانَ لِيَقُومَ النَّاسُ بِالْقِسْطِ ۖ وَأَنزَلْنَا الْحَدِيدَ فِيهِ بَأْسٌ شَدِيدٌ وَمَنَافِعُ لِلنَّاسِ وَلِيَعْلَمَ اللَّهُ مَن يَنصُرُهُ وَرُسُلَهُ بِالْغَيْبِ ۚ إِنَّ اللَّهَ قَوِيٌّ عَزِيزٌ﴾ ئێمە پێغەمبەرانمان نارد بە چەند بەڵگەی ئاشکراوەو وێڕای ئەوان کتێبو هۆی هەڵسەنگاندنمان ناردە خوار، هەتا خەڵك بێ جیاوازی لەناو یەکدا ڕەفتار بکەن. ئاسنیشمان ناردووەتە خوار، کە هێزی بە تینی زۆرەو زۆر بەهرەی بۆ مەردم تێدایە، تا خودا بۆ خۆی بزانێت کێ لە نادیار دێتە یاریو خۆیو پێغەمبەرەکانی، دیارە خودا خاوەن هێزو دەسەڵاتە. ﴿بِالْبَيِّنَاتِ﴾ واتە: بە بەڵگەی ئاشکراو نیشانەی گەورە، دەلیلی تەواو. ﴿وَأَنزَلْنَا مَعَهُمُ الْكِتَابَ﴾ واتە: کە بریتیە لە ڕەوانەکردنی ڕاستی، ﴿وَالْمِيزَانَ﴾ هۆی هەڵسەنگاندنو دادپەروەری، موجاهدو قەتادەو کەسانی تریش وتوویانە.[1] ئەمەش ئەو ڕاستیەیە کە هەموو عەقڵێکی تەواو کە لەسەر ڕاستەڕێ بێت، دژی ئەو بۆچوونە لاوازو نەخۆشانەیە. وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿أَفَمَن كَانَ عَلَىٰ بَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّهِ وَيَتْلُوهُ شَاهِدٌ مِّنْهُ﴾[2] واتە: جا ئایا کەسێك بەڵگەیەکی ئاشکرای ببێت لە لایەن پەروەردگاریەوەو شایەتێك لای ئەوەوە بۆی بخوێنێتەوە. وە دەفەرمووێت: ﴿فِطْرَتَ اللَّهِ الَّتِي فَطَرَ النَّاسَ عَلَيْهَا﴾[3] واتە: شوێن ئایینی نێردراوی خوا بکەوە کە خەڵکی لەسەر دروست کردووە. وە فەرموویەتی: ﴿وَالسَّمَاءَ رَفَعَهَا وَوَضَعَ الْمِيزَانَ﴾[4] واتە: وە ئاسمانی بڵندو بەرزکردووەتەوەو تەرازو(ی عەدالەتی) داناوە. لەبەر ئەمەیە کە خودا فەرموویەتی: ﴿لِيَقُومَ النَّاسُ بِالْقِسْطِ﴾ واتە: بە هەقو دادپەروەری. ئەوەیش بە شوێنکەوتنی پێغەمبەرانو گوێڕایەڵی فەرمانەکانیان کە لە لایەن خوداوە بۆیان هاتووە. چونکە ئەو پەیامەی ئەوان هێناویانە هەر ئەوە ڕاستەو دوای ئەوە هیچ شتێکی تر ڕاست نیە، وەك خوای گەورە

---

[1] الطبري (٢٣/٢١٠).

[2] هود (١٧).

[3] الروم (٣٠).

[4] الرحمن (٧).

فەرموویەتی: ﴿ وَتَمَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ صِدْقًا وَعَدْلًا ﴾[1] واتە: وە فەرمانو وتەی پەروەردگارت تەواو بووەو بە ئەنجام گەیشت بە ڕاستیو دروستی. واتە: ڕاستگۆیە لە هەواڵەکانیداو دادپەروەرە لە فەرمانو ئەو شتانەی کە فەرموویەتی وازی لێ بێننو لێی دووربکەونەوە. بۆیە دەفەرمووێت بە خاوەن باوەڕان (کاتێك کۆشکەکانیان بۆ ئامادە دەکرێتو دەڕازێنرێتەوە لە باغەکانی بەهەشتدا لە شوێنە بەرزەکاندا لەسەر تەختی ڕیزکراو: ﴿الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي هَدَانَا لِهَٰذَا وَمَا كُنَّا لِنَهْتَدِيَ لَوْلَا أَنْ هَدَانَا اللَّهُ لَقَدْ جَاءَتْ رُسُلُ رَبِّنَا بِالْحَقِّ﴾[2] واتە: سوپاس بۆ ئەو خودایەی کە ڕێنموونی کردین بۆ ئەم ڕێگایە کە ئێمە هەرگیز ڕێبازی ڕاست شارەزا نەدەبووین ئەگەر خودا ڕێنموونی نەکردینایە سوێند بە خوا بێگومان نێردراوەکانی پەروەردگارمان ڕاستیان هێنا.

**سوودەکانی ئاسن**

خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿وَأَنزَلْنَا الْحَدِيدَ فِيهِ بَأْسٌ شَدِيدٌ﴾ واتە: ئاسنمان ناردووە کە زۆر بەکارە بۆ گەڕانەوەو سەرپێدانەواندنی ئەو کەسانەی کە گوێ بۆ هەق ناگرنو دژایەتی دەکەن پاش بەڵگە هێنانەوە بۆیان، لەبەر ئەوەبوو پێغەمبەری خودا(ﷺ) سیانزە ساڵ لە مەککە مایەوە پاش پێغەمبەریەتی، سورەتی مەککی بۆ دەهاتە خوارەوە هەموو مشتومڕ بوو لەگەڵ بتپەرستانو باسی بە تەنها ناسینی خودای بۆ دەکردن بەڵگەی بۆ دەهێنانەوەو بۆی ڕوون دەکردنەوە. کاتێك بەڵگەی تەواوی گەیاند بە بتپەرستاەکان، خوای مەزن ڕێگای کۆچ کردنی پێدانو فەرمانی دانێ بە شمشێر بدەن لە ملی ئەو کەسەی کە دژایەتی قورئانی کردووەو باوەڕی پێنەهێناوەو ڕێگربووە. ئیمامی ئەحمەدو ئەبو داود ڕیوایەتیان کردووە لە ئیبنوعومەرەوە دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (ڕەوانە کراوم بە شمشێر لەبەر دەمی قیامەتدا (لە کۆتایی دنیاو نزیك بوونەوەی قیامەت) هەتا تەنها خودا بپەرسترێت بەبێ هاوەڵو ڕۆزیشم لە ژێر سێبەری ڕمەکەمدایە زەبوونیو سەرشۆڕی بۆ ئەو کەسانەیە کە دژایەتی فەرمانی من دەکەن. هەر کەسێك خۆی وەك گەلێکی تر نیشان بدات ئەوە ئەو کەسە لەوانە).[3] بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فِيهِ بَأْسٌ شَدِيدٌ﴾ واتە: چەك کە بریتیە لە شمشێرو ڕمو تیرو درعو هەر شتێکی تر بەکاربهێنرێت بۆ جەنگ، ﴿وَمَنَافِعُ لِلنَّاسِ﴾ واتە: بۆ ڕۆزی وەدەست هێنانو لێدانی دراوو تەور و تەورژێن هەڵکۆڵینی دارو ئاسنو مشارو تاشینی

---

[1] الانعام (١١٥).

[2] الاعراف (٤٣).

[3] احمد (٢/٥٠)، ابو داود (٤/٣١٤)، لە سورەتی (البقرة)دا لە ئایەتی (١٠٤) پلەکەی دیاری کراوە.

بەردو دارو ئاسنو ئەو ئامێرانە کە بەکار دەهێنرێن بۆ زەوی کێڵانو چنینو چێشت لێنانو نان دروست کردن هەر شتێکی تری پێویست بۆ خەڵکی بەکاری دێنن لە ژیانی ڕۆژانەدا. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلِيَعْلَمَ ٱللَّهُ مَن يَنصُرُهُۥ وَرُسُلَهُۥ بِٱلْغَيْبِ﴾ واتە: لە دڵیدایە کە هەچ هەڵگرێتو یارمەتی خوداو پێغەمبەرەکانی دەدات، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ قَوِىٌّ عَزِيزٌ﴾ واتە: دیارە خودا خاوەنی هێزو دەسەڵاتە، مەیلی لە هەر کەس بوێت یارمەتی دەداتو بەبێ ئەوەی پێویستی بە کەس ببێت، بەڵکو جیهادی بۆ ئەوە داناوە تا بە یەکتری تاقیتان بکاتەوە.

﴿وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا وَإِبْرَٰهِيمَ وَجَعَلْنَا فِى ذُرِّيَّتِهِمَا ٱلنُّبُوَّةَ وَٱلْكِتَٰبَ ۖ فَمِنْهُم مُّهْتَدٍ ۖ وَكَثِيرٌ مِّنْهُمْ فَٰسِقُونَ ﴿٢٦﴾ ثُمَّ قَفَّيْنَا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم بِرُسُلِنَا وَقَفَّيْنَا بِعِيسَى ٱبْنِ مَرْيَمَ وَءَاتَيْنَٰهُ ٱلْإِنجِيلَ وَجَعَلْنَا فِى قُلُوبِ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُ رَأْفَةً وَرَحْمَةً وَرَهْبَانِيَّةً ٱبْتَدَعُوهَا مَا كَتَبْنَٰهَا عَلَيْهِمْ إِلَّا ٱبْتِغَآءَ رِضْوَٰنِ ٱللَّهِ فَمَا رَعَوْهَا حَقَّ رِعَايَتِهَا ۖ فَـَٔاتَيْنَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مِنْهُمْ أَجْرَهُمْ ۖ وَكَثِيرٌ مِّنْهُمْ فَٰسِقُونَ ﴿٢٧﴾﴾

**لادانو ترازانی خەڵکێکی زۆر لە ئوممەتی پێغەمبەرەکان**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَرْسَلْنَا نُوحًا وَإِبْرَٰهِيمَ وَجَعَلْنَا فِى ذُرِّيَّتِهِمَا ٱلنُّبُوَّةَ وَٱلْكِتَٰبَ ۖ فَمِنْهُم مُّهْتَدٍ ۖ وَكَثِيرٌ مِّنْهُمْ فَٰسِقُونَ﴾ ئێمە نوحو ئیبراهیمیشمان بەڕێکرد، پلەی پێغەمبەرایەتی و کتێبیشمان دابوو بە نەتەوەکەیان، شارەزایان لێ هەڵکەوتو لە ڕێ لادەریشیان زۆر بوون. خوای مەزن بۆمان باس دەکات کە لەو کاتەوە نوحی ناردوو (سەلامی خوای لێبێت) هیچ پێغەمبەرێکی ڕەوانە نەکردووە لە نەوەی ئەو نەبێت، هەروەها ئیبراهیمیش (سەلامی خوای لێبێت) هیچ پێغەمبەرێکی نەناردووە دوای خۆی بۆ مەردم مەگین هەر لە نەوەی ئەو بووە. وەك خوای گەورە فەرموویەتی لەم ئایەتەدا: ﴿وَجَعَلْنَا فِى ذُرِّيَّتِهِ ٱلنُّبُوَّةَ وَٱلْكِتَٰبَ﴾[1] واتە: وە پێغەمبەرێتیو کتێبمان بڕیاردا لە نەوەکانی (ئیبراهیم)دا. هەتا کۆتا پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای گەورەی لێبێت) کە پێغەمبەری بەنی ئیسرائیلە کە مژدەی پێدانارد بە موحەممەد (ﷺ) دوای خۆی. بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ثُمَّ قَفَّيْنَا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم بِرُسُلِنَا وَقَفَّيْنَا بِعِيسَى ٱبْنِ مَرْيَمَ وَءَاتَيْنَٰهُ ٱلْإِنجِيلَ وَجَعَلْنَا فِى قُلُوبِ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُ رَأْفَةً وَرَحْمَةً وَرَهْبَانِيَّةً ٱبْتَدَعُوهَا مَا كَتَبْنَٰهَا عَلَيْهِمْ إِلَّا ٱبْتِغَآءَ رِضْوَٰنِ ٱللَّهِ فَمَا رَعَوْهَا حَقَّ رِعَايَتِهَا ۖ فَـَٔاتَيْنَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مِنْهُمْ أَجْرَهُمْ ۖ وَكَثِيرٌ مِّنْهُمْ فَٰسِقُونَ﴾ لە پاشان بە شوێن ئەواندا گەلێك پێغەمبەرمان

[1] العنكبوت (٢٧).

نارد، دوای ئەوانیش عیسای کوڕی مەریەممان ناردو ئینجیلێکمان پێ خەڵات کرد، دلۆڤانیو بەزەیشمان خستە دڵی پەیڕەوانی، ئەو ڕەبەنیەش کە هەیانە ئێمە بۆمان نەنووسیون، بۆ خۆیان دایانهێناوە، ئەم کارەشیان بۆ ڕەزامەندی خودا بوو، بۆشیان نەکرا وەك پێویستە پێکی بێنن، جا ئەوانەی لەناویاندا خاوەن باوەڕ بوون، پاداشتی خۆیانمان دانێ، زۆربەشیان لە ڕێ لادەر بوون.

﴿وَءَاتَيْنَـٰهُ ٱلْإِنجِيلَ﴾ ئەو کتێبەی خودا بۆی ڕەوانە کردبوو. ﴿وَجَعَلْنَا فِى قُلُوبِ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُ﴾ ئەوانە پەیڕەوانی عیسای کوڕی مەریەم بوون. ﴿رَأْفَةً﴾ دڵ نەرمی یانی لە خودا ترسان. ﴿وَرَحْمَةً﴾ دلۆڤانی بە مەردم. وە دەفەرمووێت: ﴿وَرَهْبَانِيَّةً ٱبْتَدَعُوهَا﴾ واتە: گرۆی نەسارا، ﴿مَا كَتَبْنَـٰهَا عَلَيْهِمْ﴾ واتە: ئێمە بۆمان دانەنابوون خۆیان بە ئارەزوو پابەند بوون پێیەوە، وە دەفەرمووێت: ﴿إِلَّا ٱبْتِغَآءَ رِضْوَٰنِ ٱللَّهِ﴾ دوو ڕای لەسەرە: ڕای یەکەم: واتە: مەبەستیان ڕەزامەندی خودا بوو، سەعیدی کوڕی جوبەیرو قەتادە وایان وتووە.[1] ڕای دووەم: واتە: ئەو بێ ژنیەمان بۆ نەنوسیبوون، بەڵکو ئێمە تەنها ڕەزامەندی خودامان لێ داواکردبوون. خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿فَمَا رَعَوْهَا حَقَّ رِعَايَتِهَا﴾ واتە: هەڵنەسانو پابەند نەبوون بەو فەرمانەی کە پێیان درابوو. ئەمە باسی خراپیانە لە دوو ڕووەوە: یەکەم: داهێنان لە ئاینی خودا کە خودا فەرمانی شتی وای پێ نەکردبوون. دووەم: پابەند نەبوونو هەڵنەسان بەو فەرمانەی کە خودا پێی ڕاگەیاندبوونو کەچی وایان دەزانی ئەو داهێنانە لە خوداوە نزیکیان دەکاتەوە. ئیبنو جەریرو نەسائی ڕیوایەتیان کردووە وتەکە (اللفظ) وتەی نەسائیە لە ئیبنوعەباسەوە دەڵێت: پاشاکان لە پاش زەمانی عیسا پێغەمبەر(سەلامی خوای لێبێت) تەوراتو ئینجیلیان گۆڕی، لەناو گەلەکەیاندا خاوەن باوەڕ هەبوون تەوراتو ئینجیلیان دەخوێند. بە پاشاکانیان وترا هیچ شتێکمان نەدیوە لەو قسانەی ئەوانە خراپتر بێت کە دەیخوێننەوەو دەڵێن: ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَـٰفِرُونَ﴾[2] واتە: وە هەر کەس حوکم نەکات بەو بڕیارانەی کە خوا ناردوویەتیە خوارەوە ئا ئەوانە بێباوەڕنو موسڵمان نین. ئەم ئایەتانە لەبەر ئەوەی کردارەکانی ئێمە بە ناشیرینو ناتەاو دەخاتەڕوو لە خوێندنەوەیاندا. بانگیان بکەن وەك ئێمە چۆن دەخوێنین ئەوانیش هەر وا بخوێنن. وە ئێمە چۆن باوەڕمان هێنا ئەوانیش بەو شێوەیە باوەڕ بێنن. بانگی کردنو کۆی کردنەوە سەرپشکی کردن یان کوژران یان وازهێنان لە خوێندنەوەی تەوراتو ئینجیل مەگەر بەو

---

[1] الطبري (٢٣/٢٠٣).

[2] المائدة (٤٤).

گۆڕینەی کە کردوویانە تێیدا. وتیان مەبەستان چیەو چیتان دەوێت وازمان لێ بێنن. دەستەیەکیان وتیان: ئیستیوانەیەکمان بۆ دروست بکەن لە دوایدا بەرزمان بکەنەوە لەسەر ئیستیوانەکە دامانبنێن پاشان شتێکمان بدەنێ تا خواردنو خواردنەوەی پێ سەر بخەین بۆ خۆمان ئیتر تێناپەڕین بە لاتاندا. تیرەیەکی تریان وتیان: وازمان لێ بێنن بچینو بگەڕێین بەسەر زەمیندا تەرەبینیو بخۆینەوە وەك دڕندەکان دەخۆنەوە ئەگەر کەوتینە بەر دەستتانو لەسەر زەمینی خۆتاندا بمانکوژن. دەستەیەکی تریان وتیان: خانوویەکمان بۆ دروست بکەن لە چۆڵەوانیەکدا کە ئاویشی تێدا نەبێت چاڵ هەڵدەکەنین پاقلەو جۆرەکانی پاقلە دەچێنین ناگەڕێینەوە لاتانو بە لاشتاندا تێ ناپەڕین. هیچ بنەماڵەیەك نەبوو لەو بنەماڵانە مەگین خزمێکی لەناویاندا بوو، بەوە ڕازی بوون خوای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: ﴿وَرَهۡبَانِيَّةً ٱبۡتَدَعُوهَا مَا كَتَبۡنَٰهَا عَلَيۡهِمۡ إِلَّا ٱبۡتِغَآءَ رِضۡوَٰنِ ٱللَّهِ فَمَا رَعَوۡهَا حَقَّ رِعَايَتِهَا﴾[1].

ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئەنەسی کوڕی مالکەوە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (بۆ هەموو پێغەمبەرێك گۆشەگیریەك هەبووە، گۆشەگیری ئەم ئوممەتە تەنها جیهادە لە ڕێی خودای گەورەدا). حافیزی ئەبو یەعلاش ڕیوایەتی کردووە بەم وتەیە: (بۆ هەموو ئومەتێك گۆشەگیریەك هەبووە، گۆشەگیری ئەم ئوممەتە جیهادە لە ڕێی خودای گەورەدا).[2] وە ئیمامی ئەحمەدیش ڕیوایەتی کردوە لە ئەبو سەعیدی خودەریەوە کە پیاوێك هاتە لایو وتی: ئامۆژگاریم بکە، وتی: پرسیارم کردووە لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) کە تۆ پرسیاری لێ دەکەی لەوەی کە لە دڵتایە. ئامۆژگاریت دەکەم بە ترسان لە خودا چونکە ترسان لە خودا سەری هەموو شتێکەو جیهادیش بکە چونکە جیهاد گۆشەگیری ئیسلامە. زیکری خودا بکەو قورئانیش بخوێنە چونکە پێی دەحەسێیتەوە لە ئاسمانداو زیکریشە بۆت لەسەر زەمیندا.[3] تەنها ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە والله أعلم.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَءَامِنُواْ بِرَسُولِهِۦ يُؤۡتِكُمۡ كِفۡلَيۡنِ مِن رَّحۡمَتِهِۦ وَيَجۡعَل لَّكُمۡ نُورٗا تَمۡشُونَ بِهِۦ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿٢٨﴾ لِّئَلَّا يَعۡلَمَ أَهۡلُ ٱلۡكِتَٰبِ أَلَّا يَقۡدِرُونَ عَلَىٰ شَيۡءٖ مِّن فَضۡلِ ٱللَّهِ وَأَنَّ ٱلۡفَضۡلَ بِيَدِ ٱللَّهِ يُؤۡتِيهِ مَن يَشَآءُۚ وَٱللَّهُ ذُو ٱلۡفَضۡلِ ٱلۡعَظِيمِ ﴿٢٩﴾﴾

---

[1] الطبري (٢٠٣/٢٣)، النسائي (٢٣١/٨).

[2] احمد (٢٦٦/٣)، فەرموودەیەکی حەسەنە.

[3] احمد (٨٢/٣)، ئەم فەرموودەیە سەنەدەکانی لاوازە.

**خودای مەزن دووجار چاکە (دووسەرە) لەگەڵ خاوەن باوەڕنای ئەهلی کتێب دەکات، واتە: دووجار پاداشتیان دەداتەوە**

خوای مەزن دەفەرموویت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَءَامِنُواْ بِرَسُولِهِۦ يُؤۡتِكُمۡ كِفۡلَيۡنِ مِن رَّحۡمَتِهِۦ وَيَجۡعَل لَّكُمۡ نُورٗا تَمۡشُونَ بِهِۦ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ﴾ ئەی گەلی خاوەن باوەڕان! ترستان لە خوا هەبێتو بڕوا بە پێغەمبەری ئەو بێنن، خودا دووسەرە چاکەتان دەرباره دەکاتو ڕووناکیەکتان وەپێش دەخات بە هۆیەوە بە ڕێدا بڕۆن لە گوناهتان دەبووریتو هەر ئەویشە خەتاپۆشو دلۆڤانە. لە پێشەوە نەسائی ڕیوایەتی کرد لە ئیبنو عەباسەوە ئەم ئایەتەی کردە بەڵگە لەسەر خاوەن باوەڕانی ئەهلی کتێب کە دووسەرە پاداشت وەردەگرن وەك لەو ئایەتەی سورەتی (القصص)دا هاتووە. وە لە فەرموودەی شەعبیەوە کە لە ئەبو بوردەوە ئەویش لە باوکیەوە لە ئەبو موسای ئەشعەریەوە دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (سێ کەس دوو سەرە پاداشت وەردەگرن: پیاوێك لە ئەهلی کتێب باوەڕی بە پێغەمبەرەکەی‌و بە منیش هێنابێت دوو جار پاداشت وەردەگرێت. کۆیلەیەك هەقی خوداو خاوەنەکەی دابێت ئەوەیش دوو پاداشتی هەیە. پیاوێك کەنیزەکەی بە ڕەوشتی پاكو جوان پەروەردە کردبێتو پاشان ئازادی بکاتو بیدا بە شوو ئەمیش دوو پاداشتی هەیە). لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە.[1] ئینوعەباسیش هەر هەمان ڕای هەیە بۆ تەفسیری ئەم ئایەتە. زەحاكو عوتبەی کوڕی ئەبو حەکیمو کەسانی تریش. ئیبنو جەریریش ئەم ڕایەی هەڵبژاردووە.[2] وە ئەم ئایەتە وەك ئەم ئایەتە وایە کە خوای مەزن دەفەرموویت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن تَتَّقُواْ ٱللَّهَ يَجۡعَل لَّكُمۡ فُرۡقَانٗا وَيُكَفِّرۡ عَنكُمۡ سَيِّـَٔاتِكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡۗ وَٱللَّهُ ذُو ٱلۡفَضۡلِ ٱلۡعَظِيمِ﴾[3] واتە: ئەی ئەو کەسانەی کە باوەڕتان هێناوە ئەگەر ئێوە خواناس بنو خۆتان بپارێزن هۆی جیاکەرەوە(ی ڕاستو ناڕاست)تان بۆ فەراهەم دێنێتو لە گوناهەکانتان دەبووریتو لێتان خۆش دەبێتو خوا خاوەن بەهرەو چاکەی زۆر گەورەیە. سەعیدی کوڕی عبدالعزیز دەڵێت: عومەری کوڕی خەتان پرسیاری کرد لە زانایەك لە زاناکانی جوولەکە وتی: چەند جار چاکەتان بۆ زیاد کراوە؟ وتی: جارێك کە سێ سەدو پەنجا چاکەیە. وتی: عومەر سوپاسی خودای کرد کە خودا دوو جار پێی بەخشوین، پاشان سەعید ئەم ئایەتەی خوێدەوە: ﴿يُؤۡتِكُمۡ كِفۡلَيۡنِ مِن رَّحۡمَتِهِۦ﴾ سەعید وتی: ئەو دوو بەشە لە ڕۆژی هەینیدا وەك ئەوەیە. ئیبنو جەریر ڕیوایەتی

---

[1] فتح الباري (١/٢٢٩)، مسلم (١/١٣٤).

[2] الطبري (٢٣/٢٠٨/٢١٠).

[3] الانفال (٢٩).

کردووە.[1] ئەم فەرموودەی کە ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عومەرەوە ئشتیوانی ئەو قسەیەی پێشەوە دەکات. دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (نموونەی ئێوەو جوولەکەو گاور وەك نموونەی پیاوێك وایە چەند کرێکارێکی بە کرێ گرتبێت بڵێ: چ کەسێك لە نوێژی بەیانیەوە تا نیوەڕۆ کارم بۆ دەکات بە قیرات قیرات؟ (قراط) لە بیستو چوار بەش، یەك بەش هەر شتێکە) جوولەکە بەم کارە هەڵسان پاشان وتی: چ کەسێك لە نوێژی نیوەڕۆوە تا نوێژی عەسر کارم بۆ دەکات بە قیرات قیرات؟ گاورەکان پێی هەڵسانو کردیان پاشان وتی: چ کەسێك لە نوێژی عەسر تا خۆرئاوا دەبێت کارم بۆ دەکات. بە دوو قیرات قیرات؟ ئەویش ئێوە بوون پێی هەڵسانو کردتان. گاورو جوولەکەکان تووڕە بوونو وتیان: ئێمە کاری زۆرمان کردووەو هەقی کەممان پێدراوە. وتی: هیچ ناهەقیەکم پێ کردوون لە کرێکەتاندا؟ وتیان: نەخێر، وتی: ئەوە چاکەو پیاوەتی خۆمە بە هەر کەسێك ئارەزووم لێبێت دەیدەمێ).[2] بوخاریش ئەم فەرموودەیەی هێناوە.[3] بوخاری ڕیوایەتی رکدوو لە ئەبو موسای ئەشعەریەوە دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (نموونەی گاورو جوولەکە وەك نموونەی پیاوێك وایە کە کۆمەڵێك بەکاربێنێتو ئیشێکی بۆ بکەن ڕۆژێك تا ئێوارە لەسەر کرێیەکی دیارکراو، کاریانکرد هەتا نیوەڕۆ. پاشان وتیان: پێویستمان بەو کرێیە نیە کە مەرج داوناوە لەسەرمان ئەو کارەی کردوومانە بەتاڵەو لێی پەشیمانین، پیاوەکە وتی: وا مەکەن ئەو کارەی ماوتانە تەواوی بکەن هەقەکەتان بە تەواوی وەرگرن، نەیانکردو وازیان لێ هێنا. کۆمەڵێکی تری بە کرێ گرت دوای ئەوانو وتی: ئەوەی ئەم ڕۆژە ماوە ئێوە تەواوی بکەن ئەو کرێیەی کە بۆ ئەوان دامنابوو بەو مەرجەی خۆم بۆ ئێوە. هەڵسان پێیو کردیان هەتا کاتێك نوێژی عەسریان کرد، وتیان: ئەو کارەی کردمان بەتاڵەو لێی پەشیمانین ئەو کرێیەش کە بۆت دانابووین بۆ خۆت. وتی: کارەکەتان ئەوەی ماوە تەواوی بکەن. ڕۆژ ئەوەندەی نەماوە کەمێك نەبێت. نەیانکرد. گرۆیەکی تری بە کرێ گرتو کە پاشماوەی ڕۆژەکەیان تەواو بکەن. ئەوەی مابوو لەو ڕۆژە بۆیان تەواو کرد هەتا خۆر ئاوا بوو، کرێی هەردوو دەستەکەیان وەرگرت ئەوە نموونەی ئەوانەو ئەو کەسانەش کە ئەم ڕووناکیانە وەرگرت بەو شێوەیە تەنها بوخاری ڕیوایەتی کردووە.[4] بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿لِّئَلَّا يَعْلَمَ أَهْلُ الْكِتَابِ أَلَّا يَقْدِرُونَ عَلَىٰ شَيْءٍ مِّن فَضْلِ اللَّهِ ۙ وَأَنَّ الْفَضْلَ بِيَدِ اللَّهِ يُؤْتِيهِ مَن يَشَاءُ ۚ وَاللَّهُ ذُو الْفَضْلِ الْعَظِيمِ﴾ ئەهلی کتێب وا

---

[1] الطبري (٢١٠/٢٣).

[2] احمد (١١١/٦/٢)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[3] فتح الباري (٥٢١/٤ و ٥٧١/٦).

[4] فتح الباري (٥٢٣/٤).

کردووە.[1] ئەم فەرموودەی کە ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عومەرەوە ئشتیوانی ئەو قسەیەی پێشەوە دەکات. دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (نموونەی ئێوەو جوولەکەو گاور وەك نموونەی پیاوێك وایە چەند کرێکارێکی بە کرێ گرتبێت بڵێ: چ کەسێك لە نوێژی بەیانیەوە تا نیوەڕۆ کارم بۆ دەکات بە قیرات قیرات؟ (قراط) لە بیستو چوار بەش، یەك بەش هەر شتێکە) جوولەکە بەم کارە هەڵسان پاشان وتی: چ کەسێك لە نوێژی نیوەڕۆوە تا نوێژی عەسر کارم بۆ دەکات بە قیرات قیرات؟ گاورەکان پێی هەڵسانو کردیان پاشان وتی: چ کەسێك لە نوێژی عەسر تا خۆرئاوا دەبێت کارم بۆ دەکات. بە دوو قیرات قیرات؟ ئەویش ئێوە بوون پێی هەڵسانو کردتان. گاورو جوولەکەکان توورە بوونو وتیان: ئێمە کاری زۆرمان کردووەو هەقی کەممان پێدراوە. وتی: هیچ ناهەقیەکم پێ کردوون لە کرێکەتاندا؟ وتیان: نەخێر، وتی: ئەوە چاکەو پیاوەتی خۆمە بە هەر کەسێك ئارەزووم لێبێت دەیدەمێ).[2] بوخاریش ئەم فەرموودەیەی هێناوە.[3] بوخاری ڕیوایەتی رکدوو لە ئەبو موسای ئەشعەریەوە دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (نموونەی گاورو جوولەکە وەك نموونەی پیاوێك وایە کە کۆمەڵێك بەکاربێنێتو ئیشێکی بۆ بکەن ڕۆژێك تا ئێوارە لەسەر کرێیەکی دیارکراو، کاریانکرد هەتا نیوەڕۆ. پاشان وتیان: پێویستمان بەو کرێیە نیە کە مەرج داوناوە لەسەرمان ئەو کارەی کردوومانە بەتاڵەو لێی پەشیمانین، پیاوەکە وتی: وا مەکەن ئەو کارەی ماوتانە تەواوی بکەن هەقەکەتان بە تەواوی وەرگرن، نەیانکردو وازیان لێ هێنا. کۆمەڵێکی تری بە کرێ گرت دوای ئەوانو وتی: ئەوەی ئەم ڕۆژە ماوە ئێوە تەواوی بکەن ئەو کرێیەی کە بۆ ئەوان دامنابوو بەو مەرجەی خۆم بۆ ئێوە. هەڵسان پێیو کردیان هەتا کاتێك نوێژی عەسریان کرد، وتیان: ئەو کارەی کردمان بەتاڵەو لێی پەشیمانین ئەو کرێیەش کە بۆت دانابووین بۆ خۆت. وتی: کارەکەتان ئەوەی ماوە تەواوی بکەن. ڕۆژ ئەوەندەی نەماوە کەمێك نەبێت. نەیانکرد. گرۆیەکی تری بە کرێ گرتو کە پاشماوەی ڕۆژەکەیان تەواو بکەن. ئەوەی مابوو لەو ڕۆژە بۆیان تەواو کرد هەتا خۆر ئاوا بوو، کرێی هەردوو دەستەکەیان وەرگرت ئەوە نموونەی ئەوانەو ئەو کەسانەش کە ئەم ڕووناکیانە وەرگرت بەو شێوەیە تەنها بوخاری ڕیوایەتی کردووە.[4] بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿لِّئَلَّا يَعْلَمَ أَهْلُ الْكِتَابِ أَلَّا يَقْدِرُونَ عَلَىٰ شَيْءٍ مِّن فَضْلِ اللَّهِ ۙ وَأَنَّ الْفَضْلَ بِيَدِ اللَّهِ يُؤْتِيهِ مَن يَشَاءُ ۚ وَاللَّهُ ذُو الْفَضْلِ الْعَظِيمِ﴾ ئەهلی کتێب وا

---

[1] الطبري (٢٣/٢١٠).

[2] احمد (٢/٦/١١١)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[3] فتح الباري (٤/٥٢١ و ٦/٥٧١).

[4] فتح الباري (٤/٥٢٣).

نەزانێت لەو چاکەی لای خودا هەیە. ئەوان هیچ شتیان بە دەستە. چاکە هـەمووی لای خودایەو هـەر کەسێك خۆی مەیلی بە چاکە دەیخوێنێتەوەو ئەو چاکەی کە لای خودایە، زۆر هێژایە. واتە: بۆ ئـەوەی ئەوانە بۆیان دەرکەوێت کە ناتوانن شتێك بگێڕنەوە لە خودا دەیبەخشێتو شتێکیش ببەخشن کە خودا ڕێی نەدابێت، ﴿وَأَنَّ ٱلْفَضْلَ بِيَدِ ٱللَّهِ يُؤْتِيهِ مَن يَشَآءُ ۚ وَٱللَّهُ ذُو ٱلْفَضْلِ ٱلْعَظِيمِ﴾.

## تەفسیری سورەتی (المجادلة)

## لە مەدینە هاتووەتە خوارەوە

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿قَدْ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوْلَ ٱلَّتِى تُجَٰدِلُكَ فِى زَوْجِهَا وَتَشْتَكِىٓ إِلَى ٱللَّهِ وَٱللَّهُ يَسْمَعُ تَحَاوُرَكُمَآ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌۢ بَصِيرٌ ①﴾

### هۆی هاتنە خوارەوەی

ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە عائیشەوە دەڵێت: سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە هەموو دەنگێك دەبیسێت. کاتێ ئەو ژنە هات بۆلای پێغەمبەر(ﷺ) قسەی لەگەڵ کرد سەبارەت بە مێردەکەی من لە سوچێکی (لایەکی) ماڵەوە بووم گوێم لێ نەبوو چی ئەگوت. خوای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: ﴿قَدْ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوْلَ ٱلَّتِى تُجَٰدِلُكَ فِى زَوْجِهَا وَتَشْتَكِىٓ إِلَى ٱللَّهِ وَٱللَّهُ يَسْمَعُ تَحَاوُرَكُمَآ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌۢ بَصِيرٌ﴾ واتە: بەڕاستی خوا بیستی وتەی ئەو ژنەی کە لەبارەی مێردەکەیەوە گفتوگۆی لەگەڵ ئەکردی وە سکاڵای خۆی بۆلای خوا ئەبرد وە خوا گوێی لە ووتوێژی هەردووکتان بوو بەڕاستی خوا بیسەری بینایە.[1] هەر بەم شێوەیە بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە کتێبی (التوحيد)دا،[2] نەسائیو ئیبنوماجەو ئیبنوئەبی حاتمو ئیبنوجەریریش هێناویانە.[3] لە ڕیوایەتێکدا لە ئیبنوئەبی حاتەمەوە کە لە عائیشەوە ڕیوایەتی کردووە گوتویەتی: پاکیو بێ گەردی بۆ ئەو خوایەی کە هەموو شتێك ئەبیسێت، من گوێم لە خەولەی کچی سەعلەبە ئەگرت هەندێکیم باش گوێ لێ نەبوو کە شکاتی لە مێردەکەی ئەکرد لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەی گوت: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) مێردەکەم ماڵی خواردمو لاوییشم هەموو لە پێناوی ئەوا ڕۆشت منداڵێکی زۆرم بۆ هێنایە بەرهەم (ئەوەتا ئێستا چووم بە ساڵا) منداڵم نابێ ئەڵێ: تۆ دایکمی ئەی خودایە من شکات لای تۆ دەکەم ئەوەندەی پێ نەچوو جوبرەئیل ئەم ئایەتەی هێنایە خوارەوە: ﴿قَدْ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوْلَ ٱلَّتِى تُجَٰدِلُكَ فِى زَوْجِهَا﴾ عائیشە دەڵێت: مێردەکەی ئەوسی کوڕی سامت بوو.[4]

---

[1] احمد (٦/٤٦)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[2] فتح الباري (١٣/٣٨٤).

[3] النسائي (٦/١٦٨)، و إبن ماجة (١/٦٧)، و الطبري (٢٣/٢٢٥)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[4] الطبري (٢٣/٢٢٦).

﴿ٱلَّذِينَ يُظَٰهِرُونَ مِنكُم مِّن نِّسَآئِهِم مَّا هُنَّ أُمَّهَٰتِهِمْۖ إِنْ أُمَّهَٰتُهُمْ إِلَّا ٱلَّٰٓـِٔي وَلَدْنَهُمْۚ وَإِنَّهُمْ لَيَقُولُونَ مُنكَرًا مِّنَ ٱلْقَوْلِ وَزُورًاۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَعَفُوٌّ غَفُورٌ ﴿٢﴾ وَٱلَّذِينَ يُظَٰهِرُونَ مِن نِّسَآئِهِمْ ثُمَّ يَعُودُونَ لِمَا قَالُوا۟ فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مِّن قَبْلِ أَن يَتَمَآسَّاۚ ذَٰلِكُمْ تُوعَظُونَ بِهِۦۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴿٣﴾ فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ مِن قَبْلِ أَن يَتَمَآسَّاۖ فَمَن لَّمْ يَسْتَطِعْ فَإِطْعَامُ سِتِّينَ مِسْكِينًاۚ ذَٰلِكَ لِتُؤْمِنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦۚ وَتِلْكَ حُدُودُ ٱللَّهِۗ وَلِلْكَٰفِرِينَ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٤﴾﴾

**ژن بە دایك كردن بە قسە و كەفارەتەكەی**

ئیمامی ئەحمەد ریوایەتی كردوە لە خەولەی كچی سەعلەبەوە (ثعلبة) دەڵێت: سوێند بە خوا پێشەكی سورەتی موجادلەیە لەسەر منو ئەوسی كوڕی سامت (صامت) خودا ناردیە خوارەوە دەڵێت: خێزانی بوم چوبو بە ساڵا خویشی خراپ بوبو (عەقڵی زۆر لەسەر خۆی نەما بوو) دەڵێت: ڕۆژێك هات بۆ لام بەشتێك گەڕاندمەوە ڕقی هەڵسا دەڵێت: تۆ ئیتر وەك دایكم وایت. خوەیلە دەڵێت: چووە دەرەوە لە دیوەخانی هۆزەكەی ماوەیەك دانیشت. پاشان هاتەوە بۆ لام ویستی كاری ژنو مێردیكم لەگەڵ بكات خوەیلە دەڵێت: پێم گوت: نەخێر نابێ سوێند بەو كەسەی گیانی خوەیلەی بەدەستە نایەیتە لام تا ئەو قسەی كە گوتوتە خوداو پێغەمبەری خودا(ﷺ) بڕیار نەدەن لەسەری بۆمان. دەڵێت: پەلاماری دام منیش بەرگریم كرد نەم هێشت پاڵم پێوە ناو دورم خستەوە لەخۆم. بەو شێوەیە كە ژنێك پێی زاڵ ئەبێ بەسەر پیاوێكی پیری بێ هێزا. دەڵێت: دوایی ئەوە ڕۆشتم بۆ ماڵی یەكێ لە دراوسێكانم داوای پۆشاكێكم (ثیابا) لێ كرد پاشان ڕۆشتم بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) لە خزمەتیا دانیشتم ئەوەی بەسەرم هاتبوو لەلایەن مێردەكەمەوە بۆم باس كرد. بێزاری خۆم دەربڕی كە چۆن گیرم كردوە بەدەست خراپیو بەدخوییەوە. دەڵێت پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەی فەرموو (ئەی خوەیلە ئامۆزاكەت پیاوێكی بەساڵاچووە لە خودا بترسە چاو پۆشی لێ بكە) سوێند بە خوا نەڕۆشتم هەتا قورئان لەسەرم هاتە خوارەوە. حاڵەتێك هات بەسەر پێغەمبەرا (ﷺ) كە لەپێشەوە نەی بوو پاشان ئەو حاڵەتەی نەماو فەرمووی پێم (ئەی خەولە خودا قورئانی لەبارەی تۆو لەبارەی مێردەكەتەوە (ناردە خوارەوە) پاشان ﴿قَدْ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوْلَ ٱلَّتِى تُجَٰدِلُكَ فِى زَوْجِهَا وَتَشْتَكِىٓ إِلَى ٱللَّهِ وَٱللَّهُ يَسْمَعُ تَحَاوُرَكُمَآۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌۢ بَصِيرٌ﴾ هەتا ئەفەرموێت: ﴿وَلِلْكَٰفِرِينَ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ بەسەرما خوێند. خوەیلە دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی پێم: (پێی بڵێ با كۆیلەیەك ئازاد بكا) دەڵێت: گوتم ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) سوێند بە خوا نیەتی بەندەی پێ ڕزگار بكات فەرمووی: (با دوو مانگ لەسەر یەك بەڕۆژو بێ) دەڵێت: گوتم: بەخودا پیرێكی بەساڵاچوو توانای ڕۆژوی نەماوە. فەرمووی: (با خواردن بدا بە شەست هەژار وە سقێك

(و سقا) له خورما) دەڵێت: گوتم: سوێند به خوا ئەی پێغەمبەری خودا ئەوەیشی نیە. دەڵێت: خوا فەرمووی: (ئێمه یارمەتی ئەدەین به عەرەقێ (عَرَق) له خورما) دەڵێت: گوتم: منیش یارمەتی ئەدەم به عەرەقێکی تر. فەرمووی (زۆرباشه ئافەرین ده برۆ لەباتی ئەو بیکه به خێرو ئامۆژگاریت ئەکەم به چاکه کردن لەگەڵ ئامۆزاکەت) دەڵێت: وام کرد.[1] یانی به گوێی پێغەمبەرم کرد (ﷺ) ئەبوداود ڕیوایەتی کردووه له سونەتەکەیا له کتابی تەلاقدا.[2] لەلای ئەبوداود خەولەی (خولة) کچی سەعلەبه (ثعلبة) پیان گوتوه خەولەی کچی مالکی کوڕی سەعلەبه بچوك کراوەتەوه گوتراوه خوەیله وه هیچ نارێکیو لاریەك نیه لەم قسانەدا، قسەکان له یەکەوه نزیکن والله اعلم. وه لەبارەی هاتنه خوارەوەی ئەم سورەتەدا ئەم ڕیوایەته ڕاسته. وه ئەفەرموێت: ﴿ٱلَّذِينَ يُظَٰهِرُونَ مِنكُم مِّن نِّسَآئِهِم مَّا هُنَّ أُمَّهَٰتِهِمۡۖ إِنۡ أُمَّهَٰتُهُمۡ إِلَّا ٱلَّٰٓـِٔي وَلَدۡنَهُمۡۚ وَإِنَّهُمۡ لَيَقُولُونَ مُنكَرٗا مِّنَ ٱلۡقَوۡلِ وَزُورٗاۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَعَفُوٌّ غَفُورٞ﴾ ئەو کەسانەی لەناو ئێوه، به ژنەکانی خۆیان ئەڵێن: ((تۆ دایکمی)) ژنەکان نابن به دایکیان، هەر ئەو ژنانه دایکیانن که ئەوانیان بووه، ئەوان قسەی خراپ دەکەنو بوختانه هەڵی دەبەستن. خودا له گوناه دەبورێو خەتا پۆشه. سەرچاوەی (الظهار) له پێکهاتەی (مشتق) (الظهر)وه هاتووه، ئەمه وەختی له کاتی نەفامیا ئەگەر کەسێکیان زیهاری (الظهار) بکردایه لەگەڵ ژنەکەی پێی ئەگوت: تۆ بۆ من وەك دایکم وایت. لەکاتی نەفامیا زیهار تەلاق دان بووه خودای گەوره سوکی کردوه لەسەر ئەم ئوممەته کەفارەتی بۆ داناوه، نەی کردوه به تەلاق وەك له نەفامیا به تەلاقیان داناوه پێی هەڵساون. وه ئەفەرموێت: ﴿مَّا هُنَّ أُمَّهَٰتِهِمۡۖ إِنۡ أُمَّهَٰتُهُمۡ إِلَّا ٱلَّٰٓـِٔي وَلَدۡنَهُمۡ﴾ یانی ژن نابێته دایك که پیاو بیڵێ به ژنەکەی تۆ بۆ من وەك دایکمی ئەو ژنه داکیەتی که ئەوی لێ بووه. لەبەر ئەمەیه خوای گەوره فەرموویەتی: ﴿وَإِنَّهُمۡ لَيَقُولُونَ مُنكَرٗا مِّنَ ٱلۡقَوۡلِ وَزُورٗا﴾ یانی قسەیەکی ناشرینو بێ مانایه ﴿وَإِنَّ ٱللَّهَ لَعَفُوٌّ غَفُورٞ﴾ واته: خودا لێ بوردەو خەتا پۆشه لەوەی که له کاتی نەفامیا کردوتانه وه دیسانەوه ئەو قسانەی که له دەمتان دەردەچێ ئەو کەسەی که دەڵێت مەبەستی تەلاق نیه ئەمه نارەزایی دەربڕینه بەڵام ژنەکەی لێ قەدەغه نەکرد بەو قسەیه چونکه نێتی تەلاقی نەبوو ئەگەر نێتی تەلاقی ببوایه لێی حەرام دەبوو. وه له ڕیوایەتی سەحیحا هاتووه که هیچ جیاوازێك له نێوان دایكو مەحرەمەکانی ترا نیه وەك خوشكو پورو ئەوانی تر. وه ئەفەرموێت: ﴿وَٱلَّذِينَ يُظَٰهِرُونَ مِن نِّسَآئِهِمۡ ثُمَّ يَعُودُونَ لِمَا قَالُواْ فَتَحۡرِيرُ رَقَبَةٖ مِّن قَبۡلِ أَن يَتَمَآسَّاۚ ذَٰلِكُمۡ تُوعَظُونَ بِهِۦۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرٞ﴾ جا ئەوانەی به

---

[1] احمد (٦/٤١٠)، ئەم فەرمودەیه سەنەدەکانی حەسەنه.

[2] أبوداود (٢/٦٦٢-٦٦٤)، فەرموودەیەکی حەسەنه.

هاوسەری خۆیان ئەڵێن: ((تۆ دایکمی)) پاشان پەشیمان دەبنەوە، بەر لەوەی پێکەوە بنوون، ئەبێ کۆیلەیەك ئازاد کەن. خوا وا ئامۆژگاریتان دەکا. خودا لەهەر کارێ دەیکەن ئاگادارە. وە ئەفەرموێت: ﴿وَالَّذِينَ يُظَٰهِرُونَ مِن نِّسَآئِهِمۡ ثُمَّ يَعُودُونَ لِمَا قَالُواْ﴾ شافعی دەڵێت: لای خۆی دەیهێڵێتەوە پاشی موزاهرەکە ماوەیەك کە ئەتوانێ تەلاقی بدا بەڵام تەلاقی نەدا. ئەحمەدی کوڕی حەنبەل دەڵێت: ئەوەیە کە بچێتە لای یا نیازی وا بێ بچێتە لای بۆی حەڵاڵ نابێ هەتا ئەو کەفارەتە نەدا. دەیگێڕنەوە لە مالکەوە کە نیازی چونە لا و هێشتنەوەی هەبێ بۆی نیە هەتا کەفارەت نەدا. هەر لە مالکەوە جارێکی تر وتویەتی: ئەگەر بچێتە لای بۆی نیە هەتا کەفارەت نەدا. سەعیدی کوڕی جوبەیر لەم ئایەتەدا ﴿ثُمَّ يَعُودُونَ لِمَا قَالُواْ﴾ دەڵێت: واتە: ئەیانەوێ بچن جیماع بکەن کە حەرامیان کردبوو لە خۆیان کە جیماع بکەن (یانی بچنە لای ژنەکانیان). حەسەنی بەسری دەڵێت: واتە: خۆ ڕەحات کردن لەناو ڕەحما بەبێ کەفارەت نابێ ئەگەر لەناو ڕەحما نەبوو. یانی ئەگەر نەی خستە ناوی خۆی ڕەحات کرد لێی کەفارەتی لەسەر نیە. عەلی کوڕی ئەبوتەلحە دەڵێت لە ئیبنوعەباسەوە ﴿مِّن قَبۡلِ أَن يَتَمَآسَّا﴾ لێ کەوتن (المس) یانی چونەلا (النكاح)[1] وە هەر بەو شێوەیە عەتاو زوهەری قەتادەو موقاتلو ئیبنوحەبان وتویانە. زوهەری دەڵێت: بۆی نیە ماچی بکاو لێی بکەوێ هەتا کەفارەت ئەدات. وە زانایانی فەرموودە ڕیوایەتیان کردوە لە عیکرەمەوە ئەویش لە ئیبنوعەباسەوە کە پیاوێك دەڵێت: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) من وتم بە ژنەکەم تۆ وەك دایکمی چوومە لای پێش ئەوەی کەفارەت بدەم پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: خوا لێت خۆش بێ چی وای لێ کردی ئەو کارە بکەی. دەڵێت: چاوم بە بازنەکەی قاچی کەوت لە مانگە شەودا. فەرموی: (نزیکی نەکەویتەوە تا ئەوەی خودا فەرمانی پێ کردوی بەجێی دێنی) یانی هەتا کەفارەتەکەی ئەدەیت. تیرمیزی دەڵێت: فەرموودەیەکی چاکی غەریبی سەحیحە ئەبوداودو نەسائیش ڕیوایەتیان کردوە.[2] وە خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿فَتَحۡرِيرُ رَقَبَةٍ﴾ یانی ئازاد کردنی کۆیلەیەك بەر لەوەی پێکەوە بنوون. لێرەدا ناوی کۆیلە بە ڕەها هاتوە نەبەستراوە بە باوەڕەوە. لە کەفارەتی کوشتنا بەستراوە بە کۆیلەی خاوەن باوەڕەوە. یانی ئەبێ کۆیلەکە خاوەن باوەڕ بێ. وە ئەفەرموێت: ﴿ذَٰلِكُمۡ تُوعَظُونَ﴾ واتە: بۆ ئەوەی پەندو ئامۆژگاری لێ وەرگرن. ﴿وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرٞ﴾ واتە: خودا دەزانێ چی باشە بۆتانو ئاگادارە لە هەر کارێ دەیکەن.

---

[1] الطبري (٢٣/٢٣١).

[2] أبوداود (٢/٦٦٦)، و تحفة الاحوذي (٤/٣٨٠)، و النسائي (٦/١٦٧)، و ابن ماجة (١/٦٦٦)، فەرموودەیەکی حەسەنە.

وە ئەفەرموێت: ﴿فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ مِن قَبْلِ أَن يَتَمَاسَّا فَمَن لَّمْ يَسْتَطِعْ فَإِطْعَامُ سِتِّينَ مِسْكِينًا ذَٰلِكَ لِتُؤْمِنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ وَتِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ وَلِلْكَافِرِينَ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ هەرکێ نەیبوو با دوو مانگی یەك لەدوای یەك، بە ڕۆژوو بێ، بەر لەوە بگەن بە یەکتر. کەسێ ئەمەشی نەتوانی، خۆراك بە شەست هەژار بدات، ئەمە بۆ ئەوەیە باوەڕتان بە خواو پێغەمبەر هەبێ‌و، ئەمە سنووری خودایە بۆ ئەوانەشی کە خودایان نەناسیوە ئازارێکی بە ژان هەیە. ئەو فەرموودانەی کە باسی کەفارەت دەکات‌و فەرمانی پێ دەکا لە پێشەوە یەك لە دوای یەك هێنراوە وەك لە هەردوو سەحیحەکەدا لە باسی ئەو کەسەی کە جیماعی کردبوو لەگەڵ خێزانی لە ڕەمەزاندا.[1] ﴿ذَٰلِكَ لِتُؤْمِنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ﴾ واتە: لەبەر ئەمە ئەم بڕیارەمان دا ﴿وَتِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ﴾ واتە: ئەوە سنوری خودایە مەیشکێنن. و ئەفەرموێت: ﴿وَلِلْكَافِرِينَ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ واتە: ئەوانەی کە باوەڕ ناهێنن‌و وە پابەند نابن بە فەرمانەکانی ئەم ئاینەوە وا ئەزانن کە ڕزگاریان بووە لە تۆڵە نەخێر بەو شێوەیە نیە وەك ئەوان وا تێدەگەن بەڵکو ئازاری بە ژان هەیە بۆیان واتە: لە دنیاو لە قیامەتا.

﴿إِنَّ الَّذِينَ يُحَادُّونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ كُبِتُوا كَمَا كُبِتَ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ وَقَدْ أَنزَلْنَا آيَاتٍ بَيِّنَاتٍ وَلِلْكَافِرِينَ عَذَابٌ مُّهِينٌ ۝٥ يَوْمَ يَبْعَثُهُمُ اللَّهُ جَمِيعًا فَيُنَبِّئُهُم بِمَا عَمِلُوا أَحْصَاهُ اللَّهُ وَنَسُوهُ وَاللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ ۝٦ أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ مَا يَكُونُ مِن نَّجْوَىٰ ثَلَاثَةٍ إِلَّا هُوَ رَابِعُهُمْ وَلَا خَمْسَةٍ إِلَّا هُوَ سَادِسُهُمْ وَلَا أَدْنَىٰ مِن ذَٰلِكَ وَلَا أَكْثَرَ إِلَّا هُوَ مَعَهُمْ أَيْنَ مَا كَانُوا ثُمَّ يُنَبِّئُهُم بِمَا عَمِلُوا يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِنَّ اللَّهَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ ۝٧﴾

## ڕوون کردنەوەی پاشەڕۆژی دوژمنانی ئاین

خودای مەزن فەرموویەتی: ﴿إِنَّ الَّذِينَ يُحَادُّونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ كُبِتُوا كَمَا كُبِتَ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ وَقَدْ أَنزَلْنَا آيَاتٍ بَيِّنَاتٍ وَلِلْكَافِرِينَ عَذَابٌ مُّهِينٌ﴾ ئەو کەسانەی دژایەتی خوداو پێغەمبەری دەکەن، دوچاری ناچاری دەبن، وەك ئەوانەی بەر لەوان بەدبەخت بوون. ئێمە گەلێك نیشانەی زۆر ئاشکرامان ناردۆتە خوار، ئەوی بڕوایان پێ ناکا، بەشیان جەزرەبەدانێکی ئابڕوبەرە. خوای گەورە هەواڵی ئەو کەسانەمان ئەداتێ کە دژایەتی خوداو پێغەمبەری خودا دەکەن‌و لاساری‌و بێ گوێی ئاینەکەی ئەکەن ئەفەرموێت: ﴿كُبِتُوا كَمَا كُبِتَ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ﴾ سوکایەتیان پێ دەکرێ‌و بێ بەش دەبن لە بەزەیی خوداو چارە ڕەش

---

[1] فتح الباري (٤/١٩٣)، و مسلم (٢/٧٨١).

دەبن وەك ئەوانەی پێش خۆیان كە بەدبەختو چارە ڕەش بوون. وە ئەفەرموێت: ﴿وَقَدْ أَنزَلْنَآ ءَايَٰتٍۭ بَيِّنَٰتٍ﴾ واتە: نیشانەی ئاشكراو ڕوون خوانەناسو بەدكارو لووت بەرز نەبێ دژایەتیو بێ گوێی ناكات ﴿وَلِلْكَٰفِرِينَ عَذَابٌ مُّهِينٌ﴾ لە بەرانبەری ئەو لووت بەرزیەیان كە شوێنی بەرنامەی خوا نەدەكەوتنو فەرمانی خودایان بەجێ نەدەهێناو ملیان بۆ كەچ نەدەكرد بەشیان جەزرەبە دانێكی ئابڕوبەرە. پاشان خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿يَوْمَ يَبْعَثُهُمُ ٱللَّهُ جَمِيعًا فَيُنَبِّئُهُم بِمَا عَمِلُوٓا۟ أَحْصَىٰهُ ٱللَّهُ وَنَسُوهُ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ﴾ ئەو ڕۆژە كە خوا (تێكڕا) هەموان زیندوو دەكاتەوە، پێیان ئەڵێ، چیان كردوە، خوا كردەوەیانی ژماردوە بۆخۆیان لەبیریان چووە، خوا لە هەموو شت ئاگادارە. پاشان خودا ئەفەرموێت: ﴿يَوْمَ يَبْعَثُهُمُ ٱللَّهُ جَمِيعًا﴾ ئەو ڕۆژەش ڕۆژی قیامەتە كە پێشینانو ئەوانەش لە پاشەوە دێن هەموو لە یەك ئاستو شوێنا كۆ دەكاتەوە ﴿فَيُنَبِّئُهُم بِمَا عَمِلُوٓا۟﴾ واتە: ئاگاداریان دەكات لەوەی كردوویانە لە چاكەو لە خراپە ﴿أَحْصَىٰهُ ٱللَّهُ وَنَسُوهُ﴾ واتە: خودا كردەوەكانی بۆ تۆمار كردنو نوسیویەتی لەسەریان بەڵام خۆیان لە یادیان نەماوە كە چیان كردوە ﴿وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ﴾ واتە: خودا هیچی لێ ون نابێو ناشارێتەوە هیچیشی لەبیر ناچێ.

**زانینی خودا دەوری دروست كراوەكانی داوە**

پاشان خوای گەورە باسی خۆیمان بۆ دەكا كە زانیاری هەیە لەسەر دروستكراوەكانیو ئاگای لێیانەو هەموو قسەكانیان دەبیسێ لەهەر شوێنێكا بنو بۆ هەر شوێنێك بڕۆن دەیان بینێ. وە دەفەرموێت: ﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ مَا يَكُونُ مِن نَّجْوَىٰ ثَلَٰثَةٍ إِلَّا هُوَ رَابِعُهُمْ وَلَا خَمْسَةٍ إِلَّا هُوَ سَادِسُهُمْ وَلَآ أَدْنَىٰ مِن ذَٰلِكَ وَلَآ أَكْثَرَ إِلَّا هُوَ مَعَهُمْ أَيْنَ مَا كَانُوا۟ ثُمَّ يُنَبِّئُهُم بِمَا عَمِلُوا۟ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ إِنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ﴾ ئاخۆ ئەتۆ نەتزانیوە كە هەر شتێ لە ئاسمانو زەویدا هەبێت، خوا دەیزانێ؟ هەتا سێ كەس بەیەكەوە چپە بكەن. دیارە كە ئەو چوارەمینیانەو پێنج بن ئەو شەشەمینیانەو كەمتر بنو زیاتر بنو لە هەركوێ بن. ئەو هەمیشە لەگەڵیانەو پاشان لە ڕۆژی قیامەت، پێیان ئەڵێ چپەیان دەكرد. خودا بە هەموو شت زانایە. ﴿مِن نَّجْوَىٰ ثَلَٰثَةٍ﴾ لە چپەو پەنهانی هەر سێ كەس ﴿إِلَّا هُوَ رَابِعُهُمْ وَلَا خَمْسَةٍ إِلَّا هُوَ سَادِسُهُمْ وَلَآ أَدْنَىٰ مِن ذَٰلِكَ وَلَآ أَكْثَرَ إِلَّا هُوَ مَعَهُمْ أَيْنَ مَا كَانُوا۟﴾ واتە ئاگای لێیانەو گوێی لە قسەو چپەیانەو لەگەڵ ئەوەشا فریشتەكان هەرچی بە پەنهانی ئەیڵێن دەینوسن. وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ يَعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ سِرَّهُمْ وَنَجْوَىٰهُمْ وَأَنَّ ٱللَّهَ عَلَّٰمُ

ٱلْغُيُوبِ ﴾[1] واتە: بۆ نازانن خودا بە ڕازیان دەزانیّو ئاگای لە سرتەشیان هەیە وە خودا بەئاگاو زانایە بە هەموو غەیب و نادیاریێك. وە دەفەرمویّت: ﴿أَمْ يَحْسَبُونَ أَنَّا لَا نَسْمَعُ سِرَّهُمْ وَنَجْوَىٰهُمۚ بَلَىٰ وَرُسُلُنَا لَدَيْهِمْ يَكْتُبُونَ ﴾[2] واتە: یان ئەوان پێیان وایە ئێمە نهێنی وسرتەیان نابیسین؟ بەڵیّ دەیبیسینو فریشتەكانیشمان ڕاسپاردوە لەلایانو دەنوسن. بۆیە زۆر كەس گێراویانەتەوە كە كۆدەنگی زانایان (الاجماع) لەسەرە ئەوەیە كە مەبەست بەم ئایەتە بوونی زانیاری خوای گەورەیە وە هیچ گومانێكی تێدا نیە، لەگەڵ ئەوەشا گوێی لێیانەو ئاگادارە بەسەریاناو چاویشی لێیانە. ئەو خودایەی ئاگاداری دروست كراوەكانیەتیو هیچ شتێكی لیّ ون نابیّ پاشان ئەفەرمویّت: ﴿ثُمَّ يُنَبِّئُهُم بِمَا عَمِلُوا۟ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِۚ إِنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ﴾ ئیمامی ئەحمەد دەڵێت ئەم ئایەتە بە زانیاری (العلم) دەستی پیّ كردوە بە زانیاریش كۆتایی پیّ هێنا.

﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ نُهُوا۟ عَنِ ٱلنَّجْوَىٰ ثُمَّ يَعُودُونَ لِمَا نُهُوا۟ عَنْهُ وَيَتَنَٰجَوْنَ بِٱلْإِثْمِ وَٱلْعُدْوَٰنِ وَمَعْصِيَتِ ٱلرَّسُولِ وَإِذَا جَآءُوكَ حَيَّوْكَ بِمَا لَمْ يُحَيِّكَ بِهِ ٱللَّهُ وَيَقُولُونَ فِىٓ أَنفُسِهِمْ لَوْلَا يُعَذِّبُنَا ٱللَّهُ بِمَا نَقُولُۚ حَسْبُهُمْ جَهَنَّمُ يَصْلَوْنَهَاۖ فَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴿٨﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِذَا تَنَٰجَيْتُمْ فَلَا تَتَنَٰجَوْا۟ بِٱلْإِثْمِ وَٱلْعُدْوَٰنِ وَمَعْصِيَتِ ٱلرَّسُولِ وَتَنَٰجَوْا۟ بِٱلْبِرِّ وَٱلتَّقْوَىٰۖ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ٱلَّذِىٓ إِلَيْهِ تُحْشَرُونَ ﴿٩﴾ إِنَّمَا ٱلنَّجْوَىٰ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ لِيَحْزُنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَلَيْسَ بِضَآرِّهِمْ شَيْـًٔا إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِۚ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُؤْمِنُونَ ﴿١٠﴾﴾

**باسی خراپەكاری جولەكە (اليهود)**

خودای مەزن فەرموویەتی: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ نُهُوا۟ عَنِ ٱلنَّجْوَىٰ ثُمَّ يَعُودُونَ لِمَا نُهُوا۟ عَنْهُ وَيَتَنَٰجَوْنَ بِٱلْإِثْمِ وَٱلْعُدْوَٰنِ وَمَعْصِيَتِ ٱلرَّسُولِ وَإِذَا جَآءُوكَ حَيَّوْكَ بِمَا لَمْ يُحَيِّكَ بِهِ ٱللَّهُ وَيَقُولُونَ فِىٓ أَنفُسِهِمْ لَوْلَا يُعَذِّبُنَا ٱللَّهُ بِمَا نَقُولُۚ حَسْبُهُمْ جَهَنَّمُ يَصْلَوْنَهَاۖ فَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴾ ئەی تۆ ئەوانەت نەدیوە پێیان وترا، چپە مەكەن، ئەو كارەی كە وتیان مەیكەن، هەر دەیكەنو لە ناڕەوا چپەیانەو گوناهو سەرپێچی دەكەنو لە قسەی پێغەمبەر دەردەچن؟ خۆ ئەگەر تووشی تۆش دەبن، ئەو سەلامەی لە تۆی دەكەن، جیاوازە لەو سەلامە كە خودا لە تۆی كردووە، لەپاڵ خۆیانیشدا ئەڵێن دەی بۆ لەسەر ئەم وتەیە خودا جەزرەبەمان نادا؟ دەچنە جەهەننەم بەسیانەو سەرەنجامیان زۆر خراپە. ئیبنونەجیح دەڵێت لە موجاهدەوە ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ نُهُوا۟

[1] التوبة (٧٨).

[2] الزخرف (٨٠).

عَنِ ٱلنَّجْوَىٰ ثُمَّ يَعُودُونَ لِمَا نُهُواْ عَنْهُ ﴾مەبەست لەم ئایەتە جولەكەیە[1]. و هەر بەمشێوەیە موقاتلی كوڕی حیان دەڵێت‌و ئەمەیشی خستە سەری: لە نێوان پێغەمبەر(ﷺ)و جولەكەكانا ڕێكەوتنێك هەبوو وەختێ یەكێك لە هاوەڵەكانی پێغەمبەر(ﷺ) بڕۆشتایا بەلایانا دادەنیشتن چپەیان دەكرد لە نێوان خۆیانداو ئەو موسوڵمانەش وای دەزانی چپە دەكەن بۆ ئەوەی ئەو بكوژن یان شتێكی خراپ دەڵێن كە پێی ناخۆشە. كاتێ موسوڵمانەكە ئەمەی ئەبینی ئەترسا لێیان‌و لەو ڕێگایەوە نەدەڕۆشت. پێغەمبەر(ﷺ) پێی گوتن كە چپە نەكەن هەر بەردەوام بوون لەسەر چپە كردن‌و وازیان نەئەهێنا خوای گەورە قورئانی نارده خوارەوەو فەرمووی: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ نُهُواْ عَنِ ٱلنَّجْوَىٰ ثُمَّ يَعُودُونَ لِمَا نُهُواْ عَنْهُ﴾.[2] وە ئەفەرموێت: ﴿وَيَتَنَٰجَوْنَ بِٱلْإِثْمِ وَٱلْعُدْوَٰنِ وَمَعْصِيَتِ ٱلرَّسُولِ﴾ واتە: لەناو خۆیانا قسەی خراپیان ئەكردو هەر ئەوە خوڕەوشتیان بوو، ﴿وَٱلْعُدْوَٰنِ﴾ ئەوەیشی پەیوەندی بە خۆیانەوە نەبوو بە قسەی پێغەمبەریان (ﷺ) نەئەكردو سەرپێچیان ئەكرد بە بەردەوامی‌و هانی یەكتریان ئەدا. وە ئەفەرموێت: ﴿وَإِذَا جَآءُوكَ حَيَّوْكَ بِمَا لَمْ يُحَيِّكَ بِهِ ٱللَّهُ﴾ ئیبنو ئەبی حاتم ڕیوایەتی كردووە لە عائیشەوە دەڵێت: هەندێ جولەكە هاتنە لای پێغەمبەر(ﷺ) گوتیان: (السام علیك) ئەی ئەبوالقاسم،لە وەڵامدا عائیشەش وتی: (وعلیكم السام). دەڵێت پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (ئەی عائیشە خودا قسەی خراپ‌و ناشرینی پێ خۆش نیە) وتم ئایا گوێت لێ نیە ئەڵێن السام علیك؟ پێغەمبەر فەرمووی: (ئەی گوێت لێ نەبوو كە وتم (وعلیكم) خوای گەورە ئەمەی نارده خوارەوە: ﴿وَإِذَا جَآءُوكَ حَيَّوْكَ بِمَا لَمْ يُحَيِّكَ بِهِ ٱللَّهُ﴾.[3] وە لە ڕیوایەتێكی تری سەحیحدا هاتوە كە عائیشە پێی وتن: (علیكم السام و الذم و اللعنة) یانی ئێوە بمرن خوا خراپتان بۆ بكاو بێ بەش بن لە بەزەیی خوا. وە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: دوعای ئێمە وەرئەگیرێ بۆ ئەوان بەڵام دوعای ئەوان وەرناگیرێ بۆ ئێمەو قەبوڵ نابێ لای خودا.[4] ئیبنوجەریر ڕیوایەتی كردوە لە ئەنەسی كوڕی مالكەوە كە پێغەمبەری خودا(ﷺ) جارێك لەگەڵ هاوەڵەكانیدا دانیشتبوو لەو وەختەدا جولەكەیەك هاتە لایان سەلامی لێ كردن ئەوانیش وەڵامیان دایەوە. پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (ئایا دەزانن چی گوت؟) گوتیان: سەلامی كرد ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (بەڵكو دەڵێت (سام علیكم)) واتە: ئاینتان نەمێنێ‌و لەناوچێ پێغەمبەری خودا(ﷺ)

[1] الطبري (٢٣/٢٣٦).

[2] الدر المنثور (٨/٨٠)، فەرمودەیەكی مورسەلە.

[3] الطبري (٢٣/٢٣٦-٢٣٧).

[4] فتح الباري (١٠/٤٦٦).

فەرمووی: (بیهێننەوە بۆ لام) ئەوانیش هێنایانەوە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: تۆ وتت (السام علیکم) جولەکەکە دەڵێت بەڵێ. پێغەمبەر فەرمووی: (کاتێ کەسێك لە ئەهلی کیتاب سەلامی لێ کردن. ئێوەش بڵێن (علیك)) واتە: ئەوەی ووتت لەسەر خۆت بێ.[1] ئەسڵی فەرموودەکەی ئەنەس لە سەحیحی بوخاریدا هاتووە وە ئەم فەرموودەیە لە سەحیحی بوخاریدایە لە عائیشەوە بەم شێوەیە ڕیوایەت کراوە.[2] خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَيَقُولُونَ فِىٓ أَنفُسِهِمْ لَوْلَا يُعَذِّبُنَا ٱللَّهُ بِمَا نَقُولُ﴾ واتە: ئەو کارەی کە پێی هەڵدەسن ئەڵێن، پێچەوانەی ئەو سەلامەیە کە خودا لە پێغەمبەری (ﷺ) کردوەو دەیگۆڕن لەباتی سەلام قسە پێوتنە لە ناوەوە. لەگەڵ خۆشیاندا ئەڵێن کەوایە بۆچی خوا سزامان نادا لەسەر ئەو قسانەی لە دڵایە خۆ خودا ئاگادارە لەوەی کە دەیشارینەوە. گەر بەڕاستی ئەمە پێغەمبەر بێ(ﷺ) لەوانەیە لە دنیا خودا سزامان بدات. خوای گەورەش فەرموویەتی: ﴿حَسْبُهُمْ جَهَنَّمُ﴾ یانی:جەهەنیمیان بەسە لە ڕۆژی دوایدا ﴿يَصْلَوْنَهَا ۖ فَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ﴾ ئیمامی ئەحمەد دەڵێت: عبدوسەمەد (عبدالصمد) بۆی گێڕاینەوە، حەممادیش (حماد) بۆی گێڕاینەوە لە عەتای (عطاء) کوڕی سائیبەوە (سائب) لە باوکیەوە ئەویش لە عبدالله ی کوڕی عەمرەوە (عمرو) کە جولەکەکان ئەیان گوت بە پێغەمبەر(ﷺ) (سام علیك) پاشان ئەیان گوت بە خۆیان بۆچی خودا لەسەر ئەم قسەیە سزامان نادا؟ ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە ﴿وَإِذَا جَآءُوكَ حَيَّوْكَ بِمَا لَمْ يُحَيِّكَ بِهِ ٱللَّهُ وَيَقُولُونَ فِىٓ أَنفُسِهِمْ لَوْلَا يُعَذِّبُنَا ٱللَّهُ بِمَا نَقُولُ حَسْبُهُمْ جَهَنَّمُ يَصْلَوْنَهَا ۖ فَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ﴾.[3] سەنەدەکەی چاکە بەڵام نەیان هێناوە.

**شێوازی (چپە کردن)**

پاشان خوای گەورە بەندە خاوەن باوەڕەکانی ئامۆژگاری دەکات کە ئەوان وەك بێ دینو دووڕوەکان نەبن ئەفەرموێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا تَنَٰجَيْتُمْ فَلَا تَتَنَٰجَوْاْ بِٱلْإِثْمِ وَٱلْعُدْوَٰنِ وَمَعْصِيَتِ ٱلرَّسُولِ وَتَنَٰجَوْاْ بِٱلْبِرِّ وَٱلتَّقْوَىٰ ۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِىٓ إِلَيْهِ تُحْشَرُونَ﴾ ئەی ئەوانەی کەباوەڕتان هێناوە! هەرکات ئێوە چپەتان کرد بۆ گوناهو دەست درێژیو نافەرمانی لە پێغەمبەر سرتە مەکەن، چپەکەشتان بۆ چاکی خۆپارێزی بێو لەو خودایە ترستان هەبێ کە هەمووتان لەلای ئەو کۆ دەکرێنەوە. واتە: ئێوەش چپە مەکەن وەك ئەو نەفامە بێ دینانەی ئەهلی کیتابو ئەو دووڕووە سەر لێ شێواوانەی کە مەیلیان لەسەر خوانەناسیە ﴿وَتَنَٰجَوْاْ بِٱلْبِرِّ وَٱلتَّقْوَىٰ ۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِىٓ إِلَيْهِ تُحْشَرُونَ﴾ واتە: بترسن لەو خوایەی کە ئاگادارتان

---

[1] الطبري (٢٣/٢٤٠).

[2] فتح الباري (١٠/٤٦٣).

[3] احمد (٢/١٧٠)، فەرموودەیەکی حەسەنە.

دەکا لە هەموو ئەو کردارو قسانەی کردوتانەو بۆی هەڵژماردونو بەم زوانە پاداشتتان ئەداتەوە لەسەری.

پاشان ئەفەرموێت: ﴿إِنَّمَا ٱلنَّجْوَىٰ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ لِيَحْزُنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَلَيْسَ بِضَآرِّهِمْ شَيْـًٔا إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ ۚ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُؤْمِنُونَ﴾ سرتە لە شەیتانەوەیە، هەتا خاوەن باوەڕانی پێ خەمگین بکا، هەرچەند بەبێ ئیزنی خودا، هیچ زیانێکیان لێ نادا. با هەرکێ خاوەن باوەڕە خۆیان بە خودا بسپێرن. واتە: چپە کردن (بە پەنهانیو سرتەکردن) کە خاوەن باوەڕ وا دەزانێ باسی خراپەی ئەوان ئەکەنو دەیانەوێ ئازاری ئەوان بدەن. ﴿مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ لِيَحْزُنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ واتە ئەوەی ئەو چپە کەرانە پێی هەڵدەسن شەیتان دەیخاتە دڵیانەوەو بۆیان دەڕازێنێتەوە ﴿لِيَحْزُنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ واتە: بۆ ئەوەی خەمگینیان بکات ئەوە هیچ زیانێکیان لێ نادا بە ئیزنی خودا نەبێ. وە هەرکەسێ هەستی بە شتێ لەو چپانە کرد با پەنا بە خودا بگرێو پشت بە خودا ببەستێ بە یارمەتی خوا هیچ زیانێکی لێ نادات. لە فەرموودەدا هاتوە کە نەهی کردووە لە چپە کردن چونکە دەبێتە هۆی ئازاردانی موسوڵمانان وەك ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە عبدالله ی کوڕی مەسعودەوە دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (وەختێك ئێوە سێ کەس بوون بەیەکەوە با دوو کەس چپە نەکا بەبێ هاوەڵەکەی تریان چونکە ئەو چپەیە دلگرانی دەکات) لە فەرموودەی ئەعمەشەوە هێناویانە. وە عبدالرزاق لە ئیبنوعومەرەوە ڕیوایەتی کردوە دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (ئەگەر کاتێ ئێوە سێ کەس بوون با دوانتان قسە نەکا بەبێ سێهەمتان بەبێ ئیزن وەرگرتن لێی چونکە ئەو چپە کردنە خەمگینی دەکات)[1] لە فەرمودەی ئەعمەشەوە (الاعمش) هێناویانە.[2] وە عبدالرزاق ڕیوایەتی کردوە لە ئیبنوعومەرەوە دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (وەختێ ئێوە سێ کەس بوون با دووکەستان چپە نەکات بەبێ سێهەم بە ئیزنی ئەو نەبێ چونکە ئەو چپەیە خەمگینی دەکات)[3] موسلم هێناویەتی[4].

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا قِيلَ لَكُمْ تَفَسَّحُواْ فِى ٱلْمَجَٰلِسِ فَٱفْسَحُواْ يَفْسَحِ ٱللَّهُ لَكُمْ ۖ وَإِذَا قِيلَ ٱنشُزُواْ فَٱنشُزُواْ يَرْفَعِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنكُمْ وَٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْعِلْمَ دَرَجَٰتٍ ۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴿١١﴾﴾

---

[1] احمد(١/٤٢٥-٤٣١)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[2] فتح الباري (١١/٥٨)، و مسلم (٤/١٧١٨).

[3] عبدالرزاق (١١/٢٦)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[4] مسلم (٤/١٧١٧).

## ئادابی کۆڕو دانیشتن

خوای گەورە ئامۆژگاری بەندە خاوەن باوەڕەکانی دەکاتو فەرمانیان پێ دەکا کە لەگەڵ یەکتر چاك بن لەناو کۆڕدا ئەفەرموێت: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا قِيلَ لَكُمْ تَفَسَّحُواْ فِى ٱلْمَجَـٰلِسِ فَٱفْسَحُواْ يَفْسَحِ ٱللَّهُ لَكُمْ ۖ وَإِذَا قِيلَ ٱنشُزُواْ فَٱنشُزُواْ يَرْفَعِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنكُمْ وَٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْعِلْمَ دَرَجَـٰتٍ ۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴾ ئەی گەلی خاوەن باوەڕان! هەرکا لە کۆڕدا پێیان وتن: جێگە بکەنەوە، جێگا بکەنەوە! هەتا خوداش جێگەی ئێوە بکاتەوە. ئەگەر وتیشیان ڕاستەوە بن، ڕاستەوە بن با خوا ئەوانەی لە ئێوە باوەڕیان هێناوەو ئەو کەسانەش کە لە زانیاری بەشدارن، بە چەند پلە بەرزتریان دەکاتەوەو هەر کارێکی ئێوە بیکەن، خوا دەیزانێ. ﴿فِى ٱلْمَجَـٰلِسِ﴾ خوێنراوەتەوە بە (في المجلس) ﴿فَٱفْسَحُواْ يَفْسَحِ ٱللَّهُ لَكُمْ﴾ لەبەر ئەوە کە پاداشت لە شێوەی کارەکەیە وەك لە فەرموودەی سەحیحدا هاتوە (کەسێ لەبەر خاتری خودا مزگەوتێك دروست بکات خودا خانویەك بۆ ئەو کەسە دروست دەکات لە بەهەشتا).[1] وە لە فەرموودەیەکی ترا هاتوە (کەسێ ئاسانکاری بکات بۆ لێ قەوماوێ (یارمەتی بدا) خودا لە دنیاو ڕۆژی دوایدا ئاسانکاری بۆ دەکا (دەیخاتە خۆشیەوە) خودا لە یارمەتی دانی بەندەی خۆیدایە هەتا بەندە لە یارمەتی براکەیدا بێ).[2] لەم بابەتەوە نمونە زۆرە. بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَٱفْسَحُواْ يَفْسَحِ ٱللَّهُ لَكُمْ﴾ قەتادە دەڵێت: ئەم ئایەتە لە کۆڕی زیکرا هاتە خوارەوە چونکە ئەوانە وەختێ کەسێکیان بدیایە (چاو پێ بکەوتایە) دێت بۆ لایان لە کۆڕەکەیانا لای پێغەمبەر(ﷺ) جێگایان بۆ نەئەکردەوە دابنیشێ خوای گەورە فرمانی پێ کردن کە جێگە بۆ یەکتری بکەنەوە.[3] ئیمامی ئەحمەدو شافیعی ڕیوایەتیان کردوە لە ئیبنوعومەرەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (با هیچ پیاوێك پیاوێکی تر هەڵ نەسێنێ لە شوێنی دانیشتنیدا خۆی تێیدا دابنیشێ بەڵکو جێگای یەکتری بکەنەوەو شوێنەکە فراوان بکەن).[4] لە هەردوو سەحیحەکەدا هێناویانە.[5] وە ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە ئەبوهورەیرەوە ئەویش لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرموویەتی: (با هیچ پیاوێك پیاوێکی تر هەڵ نەسێنێ لە شوێنەکەیداو پاشان تێیدا دابنیشێ بەڵکو جێگای یەکتر بکەنەوە خودایش جێگا بۆ ئێوە

[1] فتح الباري (٦٤٨/١).

[2] مسلم (٢٠٧٤/٤).

[3] الطبري (٢٤٤/٢٣).

[4] احمد(١٢٦/٢)، و ترتيب الشافعي (١٨٦/٢)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[5] فتح الباري (٦٤/١)، و مسلم (١٧١٤/٤).

دەکاتەوە).[1] دووبارە ڕیوایەتی کردووە بە وتەیەکی تر (با هیچ پیاوێك بۆ پیاوێکی تر هەڵ نەسێ لە شوێنەکەیا (کۆڕەکەیا) بەڵکو جێگای یەکتر بکەنەوە خودا جێگاتان دەکاتەوە (فراوانی دەکات بۆتان).[2] تەنها ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە. ڕیوایەت کراوە لە ئیبنوعەباس و حەسەنی بەسری و کەسانی تریشەوە کە گوتویانە لەم فەرمودەی خوای گەورەدا : ﴿فَافْسَحُوا يَفْسَحِ اللَّهُ لَكُمْ﴾ واتە: هەڵسن بۆ جەنگ (غەزا) کردن.[3] قەتادە دەڵێت: ﴿وَإِذَا قِيلَ انشُزُوا فَانشُزُوا﴾ واتە: وەختێ بانگ کران بۆ خێرو چاکە قەبوڵی بکەن و بڕۆن[4].

## ڕێزی زانست و زانایان

خوای مەزن ئەفەرموێت: ﴿يَرْفَعِ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنكُمْ وَالَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ دَرَجَاتٍ﴾ واتە: وا نەزانن ئەگەر کەسێ لە ئێوە جێگای کردەوە بۆ برایەکی خۆی وەختێ پێی وترا یا فەرمانی پێ کرا کە هەڵسێ هەڵسا لە جێگاکەی ڕۆشتە دەرەوە ئەوە ئەو کەسە ڕێزی لێ نەگیراوە و ناهەقی پێ کراوە بەڵکو ئەوە ڕێزو پلەی بەرزی لەلای خودا دەدرێتێ، وە خوای گەورە ئەو پاداشتەی نافەوتێنێ و بۆی هەڵ ئەگرێ لە دنیاو قیامەتدا پاداشتی ئەداتەوە. چونکە هەر کەسێ لەبەر خاتری خودا خۆی بە کەم بزانێ خوای گەورە پلەو پایەی بەرز دەکاتەوەو دەنگو باسی لەناو خەڵکا بڵاو دەکاتتەوە. بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ﴾ یانی: زۆر ئاگادارەو دەزانێ کێ شایەنی ئەو ڕێزەیەو کێ شایەنی نیە. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە ئەبی توفەیلی عامری کوڕی واسلەوە کە نافیعی کوڕی عبدوالحرس لە عەسفان گەیشت بە عومەری کوڕی خەتاب کە عومەر کردبوی بە لێپرسراوی (مکە). عومەر پێی ووت: کێت کردوە بە لێپرسراوی ئەم شیوە؟ ئەویش دەڵێت: ئیبنو ئەبزیم کردوە بە لێپرسراویان پیاوێکە لە موالیەکانمان (لە بەندە ئازاد کراوەکانمان) عومەر دەڵێت: مەوالیت کردوە بە لێپرسراویان؟. دەڵێت ئەی گەورەی موسوڵمانان ئەو پیاوە شارەزاو خوێندەوارە لە قورئان و زانایە لە فەرائیزدا قازیشە، عومەر (ڕەزای خوای لێ بێ) ووتی: ئەی پێغەمبەرەکەتان (ﷺ) نەی فەرمووە:

---

[1]. احمد(٢/٥٢٣)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[2] احمد(٢/٣٣٨)، فەرموودەیەکی سەحیحە

[3] الطبري (٢٣/٢٤٤)، و القرطبي (١٧/٢٩٩)، الدر المنثور (٨/٨٢).

[4] الطبري (٢٣/٢٤٥).

(خوای گەورە بەم پەڕاوە گەلێك بەرز دەكاتەوەو گەلێكی تری پێ دادەبەزێنێ)[1]. وە هەر بەم شێوەیە موسلمیش ڕیوایەتی كردوە[2].

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا نَٰجَيۡتُمُ ٱلرَّسُولَ فَقَدِّمُواْ بَيۡنَ يَدَيۡ نَجۡوَىٰكُمۡ صَدَقَةٗۚ ذَٰلِكَ خَيۡرٞ لَّكُمۡ وَأَطۡهَرُۚ فَإِن لَّمۡ تَجِدُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٌ ﴿١٢﴾ ءَأَشۡفَقۡتُمۡ أَن تُقَدِّمُواْ بَيۡنَ يَدَيۡ نَجۡوَىٰكُمۡ صَدَقَٰتٖۚ فَإِذۡ لَمۡ تَفۡعَلُواْ وَتَابَ ٱللَّهُ عَلَيۡكُمۡ فَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥۚ وَٱللَّهُ خَبِيرُۢ بِمَا تَعۡمَلُونَ ﴿١٣﴾﴾

## فەرمان بە ماڵ بەخشین پێش ئەوەی قسە لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) بكەن

خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا نَٰجَيۡتُمُ ٱلرَّسُولَ فَقَدِّمُواْ بَيۡنَ يَدَيۡ نَجۡوَىٰكُمۡ صَدَقَةٗۚ ذَٰلِكَ خَيۡرٞ لَّكُمۡ وَأَطۡهَرُۚ فَإِن لَّمۡ تَجِدُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٌ﴾ ئەی گەلی خاوەن باوەڕان! هەر كاتێ ویستتان چپە لەگەڵ پێغەمبەر بكەن، بەر لە چپە كردنەكە خێرێك بكەن، ئەمە بۆ ئێوە چاكترو پاكژترە. گەر نەشتان بوو، ئەوا خودا لێتان دەبورێ‌و دلۆڤانە. خوای گەورە فەرمان ئەدا بە بەندەكانی گەر یەكێكیان ویستی سرتە لەگەڵ پێغەمبەری خودا(ﷺ) بكات كە ئەو سرتەیە لەنێوان ئەوو پێغەمبەردا بوو (ﷺ) پێش ئەو سرتەیە با خێرێك بكات. تا پاك‌و خاوێن‌و شایستەی بكات بۆ ئەوەی بڕواتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) بۆیە فەرموویەتی: ﴿ذَٰلِكَ خَيۡرٞ لَّكُمۡ وَأَطۡهَرُ﴾ پاشان فەرموویەتی: ﴿فَإِن لَّمۡ تَجِدُواْ﴾ گەر ئەوەشتان نەتوانی لەبەر هەژاری. ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٌ﴾ كەسێ نەتوانێ ئەو داوایەی لێ ناكرێ. پاشان فەرموویەتی: ﴿ءَأَشۡفَقۡتُمۡ أَن تُقَدِّمُواْ بَيۡنَ يَدَيۡ نَجۡوَىٰكُمۡ صَدَقَٰتٖۚ فَإِذۡ لَمۡ تَفۡعَلُواْ وَتَابَ ٱللَّهُ عَلَيۡكُمۡ فَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥۚ وَٱللَّهُ خَبِيرُۢ بِمَا تَعۡمَلُونَ﴾ ئاخۆ لەبەرتان گرانە بەر لە چپە كردن خێرێ بكەن؟ گەر ئەمەشتان نەكردو خودا لەمە عافوی كردن، دەسا ئێوە نوێژ بكەن‌و زەكات بدەن‌و بەرفەرمانی خوداو پێغەمبەری بن. خودا لە هەموو كردەوەتان ئاگادارە. واتە: ئەگەر ترستان هەبوو لەسەر بەردەوامی ئەم بڕیارە لەسەرتان كە كردنی خێرە پێش ئەوەی سرتە لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) بكەن ﴿فَإِذۡ لَمۡ تَفۡعَلُواْ وَتَابَ ٱللَّهُ عَلَيۡكُمۡ فَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥۚ وَٱللَّهُ خَبِيرُۢ بِمَا تَعۡمَلُونَ﴾ ئەم خێركردنە هەڵگیراو لابرا لەسەریان. وتراویشە كە ئیش بەم ئایەتە نەكرا پێش نەسخ بوونەوەشی. جگە لە عەلی كوڕی ئەبوتالب نەبێ (ڕەزای خوای لێ بێ) ئیشی پێ ئەكرد. عەلی كوڕی

---

[1] احمد(٣٥/١)، فەرموودەیەكی سەحیحە.

[2] مسلم (٥٥٩/١).

ئەبو تەلحە دەڵێت: لە ئیبنوعەباسەوە لەم ئایەتەدا ﴿فَقَدِّمُواْ بَيْنَ يَدَىْ نَجْوَىٰكُمْ صَدَقَةً﴾ لەبەرئەوەی موسوڵمانان پرسیاری زۆریان لە پێغەمبەری خودا ئەکرد (ﷺ) زۆر ماندویان کردو نارەحەت بوو. خوای گەورە ویستی سەر شانی پێغەمبەر(ﷺ) سووك بكات. وەختێ ئەمەی فەرموو موسوڵمانان زۆر ترسان‌و وازیان لە پرسیار کردن هێنا. پاشان خودا ئەمەی نارده خوارەوە ﴿ءَأَشْفَقْتُمْ أَن تُقَدِّمُواْ بَيْنَ يَدَىْ نَجْوَىٰكُمْ صَدَقَٰتٍ فَإِذْ لَمْ تَفْعَلُواْ وَتَابَ ٱللَّهُ عَلَيْكُمْ فَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ﴾ خودا دەرگای لێ کردنەوە مۆڵەتی دان‌و تەنگی لەسەر نەهێشتن.[1] عیکرمەو حەسەنی بەسری گوتیان لەوەی کە خودا ئەفەرموێت: ﴿فَقَدِّمُواْ بَيْنَ يَدَىْ نَجْوَىٰكُمْ صَدَقَةً﴾ ئایەتەکەی دوای خۆی نەسخی کردوەتەوە ﴿ءَأَشْفَقْتُمْ أَن تُقَدِّمُواْ بَيْنَ يَدَىْ نَجْوَىٰكُمْ صَدَقَٰتٍ﴾ تا کۆتاییەکەی.[2] سەعیدی کوڕی ئەبوعوروبە دەڵێت: لە قەتادەو موقاتلی کوڕی حیانەوە خەڵکی پرسیاریان ئەکرد لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەتا ماندویان کردو نارەحەت بوو خودایش بەم ئایەتە وازی پێ هێنان. وەختێ کەسێکیان پێویستیەکی ببوایە بە ڕۆشتنی بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) نەی ئەتوانی جێ بەجێی بکات هەتا ئەو خێرەی نەکردایە. ئەمەیان زۆر بەلاوە گران‌و نارەحەت بوو پاشان خودا ئایەتی مۆڵەتدان (بۆ ناردنە خوارەوە) ﴿فَإِن لَّمْ تَجِدُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾.[3] موعەمەر دەڵێت لە قەتادەوە: ﴿إِذَا نَٰجَيْتُمُ ٱلرَّسُولَ فَقَدِّمُواْ بَيْنَ يَدَىْ نَجْوَىٰكُمْ صَدَقَةً﴾ ئەمە نەسخ بووەو دەوامی نەکرد ماوەیە لە ڕۆژێك نەبێ.[4] وە هەر بەم شێوەیە عبدالرزاق لە موجاهدەوە ڕیوایەتی کردوە. عەلی کوڕی ئەبوتالب دەڵێت: تەنها من نەبێ کەس جێ بەجێی نەکرد هەتا نەسخ بوەوە بەتەمای پاداشتم، وە دەڵێت: تەنها یەك سەعات بوو.[5]

﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ تَوَلَّوْاْ قَوْمًا غَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيْهِم مَّا هُم مِّنكُمْ وَلَا مِنْهُمْ وَيَحْلِفُونَ عَلَى ٱلْكَذِبِ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴿١٤﴾ أَعَدَّ ٱللَّهُ لَهُمْ عَذَابًا شَدِيدًا إِنَّهُمْ سَآءَ مَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ ﴿١٥﴾ ٱتَّخَذُوٓاْ أَيْمَٰنَهُمْ جُنَّةً فَصَدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ فَلَهُمْ عَذَابٌ مُّهِينٌ ﴿١٦﴾ لَّن تُغْنِىَ عَنْهُمْ أَمْوَٰلُهُمْ وَلَآ أَوْلَٰدُهُم مِّنَ ٱللَّهِ شَيْـًٔا أُوْلَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿١٧﴾ يَوْمَ يَبْعَثُهُمُ ٱللَّهُ

---

[1] الطبري (٢٣/٢٤٩).
[2] الطبري (٢٣/٢٥٠).
[3] الطبري (٢٣/٢٤٨).
[4] الطبري (٢٣/٢٨٠).
[5] عبدالرزاق (٣/٢٨٠).

جَمِيعًا فَيَحْلِفُونَ لَهُۥ كَمَا يَحْلِفُونَ لَكُمْ وَيَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ عَلَىٰ شَيْءٍ ۚ أَلَآ إِنَّهُمْ هُمُ ٱلْكَٰذِبُونَ ﴿١٨﴾ ٱسْتَحْوَذَ عَلَيْهِمُ ٱلشَّيْطَٰنُ فَأَنسَىٰهُمْ ذِكْرَ ٱللَّهِ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ حِزْبُ ٱلشَّيْطَٰنِ ۚ أَلَآ إِنَّ حِزْبَ ٱلشَّيْطَٰنِ هُمُ ٱلْخَٰسِرُونَ ﴿١٩﴾﴾

**باسی خراپی دووڕووەکان (المنافقین)**

خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ تَوَلَّوْا۟ قَوْمًا غَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيْهِم مَّا هُم مِّنكُمْ وَلَا مِنْهُمْ وَيَحْلِفُونَ عَلَى ٱلْكَذِبِ وَهُمْ يَعْلَمُونَ﴾ ئاخۆ تۆ ئەوانەت نەدی کە بوونە دۆستی ئەوانەی خودا غەزەبی لێ گرتبوون؟ لە ئێوە نین، لەوانیش نین، بە درۆ سوێند بە خوا دەخۆنو دەشزانن کە درۆ دەکەن. خوای گەورە ڕازی نەبوونی خۆی لە دووڕووەکان دەردەبڕێ لەوەی کە دۆستایەتی خوانەناسەکان ئەکەن لە ژێرەوە بە پەنهانی لە ڕاستیشدا نە لەگەڵ خوانەناسەکانن‌و نە لەگەڵ موسوڵمانەکان. وەك خودا فەرموویەتی: ﴿مُّذَبْذَبِينَ بَيْنَ ذَٰلِكَ لَآ إِلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِ وَلَآ إِلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِ ۚ وَمَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ فَلَن تَجِدَ لَهُۥ سَبِيلًا﴾[1]. واتە: دوودڵ‌و دڵە ڕاوکێیانە لەو نێوان (کوفرو باوەڕ)ەدا نە لای بڕوا دارانن وە نە لای بێ باوەڕانن وە هەرکەسێك خوا گومڕای بکات ئەوە هەرگیز ڕێگەیەکی ڕاستی بۆ نادۆزرێتەوە (بیگەیەنێت بە مەبەست). وە لێرەشدا فەرموویەتی: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ تَوَلَّوْا۟ قَوْمًا غَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيْهِم﴾ واتە: ئەو جولەکانەی کە دووڕووەکان دۆستایەتیان لەگەڵ ئەکردن‌و لێیان نزیك دەبونەوە بە پەنهانی‌و لەژێرەوە. پاشان خودای مەزن فەرمووی: ﴿مَّا هُم مِّنكُمْ وَلَا مِنْهُمْ﴾ واتە: ئەو دووڕووانە لە ڕاستیدا گەڵ ئێوە نین وە لەگەڵ ئەوانەیش نین کە دۆستایەتیان لەگەڵ ئەکەن کە بریتیە لە جولەکەکان وە دیسان فەرموویەتی: ﴿وَيَحْلِفُونَ عَلَى ٱلْكَذِبِ وَهُمْ يَعْلَمُونَ﴾ واتە: دووڕووەکان سوێند بو درۆ ئەخۆن. خۆشیان چاك دەزانن کە بە درۆ وە سوێند ئەخۆن کە ناو دەبرێ بە (اليمين الخموس) واتە: سوێندی درۆ. بەتایبەت لەو حاڵەتە پیس‌و ناشیرینەدا کە تێیدا دەژین پەنا بە خوای گەورە لێی. چونکە ئەو دووڕوانە وەختێ ئەگەیشتن بە موسوڵمانەکان ئەیان گوت خاوەن باوەڕین کاتێکیش بچونایەتە لای پێغەمبەریش(ﷺ) سوێندیان بۆ دەخوارد کە باوەڕدارن. ئەم کردارەش پێی هەڵدەسان دەیانزانی درۆیان کردوەو بە درۆوە سوێندیان خواردوە. چونکە ئەوان باوەڕیان بە ڕاستی قسەکەی خۆیان نەبوو. ڕاستیەکەیشی هەر وابوو کە درۆیان کردبوو. بۆیە خوای گەورە شایەتی دا لەسەر ئەوەی کە باوەڕهێنانەکەیان درۆیەو شایەتی دانەکەشیان هەر درۆیە. پاشان خودای مەزن فەرموویەتی: ﴿أَعَدَّ ٱللَّهُ لَهُمْ عَذَابًا شَدِيدًا ۖ إِنَّهُمْ سَآءَ مَا كَانُوا۟

[1] النساء (١٤٣).

يَعْمَلُونَ﴾ خودا ئازاری دژواری بۆ ئەمانە ساز کردوەو کارەکەیان زۆر خراپە. واتە: خودا لەسەر ئەم ڕەوشتە ناشیرین‌و خراپەیان کە دۆستایەتی خوانەناسەکان‌و قسە بۆکردنیان بوو لەگەڵ دژایەتی موسوڵمانان‌و خیانەت لێ کردنیان بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿اتَّخَذُوا أَيْمَانَهُمْ جُنَّةً فَصَدُّوا عَن سَبِيلِ اللَّهِ فَلَهُمْ عَذَابٌ مُّهِينٌ﴾ سوێندیان کردبوە قەڵغانێك بۆخۆیان‌و بوونە لەمپەری ڕێی خودا، سا بۆیان ئازارێکی ئابڕووبەر هەیە. واتە: خۆیان بە خاوەن ئیمان پیشان ئەداو بێ دینیەکەیان ئەشاردەوە دەریان نەئەخست. بەو سوێندە درۆیانە خۆیان ئەپاراست زۆر کەس کە ئەمانەیان نەدەناسی‌و ڕاستیەکەیان نەدەزانین هەڵ ئەخەڵەتان پێیان‌و بەو شێوەیە ئەبوونە لەمپەری ڕێی خوداو هەندێ خەڵکیان دەخستە گومانەوەو پەشیمانیان ئەکردنەوە. ﴿فَلَهُمْ عَذَابٌ مُّهِينٌ﴾ واتە: لە بەرانبەری ئەوەی کە ئەو دووڕوانە سوێندی درۆیان بە ناوە گەورەکانی خودا ئەخوارد. بە گەورەو ڕێزەوە سەیریان نەئەکرد خودایش سزایەکی ئابڕووبەریان ئەدات. پاشان خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿لَّن تُغْنِيَ عَنْهُمْ أَمْوَالُهُمْ وَلَا أَوْلَادُهُم مِّنَ اللَّهِ شَيْئًا أُولَٰئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ﴾ نە سامان‌و نە ڕۆڵەکانیان (لە بەرانبەری خوداوە) ناتوانن هیچیان بۆ بکەن، ئەوانە جەهەننەمین‌و هەتا سەر هەر لەوێ دەبن. واتە: سامان‌و ڕۆڵەکانیان ناتوانن هیچ سودێکیان پێ بگەیەنن وەختێ سزایان بۆ دابەزێ. ﴿أُولَٰئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ﴾ پاشان فەرموویەتی: ﴿يَوْمَ يَبْعَثُهُمُ اللَّهُ جَمِيعًا فَيَحْلِفُونَ لَهُ كَمَا يَحْلِفُونَ لَكُمْ وَيَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ عَلَىٰ شَيْءٍ أَلَا إِنَّهُمْ هُمُ الْكَاذِبُونَ﴾ ڕۆژێ کە خوا گشتیان زیندوو دەکاتەوە، ئەوجار سوێندێ بۆ ئەو دەخۆن وەکوو بۆ ئێوە سوێند ئەخۆن، لاشیان وایە شتێکیان لەباردایە. باش بزانن کە ئەمانە درۆزنن. واتە: لە ڕۆژی قیامەتا هەموویان کۆ دەکرێنەوە هیچ کەسێکیان لە دەست دەرناچن‌و دەهێنرێن. ﴿فَيَحْلِفُونَ لَهُ كَمَا يَحْلِفُونَ لَكُمْ وَيَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ عَلَىٰ شَيْءٍ﴾ واتە: سوێند ئەخۆن بە خودا کە لەسەر ڕێی ڕاست بوون‌و لایان نەداوە وەك چۆن لە دنیا سوێندیان ئەخوارد بۆ خەڵکی چونکە هەر کەسێ لەسەر هەر شتێ لە دنیا ژیانی بەسەر برد لەسەر ئەو شتەش ئەمرێ‌و زیندوو دەکرێتەوە. وا دەزانن ئەو سوێند خواردنە سوودیان پێ دەگەیەنێ لە لای خودا وەك لە دنیا لای خەڵکی سودیان لێ وەرگرت کە پاکانەیان ئەکردو چاوپۆشیان لێ ئەکراو باوەڕیان پێ دەکرا. ﴿وَيَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ عَلَىٰ شَيْءٍ﴾ واتە: کاتێ سوێندەکەیان بەو شێوەیە بۆ خودا ئەخوارد وایان دەزانی ڕزگاریان دەبێ. پاشان خوای گەورە هەڕەشەیان لێ دەکاو ناڕەحەت بووە لێیان‌و ئەفەرموێت: ﴿أَلَا إِنَّهُمْ هُمُ الْكَاذِبُونَ﴾ تەئکیدی دەکاتەوە

لەسەریان کە درۆزنن و ڕاست ناکەن. پاشان خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿ٱسۡتَحۡوَذَ عَلَيۡهِمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ فَأَنسَىٰهُمۡ ذِكۡرَ ٱللَّهِۚ أُوْلَٰٓئِكَ حِزۡبُ ٱلشَّيۡطَٰنِۚ أَلَآ إِنَّ حِزۡبَ ٱلشَّيۡطَٰنِ هُمُ ٱلۡخَٰسِرُونَ﴾ شەیتان لەسەریان زاڵ بووەو یادی خودای لەبیر بردوون، ئەوان کۆمەڵەی شەیتانن باش بزانن کە هەر کۆمەڵەی شەیتان زەرەرمەندن. یانی شەیتان زاڵ بووە بەسەر دڵیاندا لەبیری بردوونەتەوە کە یادی خودا بکەن. وە شەیتانیش بەسەر هەر کەسێکا زاڵ بێ وەك ئەوانەی لێ دەکا. هەر لەبەرئەوەیە کە ئەبوداود دەڵێت: ئەحمەدی کوڕی یونس و زائدەو سائیبی کوڕی حەبیشی لە مەعدانی کوڕی ئەبی تەلحەی یەعمورییەوە بۆیان گێڕاینەوە ئەویش لە ئەبودەرداوە (ابو الدرداء) دەڵێت: بیستم لە پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) ئەی فەرموو: (هەر کەسێك لە دێیەکداو (گوند) لە ڕەش ماڵێکا (بدو) ئیقامەی نوێژ نەکرێ لەناویاندا مەگین شەیتان زاڵ دەبێ بەسەریانا لەگەڵ کۆمەڵابە، چونکە بێگومان گورگ مەڕی جیابووەوە (تەرە) دەخوا) زائدەو سائب وتیان: واتە: نوێژ بە کۆمەڵ (بە جەماعەت).[1] پاشان خودای مەزن فەرمووی: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ حِزۡبُ ٱلشَّيۡطَٰنِ﴾ واتە: ئەوانەی کە شەیتان زاڵ بووە بەسەریاناو یادی خودای لەبیر بردوونەتەوە پاشان فەرمووی: ﴿أَلَآ إِنَّ حِزۡبَ ٱلشَّيۡطَٰنِ هُمُ ٱلۡخَٰسِرُونَ﴾ باش بزانن کە هەر کۆمەڵەی شەیتان زەرەرمەندن.

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُحَآدُّونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ أُوْلَٰٓئِكَ فِي ٱلۡأَذَلِّينَ ﴿٢٠﴾ كَتَبَ ٱللَّهُ لَأَغۡلِبَنَّ أَنَا۠ وَرُسُلِيٓۚ إِنَّ ٱللَّهَ قَوِيٌّ عَزِيزٞ ﴿٢١﴾ لَّا تَجِدُ قَوۡمٗا يُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ يُوَآدُّونَ مَنۡ حَآدَّ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَلَوۡ كَانُوٓاْ ءَابَآءَهُمۡ أَوۡ أَبۡنَآءَهُمۡ أَوۡ إِخۡوَٰنَهُمۡ أَوۡ عَشِيرَتَهُمۡۚ أُوْلَٰٓئِكَ كَتَبَ فِي قُلُوبِهِمُ ٱلۡإِيمَٰنَ وَأَيَّدَهُم بِرُوحٖ مِّنۡهُۖ وَيُدۡخِلُهُمۡ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَاۚ رَضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهُمۡ وَرَضُواْ عَنۡهُۚ أُوْلَٰٓئِكَ حِزۡبُ ٱللَّهِۚ أَلَآ إِنَّ حِزۡبَ ٱللَّهِ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ﴿٢٢﴾ ﴾

## زەبوونی ئەو کەسانەی کە دژایەتی خودا ئەکەن و زاڵ بوونی خوداو پێغەمبەرەکانی بەسەریاندا (علیهم السلام)

خودای مەزن فەرموویەتی: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُحَآدُّونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ أُوْلَٰٓئِكَ فِي ٱلۡأَذَلِّينَ ﴾ ئەو کەسانەی دژایەتی خوداو پێغەمبەری دەکەن، لە هەموو کەس زەبوون ترن. خوای گەورە باسی ئەو خوانەناسانە دەکا کە دژایەتی خوداو پێغەمبەرەکەی (ﷺ) دەکەن و باوەڕ ناهێنن. واتە: دوورە پەرێزن و دژایەتی ڕێی خودا ئەکەن و بە پێچەوانەی بەرنامەی خودا دەجوڵێنەوەو بە ڕێگەکەی ئەودا ناڕۆن ﴿أُوْلَٰٓئِكَ فِي ٱلۡأَذَلِّينَ ﴾

[1] ابوداود (١/٣٧١)، فەرموودەیەکی حەسەنە.

واتە: ئەوانە لە گرۆی (کۆمەڵی) بەدبەختانو دەرکراوانن وە دورن لە ڕێی ڕاستو لە دنیاو لە قیامەتدا زەلیلو سەرشۆڕن. وە ئەفەرموێت: ﴿كَتَبَ ٱللَّهُ لَأَغْلِبَنَّ أَنَا۠ وَرُسُلِىٓۚ إِنَّ ٱللَّهَ قَوِىٌّ عَزِيزٌ﴾ خودا خۆی بڕیاری داوە: بێ گومان منو پێغەمبەرەکانم سەردەکەوین. خودا بەتوانایە و بە دەستەڵاتە. یانی خودا خۆی بڕیاری داوە لە پەڕاوی یەکەمی تۆماری کردوەو گۆڕینی بەسەردا نایەتو ڕێ گری نیەو ناتوانرێ دژایەتی بکرێ. بێ گومان سەرکەوتنیش بۆ خوداو پێغەمبەرەکانیو بەندە خواناسەکانیەتی لە دنیاو لە ڕۆژی دواییدا وەك خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِنَّا لَنَنصُرُ رُسُلَنَا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَيَوْمَ يَقُومُ ٱلْأَشْهَـٰدُ ﴿٥١﴾ يَوْمَ لَا يَنفَعُ ٱلظَّـٰلِمِينَ مَعْذِرَتُهُمْ ۖ وَلَهُمُ ٱللَّعْنَةُ وَلَهُمْ سُوٓءُ ٱلدَّارِ﴾[1] واتە: بەڕاستی ئێمە پێغەمبەرانمانو ئەوانەی باوەڕیان هێناوە سەرکەوتوو دەکەین لە ژیانی دنیادا وە لەو ڕۆژەی (قیامەت) کە شایەتەکان هەڵدەسنەوە، ڕۆژێك پاکانە کردنی بێ باوەڕیان سودیان پێ ناگەیەنێ هەموویان نەفرەتیان لێ کراوەو خراپترین جێگایان هەیە.وە لێرەدا فەرموویەتی: ﴿كَتَبَ ٱللَّهُ لَأَغْلِبَنَّ أَنَا۠ وَرُسُلِىٓۚ إِنَّ ٱللَّهَ قَوِىٌّ عَزِيزٌ﴾ واتە: خودای بەتواناو خاوەن دەستەڵات بڕیاری داوە کە سەرکەوتن هەر بۆ ئەوە بەسەر دوژمنەکانیا. ئەمەیش بڕیارێکەو دراوەو بڕاوەتەوە کە پاشەڕۆژو سەرکەوتن هەر بۆ موسوڵمانانە لە دنیاو قیامەتا.

### موسوڵمانان دۆستایەتی بێ دینان ناکەن

پاشان خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿لَّا تَجِدُ قَوْمًا يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ يُوَآدُّونَ مَنْ حَآدَّ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَلَوْ كَانُوٓا۟ ءَابَآءَهُمْ أَوْ أَبْنَآءَهُمْ أَوْ إِخْوَٰنَهُمْ أَوْ عَشِيرَتَهُمْ ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ كَتَبَ فِى قُلُوبِهِمُ ٱلْإِيمَـٰنَ وَأَيَّدَهُم بِرُوحٍ مِّنْهُ ۖ وَيُدْخِلُهُمْ جَنَّـٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَـٰرُ خَـٰلِدِينَ فِيهَا ۚ رَضِىَ ٱللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا۟ عَنْهُ ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ حِزْبُ ٱللَّهِ ۚ أَلَآ إِنَّ حِزْبَ ٱللَّهِ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ﴾ تۆ نابینی ئەوانەی باوەڕیان هەیە بە خوداو بە ڕۆژی قیامەت، نابێ هەرگیز ببنە دۆستی ئەو کەسانەی پێچەوانەی خوداو پێغەمبەری خودان. تەنانەت ئەگەر باوکیشیان یان کوڕیان بن، یا لە هۆزەکەی خۆیان بن، کە ئەمانە خودا بڕوای لە دڵیان جێگیر کردوەو بە هێزێکی تایبەتی خۆی دیاری کردوون، دەیان نێرێتە باغاتێك جۆ باریان بە بەردا دەڕواو هەتا سەر هەر لەوێ دەبن، خودایان لێ ڕازی بووەو ئەوانیش لە خودا ڕازین. ئەوانە کۆمەڵی خودان. باش بزانن هەر کۆمەڵی خودا ڕزگارن وسەرفرازن. واتە: دۆستایەتی ئەو کەسانە ناکەن کە پێچەوانەی فەرمانی خوداو پێغەمبەری خودان (ﷺ) با ئەوانە خزمی نزیکیش بن وەك خودا

---

[1] غافر (٥١-٥٢).

فەرموویـــــەتی: ﴿لَا يَتَّخِذِ ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلْكَٰفِرِينَ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ۖ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ فَلَيْسَ مِنَ ٱللَّهِ فِى شَىْءٍ إِلَّآ أَن تَتَّقُوا۟ مِنْهُمْ تُقَىٰةً ۗ وَيُحَذِّرُكُمُ ٱللَّهُ نَفْسَهُۥ﴾[1]، واتـە: نـابێ بـڕواداران بـێ بـاوەڕان بگـرن بـە دۆستی خۆیان لەجیاتی بڕواداران وە هەرکەسێك وابكات ئیتر پەیوەستی لەگەڵ خودا نامێنێ مەگەر بۆ خۆپاراستنتان بێت لێیان وە خـودا دەتـان ترسێنێت لـە سـزای خـۆی. وە ئەفـەرموێت: ﴿قُلْ إِن كَانَ ءَابَآؤُكُمْ وَأَبْنَآؤُكُمْ وَإِخْوَٰنُكُمْ وَأَزْوَٰجُكُمْ وَعَشِيرَتُكُمْ وَأَمْوَٰلٌ ٱقْتَرَفْتُمُوهَا وَتِجَٰرَةٌ تَخْشَوْنَ كَسَادَهَا وَمَسَٰكِنُ تَرْضَوْنَهَآ أَحَبَّ إِلَيْكُم مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَجِهَادٍ فِى سَبِيلِهِۦ فَتَرَبَّصُوا۟ حَتَّىٰ يَأْتِىَ ٱللَّهُ بِأَمْرِهِۦ ۗ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْفَٰسِقِينَ﴾[2]، واتە: (ئـەی موحەممـەد (ﷺ)) بڵـێ: ئەگـەر باوکانتـانو کوڕانتـانو برایانتـانو هاوسـەرانتانو خـزمو عەشـیرەتتانو مـاڵو داراییـەك (بـە زەحمـەت) پەیـداتان کردوەو بازرگانیەك کە دەترسن برەوی نەبێ (بێ بازاڕ بێ)و خانوبەرەیەك کە پێی ڕازیـن خۆشەویست ترە لاتان لە خواو پێغەمبەرەکەیو تێکۆشان لە ڕێگەکەیدا ئەوە چاوەڕوان بکەن هەتا خوا فـەرمان (و تۆڵە)ی خۆی دێنێ (بۆتان) وە خوا ڕێنمونی کەسانی تێپەڕ لە سنور ناکات. سەعیدی کوڕی عبدالعزیزو کەسانی تریش گوتویانە: ئەم ئایەتە هاتە خـوارەوە: ﴿لَّا تَجِدُ قَوْمًا يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ﴾ تـا کۆتایەکەی لەسەر ئەبوعوبەیدەی عامری کوڕی عبدالله کوڕی جەڕاح وەختـێ بـاوکی خـۆی کوشـت لـە غەزای بەدرا.[3] لەبەر ئەمەیە عومەری کوڕی خەتاب (ڕەزای خوای لێ بێ) کاتێ فـەرمانی کـرد بـە ڕاوێـژ دوای خۆی لەو شەش کەسەی یەکێك هەڵبژێرن. دەڵێت: ئەگەر ئەبوعوبەیدە زیندوو بوایە ئەوم ئەکردە جێنشینی خۆم. وە وتراوە لەم ئایەتەدا ﴿وَلَوْ كَانُوٓا۟ ءَابَآءَهُمْ﴾ هاتە خوارەوە لەسەر ئەبوعوبەیدە کە باوکی کوشت لە غەزای بەدرا. ﴿أَوْ أَبْنَآءَهُمْ﴾ لەسەر ئەبوبـەکری سـدیق کە ویستی عبدالرحمنی کوڕی بکوژێ لەو ڕۆژەدا. ﴿أَوْ إِخْوَٰنَهُمْ﴾ لەسەر موسعەبی کوڕی عومەیر کە براکەی خـۆی عبـدالله ی کوڕی عومەیری کوشت لەو ڕۆژەدا ﴿أَوْ عَشِيرَتَهُمْ﴾ لەسەر عومەر کە خزمێکی نزیکی خۆی کوشت لـەو ڕۆژەدا. وە لەسەر عەلیو حەمزەو عوبەیدەی (عبيدة) کوڕی حارس کە عوتبەو شیبەو وەلیـدی کـوڕی عوتبەیان کوشت لـە ڕۆژی بـەدرا والله اعلـم. وە منـیش ئـەڵێنم هـەر لـە شـێوەی ئـەم ڕووداوە وەختـێ پێغەمبەر(ﷺ) ڕاوێژی کرد لە بارەی دیلەکانی بەدرەوە بە موسوڵمانان، ئەبوبەکری سدیق دەڵێت کە

---

[1] ال عمران (٢٨).

[2] التوبة (٢٤).

[3] انظر الاصابة ترجمة عامر بن عبدالله بن الجراح.

با فیدیەیان لێ وەرگیرێ ،ئەو سامان‌و دەرامەتە ئەبێتە یارمەتی‌و هێزێکی گەورە بۆ موسولمانان. وە ئەمانە ئامۆزاو خزمی خۆمانن بەلکو خوای گەورە هیدایەتیان بداو موسولمان بن. عومەر دەلێت: نەخێر من رام لەسەر رای ئەبوبەکر نیە ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئایا رێم ئەدەی کە بۆ فلانە کەسی خزمم تا بیکوژم‌و عەلیش بۆ عەقیل‌و وە رێگای فلانە کەسیش بدە بۆ خزمەکەی بۆ ئەوەی خودای گەورە ئاگای لێ بێ کە هیچ خۆشەویستی‌و دۆستایەتیە نیە لە دلمانا بەرامبەر ئەم بت پەرستانە. ئەمە رووداوەکە بوو بە تەواوی. وە ئەفەرموێت: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ كَتَبَ فِي قُلُوبِهِمُ ٱلۡإِيمَٰنَ﴾ئائەوانە خودا باوەری لە دلیاندا جێگیر کردووە. ئیبنوعەباس دەلێت: ﴿وَأَيَّدَهُم بِرُوحٖ مِّنۡهُۖ﴾ بە هێزی خۆی یاریدەی داون. وە ئەفەرموێت: ﴿وَيُدۡخِلُهُمۡ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَاۚ رَضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهُمۡ﴾ هەموو جارێ لە وێنەی ئەمە لە پێشەوە تەفسیر کراوە ﴿رَضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهُمۡ وَرَضُواْ عَنۡهُۚ﴾ نهێنیەکی جوان‌و شیرینە کاتێ ئەوان بەزەییان نەهاتەوە بە کەسوکارو خزمە نزیك‌و هۆزەکەیان لەبەر رەزامەندی خوای گەورە خودایش پاداشتی دانەوە لەوان رازی بوو ئەمانیش لە خودا رازین بەوەی کە پێی بەخشین لەو هەموو نازو نیعمەتە نەبراوەیە لە قیامەتاو ئەو سەرکەوتنە گەورەو رێزە لە دنیا.

﴿أُوْلَٰٓئِكَ حِزۡبُ ٱللَّهِۚ أَلَآ إِنَّ حِزۡبَ ٱللَّهِ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ﴾ واتە: ئەوانە کۆمەلی خودان. واتە: بەندەی خودان‌و شایەنی رێزن لە لای خودا وە ئەفەرموێت: ﴿أَلَآ إِنَّ حِزۡبَ ٱللَّهِ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ﴾ ئەمە ئاگاداری‌و هەولێ دانە بە رزگار بوون‌و خۆش بەختی‌و سەرکەوتنیان لە دنیاو لە رۆژی دوایا لە بەرانبەری ئەوانەی کە باس کران کە لە کۆمەلی شەیتانن زیانبارن. وەك فەرموویەتی: ﴿أَلَآ إِنَّ حِزۡبَ ٱلشَّيۡطَٰنِ هُمُ ٱلۡخَٰسِرُونَ﴾[1]، واتە: باش بزانن کە هەر کۆمەلی شەیتان زیانبارن.

---

[1] المجادلة (١٩).

## تەفسیری سورەتی (الحشر)

## لە مەدینە هاتووەتە خوارەوە

عەبدەڵای کوڕی عەباس ئەیووت سورەتی بەنی نەزیر.[1] سەعیدی کوڕی مەنسور ڕیوایەتی کردوە لە سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە دەڵێت: گوتم بە ئیبنوعەباس لەبارەی سورەتی حەشرەوە دەڵێت: لەسەر بەنی نەزیر هاتە خوارەوە. وە بوخاریو موسلمیش ڕیوایەتیان کردووە لە ڕوویەکی ترەوە لە هوشەییەوە بەو شێوەیە[2] وە بوخاری ڕیوایەتی کردوە لە فەرموودەکەی ئەبوعەوانەوە لە بشرەوە ئەویش لە سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە دەڵێت: گوتم بە ئیبنوعەباس لەبارەی سورەتی حەشرەوە دەڵێت سورەتی بەنی نەزیرە[3].

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

﴿سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ ﴿١﴾ هُوَ الَّذِي أَخْرَجَ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ مِن دِيَارِهِمْ لِأَوَّلِ الْحَشْرِ ۚ مَا ظَنَنتُمْ أَن يَخْرُجُوا ۖ وَظَنُّوا أَنَّهُم مَّانِعَتُهُمْ حُصُونُهُم مِّنَ اللَّهِ فَأَتَاهُمُ اللَّهُ مِنْ حَيْثُ لَمْ يَحْتَسِبُوا ۖ وَقَذَفَ فِي قُلُوبِهِمُ الرُّعْبَ ۚ يُخْرِبُونَ بُيُوتَهُم بِأَيْدِيهِمْ وَأَيْدِي الْمُؤْمِنِينَ فَاعْتَبِرُوا يَا أُولِي الْأَبْصَارِ ﴿٢﴾ وَلَوْلَا أَن كَتَبَ اللَّهُ عَلَيْهِمُ الْجَلَاءَ لَعَذَّبَهُمْ فِي الدُّنْيَا ۖ وَلَهُمْ فِي الْآخِرَةِ عَذَابُ النَّارِ ﴿٣﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ شَاقُّوا اللَّهَ وَرَسُولَهُ ۖ وَمَن يُشَاقِّ اللَّهَ فَإِنَّ اللَّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ ﴿٤﴾ مَا قَطَعْتُم مِّن لِّينَةٍ أَوْ تَرَكْتُمُوهَا قَائِمَةً عَلَىٰ أُصُولِهَا فَبِإِذْنِ اللَّهِ وَلِيُخْزِيَ الْفَاسِقِينَ ﴿٥﴾﴾

### هەموو شتێ بە پاکیو بێعەیبی خودا هەڵدەدا (دەبێژێ)

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ﴾ هەر بە پاکیو بێ عەیبی خودا هەڵدەدەن، هەرچی لە ئاسمانەکانو زەمیندا هەن، هەر خۆی خاوەن دەستەڵاتو لە کارزانە. خوای گەورە هەواڵمان ئەداتێ کە هەرچی لە ئاسمانەکانو زەمینا هەیە هەمووی بە پاکو بێعەیبی خوای گەورەدا هەڵدەدەن یادی ئەکەنو پاکو پیرۆز ڕای دەگرن لێی دەپاڕێنەوەو نوێژی بۆ دەکەن، وە هەر ئەو بە پەروەردگارو خودای خۆیان دەزانن‌و هاوەڵی بۆ دانانێن بە تەنها ئەو دەپەرستن. وەک خۆی ئەفەرموێت: ﴿تُسَبِّحُ لَهُ السَّمَاوَاتُ السَّبْعُ وَالْأَرْضُ وَمَن فِيهِنَّ ۚ وَإِن مِّن شَيْءٍ

[1] فتح الباري (٨/٤٩٧).

[2] فتح الباري (٨/٤٩٧)، و مسلم (٤/٢٣٢٢).

[3] فتح الباري (٨/٤٩٧).

إِلَّا يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِۦ وَلَٰكِن لَّا تَفْقَهُونَ تَسْبِيحَهُمْ﴾[1]، واته: ستایشی خوا دەكەن هەر حەوت ئاسمانەكانو زەمینو هەرچی لەناویاندایە وە هیچ شتێك نییە بە سوپاسی ئەو ستایش نەكات بەڵام ئێوە تێناگەن لە تەسبیحاتەكەیان. وە ئەفەرموێت: ﴿وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ﴾ واتە: جێی پەناو خاوەن دەستەڵات ﴿ٱلْحَكِيمُ﴾ لە كارزانە لە بڕیارو بەرنامە ڕێبازیدا.

**باسی ئەو كارەساتەی كە بەسەر بەنی نەزیر هات:**

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿هُوَ ٱلَّذِىٓ أَخْرَجَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ مِن دِيَٰرِهِمْ لِأَوَّلِ ٱلْحَشْرِ ۚ مَا ظَنَنتُمْ أَن يَخْرُجُوا۟ ۖ وَظَنُّوٓا۟ أَنَّهُم مَّانِعَتُهُمْ حُصُونُهُم مِّنَ ٱللَّهِ فَأَتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِنْ حَيْثُ لَمْ يَحْتَسِبُوا۟ ۖ وَقَذَفَ فِى قُلُوبِهِمُ ٱلرُّعْبَ ۚ يُخْرِبُونَ بُيُوتَهُم بِأَيْدِيهِمْ وَأَيْدِى ٱلْمُؤْمِنِينَ فَٱعْتَبِرُوا۟ يَٰٓأُو۟لِى ٱلْأَبْصَٰرِ﴾ خوا زاتێكە كۆمەڵی پێنەزانانی، لەوانەی ئەهلی كتێب بوون (لە وەدەرنانی یەكەمدا) لە زێدی خۆیان وەدەرنا، ئێوە پێتان وا نەبوو كە دەرپچن، خۆشیان وایان خەیاڵ دەكرد قەڵاكانیان لە خودا دەیانپارێزێ. خودا لە شوێنێكی واوە پارێزی بردە سەر ئەوان، كە لە خەیاڵیشیان نەبوو. وا ترسی هاوێشتە دڵیان، ماڵی خۆیان بە دەستی خۆو بە دەستی خاوەن باوەڕان كاول دەكرد. سا ئێوە دەرس وەرگرن ئەی گرۆی خاوەن ئاوەزان! وە ئەفەرموێت: ﴿هُوَ ٱلَّذِىٓ أَخْرَجَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ﴾ واتە: جولەكەی بەنی نەزیر، ئیبنوعەباسو موجاهدو زەهری كەسانی تریش گوتویانە[2] پێغەمبەری خودا(ﷺ) وەختێ گەیشتە مەدینە ڕێكەوت لەگەڵیانو پەیمانو بەڵێنی دانێ كە شەڕیان لەگەڵ نەكات ئەوانیش شەڕی لەگەڵ نەكەن ئەوان ئەو پەیمانەیان شكاند كە لە نێوان ئەوانو پێغەمبەردا بوو (ﷺ)، خوداش سزایەكی وای توش كردن كە كەس نەیدەتوانی بەرگری لێ بكات. ئەو بڕیارەی خۆی بەجێ هێنا كە ڕێی لێ ناگیرێ. پێغەمبەر(ﷺ) دەری كردن لە قەڵا قایمەكانیان كە موسوڵمانەكان پێیان وانەبوو كە دەردەچن تیایدا. وە خۆشیان وایان دەزانی كە ئەم قەڵانە دەیان پارێزن لە تۆڵەو سزای خودا بەڵام خودا لە شوێنێكی واوە توشی بەڵای كردن كە هەر بە خەیاڵیاندا نەدەهات وە هیچ سودێكیان لە قەڵاكانیان وەرنەگرت. وە پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەری كردنو دووری خستنەوە لە (مەدینە) هەندێ لەو جولەكانە ڕۆشتن بۆ ئەزریعات لە سەرووی شامەوە كە ئەو شوێنە زەمینی كۆكردنەوە بڵاوبوونەوەیە (ارض المحشر و المنشر) وە هەندێكی تریان ڕۆشتن بۆ (خەیبر) وە هەر ئەوەندە سامانو ماڵیان لەگەڵ خۆیان برد كە وشترەكانیان هەڵیان ئەگرتو دەیان توانی. ئەوەی دەمایەوە لە سامانو خانو شتی تر تێكیان

---

[1] الاسراء (٤٤).

[2] الطبري (٢٣/٢٦٢).

ئەشکاندو لەناویان ئەداو کاولیان ئەکرد. بۆیە خوای مەزن فەرموویەتی: ﴿يُخْرِبُونَ بُيُوتَهُم بِأَيْدِيهِمْ وَأَيْدِي الْمُؤْمِنِينَ فَاعْتَبِرُوا يَا أُولِي الْأَبْصَارِ﴾ واتە: ئەوەش پاشەڕۆژی ئەوانەی کە دژایەتی خوداو پێغەمبەری خودایان کرد (ﷺ) کە باوەڕیان بە کتێبی خودا نەبوو کە چی بەسەر هێنان لە سزاو سەرشۆڕی لە دنیاو وە ئەوەشی بۆی هەڵگرتوون لە ئازاری بە ژان لە ڕۆژی دوایدا. ئەبوداود ڕیوایەتی کردوە لە عبدالرحمنی کوڕی کەعبی کوڕی مالکەوە ئەویش لە یەکێك لە هاوەڵەکانی پێغەمبەرەوە (ﷺ) کە دەڵێت: خوانەناسەکانی قورەیش نامەیان نووسی بۆ عبدالله ی کوڕی ئوبەی‌و ئەوانەی کە لەگەڵی بوون لە بت پەرستەکانی ئەوس‌و خەزرەج. پێغەمبەر(ﷺ) لەوکاتا لە (مەدینەدا بوو) پێش غەزای بەدر. لە نامەکەدا نووسیبویان: ئێوە پەنای ئەو خزمەی ئێمەتان داوەو جێگاتان کردوەتەوە لای خۆتان. سوێند بە خوا گەر شەڕی لەگەڵ نەکەن دێین دەرتان دەکەین یان هەموو دێین بۆ ئەوێ دەتان کوژین خێزانەکانیشتان (ژنەکان) دەکەینە کۆیلەو داگیریان ئەکەین. کاتێك ئەو هەواڵە گەیشتە عبدالله ی کوڕی ئوبەی‌و بت پەرستەکانی ئەوانەی کە لەگەڵی بوون بڕیاریان دا کە شەڕ دژی پێغەمبەر(ﷺ) بکەن. کاتێ ئەم هەواڵە گەیشتە پێغەمبەر(ﷺ) (چاوی پێیان کەوت) فەرمووی: (بێ گومان ئەوە هەڕەشەی قورەیشە بەم شێوەیە کاری تێکردوون. ئەو فێڵەی کە ئەتانەوێ بیکەن خۆتان زیاتر زیانی لێ ئەکەن. فێڵ لە خۆتان دەکەن دەتانەوێ شەڕ دژی کوڕو براکانتان بکەن) کاتێ ئەم قسەیان لە پێغەمبەر(ﷺ) بیست بڵاوەیان لێ کرد. ئەم هەواڵە گەیشتە خوانەناسەکانی قورەیش. دوای غەزای بەدر کافرەکانی قورەیش نامەیەکیان نووسی بۆ جولەکەکان پێیان گوتن: ئێوە ئەهلی چەك‌و قەڵای قایمن ئەگەر ئێوە شەڕ نەکەن لەگەڵ ئەو خزمەی ئێمە ئێمە دێین خۆمان دەزانین چیتان لێ دەکەین. ئەمەتان بەسەر ناچێ. ژنەکانیشتان دەبەین بۆ خۆمان. ئەیانکەین بە خێزانی خۆمان. وەختێ هەواڵی نامەکەیان گەیشتە پێغەمبەر(ﷺ) بەنی نەزیر زانیان‌و هەستیان کرد بەو خەیانەتە ناردیان بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) کە بێت بۆلایان لەگەڵ سی کەس (٣٠) ئەوانیش سی (٣٠) زانا دەنێرن هەتا بەیەك دەگەین لە نیوەی ڕێگا. گوێ لە قسەکانت بگرن گەر باوەڕیان پێ کردی‌و بوونە خاوەن باوەڕ ئێمەیش ئەبینەخاوەن باوەڕ پاشان باسی خەیانەتەکەیان کرد. ئەوەی کە شاردبوویانەوە کەبەسەری پێغەمبەر بێنن(ﷺ) پێی هەڵسن جێبەجێی کەن. واتە: پێغەمبەرو(ﷺ) هاوەڵەکانی بکوژن‌و لەناویان بەرن. پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێش ئەوەی ئەوان بە کارەکە هەڵسن هەواڵی ئەو خەیانەتەی پێ درابوو. پاشان پیاوەکە دەڵێت: ڕۆژی دوایی سەر لە بەیانی چەند کەتیبەیەکی ناردە سەریان‌و چوار دەوری گرتن فەرمووی پێیان: (بە خودا ئێوە لای من جێی بڕوا نین (واتە: باوەڕتان پێ ناکەم) مەگەر بە پەیمانێك کە بەڵێنم بدەنێ لەسەری بڕۆن‌و جێبەجێی بکەن. ڕازی نەبوون ئەو پەیمانەی بدەنێ. هەر ئەو ڕۆژە شەڕی

دەست پێ کرد لەگەڵیان. پاشان ڕۆژی دوایی سەر لە بەیانی بە چەند کەتیبەیەکەوە دای بەسەر بەنی قورەیزەداو وازی لە بەنی نەزیر هێناو داوای لێ کردن کە پەیمانی لەگەڵ ببەستن ئەوانیش پەیمانیان دایەو پێغەمبەریش (ﷺ) وازی لێ هێنان. بە چەند کەتیبەیەکەوە بەرەو بەنی نەزیر کەوتە ڕێ‌و شەڕی لەگەڵ کردن هەتا ڕازی بوون بڕۆن‌و لەوێ نەمێنن. بەنی نەزیر دەرچوون هەر چەندێ وشترەکانیان توانی هەڵی گرێ هەڵیان گرت لە خواردن‌و تەختەو دەرگای خانوەکانیان لەگەڵ خۆیان بردیان. باخە دارخورماکانی بەنی نەزیر بوو بە ماڵی پێغەمبەر(ﷺ) بەتایبەتی خوای گەورە بەخشی پێی‌و کردی بە ماڵی تایبەتی پێغەمبەر(ﷺ) خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَمَآ أَفَآءَ ٱللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ مِنۡهُمۡ فَمَآ أَوۡجَفۡتُمۡ عَلَيۡهِ مِنۡ خَيۡلٍ وَلَا رِكَابٍ﴾[1]، واتە: ئەو (دەسکەوتانەی) کە خوا سەندیەوە بۆ پێغەمبەرەکەی لە ماڵی (بەنی نەضیر) ئێوە بۆ بەدەستهێنانی هیچ ئەسپ و حوشترێکتان تاو نەداوە. واتە: بەبێ شەڕ کردن. پێغەمبەری خودا(ﷺ) زۆرینەی ئەو سامانەی بەخشی بە کۆچەریەکان‌و دابەشی کرد لەنێوانیانا. وە بەشێکیشی بەخشی بە دوو پیاوی ئەنساری کە زۆر هەژار بوون جگە لەم دوو ئەنساریە بەشی کەسی تریانی نەدا. وە هەندێکی مایەوە کە خێری (صدقة) پێغەمبەری خودا بوو (ﷺ) لەژێر دەستی نەوەکانی فاتمە دا مایەوە.[2] باسی هەندێ لە غەزای بەنی نەزیر دەکەین بە کورتی پشت بە خوای گەورە.

### هۆی غەزاکردنی بەنی نەزیر (بني النضير)

هۆی ئەم غەزایە ئەوە بوو کە وەك ئەو کەسانەی کە ژیانی پێغەمبەرو (ﷺ)غەزاکانیان نووسیوەو باسیان کردوە وەختێ ئەو کەسانەی لە بیری مەعونەوە (بئر معونة) شەهید کران لە هاوەڵەکانی پێغەمبەری خودا(ﷺ) کە حەفتا کەس بوون. یەك پیاو ڕزگاری بوو لە دەستیان نەکوژرا ناوی عومری کوڕی ئومەیەی زەمەری بوو، لەو کاتەدا کە ئەگەڕایەوە بۆ مەدینە لە ڕێگا دوو پیاوی لە بەنی عامریەکان کوشت کە پەیمان هەبوو لەنێوان ئەوان‌و پێغەمبەری خودا(ﷺ) عەمر بەو پەیمانەی نەدەزانی. کاتێ گەڕایەوە مەدینە هەواڵی دایە پێغەمبەری خودا(ﷺ) پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێی فەرموو: (تۆ دوو پیاوت کوشتووە کە هەقیان بەسەر ئێمەوەیە). لەنێوان بەنی نەزیرو بەنی عامرا پەیمان‌و بەڵێن هەبوو کە یەکتر بپارێزن. پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕۆیشت بۆلای بەنی نەزیر کە یارمەتی بدەن بۆ ئەوەی خوێنی ئەو دوو پیاوە بدات بە بەنی عامریەکان. بەنی نەزیر خانوەکانیان لە دەرەوەی مەدینە بوو بە چەند میلێك لەلای ڕۆژهەڵاتەوە.[3] محمدی کوڕی ئیسحاقی کوڕی یەسار لە کتێبی

---

[1] الحشر (٦).

[2] ابوداود (٣/٤٠٤)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[3] الدر في اختصار المغازي و المسير (١٨٠-١٨١) و ابن هشام (٣/١٩٥).

ژیانەکەیدا دەڵێت: لە دوای ئەوە پێغەمبەری خودا(ﷺ) ڕۆشت بۆلای بەنی نەزیر کە یارمەتی بدەن خوێنی ئەو دوو پیاوە بدات بە بەنی عامریەکان کە عەمری کوڕی ئومەیەی زەمەری کوشتنی لە هەقی ئەو بەڵێنو پەیمانەی کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دابووی بە بەنی عامریەکان. بەو شێوەیەی کە یەزیدی کوڕی ڕوومان بۆی باس کردم. لەوکاتەدا لەنێوان بەنی نەزیرو بەنی عامریشا پەیمانو بەڵێن هەبوو. کاتێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) هات بۆ لای بەنی نەزیر کە یارمەتی بدەن لە خوێنی ئەو دوو پیاوە کوژراوە وتیان: بەڵێ ئەی ئەبوقاسم هاوکاریت ئەکەینو چۆنت پێ باشە یارمەتیت ئەدەین. پاشان چوونە لای یەکتریو لەناو خۆیانا کەوتنە قسەکردن گوتیان: جارێکی تر ئەم پیاوە بەم شێوەیە ناکەوێتە دەستتان پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە تەنیشت (دیوارێکا بوو لە یەکێ لە خانوەکانیان. چ پیاوێك) کەسێك سەرئەکەوێتە ئەم سەربانە بەردێك ئەکێشێ پیایا ڕزگارمان دەکات لێی؟ یەکێك لە بەنی عامریەکان عەمری کوڕی جەحاشی بانگ کردو پێی ووت: عەمر دەڵێت من ئامادەم بۆ ئەو کارە سەرکەوتە سەر بانەکە بەردەکە بکێشێ بە پێغەمبەرا (ﷺ) وەك پێغەمبەری خوا فەرمووی (ﷺ) کە لەگەڵ کۆمەڵێ لە هاوەڵەکانی لەوانە ئەبوبەکرو عومەرو عەلی (ڕەزای خوایان لێ بێ) لە ئاسمانەوە هەواڵ گەیشت بە پێغەمبەری خودا بەو کردارەی کە بەنی نەزیر ئەیانەوێ جێ بەجێی کەن پێغەمبەر(ﷺ) هەڵسا لەو شوێنەو بەرەو مەدینە گەڕایەوە. ئەوەندەی پێ نەچوو هاوەڵەکانی گەڕان بە شوێن پێغەمبەرا (ﷺ) گەیشتن بە پیاوێك کە لە مەدینەوە ئەهات، هەواڵی پێغەمبەریان (ﷺ) لێ پرسی. پیاوەکە دەڵێت: چاوم پێی کەوتو ڕۆشتە ناو مەدینە هاوەڵەکانی پێغەمبەر(ﷺ) گەڕانەوەو ڕۆشتنە خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ) هەواڵەکەی بۆ گێڕانەوە کە جولەکەکان نیازیان بووە بیکوژن. پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمانیدا بە خۆ ئامادەکرنو ڕۆشتن بۆیانو شەڕکردن لەگەڵیان. پاشان ڕۆشتن بۆیان، خۆیان قایم کردبوو لەناو قەڵاکەیانا. پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانیدا بە بڕینی دارخورماکانیان و سوتاندنیان. بانگیان کرد ئەی محمد (ﷺ) تۆ خۆت بەرگریت ئەکرد لە خراپەکاری لەسەر زەمینا وە هەر کەسێ خراپەی بکردایە تۆ ڕەخنەت لێ دەگرتو لۆمەت ئەکرد ئێستا ئەم دارخورما بڕینو سوتاندنەت لەچی؟ لەوکاتەدا کۆمەڵێك لە هۆزی بەنی عەوفی کوڕی خەزرەج لەوانە عبدالله ی کوڕی ئوبەی کوڕی سەلولو وەدیعە مالکی کوڕی ئەبی قوقەلو سوەیدو داعس ناردیان بۆلای بەنی نەزیر کە خۆیان بگرن بەرگری بکەن ئێمە ناتاندەین بە دەستەوە گەر شەڕ بکەن یارمەتیتان ئەدەینو لەگەڵتانا شەڕ ئەکەین وە ئەگەر بڕۆنو دەرچن ئێمەش لەگەڵتان دەرئەچینو دەڕۆین. جولەکەکان چاوەڕوانیان کرد کە شەڕیان لەگەڵ بکەن بەڵام ئەوان نەیان کردو یارمەتیان نەدان. خوا ترسی نایە دڵیانەوە. داوایان کرد لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕازی بوون کە دەریان بکات بە مەرجێ نەیان کوژێ باری وشترەکانیانوماڵو سامانیان بەرن لەگەڵ مەڕو ماڵاتیان. ڕێگا دران وشترەکانیان بار کردو هەندێ لە

پیاوەکانیان خانوەکەی بە دەستی خۆی دەڕوخاندو دەرگای خانوەکەی دەخستە سەر پشتی وشترەکەی دەڕۆشت. بەرەو خەیبەر کەوتنە ڕێ هەندێکیشیان بەرەو شام ڕۆشتن ماڵەکانیان بەجێهێشت بۆ پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەم ماڵو سامانە هەمووی بەتایەبەتی بۆ پێغەمبەر(ﷺ) بوو بە ئارەزوی خۆی بە هەر کەسی بدایە ئەیدا. دابەشی کرد بەسەر کۆچەریەکانا ئەوانەی کە زوتر کۆچیان کردبوو هیچی نەدا بە پشتیوانەکان بە دوو پیاو نەبێ کە سەهلی کوڕی حونەیفو (ئەبو دجانە (سماك بن خرشة) بوون. باسی هەژاری کرا پێغەمبەریش بەشی دان. هیچ کەس لە بەنی نەزیر موسوڵمان نەبوو، دوو پیاو نەبێ کە یامینی کوڕی عومەیری کوڕی کەعبی کوڕی عەمری کوڕی جەحاشو ئەبوسەعدی کوڕی وەهەب بوون. لەسەر ماڵو سامانی خۆیان مانەوەو پارێزران. ئیبنوئیسحاق دەڵێت: هەندێ لە خەڵکی ئالی یامین بۆیان گێڕامەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی بە یامین: (ئایا نابینی ئامۆزاکەت تووشی چی کردمو نیازی چی بوو بەرانبەرم؟) یامینی کوڕی عومەیر پیاوێکی بانگ کردو بەخششی دایە کە عەمری کوڕی جەحاشی بۆ بکوژێ. پیاوەکە عەمری کوشت وەك باسی دەکەن. ئیبنوئیسحاق دەڵێت: سورەتی حەشر لەسەر بەنی نەزیر هاتە خوارەوە.[1] وە هەر بەم شێوەیە یونسی کوڕی بەکیر ڕیوایەتی کردوە لە ئیبنوئیسحاقەوە وەك لە پێشەوە باس کرا. خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ هُوَ ٱلَّذِيٓ أَخۡرَجَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ ﴾ واتە: بەنی نەزیر ﴿مِن دِيَٰرِهِمۡ لِأَوَّلِ ٱلۡحَشۡرِ﴾ لە شوێنی خۆیان لە وەدەرنانی یەکەمدا. وە ئەفەرموێت: ﴿مَا ظَنَنتُمۡ أَن يَخۡرُجُواْ﴾ واتە: ئێوە واتان نەدەزانی ئەوا دەڕۆن لەو ماوەیەی کە چواردەورتان گرتبوون. لەگەڵ ئەو قەڵا قایمە بەهێزە شەش ڕۆژی خایاندو چۆڵیان کردو ڕۆشتن. بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَظَنُّوٓاْ أَنَّهُم مَّانِعَتُهُمۡ حُصُونُهُم مِّنَ ٱللَّهِ فَأَتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِنۡ حَيۡثُ لَمۡ يَحۡتَسِبُواْ﴾ واتە: لە شوێنێکی واوە خوای گەورە توشی کردن کە خۆشیان بە خەیاڵیاندا نەدەهات وەك لە ئایەتێکی ترا خوا ئەفەرموێت: ﴿ قَدۡ مَكَرَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡ فَأَتَى ٱللَّهُ بُنۡيَٰنَهُم مِّنَ ٱلۡقَوَاعِدِ فَخَرَّ عَلَيۡهِمُ ٱلسَّقۡفُ مِن فَوۡقِهِمۡ وَأَتَىٰهُمُ ٱلۡعَذَابُ مِنۡ حَيۡثُ لَا يَشۡعُرُونَ ﴾[2]، واتە: بەڕاستی ئەوانەشی کە لە پێش ئەمانەوە بوون پیلانیان کرد جا خوا کۆشكو خانوەکانی لە بنو بناغەکانیەوە دەرهێنا ئەوسا سەربانەکانیان لەسەریانەوە ڕووخا بەسەریادا لەلایەکەوە سزایان بۆ هات کە هەستیان پێ نەدەکرد. وە ئەفەرموێت: ﴿وَقَذَفَ فِي قُلُوبِهِمُ ٱلرُّعۡبَ﴾ یانی

---

[1] ابن هشام (٣/١٩٩–٢٠٢)، فەرموودەیەکی مورسەلە بەلام پشتگیری زۆرە.

[2] النحل (٢٦).

ترس‌و دڵە لەرزەو بێ ئارامی خستە دڵیانەوە. چۆن وایان بەسەر نایە، کەسێك چواردەوری داوون کە یارمەتی دراوەو سەرخراوە بە ترس بە ئەندازەی مانگێك ڕێگە ڕۆشتن (یانی خودا ترسی خستۆتە دڵی دوژمنی پێغەمبەر(ﷺ) بە ئەندازەی مانگێك ڕێگە ڕۆشتن).وە ئەفەرموێت: ﴿يُخْرِبُونَ بُيُوتَهُم بِأَيْدِيهِمْ وَأَيْدِي الْمُؤْمِنِينَ﴾ لە پێشەوە ئیبنو ئیسحاق مانای ئەوەی کرد. ئەوە بوو ئەو خانووە چاکانەی کە بە دڵی خۆیان دروستیان کردبوو تێکیان ئەداو دەرگاو تەختەکانیان لە وشترەکانیان بار ئەکردو ئەیان برد. وە هەر بەم شێوەیە عوروەی کوڕی زوبەیرو عبدالرحمانی حوڕی زەیدی کوڕی ئەسلەم‌و کەسانی تریش ووتویانە.[1] خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَلَوْلَا أَن كَتَبَ اللَّهُ عَلَيْهِمُ الْجَلَاءَ لَعَذَّبَهُمْ فِي الدُّنْيَا وَلَهُمْ فِي الْآخِرَةِ عَذَابُ النَّارِ﴾ ئەگەر خودا ئاوارەیی لەسەر ئەوانە نەنووسیبایە هەر لە دنیا تووشی ئازاری دەکردن‌و لەو دنیاش بەشیان ئازاری بە ئاگر بوو. واتە: ئەگەر خودا ئەم ئاوارەییەی لەسەر نەنوسینایەو تووشی ئەم دوورخستنەوەی نەکردنایە لە زێدو ماڵ‌و سامانیان. خودا سزایەکی تری ئەدان لە کوشتن‌و بە دیل گیران‌و کۆیلەیی. زەهەری دەڵێت: لە عروەو سەدی‌و ئیبنوزەیدەوە. چونکە خودا لەسەری نووسیبون کە بەم زوانە سزایان ئەدا لە دنیاو لەگەڵ ئەو سزایەی کە بۆی ئامادە کردون لە ڕۆژی دوایدا لەناو ئاگری جەهەننما.[2] وە ئەفەرموێت: ﴿وَلَهُمْ فِي الْآخِرَةِ عَذَابُ النَّارِ﴾ واتە: بێگومان ئەو سزایە هەر دەدرێن‌و دەیچەژن. خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ شَاقُّوا اللَّهَ وَرَسُولَهُ ۖ وَمَن يُشَاقِّ اللَّهَ فَإِنَّ اللَّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ﴾ ئەمەش چونکە ئەوان دژی خوداو پێغەمبەرەکەی بوون. هەرکەسیش دژی خوداو پێغەمبەری ئەو بێ، تۆڵەی خودا زۆر دژوارە. واتە: بۆیە خودا ئەوەی بەسەر هاوردن‌و پێغەمبەرەکەی‌و (ﷺ) بەندە خاوەن باوەڕەکانی زاڵ کرد بەسەریانا چونکە ئەوان دژی خوداو پێغەمبەرەکەی بوون. باوەڕیان نەکرد بەو قورئانەی کە خودا ناردیە خوارەوە بۆ پێغەمبەرەکەی (ﷺ) کە لە پێش هاتنی مژدەیان دەدا بە هاتنی محمد (ﷺ) ئەوان دەیانناسی وەك چۆن کوڕەکانی خۆیان دەناسی. پاشان فەرمووی: ﴿وَمَن يُشَاقِّ اللَّهَ فَإِنَّ اللَّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ﴾ هەرکەسێ دژایەتی خودا بکات خودا تۆڵەی زۆر بەهێزە.

---

[1] القرطبي (٤/١٨).

[2] الرازي (٢٤٥/٢٩).

**ئەو دارخورما بڕینەی کە ڕوویدا بە ئیزنی خودا بوو**

خودای مەزن فەرموویەتی: ﴿مَا قَطَعْتُم مِّن لِّينَةٍ أَوْ تَرَكْتُمُوهَا قَائِمَةً عَلَىٰٓ أُصُولِهَا فَبِإِذْنِ ٱللَّهِ وَلِيُخْزِىَ ٱلْفَـٰسِقِينَ﴾ هەر دارخورمایەکتان بڕی، یان لێی گەڕان لەسەر ڕەگی خۆی بمێنێ. هەمووی بە ئیزنی خودا بوو، تا ئەو لەڕێ لادەرانە تووشی سووکایەتی بکات. (اللين) جۆرێکە لە خورما کە زۆر چاکە. لە جۆری خورمای عەجوەو برەنی نیە.[1] زۆرێك لە زانایانی تەفسیر ئەڵێن: (اللينة) جۆرەکانی خورمایە جگە لە عەجوە. ئیبنوجەریر دەڵێت: هەموو جۆرەکانی خورمایە.[2] لە موجاهیدەوە هێناویەتی، هەروەها خورمای بویرەش چونکە پێغەمبەری خودا(ﷺ)کاتێ چواردەوری دان فەرمانی دا بە بڕینی دارخورماکانیان بۆ سوکایەتی پێ کردنو ترسو لەرزی خستە دڵیان محمدی کوڕی ئیسحاق ڕیوایەتی کردوە لە یەزیدی کوڕی ڕومانو قەتادەو موقاتلی کوڕی حەیانەوە کە وتیان: بەنی نەزیر ناردیان بۆلای پێغەمبەری خوا (ﷺ) وتیان: تۆ بەرگری ئەکەی لە خراپە کردن کەچی خۆت فەرمان ئەدەی بە دار بڕین؟ خوای گەورەش ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: ﴿مَا قَطَعْتُم مِّن لِّينَةٍ أَوْ تَرَكْتُمُوهَا قَائِمَةً عَلَىٰٓ أُصُولِهَا فَبِإِذْنِ ٱللَّهِ وَلِيُخْزِىَ ٱلْفَـٰسِقِينَ﴾ واتە: هەر دارخورمایەکتان بڕی یا وازتان لێ هێنا هەموو بە ئیزنو مەیلی خودایە ئەو بڕیاری داوەو پێی ڕازیە ئەمەیش بۆ زیاتر ڕیسواکردنی دوژمنو سەرشۆڕ کردنو لووت شکاندنیەتی.[3] موجاهد دەڵێت: هەندێ لە کۆچەریەکان ئەیان ووت بە هەندێکی تریان کە دارخورما مەبڕن چونکە ئەم دارخورمایانە غەنیمەتی موسوڵمانانە. خوای گەورە قورئانی ناردە خوارەوە بۆ پشگیری ئەوانەی کە ئەیان ووت دارخورما مەبڕنو وە ئەوانەیش کە ئەیبڕن هیچ گوناهێکیان لەسەر نیەو بڕینو نەبڕینی هەر بە فەرمانی خودایە. وەك ئەم ڕیوایەتە ڕیوایەتی تریش کراوە بە مەرفوعی[4]. نەسائی ڕیوایەتی کردوە لە ئیبنوعەباسەوە لەم ئایەتەدا ﴿مَا قَطَعْتُم مِّن لِّينَةٍ أَوْ تَرَكْتُمُوهَا قَائِمَةً عَلَىٰٓ أُصُولِهَا فَبِإِذْنِ ٱللَّهِ وَلِيُخْزِىَ ٱلْفَـٰسِقِينَ﴾ دەڵێت: دایان ئەبەزاندن لە قەڵاکانیانداو فەرمانیان پێ دەکرا بە بڕینی دارخورماکان لە دڵی خۆیاندا ئەیان گوت هەندێ لە دارخورماکانمان بڕیو هەندێکمان نەبڕی پرسیار دەکەین کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئاخۆ خودا پاداشتمان ئەداتەوە لەسەر ئەو دارخورما بڕینە؟ وە ئایا لەسەر ئەو دارخورمایانەی کە هێشتمانەوە تووشی گوناە ئەبین؟

---

[1] الرازي (٢٩/٢٤٦).

[2] الطبري (٢٣/٢٦٨).

[3] الطبري (٢٣/٢٧١).

[4] الطبري (٢٣/٢٧١).

خوای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: ﴿مَا قَطَعْتُم مِّن لِّينَةٍ﴾[1] ئیمامی احمد ڕیوایەتی کردوە لە ئیبنوعومەرەوە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) دارخورمای بەنی نەزیری بڕیو سوتاندی.[2] بوخاریو مسلم ڕیوایەتیان کردووە هەر بەو شێوەیە.[3] ئەمە قسەی بوخاریە لە ئیبنوعومەرەوە دەڵێت: بەنی نەزیرو بەنی قورەیزە شەڕیان کرد بەنی نەزیری دەرکرد لە مەدینەو بەنی قورەیزەو ئەوانەی لەگەڵی بوون هێشتنیەوە تا ئەو کاتەی کە بەنی قورەیزەش شەڕی دەست پێ کرد (هەندێ لە پیاوەکانی کوشتو خێزانەکانیشیان لەگەڵ خۆیان بوونە کۆیلەو کەنیزەکو دابەشی کردن لەنێوان موسوڵمانانا. چەند کەسێکیان نەبێ خۆیان گەیاندە لای پێغەمبەر(ﷺ) پەنای دانو موسوڵمان بوون. هەموو جولەکەی دەرکرد. بەنی قەینوقاع ئەمانە کۆمەڵی عبداللە ی کوڕی سەلام بوون. جولەکەی بەنی حارسەیشو هەرچی جوولەکە بوو لە (مەدینە) هەمووی دەرکردن.[4] وە هەر لە بوخاریو موسلمەوە لە عبداللە ی کوڕی عومەرەوە کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) دارخورمای بەنی نەزیری سوتاندو بڕی. کە دارخورمای بوەیرە بوون (شوێنێکە لەنێوان مەدینەو تەیماءدا) خودای گەورە ئەم ئایەتەی ڕەوانە کرد لەسەری ﴿مَا قَطَعْتُم مِّن لِّينَةٍ أَوْ تَرَكْتُمُوهَا قَائِمَةً عَلَىٰٓ أُصُولِهَا فَبِإِذْنِ ٱللَّهِ وَلِيُخْزِىَ ٱلْفَٰسِقِينَ﴾[5] ئیبنو ئیسحاق دەڵێت: ڕوداوی بەنی نەزیر دوای ڕوداوی ئوحدو دوای ڕووداوی بیری مەعونە بووە.

﴿وَمَآ أَفَآءَ ٱللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ مِنْهُمْ فَمَآ أَوْجَفْتُمْ عَلَيْهِ مِنْ خَيْلٍ وَلَا رِكَابٍ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يُسَلِّطُ رُسُلَهُۥ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ ۚ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٦﴾ مَّآ أَفَآءَ ٱللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ مِنْ أَهْلِ ٱلْقُرَىٰ فَلِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَٰمَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينِ وَٱبْنِ ٱلسَّبِيلِ كَىْ لَا يَكُونَ دُولَةًۢ بَيْنَ ٱلْأَغْنِيَآءِ مِنكُمْ ۚ وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمْ عَنْهُ فَٱنتَهُوا۟ ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴿٧﴾﴾

## ماڵی تاڵانیو شێوەی دابەش کردنی

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَمَآ أَفَآءَ ٱللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ مِنْهُمْ فَمَآ أَوْجَفْتُمْ عَلَيْهِ مِنْ خَيْلٍ وَلَا رِكَابٍ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يُسَلِّطُ رُسُلَهُۥ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ ۚ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ﴾ هەر تاڵانیێك لە دانیشتووی ئەو گوندانە کە خوا دای بە پێغەمبەری (ﷺ) ئەوانە نین کە ئێوە بە سواریو ئەسپ یان بە وشترەوە بۆی چوون.

---

[1] النسائي في الكبرى (٤٨٣/٦)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[2] احمد (٧/٢)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[3] مسلم (١٣٦٥/٣).

[4] فتح الباري (٣٨٣/٧).

[5] فتح الباري (٣٨٣/٧)، و مسلم (١٣٦٥/٣).

بەڵام خوا پێغەمبەرانی (علیهم السلام) ئەگەر حەز بکات (لەسەر هەرکەسێ زاڵ دەکا. خوا بۆ هەموو شت توانایە). خوای مەزنماڵی تالآنی ڕوون کردوەتەوە کە سیفەتی ماڵی تالآنی چۆنەو حوکمەکەیشی چیە. ماڵی تالآنی هەموو ماڵێکە سەنرابێ لە خوانەناس بەبێ شەڕکردن. بە سواری ئەسپ یان بە وشتر موسوڵمانەکان بۆی نەڕۆشتبن وەك ئەو ماڵو سامانەی بەنی نەزیر گیرا کە موسوڵمانان نە بە سواری ئەسپ یان بە وەشترەوە بۆی نەچووبن. واتە: شەڕیان لەگەڵ دوژمن نەکردوە لە یەکتریان نەکوشتوەو پەلاماری یەکتریان نەداوەو یەکیان ڕاونەناوە. بەڵکو ئەوانە لەبەر ئەو ترسەی خوای گەورە نایە دڵیانەوەو لە ترسی پێغەمبەر(ﷺ) خۆیان دا بەدەستەوە. هەموو ئەو تالآنیەی بەخشی بە پێغەمبەر(ﷺ). پێغەمبەریش بە ئارەزوی خۆی گەڕانیەوە بۆ موسوڵمانان بە شێوەیەکی چاكو لە بەرژەوەندی موسوڵماناندا بەشی کرد وەك خوای گەورە لەم ئایەتانەدا باسی کردوە فەرموویەتی: ﴿وَمَآ أَفَآءَ ٱللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ مِنْهُمْ﴾ واتە: بەنی نەزیر ﴿فَمَآ أَوْجَفْتُمْ عَلَيْهِ مِنْ خَيْلٍ وَلَا رِكَابٍ﴾ یانی ئەسپو وشتر. ﴿وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يُسَلِّطُ رُسُلَهُۥ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ ۚ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ﴾ واتە: هەر ئەو بە تواناو زاڵە کەس ناتوانێ دژایەتی بکات دەستەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە. پاشان فەرموویەتی: ﴿مَّآ أَفَآءَ ٱللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ مِنْ أَهْلِ ٱلْقُرَىٰ فَلِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَٰمَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينِ وَٱبْنِ ٱلسَّبِيلِ كَىْ لَا يَكُونَ دُولَةًۢ بَيْنَ ٱلْأَغْنِيَآءِ مِنكُمْ ۚ وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمْ عَنْهُ فَٱنتَهُوا۟ ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ﴾ هەر تالآنێ لە دانیشتوانی ئەو شارانە خوا بۆ پێغەمبەری (ﷺ) ناردوە. بۆ خوداو بۆ پێغەمبەرەو (ﷺ) بۆ خزمە نزیکەکانو هەتیوانو هەژارانو ڕێبوارانە. نەك ببێتە سەرمایەی ئاڵو گۆڕکردن لەناو دەوڵەمەندەکانو، هەرچی پێغەمبەر(ﷺ) دەتان داتێ، لێی وەرگرن، لە هەرچیشتان بێ بەش دەکا، دەستی بۆ مەبەن. دەبێ لە خودا بترسن، کە تۆڵەی خودا زۆر دژوارە. پاشان فەرموویەتی: ﴿مَّآ أَفَآءَ ٱللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ مِنْ أَهْلِ ٱلْقُرَىٰ﴾ واتە: هەموو ئەو وڵاتانەی کە ئازاد دەکرێن (فەتح دەکرێن) هەر بەم شێوەیە دەبێ حوکمەکەی هەر حوکمی ماڵو سامانی بەنی نەزیری هەیە. بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَلِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَٰمَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينِ وَٱبْنِ ٱلسَّبِيلِ﴾ تا کۆتایی ئایەتەکەو دوایەکەیشی. ئەمە ڕێگاو شێوازی دابەش کردنی ماڵی تالآنیە. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە عومەرەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێت: ماڵو سامانی بەنی نەزیر کە بە تالآنی گیرا خوا دای بە پێغەمبەر(ﷺ) کە موسوڵمانان بە سواری ئەسپو وشتر نەڕۆشتبوون بۆی ئەوە هەمووی بۆ

پێغەمبەری خوایە بە تایبەتی. بەشی ساڵێکی دەدات بە ئەهلی خۆی. جارێکی تر دەڵێت: خواردنی ساڵێکی. ئەوەیش ئەمێنێتەوە ئەدرێ بە ئەسپو وشترو چەك بەکارنەهێنرێ لە ڕێگای خوا.[1] هەر بەم شێوەیە ئەحمەد لێرەدا ڕیوایەتی کردوە بە کورتیو زانایانی فەرموودەیش هێناویانە ئیبنوماجە نەبێ وە بە درێژی گێڕامانەوە.[2] ئەبوداود ڕیوایەتی کردوە لە مالکی کوڕی ئەوسەوە دەڵێت: کاتێ خۆر بەرز بوەوە عومەری کوڕی خەتاب ناردی بە شوێنما هاتم بۆلای بینیم لەسەر جێگاکەی کە لەو خۆلاوی بوبوو. وەختێ چومە لای دەڵێت: ئەی مالك هەندێ لە خزمەکانت بەپەلە هاتوون منیش بڕیارم دا ە شتێك دابەشی بکەم لەنێوانیانا. گوتم ئەگەر یەکێکی ترت بناردایە لەجێی من باشتر بوو. دەڵێت: هەڵیگرە ببیە. لەوکاتەدا یەزما هات بۆلای دەڵێت: ئەی گەورەی موسوڵمانان، ئیشێکت هەیە بە عوسمانی کوڕی عەفانو عبدالرحمانی کوڕی عەوفـو زوبەیری کوڕی عەووامو سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص؟ دەڵێت بەڵێ. ئیزنی دانو چوونە ژورەوە. پاشان یەزما هاتەوە بۆلای دەڵێت: ئەی گەورەی موسوڵمانان. ئیشێکت هەیە بە عەباسو عەلی کوڕی ئەبوتالب؟ دەڵێت بەڵێ. ئیزنی دانو ڕۆشتن ژورەوە. عەباس دەڵێت: ئەی گەورەی موسوڵمانان شەرعی منو ئەمە بکە یانی عەلی کوڕی ئەبوتالب. هەندێ لەو کەسانەش کە لەوێ دانشتبوون گوتیان: بەڵێ ئەی گەورەی موسوڵمانان شەرعیان بکەو (بڕیاریان بۆ بدە) بەزەیت بێتەوە پیایانا. مالکی کوڕی ئەوس دەڵێت: وام دەزانی کە هاتوون بۆلای ئەو کۆمەڵە بۆ ئەو مەبەستە. عومەر دەڵێت: ئامادەبن پاشان ڕووی کردە ئەو کۆمەڵەی لای دانیشتبوونو دەڵێت: سوێندتان ئەدەم بەو خوایە کە ئاسمانو زەمین بە فەرمانی ئەو ئەوەستێ ئایا ئەزانن (ئاگاتان لێیە) کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (لا نورث ما ترکناه صدقة) یانی (سامانمان دابەش ناکرێ بەسەر کەسوکارا ئەوەی بەجێی ئەهێڵین ئەکرێ بە خێر (صدقة)) ووتیان بەڵێ. پاشان ڕوی کردە عەلیو عەباسو دەڵێت: سوێندتان ئەدەم بەو خوایەی کە ئاسمانو زەمین بە ئیزنی ئەو دەوەستێ. ئایا ئەزانن (ئاگادارن) کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (لا نورث ما ترکناه صدقة) گوتیان بەڵێ. عومەر دەڵێت: خوای گەورە شتێکی داوە بە پێغەمبەرەکەی (ﷺ) بە تایبەتی کە نەیداوە بە هیچ کەسێکی تر لە خەڵکی وە ئەفەرموێت: ﴿وَمَآ أَفَآءَ ٱللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ مِنۡهُمۡ فَمَآ أَوۡجَفۡتُمۡ عَلَيۡهِ مِنۡ خَيۡلٖ وَلَا رِكَابٖ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يُسَلِّطُ رُسُلَهُۥ عَلَىٰ مَن يَشَآءُۚ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ﴾ وە خوای گەورە سامانی بەنی نەزیری هەمووی دا بە پێغەمبەرەکەی ڕێزی کەسی نەداوە بەسەر ئێوەدا لەو سامانەدا جیای نەکردوەتەوە لە ئێوە. پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەشی ساڵێکی لێ هەڵ ئەگرت. یان بژێوی خۆیو

---

[1] احمد (۱/۲۵)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[2] فتح الباري (۸/٤۹۸)، و مسلم (۳/۱۳۷٦)، و ابوداود (۳/۳۷۱)، و تحفة الاحوذي (٥/۳۸۱)، و النسائي (۷/۱۳۲).

ماڵو منداڵی ساڵێکی دادەنا. ئەوی تری کە ئەمایەوە دابەشی ئەکرد پاشان ڕوی کردە ئەو خەڵکەو دەڵێت: سوێندتان ئەدەم بەو خوایە کە ئاسمانو زەمین بە ئیزنی ئەو ئەوەستێ ئایا ئەمە ئاگادارنو دەزانن؟ گوتیان بەڵێ. پاشان ڕوی کردە عەلیو عەباس دەڵێت: سوێندتان ئەدەم بەو خوایە کە ئاسمانو زەمین بە ئیزنی ئەو ئەوەستن. ئەمە ئاگادارنو دەزانن؟ گوتیان بەڵێ. عومەر دەڵێت: کاتێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) وەفاتی کرد (کۆچی دوایی کرد) ئەبوبەکر دەڵێت: من جێنشینی پێغەمبەری خوام (ﷺ) تۆو ئەمە هاتن بۆلای ئەبوبەکر. تۆ داوای بەشت کرد لە کوڕی مامەکەت ئەمیش داوای بەشی خێزانەکەی کرد (یانی فاتمە) لە میراتی باوکی. ئەبوبەکر (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (لا نورث ما ترکناه صدقة) خودا دەزانێ کە ڕاستگۆو شارەزاو شوێنکەوتووی هەق بووە هەتا خوا ئارەزوی لێ بوو ئەم جێنشینیەی بەڕێوە برد. وەختێکیش کۆچی دوایی کرد من بووم بە جێنشینی پێغەمبەری خوداو (ﷺ) ئەبوبەکر ئەم کارەی ئەوانم گرتە دەست هەتا خوا مەیلی لێ بێ. ئێستا تۆو ئەم بەیەکەوە هاتوون بۆ ئەو مەبەستەو داوا لە من ئەکەن منیش ووتم: ئەگەر حەز ئەکەن بۆتان ئەگێڕمەوە بەڵام سوێندتان ئەدەم بە خوا ئێوەیش بەو شێوەیە جێبەجێی کەن کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) جێبەجێی ئەکرد. ئێوەیش بەو شێوەیە لە منتان وەرگرت. پاشان هاتوون بۆلای من کە بڕیار بدەم بە پێچەوانەی ئەوەوە. سوێند بە خوا بەوە نەبێ هیچ بڕیارێك لە نێوانتانا نادەم هەتا ڕۆژی قیامەت ئەگەر ناتوانن جێبەجێی بکەن بیگێڕنەوە بۆم.[1] لە فەرموودەکەی زوهەریشەوە بەو شێوەیە هێناویانە.[2] وە خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿كَيۡ لَا يَكُونَ دُولَةَۢ بَيۡنَ ٱلۡأَغۡنِيَآءِ مِنكُمۡ﴾ واتە: بۆیەئەم ماڵی تالانیەمان بەم شێوەیە دابەش کرد هەتا نەکەوێتە دەستی دەوڵەمەندەکان و بیخۆنو ئاڵوگۆڕی پێوە بکەنو دابەشی بکەن با ئارەزوی خۆیان هیچی لێ نەدەن بە هەژاران.

### فەرماندان بە گوێڕایەڵی پێغەمبەر( ﷺ ) لەهەر شتێکدا ئەفەرموێت بیکەن یا مەیکەن

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمۡ عَنۡهُ فَٱنتَهُواْ﴾ واتە: هەرچیتان پێ ئەفەرموێت بیکەن وە هەرچیتان پێ ئەفەرموێت مەیکەن وازی لێ بێنن. چونکە پێغەمبەر(ﷺ)هەموو کاتێ فەرمان دەکات بە چاکە ڕێ ئەگرێ لە خراپە. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە عبدالله ی کوڕی مەسعودەوە دەڵێت: خودا لەعنەتی کردووە لە خاڵ کوتو ئەوەیش بۆی ئەکوترێ (الراشماتُ والمترشمات) وە ئەو ژنانەیش کە برۆی خۆیان هەڵدەگرنو باریكو تەنکی ئەکەن (والمنتمصات) وە ئەوانەیش کە دانیان ئەڕنن بۆ ئەوەی کە بەینیان تێ بکەوێ بۆ جوانکردنی (المتفلجات) ئەوانەی کە

---

[1] ابوداود (٣٦٥)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[2] فتح الباري (٢٩٠/١٣)، مسلم (١٣٧٧/٣)، تحفة الاحوذي (٢٣٣/٥)، النسائي (١٣٦/٧).

دروستکراوی خودا ئەگۆڕن (المغيرات خلق الله) دەڵێت: ئەم هەواڵە گەیشتە ژنێك لەماڵی خۆی پێیان ئەوت ئوموبەعقوب هات بۆلای عبدالله ی کوڕی مەسعود. دەڵێت: پێیان ووتم کە تۆ هەندێ قسەت کردوە ئاواو ئاوات ووتوە؟. عبدالله دەڵێت: بۆچی من لەعنەت نەکەم لە کەسێ کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەعنەتی لێ کردوە. وە لە کتێبی خودایشدا هەیە. ئوموبەعقوب دەڵێت: من لەم بەرگ بۆ ئەو بەرگی ئەخوێنم ئەوەم نەدیوە. عبدالله دەڵێت: گەر تۆ بتخوێندایەتەوە دەتبینی. ئایا ئەم ئایەتەت نەخوێندوەتەوە: ﴿وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمْ عَنْهُ فَٱنتَهُوا۟﴾ ئوموبەعقوب دەڵێت: بەڵێ. عبدالله دەڵێت: بێ گومان پێغەمبەری خوا (ﷺ) قەدەغەی کردوەو فەرموویەتی مەیکەن. ئوموبەعقوب دەڵێت: من وادەزانم خێزانو ماڵو منداڵەکانت ئەیکەن. عبدالله دەڵێت: برۆ بۆ ماڵەوە. ڕۆشت بۆ ماڵەوە هیچ شتێکی لەو شتانە نەبینی. هاتەوەو دەڵێت هیچم چاو پێ نەکەوت. عبدالله دەڵێت: ئەگەر وابوایە بەیەکەوە نەدەبووین (وا کۆنەدەبوینەوە)[1] لە هەردوو سەحیحەکەدا هێناویانە لە فەرموودەکەی سوفیانی سەوریەوە[2] وە لە هەردوو سەحیحەکەدا تۆمارکراوەو هاتوە لە ئەبوهورەیرەوە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (کاتێ فرمانم پێ کردن بە شتێك هەڵسن بەو شتە هەرچەندە دەتوانن وە هەر شتێ نەهیم لێ کردن کە نەیکەن لێی دوربکەونەوە)[3] وە خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ إِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ﴾ واتە: لە خوا بترسن گوێ ڕایەڵی فەرمانەکانی بکەنو واز لەو خراپانە بێنن کە لێی قەدەغە کردوون چونکە تۆڵەی خودا زۆر بەهێزو دژوارە بۆ ئەوانەی لە خودا یاخی ئەبنو دژایەتی فەرمانەکانی ئەکەنو هەڵدەسن بەو کارە خراپانەی کەخودا قەدەغەی کردوەو هەڕەشەی کردوە لەو کەسانەی کە بێ گوێی دەکەن.

﴿لِلْفُقَرَآءِ ٱلْمُهَـٰجِرِينَ ٱلَّذِينَ أُخْرِجُوا۟ مِن دِيَـٰرِهِمْ وَأَمْوَٰلِهِمْ يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضْوَٰنًا وَيَنصُرُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ أُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلصَّـٰدِقُونَ ﴿٨﴾ وَٱلَّذِينَ تَبَوَّءُو ٱلدَّارَ وَٱلْإِيمَـٰنَ مِن قَبْلِهِمْ يُحِبُّونَ مَنْ هَاجَرَ إِلَيْهِمْ وَلَا يَجِدُونَ فِى صُدُورِهِمْ حَاجَةً مِّمَّآ أُوتُوا۟ وَيُؤْثِرُونَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ ۚ وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِۦ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿٩﴾ وَٱلَّذِينَ جَآءُو مِنۢ بَعْدِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَا ٱغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَٰنِنَا ٱلَّذِينَ سَبَقُونَا بِٱلْإِيمَـٰنِ وَلَا تَجْعَلْ فِى قُلُوبِنَا غِلًّا لِّلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ رَبَّنَآ إِنَّكَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿١٠﴾﴾

---

[1] احمد (٤٣٣/١)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[2] فتح الباري (٤٩٨/٨)، مسلم (١٦٧٨/٣).

[3] فتح الباري (٤٩٨/٨)، مسلم (٩٧٥/٢).

**باسی ئەو کەسانەی تر کە ماڵی تاڵانیان پێ دەشێ‌و باس‌و ڕێزی کۆچەری‌و پشتیوانان (المهاجرين و الانصار)**

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿لِلْفُقَرَاءِ الْمُهَاجِرِينَ الَّذِينَ أُخْرِجُوا مِن دِيَارِهِمْ وَأَمْوَالِهِمْ يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِّنَ اللَّهِ وَرِضْوَانًا وَيَنصُرُونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ ۚ أُولَٰئِكَ هُمُ الصَّادِقُونَ﴾ ئەو تاڵانە (بۆ ئەو هەژارو دورە وڵاتانەیە، کە لە ماڵ‌و زێدی خۆیان دەرکراون، چاوەڕوانی بەهرەو ڕەزامەندی خوان‌و یاریدەی خوداو پێغەمبەرەکەی دەکەن، کە ئەمانە ڕاستەکانن. خوای گەورە باسی ژیانی ئەو هەژارانە دەکا کە ماڵی تاڵانیان پێ دەشێت ئەفەرموێت: ﴿أُخْرِجُوا مِن دِيَارِهِمْ وَأَمْوَالِهِمْ يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِّنَ اللَّهِ وَرِضْوَانًا﴾ واتە: ئەوانەی کە لە زێدی خۆیان دەرکراون‌و دژایەتی هۆزەکەیان کرد لەبەر خاترو ڕەزامەندی خودا ﴿وَيَنصُرُونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ ۚ أُولَٰئِكَ هُمُ الصَّادِقُونَ﴾ واتە: ئەوانەی کە بە کردار ڕاستی قسەکانی خۆیان سەلماند. ئەوانە لە گەورە پیاوانی کۆچەریەکانن. پاشان خوای مەزن ستایشی پشتیوانان‌و باسی زێڕو پیاوەتی‌و جوامێریان دەکات کە حەسادەت نابەن (ئیرەیی نابەن) بەوەی بەوان دراوەو کۆچەریەکان لە پێشتر دەزانن لە خۆیان هەرچەندە خۆشیان نەبوو کەم دەستن. خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَالَّذِينَ تَبَوَّءُوا الدَّارَ وَالْإِيمَانَ مِن قَبْلِهِمْ يُحِبُّونَ مَنْ هَاجَرَ إِلَيْهِمْ وَلَا يَجِدُونَ فِي صُدُورِهِمْ حَاجَةً مِّمَّا أُوتُوا وَيُؤْثِرُونَ عَلَىٰ أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ ۚ وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ﴾ ئەو کەسانەش کە بەر لەوان لە مەدینە نیشتەجێ بوونو بە دڵ بڕوایان هێنا، حەز بەو ئاوارانە دەکەن کە پەنایان پێ هێناون‌و بە دڵیش ئیرەیی نابەن بەوەی کە بەوان دراوەو ئەوان لە پێشتر دەزانن. هەرچەند دەست تەنگیشیان هەیە. کەسانێکیش خۆ لە ڕژدی دەپارێزن ئەوانە لەسەرفرازانن. خودای مەزن فەرموویەتی: ﴿وَالَّذِينَ تَبَوَّءُوا الدَّارَ وَالْإِيمَانَ مِن قَبْلِهِمْ﴾ واتە: ئەوانەی کە لە مەدینە نیشتەجێ بوون لە پێش کۆچەریەکانەوە وە بوونە خاوەن باوەڕ لەپێش کۆچەریەکانەوە. عومەر دەڵێت: وەسیەت ئەکەم بۆ جێنشینی دوای خۆم بەو کۆچەریانەی لە ئەوەڵەوە کۆچیان کردوە کە مافەکانیان بپارێزێ‌و ئاگای لێیان بێ‌و بە ڕێزەوە سەیریان بکات وە ئامۆژگاریشی دەکەم کە بە چاکی بجوڵێتەوە لەگەڵ پشتیوانەکاندا ئەوانەی کە لەپێش ئەوان نیشتەجێ بوون لە مەدینەو کە قسە چاکەکانیان وەرگرێ‌و چاوپۆشی لەو کەسانەش بکات کە تووشی خراپەو هەڵە دەبن. بوخاری دیسانەوە لێرەدا ڕیوایەتی کردوە.[1] وە ئەفەرموێت: ﴿يُحِبُّونَ مَنْ هَاجَرَ إِلَيْهِمْ﴾ واتە: پێخۆشحاڵن بەو کۆچەریانەی کە کۆچیان

---

[1] فتح الباري (٨/٤٩٩).

کردوە بۆلایان ئەوەیش لە بەخشندەییو نەفس بەرزیانە کە ماڵو سامانی خۆیان ئەبەخشن پێیان.
ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە ئەنەسەوە دەڵێت: کۆچەریەکان ووتیان: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەمان دیوە هیچ گەلێك وەك ئەمانە بەدەم لێ قەوماوەوە بێ کە خۆیشی نەیبێ. گەر هەیشی بێ ئەوەندە بەخشندە بێ. هەموو پێویستیەکیان بۆ تەواو کردووین وە لە هەموو خۆشیو ناخۆشیەکدا بە دەممانەوە بوون (لەگەڵمان بوون) دەترسین هەرچی پاداشتە هەمووی ببەن بۆ خۆیان. پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (نەخێر ئەگەر سوپاسیان بکەنو دوعای خێریان بۆ بکەن)[1] ئەم فەرموودەیەم لە کتێبەکانا نەدیوە بەم شێوەیە. بوخاری ڕیوایەتی کردوە لە یەحیای کوڕی سەعیدەوە کە بیستویەتی لە ئەنەسی کوڕی مالکەوە کاتێ لەگەڵی ڕۆشت بۆلای ولید دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) پشتیوانانی بانگ کرد کە بەحرەینیان بۆ ببڕێو بیانداتێ ، ووتیان نەخێر وەری ناگرین ئەگەر کۆچەریەکانیش بە ئەندازەی ئێمە وەرنەگرن، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: واتە: (کە ناتانەوێ خۆتان بگرن هەتا دەگەن بە من چونکە دوای من تۆشی کەسانێ دەبن خۆیان لە پێشتر دەزانن لە ئێوە).[2] تەنها بوخاری ئەم فەرموودەیەی هێناوە بەم شێوەیە. وە بوخاری ڕیوایەتی کردوە لە ئەبوهورەیرەوە دەڵێت: پشتیوانەکان ووتیان: دارخورماکان لەنێوان ئێمەو برا کۆچەریەکاندا دابەش بکە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: نەخێر. ووتیان: ئایا مەسرەفمان بۆ دەکەن ئێمەیش بتانکەینە هاوبەش (ببن بە شەریك لەگەڵمان) ووتیان بەڵێ بیستمانو گوێڕایەڵیان بوین[3] تەنها بوخاری هێناویەتی موسلمی لەگەڵ نیە.

## پشتیوانەکان (الانصار) ئیرەییان نەدەبرد (حەسودیان نەدەبرد) بە کۆچەریەکان

خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَلَا يَجِدُونَ فِي صُدُورِهِمْ حَاجَةً مِّمَّآ أُوتُوا۟﴾ واتە: حەسودیان نەئەبرد بە کۆچەریەکان بەوەی کە خوا ڕێزی زیاترو پلەی بەرزترو گەورەتری دابونێ هەمیشە لەپێش ئەوانەوە بوون لە ڕێزو پلەدا. وە ئەفەرموێت: ﴿مِّمَّآ أُوتُوا۟﴾ قەتادە دەڵێت: بەوەی کە دەبەخشرا بە برا کۆچەریەکانیان. ئیبنوزەیدش هەر وای ووتوە.

## ئەنسارەکان بەرژەوەندی کۆچەریەکان دەخەنە پێش بەرژەوەندی خۆیان

وە ئەفەرموێت: ﴿وَيُؤْثِرُونَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ﴾ واتە: هەرچەندە خۆیان زۆر پێویستیان بەو شتە بوو. واتە: پێویستی ئەوانیان پێش ئەخست لەسەر پێویستی خۆیان هەرچەندە خۆشیان زۆر نەدارو هەژار بوون پێویستیان زۆر بوو بەو شتانە کە ئەیانبەخشی بە کۆچەریەکان. لە

[1] احمد (٢٠٠/٣)، فەرموودەیەکی سەحیحە.
[2] فتح الباري (١٤٦/٧).
[3] فتح الباري (١١/٥).

فەرموودەی سەحیحا هاتوە لە پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: (ئەم شێوە بەخشینە بەرزترینو گەورەترین پلەی بەخشینە)[1] وە گەورەترو پاداشتی زیاترە لە بەخشینی ئەو کەسانەی کە خوا باسو وەسفیان دەکاتو ئەفەرموێت: ﴿وَيُطْعِمُونَ ٱلطَّعَامَ عَلَىٰ حُبِّهِۦ﴾[2]، واتە: وە خواردەمەنیان دەرخوارد دەدەین با حەزیشیان لێ بێت. وە ئەفەرموێت: ﴿واتی المال علی حبه﴾ چونکە ئەمانە ماڵیان کردوە بە خێر ئەو ماڵەیان هەبوەو خۆشیان ویستوە لەوانەیە زۆر پێی نەبوبێ گران نەبوبێ لایان بەڵام ئەمانەی کە نەدارنو زۆر پێویستیان پێیەتیو لەوە زیاتریان نیەو خۆیان ئەگرنو خەڵکی تر لە پێشتر دەزانن لە خۆیانو پێی دەدەن لەبەر ڕەزامەندی خودا بەرزترین پلەی بەخشینە. وە لە وێنەی ئەم ماڵ بەخشینە. ئەبوبەکری صدیق (ڕەزای خوای لێ بێ) هەموو ماڵەکەی بەخشی، پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێی فەرموو: (چیت هێشتوەتەوە بۆ ماڵو منداڵت؟) ئەبوبەکر دەڵێت: خوداو پێغەمبەری خودام (ﷺ) بۆ بەجێهێشتوون.[3] ئەو ئاوەی هێنراو درا بە عیکرمەو هاوەڵەکانی لە ڕۆژی (غەزای) یەرموکا. هەموو یەکێ لەوانە ئەی گوت کە ئاوەکە بدرێ بە هاوەڵەکەی کە برینەکەیشی زۆر گران بوو زۆر پێویستی بە ئاو هەبوو. دووهەمیش ئەی گوت ئاوەکە بدەن بە سێهەم ئاوەکە نەگەیشتە سێهەم هەرسێکیان مردنو هیچ کەسیان ئاوەکەی نەخواردەوە (خوای گەورە لێیان خۆش بێ) بوخاری ڕیوایەتی کردوە لە ئەبوهورەیرەوە دەڵێت: پیاوێك هات بۆلای پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەڵێت: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) تووشی نەبوونی بووم هیچم نیە (برسیم) پێغەمبەر(ﷺ) ناردی بۆ لای خێزانەکانی. لای خێزانەکانی هیچی دەست نەکەوت. پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (چی کەسێ ئەم شەو میوانداری دەکات (میوان ڕائەگرێ) خوا لێی خۆش بێ) پیاوێك هەڵسا لە پشتیوانان دەڵێت من ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕۆشتەوە بۆ ماڵ دەڵێت بە ژنەکەی، ئەم پیاوە میوانی پێغەمبەری خوایە (ﷺ) هیچ شتێکت هەیە بۆی، (لە خۆراك) ژنەکە دەڵێت: بەخوا هیچ شك نابەم خواردنی منداڵەکان نەبێ. پیاوەکە دەڵێت: کاتێ منداڵەکان داوای خواردنیان کرد بیان خەوێنە وەرە چراکە بکوژێنەوە. پاشان میوانەکە بەیانی هاتە خزمەت پێغەمبەر(بۆ خواردنی بەیانی) پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (خودا پێی خۆش بوو (یان پێکەنی) بەو ژنەو بەو پیاوە)[4]. خوای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە ﴿وَيُؤْثِرُونَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ﴾ وە هەر بەم شێوەیە بوخاری ڕیوایەتی کردوە لە

---

[1] ابوداود (٢/١٤٦)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[2] الانسان (٨).

[3] تحفة الاحوذي (١٠/١٦١)، ئەم فەرمودەیە ئەلبانی بە حەسەنی داناوە.

[4] فتح الباري (٨/٥٠٠).

شوێنێکی ترا وە مسلمو تیرمیزیو نەسائیش لە لایەکی ترەوە لە فوزەیلی کوڕی غەزوانەوە هەر بەو شێوەیە وەکو ئەو ڕیوایەتیان کردووە. وە لە ڕیوایەتێکی موسلمدا ئەم پیاوە ئەنساریە ناوبراوە بە ئەبوتەلحە خودا لێی ڕازی بێ.[1] خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِۦ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ﴾ یانی: هەرکەسێ خۆی لە ڕژدی بپارێزێ بێ گومان ڕزگارو سەرکەوتووە. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە جابیر کوڕی عبدالله وە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (خۆتان بپارێزن لە ستەم چونکە ستەم تاریکی یە لە ڕۆژی قیامەتا وە خۆتان بپارێزن لە ڕژدی چونکە ڕژدی ئەوانەی پێشی ئێوەی لەناو بردو وای لێ کردن خوێنی یەکتر بڕێژنو دەست درێژی بکەنە سەر ناموسی یەکتری.[2] تەنها موسلیم ڕیوایەتی کردوە.[3] ئیبنوئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردوە لە ئەسوەدی کوڕی هیلالەوە دەڵێت: پیاوێك هات بۆ لای عبدالله دەڵێت: ئەی ئەبو عبدالرحمان من ئەترسم کە تیاچوویمو فەوتا بم. عبدالله یش پێی گوت: لەبەر چی (چی ڕوی داوە) دەڵێت: بیستومە کە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِۦ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ﴾ وە من پیاوێکی ڕژدم ناتوانم هیچ شتێ لە دەستم دەرچێ (خێرو چاکەم لەدەست نایە) عبدالله دەڵێت: ئەوە ڕژدی نیە. ئەوە لە قورئان باسی کردوە. ئەو ڕژدیەی خوای گەورە لە قورئاندا باسی کردوە ئەوەیە کە تۆ ماڵی برا موسوڵمانەکەت بە ناهەقی بخۆیت. بەڵام ئەوەی تۆ باسی ئەکەی چاوچنۆکیە. چاوچنۆکیش شتێکی خراپە.[4] خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَٱلَّذِينَ جَآءُو مِنۢ بَعْدِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَا ٱغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَٰنِنَا ٱلَّذِينَ سَبَقُونَا بِٱلْإِيمَٰنِ وَلَا تَجْعَلْ فِى قُلُوبِنَا غِلًّا لِّلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ رَبَّنَآ إِنَّكَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ﴾ ئەو کەسانەی کە لە دوای ئەمانە هاتوون. ئەڵێن: ئەی پەروەردگارمان! لە ئێمەو ئەو برایانەمان وا پێش ئێمە باوەڕیان هێناوە خۆش بە، کینەی ئەوانەمان مەخە دڵ کە باوەڕدار بوون. ئەی پەروەردگاری هەموان تۆ دڵسۆزیو دلۆڤانی (ئا ئەمانە بەشی سێهەمن کە ماڵی تاڵانیان) پێ دەشێ. کە بریتی بوو لە کۆچەریانو پشتیوانانو ئەوانەی بە چاکی شوێنی ئەوان کەوتوون، وەك خودا فەرموویەتی: ﴿وَٱلسَّٰبِقُونَ ٱلْأَوَّلُونَ مِنَ ٱلْمُهَٰجِرِينَ وَٱلْأَنصَارِ وَٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُم بِإِحْسَٰنٍ رَّضِىَ ٱللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا۟

---

[1] فتح الباري (۱٤۹/۷)، و مسلم (۱٦۲٤/۳-۱٦۲٥)، تحفة الاحوذي (۱۹۷/۹)، و النسائي في الكبرى (٤٨٦/٦).

[2] احمد (۳۲۳/۳)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[3] مسلم (۱۹۹٦/٤).

[4] الطبري (۲۹/۲۸).

عَنْهُ﴾[١]، واتە: وە پێشكەوتوەیەكەمەكان لە كۆچەرانو یاریدەدەرانو ئەوانەشی زۆر بە چاكی پەیڕەوی ئەوانیان كردوەو شوێنیان كەوتوون خوا لێیان ڕازیە ئەوانیش لە خوا ڕازین. شوێن كەوتوانی ئەوان بە چاكە، ئەو كەسانەن كە شوێنی خوڕەوشتو سیفەتە جوانەكانی ئەوان كەوتوون بە ئاشكراو پەنهانی بانگی خەڵكی ئەكەن بۆی. لەبەر ئەمەیە خوای گەورە لەم ئایەتە پیرۆزەدا فەرمویەتی: ﴿رَبَّنَا ٱغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَٰنِنَا ٱلَّذِينَ سَبَقُونَا بِٱلْإِيمَٰنِ وَلَا تَجْعَلْ فِى قُلُوبِنَا غِلًّا﴾ یانی كینەو ئیرەیی (ئەوان مەخە دڵمان) ﴿لِّلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ رَبَّنَآ إِنَّكَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ﴾ چەند جوانو شیرینە ئەوەی كە ئیمامی مالك لەم ئایەتە پیرۆزە وەری گرتوەو دەری هێناوە ئەفەرموێت: ئەو ڕافزیانەی كە قسەو جوێن بە هاوەڵەكانی پێغەمبەر ئەدەن لە ماڵی تالانی بەشیان نیە، لەبەر ئەوەی كە ئەم ڕافزیانە ئەو سیفەتەیان تیا نیە كە خودا باسو وەسفیان دەكات. وەك خودا ئەفەرموێت: ﴿رَبَّنَا ٱغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَٰنِنَا ٱلَّذِينَ سَبَقُونَا بِٱلْإِيمَٰنِ وَلَا تَجْعَلْ فِى قُلُوبِنَا غِلًّا لِّلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ رَبَّنَآ إِنَّكَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ﴾ ئیبنوئەبی حاتەم ڕیوایەتی كردووە لە عائیشەوە دەڵێت: كە فەرمانیان پێ كرا كە داوای لێ خۆشبوون بكەن بۆ هاوەڵەكانی پێغەمبەر(ﷺ)، قسەو جوێنیان دانێ، عائیشەش ئەم ئایەتەی خوێندەوە ﴿وَٱلَّذِينَ جَآءُو مِنۢ بَعْدِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَا ٱغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَٰنِنَا ٱلَّذِينَ سَبَقُونَا بِٱلْإِيمَٰنِ﴾[٢].

﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ نَافَقُوا۟ يَقُولُونَ لِإِخْوَٰنِهِمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ لَئِنْ أُخْرِجْتُمْ لَنَخْرُجَنَّ مَعَكُمْ وَلَا نُطِيعُ فِيكُمْ أَحَدًا أَبَدًا وَإِن قُوتِلْتُمْ لَنَنصُرَنَّكُمْ وَٱللَّهُ يَشْهَدُ إِنَّهُمْ لَكَٰذِبُونَ ﴿١١﴾ لَئِنْ أُخْرِجُوا۟ لَا يَخْرُجُونَ مَعَهُمْ وَلَئِن قُوتِلُوا۟ لَا يَنصُرُونَهُمْ وَلَئِن نَّصَرُوهُمْ لَيُوَلُّنَّ ٱلْأَدْبَٰرَ ثُمَّ لَا يُنصَرُونَ ﴿١٢﴾ لَأَنتُمْ أَشَدُّ رَهْبَةً فِى صُدُورِهِم مِّنَ ٱللَّهِ ۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَفْقَهُونَ ﴿١٣﴾ لَا يُقَٰتِلُونَكُمْ جَمِيعًا إِلَّا فِى قُرًى مُّحَصَّنَةٍ أَوْ مِن وَرَآءِ جُدُرٍۭ ۚ بَأْسُهُم بَيْنَهُمْ شَدِيدٌ ۚ تَحْسَبُهُمْ جَمِيعًا وَقُلُوبُهُمْ شَتَّىٰ ۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَعْقِلُونَ ﴿١٤﴾ كَمَثَلِ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ قَرِيبًا ۖ ذَاقُوا۟ وَبَالَ أَمْرِهِمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿١٥﴾ كَمَثَلِ ٱلشَّيْطَٰنِ إِذْ قَالَ لِلْإِنسَٰنِ ٱكْفُرْ فَلَمَّا كَفَرَ قَالَ إِنِّى بَرِىٓءٌ مِّنكَ إِنِّىٓ أَخَافُ ٱللَّهَ رَبَّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٦﴾ فَكَانَ عَٰقِبَتَهُمَآ أَنَّهُمَا فِى ٱلنَّارِ خَٰلِدَيْنِ فِيهَا ۚ وَذَٰلِكَ جَزَٰٓؤُا۟ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٧﴾﴾

---

[١] التوبة (١٠٠).

[٢] روی مسلم نحوه (٢٣١٧/٤)، فەرموودەیەكی سەحیحە.

**بەڵێنی دووڕووەکان بۆ بەنی نەزیر (بني النضير) (تەنها درۆ کردنە)**

خوای گەورە باسی دووڕووەکان دەکات وەك عبدالله ی کوڕی ئوبەی‌و هاو وێنەکانی وەختێ ناردیان بۆلای بەنی نەزیرو بەڵێنیان دانێ کە یارمەتیان ئەدەین‌و لەگەڵتانین خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ نَافَقُوا يَقُولُونَ لِإِخْوَانِهِمُ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ لَئِنْ أُخْرِجْتُمْ لَنَخْرُجَنَّ مَعَكُمْ وَلَا نُطِيعُ فِيكُمْ أَحَدًا أَبَدًا وَإِن قُوتِلْتُمْ لَنَنصُرَنَّكُمْ وَاللَّهُ يَشْهَدُ إِنَّهُمْ لَكَاذِبُونَ﴾ ئایا پەندی دووڕووەکان بە هاو سونفەکانی خۆیان (لەوانەی ئەهلی کتێب‌و دژی دین بوون) ووتیان: ئەگەر ئێوە دەرکران، بێگومان ئێمەش لەگەڵتان دەردەچین وە هەرگیز بە زیانی ئێوە گوێ ڕایەڵی هیچ کەسێ نابین، ئەگەر بەگژیشتانا چوون ئێمە یارمەتیتان دەدەین. خواش شایەتە کە ئەوانە درۆزنن. واتە: درۆ دەکەن لەو بەڵێنەی کە ئەیدەن یا هەر قسەیەکە ئەیکەن‌و نیازیان نیە بەجێی بێنن بۆیان یان ئەوەی کە بەڵێنیان ئەدەنێ ئەگەر دەرچوون‌و شەڕیان کرد ئەمانیش لەگەڵیانن ڕوونادات، بۆیە خودا ئەفەرموێت: ﴿لَئِنْ أُخْرِجُوا لَا يَخْرُجُونَ مَعَهُمْ وَلَئِن قُوتِلُوا لَا يَنصُرُونَهُمْ وَلَئِن نَّصَرُوهُمْ لَيُوَلُّنَّ الْأَدْبَارَ ثُمَّ لَا يُنصَرُونَ﴾ دیارە ئەگەر دەریش کران، لەگەڵتان دەرناچن ئەگەر لەگەڵیشتان بجەنگن ئەوان یاریدەیان نادەن، خۆ ئەگەر یاریدەشیان دەن، پشتیان تێ دەکەن‌و هەڵدێن. لە پاشانیش کەسێ وە هانایان نایە. خودا ئەفەرموێت: ﴿لَئِنْ أُخْرِجُوا لَا يَخْرُجُونَ مَعَهُمْ﴾ ئەگەر دەرکران ئەوان لەگەڵیان ناڕۆن ﴿وَلَئِن قُوتِلُوا لَا يَنصُرُونَهُمْ﴾ ئەگەر شەڕیشیان کرد یارمەتیان نادەن. ﴿وَلَئِن نَّصَرُوهُمْ﴾ ئەگەر یارمەتیشیان بدەن ﴿وَلَئِن نَّصَرُوهُمْ لَيُوَلُّنَّ الْأَدْبَارَ ثُمَّ لَا يُنصَرُونَ﴾ پشتیان تێ دەکەن‌و هەڵدێن لە پاشانیش کەس نایەت بە هاواریانەوە. ئەمەیش مژدەیەکی دیارو ئاشکرایە بۆ خۆی وەك خوای مەزن ئەفەرموێت: ﴿لَأَنتُمْ أَشَدُّ رَهْبَةً فِي صُدُورِهِم مِّنَ اللَّهِ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَفْقَهُونَ﴾ بێگومان دڵیان لە ئێوە پتر دەترسێ تا لە خوا، چونکە ئەوان کەسانێکی وان تێناگەن. واتە: لە ئێوە دەترسن زیاتر لەوەی کە لە خوا دەترسن. وەك خودا ئەفەرموێت: ﴿إِذَا فَرِيقٌ مِّنْهُمْ يَخْشَوْنَ النَّاسَ كَخَشْيَةِ اللَّهِ أَوْ أَشَدَّ خَشْيَةً﴾[1]، واتە: یەکسەر دەستەیەکیان لە خەڵکی دەترسان وەك ترسان لە خودا بگرە زیاتریش دەترسان. بۆیە لێرەدا ئەفەرموێت: ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَفْقَهُونَ﴾ چونکە ئەوانە گەلێکی بێ ئاوەزن‌و تێ ناگەن. خوا ئەفەرموێت: ﴿لَا يُقَاتِلُونَكُمْ جَمِيعًا إِلَّا فِي قُرًى مُّحَصَّنَةٍ أَوْ مِن وَرَاءِ جُدُرٍ بَأْسُهُم بَيْنَهُمْ شَدِيدٌ

[1] النساء (٧٧).

تَحْسَبُهُمْ جَمِيعًا وَقُلُوبُهُمْ شَتَّىٰ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَعْقِلُونَ ﴾ بە تێکڕایی ئەوان بەگژتاندا نایەن مەگین لەناو ئەو شارانەی قەڵای زۆر پتەویان هەیە، یان لەودیو دیوارانەوە ناکۆکی توند کەوتۆتە نێوانیانەوە، تۆ پێت وایە بە کۆمەڵ یەکیان گرتوە. بەڵام دڵیان لێك بڵاوە، چون ئەمانە مەردمانێکی نەفامن. واتە: ئەوانە لە ترسنۆکیانو دڵەڕاوکەیانو دڵە لەرزەیان ناتوانن بەرانبەر سوپای ئیسلام بوەستنو بجەنگن بەڵکو لە قەڵای بتەوو پشت دیوارەکانەوە کە چوار دەور گیراوە شەڕ ئەکەنو لە ناچاریا بەرگری ئەکەن. پاشان خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿بَأْسُهُم بَيْنَهُمْ شَدِيدٌ تَحْسَبُهُمْ جَمِيعًا وَقُلُوبُهُمْ شَتَّىٰ﴾ ئێوە وا سەیریان دەکەن کە کۆنو بەیەکەوەن کەچی ئەوان زۆر ناکۆکن لە ڕادەبەدەر. ئیبراهیمی نەفەعی دەڵێت: واتە: ئەهلی کتێبو دووڕوەکان. ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَعْقِلُونَ﴾ چونکە ئەمانە گەلێکی تێ نەگەیشتووو نەفامن. پاشان خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿كَمَثَلِ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ قَرِيبًا ذَاقُوا وَبَالَ أَمْرِهِمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ وەك ئەوانەیان بەسەردێ کە پێش ئەوان (بەم زوانە) ئاکامی کردەوەی خۆیان چەشت. ئەوانە ئازارێکی بە ژانیان دەبێ. ئیبنوعەباس دەڵێت: وەك ئەوانەیان بەسەردێ واتە: وەك جولەکەکانی بەنی قەینوقاعیان بەسەر دێت.[1] وە هەر بەم شێوەیە قەتادەو محمدی کوڕی ئیسحاق وتویانە[2].

### وێنەی دووڕوەکانو جولەکە لەم ڕووداوەدا

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿كَمَثَلِ الشَّيْطَانِ إِذْ قَالَ لِلْإِنسَانِ اكْفُرْ فَلَمَّا كَفَرَ قَالَ إِنِّي بَرِيءٌ مِّنكَ إِنِّي أَخَافُ اللَّهَ رَبَّ الْعَالَمِينَ﴾ وەکوو شەیتان، کاتێ بە بەنیادەمی ووت خوا مەناسە، وەختێ لە خودا تەکیەوە، وتی: لێم نزیك مەبەوە من لەو خودایە دەترسم پەروەرێنی گشت دنیایە. واتە: وێنەی ئەو جولەکانە کە لەخۆبایی بوونو خلافان بە قسەی دووڕوەکان کە بەڵێنیان دانێ کە یارمەتیان ئەدەنو ئەجەنگن لەگەڵیان دژی موسوڵمانەکان پاشانو کاتێ ڕووداوەکە ڕویداو چواردەوریان گیرا. وازیان لێ هێنانو تووشی ماڵ کاولیان کردن وێنەی ئەمانە لەم ڕووداوەدا وەك وێنەی شەیتان وایە کاتێ دەڵێت بە نەوەی ئادەمی خوا مەناسە (پەنا بە خوا) کاتێ کە پەشیمان بوەوە شەیتان دەڵێت: دوورکەوە لێم ﴿إِنِّي أَخَافُ اللَّهَ رَبَّ الْعَالَمِينَ﴾ من لەو خودایە دەترسم کە پەروەرێنی گشت دنیایە. وە ئەفەرموێت: ﴿فَكَانَ عَاقِبَتَهُمَا أَنَّهُمَا فِي النَّارِ خَالِدَيْنِ فِيهَا وَذَٰلِكَ جَزَاءُ الظَّالِمِينَ﴾ سەرەنجامی هەردوکیان هەر

---

[1] الطبري (٢٣/٢٩٣).

[2] الطبري (٢٣/٢٩٣).

ئەوەیە کە هەتا هەتایە، لە ئاگردا دەمێننەوە سزای ناهەقان ئەمەیە. واتە: پاشەڕۆژی خوانەناس و ئەو کەسانەی کە لە ئاین پەشیمان ئەبنەوە ناو ئاگری جەهەننمە هەتا هەتایە تیا دەمێننەوە وە پاداشتی هەموو ستەم کارێکیش هەر ئەوەیە.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَلۡتَنظُرۡ نَفۡسٞ مَّا قَدَّمَتۡ لِغَدٖۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ خَبِيرُۢ بِمَا تَعۡمَلُونَ ١٨ وَلَا تَكُونُواْ كَٱلَّذِينَ نَسُواْ ٱللَّهَ فَأَنسَىٰهُمۡ أَنفُسَهُمۡۚ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ ١٩ لَا يَسۡتَوِيٓ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِ وَأَصۡحَٰبُ ٱلۡجَنَّةِۚ أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَنَّةِ هُمُ ٱلۡفَآئِزُونَ ٢٠﴾

## فەرماندان بە لە خودا ترسان و خۆ ئامادەکردن بۆ ڕۆژی قیامەت

ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە مونزیری کوڕی جەریرەوە ئەویش لە باوکیەوە دەڵێت لەلای پێغەمبەری خوا بووین (ﷺ) دوای خۆرکەوتنی بەیانی دەڵێت: خەڵکێك (کۆمەڵێك) هاتن بۆلای پێ پەتی و بێ جلوبەرگ (یانی بێ مێزەرو عەبا شمشێریان هەڵگرتبوو هەموویان یا زۆرینەیان لە هۆزی موزەڕ بوو. پێغەمبەر(ﷺ) ئەم هەژاریەی پێوە دین ڕەنگی گۆڕا (ناڕەحەت بوو) فەرمانی دا بە بیلال بانگی داو نوێژیان کرد پاشان وتارێکی داو فەرمووی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ﴾[1]، واتە: ئەی خەڵکینە خۆتان بپارێزن لە (سزای) پەروەردگارتان ئەوەی کە دروستی کردوون لە یەك کەسەوە (کە ئادەمە)، تا کۆتایی ئایەتەکە. وە ئەم ئایەتەیشی خوێند لە سورەتی حەشردا ﴿وَلۡتَنظُرۡ نَفۡسٞ مَّا قَدَّمَتۡ لِغَدٖ﴾ خەڵکی دەستیان کرد بە خێرکردن یەکێ بە دینار یەکێ بە درهەم یەکێکی تر بە ساعێ جۆو ئەوی تر بە ساعێ خورماو هەتا فەرموی: (خێر بکەن با بەلەتە خورمایەکیش بێ) دەڵێت: پیاوێك هات لە ئەنسارەکان بە کیسەیەکەوە ئەوەندە قورس بوو بە دەست بە ناڕەحەت بۆی هەڵدەگیرا بەڵکو بۆی هەڵنەدەگیرا. پاشان خەڵکی بە دوایا دەستیان کرد بە ماڵ هێنان هەتا بە چاوی خۆم بینیم دوو کۆمەڵ لە خواردن و جلوبەرگ کۆ بوەوە. پێغەمبەری خوام (ﷺ) بینی ڕوی موبارەکی ئەدرەوشایەوە ناڕەحەتیەکە لە ڕویا نەما. پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: هەر کەسێ کارێکی چاکە بکات پاداشتی کارەکەی وەردەگرێ و وە پاداشتی ئەو کەسانەش وەردەگرێ کە دوای خۆی ئەو کارە چاکانە دەکات، بەبێ ئەوەی پاداشتی ئەو کەسانە کەم بێتەوە کە هەڵساون بەو چاکەیەی ئەو کردویەتی. وە هەر کەسێکیش کارێکی خراپە بکات خەڵکی لەسەر ئەو کارەی ئەو بڕۆن. خودا سزای ئەداو لەو تاوانەی ئەوانیش ئەیکەن بەشدارەو بەبێ ئەوەی تاوانی ئەوان

[1] النساء (١).

هیچ کەم بکاتەوە.[1] تەنها موسلیم هێناویەتی لە فەرمودەکەی شوعیەوە.[2] وە خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَلْتَنظُرْ نَفْسٌ مَّا قَدَّمَتْ لِغَدٍ ۖ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ خَبِيرٌۢ بِمَا تَعْمَلُونَ﴾ ئەی گەلی خاوەن باوەڕان! ئەشێ لە خودا بترسن، با هەر کەسێ ببنێتەوە بەر چاوی خۆی، بۆ سبەینێ چی وەپێش خۆی خستوەو ترستان لە خودا هەبێ، خودا لە هەر کارێ دەیکەن ئاگادارە. واتە: فەرمانی داوە کە لێی بترسن کە بریتیە لە بەجێهێنانی ئەوەی کە فەرمانی پێ کردوەو وازهێنانە لەو شتانەی کە هەڕەشەی کردوە لێی کە نەی کەین. ﴿وَلْتَنظُرْ نَفْسٌ مَّا قَدَّمَتْ لِغَدٍ﴾ واتە: پرسیار لە خۆتان بکەن پێش ئەوەی کە لێتان بپرسنەوە. وە سەیر بکە بزانن چیتان پاشەکەوت کردوە لە کرداری چاك بۆ ڕۆژی قیامەتو ئەو ڕۆژەی کە پیشانی پەروەرندەتان دەدرێن ﴿وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ﴾ دووبارە خودا ئاگادارمان دەکاتەوە کە لێی بترسین ﴿إِنَّ ٱللَّهَ خَبِيرٌۢ بِمَا تَعْمَلُونَ﴾ واتە: بزانن کە خودا ئاگای لە هەموو کارو کردارێکتانەو هیچی ئێوەی لێ ون نابێو هیچی ئێوەی لە گەورەو بچوك لا شاراوە نیە. وە ئەفەرموێت: ﴿وَلَا تَكُونُوا۟ كَٱلَّذِينَ نَسُوا۟ ٱللَّهَ فَأَنسَىٰهُمْ أَنفُسَهُمْ ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَـٰسِقُونَ﴾ نەچن وەکو ئەوانە بن کە خودایان لەبیر کردو خواش ئەوانی لەبیر بردەوە. ئەوانە لە ڕێ لادەرن. واتە: یادی خوداتان لەبیر نەچێ هەتا خودایش کرداری چاکتان لەبیر بەرێتەوە کە سودی لێ وەرئەگرن لە ڕۆژی زیندووبونەوەتاندا. بێگومان پاداشت بەپێی چۆنیەتی کردەوەیە. ﴿أُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَـٰسِقُونَ﴾ واتە: ئەوانەی لایان داوە لە فەرمانی خوداو لە ڕۆژی قیامەتا لەناوچوو زیانبارن. وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تُلْهِكُمْ أَمْوَٰلُكُمْ وَلَآ أَوْلَـٰدُكُمْ عَن ذِكْرِ ٱللَّهِ ۚ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْخَـٰسِرُونَ﴾[3]، واتە: ئەی ئەوانەی کە باوەڕتان هێناوە ماڵو منداڵانتان بێ ئاگاتان نەکەن لە یادی خوا هەرکەسێك وابکات ئا ئەوانە خۆیان خەسارۆمەندن.

## ئەهلی بەهەشتو ئەهلی جەهەنم وەك یەك نین

خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿لَا يَسْتَوِىٓ أَصْحَـٰبُ ٱلنَّارِ وَأَصْحَـٰبُ ٱلْجَنَّةِ ۚ أَصْحَـٰبُ ٱلْجَنَّةِ هُمُ ٱلْفَآئِزُونَ﴾ ئەو کەسانەی جەهەنەمین لەگەڵ ئەو کەسانەی بەهەشتین وەکو یەك نین. تەنهائەوانەی لە بەهەشتن بەختەوەرن. یانی بەهەشتیو جەهەنمی لە دادگای خودا وەك یەك نین لە ڕۆژی قیامەتا. وەك خودا

---

[1] احمد (٣٥٨/٤)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[2] مسلم (٧٠٤/٢).

[3] المنافقون (٩).

خوای ئەفەرموێت: ﴿أَمْ حَسِبَ ٱلَّذِينَ ٱجْتَرَحُوا۟ ٱلسَّيِّـَٔاتِ أَن نَّجْعَلَهُمْ كَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ سَوَآءً مَّحْيَاهُمْ وَمَمَاتُهُمْ ۚ سَآءَ مَا يَحْكُمُونَ﴾[1]، واتە: ئاخۆ ئەوانەی بەدکارن وادەزانن ئێمە لە ژیان‌و مردنیاندا وەك ئەوانەیان دادەنێین کە بونەتە خاوەنی باوەڕو ئاکار چاك بوون؟ زۆر خراپی تێگەیشتوون. وە فەرموویەتی: ﴿وَمَا يَسْتَوِى ٱلْأَعْمَىٰ وَٱلْبَصِيرُ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ وَلَا ٱلْمُسِىٓءُ ۚ قَلِيلًا مَّا تَتَذَكَّرُونَ﴾[2]، واتە: وە نابیناو بینا یەکسان نین وە کەسانێ باوەڕیان هێناوەو کردەوە چاکەکانیان کردوە لەگەڵ بەدکاران وەك یەك نین زۆر کەم بیر دەکەنەوە. وە فەرموویەتی: ﴿أَمْ نَجْعَلُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ كَٱلْمُفْسِدِينَ فِى ٱلْأَرْضِ أَمْ نَجْعَلُ ٱلْمُتَّقِينَ كَٱلْفُجَّارِ﴾[3]، واتە: ئایا ئەوانەی باوەڕیان هێناوەو کردەوە چاکەکانیان کردوە لەگەڵ خراپەکاران لە زەویدا وەك یەکیان دادەنێین؟ (لە دوا ڕۆژدا، نەخێر وا نی یە) یا پارێزگاران وەك بەدکرداران لێ دەکەین؟. لە ئایەتی تردا بەڵگەی زۆر هەیە کە خودا ڕێزی ئاکار چاکان دەگرێ‌و بەدبەختانیش ڕسوا دەکات.

﴿لَوْ أَنزَلْنَا هَـٰذَا ٱلْقُرْءَانَ عَلَىٰ جَبَلٍ لَّرَأَيْتَهُۥ خَـٰشِعًا مُّتَصَدِّعًا مِّنْ خَشْيَةِ ٱللَّهِ ۚ وَتِلْكَ ٱلْأَمْثَـٰلُ نَضْرِبُهَا لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٢١﴾ هُوَ ٱللَّهُ ٱلَّذِى لَآ إِلَـٰهَ إِلَّا هُوَ ۖ عَـٰلِمُ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَـٰدَةِ ۖ هُوَ ٱلرَّحْمَـٰنُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٢٢﴾ هُوَ ٱللَّهُ ٱلَّذِى لَآ إِلَـٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلْمَلِكُ ٱلْقُدُّوسُ ٱلسَّلَـٰمُ ٱلْمُؤْمِنُ ٱلْمُهَيْمِنُ ٱلْعَزِيزُ ٱلْجَبَّارُ ٱلْمُتَكَبِّرُ ۚ سُبْحَـٰنَ ٱللَّهِ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٢٣﴾ هُوَ ٱللَّهُ ٱلْخَـٰلِقُ ٱلْبَارِئُ ٱلْمُصَوِّرُ ۖ لَهُ ٱلْأَسْمَآءُ ٱلْحُسْنَىٰ ۚ يُسَبِّحُ لَهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٢٤﴾﴾

**باسی گەورەیی قورئان**

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿لَوْ أَنزَلْنَا هَـٰذَا ٱلْقُرْءَانَ عَلَىٰ جَبَلٍ لَّرَأَيْتَهُۥ خَـٰشِعًا مُّتَصَدِّعًا مِّنْ خَشْيَةِ ٱللَّهِ ۚ وَتِلْكَ ٱلْأَمْثَـٰلُ نَضْرِبُهَا لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ﴾ ئەگەر ئێمە ئەم قورئانەمان بناردایەتە سەر کەژێك، تۆ دەتدی کە لە ترسی خودا وردوخاش و لەت لەت دەبوو. ئەم نمونانە بۆ مەردم دێنینەوە، بەشکوو ئەوان ڕابمێنن. خودای مەزن باسی گەورەیی‌و بڵندی قورئان‌و ڕێزو پلەی دەکات کە پێویستە دڵەکان کاتێ دەیبیسن‌و گوێیان لێی ئەبێ ڕاچڵەکێن‌و بلەرزن‌و پەل پەل بن‌و بێنە کوڵ بۆ ئەو هەموو بەڵێن‌و

---

[1] الجاثية (٢١).

[2] غافر (٥٨).

[3] ص (٢٨).

مژدە هەقانەو وە ئەو هەموو هەڕەشە گەورەو ترسناكانە كە گومانی تێدا نیە دێنە جێ كە ئەفەرموێت: ﴿لَوْ أَنزَلْنَا هَٰذَا ٱلْقُرْءَانَ عَلَىٰ جَبَلٍ لَّرَأَيْتَهُۥ خَٰشِعًا مُّتَصَدِّعًا مِّنْ خَشْيَةِ ٱللَّهِ﴾ واتە: ئەو كەژانە بەو ڕەقیو سەختیە ئەگەر لەو قورئانە تێ بگەیشتنایەو ڕابمانایە لە ماناكەی سەریان شۆڕ ئەكردەوە لەت لەت ئەبوون لە ترسی خوا. باشە ئەی بەنیادەم چۆن بۆ تۆ ڕەوایە كە دڵەكانتان نەرم نابیۆ سەر شۆڕ ناكەنو دڵتان پارە پارە (لەت لەت) نابێ لە ترسی خوا كە ڕامانو تێ گەیشتن لەو قورئانەی كە بۆی ناردن. بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَتِلْكَ ٱلْأَمْثَٰلُ نَضْرِبُهَا لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ﴾ لە فەرموودەی متەواترا هاتوە كە پێغەمبەری خودا(ﷺ) كاتێ كە مینبەریان بۆ دروست كرد، لە پێش ئەوا وتاری ئەدا لە تەنیشت كۆتەرەیە (جذع) لە كۆتەرەكانی مزگەوتا ئەوەستا دەستی بە وتار خوێندن ئەكرد. وەختێ كە مینبەر دانرا یەكەم جار كە پێغەمبەر(ﷺ) هاتو تێپەڕی بە لای كۆتەرەكەدا بەرەو مینبەرەكە چوو، لەو كاتەدا كۆتەرەكە دەنگێكی لێوە هات وەك چۆن منداڵ كاتێ بێ دەنگ ئەبێ دەنگێكی لێوە دێتو ئەنركێنێ (یانی نارەحەت بوو) چونكە لەوەو پێش نیگاو یادی خوا لە تەنیشت ئەوا ئەبیسرا. لە هەندێ لە ڕیوایەتەكانی ئەم فەرموودەیەدا. حەسەنی بەسری دوای هێنانی ئەم فەرموودەیە دەڵێت: ئێوە شایەنترنو زیاتر لەسەرتانە (ئارۆزە مەند تر بن) لەو كۆتەرە دارە.[1] وە هەر بەو شێوەیە لەم ئایەتە پیرۆزەدا خوای گەورە فەرمووی ئەو كێوە ڕەقە ئەگەر ئەم قورئانەی ببیستایە لە ترسی خوا دەكەوتو لەت لەت ئەبوو. ئاخۆ ئەبێ ئێوە چۆن بن كە بیستوتانەو تێگەیشتوشن لێی؟. خوای مەزن فەرموویەتی: ﴿وَلَوْ أَنَّ قُرْءَانًا سُيِّرَتْ بِهِ ٱلْجِبَالُ أَوْ قُطِّعَتْ بِهِ ٱلْأَرْضُ أَوْ كُلِّمَ بِهِ ٱلْمَوْتَىٰ﴾[2]، واتە: بەڕاستی ئەگەر قورئانێك (بە خوێندنەوەی) چیاكانی پێ ببرایە (بۆ شوێنێكی تر) یا زەوی پێ لەتلەت بكرایە یان لەگەڵ مردواندا قسەی بكردایە (ئەنجا باوەڕی پێ ناهێنن). وە ئەفەرموێت: ﴿وَإِنَّ مِنَ ٱلْحِجَارَةِ لَمَا يَتَفَجَّرُ مِنْهُ ٱلْأَنْهَٰرُ ۚ وَإِنَّ مِنْهَا لَمَا يَشَّقَّقُ فَيَخْرُجُ مِنْهُ ٱلْمَآءُ ۚ وَإِنَّ مِنْهَا لَمَا يَهْبِطُ مِنْ خَشْيَةِ ٱللَّهِ﴾[3]، واتە: بەڕاستی بەردی وا هەیە لە چەند لاوە جۆگە ئاوی لێ هەڵدەقوڵێ وە بێگومان هی وایان هەیە كە لەت لەت دەبیۆ ئاوی لێ دێتە دەرێ وە بەڕاستی هی وایان هەیە لە ترسی خوا (لە لوتكەی شاخەكان) بەر ئەبێتەوە.

---

[1] فتح الباري (٦/٦٩٦)، الدارمي (١/٣٤-٣٥).

[2] الرعد (٣١).

[3] البقرة (٧٤).

## بەرزو گەورەو پیرۆز ڕاگرتنی خودا بە ناوەکانی و سیفاتەکانی

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿هُوَ ٱللَّهُ ٱلَّذِى لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ۖ عَٰلِمُ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ ۖ هُوَ ٱلرَّحْمَٰنُ ٱلرَّحِيمُ﴾ ئەو خودایە زاتێکە کە جگە لەئەو کەس بۆ پەرستن نابێ. نەدیارە، لە دیاران ئاگادارەو دلاوایەو دلۆڤانە. خوای گەورە پێی ڕاگەیاندووین کە ئەو خودایەکە جگە ئەو کەس بۆ پەرستن ناشێ پەروەرندە نیە غەیرەز ئەو وە کەس خاوەنی ئەم بوونەوەرە نیە لەو زیاتر وە پەرستنی هەر شتێ بێجگە لەو بێ سوودەو کەڵکی نیە. ئەو ئاگاداری نەدیارو دیارەکانە واتە: ئاگای لە هەموو وەدی هێنراوەکانە، ئەوەیش لە ئێمەوە نادیارەو نای بینین و چاومان لێی نیە. هیچ شتێکی لێ ون نابێ نە لە زەمین و نە لە ئاسمانەکاندا لە چاك و لە خراپ و لە گەورەو بچوك هەتا بچوکترین شت لە تاریکایی و نوتەکدا. ئەفەرموێت: ﴿هُوَ ٱلرَّحْمَٰنُ ٱلرَّحِيمُ﴾ لەم بارەیەوە لە ئەوەڵی ئەم تەفسیرا قسەمان لێ کردووە، پێویست ناکا لێرەدا دووبارەی بکەینەوە. یانی ئەو خودایەکی خاوەن بەزەیی بێ پایانە کە هەموو دروست کراوەکانی بەتەواوی دەگرێتەوە. هەر ئەو دلاواو دلۆڤانی دنیاو ڕۆژی دواییە. وەك فەرموویەتی: ﴿وَرَحْمَتِى وَسِعَتْ كُلَّ شَىْءٍ﴾[1]، واتە: وە بەزەیی و ڕەحمەتیشم هەموو شتێکی گرتۆتەوە. وە فەرموویەتی: ﴿كَتَبَ رَبُّكُمْ عَلَىٰ نَفْسِهِ ٱلرَّحْمَةَ﴾[2]، واتە: پەروەردگارتان بەزەیی و میهرەبانی لەسەر خۆی پێویست کردوە. وە فەرموویەتی: ﴿قُلْ بِفَضْلِ ٱللَّهِ وَبِرَحْمَتِهِۦ فَبِذَٰلِكَ فَلْيَفْرَحُوا۟ هُوَ خَيْرٌ مِّمَّا يَجْمَعُونَ﴾[3]، واتە: (ئەی موحەممەد (ﷺ)) بڵێ: هەر بەهۆی چاکە و میهرەبانی خواوەیە جا کەواتە با بەوە دڵخۆش بن ئەوە چاکترە (بۆیان) لەوەی کۆی دەکەنەوە (لە شتی ئەم دنیایە). پاشان خودای مەزن فەرموویەتی: ﴿هُوَ ٱللَّهُ ٱلَّذِى لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلْمَلِكُ ٱلْقُدُّوسُ ٱلسَّلَٰمُ ٱلْمُؤْمِنُ ٱلْمُهَيْمِنُ ٱلْعَزِيزُ ٱلْجَبَّارُ ٱلْمُتَكَبِّرُ ۚ سُبْحَٰنَ ٱللَّهِ عَمَّا يُشْرِكُونَ﴾ ئەو خودایە (کە لەو بەدەر شیاوی پەرستنێك نیەبەحەق) پادشایە لە کەمایەتی بە دوورە، سەرچاوەی هێمنایەتی، هێمنی دەرە، بەسەر هەموو شت ڕادەگات، گشت دەستەڵات بەدەست ئەوە، بەسەر هەموو شتدا زاڵە، هیچ شتێ دەرۆستی نایە. خودا پاکە لەو شتانەی ئەوان دەیکەنە شەریکی. واتە: پادشای هەموو شتێکە بە فەرمانی ئەو هەڵدەسوڕێن بەبێ لەمپەرو لەبەردا وەستان ﴿ٱلْقُدُّوسُ﴾ وەهەبی کوڕی مونەبە دەڵێت:

---

[1] الاعراف (١٥٦).

[2] الانعام (٥٤).

[3] یونس (٥٨).

واتە: پاك. موجاهدو قەتادە گوتیان: یانی پیرۆز[1] ئیبنوجورەیج دەڵێت: فریشتە بەرێزەكان پاكو پیرۆزی خودا ڕادەگرن.[2] ﴿ٱلسَّلَـٰمُ﴾ دوورە لە هەموو عەیبو كەمو كوڕیەك. لەبەر تەواوی لە زاتو سیفاتو كرداریدا. ﴿ٱلْمُؤْمِنُ﴾ زەحاك دەڵێت: لە ئیبنوعەباسەوە: یانی دروست كراوەكانی دڵنیا كردوە كە ناهەقیان لەگەڵ بكا.[3] قەتادە دەڵێت: هێمنی بەخشە كە فەرموویەتی: كە هەر خۆی هەقو ڕاستە[4]. ئیبنوزەید دەڵێت: بەندە خاوەنباوەڕەكانی بۆ دڵنیاكردوە لە باوەڕ هێنانیان پێی[5]. ﴿ٱلْمُهَيْمِنُ﴾ ئیبنوعەباسو كەسانی تریش ووتویانە: واتە: ئاگای لە هەڵسوكەوتی دروست كراوەكانیەتی[6]، یانی هەموو كاتێ ئاگای لێیانە. وەك ئەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ﴾[7]، واتە: بەڕاستی خوا بەسەر هەموو شتێكدا ئاگادارە. وە ئەفەرموێت: ﴿ثُمَّ ٱللَّهُ شَهِيدٌ عَلَىٰ مَا يَفْعَلُونَ﴾[8]، واتە: پاشان خوا شایەتە لەسەر ئەو كردەوانەی كە دەیكەن (لەپاشی تۆ). وە ئەفەرموێت: ﴿أَفَمَنْ هُوَ قَآئِمٌ عَلَىٰ كُلِّ نَفْسٍۭ بِمَا كَسَبَتْ﴾[9]، واتە: دەی ئەو (خوایە)ی چاودێرە بەسەر هەموو كەسەوە هەرچی كردوە (وەك بتانێكە ئاگای لە هیچ نی یە). وە ئەفەرموێت ﴿ٱلْعَزِيزُ﴾ یانی ئەو خوایەی كە زاڵە بەسەر هەموو شتێكداو سەری پێ شۆڕ دەكات وە هەموو شتێ لەبەردەم دەستەڵاتو گەورەیی‌و هێزو تواناو تۆڵەیا خۆی ناگرێ. بۆیە فەرموویەتی: ﴿ٱلْجَبَّارُ ٱلْمُتَكَبِّرُ﴾ واتە: دەستەڵاتو زاڵی هەر شایانی ئەوەو گەورەیی‌و بڵندی هەر بۆ ئەو ئەشێ بۆ هیچ كەس نابێ. وەك لە فەرموودەی سەحیحدا لە پێشەوە باسمان كرد واتە: گەورەیی پۆشاكی منە بێباكیش كاڵای باڵامە هەر كەسێ لە یەكێ لەم دووانا دژایەتیم بكات سزای ئەدەم.[10] پاشان خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿سُبْحَـٰنَ ٱللَّهِ عَمَّا

---

[1] الطبري (٣٠٢/٢٣).
[2] الدر المنثور (١٢٣/٨).
[3] الدر المنثور (١٢٣/٨).
[4] الطبري (٣٠٣/٢٣).
[5] الطبري (٣٠٣/٢٣).
[6] البغوي (٣٢٦/٤).
[7] الحج (١٧).
[8] يونس (٤٦).
[9] الرعد (٣٣).
[10] مسلم (٢٠٢٣/٤).

یُشۡرِكُونَ﴾ وە ئەفەرموێت: ﴿هُوَ ٱللَّهُ ٱلۡخَٰلِقُ ٱلۡبَارِئُ ٱلۡمُصَوِّرُۖ لَهُ ٱلۡأَسۡمَآءُ ٱلۡحُسۡنَىٰۚ یُسَبِّحُ لَهُۥ مَا فِی ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ وَهُوَ ٱلۡعَزِیزُ ٱلۡحَكِیمُ﴾ هەر ئەوە خودای وەد هێنی داهێنەری وێنەگر. ناوی هەرە جوان بۆ ئەوە هەر شتێکی لە ئاسمانانو زەمیندان پەسەنی پاکی ئەو دەدەنو هەر خۆیەتی بە دەستەڵاتی لە کارزان. وەدی هێنەرو داهێنەرو وێنەگر هەر خۆیەتیو جێبەجێکردنو هەڵسوڕێنەریش هەر ئەوە. ئەو کەسەی شت دادەنێو ڕێکی دەخا مەرج نیە کە بتوانێ وەدی بهێنێو جێبەجێی بکا جگەخودا. وە ئەفەرموێت: ﴿ٱلۡخَٰلِقُ ٱلۡبَارِئُ ٱلۡمُصَوِّرُ﴾ واتە: ئەو خودایەی کە مەیلی شتێکی هەبوو ئەفەرموێت ببە دەبێ بەو شێوەیەی ئەیەوێتو بەو وێنەیەی ئارەزووی دەکات. وەك ئەفەرموێت: ﴿فِیٓ أَیِّ صُورَةٖ مَّا شَآءَ رَكَّبَكَ﴾[1]، واتە: لەهەر وێنەیەکدا کە خۆی ویستبێتی یەکی خستویت. بۆیە فەرموویەتی:﴿ٱلۡمُصَوِّرُ﴾ واتە: ئەو خودایەی ئەوەی بیەوێ جێبەجێی دەکاتو وەدی ئەهێنێ بەو شێوەیەی مەیلی لێ بێ.

## ناوە هەرە جوانەکان

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿لَهُ ٱلۡأَسۡمَآءُ ٱلۡحُسۡنَىٰ﴾ لە پێشەوە قسەی لەسەر کرا لە سورەتی ئەعرافدا وە لێرا ئەو فەرموودەیە ئەهێنین کە لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتوە لە ئەبوهورەیرەوە ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) فەرموویەتی: واتە: (خودا نەوەدو نۆ ناوی هەیە، سەد یەکێ کەم هەر کەسێ ژماردی چوەتە بەهەشت ئەو تاکەو تاکیشی پێ خۆشە)[2].

## هەموو شتێ شایەتی پاکیو پەسەندی خودا دەدات

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿یُسَبِّحُ لَهُۥ مَا فِی ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ﴾ وەك ئەم ئایەتەیە کە ئەفەرموێت: ﴿تُسَبِّحُ لَهُ ٱلسَّمَٰوَٰتُ ٱلسَّبۡعُ وَٱلۡأَرۡضُ وَمَن فِیهِنَّۚ وَإِن مِّن شَیۡءٍ إِلَّا یُسَبِّحُ بِحَمۡدِهِۦ وَلَٰكِن لَّا تَفۡقَهُونَ تَسۡبِیحَهُمۡۚ إِنَّهُۥ كَانَ حَلِیمًا غَفُورًا﴾[3]، واتە: ستایشی خوا دەکەن هەر حەوت ئاسمانەکانو زەویو هەرچی لەناویاندایە وە هیچ شتێك نی یە بە سوپاسی ئەو ستایش نەکات بەڵام ئێوە تێ ناگەن لە تەسبیحاتەکەیان بەڕاستی خوا هەمیشە پەلە نەکەری لێبوردەیە. وە ئەفەرموێت: ﴿وَهُوَ ٱلۡعَزِیزُ﴾ یانی هەر خۆیەتی بە دەستەڵات کەس ناتوانێ باڵادەستی بێت ﴿ٱلۡحَكِیمُ﴾ لە کارزانی و لە بریارو بەرنامەیدا.

---

[1] الانفطار (٨).

[2] فتح الباري (١١/٢١٨)، مسلم (٤/٢٠٢٣).

[3] الاسراء (٤٤).

## تەفسیری سورەتی (الممتحنه)

### لە مەدینە هاتووەتە خوارەوە

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَتَّخِذُوا عَدُوِّي وَعَدُوَّكُمْ أَوْلِيَاءَ تُلْقُونَ إِلَيْهِم بِالْمَوَدَّةِ وَقَدْ كَفَرُوا بِمَا جَاءَكُم مِّنَ الْحَقِّ يُخْرِجُونَ الرَّسُولَ وَإِيَّاكُمْ أَن تُؤْمِنُوا بِاللَّهِ رَبِّكُمْ إِن كُنتُمْ خَرَجْتُمْ جِهَادًا فِي سَبِيلِي وَابْتِغَاءَ مَرْضَاتِي تُسِرُّونَ إِلَيْهِم بِالْمَوَدَّةِ وَأَنَا أَعْلَمُ بِمَا أَخْفَيْتُمْ وَمَا أَعْلَنتُمْ وَمَن يَفْعَلْهُ مِنكُمْ فَقَدْ ضَلَّ سَوَاءَ السَّبِيلِ (١) إِن يَثْقَفُوكُمْ يَكُونُوا لَكُمْ أَعْدَاءً وَيَبْسُطُوا إِلَيْكُمْ أَيْدِيَهُمْ وَأَلْسِنَتَهُم بِالسُّوءِ وَوَدُّوا لَوْ تَكْفُرُونَ (٢) لَن تَنفَعَكُمْ أَرْحَامُكُمْ وَلَا أَوْلَادُكُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ يَفْصِلُ بَيْنَكُمْ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ (٣)﴾

**هۆی هاتنە خوارەوەی سورەتی (الممتحنة)**

هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم سورەتە پیرۆزە ڕووداوەکەی حاتەبی کوڕی ئەبی بەلتەعەیە ئەم حاتبە پیاوێك بوو لەوانەی کە کۆچی کردبوو لە مەکەوە بۆ مەدینە یەکێك بوو لەوانەی کە لە جەنگی بەدرا بەشداری کرد ئەم پیاوە ماڵو منداڵی لە مەکە بوون لە ڕەچەڵەکدا لە هۆزی قورەیش نەبوو بەڵکو لە هاوپەیمانەکانی عوسمان بوو کاتێ پێغەمبەری خوا بڕیاری دا کە مەکە ئازاد بکات کاتێ خەڵکەکەی پەیمانیان شکاند. پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی دا بۆ خۆ ئامادەکردنو غەزا کردنیانو فەرمووی: (ئەی خودایە هەواڵی ئێمەیان لێ ون کەی (بشاریتەوە)) حاتەب ویستی ئەم هەواڵە بدات بە قورەیش نامەیەکی نووسیو دای بە ژنێکی قورەیشی کە بیگەیەنێ بە مەکەیەکانو ئاگاداریان بکات کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) نیازی هەیە کە بدا بەسەریانا بۆ ئەوەی بیکاتە دەست پێشخەریەك بۆ خۆی بۆ پاراستنی ماڵو منداڵی. خوای گەورە پێغەمبەری(ﷺ) لەمە ئاگادار کرد لە وەڵامی ئەو دوعایەی کردی. ناردی کە بگەڕێن بە شوێن ئەو ژنەداو نامەکەیان لێ وەرگرت وە ئەمەیش باسی کراوە لەو فەرموودەی بوخاریو موسلم هاوڕان تیایدا. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە حەسەنی کوڕی محمدی کوڕی عەلیەوە دەڵێت: عبدالله ی کوڕی ئەبی ڕافع هەواڵی دامێ. جارێکی تر دەڵێت: کە عبدالله ی کوڕی ئەبی ڕافع هەواڵی داومەتێ. کە گوێی لە عەلی بوو (ڕەزای خوای لێ بێ) ئەی گوت: کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ناردمی، منو زوبەیرو میقداد (واتە: ئەوانیشی لەگەڵ نارد) فەرمووی: (بڕۆن هەتا دەگەنە باخچەی خاخ) شوێنێکە لەنێوان مەکەو مەدینەدا (کە ژنێکی تێدایە لە ناو کەژاوەیەکا) لەسەر پشتی وشتر دادەنرێ (نامەیەکی پێیە لێی وەرگرن) بە سواری وڵاغەکانمان بە تاو ڕۆشتین هەتا گەیشتینە ئەو باخچەیە ژنەکەمان بینی پێمان گوت نامەکە دەربهێنە. دەڵێت: نامەم پێ نیە. ووتمان:

نامەکە دەربێنە یا پۆشاکەکانت لابەرە لەبەرت دەڵێت: نامەکەی لە پەلکەکەیا دەرهێنا. نامەکەمان وەرگرت، هێنامان بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە نامەکەدا نوسرا بوو لە حاتەبی کوڕی ئەبی بەلتەعەوە بۆ کەسانێ کە بت پەرستن لە مەکە. هەواڵی ئەدانێ بە هەندێ شت کە پێغەمبەر(ﷺ) لەبارەی داگیر کردنی مەکەوە ئەی ویست بیکا. پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی: (حاتەب ئەمە چیە؟ حاتەب دەڵێت: پەلەم لێ مەکە من پیاوێك بووم خۆم دابوە پاڵ قورەیش وە من لە ڕەچەڵەکا قورەیشی نیم. ئەو کۆچەریانەی لە خزمەتتان هەموو خزمو کەسو کاریان هەیە لە مەکە ئەیان پارێزن بە هۆی خزمایەتیەوە. وام بە چاك زانی کە من خزمم نیە لە مەکە ئەم کارە بکەم هەتا بە هۆیەوە کەسو کارم بپارێزن. وە ئەمەی کردومە لەبەر بێ دینیو پەشیمان بوونەوەم نیە لە ئاینەکەمو ڕازیبوون، بە خوانەناسی پاش موسوڵمان بوون. پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (بێگومان ڕاستتان پێ ئەڵێت). عومەر دەڵێت: وازم لێ بێنە با بدەم لە ملی ئەم دووڕوە. پێغەمبەری خودا فەرمووی: ئەوە ئامادەی بەدر بوە چۆن دەزانی بەشکو خودا ئاگاداری ئەهلی بەدر بوبێ فەرموبێتی: ﴿چی ئەکەن بیکەن لە گوناهتان خۆش بووم﴾ هەر بەم شێوەیە زانایانی فەرموده هێناویانە ئیبنوماجە نەبێ بە شێوەیەکی تر هێناویەتی لە سوفیانی کوڕی عویەینەوە بوخاری لە کتێبی مەغازیدا ئەمەی لێ زیاد کردوە. خوای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ عَدُوِّي وَعَدُوَّكُمْ أَوْلِيَآءَ﴾ وە لە کتێبی تەفسیرا دەڵێت: عەمر دەڵێت لەسەر ئەم ئایەتە هاتوەتە خوارەوە: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ عَدُوِّي وَعَدُوَّكُمْ أَوْلِيَآءَ﴾ دەڵێت: نازانم ئەم ئایەتە لەسەر فەرمودەکەیە یان قسەی عەمر خۆیەتی. بوخاری دەڵێت: عەلی (یانی ئیبنولمەدینی) دەڵێت: ووترا بە سوفیان لەسەر ئەمە هاتوەتە خوارەوە ئەم ئایەتە ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ عَدُوِّي وَعَدُوَّكُمْ أَوْلِيَآءَ﴾ سوفیان دەڵێت: ئەمە لەناو خەڵکا باس کراوە. لە عەمرەوە لەبەرم کردوە یەك پیتم لێ لانەبردوە. وە گومان نابەم کەسێ تر لەبەری کردبێ من نەبێ (جگەلەمن)[1].

### فەرمان دان بە دوژمنایەتی کردنی بێ دین و دۆستایەتی نەکردنیان

خودای مەزن فەرموویەتی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ عَدُوِّي وَعَدُوَّكُمْ أَوْلِيَآءَ تُلْقُونَ إِلَيْهِم بِٱلْمَوَدَّةِ وَقَدْ كَفَرُواْ بِمَا جَآءَكُم مِّنَ ٱلْحَقِّ يُخْرِجُونَ ٱلرَّسُولَ وَإِيَّاكُمْ أَن تُؤْمِنُواْ بِٱللَّهِ رَبِّكُمْ إِن كُنتُمْ خَرَجْتُمْ جِهَٰدًا فِي سَبِيلِي وَٱبْتِغَآءَ مَرْضَاتِي تُسِرُّونَ إِلَيْهِم بِٱلْمَوَدَّةِ وَأَنَا۠ أَعْلَمُ بِمَآ أَخْفَيْتُمْ وَمَآ أَعْلَنتُمْ وَمَن يَفْعَلْهُ مِنكُمْ فَقَدْ ضَلَّ سَوَآءَ ٱلسَّبِيلِ﴾

---

[1] فتح الباري (١٦٦/٦) و (٥٩٢/٧) و (٥٠٢/٨)، مسلم (١٩٤١/٤)، ابوداود (١٠٨/٣)، تحفة الاحوذي (١٩٨/٩)، النسائي في الكبرى (٤٨٧/٦).

ئەی كۆمەڵی خاوەن باوەڕان! مەبنە دۆستی دوژمنانو خۆتان، ئێوە دۆستایەتیتان بەوان ڕادەگەیەنن، كەچی ئەوان بەو دینە ڕاستەقینەیە كە بۆ ئێوە هاتووە بڕوایان نیە (و) لەبەر ئەوە بە خودای پەروەرندەتان بە باوەڕن، ئێوەو پێغەمبەر لە زێدی خۆ دەردەكەن. ئەگەر بۆ غەزا لە ڕای منو ڕەزامەندیم دەردەكەون، (دۆستایەتی ئەوان مەكەن). پەنامەكی پێیان ئەڵێن: خۆشمان دەوێن، كەچی من لە هەر شتێ دەیشارنەوەو هەر شتێ ئاشكرای دەكەن، لە خۆتان ئاگادار ترم. كێ لە ئێوە ئەو كارە بكا، ڕێگەی ڕاستی لێ تێكچووە. واتە: ئەو بتپەرستو خوانەناسانەی كە دەجەنگێن لە دژی خوداو پێغەمبەرەكەیو(ﷺ) خاوەنباوەڕان. ئەوانەی كە خودا فەرموویەتی كە دوژمنایەتیان بكەنو توندو تیژ بن بەرانبەریانو دۆستایەتیو هاوڕێتیو برادەرایەتیان مەكەن. وەك فەرموویەتی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ ٱلۡيَهُودَ وَٱلنَّصَٰرَىٰٓ أَوۡلِيَآءَۘ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلِيَآءُ بَعۡضٖۚ وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمۡ فَإِنَّهُۥ مِنۡهُمۡ﴾[1]، واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە جولەكەو گاور مەكەن بە پشتیوانو خۆشەویستی خۆتان ئەوانە هەندێكیان دۆستی یەكترن ئەوەتان ئەوان بكات بە پشتیوانو دۆست ئەوە بەڕاستی ئەو كەسە لەوانە. ئەمە هەڕەشەیەكی توندەو بەڵێنێكی ڕوونو ئاشكرایە. وە ئەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ دِينَكُمۡ هُزُوٗا وَلَعِبٗا مِّنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ مِن قَبۡلِكُمۡ وَٱلۡكُفَّارَ أَوۡلِيَآءَۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ﴾[2]، واتە: ئەی ئەوانەی كە بڕواتان هێناوە، ئێوە لەگەڵ ئەو كەسانەی گاڵتە بە دینتان دەكەنو لە ئەهلی كتێب حسێبن (كە پێشو بۆیان هاتوە)و ئەو كەسانەی خوا نەناسن، هەرگیز دۆستایەتی مەكەن، ئەگەر ئێوە بەڕاستی خاوەن باوەڕن، ئەشێ لە خوا بترسن. وە ئەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ ٱلۡكَٰفِرِينَ أَوۡلِيَآءَ مِن دُونِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَۚ أَتُرِيدُونَ أَن تَجۡعَلُواْ لِلَّهِ عَلَيۡكُمۡ سُلۡطَٰنٗا مُّبِينًا﴾[3]، واتە: ئەی ئەوانەی كە بڕواتان هێناوە بێبڕواكان مەكەنە دۆستی خۆتان لەبری ئیمانداران ئایا (بەم كارە) دەتانەوێت بەڵگەیەكی ڕون لە دژی خۆتان بدەن بە خوا ؟. وە ئەفەرموێت: ﴿لَّا يَتَّخِذِ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ٱلۡكَٰفِرِينَ أَوۡلِيَآءَ مِن دُونِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَۖ وَمَن يَفۡعَلۡ ذَٰلِكَ فَلَيۡسَ مِنَ ٱللَّهِ فِي شَيۡءٍ إِلَّآ أَن تَتَّقُواْ مِنۡهُمۡ تُقَىٰةٗۗ وَيُحَذِّرُكُمُ ٱللَّهُ نَفۡسَهُۥ﴾[4]، واتە: نابێ بڕواداران بێباوەڕان بگرن بە دۆستی خۆیان لە جیاتی بڕواداران وە هەركەسێك وا بكات ئیتر پەیوەستی لەگەڵ خودا نامێنێ مەگەر بۆ خۆپاراستنتان بێت لێیان وە خوا دەتان ترسێنێت لە سزای خۆی. لەبەر

---

[1] المائدة (٥١).

[2] المائدة (٥٧).

[3] النساء (١٤٤).

[4] آل عمران (٢٨).

ئەمە بوو پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەهانەی حاتەبی قەبوڵ کرد کاتێ کە دەڵێت بۆیە هەڵساوە بەو کارە لەگەڵ قورەیشا کە ماڵو منداڵەکانی بپارێزێ لە دەست درێژی قورەیش. خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿يُخْرِجُونَ الرَّسُولَ وَإِيَّاكُمْ﴾ ئەمە وەك لە پێشەوە زۆر بە گرنگی باسی دوژمنایەتی بت پەرستو خوانەناسەکانی کرد کە دۆستایەتی نەکەن لەگەڵیان چونکە ئەوانە دوژمنی خوداو ئێوەشن. ئەوانە پێغەمبەری خوداو (ﷺ) هاوەڵەکانی ئەویان دەرکرد لە مەکە پێیان گران بوو ئەوانە تەنها خودا ئەپەرستنو تەنها سوژدە بۆ ئەو خودایە دەبەن. بۆیە ئەفەرموێت: ﴿أَن تُؤْمِنُوا بِاللَّهِ رَبِّكُمْ﴾ یانی ئێوە هیچ تاوانێکتان نەبوو جگە لەوەی باوەڕتان هەبوو بە پەروەرندەی هەموو جیهان. وەك خودا ئەفەرموێت: ﴿وَمَا نَقَمُوا مِنْهُمْ إِلَّا أَن يُؤْمِنُوا بِاللَّهِ الْعَزِيزِ الْحَمِيدِ﴾[1]، واتە: ئەم سزایەشیان هەر لەبەر ئەوە دەدان کە بڕوایان هێنا بوو بە خوای بە دەستەڵاتی سوپاسکراو. وە ئەفەرموێت: ﴿الَّذِينَ أُخْرِجُوا مِن دِيَارِهِم بِغَيْرِ حَقٍّ إِلَّا أَن يَقُولُوا رَبُّنَا اللَّهُ﴾[2]، واتە: ئەوانەی کە دەرکران لە ماڵو وولاتیان بە ناهەق تەنها (گوناهیان ئەوە بوو) کە دەیان ووت پەروەردگارمان خوایە. وە ئەفەرموێت: ﴿إِن كُنتُمْ خَرَجْتُمْ جِهَادًا فِي سَبِيلِي وَابْتِغَاءَ مَرْضَاتِي﴾ واتە: ئێوە کە ئاوا بوون مەبنە دۆستیان. ئێوە ئەگەر لەبەر ڕەزامەندی من لە زێدی خۆتان دەرچوون بۆ غەزا کردن مەبنە دۆستی دوژمنانی منو خۆتان. ئەوانە ئێوەیان ئاوارە کردوە ڕقیانە لە خۆتانو ئاینەکەشتانە. وە ئەفەرموێت: ﴿تُسِرُّونَ إِلَيْهِم بِالْمَوَدَّةِ وَأَنَا أَعْلَمُ بِمَا أَخْفَيْتُمْ وَمَا أَعْلَنتُمْ﴾ واتە: ئەوەی کە دەیکەن من ئاگاداری پەنهانیو ئاشکرای دڵو دەروونتانم ﴿وَمَن يَفْعَلْهُ مِنكُمْ فَقَدْ ضَلَّ سَوَاءَ السَّبِيلِ﴾ هەر کەسێ لە ئێوە ئەو کارە بکات ڕێگەی ڕاستی لێ تێکچووە. وە ئەفەرموێت: ﴿إِن يَثْقَفُوكُمْ يَكُونُوا لَكُمْ أَعْدَاءً وَيَبْسُطُوا إِلَيْكُمْ أَيْدِيَهُمْ وَأَلْسِنَتَهُم بِالسُّوءِ وَوَدُّوا لَوْ تَكْفُرُونَ﴾ ئەگەر گیریان بکەون، دوژمنایەتیتان دەکەن، بۆ ئازارتان دەستو زمان وە کار دەخەن، حەز دەکەن لە دین وەرگەڕێن. یانی (گەر دەستیان بچێ بەسەرتانا) درێغی ناکەن لە ئازاردانتان بە دەستو زمان. ﴿وَوَدُّوا لَوْ تَكْفُرُونَ﴾ زۆر هەوڵ دەدەن کە توشی خێر نەبن دوژمنایەتی ئەوانە بەردەوامە بە پەنهانیو ئاشکرا چۆن ئێوە دۆستایەتی ئەو جۆرە کەسانە ئەکەن؟ ئەمەیش هەر وریا کردنەوەیە لەوەی کە دەبێ ئەمانیش دوژمنایەتی خوانەناسان بکەنو دۆستایەتیان نەکەن. وە ئەفەرموێت: ﴿لَن تَنفَعَكُمْ أَرْحَامُكُمْ

---

[1] البروج (٨).

[2] الحج (٤٠).

وَلَآ أَوْلَٰدُكُمْۚ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ يَفْصِلُ بَيْنَكُمْۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ﴾ ڕۆژی قیامەت نە خزمان‌و نە جگەرگۆشەکانیشتان هەرگیز فریاتان ناکەون. لێکتان جودا دەکاتەوەو چی بکەن خودا دەیبینێ. واتە: خزمایەتیتان هیچ سودێکتان پێ ناگەیەنێ لای خودا ئەگەر بیەوێ سزاتان بدات. وە ئەگەر خواتان لە خۆتان ڕەنجاندبێت لەبەر خاتری ئەوان ناگەنە فریاتان‌و سودیان نیە بۆتان. هەرکەسێ لەگەڵ خزم‌و کەس‌و کاری بێ بۆ ئەوەی دڵی نەیەشێ‌و دڵ گران نەبێ ئەوە ئەو کەسە ڕەنج بێوەرو ماڵ وێران‌و زیان لێ کەوتووە. هەرچی بکات بێ سوودە هیچ کەڵکێکی لای خودا پێ ناگەیەنێ ئەو خزمایەتیەی. با ئەو کەسە خزمێکی نزیکی پێغەمبەرێکیش بێ (علیه السلام) ئیمامی ئەحمەد دەڵێت: حەممادی کوڕی سابت بۆی گێڕاینەوە لە ئەنەسەوە کە پیاوێك دەڵێت: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) باوکم لە کوێیە؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (لەناو ئاگردایە) کاتێ کە پیاوەکە ڕۆشت‌و پشتی هەڵ کرد پێغەمبەر(ﷺ) فەرموی: (باوکی من‌و باوکی تۆ لەناو ئاگردان)[1] موسلم‌و ئەبوداود ڕیوایەتیان کردوە[2].

﴿قَدْ كَانَتْ لَكُمْ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ فِىٓ إِبْرَٰهِيمَ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ إِذْ قَالُوا۟ لِقَوْمِهِمْ إِنَّا بُرَءَٰٓؤُا۟ مِنكُمْ وَمِمَّا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ كَفَرْنَا بِكُمْ وَبَدَا بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ ٱلْعَدَٰوَةُ وَٱلْبَغْضَآءُ أَبَدًا حَتَّىٰ تُؤْمِنُوا۟ بِٱللَّهِ وَحْدَهُۥٓ إِلَّا قَوْلَ إِبْرَٰهِيمَ لِأَبِيهِ لَأَسْتَغْفِرَنَّ لَكَ وَمَآ أَمْلِكُ لَكَ مِنَ ٱللَّهِ مِن شَىْءٍ ۖ رَّبَّنَا عَلَيْكَ تَوَكَّلْنَا وَإِلَيْكَ أَنَبْنَا وَإِلَيْكَ ٱلْمَصِيرُ ﴿٤﴾ رَبَّنَا لَا تَجْعَلْنَا فِتْنَةً لِّلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَٱغْفِرْ لَنَا رَبَّنَآ ۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٥﴾ لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِيهِمْ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُوا۟ ٱللَّهَ وَٱلْيَوْمَ ٱلْءَاخِرَ ۚ وَمَن يَتَوَلَّ فَإِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْغَنِىُّ ٱلْحَمِيدُ ﴿٦﴾﴾

**ئیبراهیم (سەلامی خوای لێ بێ)و ئەوانەی لەگەڵی بوون چاکترین نموونەن کە بێزاری خۆیان دەربڕی‌و ئاشکرایان کرد لە خزمە بێ دینەکانیان**

خوای مەزن ئەفەرموێ: ﴿قَدْ كَانَتْ لَكُمْ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ فِىٓ إِبْرَٰهِيمَ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ إِذْ قَالُوا۟ لِقَوْمِهِمْ إِنَّا بُرَءَٰٓؤُا۟ مِنكُمْ وَمِمَّا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ كَفَرْنَا بِكُمْ وَبَدَا بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ ٱلْعَدَٰوَةُ وَٱلْبَغْضَآءُ أَبَدًا حَتَّىٰ تُؤْمِنُوا۟ بِٱللَّهِ وَحْدَهُۥٓ إِلَّا قَوْلَ إِبْرَٰهِيمَ لِأَبِيهِ لَأَسْتَغْفِرَنَّ لَكَ وَمَآ أَمْلِكُ لَكَ مِنَ ٱللَّهِ مِن شَىْءٍ ۖ رَّبَّنَا عَلَيْكَ تَوَكَّلْنَا وَإِلَيْكَ أَنَبْنَا وَإِلَيْكَ ٱلْمَصِيرُ﴾ ئیبراهیم‌و ئەو کەسانەی لەگەڵی ئەو بوون. بۆ ئێوە نمونەی زۆر باشن، کە بە هۆزەکەی خۆیان وت: ئێمە لە ئێوەو لەو شتانەی (لە خودا بەدەر) دەپەرستن بە دوورین‌و باوەڕمان بە ئێوە نەماوە هەتا هەتایە دوژمنایەتی‌و ڕق‌و کینە کەوتۆتە نێوانمانەوە، تا ئەو کاتەی ئێوە باوەڕ بە خودای تاقانە دێنن

---

[1] احمد (٢٦٨)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[2] مسلم (١/١٩١)، ابوداود (٥/٩٠).

جیا لەوە کە ئیبراهیم بە بابیٚ خۆی گوت: داوای لیٚ خۆشبونت بۆ دەکەم، دەربارەی تۆ هیچی ترم بۆ لەگەڵ خودا ناکریٚ. ئەی پەروەردگاری هەمووومان! خۆمان بە تۆ سپاردووەو هەموومان ڕوومان لە تۆیەو وە گەڕانەوەی دوا ڕۆژیش هەر بەرەو تۆیە. خودای مەزن بە بەندە خاوەن باوەڕەکانی خۆی دەفەرمویٚت کە دژایەتیو دوژمنایەتی خوانەناسەکان بکەنو جەنگیان لەگەڵ بکەنو دوورکەونەوە لێیانو ناڕەزایی خۆتان دەربڕن لێیان ئەفەرمویٚت: ﴿قَدۡ كَانَتۡ لَكُمۡ أُسۡوَةٌ حَسَنَةٞ فِيٓ إِبۡرَٰهِيمَ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ﴾ واتە: شوێن کەوتووەکانیو ئەوانەی لەگەڵی بوون ﴿إِذۡ قَالُواْ لِقَوۡمِهِمۡ إِنَّا بُرَءَٰٓؤُاْ مِنكُمۡ﴾ واتە: ئێمە دوورین لە ئێوەو هیچ پەیوەندیەکمان پێتانەوە نیە ﴿وَمِمَّا تَعۡبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ كَفَرۡنَا بِكُمۡ﴾ واتە: بە ئاینتانو ڕێبازتان ﴿وَبَدَا بَيۡنَنَا وَبَيۡنَكُمُ ٱلۡعَدَٰوَةُ وَٱلۡبَغۡضَآءُ أَبَدًا﴾ واتە: دوژمنایەتیو کینە دەستی پێکرد لە نێوانی ئێمەو ئێوەدا هەتا ئێوە بەردەوام لەسەر بێدینی بڕۆن. وە هەتا هەتایشە ئێمە بە دوژمنی خۆمانتان دەزانینو ڕقمان لێتانە ﴿حَتَّىٰ تُؤۡمِنُواْ بِٱللَّهِ وَحۡدَهُۥٓ﴾ واتە: هەتا ئەو کاتەی کە تەنها خودا دەپەرستنو سوژدەی بۆ دەبەنو هیچ خوایەکی تر بێجگە لەو ناپەرستن لە بتو شتی تر. وە ئەفەرمویٚت: ﴿إِلَّا قَوۡلَ إِبۡرَٰهِيمَ لِأَبِيهِ لَأَسۡتَغۡفِرَنَّ لَكَ﴾ واتە: لە ئیبراهیمو ئەوانەی لەگەڵی بوون نمونەی باشتان دەست دەکەویٚ کە لەسەری بڕۆن جگە ئیبراهیم داوای لیٚ بووردنی لە خودا کرد بۆ باوکی کە ئەویش بەڵێنێك بوو کە ئیبراهیم بە باوکی دابوو. وەختیٚ بۆی ئاشکرا بوو کە باوکی دوژمنی خوایە لێی تەکیەوە. کاتیٚ هەندیٚ لە موسوڵمانان داوای لیٚ خۆشبوونیان بۆ بابو باپیرانیان دەکرد کە مردبوون لەسەر بتپەرستیو دەپاڕانەوە لە خودا بۆیانو ئەیان ووت خۆ ئیبراهیمیش داوای لیٚ بوردنی بۆ باوکی کردوە، خوای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: ﴿مَا كَانَ لِلنَّبِيِّ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَن يَسۡتَغۡفِرُواْ لِلۡمُشۡرِكِينَ وَلَوۡ كَانُوٓاْ أُوْلِي قُرۡبَىٰ مِنۢ بَعۡدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمۡ أَنَّهُمۡ أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَحِيمِ ﴿١١٣﴾ وَمَا كَانَ ٱسۡتِغۡفَارُ إِبۡرَٰهِيمَ لِأَبِيهِ إِلَّا عَن مَّوۡعِدَةٖ وَعَدَهَآ إِيَّاهُ فَلَمَّا تَبَيَّنَ لَهُۥٓ أَنَّهُۥ عَدُوّٞ لِّلَّهِ تَبَرَّأَ مِنۡهُۚ إِنَّ إِبۡرَٰهِيمَ لَأَوَّٰهٌ حَلِيمٞ﴾[1]، واتە: ڕەواو شایستە نیە بۆ پێغەمبەرو باوەڕداران کە داوای لێبوردن بکەن بۆ هاوبەش پەیداکەران با خزمی نزیکیشیان بن لەپاش ئەوەی کە بۆیان دەرکەوتوە کە بێگومان ئەو (هاوبەش دانەرانە) هاوەڵو پێڕی دۆزەخن، وە داوای لیٚ خۆشبوونی ئیبراهیم بۆ باوکی تەنها لەبەر وادەو بەڵێنێك بوو کە بە باوکی دابوو (کە داوای لیٚ بوردنی بۆ بکات) جا کاتیٚ بۆی ڕوون بویەوە کە بێگومان باوکی دوژمنی خوایە خۆی لیٚ بەری کرد بەڕاستی ئیبراهیم زۆر لە خوا ترسو لەسەرخۆ بوو. وە خوای گەورە لەم ئایەتەدا

---

[1] التوبة (١١٣-١١٤).

ئەفەرموێت: ﴿قَدْ كَانَتْ لَكُمْ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ فِيٓ إِبْرَٰهِيمَ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ إِذْ قَالُوا۟ لِقَوْمِهِمْ إِنَّا بُرَءَٰٓؤُا۟ مِنكُمْ﴾ تا ئەفەرموێت: ﴿إِلَّا قَوْلَ إِبْرَٰهِيمَ لِأَبِيهِ لَأَسْتَغْفِرَنَّ لَكَ وَمَآ أَمْلِكُ لَكَ مِنَ ٱللَّهِ مِن شَىْءٍ﴾ واتە: ئیبراهیم نمونە نیە بۆ ئێوە كە داوای لێ بوردن بكەن بۆ بتپەرستەكان. ئا بەو شێوەیەی كە ئەتانەوێ واتە: كە زانیوتانە بە بت پەرستی مردوون (ئەمە قسەی ئیبنوعەباس‌و موجاهدو قەتادەو موقاتل‌و زەحاك‌و كەسانی تریشە.[1] پاشان خودای مەزن باسی ئیبراهیم‌و ئەوانەی كە لەگەڵی بوون دەكاو وەختێ لە گەلەكەیان دووركەوتنەوەو بێزاری خۆیان دەربڕی لێیان‌و تەبەرایان لێ كردن خۆیان تەنها بە خودا سپاردو لێی ئەپاڕانەوە گوتیان: ﴿رَّبَّنَا عَلَيْكَ تَوَكَّلْنَا وَإِلَيْكَ أَنَبْنَا وَإِلَيْكَ ٱلْمَصِيرُ﴾ واتە: لە هەموو هەڵسوكەوتێكماندا هەموو شتێكمان هەر بە تۆ دەسپێرین‌و دەیدەینە دەستی تۆو وە هەر بۆلای تۆش لە دواڕۆژدا دەگەڕێینەوە. واتە: زیندوو دەكرێینەوە لە ڕۆژی دوایدا. وە ئەفەرموێت: ﴿رَبَّنَا لَا تَجْعَلْنَا فِتْنَةً لِّلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَٱغْفِرْ لَنَا رَبَّنَآ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ﴾ ئەی پەروەردەی هەموومان، مەمانخە بەر تیرو تانەی ئەوانەی كە تۆ ناناسن، لە گوناهیشمان ببورە، هەرتۆ خاوەن دەستەڵاتی لە كارزانی. موجاهد دەڵێت: خودایە تۆش گرفتارمان مەكە بەدەستی ئەو خوانەناسانەو سزامان مەدە تا ئەو بێدینانە بڵێن: ئەگەر ئەوانە لەسەر هەق بونایە ئەمەیان بەسەر نەدەهات.[2] زەحاكیش هەر وای گوتوە. قەتادە دەڵێت: ئەڵێن خودایە زاڵیان مەكە بەسەرمانا هەتا تیرو تانەمان لێ بدەن‌و وابزانن كە ئەوان لەسەر هەقن بۆیە زاڵ بوون بەسەرمانا. ئیبنوجەریریش هەمان ڕای هەڵبژاردوە. عەلی كوڕی ئەبو تەلحە لە ئیبنوعەباسەوە دەڵێت: خودایە زاڵیان مەكە بەسەرمانا هەتا ئازارمان بدەن. خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَٱغْفِرْ لَنَا رَبَّنَآ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ﴾ واتە: تاوانەكانمان داپۆشەو با كەس پێی نەزانێ خۆت نەبێ‌و لەو گوناهانەشمان ببورە كە خۆت ئاگات لێیەتی كە كردومانە. ﴿إِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَزِيزُ﴾ واتە: ئەو خودایەی كە هەركەسێ پەنات پێ بێنێ نائومێد نابێ ﴿ٱلْحَكِيمُ﴾ لە كارزانی لە فەرمان‌و كردارو بەنامەو بڕیارتا. پاشان خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِيهِمْ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُوا۟ ٱللَّهَ وَٱلْيَوْمَ ٱلْءَاخِرَ ۚ وَمَن يَتَوَلَّ فَإِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْغَنِىُّ ٱلْحَمِيدُ﴾ بێگومان ئەوانە نمونەی باشن بۆ ئێوەو بۆ ئەو كەسەی كە ئومێدی بە خوداو ڕۆژی قیامەت هەیە. هەركەسیش خۆ دەبوێرێ خودا پەكی پێ ناكەوێ‌و هەر شایانی پەسەند دانە. ئەم ئایەتە پشتگیری پێش خۆی دەكاو جیاش بوەتەوە لە پێش خۆی‌و نمونەیەكی زۆر چاك‌و باشە بۆ

[1] الطبري (٢٣/٣١٨).

[2] الطبري (٢٣/٣١٩.

کەسێ بەتەمای خوداو ڕۆژی دواییە. وە ئەفەرموێت: ﴿لِّمَن كَانَ يَرْجُواْ ٱللَّهَ وَٱلْيَوْمَ ٱلْآخِرَ﴾ هانی هەموو خواناسێ ئەدا کە باوەڕی بە خوداو ڕۆژی دوایی هەیە ﴿وَمَن يَتَوَلَّ﴾ هەرکەسیش خۆی لادەدا لەوەی کە خودا فەرمانی پێ کردوە ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْغَنِيُّ ٱلْحَمِيدُ﴾ خودا بێنیازەو هەر ئەو شایانی پەسەن دانو ستایشە. وەك خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿إِن تَكْفُرُوٓاْ أَنتُمْ وَمَن فِي ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا فَإِنَّ ٱللَّهَ لَغَنِيٌّ حَمِيدٌ﴾[1]، واتە: ئەگەر ئێوە نا سوپاسی (بەهرەکانی خوا) بکەنو هەموو ئەو کەسانەش لە زەویدان ئەوە بەڕاستی خوا بێنیازی سوپاس کراوە. عەلی کوڕی ئەبو تەلحە لە ئیبنوعەباسەوە دەڵێت: ﴿ٱلْغَنِيُّ﴾ ئەو کەسەی کە زۆرو بێ پایان دەوڵەمەندە کە خودایە. ئەم سیفەتە تەنها هەر بۆ خودایە هیچ کەس هاوشانو هاو وێنەی نیە لە هیچ شتێکیدا پەسەندی پاکی هەر بۆ ئەوە کە تاكو تەنهاو زاڵو خاوەن دەستەڵاتە. ﴿ٱلْحَمِيدُ﴾ هەر ئەو شایەنی پەسەنی دانە لای بەندەکانی واتە: سوپاس کراوە لە هەموو گفتارو کردارێکیداو هیچ خودایێك نیە جگە لەو پەروەردگاریش هەر ئەوە.

﴿عَسَى ٱللَّهُ أَن يَجْعَلَ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَ ٱلَّذِينَ عَادَيْتُم مِّنْهُم مَّوَدَّةً وَٱللَّهُ قَدِيرٌ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٧﴾ لَّا يَنْهَىٰكُمُ ٱللَّهُ عَنِ ٱلَّذِينَ لَمْ يُقَٰتِلُوكُمْ فِي ٱلدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُم مِّن دِيَٰرِكُمْ أَن تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوٓاْ إِلَيْهِمْ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُقْسِطِينَ ﴿٨﴾ إِنَّمَا يَنْهَىٰكُمُ ٱللَّهُ عَنِ ٱلَّذِينَ قَٰتَلُوكُمْ فِي ٱلدِّينِ وَأَخْرَجُوكُم مِّن دِيَٰرِكُمْ وَظَٰهَرُواْ عَلَىٰٓ إِخْرَاجِكُمْ أَن تَوَلَّوْهُمْ وَمَن يَتَوَلَّهُمْ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٩﴾﴾

## شایەد خودا لەنێوان خاوەن باوەڕانو ئەو کەسانەی کە دوژمنیانن دۆستایەتی دا بمەزرێنن

خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿عَسَى ٱللَّهُ أَن يَجْعَلَ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَ ٱلَّذِينَ عَادَيْتُم مِّنْهُم مَّوَدَّةً وَٱللَّهُ قَدِيرٌ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ شایەت خوا لەناو ئێوەو ئەو کەسانەی دوژمنایەتیان دەکردن، دۆستایەتی دامەزرێنێت. خودا توانایەو خوا دەبورێو دلۆڤانە. پاش ئەوەی کە خودا فەرمانی دا بە دوژمنایەتی کردنی خوانەناسان دەفەرموێت بە بەندە خاوەنباوەڕەکانی کە دۆستایەتی دامەزرێنن لەنێوان خۆیانو ئەو کەسانەی کە دوژمنایەتیتان دەکردن ﴿عَسَى ٱللَّهُ أَن يَجْعَلَ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَ ٱلَّذِينَ عَادَيْتُم مِّنْهُم مَّوَدَّةً﴾ واتە: پاش کینەو دژایەتیو دورەپەرێزی خۆشەویستیو دۆستایەتی و برایەتی دامەزرێنن. ﴿وَٱللَّهُ قَدِيرٌ﴾ خودا دەتوانێ ئەم هەموو شتە دوور لەیەكو جیاوازو بەش بەشە کۆ بکاتەوە کە بیەوێت. وە دڵەکان ئەبەستێ بەیەکەوە دوای ئەو هەموو کینەو دوژمنایەتیە دەتوانێ بیانکاتەوە بە یەك وەك خوای گەورە منەتی

[1] ابراهیم (٨).

کردووە بەسەر ئەنساریەکانا فەرموویەتی: ﴿وَاذْكُرُوا نِعْمَتَ اللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ كُنتُمْ أَعْدَاءً فَأَلَّفَ بَيْنَ قُلُوبِكُمْ فَأَصْبَحْتُم بِنِعْمَتِهِ إِخْوَانًا وَكُنتُمْ عَلَىٰ شَفَا حُفْرَةٍ مِّنَ النَّارِ فَأَنقَذَكُم مِّنْهَا﴾[1]، واتە: بیر لە بەهرەو چاکەی خوا بکەنەوە بەسەرتانەوە لە کاتێکدا ئێوە دوژمنی یەکتر بوون بەڵام خوا هۆگری خستە نێوان دڵەکانتان ئیتر بوون بە برای یەکتر بەهۆی ئەو چاکەی خواوە ئێوە لەسەر لێواری چاڵێك بوون لە ئاگر بەڵام خوا ڕزگاری کردن لێی. وە پێغەمبەریش (ﷺ) فەرموویەتی پێیان: (ئاخۆ نەم دین گومڕا بوون خودا ڕێی نیشاندان بەهۆی منەوەو بەش بەش بوون خودا یەکی خستنەوە بەهۆی منەوە).[2] خودای مەزن فەرموویەتی: ﴿هُوَ الَّذِي أَيَّدَكَ بِنَصْرِهِ وَبِالْمُؤْمِنِينَ ﴿٦٢﴾ وَأَلَّفَ بَيْنَ قُلُوبِهِمْ لَوْ أَنفَقْتَ مَا فِي الْأَرْضِ جَمِيعًا مَّا أَلَّفْتَ بَيْنَ قُلُوبِهِمْ وَلَٰكِنَّ اللَّهَ أَلَّفَ بَيْنَهُمْ إِنَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾[3]، واتە: خوا ئەو زاتەیە کە بەهێزی کردیت بە یارمەتی خۆی وە بە بڕواداران، وە هۆگری خستە نێوان دڵەکانیان ئەگەر بەختت بکردایە هەرچی لە زەویدایە هۆگریت نەدەخستە نێوان دڵەکانیانەوە بەڵام خوا هۆگری خستە نێوانیان بەڕاستی هەر ئەو زاڵی کار دروستە. وە لە فەرمودەیەکا هاتوە: (خۆشەویستەکەت خۆش بوێ بە ئەندازەیەك شایەدا ڕۆژێك بێت کەڕقت لێی بێ. وە کینەت ببێ لەو کەسەی کە ڕقت لێیەتی بە ئەندازەیەك. شایەدا کە ڕۆژێك بێت خۆشت بوێت)[4] وە ئەفەرموێت: ﴿وَاللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ واتە: لە خوانەناسان خۆش ببێ وەختێ پەشیمان بونەوە لە خوانەناسیو گەڕانەوە بۆلای پەروەرندەیانو سەریان دانەواند بۆ خودا کە دەبوریێو دلۆڤانە. بۆ هەموو کەسێ کە گەڕاوەتەوە بۆلای لە هەر تاوانێ کردبێتی.

## دروستە چاکەکردن دەربارەی ئەو خوا نەناسانەی کە جەنگ ناکەن لەسەر ئاین

خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿لَّا يَنْهَاكُمُ اللَّهُ عَنِ الَّذِينَ لَمْ يُقَاتِلُوكُمْ فِي الدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُم مِّن دِيَارِكُمْ أَن تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوا إِلَيْهِمْ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ﴾ خودا بەرتان لێ ناگرێ کە ئێوە لەگەڵ ئەوانەی بەگژ ئێوەدا نەچوونو لە زێد وەدەریان نەناون، چاکەیان دەربارە بکەنو بە یەکسانی ڕەفتاریان لەگەڵدا بکەن. خوا مرۆڤی دادپەروەری خۆش دەوێت. واتە: ئەوانەی کە هاوکاریان نەکردوە لە وەدەرنانتان لە زێدی بابو باپیرانتان. واتە: خودا ڕێتان لێ ناگرێ کە چاکە لەگەڵ ئەو بێدینانەدا بکەن کە لەسەر ئاین شەڕیان لەگەڵتان نەکردوە وەك ژنانو ئەوانەی کە توانای شەڕیان نیە. ﴿أَن تَبَرُّوهُمْ﴾ واتە: چاکەیان

---

[1] آل عمران (١٠٣).

[2] فتح الباري (٦٤٤/٧).

[3] الانفال (٦٢-٦٣).

[4] تحفة الاحوذي (١٣٣/٦)، فەرموودەیەکی غەریبە.

لەگەڵ بکەن ﴿وَتُقۡسِطُوٓاْ إِلَيۡهِمۡ﴾ واتە: دادپەروەرو بە ئینساف بن لەگەڵیان. ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُقۡسِطِينَ﴾ ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە ئەسمای کچی ئەبوەکرەوە (ڕەزای خوایان لێ بێ) ئەسما دەڵێت: دایکم هات کە بتپەرست بوو لە کاتێکدا کە قورەیش پەیمانیان هەبوو لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) هاتم بۆلای پێغەمبەر(ﷺ) ووتم ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) دایکم هاتوە پێی خۆشە چاوم پێی بکەوێ بڕۆم بۆلای؟ فەرمووی: (بەڵێ سەر لە دایکت بدە).[1] بوخاری‌و موسلمیش هێناویانە[2] وە ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە عبدالله ی کوڕی زوبەیرەوە دەڵێت: قەتیلە هات بۆلای ئەسمای کچی ئەبوبەکر هەندێ هەدیەی بۆ هێنا بوو کە بریتی بوو لە هیزەی ڕۆن‌و شیری وشك‌و ڕۆن. بت پەرست بوو ئەسما هەدیەکەی لێ وەرنەگرت‌و نەیهێشت بچێتە ماڵی، عائیشە پرسیاری کرد لە پێغەمبەر(ﷺ) خوای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە ﴿لَّا يَنۡهَىٰكُمُ ٱللَّهُ عَنِ ٱلَّذِينَ لَمۡ يُقَٰتِلُوكُمۡ فِي ٱلدِّينِ﴾ هەتا کۆتایی ئایەتەکە. فەرمانی پێ کرد کە هەدیەکەی وەربگرێت‌و بیباتە ماڵەکەی.[3] وە ئەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُقۡسِطِينَ﴾ لە سورەتی (الحجرات)دا لە پێشەوە مانای کراوە. وە لە فەرموودەی سەحیحا هاتوە ئەو کەسانە بە یەکسانی ڕەفتار دەکەن وان لەسەر شوێنانێکی بەرز لە ڕوناکی لەلای ڕاستی عەرشەوە. ئەوانەن کە دادپەروەرن لە بڕیاریاندا لەناو کەس‌و کارو لەناو ئەوانەشدا کە سەرپەرشتیان دەکەن[4].

## ڕێگە نەدان بە دۆستایەتی ئەوانەی کە شەڕ لەگەڵ موسوڵمانان دەکەن لە بتپەرستەکان

خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿إِنَّمَا يَنۡهَىٰكُمُ ٱللَّهُ عَنِ ٱلَّذِينَ قَٰتَلُوكُمۡ فِي ٱلدِّينِ وَأَخۡرَجُوكُم مِّن دِيَٰرِكُمۡ وَظَٰهَرُواْ عَلَىٰٓ إِخۡرَاجِكُمۡ أَن تَوَلَّوۡهُمۡۚ وَمَن يَتَوَلَّهُمۡ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ﴾ تەنیا هەر ڕێگەتان نادا لەگەڵ ئەوانە ببنە دۆست کە لەسەر دین، شەڕیان لەگەڵتانا کردو ئێوەیان لە زێدی خۆتان ئاوارەکرد، لەسەر دەرکردنی ئێوەش، بوونە پشتیوانی یەکتر. هەر کەسیش ببێتە دۆستیان دیارە غەدر لە خۆی دەکات. واتە: خودا ڕێگەتان نادا کە دۆستایەتی ئەو کەسانە بکەن دوژمنتانن‌و شەڕیان لەگەڵ کردوون‌و لە زێدی خۆتان وەدەریان ناون‌و یارمەتی یەکتریان داوە لەسەر دەرکردنتان. وە فەرمانتان پێ دەکا کە دژایەتیان بکەن. پاشان ئەو هەڕەشەیە دووبارە دەکاتەوە کە نابێ دۆستایەتیان بکەن‌و فەرموویەتی: ﴿وَمَن يَتَوَلَّهُمۡ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ﴾ دیارە ئەوانە ناهەقی‌و غەدر لە خۆیان ئەکەن. وەك ئەم ئایەتە کە ئەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ

---

[1] احمد (٦/٣٤٤)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[2] فتح الباري (٥/٢٧٥)، مسلم (٢/٦٩٦).

[3] احمد (٤/٤)، ئەم فەرمودەیە حاکم بە سەحیحی داناوە زەهەبیش پشتگیری دەکات.

[4] مسلم (٣/١٤٥٨).

ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ ٱلْيَهُودَ وَٱلنَّصَٰرَىٰٓ أَوْلِيَآءَ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍ وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمْ فَإِنَّهُۥ مِنْهُمْ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾[1]، واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە جولەکەو گاور مەکەن بە پشتیوانو خۆشەویستی خۆتان ئەوانە هەندێکیان دۆستی یەکترن ئەوەتان ئەوان بکات بە پشتیوانو دۆست ئەوە بەڕاستی ئەو کەسە لەوانە بێگومان خوا ڕێنمونی گەلی ستەمکاران ناکات.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا جَآءَكُمُ ٱلْمُؤْمِنَٰتُ مُهَٰجِرَٰتٍ فَٱمْتَحِنُوهُنَّ ٱللَّهُ أَعْلَمُ بِإِيمَٰنِهِنَّ فَإِنْ عَلِمْتُمُوهُنَّ مُؤْمِنَٰتٍ فَلَا تَرْجِعُوهُنَّ إِلَى ٱلْكُفَّارِ لَا هُنَّ حِلٌّ لَّهُمْ وَلَا هُمْ يَحِلُّونَ لَهُنَّ وَءَاتُوهُم مَّآ أَنفَقُواْ وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ أَن تَنكِحُوهُنَّ إِذَآ ءَاتَيْتُمُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ وَلَا تُمْسِكُواْ بِعِصَمِ ٱلْكَوَافِرِ وَسْـَٔلُواْ مَآ أَنفَقْتُمْ وَلْيَسْـَٔلُواْ مَآ أَنفَقُواْ ذَٰلِكُمْ حُكْمُ ٱللَّهِ يَحْكُمُ بَيْنَكُمْ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿١٠﴾ وَإِن فَاتَكُمْ شَىْءٌ مِّنْ أَزْوَٰجِكُمْ إِلَى ٱلْكُفَّارِ فَعَاقَبْتُمْ فَـَٔاتُواْ ٱلَّذِينَ ذَهَبَتْ أَزْوَٰجُهُم مِّثْلَ مَآ أَنفَقُواْ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِىٓ أَنتُم بِهِۦ مُؤْمِنُونَ ﴿١١﴾ ﴾

## هێشتنەوەو نەناردنەوەی ژنانی موسوڵمان بۆلای خوانەناسان ئەگەر دوای پەیمان نامەی حودەیبیە (الحديبية) کۆچیان کرد

لە پێشەوە لە سورەتی فەتحدا (الفتح) باسی پەیمان نامەی حودەیبیە (صلح الحديبية) کرا کە لە نێوان پێغەمبەری خوداو (ﷺ) خوانەناسەکانی قورەیشا بەسترا کە تێیدا هاتبوو: هیچ پیاوێك لەلای ئێمە نایەت با لەسەر دینی تۆش بێ مەگین ئەبێ بۆمان بگێڕیتەوە. وە لە ڕیوایەتێکی ترا هاتوە کە: هیچ کەسێك لەلای ئێمەوە نایەت لەسەر دینی تۆش بێ مەگین ئەبێ بۆمان بگێڕیتەوە. ئەمە قسەی عروەو زەححاكو عبدالرحمانی کوڕی زەیدو زوهەیری موقاتلی کوڕی ئیبنوحیانو سودیە. بەپێی ئەم ڕیوایەتە ئەم ئایەتە تایبەتە بەو ساڵە. وە بە ڕای هەندێ لە زانایانی سەلەف هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە هەڵوەشێنەرەوەی (ناسخة) ئەو پەیماننامەیە. چونکە خوای گەورە فەرمانی دا بە بەندە خاوەن باوەڕەکان ئەگەر ژنی بە باوەڕی ئاوارە دەگاتە لاتان تاقیان بکەنەوە خوا لە بیرو باوەڕیان ئاگادارترە. گەر ناسیتانن بەڕاستی باوەڕدارن بۆلای خودانەناسانیان مەنێرنەوە نە ئەمان بەوان دەشێنو نە ئەوانیش بەمان دەشێن. وە لە ژیانی عبدالله ی کوڕی ئەبوئەحمدی کوڕی جەحشدا لە موسنەدی گەورەدا باسمان کرد لە عبدالله ی کوڕی ئەبوئەحمدەوە دەڵێت: ئوموکەلسومی کچی عوقبەی کوڕی ئەبی مەعیت کۆچی کرد کاتێ موسوڵمانان کۆچیان کرد دوو برای کە ناویان عومارەو وەلید بوو چوون بە شوێنیا. ڕۆشتنە خزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) قسەیان لەگەڵ کرد بۆ ئەوەی بینێرێتەوە لەگەڵیان، خوای گەورە ئەو پەیمانەی هەڵوەشاندەوە کە لەنێوان پێغەمبەرو (ﷺ) بت

[1] المائدة (٥١).

پەرستەکانا بەسترا بوو خوای گەورە ئایەتەکانی تاقیکردنەوەی ناردە خوارەوە.[1] خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا جَآءَكُمُ ٱلْمُؤْمِنَٰتُ مُهَٰجِرَٰتٍ فَٱمْتَحِنُوهُنَّ ٱللَّهُ أَعْلَمُ بِإِيمَٰنِهِنَّ فَإِنْ عَلِمْتُمُوهُنَّ مُؤْمِنَٰتٍ فَلَا تَرْجِعُوهُنَّ إِلَى ٱلْكُفَّارِ لَا هُنَّ حِلٌّ لَّهُمْ وَلَا هُمْ يَحِلُّونَ لَهُنَّ وَءَاتُوهُم مَّآ أَنفَقُواْ وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ أَن تَنكِحُوهُنَّ إِذَآ ءَاتَيْتُمُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ وَلَا تُمْسِكُواْ بِعِصَمِ ٱلْكَوَافِرِ وَسْـَٔلُواْ مَآ أَنفَقْتُمْ وَلْيَسْـَٔلُواْ مَآ أَنفَقُواْ ذَٰلِكُمْ حُكْمُ ٱللَّهِ يَحْكُمُ بَيْنَكُمْ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾ ئەی گەلی خاوەن باوەڕان ئەگەر ژنێ بە باوەڕی، تەواوەوە دەگاتە لاتان بیانخەنە بەر ئەزموونەوە خوا لە بیرو باوەڕیان ئاگادارترە گەر ناسیتانن بەڕاستی بڕوادارن، بۆلای خودا نەناسانیان مەنێرنەوە. نە ئەمان بەوان دەشێن و نە ئەوانیش بەمان دەشێن. هەرچیش بەختیان کردوە، بیاندەنەوە. گەر ئێوە مارەیان کەن و مارەییەکەیان بدەنێ،هیچ گوناهێکتان ناگاتێ. ژنانی خودانەناسانیش لای خۆتان گل مەدەنەوە. هەرچیشتان لێ بەخت کردووەن بیسێننەوە، با ئەوانیش هەرچێکی بەختیان کردوە داوای بکەن. ئەمە دەستوری خودایە کە بە نێوانتان ڕادەگات. خودا زانای لەکارزانە. عەوفی دەڵێت لە ئیبنو عەباسەوە لەم ئایەتەدا: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا جَآءَكُمُ ٱلْمُؤْمِنَٰتُ مُهَٰجِرَٰتٍ فَٱمْتَحِنُوهُنَّ﴾ تاقیکردنەوەکەشتان بریتی بووە لە (اشهد ان لا اله الا الله و ان محمداً رسول الله).

موجاهد دەڵێت: ﴿فَٱمْتَحِنُوهُنَّ﴾ پرسیاریان لێ بکەن چی وای لێ کردوون کۆچیان کردوە ئەگەر ڕقیان لە مێردەکانیان هەڵسابێ و لە قینی ئەوان ڕایان کردبێ یان هەر شتێکی تر وە خاوەن باوەڕ نەبوون بیان گێڕنەوە بۆلای مێردەکانیان[2] وە ئەفەرموێت: ﴿فَإِنْ عَلِمْتُمُوهُنَّ مُؤْمِنَٰتٍ فَلَا تَرْجِعُوهُنَّ إِلَى ٱلْكُفَّارِ﴾ ئەم ئایەتەبەڵگەیە لەسەرئەوە کە تونای ئاگادار بوون هەیە لەسەر باوەڕی خەڵکی بەبێ گومان.

## ژنانی موسوڵمان ناشێن بۆ بتپەرست و ژنانی بتپەرستیش ناشێ بۆ خاوەنباوەڕان

خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿لَا هُنَّ حِلٌّ لَّهُمْ وَلَا هُمْ يَحِلُّونَ لَهُنَّ﴾ ئەم ئایەتە ژنی موسوڵمانی حەرام کرد بۆ بت پەرستان لە ئەوەڵی هاتنی ئاینی ئیسلاما بت پەرست ژنی خاوەن باوەڕی مارە ئەکرد بۆی ئەشیا. بۆیە ئەبوعاس کوڕی ڕەبیع زەینەبی کچی پێغەمبەری (ﷺ) مارە کرد، زەینەب موسوڵمان بوو، عاسیش بت پەرست بوو. کاتێ عاس (عاص) لە غەزای بەدرا بە دیلی کەوتە دەست موسوڵمانان زەینەبی خێزانی ملوانکەیەکی نارد لە بارتەقایا کە هی دایکی بوو (خەدیجە) کاتێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) چاوی پێی کەوت زۆر دڵی بۆی تەنگ بوو فەرمووی بە موسوڵمانان: (ئەگەر بە باشتان زانی

---

[1] جامع المسانيد (٢٤٣/٧)، فەرموودەیەکی مورسەلی لاوازە.

[2] الطبري (٣٢٦/٢٣).

دیلەکەی بۆ ئازاد کەن بۆی ئازاد کەن) بۆیان کرد پێغەمبەری خوایش ئازادی کرد بەمەرجێ کچەکەی بۆ ڕەوانە بکا. ئەویش بەڵێنەکەی بەجێ هێناو کچەکەی زەینەبی لەگەڵ زەیدی کوڕی حاریسە بۆ نارد (ڕەزای خوای لێ بێ)[1] زەینەب لە مەدینە مایەوە پاش غەزای بەدر. کە ساڵی دووەم بوو هەتا مێردەکەی عاسی کوڕی ڕەبیع لە ساڵی هەشتەما موسوڵمان بوو[2] بە نیکای پێشوو بۆی ناردەوەو مارەیی تازەی بۆ دانەناوە. وە ئەفەرموێت: ﴿وَءَاتُوهُم مَّآ أَنفَقُواْ﴾ واتە: هەرچیشتان مەسرەف کردوە لە مارەیی بیاندەنەوە. ئیبنوعەباس‌و موجاهدو قەتادەو زوهەری کەسانی تریش گوتویانە.[3] وە ئەفەرموێت: ﴿وَلَا جُنَاحَ عَلَيۡكُمۡ أَن تَنكِحُوهُنَّ إِذَآ ءَاتَيۡتُمُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ﴾ واتە: ئەگەر مارەیەیان کەوت مارەییەکەیان بدەنێ واتە: مارەیان بکەن بەو مەرجانەی کە بۆ مارە کردن دانراوە. لە تەواو بوونی ماوەی دیاریکراو خاوەنی ژنەکەو مەرجەکانی تری مارەبڕین هیچ گوناهێکتان ناگات. وە ئەفەرموێت: ﴿وَلَا تُمۡسِكُواْ بِعِصَمِ ٱلۡكَوَافِرِ﴾ ژنانی خوانەناسانیش لەلای خۆتان مەهێڵنەوە خوای گەورە حەرامی کردوە لەسەریەندە خاوەنباوەڕەکانی مارەکردن‌و درێژەدان بە هاوسەریەتی لەگەڵ ژنە خوانەناسەکان. لە فەرموودەی سەحیحا هاتوە لە میسوەرو مەروانی کوڕی حەکەمەوە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) وەختێ پەیمانی بەست لەگەڵ بتپەرستەکانی قورەیش. ژنە موسوڵمانەکان هاتن، خوای گەورە ئەمەی ناردە خوارەوە: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا جَآءَكُمُ ٱلۡمُؤۡمِنَٰتُ مُهَٰجِرَٰتٖ فَٱمۡتَحِنُوهُنَّۖ ٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِإِيمَٰنِهِنَّۖ فَإِنۡ عَلِمۡتُمُوهُنَّ مُؤۡمِنَٰتٖ فَلَا تَرۡجِعُوهُنَّ إِلَى ٱلۡكُفَّارِۖ لَا هُنَّ حِلّٞ لَّهُمۡ وَلَا هُمۡ يَحِلُّونَ لَهُنَّۖ وَءَاتُوهُم مَّآ أَنفَقُواْۚ وَلَا جُنَاحَ عَلَيۡكُمۡ أَن تَنكِحُوهُنَّ إِذَآ ءَاتَيۡتُمُوهُنَّ أُجُورَهُنَّۚ وَلَا تُمۡسِكُواْ بِعِصَمِ ٱلۡكَوَافِرِ﴾ عومەری کوڕی خەتاب ئەو ڕۆژە دوو ژنی خۆی تەڵاق دا یەکێکیان مەعاویەی کوڕی ئەبوسوفیان مارەی کردو ئەوی تریان سەفوانی کوڕی ئومەیە مارەی کرد.[4] ئیبنوسەور دەڵێت: لە موعەمەرەوە ئەویش لە زوهەریەوە ئەم ئایەتە کە هاتە خوار بۆ سەر پێغەمبەری خودا(ﷺ) کاتێ پەیمانی لەگەڵ ئەبەستن لە خواری حودەیبیەوە. کە ئەگەر کەسێکیان هات بۆلای پێغەمبەر(ﷺ) بیداتەوە پێیان وەختێ کە ژنان هاتن ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە خوای گەورە فەرمانی دا کە مارەییەکەیان بدەنەوە بە مێردەکانیان وە هەمان بڕیاریش بۆ بتپەرستەکان درا ئەگەر ژنێك لەناو موسوڵمانەکانەوە چووبۆلایان مارەییەکەی ڕەوانە بکەنەوە بۆ مێردەکەی‌و فەرمووی: ﴿وَلَا تُمۡسِكُواْ

---

[1] ابوداود (٣/١٤٠)، فەرموودەیەکی باشە (جید).

[2] الصحیح انه سنة ست قبل الحدیبیة و قبل نزول الایة.

[3] الطبري (٢٣/٣٢٨-٣٢٩).

[4] فتح الباري (٥/٣٩١).

بِعِصَمِ ٱلْكَوَافِرِ﴾[1] ژنی خوانەناسیش لای خۆتان مەهێڵنەوە. وە ئەفەرموێت: ﴿وَسْـَٔلُوا۟ مَآ أَنفَقْتُمْ وَلْيَسْـَٔلُوا۟ مَآ أَنفَقُوا۟﴾ واتە: هەرچیتان داوە بە ژنەکانتان داوای بکەنەوە ئەگەر چوونەوە بۆ لای خوانەناسەکان وە هەرچیش ئەوان داویانە بیاندەنەوە بە مێردەکانیان کاتێ کۆچیان کرد بۆلای موسوڵمانان. خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ذَٰلِكُمْ حُكْمُ ٱللَّهِ يَحْكُمُ بَيْنَكُمْ﴾ واتە: ئەمە دەستوورو فەرمانی خودایە لە نێوانتانا داویەتی، یانی لەو ڕێکەوتنەدا کە ژنی تێدا نیەو ژن جیا کراوەتەوە. وە ئەم بڕیارەش بڕیاری خودایە کاری پێ دەکا لەناو بەندەکانیا ﴿وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾ خودا زانای لە کارزانە خۆی دەزانێ چی ئەشێ‌و چاکە بۆ بەندەکانی. پاشان خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَإِن فَاتَكُمْ شَىْءٌ مِّنْ أَزْوَٰجِكُمْ إِلَى ٱلْكُفَّارِ فَعَاقَبْتُمْ فَـَٔاتُوا۟ ٱلَّذِينَ ذَهَبَتْ أَزْوَٰجُهُم مِّثْلَ مَآ أَنفَقُوا۟ ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ٱلَّذِىٓ أَنتُم بِهِۦ مُؤْمِنُونَ﴾ ئەگەر ژنێکیشتان ڕۆیی بۆلای خوانەناسەکان‌و ئێوە تۆڵەتان لێ سەندن. بەو کەسانە وا ژنەکانیان هەڵاتوون. هێندە بدەن کە داویانە ترسیشتان لەو خودایە بێ کە بڕواتان پێ هێناوە. موجاهدو قەتادە گوتیان: ئەمە بۆ ئەو خوانەناسانەیە کە پەیماننامە نەبوە لەگەڵیانا کاتێ ژنێك ڕای کرد بۆ لایان هیچ شتێکیان نەدابوو بە مێردەکەی. وە ئەگەر ژنێکیش ڕای کرد لەوان هیچ نادرێ بە مێردی ئەو ژنە هەتا بە ئەندازەی ئەوە کە ڕۆشتوە بۆ لای ئەوان سەرف نەکەن بۆی.[2] ئیبنوجەریر ڕیوایەتی کردوە لە زوهەریەوە دەڵێت: موسوڵمانەکان پابەند بوون بە بڕیاری خوای گەورەو ئەو مارەیەیەی کە خودا لەسەری دانان‌و سەرفیان کردبوو بۆ خێزانی خۆیان بۆ ئەوانیشیان بەخت کرد بەڵام بت پەرستەکان دانیان پێدا نەناو ئەوەی خودا داینا لەسەریان کە بیدەن بە موسوڵمانەکان بەجێیان نەهێنا. خوای مەزن لەو بارەیەوە بە خاوەن باوەڕانی فەرموو وە: ﴿وَإِن فَاتَكُمْ شَىْءٌ مِّنْ أَزْوَٰجِكُمْ إِلَى ٱلْكُفَّارِ فَعَاقَبْتُمْ فَـَٔاتُوا۟ ٱلَّذِينَ ذَهَبَتْ أَزْوَٰجُهُم مِّثْلَ مَآ أَنفَقُوا۟ ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ٱلَّذِىٓ أَنتُم بِهِۦ مُؤْمِنُونَ﴾ ئەگەر ژنی پیاوێکی موسوڵمان دوای هاتنی ئەم ئایەتە بڕۆشتایە بۆلای بت پەرستەکان موسوڵمانان ئەو نەفەقەیەی کە ئەو پیاوە سەرفی کردبوو بۆیان. ئەیگێڕایەوە لەو پاشماوەیەی لایان بوو کە فەرمان درا بوو بیدەنەوە بە بتپەرستەکان لەو بەختەی خۆیان ئەیاندا بە ژنەکانیان کە خاوەنباوەڕ بوون کۆچیان کردبوو. پاشان ئەوەی کە زیاد بوو ئەیان گێڕایەوە بۆ بتپەرستەکان ئەگەر بمایەتەوە، (والعَقِب) بریتیە لەو پاشماوەیەی کە لە مارەیی ژنانی بتپەرست دەمایەوە کاتێ کە باوەڕیان هێنابوو پاشان کۆچیان کردبوو[3].

---

[1] الطبري (٢٣/٣٢٩).

[2] الطبري (٢٣/٣٣٨).

[3] الطبري (٢٣/٣٣٧).

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِذَا جَآءَكَ ٱلۡمُؤۡمِنَٰتُ يُبَايِعۡنَكَ عَلَىٰٓ أَن لَّا يُشۡرِكۡنَ بِٱللَّهِ شَيۡـٔٗا وَلَا يَسۡرِقۡنَ وَلَا يَزۡنِينَ وَلَا يَقۡتُلۡنَ أَوۡلَٰدَهُنَّ وَلَا يَأۡتِينَ بِبُهۡتَٰنٖ يَفۡتَرِينَهُۥ بَيۡنَ أَيۡدِيهِنَّ وَأَرۡجُلِهِنَّ وَلَا يَعۡصِينَكَ فِي مَعۡرُوفٖ فَبَايِعۡهُنَّ وَٱسۡتَغۡفِرۡ لَهُنَّ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ١٢﴾

**ئەو شتانەی کە ژنان پەیمانیان لەسەر دەدا**

خودای مەز ئەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِذَا جَآءَكَ ٱلۡمُؤۡمِنَٰتُ يُبَايِعۡنَكَ عَلَىٰٓ أَن لَّا يُشۡرِكۡنَ بِٱللَّهِ شَيۡـٔٗا وَلَا يَسۡرِقۡنَ وَلَا يَزۡنِينَ وَلَا يَقۡتُلۡنَ أَوۡلَٰدَهُنَّ وَلَا يَأۡتِينَ بِبُهۡتَٰنٖ يَفۡتَرِينَهُۥ بَيۡنَ أَيۡدِيهِنَّ وَأَرۡجُلِهِنَّ وَلَا يَعۡصِينَكَ فِي مَعۡرُوفٖ فَبَايِعۡهُنَّ وَٱسۡتَغۡفِرۡ لَهُنَّ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ﴾ ئەی پێغەمبەر کاتێك ژنانی باوەڕدار دێنە لاتو پەیمان دەدەن هیچ شتێکی (لە خوا بەدەر) نەپەرستن‌و تووشی دزیی‌و بێ ئابڕوویی نەبن‌و منداڵی خۆیان نەکوژن‌و منداڵی تر بە درۆ نەکەنە منداڵ مێردەکانیان‌و بۆ کاری چاك لە فەرمانی تۆ دەرنەچن، ئەوسا کە تۆش پەیمانیان لەگەڵ ببەستەو لێ خۆشبوونیان بۆ لە خودا داوا بکە. خوا دەبورێ‌و دلۆڤانە. بوخاری ڕیوایەتی کردوە لە عائیشەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەوانەی کە کۆچیان ئەکرد لە ژنە خاوەن باوەڕەکان بەم ئایەتە تاقی ئەکردنەوە: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِذَا جَآءَكَ ٱلۡمُؤۡمِنَٰتُ يُبَايِعۡنَكَ﴾ هەتا ﴿غَفُورٞ رَّحِيمٞ﴾ عوروە دەڵێت: عائیشە دەڵێت: هەرکەسێ دانی بنایە بەم مەرجانەدا لە ژنە خاوەن باوەڕەکان. پێغەمبەر(ﷺ)پێی ئەفەرموو: پەیمانم لەگەڵ بەستووی بە گوفتار سوێند بە خوا هیچ کاتێ دەستی نەکەوتوە لە دەستی ئافرەت لە پەیمان داندا وە پەیمانی لێ وەرنەگرتوون مەگین فەرموویەتی: (پەیمانم لەگەڵ بەستن لەسەر ئەوە)[1] ئەمە قسەی بوخاریە. ئیمامی ئەحمد ڕیوایەتی کردوە لە ئومەیمەی کچی ڕەقیقەوە دەڵێت: لەگەڵ چەند ژنێك هاتم کە پەیمان بدەین بە پێغەمبەر(ﷺ) ئەو مەرجانەی لێ وەرگرتین کە لە قورئاندا هاتووە هاوەڵ بۆ خودا دانەنێین لە هیچ شتێکداو وە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (لەو شتانەی کە دەستەڵاتتان هەیەو دەتوانن پێی هەڵسن.) گوتمان: خوداو پێغەمبەری خودا بە بەزەیی ترە لە نەفسی خۆمان. گوتمان ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) تەوقەمان لەگەڵ ناکەی فەرمووی: (من دەست ناخەمە نێو دەستی ژنان قسە کردنیشم بۆ یەك ئافرەت وەك قسە کردنم بۆ سەد ئافرەت وایە)[2] ئەم فەرموودەیە سەنەدەکانی ڕاستە. تیرمیزی‌و نەسائی‌و ئیبنوماجە

[1] فتح الباري (٨/٥٠٤).

[2] احمد (٦/٣٥٧)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

ڕیوایەتیان کردوە.[1] بوخاری ڕیوایەتی کردوە لە ئوم عەتیەوە دەڵێت: پەیمانمان دا بە پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەم ئایەتەی خوێند بەسەرماندا: ﴿أَن لَّا يُشْرِكْنَ بِاللَّهِ شَيْئًا﴾ وە لاواندنەوەی لێ قەدەغە کردن ژنێك دەستی قوچاو دەڵێت: فلانە ژن چاکەی لەگەڵ کردوم یانی گریاوە بۆ من ئەمەوێ هەقی بۆ بکەمەوە پێغەمبەری خوا (ﷺ) هیچ وەڵامێکی نەدایەوە. ڕۆشتە دەرەوەو پاشان هاتەوە پەیمانی دا بە پێغەمبەر(ﷺ)[2] موسلیمیش ڕیوایەتی کردوە.[3] ئیمامی ئەحمد ڕیوایەتی کردوە لە عوبادەی کوڕی سامتەوە دەڵێت: لە خزمەت پێغەمبەری خودا بووین (ﷺ) لە کۆمەڵێکدا فەرمووی: پەیمانم دەدەنێ کە لە هیچ شتێکدا هاوەڵ بۆ خودا دانەنێن‌و دزی‌و بەدڕەوشتی (زینا) نەکەن‌و منداڵی خۆتان نەکوژن‌و ئەو ئایەتەی خوێندەوە کە پەیمانی لە ژنان وەرگرتبوو ﴿إِذَا جَاءَكَ الْمُؤْمِنَاتُ﴾ هەرکەسێ لە ئێوە بەجێی بێنێ پاداشتەکەی لای خودایە. وە هەرکەسێ تووشی هەر یەکێ لەو تاوانانە بکاو سزا درا ئەو سزایە کفارەتە بۆی وە هەرکەسێ تووشی ئەو تاوانانە بوو خودا بۆی داپۆشی بەدەستی خۆیەتی. ئەگەر حەز بکات بۆی دەپۆشێ ئەگەر مەیلیشی لێ بوو سزای ئەدا.[4] لە هەردوو سەحیحەکەدا هێناویەتی.[5] وە ئەم فەرموودەی خوایە کە ئەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِذَا جَاءَكَ الْمُؤْمِنَاتُ يُبَايِعْنَكَ﴾ واتە: هەر ژنێك هات بۆ لات پەیمانی دایتێ بەم مەرجانە پەیمانی لێ وەرگرە ﴿عَلَىٰ أَن لَّا يُشْرِكْنَ بِاللَّهِ شَيْئًا وَلَا يَسْرِقْنَ﴾ ماڵی خەڵکی نەدارن. بەڵام ئەگەر پیاوێك هەقی ژنەکەی نەئەداو نەفەقەی بۆ سەرف نەئەکرد ئەو ژنە بۆی هەیە لە ماڵی مێردەکەی بخوا بەپێی پێویست‌و زیادەڕەوی نەکا وەك چۆن خەڵکی هەقی ژنی ئەدا بەپێی عورفی ئەو کاتە. با مێردەکەیشی ئاگادار نەبێ هیچ گوناهی ناگا بەپێی فەرموودەکەی هیندی کچی عوتبە کە دەڵێت: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەبوسوفیان پیاوێکە زۆر پیسکەیە (ئەوەندە مەسرەفم بۆ ناکا کە بەشی خۆم‌و منداڵەکانم بکات) ئاخۆ گوناهم ئەگات ئەگەر لە ماڵەکەی ببەم‌و سەرفی بکەم بەبێ ئاگاداری ئەو؟ پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (لە ماڵەکەی سەرف بکە بە چاکی‌و بەپێی پێویستی خۆت‌و منداڵەکانت) لە هەردوو سەحیحەکەدا هێناویەتی.[6] وە ئەمە کە

---

[1] تحفة الاحوذي (٥/٢٢٠)، النسائي (٧/١٤٩)، النسائي في الكبرى (٦/٤٨٨)، ابن ماجة (٢/٩٥٩)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[2] فتح الباري (٨/٥٠٦).

[3] مسلم (٢/٦٤٩).

[4] احمد (٥/٣١٤)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[5] فتح الباري (٨/٥٠٦)، مسلم (٣/١٣٣٣).

[6] فتح الباري (١٣/١٨٣)، مسلم (٣/١٣٣٨).

ئەفەرموێت: ﴿وَلَا يَزْنِينَ﴾ وەك ئەم ئایەتە وایە کە ئەفەرموێت: ﴿تَقْرَبُوا۟ ٱلزِّنَىٰٓ إِنَّهُۥ كَانَ فَٰحِشَةً وَسَآءَ سَبِيلًا﴾[1]، واتە: وە نزیکی زیناش مەکەونەوە بەڕاستی ئەوە کردوەیەکی زۆر ناشیرینو ڕێگەیەکی پیسو خراپە. وە لە فەرمودەکەی سەمرەدا (سمرة) باسی تۆڵەی داوێن پیسانی کردوە بە سزای بە ژان لەناو ئاگری جەهەنمدا.[2] وە ئیمامی ئەحمد ڕیوایەتی کردوە لە عائیشەوە دەڵێت: فاتمەی (فاطمة) کچی عوتبە (عتبة) هات پەیمان بدات بە پێغەمبەر(ﷺ) ئەم مەرجانەی لەسەر دانا ﴿أَن لَّا يُشْرِكْنَ بِٱللَّهِ شَيْـًٔا وَلَا يَسْرِقْنَ وَلَا يَزْنِينَ﴾ دەڵێت: دەستی نایە سەر سەری لە شەرمانا، کە ئەوەی لێ بینی سەرنجی ڕاکێشا. عائیشە دەڵێت: بیخوێنەرەوە ئەی ژنەکە، سوێند بە خوا ئێمەیش بەو شێوەیە نەبێ پەیمانمان نەداوە (یانی ئێمەیش هەر بەو شێوەیە پەیمانمان داوە) ئەمیش دەڵێت: بەڵێو پەیمانی دا بەپێی ئەو ئایەتە[3] وە ئەفەرموێت: ﴿وَلَا يَقْتُلْنَ أَوْلَٰدَهُنَّ﴾ ئەمە ئەوانە دەگرێتەوە کە منداڵی خۆیان پاش ئەوەی پەیدا ئەبێ دەیانکوشت وەك لە کاتی نەفامیا خەڵکی منداڵی خۆی ئەکوشت لەبەر هەژاری وە ئەوانەش دەگرێتەوە کاتێ لە سکی دایکا کە جەنینە (جنین) لەناوی دەبەن. وەك هەندێ لە ئافرەتی نەفام منداڵ فڕێ دەدەن بۆ ئەوەی سکی پڕ نەبێ لەبەر مەبەستێکی خراپو جێی گومان. وە ئەفەرموێت: ﴿وَلَا يَأْتِينَ بِبُهْتَٰنٍ يَفْتَرِينَهُۥ بَيْنَ أَيْدِيهِنَّ وَأَرْجُلِهِنَّ﴾ ئیبنوعەباس دەڵێت: واتە: کوڕی خۆیان نەبێ کوڕی کەسی تر نەکەن بە کوڕی مێردیان[4] موقاتلیش هەر وای گوتوە وە ئەفەرموێت: ﴿وَلَا يَعْصِينَكَ فِى مَعْرُوفٍ﴾ واتە: ئەوەی تۆ فەرمانت پێ کردوون لە چاکە بیکەنو واز بێنن لەو خراپانەی کە پێت گوتوون وازی لێ بێنن. بوخاری ڕیوایەتی کردوە لە ئیبنوعەباسەوە لەم فەرمودەی خوادا ﴿وَلَا يَعْصِينَكَ فِى مَعْرُوفٍ﴾ دەڵێت: ئەمە ئەو مەرجەیە کە خوای گەورە دایناوە لەسەر ژنان[5] مەیمونی کوڕی مەهران دەڵێت: خوای گەورە گوێ ڕایەڵی دانەناوە بۆ پێغەمبەرەکەی (ﷺ) لە چاکە دا نەبێ وە چاکەکردنیش گوێ ڕایەڵیە.[6] ئیبنوزەید دەڵێت: خودا فەرمانی داوە بە گوێ ڕایەڵی

---

[1] الاسراء (٣٢).

[2] احمد (٩/٥)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[3] احمد (١٥١/٦)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[4] الطبري (٣٤٠/٢٣).

[5] فتح الباري (٥٠٦/٨).

[6] القرطبي (٧٣/١٨).

پێغەمبەرەکەی (ﷺ) کە ئەو چاکترین خەڵکی خودایە لە چاکەدا.[1] وە ئیبنوجەریر ڕیوایەتی کردوە لە ئوموعەتیەی ئەنساریەوە دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) مەرجی لەسەرمان دانا، کاتێ کە پەیمانمان دایە لەسەر چاکە کە هاوار نەکەین لەسەر مردوو (نەی لاوێنینەو) ژنێك لە بەنی فلان دەڵێت: بنەماڵەی فلانە کەس هاتوون بە دەمی ئێمەوە (دڵیان داوینەتەوە) پەیمان نادەم هەتا پاداشتیان نەدەمەوە ڕۆشتە دەرەوەو دڵی نەداوەو پاشان هاتەوەو پەیمانی دا. دەڵێت: هیچ کەس پاداشتی نەدایەوە ئەو نەبێو ئوموسولیمی کچی مەلحان نەبێ کە دایکی ئەنەسی کوڕی مالکە.[2] بوخاری ئەم فەرموودەی ڕیوایەت کردوە لە ڕێگەی حەفسەی کچی سیرین لە ئوموعەتیەوە نوسەیبەی ئەنساری[3] ئینوئەبی حاتم ڕیوایەتی کردوە لە ئەسیدی کوڕی ئەبو ئوسەیدی بەرادەوە لەو ژنانەی کە پەیمانیان داوو دەڵێت: ئەوەی کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) پەیمانی لەسەر وەرگرتین کە لە چاکە کردنا بێ گوێی نەکەن: دەموچاو نەڕوشێنینو (زامداری نەکەین) قژ نەڕنینو یەخە دانەدڕینو هاوار نەکەین.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَوَلَّوْاْ قَوۡمًا غَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِمۡ قَدۡ يَئِسُواْ مِنَ ٱلۡأٓخِرَةِ كَمَا يَئِسَ ٱلۡكُفَّارُ مِنۡ أَصۡحَٰبِ ٱلۡقُبُورِ ١٣﴾

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَوَلَّوْاْ قَوۡمًا غَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِمۡ قَدۡ يَئِسُواْ مِنَ ٱلۡأٓخِرَةِ كَمَا يَئِسَ ٱلۡكُفَّارُ مِنۡ أَصۡحَٰبِ ٱلۡقُبُورِ﴾ ئەی گەلی خاوەن باوەڕان! مەبنە دۆستی ئەو کەسانەی خودا غەزەبی لێ گرتوون، لە هاتنی ڕۆژی قیامەت نائومێد بوون، وەکوو خوانەناسەکان لە مردووەکانی گۆڕستان نائومێدن. خودای مەزن لە کۆتایی ئەم سورەتەدا ئەفەرموێت مەبنە دۆستی خوانەناسەکان وەك لە پێش سورەتەکەیشەوە فەرمووی وە ئەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَوَلَّوْاْ قَوۡمًا غَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِمۡ﴾ واتە: جولەکەو گاورەکانو خوانەناسەکانی تر کە خوا غەزەبی لێ گرتوونو لە بەزەیی خۆی بێ بەشی کردوون. وە شایەنی ئەو دەرکردنو بێ بەش بوونەن لەلای خوداوە. ئێوە چۆن دۆستایەتیان ئەکەنو دەیان کەنە هاوەڵو برادەری خۆتان. ئەوانە نائومێد بوون لە هاتنی ڕۆژی قیامەت واتە: لە پاداشتی ڕۆژی قیامەتو خۆشیەکانی لەلای خوای گەورە براوەتەوە. وە ئەفەرموێت: ﴿كَمَا يَئِسَ ٱلۡكُفَّارُ مِنۡ أَصۡحَٰبِ ٱلۡقُبُورِ﴾ دوو بۆچوون هەیە: یەکەم: چۆن خوانەناسە زیندووەکان نائومێد بوون لە خزمەکانیان لەناو گۆڕستان کە دوای ئەوەی کە مردوون جارێکی تر لەگەڵیان کۆ ببنەوە چونکە ئەوانە

[1] الطبري (٢٣/٣٤٥).

[2] الطبري (٢٣/٣٤٦).

[3] البخاري (٤٨٩٢).

نە باوەڕیان بە زیندووبونەوە هەیەو نە بە کۆبوونەوە. وە هیچ ئومێدێکیان بە باوەڕی خۆیان پێیان نەماوە. بۆچوونی دووهەم: یانی وەك ئەو خوانەناسانەی کە لە هەموو چاکەیەك نائومێد بوون لەناو گۆڕستانا. ئەعمەش دەڵێت لە ئەبی زوحاوە لە مەسروقەوە لە ئیبنومەسعودەوە ﴿كَمَا يَئِسَ ٱلْكُفَّارُ مِنْ أَصْحَٰبِ ٱلْقُبُورِ﴾ دەڵێت: وەك چۆن ئەم خوانەناسە کاتێ مرد نائومێد ئەبێ کە پاداشتو سزای خۆی ئەبینێو ئاگادار ئەبێ لێی. ئەمە قسەی موجاهدو عیکرمەو موقاتلو ئیبنوزەیدو کەلبیو مەنسورە[1] ئیبنوجەریریش ئەم ڕایەی هەڵبژاردووە (خوا لێی خۆش بێ)[2].

## تەفسیری سورەتی (الصف)

## لە مەدینە هاتووەتە خوارەوە

### ڕێزی سورەتی (الصف)

ئیمامی ئەحمد ڕیوایەتی کردوە لە عبدالله ی کوڕی سەلامەوە (سلام) دەڵێت: لەناو خۆماندا قسەمان ئەکرد. کە کێتان دێت بۆ لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) پرسیاری لێ بکات. کام کردار خۆشەویست ترە لای خودا. کەسێك لە ئێمە هەڵ نەسا. پێغەمبەری خودا(ﷺ) پیاوێکی نارد بە دواماناو کۆ بووینەوە ئەم سورەتەی خوێندەوە بەسەرمانا یانی سورەتی سەف (الصف) هەمووی.[3] وە هەر بەم شێوە یە ئیمامی ئەحمد ڕیوایەتی کردوە.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ۖ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿١﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لِمَ تَقُولُونَ مَا لَا تَفْعَلُونَ ﴿٢﴾ كَبُرَ مَقْتًا عِندَ ٱللَّهِ أَن تَقُولُوا۟ مَا لَا تَفْعَلُونَ ﴿٣﴾ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلَّذِينَ يُقَٰتِلُونَ فِى سَبِيلِهِۦ صَفًّا كَأَنَّهُم بُنْيَٰنٌ مَّرْصُوصٌ ﴿٤﴾﴾

### باسی خراپی قسەیەك کە کردەوەی بە دوادا نەیەت

خودای مەزن فەرموویەتی: ﴿سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ۖ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ﴾ هەر شتێکی لە ئاسمانانو زەمیندان، هەر پەسەندی خودا دەدەنو هەر ئەو خاوەن دەستەڵاتی لە کارزانە. لە پێشەوە قسەمان لەم ئایەتە کرد کە ئەفەرموێت: ﴿سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ۖ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ

---

[1] الطبري (٢٣/٣٤٨).

[2] الطبري (٢٣/٣٤٨).

[3] احمد (٥/٤٥٢)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

﴿الْحَكِيمُ﴾ چەند جارێك پێویست ناكات لێرەدا دووبارەی كەینەوە. وە ئەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لِمَ تَقُولُونَ مَا لَا تَفْعَلُونَ﴾ ئەی گەلی خاوەن باوەڕان! بۆ قسە دەكەن‌و كردوەی بە دووادا نیە. ناڕەزایی دەربڕینە لەو كەسانەی كە بەڵێن دەدەن یا قسە دەكەن‌و ئەو قسەو بەڵێنە بەجێ ناهێنن. بۆیە زانایانی پێشین ئەم ئایەتە دەكەنە بەڵگە لەسەر بەجێهێنانی بەڵێن ڕەهایی ئیتر ئەو بەڵێنە زیانی تیا بێ یا تێدا نەبێ. وە بەڵگەی تریشی لە فەرموودەكانی پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) هێناوە وەك لە هەردوو سەحیحەكە هاتوە كە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (نیشانەی دووڕوو سێ شتە كاتێ بەڵێنی دا بەجێی ناهێنی. وە كاتێ قسەی كرد درۆ دەكا. وە كاتێ كە ڕاسپاردەیەكی لابوو خەیانەتی لێ دەكات)[1] وە لە فەرموودەیەكی سەحیحی ترا هاتوە (چوار شت هەن هەر كەسێ تێیدا بێ دووڕوی تەواوە. وە هەركەسێ یەكێك لەو شتانەی تێدا بێ ئەوە ئەو كەسە نیشانەیەكی دووڕوی تێدایە هەتا وازی لێ دێنێ)[2] یەكێ لەوانە كە باسی كرد بەجێ نەهێنانی بەڵێن بوو، لەبەر ئەوە خوای گەورە ناڕەزایی خۆی دووبارە دەكاتەوە لێیان‌و ئەفەرموێت: ﴿كَبُرَ مَقْتًا عِنْدَ اللَّهِ أَنْ تَقُولُوا مَا لَا تَفْعَلُونَ﴾ خودا زۆر لەوە تووڕەیە كە ئێوە شتێك بڵێن‌و كردەوەی پێ نەكەن. ئیمامی ئەحمەدو ئەبوداود ڕیوایەتیان كردوە لە عبدالله ی كوڕی عامیری كوڕی ڕبیعەوە دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) هات بۆ لامان من منداڵ بووم ڕۆشتم بۆ ئەوەی لە دەرەوە یاری بكەم. دایكم دەڵێت: عبدالله وەرە بتدەمێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێی ووت: (دەت ویست چی پێ بدەیت؟) دایكم دەڵێت: خورما. پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (ئەگەر تۆ پێت نەدایە درۆیەكت لەسەر دەنوسرا).[3] موقاتلی كوڕی حەیان دەڵێت: موسوڵمانان گوتیان گەر دەمان زانی خۆشەویست ترین كردار لای خودا كامەیە پێی هەڵدەساین خودایش چاكترین كردارێ كە لەلای خۆی خۆشەویستە نیشانی دان‌و فەرمووی: ﴿إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الَّذِينَ يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِهِ صَفًّا كَأَنَّهُمْ بُنْيَانٌ مَرْصُوصٌ﴾ خودا ئەو كەسانەی خۆش دەوێ كە بۆ غەزا لەڕێی خودا، ڕیز دەبەستن، ئەڵێی دیواری قورقوشمن. بۆی ڕوون كردنەوەو تاقی كردنەوە لە غەزای ئوحدا پشتیان لە پێغەمبەر هەڵكردو (ﷺ) ڕایان كرد خودا ئەمەی لەسەر ئەوە ناردە خوارەوەو فەرموویەتی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لِمَ تَقُولُونَ مَا لَا تَفْعَلُونَ﴾ وە فەرموی

[1] فتح الباري (١١١/١)، و مسلم (٧٨/١).

[2] فتح الباري (١١١/١).

[3] احمد (٤٤٧/٣)، ابوداود (٢٦٥/٥)، فەرموودەیەكی حەسەنە.

خۆشەویستترینتان لای من کەسێکە کە غەزا بکات لە ڕێی منا.[1] وە هەندێ ئەڵێن لەبارەی جەنگەوە هاتوەتە خوارەوە. پیاوی وا هەیە دەڵێت من جەنگم کردوە کەچی جەنگیشی نەکردوە هی واش هەیە دەڵێت خەڵکم بریندار کردوە نەشی کردوە هی وای تریش هەیە دەڵێ داومە لە خەڵك لێشی نەداوە هەیشە دەڵێ خۆڕاگر بووم خۆڕاگریش نەبووە. قەتادەو زەحاك گوتیان: ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە بۆ سەرزەنشت کردنی ئەوانەی کە دەڵێن: جەنگاوینو خەڵکمان بریندار کردوەو لێمان داون ئەوەمان کردوە کەچی نەشیان کردوە. وە سەعیدی کوڕی جوبەیریش لەم ئایەتەدا کە ئەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلَّذِينَ يُقَـٰتِلُونَ فِى سَبِيلِهِۦ صَفًّا﴾ دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) جەنگی لەگەڵ دوژمن دەست پێ نەدەکرد هەتا ڕیزی نەکردنایە، وە ئەمە دەرسو فێرکردنە بۆ خاوەن باوەڕان[2] وە دەڵێت: خودا ئەفەرموێت: ﴿كَأَنَّهُم بُنْيَـٰنٌ مَّرْصُوصٌ﴾ واتە: پاڵیان داوە بەیەکەوە بە ڕیز لە جەنگا.موقاتلی کوڕی حەیان دەڵێت: شانیان بە شانی یەکەوەیە. وە ئیبنوعەباس لەم ئایەتەدا ﴿كَأَنَّهُم بُنْيَـٰنٌ مَّرْصُوصٌ﴾ دەڵێت: ڕاوەستاوەو وا ناڕوخێو پاڵیان داوە بەیەکەوە[3].

﴿وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِۦ يَـٰقَوْمِ لِمَ تُؤْذُونَنِى وَقَد تَّعْلَمُونَ أَنِّى رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيْكُمْ ۖ فَلَمَّا زَاغُوٓا۟ أَزَاغَ ٱللَّهُ قُلُوبَهُمْ ۚ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْفَـٰسِقِينَ ﴿٥﴾ وَإِذْ قَالَ عِيسَى ٱبْنُ مَرْيَمَ يَـٰبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ إِنِّى رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيْكُم مُّصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَىَّ مِنَ ٱلتَّوْرَىٰةِ وَمُبَشِّرًۢا بِرَسُولٍ يَأْتِى مِنۢ بَعْدِى ٱسْمُهُۥٓ أَحْمَدُ ۖ فَلَمَّا جَآءَهُم بِٱلْبَيِّنَـٰتِ قَالُوا۟ هَـٰذَا سِحْرٌ مُّبِينٌ ﴿٦﴾﴾

**موسا دەڵێت بە هۆزەکەی بۆچی ئازارم دەدەن ڕوویان لێ وەرگێڕا. خودایش دڵی ئەوانی وەرگێڕا**

خودای مەزن فەرموویەتی: ﴿وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِۦ يَـٰقَوْمِ لِمَ تُؤْذُونَنِى وَقَد تَّعْلَمُونَ أَنِّى رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيْكُمْ ۖ فَلَمَّا زَاغُوٓا۟ أَزَاغَ ٱللَّهُ قُلُوبَهُمْ ۚ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْفَـٰسِقِينَ﴾ کە مووسا بە هۆزەکەی خۆی گوت: کەسەکانم! بۆچیم ئازار دەدەن، سوور دەشزانن کە من پێغەمبەری خودام بۆ لای ئێوە؟ وەختێ ئەوان خۆیان لادا خوداش دڵی ئەوانی لادا. ئەوانەی لە ڕێ دەردەچن، خودا ڕێگەی بەرەو خۆیان نیشان نادات. خودای گەورە باسی بەندەو پێغەمبەرو هاوگفتی خۆی دەکا کە دەڵێت بە هۆزەکەی ﴿لِمَ تُؤْذُونَنِى وَقَد تَّعْلَمُونَ أَنِّى رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيْكُمْ﴾ واتە: بۆچی ئازارم ئەدەن وە ئێوە دەزانن کە من ڕاست دەکەمو بە پەیامێکەوە هاتوم بۆ لای ئێوە. ئەم ئایەتە دڵدانەوەیەکی پێغەمبەری

---

[1] الدر المنثور (٨/١٤٦).

[2] القرطبي (١٨/٨١).

[3] الدر المنثور (٨/١٤٧).

خودایە (ﷺ) لەو ئازارو ناڕەحەتیەی توشی بووە بە دەست هۆزەکەی‌و ئەو خەڵکەوە وە خوای گەورە فەرمانی پێ دەکات کە ئارامی ببێ، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (خودا لە موسی خۆش بێ زیاتر لەمە ئازار دراوەو خۆی گرتوە)[1] خوای گەورە قەدەغەی کردوە لە موسوڵمانان کە ئازاری پێغەمبەر(ﷺ) بدەن‌و دڵ گرانی بکەن. وەك خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَكُونُواْ كَٱلَّذِينَ ءَاذَوْاْ مُوسَىٰ فَبَرَّأَهُ ٱللَّهُ مِمَّا قَالُواْۚ وَكَانَ عِندَ ٱللَّهِ وَجِيهًا﴾[2]، واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە وەك ئەو کەسانە مەبن کە مووسایان ئازاردا (تۆمەتیان بۆ کرد) جا خوا مووسای پاك کردەوە لەوەی دەیان ووت (مووسا) لای خوا ڕێزو پلەی هەبوو. ﴿فَلَمَّا زَاغُوٓاْ أَزَاغَ ٱللَّهُ قُلُوبَهُمْ﴾ واتە: کاتێ لە ڕێگای ڕاستی لایاندا کە دەشیان زانی ڕاستە خودایش دڵی ئەوانی لادا لە ڕێگای ڕاست‌و گومان‌و دڵە ڕاوکەی خستە دڵیانەوەو ڕێیان لێ تێك چوو. وەك خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَنُقَلِّبُ أَفْـِٔدَتَهُمْ وَأَبْصَٰرَهُمْ كَمَا لَمْ يُؤْمِنُواْ بِهِۦٓ أَوَّلَ مَرَّةٍ وَنَذَرُهُمْ فِي طُغْيَٰنِهِمْ يَعْمَهُونَ﴾[3]، واتە: وە هەر کەسێك دژایەتی پێغەمبەر(ﷺ) بکات پاش ئەوەی کە ڕێبازی ڕاستی بۆ ڕوون بویەوەو شوێنی ڕێگایەکی تر بکەوێ بێجگە لە ڕێگای بڕواداران ڕووی وەردەگێڕین بۆ ئەو ڕێبازەی کە هەڵی بژاردوەو دەیخەینە دۆزەخ ئای چ پاشەڕۆژێکی خراپە. وە فەرموویەتی: ﴿وَمَن يُشَاقِقِ ٱلرَّسُولَ مِنۢ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُ ٱلْهُدَىٰ وَيَتَّبِعْ غَيْرَ سَبِيلِ ٱلْمُؤْمِنِينَ نُوَلِّهِۦ مَا تَوَلَّىٰ وَنُصْلِهِۦ جَهَنَّمَۖ وَسَآءَتْ مَصِيرًا﴾[4]، واتە: وە (کاتی هاتنی موعجیزەکان) دڵ‌و چاویان وەردەگێڕین‌و لادەدەین (لە باوەڕ هێنان) هەروەك لە سەرەتاوە بڕوایان بە قورئان نەهێناوە لێیان دەگەڕێین لە سەرکەشی خۆیاندا هەر سەرگەردان بن. بۆیە خوای گەورە لەم ئایەتەدا فەرموویەتی:

﴿وَٱللَّهُ لَا يَهْدِي ٱلْقَوْمَ ٱلْفَٰسِقِينَ﴾ خودا ڕێگا نیشانی لە ڕێ لادەران نادا.

**مژدەی عیسا بە هاتنی پێغەمبەر(ﷺ) بە ناوی ئەحمد**

خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَإِذْ قَالَ عِيسَى ٱبْنُ مَرْيَمَ يَٰبَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ إِنِّي رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيْكُم مُّصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيَّ مِنَ ٱلتَّوْرَىٰةِ وَمُبَشِّرًۢا بِرَسُولٍ يَأْتِي مِنۢ بَعْدِي ٱسْمُهُۥٓ أَحْمَدُۖ فَلَمَّا جَآءَهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ قَالُواْ هَٰذَا سِحْرٌ مُّبِينٌ﴾ کە عیسای کوڕی مەریەمیش دەڵێت: ئەی بەرەی ئیسرائیل! ئەمن پێغەمبەری خودام بۆ لای ئێوە. ئەو تەوراتە

---

[1] فتح الباري (٧/٦٥٢).

[2] الاحزاب (٦٩).

[3] الانعام (١١٠).

[4] النساء (١١٥).

دەسەلمێنم کە لە پێش مندا هاتوە، مژدەتان لێ بێ پێغەمبەرێك لە پاش من دێ وە ناوی ئەحمەدە. وەختێ بە چەند نیشانەی دیاری دەرەوە هاتە لایان، گوتیان: ئەمە هەر بە ئاشکرا جادوە. واتە: تەورات مژدەی دا بە هاتنی من. وە من ئەو ڕاستیەم سەلماند کە تەورات هەواڵی پێدا. وە منیش مژدە دەدەم بەوانەی دوای خۆم کە ئەحمد ئەو پێغەمبەرە مورسەلە نەخوێندەوارە عەرەبەیە کە خەڵکی مەکەیە. وە ئەو عیسایە کە دواین پێغەمبەری بەرەی ئیسرائیلە. لەناو کۆمەڵێ لە بەرەی ئیسرائیلا هەڵساو مژدەی هاتنی محمدی (ﷺ) دانێ کە ئەو ئەحمدەیە کە خاتەمی هەموو پێغەمبەرانە (علیهم السلام) دوای ئەو هیچ پێغەمبەرێكو هیچ پەیامێك نایەت. چەند جوانە ئەو فەرموودەیەی کە بوخاری هێناویەتیو ڕیوایەتی کردوە لەم بارەیەوە لە جوبێر کوڕی موتعیمەوە کە دەڵێت: بیستم لە پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) ئەی فەرموو: (من چەند ناوێکم هەیە. من محمدم وە من ئەحمدمو من لەناوبەرم ئەو لەناوبەرەی کە خودای گەورە بێ دینی پێ لەناو دەبا. وە من کۆکەرەوەم ئەو کۆکەرەوەی کە خەڵکی لەبەر پێما کۆدەکرێتەوە. وە من دواین پێغەمبەرم)[1] موسلمیش ڕیوایەتی کردوە هەر بەو شێوەیە[2] محمدی کوڕی ئیسحاق ڕیوایەتی کردوە لە خالدی کوڕی مەعدانەوە (معدان) ئەویش لە هاوەڵەکانی پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) کە ووتویانە: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) باسی خۆتمان بۆ بکە فەرمووی: (بانگەوازی باوکم ئیبراهیمو موژدەی عیساو دایکشم کاتێ من لە سکیا بووم لە خەویا وەك ئەوەی کە ڕوناکیەکی لێ دەرچووە کۆشکەکانی بوسرای بۆ ڕۆشن بوەتەوە لەسەر زەمینی شاما).[3] ئەم فەرموودەیە سەنەدەکانی باشنو فەرموودەی کە لەم بارەیەوە بە شێوازی تر هاتوە. ئیمامی ئەحمد ڕیوایەتی کردوە لە عیربازی کوڕی ساریەوە دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فورموویەتی: (من لەلای خودا دواین پێغەمبەر بووم کە ئادەم لە قوڕەکەیدا وشك بووەوە وە هەواڵتان ئەدەمێ بە دەست پێکردنی ئەوە. بانگەوازی باوکم ئیبراهیمو مژدەدانی عیسا بە هاتنمو ئەو خەوەی دایکم کە بینیو هەروەها خەو بینینی دایکی پێغەمبەران (علیهم السلام)).[4] ئیمامی ئەحمد دیسان ڕیوایەتی کردوە لە ئەبی ئومامەوە دەڵێت: ووتم: ئەی پێغەمبەری خودا ئەوەڵی ئەم بانگەوازەی تۆ کەی بوو. فەرمووی: (لە بانگەوازی باوکمەوە ئیبراهیمو مژدەی عیساو وە دایکم خەوی بینی لە ڕووناکیەك دەرچوو لێی کۆشکەکانی شام ڕۆشن بوەوە بۆی)[5] واتە: بۆ ئەو نورە. وە هەر ئیمامی ئەحمد ڕیوایەتی کردوە لە

---

[1] فتح الباري (٥٠٩/٨).

[2] مسلم (١٨٢٨/٤).

[3] ابن هشام (١٧٥/١)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[4] احمد (١٢٧/٤)، فەرموودەیەکی سەحیحە جگە لە کۆتاییەکەی.

[5] احمد (٢٦٢/٥).

عبدالله کوڕی مەسعودەوە دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) ناردینی بۆ لای نەجاشی‌و ئێمە نزیکی هەشتا پیاو بووین لەوانە عبدالله ی کوڕی مەسعودو جەعفەرو عبدالله ی کوڕی عورفەتەو عوسمانی کوڕی مەزعون و ئەبوموسا چوینە لای نەجاشی. قورەیشیەکان عەمری کوڕی عاس‌و عەمارەی کوڕی وەلیدیان نارد بە هەدیەیەکەوە کاتێ چوونە لای نەجاشی سوژدەیان بۆ برد پاشان چوونە لای ڕاست‌و چەپی‌و پێیان گوت: هەندێ لە ئامۆزاکانمان هاتونەتە سەر زەمینی تۆ وە وازیان لە ئێمەو ئاینەکەیشیان هێناوە. نەجاشی دەڵێت: ئەوانە لە کوێن؟ گوتیان: وان لە وڵاتی تۆ، ناردی بە شوێنیانا. جەعفەر دەڵێت بە هاوەڵەکانی ئەمڕۆ من وتار بێژی ئێوەم (من قسە ئەکەم) لەگەڵ جەعفەر ڕۆشتن‌و سەلامی کردو سوژدەی نەبرد. پێیان گوت: بۆچی سەژدە نابەی بۆ پاشا. جەعفەر دەڵێت: ئێمە سوژدە نابەین مەگین بۆ خوای گەورە نەبێ. دەڵێت: ئەو خوایە کێیە؟ دەڵێت: ئەو خودایە پێغەمبەرێکی بۆ ناردوین. فەرمانی پێکردووین کە سوژدە بۆ کەس نەبەین بۆ خودای گەورە نەبێ. وە فەرمانی پێ کردووین کە نوێژ بکەین‌و زەکات بدەین. عەمری کوڕی عاس دەڵێت: ئەوانە بۆچونیان جیاوازە لەگەڵ تۆ لەبارەی عیسای کوڕی مەریەمەوە. نەجاشی دەڵێت: چی ئەڵێن لەبارەی عیسای کوڕی مەریەم‌و دایکیەوە. جەعفەر دەڵێت: ئێمە ئەڵێین، کەلیمەو ڕوحی خودایە داویەتی بەسەر مەریەما (کچ بووەو مێردی نەبوە) ئەو مەریەمەی کە مرۆڤ نزیکی نەبوەتەوەو منداڵیشی بووە. دەڵێت: دارێکی بچوکی بەرز کردوە لە زەوی پاشان دەڵێت: ئەی خەڵکی حەبەشەو قەشەو ڕاهیب‌و مەسیحیەکان سوێند بە خودا ئەوەی ئەوان ئەیڵێن بە ئەندازەی ئەم دارە بچووکە جیاوازی نیە لەگەڵ ئەوەی ئێمە باسی ئەکەین‌و ئەیڵێین. سڵاوتان لێ بێ وە سڵاو لەو کەسەیش بێت کە لە لایەوە هاتوون. وە من شایەتی دەدەم کە ئەوە پێغەمبەری خودایە. وە ئەو کەسەیە کە لە ئینجیلا چاومان پێی کەوتوە وە ئەو کەسەیە کە عیسای کوڕی مەریەم مژدەی پێداوە. وە لە هەر شوێنێك حەز ئەکەن دانیشن. سوێند بە خوا ئەگەر ئەم پاشایەتیە نەبوایە پێوەی سەرقاڵم دەهاتم بۆ خزمەتی هەتا بۆ ئەوەی من نەعلەکانی بۆ هەڵگرم‌و ئاوی دەست نوێژی بدەم. وە فەرمانی دا کە هەدیەی قورەیشیەکان بدەنەوە. بۆیان گەڕاندنەوە. پاشان عبدالله ی کوڕی مەسعود بەپەلە گەڕایەوە فریای غەزای بەدر کەوت وە دەڵێت کاتێ هەواڵی مردنی گەیشت بە پێغەمبەر(ﷺ) داوای لێ خۆش بوونی بۆ کرد.[1] وە خوا ئەفەرموێت: ﴿فَلَمَّا جَآءَهُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِ قَالُواْ هَٰذَا سِحۡرٞ مُّبِينٞ﴾ ئیبنوجورەیج‌و ئیبنوجەریر دەڵێت: ﴿فَلَمَّا جَآءَهُم﴾ ئەحمەد. ئەو کەسەی کە مژدەی پێدرا بوو کە دێت لە چەرخە پێشوەکاندا باس کرابوو

[1] احمد (٤٦١)، فەرموودەیەکی باشە (جید).

چاوەڕوانی ئەکرا، وەختیٚ هات بە چەند نیشانەی ڕوونەوە، خوانەناسانو جیاواز خوازان گوتیان: ﴿هَٰذَا سِحۡرٞ مُّبِينٞ﴾ ئەمە هەر بە ئاشکرا جادووە.

﴿وَمَنۡ أَظۡلَمُ مِمَّنِ ٱفۡتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ ٱلۡكَذِبَ وَهُوَ يُدۡعَىٰٓ إِلَى ٱلۡإِسۡلَٰمِۚ وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ۝٧ يُرِيدُونَ لِيُطۡفِـُٔواْ نُورَ ٱللَّهِ بِأَفۡوَٰهِهِمۡ وَٱللَّهُ مُتِمُّ نُورِهِۦ وَلَوۡ كَرِهَ ٱلۡكَٰفِرُونَ ۝٨ هُوَ ٱلَّذِيٓ أَرۡسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلۡهُدَىٰ وَدِينِ ٱلۡحَقِّ لِيُظۡهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦ وَلَوۡ كَرِهَ ٱلۡمُشۡرِكُونَ ۝٩﴾

## باسی ناهەقترین مرۆڤو مژدە بە تەواو بوونیو سەرکەوتنی تیشکی ئیسلام بەسەر هەموو ئاینەکانا

خوای گەورە ئەفەرمویٚت: ﴿وَمَنۡ أَظۡلَمُ مِمَّنِ ٱفۡتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ ٱلۡكَذِبَ وَهُوَ يُدۡعَىٰٓ إِلَى ٱلۡإِسۡلَٰمِۚ وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ کیٚ لەوە ناهەقترە درۆ بۆ خوا هەڵدەبەستیٚو لە کاتیٚکدا کە بۆ ئیسلام بانگ دەکریٚ؟ خودا گرۆی غەدر کاران بەرەو خۆی شارەزا ناکات. واتە: هیچ کەسیٚ ناهەقتر نیە لەو کەسەی کە درۆ هەڵدەبەسیٚ بەدەم خوداوەو هاوەڵی بۆ دادەنیٚو ئەیپەرستیٚ لە کاتیٚکدا ئەو کەسە بانگ دەکریٚ بۆ یەکتاپەرستیو ناسینی خودا بەتەنها. بۆیە خوای گەورە ئەفەرمویٚت: ﴿وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ خودا گەلی ستەمکار شارەزا ناکا. پاشان ئەفەرمویٚت: ﴿يُرِيدُونَ لِيُطۡفِـُٔواْ نُورَ ٱللَّهِ بِأَفۡوَٰهِهِمۡ وَٱللَّهُ مُتِمُّ نُورِهِۦ وَلَوۡ كَرِهَ ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾ ئەیانەویٚ تیشکی خودا هەر بە فوی دەم بکوژیٚننەوە. خواش تیشکی خۆی هەر سەر دەخا، جا با خوانەناسانیش خۆشیان نەیەت. یانی هەوڵ ئەدەن کە بە ناهەقیو قسەی بیٚ کەڵك بەری ڕاستی بگرن. نموونەی ئەمانە وەك نموونەی ئەو کەسانە وایە کە ئەیانەویٚ بە فوی دەم تیشکی خۆر بکوژیٚننەوە. وەك چۆن تیشکی خۆر نەگونجاوە کە بە فوی دەم بکوژیٚتەوە هەر بەم شیٚوەیە هەرگیز ناتوانن ئاینی خوا لەناوبەرن. بۆیە خودای مەزن فەرموویەتی: ﴿وَٱللَّهُ مُتِمُّ نُورِهِۦ وَلَوۡ كَرِهَ ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾ با بت پەرستانیش پیٚیان ناخۆش بیٚ وە ئەفەرمویٚت: ﴿هُوَ ٱلَّذِيٓ أَرۡسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلۡهُدَىٰ وَدِينِ ٱلۡحَقِّ لِيُظۡهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦ وَلَوۡ كَرِهَ ٱلۡمُشۡرِكُونَ﴾ ئەو خودایە پیٚغەمبەری خۆی بە ڕیٚکرد، بۆ ڕیٚبەریو ڕاگەیاندنی دینی ڕاست. تا سەری خا بەسەر هەموو دینەکاندا. جا با بت پەرستەکانیش خۆشیان نەیە. لەسەر ئەم دوو ئایەتە لە پیٚشەوە قسە کرا لە سورەتی بەرائەدا (براءة) چەندیٚ پیٚویست بیٚ سوپاسو ستایش خوای گەورە.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ هَلۡ أَدُلُّكُمۡ عَلَىٰ تِجَٰرَةٖ تُنجِيكُم مِّنۡ عَذَابٍ أَلِيمٖ ﴿١٠﴾ تُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَتُجَٰهِدُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ بِأَمۡوَٰلِكُمۡ وَأَنفُسِكُمۡۚ ذَٰلِكُمۡ خَيۡرٞ لَّكُمۡ إِن كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ﴿١١﴾ يَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡ وَيُدۡخِلۡكُمۡ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ وَمَسَٰكِنَ طَيِّبَةٗ فِي جَنَّٰتِ عَدۡنٖۚ ذَٰلِكَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ ﴿١٢﴾ وَأُخۡرَىٰ تُحِبُّونَهَاۖ نَصۡرٞ مِّنَ ٱللَّهِ وَفَتۡحٞ قَرِيبٞۗ وَبَشِّرِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿١٣﴾ ﴾

**ئەو مامەڵەیەی کە ئەبێتە هۆی ڕزگار بوون لە ئازاری بە ژان**

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ هَلۡ أَدُلُّكُمۡ عَلَىٰ تِجَٰرَةٖ تُنجِيكُم مِّنۡ عَذَابٍ أَلِيمٖ ﴾ ئەی گەلی خاوەن باوەڕان دەتانەوێ مامڵەیەکتان پێ بڵێم کە لە ئازارێکی بە ژان ڕزگارتان بکات. لە پێشەوە لە فەرموودەکەی عبدالله ی کوڕی سەلاما باسمان کرد کە هاوەڵەکانی پێغەمبەر(ﷺ) ئەیان ویست (پرسیار لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بکەن لە خۆشەویست ترین کردار لەلای خودای گەورە بۆ ئەوەی بیکەن. خوای گەورە ئەم سورەتەی ناردە خوارەوە لەناو ئەم سورەتەدا ئەم ئایەتەیش کە ئەفەرموێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ هَلۡ أَدُلُّكُمۡ عَلَىٰ تِجَٰرَةٖ تُنجِيكُم مِّنۡ عَذَابٍ أَلِيمٖ ﴾ پاشان ڕافەی ئەم ئایەتەی کرد بەم مامەڵە گەورەیە کە هەرگیز تووشی زیانو لەناوچوون نابێ کە گەیشتن بە مەبەستو لابەری هەموو گیرو گرفتێکە. خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ تُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَتُجَٰهِدُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ بِأَمۡوَٰلِكُمۡ وَأَنفُسِكُمۡۚ ذَٰلِكُمۡ خَيۡرٞ لَّكُمۡ إِن كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ﴾ بڕوا بە خواو بە پێغەمبەری ئەو بێننو بە دارایيو گیانی خۆتان لە ڕێی خودا تێ بکۆشن! ئەمە بۆ ئێوە باشترە گەر بزانن. واتە: لە مامەڵە کردنی دنیاو خۆماندوو کردنیو هەوڵ دان بۆ دنیا بە تەنها زۆر باشترە. پاشان ئەفەرموێت: ﴿يَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡ وَيُدۡخِلۡكُمۡ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ وَمَسَٰكِنَ طَيِّبَةٗ فِي جَنَّٰتِ عَدۡنٖۚ ذَٰلِكَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ﴾ لە گوناهەکانتان دەبورێو دەتانباتە ناو باغاتێك جۆباریان بە بەردا دەڕواو خانوی زۆر خۆشو خاوێنتان لە بەهەشتی هەمیشەییدا دەداتێ، ئەمە دەسکەوتی گەورەیە. ﴿يَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡ﴾ واتە: گەر ئەوەی فەرمانم پێکردن کردتانو پێی هەڵسان منیش لە تاوانەکانتان دەبورم دەتان خەمە باغاتو خانوی خۆش پلەی بەرزیشتان پێدەدەم بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَيُدۡخِلۡكُمۡ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ وَمَسَٰكِنَ طَيِّبَةٗ فِي جَنَّٰتِ عَدۡنٖۚ ذَٰلِكَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ﴾ پاشان ئەفەرموێت: ﴿وَأُخۡرَىٰ تُحِبُّونَهَاۖ نَصۡرٞ مِّنَ ٱللَّهِ وَفَتۡحٞ قَرِيبٞۗ وَبَشِّرِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾ شتی تریش (کە ئێوە حەزی لێ دەکەن) یارمەتیدانە لە خوداوەو سەرکەوتنێکی نزیکیش. ئەم مژدەیە بە باوەڕداران بدە. پاشان خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَأُخۡرَىٰ تُحِبُّونَهَا﴾ واتە: وە لەوەش زیاترتان دەدەمێ لەوەی کە پێم داونو حەزی لێ دەکەن ئەوەیش ﴿نَصۡرٞ مِّنَ ٱللَّهِ وَفَتۡحٞ قَرِيبٞ﴾ واتە: کاتێ کە غەزاتان کرد لە ڕێگای خوداو وە یارمەتی

دینەکەتان دا. خودایش کەفیلی سەرکەوتنتان دەکات. خودای مەزن فەرموویەتی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن تَنصُرُواْ ٱللَّهَ يَنصُرۡكُمۡ وَيُثَبِّتۡ أَقۡدَامَكُمۡ﴾[1]، واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە ئەگەر ئێوە یارمەتی (ئایینی) خوا بدەن خواش ئێوە زاڵو سەرکەوتوو دەکات (بەسەر کافراندا) وە پێیەکانتان جێگیر دەکات (لە جەنگدا خۆڕاگرتان دەکات). وە ئەفەرموێت: ﴿وَلَيَنصُرَنَّ ٱللَّهُ مَن يَنصُرُهُۥٓۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَقَوِيٌّ عَزِيزٌ﴾[2]، واتە: وە بێگومان خوا یارمەتی کەسانێ ئەدات (سەریان ئەخات) کە یارمەتی (دینی) خوا دەدەن بەڕاستی خوا بەهێزو بالادەستو بەتوانایە. وە ئەفەرموێت: ﴿وَفَتۡحٞ قَرِيبٞ﴾ واتە: سەرکەوتنێکی نزیکیش ئەمەیش ئارەزوو حەزێکی دنیاییەو هۆی گەیشتنە بە خۆشیەکانی دواڕۆژ بۆ ئەو کەسانەی کە گوێ ڕایەڵی خواو پێغەمبەرەکەیان کردوەو یارمەتی خوداو دینەکەیان داوە. بۆیە خودا ئەفەرموێت: ﴿وَبَشِّرِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾ ئەم مژدەیە بە باوەڕدارەکان بدە.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُونُوٓاْ أَنصَارَ ٱللَّهِ كَمَا قَالَ عِيسَى ٱبۡنُ مَرۡيَمَ لِلۡحَوَارِيِّـۧنَ مَنۡ أَنصَارِيٓ إِلَى ٱللَّهِۖ قَالَ ٱلۡحَوَارِيُّونَ نَحۡنُ أَنصَارُ ٱللَّهِۖ فَـَٔامَنَت طَّآئِفَةٞ مِّنۢ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ وَكَفَرَت طَّآئِفَةٞۖ فَأَيَّدۡنَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ عَلَىٰ عَدُوِّهِمۡ فَأَصۡبَحُواْ ظَٰهِرِينَ ﴿١٤﴾﴾

**موسوڵمانان لە هەموو کاتێکدا یاری دەدەری ئاینن**

خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُونُوٓاْ أَنصَارَ ٱللَّهِ كَمَا قَالَ عِيسَى ٱبۡنُ مَرۡيَمَ لِلۡحَوَارِيِّـۧنَ مَنۡ أَنصَارِيٓ إِلَى ٱللَّهِۖ قَالَ ٱلۡحَوَارِيُّونَ نَحۡنُ أَنصَارُ ٱللَّهِۖ فَـَٔامَنَت طَّآئِفَةٞ مِّنۢ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ وَكَفَرَت طَّآئِفَةٞۖ فَأَيَّدۡنَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ عَلَىٰ عَدُوِّهِمۡ فَأَصۡبَحُواْ ظَٰهِرِينَ﴾ ئەی کەلی خاوەن باوەڕان! یارمەتیدەرانی خودا بن وەکوو عیسای کوڕی مەریەم بە یارانی حەواری گوت: کێ بەرەو خودا دەبێتە یاریدەری من؟ دەستەی حەواریەکان وتیان: ئێمە یاریدەری خوداین. ئەوسا لە بەرەی ئیسرائیل هێندێکیان بڕوایان هێناو هێندێکیش هەر بێباوەڕ مان. ئیتر ئێمە خاوەنباوەڕەکانیانمان یارمەتی دا، تا دەرۆستی دوژمنانی خۆیان هاتن. خوای گەورە ئەفەرموێتو فەرمان ئەدا بە بەندە خاوەنباوەڕەکانی کە ببنە یاریدەدەری خودا لە هەموو هەڵسو کەوتێکیانا لە قسەو هەڵسانو دانیشتنیاندا بە گیانو سامان وەڵامی خوداو پێغەمبەری خودا(ﷺ) بدەنەوە وەك چۆن حەواریەکان وەڵامی عیسایان دایەوە کاتێ فەرمووی: ﴿مَنۡ أَنصَارِيٓ إِلَى ٱللَّهِۖ﴾ کێ پشتیوانیم لێ دەکا بۆ لای خوای گەورە. ﴿قَالَ ٱلۡحَوَارِيُّونَ﴾ کە ئەوانە شوێنکەوتوی عیسا بوون (علیه

---

[1] محمد (٧).

[2] الحج (٤٠).

السلام) گوتیان ﴿نَحۡنُ أَنصَارُ ٱللَّهِ﴾ یانی ئێمە پشتیوانی تۆین لەسەر ئەو ئاینەی کە پێی هاتوی. یارمەتیت دەدەین لەسەری. عیسا ناردنی بۆ ولاتێ کە جولەکەو یۆنانیەکانی (الوینانین) لێ بوو. و هەر بەو شێوەیە پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە رۆژەکانی حەجدا ئەی فەرموو: (چی پیاوێك پەنام ئەدا هەتا پەیامی پەروەردەم بگەیەنم چونکە قورەیش نەیان هێشت پەیامی پەروەردەم بگەیەنم (بلاو بکەمەوە))[1] حودای مەزن دلّی ئەوس‌و خەزرەجیەکانی بۆ نەرم کردو لە ئەهلی مەدینەو پەیمانیان دایەو پشتیوانیان لێ کرد وە بەلّێنیان پێدا پارێزگاری لێ بکەن ڕەك چۆن پارێزگاری لە خۆیان‌و مالّو منداڵیان ئەکەن ئەگەر کۆچی کردو چوو بۆلایان. کاتێ پێغەمبەر(ﷺ) خۆی‌و هاوەڵەکانی کۆچیان کرد بۆ مەدینە، ئەو بەلّێنەی کە دابویان بە خودا بەجێیان هێنا. بۆیە خوداو پێغەمبەری خودا(ﷺ) ناویان ناوە ئەنسار (الانصار) وە ئەم ناوە بوو بە نازناویان خودای گەورە لێیان ڕازی بێ.

**دەستەیەك لە بەرەی ئیسرائیل باوەڕیان هێنا بە عیساو دەستەیەك باوەڕیان پێ نەهێنا**

وە ئەفەرموێت: ﴿فَـَٔامَنَت طَّآئِفَةٞ مِّنۢ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ وَكَفَرَت طَّآئِفَةٞ﴾ یانی کاتێ عیسای کوڕی مەریەم دەستی دایە بلاّو کردنەوەی پەیامی پەروەردەی لەناو هۆزەکەیا ئەوەی پشتیوانی لێ کرد کردی. هەندێکی ڕێگای ڕاستی گرت بەوەی کە بۆی هاتبوو شارەزا بوو. هەندێکیشی ڕێگای ون کردو سەری لێ شێواو لە ڕێگا لایدا باوەڕی بە پێغەمبەریەتی عیسا (علیه السلام) نەکردو گومانی گەورەیان خستە پالّ عیساو مەریەمی دایکی. کە بریتی بوون لە جوولەکەکان بەر نەفرینی خودا کەون بە بەردەوامی هەتا ڕۆژی قیامەت. وە هەندێ لەو کەسانەی کە شوێنی عیسا کەوتبون زیادەڕەویان لەبارەی عیساو دایکیەوە کرد هەتا بەرزیان کردوە زیاد لەوەی کە خودا پێی بەخشیبوو لە پێغەمبەریەتی. بوون بە کۆمەلّ کۆمەلّو دەستە دەستە. هەندێکیان ئەیان ووت: عیسا کوڕی خودایە. هەندێکی تر ئەی ووت: یەکێکە لە سێ خوداکە. بابو کوڕو ڕوحول قودس (روح القدس) وە هەندێکی تریش ئەی ووت: عیسا خوایە. ئەم هەموو ڕاو بۆچونانە بە درێژی لە سورەتی نیسائدا باس کراوە.

**خودا یارمەتی دەستەی خاوەنباوەڕانیدا**

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿فَأَيَّدۡنَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ عَلَىٰ عَدُوِّهِمۡ﴾ واتە: سەرمان خستن بەسەر دوژمنەکانیانا لە گرۆو دەستەی گاورەکان ﴿فَأَصۡبَحُواْ ظَٰهِرِينَ﴾ تا دەرەقەتی دوژمنانی خۆیان هاتن بە هاتنی محمد (ﷺ) وەك چۆن ئیمامی ئەبوجەعفەری کوڕی جەریر ڕیوایەتی کردوە لە ئیبنوعەباسەوە (ڕەزای خوایان لێ بێ) دەلّێت: کاتێ خوای گەورە ویستی عیسای کوڕی مەریەم (علیه السلام) بەرزکاتەوە بۆ

---

[1] احمد (٣/٣٢٢)، و الحاكم (٢/٦٢٤)، و البيهقي (٨/١٤٦)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

ئاسمان. هات بۆ لای هاوەڵەکانی لەماڵێکدا کە دوانزە پیاو بوون کە کانیەك لەو ماڵەدا بوو سەری ئاوی لێ ئەتکا دەڵێت: کەسی وا هەیە لە نێوانتانا دوانزە جار پەشیمان بووەتەوەو باوەڕی بە من نەماوە پاش ئەوەی کە باوەڕی پێ هێنام. دەڵێت: پاشان دەڵێت: کێ لە ئێوە وێنەی من ئەکێشێ بەسەر خۆیا لە جێگای من بکوژرێ دوایی بەو پلەیەی کە من هەمە لەگەڵما بێ؟ دەڵێت: لاوێك لە هەموویان کەم تەمەنتر هەڵسا. دەڵێت: من. پێی گوت دانیشە. پاشان دووبارەی کردەوە بۆیان. لاوەکە هەڵساو دەڵێت: من. پێی گوت دانیشە. پاشان. جارێکی تر دووبارەی کردوە لێیان لاوەکە هەڵسایەوەو دەڵێت: من. دەڵێت: بەڵێ تۆ ئەوەی. دەڵێت: وێنەی عیسا کێشرا بە ڕویا. عیسا (علیە السلام) لە کلاو ڕۆشنەکەیەوە لەو ماڵەدا بوو بەرز کرایەوە بۆ ئاسمان دەڵێت: ئەو جولەکانەی کە دەگەڕان بە دوای عیسادا (علیە السلام) ئەو کەسەی کە لە ئەو ئەچوو گرتیانو کوشتیانو هەڵیان واسی (کردیان بە دارا) وە هەندێکیان دوانزە جار پەشیمان بوبونەوەو باوەڕیان پێ نەکردبوو پاش ئەوەی باوەڕیان پێ هێنا بوو. پاشان بوون بە سێ دەستەو هەر دەستەی ڕای خۆی هەبوو. دەستەیەکیان دەڵێت: خودا لەناوماندا بوو هەتا ویستی پاشان بەرز بوەوە بۆ ئاسمان ئەمانە پێیان ئەگوترێ یەعقوبیە دەستەیەکی تریان دەڵێت: کوڕی خودا لەنێوانماندا بوو تا خوا مەیلی لێ بوو. پاشان بەرزی کردوە بۆ لای خۆی ئەمانە پێیان ئەڵێن: نەستوریە دەستەی سێهەم ووتیان: عیسا (علیە السلام) لەنێوانماندا بوو بەندەو پێغەمبەری خودا بوو (علیە السلام) هەتا خوا حەزی کرد پاشان بەرزی کردەوە بۆلای خۆی. ئەمانە موسوڵمانەکان بوون. هەردوو دەستە خوانەناسەکە هەڵسان لە کۆمەڵە موسوڵمانەکەو کوشتیان. ئیسلامیان لەناوبرد هەتا ئەو کاتەی خودا محمدی (ﷺ) ڕەوانە کرد ﴿فَـَٔامَنَت طَّآئِفَةٌ مِّنۢ بَنِىٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ وَكَفَرَت طَّآئِفَةٌ﴾ واتە: ئەو دەستەیەی کە بوونە خوانەناس لە بەرەی ئیسرائیل لە وەختی هاتنی عیسا (علیە السلام) وە ئەو دەستەیەش کە باوەڕیان پێ هێنا لەو کاتەدا ﴿فَأَيَّدۡنَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ عَلَىٰ عَدُوِّهِمۡ فَأَصۡبَحُواْ ظَٰهِرِينَ﴾ بەدەرکەوتنو هاتنی محمد (ﷺ) ئاینی ئەوان سەرکەوت بەسەر ئاینی خوانەناسەکاندا.[1] ئەمە قسەی ئەوە لە کتێبەکەیا لە تەفسیری ئەم ئایەتە پیرۆزەدا (یانی ئیمامی تەبەری) وە هەر بەم شێوەیە نەسائی ڕیوایەتی کردوە لە تەفسیری ئەم ئایەتا لە سونەنەکەیا.[2] شوێن کەوتوانی محمد (ﷺ) بەردەوام لەسەر ڕاستین هەتا فەرمانی خودا دێت دەمێننەوە لەسەری بەو شێوەیە وە هەتا دواین کەسیان کە ئەجەنگێ لەگەڵ مەسیح عیسای کوڕی

---

[1] الطبري (٢٣/٣٦٦).

[2] النسائي في الكبرى (٦/٤٨٨).

مەریەم (علیه السلام) دژی دەجال. وە زۆر فەرموودەی سەحیح لەو بارەیەوە هاتوەو ڕیوایەت کراوە[1] والله اعلم.

## تەفسیری سورەتی (الجمعة)

## لە مەدینە هاتووەتە خوارەوە

**ڕێزی سورەتی (الجمعە)**

لە ئیبنوعەباس و ئەبوهورەیرەوە (ڕەزای خوایان لێ بێ) گوتیان: پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە نوێژی جومعەدا سورەتی جومعەو موونافیقینی (الجمعة و المنافقين) ئەخوێند موسلم ڕیوایەتی کردوە لە سەحیحەکەیا[2].

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

﴿يُسَبِّحُ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ الْمَلِكِ الْقُدُّوسِ الْعَزِيزِ الْحَكِيمِ ﴿١﴾ هُوَ الَّذِي بَعَثَ فِي الْأُمِّيِّينَ رَسُولًا مِّنْهُمْ يَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِهِ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَإِن كَانُوا مِن قَبْلُ لَفِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ ﴿٢﴾ وَآخَرِينَ مِنْهُمْ لَمَّا يَلْحَقُوا بِهِمْ ۚ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ ﴿٣﴾ ذَٰلِكَ فَضْلُ اللَّهِ يُؤْتِيهِ مَن يَشَاءُ ۚ وَاللَّهُ ذُو الْفَضْلِ الْعَظِيمِ ﴿٤﴾﴾

**هەمووشتێ پەسەندی خودای گەورە دەدا**

خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿يُسَبِّحُ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ الْمَلِكِ الْقُدُّوسِ الْعَزِيزِ الْحَكِيمِ﴾ هەرچی لەناو ئاسمانەکان و زەمینە، پەسنی ئەو خودایە دەدەن پادشایەکی پاک و دوور لە هەموو کەمایەتی و بەدەستەڵات و کاربزانە. خوای مەزن ئاگادارمان دەکات کە هەرچی لەناو ئاسمانەکان و زەمینایە یانی هەرچی دروست کراوێ هەیە بە زماندارو بێ زمان هەمووی پەسەندی خودا ئەدەن و وەک خۆی ئەفەرموێت: ﴿وَإِن مِّن شَيْءٍ إِلَّا يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ﴾[3]، واتە: وە هیچ شتێك نی یە بە سوپاسی ئەو ستایش نەکات. پاشان فەرموویەتی: ﴿الْمَلِكِ الْقُدُّوسِ﴾ یانی ئەو پادشای ئاسمانەکان و زەمینە. وە ئەو هەڵیان ئەسوڕێنێ بە فەرمانی خۆی. پیرۆزە: واتە: پاکەو دوورە لە هەموو کەمایەتیەك و هەرچی سیفاتی تەواوە هی ئەوەو بۆ ئەوە ﴿الْعَزِيزِ الْحَكِيمِ﴾ بە دەستەڵات و کاربزانە چەند جار مانای کراوە لەپێشەوە.

---

[1] فتح الباري (١٣/٣٠٦)، مسلم (٣/١٥٢٤)، ابوداود (٣/١١).

[2] مسلم (٢/٥٩٧-٥٩٩)

[3] الاسراء (٤٤).

**خودا منەت دەکات بەسەر عەرەبەکاندا بە ناردنی پێغەمبەری خودا بۆیان**

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿هُوَ ٱلَّذِى بَعَثَ فِى ٱلْأُمِّيِّـۧنَ رَسُولًا مِّنْهُمْ يَتْلُوا۟ عَلَيْهِمْ ءَايَـٰتِهِۦ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلْكِتَـٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَإِن كَانُوا۟ مِن قَبْلُ لَفِى ضَلَـٰلٍ مُّبِينٍ﴾ هەر ئەویشە لەناو نەخوێندەواراندا پێغەمبەرێکی لە خۆیان بۆ ناردن، کە نیشانەکانی ئەویان بۆ دەخوێنێ‌و لە کتێب‌و لە کارزانی ڕایان بێنێ. هەرچەندە ئەوان لە پێشوودا لەوپەڕی گومڕایی دا بوون. (الامویون) یانی عەرەبەکان وەك خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَقُل لِّلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَـٰبَ وَٱلْأُمِّيِّـۧنَ ءَأَسْلَمْتُمْ ۚ فَإِنْ أَسْلَمُوا۟ فَقَدِ ٱهْتَدَوا۟ ۖ وَّإِن تَوَلَّوْا۟ فَإِنَّمَا عَلَيْكَ ٱلْبَلَـٰغُ ۗ وَٱللَّهُ بَصِيرٌۢ بِٱلْعِبَادِ﴾[1] وە تایبەت مەندکردنی عەرەبەکان بە نەخوێندەواری مانای وا نیە کە کەسانی تریش نەخخوێندەوار نین. بەڵام منەت کردن بەسەر ئەماندا گەورەترو زۆرترو دیارترە وەك خودا ئەفەرموێت: ﴿وَإِنَّهُۥ لَذِكْرٌ لَّكَ وَلِقَوْمِكَ﴾[2]، واتە: وە بێگومان ئەم قورئانە هۆی ناوداری یە بۆ خۆت‌و بۆ گەلەکەت. واتە: وە (ئەی موحەممەد (ﷺ)) بڵێ بەوانە کە نامەی تەورات‌و ئینجیلیان دراوەتێ (کە جولەکەو گاورەکانن) وە بە نەخوێندەوارەکان (هاوبەش پەیداکەرانی گەلی عەرەب) ئایا ئێوە موسوڵمان بوون؟ ئینجا ئەگەر موسوڵمان بوون ئەوا ڕێنمونی یان کردوە ئەگەر ڕووشیان وەرگێڕا ئەوە بەڕاستی تۆ هەر ڕاگەیاندنت لەسەرە خوا بینایە بە بەندەکانی. وە ئەمە بۆ غەیرەز خۆشیانە کە ئامۆژگاری لێ وەربگرێ. ئەم ئایەتە وێنەی ئەم ئایەتانە پێچەوانەو دژایەتی ئەم ئایەتە ناکەن کە ئەفەرموێت: ﴿قُلْ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنِّى رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيْكُمْ جَمِيعًا﴾[3]، واتە: (ئەی موحەممەد(ﷺ)) بڵێ: ئەی خەڵکینە بەڕاستی من پێغەمبەری خوام بۆ ئێوە هەمووتان. وە ئەم ئایەتەی کە ئەفەرموێت: ﴿لِأُنذِرَكُم بِهِۦ وَمَنۢ بَلَغَ﴾[4]، واتە: بۆ ئەوەی ئێوەی پێ بترسێنم‌و هەر کەسێکی کەش کە پێی دەگات. وە ئەم ئایەتە کە باسی قورئان دەکات‌و ئەفەرموێت: ﴿وَمَن يَكْفُرْ بِهِۦ مِنَ ٱلْأَحْزَابِ فَٱلنَّارُ مَوْعِدُهُۥ﴾[5]، واتە: وە هەر کەسێ باوەڕی پێی نەبێت لەو کۆمەڵ‌و تاقمانە (ئەوانەی کۆبونەوە لەسەر دژایەتی ئیسلام) ئەوە ئاگر جێگایەتی. وە چەندەها ئایەتی تر کە باسی هاتنی پێغەمبەر(ﷺ) دەکات بۆسەر هەموو ئادەمیزاد بە سورو ڕەش‌و هەموو ڕەنگەکانیەوە. وە لە پێشەوە

---

[1] آل عمران (٢٠).

[2] الزخرف (٤٤).

[3] الاعراف (١٥٨).

[4] الانعام (١٩).

[5] هود (١٧).

لە تەفسیری سورەتی ئەنعامدا (الانعام) مانامان کرد بە چەند ئایەتو فەرموودەی سەحیح سوپاسو ستایش بۆ خوای گەورە. ئەم ئایەتە نیشانەی گیرا بوونی پاڕانەوەکەی ئیبراهیمی خەلیل بوو. وەختێ داوای کرد لە خودا کە پێغەمبەرێکیان لە خۆیان بۆ ڕەوانە بکاو قورئانیان بەسەرا بخوێنێو وە لە کتێبو لە کارزانی شارەزایان بکاو. خودایش بۆی ناردن لە کاتێکدا کە ماوەیەك پێغەمبەرانیان بۆ نەهاتبوو وە لە ڕێگا لایان دابوو وە زۆر پێویستیان بە ڕێ نیشاندەرێك هەبوو وە خودا زۆر لە خەڵکی سەر زەمین تورە بوو بە عەرەبو عەجەمەوە، مەگەر هەندێ پاشماوەی ئەهلی کتێب نەبێ. کە ژمارەیەکی کەم بوون لەسەر ئاینی عیسای کوڕی مەریەم (علیه السلام) مابوونەوە. بۆیە خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿هُوَ ٱلَّذِى بَعَثَ فِى ٱلْأُمِّيِّـۧنَ رَسُولًا مِّنْهُمْ يَتْلُوا۟ عَلَيْهِمْ ءَايَـٰتِهِۦ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلْكِتَـٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَإِن كَانُوا۟ مِن قَبْلُ لَفِى ضَلَـٰلٍ مُّبِينٍ﴾ چونکە عەرەبەکان لە کۆنەوە پابەند بوون بە ئاینی ئیبراهیمی خەلیلەوە (علیه السلام). پاشان لایاندا لێیو گۆڕایانو پەشیمان بونەوە لێیو بە پێچەوانەی ئەو ئاینەوە دەجولانەوەو دژایەتیان ئەکرد لە جێگای یەکتاپەرستی هاوەڵیان بۆ خوا دانابوو گومان لە دڵیاندا پەیدابوو. شتی وایان بەناوی خوداوە ئەکرد کە هیچ پەیوەندیەکی بە ئاینو خودای گەورەوە نەبوو. هەروەها ئەهلی کتێبیش کتێبەکانیان دەست کاری کردو گۆڕایان وە بە ئارەزوی خۆیان مانایان ئەکردو ئا لەو ساتەدا خوای گەورە محمدی (ﷺ) ڕەوانە کرد بە بەرنامەیەکی زۆر تێرو تەواوو گەورەوە بۆ هەموو مرۆڤایەتی بە گشتی کە ڕێ نیشاندەریانەو ڕون کەرەوەیە بۆ هەموو ئەو شتانەی کە پێویستیان پێیەتی لە کاروباری ژیانو پاشەڕۆژا کە زیندوو دەکرێنەوە. وە بانگیان دەکا بۆ ئەو شتانەی کە نزیکیان دەکاتەوە لە بەهەشتو ڕەزامەندی خوای گەورە وە دورخستنەوەیان لەو شتانەی کە بەرەو جەهەنەمو تورەیی خوا دەیانبات وە جیاکەرەوەی هەموو گومانو دوودڵیو دڵەڕاوکەیەکە کە ئەسڵو فەرعی دینە وە هەرچی ئاکارو خوڕەوشتی جوان هەیە تێدا کۆبوەتەوە لە ئاکاری جوانی ئاینە پێشوەکانو وە خوای مەزن بەخششێکی وای داوە بە پێغەمبەر(ﷺ) کە بە کەسی نەداوە لەمەو پێش وە بە کەسیشی نادات لەمەودوا سەلاتو سەلامی خوای لێ بێت بەردەوام هەتا ڕۆژی قیامەت.

**محمد (ﷺ) پێغەمبەری عەرەبو عەجەمە**

خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَءَاخَرِينَ مِنْهُمْ لَمَّا يَلْحَقُوا۟ بِهِمْ ۚ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ﴾ بۆ هێندێ تریش لەمانە، وا هێشتا پێیان نەگەیشتوون. خودا خاوەنی دەستەڵاتی لەکارزانە. ئیمام ئەبوعبدالله ی بوخاری ڕیوایەتی کردوە لە ئەبوهورەیرەوە دەڵێت: لە خزمەت پێغەمبەرا (ﷺ) دانیشتبووین سورەتی جومعەی بۆ هاتە خوارەوە ﴿وَءَاخَرِينَ مِنْهُمْ لَمَّا يَلْحَقُوا۟ بِهِمْ﴾ گوتیان ئەوانە کێن ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ)؟. وەڵامی نەدانەوە هەتا سێ جار پرسیاری لێ کرا. سەلمانی فارسیش لەناوماندا بوو.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەستی نایە سەر سەلمانی فارسیو پاشان فەرمووی: (ئەگەر باوەڕ لە سورەیا بوایە (الثريا) پیاوانێك یا پیاوێك لە ئا ئەمانەوە دەستیان ئەهێنا)[1] یانی هەوڵیان بۆ ئەداو خۆیان ئەگەیاندێ موسلمو تیرمیزوی نەسائیو ئیبنوئەبی حاتەمو ئیبنوجەریر ڕیوایەتیان کردوە.[2] ئەم فەرمودەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە ئەم سورەتە لە مەدینەدا هاتوەتە خوارەوەو وە گشت گیری هاتنی پێغەمبەر(ﷺ) ئەگەیەنێ بۆ هەموو بەرەی ئادەمیزاد. چونکە مانای ئەم ئایەتەی کە ئەفەرموێت: ﴿وَءَاخَرِينَ مِنۡهُمۡ﴾ بە فارسەکان مانای کرد. بۆیە پێغەمبەری خوا (نامەکانی نوسی بۆ فارسو ڕۆمەکانو گەلانی تریشو بانگی کردن بۆسەر ئاینی خوای گەورەو شوێن کەوتنی ئەو پەیامەی کە پێی هاتوە. بۆیە موجاهدو کەسانی تریش لەم ئایەتەدا ﴿وَءَاخَرِينَ مِنۡهُمۡ لَمَّا يَلۡحَقُواْ بِهِمۡ﴾ گوتوویانە: ئەمانە عەجەمەکانن[3]و هەموو کەسێ کە پێغەمبەری بە ڕاست زانیبێو باوەڕی پێ هێنابێ. وە ئەفەرموێت: ﴿وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ﴾ واتە: خاوەنی دەستەڵاتو لەکارزانە لە بەرنامەو بڕیاریا. وە ئەفەرموێت: ﴿ذَٰلِكَ فَضۡلُ ٱللَّهِ يُؤۡتِيهِ مَن يَشَآءُۚ وَٱللَّهُ ذُو ٱلۡفَضۡلِ ٱلۡعَظِيمِ﴾ ئەمە چاکەیە لە خواوە، دەربارەی هەرکەس بیەوێ دەیکا. چاکەیە کە لای خودایە. زۆر هێژایە. واتە: ئەمەی کە خودا بەخشیویەتی بە محمد (ﷺ) لەو پێغەمبەریەتیە مەزنەو وە ئومەتەکەیشی تایبەت مەند کردوە بە ڕەوانە کردنی ئەو بۆ سەریان ئەمە چاکەو ڕێزە لە خوداوە.

﴿مَثَلُ ٱلَّذِينَ حُمِّلُواْ ٱلتَّوۡرَىٰةَ ثُمَّ لَمۡ يَحۡمِلُوهَا كَمَثَلِ ٱلۡحِمَارِ يَحۡمِلُ أَسۡفَارَۢاۚ بِئۡسَ مَثَلُ ٱلۡقَوۡمِ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِۚ وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٥﴾ قُلۡ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ هَادُوٓاْ إِن زَعَمۡتُمۡ أَنَّكُمۡ أَوۡلِيَآءُ لِلَّهِ مِن دُونِ ٱلنَّاسِ فَتَمَنَّوُاْ ٱلۡمَوۡتَ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ﴿٦﴾ وَلَا يَتَمَنَّوۡنَهُۥٓ أَبَدَۢا بِمَا قَدَّمَتۡ أَيۡدِيهِمۡۚ وَٱللَّهُ عَلِيمُۢ بِٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٧﴾ قُلۡ إِنَّ ٱلۡمَوۡتَ ٱلَّذِي تَفِرُّونَ مِنۡهُ فَإِنَّهُۥ مُلَٰقِيكُمۡۖ ثُمَّ تُرَدُّونَ إِلَىٰ عَٰلِمِ ٱلۡغَيۡبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ﴿٨﴾﴾

## باسی خراپی جولەکەو بانگ کردنیان بۆ خواستنی مردن لە ڕێگای موباهەلەوە

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿مَثَلُ ٱلَّذِينَ حُمِّلُواْ ٱلتَّوۡرَىٰةَ ثُمَّ لَمۡ يَحۡمِلُوهَا كَمَثَلِ ٱلۡحِمَارِ يَحۡمِلُ أَسۡفَارَۢاۚ بِئۡسَ مَثَلُ ٱلۡقَوۡمِ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِۚ وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ بەسەرهاتی ئەو کەسانی

---

[1] فتح الباري (٨/٥١٠).

[2] مسلم (٤/١٩٧٢)، و تحفة الاحوذي (٩/٢٠٩)، النسائي في الكبرى (٥/٧٥) (٦٠/٤٩٠)، الطبري (٥٣/٣٧٥).

[3] الطبري (٢٣/٣٧٤).

تەوراتیان پێ هەڵگرتوون‌و لە ڕێگە دەرچوون. وەکو ئەو کەرەیە کە چەند کتێبی لێ بارە. بەسەرهاتێکی نالەبارە بۆ ئەوانەی لە نیشانەکانی خودا حاشایان کرد. خوداش ئەوانەی ناهەقن بەرەو خۆی شارەزا ناکات. خودای مەزن باسی خراپی جولەکە دەکات ئەوانەی کە تەوراتیان پێ دراو هەڵیان گرت بۆ ئەوەی کاری پێ بکەن‌و بیکەنە بەرنامەی خۆیان کەچی پاش ئەوەی وەریان گرت ئیشیان پێ نەکردو لەسەری نەڕۆشتن بەڕێوە. نمونەیان لەو کردارەیانا وەك نمونەی ئەو کەرەیە کە باری کتێبی هەڵگرتبێ. واتە: وەك ئەو کەرەیە کە کتێبێکی زۆری هەڵگرتبێ کە نازانێ چی تێدایە. ئەو هەر ئەوەندە دەزانێ کە بارێکی پێوەیە ئیتر ئاگای لە بارەکە نیە چیە. هەر بەو شێوەیە ئەو کەسانەی کە ئەو کتێبەیان وەرگرتوە کە پێیان دراوەو لەبەریان کردوە لێی تێ نەگەیشتوون‌و کاریان بە ناوەڕۆکەکەی نەکردوە بەڵکو گۆڕیویانەو بە ئارەزووی خۆیان مانایان لێك داوەتەوە. ئەوانە حاڵیان لە کەر خراپ ترە. چونکە کەر تێ گەیشتنی نیە. بەڵام ئەوانە تێ دەگەن بەڵام بەکاری ناهێنن‌و ئیشی پێناکەن. بۆیە خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ كَٱلۡأَنۡعَٰمِ بَلۡ هُمۡ أَضَلُّۚ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡغَٰفِلُونَ﴾[1]، واتە: ئەوانە وەك ئاژەڵ‌و (چوارپێ) وان بگرە خراپترو گومراترن (لە ئاژەڵ) هەر ئەوانەن بێئاگایان. وە خودای مەزن لێرەدا ئەفەرموێت: ﴿بِئۡسَ مَثَلُ ٱلۡقَوۡمِ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِۚ وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ پاشان خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿قُلۡ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ هَادُوٓاْ إِن زَعَمۡتُمۡ أَنَّكُمۡ أَوۡلِيَآءُ لِلَّهِ مِن دُونِ ٱلنَّاسِ فَتَمَنَّوُاْ ٱلۡمَوۡتَ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ﴾ بڵێ ئەی ئەوانەی کە جولەکەن! ئەگەر ئێوە پێتان وایە زیاد لە خەڵکی هەر ئێوە دۆستی خودان، دەسا ئەگەر قسەتان ڕاستە، مردنی خۆتان بخوازن. واتە: ئەگەر ئێوە وا دەزانن لەسەر ڕێی ڕاستن وە محمدو (ﷺ) هاوەڵەکانی لەسەر گومڕاین. داوای مردنی ئەو گومڕایە بکەن لە هەر لایەکە لەو دوو لایەنە ئەگەر ڕاست ئەکەن. واتە: لەوەی کە ئەیڵێن. وە خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَلَا يَتَمَنَّوۡنَهُۥٓ أَبَدَۢا بِمَا قَدَّمَتۡ أَيۡدِيهِمۡۚ وَٱللَّهُ عَلِيمُۢ بِٱلظَّٰلِمِينَ﴾ هێندەیان خراپە کردوە، هەرگیز داوای مردن ناکەن خوداش لە ناهەقیکاران ئاگادارە(٧) واتە: بەو خراپانەی دەیکەن لە خوانەناسی‌و ناهەقیکاری‌و بەدخویی‌و بەدکاری. وە لە سورەتی بەقەرەدا (البقرة) باسی موباهەلەمان کرد (المباهلة) لەگەڵ جولەکەکان کە خوای گەورە فەرمووی: ﴿قُلۡ إِن كَانَتۡ لَكُمُ ٱلدَّارُ ٱلۡأٓخِرَةُ عِندَ ٱللَّهِ خَالِصَةٗ مِّن دُونِ ٱلنَّاسِ فَتَمَنَّوُاْ ٱلۡمَوۡتَ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ٩٤ وَلَن يَتَمَنَّوۡهُ أَبَدَۢا بِمَا قَدَّمَتۡ أَيۡدِيهِمۡۗ وَٱللَّهُ عَلِيمُۢ بِٱلظَّٰلِمِينَ ٩٥ وَلَتَجِدَنَّهُمۡ أَحۡرَصَ ٱلنَّاسِ عَلَىٰ حَيَوٰةٖ وَمِنَ ٱلَّذِينَ أَشۡرَكُواْۚ

---

[1] الاعراف (١٧٩).

يَوَدُّ أَحَدُهُمْ لَوْ يُعَمَّرُ أَلْفَ سَنَةٍ وَمَا هُوَ بِمُزَحْزِحِهِۦ مِنَ ٱلْعَذَابِ أَن يُعَمَّرَ ۗ وَٱللَّهُ بَصِيرٌۢ بِمَا يَعْمَلُونَ ﴾[1]، واته: (ئەی موحەممەد (ﷺ)) بڵێ: ئەگەر ماڵی دوایی (بەهەشت) بۆ ئێوەیە لای خوا (وەك خۆتان دەڵێن) بە تایبەتی بێ ئەوەی كەس ببێ بە هاوبەشتان كەواتە داوای مردن بكەن ئەگەر ڕاستگۆن، وە هەرگیز داوای مردن ناكەن بەهۆی ئەو (گوناهانە) كە بە دەستی خۆیان پێشیان خستوە وە خوا ئاگادارە بە ستەمكاران، سوێند بێت ئەو (جولەك)انە لە هەموو كەس زیاتر حەز لە ژیان دەكەن وە لەوانەشی كە هاوبەشی بۆ خوا پەیدا دەكەن (لەبەر ئەوە) هەر یەكێكیان ئاوات دەخوازێ كە هەزارساڵ بژیایە وە ئەو تەمەنە (كە بەسەری دەبات) ڕزگاری ناكات لە سزا وە خوا بینایە بەوەی كە دەیكەن. وە لێرەدا باسمان كردو ڕونمان كردوە كە مەبەست بەو نزاو پاڕانەوەیە (المباهلة) ئەوە بوو كە نزا بكەن لە خۆیان ئەوانە كە بەریەرەكانیان لەگەڵ دەكەن بڵێن: درۆزنتان بێ بەش بێ لە ڕەحمی خوا. وەك لە سورەتی (آل عمران)دا لەبارەی موباهەلەی گاورەكانەوە باس كرا. خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَمَنْ حَآجَّكَ فِيهِ مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَكَ مِنَ ٱلْعِلْمِ فَقُلْ تَعَالَوْا۟ نَدْعُ أَبْنَآءَنَا وَأَبْنَآءَكُمْ وَنِسَآءَنَا وَنِسَآءَكُمْ وَأَنفُسَنَا وَأَنفُسَكُمْ ثُمَّ نَبْتَهِلْ فَنَجْعَل لَّعْنَتَ ٱللَّهِ عَلَى ٱلْكَٰذِبِينَ ﴾[2]، واتە: ئینجا هەر كەسێك دەمەقاڵێی لەگەڵ كردیت (لە بارەی عیساوە) دوای ئەو زانینەی كە (بە سروش) بۆت هات تۆش پێیان بڵێ وەرن با بانگی كوڕەكانمان و كوڕەكانتان وە ژنەكانمان و ژنەكانتان وە خۆمان و خۆتان بكەین لە پاشان لە خوا بپاڕێینەوە ئینجا نەفرەتی خوا بكەین لە درۆزنان. وە موباهەلەی بت پەرستەكان لە سورەتی (مریم) ﴿قُلْ مَن كَانَ فِى ٱلضَّلَٰلَةِ فَلْيَمْدُدْ لَهُ ٱلرَّحْمَٰنُ مَدًّا﴾[3]، واتە: (ئەی موحەممەد (ﷺ)) بڵێ: ئەوەی لە گومڕایی دایە با خوای میهرەبان مۆڵەتی پێ بداتو تەمەنی درێژ بكات (تا زیاتر تاوان بكەن). ئیمامی ئەحمد ڕیوایەتی كردوە لە ئیبنوعەباسەوە دەڵێت: ئەبوجەهل لەعنەتی خوای لێ بێ دەڵێت: ئەگەر محمدم بینی لەلای كەعبەدا ئەچم بۆی پێی دەخەمە سەخەمە سەرملی (یان دێخەمە ژێر پێ) ئیبنوعەباس دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (ئەگەر وای بكردایە بە ئاشكرا فریشتەكان ئەیانگرت (هەڵیان ئەگرت) وە ئەگەر جولەكەكان مردنیان بخواستایە ئەمردنو شوێنی خۆیانیان لەناو ئاگردا دەبینی. وە ئەگەر ئەوانە دەرچوونایە بۆ موباهەلە لەگەڵ پێغەمبەری خوا (ﷺ) كە بگەڕانایەتەوە نە

---

[1] البقرة (٩٤-٩٦).

[2] آل عمران (٦١).

[3] مريم (٧٥).

ماڵ‌و نە منداڵیان نەدەبینیەوە)[1] بوخاری‌و موسلم‌و تیرمیزی ڕیوایەتیان کردوە.[2] وە ئەفەرمویت: ﴿قُلْ إِنَّ ٱلْمَوْتَ ٱلَّذِى تَفِرُّونَ مِنْهُ فَإِنَّهُۥ مُلَٰقِيكُمْ ۖ ثُمَّ تُرَدُّونَ إِلَىٰ عَٰلِمِ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ بڵێ: ئەو مەرگەی کە ئێوە لێی ڕادەکەن، هەر دەتانگاتی‌و پاشان هەر دەتانبەنەوە لای زانای نەدیارو دیاران، ئەوسا هەر خۆی پێتان ئەڵێ چیتان کردوە. وەك لە سورەتی نیساء (النساء) فەرموویەتی: ﴿أَيْنَمَا تَكُونُوا۟ يُدْرِككُّمُ ٱلْمَوْتُ وَلَوْ كُنتُمْ فِى بُرُوجٍ مُّشَيَّدَةٍ﴾[3].

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِذَا نُودِىَ لِلصَّلَوٰةِ مِن يَوْمِ ٱلْجُمُعَةِ فَٱسْعَوْا۟ إِلَىٰ ذِكْرِ ٱللَّهِ وَذَرُوا۟ ٱلْبَيْعَ ۚ ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٩﴾ فَإِذَا قُضِيَتِ ٱلصَّلَوٰةُ فَٱنتَشِرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ وَٱبْتَغُوا۟ مِن فَضْلِ ٱللَّهِ وَٱذْكُرُوا۟ ٱللَّهَ كَثِيرًا لَّعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿١٠﴾﴾

### جومعەو فەرمان‌و ئادابەکانی ڕۆژی جومعە

جومعە بۆیە ناونراوە جومعە چونکە لە وتەی جەمعەوە (الجمع) دەرهێنراوە لەبەرئەوەی موسوڵمانان کۆدەبنەوە لە هەینیدا هەموو هەفتەی جارێك لە مزگەوتە گەورەکانا، وە لە هەینیدا هەموو دروست کراوەکان وەدی هاتوون‌و تەواو بوون وە ڕۆژی شەشەم لەو ساڵەدا خوای گەورە ئاسمانەکان‌و زەمینی دروست کرد. وە لە هەینیدا بوو دروست کردنی ئادەم‌و وە هەر لە هەینیدا چووە بەهەشت‌و لە هەینیشدا هێنرایە دەرەوە وە لەو ڕۆژەشدا قیامەت هەڵدەسێ وە کاتێکی تێدایە هیچ بەندەیەکی خاوەن باوەڕ دوعای خێری تێدا ناکات مەگین خودا دوعاکەی لێ وەرئەگرێ‌و قەبوڵی دەکات وەك لە فەرمودەی سەحیحا هاتوە. وە لە زمانە کۆنەکانا بە هەینی(جومعە) گوتراوە ڕۆژی عەرەبەکان (يوم العروبة) وە لە فەرمودەی سەحیحا هاتوە کە گەلەکانی پێشمان فەرمانیان پێکرا کە ڕۆژ هەینی هەڵبژێرن لێیان تێك چوو. جولەکە ڕۆژی شەمەیان هەڵبژارد کە دروست کردنی ئادەم ئەو ڕۆژە نەبوو. گاورەکان ڕۆژی یەك شەمەیان هەڵبژارد کە وەدی هێنان تێیدا دەستی پێ کرد. وە خوای گەورە ڕۆژی هەینی (الجمعة) هەڵبژارد بۆ ئەم ئوممەتە کە دروست کراوەکانی هەموو تێدا تەواو کرد. وەك بوخاری‌و موسلم ڕیوایەتیان کردوە لە ئەبوهورەیرەوە دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (ئێمە دواهەمینین وە لە ڕۆژی قیامەتا پێشەنگین. بەڵام ئەوان لە پێش ئێمەوە کتێبیان پێ دراوە پاشان ئەم ڕۆژە ڕۆژی ئەوان بوو کە خودا فەرزی کرد لەسەریان. ناکۆك بوون لەسەری. خوا ئێمەی لێ شارەزا

---

[1] احمد (٢٤٨/١)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[2] فتح الباري (٥٩٥/٨)، و تحفة الاحوذي (٢٧٧/٩)، النسائي في الكبرى (٥١٨/٦/٣٠٨).

[3] النساء (٧٨).

کرد. خەڵکی بەدوای ئێمەدا دێن لە جومعەدا جولەکە بەیانی‌و گاور دوای بەیانی)[1] واتە: (شەممەو یەك شەممە)ئەمە قسەی بوخاریە. وە لە وتەی موسلما هاتوە (خوا سەری تێکدا لەوانەی پێشمان لە هەینیا (شەممە بۆ جولەکەکان‌و یەك شەممە بۆ گاورەکان. خودا ئێمەی هێناو شارەزای کردین لە ڕۆژی هەینی (الجمعة). کرا بە هەینی‌و شەممەو یەك شەممە. و هەر بەو شێوەیە لەدوای ئێمەون لە ڕۆژی قیامەتدا، ئێمە دواین کەسین لە خەڵکی دنیاو یەکەمیشین لە ڕۆژی قیامەتدا. لەپێش هەموو خەڵکی بڕیار ئەدرێ لە نێوانیاندا[2].

## فەرمان بە گرنگی دان‌و ڕۆشتن بەرەو یادی خوا

خوای گەورە فەرمانی داوە بە موسوڵمانان کە کۆببنەوە بۆ عیبادەت کردنی لە ڕۆژی هەینیا وە فەرموویەتی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا نُودِيَ لِلصَّلَوٰةِ مِن يَوۡمِ ٱلۡجُمُعَةِ فَٱسۡعَوۡاْ إِلَىٰ ذِكۡرِ ٱللَّهِ وَذَرُواْ ٱلۡبَيۡعَۚ ذَٰلِكُمۡ خَيۡرٞ لَّكُمۡ إِن كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ﴾ ئەی گەلی خاوەن باوەڕان! هەر وەختێ لە ڕۆژی هەینی بۆ نوێژی هەینی بانگ ئەدرێ ئێوە بەپەلە بەرەو یادی خوا بچن‌و کڕین‌و فرۆشتن وێڵ کەن گەر بزانن ئەمە بۆ ئێوە چاکترە. واتە: زوکەن بڕۆن گرنگی بدەن بە خواناسی ڕۆژی هەینی. وە مەبەست لێرەدا بە (السعی) ڕاکردن نیە بۆ نوێژی هەینی، بەڵکو مەبەست گرنگی پێدانیەتی وەك خوای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَمَنۡ أَرَادَ ٱلۡأٓخِرَةَ وَسَعَىٰ لَهَا سَعۡيَهَا وَهُوَ مُؤۡمِنٞ﴾[3]، واتە: هەر کەسێکیش مەبەستی ڕۆژی دوایی بوبێت وە هەوڵی بۆ بدا بەو جۆرەی شایستەی ئەوەو باوەڕداریش بێت. عومەری کوڕی خەتاب‌و ئیبنومەسعود ئەیان خوێندەوە (فأمضوا الى ذكر الله)[4] واتە: بەرەو یادی خوا بڕۆن. چونکە ڕۆشتن بەپەلە بۆ نوێژ نەهی لێ کراوەو باش نیە. وەك بوخاری‌و موسلم لە هەردوو سەحیحەکەیاندا هێناویانە. لە ئەبوهورەیرەوە ئەویش لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرمووی: (وەختێ گوێتان لە بانگ بوو بچن بۆ نوێژ لەسەرخۆو ئارام بن‌و پەلە مەکەن ئەوەی کە پێیا گەیشتن بیکەن‌و ئەوەیشی کە فریا نەکەوتن (پیا نەگەیشتن) تەواوی کەن)[5] بوخاری ڕیوایەتی کردوە. وە لە ئەبوقەتادەوە دەڵێت: (کاتێ ئێمە نوێژمان ئەکرد لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) لەو کاتەدا گوێی لە دەنگە دەنگی چەند پیاوێك بوو کە نوێژەکەی تەواو کرد فەرمووی: (ئەوە چیتان بوو؟) ووتیان: پەلەمان کرد بگەین بە نوێژا. فەرمووی: (وامەکەن، وەختێ

---

[1] فتح الباري (١١/٥٢٦)، مسلم (٢/٥٨٦)

[2] مسلم (٢/٥٨٦).

[3] الاسراء (١٩).

[4] الطبري (٢٣/٣١٨).

[5] فتح الباري (١/١٣٨)، مسلم (١/٤٢٠).

هاتن بۆ نوێژ بچن بەڕێدا بە ئارامی ئەگەر گەیشتن بە نوێژا بیکەن وە ئەگەر فریاش نەکەوتن تەواوی بکەن) بوخاریو موسلم ڕیوایەتیان کردوە.[1] حەسەن دەڵێت: سوێند بە خوا مەبەست بەپەلە ڕۆشتن نیە بۆ نوێژ وە پێیان گوتراوە کە بەپەلە نەچن بۆ نوێژ بەڵکو ئەبێ بە ئارامیو لەسەرخۆو ملکەچیو دڵو دەرونێکی سافەوە بڕۆن. قەتادە لەم ئایەتەدا: ﴿فَٱسۡعَوۡاْ إِلَىٰ ذِكۡرِ ٱللَّهِ﴾ دەڵێت: واتە: پەلە بکە بە دڵو کردار ئەوە ڕۆشتن بۆ نوێژ.[2] وە مانای ئەم ئایەتەی ئەکرد کە ئەفەرموێت: ﴿فَلَمَّا بَلَغَ مَعَهُ ٱلسَّعۡىَ﴾[3]، واتە: جا کاتێ ئەو (کوڕە گەورە بووتا) گەیشتە ئەوەی ئیشو کار بکات لەگەڵی (ئیبراهیم)دا. یانی ڕۆشتن لەگەڵی. ڕیوایەت کراوە لە محمدی کوڕی کەعبو زەیدی کوڕی ئەسلەمو کەسانی تریشەوە هەر بەم شێوەیە[4] وە سوننەتە بۆ کەسێ کە هات بۆ نوێژی هەینی پێش هاتنی خۆی بشورێ چونکە لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتوە لە عبداللە ی کوڕی عومەرەوە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (وەختێ یەکێکتان هات بۆ نوێژی هەینی با خۆی بشورێ)[5] وە هەمیسان لە بوخاریو موسلمەوە کە لە ئەبوسەعیدەوە ڕیوایەتیان کردوە دەڵێت: پێغەمبەری خودا فەرموویەتی: (خۆ شوردنی ڕۆژی هەینی پێویستە لەسەر هەموو کەسێ کە باڵغ ببێ)[6] وە لە ئەبوهورەیرەوە دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (هەقی خوا لەسەر هەموو موسوڵمانێ ئەوەیە کە هەموو حەوت ڕۆژ جارێك خۆ بشورێ، واتە: سەرو لاشەی بشورێ) موسلم ڕیوایەتی کردوە.[7] وە لە جابیرەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (لەسەر هەموو پیاوێکی موسوڵمانە لە هەموو هەفتەیەکا ڕۆژێك خۆشوردن کە ئەویش ڕۆژی هەینیە) ئەحمدو نەسائیو ئیبنوحەبان ڕیوایەتیان کردووە[8].

### ڕێزی هەینی (الجمعة)

ئیمامی ئەحمد ڕیوایەتی کردوە لە ئەوسی کوڕی ئەوسی سەقەفیەوە (الثقفي) دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەری خودا بوو (ﷺ) ئەی فەرموو: (هەرکەسێ ڕۆژی هەینی جلو بەرگی خۆی بشورێو پەلە بکاو زوو بچێو بە سواری نەڕوا (بە پێ بچێ) نزیك بێتەوە لە پێش نوێژ گوێ بگرێو قسە نەکا بە

---

[1] فتح الباري (٢/١٣٧)، مسلم (١/٤٢٢).

[2] الطبري (٢٣/٣٨٠)

[3] الصافات (١٠٢).

[4] الطبري (٢٣/٣٨٣)، و الدر المنثور (٨،١٦٢)

[5] فتح الباري (٢/٤١٥)، مسلم (٢/٥٧٩).

[6] فتح الباري (٢/٤١٥)، مسلم (٢/٥٨٠).

[7] مسلم (٢/٥٨٢).

[8] احمد (٣/٣٠٤)، النسائي (٣/٩٣)، و ابن حبان (٢/٢٦٢)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

هەموو هەنگاوێك پاداشتی ساڵێكی ڕۆژوگرتن‌و نوێژ كردنی هەیە).[1] وە ئەم فەرمودەیە بە وتەو ڕێگای تر هاتوە وە چوار لە زانایانی فەرموودە هێناویانە تیرمیزی بە چاكی داناوە (حسنة الترمیزي)[2] وە لە ئەبوهورەیرەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: (هەركەسێ خۆی بشورێ وەك خۆ شۆرین لە لەشی پیس لە ڕۆژی هەینیا پاشان لە كاتی یەكەما بڕوا بۆ جومعە وەك ئەوە وایە وشترێكی دابێ. وە هەركەسێ لە كاتی دووەما بڕوا وەك ئەوە وایە مانگایەكی دابێ. وە هەركەسێ لە كاتی سێهەما بڕوا وەك ئەوە وایە بەرانێكی دابێ وە هەركەسێ لە كاتی چوارهەما بڕوا وەك ئەوە وایە مریشكێكی دابێ وە هەركەسێ لە كاتی پێنج هەما بڕوا وەك ئەوە وایە هێلكەیەكی دابێ. وەختێ پێش نوێژ (الامام) دەرچوو فریشتەكان ئامادە ئەبن‌و گوێ ئەگرن بۆ ئامۆژگاری (الذكر)) بوخاری‌و موسلم هێناویانە.[3] وە سونەتە چاكترین جل‌و بەرگی لەبەركات‌و خۆی بۆن خۆش كاو سیواك بكات‌و خۆی پاك‌و خاوێن كا وە لە فەرمودەكەی ئەبوسەعید كە لە پێشەوە باس كرا (خۆ شوردنی ڕۆژی هەینی پێویستە لەسەر هەموو كەسێكی باڵغ وە لە بۆن خۆشیماڵیش بدات لە خۆی)[4] وە ئیمامی ئەحمد ڕیوایەتی كردوە لە ئەبوئەیوبی ئەنساریەوە دەڵێت: بیستم لە پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) ئەی فەرموو: (هەركەسێ ڕۆژی هەینی خۆی شۆردو لە بۆن خۆشی ماڵەوەی لە خۆی دا گەر هەیان بوو وە چاكترین جل‌و بەرگی لەبەر كردو پاشان چووە دەرەوە بۆ مزگەوت ئەگەر بۆی كرا (لوا) نوێژ بكاو ئازاری كەس نەداو بێ دەنگ بێ هەتا كاتێ پێش نوێژەكەی هەڵدەسێ نوێژ دەكا ئەبێتە هۆی كەفارەتی گوناهی ئەو نێوانە هەتا هەینیەكەی تر)[5] وە لە سونەنی ئەبوداودو ئیبنوماجەدا هاتوە لە عبدالله ی كوڕی سەلامەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) كە بیستویەتی كە لە پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) لەسەر دوانگە (مینبر) ئەی فەرموو: (چی دەبوو گەر یەكێك لە ئێوە دوو دەست جل‌و بەرگی بكڕیایە بۆ نوێژی هەینی بێجگە لە جل‌و بەرگی ئیشی)[6] وە لە عائیشەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) وتاری ئەدا لە ڕۆژی هەینیا خەڵكەكەی بینی جل‌و بەرگی ئیشیان لەبەردایە (جل‌و بەرگێكی

---

[1] احمد (٤/٩)، فەرموودەیەكی سەحیحە.

[2] ابوداود (١/٤٦)–٢٤٧)، و تحفة الاحوذي (٣/٣) و النسائي (٩٥/٩٧)، و ابن ماجة (١/٢٤٦)، فەرموودەیەكی سەحیحە.

[3] فتح الباري (٢/٤٢٥)، مسلم (٢/٥٨٢).

[4] فتح الباري (٢/٤٢٣).

[5] احمد (٥/٤٢٠)، فەرموودەیەكی حەسەنە.

[6] ابوداود (١/٦٥٠)، و ابن ماجة (١/٣٤٨)، فەرموودەیەكی سەحیحە.

ڕەش‌و سپی بوو (النمار)) فەرموی: (چی دەبوو گەر هەریەکێ لە ئێوە دوو قات (دەست) جل‌و بەرگی ببوایە بۆ هەینیەکەی بێجگە لە جل‌و بەرگی کارەکەی)[1].

**مەبەست بە بانگ، بانگدانی وتارە (الخطبة)**

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿إِذَا نُودِيَ لِلصَّلَوٰةِ مِن يَوْمِ ٱلْجُمُعَةِ﴾ مەبەست بەم بانگە بانگی دووهەمە وەختێ کە پێغەمبەر(ﷺ) ئەڕۆشت‌و لەسەر دوانگە (منبر) دادەنیشت لەلای ئەوا ئەو بانگە ئەدرا. وە ئەو بانگەیش لەو کاتەدا لە لایدا ئەدرا (لای دەرگاکە دا بوو) ئەوەی کە مەبەست بوو ئەمە بوو. بەڵام بانگی یەکەم کە گەورەی موسوڵمانان عوسمانی کوڕی عەفان (ڕەزای خوای لێ بێ) زیادی کرد ئەم بانگە لەبەر زۆری خەڵکەکە بوو وەك بوخاری ڕیوایەتی کردوە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێت: ئادەم بۆی گێڕاینەوە کە کوڕی ئەبو ئەیاسە. ئیبنوئەبی زیئب بۆی گێڕاینەوە لە زوهەریەوە لە سائبی کوڕی یەزیدەوە دەڵێت: بانگ دان لە ڕۆژی هەینیا لە یەکەم جارەوە وەختێ کە پێش نوێژ دادەنیشت لەسەر دوانگە ئەدرا (لە زەمانی پێغەمبەری خوداو (ﷺ) ئەبوبەکرو عومەرا، کاتێ عوسمان بووە جێ نشین پاش ماوەیەك خەڵك زۆر بوو، بانگی دووهەمی زیاد کرد لەسەر زەورا ئەدرا، یانی لەسەر خانویەك کە پێیان ئەووت زوراء[2] بەرزترین خانوو بوو لە نزیك مزگەوت لەناو مەدینەدا.

**پاش بانگ دانی هەینی کڕین‌و فرۆشتن دروست نیە (حەرام) بەڵام دوای تەواو بوونی نوێژی هەینی (الجمعة) گەڕان بە شوێنی ڕۆزیا ڕێگا دراوە**

خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَذَرُوا۟ ٱلْبَيْعَ﴾ واتە: خۆ ئامادەکەن‌و بڕۆن یادی خودا بکەن‌و واز لە کڕین‌و فرۆشتن بێنن وەختێ بانگی دا بۆ نوێژ. لەبەرئەوە هەموو زانایان کۆن (ڕەزای خوایان لێ بێ) لەسەر نادروستی کڕین‌و فرۆشتن دوای بانگی دووهەم وە خوا ئەفەرموێت: ﴿ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ﴾ واتە: وازهێنانتان لە کڕین‌و فرۆشتن‌و چونتان بۆ خواناسی‌و نوێژکردن چاکترە بۆتان واتە: لە دنیاو قیامەتا، ئەگەر بزانن. وە ئەفەرموێت: ﴿فَإِذَا قُضِيَتِ ٱلصَّلَوٰةُ فَٱنتَشِرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ وَٱبْتَغُوا۟ مِن فَضْلِ ٱللَّهِ وَٱذْكُرُوا۟ ٱللَّهَ كَثِيرًا لَّعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾ هەرکە لە نوێژ بوونەوە بە زەویدا بڵاوببنەوەو بۆ چاکەی خودا بکۆشن‌و گەلێك یادی خودا بکەن، شایەتا ڕزگاریتان بێت. واتە: نوێژ تەواو بوو ﴿فَٱنتَشِرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ وَٱبْتَغُوا۟ مِن فَضْلِ ٱللَّهِ﴾ وەختێ کە کڕین‌و فرۆشتنیان لێ قەدەغە کرا (حەرام کرا) دوای بانگ‌و

---

[1] ابن ماجة (٣٤٩/١)، فەرموودەیەکی حەسەنە.

[2] فتح الباري (٤٥٧/٢).

فەرمانیان پێکرا بۆ کۆبونەوە بۆ نوێژ، ڕێگا دران دوای نوێژ بڵاوە بکەن بەسەر زەمینا بۆ گەڕان بە شوێنی بژێوی ژیاندا وەك چۆن عەراکی کوڕی مالك (ڕەزای خوای لێ بێ) وەختێ نوێژی کرد چووە دەرەوە لە دەرگای مزگەوتا وەستاو دەڵێت: ئەی خوایە وەڵامی بانگی تۆم دایەوە وە نوێژە فەرزەکەیشم کرد وە چوومە دەرەوە بەو شێوەیەی کە فەرمانت پێ کردم. ڕۆزیم بدە بە چاکەی خۆت وە تۆ چاکترین ڕۆزیدەری. ئیبنوئەبی حاتم ڕیوایەتی کردوە.[1] وە خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَٱذۡكُرُواْ ٱللَّهَ كَثِيرٗا لَّعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ﴾ واتە: لە وەختی کڕینو فرۆشتانو لەکاتی وەرگرتنو پێدانتاندا زۆر یادی خودا بکەنو لێی بپاڕێنەوە، با دنیا زۆر سەرقاڵتان نەکا لەوەی کە سوودتان پێ دەگەیەنێ لە ڕۆژی دواییدا. بۆیە لە فەرموودەدا هاتوە: (هەرکەسێ چووە بازاڕێك لە بازاڕەکان دەڵێت لااله الا الله وحده لا شريك له، له الملك و له الحمد وهو على كل شيءٍ قدير. خوا هەزار هەزار چاکەی بۆ نوسیوە وە هەزار هەزار خراپەی (گوناهی) لێ سڕیوەتەوە).[2] موجاهد دەڵێت: بەندە نابێتە ئەوانەی کە زۆر یادی خودا ئەکەن هەتا لە هەڵسانو دانیشتنو پاڵکەوتندا یادی خودا نەکا. یانی لە هەڵسانو دانیشتنو پاڵکەوتنا دەبێ یادی خودا بکات. ئینجا دەبێتە ئەوانەی کە یادی خودا دەکەن.

﴿وَإِذَا رَأَوۡاْ تِجَٰرَةً أَوۡ لَهۡوًا ٱنفَضُّوٓاْ إِلَيۡهَا وَتَرَكُوكَ قَآئِمٗاۚ قُلۡ مَا عِندَ ٱللَّهِ خَيۡرٞ مِّنَ ٱللَّهۡوِ وَمِنَ ٱلتِّجَٰرَةِۚ وَٱللَّهُ خَيۡرُ ٱلرَّٰزِقِينَ ١١﴾

## دروست نیە چوونە دەر لە مزگەوت کە وتارخوێن وتار ئەدات

خودای گەورە سەرزەنشتی موسوڵمانان دەکا لەو چوونە دەرەوە کە ڕویدا لەکاتی وتارا لە ڕۆژی هەینیا بۆ لای ئەو کاروانە بازرگانیە کە گەیشتە مەدینە لەو وەختەدا ئەفەرموێت: ﴿وَإِذَا رَأَوۡاْ تِجَٰرَةً أَوۡ لَهۡوًا ٱنفَضُّوٓاْ إِلَيۡهَا وَتَرَكُوكَ قَآئِمٗاۚ قُلۡ مَا عِندَ ٱللَّهِ خَيۡرٞ مِّنَ ٱللَّهۡوِ وَمِنَ ٱلتِّجَٰرَةِۚ وَٱللَّهُ خَيۡرُ ٱلرَّٰزِقِينَ﴾ هەرکاتێ دییان مامەڵەیەك یان گەمەیەك، بەرەو ئەوێ بڵاو دەبنو تۆ بە پێوە بەجێ دێڵن. بڵێ: ئەوەی لای خودایە لە گەمەشو لە بازرگانیش چاکترەو خوا چاکترین ڕۆزی دەرە. واتە: لەسەر دوانگە وتارت ئەدا. چەند کەس لە تابیعین بەم شێوەیە باسیان کردوە لەوانە ئەبوعالیەو زەیدی کوڕی ئەسلەمو قەتادە[3] موقاتلی کوڕی حەیان دەڵێت: کە ئەو بازرگانیەماڵی دەحییەی کوڕی خەلیفە بووە پێش موسوڵمان بوونی. بە تەپڵ لێدانەوە هات خەڵکەکە لە مزگەوت هاتنە دەرەوەو پێغەمبەریان (ﷺ) کە لەسەر

---

[1] القرطبي (١٨/١٠٨).

[2] تحفة الاحوذي (٩/٣٨٦)، ئەم فەرمودەیە سەنەدەکانی لاوازە.

[3] الطبري (٢٣/٣٨٧).

دوانگەکە وەستا بوو بەجێ هێشت چەند کەسێکیان نەبێ. ئەو هەواڵە لەو بارەیەوە ڕاست بوو ئیمامی ئەحمد ڕیوایەتی کردوە لە سالمی کوڕی ئەبی جەعدەوە لە جابیرەوە دەڵێت: کاروانی مورە گەیشتە مەدینە لەو کاتەدا پێغەمبەری خوا (ﷺ) وتاری ئەدا خەڵکەکە چوونە دەرەوە دوانزە کەس مایەوە ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە ﴿وَإِذَا رَأَوْاْ تِجَـٰرَةً أَوْ لَهْوًا ٱنفَضُّوٓاْ إِلَيْهَا﴾[1] لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە لە فەرمودەکەی سالمدا بەو شێوەیە.[2] وە لەم فەرمودەی خوای مەزنەدا ﴿وَتَرَكُوكَ قَآئِمًا﴾ بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە وتارخوێن لە ڕۆژی هەینیدا بە پێوە وتار ئەدا. موسلم ڕیوایەتی کردوە لە سەحیحەکەیدا لە جابیری کوڕی سەمرەوە (سمرة) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) دوو وتاری ئەدا دادەنیشت لەنێوانیانداو قورئانی دەخوێندو ئامۆژگاری خەڵکی دەکرد.[3] وە خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿قُلْ مَا عِندَ ٱللَّهِ﴾ واتە: ئەو پاداشتەی لە ڕۆژی دوایدا هەیە ﴿خَيْرٌ مِّنَ ٱللَّهْوِ وَمِنَ ٱلتِّجَـٰرَةِ ۚ وَٱللَّهُ خَيْرُ ٱلرَّٰزِقِينَ﴾ بۆ کەسێ کە پشت بە خودا ببەستێ‌و داوای ڕۆزی لەکاتی خۆیا لە خودا بکا.

## تەفسری سورەتی (المنافقون)

## لە مەدینە هاتووەتە خوارەوە

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَـٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿إِذَا جَآءَكَ ٱلْمُنَـٰفِقُونَ قَالُواْ نَشْهَدُ إِنَّكَ لَرَسُولُ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ إِنَّكَ لَرَسُولُهُۥ وَٱللَّهُ يَشْهَدُ إِنَّ ٱلْمُنَـٰفِقِينَ لَكَـٰذِبُونَ ﴿١﴾ ٱتَّخَذُوٓاْ أَيْمَـٰنَهُمْ جُنَّةً فَصَدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّهُمْ سَآءَ مَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ ﴿٢﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ ءَامَنُواْ ثُمَّ كَفَرُواْ فَطُبِعَ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ فَهُمْ لَا يَفْقَهُونَ ﴿٣﴾ ۞ وَإِذَا رَأَيْتَهُمْ تُعْجِبُكَ أَجْسَامُهُمْ ۖ وَإِن يَقُولُواْ تَسْمَعْ لِقَوْلِهِمْ ۖ كَأَنَّهُمْ خُشُبٌ مُّسَنَّدَةٌ ۖ يَحْسَبُونَ كُلَّ صَيْحَةٍ عَلَيْهِمْ ۚ هُمُ ٱلْعَدُوُّ فَٱحْذَرْهُمْ ۚ قَـٰتَلَهُمُ ٱللَّهُ ۖ أَنَّىٰ يُؤْفَكُونَ ﴿٤﴾﴾

خودای گەورە باسی دووڕووەکان دەکات‌وئەفەرموێت ئەوانە کاتێ دێن بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) تەنها بە دەم موسوڵمانن کەچی لە ڕاستیدا لە ناوەوە بەو شێوەیە نین بەڵکو بە پێچەوانەی ئەوەن کە ئەیلێن. بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِذَا جَآءَكَ ٱلْمُنَـٰفِقُونَ قَالُواْ نَشْهَدُ إِنَّكَ لَرَسُولُ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ إِنَّكَ لَرَسُولُهُۥ وَٱللَّهُ يَشْهَدُ إِنَّ ٱلْمُنَـٰفِقِينَ لَكَـٰذِبُونَ﴾ کاتێ دووڕوو دێنە لای تۆ، ئەڵێن: شایەتیت بۆ دەدەین کە تۆ پێغەمبەری خودای، خوداش دەزانێ کە تۆ پێغەمبەری ئەوی‌و خودا شایەتە کە (بەڕاستی)

[1] احمد (٣١٣/٣)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[2] فتح الباري (٥١١/٨)، و مسلم (٥٩٠/٢).

[3] مسلم (٥٨٩/٢).

هەرچی دووڕووەکانە درۆزنن. واتە: کاتێ هاتنە لات خۆیان بە موسوڵمان نیشان ئەدەن وەك موسوڵمان هەڵس‌و کەوت ئەکەن لەبەر تۆ کەچی ئەوەی ئەیڵێن وانیە بۆیەخوای گەورە بە جوملەیەکی موعتەرەزە هەواڵ ئەدا کە ئەو (یانی محمد(ﷺ)) پێغەمبەری خودایە (ﷺ) فەرموویەتی: ﴿وَٱللَّهُ يَعْلَمُ إِنَّكَ لَرَسُولُهُۥ﴾ پاشان فەرموویەتی: ﴿وَٱللَّهُ يَشْهَدُ إِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ لَكَٰذِبُونَ﴾ واتە: درۆ دەکەن لەو قسەی کە گوتویانە، هەرچەندە لە ڕوو وا دەردەکەوێ، چونکە ئەوانە باوەڕیان بەو قسەیە نیە کە ئەیڵێن لەبەر ئەوەی کە لە دڵا ڕاست ناکەن خوای گەورە بە درۆیان ئەخاتەوە، وە ئەفەرموێت: ﴿ٱتَّخَذُوٓاْ أَيْمَٰنَهُمْ جُنَّةً فَصَدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّهُمْ سَآءَ مَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ﴾ سوێندی خۆیان کردۆتە قەڵغانی خۆیان‌و لەمپەرن لە ڕێگەی خوداو ئاکاریان زۆر نالەبارە. واتە: خۆیان دەپارێزن لە مەردم بە سوێندی درۆ خواردن‌و پاکانە کردن تا ئەوەی ئەیڵێن باوەڕیان پێ بکرێ، بۆ ئەوەی ئەو کەسانەی کە شارەزای ئاکاریان نین بیان خەڵەتێنن وا بزانن کە ئەمانە موسوڵمانن. چاویان لێ بکەن لەوەی ئەوان دەیکەن باوەڕ بەو قسانە بکەن کە ئەوان ئەیڵێن. بە بەردەوام خەریکی ئاژاوە نانەوەن لەناو ئیسلام‌و موسوڵمانانا. بەو شێوەیە ئەبنە هۆی گیرو گرفت‌و زیانێکی زۆر ئەگەیەنن بە خەڵکی‌و سەری لێ دەشێوێنن. بۆیە خودای مەزن فەرموویەتی: ﴿فَصَدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّهُمْ سَآءَ مَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ﴾[1] وە ئەفەرموێت: ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ ءَامَنُواْ ثُمَّ كَفَرُواْ فَطُبِعَ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ فَهُمْ لَا يَفْقَهُونَ﴾ چونکە ئەمان لە پێشا باوەڕیان هێناوەو پاشان لە دین لایانداوە، جا سەر دڵیان مۆر کراوە لە هیچ ناگەن. واتە: لەبەر ئەوە بوونەتە دووڕوو چونکە لەپاش باوەڕ هێنان پەشیمان بوونەتەوەو بوون بە خوانەناس‌و ڕێگای ڕاستیان گۆڕیوەتەوە بە ڕێگای لاروو چەوت‌و گومڕایی. خودایش مۆری ناوە بەسەر دڵیاناو لە هیچ تێ ناگەن. خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَإِذَا رَأَيْتَهُمْ تُعْجِبُكَ أَجْسَامُهُمْ ۖ وَإِن يَقُولُواْ تَسْمَعْ لِقَوْلِهِمْ ۖ كَأَنَّهُمْ خُشُبٌ مُّسَنَّدَةٌ ۖ يَحْسَبُونَ كُلَّ صَيْحَةٍ عَلَيْهِمْ ۚ هُمُ ٱلْعَدُوُّ فَٱحْذَرْهُمْ ۚ قَٰتَلَهُمُ ٱللَّهُ ۖ أَنَّىٰ يُؤْفَكُونَ﴾ ئەگەر چاویشت پێ کەوتن لە قەڵافەتیان سەیرت دێ. کە قسە دەکەن‌و تۆ قسەکانیان دەبیسی ئەڵێی دارن بە دیوار هەڵپەسێراون. هەر هاوارێك لە دژی خۆیان دەزانن، ئەوانە دوژمنتن، تۆ خۆیان لێ بپارێزە. خودا بیانکوژێ ئەمانە ڕوو لە کوێ دەکەن؟. واتە: کاتێ ئەیان بینی بەژن‌و باڵا جوان‌و قسەخۆش‌و زمان لوسن. گەر کەسێ گوێی لێیان بێ باش گوێیان بۆ ئەگرێ لەبەر زمان لوسیان. ئەوانە لەگەڵ ئەم بیچم‌و قسە لوسی یەیان زۆر لاوازو ترسنۆك‌و بێ هورەن‌و هەمیشە دڵیان ئۆقرە ناگرێ‌و بێ ئارامە. بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی:

---

[1] الطبري (٣٩٤/٢٣).

﴿يَحْسَبُونَ كُلَّ صَيْحَةٍ عَلَيْهِمْ﴾ هەرکاتێ شتێ ڕوبدا یا ترسێ ڕووبدات دنیایان لێ دێتە یەك لە ترسانا وادەزانن توشی ئەوان دەبێ وەك خودا فەرموویەتی: ﴿أَشِحَّةً عَلَيْكُمْ فَإِذَا جَاءَ الْخَوْفُ رَأَيْتَهُمْ يَنظُرُونَ إِلَيْكَ تَدُورُ أَعْيُنُهُمْ كَالَّذِي يُغْشَىٰ عَلَيْهِ مِنَ الْمَوْتِ فَإِذَا ذَهَبَ الْخَوْفُ سَلَقُوكُم بِأَلْسِنَةٍ حِدَادٍ أَشِحَّةً عَلَى الْخَيْرِ أُولَٰئِكَ لَمْ يُؤْمِنُوا فَأَحْبَطَ اللَّهُ أَعْمَالَهُمْ وَكَانَ ذَٰلِكَ عَلَى اللَّهِ يَسِيرًا﴾[1]، واتە: لە ئاستی ئێوەدا (موسوڵمانان) چروکن ئینجا کاتێ (بەهۆی جەنگەوە) ترس‌و بیم پەیدا بێت دەیان بینی بە جۆرێ سەیرت دەکەن (لە ترسی جەنگ) چاویان بەم لاولادا دەسوڕێ بە وێنەی کەسێك لە سەرە مەرگدا بێهۆشی بەسەردا بێ بەڵام کاتێ ترسەکە ڕۆشت‌و نەما بە زمانی تیژ زمانتان لێ درێژ دەکەن (وە داوای غەنیمەتتان لێ دەکەن) کەچی چروك‌و ڕژدن لەسەر ماڵ‌و غەنیمەت ئا ئەوانە باوەڕیان نەهێنا بوو بۆیە خوا کردەوەیانی پوچەڵ کردوەوە ئەمە بەلای خواوە (کارێکی) ئاسانە. واتە: ئەوانە وەك لاشەیەکی بێ گیان وان‌و بێ کەڵکن لەبەر ئەمەیە خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿هُمُ الْعَدُوُّ فَاحْذَرْهُمْ قَاتَلَهُمُ اللَّهُ أَنَّىٰ يُؤْفَكُونَ﴾ واتە: چۆن لە ڕێی ڕاست لادەدەن‌و ڕێی گومڕایی دەگرنە بەر. ئیمامی ئەحمد ڕیوایەتی کردوە لە ئەبوهورەیرەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (دووڕووەکان چەند نیشانەیەکیان هەیە پێی دەناسرێن. سەلام کردنیان لەعنەتە خواردنیان تالانیە. دەست کەوتیان خەیانەت‌و لادان‌و بردنی ماڵە بە حەرامی. نزیکی مزگەوت ناکەونەوە مەگین بە تەمەڵی‌و قورس‌و گرانی. نایەن بۆ نوێژ لە کۆتایەکەیا نەبێ‌و لوت بەرزن‌و تێکەڵی کەس ناکەون‌و نایانەوێ کەسیش تێکەڵاویان بێ (حەز ناکەن لەگەڵ کەس بن‌و کەسیش لەگەڵیان بێ) بە شەو لاوازن‌و بە ڕۆژ دەم بازن) یەزیدی کوڕی مەڕڕە (مرّة) دەڵێت: هیچ لێ نەهاتووو بێ کەڵکن لەو ڕۆژەدا.[2]

﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْا يَسْتَغْفِرْ لَكُمْ رَسُولُ اللَّهِ لَوَّوْا رُءُوسَهُمْ وَرَأَيْتَهُمْ يَصُدُّونَ وَهُم مُّسْتَكْبِرُونَ ﴿٥﴾ سَوَاءٌ عَلَيْهِمْ أَسْتَغْفَرْتَ لَهُمْ أَمْ لَمْ تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ لَن يَغْفِرَ اللَّهُ لَهُمْ إِنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الْفَاسِقِينَ ﴿٦﴾ هُمُ الَّذِينَ يَقُولُونَ لَا تُنفِقُوا عَلَىٰ مَنْ عِندَ رَسُولِ اللَّهِ حَتَّىٰ يَنفَضُّوا وَلِلَّهِ خَزَائِنُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَلَٰكِنَّ الْمُنَافِقِينَ لَا يَفْقَهُونَ ﴿٧﴾ يَقُولُونَ لَئِن رَّجَعْنَا إِلَى الْمَدِينَةِ لَيُخْرِجَنَّ الْأَعَزُّ مِنْهَا الْأَذَلَّ وَلِلَّهِ الْعِزَّةُ وَلِرَسُولِهِ وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَلَٰكِنَّ الْمُنَافِقِينَ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٨﴾﴾

---

[1] الاحزاب (١٩).

[2] احمد (٢/٢٩٣)، فەرموودەیەکی لاوازە.

**پشت هەڵکردنیان لە داواکردنی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ لێ بوردنیان و ماڵ نەدان بەوانەی کە لە لای پێغەمبەرن (ﷺ)**

خودای مەزن باسی ئەو دووڕووانە دەکات نەفرینی خوایان لێ بێ ئەفەرموێت: ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْا يَسْتَغْفِرْ لَكُمْ رَسُولُ اللَّهِ لَوَّوْا رُءُوسَهُمْ وَرَأَيْتَهُمْ يَصُدُّونَ وَهُم مُّسْتَكْبِرُونَ﴾ خۆ ئەگەر پێشیان بوترێ: وەرن پێغەمبەری خودا داوای بەخشینتان بۆ دەکا، سەر بادەدەن، دەشیانبینی فیز دەنوێنن و خۆ لادەدەن. واتە: دەبنە لەمپەرو پشت هەڵدەکەن و خۆ لادەدەن و گەر پێیان بڵێن وەرن پێغەمبەر داوای لێ بوردنتان بۆ دەکا. فیز دەنوێنن و گرنگی نادەن بەوەی کە پێیان ئەڵێن و بە کەم بایەخ سەیری دەکەن. بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَرَأَيْتَهُمْ يَصُدُّونَ وَهُم مُّسْتَكْبِرُونَ﴾ پاشان خودا تۆڵەی لێ سەندون لەسەر ئەو ڕەفتارە ناشرینەیان و فەرموویەتی: ﴿سَوَاءٌ عَلَيْهِمْ أَسْتَغْفَرْتَ لَهُمْ أَمْ لَمْ تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ لَن يَغْفِرَ اللَّهُ لَهُمْ إِنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الْفَاسِقِينَ﴾ ئەگەر ئەتۆ داوای بەخشینیان بۆ بکەی، یان داوای بەخشینیان نەکەی، بۆ ئەوان جیاوازی نیە، هەرگیز خودا نایانبەخشێ، خودا گرۆی لە ڕێ لادەران بەرەو خۆی شارەزا ناکات. ﴿هُمُ الَّذِينَ يَقُولُونَ لَا تُنفِقُوا عَلَىٰ مَنْ عِندَ رَسُولِ اللَّهِ حَتَّىٰ يَنفَضُّوا وَلِلَّهِ خَزَائِنُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَلَٰكِنَّ الْمُنَافِقِينَ لَا يَفْقَهُونَ﴾ هەر ئەمانەشن کە ئەڵێن: شتێ مەدەن بەو کەسانەی کە لای پێغەمبەری خودان، هەتا بڵاوەی لێ دەکەن. هەموو سامان و گەنجینەی ئەم ئاسمان و زەمینەش سەر بە خودان. بەڵام ئەو دوڕوانە هیچ تێناگەن. ﴿يَقُولُونَ لَئِن رَّجَعْنَا إِلَى الْمَدِينَةِ لَيُخْرِجَنَّ الْأَعَزُّ مِنْهَا الْأَذَلَّ وَلِلَّهِ الْعِزَّةُ وَلِرَسُولِهِ وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَلَٰكِنَّ الْمُنَافِقِينَ لَا يَعْلَمُونَ﴾ ئەڵێن ئەگەر گەڕاینەوە بۆ مەدینە. بێ گومان بە دەستەڵاتان، ڕووت و لاتی لێ دەردەکەن دەستەڵاتیش هەر بۆ خوداو پێغەمبەری و کۆمەڵی باوەڕدارانە بەڵام ئەو دووڕوانە هیچێ نازانن. وەك خوای گەورە لە سورەتی بەرائەتا (براوە) فەرمووی کە لە پێشەوە باس کراو ئەو فەرمودانەشمان هێنا لەوێدا کە لەو بارەیەوە ڕیوایەت کرابوو. زۆر کەس لە زانا پێشینەکان باسیان کردوە کە ئەم ئایەتانە هەمووی لەسەر عبداللە ی کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول هاتوەتە خوار کە بەم زوانە خوا مەیلی لێ بێ باسی ئەکەین بە پشت و پەنای خوای گەورە. محمدی کوڕی ئیسحاق لە سیرەتەکەیا دەڵێت: وەختێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) گەیشتە مەدینە. یانی کاتێ گەڕایەوە لە غەزای ئوحود عبداللە ی کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول وەك ئیبنوشەهابی زوهەری بۆی گێڕامەوە هەموو ڕۆژی هەینیەك وتاری ئەدا گوێیان بۆ ئەگرت و ڕێزی خۆی و هۆزەکەشیان ئەگرت چونکە لەناو هۆزەکەیا جێگەی ڕێز بوو. کاتێ

پێغەمبەر(ﷺ) دانیشتایە لە ڕۆژی هەینیا ئەو وتاری ئەدا بۆخەڵکی. هەڵساو دەڵێت: ئەی خەڵکینە ئەمە پێغەمبەری خودایە(ﷺ) لەنێوانتانایە خودا بەهۆی ئەوەوە ڕێزیشی لە ئێوە ناوە سەربەرزی کردون یارمەتی بدەن‌و پشتگیری بکەن گوێ لە قسەی بگرن فەرمانی بەجێ بێنن‌و پاشان دادەنیشت هەتا ئەوەی کردی لە ڕۆژی ئوحودا کە کردی واتە: گەڕانەوەی بە سێ یەکی ئەو سوپاوە خەڵکی تریشی گەڕانەوە. هەڵسا وەك چۆن ئەوسا قسەی ئەکرد ویستی قسە بکا. موسوڵمانەکان. لە چەندین لاوە پۆشاکەکەیان گرت‌و وتیان: ئەی دوژمنی خودا تۆ پیاوی ئەوە نیت ئەوەی توانیت کردت. ئەویش هەڵساو ڕۆشت‌و بەناو خەڵکا هەنگاوی ئەناو ئەی گوت: بە خوا وەك ئەوەی قسەیەکی خراپم کردبێ کە هەڵساوم پشتگیری کارەکەی دەکەم، چەند پیاوێکی ئەنساری پێ گەیشت لە دەرگای مزگەوتدا وتیان: هاوار بۆ تۆ ئەوە چیتە؟ دەڵێت: هەڵسام پشتگیری کارەکەی لێ بکەم چەند کەسێ لە هاوەڵەکانی پەلاماریان دام‌و ڕایانکێشام قسەیان پێ وتم وەك ئەوەی قسەیەکی خراپم کردبێ کە هەڵسام پشتگیری لێ بکەم. وتیان هاوار بۆ تۆ بگەڕێوە بۆ لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) با داوای لێ بوردنت بۆ بکات. دەڵێت: سوێند بە خوا نامەوێ داوای لێ بوردنم بۆ بکات.[1] قەتادەو سودی وتیان: ئەم ئایەتە لەسەر عبدالله ی کوڕی ئوبەی هاتە خوارەوە، چونکە لاوێك (منداڵێك) لە خزمەکانی ڕۆشت بۆ لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) قسەیەکی بۆ گێڕایەوە کە عبدالله ی کوڕی ئوبەی کردبوی هەڕەشەی لە پێغەمبەرو (ﷺ) هاوەڵەکانی کردبوو. پێغەمبەریش (ﷺ) ناردی بە شوێنیاو هات سوێندی خوارد بە خوا کە قسەی وای نەگوتوەو پاکانەی خۆی کرد. ئەنساریەکان ڕویان کردە لاوەکەو سەرزەنشتی زۆریان کرد. خوای گەورە ئەوەی کە دەیبیسن لەبارەیەوە ناردیە خوارەوە. وە ووترا بەو دوژمنەی خودا گەر بهاتیتایە بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) داوای لێ بوردنت بکردایە لێی، ئەویش سەری با ئەدا واتە: ناچم بۆ لای.[2] یونسی کوڕی بوکەیر دەڵێت: لە ئیبنوئیسحاقەوە: محمدی کوڕی یەحیای کوڕی حەببان و عبدالله ی کوڕی ئەبوبەکرو عاسمی کوڕی عومەری کوڕی قەتادە لە ڕوداوی (قصة) بەنی موستەلەقدا بۆیان گێڕامەوە وتیان: پێغەمبەری خودامان (ﷺ) لەگەڵ بوو لەو شوێنەدا دوو کەس بوو بە شەڕیان لەسەر ئاو یەکێکیان جەهجاهی کوڕی سەعیدی غەفاری بوو کە کرێکاری عومەری کوڕی خەتاب بوو، ئەوی تریان سینانی کوڕی وەبەر بوو. ئیبنوئیسحاق دەڵێت: محمدی کوڕی یەحیای کوڕی حببان بۆی گێڕامەوە دەڵێت: کۆ بووینەوە لەسەر ئاوەکەو ئەو دوو کەسە شەڕیان بوو. سینان دەڵێت: ئەی ئەنساریەکان (هاواری کرد بچن بە دەمیەوە) جەهجایش دەڵێت: ئەی کۆچەریەکان لەو کاتا زەیدی کوڕی ئەرقەم‌و چەند کەسێك لە ئەنساریەکان لە لای عبدالله ی کوڕی ئوبەی بوون کاتێ

---

[1] ابن هشام (١١/٣)، فەرمودەیەکی مورسەلە.

[2] الطبري (٣٩٩/٢٣).

گوێی لە هاوارەکە بوو دەڵێت: ئەمانە لە وڵاتی خۆشمانا ئەچن بە گژمانا. سوێند بە خوا نمونەی ئێمەو ئەو قورەیشیە ئاوارانە وەك ئەو نمونەیەیە کە ووتراوە: سەگەلەکەت قەڵەو کەی دەتخوات. سوێند بە خوا ئەگەر گەڕاینەوە بۆ مەدینە بە دەستەڵاتان ڕووتو لاتەکان لە مەدینە دەردەکەن. پاشان ڕووی کردە ئەو کەسانەی کە لە دەوری بوون لە هۆزەکەیو دەڵێت: چیتان کرد بە خۆتانو وڵاتەکەتان دایە دەستیانو سامانەکەیشتان بەش کرد لێیان. سوێند بە خوا گەر وازیان لێ بێننو یارمەتیان نەدەن ئەم وڵاتەی ئێمە بەجێ ئەهێڵنو ئەڕۆن بۆ وڵاتێکی تر. زەیدی کوڕی ئەرقەم گوێی لەم قسانەی بوو، ڕۆشت بۆ لای پێغەمبەری خواو (ﷺ) قسەکانی عبدالله ی کوڕی ئوبەیی بۆ گێڕایەوە (زەید منداڵ بوو) عومەری کوڕی خەتابی لەلا بوو پێغەمبەر(ﷺ) هەواڵەکەی بۆ گێڕایەوە عومەر (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێت: ئەی پێغەمبەری خودا(فەرمان بدە بە عەبادی کوڕی بیشر با بدا لە ملی (یانی بیکوژێ)) پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (چۆن ئەی عومەر گەر مەردم گوتیان محمد (ﷺ) هاوەڵەکانی خۆی ئەکوژێ؟ بانگکە ئەی عومەر با بکەونە ڕێ وەختێ ئەم هەواڵە گەیشتە عبدالله ی کوڕی ئوبەی کە قسەکانی گەیشتوە بە پێغەمبەری خوا هات بۆ لایو پاکانەی کردو سوێندی خوارد کە وای نەگوتوە کە زەیدی کوڕی ئەرقەم لەبارەی ئەوەوە گوتویەتی. عبدالله لای هۆزەکەی جێی ڕێز بوو گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) بەشکو ئەم منداڵە چاك تێنەگەیشتبێ کە ئەم پیاوە چی گوتوەو لێی تێك چووبێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) کەوتە ڕێ ئەو شوێنەی بەجێ هێشت لە وەختێکدا کە کاتی ڕۆشتن نەبوو. ئوسەیدی کوڕی حەزیری پێ گەیشت (ڕەزای خوای لێ بێ) سەلامی کرد لە پێغەمبەر(ﷺ) زۆر بە ڕێزەوە پاشان دەڵێت: سوێند بە خوا لە کاتێکی نەگونجاودا کەوتویتە ڕێ کە تۆ سەفەری تیا ناکەی. پێغەمبەر خوا (ﷺ) فەرمووی: (ئایا ئەوەی هاوەڵەکەتِ گوتویەتی ئیبنوئوبەی پێت نەگەیشتوە؟ کە گوتویەتی کاتێ چوینە مەدینە دەستەڵاتدار، لاتو بێ دەستەڵات دەردەکا) دەڵێت: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) تۆ خاوەنی دەستەڵاتیو ئەو ڕوتو لاتو بێ دەستەڵاتو سەر شۆڕە، پاشان دەڵێت: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) نەرمی بنوێنە لەگەڵی سوێند بە خوا کە خوای گەورە تۆی نارد (بۆ لامان) ئێمە خەریك بووین بیکەین بە گەورەی خۆمان ئەو ئێستا وا دەبینێ کە تۆ لە گەورەیت خستوە (وا دەزانێ کە تۆ بوی بە هۆی ئەوەی کە نەبێ بە سەرۆکمان) پێغەمبەری خودا(ﷺ) خەڵکەکەی بەڕێ کرد هەتا ئێوارەو شەوەکەیشی هەر بەڕێوە بوون هەتا بەیانی. بەیانیەکەیشی هەتا چێشتەنگایەکی درەنگ پاشان ئەو خەڵکەی سەرقاڵ کرد لەو قسانەی کە کرا. ئەو مەردمە هەر دەستی دای لە زەمین خۆیان پێ نەگیراو خەوتن لەو وەختا سورەتی مونافیقین هاتە خوارەوە.[1] حافیز

[1] ابن هشام (٢/٢٩٠-٢٩٢)، فەرمودەیەکی مورسەلە.

ئەبوبەکری بەیهەقی دەڵێت: ئەبوعبدالله ی حافیز هەواڵی داینیّو ئەبوبەکری کوڕی ئیسحاقیش هەواڵی پیّ داینو بیشری کوڕی موسایش هەواڵی داینیّ. کە حومەیدی (الحُمَيدي) بۆی گێڕاینەوە سوفیانیش بۆی گێڕاینەوەو عەمری کوڕی دیناریش بۆی گێڕاینەوە دەڵێت: بیستم لە جابیری کوڕی عبدالله ئەی گوت: لە غەزایەکا لە خزمەت پێغەمبەرا بووین (ﷺ) پیاوێکی کۆچەری دای لە پیاوێکی ئەنساری. پیاوە ئەنساریەکە هاواری کردە ئەنساریەکان فریام کەون. کۆچەریەکەش دەڵێت: کۆچەریەکان فریام کەون، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (ئەم باسو هاواری نەفامیە چیە؟ وازی لیّ بێنن شتێکی بۆگەنە) عبدالله کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول دەڵێت: ئیشی خۆیان کرد؟ سوێند بە خوا ئەگەر گەڕاینەوە بۆ مەدینە خاوەن دەستەڵات لاتو ڕوتو بیّ دەستەڵاتی لیّ دەردەکات. جابیر دەڵێت: ئەنساریەکان لە مەدینەدا لە کۆچەریەکان زۆرتر بوون وەختیّ پێغەمبەری خوا هاتە مەدینە پاشان کۆچەریەکان زۆر بوون. عومەر دەڵێت: وازم لیّ بێنە با بدەم لە ملی ئەم دووڕووە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (وازم لیّ بێنە تا خەڵکی نەڵێن محمد (ﷺ) هاوەڵەکانی خۆی ئەکوژیّ)[١] ئیمامی ئەحمدیش ڕیوایەتی کردوە[٢] بوخاریو موسلمیش ڕیوایەتیان کردوە.[٣] عیکرمەو ئیبنوزەیدو کەسانی تریش باسیان کردوە گوتیان کاتیّ خەڵکی ئەگەڕانەوە عبدالله کوڕی ئەم عبدالله ی (کوڕی ئوبەی کوڕی سەلولە) لە دەرگای مەدینەدا (ڕێگای چوونە ژورەوەی مەدینە) شمشێرەکەی هەڵکێشاو خەڵکی بە بەر دەما ئەڕۆشتن کاتیّ باوکی عبدالله ی کوڕی ئوبەی هات. کوڕەکەی پێی گوت: بگەڕێوە! ئەویش دەڵێت: چییە هاوار بۆ تۆ (بۆ وا دەکەی)؟ عبدالله کوڕی دەڵێت: سوێند بە خوا لێرەوە تێناپەڕی هەتا پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئیزنت نەدا ئەو بە دەستەڵاتەو تۆ بیّ دەستەڵاتو سەر شۆڕی. کاتیّ پێغەمبەری خوا (ﷺ) هات کۆمەڵێکی لە کۆتایی سوپاکەوە بە ڕیّ ئەکرد (سەرپەرشتی ئەکرد). عبدالله کوڕی ئوبەی سکاڵای کوڕەکەی بردە لای پێغەمبەر(ﷺ) عبدالله ی کوڕی دەڵێت: سوێند بە خوا ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ناچێتە ناو مەدینە هەتا تۆ ڕێگەی پیّ نەدەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئیزنی دایەو. عبدالله ی کوڕی دەڵێت: لەبەر ئەوەی کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕێگای دای ئێستا تێپەڕە.[٤] ئەبوبەکر (عبدالله ی کوڕی زوبەیری حومەیدی ڕیوایەتی کردوە لە موسنەدەکەیا لە ئەبوهارونی مەدەنیەوە دەڵێت: عبدالله ی کوڕی عبدالله ی کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول دەڵێت بە باوکی: سوێند بە خوا هەرگیز ناچیتە ناو مەدینە هەتا نەڵێیت پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەدەستەڵاتەو من بیّ دەستەڵاتم. دەڵێت هات بۆ لای

---

[١] دلائل النبوة (٤/٥٣)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[٢] احمد (٣/٣٩٢)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[٣] البخاري (٤٩٠٧)، مسلم (٢٥٨٤).

[٤] الطبري (٢٣/٤٠٣-٤٠٥).

پێغەمبەر(ﷺ) دەڵێت: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) هەواڵم پێ گەیشتوە (تۆ دەتەوێ باوکم بکوژی سوێند بەو کەسەی تۆی بە ڕاستی ڕەوانە کردوە هەرگیز سەیری ناوچاوانی باوکم نەکردوە ئەوەندە شەرمم لێ کردوە ئەگەر ئەفەرمویت: سەریت بۆ بێنم بۆت دێنم. من پێم ناخۆشە بکوژی باوکم ببینم).[١]

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تُلْهِكُمْ أَمْوَٰلُكُمْ وَلَآ أَوْلَـٰدُكُمْ عَن ذِكْرِ ٱللَّهِ ۚ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْخَـٰسِرُونَ ﴿٩﴾ وَأَنفِقُوا۟ مِن مَّا رَزَقْنَـٰكُم مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِىَ أَحَدَكُمُ ٱلْمَوْتُ فَيَقُولَ رَبِّ لَوْلَآ أَخَّرْتَنِىٓ إِلَىٰٓ أَجَلٍ قَرِيبٍ فَأَصَّدَّقَ وَأَكُن مِّنَ ٱلصَّـٰلِحِينَ ﴿١٠﴾ وَلَن يُؤَخِّرَ ٱللَّهُ نَفْسًا إِذَا جَآءَ أَجَلُهَا ۚ وَٱللَّهُ خَبِيرٌۢ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴿١١﴾﴾

**هاندان بۆ خۆ سەرقاڵ نەکردن بە ماڵو منداڵەوەو سامان بەخشین لە ڕێی خوادا پێش مردن**

خودای مەزن ئەفەرمویت: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تُلْهِكُمْ أَمْوَٰلُكُمْ وَلَآ أَوْلَـٰدُكُمْ عَن ذِكْرِ ٱللَّهِ ۚ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْخَـٰسِرُونَ﴾ ئەی گەلی خاوەن باوەڕان سامانو زاڕۆڵەکانتان یادی خواتان نابێ لەبیر بەرێتەوە ئەوانەی وایان بەسەردێ زیانبارن. خوای گەورە فەرمان ئەدا بە بەندە خاوەن باوەڕەکانی کە زۆر یادی خودا بکەنو ئەفەرموێت کە سامانو منداڵەکانتان با زۆر سەرقاڵتان نەکەن وە ئاگاداری کردوون کە هەرکەسێ زۆر خۆی سەرقاڵ بکات بە ڕابواردنو خۆشیەکانی دنیاوە.ئەوەی لە یاد بچێ کە وەدی هاتوە بۆ خواپەرستیو گوێڕایەڵی فەرمانەکانی پەروەرندەی ئەوە لە گرۆی زیانبارانە ئەوانەی کە زیان لە خۆیانو ماڵو منداڵیان ئەدەن لە ڕۆژی قیامەتا. پاشان هانەیان ئەدا کە سامان بەخت بکەنو ببیەخشن لە ڕێگای خوداو ڕەزامەندی ئەودا. وە فەرموویەتی: ﴿وَأَنفِقُوا۟ مِن مَّا رَزَقْنَـٰكُم مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِىَ أَحَدَكُمُ ٱلْمَوْتُ فَيَقُولَ رَبِّ لَوْلَآ أَخَّرْتَنِىٓ إِلَىٰٓ أَجَلٍ قَرِيبٍ فَأَصَّدَّقَ وَأَكُن مِّنَ ٱلصَّـٰلِحِينَ﴾ ئەو بژێویەشی کە ئێمە پێمان بەخشیون، لە ڕای خودا بەخت بکەن. بەر لەوەی یەکێ لە ئێوە مردن یەخەی بگرێو بڵێ: ئەی پەروەرندەی من! بۆچی تا ماوەیەکی نزیك مەودات نەدام، کە ئەوسا خێرات بکەمو لە ڕیزی کارچاکەکان بم؟. هەموو زیادەڕەوی کەرێ پەشیمانە لە کاتی سەرەمەرگا داوای مۆڵەت دەکات کە بمێنێتەوە با مەودایەکی کەمیش بێ بۆ ئەوەی پەندو ئامۆژگاری وەرگرێ ئەوەی کە لە کیس چووە بەدەستی بێنێتەوە بەلام مەحاڵەو بێ سوودە. هەرچی ڕۆیی ڕۆییو ئەوەیش کە هاتوە ناگەڕێتەوەوە هەموو کەسێ بەپێی ئەو زیادەڕەویەی مامەڵەی لەگەڵ ئەکرێ. ئەوانەی کە خوانەناسن وەك خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَأَنذِرِ ٱلنَّاسَ يَوْمَ يَأْتِيهِمُ ٱلْعَذَابُ فَيَقُولُ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ رَبَّنَآ أَخِّرْنَآ إِلَىٰٓ أَجَلٍ قَرِيبٍ نُّجِبْ دَعْوَتَكَ وَنَتَّبِعِ ٱلرُّسُلَ ۗ أَوَلَمْ تَكُونُوٓا۟ أَقْسَمْتُم مِّن قَبْلُ مَا

---

[١] مسند الحميدي (٢/٥٢٠)، فەرمودەیەکی مورسەلە بەلام پشتگیری هەیە.

لَكُم مِّن زَوَالٍ ﴾[1]، واتە: وە (ئەی موحەممەد (ﷺ)) خەڵکی ئاگادار بکەو بترسێنە لەو ڕۆژەی کە سزایان بۆ دێت ئینجا ئەوانەی کە ستەمیان کردوە دەڵێن ئەی پەروەردگارمان بۆ ماوەیەکی کەم دوامان بخە تا وەڵامی بانگەوازەکەت بدەینەوەو شوێنی پێغەمبەران بکەوین ئەی ئێوە نەبون پێشتر سوێندتان خوارد کە هەرگیز لەناو ناچن. وە ئەفەرموێت: ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَ أَحَدَهُمُ ٱلْمَوْتُ قَالَ رَبِّ ٱرْجِعُونِ ﴿٩٩﴾ لَعَلِّىٓ أَعْمَلُ صَٰلِحًا فِيمَا تَرَكْتُ ۚ كَلَّآ ۚ إِنَّهَا كَلِمَةٌ هُوَ قَآئِلُهَا ۖ وَمِن وَرَآئِهِم بَرْزَخٌ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ ﴾[2]، واتە: (بێ بڕوایان وەك خۆیان مانەوە) هەتا کاتێ مردن دێت بۆ هەر کامیان ئەوسا دەڵێ ئەی پەروەردگارم بمگێڕەرەوە (بۆ دونیا)، بەڵکو کردەوەی چاك بکەم (لە بری ئەوەی نەمکردوە) لەو تەمەنەی لە دەستم چوو نەخێر بێگومان ئەمە (ی دەیڵێ) تەنها قسەیەکە کە ئەو دەیڵێ (ئەگەر بگەڕێتەوە بۆ دونیا هەر وەك جاران دەبێت)و لەبەردەمیاندا بەرزەخێك هەیە تا ئەو ڕۆژەی زیندوو دەکرێنەوە. پاشان خودای مەزن فەرموویەتی: ﴿وَلَن يُؤَخِّرَ ٱللَّهُ نَفْسًا إِذَا جَآءَ أَجَلُهَا ۚ وَٱللَّهُ خَبِيرٌۢ بِمَا تَعْمَلُونَ﴾ هەرکەسیش وەختی مردنی هات خوا هەرگیز درەنگی ناخات. خودا لە هەر کارێ دەیکەن ئاگادارە. واتە: هیچ کەسێ دواناخرێ کە وەختی مردنی هات. خودا خۆی ئاگادارترو زاناترە بەو کەسانەی کە ڕاست ئەکەن لە قسەو داواکانیانا. وە لەوانەش ئەگەر بگەڕێنرێنەوە دەچنەوە سەر خراپەی خۆیان.

## تەفسیری سورەتی (التغابن)

## مەدەنیەو گوتراویشە مەکیە

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿يُسَبِّحُ لِلَّهِ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ۖ لَهُ ٱلْمُلْكُ وَلَهُ ٱلْحَمْدُ ۖ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿١﴾ هُوَ ٱلَّذِى خَلَقَكُمْ فَمِنكُمْ كَافِرٌ وَمِنكُم مُّؤْمِنٌ ۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿٢﴾ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِٱلْحَقِّ وَصَوَّرَكُمْ فَأَحْسَنَ صُوَرَكُمْ ۖ وَإِلَيْهِ ٱلْمَصِيرُ ﴿٣﴾ يَعْلَمُ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَيَعْلَمُ مَا تُسِرُّونَ وَمَا تُعْلِنُونَ ۚ وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴿٤﴾﴾

### پەسەندی و پاکی هەر بۆ خودایەو باسی دروست کراوەکانی و زانایی خودا

ئەم سورەتە دوایین سورەتی موسوبیحاتە (المسبحات) دەست پێ دەکات بە پەسەندی و پاکی وەدی هێنراوەکان بۆ وەدی هێنەرو خاوەن دەسەڵات کە خودایەو ئەفەرموێت: ﴿يُسَبِّحُ لِلَّهِ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ۖ لَهُ ٱلْمُلْكُ وَلَهُ ٱلْحَمْدُ ۖ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ﴾ هەرچی هەیەو لەناو ئەو ئاسمانانەو

---

[1] ابراهيم (٤٤).

[2] المؤمنون (٩٩-١٠٠).

زەمینەیە، پەسەندیو پاکی خودا دەدەن. هەر بۆ خۆی فەرمانڕوایەو سوپاس هەر بۆ ئەو ڕەوایەو بۆ هەموو کارێك توانایە. واتە: هەر ئەو خاوەن دەستەڵاتە بەسەر هەموو بونەوەرا، سوپاس کراوە لەسەر هەموو ئەو شتانەی کە وەدی دەهێنیو دایدەنێ بە ئەندازەی خۆی ﴿وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ هەرچی ئەو مەیلی لێ بێ دەبێ بێ ڕێگرو لەبەراوەستان وە هەر شتێ مەیلی لێ نەبێ نابێ. وە ئەفەرموێت: ﴿هُوَ ٱلَّذِي خَلَقَكُمْ فَمِنكُمْ كَافِرٌ وَمِنكُم مُّؤْمِنٌ ۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ﴾ هەر ئەویشە کە ئێوەی وەدی هێناوە. سا هێندێکتان باوەڕتان پێ نەهێناوەو هێندێکیشتان بە بڕوایە، هەر کارێکیش ئێوە دەیکەن خوا دەیبینێ. واتە: ئەو وەدی هێنەری ئێوەیە بەو جۆرە خوا خۆی دەیەوێ دەزانێ کە دەبێ باوەڕدارو بێ باوەڕتان تێدا بێ وە هەر ئەو چاك ئاگادارە کە کێ شایەنی شارەزا بوونە وە کێش شایەنی سەر لێ شێوانو گومڕاییە. وە هەر ئەو شایەتە لەسەر کرداری بەندەکانیو بەو زوانە پاداشتیان ئەداتەوە لەسەری بە تەواوی بێ کەمو کوڕی. بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ﴾ هەر کارێکیش ئێوە دەیکەن خوا دەیبینێ. پاشان فەرموویەتی: ﴿خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِٱلْحَقِّ وَصَوَّرَكُمْ فَأَحْسَنَ صُوَرَكُمْ ۖ وَإِلَيْهِ ٱلْمَصِيرُ﴾ ئاسمانەکانو زەمینی بەڕاستی وەدی هێناوەو وێنەی بۆ ئێوە کێشاوەو شکڵێ فرە جوانی دانێو هەر بۆ لای ئەویش دێنەوە. واتە: بەڕاستیو ڕێکیو لە کارزانی ﴿وَصَوَّرَكُمْ فَأَحْسَنَ صُوَرَكُمْ﴾ واتە: بە جوانترین وێنەو بەژنو باڵا. وەك خۆی ئەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلْإِنسَٰنُ مَا غَرَّكَ بِرَبِّكَ ٱلْكَرِيمِ ۝٦ ٱلَّذِي خَلَقَكَ فَسَوَّىٰكَ فَعَدَلَكَ ۝٧ فِيٓ أَيِّ صُورَةٍ مَّا شَآءَ رَكَّبَكَ﴾[1]، واتە: ئەی ئینسان چی تۆی خەڵەتاندوە بە پەروەردگاری گەورەت (بەخشندەت)، ئەو پەروەردگارەی کە دروستی کردویتو ڕێکی خستویتو جیای کردویتەوە (لە گیانلەبەرانی تر) لە هەر وێنەیەکدا کە خۆی ویستبێتی یەکی خستویت. وە ئەفەرموێت: ﴿ٱللَّهُ ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ قَرَارًا وَٱلسَّمَآءَ بِنَآءً وَصَوَّرَكُمْ فَأَحْسَنَ صُوَرَكُمْ وَرَزَقَكُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ﴾[2]، واتە: خوا زاتێکە کە زەوی بۆ کردونەتە ئارامگا وە ئاسمانیشی بۆ کردون بە سەربانو بە جوانترین شێوە ئێوەی دروست کردوەو لەوەشی کە حەڵاڵو پاکە ڕۆزی داون. وە ئەفەرموێت: ﴿وَإِلَيْهِ ٱلْمَصِيرُ﴾ واتە: لە دوایشدا هەر بۆ لای ئەو دێنەوەو دەگەڕێنەوە. پاشان خوای گەورە باسی زانایيو ئاگاداری خۆی دەکا بە هەموو وەدی هێنراوەکان لە ئاسمانیەکان یا زەمینیەکان یان دەرونیەکانو فەرموویەتی: ﴿يَعْلَمُ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَيَعْلَمُ مَا تُسِرُّونَ

---

[1] الانفطار (٦-٨).

[2] غافر(٦٤).

﴿وَمَا تُعْلِنُونَۚ وَٱللَّهُ عَلِيمُۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ﴾ هەرچی لە ئاسمانەکانو زەمیندایە ئەو دەیزانیّ! هەر شتێکیش بیشارنەوەو ئاشکرا کەن. ئەو دەیزانیّو خودا لە نهێنی دڵان ئاگادارە.

﴿أَلَمْ يَأْتِكُمْ نَبَؤُا۟ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِن قَبْلُ فَذَاقُوا۟ وَبَالَ أَمْرِهِمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٥﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُۥ كَانَت تَّأْتِيهِمْ رُسُلُهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ فَقَالُوٓا۟ أَبَشَرٌ يَهْدُونَنَا فَكَفَرُوا۟ وَتَوَلَّوا۟ۚ وَّٱسْتَغْنَى ٱللَّهُۚ وَٱللَّهُ غَنِىٌّ حَمِيدٌ ﴿٦﴾﴾

**هەڕەشەکردنو باسی لەناوچوونی ئەو کەسانەی کە لە پێشەوە خوانەناس بوون**

خودای مەزن باسی گەلە پێشووەکانمان بۆ دەکات کە چیان بەسەرهات لە سزاو نەهامەتیو قڕبوون بەهۆی دژایەتی کردنی پێغەمبەرەکانیانو باوەڕنەکردنیان بە ڕاستیو خوانەناسیانەوە فەرموویەتی: ﴿أَلَمْ يَأْتِكُمْ نَبَؤُا۟ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِن قَبْلُ فَذَاقُوا۟ وَبَالَ أَمْرِهِمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ ئاخۆ ئێوە دەنگو باسی ئەو کەسانەتان پیّ نەگەیوە کە پێشوو خودانەناس بوون سزای کردەوەیان چەشتو تووشی ئازاری بە ژان بوون. واتە: دەنگو باسیان چیان بەسەر هات ﴿فَذَاقُوا۟ وَبَالَ أَمْرِهِمْ﴾ واتە: هەقی ئەو بیّ باوەڕیو کردەوە پیسانەی خۆیان چەشت هەر لە دنیا تووشی سزاو نەگبەتیو سەرشۆڕی بوون ﴿وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ وە لە ڕۆژی دوایشدا تووشی ئازاری بە ژان بوون پاش ئەو سزایەشی کە لە دنیادا دران. پاشان هۆکاری سزاکەشیانی باس کردوەو فەرموویەتی: ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّهُۥ كَانَت تَّأْتِيهِمْ رُسُلُهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ فَقَالُوٓا۟ أَبَشَرٌ يَهْدُونَنَا فَكَفَرُوا۟ وَتَوَلَّوا۟ۚ وَّٱسْتَغْنَى ٱللَّهُۚ وَٱللَّهُ غَنِىٌّ حَمِيدٌ﴾ چونکە ئەوان پێغەمبەرەکانی خۆیان بە بەڵگەی دیاری دەرەوە هاتنە لایان. ئەوسا وتیان: جا چۆن مرۆڤ دەتوانن ڕیّ نیشان ئێمە دەن؟ ئەوسا حاشایان کردو ڕویان وەرگێڕاو خوداش پەکی پیّ نەکەوتو بیّ نیازەو هەر شایانی پەسەن دانە. ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّهُۥ كَانَت تَّأْتِيهِمْ رُسُلُهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ﴾ واتە: بە بەڵگەو نیشانەو سەلماندنی زۆرەوە ﴿فَقَالُوٓا۟ أَبَشَرٌ يَهْدُونَنَا﴾ واتە: زۆر بە دووریان دەزانی کە پێغەمبەرایەتی لەناو مرۆڤدا بیّ وە شارەزا کردنیشیان لەسەر دەستی مرۆڤێکی وەك خۆیاندا بیّ. ﴿فَكَفَرُوا۟ وَتَوَلَّوا۟﴾ واتە: باوەڕیان نەهێناو ڕویان وەرگێڕا لە ڕاستی ﴿وَّٱسْتَغْنَى ٱللَّهُ﴾ خودایش پێویستی بەوان نەبوو ﴿وَٱللَّهُ غَنِىٌّ حَمِيدٌ﴾ خودا بێنیازەو هەر شایانی پەسەندانە.

﴿زَعَمَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ أَن لَّن يُبْعَثُوا۟ۚ قُلْ بَلَىٰ وَرَبِّى لَتُبْعَثُنَّ ثُمَّ لَتُنَبَّؤُنَّ بِمَا عَمِلْتُمْۚ وَذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٌ ﴿٧﴾ فَـَٔامِنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَٱلنُّورِ ٱلَّذِىٓ أَنزَلْنَاۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴿٨﴾ يَوْمَ يَجْمَعُكُمْ لِيَوْمِ ٱلْجَمْعِۖ ذَٰلِكَ يَوْمُ ٱلتَّغَابُنِۗ وَمَن يُؤْمِنۢ بِٱللَّهِ وَيَعْمَلْ صَٰلِحًا يُكَفِّرْ عَنْهُ سَيِّـَٔاتِهِۦ وَيُدْخِلْهُ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًاۚ ذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ

ٱلْعَظِيمُ ﴿٩﴾ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَكَذَّبُوا۟ بِـَٔايَـٰتِنَآ أُو۟لَـٰٓئِكَ أَصْحَـٰبُ ٱلنَّارِ خَـٰلِدِينَ فِيهَا ۖ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴿١٠﴾﴾

**ژیانی دوای مردن ڕاستە**

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿زَعَمَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ أَن لَّن يُبْعَثُوا۟ ۚ قُلْ بَلَىٰ وَرَبِّى لَتُبْعَثُنَّ ثُمَّ لَتُنَبَّؤُنَّ بِمَا عَمِلْتُمْ ۚ وَذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٌ﴾ ئەوانەی خۆیان نەناسی پێیان وابوو هەرگیز زیندوو ناکرێنەوە. بلێ: بەڵێ سوێند بە پەروەرندەی خۆم بێ گومان زیندوو دەکرێنەوە، پێشتان ئەڵێن: چ کارێکتان کردوەو ئەمەیش لای خودا ئاسانە. خوای مەزن باسی خوانەناسو بت پەرستو بێ دینەکانمان بۆ دەکا ئەوانەی کە وا دەزانن زیندوو ناکرێنەوە ئەفەرموێت: ﴿زَعَمَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ أَن لَّن يُبْعَثُوا۟ ۚ قُلْ بَلَىٰ وَرَبِّى لَتُبْعَثُنَّ ثُمَّ لَتُنَبَّؤُنَّ بِمَا عَمِلْتُمْ﴾ واتە: هەواڵتان دەدرێتێ بە هەموو کردارێکتان چاکو خراپو گەورەو بچوکو نهێنیو ئاشکرا. ﴿وَذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٌ﴾ واتە: لای خودا ئاسانە زیندوو کردنەوەتانو سزادانو تۆڵە لێ سەندنتان. ئەمە ئایەتی سێ هەمە کە خوای گەورە فەرمان ئەدا بە پێغەمبەرەکەی (ﷺ) کە سوێند بخوا بە پەروەرندەی لەسەر هاتنو ڕوودانی ڕۆژی زیندووبوونەوە. یەکەمجار لە سورەتی یونسدا فەرمووی: ﴿وَيَسْتَنۢبِـُٔونَكَ أَحَقٌّ هُوَ ۖ قُلْ إِى وَرَبِّىٓ إِنَّهُۥ لَحَقٌّ ۖ وَمَآ أَنتُم بِمُعْجِزِينَ﴾[1]، واتە: (ئەی موحەممەد (ﷺ)) لێت دەپرسن ئایا ئەو سزایە ڕاستە (بەدی دێت)؟ پێیان بلێ بەڵێ سوێند بە پەروەردگارم بێگومان ئەوە ڕاستە وە ئێوە ناتوانن خۆتانی لێ قوتار بکەن. دووهەم جار لە سورەتی سەبەئا (سبأ) فەرموویەتی: ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَا تَأْتِينَا ٱلسَّاعَةُ ۖ قُلْ بَلَىٰ وَرَبِّى لَتَأْتِيَنَّكُمْ﴾[2]، واتە: بێ باوەڕان وتیان: ڕۆژی دواییمان بەسەردا نایەت (ئەی موحەممەد(ﷺ)) بلێ (وا نیە) سوێند بە پەروەردگارم ئەو (قیامەتە)تان بۆ دێ. وە سێ هەم جار ئەمەیە کە ئەفەرموێت: ﴿زَعَمَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ أَن لَّن يُبْعَثُوا۟ ۚ قُلْ بَلَىٰ وَرَبِّى لَتُبْعَثُنَّ ثُمَّ لَتُنَبَّؤُنَّ بِمَا عَمِلْتُمْ ۚ وَذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٌ﴾ پاشان خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَـَٔامِنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَٱلنُّورِ ٱلَّذِىٓ أَنزَلْنَا ۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ﴾ دەسا ئێوە بڕوا بێنن بە خوداو پێغەمبەریو بەو ڕۆناکیە کە ناردوومانەتە خوار. خوداش لە هەر کارێ دەیکەن ئاگادارە. ﴿وَٱلنُّورِ﴾ واتە: قورئان ﴿وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ﴾ واتە: هیچ کردارێکی ئێوەی لێ ون نابیو ناشارێتەوە.

---

[1] یونس (٥٣).

[2] سبأ (٣).

**باسی ڕۆژی تێشکان (التغابن)**

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿يَوْمَ يَجْمَعُكُمْ لِيَوْمِ الْجَمْعِ ذَٰلِكَ يَوْمُ التَّغَابُنِ وَمَن يُؤْمِن بِاللَّهِ وَيَعْمَلْ صَالِحًا يُكَفِّرْ عَنْهُ سَيِّئَاتِهِ وَيُدْخِلْهُ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا أَبَدًا ذَٰلِكَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ﴾ لەو ڕۆژەدا کە هەمووتان (لە قیامەت) کۆ دەکاتەوە ئەوە ڕۆژی تێشکانە. هەر کەسێ خاوەن باوەڕو ئاکار چاکە هەر خراپەیە کردوویەتی، ڕای دەماڵێو دەینێرێتە ناو باغاتێك جۆباریان بە بەردا دەڕواو هەتا سەر هەر تیا دەبن. ئەمەیە دەسکەوتی گەورە. (اليوم الجمع) ڕۆژی قیامەتە بۆیە بەو ناوە ناونراوە چونکە مرۆڤ لە ئەودەڵەوە هەتا کۆتایی دنیا لە یەك شوێنا کۆ دەبنەوەو دەنگی بانگ کەریان دەگاتێو دەبینرێن وەك خودا فەرموویەتی: ﴿ذَٰلِكَ يَوْمٌ مَّجْمُوعٌ لَّهُ النَّاسُ وَذَٰلِكَ يَوْمٌ مَّشْهُودٌ﴾[1]، واتە: ئەو ڕۆژە ڕۆژێکە کە ئادەمی بۆ کۆدەکرێتەوەو ئەوە ڕۆژێکی دیارو بەرچاوە (هەمووان ئامادەن تێیدا). وە ئەفەرموێت: ﴿قُلْ إِنَّ الْأَوَّلِينَ وَالْآخِرِينَ ﴿٤٩﴾ لَمَجْمُوعُونَ إِلَىٰ مِيقَاتِ يَوْمٍ مَّعْلُومٍ﴾[2]، واتە: (ئەی موحەممەد (ﷺ)) بڵێ بێگومان هەموو پێشینانو پاشینان، کۆدەبنەوەلە ژوانگەی ڕۆژی دیاری کراودا. ئیبنوعەباس دەڵێت: ناوێکە لە ناوەکانی ڕۆژی قیامەت. چونکە ئەو ڕۆژە بەهەشتیەکان جەهەنمیەکان تێدەشکێنن.[3] یانی هەموو شتی ڕوون ئەبێتەوەو دەردەکەوێ. قەتادەو موجاهدیش هەر وایان گوتوە.[4] موقاتلی کوڕی حەیان دەڵێت: هیچ زیانو تێشکانێ نیە لەوە گەورەتر بێ بەهەشتیەکان دەچن بۆ بەهەشتو جەهەنمیەکانیش بە ڕێ دەکرێن بۆ ناو ئاگر. منیش ئەڵێم: ئەو ڕووداوە تەفسیرەکەی ئەمەیە کە خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَمَن يُؤْمِن بِاللَّهِ وَيَعْمَلْ صَالِحًا يُكَفِّرْ عَنْهُ سَيِّئَاتِهِ وَيُدْخِلْهُ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا أَبَدًا ذَٰلِكَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ﴾ و ئەفەرموێت: ﴿وَالَّذِينَ كَفَرُوا وَكَذَّبُوا بِآيَاتِنَا أُولَٰئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ خَالِدِينَ فِيهَا وَبِئْسَ الْمَصِيرُ﴾ ئەو کەسانەش کە خودایان نەناسیوەو نیشانەکانی ئێمەیان باوەڕ نەکردو ئەوان یارانی ئاگرنو تا سەر هەر تیایا دەبنو چارەنووسیان زۆر خراپە. وێنەی ئەم ئایەتانە لە پێشەوە چەند جار تەفسیر کراوە.

---

[1] هود (١٠٣).

[2] الواقعة (٤٩–٥٠).

[3] الطبري (٢٣/٤٢٠).

[4] الطبري (٢٣/٤١٩–٤٢٠).

﴿ مَآ أَصَابَ مِن مُّصِيبَةٍ إِلَّا بِإِذۡنِ ٱللَّهِۗ وَمَن يُؤۡمِنۢ بِٱللَّهِ يَهۡدِ قَلۡبَهُۥۚ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٞ ﴿١١﴾ وَأَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَۚ فَإِن تَوَلَّيۡتُمۡ فَإِنَّمَا عَلَىٰ رَسُولِنَا ٱلۡبَلَٰغُ ٱلۡمُبِينُ ﴿١٢﴾ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۚ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلۡيَتَوَكَّلِ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ﴿١٣﴾ ﴾

**ئەوەی تووشی مرۆڤ دەبێ بە ئیزنی خودایە**

خوای گەورە هەواڵمان دەداتێ بەوەی کە لە سورەتی حەدیدا (الحدید) باسی کردوە کە ئەفەرموێت: ﴿مَآ أَصَابَ مِن مُّصِيبَةٖ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَا فِيٓ أَنفُسِكُمۡ إِلَّا فِي كِتَٰبٖ مِّن قَبۡلِ أَن نَّبۡرَأَهَآۚ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٞ﴾[١]، واتە: هیچ زیانو بەڵایەك ڕوی نەداوە نە لە زەویو نە لە خودی خۆتاندا ئیللا لە (لوح المحفوظ)دا نوسراوە پێش ئەوەی وەدی بهێنین بێگومان ئەوە بۆ خوا زۆر ئاسانە. وە هەر بەو شێوەیە لێرەشدا فەرموویەتی: ﴿ مَآ أَصَابَ مِن مُّصِيبَةٍ إِلَّا بِإِذۡنِ ٱللَّهِۗ وَمَن يُؤۡمِنۢ بِٱللَّهِ يَهۡدِ قَلۡبَهُۥۚ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٞ ﴾ کەس هیچ بەڵای بەسەر نایە مەگین خودا فەرمان بدا، هەرکێش بڕوای بە خودا بێ، دڵی شارەزای خۆی دەکاتو خودا هەموو شت دەزانێ. ئیبنوعەباس دەڵێت: ﴿بِإِذۡنِ ٱللَّهِ﴾ بە فەرمانی خودایەو ئەو دەیکاتو بە مەیلی ئەوە. ﴿وَمَن يُؤۡمِنۢ بِٱللَّهِ يَهۡدِ قَلۡبَهُۥۚ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٞ﴾ واتە: هەرکەسێ تووشی بەڵایەك بوو وای زانی کە ئەو بەڵایە بە فەرمانو بڕیاری خودایە ئارامی گرت پاداشتەکەی لە خودا داوا کردو خۆی دایە دەست خوداو ڕازی بوو بە فەرمانی ئەو خودا دڵی شارەزای خۆی دەکاو پاداشتی ئەداتەوە بەو شتەی کە لە دەستی دەرچووەو نەماوە لە دنیاو دڵی پڕ باوەڕ دەکاو ئەیبەستێ بە خۆیەوە چاکتری لەوەی دەداتێ کە لێی سەندوە. عەلی کوڕی ئەبی تەلحە لە ئیبنوعەباسەوە دەڵێت: ﴿وَمَن يُؤۡمِنۢ بِٱللَّهِ يَهۡدِ قَلۡبَهُۥ﴾ واتە: دڵی پڕ باوەڕ دەکاو گومان لە دڵیا ناهێڵێ دەزانێ ئەوەی توشی بووە ئەبوایە تووشی ببوایە. ئەوەیشی تووشی نابێ نابێ تووشی ببێ.[٢] ئەم فەرمودەیە بوخاریو موسلم یەك ڕان لەسەری هاتوە (خاوەن باوەڕ جێی سەرنجە (یانی هەموو شتێکی چاکە) خودا هیچ ڕوداوێکی بەسەرا ناهێنێ مەگین ئەو ڕوداوە چاکە بۆی. ئەگەر تووشی ناخۆشی بووبێ ئارامی گرتوە ئەو ئارامگرتنە چاك بوە بۆی. وە ئەگەر توشی خۆشیەك بووبێ سوپاسی خودای کردوە ئەو سوپاس کردنە چاك بووە بۆی. ئەمەیش بۆ خاوەنباوەڕ نەبێ بۆ کەسی تر نابێ).[٣]

---

[١] الحدید (٢٢).

[٢] الطبري (٢٣/٤٢١).

[٣] مسلم (٤/٢٢٩٥).

**فەرمان بە گوێڕایەڵی خوداو گوێڕایەڵی پێغەمبەر(ﷺ)**

خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَأَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ فَإِن تَوَلَّيْتُمْ فَإِنَّمَا عَلَىٰ رَسُولِنَا الْبَلَاغُ الْمُبِينُ﴾ بە فەرمانی خودا بنو پێغەمبەر چی وت وا بکەن. خۆ ئەگەر خۆشتان لادەن لەسەر پێغەمبەری ئێمە، هەر ئەوەندەیە (بە ئاشکرا) ڕایگەیەنێت. فەرمانی داوە بە گوێڕایەڵی خوداو پێغەمبەرەکەی (ﷺ) لە هەموو شتێکدا. ئەوەی کە بڕیاری داوە بیکەنو ئەوەیش بڕیاری داوە مەیکەن وازی لێ بێننو لێی دوورکەونەوە. پاشان فەرموویەتی: ﴿فَإِن تَوَلَّيْتُمْ فَإِنَّمَا عَلَىٰ رَسُولِنَا الْبَلَاغُ الْمُبِينُ﴾ واتە: ئەگەر خۆتان لاداو نەتان کرد ئەو هەر ئەوەندەی لەسەرە کە پێتان ڕاگەیەنێ لەسەر ئێوەش گوێڕایەڵیو بەجێ هێنانە. زوهەری (الزهري) دەڵێت: پەیام لەلایەن خوداوەیەو لەسەر پێغەمبەریش ڕاگەیاندنو لەسەر ئێمەش جێبەجێ کردنو فەرمان بەری.[1]

**یەکتاپەرستی (ناسینی خودا بە تەنها)**

پاشان خوای مەزن فەرموویەتی کە خودا تاکەو بێنیازو جێ نیازەو هیچ خودایەك نیە تەنها ئەو نەبێ وەك فەرموویەتی: ﴿اللَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ۚ وَعَلَى اللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ الْمُؤْمِنُونَ﴾ خودای مەزن غەیرەز ئەو هیچ شت بۆ پەرستن باوەڕداران با خۆ بە خودا بسپێرن. یەکەم جار هەواڵی یەکتاپەرستیمان دەداتێ کە ماناکەی مانای داوا کردنە کە هەر خودا بپەرستن بە تەنها خۆتان یەکلایی بکەنەوە بۆیو پشت هەر بەو ببەستن. وەك فەرموویەتی: ﴿رَّبُّ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ فَاتَّخِذْهُ وَكِيلًا﴾[2]، واتە: ئەو خوای ڕۆژهەڵاتو ڕۆژئاوایە هیچ پەرستراوێکی بەڕاستی نی یە تەنیا ئەو نەبێ کەوابوو بیکە بە بریکاری خۆت.

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنَّ مِنْ أَزْوَاجِكُمْ وَأَوْلَادِكُمْ عَدُوًّا لَّكُمْ فَاحْذَرُوهُمْ ۚ وَإِن تَعْفُوا وَتَصْفَحُوا وَتَغْفِرُوا فَإِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٤﴾ إِنَّمَا أَمْوَالُكُمْ وَأَوْلَادُكُمْ فِتْنَةٌ ۚ وَاللَّهُ عِندَهُ أَجْرٌ عَظِيمٌ ﴿١٥﴾ فَاتَّقُوا اللَّهَ مَا اسْتَطَعْتُمْ وَاسْمَعُوا وَأَطِيعُوا وَأَنفِقُوا خَيْرًا لِّأَنفُسِكُمْ ۗ وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ ﴿١٦﴾ إِن تُقْرِضُوا اللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا يُضَاعِفْهُ لَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ۚ وَاللَّهُ شَكُورٌ حَلِيمٌ ﴿١٧﴾ عَالِمُ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ ﴿١٨﴾﴾

---

[1] البخاري (توحيد رباب (٤٦)).

[2] المزمل (٩).

**ترساندن (ئاگاداركردن) له شەڕی (فتنة) ژنان و منداڵان**

خوای گەورە باسی ژن و منداڵ دەكات كە هەندێ لە ژن و منداڵ هەن دەبنە دوژمنی مێردو باوك بەشێوەیەك كە سەرقاڵی دەكەن و دەبنە هۆی ئەوەی كە ئەو پیاوە یا ئەو باوكە تووشی خراپە ببێ و دەبنە ڕێگری لە چاكەكردن و هەوڵ دان بۆ چاكە وە ئەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّ مِنۡ أَزۡوَٰجِكُمۡ وَأَوۡلَٰدِكُمۡ عَدُوّٗا لَّكُمۡ فَٱحۡذَرُوهُمۡۚ وَإِن تَعۡفُواْ وَتَصۡفَحُواْ وَتَغۡفِرُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٌ﴾ ئەی گەلی خاوەن باوەڕان! هێندێك لە ژنانی ئێوەو منداڵانتان دوژمنتانن، خۆتانیان لێ بپارێزن، ئەگەر چاویان لێ بپۆشن و واز بێنن و بیانبەخشن، خوداش لە گوناه دەبورێ و دلۆڤانە. وەك خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تُلۡهِكُمۡ أَمۡوَٰلُكُمۡ وَلَآ أَوۡلَٰدُكُمۡ عَن ذِكۡرِ ٱللَّهِۚ وَمَن يَفۡعَلۡ ذَٰلِكَ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡخَٰسِرُونَ﴾[1]، واتە: ئەی ئەوانەی كە باوەڕتان هێناوە ماڵ و منداڵانتان بێ ئاگاتان نەكەن لە یادی خوا هەركەسێ وابكات ئا ئەوانە خۆیان خەسارۆمەندن. بۆیە خوای مەزن لێرەدا فەرموویەتی: ﴿فَٱحۡذَرُوهُمۡ﴾ واتە خۆتانیان لێ بپارێزن ئیبنوزەید دەڵێت: واتە: لەوەی كە زیانتان پێ بگەیەنن لە ئاینتاندا. موجاهد دەڵێت: ﴿إِنَّ مِنۡ أَزۡوَٰجِكُمۡ وَأَوۡلَٰدِكُمۡ عَدُوّٗا لَّكُمۡ﴾ واتە: وا بكات لە پیاو كە پەیوەندی خزمایەتی واز لێ بێنێ یا تووشی بێ فەرمانی خودای بكا. كە ئەو پیاوە لەبەر خاتری خێزانی و دڵ نەشكاندنی لە قسەی دەرنەچێ. ئیبنوئەبی حاتم ڕیوایەتی كردوە لە ئیبنوعەباسەوە كە پیاوێك پرسیاری لێ كرد لە بارەی ئەم ئایەتەوە: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّ مِنۡ أَزۡوَٰجِكُمۡ وَأَوۡلَٰدِكُمۡ عَدُوّٗا لَّكُمۡ فَٱحۡذَرُوهُمۡ﴾ دەڵێت: ئەوانە چەند پیاوێك بوون موسوڵمان بوون لە مەكە ویستیان بێن بۆ لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) ژن و منداڵەكانیان نەیان دەهێشت وەختێ هاتن بۆ لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) سەیریان كرد خەڵكی شارەزای ئاین بوون. ویستیان ئازاری ژن و منداڵەكانیان بدەن كە بوونە ڕێگر لە ڕێیاندا خوای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: ﴿وَإِن تَعۡفُواْ وَتَصۡفَحُواْ وَتَغۡفِرُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٌ﴾ وە هەر بەم شێوەیە تیرمیزی ڕیوایەتی كردوەو دەڵێت: چاك و ڕاستە (حسن صحيح).[2] وە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِنَّمَآ أَمۡوَٰلُكُمۡ وَأَوۡلَٰدُكُمۡ فِتۡنَةٞۚ وَٱللَّهُ عِندَهُۥٓ أَجۡرٌ عَظِيمٞ﴾ ئەو دارایی و منداڵانەی هەتانن، مایەی تاقی كردنەوەن پاداشتی زۆر گەورە لەلای

---

[1] المنافقون (٩).

[2] تحفة الاحوذي (٢٢٢/٩)، فەرموودەیەكی حەسەنی سەحیحە.

خودایە. واتە: سامانو منداڵ جێی ئەزمونە واتە: شوێنی تاقی کردنەوەی خودایە بۆ بەندەکانی بۆ ئەوەی دەرکەوێ کێ گوێڕایەڵی خودا دەکاتو کێش لە ڕێگەی لادەدات. وە ئەفەرموێت: ﴿وَٱللَّهُ عِندَهُۥٓ﴾ لە ڕۆژی قیامەتدا. ﴿أَجۡرٌ عَظِيمٌ﴾ پاداشتی گەورە هەیە. وەك فەرموویەتی: ﴿زُيِّنَ لِلنَّاسِ حُبُّ ٱلشَّهَوَٰتِ مِنَ ٱلنِّسَآءِ وَٱلۡبَنِينَ وَٱلۡقَنَٰطِيرِ ٱلۡمُقَنطَرَةِ مِنَ ٱلذَّهَبِ وَٱلۡفِضَّةِ وَٱلۡخَيۡلِ ٱلۡمُسَوَّمَةِ وَٱلۡأَنۡعَٰمِ وَٱلۡحَرۡثِۗ ذَٰلِكَ مَتَٰعُ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۖ وَٱللَّهُ عِندَهُۥ حُسۡنُ ٱلۡمَـَٔابِ﴾[1]، واتە: جوان کراوە بۆ خەڵکی (دنیا پەرست) خۆشیو ئارەزواتی نەفسی لە ئافرەتانو کوڕانو دارایی زۆری کەڵەکە کراو لە ئاڵتونو زێڕو زیوو ئەسپو مایینانی نیشانەدار (بە سپێتی ناوچەوانو هەر چوار پەل) هەروەها ئاژەڵو چوار پێیانو کشتوکاڵ ئەمانە بەهرەو (کەلوپەل)ی زیندەگانی (ژیان) دنیان وە لای خوا هەیە خۆشترین جێی پاشەڕۆژ. هەروەها ئایەتەکانی تریش کە بەدوای ئەم ئایەتەدا دێت. ئیمامی ئەحمد ڕیوایەتی کردوە لە بورەیدەوە دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) وتاری ئەدا حەسەنو حوسەین (ڕەزای خوایان لێ بێ) هاتن بۆ لای دوو کراسی سووریان لەبەردا بوو دەڕۆشتنو کەوتن (پێیان هەڵکەوت) پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەسەر دوانگەکە (میمبەرەکە) هاتە خوارەوە هەڵی گرتنو لەبەردەم خۆی دایانان پاشان فەرمووی: (خوداو پێغەمبەری خودا(ﷺ) ڕاستیان فەرموە داراییو منداڵتان مایەی ئەزمونە سەیری ئەو دوو منداڵەم کرد دەڕۆینو کەوتن خۆم بۆ نەگیرا هەتا قسەکەم بڕیو هەڵم گرتن)[2] زانایانی فەرموودە ڕیوایەتیان کردوەتیرمیزی دەڵێت: فەرموودەیەکی حەسەنی غەریبە (حسن غريب)[3].

### فەرماندان بە لە خودا ترسان بە پێی توانا

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ مَا ٱسۡتَطَعۡتُمۡ وَٱسۡمَعُواْ وَأَطِيعُواْ وَأَنفِقُواْ خَيۡرٗا لِّأَنفُسِكُمۡۗ وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفۡسِهِۦ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ﴾ دەبێ لە خودا بترسن تا دەتوانن، گوێ ڕایەڵو بەر فەرمان بن، ماڵ لە ڕای خودا ببەخشن، بۆتان چاکە، ئەو کەسانەی لە ڕژدی خۆ دەپارێزن ئەوانە ڕزگارەکانن. چەندێ لە تواناو وزەتانا هەیە لە خوا بترسن وەك لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتوە لە ئەبوهورەیرەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (کاتێ فەرمانم پێکردن بە شتێ بەپێی توانا جێبەجێی کەن وە هەر شتێ لێم قەدەغەکردن لێی دورکەونەوە).[4] وە خوا ئەفەرموێت: ﴿وَٱسۡمَعُواْ وَأَطِيعُواْ﴾ واتە:

---

[1] آل عمران (١٤).

[2] احمد (٥/٣٥٤)، فەرموودەیەکی حەسەنی غەریبە.

[3] ابوداود (١/٦٦٣)، تحفة الاحوذي (١٠/٢٧٨)، النسائي في الكبرى (٣/١٠٨)، ابن ماجة (٢/١١٩٠)، حەسەنی غەریبە.

[4] فتح الباري (١٣/٢٦٤)، مسلم (٢/٩٧٥).

گوێ ڕایەڵی خوداو پێغەمبەری خودا بن (ﷺ) لە هەر شتێکدا فەرمانتان پێ دەکەن لامەدەن بە لای ڕاستو بە لای چەپاو نەچن وە پێش خواو پێغەمبەرەکەی (ﷺ) کەوون‌و دوامەکەون ئەو شتانەی کە فەرمانتان پێکراوە بیکەن. لەسەر ئەو شتانەی مەڕۆن کە سەرزەنشت کراون لەسەری‌و وازی لێبێنن.

**هاندان (الترغيب) بۆ خێرکردن**

خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَأَنفِقُوا خَيْرًا لِّأَنفُسِكُمْ﴾ واتە: ئەو ماڵەی خودا پێی داون لە ڕێی خودا ببیەخشن بە خزمان‌و هەژاران‌و کەم دەستان وە ئەو کەسانەی پێویستیان پێیتی وە چاك بن لەگەڵ مەردما وەك چۆن خودا چاکەی لەگەڵ ئێوە کردوە ئەوە باشترە بۆ ئێوە لە دنیاو قیامەتا وە کارێ مەکەن کە زیانی لێ ببینن لە دنیاو قیامەتدا. وە خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِ﴾ ئەو کەسانەی خۆ لە ڕژدی دەپارێزن ئەوانە ڕزگارەکانن. لە سورەتی حەشرا (الحشر) تەفسیری کراو وە ئەو فەرمودانەی کە لەو بارەیەوە هاتبوون لە مانای ئەم ئایەتەدا باس کرا پێویست ناکا لێرەدا دووبارەی بکەینەوە، سوپاس بۆ خوای گەورە. خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿إِن تُقْرِضُوا اللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا يُضَاعِفْهُ لَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ۚ وَاللَّهُ شَكُورٌ حَلِيمٌ﴾ ئەگەر ئێوە قەرزێ بە خودا ڕەوا ببینن. چەند قات پێتان ئەداتەوەو لە گوناهتان خۆش دەبێ. هەر خودا بۆ شوکر دەبێ‌و لەسەرخۆیە. واتە: هەرچەندە ماڵ ببەخشن لە ڕێی خوادا، خودا بە چەند قات پێتان ئەداتەوە. وە هەرچەندە خێرو چاکە بکەن خودا پاداشتتان ئەداتەوە لەسەری. وە ئەم ماڵ بەخشینەش وەك قەرزێك دانراوە بۆ ئەو کەسەی کە ماڵ ئەبەخشێ وەك لە فەرمودەی سەحیحا هاتوە کە خوای گەورە فەرموویەتی: هەر کەسێ قەرز بدا کە زۆر ناهەقی کار نەبێ‌و زۆریش فەقیر نەبێ.[1] لەبەر ئەمەیە خوای گەورە لە سورەتێ بەقەرەدا (البقرة) فەرموویەتی بە چەند قات پێتان ئەداتەوە ﴿فَيُضَاعِفَهُ لَهُ أَضْعَافًا كَثِيرَةً﴾[2]، واتە: ئینجا خوا بۆی زیاد دەکات بە زیادکردنێکی زۆر. وە لێرەدا فەرموویەتی: ﴿وَيَغْفِرْ لَكُمْ﴾ واتە: لە تاوانەکانتان خۆش دەبێ. بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَاللَّهُ شَكُورٌ﴾ واتە: پاداشتی کەم‌و زۆر دەداتەوە. ﴿حَلِيمٌ﴾ چاوپۆشی دەکات‌و دەبورێ‌و تاوان دادەپۆشێ‌و وازتان لێ دێنێ لەو گوناهو خراپانەی کردوتانە. و ئەفەرموێت: ﴿عَالِمُ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ﴾ لە پەنامەکی‌و ئاشکرا ئاگادارە، بە دەستەڵات‌و لە کارزانە (زۆر جار مانای ئەم ئایەتە لە پێشەوە کراوە).

---

[1] مسلم (٥٢٢/١).

[2] البقرة (٢٤٥).

## تەفسیری سورەتی (الطلاق)

## لە مەدینە هاتووەتە خوارەوە

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِىُّ إِذَا طَلَّقْتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ وَأَحْصُوا۟ ٱلْعِدَّةَ ۖ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ رَبَّكُمْ ۖ لَا تُخْرِجُوهُنَّ مِنۢ بُيُوتِهِنَّ وَلَا يَخْرُجْنَ إِلَّآ أَن يَأْتِينَ بِفَٰحِشَةٍ مُّبَيِّنَةٍ ۚ وَتِلْكَ حُدُودُ ٱللَّهِ ۚ وَمَن يَتَعَدَّ حُدُودَ ٱللَّهِ فَقَدْ ظَلَمَ نَفْسَهُۥ ۚ لَا تَدْرِى لَعَلَّ ٱللَّهَ يُحْدِثُ بَعْدَ ذَٰلِكَ أَمْرًا ﴿١﴾﴾

**ژن تەڵاق دان تا ئەو ماوەیەی بۆی دیاری کراوەو لە ماڵی خۆی دەرناکرێ‌و ماوەکەیشی بۆ دەژمێررێ**

یەکەم جار ڕوی فەرمودەکە کراوەتە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بۆ ڕێزو تەقدیر لێنان پاشان بە دوایدا خوای گەورە ڕوی فەرمودەکەی کردوەتە هەموو موسوڵمانان‌و فەرموویەتی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِىُّ إِذَا طَلَّقْتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ وَأَحْصُوا۟ ٱلْعِدَّةَ ۖ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ رَبَّكُمْ ۖ لَا تُخْرِجُوهُنَّ مِنۢ بُيُوتِهِنَّ وَلَا يَخْرُجْنَ إِلَّآ أَن يَأْتِينَ بِفَٰحِشَةٍ مُّبَيِّنَةٍ ۚ وَتِلْكَ حُدُودُ ٱللَّهِ ۚ وَمَن يَتَعَدَّ حُدُودَ ٱللَّهِ فَقَدْ ظَلَمَ نَفْسَهُۥ ۚ لَا تَدْرِى لَعَلَّ ٱللَّهَ يُحْدِثُ بَعْدَ ذَٰلِكَ أَمْرًا﴾ ئەی پێغەمبەر(ﷺ) ئەگەر ژنانتان تەڵاق دا، ماوەیەکیان بۆ دیاری کەن‌و بیژمێرن. لە خودای پەروەرندەتان شەرم بکەن، لە ماڵ خۆیان دەریان مەکەن ئەگەر دەرنەچوون. جا مەگین هەر بە ئاشکرا کارێکی شوورەیی بکەن ئەمە سنووری خودایەو هەرکێ لە سنوری خودا دەرچێت، ناهەقی لە خۆی کردوە. تۆ چوزانی لەوانەیە لە پاش ئەمە خوا شتێکی تر وەدی بێنێ. بوخاری ڕیوایەتی کردوە لە عبدالله ی کوڕی عومەرەوە ژنێکی بوو تەڵاقی دا لە عوزردا بوو (حائض) عومەر باسی کرد بۆ پێغەمبەری خودا(ﷺ) پێغەمبەری خودا(ﷺ) توڕە بوو پاشان فەرمووی: (با بیباتەوە پاشان ڕایگرێ تا پاك دەبێتەوە پاشان دەکەوێتە عوزرو هەمیسان پاك دەبێتەوە. ئەگەر ویستی تەڵاقی بدا با تەڵاقی بدات بە پاکی پێش ئەوەی نزیکی بکەوێتەوە (بچێتە لای) ئەوە ئەو مەودابیە کە خوای گەورە فەرمانی پێ کردوە)[1] هەر بەم شێوەیە لێرەدا بوخاری ڕیوایەتی کردوە لە شوێنێکا لە کتێبەکەیا وە موسلیمیش هەر وای وتوە: (ئەوە ئەو مەودایە کە خودا فەرمانی پێ کردوە کە ژنی تێدا تەڵاق بدرێ)[2] گرنگ ترین وتە هێنرابێ لێرەدا ئەوەیە کە موسلم ڕیوایەتی کردوە لە سەحیحەکەیا لە ڕێگای ئیبنوجورەیجەوە دەڵێت: ئەبوزوبەیر هەواڵی دامێ کە

[1] فتح الباري (٨/٥٢١).

[2] فتح الباري (٩/٢٥٨-٣٩٣)، مسلم (٢/١٠٩٤-١٠٩٥).

بیستویەتی لە عبدالرحمن کوڕی ئەیمەنەوە (ایمن) کە مەولای غەززە بوو پرسیاری لە ئیبنوعومەر کرد کە ئەبوزوبەیر گوێی لێبوو: دەڵێت: بە لاتەوە چۆنە کە پیاوێك ژنەکەی تەڵاق دابێ لە عوزرا؟ دەڵێت: ئیبنوعومەر ژنەکەی تەڵاق دا لە عوزرا بوو لە زەمانی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (با بیباتەوە (گەڕاندیەوە فەرمووی) وەختێ پاك بووەوە یا تەڵاقی بدا یا بیهێڵێتەوە). ئیبنوعومەر دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) ئەم ئایەتەی خوێند ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِذَا طَلَّقۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ﴾[1] وە لە عبدالله وە لەمەدا کە خودا ئەفەرموێت: ﴿فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ﴾ دەڵێت: لە پاکیدا کە نەچوبێتە لای (جیماعی لەگەڵ نەکردبێ)[2] ڕیوایەت کراوە لە ئیبنوعومەرو عەتاو موجاهدو حەسەنو ئیبنوسیرینو قەتادەو مەیمونی کوڕی مەهرانو موقاتلی کوڕی حیان هەر بەو شێوەیە. وە ڕیوایەتیش کراوە لە عیکرمەو زەحاکەوە.[3] وە عەلی کوڕی ئەبی تەلحە دەڵێت: لە ئیبنوعەباسەوە ﴿فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ﴾ تەڵاقی نەدا کە لە عوزرا بێو تەڵاقیشی نەدا کە چووبێتە لای (کە جیماعی لەگەڵا کردبێ) بەڵام وازی لێ بێنێ هەتا ئەکەوێتە عوزرەوە پاك دەبێتەوە تەڵاقی بدا[4] عیکرمە دەڵێت: ﴿فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ﴾ (العدة) ماوەی پاکیەتی (القرء) وەختی عوزر. کە تەڵاقی ئەدا سکی هەبێو سکەکەی ئاشکرا بووبێ. نابێ تەڵاقی بدا کە چووبێ بە دەوریا نەزانێ سکی هەیە یا نیەتی؟ ئا لێرەدا زانایانی فیقە تەڵاقیان کردوە بە چەند بەشەوە وەك تەڵاقی سونیو تەڵاقی بیدعی مەبەست بە تەڵاقی سونی کە وەختێ تەڵاقی بدا کە نەچوبێتە لای (جیماعی لەگەڵ نەکردبێ) یا سکی پێ بوبێ بە ئاشکرا دەرکەوێ. تەڵاقی بیدعیش (البدعة) ئەوەیە کە تەڵاقی بدات لە وەختی عوزرا یا لە پاك بوونەوەیەك دا کە چووبێتە لای (جماعی لەگەڵ کردبێ وە نەزانێ سکی پڕە یا سکی پڕ نیە). سێ تەڵاقیش نە لە جۆری تەڵاقی سونیە وە نە لە جۆری تەڵاقی بیدعیە ئەکەیش بریتیە لە تەڵاقی ژنی مندالّ (بچووك) یا ژنێك کە لە مندالّ بوون چوبێتەوە واتە: تەمەنی گەورە بووبێ بەو هۆیەوە مندالّی نەبێ (یا ژنێك کە جیماعی لەگەڵ نەکرابێ) (غیر المدخون بها) وە خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَأَحۡصُواْ ٱلۡعِدَّةَ﴾ واتە: ماوەکەی بژمێرنو ئەوەڵو کۆتایەکەیشی ئاگادار بنو بزانن بۆ ئەوەی ماوەکە درێژە نەکێشێ لەسەر ژنەکە بێتە ڕێگر لە شوکردنی ﴿وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ رَبَّكُمۡ﴾ لە خودای پەروەرندەتان بترسن لەو ڕووەوە.

---

[1] مسلم (١٠٩٨/٢).

[2] الطبري (٤٣٢/٢٣).

[3] الطبري (٤٣٢/٢٣-٤٣٤).

[4] الطبري (٤٣٥/٢٣).

**نەفەقەو شوێنی ژن لەسەر مێردە لە ماوەی گەڕانەوەیدا**

خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿لَا تُخْرِجُوهُنَّ مِنۢ بُيُوتِهِنَّ وَلَا يَخْرُجْنَ﴾ واتە: لەو مەودایەی کە بۆی دیاری کراوە. هەقی شوێنی مانەوە لەسەر مێردە هەتا لە عوزرا بێ مێرد بۆی نیە دەری بکات وە خۆیشی بۆی نیە بڕوا. چونکە پابەندە بە هەقی مێردەکەیەوە وە ئەفەرموێت: ﴿إِلَّآ أَن يَأْتِينَ بِفَٰحِشَةٍ مُّبَيِّنَةٍ﴾ واتە: دەریش نەچن لە ماڵەکانیان جا مەگین بە ئاشکرا ئەو ژنە کارێکی شوورەیی بکات ئەو کاتە لەو ماڵە دەرنەکرێ. ئەو کارە شوورەییەش زینا کردن دەگرێتەوە وەك ئیبنومەسعودو ئیبنوعەباس‌و سەعیدی کوڕی موسەیەب‌و شەعبی‌و حەسەن‌و ئیبنوسیرین‌و موجاهدو عیکریمەو سەعیدی کوڕی جوبەیرو ئەبوقەلابەو ئەبوصالح‌و زەحاك‌و زەیدی کوڕی ئەسلەم‌و عەتای خۆراسانی‌و سودی‌و سەعیدی کوڕی ئەبوهیلال ووتویانەو کەسانی تریش.[1] هەروەها بێ گوێی‌و لاساری‌و قسەی ناشرین گوتن بە خزمی مێردو ئازاردانیان ئەگرێتەوە بە قسە یا بە کردار وەك ئوبەی کوڕی کەعب‌و ئیبنوعەباس‌و عیکریمەو کەسانی تریش گوتویانە.[2] وە ئەفەرموێت: ﴿وَتِلْكَ حُدُودُ ٱللَّهِ﴾ واتە: ئەمە بەرنامەو سنوورو قەدەغەکانی خودایە ﴿وَمَن يَتَعَدَّ حُدُودَ ٱللَّهِ﴾ هەرکەسێ لە سنورەکانی خودا لابداو دەرچێ بۆ شوێنێکی ترو بە گوێی نەکات ﴿فَقَدْ ظَلَمَ نَفْسَهُۥ﴾ ناهەقی لە خۆی کردوە بەو کارەی کە دەیکا.

**بەرژەوەندی ماوەی مانەوە لە ماڵی مێرد**

خوای مەزن ئەفەرموێت: ﴿لَا تَدْرِى لَعَلَّ ٱللَّهَ يُحْدِثُ بَعْدَ ذَٰلِكَ أَمْرًا﴾ واتە: کاتێ تەڵاقدراومان هێشتەوە لە ماڵی مێردا لەو ماوە دیاری کراوەدا لەوانەیە مێردی ژنەکە پەشیمان بێتەوە لە تەڵاق دانەکەی وە خودا بینێتە دڵیەوە کە بیباتەوە. ئەو کاتە ئەمە سوك‌و ئاسانترە. زوهەری دەڵێت لە عبدالله ی کوڕی عبدالله وە، لە فاتیمەی کچی قەیسەوە لەم ئایەتەدا ﴿لَا تَدْرِى لَعَلَّ ٱللَّهَ يُحْدِثُ بَعْدَ ذَٰلِكَ أَمْرًا﴾ فاتیمە دەڵێت: واتە: گەڕانەوە[3] وە هەروەها شەعبی‌و عەتاو قەتادەو زەحاك‌و موقاتلی کوڕی حەیان‌و سەوری ووتویانی واتە: گەڕانەوە[4].

---

[1] الطبري (٢٣/٤٣٨)، القرطبي (١٨/١٥٦) الدر المنثور (٨/١٩٤).

[2] الطبري (٢٣/٤٣٨).

[3] الطبري (٢٣/٤٤١).

[4] الطبري (٢٣/٤٤٢)، القرطبي (٨/١٥٧)، الدرالمنثور (٨/١٩٤).

**بەخت کردن و (نفقة) جێگا بۆ ژنی سێ تەڵاقە دراو نیە**

ئا لێرەدا هەندێ لە زانایانی پێشین و ئەوانەیش کە لەسەر ڕاو بۆچوونی ئەوانن لایان وایە جێگاو مانەوە پێویست ناکا بۆ ئەو ژنانەی کە سێ تەلاق دراون ئەمانیش پشتیان بەو فەرمودەی فاتیمەی کچی قەیسی فەهری بەستوە وەختێ مێردەکەی تەڵاقی دا بە سێ تەلاقە کە ناوی ئەبوعەمری کوڕی حەفس بوو لە لای نەبوو لەوکاتا لە یەمەن بوو. سێ تەلاقەی بۆ نارد بە بریکارەکەیا نەفەقەکەی کە جۆ بوو لەگەلا بۆ نارد. فاتیمە لێی توڕە بوو. پیاوەکە دەڵێت: سوێند بە خوا نەفەقەت لەسەر ئێمە نیە. فاتیمە هات بۆ لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (نەفەقەی تۆ لەسەر مێردەکەو نیە) وە لە سەحیحی موسلمیش هاتوە(شوێنی مانەوەیشت لەسەری نی یە)فەرمانی پێ کرد کە لە ماڵی ئوموشەریك ماوەکەی تەواو بکات. پاشان فەرمووی: (ئەوە ژنێکە کە لەلای دۆستێکمە ماوەکەت تەواو بکە لای ئیبنوئومو مەکتوم چونکە ئەو پیاوێکی نابینایە پۆشاکیش لادەبەی). واتە: لای ئەوا دەتوانێ پۆشاك لابەرێ لەبەر ئەوەی چاوی پێی ناکەوێ‌و ئەو ماڵە چاکترە بۆی.[1] ئیمامی ئەحمد ڕیوایەتی کردوە لە ڕێگای کەوە بە وتەی تر پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (ماوە بەدە (بڕوانە) ئەی کچی ئالی قەیس وەختێ نەفەقەو جێگای ژن لەسەر پیاوە کە ئەو کەسە بتوانێ ژنەکەی بباتەوەو بیگەڕێنێتەوە لای خۆی. کە نەتوانێ ژنەکە بباتەوە لای خۆی. ئەو ژنە نە جێگای هەیەو نە نەفەقە. بچۆ بڕۆ بۆ ماڵی فلانە ئافرەت) پاشان دەڵێت: (قسەی بۆ ئەکردو فەرمووی بچۆ بۆ ماڵی ئیبنوئوممەکتوم چونکە ئەو نابینایەو ناوبینێ).[2] پاشان فەرموودەکەی هەموو باس کرد. ئەبوقاسمی تەبەرانی ڕیوایەتی کردوە لە عامیری شەعبیەوە کە ڕۆشت بۆ لای فاتیمەی کچی قەیس کە خوشکی زەححاکی کوڕی قەیسی قورەیشی بوو، کە مێردەکەی ئەبوعەمری کوڕی حەفس کوڕی موغەیرەی مەخزومی بوو. فاتیمە دەڵێت: ئەبوعەمری کوڕی حەفس کە لەگەڵ سوپایەکا چوو بوو بۆ یەمەن تەلاق نامەی بۆ ناردوم پرسیاری نەفەقەم‌و جێگام کرد لە خزمەکانی. وتیان: هیچ شتێکی لەو بارەیەوە بۆ ئێمە نەناردوەو هیچ شتێکیشی پێ نەگوتوین کە بیکەین، فاتیمە دەڵێت: ڕۆشتم بۆ خزمەت پێغەمبەری خودا(ﷺ) گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەبوعەمری کوڕی حەفس تەلاق نامەی بۆ ناردوم. داوای جێگاو نەفەقەم لە کەس‌وکاری کرد. کەس‌وکاری گوتیان: هیچی بۆ نەناردوین لەو بارەیەوە. پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (وەختێ جێگاو نەفەقەی ژن لەسەر پیاوە کاتێ پیاوەکە بتوانێ

[1] مسلم (١٤٨٠).

[2] احمد (٦/٣٧٣)، ئەم فەرمودەیە سەنەدەکانی بەهێز نی یە.

بیباتەوە بۆ لای خۆی. کاتێ ئەو ژنە بۆ ئەو ناشێ (حەرامە بۆی) هەتا شویە تر نەکا بە پیاوێکی تر نە نەفەقەی ئەکەوێ نە جێگا).[1] هەر بەم شێوەیە نەسائی ڕیوایەتی کردوە[2].

﴿ فَإِذَا بَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَأَمْسِكُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ أَوْ فَارِقُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ وَأَشْهِدُوا ذَوَيْ عَدْلٍ مِّنكُمْ وَأَقِيمُوا الشَّهَادَةَ لِلَّهِ ذَٰلِكُمْ يُوعَظُ بِهِ مَن كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَمَن يَتَّقِ اللَّهَ يَجْعَل لَّهُ مَخْرَجًا ﴿٢﴾ وَيَرْزُقْهُ مِنْ حَيْثُ لَا يَحْتَسِبُ وَمَن يَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ فَهُوَ حَسْبُهُ إِنَّ اللَّهَ بَالِغُ أَمْرِهِ قَدْ جَعَلَ اللَّهُ لِكُلِّ شَيْءٍ قَدْرًا ﴿٣﴾ ﴾

## فەرماندان بە چاکەکردن لەگەڵ ژنی تەڵاق دراو یا بیەوێ بیباتەوە یا جیابێتەوە لێی

خودای مەزن فەرموویەتی: ﴿ فَإِذَا بَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَأَمْسِكُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ أَوْ فَارِقُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ وَأَشْهِدُوا ذَوَيْ عَدْلٍ مِّنكُمْ وَأَقِيمُوا الشَّهَادَةَ لِلَّهِ ذَٰلِكُمْ يُوعَظُ بِهِ مَن كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَمَن يَتَّقِ اللَّهَ يَجْعَل لَّهُ مَخْرَجًا ﴾ سا هەر کاتێ ماوەکەی خۆیان بەسەر برد، ئەوسا بە تەرزێکی پەسەند ڕایانگرن یان لێیان جیا ببنەوە بە شێوەیێ کە لەناو خۆتاندا باوە، دوو کەسی ڕاستو دروستیش هەر لە خۆتان لەم کارە ئاگادار بکەن، کە شایەتی بۆ خوا بدەن. هەرکێ بڕوای بە خواو ڕۆژی قیامەت هەیە. بەمە ئامۆژگاری دەکرێت. هەرکەسیش لە خوا بترسێ دەرویەکی لێ دەکاتەوە. خوای گەورە ئەفەرموێت هەر کاتێ ماوەکەی خۆیان تەواو کرد واتە: نزیك بوو کە ماوەکەیان تەواو ببێ بەڵام ماوەکە بە تەواوی نەڕۆشتبوو ئەو کاتە بە شێوەیەکی چاكو جوان مێرد ژنەکە بگێڕێتەوە بۆ ژێر نیکاحی خۆیو درێژە بدەن بە ژیان وەك چۆن لە پێشەوە بەیەکەوە بوون چاك بێ لەگەڵی یان ئەگەر حەز دەکاتو ئەیەوێت جیابێتەوە لێی با بە شێوەیەکی باش لێی جیابێتەوە. واتە: بە بێ قسەی ناشرین پێ گوتنو سوکایەتی پێ کردنو لێدان بەڵکو بە شێوەیەکی ڕێكو پێكو جوانو پەسەند تەڵاقی بدات.

## فەرماندان بە ئامادەکردنی شایەت لەسەر گەڕانەوە

خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَأَشْهِدُوا ذَوَيْ عَدْلٍ مِّنكُمْ﴾ واتە: لەسەر گەڕانەوە کاتێ ویستتان. وەك ئەبوداودو ئیبنوماجە ڕیوایەتیان کردوە لە عیمرانی کوڕی حوسەین کە پرسیاری لێ کرا لەو پیاوەی کە ژنەکەی تەڵاق بداو پاشان بچێتە لای (جیماعی لەگەڵ بکا) شایەت نەگرێ لەسەر تەڵاق دانەکەیو لەسەر گەڕانەوەیشی بۆ ژێر نیکاحی خۆی عیمران دەڵێت: تەڵاق دانەکەی لەسەر سوننەت نەبوە گەڕانەوەکەیشی لەسەر سوننەت نەبوە. شایەت دانێ لەسەر تەڵاق دانو لەسەر گەڕانەوەیشیو

---

[1] الطبراني الكبير (٢٤/٣٨٢)، فەرموودەیەکی حەسەنە.

[2] النسائي (٦/١٤٤)، فەرموودەیەکی حەسەنە.

دووبارەی مەکەرەوە.[1] ئیبنوجورەیج دەڵێت: عەتا لەم فەرموودەیەدا: ﴿وَأَشْهِدُواْ ذَوَىْ عَدْلٍ مِّنكُمْ﴾ ئەی گوت: دروست نیە نە لە نیکاحو نە لە تەڵاقو نە لە گەڕانەوەدا مەگین بە دوو شایەتی ڕاستو دروست نەبێ. وەك خوای گەورە فەرموویەتی مەگەر ڕێگرێك هەبێ. وە ئەفەرموێت: ﴿ذَٰلِكُمْ يُوعَظُ بِهِۦ مَن كَانَ يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْأَخِرِ﴾ واتە: ئەمەی کە ئێمە فەرمانتان پێ دەکەین لە ئامادەکردنی شایەتو شایەتی دان. کەسێ گوێ بۆ ئەم ئامۆژگاریە ئەگرێتو پێی هەڵدەسێ کە بڕوای بە خواو ڕۆژی دوایی هەیەو لە تۆڵەو سزای خودا دەترسێ لە ڕۆژی دوایدا.

## خوای گەورە بۆ ئەو کەسانەی کە خۆیان بە خودا ئەسپێرن لە شوێنێکەوە بژێویان بۆ دەنێرێ پێی بژین کە بە خەیاڵیاندا نایە

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجْعَل لَّهُۥ مَخْرَجًا ۝ وَيَرْزُقْهُ مِنْ حَيْثُ لَا يَحْتَسِبُ ۚ وَمَن يَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ فَهُوَ حَسْبُهُۥٓ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ بَٰلِغُ أَمْرِهِۦ ۚ قَدْ جَعَلَ ٱللَّهُ لِكُلِّ شَىْءٍ قَدْرًا﴾ هەرکەسیش لە خودا بترسێ دەرویەکی لێ دەکاتەوە. لە شوێنێکەوە بژێوی بۆ دەنێرێ کە بە خەیاڵیدا نایە. هەرکێ خۆی بە خوا بسپێرێ. ئەوەی بەسە، خوا کارو فەرمانی خۆی بەجێ دێنێ دیارە خودا بۆ هەرشتێ ئەندازەیەکی داناوە. واتە: هەرکەسێ خۆی بە خودا بسپێرێو لێی بترسێو ئەوەی خودا فەرمانی پێ کردوە بیکاو ئەوەیش لێی قەدەغە کردوە نەیکا خودا دەرگای خێری لێ دەکاتەوەوە بە شێوەیەك بژێوی بۆ دەنێرێ کە هەر بە خەیاڵی خۆیا نەهاتوەو چاوەڕوانیشی نەکردوە. ئیمامی ئەحمد ڕیوایەتی کردوە لە ئەبوزەڕەوە دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەم ئایەتەی دەخوێند: ﴿وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجْعَل لَّهُۥ مَخْرَجًا ۝ وَيَرْزُقْهُ مِنْ حَيْثُ لَا يَحْتَسِبُ﴾ هەتا ئایەتەکەی تەواو خوێند. پاشان فەرمووی: (ئەی ئەبوزەڕ گەر هەموو خەڵکی دەستیان بەم ئایەتەوە بگرتایە (کاریان پێ بکردایە) بەسیان بوو) ئەبوزەڕ دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەم ئایەتەی ئەخوێندو دووبارەی ئەکردەوە بۆم هەتا خەوەنوچکە بردیەوە. پاشن فەرمووی: ئەی ئەبوزەڕ (چی ئەکەی ئەگەر دەرکرای لە مەدینە؟) ووتم ئەڕۆم بۆ شوێنێکی فراوانو ئازاد وە دەبم بە کۆترێك لە کۆترەکانی مەکەو بۆ خۆم ئەگەڕێم. فەرمووی: (چی ئەکەی ئەگەر لە مەکەیش وەدەریان نایت؟) ووتم: دەچم بۆ شوێنێکی فراوانو ئازاد بۆ شامو زەمینە پیرۆزەکە. فەرمووی: (چی ئەکەی ئەگەر لە شام وەدەر نرای؟) ووتم: سا سوێند بەو کەسەی کە تۆی بەڕاستی ڕەوانە کردوە شمشێرەکەم دەنێم بە شانمەوە (یانی دەجەنگم) فەرمووی: (ئەی چاکتر لەوە؟) ووتم: لە ئەوە چاکتر هەیە؟. فەرمووی: (گوێ گرتنو فەرمان بەجێ هێنان چاکترە با بەندەیەکی حەبەشیش

---

[1] أبوداود (٦٣٧/٢)، إبن ماجة (٦٥٢/١).

بێت)[1] ئیبنوئەبی حاتم لە عبدالله ی کوڕی مەسعودەوە ڕیوایەتی کردووە ئەی گوت: کۆترین (أجمع) ئایەت لە قورئاندا ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُ بِٱلۡعَدۡلِ وَٱلۡإِحۡسَٰنِ﴾[2]، واتە: بەڕاستی خوا فەرمان دەدات بە دادگەریو بە چاکە. وە گەورەترین ئایەت کە دڵ گوشاو دەکات لە قورئاندا (دڵ خۆش دەکات) ئەوەیە کە خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجۡعَل لَّهُۥ مَخۡرَجٗا﴾ عیکرمە دەڵێت: کەسێ وەك خودا فەرمانی کردوە بڕوات خودا دەروی لێ دەکاتەوە.[3] وە هەر بەم شێوەیە ڕیوایەت کراوە لە ئیبنوعەباسو زەحاکەوە. ئیبنومەسعودو مەسروقیش (مسروق) گوتویانە: لەم ئایەتەدا ﴿وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجۡعَل لَّهُۥ مَخۡرَجٗا﴾ ئەم کەسە دەزانێ کە خودا مەیلی لێ بێ دەی بەخشێو مەیلیشی لێ بێ ئەیبڕێو نایدا. وە خوا ئەفەرموێت: ﴿مِنۡ حَيۡثُ لَا يَحۡتَسِبُ﴾ بە شێوەیەك کە خۆی نازانێو ئاگای لێی نیە.[4] قەتادە دەڵێت: ﴿وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجۡعَل لَّهُۥ مَخۡرَجٗا﴾ واتە: هەرکێ خۆی بە خودا بسپێرێ ئەیپارێزێ لە ناڕەحەتیو ئەو شتانەی کە جێی گومانن لە کاتی مردندا ﴿وَيَرۡزُقۡهُ مِنۡ حَيۡثُ لَا يَحۡتَسِبُ﴾ ڕۆزی ئەدا بە شێوەیەك کە خۆی بە خەیاڵیا نایەو بەتەمای نیە.[5] وە خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَمَن يَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱللَّهِ فَهُوَ حَسۡبُهُۥٓ﴾ ئیمامی ئەحمد ڕیوایەتی کردوە لە عبدالله ی کوڕی عەباسەوە کە ڕۆژێك لە پاشکۆی پێغەمبەری خوادا بوو(ﷺ) لەسەر وڵاغێك پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی پێی: (ئەی منداڵە بچکۆلەکە چەند ئامۆژگاری یەکت فێردەکەم ئاگاداری ئەو فەرزو ئەو سنورانە بکە کە خودا دایناوە بەجێی بێنەو مەیان شکێنە لە خوا بترسەو دوورکەوە لەو شتانەی کە ڕێی پێ نەداوەو پێی ناخۆشەو خودایش خۆتوماڵو منداڵت ئەپارێزێ لە دنیاو قیامەتا. لە خوا بترسە، خودایش لەگەڵتە دەتپارێزێو یارمەتیت ئەداو پشتیوانیت لێ دەکا لە هەر شوێنێك بیت، ئەگەر داوات کرد هەر داوا لە خودا بکە، ئەگەر داوای یارمەتیت کرد داوای یارمەتی تەنها لە خوا بکە. وە بزانە ئەگەر مەردم هەمووی کۆبوبنەوە لەسەر ئەوەی کە سوودت پێ بگەیەنن، سوودت پێ ناگەیەنن مەگین شتێك نەبێ کە خودا بۆی نوسیبی. وە ئەگەر هەموو کۆبوبنەوە لەسەر ئەوەی کە زیانێکت پێ بگەیەنن، زیانت پێ ناگەیەنن مەگین شتێك

---

[1] احمد (١٧٨/٥)، فەرموودەیەکی حەسەنە.

[2] النحل (٩٠).

[3] الطبري (٤٤٦/٢٣).

[4] الطبري (٤٤٥/٢٣-٤٤٦).

[5] الطبري (٤٤٨/٢٣).

نەبێ کە خودا بۆی نوسیبی پێنوس هەڵگیراوەو نوسین تەواو بووەو پەڕاویش وشك بووەتەوە)[1] تیرمیزی ڕیوایەتی کردوەو دەڵێت: چاکەو ڕاستە (حسن صحیح)[2] خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ بَٰلِغُ أَمۡرِهِۦ﴾ واتە: خودا بڕیارو بەرنامەی خۆی جێ بەجێ دەکا لەنێوان وەدی هێنراوەکانیا چۆن مەیلی لێ بیٔو بیەوێ. ﴿قَدۡ جَعَلَ ٱللَّهُ لِكُلِّ شَيۡءٖ قَدۡرٗا﴾ بۆ هەر شتێ ئەندازەیەکی داناوە. وەك ئەفەرموێت: ﴿وَكُلُّ شَيۡءٍ عِندَهُۥ بِمِقۡدَارٍ﴾[3]، واتە: وە هەموو شتێ لای ئەو (خوا) ئەندازەی (دیاری کراوی) هەیە.

﴿ وَٱلَّٰٓـِٔي يَئِسۡنَ مِنَ ٱلۡمَحِيضِ مِن نِّسَآئِكُمۡ إِنِ ٱرۡتَبۡتُمۡ فَعِدَّتُهُنَّ ثَلَٰثَةُ أَشۡهُرٖ وَٱلَّٰٓـِٔي لَمۡ يَحِضۡنَۚ وَأُوْلَٰتُ ٱلۡأَحۡمَالِ أَجَلُهُنَّ أَن يَضَعۡنَ حَمۡلَهُنَّۚ وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجۡعَل لَّهُۥ مِنۡ أَمۡرِهِۦ يُسۡرٗا ﴿٤﴾ ذَٰلِكَ أَمۡرُ ٱللَّهِ أَنزَلَهُۥٓ إِلَيۡكُمۡۚ وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يُكَفِّرۡ عَنۡهُ سَيِّـَٔاتِهِۦ وَيُعۡظِمۡ لَهُۥٓ أَجۡرًا ﴿٥﴾ ﴾

**ماوەی ( عدة ) ئەو ژنانەی کە نائومێدن و ئەوانەیش کە عوزر ناشۆن**

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿ وَٱلَّٰٓـِٔي يَئِسۡنَ مِنَ ٱلۡمَحِيضِ مِن نِّسَآئِكُمۡ إِنِ ٱرۡتَبۡتُمۡ فَعِدَّتُهُنَّ ثَلَٰثَةُ أَشۡهُرٖ وَٱلَّٰٓـِٔي لَمۡ يَحِضۡنَۚ وَأُوْلَٰتُ ٱلۡأَحۡمَالِ أَجَلُهُنَّ أَن يَضَعۡنَ حَمۡلَهُنَّۚ وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجۡعَل لَّهُۥ مِنۡ أَمۡرِهِۦ يُسۡرٗا﴾ ئەو ژنانەتان کە لە عوزر پێدا هاتن نائومێدن و ئەوانەی کە عوزر ناشۆن (ئەگەر شکیان بوو) ئەشێ سێ مانگ چاوەڕوان بن. ئەوانەش کە سکیان هەیە. ماوەی چاوەڕوانیەکەیان دانانی سکەکەیانە. هەرکێش لە خودا بترسێ. خودا کاری بۆ ئاسان دەکات. خوای گەورە باس لە ماوەی ئەو ژنانە دەکا کە لە عوزر پێدا هاتن نائومێدن، ئەو ژنەی کە لەبەر بەساڵاچوون عوزر ناشوا ماوەکەی سێ مانگە لە جیاتی ئەو سێ عوزرەی ئەو ژنانەی کە عوزر ئەشۆن وەك ئەو ئایەتەی کە لە سورەتی بەقەرەدا (البقرة) ئیشارەتی بۆ کردوە هەروەها ئەو ئافرەتە منداڵانەی کە نەگەیشتونەتە تەمەنی عوزر شۆردن. ماوەی ئەمیش وەك ماوەی ئەو ژنانە وایە کە ناهومێد بوون لە عوزر شۆردن کە سێ مانگە. بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَٱلَّٰٓـِٔي لَمۡ يَحِضۡنَ﴾ وە فەرموویەتی: ﴿إِنِ ٱرۡتَبۡتُمۡ﴾ دوو بۆچوون هەیە لەسەری، یەکەمیان: ئەمە قسەی دەستەیەك لە زانا پێشینەکانە وەك موجاهدو زوهەری و ئیبنوزەید. واتە: ئەگەر خوێنیان بینی گومانتان هەبوو عوزرە یا نەخۆشیەو هەر شکتان مابوو.[4] بۆچونی دووەم: ئەگەر

---

[1] احمد (٢٩٣/١)، فەرموودەیەکی حەسەنی سەحیحە.

[2] تحفة الاحوذي (٢١٩/٧)، فەرموودەیەکی حەسەنی سەحیحە.

[3] الرعد (٨).

[4] الطبري (٤٥٠/٢٣).

گومانتان هەبوو لەسەر ماوەی چاوەڕوانیەکە نەتان دەزانی. ئەوە ماوەکە سێ مانگە. ئەمە ڕیوایەت کراوە لە سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە ئیبنوجەریریش هەمان بۆچوونی هەیە.[1] ئەمە زیاترو ئاشکرا ترە لە ماوەکەوە دەرئەکەوێ. وە ئەو فەرمودەیەش کە ڕیوایەتی کردوە لە ئوبەی کوڕی کەعبەوە. دەکاتە بەڵگە کە دەڵێت: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) هەندێ لە ئافرەتان باسیان لە قورئانا نەکراوە وەك ئافرەتی منداڵو بەساڵاچوی نائومێدو ژنی سك پڕ، دەڵێت: خوای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە ﴿وَٱلَّٰٓـِٔي يَئِسۡنَ مِنَ ٱلۡمَحِيضِ مِن نِّسَآئِكُمۡ إِنِ ٱرۡتَبۡتُمۡ فَعِدَّتُهُنَّ ثَلَٰثَةُ أَشۡهُرٖ وَٱلَّٰٓـِٔي لَمۡ يَحِضۡنَۚ وَأُوْلَٰتُ ٱلۡأَحۡمَالِ أَجَلُهُنَّ أَن يَضَعۡنَ حَمۡلَهُنَّۚ﴾[2] ئیبنوئەبی حاتم ڕیوایەتی کردوە بە ئاسان تر لەمەی پێشەوە لە ئوبەی کوڕی کەعبەوە دەڵێت: گوتم بە پێغەمبەری خودا(ﷺ) مەردمێك لە خەڵکی مەدینە کاتێ ئەو ئایەتە هاتە خوارەوە لە سورەتی بەقەرەدا (البقرة) لەبارەی ماوەی عوزری ژنانەوە گوتیان: هەندێ لە ژنان ماوە کە ماوەی چاوەڕوانیان لە قورئانا باس نەکراوە ئافرەتی منداڵو ژنی بەساڵاچوو کە ناکەونە عوزرەوە یان نائومێدن لە عوزر پێدا هاتنو ژنی سك پڕیش. دەڵێت: ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە لەسەر ئەو ژنانە ﴿وَٱلَّٰٓـِٔي يَئِسۡنَ مِنَ ٱلۡمَحِيضِ مِن نِّسَآئِكُمۡ إِنِ ٱرۡتَبۡتُمۡ فَعِدَّتُهُنَّ ثَلَٰثَةُ أَشۡهُرٖ وَٱلَّٰٓـِٔي لَمۡ يَحِضۡنَۚ﴾.[3]

### ماوەی چاوەڕوانی ژنی سك پڕ

خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَأُوْلَٰتُ ٱلۡأَحۡمَالِ أَجَلُهُنَّ أَن يَضَعۡنَ حَمۡلَهُنَّۚ﴾ واتە: ئەو ژنانەی کە سکیان هەیە ماوەی چاوەڕوانیان دانانی سکەکەیە با دوای تەڵاق دان یا مردنیش بێ بە چرکەیەك (بنراق نامة) واتە: دوو پەنجە نان بە گوانی وشتراو هەڵگرتنی (لەسەر قسەی کۆمەڵێ زانایانی پێشینو پاشین) وەك دەقی ئەم ئایەتە پیرۆزەو ئەو فەرمودانەی کە لەم بارەیەوە هاتوە. بوخاری ڕیوایەتی کردوە لە ئەبوسەلەمەوە کە دەڵێت: پیاوێك هات بۆ لای ئیبنوعەباس ئەبوهورەیرەش دانیشتبوو. دەڵێت: فەتوام بۆ بدە لەسەر ژنێك کە منداڵی بووە دوای مردنی مێردەکەی بە چل شەو. ئیبنوعەباس دەڵێت: بە دواترین ماوەی چاوەڕوانی منیش گوتم: ﴿وَأُوْلَٰتُ ٱلۡأَحۡمَالِ أَجَلُهُنَّ أَن يَضَعۡنَ حَمۡلَهُنَّۚ﴾ ئەبوهورەیرەش دەڵێت: منیش لەگەڵ برازای خۆمم واتە: ئەبوسەلەمە. ئیبنوعەباس منداڵەکەی کە کورەیبی ناو بوو نارد بۆ لای ئوموسەلەمە کە لێی بپرسێ. ئوموسەلەمە دەڵێت: مێردەکەی سوبەیعەی ئەسلەمی کوژرا لەو کاتا سکی هەبوو پاش چل شەو سکەکەی دانا (منداڵی بوو) داواکراو پێغەمبەری خودا(ﷺ) دای

---

[1] الطبري (٢٣/٤٥٢).

[2] الطبري (٢٣/٤٥١).

[3] الحاكم (٢/٤٩٢)، ئەم فەرمودەیە سەنەدەکانی براوە (منقطعة).

بە شوو (ئەبوسەنابل) یەکێك بوو لەو کەسانە هاتبوە داوای.[١] هەر بەم شێوەیە بوخاری ئەم فەرمودەیەی لێرەدا هێناوە بە کورتی‌و بوخاری‌و موسلم‌و زاناکانی تری فەرمودەیش لە کتێبەکانیاندا هێناویانە بە درێژی، بە چەند شێوازی تر.[٢] ئیمامی ئەحمد ڕیوایەتی کردوە لە میسوەری کوڕی مەخزەمەو کە سوبەیعەی ئەسلەمی مێردەکەی مرد سکی هەبوو چەند شەوێکە نەخایاند منداڵی بوو، وەختێ هاتە دەرەوە داواکرا. داوای ئیزنی کرد لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) کە شوو بکات (في النكاح) ئیزنی دا کە شووبکات، شوی کرد[٣] بوخاری‌و موسلم ڕیوایەتیان کردوە لە سەحیحەکەیاناو ئەبوداودو نەسائی‌و ئیبنوماجەیش لە چەند ڕێگاوە لە سوبەیعەی ئەسلەمیەوە ڕیوایەتیان کردوە.[٤] وەك موسلمی کوڕی حەجاج ڕیوایەتی کردوە لە عوبەیدڵلای کوڕی عبدالله ی کوڕی عوتبەوە کە باوکی نامەی نوسی بۆ عومەری کوڕی عبدالله ی کوڕی ئەرقەمی زوهەری فەرمانی پێ دا کە بچێتە لای سوبەیعەی ئەسلەمی پرسیاری لێ بکات لەو دەنگو باسەی‌و لەوەی کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی پێی کاتێ داوای فەتوای لێ کردوە (کاتێ پرسی لە پێغەمبەر کردو (ﷺ)) عومەری کوڕی عبدالله نامەی نوسی هەواڵی دایە کە سوبەیعە پێی گوتوە: کە خێزانی سەعدی موڕی خەولە بووە کە یەکێك بووە لەو کەسانەی کە ئامادەی جەنگی بەدر بووە. لە حەجی ماڵ ئاوایدا مردووە کە ئەم سکی هەبووە زۆری پێ نەچوە منداڵەکەی بووە. پاش مردنی پیاوەکەی وەختێ هاتوەتە دەرەوە خۆی جوان کردوە (دەستی بە خۆیا هێناوە) بۆ شوو کردن. ئەبوسەنابیلی کوڕی بەعکەك هاتوەتە لای پێی ووتوە: چیتە دەتبینم خۆت جوان کردوە؟ لەوانەیە بتەوێ شوو بکەی. سوێند بە خوا تۆ ناتوانی شوو بکەی هەتا چوارمانگو دە ڕۆژ تێنەپەڕێ بەسەرتا. سوبەیعە دەڵێت: کاتێ ئەمەی پێ ووتم جلو بەرگەکەم کۆ کردەوە کە شەوم بەسەرا هات ڕۆشتمە خزمەت پێغەمبەری خودا(ﷺ) لەو بارەیەوە پرسیارم لێ کرد ئیزنی پێدام (فەتوای بۆ دام) کە منداڵەکەم بوو من ئازادم‌و ئیزنی دام کە شوو بکەم گەر ئارەزوم لێ بێ‌و بمەوێ،[٥] ئەمە وتەی موسلمە بوخاریش ڕیوایەتی کردووە بە کورتی.[٦] خوای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجۡعَل لَّهُۥ مَخۡرَجٗا﴾ واتە: هەرکەس لە خوا ترس بێ خودا کاری بۆ ئاسان دەکات. زوو دێت بە هاواریەوەو دەرگای خێری لێ دەکاتەوە. پاشان فەرموویەتی: ﴿ذَٰلِكَ أَمۡرُ ٱللَّهِ أَنزَلَهُۥٓ إِلَيۡكُمۡۚ وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يُكَفِّرۡ عَنۡهُ سَيِّـَٔاتِهِۦ وَيُعۡظِمۡ لَهُۥٓ أَجۡرًا﴾

---

[١] فتح الباري (٨/٥٢١).

[٢] فتح الباري (٩/٣٧٩)، مسلم (٢/١١٢٣)، تحفة الاحوذي (٤/٣٧٥)، النسائي (٦/١٩٢).

[٣] احمد (٤/٣٢٧)، فەرمودەیەکی سەحیحە.

[٤] فتح الباري (٩/٢٧٩)، (٧/٣٦٠)، أبوداود (٢/٢٧٨)، النسائي (٦/١٩٠-١٩٦)، إبن ماجة (١/٦٥٤).

[٥] مسلم (١١٢٢).

[٦] فتح الباري (٩/٣٧٩).

ئەمەیش فەرمانی خودایە بۆ ئێوەی نادرووتە خوارێ. هەرکەسیش لە خودا بترسێ خەتاکانی دادەپۆشێ‌و پاداشتی گەورەی دەداتێ. واتە: ئەمە بریارو بەرنامەی خودایە ڕەوانەی کردوە بەهۆی پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) بۆ ئێوە ﴿وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يُكَفِّرْ عَنْهُ سَيِّـَٔاتِهِۦ وَيُعْظِمْ لَهُۥٓ أَجْرًا﴾ خەتاکانی دادەپۆشێ‌و دەیسرێتەوە بۆی. و پاداشتی زۆر گەورەی دەداتەوە. لەسەر کردەوەی کەم و بچووك.

﴿أَسْكِنُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ سَكَنتُم مِّن وُجْدِكُمْ وَلَا تُضَآرُّوهُنَّ لِتُضَيِّقُوا۟ عَلَيْهِنَّ ۚ وَإِن كُنَّ أُو۟لَـٰتِ حَمْلٍ فَأَنفِقُوا۟ عَلَيْهِنَّ حَتَّىٰ يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّ ۚ فَإِنْ أَرْضَعْنَ لَكُمْ فَـَٔاتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ ۖ وَأْتَمِرُوا۟ بَيْنَكُم بِمَعْرُوفٍ ۖ وَإِن تَعَاسَرْتُمْ فَسَتُرْضِعُ لَهُۥٓ أُخْرَىٰ ﴿٦﴾ لِيُنفِقْ ذُو سَعَةٍ مِّن سَعَتِهِۦ ۖ وَمَن قُدِرَ عَلَيْهِ رِزْقُهُۥ فَلْيُنفِقْ مِمَّآ ءَاتَىٰهُ ٱللَّهُ ۚ لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا مَآ ءَاتَىٰهَا ۚ سَيَجْعَلُ ٱللَّهُ بَعْدَ عُسْرٍ يُسْرًا ﴿٧﴾﴾

## جێ کردنەوەی تەڵاق دراو بە پێی دەست ڕۆشتن‌و توانا

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿أَسْكِنُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ سَكَنتُم مِّن وُجْدِكُمْ وَلَا تُضَآرُّوهُنَّ لِتُضَيِّقُوا۟ عَلَيْهِنَّ ۚ وَإِن كُنَّ أُو۟لَـٰتِ حَمْلٍ فَأَنفِقُوا۟ عَلَيْهِنَّ حَتَّىٰ يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّ ۚ فَإِنْ أَرْضَعْنَ لَكُمْ فَـَٔاتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ ۖ وَأْتَمِرُوا۟ بَيْنَكُم بِمَعْرُوفٍ ۖ وَإِن تَعَاسَرْتُمْ فَسَتُرْضِعُ لَهُۥٓ أُخْرَىٰ﴾ لە هەر کوێدا خۆتان دەژین (بەرانبەر بە دەست ڕۆینتان) جێی ئەوانیش بکەنەوە، هێندەشیان زۆر بۆ مەهێنن کە بیانخەنە تەنگانەوە، گەر منداڵیشیان لە سکدایە، خەرجیان بکێشن تا سکەکەیان دادەنێن، ئەوسا ئەگەر شیریان دا بە منداڵەکەوو، کرێی خۆیانیان بدەنێ‌و لەناو خۆتان بە تەرزێ ڕەوا پێك بێن. خۆ ئەگەر پێکیش نەهاتن، با یەکێ تر شیری پێ بدات. خوای گەورە فەرمان ئەدات بە بەندەکانی کە ئەگەر یەکێکیان ژنەکەی تەڵاق دا با لە ماڵی خۆیا جێگای بکاتەوە هەتا ماوەی چاوەڕوانیەکەی تەواو ئەبێ. و فەرموویەتی: ﴿أَسْكِنُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ سَكَنتُم﴾ واتە: لای خۆتان جێگایان بۆ دابنێن ﴿مِّن وُجْدِكُمْ﴾ ئیبنوعەباس‌و موجاهدو کەسانی تریش گوتویانە: واتە: بەپێی دەست ڕۆینتان[1] تا قەتادە دەڵێت: ئەگەر هەر توانات نەبوو دەست‌و نەڕۆیی. لە سوچێکی ناو ئەو ماڵەی خۆتا جێگای بۆ دانێ[2].

## نابێ زۆر بهێنرێ بە تەڵاق دراوەکە

خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَلَا تُضَآرُّوهُنَّ لِتُضَيِّقُوا۟ عَلَيْهِنَّ﴾ موقاتلی کوڕی حیان دەڵێت: واتە: زۆری پێ بهێنێ‌و هەراسانی بکات بۆ ئەوەی واز لەو مەسرەفەی بێنێ کە بۆی دەکات یا لە ماڵەکەی دەریکا.

---

[1] الطبري (٢٣/٤٥٧).

[2] الدر المنثور (٨/٢٠٧).

سەوری دەڵێت: لە مەنسورەوە ئەویش لە ئەبوزوحاوە ﴿وَلَا تُضَآرُّوهُنَّ لِتُضَيِّقُواْ عَلَيۡهِنَّ﴾ دەڵێت: واتە: تەڵاقی ئەدا هەتا دوو ڕۆژی ئەمێنێ چاوەڕوانیەکەی تەواو ببێ ئەیگێڕێتەوە ئەیباتەوە لای خۆی[1] زۆری پێ ئەهێنێ و هەراسانی دەکات.

## نەفەقەی سک پڕ لەسەر مێردەکەیەتی تا سکەکەی دادەنێ

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَإِن كُنَّ أُوْلَٰتِ حَمۡلٖ فَأَنفِقُواْ عَلَيۡهِنَّ حَتَّىٰ يَضَعۡنَ حَمۡلَهُنَّ﴾ ئەمە بۆ ژنێکە کە تەڵاقی کەوتبێ ئەگەر منداڵی لە سکا بوو مێردەکەی نەفەقەی ئەدا هەتا سکەکەی دائەنێ. بە بەڵگەی ئەوەی کە تەڵاقی گەڕانەوە پێویستە نەفەقەی بدرێ منداڵی لە سکا بێ یا لە سکیا نەبێ.

## دایکی تەڵاق دراو کرێی شیر پێدانی منداڵەکەی وەرئەگرێ پاش بوونی

خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿فَإِنۡ أَرۡضَعۡنَ لَكُمۡ﴾ واتە: وەختێ سکەکەیان دانا، تەڵاقیش درا بوون ماوەی چاوەڕوانیەکە بە دانانی سکەکەی تەواو دەبێ ئەو کاتە دایکی منداڵەکە بۆی هەیە (دەتوانێ) شیری بداتێ ئەشتوانێ شیری نەداتێ بەڵام دوای ئەوەی کە گۆشی دەکات. چونکە ئەو شیرەی کە پێی گۆش ئەکرێ زۆر پێویستە بۆ ئەو منداڵە بەو شیرە نەبێ ئەو منداڵە بەرهەم نایە بەباشیو ڕێکو پێکی. ئەگەر دایکەکە شیری دا بە منداڵەکە کرێی هاو وێنەی خۆی دەدرێتێ. وە ئەو ژنە بۆی هەیە کە پەیمان نامە لەگەڵ باوکی منداڵەکە یا بریکارەکەیا ببەستێ لەسەر کرێی شیردانەکە. بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَإِنۡ أَرۡضَعۡنَ لَكُمۡ فَـَٔاتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ﴾ وە ئەفەرموێت: ﴿وَأۡتَمِرُواْ بَيۡنَكُم بِمَعۡرُوفٖ﴾ واتە: لەناو خۆتانا بە شێوەیەکی جوان مامەڵە لەگەڵ یەکتر بکەن زیان بە یەکتر مەگەیەنن منداڵەکەیش توشی زیان مەکەن وەك خوای گەورە لە سورەتی بەقەرەدا (البقرة) فەرموویەتی: ﴿لَا تُضَآرَّ وَٰلِدَةُۢ بِوَلَدِهَا وَلَا مَوۡلُودٞ لَّهُۥ بِوَلَدِهِۦ﴾[2]، واتە: با زیان نەگەیەنرێ بە هیچ دایکێك بە هۆی منداڵەکەیەوە وە بە هیچ باوکێك بە هۆی منداڵەکەیەوە. وە ئەفەرموێت: ﴿وَإِن تَعَاسَرۡتُمۡ فَسَتُرۡضِعُ لَهُۥٓ أُخۡرَىٰ﴾ واتە: ئەگەر باوكو دایکەکە ڕێ نەکەوتنو دایکەکە داوای کرێی زیاتری دەکرد، باوکەکە ڕازی نەدەبوو یان باوکەکە کرێی کەمی ئەداو ڕازی نەدەبوو لەسەر کرێکە. با کەسێکی تر بە کرێ بگرێت بۆ شیردان بە منداڵەکەی، بەڵام ئەگەر دایکەکە ڕازی بوو بەو کرێیەی کە ئەدرێت بە کەسێکی تر کە شیر بە منداڵەکە ئەدا، پێویستە ئەو شیرەکەی بداتێ چونکە ئەم هەقی زیاترە. وە ئەفەرموێت: ﴿لِيُنفِقۡ ذُو سَعَةٖ مِّن سَعَتِهِۦۖ

---

[1] القرطبي (٨/١٦٨).

[2] البقرة (٢٣٣).

وَمَن قُدِرَ عَلَيْهِ رِزْقُهُۥ فَلْيُنفِقْ مِمَّآ ءَاتَىٰهُ ٱللَّهُ ۚ لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا مَآ ءَاتَىٰهَا ۚ سَيَجْعَلُ ٱللَّهُ بَعْدَ عُسْرٍ يُسْرًا ﴾ کێ دارایە لە دارایی خۆی بەخت کاو کێش بژێوی کەم پێ گەیوە، لەوەندەی خودا پێداوە بەخت بکا. خودا ئەرك ناخاتە سەر کەس، مەگین لەوەندەی پێداوە. خوا زوو لە پاشی تەنگانە فەرمانی دێنێ. واتە: باوك یان ئەو کەسەی لە جێی باوکە (نەفەقە) بدا بۆ شیر پێدانی منداڵەکە بەپێی توانا. وەك خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا﴾[1]، واتە: خوا داوا لە هیچ کەسێك ناکات مەگەر بە ئەندازەی توانای خۆی.

**چیرۆکی ژنە خواناسەکە**

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿سَيَجْعَلُ ٱللَّهُ بَعْدَ عُسْرٍ يُسْرًا﴾ ئەمە بەڵێنی خوای گەورەیە بەڵێنی خودایش ڕاستەو بەجێی دێنێ وەك ئەفەرموێت: ﴿فَإِنَّ مَعَ ٱلْعُسْرِ يُسْرًا ۝٥ إِنَّ مَعَ ٱلْعُسْرِ يُسْرًا﴾[2]، واتە: بەڕاستی لەگەڵ هەموو تەنگانەیەکدا خۆشیو ئاسانی دێت، بێگومان لە ڕاستیدا لەگەڵ هەموو تەنگانەیەکدا خۆشیو ئاسانی دێت. ئیمامی ئەحمد فەرموودەیەکی ڕیوایەت کردوە جوانە لێرەدا باسی بکەین ڕیوایەتی کردوە لە ئەبوهورەیرەوە: دەڵێت: پیاوو ژنێك لە ڕابوردودا (لە ساڵانی پێشودا) هیچیان نابێ (هەژار دەبن) پیاوەکە لە سەفەر دێتەوەو بە برسیەتی دەچێتە ژوورەوە لای خێزانی، برسیەتی تەنگی پێ هەڵچنیوە دەڵێ بە خێزانی هیچ شتێکت لەلایە؟ ژنەکە دەڵێ: بەڵێ مژدەبێ خودا ڕۆزی بۆ ناردین. پەلەی لێ کردو دەڵێت: هاوار بۆ تۆ هەوڵێ بدە گەر شتێکت لەلایە. خێزانی دەڵێت بەڵێ کەمێ بوەستە (بە هیوای بەزەیی خوا بوو) هەتا کاتەکە درێژەی کێشا لەسەری دەڵێت: هاوار بۆ تۆ هەڵسە هەوڵێ بدە ئەگەر شتێکت لایە بۆم بێنە زۆر ناڕەحەتمو ئێجگار برسیمە. ژنەکە دەڵێت: بەڵێ ئێستا تەنورەکە دەکەینەوە پەلە مەکە! ماوەیەك خێزانی بێ دەنگ بوو چاوەڕوانی ئەکرد کە بانگی لێ بکا. لەبەرخۆیەوە دەڵێت: مەگەر هەڵسم سەیری تەنورەکە بکەم. هەڵساو کە سەیری تەنورەکەی کرد پڕ بوو (لە لاکی مەڕا) دەساڕەکەیش (طاحونة) ئاردی ئەکرد. هەڵسا دەساڕەکەی تەکاندو هەرچی لە تەنورەکەشدا بوو دەری هێناو لە لاکی مەڕەکە. ئەبوهورەیرە دەڵێت: سوێند بەو کەسەی کە گیانی ئەبوقاسمی بەدەستە ئەمە قسەی محمدە (ﷺ): (ئەگەر ئەوەی لەناو دەساڕەکەدا بوو هەڵی بگرتایەو نەی تەکاندایە هەتا ڕۆژی قیامەت هەر بۆی دەهاڕی)[3].

---

[1] البقرة (٢٨٦).

[2] الشرح (٥-٦).

[3] احمد (٤٢١/٢)، ئەم فەرمودەیە سەنەدەکانی لاوازە.

﴿ وَكَأَيِّن مِّن قَرْيَةٍ عَتَتْ عَنْ أَمْرِ رَبِّهَا وَرُسُلِهِۦ فَحَاسَبْنَٰهَا حِسَابًا شَدِيدًا وَعَذَّبْنَٰهَا عَذَابًا نُّكْرًا ﴿٨﴾ فَذَاقَتْ وَبَالَ أَمْرِهَا وَكَانَ عَٰقِبَةُ أَمْرِهَا خُسْرًا ﴿٩﴾ أَعَدَّ ٱللَّهُ لَهُمْ عَذَابًا شَدِيدًا ۖ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ يَٰٓأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ۚ قَدْ أَنزَلَ ٱللَّهُ إِلَيْكُمْ ذِكْرًا ﴿١٠﴾ رَّسُولًا يَتْلُوا۟ عَلَيْكُمْ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ مُبَيِّنَٰتٍ لِّيُخْرِجَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ مِنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ ۚ وَمَن يُؤْمِنۢ بِٱللَّهِ وَيَعْمَلْ صَٰلِحًا يُدْخِلْهُ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا ۖ قَدْ أَحْسَنَ ٱللَّهُ لَهُۥ رِزْقًا ﴿١١﴾ ﴾

**سزای سەرپێچی کردن لە فەرمانی خودا**

خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ وَكَأَيِّن مِّن قَرْيَةٍ عَتَتْ عَنْ أَمْرِ رَبِّهَا وَرُسُلِهِۦ فَحَاسَبْنَٰهَا حِسَابًا شَدِيدًا وَعَذَّبْنَٰهَا عَذَابًا نُّكْرًا ﴾ شارگەلێ زۆر لە فەرمانی پەروەردگاری خۆیان‌و پێغەمبەرانی وەدەرکەوتن، ئەوسا پێمان بژاردنەوە، بژاردەیەکی زۆر توندو ئازارمان دان بە ئازاردانێکی دژوار. خودای گەورە هەڕەشە لەو کەسانە دەکا کە پێچەوانەی فەرمانی ئەو دەجوڵێنەوەو باوەڕ بە پێغەمبەرەکانی ناکەن‌و ڕێیە دەگرنە بەر غەیرەز ئەو ڕێگەیە کە خوا بۆی داناون. وە باسی ئەو گەلە پێشوانەمان بۆ دەکا کە چیان بەسەرهات بەهۆی ئەو گومڕایی‌و لە ڕێ لادانەیانەوە. ئەفەرموێت: ﴿ وَكَأَيِّن مِّن قَرْيَةٍ عَتَتْ عَنْ أَمْرِ رَبِّهَا وَرُسُلِهِۦ ﴾ واتە: یاخی بوون‌و لایانداو خۆیان بە زل گرت لە شوێن کەوتنی فەرمانی خوداو پێغەمبەرەکانی (سەلامی خوایان لێ بێ) ﴿فَحَاسَبْنَٰهَا حِسَابًا شَدِيدًا وَعَذَّبْنَٰهَا عَذَابًا نُّكْرًا﴾ واتە: ئازارمان دان بە ئازارێکی دژوار، وە ئەفەرموێت: ﴿ فَذَاقَتْ وَبَالَ أَمْرِهَا وَكَانَ عَٰقِبَةُ أَمْرِهَا خُسْرًا ﴾ ئیتر ئاکامی ئاکاری خۆیان چەشت‌و هەموو بەرهەمی کردەوەیان هەر زیان بوو. پاشان بەرهەمی ئەو سەرپێچیەی خۆیان چەشت‌و پەشیمان بوونەوە بەڵام پەشیمانی هیچ دادێکیان نادات. ﴿وَكَانَ عَٰقِبَةُ أَمْرِهَا خُسْرًا﴾ هەموو بەرهەمی کردەوەیان هەر زیان بوو. وە خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿أَعَدَّ ٱللَّهُ لَهُمْ عَذَابًا شَدِيدًا ۖ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ يَٰٓأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ۚ قَدْ أَنزَلَ ٱللَّهُ إِلَيْكُمْ ذِكْرًا﴾ خودا بۆیان جەزرەبەی زۆر توندو تیژی ئامادە کرد دەسا ئەی خاوەن ئاوەزان، ئەوانەی خاوەن باوەڕن، ئەشێ لە خودا بترسن. ئەوا خودا قورئانی بۆ ناردونەتە خوار. واتە: لە ڕۆژی دوایدا لەگەڵ ئەو ئازارەی کە لە دنیادا ئەیاندا پێشی خستوە بۆیان. پاش ئەوەی خودای گەورە باسی ئەو دوور لە خوایانەی کرد ئەفەرموێت: ﴿فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ يَٰٓأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ﴾ واتە: ئەی ئەو کەسانەی خاوەن بیرو هۆشێکی ڕێك‌و ڕاستن ئێوە وەك ئەوان مەبن ئەوەی ئەوان تووشی بوون با ئێوە تووشی نەبن. ﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾ واتە: ئەوانەی کە باوەڕیان هێنا بە خواو بە پێغەمبەرەکانی (سەلامی خوایان لێ بێ) ﴿قَدْ أَنزَلَ ٱللَّهُ إِلَيْكُمْ ذِكْرًا﴾ واتە: قورئان. وەك خودا ئەفەرموێت: ﴿ إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا

ٱلذِّكۡرَ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ﴾[١]، واتە: بێگومان هەر ئێمە قورئانمان ناردۆتە خوارەوەو بەڕاستی هەر ئێمەش دەیپارێزین.

**باس و وەسفی (صفة) پێغەمبەر(ﷺ)**

خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿رَّسُولٗا يَتۡلُواْ عَلَيۡكُمۡ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ مُبَيِّنَٰتٖ لِّيُخۡرِجَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ مِنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِۚ وَمَن يُؤۡمِنۢ بِٱللَّهِ وَيَعۡمَلۡ صَٰلِحٗا يُدۡخِلۡهُ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدٗاۖ قَدۡ أَحۡسَنَ ٱللَّهُ لَهُۥ رِزۡقًا﴾ پێغەمبەرێکی ناردوە کە نیشانە ڕون کەرەوەکانی خۆتان بۆ دەخوێنێ، تا ئەوانەی بە باوەڕو ئاکار چاکن لە تاریکایی دەربخاو بەرەو ڕۆشناییان بەرێ و هەرکێش بە خوا بڕوای هەبێ و ئاکار چاك بێ، دەینێرێتە ناو باغاتێك جۆباریان بە بەردا دەڕوات و هەتا سەر، هەر لەوێ دەبن، دیارە خودا بژێوی باشی دەداتێ. هەندێ گوتویانە: ﴿رَّسُولٗا﴾ مەنسوبە (منصوب) لەبەر ئەوەی بەدەل ئیشتیمال و مولابەسەیە (بدل إشتمال و ملابسة) چونکە پێغەمبەر(ﷺ) ئەو کەسە بووە کە قورئانی گەیاندوە بە مەردم. ئیبنوجەریر دەڵێت ڕاست ئەوەیە کە پێغەمبەر(ﷺ) خۆی مانای قورئانەو تەفسیرە بۆی.[٢] بۆیە خودا فەرموویەتی: ﴿رَّسُولٗا يَتۡلُواْ عَلَيۡكُمۡ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ مُبَيِّنَٰتٖ﴾ لە ڕاستیدا قورئان ڕون کەرەوەو ڕۆشنایەکی دیارو ئاشکرایە. ﴿لِّيُخۡرِجَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ مِنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ﴾ ئەم فەرمودەیە وەك ئەمە وایە کە ئەفەرموێت: ﴿كِتَٰبٌ أَنزَلۡنَٰهُ إِلَيۡكَ لِتُخۡرِجَ ٱلنَّاسَ مِنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ﴾[٣]، واتە: ئەمە پەڕاوێکە ناردومانەتە خوارەوە بۆ تۆ (ئەی موحەممەد (ﷺ)) بۆ ئەوەی خەڵکی ڕزگار بکەیت لە تاریکی یەکانەوە بۆ ڕووناکی. وە ئەفەرموێت: ﴿ٱللَّهُ وَلِيُّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ يُخۡرِجُهُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ﴾[٤]، واتە: خوا دۆست و کارسازی ئەوانەیە کە بڕوادارن دەریان دەهێنێت لە تاریکستانی بێ بڕوایی بۆ ڕوناکی باوەڕو ڕێنمونی. واتە: لە تاریکایی بێ دینی و نەفامیەوە بۆ ڕوناکی و زانیاری و باوەڕ. خوای مەزن ئەو نیگایەی کە ناردویەتی ناوبردوە بە ڕووناکی کە ڕێگای پێ نیشان دەدرێ وە ناویشی بردوە بە ڕوح کە بەهۆی ڕۆحەوە دڵەکان زیندوو دەبنەوە. وە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَكَذَٰلِكَ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ رُوحٗا مِّنۡ أَمۡرِنَاۚ مَا كُنتَ تَدۡرِي مَا ٱلۡكِتَٰبُ وَلَا ٱلۡإِيمَٰنُ وَلَٰكِن جَعَلۡنَٰهُ نُورٗا

---

[١] الحجر (٩).

[٢] الطبري (٢٣/٤٦٨).

[٣] ابراهيم (١).

[٤] البقرة (٢٥٧).

نَّهۡدِي بِهِۦ مَن نَّشَآءُ مِنۡ عِبَادِنَاۚ وَإِنَّكَ لَتَهۡدِيٓ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ﴾[1]، واته: هەر بەو شێوەیە (کە وەحی پێ دێ) قورئانمان بۆ تۆ نارد (ئەی موحەممەد (ﷺ)) بە فەرمانی خۆمان کە تۆ نەتدەزانی کتێبو ئیمان چی یە بەڵام ئێمە ئەوەمان کردە ڕوناکی یەك ڕێنمونی هەرکەسێکی پێ دەکەین کە بمانەوێت لە بەندەکانمان وە بە ڕاستی تۆ (خەڵك) ڕێنمونی دەکەیت بۆ ڕێگای ڕاست. وە ئەفەرموێت: ﴿وَمَن يُؤۡمِنۢ بِٱللَّهِ وَيَعۡمَلۡ صَٰلِحٗا يُدۡخِلۡهُ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدٗاۖ قَدۡ أَحۡسَنَ ٱللَّهُ لَهُۥ رِزۡقًا﴾ وێنەی ئەم ئایەتە لە پێشەوە تەفسیر کراوە چەند جارێك پێویست ناکا لێرەدا دیسان دووبارەی بکەینەوە سوپاسو ستایش بۆ خوای گەورە.

﴿ٱللَّهُ ٱلَّذِي خَلَقَ سَبۡعَ سَمَٰوَٰتٖ وَمِنَ ٱلۡأَرۡضِ مِثۡلَهُنَّۖ يَتَنَزَّلُ ٱلۡأَمۡرُ بَيۡنَهُنَّ لِتَعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ وَأَنَّ ٱللَّهَ قَدۡ أَحَاطَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عِلۡمَۢا ﴿١٢﴾﴾

## باسی توانای بێ پایانی خودا

خوای گەورە باسی دەسەڵاتی بێ پایانی خۆیمان بۆ دەکات کە خودایەکی گەورەو خاوەن دەسەڵاتەو وە هەر ئەو گەورەیی‌و دەسەڵاتەیە وای کردوە کە ئەو ئاینەشی کە ناردویەتی ئاینێکی پیرۆزو گەورەو بەردەوامە هەتا دنیا کۆتایی دێت وەك ئەفەرموێت: ﴿ٱللَّهُ ٱلَّذِي خَلَقَ سَبۡعَ سَمَٰوَٰتٖ وَمِنَ ٱلۡأَرۡضِ مِثۡلَهُنَّۖ يَتَنَزَّلُ ٱلۡأَمۡرُ بَيۡنَهُنَّ لِتَعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ وَأَنَّ ٱللَّهَ قَدۡ أَحَاطَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عِلۡمَۢا﴾ ئەو خودایەی حەوت ئاسمانو وەك ئەوانەشی،و زەمینی وەدی هێناوە! فەرمانی بە نێوانیاندا دێتو دەچێ، تا بزانن خوا بۆ هەموو شت توانایەو زانستی خوا هەموو شتێ دەورەی داوە. ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە وایە کە باسی نوح پێغەمبەر(علیه السلام) دەکات کە دەڵێت: بە گەلەکەی ﴿أَلَمۡ تَرَوۡاْ كَيۡفَ خَلَقَ ٱللَّهُ سَبۡعَ سَمَٰوَٰتٖ طِبَاقٗا﴾[2]، واته: ئایا نابینن کە خوا چۆن حەوت ئاسمانی دروست کردوە نهۆم لەسەر نهۆم. وە خوا ئەفەرموێت: ﴿تُسَبِّحُ لَهُ ٱلسَّمَٰوَٰتُ ٱلسَّبۡعُ وَٱلۡأَرۡضُ وَمَن فِيهِنَّ﴾[3]، واته: ستایشی خوا دەکەن هەر حەوت ئاسمانەکانو زەوی‌و هەرچی لەناویاندایە. و ئەفەرموێت: ﴿وَمِنَ ٱلۡأَرۡضِ مِثۡلَهُنَّ﴾ واته: حەوت زەمینیش. وەك لەهەردووسەحیحەکەدا هاتوە (کەسێ بە ئەندازەی بستێ زەمین بە ناهەق

---

[1] الشوری (٥٢).

[2] نوح (١٥).

[3] الاسراء (٤٤).

بەرێ خودا دەیكاتە ملی تا حەوت تەبەقەی زەمین)[1] واتە: هەقی لێ ئەسێنێ. وە لە سەحیحی بوخاریا هاتوە (دەبرێتەخوارەوە بەهۆی داگیر كردنی ئەو بوستە زەمینەوە تا حەوت تەبەقەی ژێر زەمین)[2] وە باسی ڕێگاكان‌و وتەكانی بەهێزیم لە پێشەكی(البدایة و النهایة) دا كردوە لە باسی وەدی هاتنی زەمین[3] سوپاس‌و ستایش بۆ خودا. وەهەندێ مانای حەوت زەمینیان بە حەوت هەرێم داناوە. ئەوەی ئەم بۆچوونەی هەیە لایداوە لە ڕاستە ڕێی‌و دوور كەوتوەتەوە لە ڕاستی، دژی قورئان‌و سونەتە بەبێ سەنەدو بەلگە.

## تەفسیری سورەتی (التحریم)

## لە مەدینە هاتووەتە خوارەوە

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ لِمَ تُحَرِّمُ مَآ أَحَلَّ ٱللَّهُ لَكَۖ تَبۡتَغِي مَرۡضَاتَ أَزۡوَٰجِكَۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ۝١ قَدۡ فَرَضَ ٱللَّهُ لَكُمۡ تَحِلَّةَ أَيۡمَٰنِكُمۡۚ وَٱللَّهُ مَوۡلَىٰكُمۡۖ وَهُوَ ٱلۡعَلِيمُ ٱلۡحَكِيمُ ۝٢ وَإِذۡ أَسَرَّ ٱلنَّبِيُّ إِلَىٰ بَعۡضِ أَزۡوَٰجِهِۦ حَدِيثٗا فَلَمَّا نَبَّأَتۡ بِهِۦ وَأَظۡهَرَهُ ٱللَّهُ عَلَيۡهِ عَرَّفَ بَعۡضَهُۥ وَأَعۡرَضَ عَنۢ بَعۡضٖۖ فَلَمَّا نَبَّأَهَا بِهِۦ قَالَتۡ مَنۡ أَنۢبَأَكَ هَٰذَاۖ قَالَ نَبَّأَنِيَ ٱلۡعَلِيمُ ٱلۡخَبِيرُ ۝٣ إِن تَتُوبَآ إِلَى ٱللَّهِ فَقَدۡ صَغَتۡ قُلُوبُكُمَاۖ وَإِن تَظَٰهَرَا عَلَيۡهِ فَإِنَّ ٱللَّهَ هُوَ مَوۡلَىٰهُ وَجِبۡرِيلُ وَصَٰلِحُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَۖ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ بَعۡدَ ذَٰلِكَ ظَهِيرٌ ۝٤ عَسَىٰ رَبُّهُۥٓ إِن طَلَّقَكُنَّ أَن يُبۡدِلَهُۥٓ أَزۡوَٰجًا خَيۡرٗا مِّنكُنَّ مُسۡلِمَٰتٖ مُّؤۡمِنَٰتٖ قَٰنِتَٰتٖ تَٰٓئِبَٰتٍ عَٰبِدَٰتٖ سَٰٓئِحَٰتٖ ثَيِّبَٰتٖ وَأَبۡكَارٗا ۝٥﴾

**خودا پێغەمبەرەكەی (ﷺ) ئاگادار دەكاتەوە لەسەر ئەو شتەی كە بۆی ڕەوا بینیوە لە خۆی ناڕەوا دەكات، وە باسی كەفارەتی سوێندەكەی‌و سەرزەنشتی خێزانەكانی دەكات لەسەر دڵ گران كردنی**

بوخاری ڕیوایەتی كردوە لە كیتابی (الایمان و النذور)دا لە عوبەیدەی كوڕی عومەیرەوە دەڵێت: بیستم لە عائیشە ئەی ووت: پێغەمبەر(ﷺ) لای زەینەبی كچی جەحش ئەمایەوە شەربەتی هەنگوینی ئەخواردەوە، من‌و حەفسە ڕێكەوتین هەر یەكێكمان پێغەمبەری(ﷺ) هاتە لا با پێی بڵێ: بۆنی سەمغی وشتر خوارت لێ دێ ئایا ئەو سەمغەت خواردوە؟ پێغەمبەر(ﷺ) چووە لای یەكێكیان ئەوەی پێ ووت فەرمووی: (نەمخواردوە، لای زەینەب شەربەتی هەنگوینم خواردۆتەوە ئیتر هەرگیز نایخۆمەوە) ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ لِمَ تُحَرِّمُ مَآ أَحَلَّ ٱللَّهُ لَكَ﴾ تا ئەفەرموێت: ﴿إِن تَتُوبَآ إِلَى ٱللَّهِ فَقَدۡ صَغَتۡ قُلُوبُكُمَا﴾ لەسەر عائیشەو حەفسە. ﴿وَإِذۡ أَسَرَّ ٱلنَّبِيُّ إِلَىٰ بَعۡضِ أَزۡوَٰجِهِۦ حَدِيثٗا﴾ بۆ ئەوەی

---

[1] فتح الباري (١٥/١٢٤)، مسلم (٣/١٢٣٢).

[2] فتح الباري (٥/١٢٤).

[3] البداية و النهاية (١/١٩–٢٠).

کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (نەخێر شەربەتی هەنگوینم خواردۆتەوە) ئیبراهیمی کوڕی موسا دەڵێت لە هیشامەوە (ئیتر هەرگیز نایخۆمەوە وا سوێندم خوارد هەواڵ بە کەس مەدە لەو بارەیەوە)[1] وە هەر بەم شێوەیە کە کتابی تەڵاقا (کتاب الطلاق) هەر بەم سەنەدە ڕیوایەتی کردوە وتەکانیشی لێیەوە نزیکە.[2] پاشان دەڵێت: (مەغافیر سەمغێکی شیرینو بۆن ناخۆشە لە وشتر خوار دێتە دەر. گوتراوە سەمغی پێوەیە وەختێ پێوەی دیار بێ. موفرەدەکەی (مغفور) پێی ئەگوترێ: (مغافير) جەوهەریش هەر وای گوتوە. وە ئەم سەمغە (الصمغ) لەم درەختانەش دەدرێت وەك (عوشرو سەمامو سەلەمو تەلح) (العشر و الثمام و السلم و الطلح) وە دەڵێت: (الرمث) بە کەسرە واتە: لەوەڕگایەك لە لەوەڕگاکانی وشتر (کە ئەو خواردنە تامەکەی ترشە) وە دەڵێت: (عُرفوط) وشتر خۆرە سەمغی لێ دەدرێت. موسلمیش ئەم فەرمودەی ڕیوایەت کردوە لە سەحیحەکەیا لە کیتابی تەڵاقدا (کتاب الطلاق) لە عائیشەوە بەم شێوەیە. بەم وتەیەش وەك چۆن بوخاری هێنابوی لە (الایمان و النذور)دا.[3] پاشان بوخاری ڕیوایەتی کردوە لە (کتاب الطلاق)دا لە عائیشەوە دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) حەزی لە حەڵواو هەنگوین ئەکرد. کاتێ لە نوێژی عەسر ئەگەڕایەوە ئەچوە لای خێزانەکانی لە یەکێکیان نزیك ئەبوەوە. چوە لای حەفسە ئەوەندە لای مایەوە زیاد لە ئەندازەی خۆی. غیرەتم هەڵسا. پرسیارم کرد پێیان وتم: ژنێکی خزمی هیزەیەك هەنگوینی بە دیاری بۆ هێنا بوو. شەربەتی هەنگوینی دا بە پێغەمبەر(ﷺ) ووتم: سوێند بە خوا ئەبێ فێڵێکی لێ بکەین. بە سەودەی کچی زەمعەم (زمعة) ووت: پێغەمبەری خودا(ﷺ)کە هاتە لای نزیکت ئەکەوێتەوە، کە لێت نزیك بوەوە، پێی بڵێ مەغافیرت خواردوە. ئەفەرموێ نەخێر نەمخواردوە. پێی بڵێ: ئەی ئەو بۆنە چیە لێت دێ. پێغەمبەر(ﷺ) ئەفەرموێت لای حەفسە شەربەتی هەنگوینم خواردوەتەوە. بڵێ: هەنگەکەی بە داری وشتر خوارەوە نیشتوەتەوە منیش وا ئەڵێم ئەی سەفیە تۆیش وا بڵێ. عائیشە دەڵێت: سەودە ووتی: سوێند بە خوا کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) گەیشتە دەرگاکە ویستم ئەوەی کە تۆ پێت ووتم پێی بڵێم لە ترسی تۆ. کاتێ لێی نزیك بوەوە سەودە پێی ووت: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) مەغافیرت خواردوە؟ فەرمووی: نەخێر. دەڵێت: ئەی ئەم بۆنە چیە لێت دێت؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (لای حەفسە شەربەتی هەنگوینم خواردوەتەوە). دەڵێت: هەنگەکەی بە داری وشتر خوارەوە نیشتوەتەوە. کاتێ لای دایەوە لای من. منیش وام ووت. وەختێ لای دایەوە بۆ لای سەفیەش هەر وای ووت: کاتێ لای کردەوە بۆ لای حەفسە. حەفسە دەڵێت: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) شەربەتی هەنگوینت نەدەمێ؟ فەرمووی:

---

[1] فتح الباري (١١/٥٨٢).

[2] فتح الباري (٩/٢٨٧).

[3] مسلم (٢/١١٠٠).

(پێویستم پێی نیه) دەڵێت: سەودە دەڵێت: سوێند بە خوا لێمان حەرام کرد. ووتم: کچێ بێ دەنگ بە.[1] ئەمە قسەی بوخاریە موسلمیش ڕیوایەتی کردوە.[2] وە لای موسلم عائیشە دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) زۆری پێ ناخۆش بوو کە بۆنی ناخۆشی لێ بێ[3] بۆیە پێیان گوتوە: مەغافیرت خواردوە چونکە بۆنەکەی ناخۆش بوە. وەختێ فەرمووی: (نەخێر شەربەتی هەنگوینم خواردوە) گوتیان: هەنگەکە بە داری وشتر خوارەوە نیشتوەتەوە. واتە: کە سەمغەکەی مەغافیرە. بۆیە ئەو هەنگوینەی خواردوتە بۆنی دێ. جەوهەری دەڵێت: کاتێ هەنگەکە پێوە دەنیشێتەوەو ئەیخوات، وە بە هەنگیش گوتراوە (جوارس) وەك شاعر دەڵێت: (تظل على الثمراء منها جوارس) واتە: هەنگ بەردەوام وا بەسەر گوڵو بەرەوە دەنیشێتەوە. وە دەڵێت: (الجَرْس) و (الجِرْس) دەنگی هێواش. ووتراوە: گوێم لە دەنگی باڵندەیە: وەختێ گوێی لە دەنوکی بێ کە بدا لە شتێ بیخوات. وە لەم فەرمودەدا هاتوە (دەنگی باڵندەی بەهەشت دەبیسن) ئەسمەعی دەڵێت: لە مەجلیسی شوعبەدا دانیشتبووم دەڵێت: (فیسمعون جَرْش طيور الجنة) بە پیتی (شین) منیش ووتم: جرس؟ سەیری کردمو دەڵێت: لێی وەرگرە چونکە ئەو باشتر دەزانێ لە ئێمە.[4] مەبەست لێرەدا ئەوەیە کە حەفسە شەربەتی هەنگوینەکەی داوە بە پێغەمبەر(ﷺ) ئەویش لە ڕێگای هیشامی کوڕی عوروەوە وە ئەویش لە باوکیەوە لە پوریەوە لە عائیشە. وە لە ڕێگای ئیبنوجورەیجەوە لە عەتاوە ئەمیش لە عوبەیدی کوڕی عومەیرەوە لە عائیشەوە کە زەینەبی کچی جەحش شەربەتی هەنگوینی دا بە پێغەمبەر(ﷺ) وە عائیشەو حەفسە هەڵسان بەو فێڵە پێی هەڵسان فالله أعلم. وە ئەوەی کە ئەبێتە بەڵگە لەسەر ئەوەی کە عائیشەو حەفسە هەڵسانو ئەو فێڵەیان کرد ئەو فەرمودەیە کە ئیمام ئەحمد ڕیوایەتی کردوە لە موسنەدەکەیا کە دەڵێت: لە ئیبنوعەباسەوە دەڵێت: بە بەردەوام هەوڵم ئەدا کە پرسیار بکەم لە عومەری کوڕی خەتاب لەو دوو ئافرەتەی کە خێزانی پێغەمبەر بوون (ﷺ) خوای گەورە لە بارەیانەوە فەرموویەتی: ﴿إِن تَتُوبَآ إِلَى ٱللَّهِ فَقَدْ صَغَتْ قُلُوبُكُمَا﴾ تا حەجی کرد منیش لەگەڵیا حەجم کرد لە ڕێگا لایداو چوە ناو دارستانەکە بۆ دەست بە ئاوگەیاندن پاشان هاتەوە بۆ لام ئاوم کرد بە دەستیدا دەست نوێژی گرت. ووتم: ئەی گەورەی موسوڵمانان. ئەو دوو ژنە کێن کە لە دژی پێغەمبەر(ﷺ) قسەیان کردبوو بەیەكو خوای گەورە فەرمووی: ﴿إِن تَتُوبَآ إِلَى ٱللَّهِ فَقَدْ صَغَتْ قُلُوبُكُمَا﴾ عومەر دەڵێت: ئەی ئیبنوعەباس قسەکەتم بە

---

[1] فتح الباري (٢٨٧/٩).

[2] مسلم (١١٠١/٢-١١٠٢).

[3] مسلم (١١٠٢/٢).

[4] المجموع المغيث (٣٢٠/١).

لاوە سەیرە. زوهەری دەڵێت: بە خوا عومەر پێی ناخۆش بوو ئەو پرسیارەی لێ کرد بەڵام نەیشاردەوە. دەڵێت: عائیشەو حەفسە بوون. دەڵێت: پاشان فەرموودەکە دێنێتو عومەر دەڵێت: ئێمەی قورەیشی لە کاتی نەفامیدا هیچ حیسابێکمان بۆ ژن نەدەکرد، کاتێ چووینە مەدینە. بینیمان ژنان زاڵن بەسەر پیاوەکانیاندا وای لێ هات ژنەکانمان لەوانەوە فێربوونو بە گوێیان نەدەکردین. دەڵێت: ماڵەکەم لە لای ماڵی ئومەیەی کوڕی زەید بوو لە عەوالی دەڵێت: ڕۆژێك لە ژنەکەم تورە بووم ئەویش بەرامبەرم وەستاو وەڵامی دامەوە پێم ناخۆش بوو بەرامبەرم وەستا پێی ووتم: بە لامەوە سەیرە کە پێت ناخۆشە قسە لە قسەتا بکەم سوێند بە خوا ژنەکانی پێغەمبەر(ﷺ) بەرەو ڕووی ئەوەستن وە ژنی وایان هەیە کە لە بەیانیەوە هەتا شەو نزیکی پێغەمبەر(ﷺ) نابنەوە. عومەر دەڵێت: چومە دەرەوە ڕۆشتمە لای حەفسە ووتم: ئایا بەرەو ڕوی پێغەمبەر(ﷺ) ئەوەستن. دەڵێت: بەڵێ، ووتم: یەکێك لە ئێوە ڕۆژێ تا ئێوارە لێی دوور ئەکەوێتەوە؟ دەڵێت: بەڵێ گوتم: هەر یەکێك لە ئێوە وای کردبێ زیانبار بوەو تیا چوە. ئاخۆ هەر یەکێکتان ناترسێ لە خوا کە غەزەبی لێ بگرێ لەسەر ئەو تورەبوونی پێغەمبەر(ﷺ) ئەو کاتە ئەو کەسە تیاچوە. بەرەو ڕووی پێغەمبەر(ﷺ) مەوەستەو پرسیاری هیچی لێ مەکە. داوا لە من بکە هەر چیەکت پێویست بوو تۆ لەخۆت بایی مەبە ئەوەی لەگەڵتە جوانترەو خۆشەویست ترە لە تۆ لە لای پێغەمبەر(ﷺ) مەبەستی عائیشە بوو، ووتی: پیاوێکی ئەنساری دراوسێم هەبوو بە نۆرە ڕۆژێ یەکێکمان ئەچوینە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) ڕۆژێ ئەو ئەچوو ڕۆژێکیش من ئەڕۆشتم. هەواڵی نیگاو شتی تریشی بۆ ئەهێنام وە منیش هەر بەو شێوەیە بۆ ئەوم ئەهێنا. دەڵێت: ئێمە لەوکاتەدا ترسمان لە مەلیکێ لە مەلیکەکانی غەسان هەبوو کە بدا بە سەرماناو داگیرمان بکا. هاوەڵەکەم ڕۆژێك دابەزی پاشان عیشا هاتەوە دای لە دەرگاکەم پاشان بانگی کردم چوومە دەرەوە بۆ لای. دەڵێت: ڕوداوێکی زۆر گەورە ڕویداوە. گوتم: چیە غەسانیەکە هاتوە؟ دەڵێت: لەوە گەورەترو خراپتر. پێغەمبەر(ﷺ) لە ژنەکانی جیا بوەتەوە ووتم: حەفسە داماو زیانبار بوو. من وام دەزانی وایەو ژنەکانی تەڵاق داوە هەتا وەختێ نوێژی بەیانیم کردو جلەکانم هەڵگرتو ڕۆشتم بۆ ئەوێو چوومە لای حەفسە ئەگریا. ووتم: پێغەمبەری خودا(ﷺ) تەڵاقی داون. حەفسە دەڵێت: نازانم. ئەوە پێغەمبەرە (ﷺ) بە تەنیا لەو گەنجێنە دایە چومە لای ئەو منداڵە (غولامە) ڕەشەکە لای بوو گوتم: ئیزنم بۆ وەرگرە. منداڵەکە چوە ژورەوە پاشان هاتەوە بۆ لام دەڵێت: باسی تۆم بۆ کرد قسەی نەکرد. عومەر دەڵێت: ڕۆشتم بۆ لای مینبەرەکە لەوکاتەدا کۆمەڵێك دانیشتبوون دەگریان. منیش کەمێك دانیشتم پاشان خۆم نەگرت. چومە لای منداڵەکە گوتم: ئیزن بۆ عومەر وەرگرە چووە ژورەوەو هاتە دەرەوە دەڵێت: باسی تۆم بۆ کرد قسەی نەکرد ڕۆشتمەوە بۆ لای مینبەرەکە دانیشتم پاشان خۆم نەگرت چومەوە بۆ لای منداڵەکە گوتم: ئیزن وەرگرە بۆ عومەر

ڕۆشتو پاشان هاتەوە دەڵێت: باسی تۆم بۆ کرد قسەی نەکرد. منیش گەڕامە دواوە. وەختێکم زانی منداڵەکە بانگم دەکات. دەڵێت: ئیزنی دای بڕۆرە ژورەوە. سڵاوم لە پێغەمبەر کرد (ﷺ) لەسەر حەسیرێك ڕاکشا بوو کە جێگاکەی دیار بوو لە لاتەنیشتیا (لە لەشیا) ووتم: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) خێزانەکانت تەڵاق داوە؟ سەری بۆم بەرز کردەوەو فەرمووی: (نەخێر) ووتم: (الله اکبر) ئەگەر ئەت بینین‌و چاوت پێمان ئەکەوت ئەی پێغەمبەری خودا ئێمەی خەڵکی قورەیشی خەڵکێك بووین زاڵ بووین بەسەر ژناندا وەختێ هاتینە مەدینە خەڵکێکمان چاو پێ کەوت کە ژنەکانیان زاڵن بەسەریانا. ژنانی ئێمەیش لەوانەوە فێری ئەوە بوون. عومەر دەڵێت: ڕۆژێك تورە بووم لە ژنەکەم بەرەو ڕووم وەستا دەستی ئەخستە کارم پێم ناخۆش بوو کە بەو شێوەیە قسە دەکات. دەڵێت: تۆ پێت ناخۆشە قسە لە قسەتا بکەم. سوێند بە خوا ژنەکانی پێغەمبەر(ﷺ) ڕوبەڕوی پێغەمبەر دەوەستن وە یەکێك لە ژنەکانی ئەمڕۆ تا ئێوارە لێی بەدوور بووە. منیش گوتم ئەوەی ئەو کارەی کردوە داماوو زەرەرمەند (زیانبار) بووە لە ئێوە. ئاخۆ هیچ کەسێکتان ناترسن کە خودا غەزەبی لێ بگرێ لەسەر تورەبونی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لێی‌و ئەوکاتە ئەو کەسە تیا چوەو داماو بوە. پێغەمبەری خودا(ﷺ) زەردەخەنەیەکی کرد (پێکەنی) ووتم: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) چومە لای حەفسە پێم گوت: لە خۆت نەگۆڕێیت کە هاوەڵەکەت لە تۆ جوانترە یا خۆشەویست ترە لە لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە تۆ، جارێکی تریش پێکەنی. ووتم: لە خزمەتت بم ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (بەڵێ) دانیشتم سەرم بەرز کردەوە لەوماڵا سوێند بە خوا هیچ شتێکم نەبینی کە بەرچاوم بگرێ جگە لە تورەکەیە (پارچە قوماشێ) ووتم: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) داوا بکە لە خودا! کە بژێوی ئوممەتەکەت فراوان بکا. خودا بژێوی فارس‌و ڕۆمی فراوان کردوە کە خوانەناسن، هەڵسایەوەو دانیشت فەرمووی: (تۆ گومانت هەیە ئەی کوڕی خەتاب! ئەوانە گەلێکن خۆش گوزەرانیان بۆ پێش خراوە لە ژیانی دنیادا) ووتم: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) داوای لێ بوردنم بۆ بکە! سوێندی خواردبوو کە نەچێتە لایان هەتا مانگێك ئەوەندە دڵ گران بوو لێیان هەتا خوای مەزن ئاگاداری کردو عتابی لێ گرت.[1] بوخاری‌و موسلم‌و تیرمیزی‌و نەسائی لە چەند ڕێگاوە ڕیوایەتیان کردوە.[2] وە بوخاری‌و موسلم ڕیوایەتیان کردوە لە ئیبنوعەباسەوە دەڵێت: ساڵێك مامەوەو چاوەڕوانم کرد ئەم ویست (کە پرسیار لە عومەری کوڕی خەتاب بکەم لە ئایەتێك نەم دەتوانی پرسیاری لێ بکەم شەرمم لێ دەکرد) هەتا ڕۆشت بۆ حەج منیش لەگەڵی ڕۆشتم بۆ حەج بە ڕێگا دەڕۆشتین لە ڕێگا لایداو چووە دارستانێك بۆ دەست بە ئاوگەیاندن دەڵێت: وەستام تا هاتەوە پاشان لەگەڵی کەوتمە ڕێگا.

---

[1] احمد (١/٣٣-٣٤)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[2] فتح الباري (٩/١٨٧) (٥/١٣٧)، و مسلم (٢/١١١)، و تحفة الاحوذي (٩/٢٢٤)، و النسائي في الكبرى (٥/٣٦٦).

ووتم: ئەی گەورەی موسوڵمانان ئەو دوو ژنە کێ بوون بە ڕووی پێغەمبەری خودا(ﷺ) وەستان بەیەکەوە.[1] ئەمە قسەی بوخاری‌و موسلمە کە ئەڵێن: ئەو دوو ژنە کێ بوون کە خوای گەورە فەرمووی: ﴿وَإِن تَظَٰهَرَا عَلَيۡهِ﴾ عومەر دەڵێت: عائیشەو حەفسە بوون. پاشان بە درێژی فەرمودەکەی باس کرد.[2] وە هەندێکیان کورتی کردوەتەوە. هەمیسان موسلم ڕیوایەتی کردوە لە عبدالله ی کوڕی عەباسەوە دەڵێت: عومەری کوڕی خەتاب بۆی باس کردم دەڵێت: وەختێ پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە خێزانەکانی جیا بووەوە چومە مزگەوت خەڵکی وردە بەردیان ئەدا بە یەکاو ئەیان گوت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) ژنەکانی تەڵاق داوە. ئەم ڕوداوە پێش فەرمان دان بوو بە خۆداپۆشین (الحجاب) منیش گوتم ئەمڕۆ ئەبێ بە تەواوی بزانم باسەکەی دەست پێ کرد لە چونیەوە بۆ لای عائیشەو حەفسەو ئامۆژگاری کردنیان‌و هەتا گەیشتە ئەوەی کە دەڵێت. چومە ژورەوە گەیشتمە ڕباح کە منداڵێکی (غولامێکی) پێغەمبەری خوا بوو (ﷺ) کە لەلای بوو لەبەر دەرگای گەنجینەکەدا دانیشتبوو. بانگم کردو گوتم ئەی ڕباح داوای ئیزنم بۆ بکە تا بچم بۆ خزمەت پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەوەی پێشەوەی باس کرد تا گەیشتە ئەوەی کە دەڵێت: گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئیشی ژنانت بۆ لەبەر گرانە؟ ئەگەر تەڵاقیان بدەی خوا لەگەڵ تۆیەو فریشتەکان‌و جوبرەئیل‌و میکائیل‌و منو ئەبوبەکرو خاوەن باوەڕانیش لەگەڵ تۆین سوپاسی خودا ئەکەم کەم جار هەیە قسەیەکم کردبێت ئومێدم نەبوبێ کە خودا بەڕاست قسەکەم لێ وەرگرێ‌و تەسدیقی کردوە. دەڵێت ئەم ئایەتە هاتە خوار کە ئایەتی سەرپشك کردنە ئەفەرموێت: ﴿إِن طَلَّقَكُنَّ أَن يُبۡدِلَهُۥٓ أَزۡوَٰجًا خَيۡرًا مِّنكُنَّ مُسۡلِمَٰتٖ مُّؤۡمِنَٰتٖ قَٰنِتَٰتٖ تَٰٓئِبَٰتٍ عَٰبِدَٰتٖ سَٰٓئِحَٰتٖ ثَيِّبَٰتٖ وَأَبۡكَارٗا﴾ ئەگەر ئێوە تەڵاق بدا شایەتا پەروەردەی ئەو ژنانی لە ئێوە باشتری بداتێ، ژنانێکی گەردەنکەچی بە باوەڕی بەر فەرمانی لە خراپە پەشیمانی خواپەرستانی ڕۆژووگر، لە بێوەژنان‌و کیژان. وە لە ئایەتی پێش ئەم ئایەتەدا ئەفەرموێت: ﴿إِن تَتُوبَآ إِلَى ٱللَّهِ فَقَدۡ صَغَتۡ قُلُوبُكُمَاۖ وَإِن تَظَٰهَرَا عَلَيۡهِ فَإِنَّ ٱللَّهَ هُوَ مَوۡلَىٰهُ وَجِبۡرِيلُ وَصَٰلِحُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَۖ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ بَعۡدَ ذَٰلِكَ ظَهِيرٌ﴾ باشی ئەوەیە کە هەردووکتان بەرەو خودا بگەڕێنەوە. دیارە دڵتان بەرەو ناڕەوا لایداوە. گەر لە دژی ئەم ببنە یەك. ئەوسا خودا دۆستیەتی‌و لەمە بەولا جوبرائیل‌و باوەڕدارانی چاك‌و فریشتەکان، پشتی دەگرن. گوتم: تەڵاقت داون؟ فەرمووی: (نەخێر) هەڵسام‌و لە دەرگای مزگەوتا بە دەنگی بەرز هاوارم کرد: ژنەکانی تەڵاق نەداوە. ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە کە خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ وَإِذَا جَآءَهُمۡ أَمۡرٞ مِّنَ ٱلۡأَمۡنِ أَوِ

---

[1] فتح الباري (٨/٥٢٥).

[2] مسلم (٢/١١٠٨).

ٱلۡخَوۡفِ أَذَاعُواْ بِهِۦۖ وَلَوۡ رَدُّوهُ إِلَى ٱلرَّسُولِ وَإِلَىٰٓ أُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنۡهُمۡ لَعَلِمَهُ ٱلَّذِينَ يَسۡتَنۢبِطُونَهُۥ مِنۡهُمۡ﴾[1]، واتە: وە كاتێك هەواڵێكیان پێ بگات دەربارەی ئاسایش‌و هێمنایەتی یان لەبارەی ترسەوە بڵاوی دەكەنەوە بەڵام لە لای پێغەمبەرو كاربەدەستانی خۆیان بیان ووتایە دەیانزانی ڕاستەقینەكەی كامەیەو ئەو جۆرە دەنگو باسە لە كوێوە سەریان هەڵداوە. وە من بووم لەو شتە تێ گەیشتم.[2] وە هەر بەو شێوەیە سەعیدی كوڕی جوبەیرو عیكریمەو موقاتلی كوڕی حەیان‌و زەحاك‌و كەسانی تریش گوتویانە.[3]

﴿وَصَٰلِحُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾ واتە: ئەبوبەكرو عومەر. حەسەنی بەسری: عوسمانیشی بۆ زیاد كردوە. وە لەیسی كوڕی ئەبوسولەیم لە موجاهدەوە ﴿وَصَٰلِحُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾ دەڵێت: عەلی كوڕی ئەبوتالیبیش. بوخاری ڕیوایەتی كردوە لە ئەنەسەوە دەڵێت: عومەر دەڵێت: ژنەكانی پێغەمبەر(ﷺ) دژی پێغەمبەر كۆبونەوە پێم گوتن: وەك خودا ئەفەرموێت: ﴿عَسَىٰ رَبُّهُۥٓ إِن طَلَّقَكُنَّ أَن يُبۡدِلَهُۥٓ أَزۡوَٰجًا خَيۡرًا مِّنكُنَّ﴾ ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە.[4] لە پێشەوە باس كرا كە چەند ئایەت لە چەند شوێنا ڕێكی قسەی عومەر هاتوەتە خوارەوە لەو ئایەتانە لەبارەی خۆداپۆشینەوە وە لە دیلەكانی بەدراو لەوەی كە دەڵێت ئەگەر مەقامی ئیبراهیمت بكردایەتە شوێنی نوێژ خوای گەورە ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە كە ئەفەرموێت: ﴿وَٱتَّخِذُواْ مِن مَّقَامِ إِبۡرَٰهِـۧمَ مُصَلًّى﴾[5]، واتە: (پێمان ووتن) شوێنی ئیبراهیم بكەنە جێگای نوێژ. وە ئیبنوئەبی حاتم ڕیوایەتی كردوە لە ئەنەسەوە دەڵێت: عومەری كوڕی خەتاب دەڵێت: شتێكم بیست كە لە نێوان پێغەمبەرو (ﷺ) ژنەكانیا ڕوی داوە گوتم ئەڕۆم بۆ لای ژنەكان‌و ئەڵێم: واز نەهێنن لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) خودا ژنانی لە ئێوە باشتری لەباتی ئێوە دەداتێ. هەتا چوومە لای دواین ژنی پێغەمبەر(ﷺ) پێی گوتم: ئەی عومەر پێغەمبەر(ﷺ) خۆی ئامۆژگاری ژنەكانی پێ ناكرێ. هەتا تۆ نەیەیت ئامۆژگاریان بكەی. دەڵێت: منیش وازم هێناو خوای گەورە ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە كە ئەفەرموێت: ﴿عَسَىٰ رَبُّهُۥٓ إِن طَلَّقَكُنَّ أَن يُبۡدِلَهُۥٓ أَزۡوَٰجًا خَيۡرًا مِّنكُنَّ مُسۡلِمَٰتٖ مُّؤۡمِنَٰتٖ قَٰنِتَٰتٖ تَٰٓئِبَٰتٍ عَٰبِدَٰتٖ سَٰٓئِحَٰتٖ ثَيِّبَٰتٖ وَأَبۡكَارًا﴾[6] ئەو ژنەی كە وەڵامی داوەو لەسەر ئامۆژگاری كردنی ژنەكانی پێغەمبەر(ﷺ)

---

[1] النساء (٨٣).

[2] مسلم (١١٠٥/٢).

[3] الطبري (٤٨٦/٢٣).

[4] فتح الباري (٥٢٨/٨).

[5] البقرة (١٢٥).

[6] الطبري (٤٨٨/٢٣).

ئوموسەلەمە بوو وەك لە سەحیحی بوخاریا هاتووە.[1] وە ئەفەرموێت: ﴿مُسْلِمَٰتٍ مُّؤْمِنَٰتٍ قَٰنِتَٰتٍ تَٰٓئِبَٰتٍ عَٰبِدَٰتٍ﴾ ماناکەی ئاشکراو دیارە وە ئەفەرموێت: ﴿سَٰٓئِحَٰتٍ﴾ ڕۆژوگر. ئەبوهورەیرەو عائیشەو ئیبنوعەباسو عیکریمەو موجاهدو سعیدی کوڕی جوبەیرو عەتاو محمدی کوڕی کەعبی قەرەزی ئەبوعبدالرحمانی سەلەمیو ئەبومالكو ئیبراهمی نەخەعیو حەسەنو قەتادەو زەحاكو ڕەبیعی کوڕی ئەنەسو سودیو کەسانی تریش ووتویانە.[2] وە ئەفەرموێت: ﴿ثَيِّبَٰتٍ وَأَبْكَارًا﴾ هەیانە بێوەژنو هەشیانە کیژن. بۆ ئارەزوی دڵ ئەمە باشترەو دڵ زیاتر دەکاتتەوە بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ثَيِّبَٰتٍ وَأَبْكَارًا﴾.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ قُوٓا۟ أَنفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ نَارًا وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ وَٱلْحِجَارَةُ عَلَيْهَا مَلَٰٓئِكَةٌ غِلَاظٌ شِدَادٌ لَّا يَعْصُونَ ٱللَّهَ مَآ أَمَرَهُمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ ﴿٦﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَا تَعْتَذِرُوا۟ ٱلْيَوْمَ إِنَّمَا تُجْزَوْنَ مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٧﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ تُوبُوٓا۟ إِلَى ٱللَّهِ تَوْبَةً نَّصُوحًا عَسَىٰ رَبُّكُمْ أَن يُكَفِّرَ عَنكُمْ سَيِّـَٔاتِكُمْ وَيُدْخِلَكُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ يَوْمَ لَا يُخْزِى ٱللَّهُ ٱلنَّبِىَّ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَعَهُۥ نُورُهُمْ يَسْعَىٰ بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَبِأَيْمَٰنِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَآ أَتْمِمْ لَنَا نُورَنَا وَٱغْفِرْ لَنَآ إِنَّكَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٨﴾﴾

## شارەزا کردنی کەسو کار لە ئایینو ڕەوشتی جوان

خودای مەزن فەرموویەتی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ قُوٓا۟ أَنفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ نَارًا وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ وَٱلْحِجَارَةُ عَلَيْهَا مَلَٰٓئِكَةٌ غِلَاظٌ شِدَادٌ لَّا يَعْصُونَ ٱللَّهَ مَآ أَمَرَهُمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ﴾ ئەی گەلی خاوەن باوەڕان! خۆتانو کەسو کاریشتان لەو ئاگرە بپارێزن کە سووتەمەنی لە مەردمو بەردە. فریشتەی زەبرو زەنگو توندو تیژی پێ ڕادەگەن، خوا چۆنیان فەرمان پێبدا. لە فەرمانی دەرناکەونو هەرچی بەوانی دەسپێرێ بەجێی دێنن. عەلی کوڕی ئەبوتەلحە دەڵێت: لە ئیبنوعەباسەوە ﴿قُوٓا۟ أَنفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ نَارًا﴾ دەڵێت: ئاکارتان با لەسەر فەرمانی خودا بێو خۆتان بپارێزن لەو گوناهانەی کە فەرموویەتی وازی لێ بێنن. فەرمان بکەن بە کەسو کاریشتان کە یادی خودا بکەن خودا لە ئاگر ڕزگارتان دەکا.[3] موجاهد دەڵێت: ﴿قُوٓا۟ أَنفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ نَارًا﴾ واتە: لە خودا بترسنو ئامۆژگاری کەسو کاریشتان بکەن کە لە خوا

---

[1] فتح الباري (١٦/٨).

[2] الطبري (٤٩٠/٢٣)، و القرطبي (١٩٣/١٨)، الدر المنثور (٢٢٤/٨).

[3] الطبري (٤٩١/٢٣).

بترسن.[1] قەتادە دەڵێت: فەرمانیان پێ دەکا کە بەندایەتی خودا بکەن‌و خۆیان لادەن لە بێ فەرمانی خوداو وە خودا چۆن پێی خۆشە وا مامەڵەیان لەگەڵا دەکاو یارمەتیشیان ئەدا لەسەری. وە ئەگەر بێ فەرمانیەکیان لێ بینرا سەرزەنشتیان دەکاو ئاگاداریان دەکا کە وازی لێ بێنن.[2] زەحاك‌و موقاتل گوتویانە: موسوڵمان پێویستە لەسەری کە کەسوکاری‌و ئەو بەندەو کەنیزەکانەی کە بەر فەرمانی ئەون شارەزایان بکات لەو شتانەی کە خودا فەرزی کردوە لەسەریان‌و ئەو شتانەیش خودا فەرموویەتی وازی لێ بێنن.[3] وە لە مانای ئەم ئایەتەدا لەو فەرمودەیەیە کە ئەحمدو ئەبوداودو تیرمیزی ڕیوایەتیان کردوە عبدالملکی کوڕی ڕەبیعی کوڕی سەبرە لە باوکیەوە ئەمیش لە باپیریەوە دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (فەرمان بدەن بە منداڵ بە نوێژ کردن وەختێ تەمەنی گەیشتە حەوت ساڵ، کاتێ تەمەنی گەیشتە دەساڵ لێی دەن لەسەری) یانی ئەگەر نوێژی نەکرد. ئەمە وتەی ئەبوداودە. تیرمیزی دەڵێت: ئەم فەرمودەیە فەرمودەیەکی چاکە (هذا حديث حسن)[4].

## سوتەمەنی جەهەنم‌و فریشتەکانی

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ وَٱلْحِجَارَةُ﴾ واتە: سوتەمەنی یەکەی لە جیاتی دارا لەشی بەنیادەمە کەتێی فڕێ دەدرێ ﴿وَٱلْحِجَارَةُ﴾ مەبەست پێی ئەو بتانەیە کە پەرستراون. وەك خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿إِنَّكُمْ وَمَا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ حَصَبُ جَهَنَّمَ﴾[5]، واتە: بەڕاستی ئێوەو ئەوانەشی دەتانپەرستن جگە لە خوا (دەبنە) سوتەمەنی‌و هەڵگیرسێنەری دۆزەخ. ئیبنومەسعودو موجاهدو ئەبوجەعفەری باقرو سودی گوتیان: ئەوە بەردێکە لە کبریت. موجاهد ئەمەیشی بۆ زیاد کردوەو دەڵێت: بۆنی پیس ترە لە مرداری بوو (جيفة)[6] وە ئەفەرموێت: ﴿عَلَيْهَا مَلَٰٓئِكَةٌ غِلَاظٌ شِدَادٌ﴾ واتە: سروشتیان وایە کە زۆر بە زەبرو زەنگن‌و خودا بەزەیی لە دڵیانا لابردوە بەرانبەر بە خوانەناسان ﴿شِدَادٌ﴾ زۆر توندو تیژن شێوازیان زۆر گەورەو ترسناك‌و ناهەموارە. وە ئەفەرموێت: ﴿لَّا يَعْصُونَ ٱللَّهَ مَآ أَمَرَهُمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ﴾ واتە: هەرفەرمانێکیان پێبکرێت بە پەلە

---

[1] الطبري (٢٣/٤٩٢).

[2] الطبري (٢٣/٤٩٢).

[3] القرطبي (١٨/١٩٦).

[4] احمد (٣/٤٠٤)، أبوداود (١/٣٣٢)، تحفة الاحوذي (٢/٤٤٥)، فەرمودەیەکی حەسەنە.

[5] الانبياء (٩٨).

[6] الطبري (١/٣٨١).

جێبەجێی دەکەن. چاوتروکاندنێك دوا ناکەون و زۆر بە توانایشنو ماندوو نابن. ئا ئەوانە زەبانیەن (الزبانية) پەنا بە خوای گەورە لێیان.

**لە ڕۆژی قیامەتدا عوزر خوازی لە خوانەناس وەرناگیرێ**

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَا تَعْتَذِرُوا۟ ٱلْيَوْمَ ۖ إِنَّمَا تُجْزَوْنَ مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ ئەی ئەوانەی خوانەناس بوون! ئەمرۆ عوزر خوازی پێ ناوێ. دیارە هەرچی کردوتانە هەر لەوە جەزاتان دەدرێ. واتە: لە ڕۆژی قیامەتا بە خوانەناسان ئەووترێ داوای لێ بوردن مەکەن چونکە لێتان وەرناگیرێ. وە تۆڵەتان هەر لەسەر ئەوە دەدرێ کە کردوتانە واتە: لەسەر کردارەکانتان جەزاتان ئەدرێتەوە.

**هەڵنان بۆ گەڕانەوەی ڕاستو دروست**

پاشان خودای مەزن فەرموویەتی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ تُوبُوٓا۟ إِلَى ٱللَّهِ تَوْبَةً نَّصُوحًا عَسَىٰ رَبُّكُمْ أَن يُكَفِّرَ عَنكُمْ سَيِّـَٔاتِكُمْ وَيُدْخِلَكُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ يَوْمَ لَا يُخْزِى ٱللَّهُ ٱلنَّبِىَّ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَعَهُۥ ۖ نُورُهُمْ يَسْعَىٰ بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَبِأَيْمَٰنِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَآ أَتْمِمْ لَنَا نُورَنَا وَٱغْفِرْ لَنَآ ۖ إِنَّكَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ﴾ ئەی کەلی خاوەن باوەڕان بەرەو خوا بگەڕێنەوە، گەڕانەوەی ڕاستو دروست، شایەدا پەروەرندەتان گوناهتان لەسەر لابەرێو بتان نێرێتە ناو باغاتێك جۆ باریان بە بەردا دەڕوا. خوا پێغەمبەرو ئەوانەی لەگەڵ ئەو باوەڕیان هێناوە. سووكو هەناسە سارد ناکاو تیشکی ئەوان لە پێشیانو لە لای ڕاستیانەوە هەمیشە لە جووڵەو بزوتندایە، ئەڵێن: ئەی پەروەرندەمان! تیشکەکەمان بۆ زیاتر کەو لێمان خۆشبە، خۆت لەسەر هەموو شت تواناى. ﴿تَوْبَةً نَّصُوحًا﴾ واتە: گەڕانەوەیەکی ڕاستو دروست کە تاوانەکانی پێشوو هەموو بسڕێتەوە هەرچی گوناهو بەدکاری لە گوناهبارە هەموو لابەرێو وازی پێ بێنێ لە هەموو خورەوشتێکی ناشیرین. وە ئەفەرموێت: ﴿عَسَىٰ رَبُّكُمْ أَن يُكَفِّرَ عَنكُمْ سَيِّـَٔاتِكُمْ وَيُدْخِلَكُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ﴾ شایەدا خوا وەری بگرێ. ﴿يَوْمَ لَا يُخْزِى ٱللَّهُ ٱلنَّبِىَّ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَعَهُۥ﴾ واتە: لە ڕۆژی قیامەتدا خودا پێغەمبەرو (ﷺ) ئەوانەی لەگەڵ ئەون سووكو هەناسە ساردیان ناکات. ﴿نُورُهُمْ يَسْعَىٰ بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَبِأَيْمَٰنِهِمْ﴾ وەك لە پێشەوە لە سورەتی حەدیددا (الحديد) باس کرا. ﴿يَقُولُونَ رَبَّنَآ أَتْمِمْ لَنَا نُورَنَا وَٱغْفِرْ لَنَآ ۖ إِنَّكَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ﴾. موجاهدو زەحاكو حەسەنی بەسری کەسانی تریش گوتویانە: خاوەن باوەڕان ئەمە ئەڵێن وەختێ ئەبینن تیشکی دووڕووەکان

ئەکوژێتەوە لە ڕۆژی قیامەتا.[1] ئیمامی ئەحمد ڕیوایەتی کردوە لە پیاوێك کە لە بەنی کەنانە بوو دەڵێت: لە پشت پێغەمبەری خوداوە نوێژم کرد گوێم لێ بوو ئەی فەرموو: (ئەی خودایە لە ڕۆژی قیامەتا سوكو هەناسە ساردم نەکەی).[2]

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِىُّ جَـٰهِدِ ٱلْكُفَّارَ وَٱلْمُنَـٰفِقِينَ وَٱغْلُظْ عَلَيْهِمْ ۚ وَمَأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ ۖ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴿٩﴾ ضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا لِّلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ٱمْرَأَتَ نُوحٍ وَٱمْرَأَتَ لُوطٍ ۖ كَانَتَا تَحْتَ عَبْدَيْنِ مِنْ عِبَادِنَا صَـٰلِحَيْنِ فَخَانَتَاهُمَا فَلَمْ يُغْنِيَا عَنْهُمَا مِنَ ٱللَّهِ شَيْـًٔا وَقِيلَ ٱدْخُلَا ٱلنَّارَ مَعَ ٱلدَّٰخِلِينَ ﴿١٠﴾﴾

**فەرمان دان بە غەزاکردنی خوانەناس و دووڕوەکان**

خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِىُّ جَـٰهِدِ ٱلْكُفَّارَ وَٱلْمُنَـٰفِقِينَ وَٱغْلُظْ عَلَيْهِمْ ۚ وَمَأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ ۖ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ﴾ ئەی پێغەمبەر! لەگەڵ ئەو خودانەناسانەو ئەو دووڕووانە جەنگ بکە زەبرو زەنگیشیان نیشاندە. شوێنی ئەوانە ئاگرەو چارەنووسیان زۆر خراپە. خوای گەورە فەرمان ئەدا بە پێغەمبەری خودا کە جەنگ بکات لەگەڵ خوانەناسان و دووڕوانداو. خوانەناسان بە چەك و شەڕکردن و دووڕوانیش بە جێبەجێ کردنی سنورەکانی خودا بەسەریاندا. ﴿وَٱغْلُظْ عَلَيْهِمْ﴾ لە دنیاداو ﴿وَمَأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ ۖ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ﴾ لە ڕۆژی دوایدا.

**خاوەن باوەڕان هیچ سودێك بە خوانەناسان ناگەیەنن لە لای خودا هەرچەند خزمی زۆر نزیکیشیانبن**

پاشان خودای مەزن فەرموویەتی: ﴿ضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا لِّلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ٱمْرَأَتَ نُوحٍ وَٱمْرَأَتَ لُوطٍ ۖ كَانَتَا تَحْتَ عَبْدَيْنِ مِنْ عِبَادِنَا صَـٰلِحَيْنِ فَخَانَتَاهُمَا فَلَمْ يُغْنِيَا عَنْهُمَا مِنَ ٱللَّهِ شَيْـًٔا وَقِيلَ ٱدْخُلَا ٱلنَّارَ مَعَ ٱلدَّٰخِلِينَ﴾ خوا ژنی نوح و ژنی لوت (بۆ ئەوانەی خوانەناسن) بە نمونە دێنێتەوە. هەردوکیان لە لای دوو عەبدی چاکی ئێمە بوون. خیانەتیان لەگەڵ کردن. نەیانتوانی لە لای خودا هیچ شتیان دەربارە بکەن. وترا ئێوەش بڕۆنە ناو ئاگرەوە، لەگەڵ ئەوانەی دەڕۆنە ناوی. ﴿ضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا لِّلَّذِينَ كَفَرُوا۟﴾ خوانەناسان لە تێکەلاوی کردنی موسوڵمانان و ژیان لەگەڵیاندا هیچ سودو کەڵکێکی لێ وەرناگرن لە لای خودا ئەگەر خۆیان خاوەن باوەڕ نەبن. پاشان نمونەکەی بۆ باس کردوین و

---

[1] الطبري (٢٣/٤٩٦).

[2] احمد (٤/٢٣٤)، ئەم فەرموودە پیاوەکانی جێی متمانەن.

فەرموویەتی: ﴿ٱمْرَأَتَ نُوحٍ وَٱمْرَأَتَ لُوطٍ كَانَتَا تَحْتَ عَبْدَيْنِ مِنْ عِبَادِنَا صَـٰلِحَيْنِ﴾ لەگەڵ دوو پێغەمبەری مورسەل (سەلامی خودایان لێ بێ) بوون شەوو ڕۆژ لەگەڵیان ژیاون‌و نانیان لەگەڵ خواردون‌و لەگەڵیانا خەوتون‌و هەموو کات بە یەکەوە بوون‌و ژیاون. ﴿فَخَانَتَاهُمَا﴾ واتە: باوەڕیان نەمێناو خاوەنباوەڕ نەبوون لەگەڵیاندا وە باوەڕیان بە پەیامەکەیان نەکرد. لەبەر ئەوە نەیانتوانی هیچ تکایەکیان لای خودا بۆ بکەن وە هیچ سودێکیان پێ بگەیەنن. بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَلَمْ يُغْنِيَا عَنْهُمَا مِنَ ٱللَّهِ شَيْـًٔا﴾ واتە: لەبەر خوانەناسیان. ﴿وَقِيلَ﴾ بەو دوو ژنە وترا ﴿ٱدْخُلَا ٱلنَّارَ مَعَ ٱلدَّٰخِلِينَ﴾. وە مەبەست بەوەی کە ئەفەرموێت: ﴿فَخَانَتَاهُمَا﴾ بەدڕەوشتی نیە بەڵکو خەیانەتە لە ئاینا. چونکە ژنانی پێغەمبەران (سەلامی خوایان لێ بێ) پارێزراو بوون لە بەدڕەوشتی لەبەر ڕێزی پێغەمبەرەکان (سەلامی خوایان لێ بێ) وەك لە سورەتی نوردا (النور) لە پێشەوە باسمان کرد. عەوفی دەڵێت لە ئیبنوعەباسەوە: خەیانەتەکەیان ئەوە بووە کە لەسەر ئاینێکی تر بوون. ژنەکەی نوح ئاگای لە پەنهانیەکانی نوح بوو هەرکاتێ کەسێك باوەڕی بهێنایە لەگەڵ نوح ئەو ژنە هەواڵی ئەدا بەو ستەمکارانەی هۆزی نوح بەو کەسە کە باوەڕی هێناوە. ژنی لوتیش هەرکاتێ لووت میوانداری کەسێکی بکردایە ژنەکەی هەواڵی ئەدا بە خەڵکی ئەو شارە. ئەوانەی کە بەدڕەوشتیان ئەکرد.[1] زەحاك دەڵێت: لە ئیبنوعەباسەوە: هیچ ژنی پێغەمبەرێك هەرگیز بەدڕەوشتی نەکردوە. بەڵکو خەیانەتەکەیان لە ئاینا بووە.[2] عیکریمەو سەعیدی کوڕی جوبەیرو زەحاك‌و کەسانی تریش هەر وایان گوتوە.[3]

﴿وَضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا لِّلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱمْرَأَتَ فِرْعَوْنَ إِذْ قَالَتْ رَبِّ ٱبْنِ لِى عِندَكَ بَيْتًا فِى ٱلْجَنَّةِ وَنَجِّنِى مِن فِرْعَوْنَ وَعَمَلِهِۦ وَنَجِّنِى مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴿١١﴾ وَمَرْيَمَ ٱبْنَتَ عِمْرَٰنَ ٱلَّتِىٓ أَحْصَنَتْ فَرْجَهَا فَنَفَخْنَا فِيهِ مِن رُّوحِنَا وَصَدَّقَتْ بِكَلِمَـٰتِ رَبِّهَا وَكُتُبِهِۦ وَكَانَتْ مِنَ ٱلْقَـٰنِتِينَ ﴿١٢﴾﴾

## تێکەڵاوی موسوڵمان لەگەڵ خوانەناس لای خودا زیانی نیە ئەگەر موسوڵمان پێویستی پێیان بوو نەدەکرا لەگەڵیان نەبن

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا لِّلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱمْرَأَتَ فِرْعَوْنَ إِذْ قَالَتْ رَبِّ ٱبْنِ لِى عِندَكَ بَيْتًا فِى ٱلْجَنَّةِ وَنَجِّنِى مِن فِرْعَوْنَ وَعَمَلِهِۦ وَنَجِّنِى مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلظَّـٰلِمِينَ﴾ خودا ژنەکەی

[1] الطبري (٢٣/٤٩٨).

[2] الطبري (٢٣/٤٩٨).

[3] الطبري (٢٣/٤٩٨).

فیرعەونیش (بۆ کەسانی خاوەن باوەڕ) بە نمونە دێنێتەوە، کە لەبەر پەروەرندەی خۆی پاڕایەوە، تۆ لەلای خۆت لە بەهەشتا ماڵێکم بۆ دیاری بکەو ڕزگارم کە لە فیرعەونو کردەوەی ئەو، لە کۆمەڵی ناهەقانیشم ڕاهی بکە. ئەمە نمونەیەکە خودا ئەیهێنێتەوە بۆ خاوەن باوەڕان کە تێکەڵاوی خوانەناسان زیانیان پێ ناگەیەنێ کاتێ خاوەنباوەڕان پێویستیان پێیان بێ وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿لَّا يَتَّخِذِ ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلْكَٰفِرِينَ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ۖ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ فَلَيْسَ مِنَ ٱللَّهِ فِى شَىْءٍ إِلَّآ أَن تَتَّقُوا۟ مِنْهُمْ تُقَىٰةً﴾[1]، واتە: باوەڕداران با جگە لە باوەڕداران نەگرن بەدۆست، هەر کەس لەم فەرمانە دەرچێ هیچ بەشی بە خواوە نی یە جا مەگین لێیان بترسنو لە ناچاری پێیان بڵێن: دۆستی ئێوەین. قەتادە دەڵێت: فیرعەون سەرسەخت ترینو خوانەناسترین مرۆڤی سەر زەمین بوو سوێند بە خوا خوانەناسی فیرعەون هیچ زیانێکی نەئەدا لە ژنەکەی. کاتێ کە خودای ئەپەرستو گوێ ڕایەڵی پەروەرندەی ئەکرد. بۆ ئەوەی هەموو کەس بزانێ کە خودا خودایەکی بە دەستەڵاتو دادپەروەرە هیچ کەسێ ناگرێو تۆڵەی لێ ناسێنێ بە نیازو کرداری ئەو کەسە نەبێ.[2] ئیبنوجەریر ڕیوایەتی کردوە لە سولەیمانەوە کە ژنەکەی فیرعەون سزا ئەدرا لەبەر خۆر وەختێ وازیان لە سزادانی ئەهێنا فریشتەکان بە باڵەکانیان سێبەریان بۆ ئەکرد. وە ماڵەکەی خۆی لەناو بەهەشتدا ئەبینی.[3] هەمیسان ئیبنوجەریر ڕیوایەتی کردوە لە قاسمی کوڕی ئەبی بەززەوە دەڵێت: ژنی فیرعەون ئەی پرسی کێ سەرکەوتوە؟ ئەگەر بیانوتایە: موساو هارون سەرکەوتون. دەیوت: باوەڕم هێنا بە پەروەرندەی موساو هارون. فیرعەون ناردی بە شوێنیاو دەڵێت: سەیرکەن بزانن کام بەردە گەورەیە، ئەگەر هەر بەردەوام بوو لەسەر قسەی خۆی بەری دەنەوە بەسەریا. ئەگەر پەشیمان بوەوە لە قسەکەی ئەوە ئەو ژنی منە. وەختێ بەردەکەی بۆ هات سەری بەرز کردەوە بۆ ئاسمان ماڵەکەی خۆی بینی لەناو بەهەشتدا. لەسەر قسەی خۆی هەر بەردەوام بوو وازی نەئەهێنا. خوای مەزن گیانی کێشا بەردەکە کەوت بەسەر لاشەیەکی بێ گیاندا.[4] وە دەڵێت: وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿رَبِّ ٱبْنِ لِى عِندَكَ بَيْتًا فِى ٱلْجَنَّةِ وَنَجِّنِى مِن فِرْعَوْنَ وَعَمَلِهِۦ﴾ واتە: خودایە ڕزگارم کە لە فیرعەون وە من دوری خۆم لای تۆ دەردەبڕم لە کردەوەکانی فیرعەون. ﴿وَنَجِّنِى مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ وە لە کۆمەڵی ناهەقی کارانیش ڕزگارم کە. ئەو ژنە

---

[1] آل عمران (٢٨).

[2] الطبري (٢٣/٥٠٠).

[3] الطبري (٢٣/٥٠٠).

[4] الطبري (٢٣/٥٠٠).

ئاسیەی کچی موزاحم بوو (ڕەزای خوای لێ بێ). وە خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَمَرْيَمَ ٱبْنَتَ عِمْرَانَ ٱلَّتِىٓ أَحْصَنَتْ فَرْجَهَا فَنَفَخْنَا فِيهِ مِن رُّوحِنَا وَصَدَّقَتْ بِكَلِمَٰتِ رَبِّهَا وَكُتُبِهِۦ وَكَانَتْ مِنَ ٱلْقَٰنِتِينَ﴾ مەریەمی کچی عیمرانیش. ئەوەی شەرمی لە کاری شوورەیی پاراست. ئەووسا ئێمە لە فووی خۆمان تێمان دەماند. بە وتارو کتێبانی پەروەرندەی بڕوای هێناو لە ڕێزی فەرمان بەران بوو. واتە: پاراستیو داوێن پاك بوو (الاحصان) واتە: داوێن پاکیو سەربەرزی. ﴿فَنَفَخْنَا فِيهِ مِن رُّوحِنَا﴾ واتە: فوومان پیا کرد بەهۆی جبرەئیلەوە کە خوای گەورە ناردی بۆ لای لە شێوەی مرۆڤێکی تەواوو ڕێکدا. فەرمانی پێ کرد کە فوو بکات بە گیرفانی (باخەڵی) کراسەکەیاو فووەکە چووە ناو شەرمیەوە بەهۆی ئەو فوەوە سکی بوو بە عیسا پێغەمبەر(سەلامی خوایان لێ بێ) بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَنَفَخْنَا فِيهِ مِن رُّوحِنَا وَصَدَّقَتْ بِكَلِمَٰتِ رَبِّهَا وَكُتُبِهِۦ﴾ واتە: بە بڕیارو بەرنامەی ﴿وَكَانَتْ مِنَ ٱلْقَٰنِتِينَ﴾ ئیمامی ئەحمد ڕیوایەتی کردوە لە ئیبنوعەباسەوە دەڵێت: پێغەمبەری خودا لەسەر زەمین چوار هێڵی کێشاو فەرمووی: (بەڕێزترین ژنانی خەڵکی بەهەشت خەدیجەی کچی خوەیلدو فاتیمەی کچی محمدو(ﷺ) مەریەمی کچی عیمرانو ئاسیەی کچی موزاحیمە ژنی فیرعەون).[1] لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتوە لە ئەبوموسای ئەشعەریەوە لە پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) فەرموویەتی: (پیاوی تەواو لەناو پیاواندا زۆر بووە. بەڵام لەناو ژناندا تەواو نەبوە مەگین ئاسیەی ژنی فیرعەونو مەریەمی کچی عیمرانو خەدیجەی کچی خوەیلد. وە ڕێزی عائیشە بەسەر ژناندا وەك گۆشتاو وایە بەسەر خواردنەکانی ترا).[2] ڕێگای ئەم فەرمودانەمان باس کردوە وتەکانیشی (ألفاظها) وە لە چیرۆکی عیسای کوڕی مەریەمیشدا (سەلامی خوایان لێ بێ) هەر باسمان کرد. لە کتێبەکەماندا (البداية و النهاية).[3] سوپاسو ستایش بۆ خوای گەورە.

---

[1] احمد (١/٢٩٣)، ئەم فەرموودەیە سەنەدەکانی لەسەر مەرجی سەحیحە.

[2] فتح الباري (٦/٥١٤)، مسلم (٤/١٨٨٦).

[3] البداية و النهاية (٢/٦١).

## تەفسیری سورەتی (الملك)

## لە مەككەدا هاتووەتە خوارەوە

### ڕێزو چاكەی سوڕەتی (الملك)

ئیمامی احمد ڕیوایەتی كردوە لە ئەبو هورەیرەوە ئەویش لەپێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرمویەتی: (سورەتێك لەقورئاندا هەیە سی ئایەتە تكای كردووەبۆهاوەڵەكەی هەتا لێی بوراوە: ﴿تَبَٰرَكَ ٱلَّذِي بِيَدِهِ ٱلْمُلْكُ﴾[1] خاوەنی چوار سونەتەكە (السنن الاربعه) ڕیوایەتیان كردووە. ترمذی وتی فەرمودەیەكی حەسەنە.[2] تەبەڕانیو حافیزی زیائی مەقدیسی (الحافظ ضیاء المقدس) ڕیوایەتیان كردووە لە ئەنەسەوە وتی: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (سوڕەتێك لە قورئاندا مشتو مڕی بوو (كۆڵی نەدا) لەسەر هاوەڵەكەی هەتا خستیە بەهەشت ﴿تَبَٰرَكَ ٱلَّذِي بِيَدِهِ ٱلْمُلْكُ﴾)[3].

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿تَبَٰرَكَ ٱلَّذِي بِيَدِهِ ٱلْمُلْكُ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴿١﴾ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلْمَوْتَ وَٱلْحَيَوٰةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْغَفُورُ ﴿٢﴾ ٱلَّذِي خَلَقَ سَبْعَ سَمَٰوَٰتٍ طِبَاقًا مَّا تَرَىٰ فِي خَلْقِ ٱلرَّحْمَٰنِ مِن تَفَٰوُتٍ فَٱرْجِعِ ٱلْبَصَرَ هَلْ تَرَىٰ مِن فُطُورٍ ﴿٣﴾ ثُمَّ ٱرْجِعِ ٱلْبَصَرَ كَرَّتَيْنِ يَنقَلِبْ إِلَيْكَ ٱلْبَصَرُ خَاسِئًا وَهُوَ حَسِيرٌ ﴿٤﴾ وَلَقَدْ زَيَّنَّا ٱلسَّمَآءَ ٱلدُّنْيَا بِمَصَٰبِيحَ وَجَعَلْنَٰهَا رُجُومًا لِّلشَّيَٰطِينِ وَأَعْتَدْنَا لَهُمْ عَذَابَ ٱلسَّعِيرِ ﴿٥﴾﴾

### گەورەیی هەر بۆ خودایە مردن و ژیانی داهێناوەو ئاسمانەكان و ئەستێرەكانیشی دروست كردووە

خودای گەورە باسی گەورەیی خۆی دەكاتو ئاگادارمان دەكات كەهەر خۆی فەرمانڕەوایەو واتە: هەر ئەو كاربەدەستی هەموو بەدی هێنراوەكانیەتی هەر چۆنێك مەیلی لێبێت (بیەوێت) هیچ كەس دەست ناخاتە كاری هیچ كەس بۆی نیە پرسیاری لێ بكات لەوەی دەیكات لەبەر زاڵیو كارزانیو دادی بۆیە دەفەرموێت: ﴿تَبَٰرَكَ ٱلَّذِي بِيَدِهِ ٱلْمُلْكُ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ واتە: هەرچی لەناو ئاسمانو زەمیندایە، پەسەنی پاكی خودا دەدەن. هەر بۆخۆی فەرمانڕەوایەو سوپاس هەر بۆ ئەو ڕەوایەو بۆ هەمو كارێك بەتوانایە. پاشان فەرموویەتی: ﴿ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلْمَوْتَ وَٱلْحَيَوٰةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ

---

[1] احمد (٢/٣٢١) فەرمودەیەكی حەسەنی سەحیحە.

[2] أبوداود (٢/١١٩)، تحفة الاحوزي(٨/٢٠٠)، النسائی فی الكبری (٦/٤٩٦)، (ابن ماجه٢/١٢٤٤) فەرمودەیەكی حەسەنی سەحیحە.

[3] الطبرانی فی الاوسط (٤/٣٩١) فەرموودەیەكی چاكەو سەنەدەكانی بەهێزەو فەرموودەی تر پشتگیری دەكات.

ٱلْغَفُورُ﴾ ئەو كەمردنو ژینی داهێناوە تا ئێوە تاقی كاتەوە كامتان ئاكاری جوانترە. هەر ئەویشە لێ بووردەی خاوەن دەستەلاَت. ئەم ئاینە بەلگەیە لەسەر ئەو كەسانەی كە دەڵێن مردن شتێكی سروشتیە چونكە دروست كراوە مانای ئایەتەكەیش ئەو خودایەی كە دروست كراوەكانی لە نەبوونەوە هێناوەتە بون هەتا تاقیان بكاتەوە واتە: تاقیان بكاتەوە كامەیان ئاكاری جوانترە. وەك ئەفەرموێت: ﴿كَيْفَ تَكْفُرُونَ بِٱللَّهِ وَكُنتُمْ أَمْوَٰتًا فَأَحْيَٰكُمْ﴾[1] واتە: چۆن بێ باوەڕ دەبن بەخوا!؟ لەكاتێكدا كەئێوە بێ گیان بوونو گیانی بە بەرداكردن.كاتی یەكەمی (ماڵی یەكەمی) ناونا بەنەبوون (مردن) وەئەم بوونەشی ناونا ژین. بۆیە دەفەرمووێت: ﴿ثُمَّ يُمِيتُكُمْ ثُمَّ يُحْيِيكُمْ﴾[2] واتە: لەپاشان دەتان مرێنێ دوای ئەوە زیندوتان دەكاتەوە. وە دەفەرموێت: ﴿لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا﴾ واتە: كامتان ئاكاری جوانترە، وەك محمدی كوڕی عەجلان(عجلان) گوتی: نەی فەرمووە كامتان كاری زۆر دەكات پاشان خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا﴾ واتە: هەر ئەوە خاوەنی دەستەلاَتو گەورەییو جێی پەنایەو لێ بوردەیشە بۆ ئەو كەسانەی تەوبە دەكەنو ئەگەڕێنەوە بۆلای دوای ئەوەی كە گوناهیان كردوەو فەرمانی ئەویان بەجێ نەهێناوە هەرچەندە خوای گەورە لەگەڵ ئەوەشدا لێ بوردەو بەبەزەیشە چاوپۆشی دەكاو دەبورێت لەبەندەكانی پاشان خودای گەورە فەرمویەتی: ﴿ٱلَّذِى خَلَقَ سَبْعَ سَمَٰوَٰتٍ طِبَاقًا مَّا تَرَىٰ فِى خَلْقِ ٱلرَّحْمَٰنِ مِن تَفَٰوُتٍ فَٱرْجِعِ ٱلْبَصَرَ هَلْ تَرَىٰ مِن فُطُورٍ﴾ ئەو كەسەی حەوت ئاسمانی چین لەسەر چینی ساز داوە، لەدەسكاری ئەو خودایەدا هیچ ناڕێكی یەك نابینی، جارێكی تر تەماشابكە، ئاخۆ قەڵیشێكی تێدایە؟. ﴿ٱلَّذِى خَلَقَ سَبْعَ سَمَٰوَٰتٍ طِبَاقًا﴾ واتە: چین لەسەر چین، بەو مانایەی بەرزكراونەتەوە بەسەریەكەوە یان جیان لەیەكتریو بۆشایی لەنێوانیاندا هەیە، دوو بۆچون هەیە دووەمیان ڕاست ترە وەك ئەو بەڵگانە لەباسی شەو ڕەویەكەی ـ الاسراء ـ پێغەمبەردا (ﷺ) باس كراوەو چەند بەڵگەی تریش. وەدەفەرمووێت: ﴿مَّا تَرَىٰ فِى خَلْقِ ٱلرَّحْمَٰنِ مِن تَفَٰوُتٍ﴾ واتە: تەختو ڕێكەو ناتەواویو ناڕێكیەكی تێدانابینی و هیچ كەمو كوڕیو قەڵیشێكی تێدا نیە. بۆیە خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿فَٱرْجِعِ ٱلْبَصَرَ هَلْ تَرَىٰ مِن فُطُورٍ﴾ واتە: تەماشای ئاسمان بكە لێی ورد بەرەوە ئاخۆ هیچ كەمو كوڕیەكی تێدا دەبینی؟ وەبزانە هیچ درزو ناتەواویەكی تێدایە؟. ابن عباس و موجاهدو زەحاك (ضحاك) و سەوریو (الثوری) لەم ئایەتەی خودا دەفەرمووێت:﴿فَٱرْجِعِ ٱلْبَصَرَ هَلْ تَرَىٰ مِن فُطُورٍ﴾

---

[1] البقرة (٢٨) .

[2] البقرة (٢٨).

وتویانە: واتە قەڵیش (درز)[1] سوددی (السدی) وتی: ﴿فَٱرۡجِعِ ٱلۡبَصَرَ هَلۡ تَرَىٰ مِن فُطُورٖ﴾ واتە: (کون) کلاو ڕۆشنە[2] قەتادە وتی:﴿ هَلۡ تَرَىٰ مِن فُطُورٖ﴾ واتە ئاخۆ نارێکیەکی تێدا دەبینی ئەی بەنیام؟. وە خودا دەفەرموویێت: ﴿ثُمَّ ٱرۡجِعِ ٱلۡبَصَرَ كَرَّتَيۡنِ يَنقَلِبۡ إِلَيۡكَ ٱلۡبَصَرُ خَاسِئٗا وَهُوَ حَسِيرٞ﴾ دیسانەوە چاوی پێدا بگێڕەوە، سۆمای چاوت بەداماوی و بەڕاماوی بەرەو خۆت دەگەڕێتەوە. قەتادە وتی: ﴿كَرَّتَيۡنِ﴾ واتە دووجار، ابن عباس وتی: ﴿خَاسِئٗا﴾ واتە بە داماوی،[3] موجاهدو قەتادە وتیان: ﴿خَاسِئٗا﴾ واتە بێ دەستەڵاتی،[4] ابن عباس وتی: ﴿وَهُوَ حَسِيرٞ﴾ واتە بەدحاڵیو ڕاماوی،[5] موجاهد و قەتادەو سودی (السدی) وتیان: ﴿حَسِيرٞ﴾ واتە پەککەوتەو ئەبلەق. مانای ئایەتەکە ئەوەیە چەند جار بنواڕیو هەر چەند چاو بگێڕی سۆمای چاوت بەداماویو ڕاماوی بەرەو خۆت دەگەڕێتەوە واتە چاوت دەگەڕێتەوە بۆلای خۆت ﴿خَاسِئٗا﴾ بەبێ ئەوەی عەیبێك یان نكوڵیەك ببینی. ﴿وَهُوَ حَسِيرٞ﴾ واتە: بەڕاماوی و شەکەتی بەهۆی ئەو هەموو چاوگێڕانەوە کە هیچ کەموکوڕیەك نابینێتو دەگەڕێتەوە، کاتێ کەخودا باسی بێ عەیبی ئاسمانەکانی کرد کە دروستی کردووە دێتە سەر باسی جوانیو ڕێکی ئاسمانی دونیاو دەفەرموویێت: ﴿ وَلَقَدۡ زَيَّنَّا ٱلسَّمَآءَ ٱلدُّنۡيَا بِمَصَٰبِيحَ وَجَعَلۡنَٰهَا رُجُومٗا لِّلشَّيَٰطِينِۖ وَأَعۡتَدۡنَا لَهُمۡ عَذَابَ ٱلسَّعِيرِ﴾ ئێمە ئاسمانی دونیامان بە زۆر چرا ڕازاندەوە، کردوشمانن بە کەرەستەی ڕاوەدوونانی شەیتانان، ئازاری گڕیە داریشمان بۆ ساز کردوون. ﴿ وَلَقَدۡ زَيَّنَّا ٱلسَّمَآءَ ٱلدُّنۡيَا بِمَصَٰبِيحَ﴾ ئەو ئەستێرانەی گەڕۆكو وەستاویشیان تێدایە وە دەفەرموویێت: ﴿وَجَعَلۡنَٰهَا رُجُومٗا لِّلشَّيَٰطِينِ﴾ ئەو ضمیرەی کە لە (جعلناها) دایە گەڕاوەتەوە بۆ جنسی (المصابیح) نەوەك بۆ (المصابیح) خۆی، چونکە بە ئەستێرەکان ڕاوەدو نانرێن بەڵکو بە بروسکی ئاگر (شهب) کە ئەستێرەنیە وە لەوانەشە ئەو بروسکە لە ئەستێرەکانەوە بێت ـ والله اعلم ـ. وە دەفەرموویێت: ﴿وَأَعۡتَدۡنَا لَهُمۡ عَذَابَ ٱلسَّعِيرِ﴾ واتە: ئەم سوکیو سەر شۆڕیەمان بەسەر شەیتانەکان هێنا لەدنیادا ئازاری گڕیە داریشمان بۆ سازکردوون لە ڕۆژی قیامەتدا وەك خودای گەورە فەرموویەتی لە سورەتی (الصافات) دا ﴿إِنَّا زَيَّنَّا ٱلسَّمَآءَ ٱلدُّنۡيَا بِزِينَةٍ ٱلۡكَوَاكِبِ ﴿٦﴾ وَحِفۡظٗا مِّن كُلِّ شَيۡطَٰنٖ مَّارِدٖ

---

[1] الدر المنثور (٨/٢٣٥)، القرطبی (١٨/٢٠٩)، الطبری (٢٣/٥٠٧).

[2] القرطبی (١٨/٢٠٩).

[3] الطبری (٢٣/٥٠٧).

[4] الطبری (٢٣/٥٠٧).

[5] الدر المنثور (٨/٢٣٥).

﴿٧﴾ لَا يَسَّمَّعُونَ إِلَى ٱلْمَلَإِ ٱلْأَعْلَىٰ وَيُقْذَفُونَ مِن كُلِّ جَانِبٍ ﴿٨﴾ دُحُورًا وَلَهُمْ عَذَابٌ وَاصِبٌ ﴿٩﴾ إِلَّا مَنْ خَطِفَ ٱلْخَطْفَةَ فَأَتْبَعَهُۥ شِهَابٌ ثَاقِبٌ﴾[1] واتە: بێگومان ئێمە ئاسمانی نزیك (دونیا)مان بە جوانی ئەستێرەكان ڕازاندووەتەوە، وە لە هەموو شەیتانێكی سەركەش پاراستومانە، ناتوانن گوێ بگرن بۆ ئەو فریشتانەی لە بەرزترین پلەدان وە (ئەگەر بچن گوێ بگرن) لە هەموو لایەكی (ئاسمانەوە) ئاگر باران دەكرێن، ڕاودەنرێن زۆر بەتوندی و(لە قیامەتدا) سزایان بەردەوامەو سەختە، (شەیتانەكان ناتوانن گوێ بگرن) مەگەر یەكێكیان بەدزیەوە هەواڵێك (لە فریشتەیەك ببیستێ) و بەپەلە بیفڕێنێت ئەویش ئەستێرەیەكی ڕووناك شوێنی دەكەوێتو (دەی سوتێنێ). قەتادە وتی: ئەم ئەستێرانە دروست كراون بۆ سێ شت (كار) خودا دروستی كردون بۆ ڕازاندنەوەی ئاسمانو ڕاونانی شەیتانەكانو نیشانە بۆ ڕێگا دەركردن (بۆ دۆزینەوەی ڕێگا) هەرسێ بەهەر ماناو شێوەیەكی تر مانای بكاو لێكی بداتەوە بە ئارەزوی خۆی قسە دەكاتو نەی پێكاوە وە هەڵدەسێت بە ئیشێك كە هیچ ئاگای لەوئیشە نیە. ابن جەریرو ابن أبی حاتم ریوایەتیان كردوە[2].

﴿وَلِلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِرَبِّهِمْ عَذَابُ جَهَنَّمَ ۖ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴿٦﴾ إِذَآ أُلْقُوا۟ فِيهَا سَمِعُوا۟ لَهَا شَهِيقًا وَهِىَ تَفُورُ ﴿٧﴾ تَكَادُ تَمَيَّزُ مِنَ ٱلْغَيْظِ ۖ كُلَّمَآ أُلْقِىَ فِيهَا فَوْجٌ سَأَلَهُمْ خَزَنَتُهَآ أَلَمْ يَأْتِكُمْ نَذِيرٌ ﴿٨﴾ قَالُوا۟ بَلَىٰ قَدْ جَآءَنَا نَذِيرٌ فَكَذَّبْنَا وَقُلْنَا مَا نَزَّلَ ٱللَّهُ مِن شَىْءٍ إِنْ أَنتُمْ إِلَّا فِى ضَلَٰلٍ كَبِيرٍ ﴿٩﴾ وَقَالُوا۟ لَوْ كُنَّا نَسْمَعُ أَوْ نَعْقِلُ مَا كُنَّا فِىٓ أَصْحَٰبِ ٱلسَّعِيرِ ﴿١٠﴾ فَٱعْتَرَفُوا۟ بِذَنۢبِهِمْ فَسُحْقًا لِّأَصْحَٰبِ ٱلسَّعِيرِ ﴿١١﴾﴾

### باس و وەسفی جەهەننەمو ئەوانەی كەلە ناویدان

خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَلِلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِرَبِّهِمْ عَذَابُ جَهَنَّمَ ۖ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ﴾ بۆ ئەوانەش كە باوەڕیان بە پەروەردگاریان نیە، جەزرەبەی جەهەننەم هەیەو ئای چ ئەنجامێك خراپە، واتە: چ ئەنجامو پاشەڕۆژێكی خراپە. ﴿إِذَآ أُلْقُوا۟ فِيهَا سَمِعُوا۟ لَهَا شَهِيقًا وَهِىَ تَفُورُ﴾ كەفڕێیان دەدەنە ناوی ناڵە ناڵی جەهەندەمیان گوێ لێ دەبێتو هەر هەڵدەچێت. ابن جەریر وتی: ﴿شَهِيقًا﴾ واتە هاوار كردن[3]، سەوری (الثوری) وتی: ﴿وَهِىَ تَفُورُ﴾ واتە دەیانكوڵێنێتو هەڵدەچێت وەك چۆن دانەوێڵەیەكی كەم لەناو ئاوێكی زۆردا دەكوڵێتو هەڵدەچێت. وە دەفەرمووێت: ﴿تَكَادُ تَمَيَّزُ مِنَ ٱلْغَيْظِ ۖ كُلَّمَآ أُلْقِىَ فِيهَا فَوْجٌ سَأَلَهُمْ خَزَنَتُهَآ أَلَمْ

[1] الصافات (٦_١٠).

[2] الطبری (٢٣/٥٠٨).

[3] الطبری (٢٣/٥٠٨).

يَأۡتِكُمۡ نَذِيرٞ ﴾ وەختە لە داخان شەق بەرێت تا دەستەیەکی تێ فڕێ دەدەن. گزیرەکانی جەهەننەم پێیان دەڵێنن: ئاخۆ ئێوە ترسێنەرتان نەهاتەلاتان؟ واتە: وەختەبوو جەهەننەم لە داخان شەق بەرێتو پارچەپارچە ببێت ئەوەندە ڕقو کینەی لێیان بوو. وە دەفەرموێت: ﴿قَالُواْ بَلَىٰ قَدۡ جَآءَنَا نَذِيرٞ فَكَذَّبۡنَا وَقُلۡنَا مَا نَزَّلَ ٱللَّهُ مِن شَيۡءٍ إِنۡ أَنتُمۡ إِلَّا فِي ضَلَٰلٖ كَبِيرٖ﴾ دەڵێن: بەڵێ ترسێنەر هاتبووە لامان، ئەوسا باوەڕمان پێ نەکردو وتمان خودا هیچ شتی نەناردوەتە خوارەوە، ئێوە بێ گومان لەناو گومڕاییەکی گەورەدان. خودای گەورە باسی دادی خۆی دەکات لە ناو بەندەکانو دروست کراوەکانیدا کە جەزرەبەی هیچ کەسێك نادات هەتا بەڵگەو نیشانەی تەواویان بۆ ڕەوانە نەکاتو پێغەمبەرانیان بۆ نەنێرێت. وەك دەفەرموێت: ﴿وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّىٰ نَبۡعَثَ رَسُولٗا﴾[1] واتە: ئێمە هەرگیز سزای (بەندەکان) نادەین هەتا پێغەمبەر نەنێرین (بۆیان). وە فەرموویەتی: ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءُوهَا فُتِحَتۡ أَبۡوَٰبُهَا وَقَالَ لَهُمۡ خَزَنَتُهَآ أَلَمۡ يَأۡتِكُمۡ رُسُلٞ مِّنكُمۡ يَتۡلُونَ عَلَيۡكُمۡ ءَايَٰتِ رَبِّكُمۡ وَيُنذِرُونَكُمۡ لِقَآءَ يَوۡمِكُمۡ هَٰذَاۚ قَالُواْ بَلَىٰ وَلَٰكِنۡ حَقَّتۡ كَلِمَةُ ٱلۡعَذَابِ عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ﴾[2] واتە: تا کاتێك دێنە (نزیکی) دۆزەخ دەرگاکانی دەکرێنەوە وە دەرگاوانەکانی دۆزەخ بەوان دەڵێن ئایا پێغەمبەرانتان لە خۆتان بۆ نەهات کە ئایەتەکانی پەروەردگارتان بەسەردا بخوێنێتەوەو بتان ترسێنن لە گەیشتنتان بەم ڕۆژە؟ دەڵێن: بەڵێ (هاتن ئاگاداریان کردین) بەڵام بڕیاری سزا دراوە بەسەر (ئێمەی) بێ باوەڕان دا. ئا بەم شێوەیە بیر دەکەنەوەو سەرزەنشتی خۆیان دەکەنو پەشیمانی دەردەبڕن بەڵام پەشیمانی لەوێدا چ سودێکی هەیە. وە دەفەرموێت: ﴿وَقَالُواْ لَوۡ كُنَّا نَسۡمَعُ أَوۡ نَعۡقِلُ مَا كُنَّا فِيٓ أَصۡحَٰبِ ٱلسَّعِيرِ﴾ دەڵێن: ئەگەر گوێ بیست باین یاخۆ تێ گەیشتباین نەدەبووینە یارانی ئەم ئاگردانە، واتە ئەگەر (عەقڵ)مان ببوایە سودمان لێ وەردەگرتو وە ئەوەی خودا ناردویەتیە خوارەوە گوێ بیستی بووینایە ئا ئەمەی ئێستا بەسەرمان هاتووە توشمان نەدەبوو بەهۆی ئەو خودانەناسو لەخۆبایی بوونەمانەوە، بەڵام ئێمە نەزان بووین تێ نەدەگەیشتین لەوەی کە پێغەمبەران هێنابوویان عەقڵمان نەبوو تارێکامان نیشان بدات بۆ ئەوەی شوێن ئەو پێغەمبەرانە بکەوین، خودایش دەفەرموێت: ﴿فَٱعۡتَرَفُواْ بِذَنۢبِهِمۡ فَسُحۡقٗا لِّأَصۡحَٰبِ ٱلسَّعِيرِ﴾ ئاوا گوناهانی خۆیان پێ لێ دەنێن، هەی دووری لە بەزەیی خودا بۆ جەهەننەمیەکان. ئیمامی احمد

---

[1] الاسراء (١٥).

[2] الزومر ٧١).

ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو بەختەری تائیەوە (أبو بختر الطائی) وتی: (خەڵکی لە ناو ناچن هەتا خیانەت لە خۆیان دەکەن)[1].

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَخۡشَوۡنَ رَبَّهُم بِٱلۡغَيۡبِ لَهُم مَّغۡفِرَةٞ وَأَجۡرٞ كَبِيرٞ ﴿١٢﴾ وَأَسِرُّواْ قَوۡلَكُمۡ أَوِ ٱجۡهَرُواْ بِهِۦٓۖ إِنَّهُۥ عَلِيمُۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴿١٣﴾ أَلَا يَعۡلَمُ مَنۡ خَلَقَ وَهُوَ ٱللَّطِيفُ ٱلۡخَبِيرُ ﴿١٤﴾ هُوَ ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُمُ ٱلۡأَرۡضَ ذَلُولٗا فَٱمۡشُواْ فِي مَنَاكِبِهَا وَكُلُواْ مِن رِّزۡقِهِۦۖ وَإِلَيۡهِ ٱلنُّشُورُ ﴿١٥﴾﴾

## پاداشتی ئەو کەسانەی لەخودا دەترسن کەتەنهان و کەس نایان بینێت

خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَخۡشَوۡنَ رَبَّهُم بِٱلۡغَيۡبِ لَهُم مَّغۡفِرَةٞ وَأَجۡرٞ كَبِيرٞ﴾ ئەو کەسانەی (لە نەدیدە) لە پەروەرێنیان ئەترسن لێ خۆشبوون و پاداشتی گەورەیان هەیە. وە فەرموویەتی: ﴿وَأَسِرُّواْ قَوۡلَكُمۡ أَوِ ٱجۡهَرُواْ بِهِۦٓۖ إِنَّهُۥ عَلِيمُۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ﴾ ئێوە چ بە چرپە قسە بکەن یان بەئاشکرا، ئەولە زاری کە بەدڵاندا دەبوورێت ئاگادارە. ﴿أَلَا يَعۡلَمُ مَنۡ خَلَقَ وَهُوَ ٱللَّطِيفُ ٱلۡخَبِيرُ﴾ ئاخۆ کەسێك ئافراندویە، چۆن نازانێت؟ وورد بین و ئاگادار هەرخۆیەتی. خوای گەورە باسی ئەو کەسانە دەکات کە لە گەورەیی پەروەرندەی خۆی دەترسێت و کاتێك بەینی خۆی و خودا هیچ کەس ئاگای لێی نیە واز لە گوناهو تاوان دێنێت و خواپەرستی دەکات لێ خۆشبوون و پاداشتی گەورەی هەیە واتە: خەتاکانی دادەپۆشێت پاداشتی گەورەی دەداتەوە وەك لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە - فی الصحیحین - کە (حەوت کەس خودای گەورە دەیخاتە ژێر سێبەری عەرشی خۆی لەو ڕۆژەدا سێبەر نیە مەگەر سێبەری ئەو نەبێت یەکێك لەوانە کە باسی کردووە پیاوێکە ئافرەتێکی خاوەن پلەو جوان داوای لێ دەکات کە خراپەی لەگەڵ بکات ئەویش دەڵێت: من لە خودا دەترسم. وە پیاوێکە ماڵ دەبەخشێت بە شێوەیەك دەی بەخشێت و دەیشارێتەوە هەتا لای چەپی نەزانێت بەوشتەی لای ڕاستی دەیبەخشێت)[2] پاشان ئاگاداری کردووین و فەرموویەتی کەئاگای لەپەنهانی وشاراوەکانە ﴿وَأَسِرُّواْ قَوۡلَكُمۡ أَوِ ٱجۡهَرُواْ بِهِۦٓۖ إِنَّهُۥ عَلِيمُۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ﴾ واتە: لەوەی کە بەناو دڵەکاندادێت، ﴿أَلَا يَعۡلَمُ مَنۡ خَلَقَ﴾ واتە: ئاخۆ وەدیهێنەر چۆن نازانێت؟ ﴿وَهُوَ ٱللَّطِيفُ ٱلۡخَبِيرُ﴾ کە وورد بین ئاگادار هەر خۆیەتی.

---

[1] احمد (٢٩٣/٥) فەرموودەیەکی حەسەنەو سەنەدەکانی جێی بڕوایە.

[2] فتح الباری (١٦٨/٢) ، مسلم (٧١٥/٢).

**لە بەهرەکانی خودا ڕام هێنانی زەمین بۆ بەندەکانی**

خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿هُوَ ٱلَّذِی جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ ذَلُولًا فَٱمْشُوا۟ فِی مَنَاكِبِهَا وَكُلُوا۟ مِن رِّزْقِهِۦ ۖ وَإِلَیْهِ ٱلنُّشُورُ﴾ ئەو خودایە زاتێکە ئەم زەمینەی بۆ رام کردوون بگەڕێن بە هەموو گۆشەو کەنارێکیداو لە بژێویەکەی بخۆن‌و هەستانەوەش بۆلای ئەوە. پاشان خودا باسی بەهرەکانی خۆی دەکات بەسەر بەندەکانیەوە لە ڕام هێنانی زەمین بۆیان‌و ژێر باری خستن وەك کیشوەرێکی ئارام بەملاو ئەولادا ناچێت‌و نا لەرزێت‌و کێوەکانی تێدا داکوتاو و کانیاویشی تێدا هەڵقولاندوەو ڕێگاوبانیشی تێدا ئاسان کردووەو وە شوێنی کشتوکاڵ‌و بەروبوم‌و ئەو شتانە، بەسودو ئاسان‌و ئامادەی کردووە بۆیان. وە فەرموویەتی: ﴿هُوَ ٱلَّذِی جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ ذَلُولًا فَٱمْشُوا۟ فِی مَنَاكِبِهَا﴾ بە هەر شوێنێکیدا دەتانەوێت بگەڕێن‌و هاتوچۆ بکەن بە هەرێمی هەموو بەشەکانی زەمیندا بۆ گشت جۆرە مامەڵەو بازرگانیەك وە چاکیش بزانن کە هەر چەندە خۆ ماندو بکەن بێ سودە ئەگەر خودا بۆتان ئاسان نەکات، بۆیە خودا فەرموویەتی: ﴿وَكُلُوا۟ مِن رِّزْقِهِۦ﴾ وە دەست هێنانی هۆکار دژایەتی پشت بەخودا بەستن ناکات وەك ئیمامی احمد ڕیوایەتی کردووە لە عومەری کوڕی خەتابەوە وتی: کە بیستوویەتی لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرموویەتی: (ئەگەر ئێوە بەڕاستی پشت ببەستن بە خودا، خودایش ڕۆزیتان دەدات وەك چۆن باڵندەکان ڕۆزی دەدات بە سکی خاڵی دەردەچن بە تێری‌و سکی پڕی دەگەڕێنەوە)[1] ترمذی‌و نەسائی‌و ابن ماجە ڕیوایەتیان کردووە، ترمذی وتی: (فەرمودەیەکی چاك‌و ڕاستە - حسن صحیح-)[2] واتە هات‌و چۆی بەیانیان‌و ئێوارانی بۆ داناوە لەگەڵ پشت بەستنی بە خودای گەورە، چونکە هەر ئەو ڕام هێنەرو ئاسانکار هۆکارە بۆ هەمووشتێك ﴿وَإِلَیْهِ ٱلنُّشُورُ﴾ واتە: گەڕانەوەشی لە ڕۆژی قیامەتدا بۆلای ئەوە. ابن عباس‌و موجاهدو سودی (السدی) و قەتادە وتیان: ﴿مَنَاكِبِهَا﴾ چواردەورەو ڕێگاوبان‌و ناوچەکانی[3].

﴿ءَأَمِنتُم مَّن فِی ٱلسَّمَآءِ أَن یَخْسِفَ بِكُمُ ٱلْأَرْضَ فَإِذَا هِیَ تَمُورُ ﴿١٦﴾ أَمْ أَمِنتُم مَّن فِی ٱلسَّمَآءِ أَن یُرْسِلَ عَلَیْكُمْ حَاصِبًا ۖ فَسَتَعْلَمُونَ كَیْفَ نَذِیرِ ﴿١٧﴾ وَلَقَدْ كَذَّبَ ٱلَّذِینَ مِن قَبْلِهِمْ فَكَیْفَ كَانَ نَكِیرِ ﴿١٨﴾ أَوَلَمْ یَرَوْا۟ إِلَى ٱلطَّیْرِ فَوْقَهُمْ صَٰٓفَّٰتٍ وَیَقْبِضْنَ ۚ مَا یُمْسِكُهُنَّ إِلَّا ٱلرَّحْمَٰنُ ۚ إِنَّهُۥ بِكُلِّ شَیْءٍۭ بَصِیرٌ ﴿١٩﴾﴾

---

[1] احمد (٥٢/١) فەرمودەیەکی حەسەنی سەحیحە.

[2] تحفة الاحوذی (٨/٨)، (النسائی فی الکبری فی الرقائق وتحفة).

الاشراف (٧٩/٨)، ابن ماجة (١٣٩٤/٢) فەرمودەیەکی حەسەنی سەحیحە.

[3] الطبری (٥١٢/٢٣)، القرطبی (٢١٥/١٨).

**ئێوە چۆن لەسزای خودا ناترسن ئەو دەتوانێت بەهەر شێوەیەك بیەوێ جەزرەبەتان بدات**

وە هەمیسان لێرەدا لە سۆزو بەزەیی خۆیەتی بە بەندەکانی کە دەتوانێت سزایان بدات بەهۆی خودانەناسی هەندێکیان وە هاوەڵ دانانیان بۆ خودا لە پەرستنداو لەگەڵ ئەمانەشدا خودای گەورە پەلەیان لێ ناکاتو لێ بوردەیەو سزایان دوادەخات بۆ ڕۆژی قیامەت، وەك فەرموویەتی: ﴿وَلَوۡ يُؤَاخِذُ ٱللَّهُ ٱلنَّاسَ بِمَا كَسَبُواْ مَا تَرَكَ عَلَىٰ ظَهۡرِهَا مِن دَآبَّةٖ وَلَٰكِن يُؤَخِّرُهُمۡ إِلَىٰٓ أَجَلٖ مُّسَمّٗىۖ فَإِذَا جَآءَ أَجَلُهُمۡ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِعِبَادِهِۦ بَصِيرَۢا﴾[1] واتە: وە ئەگەر خودا قاربگرێت لە خەڵکی (تۆڵەیان لێ بسێنێت) لەبەر ئەوخراپانەی کردوویانە هیچ گیاندارێکی بەسەر زەوییەوە نەدەهێشت بەڵام (خودا) مۆڵەتی ئەوان دەدات تا ماوەی دیاریکراو ئینجا کاتێك ماوەکەیان کۆتایی هات (دەیانمرێنێت) جا بێگومان خودا بە بەندەکانی ئاگادارو بینایە و لێرەیشدا فەرموویەتی: ﴿ءَأَمِنتُم مَّن فِي ٱلسَّمَآءِ أَن يَخۡسِفَ بِكُمُ ٱلۡأَرۡضَ فَإِذَا هِيَ تَمُورُ﴾ ئاخۆ ئێوەلەوکەسەی کە لەئاسمانە ترستان نیە، کەبەزەمیندا ڕۆتان بەرێتو لەپڕ زەمین بێتە لەرزین؟ واتە بێتو بڕواتو بلەرزێت. وە فەرموویەتی: ﴿أَمۡ أَمِنتُم مَّن فِي ٱلسَّمَآءِ أَن يُرۡسِلَ عَلَيۡكُمۡ حَاصِبٗاۖ فَسَتَعۡلَمُونَ كَيۡفَ نَذِيرِ﴾ ئاخۆ ئێوە لەوکەسەی لە ئاسمانە ترستان نیە بایەکی توندی پڕ زیخو چەوتان لێ هەڵ بکات؟ ئەوساکە زوو دەزانن هەڕەشەی من چۆن بووە، واتە: بایەکی پڕ لە زیخو چەو سەرتان بشکێنێتو کونی تێ بکات، وەك فەرموویەتی: ﴿أَفَأَمِنتُمۡ أَن يَخۡسِفَ بِكُمۡ جَانِبَ ٱلۡبَرِّ أَوۡ يُرۡسِلَ عَلَيۡكُمۡ حَاصِبٗا ثُمَّ لَا تَجِدُواْ لَكُمۡ وَكِيلًا﴾[2] واتە: جا ئایا ئێوە ناترسنو بێ باکن لەوەی کە لە وشکایی دا (بومەلەرزە) بتانبات بە ناخی زەویدا؟ یان (ناترسن لەوەی) بای توندتان بنێرێتە سەر بە ووردە زیخەوە پاشان پارێزەرێکیشتان دەست نەکەوێت؟ وە بەم شێوەیەش لێرەدا هەڕەشەیان لێ دەکاتو دەفەرمووێت: ﴿فَسَتَعۡلَمُونَ كَيۡفَ نَذِيرِ﴾ واتە: هەڕەشەی من چۆنەو وە پاشەڕۆژی ئەوکەسانەی کە بێ گوێی دەکەنو باوەڕی پێ ناکەن. پاشان فەرموویەتی: ﴿وَلَقَدۡ كَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡ فَكَيۡفَ كَانَ نَكِيرِ﴾ خۆ بەر لەوانەش هەر هەبوون بە نیشانەکانی منتان بڕوا نەبووە، سا چۆنیان بەگژدا هاتم. واتە: لەگەڵ پێشوەکان ئەوانەی کە لە پێش ئەمانەوە ڕۆشتن کە چۆن سزامان دانو بەگژیاندا چووین، واتە ئازارێکی زۆر توندو گەورەو بەژانماندان.

---

[1] الفاطر (٤٥).

[2] الایسراء (٦٨).

**فڕینی باڵندەکان بە ئاسماندا بە یارمەتی خودا نیشانەیە لەسەر ئەوەی کە خودا لە هەموو شتێکی گەورەو بچوك ئاگادارە**

پاشان خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿أَوَلَمْ يَرَوْا إِلَى الطَّيْرِ فَوْقَهُمْ صَافَّاتٍ وَيَقْبِضْنَ مَا يُمْسِكُهُنَّ إِلَّا الرَّحْمَٰنُ إِنَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ بَصِيرٌ﴾ ئاخۆ ئەوان ئەو مەلانەیان نەدیوون کە لە سەرووی ئەوانەوە لەنگەریانەو باڵ لێك دەدەن؟ غەیری خودا کێ دەتوانێت ڕاگیریان بکات؟ خودا بۆ خۆی لە هەمووشت چاوەدێرە، واتە: هەندێك جار باڵەکانیان دەکەنەوەو لەنگەر دەگرن‌و هەندێك جاری تریش باڵەکانیان لێك دەدەن لە ئاسماندا، ﴿مَا يُمْسِكُهُنَّ إِلَّا الرَّحْمَٰنُ﴾ بێجگە لە خودا کێ دەتوانێت ڕایان گرێت بەهۆی ئەو هەوایەی کە ڕامی هێناوە بۆیان بە سۆزو بەزەیی خۆی، ﴿إِنَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ بَصِيرٌ﴾ بەو هەموو شتانەی کە بۆ دروست کراوەکانی دەشێت ئاگادارە ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە وایە کە دەفەرموێت: ﴿أَلَمْ يَرَوْا إِلَى الطَّيْرِ مُسَخَّرَاتٍ فِي جَوِّ السَّمَاءِ مَا يُمْسِكُهُنَّ إِلَّا اللَّهُ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ﴾[1] واتە: ئایا ئەوان سەرنجی باڵندەیان نەداوە؟ کە چۆن لە هەوای ئاسماندا ڕام هێنراون بێجگە لە خودا کێ ڕایان دەگرێت بەڕاستی لەو (ڕاگیر کردنەدا) چەند نیشانەو بەڵگە هەیە بۆ ئەوانەی باوەڕ دێنن.

﴿أَمَّنْ هَٰذَا الَّذِي هُوَ جُنْدٌ لَكُمْ يَنْصُرُكُمْ مِنْ دُونِ الرَّحْمَٰنِ إِنِ الْكَافِرُونَ إِلَّا فِي غُرُورٍ (٢٠) أَمَّنْ هَٰذَا الَّذِي يَرْزُقُكُمْ إِنْ أَمْسَكَ رِزْقَهُ بَلْ لَجُّوا فِي عُتُوٍّ وَنُفُورٍ (٢١) أَفَمَنْ يَمْشِي مُكِبًّا عَلَىٰ وَجْهِهِ أَهْدَىٰ أَمَّنْ يَمْشِي سَوِيًّا عَلَىٰ صِرَاطٍ مُسْتَقِيمٍ (٢٢) قُلْ هُوَ الَّذِي أَنْشَأَكُمْ وَجَعَلَ لَكُمُ السَّمْعَ وَالْأَبْصَارَ وَالْأَفْئِدَةَ قَلِيلًا مَا تَشْكُرُونَ (٢٣) قُلْ هُوَ الَّذِي ذَرَأَكُمْ فِي الْأَرْضِ وَإِلَيْهِ تُحْشَرُونَ (٢٤) وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا الْوَعْدُ إِنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ (٢٥) قُلْ إِنَّمَا الْعِلْمُ عِنْدَ اللَّهِ وَإِنَّمَا أَنَا نَذِيرٌ مُبِينٌ (٢٦) فَلَمَّا رَأَوْهُ زُلْفَةً سِيئَتْ وُجُوهُ الَّذِينَ كَفَرُوا وَقِيلَ هَٰذَا الَّذِي كُنْتُمْ بِهِ تَدَّعُونَ (٢٧) فَلَمَّا رَأَوْهُ زُلْفَةً سِيئَتْ وُجُوهُ الَّذِينَ كَفَرُوا وَقِيلَ هَٰذَا الَّذِي كُنْتُمْ بِهِ تَدَّعُونَ (٢٧)﴾

**خودا نەبێت هیچ کەس یارمەتیان نادات‌و بژێویشتان نادات**

خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَمَّنْ هَٰذَا الَّذِي هُوَ جُنْدٌ لَكُمْ يَنْصُرُكُمْ مِنْ دُونِ الرَّحْمَٰنِ إِنِ الْكَافِرُونَ إِلَّا فِي غُرُورٍ﴾ ئایائەو کەسە کێیە خۆی بە سوپاو لەشکری ئێوە دەزانێت لەجیاتی خودای میهرەبان؟ بێ بڕوایان هەر لە فریو خواردندان. خودا ڕوی و خۆی دەکاتە بت پەرستان ئەوانەی بێجگە لە خۆی کەسانی تریش دەپەرستن لەگەڵی، داوای یارمەتی‌و بژێوی لێ دەکەن هەڕەشەیان لێ دەکات لەسەر ئەو بیرو

[1] النحل (٧٩).

باوەڕەیان وە هەواڵیان دەداتێت کە ئەوەی ئەوان چاوەڕوانی دەکەن خەیاڵەخەڵەفاون و نایەتەدی بۆیە فەرموویەتی: ﴿إِنِ ٱلْكَٰفِرُونَ إِلَّا فِى غُرُورٍ﴾، پاشان فەرموویەتی: ﴿أَمَّنْ هَٰذَا ٱلَّذِى يَرْزُقُكُمْ إِنْ أَمْسَكَ رِزْقَهُۥ ۚ بَل لَّجُّوا۟ فِى عُتُوٍّ وَنُفُورٍ﴾ ئەی کێیە ئەوکەسەی بژێوتان دەدات، ئەگەر بژێوی لێ برین؟ نەخێر ئەوان لەسەر خۆبەزل زانین و دورکەوتنەوە پێ داگرن، واتە: ئەو کەسانە کێن کاتێك خودا بژێوی لێ برین بژێویتان دەداتێت پاش ئەو؟ واتە هیچ کەسێك نایدات و نایەنێرێت و یارمەتی نادات و ڕۆزی نانێرێت و وەدی ناهێنێت غەیری خودای گەورە نەبێت کە هاوەڵی نیەو خۆشیان چاك دەزانن لەگەڵ ئەوەشدا جگە لە خودا شتی تر دەپەرستن، واتە: بەردەوامن لەسەر خۆبەزل زانین و درۆ هەڵبەستن و خۆ خەلافاندن و سەرپێچی دەکەن و دوور دەکەونەوەو بەرەودوا دەگەڕێنەوەو پشت دەکەنە ڕاستی و گوێی بۆ ناگرن و شوێنی ناکەون.

**وێنەی خودانەناس و خوداناس**

خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿أَفَمَن يَمْشِى مُكِبًّا عَلَىٰ وَجْهِهِۦٓ أَهْدَىٰٓ أَمَّن يَمْشِى سَوِيًّا عَلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ﴾ ئاخۆ کەسێك دەم و ڕوو بە زەویدا دەخشێت چاکتر بەڕێگە دەزانێت یان ئەو کەسەی بە ئاسایی بەسەر ڕاستە ڕێدا دەڕوات؟. ئەمە وێنەیەکە خودای گەورە دەیهێنێتەوە بۆ خاوەن باوەڕو خودانەناس. خودانەناس وەك کەسێك وایە دەمەوڕو بە زەمیندا ڕادەکێشرێت، واتە: بە لادا لەسەر دەموچاو ڕادەکێشرێت ، واتە نازانێت بۆ کوێ ڕادەکێشرێت بۆ کوێ دەڕوات بەڵکو داماو و سەرلێ شێواو کولۆلە، ئەمە چاکتر بەڕێگە دەزانێت ﴿أَفَمَن يَمْشِى مُكِبًّا﴾ یان ئەو کەسەی بەئاسانی و لەسەرخۆ دەڕوات ﴿عَلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ﴾ واتە: لەسەر ڕاستە ڕێیەکی دیارو ئاشکرا کە خۆشی ڕاستەو ڕێگاکەیشی ڕاستە. ئەمە وێنەی خوانەناس و خواناسە لە دونیادا وە لە ڕۆژی قیامەتیشدا هەر بەو شێوەیە دەبن، خاوەن باوەڕ زیندوو دەکرێتەوە بە ئاسانی بەسەر ڕاستە ڕێدا دەڕوات و بەڕێ دەکرێت بۆ ئەو بەهەشتە خۆش و ڕازاوەیەو، خوانەناسیش زیندوو دەکرێنەوە بە دەم و ڕودا ڕادەکێشرێن بۆ ناو جەهەننەم ﴿ٱحْشُرُوا۟ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ وَأَزْوَٰجَهُمْ وَمَا كَانُوا۟ يَعْبُدُونَ ﴿٢٢﴾ مِن دُونِ ٱللَّهِ فَٱهْدُوهُمْ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلْجَحِيمِ﴾[1] واتە: (خودا بە فریشتەکان دەفەرموێت) ئەوانەی ستەمیان کرد کۆیان بکەنەوە لەگەڵ هاوڕێکانیان (هاو وێنەکانیان) لەگەڵ ئەوانەش کە دەیانپەرستن جگە لە خودا ئینجا ڕێگای دۆزەخیان نیشان بدەن. ئیمامی احمد ڕیوایەتی کردووە لە ئەنەسی کوڕی مالکەوە وتی: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) چۆن خەڵکی لەسەر دەموچاو

[1] الصافات (٢٢_٢٣).

کۆدەکرێنـەوە؟ پێغەمبـەر(ﷺ) فـەرمووی: (ئـاخۆ ئـەو کەسـەی کەڕانـدونی لەسـەر پاکانیـان (قـاچ) ناتوانێت لەسەر دەمو چاویان بیان گێڕێت؟)[1] ئەم فەرموودەیە لە هەردوو سەحیحەکەدا دەرهێنراوە[2].

**توانای خودا لەسەر دروست کردن و ( خلق ) نیشانەکانی لەسەر زیندوو بوونەوە**

خودای گـەورە فەرموویـەتی: ﴿قُلْ هُوَ الَّذِي أَنشَأَكُمْ وَجَعَلَ لَكُمُ السَّمْعَ وَالْأَبْصَارَ وَالْأَفْئِدَةَ قَلِيلًا مَا تَشْكُرُونَ﴾ بڵێ: ئەوە کە ئێوەی وەدی هێناوەو گوێو چاوو دڵـی دانـێ ئێـوە کـەمتر شوکری دەکـەن، واتـە: وەدیهێنـان پـاش ئـەوەی کـە ئێـوە شـتێك نـەبوون باسـتان لێـوە بکرێـت ﴿وَجَعَلَ لَكُمُ السَّمْعَ وَالْأَبْصَارَ وَالْأَفْئِدَةَ﴾ واتە: گوێو چاو و بیرو هۆشی دانێ ﴿قَلِيلًا مَا تَشْكُرُونَ﴾ زۆر کەم ئەو توانایانە بەکاردێنن کە خودا پێی داون لە خواپەرستیو گوێ ڕایەڵی فەرمانەکانیو وازهێناو دورکەوتنەوە لە قەدەغـەکانی، وە فەرموویەتی: ﴿قُلْ هُوَ الَّذِي ذَرَأَكُمْ فِي الْأَرْضِ وَإِلَيْهِ تُحْشَرُونَ﴾ بڵێ: ئەوەی کە ئێوەی لـەم زەمینـەدا پـەرشو بڵاو کردۆتەوە، لای ئەویش کۆدەکرێنەوە، واتە: پەرشو بڵاوی کردونەتەوە بەسەر هـەموو پارچـەکانی زەمینداو هەریەکی بەجۆرێك قسەدەکاتو هەریـەکێك ڕەنگێکـەو شـێوەیەکەو لـەوی تـر ناکـات ﴿وَإِلَيْهِ تُحْشَرُونَ﴾ لای خودا کۆدەکرێنەوە دوای ئەوەی هەریەکە بەلایەکدا چوونو بڵاو بوونەوە، چۆن بـڵاوەی پێ کردوون بەو شێوەیە کۆتان دەکاتەوە وەچۆن وەدیهێناون بەو شـێوەیەش دەتانگێڕێتـەوە. پاشـان خودای گەورە باسی ئەو خوانەناسانەمان بۆ دەکـات کـە باوەڕیـان بـە زیندوبوونـەوە نیـەو بـە ڕاستی نـازانن، دەفـەرموێت: ﴿وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا الْوَعْدُ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ﴾ دەشـڵێن: ئەگـەر ئێـوە ڕاسـتن، ئـەو بەڵێنـەتان کـەی دێتـە جـێ؟. واتـە ئـەوەی کـە تـۆ هـەواڵمان دەدەیتـێ کـەی ڕوودەدتو کـەی کـۆ دەکرێینـەوە پـاش ئـەو پـەرشو بـڵاو بونەوەیـە، وە دەفـەرموێت: ﴿قُلْ إِنَّمَا الْعِلْمُ عِندَ اللَّهِ وَإِنَّمَا أَنَا نَذِيرٌ مُّبِينٌ﴾ بڵێ: تەنیا خودا لەمە ئاگادارە، من هەر ئەوەندەم لەسەرە پێتان بڵێم دەبێت لە خودا بترسن. واتە خودا نەبێت هیچ کەسێك کاتەکەی نازانێت بەڵام خوای گەورە هـەواڵی پـێ داوم کـە بێگومـان ئـەم کارەسـاتە ڕودەدتو لـە خـودا بترسـن. ﴿وَإِنَّمَا أَنَا نَذِيرٌ مُّبِينٌ﴾ واتـە: وەمـن هـەر ئاگادارکردنـەوەم لەسەرەو هەر ئەوەم پێ سپێردراوە بۆتان. وە فەرموویـەتی: ﴿فَلَمَّا رَأَوْهُ زُلْفَةً سِيئَتْ وُجُوهُ الَّذِينَ كَفَرُوا وَقِيلَ هَٰذَا الَّذِي كُنتُم بِهِ تَدَّعُونَ﴾ جا ئەو کاتەی لە نزیکەوە دەیبینن کە خودانەناسان چرچاویان گرژ

---

[1] احمد (٣/١٦٧) فەرمودەیەکی سەحیحە.

[2] فتح الباری (٦/٣٥٠)، مسلم (٤/٢١٦١).

دەبێتو پێیان دەڵێن: ئەمە ئەوەیە کە ئێوە داواتان دەکرد، واتە کاتێك کە ڕۆژی قیامەت هات خودانەناسان بە چاوی خۆیان بینیان بۆیان دەرکەوت کە دوور نەبووە چونکە هەرشتێك چاوەڕوانی بکرێت دێت با ماوەیەکیش درێژە بکێشێت، جا ئەوکاتەی کە نزیك دەبێتەوە چرچاو دەدەن بەیەکداو گرژی دەکەن چونکە دەزانن چەندە خراپەو تاوانیان کردووە لە دنیادا. واتە کردەوەکانی خۆیان دێتەوە بیرو ئەوەی کە چاوەڕوانیان نەدەکردو بیریان لێ نەدەکردەوە دەی بینن. ﴿وَبَدَا لَهُمْ سَيِّئَاتُ مَا كَسَبُوا وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُوا بِهِ يَسْتَهْزِءُونَ﴾[1] واتە: وە لەلایەن خوداوە بۆیان دەرکەوت شتی وا کە ئەوان بیریان لێ نەکردۆتەوەو گومانیان بۆی نەچووە، وە بۆشیان دەرکەوت چی خراپەیان کردوە وە دەوری گرتن ئەو سزایەی ئەوان گاڵتەیان پێ دەکرد، بۆیە پێیان دەڵێن بەشێوەی لوخەو هەڕەشە لێ کردن ﴿وَقِيلَ هَٰذَا الَّذِي كُنتُم بِهِ تَدَّعُونَ﴾ واتە: ئەمە ئەوەیە کە ئێوە داواتان دەکردو پەلەتان بوو بۆی.

﴿ قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِنْ أَهْلَكَنِيَ اللَّهُ وَمَن مَّعِيَ أَوْ رَحِمَنَا فَمَن يُجِيرُ الْكَافِرِينَ مِنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ (٢٨) قُلْ هُوَ الرَّحْمَٰنُ آمَنَّا بِهِ وَعَلَيْهِ تَوَكَّلْنَا فَسَتَعْلَمُونَ مَنْ هُوَ فِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ (٢٩) قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِنْ أَصْبَحَ مَاؤُكُمْ غَوْرًا فَمَن يَأْتِيكُم بِمَاءٍ مَّعِينٍ (٣٠) ﴾

**مردنی خاوەن باوەڕ خوانەناس نا پارێزێ بابیر لەڕزگار کردنی خۆی بکاتەوە**

خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِنْ أَهْلَكَنِيَ اللَّهُ وَمَن مَّعِيَ أَوْ رَحِمَنَا فَمَن يُجِيرُ الْكَافِرِينَ مِنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ ﴾ بڵێ: بە من بڵێن ئەگەر خوا منو ئەو کەسانەی لەگەڵ منن لەناوبەرێت یان بەر بەزەیی خۆیمان بخات، دەی سا کێ خودانەناسان لە ئێشو ژان دەپارێزێت؟ واتە: ئەی محمد (ﷺ) بڵێ بەو بت پەرستو سپڵانەی کە ئەو بەهرانەی خودایان لەبەرچاو نیە دەی خۆتان ڕزگار بکەن چونکە هیچ شتێك ئێوە ڕزگار ناکات جگە لە پەشیمان بونەوەو گەڕانەوە بۆلای خوداو ئاینەکەی، ئەوەی ئێوە چاوەڕوانی دەکەن بۆ ئێمە لە بەڵاو لەناوچوون هیچ سودێك بە ئێوە ناگەیەنێت. ئەگەر خودا سزای ئێمە بدات یا بەزەیی بێتەوە پێماندا ئێوە لە جەزرەبەو تۆڵەی خودا ڕزگارتان نابێت هەر تووش دەبن.

پاشان خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿ قُلْ هُوَ الرَّحْمَٰنُ آمَنَّا بِهِ وَعَلَيْهِ تَوَكَّلْنَا فَسَتَعْلَمُونَ مَنْ هُوَ فِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ ﴾ بڵێ: ئەوەیە خودای بەخشندە، باوەڕمان پێ هێناوەو خۆمان هەر بەو سپاردووە، ئێوەش بەمزوانە دەزانن کێ بە ئاشکرا گومڕا بووە. واتە باوەڕمان هێناوە بە پەروەردەی هەموو جیهان کە دەهەندەو

[1] الزمر (٤٧).

دلۆڤانە وە پەنامان هەر بەئەوە لە هەموو کارو فەرمانێکدا ﴿فَٱعۡبُدۡهُ وَتَوَكَّلۡ عَلَيۡهِۚ﴾[1] واتە: کەواتە ئەو بپەرستەو هەرپشت بەو ببەستە، بۆیە فەرموویەتی: ﴿فَسَتَعۡلَمُونَ مَنۡ هُوَ فِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٖ﴾ واتە: لە ئێمەش و لە ئێوەش بەمزوانە دەزانێت کە پاشە ڕۆژ لە دنیاو لەڕۆژی دوایدا بۆ کێیە.

**وەبیرخستنەوەی بەهرەکانی خودا لە ئاوی زولاڵو ڕەوان و هەڕەشە بەڕۆچونی بە ناخی زەمیندا**

پاشان خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿قُلۡ أَرَءَيۡتُمۡ إِنۡ أَصۡبَحَ مَآؤُكُمۡ غَوۡرٗا فَمَن يَأۡتِيكُم بِمَآءٖ مَّعِينِۭ﴾ بلێ: بە من بڵێن ئەگەر ئاوەکەتان ڕۆچوو بەناخی زەمیندا، ئەوسا کێ ئاوی زولاڵو ڕەوانتان فریا دەخات؟. واتە ڕۆچوون بە ناخی زەمیندا بە قوڵنگی تیژو باسکی بەهێز نایەتە سەرەوە کە ڕۆچوو بۆیە خودا دەفەرموێت: ﴿فَمَن يَأۡتِيكُم بِمَآءٖ مَّعِينِۭ﴾ واتە: ئاوی زەلالی ڕەوانی ڕۆشتوو بەسەر زەمیندا. واتە هیچ کەس توانای ئەوەی نیە جگە لە خودای گەورە لە سۆزو بەزەیی و بەخشندەی خۆیەتی کە ئاوی بۆ وەدەرهێناون بە هەموو جیهاندا بلاوی کردوەتەوە بەپێی پێویستی بەندەکانی بە کەمی بێت یان بە زۆری.

**تەفسیری سورەتی ( القلم )**

**لە مەککەدا هاتوەتەخوارەوە**

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿نٓۚ وَٱلۡقَلَمِ وَمَا يَسۡطُرُونَ ١ مَآ أَنتَ بِنِعۡمَةِ رَبِّكَ بِمَجۡنُونٖ ٢ وَإِنَّ لَكَ لَأَجۡرًا غَيۡرَ مَمۡنُونٖ ٣ وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٖ ٤ فَسَتُبۡصِرُ وَيُبۡصِرُونَ ٥ بِأَييِّكُمُ ٱلۡمَفۡتُونُ ٦ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعۡلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن سَبِيلِهِۦ وَهُوَ أَعۡلَمُ بِٱلۡمُهۡتَدِينَ ٧﴾

لە سەرەتای سورەتی بەقەرەوە (البقرة) قسە لەسەر پیتەکان کراوە ئەم فەرمودەی خودای گەورەش کە: (ن) و هەروها (ص) و (ق) و پیتەکانی تریش وەك یەکن لێرەدا پێویست بە قسەلێکردن و دووبارەکردنەوەی نیە.

**تەفسیری سورەتی ( القلم )**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿نٓۚ وَٱلۡقَلَمِ وَمَا يَسۡطُرُونَ﴾ نوون سوێند بە پێنوس، بە وەش کە دێتە نوسین. وادەر دەکەوێت کە مەبەست پێی جنسی ئەو پێنووسەیە کە پێی دەنوسرێت وەك دەفەرموێت: ﴿ٱقۡرَأۡ وَرَبُّكَ ٱلۡأَكۡرَمُ ٣ ٱلَّذِي عَلَّمَ بِٱلۡقَلَمِ ٤ عَلَّمَ ٱلۡإِنسَٰنَ مَا لَمۡ يَعۡلَمۡ﴾[2] واتە: بخوێنە،

---

[1] هود(١٢٣).

[2] العلق (٣_٥).

پەروەردگاری تۆ (لە هەموو کەس) بەخشندەترە، ئەوەی کە (مرۆڤی) فێری نوسین کردووە بە قەڵەم، مرۆڤی شارەزا کردووە بەو شتانەی کە نەیدەزانی. ئەمە سوێندێکە لە خودای گەورەوەو ئاگادار کردنەوەیەکە بۆ بەندەکانی لەسەر ئەو چاکەیەی لەگەڵی کردوون لە فێرکردنی نوسین کە بەهۆی نوسینەوە شارەزای هەموو زانیارێک دەبن بۆیە فەرموویەتی: ﴿وَمَا يَسْطُرُونَ﴾ واتە: بەوەیش دەینوسنەوە[1] سودی (السدی) وتی: واتە فریشتەکان و ئەوەی دەنوسرێتەوە لە کردەوەی بەندەکان، هەندێکی تر وتویانە: (مەبەست بە پێنوس لێرەدا ئەو بڕیارەی خودای گەورەیە کە داویەتی کاتێک کە ئەندازەی دروست کراوەکانی دیاری کردوەو نوسراوە پێنج سەد هەزار ساڵ پێش دروست کردنی ئاسمانەکانو زەمین) وە لەو بارەیەوە ئەو فەرموودانەیان هێناوە کە باسی پێنوس دەکات. ئیبنو ئەبی حاتم ڕیوایەتی کردووە لە وەلیدی کوڕی عوبادەی کوڕی سامتەوە (صامت) وتی: باوکم بانگی کردم لە کاتی مردنیدا وتی: من بیستم لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) دەی فەرموو: (یەکەم شتێك خودا دروستی کرد پێنوس بوو، پێی فەرموو بنوسە، وتی: ئەی پەروەردگارم چی بنوسم؟ فەرمووی: قەدەر بنوسەو ئەوەی پەیدا دەبێت هەتاهەتایە)[2] ئەم فەرمودەیە ئیمامی احمد ڕیوایەتی کردووە لە چەند ڕێگاوە[3] وە ترمذی هێناویەتی لە فەرموودەی ئەبو داودی تیالیس (الطیالیس) بەو شێوەیەو وتی: فەرموودەیەکی چاکەو ڕاستەو غەریبە[4].

## سوێند بە پێنوس لەسەر گەورەیی پێغەمبەر (ﷺ)

خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿مَآ أَنتَ بِنِعْمَةِ رَبِّكَ بِمَجْنُونٍ﴾ لە سایەی چاکەی پەروەردەت، تۆ شێت نیت. واتە: سوپاس بۆ خودا تۆ شێت نیت وەك نەفامەکانی خزمەکانت دەڵێن ئەوانەی ئەو ڕاستیو هیدایەتە تۆ بۆت هێناون کە چەندە ئاشکرایە بە درۆی دەزاننو بە شێتت دەزانن لە گەیاندنی ئەو ڕاستیەداوە دەفەرمووێت: ﴿وَإِنَّ لَكَ لَأَجْرًا غَيْرَ مَمْنُونٍ﴾ تۆ پاداشتی واشت هەیە کە دوایی نایەت، واتە: بەڵکو تۆ پاداشتی گەورەو چاکەی نەبڕاوەت هەیەو کە هەرگیز دوایی نایەت لەناوناچێت لەبەر گەیاندنی ئەو پەیامەی پەروەردەت بە مەردوم وە ئارام گرتنت لەسەر ئازار دانیان بۆت. ﴿غَيْرَ مَمْنُونٍ﴾ واتە: نەبڕاوە. وەك دەفەرمووێت: ﴿عَطَآءً غَيْرَ مَجْذُوذٍ﴾[5] واتە: ئەوە بەخشینێکە بەبێ بڕانەوە. وە

---

[1] الطبری (٢٣/٥٢٧/٥٢٨).

[2] الطبری (٢٣/٥٢٦).

[3] احمد (٥/٣١٧) و حەسەنی سەحیحە غەریبە.

[4] تحفة الاحوذی (٩/٢٣٢) فەرموودەیەکی حەسەنی سەحیحی غەریبە.

[5] هود (١٠٨).

فەرموویەتی: ﴿فَلَهُمْ أَجْرٌ غَيْرُ مَمْنُونٍ﴾[1] واتە: پاداشتیان دوایی نایێت. موجاهد وتی: ﴿غَيْرَ مَمْنُونٍ﴾ واتە: لە ژمارە نایێت.[2] ئەمیش هەر ئەو مانایەی پێشەوە دەگەیەنێت کە وتمان.

**ماناى ﴿ وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ ﴾**

خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ ﴾ ئاکاریشت فرە بەرزە. عەوفی وتی لە ئیبنو عەباسەوە ﴿ وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ ﴾ واتە: ئیسلام[3] موجاهدو ئەبو مالكو سودی و ڕەبیعو ئەنەسیش وایان وتووە[4] زەحاكو ئیبنو زیدیش هەر وایان وتووە.[5] سعیدی کوڕی ئەبو عروبەیش (العروبە) وتی: قەتادە وتی ﴿ وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ ﴾ بۆیان باس کردوین کە سەعدی کوڕی هیشام پرسیاری لە عائیشە کردووە لە ئاکاری پێغەمبەر(ﷺ) عائیشە وتی: ئایا قورئانت نەخوێندووە؟ وتی: بەڵێ، عائیشە: ئاکاری (ڕەوشتی) پێغەمبەر(ﷺ) قورئان بووە.[6] عبدالرزاقیش هەر بەم شێوەیە ڕیوایەتی کردووە.[7] ئیمامی مسلم لە سەحیحەکەیدا لە فەرموودەکەی قەتادەوە ڕیوایەتی کردووە بە درێژی.[8] مانای ئەوەیە کە پێغەمبەر(ﷺ) قورئان چۆن بووە ئەویش وابووە لە فەرمان کردنو قەدەغەکردندا ئاکاری قورئان بووە و ئاکارە سروشتیەکەی خۆی واز لێ هێناوە هەرچی قورئان فەرمانی پێ کردبێت ئەوەی کردوەو هەرچی قەدەغەی کردبێت نەی کردووە ئەمە لەگەڵ ئەو ڕەوشتە گەورەو جوانانەی کە خودا پێی داوە لە شەرمو میوان پەرێزیو ئازایەتیو لەسەرخۆییو دڵ فراوانیو لێبوردەیی وە هەموو ڕەوشتێکی تری جوان. وەك لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە لە ئەنەسەوە وتی: دەساڵ خزمەتی پێغەمبەرم کرد هەرگیز پێی نەوتم ئۆف وە هەر شتێکیشم کردبێت نەیفەرمووە بۆچی کردت؟ ئەوەی نەشم کردبێت نەیفەرمووە بۆچی نەتکردووە؟ دەستم نەداوە لە هیچ خوریەکی نەرم یان حەریر یان هەرشتێك کە نەرم تر بووبێت لە ناو دەستی پێغەمبەر(ﷺ) وە بۆنی هیچ میسكو عەترێکم

---

[1] التين (٦).

[2] الطبري (٢٣/٥٢٨).

[3] الطبري (٢٣/٥٢٩).

[4] الطبري (٢٣/٥٢٩)، الدر المنثور(٨/٢٤٣).

[5] الطبري (٢٣/٥٣٠).

[6] الطبري (٢٣/٥٢٩).

[7] عبدالرزاق (٣/٣٠٧) فەرموودەیەکی سەحیحە.

[8] مسلم (١/٥١٣).

نەکردوە بۆنی خۆشتر بووبێت لە ئارەقی پێغەمبەر(ﷺ)[١] بوخاری ڕیوایەتی کردوە لە بەرائەوە (البراء) وتی: پێغەمبەر(ﷺ) دەموچاوی (ڕووی) لە هەموو کەس جوانتر بووە ئاکاریشی (ڕەوشتی) چاکتر بووەو زۆر بالآی بەرز نەبووەو کورتیش نەبووە[٢] فەرموودە لەمبارەیەوە زۆرە ئەبو عیسای ترمذی لەمبارەیەوە (کتاب الشائل)ی نوسیووە. ئیمامی احمد ڕیوایەتی کردوە لە عائیشەوە وتی: پێغەمبەر هەرگیز بەدەستی نەیداوە لە خزمەت کارەکانی وە نەیداوە لە خێزانەکانی وە لە هیچ شتێکی نەداوە مەگەر لە غەزادا لەڕێگای خودا وە سەرپشك (خێر) نەکراوە لە نێوان دووشتدا مەگەر خۆشەویست ترینیان لای ئاسان ترینیان بووە مەگەر گوناه بووبێت، وە ئەگەر گوناه بووبێت دوورترین کەس بووە لە گوناهەوە، وە لە هیچ شتێکدا تۆڵەی بۆ خۆی نەسەندوە کە هاتبێتە لای مەگەر قەدەقەیەکی خودای تیدا شکێندرابێت لەوکاتەدا لەبەر خودای گەورە تۆڵەی سەندوە لە تاوانبار[٣]. ئیمامی احمد ڕیوایەتی کردوە لە ئەبو هورەیرەوە وتی: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (بێ گومان من هاتووم بۆ ئەوەی کە ئاکارە (ڕەوشتە) چاکەکان تەواو بکەم) تەنها ئیمام أحمد هێناویەتی[٤] وە دەفەرمووێت: ﴿فَسَتُبۡصِرُ وَيُبۡصِرُونَ﴾ بەمزوانە تۆش‌و ئەوانیش دەبینین. ﴿بِأَييِّكُمُ ٱلۡمَفۡتُونُ﴾ کێ لە ئێوە شێتایەتی تێدایە؟ بەمزوانە ئەی محمد (ﷺ) تۆ دەبینی ئەوانەی کە دژایەتیت دەکەن‌و باوەڕت پێ ناکەن کێ سەر لێ شێواو شێتایەتی تێدایە تۆ یان ئەوان؟ ئەمە وەك ئەو ئایەتەیە کە خودا دەفەرمووێت: ﴿سَيَعۡلَمُونَ غَدٗا مَّنِ ٱلۡكَذَّابُ ٱلۡأَشِرُ﴾[٥] واتە: وە سبەی دەزانن کە کێ زۆر درۆزنی خود پەسەندە. وەك ئەم ئایەتەش کە دەفەرمووێت: ﴿وَإِنَّآ أَوۡ إِيَّاكُمۡ لَعَلَىٰ هُدًى أَوۡ فِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٖ﴾[٦] واتە: بێگومان ئێمە یان ئێوە (یەکێکمان) لەسەر ڕێنموینین یان لە گومڕاییەکی ئاشکرادابن. ئیبنو جورەیج (ابن جریج) وتی: ئیبنو عەباس وتوویەتی کە ﴿فَسَتُبۡصِرُ وَيُبۡصِرُونَ﴾ واتە: بەمزوانە تۆ دەزانی‌و ئەوانیش دەزانن لە ڕۆژی قیامەتدا.[٧] عەوفی (العوفی) وتی: لە ئیبنو عەباسەوە ﴿بِأَييِّكُمُ ٱلۡمَفۡتُونُ﴾ واتە: شێتی[٨] موجاهدو

---

[١] فتح الباری (٤٧١/١٠)، مسلم (١٨١٤/٤).

[٢] فتح الباری (٦٥٢/٦).

[٣] احمد (٢٣٢/٦) فەرموودەیەکی سەحیحی لەسەر مەرجی بوخاری وموسلیم.

[٤] احمد (٣٨١/٢) سەنەدەکانی حەسەنە.

[٥] القمر (٢٦).

[٦] سبأ (٢٤).

[٧] القرطبی (٢٢٩/١٨).

[٨] الطبری (٥٣١/٢٣).

کەسانی تریش وایان وتووە[1] مانای ﴿ٱلۡمَفۡتُونُ﴾ دیارو ئاشکرایە واتـە: ئـەوەی ڕێگـای ڕاستـی لێ ونبـووەو لێی تێك چووە، وە بۆیە(پیتی با) نراوەتە سەر ﴿أَيِيِّكُم﴾ بۆئەوەی نیشانەبێت لەسەر بوونی فیعلێك لـەم فەرموودەیەدا ﴿فَسَتُبۡصِرُ وَيُبۡصِرُونَ﴾ کە تەقدیر کراوە وەك (فستعلم ویعلمون) یـان (فستبـصر ویبـصرون بـأييكم المفتــون) والله اعلــم، پاشــان دەفــەرمووێت: ﴿إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعۡلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن سَبِيلِهِۦ وَهُوَ أَعۡلَمُ بِٱلۡمُهۡتَدِينَ﴾ بێ گومان پەروەردەی تۆ چاکتر بەوانـە دەزانێـت کـە ڕێـی ئـەویان ون کـردووە، باشـتریش ئاگای لێیە کە کێن ئەوانەی شارەزای ڕێن. واتە: ئەو خودای گەورە دەزانێـت کـام دەسـتە یـان شـارەزای ڕێن، وە ئاگای لەو کۆمەڵەیە کە ڕێگای ڕاستی ون کردووە.

﴿فَلَا تُطِعِ ٱلۡمُكَذِّبِينَ ﴿٨﴾ وَدُّواْ لَوۡ تُدۡهِنُ فَيُدۡهِنُونَ ﴿٩﴾ وَلَا تُطِعۡ كُلَّ حَلَّافٖ مَّهِينٍ ﴿١٠﴾ هَمَّازٖ مَّشَّآءِۭ بِنَمِيمٖ ﴿١١﴾ مَّنَّاعٖ لِّلۡخَيۡرِ مُعۡتَدٍ أَثِيمٍ ﴿١٢﴾ عُتُلِّۭ بَعۡدَ ذَٰلِكَ زَنِيمٍ ﴿١٣﴾ أَن كَانَ ذَا مَالٖ وَبَنِينَ ﴿١٤﴾ إِذَا تُتۡلَىٰ عَلَيۡهِ ءَايَٰتُنَا قَالَ أَسَٰطِيرُ ٱلۡأَوَّلِينَ ﴿١٥﴾ سَنَسِمُهُۥ عَلَى ٱلۡخُرۡطُومِ ﴿١٦﴾﴾

**گوێ پێ نەدانی پاڵە پەستۆ (ضغط) ی بێ باوەڕان و ومرنەگرتنی ڕاو بۆچوونیان کە بەقسەی خۆیان دەیانەوێت بگەن بەیەك لە ناوەڕاستی ڕێگادا**

خودای گەورە دەفەرمووێت وەك چۆن بەهرەی زۆرو ڕەوشتی بەرزو گەورەو بەرنامەی ڕێك و ڕاستمان پێ دایت ﴿فَلَا تُطِعِ ٱلۡمُكَذِّبِينَ﴾ سا تۆ ناشێت بە فەرمانی ئەو بێ باوەڕانە بکەیت.﴿وَدُّواْ لَوۡ تُدۡهِنُ فَيُدۡهِنُونَ﴾ حەز دەکەن گەر تۆ نەرم بیت، ئەوانیش نەرمونیانی بنوێنن، ئیبنو عەباس وتی: ئەگەر نەرمی بنوێنیت بۆیان ئەوانیش حەزدەکەن نەرمی بنوێنن[2] موجاهد وتی: ﴿وَدُّواْ لَوۡ تُدۡهِنُ فَيُدۡهِنُونَ﴾ باوەڕ بێنیت بە خوداکانی ئەوان و واز لەو ڕاستیە بێنیت کە لە سەریتی.[3] پاشان خودا دەفەرمووێت: ﴿وَلَا تُطِعۡ كُلَّ حَلَّافٖ مَّهِينٍ﴾ نابێت گوێش بەوکەسە بدەیت کە زۆر سوێند خۆرو خوێڕیە، چونکە درۆزن لەبەر لاوازی و سوکی دەبێت نرخی خۆی بە سوێند خواردنی درۆ بە ناوە پیرۆزەکانی خودا بێ ترسانە لە هەموو کات و شوێنێکدا دەیەوێت بڕوای پێ بکرێت. ئیبنو عەباس وتی: (المهين)

---

[1] الطبری (٢٣/٥٣٠).

[2] الطبری (٢٣/٥٣٣).

[3] الطبری (٢٣/٥٣٣).

واتە درۆزن.[1] وە دەفەرمووێت: ﴿هَمَّازٍ مَّشَّآءٍ بِنَمِيمٍ﴾ هەر تانە لە خەڵك دەداو قسە بۆ ئەمو ئەو دەبات. ئیبنو عەباس وتی: ﴿هَمَّازٍ﴾ باسی خەڵك كردن بە ناشیرینی.[2] ﴿مَّشَّآءٍ بِنَمِيمٍ﴾ واتە: ئەوكەسەی قسە دێنێتو دەیبات لە نێوان مەردوما بۆ ئەوەی نێوانیان تێك بداتو دڵیان لەیەك بیەشێنێت. كە ئەوەش سڕینەوەو لە بن دەرهێنانی ئاینیەتی. لە هەردوو سەحیحەكەدا هاتووە لە فەرموودەكەی موجاهدەوە لە تاوسەوە (طاوس) ئەویش لە ئیبنو عەباسەوە وتی: پێغەمبەر(ﷺ) تێپەڕی بەلای دوو گۆڕدا (قەبر) فەرمووی: (ئەمانە جەزرەبە دەدرێن جەزرەبەكەشیان لەسەر گوناهی گەورە نیە، یەكێكیان خۆی نەپاراستووە لە میز دووهەمیان: قسە دێنێتو دەبات لە نێوان خەڵكیدا)[3] ئەم فەرموودەیە زانایانی فەرموودە لە پەڕاوەكانیاندا هێناویانە لە چەند ڕێگاوە لە موجاهدەوە بەم شێوەیە[4] ئیمامی احمد ڕیوایەتی كردووە لە حوزەیفەوە وتی: بیستم لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) دەی فەرموو: (ناچێتە بەهەشتەوە (قتاة) ئەوەی قسە هەڵدەبەسێتو درۆ دەكات لە نێوان خەڵكیدا)[5] زانایانی فەرموودە ڕیوایەتیان كردووە جگە لە ئیبنو ماجە.[6] ﴿مَّنَّاعٍ لِّلْخَيْرِ مُعْتَدٍ أَثِيمٍ﴾ لە كاری چاكە لەمپەرە، شەڕفرۆشە، تاوانكەرە. ڕێگرە لە كاری چاكەو چاكەخوازیش نیە ﴿مُعْتَدٍ﴾ لە ئەندازەی خۆی زیاتر دەست دەكێشێت لەوشتانەی خودا ڕێگای پێ داوە ﴿أَثِيمٍ﴾ تاوانكەرو حەرام خۆریشە. وە دەفەرمووێت: ﴿عُتُلٍّ بَعْدَ ذَٰلِكَ زَنِيمٍ﴾ ڕەزاقورسە، لە پاش ئەمەش زۆڵێكە خۆی سەپاندوە. ﴿عُتُلٍّ﴾ واتە: ڕەزاقورسو ناشیرینو خۆسەپێنەر. ئیمامی احمد ڕیوایەتی كردوە لە حارسەی (حارثة) كوڕی وەهەبەوە (وهب) وتی: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (ئایا هەواڵتان بدەمێت بەخەڵكی بەهەشت هەموو لاوازێكو ئەوانەی كە بە لاوازو بێ هێز سەیر دەكرێن ئەگەر سوێند بخوات بە خودا بە گوێی دەكات، وە ئایا هەواڵتان بدەمێت بە خەڵكی ناوئاگر هەموو ئەو كەسانەی كە ڕەزاقورسو ناشیرنو خۆبەزل زانن)[7]

---

[1] الطبری (٢٣/٥٣٣).

[2] الطبری (٢٣/٥٣٤).

[3] فتح الباری (١/٣٥٨)، مسلم ( ١/٢٤٠).

[4] ابوداود (١/٢٥)، تحفة الاحوذی (١/٢٣٢)، النسائی (١/٢٨/٤٠/٤١٢).

النسائی فی الكبری (٦/٤٩٦)، ابن ماجة (١/١٢٥) فەرموودەیەكی سەحیحە.

[5] احمد (٥/٣٨٢) فەرموودەیەكی سەحیحە.

[6] فتح الباری (١٠/٤٨٧)، مسلم (١/١٠١)، ابوداود (٥/١٩٠).

تحفة الاحوذی (٦/١٧٢٠)، النسائی فی الكبری (٦/٤٩٦).

[7] احمد (٤/٣٠٦) فەرموودەیەكی سەحیحە.

وەکیع وتی: (هەر کەسێکە کە بەژیانی خۆی خۆش حاڵەو بە ڕێگادا خۆی بادەدتو خۆی بەزل دەزانێت) لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە وە زانایانی فەرموودە هێناویانە جگە لە ئەبو داود، لە فەرمودەکەی سوفیانی سەوری (سفيان الثوری) و شعبەو کە هەردووکیان لە سعیدی کوڕی خالدەوە بەو شێوەیە هێناویانە.[1] زانایانی ڕێزکان وتویانە: الجعظری واتە: ڕەزا قورسو قسەڕەق، (الجواظ) واتە: چاکەناکاتو ڕێگری چاکەخوازانە. ﴿زَنِيمٍ﴾ بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەباسەوە ﴿عُتُلٍّ بَعْدَ ذَٰلِكَ زَنِيمٍ﴾ وتی: پیاوێك لە قورەیش گوێی برابوو وەك چۆن مەڕومالآت گوێی دەبڕدرێت[2] مانای وایە ئەوکەسە ناوی دەرکردووە بە پیاو خراپ وەك ئەو مەڕەی دیاری کراوە لە ناو مەڕەکانی تردا. ﴿زَنِيمٍ﴾ لە زبانی عەرەبیدا واتە: بێ باوك لە ناو خەڵکدا بە کوردی خۆمان پێی دەڵێن (زۆڵ) ئیبنو جەریرو زۆرێك لە زانایان وتویانە. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَن كَانَ ذَا مَالٍ وَبَنِينَ﴾ هەر بەو هۆیە کە دەوڵەمەندەو چەند کوڕی هەن. ﴿إِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِ ءَايَٰتُنَا قَالَ أَسَٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ﴾ کەر نیشانەکانی ئێمەی بۆ بخوێننەوە دەڵێت: ئەمە چیرۆکی پێشینەکانە. ئەمە پاداشتی ئەو هەموو چاکەو بەهرانەیە کە خودا پێیدا لە سامانو منداڵی زۆرو باوەڕی بە نیشانەکانی خودا نەکردو پشتی تێکرد بە خەیاڵی خۆی وای دەزانی کە لە چیرۆکی پێشینەکانەوە وەرگیراوە. وەك خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿ذَرْنِي وَمَنْ خَلَقْتُ وَحِيدًا ﴿١١﴾ وَجَعَلْتُ لَهُۥ مَالًا مَّمْدُودًا ﴿١٢﴾ وَبَنِينَ شُهُودًا ﴿١٣﴾ وَمَهَّدتُّ لَهُۥ تَمْهِيدًا ﴿١٤﴾ ثُمَّ يَطْمَعُ أَنْ أَزِيدَ ﴿١٥﴾ كَلَّآ ۖ إِنَّهُۥ كَانَ لِآيَٰتِنَا عَنِيدًا ﴿١٦﴾ سَأُرْهِقُهُۥ صَعُودًا ﴿١٧﴾ إِنَّهُۥ فَكَّرَ وَقَدَّرَ ﴿١٨﴾ فَقُتِلَ كَيْفَ قَدَّرَ ﴿١٩﴾ ثُمَّ قُتِلَ كَيْفَ قَدَّرَ ﴿٢٠﴾ ثُمَّ نَظَرَ ﴿٢١﴾ ثُمَّ عَبَسَ وَبَسَرَ ﴿٢٢﴾ ثُمَّ أَدْبَرَ وَٱسْتَكْبَرَ ﴿٢٣﴾ فَقَالَ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا سِحْرٌ يُؤْثَرُ ﴿٢٤﴾ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا قَوْلُ ٱلْبَشَرِ ﴿٢٥﴾ سَأُصْلِيهِ سَقَرَ﴾[3] واتە: واز لەمنو ئەوکەسە بێنە کە دروستم کردووە بە تەنها، وەدارایی زۆرو زەبەندەم پێ داوە، وە کوڕانی ئامادەو بەردەست، وە هۆی ژیانم بۆ ڕاخستووە بە چۆن ڕاخستنێك، دوای ئەمانەش هێشتا بەتەمایە زیاتری بدەمێت، نەء (چاوەڕوان نەبێت) بەڕاستی ئەو دەربارەی ئایەتانی ئێمە بێ باوەڕێکی کەللە ڕەقە، بەمزوانە سزای سەختی پێ دەچەژم، (چونکە) بیری کردەوەو هەڵی سەنگاند (قسەکەی خۆی)، دەك بەکوشت بچێت چۆنی هەڵسەنگاند، دووبارە بەکوشت بچێت

---

[1] فتح الباری (٨/٥٣٠)، مسلم (٤/٢١٩٠)، تحفة الاحوذی (٧/٣٣٠١).
النسائی فی الکبری (٦/٤٩٧)، ابن ماجة (٢/٣٧٨).

[2] البخاری (٤٩١٧).

[3] المودة (١١_٢٦).

چۆنی لێکداوەتەوە، لە پاشان تەماشایەکی کرد، ئەوسا ناو چاوانی گرژو ڕوی ترش کرد، ئینجا بە فیزێکەوە پشتی هەڵکرد، جا وتی ئەم قورئانە هیچی تر نیە جادویەك نەبێت کە وەرگیراوە، ئەم قورئانە هەر گوفتاری مرۆڤە، زوو دەیخەمە دۆزەخەوە. لێرەدا خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿سَنَسِمُهُۥ عَلَى ٱلۡخُرۡطُومِ﴾ بەمزوانە سەری لوتی داخ دەکەین. ئیبنو جەریر وتی: بەمزوانە پاشەڕۆژی دیاری دەکەین زۆر بەڕونی بۆ ئەوەی بیناسنەوەو لێیان ون نەبێتو نەشاردرێتەوە ئەویش داغێکە (مۆرێکە) بەسەر لوتیەوە.[1] هەندێك کەس وتویانە: ﴿سَنَسِمُهُۥ﴾ نیشانەی خەڵکی ناوئاگرە، واتە: ڕوی ڕەش دەکەین لە ڕۆژی قیامەتدا. لە جێگای دەموچاو لوتی بەکارهێناوە.

﴿إِنَّا بَلَوۡنَٰهُمۡ كَمَا بَلَوۡنَآ أَصۡحَٰبَ ٱلۡجَنَّةِ إِذۡ أَقۡسَمُواْ لَيَصۡرِمُنَّهَا مُصۡبِحِينَ (١٧) وَلَا يَسۡتَثۡنُونَ (١٨) فَطَافَ عَلَيۡهَا طَآئِفٞ مِّن رَّبِّكَ وَهُمۡ نَآئِمُونَ (١٩) فَأَصۡبَحَتۡ كَٱلصَّرِيمِ (٢٠) فَتَنَادَوۡاْ مُصۡبِحِينَ (٢١) أَنِ ٱغۡدُواْ عَلَىٰ حَرۡثِكُمۡ إِن كُنتُمۡ صَٰرِمِينَ (٢٢) فَٱنطَلَقُواْ وَهُمۡ يَتَخَٰفَتُونَ (٢٣) أَن لَّا يَدۡخُلَنَّهَا ٱلۡيَوۡمَ عَلَيۡكُم مِّسۡكِينٞ (٢٤) وَغَدَوۡاْ عَلَىٰ حَرۡدٖ قَٰدِرِينَ (٢٥) فَلَمَّا رَأَوۡهَا قَالُوٓاْ إِنَّا لَضَآلُّونَ (٢٦) بَلۡ نَحۡنُ مَحۡرُومُونَ (٢٧) قَالَ أَوۡسَطُهُمۡ أَلَمۡ أَقُل لَّكُمۡ لَوۡلَا تُسَبِّحُونَ (٢٨) قَالُواْ سُبۡحَٰنَ رَبِّنَآ إِنَّا كُنَّا ظَٰلِمِينَ (٢٩) فَأَقۡبَلَ بَعۡضُهُمۡ عَلَىٰ بَعۡضٖ يَتَلَٰوَمُونَ (٣٠) قَالُواْ يَٰوَيۡلَنَآ إِنَّا كُنَّا طَٰغِينَ (٣١) عَسَىٰ رَبُّنَآ أَن يُبۡدِلَنَا خَيۡرٗا مِّنۡهَآ إِنَّآ إِلَىٰ رَبِّنَا رَٰغِبُونَ (٣٢) كَذَٰلِكَ ٱلۡعَذَابُۖ وَلَعَذَابُ ٱلۡأٓخِرَةِ أَكۡبَرُۚ لَوۡ كَانُواْ يَعۡلَمُونَ (٣٣)﴾

### وێنەیەك لە تیاچوونی ئەو ماڵو سامانەی خودانەناس پەیدای کردووە

ئەمە وێنەیەکە خودای گەورە دەی هێنێتەوە بۆ خودانەناسەکانی قورەیش بۆ ئەو چاکەو بەخششە گەورانەی کە پێی داون لە هەموو بەخششەکان گەورەتر ناردنی محمد (ﷺ) بۆیان. لە پاداشتی ئەو چاکە گەورەدا ڕووبەڕوی بوونەوە بە دژایەتی کردنو بەرپەرچدانەوەو باوەڕ پێ نەکردنی. بۆیە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿إِنَّا بَلَوۡنَٰهُمۡ كَمَا بَلَوۡنَآ أَصۡحَٰبَ ٱلۡجَنَّةِ إِذۡ أَقۡسَمُواْ لَيَصۡرِمُنَّهَا مُصۡبِحِينَ﴾ ئێمە ئەوانەمان تاقی کردەوە وەك خاوەنانی باغەکەمان تاقی کردەوە، کاتێك سوێندیان خوارد کە لە بەرەبەیاندا زوو بچن بەرەکەی لێ بکەنەوە. ﴿إِنَّا بَلَوۡنَٰهُمۡ﴾ واتە: تاقیمان کردنەوە، ﴿كَمَا بَلَوۡنَآ أَصۡحَٰبَ ٱلۡجَنَّةِ﴾ کە باخێك بوو هەموو جۆرە میوەو بەروبومێکی تێدابوو. ﴿إِذۡ أَقۡسَمُواْ لَيَصۡرِمُنَّهَا مُصۡبِحِينَ﴾ سوێندیان خوارد لە ناو خۆیاندا کە شەو تابەری بەیانی (پێش ڕۆژ بونەوە) بەری باخەکەیان هەموو بڕنن (لێ بکەنەوە) بۆ ئەوەی هەژارو داماو پێیان نەزانێت داوای بەشو خێریان لێ بکەنو هیچی لێ نەبەخشن. و دەفەرمووێت: ﴿وَلَا

[1] الطبری (٥٤١/٢٣).

يَسْتَثْنُونَ ﴾ واتە: هيچی بۆ(هەژاران) لێ دەرنەكەن، لەوەی كە سوێندیان لەسەر خوارد. بۆیە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَطَافَ عَلَيْهَا طَآئِفٌ مِّن رَّبِّكَ وَهُمْ نَآئِمُونَ﴾ ئەوسا كە ئەوان خەوتبون، لەلایەن پەروەردەتەوە بەلآیەكی بۆ داباری، واتە: بەلآیەكی لە ئاسمانەوە بۆ داباری. ﴿فَأَصْبَحَتْ كَٱلصَّرِيمِ﴾ ئیتر وەك زەمینێكی سووتاو تاقڕی لێ هات. ئیبنو عەباس وتی: وەك شەوی تاریكی لێ هات.[1] سەوری‌و (الثوری) سودی (السدی) وتیان: وەك كشتوكالێكی ڕناوەی لێ هات (وشك‌و ڕزاو وردكراو) ﴿فَتَنَادَوْاْ مُصْبِحِينَ﴾ ئەوسا بەیانی هەموو بانگی یەكتریان كرد. لە وەختی بەیانیدا بانگی یەكتریان كرد كە بڕۆن بۆ باخ ڕنین (واتە بڕین). ﴿أَنِ ٱغْدُواْ عَلَىٰ حَرْثِكُمْ إِن كُنتُمْ صَٰرِمِينَ﴾ ئەگەر ئێوە میوە ڕنن، هەر بەیانی بگەنە سەر كێڵگەی خۆتان، واتە: ئەگەر دەتانەوێت میوە بڕنن. ﴿فَٱنطَلَقُواْ وَهُمْ يَتَخَٰفَتُونَ﴾ بەڕێوە دەچوون‌و پێكەوە چپەیان دەكرد، واتە: بە چپە قسەیان دەكرد بۆ ئەوەی كەس گوێی لە دەنگیان نەبێت. پاشان ئەو خودایەی كە ئاگای لە چپەو پەنهانیە هۆی ئەو چپەكردنەیان باس دەكات‌و دەفەرموێت: ﴿أَن لَّا يَدْخُلَنَّهَا ٱلْيَوْمَ عَلَيْكُم مِّسْكِينٌ﴾ كە نابێت ئەمڕۆ هیچ هەژارێت بێتە ناو باخەكەی ئێوە، واتە: دەیانوت بە یەكتری نابێت ئەمڕۆ هیچ هەژارێك بێتە ناو باخەكەی ئێوە. خودای گەورە فەرمووی: ﴿وَغَدَوْاْ عَلَىٰ حَرْدٍ قَٰدِرِينَ﴾ بڕیاریان دا مەرجەكەیان بەجێ بێنن، واشیان دەزانی دەتوانن، واتە: بڕیاریان دا بە هەموو هێزو توانایەك، ﴿قَٰدِرِينَ﴾ واتە: وایان دەزانی ئەوكارە دەكەن‌و دەتوانن. ﴿فَلَمَّا رَأَوْهَا قَالُوٓاْ إِنَّا لَضَآلُّونَ﴾ وەختێك چاویان پێدا گێڕا، وتیان: ڕێمان لێ تێكچووە، واتە: وەختێت ڕۆشتنە لای باخەكەو چاویان پێی كەوت كە چی بەسەر هاتووە وەك خودا فەرمووی كە ئەو هەموو جوانی‌و بەروبومی زۆرو میوە چاكەی تێدا بوو چۆن بووە بە خەڵوزو ڕەش بووە كەڵكی نەماوەو سودی لێ وەرناگرن. تێ گەیشتن‌و زانیان كە هەڵەیان كردوەو نەیان پێكاوە بۆیە وتیان ﴿إِنَّا لَضَآلُّونَ﴾ واتە: بەو شێوەیەی كە خودا ویستی نەڕۆیشتین لێمان تێكچوبوو. ئیبنو عەباس‌و كەسانی تریش وتویانە: پاشان پەشیمان بونەوە لەوەی كردبوویان، تێ گەیشتن‌و بۆیان دەركەوت كە هۆكەی ئەوەبوو شوكرانە بژێری ئەو بەهرەو چاكانەی خودایان نەكرد بۆیە وایان بەسەرهات ﴿بَلْ نَحْنُ مَحْرُومُونَ﴾ نەخێر ئێمە بەش براوین، واتە: بەڵێ ئەمە ئەوەبوو سوپاسی خوامان نەكرد بۆیە بێ بەش بووین. خودا دەفەرموێت: ﴿قَالَ أَوْسَطُهُمْ أَلَمْ أَقُل لَّكُمْ لَوْلَا تُسَبِّحُونَ﴾ بە ئاوزترینەكەیان وتی: ئەدی پێم نەووتن بۆ پەسنی پاكی خوا نادەن؟ ئیبنو عەباس‌و موجاهدو سەعیدی

[1] الطبری (٢٣/٥٤٤).

کوڕی جوبەیر و عیکرمەو محمدی کوڕی کەعبو ڕەبیعی(الربیع) کوڕی ئەنەس‌و زەحاک‌و (ضحاك) قەتادە وتیان: راست ترینیان‌و چاکترینیان[1] ﴿أَلَمْ أَقُل لَّكُمْ لَوْلَا تُسَبِّحُونَ﴾. موجاهدو سودی‌و ئیبنو جورەیج وتویانە ﴿لَوْلَا تُسَبِّحُونَ﴾ واتە: بۆ نالێن ئەگەر خودا حەزبکات[2] سودی وتی: انشاءالله ی ئەوان لەو کاتە سوپاس کردنی خودا بووە. ئیبنو جەریر وتی: ئەوە قسەی ئەو کەسەیە کە وتویەتی خودا حەزبکات[3] وتراوە واتە بە ئاوەزترینیان وتی پێم نەوتن گەر سوپاسی خوداتان بکردایە لە سەر ئەو بەهرەو چاکانەی کە خودای گەورە پێی دان. ﴿قَالُوا سُبْحَانَ رَبِّنَا إِنَّا كُنَّا ظَالِمِينَ﴾ وتیان ئێمە پەروەرندەی خۆمان بە پاک‌و بێ عەیب دەزانین، ئێمە ناهەقیمان کرد، پەشیمان بوونەوەو دانیان نا بەهەڵەی خۆیاندا کاتێت کە پەشیمانی سودی نەبوو بۆیە وتیان: ﴿إِنَّا كُنَّا ظَالِمِينَ ﴿٢٩﴾ فَأَقْبَلَ بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ يَتَلَاوَمُونَ﴾ ئەوسا ڕقیان کردە یەکترو سەرکۆنەی یەکتریان دەکرد. واتە: سەرزەنشتی یەکتریان دەکرد لەسەر ئەو یارمەتی نەدانەی هەژاران لەو میوەو بەروبومەی دەیانویست بیڕنن (لێی کەنەوە) لە باخەکەیان. وەڵامی یەکتریان دەدایەوە دانیان دەنا بە تاوان‌و هەڵەکانی خۆیانداو دەیانوت هەروەکو خودا دەفەرموێت: ﴿قَالُوا يَا وَيْلَنَا إِنَّا كُنَّا طَاغِينَ﴾ وتیان: هەی ماڵ وێران خۆمان ئێمە هەڵەڕۆییمان کرد، واتە: ئێمە هەڵەڕۆییمان کردو سەرپێچیمان کردو لە ڕێگا لاماندا تا گرفتار بووین چ گرفتارێک. وە دەفەرموێت: ﴿عَسَىٰ رَبُّنَا أَن يُبْدِلَنَا خَيْرًا مِّنْهَا إِنَّا إِلَىٰ رَبِّنَا رَاغِبُونَ﴾ بەڵکو پەروەرندەمان لەوە چاکترمان بداتێت، ئومێدمان هەر بە پەروەرندەی خۆمانە، وتراوە: بەتەما بوون هەر لە دنیا خودا لەوە چاکتریان بداتێت، وە وتراوە: بەتەما بوون لە ڕۆژی دوایدا خودا پاداشتیان بداتەوە والله اعلم. هەندێك لە پێشینەکان (السلف) وتویانە کە ئەمانە خەڵکی (یەمەن) بوون، سەعدی کوڕی جوبەیر وتی: خەڵکی دێیەك بوون پێیان وتووە (زەروان_ضروان) کە شەش میل لە سەنعاوە دوورە، وە وتراویشە: خەڵکی حەبەشە بوون باوکیان ئەم باخەی بۆ بەجێ هێلاون وە لە ئەهلی کیتابیش بوون، باوکیان بەشێوەیەکی چاك ئەو باخەی دەبرد بەڕێوە ئەوەی لەو باخەدا بەدەستی دەهێنا پێویستی خۆی لێ تەواو دەکردو بژێوی ساڵێکی خێزانەکەی لێ دادەناو ئەوەی کە دەمایەوە دەی کرد بە خێرو دابەشی دەکرد بەسەر هەژاراندا. وەختێك مرد بوو بە ماڵی کوڕەکانی‌و وتیان: باوکمان نەزان‌و بێ عەقڵ بووە کە هەندێکی دابەش دەکرد بەسەر هەژاراندا. ئەگەر نەمان هێشتایە هەمووی بۆ خۆمان دەمایەوە،

---

[1] الطبري (٢٣/٥٥٠)، الدر المنثور (٨/٢٥٢).

[2] الطبري (٢٣/٥٥١)، الدر المنثور (٨/٢٥٣).

[3] الطبري (٢٣/٥٥٠).

کاتێك کە ویستیان وابکەن خودا تۆڵەکەی لێ سەندن‌و هیچیان بۆ نەمایەوە خودای گەورە هەمووی لەناوبرد بە سەروبەرەوە نە ماڵەکە ماو نە قازانج، نە خێرو چاکەی بۆ هەژاران. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿كَذَٰلِكَ ٱلْعَذَابُ وَلَعَذَابُ ٱلْآخِرَةِ أَكْبَرُ لَوْ كَانُوا۟ يَعْلَمُونَ﴾ ئازاری (دونیا) ئاوایە گەر بزانن، بێ گومان ئازاری دوارۆژ دژوارترە. ﴿كَذَٰلِكَ ٱلْعَذَابُ﴾ واتە: ئاوایە ئازاری ئەو کەسانەی بێ گوێی فەرمانی خودا دەکەن‌و ڕەزیل‌و پیسکەن ئەو بەهرەو چاکانەی خودا پێی داون بەشی هەژاران‌و داماوانی لێ نادەن لەباتی ئەوەی سوپاسی خودا بکەن خودانەناسی دەکەن ﴿وَلَعَذَابُ ٱلْآخِرَةِ أَكْبَرُ لَوْ كَانُوا۟ يَعْلَمُونَ﴾ واتە: ئەمە ئازارو سزای دنیایە کە گوێتان لێ بوو ئازارو جەزرەبەی دوارۆژ قورسترو دژوارترە.

﴿إِنَّ لِلْمُتَّقِينَ عِندَ رَبِّهِمْ جَنَّٰتِ ٱلنَّعِيمِ ﴿٣٤﴾ أَفَنَجْعَلُ ٱلْمُسْلِمِينَ كَٱلْمُجْرِمِينَ ﴿٣٥﴾ مَا لَكُمْ كَيْفَ تَحْكُمُونَ ﴿٣٦﴾ أَمْ لَكُمْ كِتَٰبٌ فِيهِ تَدْرُسُونَ ﴿٣٧﴾ إِنَّ لَكُمْ فِيهِ لَمَا تَخَيَّرُونَ ﴿٣٨﴾ أَمْ لَكُمْ أَيْمَٰنٌ عَلَيْنَا بَٰلِغَةٌ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ إِنَّ لَكُمْ لَمَا تَحْكُمُونَ ﴿٣٩﴾ سَلْهُمْ أَيُّهُم بِذَٰلِكَ زَعِيمٌ ﴿٤٠﴾ أَمْ لَهُمْ شُرَكَآءُ فَلْيَأْتُوا۟ بِشُرَكَآئِهِمْ إِن كَانُوا۟ صَٰدِقِينَ ﴿٤١﴾﴾

## پاداشتی خۆپارێزان وەك پاداشتی بەدکاران نابێت

خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ لِلْمُتَّقِينَ عِندَ رَبِّهِمْ جَنَّٰتِ ٱلنَّعِيمِ﴾ بۆ ئەوانەی خۆ پارێزن لەلایەن پەروەردەی خۆیان باغاتی پڕ خۆشی هەیە. وەختێك خودا باسی حاڵ‌و گوزەرانی ئەوانەی کرد کە لە دنیا باغیان هەبوو سوپاسی خودایان نەکردو بەشی هەژارانیان نەدا خودا بەڵای بۆ ناردن باغەکەی سوتاندن‌و لەناوی بردن بەهۆی ئەو بێ گوێی‌و سەرپێچیانەوە کە کردیان. لێرەدا باسی ئەو خواناسانەمان بۆ دەکات کە گوێڕایەڵی فەرمانی خودایان کردووە و خۆیان پاراستووە کە لە دوارۆژدا باغاتی پڕ لە میوەو ڕازاوە لە هەموو بەروبومێك بۆیان ئامادەکراوە کە هەرگیز لەناوناچێت‌و کەم ناکات‌و دوایی نایات هەتا هەتایە تێیدا دەمێننەوە. پاشان فەرموویەتی: ﴿أَفَنَجْعَلُ ٱلْمُسْلِمِينَ كَٱلْمُجْرِمِينَ﴾ ئاخۆ ئێمە باوەڕداران وەکو بەدکاران دادەنێین؟ واتە: ئایا پاداشتی باوەڕداران‌و بەدکاران وەك یەك دەدەینەوە؟ نەخێر سوێند بە پەروەردەی ئاسمان و زەمین. بۆیە فەرموویەتی ﴿مَا لَكُمْ كَيْفَ تَحْكُمُونَ﴾ چیتانە؟ چۆن ئەو بڕیارە دەدەن. واتە: چۆن وا دەزانن‌و بڕیاری وا دەدەن؟ پاشان خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿أَمْ لَكُمْ كِتَٰبٌ فِيهِ تَدْرُسُونَ﴾ ئاخۆ کتێبێکتان هەیە کە لەوێدا دەیخوێننەوە، ئایا پەڕاوێکتان لەبەردەستایە لەئاسمانەوە هاتبێتەخوارەوە بیخوێننەوە کاری پێبکەن کە پێشینەکانتان لە پاشینەکانتانیانی وەرگرتبێت ئەو فەرمان‌و بڕیارانەی تێدابێت! وەك خۆتان ئەڵێن؟. ﴿إِنَّ لَكُمْ فِيهِ لَمَا تَخَيَّرُونَ﴾ هەرچی خۆتان دەتانەوێت تێیدا هەیە؟. ﴿أَمْ لَكُمْ أَيْمَٰنٌ عَلَيْنَا بَٰلِغَةٌ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ إِنَّ لَكُمْ لَمَا

تَحۡكُمُونَ ﴾ واته: یان سوێندێکتان لەسەرمانە کە هەتا ڕۆژی قیامەت هەرچیتان دەوێت ئەوە بێت؟ واتە: ئاخۆ پەیمانو سوێندێکتان لەئێمە وەرگرتووە؟.﴿إِنَّ لَكُمۡ لَمَا تَحۡكُمُونَ ﴾ واته: یا بەم زوانە هەرچیتان دەوێت ئارەزوتا لێیە وەدەستی دێنن. ﴿ سَلۡهُمۡ أَيُّهُم بِذَٰلِكَ زَعِيمٌ ﴾ لێیان بپرسە کێ دەستە بەری ئەم کارەیە؟ واته: پێیان بڵێ کێ لەم کارە بەرپرسەو گرتویەتیە ئەستۆی خۆی؟. ئیبنو عەباس وتی: کامیان بەرپرسی ئەم کارەیە.[١] ﴿ أَمۡ لَهُمۡ شُرَكَآءُ فَلۡيَأۡتُواْ بِشُرَكَآئِهِمۡ إِن كَانُواْ صَٰدِقِينَ ﴾ یان چەند شەریکێکیان هەیە؟. ئەگەر ڕاستن، با شەریکەکانیان بێنن، واته: لەبتەکانو شەریکەکان.

﴿يَوۡمَ يُكۡشَفُ عَن سَاقٖ وَيُدۡعَوۡنَ إِلَى ٱلسُّجُودِ فَلَا يَسۡتَطِيعُونَ ﴿٤٢﴾ خَٰشِعَةً أَبۡصَٰرُهُمۡ تَرۡهَقُهُمۡ ذِلَّةٞۖ وَقَدۡ كَانُواْ يُدۡعَوۡنَ إِلَى ٱلسُّجُودِ وَهُمۡ سَٰلِمُونَ ﴿٤٣﴾ فَذَرۡنِي وَمَن يُكَذِّبُ بِهَٰذَا ٱلۡحَدِيثِۖ سَنَسۡتَدۡرِجُهُم مِّنۡ حَيۡثُ لَا يَعۡلَمُونَ ﴿٤٤﴾ وَأُمۡلِي لَهُمۡۚ إِنَّ كَيۡدِي مَتِينٌ ﴿٤٥﴾ أَمۡ تَسۡـَٔلُهُمۡ أَجۡرٗا فَهُم مِّن مَّغۡرَمٖ مُّثۡقَلُونَ ﴿٤٦﴾ أَمۡ عِندَهُمُ ٱلۡغَيۡبُ فَهُمۡ يَكۡتُبُونَ ﴿٤٧﴾﴾

## ترس و سامناکی ڕۆژی سەلا (قیامەت)

کاتێك خودای گەورە باسی پارێزەرانی کرد کە ئەوان لە بەهەشتو خۆشیداو ڕونی کردوەتەوە ئەوە کەی دەبێتو ڕودەداتو. فەرموویەتی:﴿يَوۡمَ يُكۡشَفُ عَن سَاقٖ وَيُدۡعَوۡنَ إِلَى ٱلسُّجُودِ فَلَا يَسۡتَطِيعُونَ ﴾ ئەو ڕۆژە (کە لەتاوان) دەرپێ دەلینگان دەکەونو پێیان دەڵێن سوژدە بەنو ناتوانن، واتە: لەڕۆژی (قیامەت) ئەو ڕۆژەی کە ترسو بیمێکی زۆر و ناڕەحەتیو زەمین لەرزەو بەڵای گەورە ڕودەداتو تاقی کردنەوە دەست پێ دەکات. بوخاری ڕیوایەتی کردووە ئا لێرەدا لە ئەبو سەعیدی خدریەوە وتی: بیستم لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) دەی فەرموو: (پەروەرندەمان ڕانی خۆی دەر دەخا هەموو پیاو و ژنێکی خاوەن باوەڕ سوژدەی بۆ دەبات. ئەوانەی کە لە دونیا بەڕوبینی (بە ڕیا) لەبەر خەڵك سوژدەیان بردووە دەیانەوێت سوژدە بەن پشتیان ڕەق دەبێتو دەبێتە یەك پارچە، واتە: ناچەمێتەوە ڕێك دەوەستێت. ئەم فەرموودەیە لەهەردوو سەحیحەکەدا هێنراوە وە جگە لەمانیش لەزۆر ڕێگاوە بە وشەی تریش هاتووە لە فەرموودەیەکی درێژی مەشهورا.[٢] خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿خَٰشِعَةً أَبۡصَٰرُهُمۡ تَرۡهَقُهُمۡ ذِلَّةٞۖ وَقَدۡ كَانُواْ يُدۡعَوۡنَ إِلَى ٱلسُّجُودِ وَهُمۡ سَٰلِمُونَ﴾ چاو دادەخەنو زەبوونی دایاندەگرێت، ئەمانە ئەوساکە لەش ساغ بوون، پێیان وتراوە سوژدە بەرن، واتە: لە دوارۆژدا بەهۆی تاوان کاریو خۆبەزل زانینیان لە دنیادا سەر شۆڕو زەبونو داماون. کاتێك لە دنیا پێیان دەوتن سوژدە بەرن بۆ

---

[١] الطبری (٥٥٤/٢٣).

[٢] فتح الباری (٥٣١/٨/٥٣٢)، مسلم (١٦٧/١).

خودا کە لەش ساغو تەندروست بوون سوژدەیان نەدەبرد بۆیە بەو شێوەیە سزا دەدرێنو پشتیان ڕەق دەبێتو ناتوانن سوژدە ببەن لە ڕۆژی دوایدا. وەختێك خودای گەورە خۆی دەردەخات هەموو خاوەن باوەڕان سوژدە دەبەن خودانەناسو دووڕووەکان ناتوانن سوژدە ببەن بەڵکو پشتیان دەبێت بەیەك تەبەق کاتێك هەرکەسێکیان بیەوێت سوژدە ببات بە پشتا دەکەوێت بە پێچەوانەی سوژدەبردنەوە وەك چۆن لە دونیادا بە پێچەوانەی خاوەن باوەڕانەوە دەجوڵانەوەو ڕەفتاریان دەکرد، بۆ ئەوکەسانەی باوەڕ بەم قورئانە ناکەن. پاشان خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَذَرْنِي وَمَن يُكَذِّبُ بِهَٰذَا ٱلْحَدِيثِ سَنَسْتَدْرِجُهُم مِّنْ حَيْثُ لَا يَعْلَمُونَ﴾ تۆ من بێڵە بۆ ئەوانەی بەم قورئانە باوەڕ ناکەن، کەم کەم بۆیان شل دەکەم، کە هەر خۆشیان هەستی پێ نەکەن. واتە: قورئان، ئەمە هەڕەشەیەکی زۆر گەورەیە واتە: لێم گەڕێن منو ئەویان وتووە باش ئاگام لێیەتی چۆن بەری بۆ شل دەکەم (ماوەی دەدەم) کە درێژە بدات بە خراپەکاری وە مۆڵەتی دەدەمو پاشان دەیگرم بە گرتنێکی زۆر توندو بەهێز. بۆیە فەرموویەتی: ﴿سَنَسْتَدْرِجُهُم مِّنْ حَيْثُ لَا يَعْلَمُونَ﴾ کە خۆشیان پێی نەزانن هەتا وادەزانن کە ڕێزیان لێ گیراوە لەلای خوداوە کەچی بە پێچەوانەوە لە ڕاستیدا ڕسواکردنە بۆیان، وەك خودا دەفەرموێت: ﴿أَيَحْسَبُونَ أَنَّمَا نُمِدُّهُم بِهِۦ مِن مَّالٍ وَبَنِينَ ﴿٥٥﴾ نُسَارِعُ لَهُمْ فِى ٱلْخَيْرَٰتِ ۚ بَل لَّا يَشْعُرُونَ﴾[1] واتە: ئاخۆ ئەوان پێیان وایە ئێمە کە بەماڵو کوڕان یارمەتیان دەدەین هەر بۆ ئەوەیەکە پەلەمانە لە چاکە لەگەڵ کردنیان؟ نەخێر، ئەمانە نەزانن. وە دەفەرموێت: ﴿فَلَمَّا نَسُوا۟ مَا ذُكِّرُوا۟ بِهِۦ فَتَحْنَا عَلَيْهِمْ أَبْوَٰبَ كُلِّ شَىْءٍ حَتَّىٰٓ إِذَا فَرِحُوا۟ بِمَآ أُوتُوٓا۟ أَخَذْنَٰهُم بَغْتَةً فَإِذَا هُم مُّبْلِسُونَ﴾[2] واتە: جا کاتێك لە بیریان چۆیەوە ئەوەی کەپێی ئامۆژگاری کران دەرگای هەموو شتێکمان لەسەر کردنەوە تاکاتێك دڵخۆش بوون بەوەی پێیان درابوو لەناکاودا تۆڵەمان لێ سەندن ئیتر ئەوانیش نائومێدو سەرگەردان بوون. بۆیە لێرەدا دەفەرموێت: ﴿وَأُمْلِى لَهُمْ ۚ إِنَّ كَيْدِى مَتِينٌ﴾ مەوداو ماوەشیان پێدەدەم، فێڵم زۆر بەڕێو جێیە، واتە: مۆڵەتیان دەدەمو چاوەڕوانیان دەکەمو دوایان دەخەم کارەکانیشم زۆر لە جێگای خۆیەتی. بۆیە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ كَيْدِى مَتِينٌ﴾ واتە: زۆر گەورەو بەهێزە بۆ ئەو کەسانەی بێ فەرمانی من دەکەنو باوەڕ بە پێغەمبەرەکان ناکەن (ﷺ) و خراپە دەکەن و گوێی نادەنێ. لە هەردوو سەحیحەکەدا و لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: (خوای گەورە مۆڵەتی ستەمکار دەدات هەتا کاتێك دەیگرێتو ئیتر دەربازبوونی بۆ نیە)

---

[1] المؤمنون (٥٥_٥٦).

[2] الانعام (٤٤).

پاشـان ئـەم ئایەتـەی خوێنـد: ﴿وَكَذَٰلِكَ أَخْذُ رَبِّكَ إِذَآ أَخَذَ ٱلْقُرَىٰ وَهِىَ ظَٰلِمَةٌ إِنَّ أَخْذَهُۥٓ أَلِيمٌ شَدِيدٌ﴾[1] واتە: ئا بەو شێوەیە سزادانی پەروەردگارت کاتێك خـەڵکی شارەکان سـزا دەدات کـە سـتەمکار بـوون بەڕاستی تۆڵـە سـەندنی ئـەو ئـازاردەر و بەتینـە.[2] وە خـودا دەفـەرمووێت: ﴿أَمْ تَسْـَٔلُهُمْ أَجْرًا فَهُم مِّن مَّغْرَمٍ مُّثْقَلُونَ﴾ ئاخۆ تۆ کرایەی کارت لە وان دەوێت، کە لەژێر بـاری دەرنەچـن؟ ﴿أَمْ عِندَهُمُ ٱلْغَيْبُ فَهُمْ يَكْتُبُونَ﴾ یان ڕوپەڕەی نهێنیەکانیان لەلایەو لەبەری دەنوسنەوە؟. لە سـورەتی تـوردا (الطـور) ماناکـەی لێك دراوەتەوە بەڕوونی. تۆ ئـەی محمد (ﷺ) بانگیان دەکەی بۆ لای خودا بەبێ ئەوەی داوای هـیچ پـارەو پولێکیان لێ بکەیت، بەڵکو پاداشتەکەیت لای خودا دەوێت کەچـی ئـەوان بـاوەڕ بـەوە ناکـەن تـۆ بـۆت هێناون بە نەفامیو دژایەتیو خودانەناسی خۆیان.

﴿فَٱصْبِرْ لِحُكْمِ رَبِّكَ وَلَا تَكُن كَصَاحِبِ ٱلْحُوتِ إِذْ نَادَىٰ وَهُوَ مَكْظُومٌ ﴿٤٨﴾ لَّوْلَآ أَن تَدَٰرَكَهُۥ نِعْمَةٌ مِّن رَّبِّهِۦ لَنُبِذَ بِٱلْعَرَآءِ وَهُوَ مَذْمُومٌ ﴿٤٩﴾ فَٱجْتَبَٰهُ رَبُّهُۥ فَجَعَلَهُۥ مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٥٠﴾ وَإِن يَكَادُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَيُزْلِقُونَكَ بِأَبْصَٰرِهِمْ لَمَّا سَمِعُوا۟ ٱلذِّكْرَ وَيَقُولُونَ إِنَّهُۥ لَمَجْنُونٌ ﴿٥١﴾ وَمَا هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ لِّلْعَٰلَمِينَ ﴿٥٢﴾﴾

**فەرماندان بە خۆڕاگریو پەلەنەکردن وەك یونس پێغەمبەر( سەلامی خودای لێ بێت )**

خودای گـەورە فەرموویـەتی:﴿فَٱصْبِرْ لِحُكْمِ رَبِّكَ وَلَا تَكُن كَصَاحِبِ ٱلْحُوتِ إِذْ نَادَىٰ وَهُوَ مَكْظُومٌ﴾ دەسـا تـۆ هەر بۆ فەرمانی پەروەردەت خـۆ ڕاگریـە وەك هـاوڕێ ی نەهەنگەکە مەبە کە لەداخانـدا هـەر پیشی دەخواردەوەو ئەوسا کە دەپاڕایەوە، ﴿فَٱصْبِرْ﴾ واتە: ئـەی محمد (ﷺ) لەسەر سزادانی قەومەکەت کە باوەڕت پێ ناکەن بەمزوانە خودا تۆڵـەیان لێ دەسـێنێت بـۆت دوارۆژ هـەر بـۆ تـۆ و شـوێنکەوتوانتە لـە دونیاو لە ڕۆژی قیامەتدا ﴿وَلَا تَكُن كَصَاحِبِ ٱلْحُوتِ﴾ واتە: (ذالنـون) کـە ئـەویش یونسی کـوڕی مەتایـە (علیە السلام) کاتێك ڕقی هەڵسا لە قەومەکەی بەجێی هێشتن، ئەوەی بەسەری هات کاتێك کـە سـواری کەشتیەکە بوو نەهەنگ هەڵی لوشی (قوتی دا) بەناو تاریکایيو شەپۆلی دەریاکاندا بـردی وە گـوێی لـە دەریاو ئەوانەشی کە تیایدا بوون تەسبیحاتی خودایان دەکـرد ئـەو خودایـەی ویستی هەرشـتێك بکـات کەسێك ناتوانێت ڕێگری لێ بکات. لەو کاتەدا لەو تاریکایـەدا هـاواری کـردو پاڕایـەوە وتـی: ﴿أَن لَّآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنتَ سُبْحَٰنَكَ إِنِّى كُنتُ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾[3] واتە: (ئەی خوا) بەڕاستی هـیچ پەرسـتراوێك نییـە

---

[1] هود (١٠٢).

[2] فتح الباری (٢٠٥/٨)، مسلم (١٩٩٧/٤).

[3] الانبیاء (٨٧).

جگە لە تۆ پاکیو بێگەردی بۆ تۆیە بێگومان من لە ستەمکاران بووم. خوای گەورە فەرمووی: ﴿ فَٱسْتَجَبْنَا لَهُۥ وَنَجَّيْنَٰهُ مِنَ ٱلْغَمِّ ۚ وَكَذَٰلِكَ نُـۨجِى ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾[1] واتە: ئێمەش نزاوهاواری ئەومان گیرا کردولەخەمو خەفەت ڕزگارمانکرد هەروەاش ئیمانداران ڕزگار دەکەین. وە دەفەرمووێت: ﴿ فَلَوْلَآ أَنَّهُۥ كَانَ مِنَ ٱلْمُسَبِّحِينَ (١٤٣) لَلَبِثَ فِى بَطْنِهِۦٓ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ ﴾[2] واتە: خۆ ئەگەر بەڕاستی ئەولە یادکارانی (خودا) نەبووایە، تا ڕۆژی زیندووکردنەوە لەناوسکی ئەو(نەهەنگەدا) دەمایەوە. لێرداخودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿إِذْ نَادَىٰ وَهُوَ مَكْظُومٌ﴾ ئیبنو عەباسو موجاهدو سودی وتیان:﴿مَكْظُومٌ﴾ دڵ گران بوو[3] (ناڕەحەت بوو) بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿لَّوْلَآ أَن تَدَٰرَكَهُۥ نِعْمَةٌ مِّن رَّبِّهِۦ لَنُبِذَ بِٱلْعَرَآءِ وَهُوَ مَذْمُومٌ﴾ ئەگەر میهرەبانیەك لەلایەن پەروەردگاریەوە فریای نەکەوتایە فڕێ دەدرایە دەشتێکی ڕووتەن، وە بەدناو دەبوو). ﴿فَٱجْتَبَٰهُ رَبُّهُۥ فَجَعَلَهُۥ مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ﴾ ئەوسا پەروەرندەی، ئەوی هەڵبژاردو کردی بەیەك لە پیاو خاسان. ئیمامی احمد ڕیوایەتی کردووە لە عبدالله وە وتی: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (هیچ کەسێك بۆی نیە بڵێت من لە یونسی کوڕی مەتا چاکترم)[4] بوخاریش ڕیوایەتی کردووە.[5] ئەم فەرموودەیە لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە لە ئەبو هورەیرەوە[6].

## پێکانی چاو ڕاستە

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَإِن يَكَادُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَيُزْلِقُونَكَ بِأَبْصَٰرِهِمْ لَمَّا سَمِعُوا۟ ٱلذِّكْرَ وَيَقُولُونَ إِنَّهُۥ لَمَجْنُونٌ﴾ وەختێك خودانەناسەکان قورئانیان بیست هەر خەریك بوو بە چاوانیان هەڵت دێرن، دەشیا وت بێ گومان ئەو شێتە. ئیبنو عەباسو موجاهدو کەسانی تریش وتیان: ﴿لَيُزْلِقُونَكَ﴾ واتە: هەڵتدێرن یا بت خلیسکێنن[7]، ﴿بِأَبْصَٰرِهِمْ﴾ بە چاویان چاوت لێ بکەن واتە: بەغیلیت پێ دەبەن ئەوەندە کینەیان لێتە ئەگەر پاراستنو یارمەتی خودای گەورە نەبووایە بۆت، ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە پێکانی

---

[1] الانبياء (٨٨).

[2] الصافات (١٤٣_١٤٤).

[3] الطبري (٢٣/٥٦٣)

[4] احمد (١/٣٩٠) فەرمودەیەکی سەحیحە.

[5] فتح الباري (٦/٥١٩).

[6] فتح الباري (٨/١٤٤)، مسلم (٤/١٨٤٦).

[7] الطبري (٢٣/٥٦٤/٥٦٥).

چاو ڕاستە کاری خۆی دەکات بە فـەرمانی خـوای گـەورە وەك چـۆن لـە فـەرموودەی زۆرەوە ڕیوایـەت کراوەو لە چەند ڕێگای جیا جیاوە.

**فەرموودەی بورەیدەی کوڕی حوسەیب ـ الحُصیب ـ (ڕەزای خوای لیٚ بێت)**

ئەبو عبداللە ی کوڕی ماجە ڕیوایەتی کـردووە لـە بورەیـدەی کـوڕی حوسـەیبەوە (الحُصیب) وتـی: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (نوشتەکردن تەنها بۆ چاوپیسیو گەستنی گیانداری ژەهـراوی یـە)[1] وە هەر بەم شێوەیە ئیبنو ماجە ڕیوایەتی کردوە وە موسلم لە سەحیحەکەیدا هێناویەتی لە بورەیدەوە بـە مەوقوفی (موقوفاً) ئەمیش بەسەر هاتێکی تێدایـە.[2] ترمـذی بـەم شـێوەیە ڕیوایـەتی کـردووە[3] ئیمـامی بوخاریو ئەبوداودو ترمذی ئەم فەرموودەیان ڕیوایەت کردووە لە عمـران کـوڕی حوسـەینەوە (حُسین) بەمەوقوفی، (نوشـتەکردن تـەنها بـۆ چاوپیـسیو گەسـتنی گیانـداری ژەهـراوی یـە)[4] موسـلم ڕیوایـەتی کردوە لە سـەحیحەکەیدا لـە ئیبنـو عەباسـەوە ئـەویش لەپێغەمبـەرەوە (ﷺ) فـەرمووی: (چاوپیـسی ڕاستە ئەگەر شتێك پێش چارەنوس بکەوتایە چاو پێشی دەکەوت (ئەگەر خـەڵکتان بـە چـاوەوە کـرد) داوای خۆشۆردنیان لیٚ کردن خۆتان بشۆن)[5] مسلم خۆی هێناویەتی بوخاری لەگەڵ نیـە. وە لـە ئیبنـو عەباسەوە وتی: پێغەمبەر(ﷺ) پـەنای دەگرت بـە خـودا بـۆ حەسـەنو حوسـەین دەیفـەرموو: (پـەنا دەگرم بە وشە تەواوەکانی خودا لە هەموو شەیتانێكو گەستنی گیانـداری ژەهـراویو چـاو پیـسێك) وە دەفەرمووێت: (هەر بەم شێوەیە ئیبراهیم پـەنای دەگـرت بـە خـودا بـۆ ئیسحاقو ئیساعیل (سـەلامی خودایان لیٚ بێت) بوخاریو زانایانی تری فەرموودە هێناویانە[6].

**فەرموودەی ئەبی ئومامەی ئەسعدی کوڕی سەهلی کوڕی حونەیف**

ئیبنو ماجە ڕیوایەتی کـردووە لـە ئـەبی ئومامـە ئەسـعدی کـوڕی حونەیفـەوە وتـی: عـامری کـوڕی ڕەبیعە تێپەڕی بە لای سەهلی کوڕی حونەیف خۆی ئەشۆرد عـامر وتـی: ڕۆژێـك وەك ئـەمڕۆم نـەدیوەو پێستی داپۆشراوی واشم نەدیووە، زۆری پیٚ نەچوو سەهلی دا بە ئەرزداو بیٚ هۆش کـەوت هێنایـان بـۆ لای پێغەمبـەر(ﷺ) پێیـان وت: کەسـەهلیان بینـی کـەوتووە. فـەرمووی: گومانتـان لـە کێیـە وای پـیٚ کردووە؟ وتیان: عامری کوڕی ڕەبیعە، فەرمووی: (لەبەرچی کەسێك لە خۆتان بـرای خـۆی دەکوژێـت؟

---

[1] ابن ماجة (١١٦١/٢) فەرمودەیەکی سەحیحە.

[2] مسلم (١٩٩/١).

[3] تحفة الاحوذی (٢١٧/٦) فەرموودەیەکی سەحیحە.

[4] فتح الباری (١٦٣/١٠)، ابو داود (٢١٣/٤)، تحفة الاحوذی (٢١٧/٦).

[5] مسلم (١٧١٩/٤/٤).

[6] فتح الباری (٤٧٠/٦)، ابو داود (١٠٤/٥)، تحفة الاحوذی (٢٢٠/٦)، النسائی فی الکبری (٢٥٠/٦)، ابن ماجة (١١٦٤/٢).

وەختێك كەسێكتان شتێكی بینی بە برایەكیەوە سەرنجی ڕاكێشا با داوا بكات لە خودا بۆی زیاد بكات) پاشان داوای ئاوی كرد فەرمانی دابە عامر كە دەست نوێژ بگرێتو دەموچاو و هەردوو دەستی بشوات تا ئانیشكیو هەردوو ئەژنۆی (وە جلو بەرگەكەی پێ خستە ناو جامێكەوەو فەرمانی دا ئاوی جامەكە لە دوایەوە لار بكەنەوە. سوفیانو موعەمەر وتی: لە زوهەریەوە (الزهری) پاشان فەرمووی ئاوی جامەكەی لە دواوە پیابكەن)[1] نەسائی ڕیوایەتی كردوە لە چەند ڕێگایەكەوە لە ئەبو ئومامەوە كە ئاوی جامەكەی لە دواوە لاركەنەوە[2].

### فەرموودەی ئەبو سەعیدی خودری

ئیبنو ماجە ڕیوایەتی كردووە لە سەعیدی خودریەوە وتی: پێغەمبەر(ﷺ) پەنای دەگرت بە خودا لە چاوی جنۆكەو مرۆڤ، كاتێك ﴿قُلۡ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلۡفَلَقِ ﴾ و ﴿قُلۡ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ ﴾ هاتە خوارەوە ئەم دوو سورەتەی دەخوێند و وازی لە شتی تر هێنا.[3] ترمذی و نەسائی ڕیوایەتیان كردوەو ترمذی وتی: فەرمودەیەكی چاكە (حسن)[4].

### فەرموودەیەكی تر لە ئەبی سەعیدەوە

ئیمامی احمد ڕیوایەتی كردووە لە ئەبی سعیدەوە كە جوبرائیل هاتە لای پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئازارت هەیە ئەی محمد (ﷺ)؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (بەڵێ) جبرائیل فەرمووی: (بەناوی خودا نوشتەت بۆ دەخوێنم لە هەمووشتێك كە ئازارت بدات و لە شەڕی هەموو دەرون نەخۆشێكو لە هەموو چاوێكی پیسیش، خودا شیفات بدات بەناوی خوداوە نوشتەو دوعات بۆ دەخوێنم)[5] موسلمو زانایانی فەرموودە ڕیوایەتیان كردوە جگە لە ئەبو داود.[6] دووبارە ئیمامی احمد ڕیوایەتی كردوە لە ئەبی سەعیدو جابری كوڕی عبداللهوە كە پێغەمبەر(ﷺ) ئازاری هەموو جبرائیل هاتە لای فەرمووی: (بەناوی خودا نوشتەت بۆ دەكەم لە هەموو شتێك كە ئازارت دەداتو لە هەموو حەسودو چاو پیسێك خودا شیفات بدات)[7].

---

[1] سنن ابن ماجة (٣٥٠٩) فەرموودەیەكی سەحیحە.

[2] النسائی فی الكبری (٧٦١٧/٧٦١٩) فەرموودەیەكی سەحیحە.

[3] ابن ماجة (١١٦١/٢) فەرموودەیەكی حەسەنە سەنەدەكانیشی سەحیحە.

[4] تحفة الاحوذی (٢١٨/٦)، النسائی (٢٧١/٨) فەرومودەیەكی حەسەنە سەنەدەكانیشی سەحیحە.

[5] احمد (٥٦/٢٨/٣) فەرمودەیەكی سەحیحە.

[6] مسلم (١٧١٨/٤)، تحفة الاحوذی ( ٤٦/٤)، النسائی فی الكبری (٢٤٩/٦)، ابن ماجة (١١٦٤/٢).

[7] احمد (٧٥/٥٨/٣) فەرموودەیەكی سەحیحە.

**فەرموودەی ئەبی هورەیرە ( ڕەزای خوای لێ بێت )**

ئیمامی احمد ڕیوایەتی کردوە لە ئەبی هورەیرەوە ئەویش لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرمووی: (بێ گومان چاو ڕاستە)[1] بوخاریو موسلم هێناویانە[2] وە ئیبنو ماجە ڕیوایەتی کردوە لە ئەبو هورەیرەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (چاو پیسی ڕاستە)[3] تەنها ئیبنو ماجە ڕیوایەتی کردووە.

**فەرموودەی ئەسمای ( أسماء ) کچی عومەیس**

ئیمامی احمد ڕیوایەتی کردووە لە عبیدی کوڕی ڕفاعەی زەرەقیەوە(الزرقی) وتی: ئەسما وتی ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) بنەماڵەی جەعفەر چاویان لێ کراوە دوعایان بۆ بکەم؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (بەڵێ ئەگەر شتێك کێ بڕکێی قەدەری بکردایە چاو پێشی دەدایەوە)[4] وە هەر بەم شێوەیە ترمذی و ئیبنو ماجەو نەسائی ڕیوایەتیان کردووە[5] ترمذی وتی: چاكو ڕاستە (حسن صحيح)[6].

**فەرموودەی عائیشە ( ڕەزای خوای لێ بێت )**

ئیبنو ماجە ڕیوایەتی کردووە لە عائیشەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی پێ کردووە کە دوعا بکات لەبەر چاو پیسی.[7] بوخاری ڕیوایەتی کردوەو موسلیمش هێناویەتی.[8]

**فەرمودەی سەهلی کوڕی حونەیف ( حُنيف )**

ئیمامی احمد ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو ئومامەی کوڕی سەهلی کوڕی حونیف (حنيف) کە باوکی بۆی گێڕاوەتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) دەرچوو بەرەو (مەککە) ئەمانیش لەگەڵی ڕۆیشتن هەتا گەیشتە شیوی خەراز (شعب الخرار) لە شوێنێکە پێی دەڵێن جەحەفە (الجحفة) سەهلی کوڕی حونەیف خۆی شۆرد پیاوێکی سپیو لەشو پێستێکی چاكو جوانی هەبوو عامری کوڕی ڕەبیعە تەماشای کرد وتی: ڕۆژێك وەك ئەمڕۆم نەدیوەو پێستی داپۆشراوی واشم نەدیووە سەهل کەوتو بێ هۆش بوو هێنایان بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) وترا بە پێغەمبەر(ﷺ) ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئاخۆ چی دەفەرموویت لە بارەی سەهلەوە، بە خودا سەر بەرزناکاتەوە ئاگای لە خۆی نیە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (ئاخۆ گومان دەبەن کەسێك وای لێ کردبێت؟) وتیان: عامری کوڕی ڕەبیعە تەماشای کردووە،

---

[1] احمد (٣١٩/٢) فەرموودەیەکی سەحیحە.

[2] فتح الباري (٢١٣/١٠)، مسلم (١٧١٩/٤).

[3] ابن ماجه (١١٥٩/٢) فەرموودەیەکی سەحیحە.

[4] احمد (٤٣٨/٦) فەرموودەیەکی حەسەنی سەحیحە.

[5] تحفة الاحوذي (٢١٩/٦)، ابن ماجة (١١٦٠/٢) فەرموودەیەکی حەسەنی سەحیحە.

[6] تحفة الاحوذي (٢٢٠/٦)، النسائي في الكبرى (٣٦٥/٤) فەرموودەیەکی حەسەنی سەحیحە.

[7] ابن ماجه (١١٦١/٢) فەرموودەیەکی سەحیحە.

[8] فتح الباري (٢١٠/١٠)، مسلم (١٧٢٥/٤).

پێغەمبەر(ﷺ) ناردی بەشوێنیدا نیگەران بوو لێی فەرمووی: (لەسەرچی کەسێك لە ئێوە برای خۆی دەکوژێت، خۆزگە کاتێك ئەو شتەت بینیو سرنجی ڕاکێشای دوعای خێرت بکردایە، پاشان فەرمووی خۆت بشۆرە بۆی، دەموچاو و هەردوو دەستی تا ئانیشکی هەردوو ئەژنۆو ئەملاو لای قاچی شۆڕیو جلو بەرگەکەی خستە ناو تەشتێك پاشان ئەو ئاوەی کرد بەسەریدا پیاوێك ئەو ئاوەی کرد بەسەرو پشتی سەهل دا لە دوایەوە پاشان تەشتەکەی بەدوایدا لارکردەوە کە ئەمەی کرد سەهل لەگەڵ خەڵکەکە کەوتەڕێ هیچ ئازارێکی نەما[1] واتە تای تیدا نەما.

**فەرموودەی عامری کوڕی ڕەبیعە**

ئیمامی احمد لە موسنەدەکەیدا ڕیوایەتی کردووە لە عبداللە ی کوڕی عامرەوە وتی: عامری کوڕی ربیعەو سەهلی کوڕی حونەیف ڕۆشتن ویستیان خۆیان بشۆن، وتی ڕۆشتن بەشوێن پەنایەکدا کە دیارنەبن‌و خۆیان بشۆن، وتی عامر جبەیەکی (جبة) خوری لەبەردابوو داینا‌و منیش سەیرم کرد بۆم ڕوانی‌و چاوم لێ کرد چووە ناو ئاوەکە خۆی بشوات، وتی: گوێم لە دەنگێك بوو لە ناو ئاوەکەدا هاتمە لای سێ جار بانگم کرد وەڵامی نەدایەوە، ڕۆشتم بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) هەواڵم دایە وتی: هات‌و ڕۆشتە ناو ئاوەکە من لەو کاتەدا سەیری هەردوو سپیایی ڕانیم دەکرد، وتی: بە دەستی دای بەسینەیداو (سنگ) پاشان فەرمووی: (ئەی خودایە گەرماو سەرماو ئێشی‌و ئازاری لابەرە) وتی: هەڵساو پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (کاتێك کە کەسێکتان شتێکی بینی لە برایەکیدا یان لە خۆیدا یان لە سامانیدا (ماڵیدا) سرنجی ڕاکێشا با دوعای خێر بکات بێگومان چاو پیسی ڕاستە)[2].

**لێدانی خودانەناسان‌و وەلام دانەوەیان**

خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَيَقُولُونَ إِنَّهُۥ لَمَجْنُونٌ﴾ دەشیانوت شێتە، واتە: چاوی لێ دەکەن‌و بە قسەش ئازاری دەدەن‌و دەڵێن شێتە، واتە: کە ئەم قورئانەی هێناوە. خوای گەورەش فەرموویەتی: ﴿وَمَا هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ لِّلْعَالَمِينَ﴾ کەئەم قورئانە هەر بیرەوەریەکیشە بۆهەموو خەڵکی دنیا.

---

[1] احمد (٣/٤٨٦) ئەم فەرموودەیە سەنەدەکانی سەحیحە.

[2] احمدی (٣/٤٤٧) فەرموودەیەکی سەحیحە.

## تەفسیری سورەتی (الحاقه)

## لە مەککە هاتووەتەخوارەوە

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿ٱلۡحَآقَّةُ ﴿١﴾ مَا ٱلۡحَآقَّةُ ﴿٢﴾ وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا ٱلۡحَآقَّةُ ﴿٣﴾ كَذَّبَتۡ ثَمُودُ وَعَادُۢ بِٱلۡقَارِعَةِ ﴿٤﴾ فَأَمَّا ثَمُودُ فَأُهۡلِكُواْ بِٱلطَّاغِيَةِ ﴿٥﴾ وَأَمَّا عَادٞ فَأُهۡلِكُواْ بِرِيحٖ صَرۡصَرٍ عَاتِيَةٖ ﴿٦﴾ سَخَّرَهَا عَلَيۡهِمۡ سَبۡعَ لَيَالٖ وَثَمَٰنِيَةَ أَيَّامٍ حُسُومٗاۖ فَتَرَى ٱلۡقَوۡمَ فِيهَا صَرۡعَىٰ كَأَنَّهُمۡ أَعۡجَازُ نَخۡلٍ خَاوِيَةٖ ﴿٧﴾ فَهَلۡ تَرَىٰ لَهُم مِّنۢ بَاقِيَةٖ ﴿٨﴾ وَجَآءَ فِرۡعَوۡنُ وَمَن قَبۡلَهُۥ وَٱلۡمُؤۡتَفِكَٰتُ بِٱلۡخَاطِئَةِ ﴿٩﴾ فَعَصَوۡاْ رَسُولَ رَبِّهِمۡ فَأَخَذَهُمۡ أَخۡذَةٗ رَّابِيَةً ﴿١٠﴾ إِنَّا لَمَّا طَغَا ٱلۡمَآءُ حَمَلۡنَٰكُمۡ فِي ٱلۡجَارِيَةِ ﴿١١﴾ لِنَجۡعَلَهَا لَكُمۡ تَذۡكِرَةٗ وَتَعِيَهَآ أُذُنٞ وَٰعِيَةٞ ﴿١٢﴾﴾

### ئاگادار کردنەوە لەسەر گەورەیی ڕۆژی سەلا (قیامەت)

خودای گەورە دەفـەرمووێت: ﴿ٱلۡحَآقَّةُ﴾ کارەساتەکە ڕوودەدا. ﴿مَا ٱلۡحَآقَّةُ﴾ کـام کارەسـات؟.﴿وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا ٱلۡحَآقَّةُ﴾ تۆ چوزانی ئەو کارەساتە چلۆنە؟ ﴿ٱلۡحَآقَّةُ﴾ یەکێکە لە ناوەکانی ڕۆژی قیامـەت چـونکە لە ڕۆژی قیامەتدا ئەو پەیمان‌و بەڵێنانە کە خودا بڕیاری داوە دێتە جیٚ‌و ڕوودەدات. وە دەفـەرمووێت: ﴿كَذَّبَتۡ ثَمُودُ وَعَادُۢ بِٱلۡقَارِعَةِ﴾ ثمود و عاد ڕوداوە دڵکوتەکەیان بەدرۆ دانا. پاشان خـودای گـەورە باسـی لەناو چون‌و قڕبوونی ئەو گەلانە دەکات کە ڕۆژی قیامەتیان بـەدرۆ دەزانـی خـودایش فـەرمووی: ﴿فَأَمَّا ثَمُودُ فَأُهۡلِكُواْ بِٱلطَّاغِيَةِ﴾ هۆزی ثمود بە نەعرەتێکی بیٚ وێنە قڕانیان کرد. دەنگێکی وەها گـەورە کـە بێدەنگی کردن‌و بومەلەرزەیەکی وەها کشووماتی کردن. هەر بەم شێوەیە قەتادە وتی: (الطاغية) واتـە نەعرەتەیەکی بیٚ وێنـە.[1] موجاهـد وتـی: ﴿الطاغيـة﴾ واتـە تاوانـەکان، ڕەبیعـی کـوڕی ئەنـەس‌و ئیبنـو زەیدیش هەروایان وتووە واتە: تاوانەکان. وە ئیبنو زەید ئەم ئایەتەی خوێند ﴿كَذَّبَتۡ ثَمُودُ بِطَغۡوَىٰهَآ﴾[2] واتە: بڕوای نەهێنا هۆزی ثمود بەهۆی سەرکەشیانەوە. خودا فەرموویـەتی: ﴿وَأَمَّا عَادٞ فَأُهۡلِكُواْ بِرِيحٖ صَرۡصَرٍ عَاتِيَةٖ﴾ هەرچی هۆزەکەی عادیش بـوو. بـە بایـەکی هـەرە بـەهێز لەبـەین چـوون.﴿صَرۡصَرٍ﴾ واتە: زۆر سارد. قەتادەو سودی‌و ڕەبیعی کوڕی ئەنەس‌و سـەوری (الثـوری) وتویانـە: ﴿عَاتِيَةٖ﴾ واتـە:

[1] الطبری (٥٧١/٢٣).

[2] الشمس (١١).

زۆر بەهێز، قەتادە وتی: بایەکی زۆر بەهێزیان بۆ هات دڵیانی هەڵتەکاند[1] واتە دڵی دەرهێنان. زەحاك (ضحاك) وتی: ﴿صَرۡصَرٍ﴾ واتە زۆر سارد، ﴿عَاتِيَةٍ﴾ واتە زۆر بەهێزو بێ بەزەیی‌و بێ خێر[2] علی‌و کەسانی تریش وتویانە: بایەکی بەهێزی وا کەهەرچیان بوو لەناوچوو هیچی نەما.[3] ﴿سَخَّرَهَا عَلَيۡهِمۡ سَبۡعَ لَيَالٖ وَثَمَٰنِيَةَ أَيَّامٍ حُسُومٗا فَتَرَى ٱلۡقَوۡمَ فِيهَا صَرۡعَىٰ كَأَنَّهُمۡ أَعۡجَازُ نَخۡلٍ خَاوِيَةٖ﴾ ماوەی حەوت شەو و هەشت ڕۆژان، بەبێ وچان، ناردیە سەریان لەوماوەدا بە مردوویی کە ونبوون دەتوت کۆتەرەی دارخورمای ناو زراون. ﴿سَخَّرَهَا عَلَيۡهِمۡ﴾ واتە: ناردیە سەریان. ﴿سَبۡعَ لَيَالٖ وَثَمَٰنِيَةَ أَيَّامٍ حُسُومٗا﴾ واتە: تەواو بەبێ وچان‌و شوم بوو بێ خێر. ئیبنو مەسعودو ئیبنو عەباس‌و موجاهدو عەکرمەو سەوری‌و (الثوری) کەسانی تریش وتویانە: ﴿حُسُومٗا﴾ بێ وچان[4] لە عیکرمەو ڕەبیعی کوڕی خوشەیم (خشیم) وتیان: واتە بای بێ خێر (شوم) لە سەریان. وەك خودا دەفەرموێت: وتراوە: ئەوی کە خەڵکی ناویان دەبرد بە کۆتەرەی ڕزی ناوبۆش، خەڵکی ئەم ناوەیان وەرگرتبوو لەم ئایەتەوە کە خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَتَرَى ٱلۡقَوۡمَ فِيهَا صَرۡعَىٰ كَأَنَّهُمۡ أَعۡجَازُ نَخۡلٍ خَاوِيَةٖ﴾ ئیبنو عەباس وتی: ﴿خَاوِيَةٖ﴾ واتە تێك چوو، کەسانی تر وتویانە کەوتوو فڕێدراو واتە: ڕەشەبا دابووی بە زەویدا بەسەردا کەوتبوو بە مردوی سەری شکابوو بە سەریەکداو لاشەکەی کەوتبوو وەك کۆتەرە دارێك چۆن لق‌و گەڵاکانی لێ کرابێتەوەو کەوتبێت. لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرموویەتی: (یارمەتی درام بە بای ڕۆژهەڵات عادیش قڕبوون بە بای ڕۆژئاوا)[5] واتە: بایەك لە ڕۆژ ئاواوە هەڵبکات پێی دەڵێن ڕەشەبای ڕۆژئاوا (الدبور). وە خودا دەفەرموێت: ﴿فَهَلۡ تَرَىٰ لَهُم مِّنۢ بَاقِيَةٖ﴾ ئاخۆ ئەتۆ پاشماوەیەکیان دەبینیت؟، ئایا تۆ کەسێکیانت چاو پێ دەکەوێت کە مابێتەوە کە بڵێی من کەسی ئەوانم؟ نەخێر تۆویان بڕاو کەسیان لەسەر زەمیندا نەما. پاشان خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَجَآءَ فِرۡعَوۡنُ وَمَن قَبۡلَهُۥ وَٱلۡمُؤۡتَفِكَٰتُ بِٱلۡخَاطِئَةِ﴾ فیرعەونیش و ئەوانەی بەر لەویش بوون‌و مەردمی شارە ژێراو ژێرکراوەکانیش، خەتایان کرد قافی (قبله) بە مەکوری خوێندراوەتەوە، واتە: لەلای فیرعەون لەو کاتەدا لە شوێن کەوتوەکانی لە قیبتیە (القبط) خودانەناسەکان. وە هەندێکی تر بە مەفتوحی

---

[1] الطبری (٢٣/٥٧٢).
[2] الطبری (٢٣/٥٧٢).
[3] الطبری (٢٣/٥٧٢).
[4] الطبری (٢٣/٥٧٣/٥٧٤).
[5] مسلم (٢/٦١٧).

خوێندویانەتەوە، واتە: ئەوانەی پێش لە فیرعەون لەو گەلانەی کە وەك ئەو بوون. ﴿وَٱلۡمُؤۡتَفِكَٰتُ﴾ ئەو گەلانەی باوەڕیان بەو پێغەمبەرانە (ﷺ) نەدەکردو هەڵ دەستان بە کرداری خراپو باوەڕیان نەبوو بەوەی خودا دەینارده خوارەوە. ڕەبیع ﴿بِٱلۡخَاطِئَةِ﴾ گوناه کردن. موجاهد وتی: واتە تاوانەکان[1] بۆیە خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَعَصَوۡاْ رَسُولَ رَبِّهِمۡ فَأَخَذَهُمۡ أَخۡذَةٗ رَّابِيَةً﴾ دژایەتی پێغەمبەری (ﷺ) پەروەردەی خۆیان کرد ئەوسا گرتنی بەگرتنێکی زۆر سەخت، واتە: هەموو باوەڕیان بەو پێغەمبەرانە نەکرد کە خودا بۆی ڕەوانە کردن. وەك خودا فەرموویەتی: ﴿كُلّٞ كَذَّبَ ٱلرُّسُلَ فَحَقَّ وَعِيدِ﴾[2] واتە: هەر هەموویان باوەڕیان نەهێنا بە پێغەمبەرەکانیان بۆیە هەڕەشەی (من لە دژیان) هاتەدی. هەر کەسێك باوەڕی بە پێغەمبەرێك نەبێت ئەوە باوەڕی بەهەموو پێغەمبەران نیە وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿كَذَّبَتۡ قَوۡمُ نُوحٍ ٱلۡمُرۡسَلِينَ﴾[3] واتە: گەلی نوح (علیە سەلام) پێغەمبەرانیان بە درۆزن دانا (بروایان پێ نەکردن). ﴿كَذَّبَتۡ عَادٌ ٱلۡمُرۡسَلِينَ﴾[4] واتە: گەلی عاد پێغەمبەرانی (خوا) یان بە درۆزن دانا (باوەڕیان پێ نەکردن). ﴿كَذَّبَتۡ ثَمُودُ ٱلۡمُرۡسَلِينَ﴾[5] واتە: گەلی ثمود پێغەمبەرانیان بە درۆزن زانی. هەموو گەلێك پێغەمبەرێکی بۆ ڕەوانە کراوە بۆیە خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَعَصَوۡاْ رَسُولَ رَبِّهِمۡ فَأَخَذَهُمۡ أَخۡذَةٗ رَّابِيَةً﴾ واتە: گەورەو بەهێزو بەئازار. موجاهد وتی: ﴿رَّابِيَةً﴾ واتە بەهێز،[6] سودی وتی لەناوبەر.

### وەبیرخستنەوەی چاکەی کەشتی

پاشان خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِنَّا لَمَّا طَغَا ٱلۡمَآءُ حَمَلۡنَٰكُمۡ فِي ٱلۡجَارِيَةِ﴾ بەڕاستی ئێمە کاتێك کە ئاو (ی تۆفان) سەرکەوت (باپیزەکانی) ئێوەمان هەڵگرت لە کەشتی دا. واتە: لافاو هات (هەڵسا) بە فەرمانی خودا بەسەر زەمیندا بەرز بووە. ئیبنو عەباسو کەسانی تریش وتیان: ﴿طَغَا ٱلۡمَآءُ﴾ واتە زۆر بوو.[7] بەهۆی دوعاکەی نوحەوە (علیه السلام) کە کردی لەگەلەکەی کاتێك کە باوەڕیان پێ نەدەکردو

[1] الطبری (٢٣/٥٧٦).
[2] ق (١٤).
[3] الشعراء (١٠٥).
[4] الشعراء ١٢٣).
[5] الشعراء (١٤١)
[6] الطبری(٢٣/٥٧٧)
[7] الطبری (٢٣/٥٧٧).

دژایەتیان دەکرد بتیان دەپەرست خودا دوعاکەی لێ وەرگرتو تۆفانو لافاو سەر زەمینی داپۆشیو جگە لەوانەی کە لەگەڵ نوح پێغەمبەر دابوون لە کەشتیەکەدا. وەخەڵکی هەموو لە بنەماڵەی نوح (علیه السلام) و لە نەوەکانی (وەچەکانی) بوون. بۆیە خوای گەورە لێرەدا منەتی کردووە بەسەر مەردماو فەرموویەتی: ﴿إِنَّا لَمَّا طَغَا ٱلْمَآءُ حَمَلْنَٰكُمْ فِى ٱلْجَارِيَةِ﴾ ئەو کەشتیەی کە بەسەر ئاودا دەگەڕا. وە فەرموویەتی: ﴿لِنَجْعَلَهَا لَكُمْ تَذْكِرَةً وَتَعِيَهَآ أُذُنٌ وَٰعِيَةٌ﴾ تابیکەینە بیرهێرەوە بۆ ئێوەو ئەو گوێیانەی کە خاوەن هەستن وەری بگرن، واتە: بۆمان هێشتنەوە لە هاوشێوەی ئەو کەشتیە کە سواری ببن لەسەر شەپۆلی ئاو لە ناو دەریادا وە خودا دەفەرمووێت: ﴿وَجَعَلَ لَكُم مِّنَ ٱلْفُلْكِ وَٱلْأَنْعَٰمِ مَا تَرْكَبُونَ ﴿١٢﴾ لِتَسْتَوُۥا۟ عَلَىٰ ظُهُورِهِۦ ثُمَّ تَذْكُرُوا۟ نِعْمَةَ رَبِّكُمْ إِذَا ٱسْتَوَيْتُمْ عَلَيْهِ﴾[1] واتە: وەکەشتیو ولآخی بۆ فەراهەم هێناون کە سواریان دەبن، بۆ ئەوەی سواری پشتیان بن لە پاشان بیر لە بەهرەی پەروەردگارتان بکەنەوە کاتێك سواریان بوون. وە فەرموویەتی: ﴿وَءَايَةٌ لَّهُمْ أَنَّا حَمَلْنَا ذُرِّيَّتَهُمْ فِى ٱلْفُلْكِ ٱلْمَشْحُونِ ﴿٤١﴾ وَخَلَقْنَا لَهُم مِّن مِّثْلِهِۦ مَا يَرْكَبُونَ﴾[2] واتە: وەبەڵگەیەکی ئاشکرای تر بۆ ئەوان ئەمەیە کە بێگومان ئێمە نەوەکانی ئەوانمان لە کەشتی پڕ کراو (لەخۆیانو کەلو پەلیان) دا هەڵگرتوە، وە بەوێنەی کەشتی شتانێکی تریشمان بۆ دروست کردون کە سواری بن. قەتادە وتی: خودا ئەم کەشتیەی هێشتەوە هەتا پێشینەکانی ئەم ئوممەتە بینیانو پێی گەیشتن.[3] ئاشکراتر ڕاوبۆچونی یەکەمە بۆیە خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿وَتَعِيَهَآ أُذُنٌ وَٰعِيَةٌ﴾ واتە: ئەو گوێیانەی لەسەر هەستن تێدەگەن لەم چاکەیەوە وەری دەگرن. ئیبنو عەباس وتی: لە بیری ناچێتەوەو گوێی لێ دەگرێت،[4] قەتادە وتی: ﴿أُذُنٌ وَٰعِيَةٌ﴾ ئەوەی خودا عەقڵی پێ دابێت کەڵکی وەرگرتووە لە وەی کە گوێی لێ بووە لە کتێبی خودا. زەحاك (ضحاك) وتی: ﴿وَتَعِيَهَآ أُذُنٌ وَٰعِيَةٌ﴾ ئەو گوێیانەی خاوەن هەستن وەری دەگرن، واتە: ئەوکەسەی گوێی چاكو عەقڵی تەواوی هەبێت، وە ئەمە بۆ هەموو کەسێکە کە تێبگاتو شت وەربگرێت.

[1] الزخرف (١٢– ١٣).

[2] يس (٤١_٤٢).

[3] الطبری (٥٧٨/٢٣).

[4] الطبری (٥٧٩/٢٣).

﴿فَإِذَا نُفِخَ فِي ٱلصُّورِ نَفْخَةٌ وَٰحِدَةٌ ﴿١٣﴾ وَحُمِلَتِ ٱلْأَرْضُ وَٱلْجِبَالُ فَدُكَّتَا دَكَّةً وَٰحِدَةً ﴿١٤﴾ فَيَوْمَئِذٍ وَقَعَتِ ٱلْوَاقِعَةُ ﴿١٥﴾ وَٱنشَقَّتِ ٱلسَّمَآءُ فَهِيَ يَوْمَئِذٍ وَاهِيَةٌ ﴿١٦﴾ وَٱلْمَلَكُ عَلَىٰٓ أَرْجَآئِهَا ۚ وَيَحْمِلُ عَرْشَ رَبِّكَ فَوْقَهُمْ يَوْمَئِذٍ ثَمَٰنِيَةٌ ﴿١٧﴾ يَوْمَئِذٍ تُعْرَضُونَ لَا تَخْفَىٰ مِنكُمْ خَافِيَةٌ ﴿١٨﴾﴾.

## باسی نارەحەتیەکانی ڕۆژی قیامەت

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَإِذَا نُفِخَ فِي ٱلصُّورِ نَفْخَةٌ وَٰحِدَةٌ﴾ ئینجا کاتێت فووکرایە کەڕەنادا بە تاقە فووکردنێك. خودای بەدەستەڵات باسی نارەحەتیەکانی ڕۆژی قیامەتمان بۆ دەکات یەکەم نارەحەتی فووە ترسناکەکەیە کە بەدوایدا ئەو فووەیە کە هەرچی لە ئاسمانەکان زەمیندایە هەمووی دەمرێت مەگەر ئەوەی خودا خۆی حەز بکات بمێنێت. پاش ئەمە فووی هەڵسانەوە لە بەردەم پەروەرندەی هەموو جیهانو زیندوو بونەوەو کۆبونەوەو کە ئەمە ئەو فووەیە (النفخە) و لێەدات تەئکید دەکاتەوە کە تەنها جارێکە چونکە فەرمانی خودایە کەس ناتوانێت بیّ گوێی بکاتو نەهێڵێت وەپێویستی بە دووبارە کردنەوە نیە. بۆیە خودا لێرەدا فەرموویەتی: ﴿وَحُمِلَتِ ٱلْأَرْضُ وَٱلْجِبَالُ فَدُكَّتَا دَكَّةً وَٰحِدَةً﴾ وە زەویو شاخەکان هەڵگیران بەجارێك دران بەیەکدا (وە تەخت کران)، واتە: تەختو سارا دەبێتەوە وە ئەم زەمینە دەگۆڕێت بە زەمینێکی تر ﴿فَيَوْمَئِذٍ وَقَعَتِ ٱلْوَاقِعَةُ﴾ سا ئەو ڕۆژە بەسەرهاتەکە ڕوودەدا، واتە: قیامەت هەڵدەستێت (دێت) وە دەفەرموێت: ﴿وَٱنشَقَّتِ ٱلسَّمَآءُ فَهِيَ يَوْمَئِذٍ وَاهِيَةٌ﴾ ئەم ئاسمانەش قڵیش دەباتو لەو ڕۆژەدا فەشەڵو بیّ کەڵکە، ئیبنو جورەیج (جريج) وتی: ئەم ئایەتە وەك ئەم ئایەتە وایە ﴿وَفُتِحَتِ ٱلسَّمَآءُ فَكَانَتْ أَبْوَٰبًا﴾[1] واتە: وە ئاسمان (لەهەموو لایەکەوە) کرایەوەو بوو بەدەرگا. ئیبنو عەباس وتی: کونی تیّ بووە، عەرشیش لێیەوە نزیکە. ﴿وَٱلْمَلَكُ عَلَىٰٓ أَرْجَآئِهَا ۚ وَيَحْمِلُ عَرْشَ رَبِّكَ فَوْقَهُمْ يَوْمَئِذٍ ثَمَٰنِيَةٌ﴾ وە فریشتەکان لەکەناری ئاسمان وە لەو ڕۆژەدا هەشت (فریشتە) تەختی پەروەردگاری تۆ هەڵ دەگرێت لە ژوور هەموو فریشتەکانی ترەوە. ﴿وَٱلْمَلَكُ﴾ ئیسمی جنسە (اسم الجنس) واتە: فریشتەکان لە چواردەوری (کەناری) ئاسماندان. ڕەبیعی کوڕی ئەنەس وتی: لەم ئایاتە ﴿وَٱلْمَلَكُ عَلَىٰٓ أَرْجَآئِهَا﴾ فریشتەکان بە وردی لە ئاسمانەوە سەیری خەڵکی سەر زەمین دەکەن. وە ئەم فەرموودەیەی خودا ﴿وَيَحْمِلُ عَرْشَ رَبِّكَ فَوْقَهُمْ يَوْمَئِذٍ ثَمَٰنِيَةٌ﴾ واتە: لە ڕۆژی قیامەتدا هەشت فریشتە تەختی پەروەرندەی تۆ هەڵدەگرن. وە ئەبو داود ڕیوایەتی کردووە لە کتێبەکەیدا لە جابری کوڕی

---

[1] النبأ (١٩).

عبداللهوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (ڕێم پێ درا کەباسی فریشتەیەك لەفریشتەکانی خودای گەورە بکەم لە هەڵگرانی تەخت (العرش) کە لە نێوانی نەرمایی گوێچکەی تا ناوشانی بە ئەندازەی حەوت سەد ساڵ ڕۆشتنە) ئەمە قسەی (وتەی) ئەبو داودە[1].

**نیشاندانی ئەوەی ئادەم (لە بەردەم خودای گەورە)**

خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿يَوْمَئِذٍ تُعْرَضُونَ لَا تَخْفَىٰ مِنكُمْ خَافِيَةٌ﴾ لەو ڕۆژەدا (لەبەردەمی خوادا) هەمووتان نیشان دەدرێن هیچ (کردەوەیەکی) پەنهانیتان بە نهێنی نامێنێتەوە، واتە: دەردەخرێن لەبەردەم ئەو کەسەی کە ئاگای لە پەنهانیو سرتەو ورتەتان هەیە کە هیچ شتێکی ئێوەی لا ون نابێت بەڵکو ئاگای لە هەموو پەنهانیو شاراوەو ئاشکرایەکتان هەیە. بۆیە فەرموویەتی: ﴿لَا تَخْفَىٰ مِنكُمْ خَافِيَةٌ﴾[2] واتە: دڵ خۆشن ئەوانەی کە بەدەستە ڕاست نامەکەیان دەدرێتیو خۆش گوزەرانن. ئیمامی احمد ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو موساوە وتی: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (خەڵکی لە ڕۆژی قیامەتدا سێ جار (پیشان دەدرێن) دوو جاریان کە پیشان دەدرێن بۆ گفتوگۆو پاکانە کردنو پەشیمان بونەوەیە جاری سێیەم لەو کاتەدا نامەکان پەرشو بڵاو دەبێتەوە بۆ ناو دەستەکان یەکێك بە دەستی ڕاست وەری دەگرێتو یەکێك بە دەستی چەپ وەری دەگرێت)[3] ئیبنو ماجە ڕیوایەتی کردووە[4] ترمذیش ڕیوایەتی کردووە[5].

﴿فَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَابَهُ بِيَمِينِهِ فَيَقُولُ هَاؤُمُ اقْرَءُوا كِتَابِيَهْ ﴿١٩﴾ إِنِّي ظَنَنتُ أَنِّي مُلَاقٍ حِسَابِيَهْ ﴿٢٠﴾ فَهُوَ فِي عِيشَةٍ رَّاضِيَةٍ ﴿٢١﴾ فِي جَنَّةٍ عَالِيَةٍ ﴿٢٢﴾ قُطُوفُهَا دَانِيَةٌ ﴿٢٣﴾ كُلُوا وَاشْرَبُوا هَنِيئًا بِمَا أَسْلَفْتُمْ فِي الْأَيَّامِ الْخَالِيَةِ ﴿٢٤﴾﴾

**دڵخۆشی ئەوانەی کە بەدەستی ڕاست نامەکەیان دەدرێتیو خۆش گوزەرانیان**

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَابَهُ بِيَمِينِهِ فَيَقُولُ هَاؤُمُ اقْرَءُوا كِتَابِيَهْ﴾ ئەوسا هەر کەسێك نامەی کردەوەی نرابێتە دەستی ڕاستی، دەڵێت: وەرن نامەکەی من بخوێننەوە. خودای گەورە هەواڵی خۆشبەختی ئەوانەمان دەداتێ کە بە دەستی ڕاستی نامەکەی درابێت لە ڕۆژی قیامەتداو دڵخۆشە بەو نامەیە کە لە خۆشیاندا بە هەر کەسێك دەگات دەڵێت: ﴿هَاؤُمُ اقْرَءُوا كِتَابِيَهْ﴾ واتە: فەرموون ئەمە نامەی

---

[1] ابو داود (٩٦/٥) ئەم فەرموودەیە سەنەدەکانی حەسەنە.

[2] الحاقه (١٨).

[3] احمد (٤١٤/٤) ئەلبانی وتی لە فەرموودە لاوازەکانی ئیبنو ماجەیە.

[4] ابن ماجة (١٤٣٠/٢) ئەلبانی وتی لە فەرموودە لاوازەکانی ئیبنو ماجەیە.

[5] تحفة الاحوذی (١١١/٧) ئەلبانی وتی لە فەرموودە لاوازەکانی ئیبنو ماجەیە.

منە بیخوێننەوە چونکە دەزانێت ئەوی کە تیایەتی هەموو خێرو چاکەیە لەوکەسانەیە کە خودا خراپەکانیشی گۆڕیوە بە چاکە بۆی عبدالرحمن کوڕی زەید وتی: ﴿هَآؤُمُ ٱقۡرَءُواْ كِتَٰبِيَهۡ﴾ واتە: (ها اقرؤ كتابية) وە (ؤم) زیادەیە. وادیارە کە(ؤم) بەواتای (هاکم)ە. ئیبنو ئەبی حاتم ڕیوایەتی کردووە لە عبدالله ی کوڕی حەنزەلەوە (حنظلة) ئەوەی کە فریشتە شۆردی (غسیل الملائکە) وتی: خودا بەندەی خۆی دەوەستێنێت لە ڕۆژی قیامەتدا خراپەکانی دەبینرێت واتە: دەردەکەوێت لە پشتی نامەکەیدا خودای گەورە دەفەرموویت پێی تۆ ئەمەت کردووە؟ دەڵێت بەڵێ، خودا دەفەرموویت پێی: من تاوانەکانت ئاشکرا ناکەم وە لە تاوانەکانیشت دەبورم ئا لەوێدا دەڵێت وەرن نامەکەی من بخوێننەوە ﴿إِنِّي ظَنَنتُ أَنِّي مُلَٰقٍ حِسَابِيَهۡ﴾ من سوور دەمزانی کە توشی لێ پرسینەوە هەردەبم، کاتێك ڕزگاری بوو لەو لێ پرسینەوەیە لە ڕۆژی قیامەتدا. وە لە فەرموودەی سەحیحدا هاتوە لە ئیبنو عومەرەوە کەپرسیاری لێ کرا لە سرتە کردن (النجوی) واتە: قسەکردن بەسوکیو بێ دەنگی وتی: بیستم لەپێغەمبەرەوە (ﷺ) دەیفەرموو: (خودا لە بەندەی نزیك دەبێتەوە دانی پێ دادەنێت بە تاوانەکانیدا هەتا وەختێك وادەبینێت کە تیاچووە خودای گەورە فەرمووی من تاوانەکانتم داپۆشیووە لە دنیاو ئەمڕۆش لێت دەبورم. پاشان نامەی چاکەکانی بە دەستی ڕاستی دەدرێتێت. بەڵام خوانەناسو دووڕو (المنافق) ئەوانەی کە دەیان ناسن دەڵێن ئەوانە ئەو کەسانەن کە درۆیان بۆ پەروەرندەیان هەڵدەبەست، (دەسا نەفرین - لەعنەتی - خوا لە ناهەقی کاران)[1] خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنِّي ظَنَنتُ أَنِّي مُلَٰقٍ حِسَابِيَهۡ﴾ واتە: من باوەڕی تەواوم بوو لە دنیا کە ئەم ڕۆژە دێتو گومانی تێدانیە. وەك خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿ٱلَّذِينَ يَظُنُّونَ أَنَّهُم مُّلَٰقُواْ رَبِّهِمۡ﴾[2] واتە: ئەوانەی کەپێیان وایە بێگومان بە خزمەت پەروەردگاریان دەگەن. وە فەرموویەتی: ﴿فَهُوَ فِي عِيشَةٖ رَّاضِيَةٖ﴾ ئیتر ئەو لە ناو ژیانێکی خۆشدایە، واتە لە ژیانێکی کامەراندایە. ﴿فِي جَنَّةٍ عَالِيَةٖ﴾ لە بەهەشتێکی بەرزایە. واتە: کۆشکەکانی بەرزن کیژەکانیشی سپیو دیمەن جوانن. خانوەکانی خۆشنو بە هەمیشەیی جێی خۆشگوزەرانین. لە فەرموودەی سەحیحدا هاتووە کە (بەهەشت سەد پلەیە نێوانی هەموو دوو پلەیەك وەك نێوانی ئاسمانو زەمینە).[3] خودا فەرموویەتی: ﴿قُطُوفُهَا دَانِيَةٞ﴾ کە میوەی نزیکە دەستە. بەرائی (البراء)

---

[1] احمد (٢/٧٤)، البخاری (٤٦٨٥)، مسلم (١٧٦٨).

[2] البقرة (٤٦).

[3] البخاری (٢٧٩٠).

کوڕی عازب وتی: واتە: میوەی نزیکە وا لەبەردەستدا بە پاڵکەوتوویی هەرکەسێك ئارەزوی لێ بێت[1] کەسانی تریش هەر وایان وتووە. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿كُلُوا۟ وَٱشْرَبُوا۟ هَنِيٓـًٔۢا بِمَآ أَسْلَفْتُمْ فِى ٱلْأَيَّامِ ٱلْخَالِيَةِ﴾ سا بخۆن و بخۆنەوە نۆشی گیانتان ئەمە بۆ ئەو کارانەیە کە لە ڕۆژانی ڕابوردوو کردووتانە، واتە: ئەمەیان پێ دەوترێت بۆ ڕێز لێ نانیان و چاکە لەگەڵ کردن و بەهرە پێدانیان. چونکە لە فەرموودەی سەحیحدا هاتووە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (کار بکەن و ڕاوەستاوبن نزیك بنەوە وە بشزانن هیچ کەسێك لە ئێوە بەکردەوەی خۆی ناچێتە بەهەشت) وتیان: تۆش ئەی پێغەمبەری خودا ناچیت؟ فەرمووی: (منش ناچم مەگەر خودا بە سۆزو بەزەیی خۆی دام بپۆشێت).[2]

﴿وَأَمَّا مَنْ أُوتِىَ كِتَـٰبَهُۥ بِشِمَالِهِۦ فَيَقُولُ يَـٰلَيْتَنِى لَمْ أُوتَ كِتَـٰبِيَهْ ﴿٢٥﴾ وَلَمْ أَدْرِ مَا حِسَابِيَهْ ﴿٢٦﴾ يَـٰلَيْتَهَا كَانَتِ ٱلْقَاضِيَةَ ﴿٢٧﴾ مَآ أَغْنَىٰ عَنِّى مَالِيَهْ ۜ ﴿٢٨﴾ هَلَكَ عَنِّى سُلْطَـٰنِيَهْ ﴿٢٩﴾ خُذُوهُ فَغُلُّوهُ ﴿٣٠﴾ ثُمَّ ٱلْجَحِيمَ صَلُّوهُ ﴿٣١﴾ ثُمَّ فِى سِلْسِلَةٍ ذَرْعُهَا سَبْعُونَ ذِرَاعًا فَٱسْلُكُوهُ ﴿٣٢﴾ إِنَّهُۥ كَانَ لَا يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ ٱلْعَظِيمِ ﴿٣٣﴾ وَلَا يَحُضُّ عَلَىٰ طَعَامِ ٱلْمِسْكِينِ ﴿٣٤﴾ فَلَيْسَ لَهُ ٱلْيَوْمَ هَـٰهُنَا حَمِيمٌ ﴿٣٥﴾ وَلَا طَعَامٌ إِلَّا مِنْ غِسْلِينٍ ﴿٣٦﴾ لَّا يَأْكُلُهُۥٓ إِلَّا ٱلْخَـٰطِـُٔونَ ﴿٣٧﴾﴾

### خراپی ژیانی ئەو کەسانەی کە نامەیان بە دەستی چەپ دەدرێتێ

خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَأَمَّا مَنْ أُوتِىَ كِتَـٰبَهُۥ بِشِمَالِهِۦ فَيَقُولُ يَـٰلَيْتَنِى لَمْ أُوتَ كِتَـٰبِيَهْ﴾ بەڵام کەسێك کە نامەکەی دەنێنە دەستی چەپیەوە، دەڵێ: خۆزگە نامەی خۆمم پێ نەدرایە. ئەمە دەنگو باسی ژیانی بەدبەختانە کاتێك هەر کەسێکیان لە ساحەی مەحشەردا (گۆڕەپانی قیامەت) نامەکەی بە دەستی چەپی دەدرێتێ لەوکاتەدا زۆر پەشیمانە چ پەشیمانییێك دەڵێت: وەك خودا فەرموویەتی: ﴿فَيَقُولُ يَـٰلَيْتَنِى لَمْ أُوتَ كِتَـٰبِيَهْ ﴿٢٥﴾ وَلَمْ أَدْرِ مَا حِسَابِيَهْ﴾ نەشم زانییایە دەربارەم چی تێدایە. ﴿يَـٰلَيْتَهَا كَانَتِ ٱلْقَاضِيَةَ﴾ خۆزگە مردنم یەکجاری بووایە. زەحاك (ضحاك) وتی: خوازیاری مردنیەتی و هەرگیز زیندوو نەبێتەوە. محمدی کوڕی کەعب و ڕەبیع و سودیش هەر وایان وتووە، قەتادە وتی: حەزی لە مردنە کە هیچ شتێك نەبووە لە دنیا لە مردن لە لای ناخۆشتر بووبێت.[3] ﴿مَآ أَغْنَىٰ عَنِّى مَالِيَهْ﴾ سامانم بەهرەی بۆم نەبوو. ﴿هَلَكَ عَنِّى سُلْطَـٰنِيَهْ﴾ دەستەڵاتم وا لەبەین چوو. واتە: ماڵ و سامان و دەستەڵات فریام نەکەوت لە سزاو جەزرەبەی پاراستم. بەڵکو بە تەنها مامەوە بەبێ یارمەتی دەرو پەنایە ئا لە وێدا خوای گەورە دەفەرموێت:

---

[1] الطبري (٢٣/٥٨٦).

[2] فتح الباري (١١/٣٠٠).

[3] الطبري (٢٣/٥٨٧).

﴿خُذُوهُ فَغُلُّوهُ﴾ سابیگرن‌و زنجیری بکەن. ﴿ثُمَّ الْجَحِيمَ صَلُّوهُ﴾ ئەوسا بۆ دۆزەخی ببەن. واتە: فەرمان دەدرێت بە گزیزەی جەهەننەم (الزبانية) کە بیگرن زنجیری کەن لە ساحەی مەحشەردا واتە: زنجیر بکەنە ملی‌و پاشان بەرەو دۆزەخ ڕای بکێشن بیخەنە ناوی، واتە بیبەنە خوارەوە لە جەهەننەمدا. وە دەفەرموێت: ﴿ثُمَّ فِي سِلْسِلَةٍ ذَرْعُهَا سَبْعُونَ ذِرَاعًا فَاسْلُكُوهُ﴾ پاشان لە ناو زنجیرێکی حەفتا گەزدا شەتەکی دەن‌و ڕای کێشن. کەعبی ئەحبار (كعب الاحبار) وتی: هەموو پێچێکی (حلقه) بە ئەندازەی ئاسنی دنیا دەبێت. عەوفی (العوفى) وتی: ئیبنو عەباس‌و ئیبنو جورەیج (جريج) وتیان: هەر پێچێکی بە ئەندازەی باڵی فریشتەیەکە[1] ئیبنو جورەیج وتی: ئیبنو عەباس وتی ﴿فَاسْلُكُوهُ﴾ لە قنگیەوە دەچێت‌و پاشان لە دەمیەوە دێتە دەر پاشان دەدرێت لە شیش وەك کولله کە دەدرێت لەشیش و دەبرژێت عەوفی وتی: لە ئیبنو عەباسەوە لە دوایەوە (دیره) دەبرێت‌و هەتا لە کونە لوتیەوە دێتە دەرەوە. بۆ ئەوەی کە لەسەر پێ ی هەڵ نەسێت.[2] ئیمامی احمد ڕیوایەتی کردوە لە عبدالله ی کوڕی عەمرەوە وتی: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (ئەگەر پارچەیەك قوڕقوشم بە ئەندازەی ئەمە (ئیشارەتی کرد بۆ کاسەی سەر) ڕەوانە بکرێت لە ئاسمانەوە بۆسەر زەمین، کە ئەو ماوەیە پێنج سەد ساڵ ڕێگایە، دەگاتە سەر زەمین پێش ئەوەی شەو دابێت، بەڵام ئەگەر لە سەری ئەو زنجیرەوە ڕەوانە بکرێت بە چل پایز دەڕوات بە شەو و بە ڕۆژ پێش ئەوەی بگاتە پیتی یا کۆتایی)[3] ترمذی هێناویەتی‌و وتی: ئەمە فەرمودەیەکی چاکە (هذا حديث حسن)[4] وە دەفەرموێت: ﴿إِنَّهُ كَانَ لَا يُؤْمِنُ بِاللَّهِ الْعَظِيمِ﴾ ئەو بڕوای بە خودای گەورە نەهێنا. ﴿وَلَا يَحُضُّ عَلَىٰ طَعَامِ الْمِسْكِينِ﴾ بۆناندان بە هەژارانیش هیچ کەسی نان نەدەدا. واتە: هەڵ ناسێت بەو هەقەی خودا کە لە سەریەتی لە گوێڕایەڵی‌و پەرستن وە بە سود نیە بۆ خەڵکی هەقی خۆیانیان ناداتێت. وە هەقی خودا بەسەر بەندەکانیەوە ئەوەیە کە بە تەنها بیپەرستن‌و هاوەڵی بۆ دانەنێن لە هیچ شتێکدا. وە هەقی بەندەکان بەسەر یەکەوە ئەوەیە کە چاکە لەگەڵ یەکتردا بکەن‌و یارمەتی یەکتر بدەن لەسەر چاکەو خودانەناس لەبەر ئەمە خودا فەرمانی داوە بە نوێژ کردن‌و زەکات دان. پێغەمبەر لە کاتی وەفاتیدا بوو دەیفەرموو: (نوێژو ئەوەی بووەتە موڵکی خۆتان)[5] واتە: هەقی

---

[1] الطبرى (٢٣/٥٨٩).

[2] الطبرى (٢٣/٥٨٩).

[3] احمد (٢/١٩٧) فەرموودەیەکی لاوازەو سەنەدەکانیشی لاوازە.

[4] تحفة الاحوذى (٧/٣١٣) تیرمیزی دەڵێ فەرموودەیەکی حەسەنە.

[5] النسائى فى الكبرى (٤/٢٥٨) فەرموودەیەکی سەحیحەو سەنەدەکانیشی سەحیحە.

نوێژ بدەن و هەقی ئەوانەش بدەن کە لە ژێر دەستتاندایە. خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿فَلَيْسَ لَهُ ٱلْيَوْمَ هَٰهُنَا حَمِيمٌ﴾ جا ئەمڕۆ لێرەداهیچ دۆستی نی یە. ﴿وَلَا طَعَامٌ إِلَّا مِنْ غِسْلِينٍ﴾ خواردن نیە مەگەر کێماوی جەهەننەمیەکان. ﴿لَّا يَأْكُلُهُۥٓ إِلَّا ٱلْخَٰطِـُٔونَ﴾ نایخۆن مەگەر خەتاکاران. واتە: ئەمڕۆ کەسێت نیە ڕزگاری بکات لە سزای خودا نە خزمو نە دۆستو نە تکاکارێك گوێ لە تکای بگرێت وە هیچ خواردنێك نیە جگە لە کێمو زوخاوی زامداران. قەتادە وتی: ئەوەش خراپترین خواردنی خەڵکی ناو ئاگرە.[1] ڕەبیعو زەحاك (ضحاك) وتیان: درەختێکە لە ناو جەهەننەمدا. شەبیبی (شبيب) کوڕی بشر وتی: لە عیکرمەوە ئەویش لە ئیبنو عەباسەوە وتی:﴿غِسْلِينٍ﴾ ئەو خوێنو ئاوەیە لە گۆشتەکانیان دێتە دەرەوە. علی کوڕی ئەبوتەلحە وتی: لە ابن عباسەوە﴿غِسْلِينٍ﴾ کێمو زوخاوی خەڵکی ئاگرە.

﴿فَلَآ أُقْسِمُ بِمَا تُبْصِرُونَ ۝٣٨ وَمَا لَا تُبْصِرُونَ ۝٣٩ إِنَّهُۥ لَقَوْلُ رَسُولٍ كَرِيمٍ ۝٤٠ وَمَا هُوَ بِقَوْلِ شَاعِرٍ ۚ قَلِيلًا مَّا تُؤْمِنُونَ ۝٤١ وَلَا بِقَوْلِ كَاهِنٍ ۚ قَلِيلًا مَّا تَذَكَّرُونَ ۝٤٢ تَنزِيلٌ مِّن رَّبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ۝٤٣﴾

### قورئان قسەی (کلامی) خودایە

خودای گەورە سوێند دەخوات بە دروست کراوەکانی بەوەی دەیبینن و بەوەی کە نایبینن کە نیشانەن (بەڵگەن) لەسەر تەواوی ناوەکانی خوداو سیفەتەکانی کە ئەم قورئانە قسەی خودایەو نیگای ئەوە کە ناردویەتی بۆ بەندەو پێغەمبەری خۆی کە هەڵی بژاردوە بۆ گەیاندنی و جێ بەجێ کردنی ئەو ئەمانەتەی کە داویەتی بەسەریدا. فەرموویەتی: ﴿فَلَآ أُقْسِمُ بِمَا تُبْصِرُونَ﴾ سا سوێند بەوشتەی دەیبینن.﴿وَمَا لَا تُبْصِرُونَ﴾ وە بەوەش کە ئێوە نایبینن.﴿إِنَّهُۥ لَقَوْلُ رَسُولٍ كَرِيمٍ﴾ ئەوە قسەی ڕاسپێراوێکی بەڕێزە واتە: محمد (ﷺ)، ئیزافەکە (اضافە) دراوەتە لای ئەو چونکە پێغەمبەر(ﷺ) ئیشەکەی گەیاندنە لەوکەسەوە کە بۆی دێنێت، وە لەبەرئەوەیە کە لە سورەتی تەکویردا (التكوير) ئیزافەکەی داوەتە پاڵ ڕاسپێراوی فریشتە ﴿إِنَّهُۥ لَقَوْلُ رَسُولٍ كَرِيمٍ ۝١٩ ذِى قُوَّةٍ عِندَ ذِى ٱلْعَرْشِ مَكِينٍ ۝٢٠ مُّطَاعٍ ثَمَّ أَمِينٍ﴾[2] واتە: بێگومان ئەو قورئانە گوفتاری ڕەوانەکراوێکی پایەبەرزە (کە فریشتەی سروشە)، بەهێزەو لای خاوەنی عەرش (خوای گەورە) خاوەن پایەیە، قسە ڕەوایە لە ناو فریشتەداو دەست پاکە. ئەمە جبرائیلە (علیه السلام) پاشان فەرموویەتی: ﴿وَمَا صَاحِبُكُم بِمَجْنُونٍ﴾[3] واتە: هاوڕێکەتان کە موحەممەدە (ﷺ) شێت

---

[1] الطبری (٢٣/٥٩١).

[2] التكوير (١٩_٢١).

[3] التكوير (٢٢).

نیە (وەك ئێوە دەڵێن) واتە محمد (ﷺ). ﴿وَلَقَدْ رَءَاهُ بِٱلْأُفُقِ ٱلْمُبِينِ﴾[1] واتە: سوێند بە خودا بێگومان (فریشتەی سروشی) دیووە لە ئاسۆی ڕووندا، واتە: محمد (ﷺ) جبرائیلی بینی لە سەر ئەو شێوەیەی کە خودا دروستی کردووە لەسەری. ﴿وَمَا هُوَ عَلَى ٱلْغَيْبِ بِضَنِينٍ﴾[2] واتە: وە ئەو ڕژدو چروك نی یە لەگەیاندنی سروشدا. ﴿وَمَا هُوَ بِقَوْلِ شَيْطَٰنٍ رَّجِيمٍ﴾[3] واتە: وە ئەو (قورئانە) قسەی شەیتانی دەرکراو لە بەزەیی خودا نی یە (وەك ئێوە دەڵێن). وە هەر بەم شێوەیە لێرەدا فەرموویەتی: ﴿وَمَا هُوَ بِقَوْلِ شَاعِرٍ قَلِيلًا مَّا تُؤْمِنُونَ﴾ وە ئەم (قورئانە) قسەی شاعیر نی یە، کەمتر باوەڕ دەهێنن. ﴿وَلَا بِقَوْلِ كَاهِنٍ قَلِيلًا مَّا تَذَكَّرُونَ﴾ وتەی فالگرەوەش نیە، زۆر کەم بیر دەکەنەوە. جارێك خودا گەیاندنەکە دەداتە پاڵ ڕاسپێراوی فریشتەو جارێکی تر دەیداتە پاڵ ڕاسپێراوی ئادەمی چونکە هەردوکیان ڕاگەیەنەرن لەلایەن خوداوە بەوەی پێی سپاردون لە قسەو نیگای خۆی. بۆیە خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿تَنزِيلٌ مِّن رَّبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾ (ئەم قورئانە) ناردراوەتە خوارەوە لە پەروەردەی گشت جیهانەوە.

﴿وَلَوْ تَقَوَّلَ عَلَيْنَا بَعْضَ ٱلْأَقَاوِيلِ ﴿٤٤﴾ لَأَخَذْنَا مِنْهُ بِٱلْيَمِينِ ﴿٤٥﴾ ثُمَّ لَقَطَعْنَا مِنْهُ ٱلْوَتِينَ ﴿٤٦﴾ فَمَا مِنكُم مِّنْ أَحَدٍ عَنْهُ حَٰجِزِينَ ﴿٤٧﴾ وَإِنَّهُۥ لَتَذْكِرَةٌ لِّلْمُتَّقِينَ ﴿٤٨﴾ وَإِنَّا لَنَعْلَمُ أَنَّ مِنكُم مُّكَذِّبِينَ ﴿٤٩﴾ وَإِنَّهُۥ لَحَسْرَةٌ عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٥٠﴾ وَإِنَّهُۥ لَحَقُّ ٱلْيَقِينِ ﴿٥١﴾ فَسَبِّحْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلْعَظِيمِ ﴿٥٢﴾﴾

**ئەگەر پێغەمبەر(ﷺ) هەندێك لە قسەکانی بەدەم خودا هەڵبەستایە بێگومان خودا جەزرەبەی دەدا**

خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَوْ تَقَوَّلَ عَلَيْنَا بَعْضَ ٱلْأَقَاوِيلِ﴾ واتە: ئەگەر بەدەم ئێمەوە هەندێك وتەی هەڵ ببەستایە واتە محمد (ﷺ) ئەگەر وەك ئەوان وا دەزانن پێغەمبەر(ﷺ) بە دەمی ئێمەوە قسەی هەڵبەستایە یاشتێکی لەخۆیەوە بوتایە بە ناوی ئێمەوە یا کەم یا زیادی بکردایە کەوایش نیە تۆڵەمان لێ دەسەندو سزامان دەدا. بۆیە خودا فەرموویەتی: ﴿لَأَخَذْنَا مِنْهُ بِٱلْيَمِينِ﴾ واتە: بێگومان ئێمە بە دەستی خۆمان تۆڵەمان لێ دەسەند. وتراوە واتە: تۆڵەمان لێ دەسەند بە دەستی ڕاست چونکە بەهێزترە لە تۆڵەدا. وە دەفەرموێت: ﴿ثُمَّ لَقَطَعْنَا مِنْهُ ٱلْوَتِينَ﴾ واتە: لە پاشان ڕەگی دڵیمان دەبڕی،

---

[1] التكوير (٢٣).

[2] التكوير (٢٤).

[3] التكوير (٢٥).

ئیبنو عەباس وتی: ڕەگی حەیات، ئەو ڕەگەی کە دڵی پێوە بەستراوە[١] هەروەها عیکرمەو سەعیدی کوڕی جوبەیرو حەکەمو (الحکم) قەتادەو زەحاك (الضحاك) و موسلمی بەتینو (مسلم البطين) ئەبو سەخر (أبو صخر) حەمیدی کوڕی زیاد وتویانە.[٢] محمدی کوڕی کەعب وتی: دڵو بۆڕییو ڕەگەکانی[٣] وە دەفەرمووێت: ﴿فَمَا مِنكُم مِّنْ أَحَدٍ عَنْهُ حَاجِزِينَ﴾ واتە: هیچ کەسێکتان ناتوانێت بێتە لەمپەر (بەرگر) لەنێوان ئێمەو ئەوا ئەگەر بمانەوێت شتێکی پێ بکەین لەسەرئەوە، بە پێچەوانەوە مانای ئەوەیە محمد (ﷺ) زۆر ڕاستو چاكو شارەزای ڕێگەیە چونکە خودای گەورە بڕیاری بۆ داوە کە فەرمانی ئەو بگەیەنێتو پشتیوانی لێ کردووە بە موعجیزەی گەورەو بەڵگەی زۆری بێ وێنە. پاشان خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَإِنَّهُ لَتَذْكِرَةٌ لِّلْمُتَّقِينَ﴾ ئەم قورئانە بیرەوەریە بۆ ئەوانەی خۆ پارێزن، واتە: قورئان وە خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿قُلْ هُوَ لِلَّذِينَ آمَنُوا هُدًى وَشِفَاءٌ ۖ وَالَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ فِي آذَانِهِمْ وَقْرٌ وَهُوَ عَلَيْهِمْ عَمًى﴾[٤] واتە: (ئەی موحەممەد ﷺ) بڵێ: قورئان بۆ کەسانێك باوەڕیان پێی هێناوە ڕێبەرو چارەسەری گومانە وە ئەوانەی باوەڕی پێ ناهێنن لە گوێیاندا گرانیو کەڕی هەیە (لە بیستنی حەق) هەروەها لە ئاست ئەو قورئانەدا کوێرن. پاشان فەرموویەتی: ﴿وَإِنَّا لَنَعْلَمُ أَنَّ مِنكُم مُّكَذِّبِينَ﴾ بێ گومان ئێمە دەشزانین تێتاندا هەیە باوەڕ ناکەن، واتە: لەگەڵ ئەم ڕونیو ئاشکرایەدا تێتاندا هەن باوەڕ ناکات بەم قورئانە. پاشان فەرمووی: ﴿وَإِنَّهُ لَحَسْرَةٌ عَلَى الْكَافِرِينَ﴾ دیارە ئەوە داخو کەسەرە بۆ ئەم خودانەناسانە. ئیبنو جەریر وتی: بێ گومان ئەم باوەڕنەکردنە داخو کەسەرە بۆ خودانەناسان لە ڕۆژی قیامەتدا.[٥] بەم شێوەیەش لە قەتادەوە گێڕاویەتەوە[٦] وە دەگونجێت زەمیرەکە بگەڕێتەوە بۆ قورئان، واتە: بێ گومان قورئانو باوەڕ بە قورئان لە ڕاستیدا داخو کەسەرە بۆ خودانەناسان وەك خودا فەرموویەتی: ﴿كَذَٰلِكَ سَلَكْنَاهُ فِي قُلُوبِ الْمُجْرِمِينَ ﴿٢٠٠﴾ لَا يُؤْمِنُونَ بِهِ﴾[٧] واتە: ئابەو جۆرە ئەو (قورئان) مان خستۆتە ناو دڵی تاوانبارانەوە، کەچی هەر باوەڕی پێ ناهێنن. وە

---

[١] الطبری (٢٣/٥٩٣).

[٢] الطبری (٢٣/٥٩٣/٥٩٤)، الدر المنثور(٨/٢٧٦).

[٣] القرطبی (١٨/٢٧٦).

[٤] فصلت (٤٤).

[٥] الطبری (٢٣/٥٩٥).

[٦] الطبری (٢٣/٥٩٥).

[٧] الشعراء (٢٠٠–٢٠١).

فەرموویەتی: ﴿وَحِيلَ بَيْنَهُمْ وَبَيْنَ مَا يَشْتَهُونَ﴾[1] واتە: بەربەست دەخرێتە نێوان ئەوانو ئەوەی ئارەزوی دەکەن (کە بڕوامێنانو تەوبەکردنە). بۆیە لێرەدا فەرموویەتی: ﴿وَإِنَّهُۥ لَحَقُّ ٱلْيَقِينِ﴾ کە دیاریشە ڕاستێکە هیچ گومانێکی تێدا نیە، واتە: هەواڵێکی ڕاستو هەقە کە هیچ دوودڵیەکی تێدا نیە. پاشان خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَسَبِّحْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلْعَظِيمِ﴾ تۆ بەیادی ناوی پەروەرندەی گەورەت. هەر پەسەنی پاکی ئەو بدە، واتە: ئەو خودایەی ئەم قورئانە گەورەیەی ڕەوانە کردووە.

## تەفسیری سورەتی (المعارج)

## لە مەککەدا هاتوەتە خوارەوە

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿سَأَلَ سَآئِلٌۢ بِعَذَابٍ وَاقِعٍ ① لِّلْكَٰفِرِينَ لَيْسَ لَهُۥ دَافِعٌ ② مِّنَ ٱللَّهِ ذِى ٱلْمَعَارِجِ ③ تَعْرُجُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ وَٱلرُّوحُ إِلَيْهِ فِى يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُۥ خَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ ④ فَٱصْبِرْ صَبْرًا جَمِيلًا ⑤ إِنَّهُمْ يَرَوْنَهُۥ بَعِيدًا ⑥ وَنَرَىٰهُ قَرِيبًا ⑦﴾

### پەلە کردن بۆ هاتنی ڕۆژی قیامەت

خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿سَأَلَ سَآئِلٌۢ بِعَذَابٍ وَاقِعٍ﴾ یەکێك داوای کرد ئازارێك بێت. ئەو مانایەی تیا وەدی دەکرێت کە ئەم پیتی بایە (حرف الباء) دەری دەخاتو دەیگەیەنێت وەك ڕوی دابێت، ئەوەی داوای کرد ئازارێك بێت زۆر پەلەی بوو. وەك خودای دەفەرموێت: ﴿وَيَسْتَعْجِلُونَكَ بِٱلْعَذَابِ وَلَن يُخْلِفَ ٱللَّهُ وَعْدَهُۥ﴾[2] واتە: وە ئەوان (قورەیشی بەگاڵتەوە) بە پەلە داوای سزات لێ دەکەن لە کاتێکدا هەرگیز خودا پێچەوانەی بەڵێنی خۆی ناکات. واتە: جەزرەبەی خودا دێتو گومانی تێدا نیە.

عەوفی وتی لە ئیبنو عەباسەوە ﴿سَأَلَ سَآئِلٌۢ بِعَذَابٍ وَاقِعٍ﴾ ئیبنو عەباس وتی: (ئەوە داوای خوانەناسانە کە سزایان بۆ بێت لەلایەن خوداوە) کە بۆیان هاتووە.[3] ئیبنو ئەبی نەجیح (نجیح) وتی: لە موجاهدەوە لەم ئایەدا ﴿سَأَلَ سَآئِلٌ﴾ یەکێك داوای کرد بەوئازارەی کە دێت لە ڕۆژی قیامەتدا وتی ئەمەیش داواکەیانە ﴿ٱللَّهُمَّ إِن كَانَ هَٰذَا هُوَ ٱلْحَقَّ مِنْ عِندِكَ فَأَمْطِرْ عَلَيْنَا حِجَارَةً مِّنَ ٱلسَّمَآءِ أَوِ ٱئْتِنَا

---

[1] سبأ (٥٤).

[2] الحج (٤٧).

[3] الطبری (٢٣/٥٩٩).

أَئْتِنَا بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ﴾[1] واتە: ئەگەر ئەم قورئانە ڕاستەو لەلایەن تۆوە هاتووە دەی بەرد بەسەرماندا ببارێنە لە ئاسمانەوە یان سزایەکی سەختی پڕ ئازارمان بۆ بنێرە.[2] وە فەرموویەتی: ﴿وَاقِعٍ﴾ واتە: چاوەڕوانەو ئامادەکراوە بۆ خودانەناسان. ئیبنو عەباس وتی: هاتووەو ئامادەبووە ﴿لِّلْكَٰفِرِينَ لَيْسَ لَهُۥ دَافِعٌ﴾ ئەو سزایە هیچ کەس‌و شتێك نی یە بیگەڕێنێتەوە لە خودانەناسان. واتە: هیچ کەسێك نیە بیان پارێزێت کاتێك خودا ویستی ئەو سزایانە بدات بۆیە فەرموویەتی: ﴿مِّنَ ٱللَّهِ ذِى ٱلْمَعَارِجِ﴾.

**تەفسیری (مانای) ﴿ذِى ٱلْمَعَارِجِ﴾**

علی کوڕی ئەبو تەلحە (طلحة) وتی: لە ئیبنو عەباسەوە ﴿ذِى ٱلْمَعَارِجِ﴾ واتە: بڵندی بەرزایەکان[3]، موجاهد وتی: ﴿ذِى ٱلْمَعَارِجِ﴾ پلەکانی ئاسمان[4] خودا دەفەرموێت: ﴿تَعْرُجُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ وَٱلرُّوحُ إِلَيْهِ فِى يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُۥ خَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ﴾ فریشتەکان‌و جوبرائیل لە ڕۆژێکدا بەرەو لای خوا سەردەکەوت کەڕێی پەنجا هەزار ساڵە. عبدالرزاق وتی: لە موعەمەرەوە (معمر) ئەویش لە قەتادەوە (تَعْرُجُ) واتە: سەرکەوت، بەڵام ﴿وَٱلرُّوحُ﴾ ئەبو صالح وتی: دروست کراوێکن لە دروست کراوەکانی خودا لە مرۆڤ دەچن بەڵام مرۆڤ نین. منیش دەڵێم لەوانەیە مەبەست پێ ی جوبرائیل بێت. لە بابی عەتفی خاسەوە بێت بۆ سەر عەتفی عامەوە دەگونجێت ئیسمی جنسی بێت بۆ گیانی بەنیام (بنی آدم) کاتێك گیانی ئەکێشرێت‌و بەند دەکرێتەوە بەرەو ئاسمان. وەك فەرموودەکەی براء (البراء) دەی گەیەنێت[5].

**مەبەست بە ڕۆژێك ئەندازەکەی پە نجا هەزار ساڵە**

خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿فِى يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُۥ خَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ﴾ مەبەست بەوڕۆژە ڕۆژی قیامەتە. ئیبنو ئەبی حاتم ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەباسەوە ﴿فِى يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُۥ خَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ﴾ وتی: ڕۆژی قیامەت. سەنەدەکانی (الاسناد) ڕاستن. سەوری (الثوری) ڕیوایەتی کردووە لە سەماکی کوڕی حەربەوە (سماك) ئەویش لە عیکرمەوە وتی: ﴿فِى يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُۥ خَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ﴾

---

[1] الانفال (٣٢).

[2] الطبری (٥٩٩/٢٣).

[3] الطبری (٦٠٠/٢٣).

[4] الطبری (٦٠٠/٢٣).

[5] الصلوال للطبرانی (٢٣٨).

واتە: ڕۆژی قیامەت.[1] هەروەها زەحاكو (الضحاك) ئیبنو زەیدیش وتویانە. علی كوڕی ئەبی تەلحە (أبی طلحة) وتی لە ئیبنو عەباسەوە ﴿تَعۡرُجُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ وَٱلرُّوحُ إِلَيۡهِ فِي يَوۡمٖ كَانَ مِقۡدَارُهُۥ خَمۡسِينَ أَلۡفَ سَنَةٖ﴾ وتی: ئەوڕۆژە ڕۆژی قیامەتە كە خودای گەورە كردویەتی بە پەنجا هەزار ساڵ لەسەر خودانەناسان[2] زۆر فەرموودە هاتووە بەو مانایە. ئیمامی ئەحمد ڕیوایەتی كردووە لە ئەبو عومەری غەدانیەوە (الغدانی) وتی: لەلای ئەبو هورەیرە بوم پیاوێك تێپەڕی كە لە هۆزی بەنی عامری كوڕی سەعسەعە بوو (سعسعە) پێیان وت ئەمە لە هەموو عامیریەكان ماڵو سامانی زۆر ترە، ئەبو هورەیرە وتی: بیگێڕنەوە بۆلام، گەڕاندیانەوە بۆلای، ئەبو هورەیرە وتی: هەواڵیان دامێ كە تۆ خاوەن ماڵو سامانێكی زۆری، پیاوە عامیركە وتی: بەڵێ، سوێند بەخودا لە وشتری سور (حمر) سەد وشترم هەیە لە وشتری ئەسمەر (أدم) سەد وشترم هەیە، هەتا هەموو ڕەنگەكانی وشتری باسی كرد لەوانە كە پیرو لاوازنو ئەوانەی كە بۆ غەزا دەشێن (رباط النحیل) ئەبو هورەیرە وتی: خۆت بپارێزە لە پێی وشترو سمی مەڕوماڵات. ئەوەندە دووبارەی كردەوە بۆی پیاوە عامیریەكە ڕەنگی گۆڕاو وتی: ئەوە چیە ئەی ئەبو هورەیرە؟ ئەبو هورەیرە وتی: بیستم لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) دەی فەرموو: (هەركەسێك وشتری هەبێت هەقی نەدات (فی نجدتها و رسلها)) وتمان ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) (ما نجدتها و رسلها)؟ فەرمووی: (لە كاتی خۆشیو ناخۆشیدا، لە ڕۆژی قیامەتدا ئەو وشترانە دێن زۆر بە پەلەو زۆر قەڵەوو سمو پێ تیژن ئەوكەسە دەكەوێت بە دەمدا بۆیان لەسەر زەویەكی نەرم بە پێەكانیان دەچن بەسەر پشتیدا. كاتێك دواترین وشتر تێ پەڕی بەسەریدا یەكەم وشتر دەچێتەوە سەر پشتی لە ڕۆژێكدا ئەندازەكەی پەنجا هەزار ساڵە هەتا خودای گەورە دادوەری نێوان خەڵكی دەكات هەركەسەو ڕێگای خۆی دەبینێت. وە ئەگەر ڕەشەوڵاغی هەبوو (بقر) هەقەكەی نەدات لە كاتی خۆشیو ناخۆشی دا ئەو گاو مانگایە دێن زۆر بە پەلەو زۆر قەڵەوو سمو پێ تیژن پاشان دەكەوێت بە دەمدا بۆیان لەسەر زەویەكی نەرم هەموو سم دارێك بە سمەكانی دەچێت بە سەریداو هەموو شاخ دارێك بە قۆچ لێی دەدات شاخ دارەكانیش نە شاخیان لارەو نە شاخیان شكاوە. كاتێك دواترینیان تێ دەپەڕێت یەكەمیان دەچێتەوە سەر پشتی لەڕۆژێكدا كە ئەندازەكەی پەنجا هەزار ساڵە. هەتا خوای گەورە دادوەری دەكات لە نێوان خەڵكیدا. هەركەسەو ڕێگای خۆی دەبینێت. وە ئەگەر مەڕی هەبێت هەقەكەی نەدات لە كاتی خۆشیو ناخۆشیدا ئەو مەڕە دێت لە ڕۆژی قیامەتدا پەلەو قەڵەوو سم تیژن ئەو كەسە دەكەوێت بە دەمدا لە زەویەكی نەرمدا ئەوەی سمی هەیە بە سمەكانی دەچێت بە سەریداو ئەوەی شاخی هەیە بە شاخەكانی لێی

[1] الطبری (٢٣/٦٠١).

[2] الطبری (٢٣/٦٠٣).

دەدات نە شاخیان لارەو نەشکاویشە، کاتێك دواترینیان تێ دەپەڕێت یەکەمیان دەست پێ دەکاتەوە لە ڕۆژێکدا کە ئەندازەکەی پەنجا هەزار ساڵە. هەتا خودای گەورە دادوەری دەکات لە نێوان خەڵکیدا هەرکەسەو ڕێگای خۆی دەبینێت) پیاوە عامریەکە وتی: هەقی وشتر چیە؟ وتی: زۆر چاکەکەیان بدەیت وە شیرەکەیان ببەخشیتو خەڵکی سواریان بێنو ئاویان پێ بدەیتو نێرەکانیشیان بپەڕێیت[1] ئەبو داودو نەسائی ڕیوایەتیان کردووە[2] .

## ڕێگایەکی تر بۆ ئەم فەرموودەیە

ئیمامی احمد ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو هورەیرەوە وتی: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (هیچ خاوەن زێڕو زیوێك نیە کە هەقی خودا نادات مەگەر پان دەکرێتەوەو سور (گەرم) دەکرێتەوە بۆی دەموچاوو ئەملاو ئەولای پشتی پێ داخ دەکرێت هەتا خودای گەورە بڕیاری خۆی دەدات لە نێوان بەندەکانیدا لە ڕۆژێکدا کە ئەندازەکەی پەنجا هەزار ساڵە بەوساڵانەی ئێوە دەیژمێرن پاشان هەرکەسە ڕێگای خۆی دەبینێت یان بۆ بەهەشت یان بۆ جەهەننەم) وە باسی پاشماوەی فەرموودەکەی کرد لە وشترو مەڕوماڵات وەك لە پێشەوە باسمان کرد وە فەرموودەکە ئەمەیشی تێدایە (چارەوێ ـ ئەسپو ماین ـ ) بۆ سێ شتە، بۆ پیاوێك پاداشتەو خێرە وە بۆ پیاوێك داپۆشینە وە بۆ پیاوێك گوناهو تاوانە) تا کۆتایەکەی[3] وە موسلم لە سەحیحەکەیدا تەواوی ئەم فەرموودەیەی ڕیوایەت کردووە بوخاری لەگەڵ نیە[4] وە مەبەست لە هێنانی ئەم فەرموودەیە لێرەدا ئەمەیە کە دەفەرموێت (هەتا خودای گەورە فەرمانی خۆی دەدات لە نێوان بەندەکانی خۆیدا لە ڕۆژێکدا کە ئەندازەکەی پەنجا هەزار ساڵە).

## ئامۆژگاری کردنی پێغەمبەر(ﷺ) بە ئارام گرتن

خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَٱصۡبِرۡ صَبۡرٗا جَمِيلًا﴾ تۆ خۆ بگرە بەخۆگرتنێکی پەسەند، واتە: ئەی محمد تۆ خۆگربە لە باوەڕ نەهێنانی گەلەکەت پێت وە پەلەکردنیان بۆ سزادان وە گومانو بەدوور زانینیان لە ڕودانی ئەو جەزرەبەیە وەك خودا دەفەرموێت: ﴿يَسۡتَعۡجِلُ بِهَا ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِهَاۖ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مُشۡفِقُونَ مِنۡهَا وَيَعۡلَمُونَ أَنَّهَا ٱلۡحَقُّۗ﴾[5] بۆیە فەرموویەتی: ﴿إِنَّهُمۡ يَرَوۡنَهُۥ بَعِيدٗا﴾ ئەوان بەدووری دەبینن، واتە: ڕوودانی جەزرەبە. وە هاتنی قیامەت خودانەناسان بەدوریان دەزانی ڕودانی.

---

[1] احمد (۲/٤٨٩) فەرموودەیەکی حەسەنە.

[2] أبو داود (۲/۳۰٤)، النسائی (۵/۱۲) فەرمودەیەکی حەسەنە.

[3] احمد (۲/۲٦۲) فەرموودەیەکی سەحیحە.

[4] مسلم (۲/٦٨۲).

[5] الشوری (۱۸).

وە دەفەرموویت: ﴿وَنَرَىٰهُ قَرِيبًا﴾ ئێمەش نزیکی دەبینین، واتە: خاوەن باوەڕان باوەڕیان وایە کە نزیکە ڕودانی. هەرچەندە ماوەیەکی خۆی هەیە خودا نەبێت کەس نایزانێت بەڵام هەرشتێك کە بێت ئەوشتە نزیکەو ڕودەداتو گومانی تێدا نیە.

﴿يَوْمَ تَكُونُ ٱلسَّمَآءُ كَٱلْمُهْلِ ﴿٨﴾ وَتَكُونُ ٱلْجِبَالُ كَٱلْعِهْنِ ﴿٩﴾ وَلَا يَسْـَٔلُ حَمِيمٌ حَمِيمًا ﴿١٠﴾ يُبَصَّرُونَهُمْ ۚ يَوَدُّ ٱلْمُجْرِمُ لَوْ يَفْتَدِى مِنْ عَذَابِ يَوْمِئِذٍۭ بِبَنِيهِ ﴿١١﴾ وَصَٰحِبَتِهِۦ وَأَخِيهِ ﴿١٢﴾ وَفَصِيلَتِهِ ٱلَّتِى تُـْٔوِيهِ ﴿١٣﴾ وَمَن فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا ثُمَّ يُنجِيهِ ﴿١٤﴾ كَلَّآ ۖ إِنَّهَا لَظَىٰ ﴿١٥﴾ نَزَّاعَةً لِّلشَّوَىٰ ﴿١٦﴾ تَدْعُوا۟ مَنْ أَدْبَرَ وَتَوَلَّىٰ ﴿١٧﴾ وَجَمَعَ فَأَوْعَىٰٓ ﴿١٨﴾﴾

**ناڕەحەتیەکانی ڕۆژی سەلا (قیامەت)**

خودای گەورە دەفەرموویت کە تۆڵەو جەزرەبە بۆ خودانەناسان هاتووە: ﴿يَوْمَ تَكُونُ ٱلسَّمَآءُ كَٱلْمُهْلِ﴾ ڕۆژی ئاسمان وەك تاواندنەوەی کانزا دەبێت. ئیبنو عەباسو موجاهدو عەتاو (عطاء) سەعیدی کوڕی جوبەیرو عیکرمەو سودیو (السدی) کەسانی تریش وتویانە: وەك زەیتی تواوە. وە فەرموویەتی: ﴿وَتَكُونُ ٱلْجِبَالُ كَٱلْعِهْنِ﴾ کەژەکانیش وەك (خوری) دەبن، واتە: وەك خوری شی کراوە. موجاهدو قەتادەو سودی وتیان.[1] ئەم ئاتە وەك ئەم ئایەتە وایە کە دەفەرموویت: ﴿وَتَكُونُ ٱلْجِبَالُ كَٱلْعِهْنِ ٱلْمَنفُوشِ﴾[2] واتە: وە شاخەکان وەك خوری شیکراویان لێدێت. وە دەفەرموویت: ﴿وَلَا يَسْـَٔلُ حَمِيمٌ حَمِيمًا﴾ هاوەڵ لە هاوەڵ ناپرسێت، واتە: هاوەڵ لە هاوەڵی خۆی ناپرسێت کە دەیبینێت لە خراپترین ژیانو وەزعدایە. سەرقاڵی بە خۆیەوە هەموو شتێکی لە بیر بردوەتەوە. عەوفی وتی: لە ئیبنو عەباسەوە: یەکتری دەناسن هەواڵی یەکتر دەپرسن پاشان دوای ئەوە لە یەکتری ڕادەکەن. خودای گەورە دەفەرموویت: ﴿لِكُلِّ ٱمْرِئٍ مِّنْهُمْ يَوْمَئِذٍ شَأْنٌ يُغْنِيهِ﴾[3] واتە: لەوڕۆژەدا هەرکەسێك کاری خۆی هەیەو ناپرژێتە سەر کەسی تر.[4] وە ئەم ئایەتە وەك ئەم ئایەتە وایە کە دەفەرموویت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُوا۟ رَبَّكُمْ وَٱخْشَوْا۟ يَوْمًا لَّا يَجْزِى وَالِدٌ عَن وَلَدِهِۦ وَلَا مَوْلُودٌ هُوَ جَازٍ عَن وَالِدِهِۦ شَيْـًٔا ۚ إِنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ﴾[5] واتە: ئەی ئادەمی خۆتان بپارێزن لە (تۆڵەی) پەروەردگارتان لەوڕۆژەش بترسن هیچ باوکێك تاوانی

[1] الطبری (٢٣/٦٠٤).

[2] القارعة (٥).

[3] عبس (٣٧).

[4] الطبری (٢٣/٦٠٥).

[5] لقمان (٣٣).

ڕۆڵەکەی هەڵناگرێتو هیچ ڕۆڵەیەکیش شتێك لە تاوانی باوکی هەڵناگرێتو بێ گومان بەڵێنی خودا حەق و ڕاستە. وەك ئەم ئایەتە کە دەفەرموێت: ﴿وَإِن تَدْعُ مُثْقَلَةٌ إِلَىٰ حِمْلِهَا لَا يُحْمَلْ مِنْهُ شَيْءٌ وَلَوْ كَانَ ذَا قُرْبَىٰٓ﴾[1] واتە: وە ئەگەر گوناهبارێك بانگی کەسێکی تر بکات بۆ هەڵگرتنی بارە گوناهەکەی هیچ لەو (بارە گوناهەکە) هەڵناگرێت هەرچەندە (داوالێکروەکە) خزمیش بێت.

وەك ئەم ئایەتە کە ئەفەروێت: ﴿ فَإِذَا نُفِخَ فِي ٱلصُّورِ فَلَآ أَنسَابَ بَيْنَهُمْ يَوْمَئِذٍ وَلَا يَتَسَآءَلُونَ ﴾[2] واتە: ئینجا کاتێك فوو دەکرێت بە شەیپوردا لەوڕۆژەدا هیچ خزمایەتیەك نامێنێت لە نێوانیاندا وە پرسیاری یەکتری ناکەن (کەس لەکەس ناپرسێت). وە وەك ئەم ئایەتە کە دەفەرموێت: ﴿يَوْمَ يَفِرُّ ٱلْمَرْءُ مِنْ أَخِيهِ ﴿٣٤﴾ وَأُمِّهِۦ وَأَبِيهِ ﴿٣٥﴾ وَصَٰحِبَتِهِۦ وَبَنِيهِ ﴿٣٦﴾ لِكُلِّ ٱمْرِيٍٕ مِّنْهُمْ يَوْمَئِذٍ شَأْنٌ يُغْنِيهِ﴾[3] واتە: ئەو ڕۆژەی کە مرۆڤ ڕادەکات لە برای، دایکیو باوکی، ژنیو کوڕانی، لەوڕۆژەدا هەرکەسێك کاری خۆی هەیەو ناپەرژێتە سەر کەسی تر. وە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يُبَصَّرُونَهُمْ ۚ يَوَدُّ ٱلْمُجْرِمُ لَوْ يَفْتَدِى مِنْ عَذَابِ يَوْمِئِذٍۭ بِبَنِيهِ﴾ کە نیشانی یەکتری دەدرێن، تاوانبار فرە حەزدەکات (بۆ ڕزگاری لە ئازاری ئەو ڕۆژە) لە باتی خۆی کوڕەکانی. ﴿وَصَٰحِبَتِهِۦ وَأَخِيهِ﴾ هاوسەریشی وە براکەشی. ﴿وَفَصِيلَتِهِ ٱلَّتِى تُـْٔوِيهِ﴾ ئەو بەشە لە هۆزەکەشی کە پەنایان دەدات. ﴿وَمَن فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا ثُمَّ يُنجِيهِ﴾ هەرچی لەسەر زەویش هەیە، گشتی براو ڕزگاری ببێت. ﴿كَلَّآ ۖ إِنَّهَا لَظَىٰ﴾ هەرگیز نابێت، ئەمە بڵێسەی ئاگرە، واتە: فیدیەی (بەرخوێن) لێ وەرناگیرێت باخەڵکی زەوی هەمووی بێنێتو هەرچی ماڵو سامانی کە زۆر لای شیرین بووە، یا بەپڕی سەرزەمینش ئاڵتونی هەبووبێت، یان ئەو منداڵەی کە پارچەیە بووە لە جگەری لەڕۆژی قیامەتدا کاتێك ئەو ناڕەحەتیو جەزرەبەیە دەبینێت پێی خۆشە هەمووی بکاتە قوربانی بۆ ئەوەی ڕزگاری ببێت لە سزای خودا. لێی وەرناگیرێت. موجاهدو سودی وتیان: ﴿وَفَصِيلَتِهِ﴾ هۆزو عەشیرەتی.[4] عیکرمە وتی: ئەو بنەماڵەیەی کە خۆی یەکێکە لێیان، ئەشهەبی (اشهب) کوڕی مالك وتی: ﴿وَفَصِيلَتِهِ﴾ دایکی، وە خودا دەفەرموێت: ﴿إِنَّهَا لَظَىٰ﴾ وەسفی ئاگرو گەرما زۆرەکەی دەکات. وە دەفەرموێت: ﴿نَزَّاعَةً

---

[1] فاطر (١٨).

[2] المؤمنون (١٠١).

[3] عبس (٣٤_٣٧).

[4] الطبری (٢٣/٦٠٦).

﴿لِّلشَّوَىٰ﴾ پێستی سەری دادەماڵێت. ئیبنو عەباسو موجاهد وتیان: پێستی سەر.[1] حەسەنی بەسریو سابتی (ثابت) بەنانی وتیان: ﴿نَزَّاعَةً لِّلشَّوَىٰ﴾ شوێنە بەڕێزەکانی دەموچاوی، قەتادە وتی: ﴿نَزَّاعَةً لِّلشَّوَىٰ﴾ ئەوەی کە جێی ڕێزبێت لە دەموچاو دەستو قاچو هەر شتێکی تر کە بووەتە هۆی جوانیو ڕێکی مرۆڤ.[2] زەحاك (الضحاك) وتی: داڕنینی گۆشتو پێست لە ئێسقان هەتا هیچی پێوە نامێنێت.[3] ئیبنو زەید وتی: ﴿لِّلشَّوَىٰ﴾ ئێسکە گەورەکان.[4] ﴿نَزَّاعَةً﴾ واتە: ئێسکەکانیان پارچە پارچە دەکرێت پاشان پێستو شێوەیان دەگۆڕێت. خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿تَدْعُوا مَنْ أَدْبَرَ وَتَوَلَّىٰ﴾ بانگێشتی کەسێك دەکات کە پشتی کردە دینەوەو ئاوڕی لێ نەدایەوە. ئاگر بانگی ئەو کەسانە دەکات کەخودا بۆ ئاگر دروستی کردوون. وە لەژیانی دنیادا خوا بڕیاری ئەو ئاگرەی بۆ داون ئەوانیش کاری لەسەر دەکەنو وە لە ڕۆژی قیامەتدا بانگیان دەکات بە زمانێکی ڕێكو ڕەوان پاشان هەڵیان دەگرێت لە ناو خەڵکی مەحشەردا وەك چۆن باڵندە دانەوێڵە هەڵدەگرێت لەبەر ئەوەی ئەوانە وەك خودا فەرموویەتی لەوکەسانە بوون کە ئاوڕیان نەدەدایەوەو پشتیان هەڵ دەکرد. واتە: بە دڵ باوەڕی نەبوو بە ئەندامەکانی لەشیش وازی هێنابوو نەی دەکرد. ﴿وَجَمَعَ فَأَوْعَىٰ﴾ ئەوەی ماڵی کۆدەکردەوەو هەڵی دەگرت، واتە: ئەی پێچایەوە هەقی خودای لێ نەدەدا کەواجبی کردبوو لەسەری لە بژێوی ماڵو منداڵیو زەکات دان بەهەژاران وە لە فەرموودەدا هاتووە (مەیگرەوە خودا لێت دەگرێتەوە).[5]

﴿إِنَّ الْإِنسَانَ خُلِقَ هَلُوعًا ﴿١٩﴾ إِذَا مَسَّهُ الشَّرُّ جَزُوعًا ﴿٢٠﴾ وَإِذَا مَسَّهُ الْخَيْرُ مَنُوعًا ﴿٢١﴾ إِلَّا الْمُصَلِّينَ ﴿٢٢﴾ الَّذِينَ هُمْ عَلَىٰ صَلَاتِهِمْ دَائِمُونَ ﴿٢٣﴾ وَالَّذِينَ فِي أَمْوَالِهِمْ حَقٌّ مَّعْلُومٌ ﴿٢٤﴾ لِّلسَّائِلِ وَالْمَحْرُومِ ﴿٢٥﴾ وَالَّذِينَ يُصَدِّقُونَ بِيَوْمِ الدِّينِ ﴿٢٦﴾ وَالَّذِينَ هُم مِّنْ عَذَابِ رَبِّهِم مُّشْفِقُونَ ﴿٢٧﴾ إِنَّ عَذَابَ رَبِّهِمْ غَيْرُ مَأْمُونٍ ﴿٢٨﴾ وَالَّذِينَ هُمْ لِفُرُوجِهِمْ حَافِظُونَ ﴿٢٩﴾ إِلَّا عَلَىٰ أَزْوَاجِهِمْ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُمْ فَإِنَّهُمْ غَيْرُ مَلُومِينَ ﴿٣٠﴾ فَمَنِ ابْتَغَىٰ وَرَاءَ ذَٰلِكَ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الْعَادُونَ ﴿٣١﴾ وَالَّذِينَ هُمْ لِأَمَانَاتِهِمْ وَعَهْدِهِمْ رَاعُونَ ﴿٣٢﴾ وَالَّذِينَ هُم بِشَهَادَاتِهِمْ قَائِمُونَ ﴿٣٣﴾ وَالَّذِينَ هُمْ عَلَىٰ صَلَاتِهِمْ يُحَافِظُونَ ﴿٣٤﴾ أُولَٰئِكَ فِي جَنَّاتٍ مُّكْرَمُونَ ﴿٣٥﴾﴾

---

[1] الطبری (٢٣/٦٠٨).

[2] الطبری (٢٣/٦٠٩).

[3] الطبری (٢٣/٦٠٩).

[4] الطبری (٢٣/٦٠٩).

[5] مسلم (٢/٧١٣).

## مرۆڤ بێ باره (لەسەر ماڵێك ناوەستێت)

خودای گەورە باسی مرۆڤو ئەو ڕەفتارە ناشیرینانە دەكات كە لەسەریەتی. دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ خُلِقَ هَلُوعًا﴾ بێگومان مرۆڤ ڕژدو چاوچنۆك دروست كراوە. پاشان مانای كردوەو دەفەرمووێت: ﴿إِذَا مَسَّهُ ٱلشَّرُّ جَزُوعًا﴾ كە ناخۆشیەكی توش ببێت هاوارونالە دەست پێ دەكات. واتە: وەختێك توشی ناخۆشی بوو دەلەرزێو هاوار دەكاو دڵی دادەكەوێت لە ترساندا بێ هیوا دەبێتو بەتەمانیە جارێكی تر توشی چاكە ببێت. وە دەفەرمووێت: ﴿وَإِذَا مَسَّهُ ٱلْخَيْرُ مَنُوعًا﴾ ئەگەر دەكەوێتە خۆشیش چاوچنۆكە. واتە: وەختێكیش بەهرەیەكی لەلایەن خوداوە وەدەست هێنا ڕژدو دەست قوچاوە بەرامبەر خەڵكی، وە هەقی خودای لێ نادات. ئیمامی ئەحمد وتی: ئەبو عبدالرحمن بۆی گێڕاینەوەو موسای كوڕی علی كوڕی رجاحیش (رجاح) بۆی گێڕاینەوە وتی: بیستم لە باوكم دەی گێڕایەوە لە عبدالعزیزی كوڕی مەروانی كوڕی حەكەمەوە (الحكم) وتی: بیستم لە ئەبو هورەیرەوە دەیوت: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (خراپ ترین شت لە مرۆڤدا زۆر ڕژدیو چنۆكیو ترسنۆكی لە ئەندازە بەدەر)[1] ئەبو داود ڕیوایەتی كردووە لە عبدالله ی كوڕی جەراحەوە (الجراح) ئەویش لە ئەبو عبدالرحمن مەقریەوە (المقری) بەو شێوەیە، وە هیچی لە عبدالعزیزەوە لانیە جگە لەوە[2].

## جیاكردنەوەی نوێژكەران لەم ڕەوشتانەی پێشەوە وە باسی ئاكارو شێوەی نوێژكردنیان

پاشان خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِلَّا ٱلْمُصَلِّينَ﴾ مەگەر ئەوانەی نوێژ خوێنن. مرۆڤ چەندین ڕەوشتی خراپی تێدایە مەگەر كەسێك كە خودا پاراستبێتیو سەركەوتوو شارەزای كردبێت بۆ ڕێگای چاكەو هۆكارەكانی بۆ ئاسان كردبێت ئەوانەش نوێژ كەرانن. ﴿ٱلَّذِينَ هُمْ عَلَىٰ صَلَاتِهِمْ دَآئِمُونَ﴾ ئەو كەسانەی قەد نایەڵن نوێژیان بچێت، واتە: چاودێری كاتەكان دەكەنو ئەوەی پێویستە لە نوێژدا بەجێی دێنن. ئیبنو مەسعودو مەسروقو (مسروق) ئیبراهیمی نەخەعی وتویانە.[3] وە وتراوە: مەبەست لە ﴿دَآئِمُونَ﴾ لێرەدا لەسەر خۆییو خوشوعە. وەك خودا دەفەرمووێت: ﴿قَدْ أَفْلَحَ ٱلْمُؤْمِنُونَ ۝ ٱلَّذِينَ هُمْ فِى صَلَاتِهِمْ خَٰشِعُونَ﴾ [4] واتە: بەڕاستی باوەڕداران ڕزگاردەبن، ئەو كەسانەی كە لە نوێژەكانیاندا لە خودا ترسن (گەردن كەچن بۆ خودا). عوقبەی (عقبە) كوڕی عامر وتی: وەك دەڵێن ئاوی وەستاو.

---

[1] احمد (٣٠٢/٢) فەرموودەیەكی سەحیحە بوخاری لە التاريخ (٦/٩_٨) هێناویەتی.

[2] أبو داود (٢٦/٣) فەرمودەیەكی سەحیحە بوخاری لە التاريخ (٦/٨_٩ ) هێناویەتی.

[3] الطبری (٦١٢/٢٣).

[4] المؤمنون (١_٢).

ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە پێویستە وەستان‌و مانەوە لە ڕوکنەکاندا. ئەو کەسەی لە ڕکوع‌و سجوددا نەمێنێتەوەو نەوەستێت ئەوە بە بەردەوام (دائم) نازمێرێت لە نوێژ کردندا، چونکە نەوەستاوە لە ڕوکنەکانداو خۆی نەگرتووە بەڵکو وەك قەلەڕەش دەنوکی داوە بە زەمینداو سەرکەوتوو نەبووە لە نوێژەکەیدا. وتراوە: مەبەست پێی ئەو کەسانەی وەختێك هەڵدەستن بە کارێك بەردەوام دەبن لەسەری بە تەواوی جێ بەجێی دەکەن وەك لە فەرموودەی سەحیحدا هاتووە لە عائیشەوە (خودا لێی ڕازی بێت) ئەویش لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرموویەتی:(خۆشەویسترین کردار لەلای خودا بەردەوام ترینیانە با کەمیش بێت)[1] خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَالَّذِينَ فِي أَمْوَالِهِمْ حَقٌّ مَعْلُومٌ﴾ ئەوانەی لە سامانیشیاندا بەشێك هەیە. ﴿لِلسَّائِلِ وَالْمَحْرُومِ﴾ بۆ مرۆڤی داواکەرو داوا نەکەرە. واتە: لە سامانیاندا بەشێکی دیاری کراو دانراوە بۆ نەبوان‌و کەم دەرامەتان. وە دەفەرموێت: ﴿وَالَّذِينَ يُصَدِّقُونَ بِيَوْمِ الدِّينِ﴾ ئەو کەسانە کە بڕوایان بەڕۆژی قیامەت هەیە. واتە: باوەڕی تەواویان هەیە بەزیندو بونەوەو لێ پرسینەوەو پاداشت دانەوە. ئەوانە کردار دەکەن بەکردەوەی ئەوانەی کە بەتەمای پاداشتی چاکن‌و دەترسن لەتۆڵەی خودا بۆیە خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَالَّذِينَ هُمْ مِنْ عَذَابِ رَبِّهِمْ مُشْفِقُونَ﴾ ئەوانەش کەلە ئازاری پەروەرێنیان نیگەرانن، واتە: دەترسن‌و نیگەرانن. ﴿إِنَّ عَذَابَ رَبِّهِمْ غَيْرُ مَأْمُونٍ﴾ چونکە بەڕاستی سزای پەروەرندەی ئەوان کەس لێی دڵنیا نی یە. هیچ کەسێك دڵنیای ناکات لەباتی (جێی) خودا مەگەر خودا فرمانی دابێت بە دڵنیاکردنی، وە دەفەرموێت: ﴿وَالَّذِينَ هُمْ لِفُرُوجِهِمْ حَافِظُونَ﴾ ئەو کەسانەی کەجێ شەرمیان دەپارێزن، واتە: دەپارێزن لە حەرام دەیپارێزن لەوشوێنەدا نەبێت کە خودا ڕێگای داوە دابنرێت‌و بەکاربێت. بۆیە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِلَّا عَلَىٰ أَزْوَاجِهِمْ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُمْ فَإِنَّهُمْ غَيْرُ مَلُومِينَ﴾ مەگەر لە ڕووی ژنی خۆیان یان ئەوانەی کەنیزەیانن، ئەوسا سەرکۆنە ناکرێن، واتە: کەنیزەك. وە دەفەرموێت: ﴿فَمَنِ ابْتَغَىٰ وَرَاءَ ذَٰلِكَ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الْعَادُونَ﴾ هەرکەسێك بەدەر لە مانە بخوازێت، ئەوانە لە ئەندازە لادەرن. تەفسیری ئەمە لە پێشەوە لە سورەتی (المؤمنون) باسی کراوە پێویست ناکات لێرەدا دووبارە بکرێتەوە. وە دەفەرموێت: ﴿وَالَّذِينَ هُمْ لِأَمَانَاتِهِمْ وَعَهْدِهِمْ رَاعُونَ﴾ ئەوکەسانەش کە ڕاگری ئامانەتی‌و بەڵێنیانن، واتە: وەختێك ئەمانەتێکیان لابوو دەی پارێزن خیانەتی لێ ناکەن‌و کاتێك بەڵێنێکیان دا نایشکێنن دەیبەنەسەر ئەمە خوڕەوشتی خاوەن باوەڕە دژەکەیشی خوڕەوشتی دووڕوکانە وەك لەم فەرموودە سەحیحەدا هاتووە: (نیشانەی دووڕوو سێ شتە: وەختێك قسەی کرد

---

[1] مسلم (٥٤١/١).

درۆ دەکات، وەختێك بەڵێنی دا نایباتەسەر، وەختێکیش ئەمانەتێکی لادانرا خیانەتی تێدادەکات)[1] لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە (وەختێك قسەی کرد درۆدەکات، وەختێك بەڵێنێکی دا نایباتەسەر، وەختێك دەمەقاڵێ دەکات بەدفەڕە)[2] واتە: قسەی سوكو نابەجێ دەکات. وە دەفەرمووێت: ﴿وَٱلَّذِينَ هُم بِشَهَـٰدَٰتِهِمْ قَآئِمُونَ﴾ ئەو کەسانەش شایەتی بە ڕاستی دەدەن، واتە: بە ڕاستی شایەتی دەدەن زیادەی پیادا نانێن کەمی ناکەنەوەو ناشی شارنەوە. ﴿وَمَن يَكْتُمْهَا فَإِنَّهُۥٓ ءَاثِمٌ قَلْبُهُۥ﴾[3] واتە: وە ئەو کەسەی بیشارێتەوە ئەوە بەڕاستی دڵ گوناهبارە. پاشان خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَٱلَّذِينَ هُمْ عَلَىٰ صَلَاتِهِمْ يُحَافِظُونَ﴾ ئەوانەی پارێزگاری نوێژەکانیان دەکەن، واتە: لەسەر ئەرکەکانیو کاتەکانیو واجباتەکانیو سونەتەکانی بەردەوامن. خوای گەورە بە باسی نوێژ لەپێشەکی ئەم سورەتەوە دەستی پێ کرد کۆتایشی هێنا بە باسی نوێژ بۆ زیاتر گرنگی دان بە نوێژو ئاگاداری لەسەریو ڕێزی وەك لە پێشەوە لە پێشەکی سورەتی (المؤمنون) دا کە وەك یەکن بۆیە لەوێدا فەرموویەتی: ﴿أُوْلَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْوَٰرِثُونَ ﴿١٠﴾ ٱلَّذِينَ يَرِثُونَ ٱلْفِرْدَوْسَ هُمْ فِيهَا خَـٰلِدُونَ﴾[4] واتە: هەر ئەوانەن میرات گران، ئەوانەی کە دەبنە خاوەن فیردەوس (بەهەشت) ئەوان لە بەهەشتدا دەمێننەوە بە هەمیشەیی. وە لێرەشدا فەرموویەتی: ﴿أُوْلَـٰٓئِكَ فِى جَنَّـٰتٍ مُّكْرَمُونَ﴾ ئەوانە لە ناو باخەکانی بەهەشتدا ڕێزلێ گیراون، واتە: ڕێزیان لێ گیراوە بە چەندین جۆری خۆشیو کامەرانی.

﴿فَمَالِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ قِبَلَكَ مُهْطِعِينَ ﴿٣٦﴾ عَنِ ٱلْيَمِينِ وَعَنِ ٱلشِّمَالِ عِزِينَ ﴿٣٧﴾ أَيَطْمَعُ كُلُّ ٱمْرِئٍ مِّنْهُمْ أَن يُدْخَلَ جَنَّةَ نَعِيمٍ ﴿٣٨﴾ كَلَّآ ۖ إِنَّا خَلَقْنَـٰهُم مِّمَّا يَعْلَمُونَ ﴿٣٩﴾ فَلَآ أُقْسِمُ بِرَبِّ ٱلْمَشَـٰرِقِ وَٱلْمَغَـٰرِبِ إِنَّا لَقَـٰدِرُونَ ﴿٤٠﴾ عَلَىٰٓ أَن نُّبَدِّلَ خَيْرًا مِّنْهُمْ وَمَا نَحْنُ بِمَسْبُوقِينَ ﴿٤١﴾ فَذَرْهُمْ يَخُوضُوا۟ وَيَلْعَبُوا۟ حَتَّىٰ يُلَـٰقُوا۟ يَوْمَهُمُ ٱلَّذِى يُوعَدُونَ ﴿٤٢﴾ يَوْمَ يَخْرُجُونَ مِنَ ٱلْأَجْدَاثِ سِرَاعًا كَأَنَّهُمْ إِلَىٰ نُصُبٍ يُوفِضُونَ ﴿٤٣﴾ خَـٰشِعَةً أَبْصَـٰرُهُمْ تَرْهَقُهُمْ ذِلَّةٌ ۚ ذَٰلِكَ ٱلْيَوْمُ ٱلَّذِى كَانُوا۟ يُوعَدُونَ ﴿٤٤﴾﴾

---

[1] فتح الباری (١/١١١).

[2] فتح الباری (١/١١١).

[3] البقرة (٢٨٣).

[4] المؤمنون (١٠_١١).

### بەگژداچوونی خودانەناسان و هەڕەشەلێیان

خوای گەورە هەڕەشە دەکات لەو بێ دینانەی کە لە کاتی پێغەمبەردابوون (ﷺ) کە بە چاوی خۆیان پێغەمبەریان دەبینیو ئەوەشی خودا بۆی دەناردە خوارەوە لەو شارەزاییو ڕێ پیشاندانەو پشت گیری کردنی خودا بۆی بە زۆر موعجیزەی گەورە ئەمانە دوای ئەم هەموو نیشانەیە جیا دەبوونەوەو لێی دوور دەکەوتنەوەو دەستە دەستە بەملاولادا ڕایان دەکردو بەلەسە دەبوون وەك خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَمَا لَهُمْ عَنِ التَّذْكِرَةِ مُعْرِضِينَ ﴿٤٩﴾ كَأَنَّهُمْ حُمُرٌ مُّسْتَنفِرَةٌ ﴿٥٠﴾ فَرَّتْ مِن قَسْوَرَةٍ﴾[1] واتە: ئەوە چیانە ڕوو وەردەگێڕن لە ئامۆژگاری (قورئان) دەڵێی کەرەکێوی سڵ کەرن، لە شێر (یان لە دەست کۆمەڵە تیرهاوێژ) هەڵهاتوت. وە ئەم ئایەتەش وەك ئەوە کە فەرموویەتی: ﴿فَمَالِ الَّذِينَ كَفَرُوا قِبَلَكَ مُهْطِعِينَ﴾ دەی ئەو بێ دینانە چیانە؟ دێنە لاتو بە مۆنێکەوە دەڕوانن. واتە: ئەی محمد(ﷺ) ئەو خوانەناسانەی کە دێنەلات بۆت دەڕوانن چیانە؟ واتە: بە پەلە ڕادەکەن لێتو دوور دەکەوتنەوە وەك حەسەنی بەسری وتی: ﴿مُهْطِعِينَ﴾ واتە دەڕۆن. وە دەفەرموێت: ﴿عَنِ الْيَمِينِ وَعَنِ الشِّمَالِ عِزِينَ﴾ دەستە دەستە دەبن لەلای ڕاستو چەپەوە. تاکەکەی (عزة) واتە: جیاجیا.[2] ئەمە خوڕەوشتی ئەوانەیە کە بۆت دەڕوانن و دەڕۆن واتە: لەو کاتەدا کە دەستە دەستە جیا دەبنەوە عەوفی وتی: لە ئیبنو عەباسەوە ﴿فَمَالِ الَّذِينَ كَفَرُوا قِبَلَكَ مُهْطِعِينَ﴾ وتی: دێنە لاتو دەڕوانن. ﴿عَنِ الْيَمِينِ وَعَنِ الشِّمَالِ عِزِينَ﴾ وە وتی: (العزين) کۆمەڵێك لە خەڵك لەلای ڕاستو چەپەوە دژایەتی دەکەنو گاڵتەی پێ دەکەن. وە لە جابیری (جابر) کوڕی سەمرەوە (سمرة) کە پێغەمبەر(ﷺ) هات بۆلایان کۆمەڵ کۆمەڵ بوون (حلق) فەرمووی: (مالي اراكم عزين؟) واتە: (چیە دەتان بینم دەستە دەستەن؟)[3] ئیمام احمدو موسلمو ئەبو داودو نەسائیو ئیبنو جەریر (جرير) ڕیوایەتیان کردووە[4] وە خودا دەفەرموێت: ﴿أَيَطْمَعُ كُلُّ امْرِئٍ مِّنْهُمْ أَن يُدْخَلَ جَنَّةَ نَعِيمٍ﴾ ئاخۆ هەر یەکێك لەمانە بەتەمایە کە بچێتە ناو بەهەشتی بەخێروبێر؟. واتە: ئایا ئەوانە بەتەمان لە کاتێکدا کە ڕادەکەنو دەردەکەونەوە لە پێغەمبەر(ﷺ) و لە ڕاستی هەڵدێن کە بخرێنە ناو بەهەشتی پڕ خێرو خۆشی؟. ﴿كَلَّا إِنَّا خَلَقْنَاهُم مِّمَّا يَعْلَمُونَ﴾ هەرگیز

---

[1] المدثر (٤٩_٥١).

[2] الطبری (٢٣/٦٢٠).

[3] الطبری (٢٣/٦٢٠).

[4] احمد (٥/٩٣)، مسلم (١/٣٢٢)، ابو داود (١/٥٦١)، النسائی (٣/٤)، الطبری (٢٣/٦٢٠).

ناشێت، ئەوان بۆ خۆیان دەزانن کە لەچیمان دروست کردوون. نەخێر شوێنیان جەهەننەمە پاشان خودا بڕیاری زیندووکردنەوەو ئەو جەزرەبەیان بۆ دەدات کە باوەڕیان پێ نەدەکردو بە درۆیان دەزانی. ئاگاداریان دەکاتەوەو نیشانیان دەدات کە چۆن لە یەکەم جارەوە هاتوون زیندووکردنەوەیان زۆر ئاسان ترە کە خۆشیان دانی پێدا دەنێن. ﴿إِنَّا خَلَقْنَاهُم مِّمَّا يَعْلَمُونَ﴾ واتە: لە ئاوێکی (منی) لینجی لاوازی بێ بایەخ. وەك خودا فەرموویەتی: ﴿أَلَمْ نَخْلُقكُّم مِّن مَّاءٍ مَّهِينٍ﴾[1] واتە: ئایا ئێوەمان دروست نەکردووە لە ئاوێکی بێ نرخ؟ وە فەرموویەتی: ﴿فَلْيَنظُرِ الْإِنسَانُ مِمَّ خُلِقَ ﴿٥﴾ خُلِقَ مِن مَّاءٍ دَافِقٍ ﴿٦﴾ يَخْرُجُ مِن بَيْنِ الصُّلْبِ وَالتَّرَائِبِ ﴿٧﴾ إِنَّهُ عَلَىٰ رَجْعِهِ لَقَادِرٌ ﴿٨﴾ يَوْمَ تُبْلَى السَّرَائِرُ ﴿٩﴾ فَمَا لَهُ مِن قُوَّةٍ وَلَا نَاصِرٍ﴾[2] واتە: دەی با مرۆڤ سەرنج بدات کە لە چی دروست کراوە، دروست کراوە لە ئاوێکی فڕێدراو (هەڵقوڵاو)، کە دەردەچێت لە ناوەندی پشت (ی پیاو) دانەی (پەراسوی) سنگ (ی ژن)ەوە، بەڕاستی خودا بە دەستەڵاتە لەسەر زیندووکردنەوەی، لە ڕۆژێکدا کە هەرچی نهێنی هەیە ئاشکرا دەکرێت، ئەو نە هێزێك شك دەبات و نە پشتیوانێك. پاشان خودا فەرموویەتی: ﴿فَلَا أُقْسِمُ بِرَبِّ الْمَشَارِقِ وَالْمَغَارِبِ إِنَّا لَقَادِرُونَ﴾ سا سوێند دەخۆم بە دانەری خۆرهەڵات و خۆرئاوایان، ئێمە لە تواناماندایە. واتە: ئەوکەسەی ئاسمانەکان و زەمینی دروست کردوەو خۆرهەڵات و خۆرئاوای تێدا وەدی هێناوەو ئەستێرەکانی ڕام هێناوە لە خۆرهەڵاتەوە هەڵ دێن و لە خۆرئاواوە ئاوا دەبن (دەنیشن) مانای قسەکە ئەوەیە کە بەو شێوەیە نیە ئێوە تێ دەگەن و دەزانن کە زیندووبونەوەو لێ پرسینەوەو کۆکردنەوە نیە. بیگومان ئەمانە هەموو دێت و ڕودەدات. لەبەرئەمە لێرەدا لای (هێناوە) لە پێش سوێندەکەوە واتە: نەخێر. مانای قسەکە ئەوەیە کە ئەوانە وادەزانن قیامەت نیەو ئینکاری دەکەن، کەچی زۆر شتی گەورە دەبینن لە نیشانەی دەستەڵاتی خودا کە زۆر ئاشکراترە لە هەڵسان و هاتنی ڕۆژی قیامەت. کە ئەویش دروست کردنی ئاسمانەکان زەمین و ڕام هێنانی ئەوەی کە تیایاندایە لە دروست کراوەکانی لە زیندەوەرو بێ گیان و هەموو جۆرە دروست کراوەکانی تر. لەبەرئەمە خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿لَخَلْقُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ أَكْبَرُ مِنْ خَلْقِ النَّاسِ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ﴾[3] واتە: بەڕاستی بەدیهێنانی ئاسمانەکان و زەوی گەورەترە لە بەدیهێنانی خەڵکی بەڵام زۆربەی مەردوم ئەمە نازانن. وە فەرموویەتی: ﴿أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّ اللَّهَ الَّذِي خَلَقَ

---

[1] المرسلات (٢٠).

[2] الطارق (٥_١٠).

[3] غافر (٥٧).

ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَلَمْ يَعْىَ بِخَلْقِهِنَّ بِقَٰدِرٍ عَلَىٰٓ أَن يُحْـِۧىَ ٱلْمَوْتَىٰ ۚ بَلَىٰٓ إِنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ﴾[1] واتـە: ئایـا ئەوانە نەیان زانیوە بەڕاستی ئەو خوایەی ئاسمانەکان‌و زەوی دروست کردووە وە لە دروست کردنیـان دا ناتەوان‌و دەستە پاچەنەبووەو بە توانایە مـردوانیش زینـدوو بکاتـەوە بـەڵێ بێگومـان خـودا بەسـەر هـەموو شتێکدا بەتوانایـە. وە لـە ئایـەتێکی تـرا فەرموویـەتی: ﴿أَوَلَيْسَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِقَٰدِرٍ عَلَىٰٓ أَن يَخْلُقَ مِثْلَهُم ۚ بَلَىٰ وَهُوَ ٱلْخَلَّٰقُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٨١﴾ إِنَّمَآ أَمْرُهُۥٓ إِذَآ أَرَادَ شَيْـًٔا أَن يَقُولَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ﴾[2] واتە: ئایا زاتێك كە ئاسمانەکان‌و زەوی بەدی هێناوە ناتوانێت وێنـەیان دروست بکـات؟ بەڵێ دەتوانێت‌و هەر ئەویش دروستکەری زانایە بەڕاستی کاری ئەو (خودا) ئەمەیـە هـەرکاتێك بیـەوێت شتێك بەدی بێنێت پێی دەڵێت: ببە دەست بەجێ (ئەو شتە) دەبێت. وە لێرەدا فەرموویەتی: ﴿فَلَآ أُقْسِمُ بِرَبِّ ٱلْمَشَٰرِقِ وَٱلْمَغَٰرِبِ إِنَّا لَقَٰدِرُونَ ﴿٤٠﴾ عَلَىٰٓ أَن نُّبَدِّلَ خَيْرًا مِّنْهُمْ وَمَا نَحْنُ بِمَسْبُوقِينَ﴾ کە بیان گـۆڕین‌و چاکتریان بێنینـە جێ، کەس پێشی ئێمە ناکەوێت. واتـە: ڕۆژی قیامـەت زینـدوویان دەکەینـەوە. بـە بـەژن‌و باڵایـەکی وا چاکتر لەمەی دنیا چونکە توانای چاکترە بـۆ ئـەوەی ﴿وَمَا نَحْنُ بِمَسْبُوقِينَ﴾ واتـە: ئێمـە بـێ توانا نـین‌و کەس پێش ئێمەش ناکەوێت. وەك خـودا فەرموویـەتی: ﴿أَيَحْسَبُ ٱلْإِنسَٰنُ أَلَّن نَّجْمَعَ عِظَامَهُۥ ﴿٣﴾ بَلَىٰ قَٰدِرِينَ عَلَىٰٓ أَن نُّسَوِّىَ بَنَانَهُۥ﴾[3] واتە: ئایا مرۆڤ وادەزانێت کـە ئێسقانە (ڕزیوەکـانی) کۆناکەینـەوە؟ بـەڵێ: بـەتواناین لەسەر ڕێك خـستنەوەی (نەقـشی) سـەر پەنجـەکانی. وە فەرموویـەتی: ﴿نَحْنُ قَدَّرْنَا بَيْنَكُمُ ٱلْمَوْتَ وَمَا نَحْنُ بِمَسْبُوقِينَ ﴿٦٠﴾ عَلَىٰٓ أَن نُّبَدِّلَ أَمْثَٰلَكُمْ وَنُنشِئَكُمْ فِى مَا لَا تَعْلَمُونَ﴾[4] واتـە: ئێمـە لەناوتانـدا مردنمـان دانـاوە وەکەس پێش دەسەڵاتی ئێمە ناکەوێت، کە لەجیاتی ئێوە نەوەی تر بێنین وە دروستتان بکەینەوە بە شێوەیەك کە هیچی لێ نازانن. ئیبنو جـەریر ئەمـەی هەڵبـژاردوە ﴿عَلَىٰٓ أَن نُّبَدِّلَ خَيْرًا مِّنْهُمْ﴾ واتـە: خـەڵکێك (گەلێك) کە گوێڕایـەڵمان بن‌و لـە فەرمانـەکانمان دەرنەچن وەك ئـەم ئایەتـەی لێ کـردووە (تەفـسیری کردووە) کە خودا دەفـەرموێت: ﴿وَإِن تَتَوَلَّوْا۟ يَسْتَبْدِلْ قَوْمًا غَيْرَكُمْ ثُمَّ لَا يَكُونُوٓا۟ أَمْثَٰلَكُم﴾[5] واتـە: جا ئەگەر ئێوە پشت هەڵبکەن ئێوە دەگۆڕێت بە کەسانێکی تر (ی زۆر چاك) کە وەکو ئێوە نـابن. واتـای

---

[1] الاحقاف (٣٣).

[2] يس (٨١_٨٢).

[3] القيامة (٣_٤).

[4] الواقعة (٦٠_٦١).

[5] محمد (٣٨).

یەكەم دیارو ئاشكراترە بە بەڵگەی چەند ئایەتی تر لەو بارەیەوە لەسەری والله سبحانە وتعالی اعلم.

پاشان خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَذَرْهُمْ يَخُوضُوا وَيَلْعَبُوا حَتَّىٰ يُلَاقُوا يَوْمَهُمُ الَّذِي يُوعَدُونَ﴾ سا تۆ لەوانە واز بێنە با هەر چەنەچەن و گاڵتەی خۆیان بكەن، تاكو تووشی ڕۆژی خۆمان دەبن كەوا بەڵێنیان پێ دەدرێت. ﴿فَذَرْهُمْ﴾ واتە: ئەی محمد ﴿يَخُوضُوا وَيَلْعَبُوا﴾ وازیان لێ بێنە لە ئینكاریو باوەڕ نەكردن و خوانەناسیان، ﴿حَتَّىٰ يُلَاقُوا يَوْمَهُمُ الَّذِي يُوعَدُونَ﴾ واتە: بەم زوانە ئەوەی چاوەڕوانی دەكەن پێی دەگەن وە تاڵاوەكەی دەچەژن. ﴿يَوْمَ يَخْرُجُونَ مِنَ الْأَجْدَاثِ سِرَاعًا كَأَنَّهُمْ إِلَىٰ نُصُبٍ يُوفِضُونَ﴾ ئەو ڕۆژە لە گۆڕستان دێنە دەرێ، هێندە بە پەلەن دەڵێی بەرەو بتەكانیان ڕادەكەن. واتە: هەڵدەسن لە گۆڕستان وەختێك پەروەردەی مەزنیان بانگیان دەكات بۆ شوێنی لێ پرسینەوە بەپەلە دەڵێی بەرەو بتەكانیان ڕادەكەن. ئیبنو عەباس و موجاهدو زەحاك (ضحاك) وتیان: بۆلای ئاڵایەك ڕادەكەن. ئەبولعالیە (ابوالعالیە) ویحیی كوڕی ئەبو گەسیر (كثیر) وتیان: واتە بۆلای مەبەستێك ڕادەكەن. حەسەنی بەسری (الحسن البصری) خوێندویەتیەوە بە ﴿نُصُبٍ﴾ بە زەمی سادو نونەكە كە ئەوەیش بەمانای بت دێت. واتە: ئەوەندە بەپەلەن بۆ ئەو شوێنی وەستانە وەك ئەوەی لە دنیادا چۆن بەرەو بتەكانیان دەچوون و ڕایان دەكرد كاتێك چاویان پێی دەكەوت پێشبڕكێیان دەكرد كە كەمیان لە پێشدا دەستی لێ دەدات؟ ئەمەش ڕیوایەت كراوە لە موجاهدو یحیی كوڕی ئەبو كسیر (كثیر) ـ مسلم البطین ـ قەتادەو زەحاك (ضحاك) ڕەبیعی كوڕی ئەنەس و ئەبو صاڵح و عاسمی (عاصم) كوڕی بەهدەلە (بهدلة) و ئیبنو زەیدو كەسانی تریش. وە خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿خَاشِعَةً أَبْصَارُهُمْ تَرْهَقُهُمْ ذِلَّةٌ ۚ ذَٰلِكَ الْيَوْمُ الَّذِي كَانُوا يُوعَدُونَ﴾ چاو شۆڕن و سوكایەتی دەوری داون، ئەمە ئیتر ئەو ڕۆژەیە كەوا بەڵێنیان پێدەدرا. ﴿خَاشِعَةً أَبْصَارُهُمْ﴾ واتە: چاو شۆڕن، ﴿تَرْهَقُهُمْ ذِلَّةٌ﴾ واتە: لەبری ئەوەی كە خۆیان بەزل دەزانی لە دنیاو گوێڕایەڵی فەرمانی خودایان نەدەكرد، ﴿ذَٰلِكَ الْيَوْمُ الَّذِي كَانُوا يُوعَدُونَ﴾ ئەمە ئیتر ئەوڕۆژەیە كەوا بەڵێنیان پێدەدرا.

## تەفسیری سورەتی نوح (علیه السلام)

## لە مەککە هاتوەتە خوارەوە

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

﴿إِنَّآ أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوْمِهِۦٓ أَنْ أَنذِرْ قَوْمَكَ مِن قَبْلِ أَن يَأْتِيَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿١﴾ قَالَ يَٰقَوْمِ إِنِّى لَكُمْ نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴿٢﴾ أَنِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ وَٱتَّقُوهُ وَأَطِيعُونِ ﴿٣﴾ يَغْفِرْ لَكُم مِّن ذُنُوبِكُمْ وَيُؤَخِّرْكُمْ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى ۚ إِنَّ أَجَلَ ٱللَّهِ إِذَا جَآءَ لَا يُؤَخَّرُ ۖ لَوْ كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٤﴾﴾

### نوح هۆزەکەی بانگ کرد

خـــودای گـــەورە دەفـــەرموێت: ﴿إِنَّآ أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوْمِهِۦٓ أَنْ أَنذِرْ قَوْمَكَ مِن قَبْلِ أَن يَأْتِيَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ ئێمە نووحمان بەڕێ کردە لای هۆزەکەی کە: هۆزەکەت بترسێنە بەر لەوەی تووشی ئازاری بەژان ببن. خودای گەورە باسی نوح پێغەمبەرمان بۆ دەکات (علیه السلام) کە ناردیە لای هۆزەکەی فەرمانی پێ کرد کە هۆزەکەی بترسێنێت لە تۆڵەی خودا پێش ئەوەی تووش ببن ئەگەر پەشیمان بونەوەو گەڕانەوە سزاکە لەسەریان لادەبات و فەرمووی: ﴿أَنْ أَنذِرْ قَوْمَكَ مِن قَبْلِ أَن يَأْتِيَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ واتە: ترساندنەکەی بۆ ڕون کردنەوە بە ئاشکرا تێی گەیاندن و پێی وتن، وەك خودا دەفەرموێت: ﴿قَالَ يَٰقَوْمِ إِنِّى لَكُمْ نَذِيرٌ مُّبِينٌ﴾ وتی: ئەی هۆزەکەم من بۆ ئێوە ترسێنەرێکی ئاشکرام و (پێتان دەڵێم). ﴿أَنِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ وَٱتَّقُوهُ وَأَطِيعُونِ﴾ خودا پەرستی بکەن و لێی بترسن و بەگوێم بکەن. واتە: واز بێنن لە قەدەغە کراوەکانی خوداو دوور کەوتنەوە لە گوناهەکان، ﴿وَأَطِيعُونِ﴾ بەگوێم بکەن لەو شتانەی داواتان لێ دەکەم و دوورکەونەوە لەو شتانەی پێتان دەڵێم مەیکەن. وە فەرموویەتی: ﴿يَغْفِرْ لَكُم مِّن ذُنُوبِكُمْ وَيُؤَخِّرْكُمْ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى ۚ إِنَّ أَجَلَ ٱللَّهِ إِذَا جَآءَ لَا يُؤَخَّرُ ۖ لَوْ كُنتُمْ تَعْلَمُونَ﴾ لـــە گوناهـــەکانتان دەبووریێت و دەتان هێڵێت تا ماوەیەکی دیاری کراو، چونکە هەرکاتێك سزای خودا هات دواناخرێت، خۆزگە ئەوەتان بزانیایە. ﴿يَغْفِرْ لَكُم مِّن ذُنُوبِكُمْ﴾ واتە: وەختێك ئەوەی فەرمانم پێی کردن بەجێتان هێناو باوەڕتان کرد بەوەی کە من پێی هاتووم بۆتان لە گوناهتان دەبورێت. وە وتراوە ﴿مِّن﴾ لێرەدا زیادەیە. بەڵام ئەم قسەیە کە ﴿مِّن﴾ زیادەیە لە ئیسپاددا کەمە (فی الاثبات قلیل) واتە: خودا تەمەنتان درێژ دەکات و ئەو ئازارەتان لەسەر لادەبات کە دێت بۆتان ئەگەر دوور بکەونەوە لەو شتانەی کە داوای لێ کردن نەیکەن. وە ئەوانەی کە دەڵێن: خوا پەرستی و چاکەو بەجێ هێنانی هەقی

خزمایـەتی (صـلە الـرحم) بـیٚ گومـان دەبیٚتـە هـۆی تەمـەن دریـژی، ئـەم ئایەتـە دەکەنـە بەلگـە بـۆ قسەکەیان. فەرمودەش لەم بارەیەوە هاتووە وەك (بەسەرکردنەوەی خزم (کەس و کار_ صلە الرحم) دەبیٚتە هۆی تەمەن دریٚژی)[1]. خودای گەورە دەفـەرموویٚت: ﴿إِنَّ أَجَلَ ٱللَّهِ إِذَا جَآءَ لَا يُؤَخَّرُ لَوْ كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴾ واتە: پەلەبکەن گویٚرایـەلّی فـەرمانی خـودا بکـەن پـیٚش دابـەزینی سـزا وەختیٚـك خـودا فـەرمانی دا سزاتان بدات هیچ کەس بەری ناگریٚت و نایگیٚریٚتەوە. چونکە ئەو خودا مەزنەی کە هـەموو شـتیٚکی تـیٚ شکاندووە و ئەو خاوەن دەستەلاٚتەیە کە هەموو دروست کراوەکانی سەری بۆ دادەنویٚنن.

﴿قَالَ رَبِّ إِنِّي دَعَوْتُ قَوْمِي لَيْلًا وَنَهَارًا ﴿٥﴾ فَلَمْ يَزِدْهُمْ دُعَآءِيٓ إِلَّا فِرَارًا ﴿٦﴾ وَإِنِّي كُلَّمَا دَعَوْتُهُمْ لِتَغْفِرَ لَهُمْ جَعَلُوٓا۟ أَصَٰبِعَهُمْ فِيٓ ءَاذَانِهِمْ وَٱسْتَغْشَوْا۟ ثِيَابَهُمْ وَأَصَرُّوا۟ وَٱسْتَكْبَرُوا۟ ٱسْتِكْبَارًا ﴿٧﴾ ثُمَّ إِنِّي دَعَوْتُهُمْ جِهَارًا ﴿٨﴾ ثُمَّ إِنِّيٓ أَعْلَنتُ لَهُمْ وَأَسْرَرْتُ لَهُمْ إِسْرَارًا ﴿٩﴾ فَقُلْتُ ٱسْتَغْفِرُوا۟ رَبَّكُمْ إِنَّهُۥ كَانَ غَفَّارًا ﴿١٠﴾ يُرْسِلِ ٱلسَّمَآءَ عَلَيْكُم مِّدْرَارًا ﴿١١﴾ وَيُمْدِدْكُم بِأَمْوَٰلٍ وَبَنِينَ وَيَجْعَل لَّكُمْ جَنَّٰتٍ وَيَجْعَل لَّكُمْ أَنْهَٰرًا ﴿١٢﴾ مَّا لَكُمْ لَا تَرْجُونَ لِلَّهِ وَقَارًا ﴿١٣﴾ وَقَدْ خَلَقَكُمْ أَطْوَارًا ﴿١٤﴾ أَلَمْ تَرَوْا۟ كَيْفَ خَلَقَ ٱللَّهُ سَبْعَ سَمَٰوَٰتٍ طِبَاقًا ﴿١٥﴾ وَجَعَلَ ٱلْقَمَرَ فِيهِنَّ نُورًا وَجَعَلَ ٱلشَّمْسَ سِرَاجًا ﴿١٦﴾ وَٱللَّهُ أَنۢبَتَكُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ نَبَاتًا ﴿١٧﴾ ثُمَّ يُعِيدُكُمْ فِيهَا وَيُخْرِجُكُمْ إِخْرَاجًا ﴿١٨﴾ وَٱللَّهُ جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ بِسَاطًا ﴿١٩﴾ لِّتَسْلُكُوا۟ مِنْهَا سُبُلًا فِجَاجًا ﴿٢٠﴾﴾

### (دلگرانی) بیٚزاری نوح بەوەی کە توشی بووە بەدەست هۆزەکەیەوە

خودای گـەورە دەفـەرموویٚت: ﴿قَالَ رَبِّ إِنِّي دَعَوْتُ قَوْمِي لَيْلًا وَنَهَارًا﴾ وتـی: ئـەی پەروەرنـدەی مـن! بـە شەو و بە ڕۆژ بانگم کردن. خوای گەورە باسی بەندەو پیٚغەمبەری خۆی نوح دەکات کە نیگەرانی خۆی دەردەبریٚت لەلای پەروەرندەی بەوەی کە بەسەری هاتووە لە ناو هۆزەکەیدا کە چەند بە ئارام بووە لە ناویاندا ئەو هەموو ماوە دوورو دریٚژە کە نۆسەدو پەنجا ساڵ خـۆی مانـدوو کـردووە ئامۆژگـاری زۆری کردوون هەموو شتیٚکی بۆ ڕوون کردونەتەوە بانگی کردوون بۆ سەر ڕیٚگـای ڕاسـت وتـی: ﴿رَبِّ إِنِّي دَعَوْتُ قَوْمِي لَيْلًا وَنَهَارًا﴾ واتـە: وازم لیٚ نەهیٚناون بە بەردەوام بانگم کردوون بەشـەو و بـەڕۆژ لـە بـەر گویٚرایـەلّی و جـیٚ بـەجیٚ کردنـی و فـەرمانی تـۆ ﴿فَلَمْ يَزِدْهُمْ دُعَآءِيٓ إِلَّا فِرَارًا﴾ بـەلاٚم بـە بـانگ کردنـی مـن! پـتر دوور دەکەوتنـەوە لـیٚم. واتـە: هـەموو کاتیٚـك کـە بـانگم کـردوون بـەرەو ڕاسـتی بـیٚن ڕایـان کـردووەو دوور کەوتونەتـەوەو لایـان داوە. ﴿وَإِنِّي كُلَّمَا دَعَوْتُهُمْ لِتَغْفِرَ لَهُمْ جَعَلُوٓا۟ أَصَٰبِعَهُمْ فِيٓ ءَاذَانِهِمْ وَٱسْتَغْشَوْا۟ ثِيَابَهُمْ

---

[1] ابن شهاب (٩٣/١).

وَأَصَرُّواْ وَٱسْتَكْبَرُواْ ٱسْتِكْبَارًا ﴾ هەرچەندە من تێم گەیاندن، کە تۆ لە گوناهیان دەبوریت، گوێیان بە پەنجەکانیان دەئاخنیو پۆشاکەکانیان بەسەر خۆیاندا دەداو پێیان دادەگرتو خۆیانیان زۆر بەزل دەزانی. واتە: گوێی خۆیان ئاخنی بۆ ئەوەی گوێیان لێ نەبێت لەوەی کە من بانگیان دەکەم بۆیە وەك چۆن خودا باسی خودانەناسەکانی قورەیشی کردوەو فەرموویەتی: ﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَا تَسْمَعُواْ لِهَٰذَا ٱلْقُرْءَانِ وَٱلْغَوْاْ فِيهِ لَعَلَّكُمْ تَغْلِبُونَ ﴾[1] واتە: وەبێ باوەڕان (بەیەکتریان) دەووت گوێ مەگرن بۆ ئەم قورئانە وەقسەی پڕو پوچی تێکەڵ بکەن بەڵکو سەرکەون (بەسەریدا). وە فەرموویەتی: ﴿وَٱسْتَغْشَوْاْ ثِيَابَهُمْ ﴾ ئیبنو جەریر وتی لەئیبنو عەباسەوە: خۆیان هەڵکرد لێی وەك ئەوەی کە نایناسن بۆ ئەوەی پێیان نەزانێت. سەعیدی کوڕی جوبەیرو سودی وتیان: سەریان داپۆشی بۆ ئەوەی گوێیان لێ نەبێت لەوەی دەیڵێت ﴿وَأَصَرُّواْ ﴾ واتە: بەردەوام بوون لەسەر ئەو بت پەرستیو بێ دینیەیان. ﴿وَٱسْتَكْبَرُواْ ٱسْتِكْبَارًا ﴾ لوت بەرزبوونو پێیان نەنگ بوو شوێنی راستی بکەونو ملی بۆ دانەوێنن. پاشان دەفەرموێت: ﴿ ثُمَّ إِنِّي دَعَوْتُهُمْ جِهَارًا ﴾ هەمیسان بەدەنگی بەرز بانگم کردن. واتە: بەدەنگی بەرز لەنێوان خەڵکیدا. ﴿ ثُمَّ إِنِّيٓ أَعْلَنتُ لَهُمْ وَأَسْرَرْتُ لَهُمْ إِسْرَارًا ﴾ لەدوایشدا بەئاشکراو بە پەنامەکی تێم گەیاندن. واتە: بەئاشکرا قسەم بۆ کردن بەدەنگی بەرز ﴿وَأَسْرَرْتُ لَهُمْ إِسْرَارًا ﴾ واتە: بە تەنهاش لە بەینی خۆمو خۆیاندا بە هەموو شێوەیەك بانگم دەکردن بۆ ئەوەی باشتر کاریان تێ بکات.

### ئەوەی نوح دەیگوت وەختێك بانگی هۆزەکەی دەکرد بۆ لای خودا

خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَقُلْتُ ٱسْتَغْفِرُواْ رَبَّكُمْ إِنَّهُۥ كَانَ غَفَّارًا ﴾ هەرپێم وتن: داوای لێ بووردن لە پەروەردەتان بکەن، ئەو بێ گومان زۆر لێبوردەیە. واتە: بگەڕێنەوە بۆلای خودا وە بگەڕێنەوە لەوەی کە لە سەری بەردەوامن وە زوو پەشیمان ببنەوە. بێ گومان هەر کەسێك بگەڕێتەوە بۆلای خودا لێی دەبورێت با هەر چەندە تاوانیشی زۆر بێت لە بێ دینیو بت پەرستی. بۆیە فەرموویەتی: ﴿فَقُلْتُ ٱسْتَغْفِرُواْ رَبَّكُمْ إِنَّهُۥ كَانَ غَفَّارًا ﴿١٠﴾ يُرْسِلِ ٱلسَّمَآءَ عَلَيْكُم مِّدْرَارًا ﴾ تا لە حەواوە بارانێکی پەڵەدەرتان بۆ بنێرێت. واتە: بارانی بەردەوام. بۆیە سونەتە خوێندنی ئەم سورەتە لە نوێژە بارانەدا (صلاة الاستسقاء) لەبەر ئەم ئایەتە. وە هەر بەم شێوەیە گەورەی موسوڵمانان عومەری کوڕی خەتاب (ڕەزای خوای لێ بێت) ڕۆیشتە سەر دوانگە (المبر) بۆ پاڕانەوەی باران بارین هەر داوای لێ

---

[1] فصلت (٢٦).

بووردنی دەکرد لـە خـوای گـەورەو ئـەو ئایەتانـەی دەخوێنـدەوە کـە باسـی لێ بووردنیـان دەکـرد. لـەو ئایەتانـەی دەیخوێنـد ئـەم دوو ئایەتـە بـوون ﴿فَقُلْتُ ٱسْتَغْفِرُواْ رَبَّكُمْ إِنَّهُۥ كَانَ غَفَّارًا ⑩ يُرْسِلِ ٱلسَّمَآءَ عَلَيْكُم مِّدْرَارًا﴾ پاشان فەرمووی: داوای بارانم کرد بەو بایەی کە بارانی پێ دەبارێت لە ئاسمانـدا. ئیبنـو عەباسو کەسانی تریش وتویانـە: بـاران لـە دوای بـاران بەسـەر یەکـەوە. وە دەفـەرموێت: ﴿وَيُمْدِدْكُم بِأَمْوَٰلٍ وَبَنِينَ وَيَجْعَل لَّكُمْ جَنَّٰتٍ وَيَجْعَل لَّكُمْ أَنْهَٰرًا﴾ بە داراییو بە کـوڕانیش یارمـەتیتان بـداتو باغاتمـان بـۆ پەیدا بکاتو جۆبارتان بۆ وەدی بێنێت. واتە: وەختێـك گـەڕانـەوە بـۆ لای خـوداو داوای لێ بووردنتـان لێ کردو فەرمانەکانیتان جێ بەجێ کرد ڕۆزیتان زۆر دەبێـتو لـە ئاسمانـەوە بـارانی پـڕ خێـرو بێرتـان بـۆ دەبارێنێتو دارودرەختی پڕ بەرهەمو کشتوکاڵی چاکو مەڕوماڵاتەکانشتان شیریان زۆر دەبێت سامانو منداڵیشتان پێ دەدات. واتە: ماڵو منداڵی پێ داون وە باغاتی زۆر کە پڕە لە هەموو جۆرە میوەیەكو بەناویشیاندا جۆبار تێدەپەڕێت ئەم بەقسەی خۆشو دڵ هێنانەوە پاشان بانگیان دەکاتو هەڕەشەیان لێ دەکات فەرموویەتی: ﴿مَّا لَكُمْ لَا تَرْجُونَ لِلَّهِ وَقَارًا﴾ چۆن لە شکۆی خودا ناترسن، واتە: گەورەیی، شکۆ. ئیبنـو عـەباسو موجاهـدو زەحـاك (ضـحاك) وتویانـە.[1] ئیبنـو عـەباس وتـی: خـودا بەگـەورە نـاگرن بەوشێوەیەی پێویستەو داواتان لێ دەکات. واتە: لە تۆڵەو سزای خـودا ناترسـن.[2] ﴿وَقَدْ خَلَقَكُمْ أَطْوَارًا﴾ کە چی ئێوەی پلەپلە وەدی هێنا، وتراوە: واتە لە ئاوێکی لینج ﴿نطفة﴾ پاشان لە پارچـەیە خـوێنێکی بەستراو (جامد) پاشان لە پارچە گۆشتێك. ئیبنو عەباسو قەتادەو یەحیای کوڕی رافعو سودیو ئیبنو زەید وتویانە. وە دەفەرموێت: ﴿أَلَمْ تَرَوْاْ كَيْفَ خَلَقَ ٱللَّهُ سَبْعَ سَمَٰوَٰتٍ طِبَاقًا﴾ ئـاخۆ بـە چـاو نەتانـدیووە چۆن خودا حەوت بەرزایی (توێ لەسەر توێ) ئافراندوە؟. واتە: یەك لەسەر یەك. پاشان خـوای گـەورە دەفـــەرموێت: ﴿أَلَمْ تَرَوْاْ كَيْفَ خَلَقَ ٱللَّهُ سَبْعَ سَمَٰوَٰتٍ طِبَاقًا ⑮ وَجَعَلَ ٱلْقَمَرَ فِيهِنَّ نُورًا وَجَعَلَ ٱلشَّمْسَ سِرَاجًا﴾ لە ناویاندا مانگی تریفەدار کـردو خۆریـشی کـردە چـرایەك. واتـە: ڕوناکیـەکانیان جیـاوازە هەریەکـە شێوەیەکی تایبەتی خۆی هەیە بۆ ئـەوەی شـەو ڕۆژ جیابکرێتـەوە بـە هـەڵهاتنی خـۆر و ئـاوابوونی وە مانگیش شوێنەکانو بورجەکانی دیاری کراوەو ڕۆشنایەکەی جیاوازەو ڕۆشنایەکەی زیـاد دەکـات هـەتا تەواو پڕ دەبێت پاشان وردە وردەکەم دەکات هەتا لە بەر چاو ون دەبێتو خۆی دەشارێتەوە دەبێتـە نیشانەی تێپەڕ بوونی مانگەکانو ساڵەکان. وەك خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿هُوَ ٱلَّذِى جَعَلَ ٱلشَّمْسَ

---

[1] الطبری (٦٣٤/٢٣).

[2] الطبری (٦٣٤/٢٣).

ضِيَآءً وَٱلْقَمَرَ نُورًا وَقَدَّرَهُۥ مَنَازِلَ لِتَعْلَمُوا۟ عَدَدَ ٱلسِّنِينَ وَٱلْحِسَابَ ۚ مَا خَلَقَ ٱللَّهُ ذَٰلِكَ إِلَّا بِٱلْحَقِّ ۚ يُفَصِّلُ ٱلْءَايَٰتِ لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ ﴾[1] واتە: خودا زاتێکە کە خۆری گێڕاوە بەتیشك مانگیشی گێڕاوە بە ڕووناکی بۆ (گەڕانی) مانگ چەند قۆناغێکی دیاری کردووە بۆ ئەوەی ژمارەی ساڵەکانو حیسابی (مانگو ڕۆژی) پیَ بزانن خودا دەوانەی دروست نەکردووە بە حەقو ڕاستی نەبێت ئایەتەکان شی دەکاتەوە بۆ کۆمەڵێك کە زانانو تیَ دەگەن. دەفەرموێت: ﴿وَٱللَّهُ أَنۢبَتَكُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ نَبَاتًا﴾ هەر خودایە ئێوەی لەم زەمینە ڕواند بەڕواندن. ﴿نَبَاتًا﴾ ئیسمی مەصدەرە (اسم مصدر) هێنانی لێرەدا چاكو جوانە. ﴿ثُمَّ يُعِيدُكُمْ فِيهَا وَيُخْرِجُكُمْ إِخْرَاجًا﴾ پاشان دەتانباتەوە ناویو دیسان دەرتان دەکاتەوە، بە دەرکردن. واتە: وەختێك مردن وە ڕۆژی قیامەت دەرتان دەکاتەوە چۆن یەکەم جار وەدی هێنان و دەفەرموێت: ﴿وَٱللَّهُ جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ بِسَاطًا﴾ هەر خودایە زەوی بۆ کردوون بە ڕایەخ. واتە: ڕای خستوەو تەختی کردوەو دایمەزراندوەو وەستاندویەتیو بە کێوە بەرزەکان. ﴿لِّتَسْلُكُوا۟ مِنْهَا سُبُلًا فِجَاجًا﴾ کە ئێوە لە ڕێگە پانو بەرینەکانیدا بێنو بچن. واتە: دروستی کردووە بۆ ئێوە بۆ ئەوەی دانیشنو بگەڕێن لە ناویداو بۆ هەر شوێنێكو جێگایەکی بتانەوێت بڕۆن، بگەڕێن. ئەم هەموو ئامۆژگاریو ئاگادار کردنەوەی نوح پێغەمبەر(علیه السلام) بۆ ئەوەبوو کە تێیان بگەیەنێت کە خودای گەورە زۆر بە توانایەو خاوەنی دەستەڵاتێکی بیَ پایانە ئاسمانەکانو زەمینی وەدی هێناوەو بەهرەو چاکەی زۆری پیَ بەخشیون وە هەر ئەوە وەدی هێنەرو بژێوی دەرو ئاسمانی ڕاگرتووەو زەمینیشی کردووە بە ڕایەخ. وە هەر ئەویشە پێویستە بەندایەتی بکرێت بە تەنهاو هاوەڵی بۆ دانەنرێت لە هیچ شتێکدا. بیَ وێنەیەو لە کەس ناچێتو نە منداڵو نە خێزانو نە وەزیرو نە بریکارو نە ڕاوێژکاری نیە بەڵکو ئەو خودایەکی مەزنو خاوەن دەستەڵاتە.

﴿قَالَ نُوحٌ رَّبِّ إِنَّهُمْ عَصَوْنِى وَٱتَّبَعُوا۟ مَن لَّمْ يَزِدْهُ مَالُهُۥ وَوَلَدُهُۥٓ إِلَّا خَسَارًا ﴿٢١﴾ وَمَكَرُوا۟ مَكْرًا كُبَّارًا ﴿٢٢﴾ وَقَالُوا۟ لَا تَذَرُنَّ ءَالِهَتَكُمْ وَلَا تَذَرُنَّ وَدًّا وَلَا سُوَاعًا وَلَا يَغُوثَ وَيَعُوقَ وَنَسْرًا ﴿٢٣﴾ وَقَدْ أَضَلُّوا۟ كَثِيرًا ۖ وَلَا تَزِدِ ٱلظَّٰلِمِينَ إِلَّا ضَلَٰلًا ﴿٢٤﴾﴾

---

[1] یونس (٥).

**نوح هاواری خۆی برد بۆ خودا پاش ئەوەی هۆزەکەی بەو شێوەیە وەڵامیان دایەوە**

خـودای گـەورە فەرموویـەتی: ﴿نُوحٌ رَّبِّ إِنَّهُمْ عَصَوْنِى وَٱتَّبَعُوا۟ مَن لَّمْ يَزِدْهُ مَالُهُۥ وَوَلَدُهُۥٓ إِلَّا خَسَارًا﴾ نـوح وتی: ئەی پەروەردگارم! ئەمانە لە من یاخی بوون، ئەمانە شوێن کەسێك کـەوتوون کە مـاڵو منداڵیان قازانجی پێ نەگەیاندون جگە لە زیان نەبێت. خودای گەورە باسی دڵ گرانی نوح دەکات لـە گەلەکەی. ئەو خودایەی کە خۆی ئاگای لە هەموو شتێکە هیچی لێ ون نابێت، لەو ئاگاداریەی کە نوح لـە پێشەوە کـردیو لـە شـێوازی بـانگ کردنیـان جارێـك بـە دڵخـۆش کـردنو جـارێکی تـر بـە هەڕەشـە لێ کـردنو ترساندنیان کەچی ئەوان گوێیان پێ نەداو دژی وەستانو باوەڕیان پـێ نـەکرد وەشـوێن کەسانی دنیا پەرست کەوتن ئەوانەی کە فەرمانی خودایان پـشت گـوێ دەخـستو دڵخـۆش بـوون بـە مـاڵو منـداڵو ئەمەش لەڕاستیدا خەڵافاندنو مۆڵەت پێ دانێك بوو نەوەك ڕێز لێنان بۆیە خودا فەرموویەتی: ﴿وَٱتَّبَعُوا۟ مَن لَّمْ يَزِدْهُ مَالُهُۥ وَوَلَدُهُۥٓ إِلَّا خَسَارًا﴾ ـ وَوَلَدُهُۥٓ ـ بەزەمـەو بـە فەتحـەیش (بالـضمة والفـتح) خوێنراوەتـەوە. هـەردووکیان گونجـاوە. وە دەفـەرموێت: ﴿وَمَكَرُوا۟ مَكْرًا كُبَّارًا﴾ وە پـیلانو فـڕ فێڵـی زۆر گـەورەیان کرد. موجاهد وتی: ﴿كُبَّارًا﴾ واتە گەورە.[1] ئیبنو زەید وتی: ﴿كُبَّارًا﴾ واتە زل، مـەزن.[2] وە مانـای ئـەم ئایەتـە کـە خـودا دەفـەرموێت: ﴿وَمَكَرُوا۟ مَكْرًا كُبَّارًا﴾ واتـە: شـوێن کـەوتووەکانیان خەڵەتانـدو فریویان دان بەوەی کە ئەمانە لەسەر ڕێگای ڕاستنو شارەزان، بۆیە لێرەدا فەرموویەتی: ﴿وَمَكَرُوا۟ مَكْرًا كُبَّارًا﴾.

**بتەکانی هۆزی نوح و بەسەرهاتیان**

خودای گـەورە فەرموویـەتی: ﴿وَقَالُوا۟ لَا تَذَرُنَّ ءَالِهَتَكُمْ وَلَا تَذَرُنَّ وَدًّا وَلَا سُوَاعًا وَلَا يَغُوثَ وَيَعُوقَ وَنَسْرًا﴾ وتووشیانە: لەوانەی پەرستووتانن مەتەکنـەوەو هـەرگیز لـە (وەدد)و (سـواع) دەسـت بەرمـەدەن، لـە (یەغوس)و (یدعوُق)و (نەسر) یش هـەروەها. ئەمانـە نـاوی ئـەو بتانـە بـوون بێجگـە لـە خـودا دەیـان پەرستن. بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەباس: ئەو بتانە کە هـۆزی نـوح دەیانپەرسـتن بـوون بـە بتـی عەروبـەکان لـە دواییـداو دەیـان پەرسـتن. (وەدد) بـووە بتـی کـەلب لـە دومـەتل جەنـدەل (دومـة الجندل)، (سواع) بووە بتی هوزەیل (الهذیل) (یـەغوس) بـووە بتـی (مـراد) و پاشـان بـووە بتـی بـەنو غەتیف (بنو غطیف) لە (جرف) لە (سەبەء) یەعوق بووە بتی هەمدان (الهمدان)، نەسریش (نسر) بـووە

---

[1] الطبری (٢٣/٦٣٨).

[2] الطبری (٢٣/٦٣٨).

بتی حەمیر (حمیر) لە ئالی زی کلاع (ال ذی کلاع)، ئەمانە ناوی پیاو چاکانی هۆزی نوح بوون (علیه السلام) وەختێك مردن شەیتان نایە دڵیانەوە کە هەیکەلیان لە شوێنی کۆبونەوەکانیاندا بۆ دروست بکەنو هەر بتێك ناوی یەکێك لەو پیاو چاکانەیان لێ بنێن. ئەمانە نەدەپەرستران هەتا کاتێك مردنو زانیاری لەبارەیانەوە نەما پاشان هەیکەلیان بۆ دروست کردنو پەرستنیان.[1] هەر بەم شێوەیە ڕیوایەت کراوە لە عیکرەمەو زەحاك (ضحاك)و قەتادەو ئیبنو ئیسحاقەوە. وە علی کوڕی ئەبو تەلحەوە (طلحة) وتی لە ئیبنو عەباسەوە: ئەمانە ئەو بتانە بوون لە چەرخی نوح پێغەمبەردا دەپەرستران[2] ئیبنو جەریر ڕیوایەتی کردووە لە محمدی کوڕی قەیسەوە (قیس) کە (یەغوسو یەعوقو نەسر) وتی: ئەمانە پیاو چاکانێك بوون لە نێوان ئادەم پێغەمبەر(علیه السلام) و نوح پێغەمبەردا (علیه السلام) ژیاون خەڵکی زۆر شوێنیان کەوتون وەختێك مردن هاوەڵەکانیان ئەوانەی شوێنیان کەوتبوون وتیان: خۆ ئەگەر وێنەیان بکێشین لەبەر چاومان بن خوانەناسیەکەمان چاکترو بەلەزەت تر دەبێت. وێنەیان کێشانو کاتێك مردن ئەوانەی پاش ئەمان شەیتان نایە دڵیانەوە وتیان: بۆیە دەیانپەرستن چونکە بەهۆی ئەوانەوە بارانیان بۆ باریووە پاشان پەرستنیان.

## دوعا کردنی نوح لەو کەسانەی کە لە هۆزەکەی بوونە بت پەرست

وە دەفەرمووێت: ﴿وَقَدْ أَضَلُّوا كَثِيرًا وَلَا تَزِدِ الظَّالِمِينَ إِلَّا ضَلَالًا﴾ بەڕاستی ئەوانە زۆر خەڵکیان گومڕا کرد (خودایە) ئەم ستەمکارانە لە گومڕایی زیاتر هیچی تریان بۆ زۆرمەکە. واتە: بە هۆی ئەو بتانەوە کە دەیانپەرستن خەڵکێکی زۆریان سەر لێ شێواند، وەپەرستنی ئەم بتانە درێژەی کێشا چەرخ دوای چەرخ تا ئەو کاتەی عەرەبو عەجەمو زۆری تریش لە گرۆی بەنی ئادەم بونە بت پەرست. وە ئیبراهیمی خەلیلیش (علیه السلام) لە دوعاکانیان دەپاڕایەوە دەیفەرموو: وەك خودا فەرموویەتی: ﴿وَاجْنُبْنِي وَبَنِيَّ أَن نَّعْبُدَ الْأَصْنَامَ (٣٥) رَبِّ إِنَّهُنَّ أَضْلَلْنَ كَثِيرًا مِّنَ النَّاسِ﴾[3] واتە: وە خۆمو کوڕەکانم بپارێزەو دوور خەرەوە لەوەی بتەکان بپەرستین، ئەی پەروەردگارم بێگومان ئەو بتانە زۆر لە خەڵکیان گومڕا کردووە (و لایان داون لەڕێگەی ڕاست). وە دەفەرمووێت: ﴿وَلَا تَزِدِ الظَّالِمِينَ إِلَّا ضَلَالًا﴾ دوعای کرد لە هۆزەکەی چونکە یاخی بووبوون باوەڕیان نەدەهێناو بەگوێیان نەدەکرد. وە موسا پێغەمبەریش (علیه السلام) دوعای کرد لە گەلەکەی وەك خودا فەرموویەتی: ﴿رَبَّنَا اطْمِسْ عَلَىٰ أَمْوَالِهِمْ

---

[1] فتح الباری (٨/٥٣٥).

[2] الطبری (٢٣/٦٤٠).

[3] ئیبراهیم (٣٥_٣٦).

وَٱشْدُدْ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ فَلَا يُؤْمِنُوا۟ حَتَّىٰ يَرَوُا۟ ٱلْعَذَابَ ٱلْأَلِيمَ ﴾[1] واتە: ئەی پەروەردگارمان لەناوی بەرەو مەیهێڵە ماڵو سامانیان دڵەکانیان ڕەقو ڕەش بکە چونکە بڕوا ناهێنن هەتا دەبینن سزای سەختی ئازاردەر. خودای گەورە وەلامی هەموو پێغەمبەرەکانی دایەوە کە لە ناو گەلەکەیاندا بوون. وەلامی نوح پێغەمبەریشی دایەوەو هۆزەکەی خنکاند بە ئاو لەبەرئەوەی کە باوەڕیان نەکرد بەوەی کە بۆی هێنابوون.

﴿مِّمَّا خَطِيٓـَٔـٰتِهِمْ أُغْرِقُوا۟ فَأُدْخِلُوا۟ نَارًا فَلَمْ يَجِدُوا۟ لَهُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ أَنصَارًا ﴿٢٥﴾ وَقَالَ نُوحٌ رَّبِّ لَا تَذَرْ عَلَى ٱلْأَرْضِ مِنَ ٱلْكَـٰفِرِينَ دَيَّارًا ﴿٢٦﴾ إِنَّكَ إِن تَذَرْهُمْ يُضِلُّوا۟ عِبَادَكَ وَلَا يَلِدُوٓا۟ إِلَّا فَاجِرًا كَفَّارًا ﴿٢٧﴾ رَّبِّ ٱغْفِرْ لِى وَلِوَٰلِدَىَّ وَلِمَن دَخَلَ بَيْتِىَ مُؤْمِنًا وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَـٰتِ وَلَا تَزِدِ ٱلظَّـٰلِمِينَ إِلَّا تَبَارًا ﴿٢٨﴾﴾

خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿مِّمَّا خَطِيٓـَٔـٰتِهِمْ أُغْرِقُوا۟ فَأُدْخِلُوا۟ نَارًا فَلَمْ يَجِدُوا۟ لَهُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ أَنصَارًا﴾ بەرانبەر بە گوناهەکانیان! بە ئاو خنکان، ئەوسا خرانە ناو ئاگر. ئیتر لەم خودایە بەدەر، یاریدەریان پەیدا نەکرد. ﴿مِّمَّا خَطِيٓـَٔـٰتِهِمْ﴾ بە (خطایاهم) یش خوێنراوەتەوە واتە: لە تاوان کردنی زۆر و بێ گوێیو بەردەوام بوونیان لەسەر بێ دینیو دژایەتی پێغەمبەرەکانیان ﴿فَأُدْخِلُوا۟ نَارًا﴾ واتە: گوێزرانەوە لە ناو شەپۆلی دەریاکاندا بۆ ناو گەرمای ئاگر، ﴿فَلَمْ يَجِدُوا۟ لَهُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ أَنصَارًا﴾ واتە: هیچ پەناو پشتیوانو یارمەتی دەرێك نەبوو لەم جەزرەبە سەختەی خودا ڕزگاریان بكات. وەك خودا دەفەرموێت: ﴿قَالَ لَا عَاصِمَ ٱلْيَوْمَ مِنْ أَمْرِ ٱللَّهِ إِلَّا مَن رَّحِمَ﴾[2] واتە: (نوح) وتی: ئەمڕۆ هیچ پارێزەرێك (پەنادەرێك) نی یە لە فەرمانی خودا (کە نوقم کردنە) مەگەر کەسێك خودا ڕەحمی پێ بكات. وە دەفەرموێت: ﴿وَقَالَ نُوحٌ رَّبِّ لَا تَذَرْ عَلَى ٱلْأَرْضِ مِنَ ٱلْكَـٰفِرِينَ دَيَّارًا﴾ نووحیش وتی: پەروەرندەم لەم سەر زەوی یە ئەو کەسانەی تۆ ناناسن، گیان لەبەریان لێ مەهێڵە. واتە: لەم سەر زەمینە گیان لەبەریان لێ مەهێڵە هەموویان لەناوبەرە. زەحاك (ضحاك) وتی: ﴿دَيَّارًا﴾ کەسێك، سودی وتی: (الدیار) ئەوەی نیشتەجێیە لە ماڵدا. خوای گەورە دوعاکەی نوحی (علیه السلام) وەرگرتو هەموو ئەو خوانەناسانەی لەو وەختە لەسەر زەمین بوون قڕکردو لەناوی بردن هەتا کوڕەکەیشی کە جگەر گۆشەی بوو لەناوچوو کە وتی وەك خودا فەرموویەتی: ﴿قَالَ سَـَٔاوِىٓ إِلَىٰ جَبَلٍ يَعْصِمُنِى مِنَ ٱلْمَآءِ ۚ قَالَ لَا عَاصِمَ ٱلْيَوْمَ مِنْ

[1] یونس (٨٨).

[2] هود (٤٣).

أَمْرِ ٱللَّهِ إِلَّا مَن رَّحِمَ ۚ وَحَالَ بَيْنَهُمَا ٱلْمَوْجُ فَكَانَ مِنَ ٱلْمُغْرَقِينَ ﴾[1] واتـــه: (كوڕەكـــەی) ووتـــی پـــەنا بۆشاخێك دەبەم كە بمپارێزێت لـەم لافـاوە (نـووح) وتـی ئـەمڕۆ هـیچ پارێزەرێـك (پـەنادەرێك) نیـە لـە فەرمانی خودا (كە نوقم كرنە) مەگەر كەسێك خودا ڕەحمی پێ بكات لەو كاتـەدا شـەپۆلی لافـاو كەوتـە نێوانیان جا ئەو (كوڕە خنكاو) لەخنكاوان بوو. وە خودای گەورە ئەوانەی لە ناو كەشتیەكەدا بوون كە خاوەن باوەڕ بوون لەگەڵ نوح پێغەمبەر(علیه السلام) ڕزگـار كـرد ئـەوانی تـر هـەموو لەناوچـوون. وە خوای گەورە لەسەر زمانی نـوح فەرموویـەتی: ﴿ إِنَّكَ إِن تَذَرْهُمْ يُضِلُّوا۟ عِبَادَكَ وَلَا يَلِدُوٓا۟ إِلَّا فَاجِرًا كَفَّارًا ﴾ چونكە ئەگەر بیانهێڵێت عەبدەكانت گومڕا دەكەنو هەر زارۆیەكیشیان ببێت تاوانبارو سپڵە دەبێت. واتە: ئەگەر كەسێكیان بهێڵێت بەندەكانت ئەوانەی دوای ئـەوان دێـن سـەر لێ دەشـێوێنن ﴿وَلَا يَلِدُوٓا۟ إِلَّا فَاجِرًا كَفَّارًا ﴾ واتە: بەدكار لە كردارو بێ دین لە دڵدا. چونكە نوح (علیه السلام) نۆسەدو پەنجا سـاڵ لـە ناویانـدا ژیـابوو زۆر بـاش دەیناسـین وە پاشـان فەرموویـەتی: ﴿رَّبِّ ٱغْفِرْ لِى وَلِوَٰلِدَىَّ وَلِمَن دَخَلَ بَيْتِىَ مُؤْمِنًا وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ وَلَا تَزِدِ ٱلظَّٰلِمِينَ إِلَّا تَبَارًۢا ﴾ پەروەرێنم منو دایكو بابی منو ئەوانەی بە باوەڕەوە لە ماڵمدانو پیاوەكانو ژنەكانی خاوەن باوەڕ عەفوبكە ناهەقانیش بەجارێك تـەفروتونا بكـە. زەحاك (ضحاك) وتی: ﴿ بَيْتِىَ ﴾ واتە: مزگەوتەكەم، وەهیچ گرفتێكی تیانیە ئەوانەی مانای ئایەتەكـە دەكەن بەشێوە دیارەكەی خۆی كە نوح پێغەمبەر(علیه السلام) پاڕاوەتەوە لـە خـودا بـۆ ئەوانـەی كـە چونەتە ماڵیو باوەڕداربوون ﴿وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ ﴾ پاڕایەوە بۆ هەموو باوەڕداران لە پیـاوانو ژنـان ئەمـە زینـدووەكانو مردووەكـانیش دەگرێتـەوە. بۆیـە سـونەتە پاڕانـەوە بـەم شـێوەیەی نـوح پێغەمبـەر(علیـە الـسلام) وەك لـە پاشمـاوەو پاڕانـەوە مەشـهورە ڕاسـتو دروسـتەكاندا هـاتووە. وە دەفەرمووێت: ﴿وَلَا تَزِدِ ٱلظَّٰلِمِينَ إِلَّا تَبَارًۢا ﴾ سودی وتی: قڕیان بكە، موجاهـد وتـی: زەرەر مەنـدیان بكـە واتە: لە دنیاو قیامەتدا.

---

[1] هود (٤٣).

## تەفسیری سورەتی (الجن)

## لە مەککە هاتوەتەخوارەوە

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

﴿قُلْ أُوحِيَ إِلَيَّ أَنَّهُ اسْتَمَعَ نَفَرٌ مِّنَ الْجِنِّ فَقَالُوا إِنَّا سَمِعْنَا قُرْآنًا عَجَبًا (١) يَهْدِي إِلَى الرُّشْدِ فَآمَنَّا بِهِ ۖ وَلَن نُّشْرِكَ بِرَبِّنَا أَحَدًا (٢) وَأَنَّهُ تَعَالَىٰ جَدُّ رَبِّنَا مَا اتَّخَذَ صَاحِبَةً وَلَا وَلَدًا (٣) وَأَنَّهُ كَانَ يَقُولُ سَفِيهُنَا عَلَى اللَّهِ شَطَطًا (٤) وَأَنَّا ظَنَنَّا أَن لَّن تَقُولَ الْإِنسُ وَالْجِنُّ عَلَى اللَّهِ كَذِبًا (٥) وَأَنَّهُ كَانَ رِجَالٌ مِّنَ الْإِنسِ يَعُوذُونَ بِرِجَالٍ مِّنَ الْجِنِّ فَزَادُوهُمْ رَهَقًا (٦) وَأَنَّهُمْ ظَنُّوا كَمَا ظَنَنتُمْ أَن لَّن يَبْعَثَ اللَّهُ أَحَدًا (٧)﴾

### گوێگرتنی جنۆکە لە قورئان و باوەڕهێنانیان پێی

خودای گەورە فەرمان دەدات بە پێغەمبەر(ﷺ) هەواڵ بدات بە قورەیشیەکان کە جنۆکە (الجن) گوێ بیستی قورئان بوون و باوەڕیان پێ هێناو بەڕاستیان زانی و سەریان بۆ دانەواند. فەرمووی: ﴿قُلْ أُوحِيَ إِلَيَّ أَنَّهُ اسْتَمَعَ نَفَرٌ مِّنَ الْجِنِّ فَقَالُوا إِنَّا سَمِعْنَا قُرْآنًا عَجَبًا﴾ بڵێ: پێم ڕاگەیەنراو، چەند کەسێك لە جنۆکەکان گوێیان هەڵخست، ئەوسا وتیان: ئێمە قورئانێك سەیرمان بیست. ﴿يَهْدِي إِلَى الرُّشْدِ فَآمَنَّا بِهِ ۖ وَلَن نُّشْرِكَ بِرَبِّنَا أَحَدًا﴾ بۆ ڕاستەڕێیە ڕێبەرەو ئێمە باوەڕمان پێ هێناوە هەرگیز کەسێك ناکەینە شەریکی خودا. واتە: بۆ ڕێگای ڕاست و سەرفەرازی. ئەم ئایەتە وەك ئەم ئایەتە وایە کە دەفەرموێت: ﴿وَإِذْ صَرَفْنَا إِلَيْكَ نَفَرًا مِّنَ الْجِنِّ يَسْتَمِعُونَ الْقُرْآنَ﴾[1] واتە: وە (بیریان خەرەوە) کاتێك چەند جنۆکەیەکمان نارد بۆلات تاگوێ لە قورئان بگرن. وەچەند فەرمودەشمان هێنا لەم بارەیەوە لە پێشەوە پێویست ناکات لێرەدا دووبارەی بکەینەوە. وە فەرموویەتی: ﴿وَأَنَّهُ تَعَالَىٰ جَدُّ رَبِّنَا مَا اتَّخَذَ صَاحِبَةً وَلَا وَلَدًا﴾ زۆر بڵندە شکۆی پەروەرێنی ئێمە، نە هاوسەری بووەو نە فەرزەندێك. علی کوڕی ئەبو تەلحە (طلحة) وتی: لە ئیبنو عەباسەوە لەم ئایەتەدا ﴿وَأَنَّهُ تَعَالَىٰ جَدُّ رَبِّنَا﴾ واتە: کارو فەرمان و دەستەلاتی زۆر بڵندە.[2] زەحاك (ضحاك) وتی: لە ئیبنو عەباسەوە: چاکەو دەستەلات و بەهرەی خودا زۆرە لەسەر دروست کراوەکانی. ڕیوایەت کراوە لە موجاهدو عیکرمەوە: واتە شکۆی پەروەرێنمان. قەتادە وتی: زۆر بڵندە

[1] الاحقاف (٢٩).

[2] الطبری (٢٣/٦٤٨).

شکۆو گەورەیی‌و فەرمانی. سودی وتی: زۆر بڵندە فەرمانی پەروەرێنمان. ئەبو دەرداء (ابو الدرداء)و موجاهدو ئیبنو جورەیج (ابن جریج) وتویانە: زۆر بڵندە یادی خودا.

**دان پێدانانی جنۆکە کە خودا نەژنی بوومو نە فەرزەندو زۆر بڵندە شکۆی**

خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿مَا ٱتَّخَذَ صَٰحِبَةً وَلَا وَلَدًا﴾ زۆر بڵندە شکۆی کە ژن‌و منداڵی ببێت. واتە: جنۆکە وتیان: وەختێك باوەڕیان هێنا بە قورئان‌و موسوڵمان بوون کە خودای گەورە پایە بەرزەو نە ژنی بووەو نە فەرزەند. پاشان وتیان: وەك خودا دەفەرموێت: ﴿وَأَنَّهُۥ كَانَ يَقُولُ سَفِيهُنَا عَلَى ٱللَّهِ شَطَطًا﴾ دیارە بێ ئاوەزەکان دەربارەی خودا قسەی توڕەهاتیان دەکرد. موجاهدو عیکرەمەو قەتادەو سودی وتیان: ﴿سَفِيهُنَا﴾ مەبەست پێی شەیتانە. سودی وتی لە ئەبومالکەوە (شَطَطًا) قسەی بێ جێ، ئیبنو زەید وتی: واتە: ناهەقیەکی گەورە، وە دەشێت و گونجاوە کە مەبەست بە ﴿سَفِيهُنَا﴾ ئیسمی جنسی بێت واتە هەرکەسێك وابزانێت خودا ژن‌و فەرزەندی هەیە، لەبەر ئەمەیە وتیان وەك خودا فەرموویەتی: ﴿وَأَنَّهُۥ كَانَ يَقُولُ سَفِيهُنَا﴾ واتە: پێش موسوڵمان بوون ﴿عَلَى ٱللَّهِ شَطَطًا﴾ قسەی پڕو پوچ‌و درۆودەلەسەیان دەکرد. وە فەرموویەتی: ﴿وَأَنَّا ظَنَنَّآ أَن لَّن تَقُولَ ٱلْإِنسُ وَٱلْجِنُّ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا﴾ ئێمە پێمان وابوو هیچ کەس (لە مرۆڤو لە جنۆکە) هیچ درۆیەك بەدەم خوداوە هەڵنابەسن. واتە: وامان نەدەزانی کە مرۆڤو جنۆکە درۆ بەدەم خوداوە هەڵدەبەسن‌و ژن‌و فەرزەندی بۆ دادەنێن. کاتێك ئەم قورئانەمان بیست‌و باوەڕمان پێ هێنا زانیمان‌و تێ گەیشتین کە درۆیان بەدەم خوداوە هەڵبەستووە.

**هۆی لەبایی بوون‌و لوت بەرزی جنۆکە خۆ پاراستن‌و پەنابردنی مرۆڤ بوو پێیان**

خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَأَنَّهُۥ كَانَ رِجَالٌ مِّنَ ٱلْإِنسِ يَعُوذُونَ بِرِجَالٍ مِّنَ ٱلْجِنِّ فَزَادُوهُمْ رَهَقًا﴾ دەشمانزانی پیاوانێك لە بەرەی مرۆڤ پەنا دەبەن بە پیاوانێك لە جنۆکەو سەرکێشیان پتر دەکەن. واتە: ئێمە وامان دەزانی کە لە مرۆڤ چاکترین چونکە ئەوان پەنا دەبەن بە ئێمە کاتێك دەڕۆنە شیوێك یا شوێنێکی ترسناك لە دەشت‌و بیابانەکاندا یان هەر شوێنێکی تر. وەك باوبووە لە ناو عەرەبەکاندا لە کاتی نەفامیاندا پەنایان دەبرد بۆ گەورەو خاوەنی ئەو شوێنە لە جنۆکە بۆ ئەوەی توشی هیچ ڕوداوێکی خراپ‌و ناخۆش نەبن. وەك چۆن کاتێك کەسێکیان بڕۆیشتایەتە وڵاتی دوژمنەکەیەوە پەنای دەبردە بەر پیاوێکی گەورەی ئەو ناوچەیە لە سایەو پەنایدا دەمایەوە. وەختێك جنۆکە ئەمەیان بینی کە مرۆڤەکان پەنایان پێ دەبەن زیاتر لە خۆبایی بوون، واتە زیاتر دەیان ترساندن‌و ترس‌و بیمیان دەخستە دڵیانەوە هەتا زیاتر لێیان بترسن‌و زۆر تر پەنایان پێ ببەن. وەك قەتادە وتی: ﴿فَزَادُوهُمْ رَهَقًا﴾ واتە: زیاتر تاوانبار بن. وە جنۆکەش بەسەریاندا زاڵ بن بەو کردارەیان. سەوری (الثوری) وتی: لە

مەنسورەوە (منصور) ئەویش لە ئیبراهیمەوە ﴿فَزَادُوهُمْ رَهَقًا﴾ واتە: جنۆکە زیاتر بەسەریاندا زاڵ بن.[1] سودی وتی: وەختێك پیاوێك بە ماڵو منداڵەوە بڕۆشتایەتە چۆڵەوانیەك بمایەتەوە تیایدا دەیگوت: پەنا دەگرم بە گەورەی ئەم شیوە كە خۆمو ماڵو منداڵو مەڕوماڵات وشترەكانم توشی هیچ ناخۆشیو خراپەیەك بین. قەتادە وتی: وەختێك پەنای دەبرد بە جنۆكە زیاتر زاڵ دەبوو بەسەریداو ئازاری دەدات لەسەر ئەو كردارەی. ئیبنو ئەبی حاتم ڕیوایەتی كردووە لە عیكرەمەوە وتی: جنۆكە لە مرۆڤ ڕایان دەكرد وەك چۆن مرۆڤ لە وان ڕای دەكرد. كاتێك مرۆڤ لە شیوێكدا دەمایەوە جنۆكە ڕایان دەكرد كاتێك گەورەی هۆزەكە پەنای دەبرد بۆ گەورەی ئەو شیوە، جنۆكەكان دەیان وت: ئەمانە لە ئێمە ڕادەكەن وەك چۆن ئێمە لە وان ڕا دەكەین پاشان نزیك دەبوونەوە لە مرۆڤەكان دەستیان لێ دەوەشاندنو شێت دەبوون ئاگایان لە خۆیان نەدەما. بۆیە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَأَنَّهُۥ كَانَ رِجَالٌ مِّنَ ٱلْإِنسِ يَعُوذُونَ بِرِجَالٍ مِّنَ ٱلْجِنِّ فَزَادُوهُمْ رَهَقًا﴾ ئەبو عالیەو (ابو لعاليه) ڕەبیعو زەیدی كوڕی ئەسلم وتیان: واتە زیاتر دەترسان. مجاهد وتی: خودانەناسان زیاتر لە خۆبایی بوونو لایاندا. وە خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَأَنَّهُمْ ظَنُّوا۟ كَمَا ظَنَنتُمْ أَن لَّن يَبْعَثَ ٱللَّهُ أَحَدًا﴾ ئەوانیش (هەر وەكو ئێوە) لایان وابوو هەرگیز خودا هیچ كەس زیندوو ناكاتەوە. ئیبنو جەریرو كەلبی (الكلبى) وتیان: واتە دوای ئەم ماوەیە هەرگیز خودا پێغەمبەر ڕەوانە ناكات.

﴿وَأَنَّا لَمَسْنَا ٱلسَّمَآءَ فَوَجَدْنَٰهَا مُلِئَتْ حَرَسًا شَدِيدًا وَشُهُبًا ﴿٨﴾ وَأَنَّا كُنَّا نَقْعُدُ مِنْهَا مَقَٰعِدَ لِلسَّمْعِ ۖ فَمَن يَسْتَمِعِ ٱلْـَٔانَ يَجِدْ لَهُۥ شِهَابًا رَّصَدًا ﴿٩﴾ وَأَنَّا لَا نَدْرِىٓ أَشَرٌّ أُرِيدَ بِمَن فِى ٱلْأَرْضِ أَمْ أَرَادَ بِهِمْ رَبُّهُمْ رَشَدًا ﴿١٠﴾﴾

**هەواڵی ئاسمان وەرگرتنی جنۆكە بە پەنامەكی (بەدزیەوە) پێش هاتنی پێغەمبەر (ﷺ) و لێدانیان بە گڕی بەرزی ئاگر دوای هاتنی**

خودا مەزن باسی جنۆكەمان بۆ دەكات وەختێك كە پێغەمبەری خۆی محمد (ﷺ) ناردووە قورئانی بۆ ناردە خوارەوە. بۆ پاراستنی ئاسمانی پڕكرد لە پاسەوانی توندو تۆڵو بڵاوبونەوە بە گشت لایەكی ئاسمانداو شەیتانەكانی دەركرد ئەوانەی كە لە چەند شوێنێكەوە دادەنیشتن بە پەنهانی پێش هاتنی قورئان نەوەك بە پەنهانی گوێ بگرن شتێك لە قورئان ببەن (بدزن) بیدەن بە گوێی جادوگەرەكانداو ئەوانیش باسی بكەنو قورئانو قسەی ئەوان تێكەڵ بنو گومان پەیدابێت نەزانرێت كێ ڕاست دەكات ئەمەش بەزەیی و لوتفی خودایە بە بەندەكانیو پارێزگاریەتی لەم قورئانە پیرۆزەی. بۆیە جنۆكە وتیان وەك خودا فەرموویەتی: ﴿وَأَنَّا لَمَسْنَا ٱلسَّمَآءَ فَوَجَدْنَٰهَا مُلِئَتْ حَرَسًا شَدِيدًا وَشُهُبًا﴾

---

[1] الطبرى (٥٣/٦٥٥).

ئێمە گەینە ئەم ئاسمانە، دیتمان پڕە لە پاسداری توندو تۆڵ و ئەستێرە گەلێ ڕادەخشن. ﴿وَأَنَّا كُنَّا نَقْعُدُ مِنْهَا مَقَاعِدَ لِلسَّمْعِ ۖ فَمَن يَسْتَمِعِ الْآنَ يَجِدْ لَهُ شِهَابًا رَّصَدًا﴾ ئێمە جاران دادەنیشتین لە چەند شوێنێك لە ئاسمان بۆ گوێ گرتن بەڵام هەر کەسێك لە ئێستا بەدواوە گوێ بگرێت گڕێکی بەرزی ئاگر دەبینێت لە بۆسەی دایە. واتە: هەر کەسێك بیەوێت بە پەنامەکی گوێ بگرێت و قسە بدزێت ئاگرێکی زۆر بە گڕ دەبینێت لە کەمینداپە بۆی بەملاولایدا ناڕوات و تێ ناپەڕێت لێی بەڵکو دەیسوتێنێت و لەناوی دەبان.

وە فەرموویەتی: ﴿وَأَنَّا لَا نَدْرِي أَشَرٌّ أُرِيدَ بِمَن فِي الْأَرْضِ أَمْ أَرَادَ بِهِمْ رَبُّهُمْ رَشَدًا﴾ وە ئێمە نازانین ئاخۆ دەربارەی ئەوانەی لە زەمیندان، بڕیاری خراپداربووە، یان پەروەرندەیان ویستوویەتی ڕاستە ڕێیان نیشان بدات. واتە: ئێمە نازانین ئەمە چیە لە ئاسماندا ڕویداوە. ئاخۆ بڕیاری خراپ دراوە دەربارەی ئەوانەی لەسەر زەمینن یان پەروەرندەیان ویستویەتی ڕاستە ڕێیان نیشانبدات لەم ئایەتەدا جنۆکەکان ﴿أَشَرٌّ أُرِيدَ بِمَن فِي الْأَرْضِ﴾ ئەدەبیان بەکارهێناوە و وتەی خراپەیان داوەتە پاڵ غەیرە خودا چاکەیان داوەتە لای خودای گەورە وە لە فەرموودەی سەحیحدا هاتووە، (هیچ خراپەیەك لای تۆوە نیە)[1] ئەوسا ئەستێرەکان ئاگری بەگڕی لێ دەدات و بەڵام بەزۆری لێی نەدەدان جار بەجار نەبێت وەك لەم فەرموودەیەی ئیبنو عەباسەوە وتی: وە کاتێك ئێمە لە خزمەت پێغەمبەردا (ﷺ) دانیشتبوین ئەستێرەیەك کشاو (ڕاخشا) فەرمووی (ئێوە بۆ ئەمە چی دەڵێن؟) ئێمە دەمانوت: گەورەیەك لە دایك دەبێت و گەورەیەك دەمرێت. فەرمووی: (بەوشێوەیە نیە کە ئێوە دەیڵێن، بەڵکو هەرکاتێك خودا فەرمانی شتێکی دا لە ئاسماندا پاشان فەرموودەکەی هەموو باسکرد)[2] لە سورەتی (سبأ) بە تەواوی هێناومانە. هەر ئەوەبوو پاڵی پێوەنان کە بگەڕێن بەسەر زەمیندا لە ڕۆژئاواوە بۆ ڕۆژهەڵات بینیان کە پێغەمبەر(ﷺ) لە نوێژدا بۆ هاوەڵەکانی دەخوێنێت. ئیتر زانیان ئەمە ئەوەیە کە خودا لەبەر ئەو ئاسمانی پاراستووە ئەوەی باوەڕی پێهێنا ئەوا هێنایی و ئەوەش باوەڕی نەهێنا لەسەر لوت بەرزی و سەرکەشی خۆی هەرمایەوە وەك باسکرا لە فەرموودەی ئیبنو عەباسدا لەوبارەیەوە لە سورەتی (الاحقاف) کو فەرموویەتی: ﴿وَإِذْ صَرَفْنَا إِلَيْكَ نَفَرًا مِّنَ الْجِنِّ يَسْتَمِعُونَ الْقُرْآنَ﴾[3]، واتە: (وەبیریان بخەرەوە) کاتێك چەند جنۆکەیەکمان نارد بۆلات تاکو گوێ لە قورئان بگرن. بێگومان کاتێك ئەم کارەساتە ڕویدا ئەم هەموو گڕی ئاگرە دەڕۆیشت و دەکشا بە هەموو لایەکدا مرۆڤ و جنۆکە ترسان و

---

[1] مسلم (١/٥٣٥).

[2] مسلم (٤/١٧٥٠).

[3] الاحقاف (٢٩) .

ئارامیان نەماو کۆبوونـەوە وایانـدەزانی دونیـا وێـران دەبێـتو تێکدەچێت وەك سودی وتـی: ئاسمـان پاسەوانی نەکراوە مەگین پێغەمبەرێك یان ئاینێك لەسـەر زەمینـدا هاتبێت. چـونکە جنۆکوکـان پـێش پێغەمبەر(ﷺ) لە چەند شوێنێك لە ئاسمانی دونیادا دادەنیشتن بە پەنهانی گوێیان دەگرت تا بزانن لە ئاسمان چی ڕودەدات. وەختێك خودای گەورە پێغەمبەری (ﷺ) نـارد شـەوێك لەوشـەوانەدا ئاگربـاران کـران، خـەڵکی تـائیف (طـائف) زۆر ترسـان وتیـان: خـەڵکی ئاسمـان هـەموو لەناوچـوون کاتێك ئـەو ئاگربارانەیان بینی لە ئاسماندا بـە هـەموو لایەکدا دەڕۆی بەنـدەکانیان (أرقـاء) ئـازاد دەکردو وشـترو ماڵاتەکانیان دوور دەخستەوەو بەرەڵایان دەکرد. عبدویالەیلی (عبد یالیل) کوڕی عەمری کوڕی عومەیر (عمیر) پێی وتن: ئەی هاوار خەڵکی تائف واز لە سامانەکانتان بێنن وەرن سەیری نیشانەکانی ئاسمـان بکەن ئەگەر بینیتان لە جێگای خۆیان ماون ئەوا خەڵکی ئاسمان لەناوچوون. ئەمە هەموو لەبەر کـوڕی ئەبو کەبشەیە. واتە: پێغەمبەر(ص) ئەگەر سەیرتان کردو نەتان بینی ئەوە بێ گومان خەڵکی ئاسمـان لەناوچوونو نـەماون. سـەیرتان کـرد نیـشانەکانیان بینـی وازیـان لـە سـامانەکانیان هێنـا. ئـەو شـەوە جنۆکەکان زۆر ترسـان هـاتن بـۆلای شـەیتان (ابلـیس) ئـەوەی کـە بینیویـان بەسـەریان هـاتبوو بۆیـان گێڕایەوە شەیتان وتی: لە هەموو سەر زەمین (مشتێك) خۆڵم بۆ بێنن تا بۆنی بکەم. بۆیان هێناو بـۆنی کردو وتی: هاوەڵەکەتان لە مەکەیە (مککە) حەوت جنۆکەی نەسیبینی (نصیبین) نارد ڕۆشـتنە مەککـە بینییان پێغەمبەر(ﷺ) بە پێـوە لـە کەعبـە نوێـژ دەکـاتو قورئـان دەخوێنێت. نزیـك بوونـەوە لێـیو حەزیان لە خوێندنی قورئان دەکرد هەتا لەوانـەبوو سینەیان (صـدر) بـەری پێغەمبـەر(ﷺ) بکـەوێت. پاشـان موسـوڵمان بـوون خـوای گـەورە هـەواڵی موسـوڵمان بوونیـانی دا بـە پێغەمبـەر(ﷺ) وە ئـەم باسەمان لە پەڕاوی (السیرة) بە درێژی هێناوە. سوپاسو ستایش بۆ خوای گەورە.

﴿وَأَنَّا مِنَّا ٱلصَّٰلِحُونَ وَمِنَّا دُونَ ذَٰلِكَۖ كُنَّا طَرَآئِقَ قِدَدًا ﴿١١﴾ وَأَنَّا ظَنَنَّآ أَن لَّن نُّعۡجِزَ ٱللَّهَ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَن نُّعۡجِزَهُۥ هَرَبًا ﴿١٢﴾ وَأَنَّا لَمَّا سَمِعۡنَا ٱلۡهُدَىٰٓ ءَامَنَّا بِهِۦۖ فَمَن يُؤۡمِنۢ بِرَبِّهِۦ فَلَا يَخَافُ بَخۡسًا وَلَا رَهَقًا ﴿١٣﴾ وَأَنَّا مِنَّا ٱلۡمُسۡلِمُونَ وَمِنَّا ٱلۡقَٰسِطُونَۖ فَمَنۡ أَسۡلَمَ فَأُوْلَٰٓئِكَ تَحَرَّوۡاْ رَشَدًا ﴿١٤﴾ وَأَمَّا ٱلۡقَٰسِطُونَ فَكَانُواْ لِجَهَنَّمَ حَطَبًا ﴿١٥﴾ وَأَلَّوِ ٱسۡتَقَٰمُواْ عَلَى ٱلطَّرِيقَةِ لَأَسۡقَيۡنَٰهُم مَّآءً غَدَقًا ﴿١٦﴾ لِّنَفۡتِنَهُمۡ فِيهِۚ وَمَن يُعۡرِضۡ عَن ذِكۡرِ رَبِّهِۦ يَسۡلُكۡهُ عَذَابًا صَعَدًا ﴿١٧﴾﴾

**دانپێدانانی جنۆکە کە ئەوانیش دەستە دەستەن، هەیانە خوداناسو لەسەر ڕاستە ڕێیەو هەشیانە خودانەناسو سەر لێ شێواوە**

خـودای گـەورە هـەواڵمان دەداتێـت کـە جنۆکـە باسـی خۆیـان دەکـەن. دەفـەرمووێت: ﴿وَأَنَّا مِنَّا ٱلصَّٰلِحُونَ وَمِنَّا دُونَ ذَٰلِكَۖ كُنَّا طَرَآئِقَ قِدَدًا﴾ لەناو ئێمەشدا کـار چـاك هـەنو تێـشماندا هەیـە وانیـە، ئێمـە

گەلێك ڕێگەمان وەبەرخۆ داوون، واتە: ڕێگای زۆرو جۆراو جۆرو بۆچونی جیاجیا. ئیبنو عەباس و موجاهدو کەسانی تریش وتوویانە: ﴿كُنَّا طَرَآئِقَ قِدَدًا﴾ واتە: خاوەن باوەڕمان تێدایەو خوانەناسیشمان تێدایە.[1] ئەحمدی کوڕی سلێمان نەجاد (النجاد) لەکتێبی ئەمالیەکەیدا (أمالی) ڕیوایەتی کردووە کە لە ئەعمەشی (الاعمش) بیستووە جنۆکەیەك سەری لێ دەدایِن (دەهاتە لامان) پێم وت: خۆشترین خواردن کامەیە لای ئێوە؟ وتی: (برنج)، وتی: بۆمان هێنان ئەمان بینی تیکە (اللقمە) بەرز دەبووەوە کەسیشمان چاو پێ نەدەکەوت، وتم: لەم جۆرە کەسانەتان تێدایە کە لەناو ئێمە دایە؟ وتی: بەڵێ، وتی: ڕافیزە (الرافضة) لەناو ئێوەدا کامەیە؟ وتی: خراپترینمانە، ئەحمدی کوڕی سلێمان وتی: ئەم سەنەدەم نیشانی مامۆستامان ئەبو حەجاجی مەزی (الحافظ أبی الحجاج المزي) دا وتی: ئەم سەنەدە بۆلای ئەعمەش ڕاستە.

**دان پێدانانی جنۆکە بەدەستەلاتی بێ پایانی خودای گەورە هەمیسان**

خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَأَنَّا ظَنَنَّآ أَن لَّن نُّعْجِزَ ٱللَّهَ فِى ٱلْأَرْضِ وَلَن نُّعْجِزَهُۥ هَرَبًا﴾ ئێمە لەوە تێگەیشتووین کە لە زەمین دەرەقەتی خودا نایەین، تەنانەت بە هەڵاتنیش لە دەستی ئەو ڕزگار نابین. واتە: دەزانین کە دەستەڵاتی خودا بەسەرمانەوەیەو هەرچەندە ڕاکەین لە دەستی دەرناچین لەسەر زەمیندا خاوەن توانایەو هیچ کەسێکمان دەرەقەتی نایەین. وە فەرمویەتی: ﴿وَأَنَّا لَمَّا سَمِعْنَا ٱلْهُدَىٰٓ ءَامَنَّا بِهِۦ ۖ فَمَن يُؤْمِنۢ بِرَبِّهِۦ فَلَا يَخَافُ بَخْسًا وَلَا رَهَقًا﴾ وەختێك ئێمە ئەم نیشاندەمان بیست، باوەڕی خۆمان پێ هێنا، هەر کەسێکیش بڕوای بە پەروەردەی بێت، نە لە کەمبوون دەترسێت و نە لە غەدرلێکردن. پێخۆشحاڵی دەردەبڕن کە باوەڕیان هێناوە وە ئەمەیش جێگای شانازیو ڕێزێکی گەورەیە بۆیان و ڕەوشتێکی جوان و چاکە ﴿فَمَن يُؤْمِنۢ بِرَبِّهِۦ فَلَا يَخَافُ بَخْسًا وَلَا رَهَقًا﴾ ئیبنو عەباس و قەتادەو کەسانی تریش وتویانە: واتە ترس نیە چاکەی کەم بکرێتەوە یان بێجگە لە خراپەی خۆی هەڵگرێت.[2] وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿يَخَافُ ظُلْمًا وَلَا هَضْمًا﴾[3] واتە: ئەوە نە لە ستەم دەترسێت (لێی بکرێت) نە لەکەمکردنەوەی پاداشتی (دەترسێت). وە فەرموویەتی: ﴿وَأَنَّا مِنَّا ٱلْمُسْلِمُونَ وَمِنَّا ٱلْقَـٰسِطُونَ ۖ فَمَنْ أَسْلَمَ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ تَحَرَّوْا۟ رَشَدًا﴾ وا هێندێکمان موسوڵمانین، هێندێکیشمان لەڕێی لادەر، ئەوانەی کە موسوڵمانن، ڕێگەی ڕاستیان دیووەتەوە. واتە: موسوڵمانیشمان تێدایەو

---

[1] الطبری (٢٣/٦٥٩).

[2] الطبری (٢٣/٦٦٠).

[3] طه (١١٢).

ناموسوڵمانیش ئەوەی کە لە ڕاستەڕێ لای داوە تاوانکارە ئەوەی موسوڵمانە ئاکار چاكو دادپەروەرە ڕێگەی ڕاستی دۆزیووەتەوە. ﴿وَأَمَّا ٱلْقَـٰسِطُونَ فَكَانُوا۟ لِجَهَنَّمَ حَطَبًا﴾ ئەوانەش کە لە ڕێگەی ڕاست لایانداوە، دەبنە سوتەمەنی جەهەننەم، واتە: دەبنە سوتەمەنیو ئاگری جەهەننەمیان پێ تاودەدرێت.وە فەرموویەتی: ﴿وَأَلَّوِ ٱسْتَقَـٰمُوا۟ عَلَى ٱلطَّرِيقَةِ لَأَسْقَيْنَـٰهُم مَّآءً غَدَقًا﴾ گەر ئەوانیش هەر لەسەر ئەم ڕێگەیە بن، بێ گومان لە ئاوێکی زۆرو زەبەندە تێر ئاویان دەکەین. ﴿لِّنَفْتِنَهُمْ فِيهِ ۚ وَمَن يُعْرِضْ عَن ذِكْرِ رَبِّهِۦ يَسْلُكْهُ عَذَابًا صَعَدًا﴾ هەتا لەوێدا تاقیان بکەینەوە هەر کەسێکیش لە یادی پەروەرندەی خۆی کلابێ، ئازارێکی زۆر دژواری بەسەردێنێت. ﴿لِّنَفْتِنَهُمْ فِيهِ﴾ زانایانی تەفسیر دوو ڕایان هەیە لە ماناکەیدا. ڕای یەکەم: گەر ئەمانە هەر لەسەر ئەم ڕێگەیە بن لێی لانەدەن لەسەری بەردەوام بن ﴿لَأَسْقَيْنَـٰهُم مَّآءً غَدَقًا﴾ تێرئاویان دەکەینو ئاوی زۆریان دەدەینێت. مەبەست لێرەدا واتە: بژێویان فراوان دەکەین وە بەم شێوەیە مانای ﴿لِّنَفْتِنَهُمْ فِيهِ﴾ واتە: تاقیان دەکەینەوە. وەك مالك وتی لە زەیدی کوڕی ئەسلەمەوە ﴿لِّنَفْتِنَهُمْ﴾ تاقیان دەکەینەوە تا دەرکەوێت کێ لەسەر ڕێی ڕاست بەردەوام دەبێتو کێش پەشیمان دەبێتەوەو سەری لێ دەشێوێت. عەوفیو کەسانی تریش ڕیوایەتیان کردووە لە ئیبنو عەباسەوە وە هەر بەم شێوەیە موجاهدو سەعیدی کوڕی جوبەیرو سەعیدی کوڕی موسەیەب (مُسیب) عەتاوو سودیو محمدی کوڕی کەعبی قەرەزی (القرظی) قەتادەو زەحاك (ضحاك) وتویانە. موقاتل (مقاتل) وتی: لەسەر خودانەناسەکان قورەیشی هاتووەتە خوارەوە وەختێك حەوت ساڵ بارانیان بۆ نەباری، ڕای دووهەم ﴿وَأَلَّوِ ٱسْتَقَـٰمُوا۟ عَلَى ٱلطَّرِيقَةِ﴾ لەسەر گومڕایی ﴿لَأَسْقَيْنَـٰهُم مَّآءً غَدَقًا﴾ واتە: ڕۆزیمان فراوان دەکردن بۆ درێژە دانیان بە تاوانکاری وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَلَمَّا نَسُوا۟ مَا ذُكِّرُوا۟ بِهِۦ فَتَحْنَا عَلَيْهِمْ أَبْوَٰبَ كُلِّ شَىْءٍ حَتَّىٰٓ إِذَا فَرِحُوا۟ بِمَآ أُوتُوٓا۟ أَخَذْنَـٰهُم بَغْتَةً فَإِذَا هُم مُّبْلِسُونَ﴾[1] واتە: جا کاتێك لەبیریان چویەوە ئەوەی کە پێی ئامۆژگاری کران دەرگای هەموو شتێکمان لەسەر کردنەوە تا کاتێك دڵخۆش بوون بەوەی پێیان درابوو لەناکاودا تۆڵەمان لێ سەندن ئیتر ئەوانیش نائومێدو سەرگەردان بوون. وە فەرمویەتی: ﴿أَيَحْسَبُونَ أَنَّمَا نُمِدُّهُم بِهِۦ مِن مَّالٍ وَبَنِينَ ﴿٥٥﴾ نُسَارِعُ لَهُمْ فِى ٱلْخَيْرَٰتِ ۚ بَل لَّا يَشْعُرُونَ﴾[2] واتە: ئایا ئەوانە وادەزانن ئەوەی پێیان دەبەخشین لە سامانو مندالآن، هەر بۆ

---

[1] الانعام (٤٤).

[2] المؤمنون (٥٥– ٥٦).

ئەوەیە کە پەلەمانە لە چاکە لەگەڵ کردنیان؟ نەخێر، ئەمانە نەزانن. ئەبو موجلیز (مجلز) لەم ئایەتەدا وتی: ﴿وَأَلَّوِ ٱسۡتَقَٰمُواْ عَلَى ٱلطَّرِيقَةِ﴾ واتە: لەسەر ڕێگای چەوتو سەرلێ شێواوی، ئیبنو جەریرو ئیبنو حاتم ڕیوایەتیان کردووە[1] بەغەویش گێڕاویەتیەوە لە ڕەبیعی کوڕی ئەنەسو زەیدی کوڕی ئەسلەمی کەلبیو ئیبنو کەیسانەوە (الکیسان)[2] وە ئەم ئایەتە دەکاتە بەڵگە کە خودا فەرموویەتی: ﴿لِّنَفۡتِنَهُمۡ فِيهِ﴾ وە دەفەرمووێت: ﴿لِّنَفۡتِنَهُمۡ فِيهِۚ وَمَن يُعۡرِضۡ عَن ذِكۡرِ رَبِّهِۦ يَسۡلُكۡهُ عَذَابٗا صَعَدٗا﴾ هەتا لەوێدا تاقیان بکەینەوە، هەرکەسێکیش لەیادی پەروەرندەی خۆی کلابێت، ئازارێکی زۆر دژواری بەسەر دێنێت. واتە: ئازارێکی زۆر گرانو دژوارو بە ژان. ئیبنو عەباسو موجاهدو عیکرەمەو قەتادەو ئیبنو زەید وتیان: ﴿عَذَابٗا صَعَدٗا﴾ واتە سزایەکی زۆر گران کە هیچ حەوانەوەو مۆڵەتێکی لەگەڵ نیە:[3] ئیبنو عەباس وتی: واتە کێوێك لە ناو جەهەننەمدا.[4] سەعیدی کوڕی جوبەیر وتی: واتە بیرێك لە ناو جەهەننەمدا.

﴿ وَأَنَّ ٱلۡمَسَٰجِدَ لِلَّهِ فَلَا تَدۡعُواْ مَعَ ٱللَّهِ أَحَدٗا ﴿١٨﴾ وَأَنَّهُۥ لَمَّا قَامَ عَبۡدُ ٱللَّهِ يَدۡعُوهُ كَادُواْ يَكُونُونَ عَلَيۡهِ لِبَدٗا ﴿١٩﴾ قُلۡ إِنَّمَآ أَدۡعُواْ رَبِّي وَلَآ أُشۡرِكُ بِهِۦٓ أَحَدٗا ﴿٢٠﴾ قُلۡ إِنِّي لَآ أَمۡلِكُ لَكُمۡ ضَرّٗا وَلَا رَشَدٗا ﴿٢١﴾ قُلۡ إِنِّي لَن يُجِيرَنِي مِنَ ٱللَّهِ أَحَدٞ وَلَنۡ أَجِدَ مِن دُونِهِۦ مُلۡتَحَدًا ﴿٢٢﴾ إِلَّا بَلَٰغٗا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِسَٰلَٰتِهِۦۚ وَمَن يَعۡصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَإِنَّ لَهُۥ نَارَ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا ﴿٢٣﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا رَأَوۡاْ مَا يُوعَدُونَ فَسَيَعۡلَمُونَ مَنۡ أَضۡعَفُ نَاصِرٗا وَأَقَلُّ عَدَدٗا ﴿٢٤﴾ ﴾

**فەرماندان بە یەکتاپەرستی (التوحید) و دوورکەوتنەوە لە هاوەڵ دانان بۆ خودا**

خودای گەورە فەرمانی داوە بە بەندەکانی کە هەر بەتەنها ئەو بپەرستنو هیچ کەسێك مەکەنە هاوەڵی خودا لە خودانەناسیەکەتانداو هاوار لە کەسی تر مەکەن لەگەڵ خودا. دەفەرمووێت: ﴿وَأَنَّ ٱلۡمَسَٰجِدَ لِلَّهِ فَلَا تَدۡعُواْ مَعَ ٱللَّهِ أَحَدٗا﴾ مزگەوتەکانماڵی خودان، لەگەڵ خودا، هاواری کەسی تر مەکەن. قەتادە لەم ئایەتەدا وتی: وەختێك گاورو جولەکەکان دەچوونە ناو کلیساو پەرستگاکانیان هاوەڵیان بۆ خودا دادەناو هاواریان لێ دەکردن خوای مەزن فەرمانی دا بە پێغەمبەر(ﷺ) کە هەر خودا بە تەنها

[1] الطبری (٢٣/٦٦٣).

[2] البغوی (٤/٤٠٤).

[3] الطبری (٢٣/٦٦٤).

[4] الطبری (٢٣/٦٦٤).

بپەرستن.[1] ئیبنو جەریر ڕیوایەتی کردووە لە سعیدی کوڕی جوبەیر ﴿وَأَنَّ ٱلْمَسَٰجِدَ لِلَّهِ فَلَا تَدْعُوا۟ مَعَ ٱللَّهِ أَحَدًا﴾ وتی: جنۆکە وتیان بە پێغەمبەر(ﷺ) چۆن ئێمە دەتوانین بێینە ناو مزگەوت کە ئێمە دوورین؟ واتە لە تۆوە دوورین. وە چۆن ئامادەی نوێژ ببین کە دوورین لە تۆوە؟ ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە ﴿وَأَنَّ ٱلْمَسَٰجِدَ لِلَّهِ فَلَا تَدْعُوا۟ مَعَ ٱللَّهِ أَحَدًا﴾.[2]

**کۆبوونەوەی جنۆکە بۆ گوێگرتن لە قورئان**

خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَأَنَّهُۥ لَمَّا قَامَ عَبْدُ ٱللَّهِ يَدْعُوهُ كَادُوا۟ يَكُونُونَ عَلَيْهِ لِبَدًا﴾ لەودەمەشدا کە عەبدی خودا (محمد ـ ﷺ ـ) هەستا نوێژ بکات خەریک بوو دابارنەسەری. عەوفی وتی: لە ئیبنو عەباسەوە کاتێک گوێیان لە پێغەمبەر بوو (ﷺ) کە قورئانی دەخوێند خەریک بوو بڕۆنە سەر پشتی کاتێک دەیان بیست قورئانی دەخوێند، لێی نزیک دەبوونەوە. پێغەمبەر(ﷺ) پێی نەدەزانین و ئاگای لێیان نەبوو هەتا جبرائیل هات بۆلای ﴿قُلْ أُوحِىَ إِلَىَّ أَنَّهُ ٱسْتَمَعَ نَفَرٌ مِّنَ ٱلْجِنِّ﴾ خوێندەوە بۆی. ئەمە ڕایەکە کە ڕیوایەت کراوە لە زوبەیری کوڕی عەوامەوە (الزبير بن العوام). ئیبنو جەریر ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەباسەوە وتی: جنۆکە بە گەلەکەیان وت: ﴿لَمَّا قَامَ عَبْدُ ٱللَّهِ يَدْعُوهُ كَادُوا۟ يَكُونُونَ عَلَيْهِ لِبَدًا﴾ وەختێک بینیان خۆی و هاوەڵەکانی نوێژ دەکەن ڕکوع دەبات ئەوانیش ڕکوع دەبەن و سوژدە دەبەن. سەریان لە گوێڕایەڵی هاوەڵەکانی سوڕمابوو بۆی. پاشان وتیان بە گەلەکەیان: ﴿لَمَّا قَامَ عَبْدُ ٱللَّهِ يَدْعُوهُ كَادُوا۟ يَكُونُونَ عَلَيْهِ لِبَدًا﴾[3] ئەمە ڕای دووهەمە کە ڕیوایەت کراوە لە سعیدی کوڕی جوبەیرەوە هەمیسان.[4] حسن وتی: وەختێک پێغەمبەر(ﷺ) هەڵساو فەرمووی (لا الـه الا الله) بانگی خەڵقی دەکرد بۆ لای پەروەردیان خەریک بوو هەموو عەرەبەکان دابارنە سەری.[5] قەتادە لەم ئایەتەدا وتی: ﴿وَأَنَّهُۥ لَمَّا قَامَ عَبْدُ ٱللَّهِ يَدْعُوهُ كَادُوا۟ يَكُونُونَ عَلَيْهِ لِبَدًا﴾ هەموو جنۆکەو مرۆڤ کۆبونەوە بۆ ئەوەی ئەم ئاینەی خودا لەناوبەرن و بیکوژێننەوە. فەرمانی خوا وابوو کە سەری بخات و بەردەوامی بکات و زاڵی بکات بەسەر

---

[1] الطبرى (٦٦٥/٢٣).
[2] الطبرى (٦٦٥/٢٣).
[3] الطبرى (٦٦٧/٢٣).
[4] الطبرى (٦٦٧/٢٣).
[5] الطبرى (٦٦٨/٢٣).

ئەوانەی کە دژایەتی دەکەن.[1] ئەمە ڕای سێ هەمە ڕیوایەت کراوە لە ئیبنو عەباس‌و موجاهدو سەعیدی کوڕی جوبەیر. وە ڕای ئیبنو زەیدیشەو ئیبنو جەریریشە هەر ئەم ڕایەی هەڵبژاردوە.[2] وە ئەمە گونجاوترە بەپێی ئەم ئایەتەی کە لەدوایەوە دێت کە دەفەرمووێت: ﴿قُلْ إِنَّمَآ أَدْعُواْ رَبِّى وَلَآ أُشْرِكُ بِهِۦٓ أَحَدًا﴾ بڵێ: من هەر هاوار لە پەروەردەی خۆم دەکەم‌و کەسی لێ ناکەم بە شەریك. واتە: وەختێك کە ئازاری پێغەمبەریان دەداو دژایەتیان دەکردو باوەڕیان پێ نەدەهێناو هەڵدەستان لێی بۆ ئەوەی ئەو پەیامە ڕاستەی کە پێی هاتووە پوچەڵی بکەنەوە هەموو بەیەکەوە بوونە دوژمنی ﴿أَدْعُواْ رَبِّى﴾ من هەر هاوار لە پەروەردەی خۆم دەکەم بە تەنهاو هاوەڵی نیەو پەنا هەر بۆ ئەو دەبەم‌و پشتی پێ دەبەستم ﴿وَلَآ أُشْرِكُ بِهِۦٓ أَحَدًا﴾ کەسیش ناکەم بە هاوەڵی ئەو.

## پێغەمبەر(ﷺ) ناتوانێت زیانیان پێ بگەیەنێت و بیشیا نخاتە سەر ڕاستە ڕێ

خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿قُلْ إِنِّى لَآ أَمْلِكُ لَكُمْ ضَرًّا وَلَا رَشَدًا﴾ بڵێ من ناتوانم نە زیانتان پێ بگەیەنم وە نە بتان خەمە سەر ڕاستەڕێ. واتە: بێ گومان منش مرۆڤێکم وەکو ئێوە نیگام بۆدێت وە بەندەیەکم لە بەندەکانی خوداو وە هیچ دەستەڵاتێکم نیە ناتوانم بتان خەمە سەر ڕاستە ڕێ یان لاتان بدەم لێی ئەمانە هەمووی بە دەستی خودای گەورەیە. وە فەرموویەتی: ﴿قُلْ إِنِّى لَن يُجِيرَنِى مِنَ ٱللَّهِ أَحَدٌ وَلَنْ أَجِدَ مِن دُونِهِۦ مُلْتَحَدًا﴾ بڵێ بەدەر لە خودا هەرگیز هیچ کەس پەنام نادا و لای ئەو نەبێت، هیچ پەنایەك شك نابەم. پاشان جارێکی تر باسی خۆی دەکات کە کەس ناتوانێت پەنای بدات خودا خۆی نەبێت ئەگەر بێ گوێیشم کرد کەس شك نابەم بێت بە هاوارمەوەو ڕزگارم بکات لە سزای خودا ﴿وَلَنْ أَجِدَ مِن دُونِهِۦ مُلْتَحَدًا﴾ موجاهیدو قەتادەو سودی وتیان: هیچ پەنایەك[3].

## پێغەمبەر(ﷺ) تەنها ڕاگەیاندنی لە سەرە

خوای گەورە فەرموویەتی﴿إِلَّا بَلَٰغًا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِسَٰلَٰتِهِۦ ۚ وَمَن يَعْصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَإِنَّ لَهُۥ نَارَ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا﴾ هیچ زانستێکم بە دەست نیە جگە ڕاگەیاندنێك لە خواوەو ڕاگەیاندنی پەیامەکانی وە هەر کەسێکش نافەرمانی خوداو پێغەمبەری بکا بەشی ئاگری دۆزەخە تا هەتایە. وە ئەم فەرموودەیەی

---

[1] الطبری (۲۳/۶۶۷).

[2] الطبری (۲۳/۶۶۸).

[3] الطبری (۶۶۹).

خودا ﴿إِلَّا بَلَٰغًا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِسَٰلَٰتِهِۦ﴾ ئیستیسنایە (استثناء) لەم فەرموودەی خودا ﴿لَن يُجِيرَنِى مِنَ ٱللَّهِ أَحَدٌ﴾ واتە: هیچ شتێك پەنام نادات و ڕزگارم ناکات جگە ڕاگەیاندنی ئەو پەیامەی کە خودا بڕیاری داوە لەسەرم بیگەیەنم و جێ بەجێی بکەم. وەکو خودا فەرموویەتی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ بَلِّغْ مَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ وَإِن لَّمْ تَفْعَلْ فَمَا بَلَّغْتَ رِسَالَتَهُۥ وَٱللَّهُ يَعْصِمُكَ مِنَ ٱلنَّاسِ﴾[1] واتە: ئەی پێغەمبەر(ﷺ) ڕابیگەیەنە (بە خەڵك) ئەوەی هێنراوەتە خوارەوە بۆت لەلایەن پەروەردگارتەوە وە ئەگەر وانەکەیت ڕاسپێرییەکەی خودات ڕانەگەیاندووە بەجێت نەهێناوە وە خودا تۆ دەپارێزێت لە خەلکی (کە بتکوژن) وە فەرموویەتی: ﴿وَمَن يَعْصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَإِنَّ لَهُۥ نَارَ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا﴾ واتە: من پەیامی خوداتان پێ ڕادەگەیەنم هەرکەسێك نافەرمانی خوداو پێغەمبەر بکات پاداشتی ئاگری دۆزەخە و تا هەتایە تێیدا دەمێنێتەوە واتە: ڕزگاریان نابێت لێی و لێشی ناڕۆنە دەرەوە. وە دەفەرموێت: ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا رَأَوْا۟ مَا يُوعَدُونَ فَسَيَعْلَمُونَ مَنْ أَضْعَفُ نَاصِرًا وَأَقَلُّ عَدَدًا﴾ تا ئەو کاتەی ئەوەیات دێتە بەرچاوان کە بەڵێنیان پێدراوە، جا دەزانێت کێ یاوەری بێ هێزترە و لە ژمارەشدا کەمترە. تا ئەو کاتەی کە هاوەڵیان بۆ خودا داناوە لە مرۆڤ و جنوکە ئەوەی کە بەڵێنیان پێدراوە لە ڕۆژی قیامەتدا بە چاوی خۆیان دەی بینن. ئەو کاتە دەزانێت پشتیوانی بە هێزترەو کێش ژمارەی کەمترە، ئەوان یان خاوەن باوەڕەکان ئەوانەی خودایان بە تەنیا دەپەرست واتە: ئەوەنەی هاوەڵیان بۆ خودا داناوە هیچ یاوەرێکیان نیەو ژمارەشیان لە سەربازەکانی خودا کەمترە.

﴿قُلْ إِنْ أَدْرِىٓ أَقَرِيبٌ مَّا تُوعَدُونَ أَمْ يَجْعَلُ لَهُۥ رَبِّىٓ أَمَدًا ﴿٢٥﴾ عَٰلِمُ ٱلْغَيْبِ فَلَا يُظْهِرُ عَلَىٰ غَيْبِهِۦٓ أَحَدًا ﴿٢٦﴾ إِلَّا مَنِ ٱرْتَضَىٰ مِن رَّسُولٍ فَإِنَّهُۥ يَسْلُكُ مِنۢ بَيْنِ يَدَيْهِ وَمِنْ خَلْفِهِۦ رَصَدًا ﴿٢٧﴾ لِّيَعْلَمَ أَن قَدْ أَبْلَغُوا۟ رِسَٰلَٰتِ رَبِّهِمْ وَأَحَاطَ بِمَا لَدَيْهِمْ وَأَحْصَىٰ كُلَّ شَىْءٍ عَدَدًۢا ﴿٢٨﴾﴾

**پێغەمبەر(ﷺ) نازانێت کەی قیامەت دێت.**

خودای گەورە فەرمان دەدات بە پێغەمبەر(ﷺ) کە خەڵکی ئاگادار بکات کە ئەو ئاگای لێ نیە کەی قیامەت دێت وە نازانێت ئاخۆ نزیکە کاتەکەی یان دوورە؟ وە دەفەرموێت: ﴿قُلْ إِنْ أَدْرِىٓ أَقَرِيبٌ مَّا تُوعَدُونَ أَمْ يَجْعَلُ لَهُۥ رَبِّىٓ أَمَدًا﴾ بڵێ: هیچ ئاگام لێ نیە ئەوەی بەڵێنتان پێدراوە، نزیکە یان پەروەردگارم مەودایەکی بۆ داناوە. واتە: ماوەیەکی دوور و درێژ. لەم ئایەتەوە دەردەکەوێت کە ئەو فەرموودەیەی باوە لە ناو زۆر خەڵکی نەفامدا کە پێغەمبەر(ﷺ) لە ناو زەمیندا نامێنێتەوە درۆیەو

[1] المائدة (٦٧).

هیچ بنەمایەکی ڕاستی نیە، وە لە هیچ پەڕاوێکدا نەمان بینیوە. پێغەمبەر(ﷺ) پرسیاری ڕۆژی قیامەتی لێ دەکرا وەڵامی نەدەدایەوە. وەختێك جوبرائیل لە شێوەی عەرەبێکدا (عەرەبی دەشتەکی) خۆی پێشاندا یەکێك لەو پرسیارانەی کە لێی پرسی فەرمووی: ئەی محمد هەواڵی ڕۆژی قیامەتم بدەرێ؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (پرسیار لێکراو لەوەی کە دەپرسێت زاناتر نیە بەوە) وە کاتێکش ئەو عەرەبە بە دەنگی بەرز بانگی کرد وتی: ئەی محمد کەی قیامەت دێت؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (هاوار بۆ تۆ بێ گومان دێت، چیت بۆ ئامادەکردووە؟) وتی: من نوێژو ڕۆژویەکی زۆرم بۆ ئامادە نەکردووە بەڵام خوداو پێغەمبەرەکەیم (ﷺ) خۆشدەوێت. فەرمووی: (تۆ لەگەڵ ئەوەی کە خۆشت ویستووە)، ئەنەس وتی: موسڵمانەکان بە هیچ شتێك بە ئەندازەی دڵخۆشیان بەم فەرمودەیە.[1] وە دەفەرمووێت: ﴿عَٰلِمُ ٱلۡغَيۡبِ فَلَا يُظۡهِرُ عَلَىٰ غَيۡبِهِۦٓ أَحَدًا﴾ (لە نەدیاران ئاگادارەو نهێنی خۆی بۆ کەس ئاشکرا ناکات). ﴿إِلَّا مَنِ ٱرۡتَضَىٰ مِن رَّسُولٖ فَإِنَّهُۥ يَسۡلُكُ مِنۢ بَيۡنِ يَدَيۡهِ وَمِنۡ خَلۡفِهِۦ رَصَدٗا﴾ مەگەر بۆ پێغەمبەرێك خۆی لێی ڕازی بێت، ئەوسا لە پێش‌و پاشیەوە پاسەوانان بەڕێ دەکات. ئەمە وەك ئەم ئایەتە وایە کە دەفەرمووێت: ﴿وَلَا يُحِيطُونَ بِشَيۡءٖ مِّنۡ عِلۡمِهِۦٓ إِلَّا بِمَا شَآءَ﴾[2] واتە: وە کەس ئاگای نی یە لە هیچ شتێك لە زانین‌و زانیاری ئەو (خودا) مەگەر بەوەی کە خۆی بیەوێت. خوای گەورە لێرەدا فەرموویەتی بێ گومان ئەو ئاگای لە دیاران‌و نەدیاران هەیە وە هیچ کەس لە دروست کراوەکانی ناتوانێت لە زانستی ڕابکات مەگەر ئەوەی خودا خۆی ئاگاداری بکات، بۆیە فەرموویەتی: ﴿عَٰلِمُ ٱلۡغَيۡبِ فَلَا يُظۡهِرُ عَلَىٰ غَيۡبِهِۦٓ أَحَدًا ٢٦ إِلَّا مَنِ ٱرۡتَضَىٰ مِن رَّسُولٖ﴾ ئەمە ڕاسپاردەی فریشتەو مرۆڤیش دەگرێتەوە. پاشان خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَإِنَّهُۥ يَسۡلُكُ مِنۢ بَيۡنِ يَدَيۡهِ وَمِنۡ خَلۡفِهِۦ رَصَدٗا﴾ واتە: پاسەوانی زۆری بۆ داناوە دەیپارێزن بە فەرمانی خودا لەگەڵ ئەو پەیامەی کە پێیەتی. بۆیە فەرموویەتی: ﴿لِّيَعۡلَمَ أَن قَدۡ أَبۡلَغُواْ رِسَٰلَٰتِ رَبِّهِمۡ وَأَحَاطَ بِمَا لَدَيۡهِمۡ وَأَحۡصَىٰ كُلَّ شَيۡءٍ عَدَدَۢا﴾ تا بزانێت بە دروستی پەیام گەلی پەروەردەیان ڕاگەیاندووە هەموو شتیشیان دەزانێت‌و هەموو شتێکی هەژمارد کردووە. ئەو زەمیرەی (الظمیر) کە لە (لِّيَعۡلَمَ) دایە دەگەڕێتەوە بۆ پێغەمبەر(ﷺ). ئیبنوجەریر ڕیواتی کردووە لە سعیدی کوڕی جوبەیرەوە لەم ئایەتەدا ﴿عَٰلِمُ ٱلۡغَيۡبِ فَلَا يُظۡهِرُ عَلَىٰ غَيۡبِهِۦٓ أَحَدًا ٢٦ إِلَّا مَنِ ٱرۡتَضَىٰ مِن رَّسُولٖ فَإِنَّهُۥ يَسۡلُكُ مِنۢ بَيۡنِ يَدَيۡهِ وَمِنۡ خَلۡفِهِۦ رَصَدٗا﴾ وتی: واتە چوار پاسەوان لە

---

[1] فتح البخاری (١/١٤٠).

[2] البقرة (٢٥٥).

فریشته، لەگەڵ جوبرائیل نارد (لِّيَعْلَمَ) واته: تابزانێت محمد (ﷺ) (أن أبلغوا رسالات ربهم واحاط بما لديهم واحصى كل شئٍ عددا).[١] وه ئیبنو ئەبوحاتەمیش ڕیوایەتی کردووه. هەمیسان زەحاك (الظحاك) سودیو یەزیدی کوڕی حەبیب ڕیوایەتیان کردووه.عبدالرزاق وتی: له موعەمەرەوه (معمرة) ەویش له قەتەدەوه ﴿لِّيَعْلَمَ أَن قَدْ أَبْلَغُوا رِسَالَاتِ رَبِّهِمْ﴾ وتی: بۆ ئەوەی کە پێغەمبەر(ﷺ) ئاگادار بێت کە پێغەمبەران (عليهم السلام) ئەو پەیامەیان گەیاندووه لە لایەن خوداوه وه فریشتەکنیش پاراستویانەو بەرگرییان لیّ کردووه.[٢] وه هەر بەم شێوەیە سەعیدی کوڕی ئەبو عوروبە (عروبة) ڕیوایەتی کردووه لە قەتادەوه ئیبنو جەریرش ئەم ڕایەی هەڵبژاردووه.[٣] بەغەوی (البغوى) وتی: خوێندویەتیەوه بە (لِـيُعلمَ) بە زەم (بالضم) واته: بۆ ئەوەی خەڵکی بزانێت که پێغەمبەران (عليهم السلام) پەیامەکانیان گەیاندووه وه دەگونجێت کە زەمیرەکە بگەڕێتەوه بۆ خودای گەورە ئەمەش قسەیەکە ئیبنول جەوزی (ابن الجوزى) گێڕاویەتەوه لە کتێبی (زاد المسير) دا ماناکەی بەم بەشێوەیەیە. خودا پێغەمبەرەکانی (عليهم السلام) پاراستووه بە فریشتەکاتی بۆ ئەوەی بتوانن پەیامەکانی خودا جێ بەجێ بکەن ئەوەی بۆیان دەنێرێت لە نیگا بیپارێزێت. بۆ ئەوەی بزانێت بێ گومان پەیامەکانی پەروەرندەیان گەیاندووه. وه ئەمە وەکو ئەم فەرموودەی خوای مەزنە وایە کە دەفەرموێت: ﴿وَمَا جَعَلْنَا الْقِبْلَةَ الَّتِي كُنتَ عَلَيْهَا إِلَّا لِنَعْلَمَ مَن يَتَّبِعُ الرَّسُولَ مِمَّن يَنقَلِبُ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ﴾.[٤] واته: ئەو ڕووگەیەی کە جاران لەسەری بوویت نەمانگێڕا (بە ڕووگەو لە پاشان گۆڕیمان بە کەعبە) وەك ئەم ئایەتەش کە فەرموویەتی: ﴿وَلَيَعْلَمَنَّ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا وَلَيَعْلَمَنَّ الْمُنَافِقِينَ﴾.[٥] وه چەند وێنەو شێوەی تر لە زانیاری کە خوای مەزن پێش ڕودانی هەر شتێك ئاگادارەو دەیزانێت. بۆیە لە دوایدا فەرموویەتی: ﴿وَأَحَاطَ بِمَا لَدَيْهِمْ وَأَحْصَىٰ كُلَّ شَيْءٍ عَدَدًا﴾.

---

[١] الطبرى (٦٧٣/٢٣)

[٢] عبدالرزاق (٣٢٣/٣).

[٣] الطبرى (٦٧٣/٢٣).

[٤] البقرة (١٤٣).

[٥] العنكبوت (١١).

## تەفسیری سورەتی ( المزمل )

## لە مەککەدا هاتوەتەخوارەوە

### هۆی هاتنە خوارەوەی سورەتی ( المزمل ) و ( المدثر )

حافیز (الحافظ) ئەبو بەکری ئەحمەدی کوڕی عەمری کوڕی عبدالرزاقی بەزار (البزار) لە جابرەوە ریوایەتی کردوە وتی: قورەیش کۆبونەوە لە دارونەدوە (دار الندوة) وتیان: ناوێك بنێن لەم پیاوە واتە محمد (ﷺ) کە ببێتە ڕێگرێك بۆ خەڵکی لێی دوور بکەونەوە وتیان: فاڵ چیە، وتیان: نا فاڵ چی نیە. پاشان وتیان: شێتە، وتیان: شێتش نیە. وتیان جادوگەرە، وتیشیان جادوگەریش نیە. لەسەر ئەوە بت پەرستەکان بلاوەیان کرد ئەم باسە گەیشتە پێغەمبەر(ﷺ) ڕۆیشتە ناو جێگاکەی خۆی داپۆشی جوبرائیل (علیه السلام) هات بۆ لای فەرمووی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمُزَّمِّلُ ۝١ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمُدَّثِّرُ ﴾.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمُزَّمِّلُ ۝١ قُمِ ٱلَّيۡلَ إِلَّا قَلِيلٗا ۝٢ نِّصۡفَهُۥٓ أَوِ ٱنقُصۡ مِنۡهُ قَلِيلًا ۝٣ أَوۡ زِدۡ عَلَيۡهِ وَرَتِّلِ ٱلۡقُرۡءَانَ تَرۡتِيلًا ۝٤ إِنَّا سَنُلۡقِي عَلَيۡكَ قَوۡلٗا ثَقِيلًا ۝٥ إِنَّ نَاشِئَةَ ٱلَّيۡلِ هِيَ أَشَدُّ وَطۡـٔٗا وَأَقۡوَمُ قِيلًا ۝٦ إِنَّ لَكَ فِي ٱلنَّهَارِ سَبۡحٗا طَوِيلٗا ۝٧ وَٱذۡكُرِ ٱسۡمَ رَبِّكَ وَتَبَتَّلۡ إِلَيۡهِ تَبۡتِيلٗا ۝٨ رَّبُّ ٱلۡمَشۡرِقِ وَٱلۡمَغۡرِبِ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ فَٱتَّخِذۡهُ وَكِيلٗا ۝٩﴾

### فەرماندان بە پێغەمبەر(ﷺ) بە شەونوێژکردن

خودای گەورە فەرمانی دا بە پێغەمبەر(ﷺ) واز لە خۆ داپۆشین بێنێت کە چوونە ناو جێگای خەوتن لە شەودا هەڵسێت بۆ شەو نوێژ بۆ پەروەندەی خۆی وەك فەرموویەتی: ﴿ تَتَجَافَىٰ جُنُوبُهُمۡ عَنِ ٱلۡمَضَاجِعِ يَدۡعُونَ رَبَّهُمۡ خَوۡفٗا وَطَمَعٗا وَمِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ يُنفِقُونَ ﴾.[1] واتە: تەنیشتیان دوور دەکەوێتەوە لە جێگای خەوتنیان (لە خەو هەڵدەستن شەو نوێژ دەکەن) هاوارو نزا لە پەروەردگاریان دەکەن بە ترس و هیواوەو لەو ڕۆزیو سامانەی پێماندائون دەبەخشن. بەو شێوە پێغەمبەر فەرمانی خودای بەجێ هێناوە هەڵدەستا بۆ شەو نوێژ کردن. شەو نوێژ لەسەر پێغەمبەر(ﷺ) واجب بوو بە فەرمانی خودا وەك فەرموویەتی:﴿ وَمِنَ ٱلَّيۡلِ فَتَهَجَّدۡ بِهِۦ نَافِلَةٗ لَّكَ عَسَىٰٓ أَن يَبۡعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامٗا مَّحۡمُودٗا ﴾.[2] واتە: وە (ئەی محمد (ﷺ) لە بەشێکی شەودا هەستە شەو نوێژ بکە بە قورئان خوێندن تێیدا ئەوە زیادە نوێژی تایبەت بە تۆیە ئومێد وایە پەروەردگارت بتگەیەنێتە پلەو جێگایەکی پەسەند کراو. وە لێرەدا

---

[1] السجدة (١٦).

[2] الإسراء (٧٩).

ئەندازەی ئەو شەو نوێژەی کە پێی هەڵدەستێت بۆ دیاریکردووە فەرموویەتی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمُزَّمِّلُ﴾ ئەی ئەو کەسەی کە خۆت داپۆشیووە. ﴿قُمِ ٱلَّيۡلَ إِلَّا قَلِيلٗا﴾ شەو هەستەوە، مەگەر کەمێك نەبێت. واتە: ئەی ئەو کەسەی کە خەوتووی، قەتادە وتی: خۆت داپۆشیووە لە ناو جێگەدا[1] وە دەفەرمووێت:﴿نِّصۡفَهُۥٓ أَوِ ٱنقُصۡ مِنۡهُ قَلِيلًا﴾ لە نیوکەی، یان کە مێکی لێ دابڕە. ﴿نِّصۡفَهُۥٓ﴾ بەدەلە لە شەو، ﴿أَوِ ٱنقُصۡ مِنۡهُ قَلِيلًا ۝٣ أَوۡ زِدۡ عَلَيۡهِ﴾ واتە: کەمێکی لێ دابڕە یان کەمێکی بخەرە سەر. واتە: فرمانمان پێ کردوویت کە نیوەی شەو شەونوێژ بکەیت یان کەمێك زیاتر یان کەمتر ئارەزوی خۆتە.

### شێوازی خوێندنەوەی قورئان

خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿أَوۡ زِدۡ عَلَيۡهِ وَرَتِّلِ ٱلۡقُرۡءَانَ تَرۡتِيلًا﴾ یان کەمێکی بخەرە سەر ئەم قورئانەش بە لەسەرخۆیی بیخوێنەو بە ڕەوانی. واتە: لەسەرخۆ بیخوێنە یارمەتی دەرە بۆ تێگەیشتنی قورئانو بیر لێ کردنەوەی، وە بەوشێوەیە پێغەمبەر(ﷺ) قورئانی دەخوێند. عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێت) وتی: پێغەمبەر(ﷺ) سورەتێك قورئانی دەخوێند بە دەنگەوەو لەسەرخۆ زۆری پێ دەچوو[2] وە لە سەحیحی بوخاریدا هاتووە لە ئەنەسەوە کە پرسیاری لێ کرا لە قورئان خوێندنی پێغەمبەر(ﷺ) وتی: خوێندنی پێغەمبەر(ﷺ) بە (مەددە) بووە واتە مەددی تەبیعی حەرفی مەمدودی مەد دەکرد .پاشان ئەنەس (بسم لله الرحمن الرحيم) ی خوێند لامی اللهو میمی ڕەحمانو یێ ڕەحیمی درێژ کردەوەو خوێندی.[3] ئیبنو جورەیج (جريج) وتی: لە ئیبنو ئەبو مولەیکەوە (مُلَيكة) ئەویش لە ئومو سەلەمەوە (أم سلمة) (ڕەزای خوای لێ بێت) کە پرسیاری لێ کرا لە خوێندنی پێغەمبەر(ﷺ) ئومو سەلەمە وتی: ئایەت ئایەت دەیبڕیو دەوەستا لە سەری، واتە لە ئایەتی دوایی جیای دەکردەوە ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ۝١ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ۝٢ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ۝٣ مَٰلِكِ يَوۡمِ ٱلدِّينِ﴾ ئەحمەدو ئەبو داودو ترمذی ڕیوایەتیان کردووە.[4] لە پێشەکی ئەم تەفسیرەدا ئەو فەرموودانەی بەڵگە بوون لەسەرئەوەی کە سونەتە قورئان خوێندن بە دەنگ لەراندنەوەو جوانکردنی لەکاتی قورئان خوێندندا باسی کرد وەك لەم

---

[1] الطبری (٢٣/٦٧٧). سەنەدی ئەم فەرموودەیە زۆر لاوازە، بە زار هێناویەتی لە (٢٢٧٦) هەیسەمیش لە (الجمع) هێناویەتی لە (١١٤٤٣)، بە زار و تەبەرانیش هێناویانە (الأوسط) دا کە ئەو فەرموودەیە ناوی موعەلای کوڕی عەبدوڕەحمانی واسیتی (الواسط) تیایە کە زۆر درۆزنە.

[2] مسلم (١/٥٠٧).

[3] فتح الباری (٨/٧٠٩).

[4] احمد (٦/٣٠٢)، ابو داود (٤/٢٩٤).

فەرموودەیەدا هاتووە (زینوا القرآن بأصواتکم) واتە: (قورئان برازێننەوە بە دەنگەکانتان)[1] وە (لە ئێمە نیە کەسێك بە ئاوازەوە (بە دەنگەوە) قورئان نە خوێنێت)[2] وە (سازێك لە سازەکانی (آل) داودی پێ دراوە)[3] واتە مەبەستی ئەبو موسا. واتە: دەنگی ئەوەندە خۆشە وەك دەنگی داود پێغەمبەر(علیه السلام) وایە ئەبو موسا وتی: گەر بمزانیایە تۆ گوێت گرتووە لە قورئان خوێندنی من جوانتر بۆم دەڕازاندیتەوە (جوانتر دەنگم بۆ دەلەرانیتەوە) وە لە ئیبنو مسعودەوە کە وتی: پەرش‌و بڵاوی مەکەنەوە وەك بڵاو کردنەوەی خورمای خراپ‌و بە پەلە مەیبڕن وەك بڕینی شیعر، بوەستن لەو شوێنانەی کە جێگای سرنج ڕاکێشانەو دڵەکانی پێ بجوڵێنن با هیچ کەس لە ئێوە هەوڵ نەدا بگاتە کۆتایی سورەتەکە. بەغەوی (البغوی) ڕیوایەتی کردووە.[4] بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو وائلەوە (وائل) کە وتی: ئەمشەو (المفصل)م خوێند لەیەك ڕکاتدا (في رکعة) ئیبنو مەسعود وتی: بە پەلە بڕین وەك بڕینی شیعر، وە من وێنەی ئەوانەم زانیووە کە پێغەمبەر(ﷺ) لە تەنیشت یەك دای دەنان، بیست سورەتی باس کرد لە (المفصل) کان هەردوو سورەت لە ڕکاتێکدا (في رکعة)[5].

### مەزنی قورئان

خـوای گـەورە فەرموویـەتی ﴿إِنَّا سَنُلْقِي عَلَيْكَ قَوْلًا ثَقِيلًا﴾ بەمزوانـە وتارێـك گرانـت دەخـەینـە سـەر. حسن‌و قەتادە وتیان: واتە کار پێکردنی. وە وتراوە: لە کاتی دابەزینیدا زۆر گرانە لەبـەر زۆر گـەورەیی وەك زەیدی کوڕی سابت (ثابت) وتی: قورئان هاتە خوارەوە بۆ پێغەمبـەر(ﷺ) ڕانـی لەسـەر ڕانم بـوو وەختەبوو ڕانم بشکێت[6] واتە: زۆر ڕانم مانـدوو بـوو. ئیمـامی ئەحمـەد ڕیوایـەتی کـردووە لـە عبـدالله ی کوڕی عەمرو (عمرو) وتی: پرسیارم کرد لە پێغەمبـەر(ﷺ) وتم: ئەی پێغەمبەری خودا ئایا هەست بـەو نیگا (وحی) یە دەکەی؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: دەنگ دەبیستم پاشان لەو کاتەدا بێ دەنـگ دەبم. هەر جارێك لەو جارانەی نیگام (وەحیم) بۆ دێت هەست دەکـەم گیـانم دادەگیرێـت[7] بـە تـەنها ئەحمـەد ڕیوتەتی کردووە. وە لە ئەوەلی سەحیحی بوخاریەوە هاتووە لە عائیـشەوە (خـوای لـێ ڕازی بێـت) کـە حارسی (الحارث) کوڕی هیشام پرسیاری لـە پێغەمبـەری خـوا کـرد (ﷺ) کـە چـۆن نیگـات بـۆ دێـت؟

---

[1] فتح الباری (٥٢٧/١٣).

[2] فتح الباری (٥١٠/١٣)

[3] فتح الباری (٧١٠/٨).

[4] معالم التنزیل (٢١٥/٨).

[5] فتح الباری (٢٩٨/٢).

[6] فتح الباری (١٠٨/٨).

[7] أحمد (٢٢٢/٢).ئیبنو لەهیعەی تێدیە کە فەرموودەی لاوازە.

فەرمووی: (هەندێ کات وەك وێنەی دەنگی زەنگ بۆم دێت، ئەم شێوە نیگایە لە هەموو شێوەکانی تر گرانترە لەسەرم لە دوایی دا ئەو گرانیەم لە سەر لادەچێ.. ئەوەی فریشتەی نیگا لەو کاتی گرانیدا پێی وتووم هەموویم لەبەر کردوە. گەلێك کاتی تریش فریشتەی نیگا دەچێتە شێوەی پیاوێکەوە قسەم لەگەڵ دەکات ئەوەی بیلێت لە بەری دەکەم). عائیشەوە (خوای لێ ڕازی بێت) وتی: لە ڕۆژی زۆر ساردو سەرمادا پێغەمبەرم (ﷺ) دیووە کە نیگای بۆ دەهاتە خوارەوە گرانی نیگاکەی لەسەر لا دەچوو لا چانگی تەوێڵی ئارەقی لێ دەهاتە خوارەوە.[1] وە ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە عائیشەوە: نیگا بهاتایەتەوە خوارەوە بۆ پێغەمبەر(ﷺ) بە سواری وڵاغەکەیەوە بوایە گرانیەکەی دیاربوو بە وڵاغەکەیەوە لە جێی خۆی دەوەستاو توانای ڕۆیشتنی نەدەما[2] ئیبنو جەریر وتی: لە دوو ڕووەوە گران دەبوو. وەك عبدالرحمن کوڕی زەید کوڕی ئەسلم (اسلم) وتی: چۆن گران بوو لە دنیادا لە تەرازوشدا گرانە لە ڕۆژی قیامەتدا.

## ڕێزی شەونوێژ

خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ نَاشِئَةَ ٱلَّيۡلِ هِيَ أَشَدُّ وَطۡـࣰٔا وَأَقۡوَمُ قِيلًا﴾ شەونخونی بۆ ڕامان بێدارترەو بۆ قورئان خوێندیش لە بارترە. عومەرو ئیبنو عەباسو ئیبنو زوبەیر(الزبیر) وتیان: شەو هەمووی کاتی هەڵسانە[3] وە هەر بەو شێوەیە موجاهیدو کەسانی تریش وتویانە.[4] کاتێك کەسێك هەڵسابێت لە شەودا وتراوە (نشأ) لە ڕیوایەتێکدا هاتووە لە موجاهدەوە: واتە دوای عیشا.[5] وە هەر بەم شێوەیە ئەبو مجلز و قەتادەو سالمو ئەبو حازمو محمدی کوڕی مونکەدیر (المنكدر) وتوویانە.[6] مەبەست لە هەڵسانی شەو (ناشئة) کاتەکانو وەختەکانی، وە هەموو کاتێك لەو کاتانە پێی دەوترێت (ناشئة) واتە هەڵسانی شەو (شەونخونی) مەبەست لێرەدا ئەوەیە کە بێداری بوونەوە بۆ شەونوێژەو بیرکردنەوە بێدارترەو کاریگەر ترە لە نێوان دڵو زماندا وە لەبارترە بۆ قورئان خوێندن. بۆیە خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿هِيَ أَشَدُّ وَطۡـࣰٔا وَأَقۡوَمُ قِيلًا﴾ واتە: چاکترو بەجێ ترە بۆ بیرکردنەوە لەخوێندنەوەی قورئانو تێ گەیشتن لێی لە نوێژکردن لە ڕۆژدا. چونکە ڕۆژ وەختێك بڵاوبوونەی گەڕان بە دوای بژێوی بۆ ماڵو منداڵو ژاوە ژاوی

[1] فتح الباري (١/٢٥).
[2] أحمد (٦/١١٨). فەرموودەیەکی حەسەنەو سەنەدەکانیشی حەسەنە.
[3] الطبري (٢٣/٦٨٣).
[4] الطبري (٢٣/٦٨٢).
[5] الطبري (٢٣/٦٨٢).
[6] الطبري (٢٣/٦٨٣)

خەڵکە. حافیزی ئەبو یەعلای موسڵی (الحافظ أبو يعلى الموسلي) وتی: ئیبراهیمی کوڕی سەعیدی جەوهەری (الجوهري)و ئەبو ئوسامەو ئەعمەش (الاعمش) بۆی گێڕاینەوە کە ئەنەسی کوڕی مالك ئەم ئایەتەی خوێندەوە ﴿إِنَّ نَاشِئَةَ ٱلَّيۡلِ هِيَ أَشَدُّ وَطۡـٔٗا واصوب قِيلًا﴾ پیاوێك پێی وت: ئێمە دەیخوێنینەوە ﴿وَأَقۡوَمُ قِيلًا﴾ ئەنەس پێی وت: (أصوب وأقوم و أهيأ) وێنەی ئەمانە هەریەکن.[1] واتە: یەك مانایان هەیە.

بۆیە فەرموویەتی: ﴿إِنَّ لَكَ فِي ٱلنَّهَارِ سَبۡحٗا طَوِيلٗا﴾ لە ڕۆژیشدا مەودای هاتو چۆت درێژە. ئیبنو عەباس‌و عیکرەمەو عەتای کوڕی ئەبو ئەسلەم وتیان: واتە کاتو خەوتن[2] ئەبو عالیەو موجاهدو ئەبو مالك‌و زەحاك (ضحاك) و حسن‌و قەتادەو ڕەبیعی کوڕی ئەنەس‌و سوفیانی سەوری (الثوري) وتیان: مەودایەکی درێژ. قەتادە وتی: واتە کاتو پێداویستی‌و هاتوچۆ. عبدالرحمانی کوڕی زەیدی کوڕی ئەسلەم لەم ئایەتەدا ﴿إِنَّ لَكَ فِي ٱلنَّهَارِ سَبۡحٗا طَوِيلٗا﴾ وتی: بۆ پێویستەکانت لە ڕۆژدا وە خۆت ئامادە بکەو مۆڵەت دابنێ بۆ دینەکەت لە شەودا. واتە: بۆ خواپەرستی. وتی: ئەمە لەوەختێکدا بووە کە شەونوێژ فەرز بووە لە دوایدا خودای گەورە چاکەو ڕێزی خۆی نا بەسەر بەندەکانیدا سوکی کردو لای برد لەسەریان وە ئەم ئایەتانەی خوێند ﴿قُمِ ٱلَّيۡلَ إِلَّا قَلِيلٗا﴾ تا کۆتایی ئایەتەکە. پاشان ئەم ئایەتەی خوێند ﴿إِنَّ رَبَّكَ يَعۡلَمُ أَنَّكَ تَقُومُ أَدۡنَىٰ مِن ثُلُثَيِ ٱلَّيۡلِ وَنِصۡفَهُۥ﴾[3] تا گەیشتە ﴿فَٱقۡرَءُواْ مَا تَيَسَّرَ مِنۡهُۚ﴾ وە خودا فەرموویەتی: ﴿وَمِنَ ٱلَّيۡلِ فَتَهَجَّدۡ بِهِۦ نَافِلَةٗ لَّكَ عَسَىٰٓ أَن يَبۡعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامٗا مَّحۡمُودٗا﴾[4] واتە: وە (ئەی موحەممەد (ﷺ) لە بەشێکی شەودا هەستە شەونوێژ بکە بە قورئان خوێندن تیایدا ئەوە زیادە نوێژی تایبەت بە تۆیە ئومێد وایە پەروەردگارت بتگەیەنێتە پلەو جێگایەکی پەسەند کراو. بەڵگەش لەسەری ئەوەیە کە ئیمامی ئەحمد ڕیوایەتی کردووە لە موسنەدەکەیدا (في مسنده) لە سەعیدی کوڕی هشامەوە کە ژنەکەی تەڵاق دابوو پاشان ڕۆشت بۆ مەدینە بۆ ئەوەی خانوویەکی هەبوو لەوێ بیفرۆشێت‌و بیدات بە چەك‌و تفاقی جەنگی پاشان غەزای پێ بکات لەگەڵ ڕۆم هەتا دەمرێت. گەیشت بە کۆمەڵێك لە هۆزەکەی ڕێگایان نەدا ئەو کارە بکات پێیان وت لە سەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) کۆمەڵێکی شەش کەسی ویستیان ئەو کارە بکەن بەڵام ڕێگای پێ نەدان‌و فەرمووی: (ئایا لە من دا پێشەنگی‌و سەرمەشقی جوان نابینن؟) وازی پێ هێنان لەوەو کردنی بە شایەت لەسەر گێڕانەوەی

---

[1] مسند أبي يعلى (٧/٨٨).

[2] الطبري (٢٣/٦٨٦)، القرطبي (١٩/٤٢).

[3] الطبري (٢٣/٦٨٦).

[4] الاسراء (٧٩).

ژنەکەی پاشان گەڕایەوە بۆ لامانو هەواڵی داینێ کە ڕۆیشتوەتە لای ئیبنو عەباس پرسیاری سونەتی وەتری (عن الوتر) لێ کردووە. ئەویش پێی وتووە: ئایا هەواڵت بدەمێت بە زاناترین خەڵکی ئەم سەر زەمینە بە وەتری پێغەمبەری خودا؟ (ﷺ) وتی: بەڵێ، بڕۆ بۆ لای عائیشەو پرسیاری لێ بکەو پاشان بێرەوە بۆلام پێم بڵێ چی وەڵاّم داویتەوە، وتی: ڕۆیشتم بۆ لای حەکیمی (حکیم) کوڕی ئەفلەح (افلح) داوام لێ کرد لەگەڵم بێت بۆ لای، وتی: من نزیکی ناکەومەوە واتە نایەم چونکە من داوام لێکرد کە هیچ نەڵێت لەبارەی ئەو دوو کۆمەڵەوە بە گوێی نەکردم هەر لەسەریان ڕۆیشت. سوێندم لێ خوارد لەگەڵم هات ڕۆیشتینە لای عائیشە وتی: تۆ حەکیمی؟ ناسی وتی: بەڵێ وتی: ئەمە کێیە لەگەڵت؟ وتی: سەعیدی کوڕی هشامە، وتی: کام هشام؟ وتی: کوڕی عامر، وتی: خودا لێی خۆش بێت، وە وتی: عامر پیاوێکی زۆر چاك بوو، وتم: ئەی دایکی موسوڵمانان لە ڕەوشتی پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئاگادارم بکە، وتی: ئایا قورئانت نەخوێندوەتەوە؟ وتم: بەڵێ، وتی: ڕەوشتی پێغەمبەری خودا(ﷺ) قورئان بووە. ویستم هەڵسمَ پاشان شەونوێژی پێغەمبەری خودام (ﷺ) هاتەوە یاد وتم: ئەی دایکی موسوڵمانان باسی شەونوێژی پێغەمبەری خودام (ﷺ) بۆ بکە، وتی: ئاخۆ ئەم ئایەتەت نەخوێندوەتەوە ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمُزَّمِّلُ﴾ وتم: بەڵێ، وتی: خودا شەونوێژی فەرز کرد لە ئەوەڵی ئەم سورەتەوە پێغەمبەری خوداو هاوەڵەکانی ساڵێك شەونوێژیان کرد هەموو پێیان ئاوسا. دوانزە مانگ کۆتایی ئەم سورەتە نەهاتە خوارەوەو وەستا لە ئاسماندا، پاشان خودا سوکی کرد بە هاتنە خوارەوەی کۆتایی ئەم سورەتە، شەو نوێژ بوو بە سونەت پاش ئەوەی کە فەرز بوو. پاشان ویستم هەستم. سونەتی وەتری (الوتر) پێغەمبەری خودا(ﷺ) هاتەوە بیر وتم: ئەی دایکی موسوڵمانان باسی سونەتی وەتری پێغەمبەری خودام (ﷺ) بۆ بکە، وتی: سیواكو ئاوی دەست نوێژمان بۆ ئامادە دەکرد ئەوندەی خودا حەزبکات هەڵدەستا لە شەودا سیواکی دەکردو پاشان دەستنوێژی دەگرتو پاشان هەشت ڕکات (رکعات) نوێژی دەکرد دانەدەنیشت تیایاندا هەتا هەشتەم ڕکات، لە هەشتەم ڕکاتدا دادەنیشت یادی (ذکری) خودای دەکرد بەتەنهاو لێی دەپاڕایەوە پاشان هەڵدەستایەوە سەلای نەدەدایەوە، پاشان نۆهەم ڕکاتی دەکردو دادەنیشتو هەر یادی خودای دەکرد لێی دەپاڕایەوە پاشان بەشێوەیەك سەلامی دەدایەوە گوێمان لێ بوو، پاشان دوو ڕکاتی تری دەکرد دادەنیشتو سەلامی دەدایەوە. ئەوە بووە نۆ ڕکات (رکعات) ئەی کوڕی خۆم، کاتێ پێك پێغەمبەری خودا(ﷺ) نوێژێکی بکردایە پێی خۆش بوو درێژەی پێ بدات. هەرکاتێك خەبەری نەبوایەتەوە یا نەخۆش بوایە یا ئێشی (وجع) ببوایە لە ڕۆژدا دوانزە ڕکات نوێژی دەکرد. وە ئاگادارنیم کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) قورئانی هەموو خوێندبێت لەیەك شەودا تا ڕۆژی کردووەتەوە وە مانگێك ڕۆژوی گرتبێت بە تەواوی لە ڕەمەزاندا نەبێت. چومە لای ئیبنو

عەباس‌و ئەوەی دایکی موسـولْمانان پێـی وتم بـۆم گێڕایـەوە وتـی: ڕاسـت دەکـەی، بـەڵام ئەگـەر مـن بچومایەتە لای‌و سەردانم بکردایە دەچووم بۆ ئەوەی لەدەمی خۆی ئەمەم ببیستایە.[1] ئـا بـەم شـێوەیە ئیمامی ئەحمد بە تەواوی ڕیوایەتی کردووە. وە موسلمیش لە سەحیحەکەیدا بەم شێوەیە هێناویـەتی.[2] ئیبنو جەریر لە ئەبو عبدالرحمانەوە ڕیوایـەتی کـردووە وتـی: وەختێـك ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمُزَّمِّلُ﴾ هاتـە خـوارەوە ساڵێك شەو نوێژیان کرد هەتا پێیان‌و ڕانیان ئاوساو فوی تـێ کـرا (ورمَـت) هـەتا ﴿فَٱقۡرَءُواْ مَا تَيَسَّرَ مِنۡهُ﴾ هاتە خوارەوە. وتی خەڵکی پشویاندا.[3] وە هەر بەم شێوەیە حەسەنی بەسری‌و سودی وتوویانە.[4] علی کوڕی ئەبو تەلحە (طلحة) وتی: لـە ئیبنـو عەباسـەوە لـەم فـەرموودەی خودایـەدا ﴿قُمِ ٱلَّيۡلَ إِلَّا قَلِيلٗا ۝٢ نِّصۡفَهُۥٓ أَوِ ٱنقُصۡ مِنۡهُ قَلِيلًا﴾ ئەو شەونوێژە زۆر گران بوو لەسەر موسولْمانان پاشان خودای گەورە سـوکی کرد لەسەریان بەزەیی هاتەوە پیایانـدا دوای ئـەوە ئـەم ئایەتانـەی نـاردە خـوارەوە: ﴿عَلِمَ أَن سَيَكُونُ مِنكُم مَّرۡضَىٰ وَءَاخَرُونَ يَضۡرِبُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ يَبۡتَغُونَ مِن فَضۡلِ ٱللَّهِ﴾ هـەتا ﴿فَٱقۡرَءُواْ مَا تَيَسَّرَ مِنۡهُ﴾ سـوپاس بـۆ خودا ڕێگای لێ تەنگ نەکردنەوە بەڵکو بۆی فراوان کردن.[5] وە دەفـەرمووێت: ﴿وَٱذۡكُرِ ٱسۡمَ رَبِّكَ وَتَبَتَّلۡ إِلَيۡهِ تَبۡتِيلٗا﴾ هەر ناوی پەروەردەی خۆت بە یاد بکەو لە غـەیرە ئـەو لـە هەمووشـت بتەکـەرەوە. زۆر لێـی بپاڕێرەوەو تەنها ئەو بپەرستە کاتێك لە کارکردن بوویتـەوەو پێویـستی بوونیـان تـەواوکرد هەڵـسە بـۆ خواناسی وەك خودا فەرمویەتی: ﴿فَإِذَا فَرَغۡتَ فَٱنصَبۡ﴾[6] واتە: وەختێك لە ئیشوکاری دنیـادا لێ بوینـەوە هەڵسە بۆ عیبادەت کردنی خودا، بەدڵێکی ئامادەو سافەوە. ئیبنـو زەیـدیش وای وتـووە یـا نزیـك لـەم مانایەی وتووە[7] وە ئیبنو عەباس‌و موجاهدو ئەبو ساڵح (صالح) عەتیەو زەحاك‌و سودی وتیان: ﴿وَتَبَتَّلۡ إِلَيۡهِ تَبۡتِيلٗا﴾ واتە: تەنها عیبـادەت هـەر بـۆ ئـەو بکـە[8] حەسـەن وتـی: هـەوڵ بـدە تـەنها دڵـت بـەوەوە

---

[1] احمد (٥٣/٦) فەرموودەیەکی سەحیحە.

[2] مسلم (٥١٢/١).

[3] الطبری (٦٧٩/٢٣).

[4] الطبری (٦٨٠/٢٣).

[5] الطبری (٦٧٩/٢٣).

[6] الطبری (٦٨٩/٢٣).

[7] الطبری (٦٨٨/٢٣).

[8] الطبری (٦٨٨/٢٣).

ببەستە.[1] ئیبنو جەریر وتی: وتراوە بەوەی کە هەر خەریکی خواناسی بووە ﴿وَتَبَتَّلْ﴾ واتە: یەکلا بوونەوە، وە لەوبارەیەوە ئەم فەرموودەیە ڕیوایەت کراوە ڕێگری کراوە لە ﴿وَتَبَتَّلْ﴾ واتە: خۆ یەکلایی کردنەوە بۆ خوداناسیو واز لە ژن هێنان.[2] وە دەفەرمووێت: ﴿رَّبُّ ٱلْمَشْرِقِ وَٱلْمَغْرِبِ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ فَٱتَّخِذْهُ وَكِيلًا﴾ پەروەرێنی خۆرهەلاتو خۆرئاوایە، بە غەیرە ئەو هیچ شت بۆ پەرستن نابێت هەر ئەو بە بریکار بگرە. واتە: هەر ئەو خاوەنو دەستەلاتدارە لە خۆرهەلاتو خۆرئاوا هیچ پەرستراوێك نیە جگە لەو چۆن بە تەنها پەرستووتە ئاواش بیکەرە بریکاری (وەکیلی) خۆت. وەك خودای گەورە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿فَٱعْبُدْهُ وَتَوَكَّلْ عَلَيْهِ﴾[3] واتە: کەواتە ئەو بپەرستەو پشت بەو ببەستە. وە فەرموویەتی: ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ﴾[4] واتە: (خودایە) تەنها تۆ دەپەرستین وە تەنها لە تۆ داوای یارمەتی دەکەین. وە ئایەتی تر زۆرە بەم مانایە کە فەرمانی تێدایە بە ناسینی خودا بە تەنهاو گوێڕایەڵی کردنیو پشت بەستن پێی.

﴿وَٱصْبِرْ عَلَىٰ مَا يَقُولُونَ وَٱهْجُرْهُمْ هَجْرًا جَمِيلًا ﴿١٠﴾ وَذَرْنِي وَٱلْمُكَذِّبِينَ أُو۟لِى ٱلنَّعْمَةِ وَمَهِّلْهُمْ قَلِيلًا ﴿١١﴾ إِنَّ لَدَيْنَآ أَنكَالًا وَجَحِيمًا ﴿١٢﴾ وَطَعَامًا ذَا غُصَّةٍ وَعَذَابًا أَلِيمًا ﴿١٣﴾ يَوْمَ تَرْجُفُ ٱلْأَرْضُ وَٱلْجِبَالُ وَكَانَتِ ٱلْجِبَالُ كَثِيبًا مَّهِيلًا ﴿١٤﴾ إِنَّآ أَرْسَلْنَآ إِلَيْكُمْ رَسُولًا شَٰهِدًا عَلَيْكُمْ كَمَآ أَرْسَلْنَآ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ رَسُولًا ﴿١٥﴾ فَعَصَىٰ فِرْعَوْنُ ٱلرَّسُولَ فَأَخَذْنَٰهُ أَخْذًا وَبِيلًا ﴿١٦﴾ فَكَيْفَ تَتَّقُونَ إِن كَفَرْتُمْ يَوْمًا يَجْعَلُ ٱلْوِلْدَٰنَ شِيبًا ﴿١٧﴾ ٱلسَّمَآءُ مُنفَطِرٌۢ بِهِۦ ۚ كَانَ وَعْدُهُۥ مَفْعُولًا ﴿١٨﴾﴾

### فەرماندان بە خۆڕاگری بەرامبەر ئازاری خودانەناسان

خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَٱصْبِرْ عَلَىٰ مَا يَقُولُونَ وَٱهْجُرْهُمْ هَجْرًا جَمِيلًا﴾ بۆ ئەو قسانەش کە دەیکەن، خۆڕاگربە وە بە شێوەیەکی جوانیش دەستیان لێ هەڵبگرەو دووربە لێیان. خودای گەورە فەرمان دەدات بە پێغەمبەر(ﷺ) بە خۆڕاگری لەسەر ئەو قسانەی کە نەفامەکانی قورەیش دەیکەن بەرامبەریو خۆی لابدات لێیان بە شێوەیەکی جوانو پەسەند کە قسەی نەیەتەسەرو وەڵامیان نەداتەوە. پاشان دەفەرمووێت بە پێغەمبەر(ﷺ) هەڕەشە دەکات لەو خودانەناسانەی هۆزەکەیو دەیانترسێنێت بە ئەو خودایەی کە هیچ کەس لەبەر قینو تورەیی ئەو خۆی ناگرێت. وە دەفەرمووێت:

---

[1] الطبري (٦٨٧/٢٣).

[2] الشرح (٧).

[3] هود (١٢٣).

[4] الفاتحة (٥).

﴿وَذَرْنِي وَٱلْمُكَذِّبِينَ أُوْلِي ٱلنَّعْمَةِ وَمَهِّلْهُمْ قَلِيلًا﴾ لێم گەڕێ بۆ ئەو خاوەن نازو نیعمەتانەی کە ئاینی منی بە درۆ دەزانن، تۆش کەمێك مۆڵتیان بدە. واتە: وازم لێ بێنە بۆ ئەو بێ دینانەی کە نازپەروەردەن‌و خاوەن سامانێکی زۆرن باشتر دەتوانن فەرمانی خودا بەجێ بێنن لە خەڵکی تر کەچی داوای هەندێك شت دەکەن لای کەسی تر نیەو دەست ناکەوێت ﴿وَمَهِّلْهُمْ قَلِيلًا﴾ تۆش کەمێك مۆڵەتیان بدە وە فەرموویەتی: ﴿نُمَتِّعُهُمْ قَلِيلًا ثُمَّ نَضْطَرُّهُمْ إِلَىٰ عَذَابٍ غَلِيظٍ﴾[1] واتە: کەمێك نازو نیعمەتیان پێدەدەین (لەدونیادا) لە پاشان ناچاریان دەکەین کە بچنە سزای سەختەوە. لەبەرئەوە لێرەدا فەرموویەتی: ﴿إِنَّ لَدَيْنَآ أَنكَالًا وَجَحِيمًا﴾ بێگومان کۆت‌و زنجیری قورس‌و ئاگری جەهەننەم لەلای ئێمەیە ﴿أَنكَالًا﴾ واتە: زنجیرە. ئبنو عەباس‌و عیکرەمەو تاوس (طاوس) و محمدی کوڕی کەعب‌و عبدالله ی کوڕی بورەیدەو ئەبو عیمرانی جەونی‌و ئەبو میجلەزو زەحاك‌و حەمادی کوڕی ئەبو سەلمان‌و قەتادەو سودی‌و ئیبنو موبارەکی سەوری کەسانی تریش وتوویانە.[2] ﴿وَجَحِيمًا﴾ ئاگری تاودراو، وە فەرموویەتی: ﴿وَطَعَامًا ذَا غُصَّةٍ وَعَذَابًا أَلِيمًا﴾ خۆراکێکی گەرووگریش، ئازارێکی زۆر بەژانیش. ئیبنو عەباس وتی: ﴿وَطَعَامًا ذَا غُصَّةٍ﴾ واتە: خواردنێکە کە چووە ناو گەروو نە دەڕواتە خوارەوە و نەدێتەدەرەوە[3]. وە فەرموویەتی: ﴿يَوْمَ تَرْجُفُ ٱلْأَرْضُ وَٱلْجِبَالُ وَكَانَتِ ٱلْجِبَالُ كَثِيبًا مَّهِيلًا﴾ لەوڕۆژەدا زەوی دەلەرزێت‌و کەژان دەهەژێن‌و کێوەکان دەبنە گردۆلکەی لمی خزۆك . واتە: کێوەکان دەبنە گردۆلکەی لمی پاش ئەوەی کە بەردێکی رەق بوون پاشان بڵاو بێتەوە هیچی نامینێت دەڕوات هەتا زەمین دەبێت بە دەشتێکی تەخت، لاری تێدا نابینیت. واتە: نە دۆڵ‌و نە شیوو نە کۆسپ‌و نە چاڵ نامینێت، واتە نە شتێك هەیە بەرزبێتەوە وە یان نزم بێتەوە.

## پێغەمبەری ئێوەش (ﷺ) وەك پێغەمبەری فیرعەون وایە، چارەنووسی فیرعەون باش دەزانن‌و ئاگادارن

پاشان خودای گەورە ڕووی قسە دەکاتە خودانەناسانی قورەیش مەبەستیشی هەموو مرۆڤە بەگشتی فەرموویەتی ﴿إِنَّآ أَرْسَلْنَآ إِلَيْكُمْ رَسُولًا شَٰهِدًا عَلَيْكُمْ كَمَآ أَرْسَلْنَآ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ رَسُولًا﴾ ئێمە پێغەمبەرێکمان بۆ ئێوە نارد شایەد بێت بە سەرتانەوە هەروەك بۆ ئالی فیرعەون پێغەمبەرێکمان بەڕێ

---

[1] لقمان (٢٤).

[2] الطبری (٦٩١/٦٩٠/٢٣)، الدر المنثور (٣١٩/٨).

[3] الطبری (٦٩١/٢٣).

کرد. ﴿فَعَصَىٰ فِرْعَوْنُ ٱلرَّسُولَ فَأَخَذْنَٰهُ أَخْذًا وَبِيلًا﴾ فیرعەون بەقسەی پێغەمبەرەکەی نەکرد ئەوسا ئێمەش ئازارێکی بە ژانماندا. ئیبنو عەباسو موجاهیدو قەتادەو سودیو سەوری (الثوری) وتیان: ﴿أَخْذًا وَبِيلًا﴾ واتە ئازارێکی بەهێز.[1] واتە: ئێوەش ئاگاداری خۆتان بن ئەگەر باوەڕ نەکەن بەم پێغەمبەرە (ﷺ)، تووشی ئەو سزایە دەبن کە فیرعەون تووشی بوو کە خودا زۆر بەتوندی تۆڵەی لێ سەندو سزایدا، وەك خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَأَخَذَهُ ٱللَّهُ نَكَالَ ٱلْءَاخِرَةِ وَٱلْأُولَىٰٓ﴾[2] واتە: ئینجا خودا گرفتاری کرد بەسزای هەردوو جیهان. وە ئێوە زیاتر سزا دەدرێنو لەناو دەبرێن ئەگەر باوەڕ نەکەن بە پێغەمبەرەکەتان چونکە پێغەمبەری ئێوە بەرێز ترو گەورەترە لە موسای کوڕی عیمران، ڕیوایەت کراوە لە ئیبنو عەباسو موجاهدەوە.

### هەڕەشەکردنو ترساندن بە ئازاری ڕۆژی قیامەت

خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَكَيْفَ تَتَّقُونَ إِن كَفَرْتُمْ يَوْمًا يَجْعَلُ ٱلْوِلْدَٰنَ شِيبًا﴾ جا ئەگەر ئێوە هەروا خودانەناس بن چۆن خۆتان دەپارێزن لەڕۆژێك کە منداڵ پیر دەکات. هەڵ دەگرێت ﴿يَوْمًا﴾ ووتەی ﴿تَتَّقُونَ﴾ کاری تێ کردبێو کردبێتی بە (معمولی) خۆی وەك ئیبنو جەریر گێڕاویەتیەوە لە ئیبنو مەسعودەوە کە وتویەتی: چۆن خۆتان دەپارێزن ئەی خەڵکینە لەوڕۆژەی کە منداڵەکانیش پیر دەکات ئەگەر باوەڕ نەهێننو بەڕاستی نەزانن.[3] وە دەگونجێت ﴿يَوْمًا﴾ (معمولی) ﴿كَفَرْتُمْ﴾ بێت. بەپێی مانای یەکەم چۆن خۆتان لادەدەن لەو ڕۆژە زۆر ترسناکە گەورەیە ئەگەر بێ دین بن. وە بەپێی مانای دووهەم چۆن خۆ دەپارێزن لە ڕۆژی قیامەتدا ئەگەر خوانەناس بنو باوەڕتان پێ نەکردبێت. هەردوو ماناکە چاکن بەڵام یەکەم باشترە والله أعلم. ﴿يَوْمًا يَجْعَلُ ٱلْوِلْدَٰنَ شِيبًا﴾ واتە: لە زۆر ناڕەحەتیو ترسناکیو جوله جولی زۆری زەمینو گرانی ئەو ڕۆژە. لەو کاتەدا خودا دەفەرموێت بە باوکمان ئادەم خەڵکی ناو ئاگر ڕەوانەکە بۆ ناو ئاگر. پێغەمبەر ئادەمیش (علیه السلام) دەڵێت بە چ ئەندازەیەك؟ دەفەرموێت: لە هەزار کەس نۆسەدو نەوەدونۆ کەس ڕەوانەکە بۆ ناو ئاگرو یەك کەسیش بۆ بەهەشت.

وە فەرموویەتی: ﴿ٱلسَّمَآءُ مُنفَطِرٌۢ بِهِۦ ۚ كَانَ وَعْدُهُۥ مَفْعُولًا﴾ ئاسمانی پێ شەقار دەبێت. بەڵێنی خواش هەر دێتە جێ. حسنو قەتادە وتیان: لەبەر هاتنی ڕۆژی قیامەت لە زۆر ترسناکیو گرانیەکەی. ﴿كَانَ وَعْدُهُۥ

---

[1] الطبری (٢٣/٦٩٣).
[2] النازعات (٢٥).
[3] الطبری (٢٣/٦٩٤).

مَفۡعُولًا ﴾ واتە: بەڵێنی خودا بۆ هاتنی ئەم ڕۆژە هەر دێتەجێ واتە: هیچ گومانی تێدانیە هەر دەبێت بێتە دی.

﴿إِنَّ هَٰذِهِۦ تَذۡكِرَةٞۖ فَمَن شَآءَ ٱتَّخَذَ إِلَىٰ رَبِّهِۦ سَبِيلًا ﴿١٩﴾ ۞ إِنَّ رَبَّكَ يَعۡلَمُ أَنَّكَ تَقُومُ أَدۡنَىٰ مِن ثُلُثَيِ ٱلَّيۡلِ وَنِصۡفَهُۥ وَثُلُثَهُۥ وَطَآئِفَةٞ مِّنَ ٱلَّذِينَ مَعَكَۚ وَٱللَّهُ يُقَدِّرُ ٱلَّيۡلَ وَٱلنَّهَارَۚ عَلِمَ أَن لَّن تُحۡصُوهُ فَتَابَ عَلَيۡكُمۡۖ فَٱقۡرَءُواْ مَا تَيَسَّرَ مِنَ ٱلۡقُرۡءَانِۚ عَلِمَ أَن سَيَكُونُ مِنكُم مَّرۡضَىٰ وَءَاخَرُونَ يَضۡرِبُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ يَبۡتَغُونَ مِن فَضۡلِ ٱللَّهِ وَءَاخَرُونَ يُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِۖ فَٱقۡرَءُواْ مَا تَيَسَّرَ مِنۡهُۚ وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَقۡرِضُواْ ٱللَّهَ قَرۡضًا حَسَنٗاۚ وَمَا تُقَدِّمُواْ لِأَنفُسِكُم مِّنۡ خَيۡرٖ تَجِدُوهُ عِندَ ٱللَّهِ هُوَ خَيۡرٗا وَأَعۡظَمَ أَجۡرٗاۚ وَٱسۡتَغۡفِرُواْ ٱللَّهَۖ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمُۢ ﴿٢٠﴾﴾

### ئەم سورەتە خاوەن هۆشەکان تێدا ڕادەمێنن و بیری لێدەکەنەوە

خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ هَٰذِهِۦ تَذۡكِرَةٞۖ فَمَن شَآءَ ٱتَّخَذَ إِلَىٰ رَبِّهِۦ سَبِيلًا﴾ ئەم قورئانە بیرەوەرییەکە (بۆ مەردوم) کێ حەز بکات بەرەو پەروەرندەی خۆی ڕێگە دەردەکات. یا ﴿إِنَّ هَٰذِهِۦ﴾ واتە: ئەم سورەتی ﴿تَذۡكِرَةٞ﴾ واتە: بیرەوەری و ئامۆژگاریە بۆ خاوەن بیرو هۆشەکان. بۆیە فەرموویەتی: ﴿ فَمَن شَآءَ ٱتَّخَذَ إِلَىٰ رَبِّهِۦ سَبِيلًا﴾ واتە: بۆ ئەو کەسانەی کە خودا حەزدەکات شارەزایان بکات وەك لە سورەتێکی تردا موقەیەدی کردووە. واتە: حەزی مرۆڤی بەستووە بە حەزی خوداوە فەرموویەتی: ﴿وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمًا﴾[1] واتە: ئێوە حەز ناکەن (لە گرتنی ئەو ڕێیە) مەگەر کاتێك کە خودا بیەوێت (وە بە زۆر ناچارتان بکات) بێگومان خودا دانای دروست کردارە.

### فەرزبوونی شەونوێژو لابردنی و (نسخ) باسی هۆی لابردنی

پاشان خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِنَّ رَبَّكَ يَعۡلَمُ أَنَّكَ تَقُومُ أَدۡنَىٰ مِن ثُلُثَيِ ٱلَّيۡلِ وَنِصۡفَهُۥ وَثُلُثَهُۥ وَطَآئِفَةٞ مِّنَ ٱلَّذِينَ مَعَكَ﴾ پەروەرندەت ئاگادارە کە تۆو هەندێك لەو لەو کەسانەی لەگەڵ تۆدان نزیك دوو بەش لە سێ بەشی ئەو شەوگارەو نیوەیی و سێ یەکیش، بۆ شەونوێژ هەڵدەستنەوە. واتە: جارێك ئەوهاو جارێکی تر بەشێوەیەکی تر ئەمەش بە ئارەزووی خۆتان نەبووە بەڵکو ناتوانن لەسەر ئەوەی کە فەرمانم پێ کردوون لە شەونوێژکردن چونکە زۆر گرانە لەسەرتان بۆیە فەرموویەتی: ﴿وَٱللَّهُ يُقَدِّرُ ٱلَّيۡلَ

---

[1] الانسان (٣٠).

﴿وَٱلنَّهَارَ﴾ هەر خوداشە کە ئەندازە بۆ شەوو ڕۆژ دادەنێت. واتە: جارێك شەوو ڕۆژ بەرامبەرن‌و جارێکی تر لە شەو کەم دەکاتەوەو جارێکی تریش لە ڕۆژ کەم دەکاتەوە، ﴿عَلِمَ أَن لَّن تُحْصُوهُ﴾ ئەو دەزانێت هەرگیز بۆتان ناژمێردرێت. واتە ئەو شەو نوێژە فەرزەی کە دایناوە لە سەرتان ﴿فَتَابَ عَلَيْكُمْ فَٱقْرَءُوا۟ مَا تَيَسَّرَ مِنَ ٱلْقُرْءَانِ﴾ ئەوا چاوپۆشی لیّ کردن دەسا هەر لە قورئانەکە چەند بۆتان دەلوێ بیخوێنن. واتە: کاتی بۆ دیاری مەکەن چەندێك بۆتان دەکرێت شەونوێژ بکەن لە جێگای نوێژکردن خوێندنەوەی فەرمووە وەك لە سورەتی(الاسراء)دا فەرموویەتی: ﴿وَلَا تَجْهَرْ بِصَلَاتِكَ﴾[1] واتە: لەنوێژکردندا دەنگت بەرزمەکەوە واتە (بقراءتك). ﴿وَلَا تُخَافِتْ بِهَا﴾[2] واتە: بە نهێنیش مەیکە. وە دەفەرموێت: ﴿عَلِمَ أَن سَيَكُونُ مِنكُم مَّرْضَىٰ ۙ وَءَاخَرُونَ يَضْرِبُونَ فِى ٱلْأَرْضِ يَبْتَغُونَ مِن فَضْلِ ٱللَّهِ ۙ وَءَاخَرُونَ يُقَـٰتِلُونَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ خودا دەزانێت هەندێکتان نەخۆش دەکەون‌و هەندێکیشتان بۆ بژێوی کە خودا بیدات بەوڵاتدا بڵاو دەبن، کۆمەڵێکیش لە ڕای خودا دەچنە غەزا. واتە: خودا دەزانێت کە هەندێك لەم کۆمەڵی موسوڵمانانە بیانکەی هەیە کە شەونوێژ نەکات، نەخۆش کە توانای نیە شەونوێژ بکات، ئەوانەی کە لە سەفەردان بە دوای بژێویکدا دەگەڕێن کە خودا بیدات وەك بازرگانی و کڕین‌و فرۆشتن، وە هەندێکی تریش سەرقاڵن بە ئیشێکەوە لە پێویستی خۆیان گرنگترە ئەویش غەزاکردنە لە ڕیگای خودا. ئەم ئایەتە بەڵکو ئەم سوڕەتە هەمووی مەکیە (فەرمانی غەزا) هێشتا نەدرابوو، ئەمەش گەورەترین نیشانەی پێغەمبەرێتیە، چونکە ئەمە هەواڵدانە بە نهێنیەکان کە لەمەودوا ڕودەدات. بۆیە فەرموویەتی: ﴿فَٱقْرَءُوا۟ مَا تَيَسَّرَ مِنْهُ﴾ سا چەندێك بۆتان دەڕەخسێت لێی بخوێنن، واتە هەستن بۆ شەونوێژ چوندێك بۆتان کرا. وە فەرموویەتی: ﴿وَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُوا۟ ٱلزَّكَوٰةَ﴾ نوێژ بکەن‌و زەکات بدەن، واتە: نوێژە فەرزەکان بکەن‌و زەکاتیش بدەن، ئەم بەڵگەیە بەدەست ئەوانەوە کە وتوویانە زەکات لە (مەککە دا) واجب بووە بەڵام ئەندازەکەی و شێوەی دەرکردنی دیاری نەکرابوو لە (مەدینە) دیاری کرا والله اعلم. ئیبنو عەباس‌و موجاهدو قەتادەو کەسانی تریش لە پێشینەکان (السلف) وتویانە: ئەو ئایەتەی خودای شەونوێژی فەرز کردبوو پێی لەسەر موسڵمانان لە پێشەوە نەسخ بووەتەوە[3] لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە کە پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمووی بەو پیاوە (پێنج نوێژ لە شەوو ڕۆژێکدا) پیاوەکە وتی: جگە لەمە

[1] الاسراء (١١٠).

[2] الاسراء (١١٠).

[3] الطبری (٢٣/٦٧٩/٦٨٠)، الدر المنثور (٨/٣٢٢).

هیچی ترم لەسەرە؟ واتە جگە لەم پێنج فەرزە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (نەخێر مەگەر خۆت زیادی بکەیت)[1] واتە: نوێژی سوننەتی زیادە بکەیت.

## فەرماندان بە ماڵ بەخشین و کاری چاك کردن

خودای گەورە دەفەرمووێت:﴿وَأَقْرِضُوا اللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا﴾ ماڵی خۆتان بە قەرزێکی پەسەند بدەن بە خودا واتە: لە ماڵی خۆتان ببەخشن خودا پاداشتتان دەداتەوە بەو ماڵ بەخشین بە چاکترین پاداشت و زۆر بەزیادیشەوە وەك فەرموویەتی: ﴿مَن ذَا الَّذِي يُقْرِضُ اللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا فَيُضَاعِفَهُ لَهُ أَضْعَافًا كَثِيرَةً ﴾[2] واتە:کێیە ئەوکەسەی قەرزبدات بە خودا بە قەرزێکی باش ئینجا خودا بۆی زیاد دەکات بە زیادکردنێکی زۆر. وە دەفەرمووێت: ﴿وَمَا تُقَدِّمُوا لِأَنفُسِكُم مِّنْ خَيْرٍ تَجِدُوهُ عِندَ اللَّهِ هُوَ خَيْرًا وَأَعْظَمَ أَجْرًا﴾ هەر چاکەیەك پێشی بخەن بۆ خۆتان لای خودا دەستان دەکەوێت ئەوەی لای خودا چاکترو گەورەترە لەڕووی پاداشەوە واتە: هەموو ئەو شتانەی لە پێشی خۆتانەوە دەیکەن بە خەیرو دەیبەخشن بۆتان دەمێنێتەوە لە ناو ناچێت ئەوە چاکەیەکە داتانناوە لە دنیا بۆ خۆتان. حافیزی ئەبو یەعلای کوڕی موسلی (الحافظ ابو يعلى الموسلى) ڕیوایەتی کردووە لە حارس (الحارث) کوڕی سوەیدەوە وتی: عبدالله وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (کێتان سامانی خۆی لەلا خۆشەویسترە لە سامانی کەس‌وکاری؟) وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) هیچ کەس نیە لە ئێمە سامانی خۆی لا خۆشەویستر نەبێت لە سامانی کەس‌وکاری، پێغەمبەر فەرمووی: (بزانن چی دەڵێن)، وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) غەیرە ئەمە هیچی تر نازانین، فەرمووی: (بێ گومان ماڵی هەرکەسێك لە ئێوە ئەوەیە کە لە پێشەوە ڕەوانەی کردووە، ماڵی کەس‌وکاریش ئەوەیە کە دوای خۆی خستووە)[3]بوخاریش ڕیوایەتی کردووە.[4] پاشان خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَاسْتَغْفِرُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ هەر لێ بوردن لە خودا بخوزن، خودا لە گوناهەکان خۆشدەبێت و دلۆڤانە. واتە زۆر زیکری خودا بکەن و داوای لێ بوردنی لێ بکەن لە هەموو هەڵس‌وکەوتێکتاندا بێ گومان خودا لێ بوردەو دلۆڤانە.

---

[1] فتح الباری (١/١٣٠)، مسلم (١/٤١).

[2] البقرة (٢٤٥).

[3] مسند أبی یعلی (٩/٩٧) فەرموودەیەکی سەحیحە.

[4] فتح الباری (١١/٢٦٤)، النسائی (٦/٢٣٧).

## تەفسیری سورەتی (المدثر)
## لە مەککەدا هاتوەتە خوارەوە

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمُدَّثِّرُ ﴿١﴾ قُمْ فَأَنذِرْ ﴿٢﴾ وَرَبَّكَ فَكَبِّرْ ﴿٣﴾ وَثِيَابَكَ فَطَهِّرْ ﴿٤﴾ وَٱلرُّجْزَ فَٱهْجُرْ ﴿٥﴾ وَلَا تَمْنُن تَسْتَكْثِرُ ﴿٦﴾ وَلِرَبِّكَ فَٱصْبِرْ ﴿٧﴾ فَإِذَا نُقِرَ فِى ٱلنَّاقُورِ ﴿٨﴾ فَذَٰلِكَ يَوْمَئِذٍ يَوْمٌ عَسِيرٌ ﴿٩﴾ عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ غَيْرُ يَسِيرٍ ﴿١٠﴾﴾

**یەکەم ئایەت بوو دوای اقرأ هاتە خوارەوە**

لە سەحیحی بوخاریو مسلم دا هاتووە لە ئەبو سەلەمەوە وتی: جابری کوڕی عبدالله هەواڵی دامێ کە بیستویەتی لە پێغەمبەری خوداوە باسی وەستانی (فترة) نیگای (وحی) دەکرد لە باسەکەیدا فەرمووی: وەختێك دەڕۆیشتم بەڕێدا لەوکاتەدا گوێم لە دەنگێك بوو لە ئاسمانەوە چاوم هەڵبڕی بەرەو ئاسمان ئەو فریشتەیە بوو کە هاتە لام لە (حراء) لە نێوان ئاسمانو زەمیندا لەسەر کورسیەك دانیشتبوو زۆر ترسابووم لێی کەوتم بەسەر زەمیندا پاشان هاتمەوە بۆماڵەوە وتم: دام پۆشن دام پۆشن، دایان پۆشیم خوای گەورە ئەم ئایەتانەی ناردە خوارەوە: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمُدَّثِّرُ ﴿١﴾ قُمْ فَأَنذِرْ ﴿٢﴾ وَرَبَّكَ فَكَبِّرْ ﴿٣﴾ وَثِيَابَكَ فَطَهِّرْ ﴿٤﴾ وَٱلرُّجْزَ فَٱهْجُرْ﴾ ئەی ئەوکەسەی خۆت داپۆشیوە، هەستە ترس وەبەربێنە، ڕاشی بگەیەنە کە پەروەرندەت مەزنە، بەرگیشت خاوێن ڕابگرە، لە هەرچی ناپاکیە دووربە. ئەبو سەلەمە وتی: ﴿وَٱلرُّجْزَ﴾ واتە بتەکان. پاشان نیگا بەردەوام دەهاتەخوارەوە، ئەمە وتەی بوخاری یە.[1] ئەم باسە ئەوە دەگەیەنێت کە نیگا پێش ئەم ئایەتانە هاتۆتە خوارەوە وەك پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (ئەمە ئەو فریشتەیە بوو کە هات بۆلام لە حراء) ئەویش جوبرەئیل بوو کاتێك هاتبووە لای. وەك خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿ٱقْرَأْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلَّذِى خَلَقَ ﴿١﴾ خَلَقَ ٱلْإِنسَٰنَ مِنْ عَلَقٍ ﴿٢﴾ ٱقْرَأْ وَرَبُّكَ ٱلْأَكْرَمُ ﴿٣﴾ ٱلَّذِى عَلَّمَ بِٱلْقَلَمِ ﴿٤﴾ عَلَّمَ ٱلْإِنسَٰنَ مَا لَمْ يَعْلَمْ﴾[2] پاشان ماوەیەك نیگا وەستا، دوای ئەوە جوبرەئیل هاتە خوارەوە، ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو سەلەمەی (سلمة) کوڕی عبدالرحمانەوە وتی: جابری کوڕی عبدالله هەواڵی دامێ کە گوێی لێ بووە پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەی فەرموو: (پاشان ماوەك نیگام لێ بڕا وەختێك من دەڕۆیشتم بە ڕێگادا گوێم لە دەنگێك بوو لە ئاسمانەوە چاوم بەرزکردەوە بەرەو ئاسمان ئەو فریشتەیە بوو کە هاتە لام لە نێوان ئاسمانو زەمیندا لەسەر کورسیەك

---

[1] فتح الباری (٦/٣٦١)، مسلم (١/١٤٣).

[2] العلق (١-٥).

دانیشتبوو زۆر ترسام لێی هەتا کەوتم بەسەر زەمیندا پاشان گەڕامەوە بۆ ماڵەوە پێم وتم: دام پۆشن، دایان پۆشیم خوای گەورە ئەم ئایەتانەی ناردەخوارەوە ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمُدَّثِّرُ (١) قُمۡ فَأَنذِرۡ (٢) وَرَبَّكَ فَكَبِّرۡ (٣) وَثِيَابَكَ فَطَهِّرۡ (٤) وَٱلرُّجۡزَ فَٱهۡجُرۡ﴾ پاشان نیگا بەردەوام دەهاتە خوارەوە).[1] وە هەر بەم شێوەیە لە زوهەریەوە (الزهری) بوخاریو مسلم هێناویانە.[2] تەبەرانی ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەباسەوە وتی: (وەلیدی کوڕی موغەیرە ـ المغيرة ـ) خواردنێکی بۆ قوڕەیشیەکان دروست کردو بانگی کردن وەخێك خواردنەکەیان خوارد، وەلید وتی: ئیوە چی دەڵێن لەبارەی ئەم پیاوەوە؟ واتە پێغەمبەر(ﷺ) هەندێکیان وتیان: جادوگەرە، هەندێکی تریان وتیان: جادوگەر نیە، هەندێکیان وتیان: شاعیرە، هەندێکی تریان وتیان: شاعیر نیە، هەندێکی تر وتیان: فاڵچیە ، هەندێکی تریشیان وتیان: فاڵچیش نیە، هەندێکی تر وتیان: هەبێ و نەبێت جادویەکە لە کۆنەوە وەرگیراوە. هەموو ڕایان هاتەسەر ئەوەی کە جادویەکەو لە کۆنەوە وەرگیراوە. ئەم دەنگو باسە گەیشتە پێغەمبەر(ﷺ) زۆر دڵگران بوو چووە ناو جێگاو سەری داپۆشی خودای گەورە ئەم ئایەتانەی ناردەخوارەوە ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمُدَّثِّرُ (١) قُمۡ فَأَنذِرۡ (٢) وَرَبَّكَ فَكَبِّرۡ (٣) وَثِيَابَكَ فَطَهِّرۡ (٤) وَٱلرُّجۡزَ فَٱهۡجُرۡ (٥) وَلَا تَمۡنُن تَسۡتَكۡثِرُ﴾[3] وە دەفەرموێت: ﴿قُمۡ فَأَنذِرۡ﴾ واتە: پەلەبکە، زۆر بە نەبەزانە خەڵکی بترسێنە. بەم شێوەیە دەستی پێکردووە وەك چۆن لە پێشدا دەستی پێکرد.﴿وَرَبَّكَ فَكَبِّرۡ﴾ واتە: مەزنی پەروەردەت ڕابگەیەنە، عەوفی وتی لە ئیبنو عەباسەوە. ﴿وَثِيَابَكَ فَطَهِّرۡ﴾ واتە: ئەو پۆشاکەی لەبەری دەکەیت با لە کاسبی حەرام نەبێت. وەك وتراوە: بە گوناه باری پۆشاکەکەت لەبەرمەکە[4] محمدی کوڕی سیرین وتی: ﴿وَثِيَابَكَ فَطَهِّرۡ﴾ واتە بە ئاو بیشۆرە[5] ئیبنو زەید وتی: بت پەرستەکان خۆیان پاك نەدەکردو خودای گەورە فەرمانی پێکرد خۆی پاك بکاتەوەو جلوبەرگەکانیشی پاك بکاتەوەو بیشۆرێت[6] ئیبنو جەریر ئەم ڕایەی هەڵبژاردووە.[7] سەعیدی کوڕی

---

[1] احمد (٣٢٥/٣) فەرموودەیەکی سەحیحە.

[2] فتح الباری (٣٧/١)، مسلم (١٤٣/١).

[3] الطبرانی (١٢٥/١١) ئەم فەرموودەیە زۆر لاوازە تەبەرانی هێناویتی لە (١١٢٥٠)، هەیسەمی وتی لە ـ الجمع ـ دا (١١٤٤٨) ئەم فەرموودەیە ئیبراهیمی کوڕی زەیدی تێدایە کە مەتروکە واتە: فەرموودەی لێ وەرناگیرێت.

[4] الطبری (١١/٢٤).

[5] الطبری (١٢/٢٤).

[6] الطبری (١٢/٢٤).

[7] الطبری (١٢/٢٤).

جوبەیر وتی: ﴿وَثِيَابَكَ فَطَهِّرْ﴾ دڵو لەشت خاوێن ڕابگرە. محمدی کوڕی کەعبی قەرەزی (القرضی) و حەسەنی بەسری وتیان: ڕەوشتت چاكو جوان بكە. وە دەفەرموویت: ﴿وَالرُّجْزَ فَاهْجُرْ﴾ علی کوڕی ئەبو تەلحە (طلحة) وتی: لە ئیبنو عەباسەوە واتە: دوور بکەوە لە بتەکان.[1] هەر بەم شێوەیە موجاهدو عیکرمەو قەتادەو زوهری (الزهری)و ئیبنو زەید وتیان: مەبەست بتەکانە.[2] وە خودا دەفەرموویت: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِىُّ ٱتَّقِ ٱللَّهَ وَلَا تُطِعِ ٱلْكَـٰفِرِينَ وَٱلْمُنَـٰفِقِينَ﴾[3] واتە: ئەی پێغەمبەر(ﷺ) (بەردەوام) لە خودا بترسە وە بەگوێی کافرانو ناپاکان مەکە. وە دەفەرموویت: ﴿وَقَالَ مُوسَىٰ لِأَخِيهِ هَـٰرُونَ ٱخْلُفْنِى فِى قَوْمِى وَأَصْلِحْ وَلَا تَتَّبِعْ سَبِيلَ ٱلْمُفْسِدِينَ﴾[4] واتە: مووسا بە هارونی برای ووت تۆ لە ناو گەلەکەمدا جێنشینم ببەو کاری چاك بکەو شوێنی ڕێبازی خراپەکاران مەکەوە. وە دەفەرموویت: ﴿وَلَا تَمْنُن تَسْتَكْثِرُ﴾ مەشی بەخشەو پێت وابێت زۆرە. ئیبنو عەباس وتی: مەی بەخشە بەهیوای ئەوەی کە زیاترت پێ ببەخشرێت. خوسەیف (خُصيف) وتی: لە موجاهدەوە ﴿وَلَا تَمْنُن تَسْتَكْثِرُ﴾ لاواز مەبە لە ماڵ بەخشینی زۆر. واتە ماڵ زۆر ببەخشە. ﴿تَمْنُن﴾ لە قسەی عەرەبدا هاتووە واتە: بێ هێز مەبە[5] وە دەفەرموویت: ﴿وَلِرَبِّكَ فَاصْبِرْ﴾ بۆخاتری پەروەرندەت خۆڕاگربە. موجاهد وتی: لەبەر خاتری خودا خۆڕاگربە بەرانبەریان کە ئازارت دەدەن[6] ئیبراهیمی نەخەعی وتی: خۆڕاگربەو بەخشینەکەشت لەبەر خاتری خودا بێت[7].

## وەبیرخستنەوەی ڕۆژی قیامەت

خودای گەورە دەفەرموویت: ﴿فَإِذَا نُقِرَ فِى ٱلنَّاقُورِ﴾ هەر کاتێکیش فوو کرایە کەڵەشاخ دا. ﴿فَذَٰلِكَ يَوْمَئِذٍ يَوْمٌ عَسِيرٌ﴾ ئەوڕۆژە ڕۆژێکی سەختو گرانە. ﴿عَلَى ٱلْكَـٰفِرِينَ غَيْرُ يَسِيرٍ﴾ بۆ بێدینان ئاسان نی یە. ئیبنو عەباسو موجاهدو شەعبی (الشعبی)و زەیدی کوڕی ئەسلەمو حسنو قەتادەو زەحاكو ڕەبیعی

---

[1] الطبری (١٣/٢٤).
[2] الطبری (١٣/٢٤).
[3] الاحزاب (١).
[4] الاعراف (١٤٢).
[5] الطبری (١٦/٢٤).
[6] الطبری (١٦/٢٤).
[7] البغوی (٤/٤١٤).

کوڕی ئەنەس‌و سودی‌و ئیبنو زەید وتیان: ﴿ٱلنَّاقُورِ﴾ واتە: کەڵەشاخ[1] موجاهد وتی: لە شێوەی کەڵەشاخ دایە.[2] ئیبنو ئەبی حاتم وتی: ئەبو سەعیدی ئەشەج (الاشج) بۆی گێڕاینەوەو ئەسباتی (اسباط) کوڕی محمد بۆی گێڕاینەوە لە موتەریفەوە (مطرف) ئەویش لە عەتیەی (عطیة) عەوفیەوە (العوفی) لە ئیبنو عەباسەوە ﴿فَإِذَا نُقِرَ فِي ٱلنَّاقُورِ﴾ وتی: پێغەمبەری خودا فەرموویەتی: (چۆن دڵخۆشبم خاوەنی کەڵەشاخ، کە کەڵەشاخەکەی گرتووە بەدەمیەوە تەوێڵی - دەموچاوی - دانەواندوە چاوەڕوانە کەی فەرمانی پێ دەکرێت فوی پێدا بکات؟) هاوەڵەکانی پێغەمبەر(ﷺ) وتیان: بەچی فەرمانمان پێ دەکەی ئەی پێغەمبەری خودا؟ فەرمووی: (بڵێن خوامان بەسەو باشترین بریکارەو پشتمان بەخودا بەستووە) هەر بەم شێوەیە ئیمامی ئەحمد ڕیوایەتی کردووە لە ئەسباتەوە (اسباط).[3] وە دەفەرمووێت: ﴿فَذَٰلِكَ يَوْمَئِذٍ يَوْمٌ عَسِيرٌ﴾ واتە: زۆر گران‌و سەختە. ﴿عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ غَيْرُ يَسِيرٍ﴾ واتە ئاسان نیە بۆیان وەك خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿يَقُولُ ٱلْكَٰفِرُونَ هَٰذَا يَوْمٌ عَسِرٌ﴾[4] واتە: بێ باوەڕان دەڵێن ئەمڕۆ ڕۆژێکی زۆر دژوارو سەختە. ڕیوایەتمان کرد لە زورارەی کوڕی ئەوفاوە (اوفی) کو قازی بەسرە نوێژی بەیانی بۆ بەکردن ئەم سورەتەی دەخوێند کاتێك گەیشتە ئەم ئایەتانە: ﴿فَإِذَا نُقِرَ فِي ٱلنَّاقُورِ ﴿٨﴾ فَذَٰلِكَ يَوْمَئِذٍ يَوْمٌ عَسِيرٌ ﴿٩﴾ عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ غَيْرُ يَسِيرٍ﴾ هەناسەیەکی هەڵکێشاو پاشان بەمردویی کەوت رحمه الله تعالی[5].

﴿ذَرْنِي وَمَنْ خَلَقْتُ وَحِيدًا ﴿١١﴾ وَجَعَلْتُ لَهُۥ مَالًا مَّمْدُودًا ﴿١٢﴾ وَبَنِينَ شُهُودًا ﴿١٣﴾ وَمَهَّدتُّ لَهُۥ تَمْهِيدًا ﴿١٤﴾ ثُمَّ يَطْمَعُ أَنْ أَزِيدَ ﴿١٥﴾ كَلَّآ ۖ إِنَّهُۥ كَانَ لِءَايَٰتِنَا عَنِيدًا ﴿١٦﴾ سَأُرْهِقُهُۥ صَعُودًا ﴿١٧﴾ إِنَّهُۥ فَكَّرَ وَقَدَّرَ ﴿١٨﴾ فَقُتِلَ كَيْفَ قَدَّرَ ﴿١٩﴾ ثُمَّ قُتِلَ كَيْفَ قَدَّرَ ﴿٢٠﴾ ثُمَّ نَظَرَ ﴿٢١﴾ ثُمَّ عَبَسَ وَبَسَرَ ﴿٢٢﴾ ثُمَّ أَدْبَرَ وَٱسْتَكْبَرَ ﴿٢٣﴾ فَقَالَ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا سِحْرٌ يُؤْثَرُ ﴿٢٤﴾ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا قَوْلُ ٱلْبَشَرِ ﴿٢٥﴾ سَأُصْلِيهِ سَقَرَ ﴿٢٦﴾ وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا سَقَرُ ﴿٢٧﴾ لَا تُبْقِي وَلَا تَذَرُ ﴿٢٨﴾ لَوَّاحَةٌ لِّلْبَشَرِ ﴿٢٩﴾ عَلَيْهَا تِسْعَةَ عَشَرَ ﴿٣٠﴾﴾

---

[1] الطبری (١٨/٢٤).

[2] الطبری (١٨/٢٤).

[3] احمد (٣٢٦).

[4] القمر (٨).

[5] الحاکم (٢٠٦/٢).

### هەڕەشە لەوکەسەی وتی ئەم قورئانە جادویەکە (سحر)

خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿ذَرْنِي وَمَنْ خَلَقْتُ وَحِيدًا﴾ تۆ لێم گەڕێ بۆ ئەو کەسەی من بەتەنها وەدیم هێناوە. خودای گەورە هەڕەشە لەو بەدڕەوشتە دەکات کە بەهرەیەکی ئێجگار زۆری دایە لە ماڵو منداڵو سامانێکی زۆر لە دنیادا سوپاسی ئەو بەهرەی خودای نەکردو بێ دینی هەڵبژاردو باوەڕی نەکرد بە قورئان درۆشی بۆ هەڵبەستو وتی: ببێتو نەبێت ئەمە هەر قسەی مرۆڤە. خودایش بەهرەکانی بۆ هەڵژماردووەو فەرموویەتی: ﴿ذَرْنِي وَمَنْ خَلَقْتُ وَحِيدًا﴾ واتە: بە تەنها لە سکی دایکی هاتە دەرەوە نەسامانی بوو نەمنداڵ. پاشان خودای گەورە بژێوی بۆ فەراهەم هێنا. دەفەرموێت: ﴿وَجَعَلْتُ لَهُ مَالًا مَمْدُودًا﴾ دارایی فرەشم دایە. واتە: سامانێکی فراوانو زۆرمان دایە. ﴿وَبَنِينَ شُهُودًا﴾ چەند کوڕێکیشی کە ئاگاداری لێدەکەن. موجاهد وتی: لایان چۆڵ نەدەکرد[1] واتە: هەمیشە لەدەوری بونو نەدەچوونە دەرەوە بۆ بازرگانی خزمەت کارو بەکرێ گیراوەکانیان لە جێگای ئەوان ئەڕۆیشتن ئەمان لای باوکیان دادەنیشتنو دەوریان دەداو شانازی پێوە دەکرد. ئەم منداڵانە وەك سودیو ئەبو مالكو عاسمی (عاصم) کوڕی عومەری کوڕی قەتادە باسیان کردوە سیانزە (١٣) کوڕ بوون.[2] ئیبنو عەباسو موجاهد وتیان دە (١٠) کوڕ بووە.[3] ئەمەیش چاکترین بەهرەیە کە هەموو کوڕەکانی لەدەوری بوون ﴿وَمَهَّدتُّ لَهُ تَمْهِيدًا﴾ هەموو کارێکم بۆ ڕێك خست. واتە: هەموو جۆرە ماڵو سامانو پێویستیەکم دایە ﴿ثُمَّ يَطْمَعُ أَنْ أَزِيدَ﴾ هێشتا هەر چاوی لەوەیە بۆی پترکەم. ﴿كَلَّا إِنَّهُ كَانَ لِآيَاتِنَا عَنِيدًا﴾ نەخێر، چونکە بەرامبەر ئایەتەکانمان ئەو هەر لاسار بوو. بێ گوێو لاساربوو. ناشوکر بوو بەو هەموو بەهرەیە کە پێی دابوو. چاکیش دەیزانی کە خودا داویەتی. خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿سَأُرْهِقُهُ صَعُودًا﴾ بەمزوانە سزای سەختی پێ دەچەژێنو پشوی لێ دەبڕین. قەتادە وتی: لەئیبنو عەباسەوە ﴿صَعُودًا﴾ واتە: بەردێکە لە ناو جەهەنما خوانەسانی بەدەمو چاوا لەسەر ڕادەکێشرێت.[4] سودی وتی: ﴿صَعُودًا﴾ بەردێکی سافە لە ناو جەهەنەمدا فرمانی پێ دەکرێت سەری بخات موجاهد وتی: ﴿سَأُرْهِقُهُ صَعُودًا﴾ واتە: جەزرەبەیەکی زۆر گرانو ناخۆش[5] قەتادە وتی: سزایەکی بەردەوام کە پشودانی تیادا نیە.[1]

---

[1] البغوی (٤/٤١٤).

[2] الدر المنثور (٨/٣٢٩).

[3] الطبری (٢٤/٢١).

[4] الدر المنثور (٨/٣٣١).

[5] الطبری (٢٤/٢٣).

خودای گەورە دەفەرموویێت: ﴿إِنَّهُۥ فَكَّرَ وَقَدَّرَ﴾ ئەو بیری کردەوەو هەڵی سەنگاند. واتە: بۆیە تەنگەتاومان کرد کە هەڵبچێت واتە: توشی سزایەکی گرانمان کرد لەبەر دوور لە خودایی‌و بێ دینی. چونکە ئەو ڕاماو لێکی دایەوە واتە: بیری کردەوە کەچی دەڵێت لە بارەی قورئانەوە وەختێك پرسیاری لێ دەکرێت‌و دیسان بیری دەکردەوە کەچ قسەیەك هەڵبەستێت. ﴿فَقُتِلَ كَيْفَ قَدَّرَ﴾ دەك بەکوشت بچێت چۆنی هەڵسەنگاند. ﴿ثُمَّ قُتِلَ كَيْفَ قَدَّرَ﴾ دیسان نەژێت چۆنی بۆچوو، نزابوو لێی، ﴿ثُمَّ نَظَرَ﴾ لە پاشان تەماشای کرد، واتە: دووبارە ڕاماو لێکی دایەوە. ﴿ثُمَّ عَبَسَ وَبَسَرَ﴾ ئەسا کە ڕووی گرژ کردو ترش هەڵگەڕا، واتە: ناچاوانی دا بەیەکداو ڕەنگی تێکچوو. ﴿وَبَسَرَ﴾ واتە: نارەحەت‌و ناوچاو تاڵ. پاشان فەرمووی: ﴿ثُمَّ أَدْبَرَ وَٱسْتَكْبَرَ﴾ لە پاشاندا پشتی هەڵکردو فیزی نواند، واتە: لە ڕاستەرێ لایداو بەرەو دوا گەڕایەوە بە فزێکەوەو شوێنی قورئان نەکەوت. ﴿فَقَالَ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا سِحْرٌ يُؤْثَرُ﴾ ئەوسا وتی: ئەم قورئانە (ببێ و نەبێت) جادویەکە لە کۆنەوە دەیگێڕنەوە، واتە: ئەمە جادویەکە محمد لە خەڵکی پێش خۆیەوە هێناویێتی و بۆیان دەگێڕێتەوە. بۆیە وتویەتی وەك خوی گەورە دەفەرموویێت: ﴿إِنْ هَٰذَآ إِلَّا قَوْلُ ٱلْبَشَرِ﴾ ببێت و نەبێت ئەمە هەر وتەی مرۆڤە، واتە: ئەمە وتەی خودا نە ئەمەی کە باسکراوە لێرەدا. وەلیدی کوڕی موغەیرەی مەخزومی (المغيرة المخزومي) یەکێك بوو لە سەرۆکەکانی قورەیش نەفرینی خودای لێ بێت، عەوفی (العوفي) لە ئیبنو عەباسەوە ئەم باسەی وەلیدمان بۆ دەگێڕێتەوە کە وتی: وەلیدی کوڕی موغەیرە چووە لای ئەبو بەکری کوڕی قوحافە پرسیاری لە بارەی قورئانەوە لێکرد، وەختێك بۆی باسکرد ڕۆیشت بۆ لای قورەیشیەکان وتی: جێگای سەرسوڕمانە ئەوەی کە کوڕی ئەبو کەبشە دەیڵێت، سوێند بە خودا ئەوە نە شیعرەو نە جادوەو نە شێتە.. بێ گومان قسەکەی قسەی خودایە. کاتێك هەندێك لە قورەیشیەکان ئەمەیان بیست کۆبوونەوەو وتیان: سوێند بە خودا ئەگەر وەلید وازبێنێت لە ئاینی باب‌و باپیرانی هەموو قورەیش واز دێنێت. کاتێك ئەبو جەهلی کوڕی هیشام بیستی وتی: بەخودا من چارەی دەکەم لەباتی ئێوە، واتە: دەزانم چی پێ دەڵێم، ڕۆیشت بۆ ماڵی وەلیدو بە وەلیدی وت: ئایا نابینیت کە خزمەکانت ماڵیان کۆکردۆتەوە بۆت؟ وەلید وتی: ئایا من ماڵ‌و منداڵم لەوان زیاتر نیە؟ ئەبوجەهل وتی: واباس دەکەن کە تۆ لەبەرئەوە دەچیت بۆ ماڵی کوڕی قوحافە (قحافە) هەندێك خۆراکت بداتێت، وەلید وتی: خزمەکانی من وایان وت؟ سا سوێند بەخودا نزیکی کوڕی ئەبو قوحافە (قحافە) و عومەرو کوڕی ئەبو کەبشە نابمەوە. ببێت‌و نەبێت ئەمە قسەی

---

[1] الطبري (٢٣/٢٤)

ئەوە جادویەکە لە کۆنەوە دەیگێڕێتەوە خودای گەورە ئەم ئایەتانەی ڕەوانە کردەخوارەوە ﴿ذَرۡنِي وَمَنۡ خَلَقۡتُ وَحِيدٗا﴾ تا ئایەتی ﴿لَا تُبۡقِي وَلَا تَذَرُ﴾[1] قەتادە وتی: وایاندەزانی وتویەتی سوێند بەخودا وردبوومەوە لەوەی ئەم پیاوە وتی. زۆر جوانو چاکو سەرسوڕهێنەرەو شیعریش نیە، سەر دەکەوێتو زاڵ دەبێت هیچ شتێك بە سەریاندا سەر ناکەوێتو زاڵ نابێت. بێگومانم کە جادووە خودای گەورە ئەم ئایەتانەی ناردە خوارەوە ﴿فَقُتِلَ كَيۡفَ قَدَّرَ ١٩ ثُمَّ عَبَسَ وَبَسَرَ﴾ ناوچاوی گرژو تاڵکرد (ناشیرین)[2] خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿سَأُصۡلِيهِ سَقَرَ﴾ بەمزوانە دەیهاوێمەدۆزەخەوە. واتە: بەمزوانە دەیخەمە ناو دۆزەخەوە بەتەواوی دایپۆشێت ﴿وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا سَقَرُ﴾ تۆ چوزانیت دۆزەخ چیە؟ ئەمە گەورەکردنو گران دەرخستنی دۆزەخە پاشان خودا خۆی ڕونی دەکاتەوە کە دۆزەخ چیە دەفەرمووێت: ﴿لَا تُبۡقِي وَلَا تَذَرُ﴾ نە دەیهێڵێتو نە وازدێنێت. ئیبنو بورەیدەو (بریدە) ئەبو سینانو کەسانی تریش وتوویانە: واتە گۆشتو ڕەگو مۆخو پێستیان دەسوتێنێت پاشان دەگۆڕێت بۆ پێستێکی تر ئا بەم شێوەیە دەمێننەوە نەدەمرن ڕزگاریان ببێت نەدەژین[3] وە دەفەرمووێت: ﴿لَوَّاحَةٞ لِّلۡبَشَرِ﴾ پێستی مرۆڤ ڕەش دەکاتەوەو دەیبرژێنێت. موجاهد وتی: ﴿لِّلۡبَشَرِ﴾ واتە: پێست ڕەش دەکاتەوە قەتادە وتی: ﴿لَوَّاحَةٞ لِّلۡبَشَرِ﴾ واتە: سوتێنەری پێستە.[4] ئیبنو عەباس وتی: پێستی مرۆڤ دەسوتێنێت.[5] وە دەفەرمووێت: ﴿عَلَيۡهَا تِسۡعَةَ عَشَرَ﴾ نۆزدە فریشتە ئەوەتان بەسەریەوە. ئەم فریشتانەش زۆر گەورەو دڵ ڕەقن.

﴿وَمَا جَعَلۡنَآ أَصۡحَٰبَ ٱلنَّارِ إِلَّا مَلَٰٓئِكَةٗۙ وَمَا جَعَلۡنَا عِدَّتَهُمۡ إِلَّا فِتۡنَةٗ لِّلَّذِينَ كَفَرُواْ لِيَسۡتَيۡقِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ وَيَزۡدَادَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِيمَٰنٗاۙ وَلَا يَرۡتَابَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡمُؤۡمِنُونَۙ وَلِيَقُولَ ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٞ وَٱلۡكَٰفِرُونَ مَاذَآ أَرَادَ ٱللَّهُ بِهَٰذَا مَثَلٗاۚ كَذَٰلِكَ يُضِلُّ ٱللَّهُ مَن يَشَآءُ وَيَهۡدِي مَن يَشَآءُۚ وَمَا يَعۡلَمُ جُنُودَ رَبِّكَ إِلَّا هُوَۚ وَمَا هِيَ إِلَّا ذِكۡرَىٰ لِلۡبَشَرِ ٣١ كَلَّا وَٱلۡقَمَرِ ٣٢ وَٱلَّيۡلِ إِذۡ أَدۡبَرَ ٣٣ وَٱلصُّبۡحِ إِذَآ أَسۡفَرَ ٣٤ إِنَّهَا لَإِحۡدَى ٱلۡكُبَرِ ٣٥ نَذِيرٗا لِّلۡبَشَرِ ٣٦ لِمَن شَآءَ مِنكُمۡ أَن يَتَقَدَّمَ أَوۡ يَتَأَخَّرَ ٣٧﴾

---

[1] الطبری (٢٤/٢٤).

[2] الطبری (٢٤/٢٥).

[3] الدر المنثور (٨/٣٣٢).

[4] الطبری (٢٤/٢٧).

[5] الطبری (٢٤/٢٨).

**ژمارەی گزیرەكانی جەهەننەم و ئەو شتانەی خودانەناسەكان لەو بارەیەوە وتوویانە**

خودای گەورە دەفەرموویت: ﴿وَمَا جَعَلْنَا أَصْحَابَ النَّارِ إِلَّا مَلَائِكَةً ۙ وَمَا جَعَلْنَا عِدَّتَهُمْ إِلَّا فِتْنَةً لِّلَّذِينَ كَفَرُوا لِيَسْتَيْقِنَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ وَيَزْدَادَ الَّذِينَ آمَنُوا إِيمَانًا ۙ وَلَا يَرْتَابَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ وَالْمُؤْمِنُونَ ۙ وَلِيَقُولَ الَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ وَالْكَافِرُونَ مَاذَا أَرَادَ اللَّهُ بِهَٰذَا مَثَلًا ۚ كَذَٰلِكَ يُضِلُّ اللَّهُ مَن يَشَاءُ وَيَهْدِي مَن يَشَاءُ ۚ وَمَا يَعْلَمُ جُنُودَ رَبِّكَ إِلَّا هُوَ ۚ وَمَا هِيَ إِلَّا ذِكْرَىٰ لِلْبَشَرِ﴾ ئێمە بێجگە لە فریشتەكان كەسمان نەكردووەتە كاربەدەستی ئاگر. بۆیەش ژمارەكەمان وا داناون تا خودانەناسان تاقی بكەینەوە. تا ئەوانەی كە كتێبیان پێدراوە هیچ گومانێكیان نەمێنێت. تا ئەوانەشی خاوەن باوەڕن باوەڕیان زیاد بكات، ئەو كەسانەش كە كتێبیان پێدراوەو باوەڕ دارن، دوو دڵ نەبن و تا ئەوانەی نەخۆشیان لە دڵدایەو ئەوانەی خودا نەناسن، بڵێن: خودا لەم نمونە نیشاندانە چی مەبەستە؟ ئاوا خودا هەركێی بوێت گومڕای دەكات و كێی بوێت شارەزای دەكات. لەشكری پەروەرندەی تۆش (لە خودا بەدەر) كەس ژمارەیان نازانێت. باسی جەهەننەم تەنیا هەر بۆ بیرەوەری مرۆڤە. ﴿وَمَا جَعَلْنَا أَصْحَابَ النَّارِ﴾ واتە: كاربەدەستی ئاگر. ﴿إِلَّا مَلَائِكَةً﴾ فریشتە نەبێت كە گزیری جەهەننەمن زۆر دڵ ڕەقن. ئەمە وەڵامی خودانەناسەكانی قورەیش بوو كاتێك باسی كاربەدەستەكانی جەهەننەمیان دەكرد. ئەبو جەهل دەی وت: ئەی خەڵكی قورەیش ئاخۆ هەر دە كەس لە ئێوە دەرەقەتی یەكێك لەوانە نایەو سەركەون بە سەریاندا؟ خودای گەورەش فەرمووی: ﴿وَمَا جَعَلْنَا أَصْحَابَ النَّارِ إِلَّا مَلَائِكَةً﴾ واتە: زۆر بەهێزن كەس ناتوانێت بەرگریان بكات و زاڵ بێت بەسەریاندا. وتراوە كە ئەبول ئەشەدەین (أبو الاشدين) كە ناوی كەلەدەی (كلده) كوڕی ئەسیدی كوڕی خەلەف (خلف) بوو وتی: خەڵكی قورەیش ئێوە دووانیان لە كۆڵی من كەنەوە حەڤدەیان دانێن بۆ من زۆر بڕوای بە خۆی هەبوو وەك دەیان وت ئەوەندە بەهێز بوو لەسەر پێستی مانگادا ڕادەوەستاو دە كەس ڕای دەكێشا كە لە ژێر پێی دەری بێنن پێستەكە پارچەپارچە دەبوو لەسەری لانەدەچوو. وە دەفەرموویت: ﴿وَمَا جَعَلْنَا عِدَّتَهُمْ إِلَّا فِتْنَةً لِّلَّذِينَ كَفَرُوا﴾ واتە: لەبەرئەوەی ژمارەمان باس كرد بۆئەوەی مەردوم تاقی بكەینەوە. ﴿لِيَسْتَيْقِنَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ﴾ واتە: تا بزانن كە ئەم پێغەمبەرە ڕاستەو قسەكانی ئەمیش هیچ جیاوازیەكی نیە لەگەڵ ئەو قسانەی لە كتێبە ئاسمانیەكانی تردایە كە لەبەردەستیاندایەو ڕەوانەكراوە بۆ پێغەمبەرەكانی پێش ئەو. وە دەفەرموویت: ﴿وَيَزْدَادَ الَّذِينَ آمَنُوا إِيمَانًا﴾ تا خاوەن باوەڕان باوەڕیان زیاتر بێت. كە شایەتی دەدەن بەوەی كە ئەو هەواڵەی پێغەمبەرەكەیان (ﷺ) پێی داون ڕاستە ﴿وَلَا يَرْتَابَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ وَالْمُؤْمِنُونَ ۙ وَلِيَقُولَ الَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ﴾

واتە: دووڕووەکان ﴿ وَٱلْكَٰفِرُونَ مَاذَآ أَرَادَ ٱللَّهُ بِهَٰذَا مَثَلًا ﴾ واتە: دەڵێن حیکمەت چیە، واتە مەبەست چیە لەم باسە لێرەدا؟ خودای گەورەش فەرموویەتی: ﴿كَذَٰلِكَ يُضِلُّ ٱللَّهُ مَن يَشَآءُ وَيَهْدِي مَن يَشَآءُ﴾ واتە: لە نمونەی ئەمو هاوشێوەی ئەم نمونەیە باوەڕ لە دڵی زۆر کەسدا بەهێز دەبێتو زۆر کەسیش دوودڵ دەبێت دەکەوێتە دڵەڕاوکێ. وە هەر خۆی خاوەن حیکمەتی زۆرو زەبەندەو بەڵگەی گەورەو بەهێزە.

**سەربازەکانی خودا خۆی نەبێت کەس ژمارەیان نازانێت**

خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَمَا يَعْلَمُ جُنُودَ رَبِّكَ إِلَّا هُوَ﴾ واتە: هیچ کەس ژمارەیان نازانێت ئەوەندە زۆرن خودا نەبێت بۆ ئەوەی ئەوانەی بەگومانن وا تێ نەگەن کە ئەو فریشتانە تەنها نۆزدە فریشتەن. لە هەردوو سەحیحەکەدا ڕیوایەت کراوە وە لە شوێنی تریشدا هاتووە لەو فەرموودەی کە باسی شەوڕەوی (الاسراء) پێغەمبەر دەکات (ﷺ) لە پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: (لە باسو وەسفی بەیتول مەعموردا (البيت المعمور) کە لە ئاسمانی حەوتەم (هەموو ڕۆژێك حەفتاهەزار فریشتە دەچنە ناوی، بەردەوام ئەوە حاڵی ئەو فریشتانەیە کە هاتنە دەرەوە ئیتر ناچنەوە ناوی ئەوە ئاخری ئەوەیە کە ئەوانی لە سەرە ـ اخر ماعليهم ـ)[1] ﴿وَمَا هِيَ إِلَّا ذِكْرَىٰ لِلْبَشَرِ﴾ موجاهدو کەسانی تریش وتیان ﴿وَمَا هِيَ﴾ واتە: ئەو ئاگرەی کە باسکراوە و وەسف کراوە[2] ﴿إِلَّا ذِكْرَىٰ لِلْبَشَرِ﴾ بۆ یادەوەری مرۆڤە. پاشان فەرموویەتی: ﴿كَلَّا وَٱلْقَمَرِ﴾ نەخێر وانیە، سوێند بەمانگ. ﴿وَٱلَّيْلِ إِذْ أَدْبَرَ﴾ وە سوێند بە شەو کە پشت هەڵ دەکاتو دەڕوات. کە تێ دەپەڕێت. ﴿وَٱلصُّبْحِ إِذَآ أَسْفَرَ﴾ وە سوێند بە بەرەبەیان کە ڕوون دەبێتەوە. واتە: هەڵدێتو ڕوناك دەبێتەوە﴿إِنَّهَا لَإِحْدَى ٱلْكُبَرِ﴾ ئەم ئاگرە یەك لەبەڵاگەورەکانە، لەتاقیکردنەوە گەورەکانە. ئیبنو عەباسو موجاهدو قەتادەو زەحاكو کەسانی تریش لە پێشینەکان (السلف) وتوویانە[3] ﴿نَذِيرًا لِّلْبَشَرِ﴾ ترس وەبەر مرۆڤ هێنەرە. ﴿لِمَن شَآءَ مِنكُمْ أَن يَتَقَدَّمَ أَوْ يَتَأَخَّرَ﴾ کێ لە ئێوە مەیلی بێت بێتە پێشێ، یان بگەڕێتە دواوە. واتە: کێ ئارەزو دەکات گوێی لەم ئاگادار کردنەوەیە بگرێتو ڕێگای ڕاست بگرێتە بەر یان پشت هەڵبکاتو وەری نەگرێتو بگەڕێتە دواوە.

﴿كُلُّ نَفْسٍۭ بِمَا كَسَبَتْ رَهِينَةٌ ﴿٣٨﴾ إِلَّآ أَصْحَٰبَ ٱلْيَمِينِ ﴿٣٩﴾ فِى جَنَّٰتٍ يَتَسَآءَلُونَ ﴿٤٠﴾ عَنِ ٱلْمُجْرِمِينَ ﴿٤١﴾ مَا سَلَكَكُمْ فِى سَقَرَ ﴿٤٢﴾ قَالُوا۟ لَمْ نَكُ مِنَ ٱلْمُصَلِّينَ ﴿٤٣﴾ وَلَمْ نَكُ نُطْعِمُ ٱلْمِسْكِينَ ﴿٤٤﴾ وَكُنَّا نَخُوضُ مَعَ ٱلْخَآئِضِينَ ﴿٤٥﴾ وَكُنَّا نُكَذِّبُ بِيَوْمِ

---

[1] فتح الباری (٦/٣٢٨)، مسلم (١/١٤٦).

[2] الطبری (٢٤/٣٢).

[3] الطبری (٢٤/٣٣).

ٱلدِّينِ ﴿٤٦﴾ حَتَّىٰٓ أَتَىٰنَا ٱلْيَقِينُ ﴿٤٧﴾ فَمَا تَنفَعُهُمْ شَفَٰعَةُ ٱلشَّٰفِعِينَ ﴿٤٨﴾ فَمَا لَهُمْ عَنِ ٱلتَّذْكِرَةِ مُعْرِضِينَ ﴿٤٩﴾ كَأَنَّهُمْ حُمُرٌ مُّسْتَنفِرَةٌ ﴿٥٠﴾ فَرَّتْ مِن قَسْوَرَةٍۭ ﴿٥١﴾ بَلْ يُرِيدُ كُلُّ ٱمْرِئٍ مِّنْهُمْ أَن يُؤْتَىٰ صُحُفًا مُّنَشَّرَةً ﴿٥٢﴾ كَلَّا ۖ بَل لَّا يَخَافُونَ ٱلْءَاخِرَةَ ﴿٥٣﴾ كَلَّآ إِنَّهُۥ تَذْكِرَةٌ ﴿٥٤﴾ فَمَن شَآءَ ذَكَرَهُۥ ﴿٥٥﴾ وَمَا يَذْكُرُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ ۚ هُوَ أَهْلُ ٱلتَّقْوَىٰ وَأَهْلُ ٱلْمَغْفِرَةِ ﴿٥٦﴾ ﴾

**باسی ئەو گفتو گۆیانەی کە لە نێوان بەھەشتیو جەھەننەمیەکاندا ڕوودەدات**

خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿كُلُّ نَفْسٍۭ بِمَا كَسَبَتْ رَهِينَةٌ﴾ هەموو کەسێك لە گرەوی کردەوەی خۆیدایە. واتە: هەموو کەسێك بارمتەی کردەوەکانی خۆیەتی لە ڕۆژی قیامەتدا، ئیبنو عەباسو کەسانی تر وتویانە.[1] ﴿إِلَّآ أَصْحَٰبَ ٱلْيَمِينِ﴾ مەگەر هاوەڵانی دەستی ڕاست. ئەوانە ﴿فِى جَنَّٰتٍ يَتَسَآءَلُونَ﴾ لە ناو باخان دا پرسیار لەیەکتری دەکەن. ﴿عَنِ ٱلْمُجْرِمِينَ﴾ سەبارەت بە گوناهباران. واتە: لە ناو کۆشکە بەرزەکاندا پرسیار لە تاوانباران دەکەن کە لە نزمترینو خراپترین شوێندان پێیان دەڵێن: ﴿مَا سَلَكَكُمْ فِى سَقَرَ﴾ چی ئێوەی خستووەتە دۆزەخەوە. ﴿قَالُوا۟ لَمْ نَكُ مِنَ ٱلْمُصَلِّينَ﴾ خۆراکیشمان بە هەژاران نەدەبەخشی. واتە: خودامان نەدەپەرستو چاکەشمان لەگەڵ بەندەکانی خودا نەدەکرد کە هاوڕەگەز بووین ﴿وَكُنَّا نَخُوضُ مَعَ ٱلْخَآئِضِينَ﴾ لە کۆڕی هەرزەبێژاندا ئێمەش لە هەرزەبێژان بووین. لە خۆمانەوە قسەمان دەکرد نەمان دەزانی چی دەڵێین. قەتادە وتی: هەر کاتێك سەرلێشێواوی سەری لێ تێك بچوایە ئێمەش لەگەڵی بووین.[2] ﴿وَكُنَّا نُكَذِّبُ بِيَوْمِ ٱلدِّينِ﴾ باوەڕمان بە ڕۆژی قیامەت نەبوو. ﴿حَتَّىٰٓ أَتَىٰنَا ٱلْيَقِينُ﴾ تا مردن یەخەی پێ گرتین. ﴿ٱلْيَقِينُ﴾ واتە: مردن. وەك خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿ وَٱعْبُدْ رَبَّكَ حَتَّىٰ يَأْتِيَكَ ٱلْيَقِينُ ﴾[3] وە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: ((بەڵام ئەو ( عثمانی کوڕی مەزعون ـ مضعون ـ) لە لایەن پەروەرندەیەوە مردنی بۆ هاتووە)[4] واتە: بە فەرمانی خودا مردووە ﴿فَمَا تَنفَعُهُمْ شَفَٰعَةُ ٱلشَّٰفِعِينَ﴾ ئیتر تکای تکاکاران، هیچ بەهرەیەکیان بۆ نادات. واتە: هەر کەسێك ئەم خوڕەوشتانەی بوو بێت لە ڕۆژی قیامەتدا تکای تکاکاران هیچ سودێکی پێ ناگەیەنێت چونکە کاتێك تکاکردن کەڵکی

---

[1] الطبری (٢٤/٣٥).

[2] الطبری (٢٤/٣٧).

[3] الحجر (٩٩).

[4] البیهقی (٣/٤٠٦) فەرموودەیەکی سەحیحە.

دەبێت ئەوەی تکای بۆ دەکرێت شایستەی بێت. نەك ئەو کەسەی کە گەڕابێتەوە بۆ لای خودا لە ڕۆژی قیامەتدا بەبێ دینی. ئەو کەسە جێگای ئاگرە بێگومان هەتا هەتایە تێیدا دەمێنێتەوە.

## ناڕەزایی دەربڕین لەسەر دژایەتی کردن و هەڵوێستی خودانەناسان

پاشان خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَمَا لَهُمْ عَنِ ٱلتَّذْكِرَةِ مُعْرِضِينَ﴾ ئەوە چیتانە ڕوو وەردەگێڕن لە ئامۆژگاری؟ واتە: ئەو بێدینانە دێنە لات چیانە تۆ بانگیان دەکەیت و ئامۆژگاریان دەکەیت کە بێن گوێ بیستی قورئان بن دەڕۆن و بەجێت دێڵن ﴿كَأَنَّهُمْ حُمُرٌ مُّسْتَنفِرَةٌ﴾ دەڵێن کەرەکێوی ڕووەکن. ﴿فَرَّتْ مِن قَسْوَرَةٍ﴾ کە لە شێر هەڵاتوون. واتە: نموونەی ئەوانەی کە لە هەق ڕادەکەن دەڕۆن پشتی تێ دەکەن وەك کۆمەڵە کەرگەلێکی وەحشی وان کە لە شێر ڕادەکەن وەختێك ڕاویان دەکەن. ئەبو هوریرە وتی.[1] حەمادی (حماد) کوڕی سەلەم وتی لە علی کوڕی زەیدەوە ئەویش لە یوسفی کوڕی مەهرانەوە لە ئیبنو عەباسەوە شێر بە زمانی عەرەبی واتە (اسد) بە زمانی حەبەشی پێی دەڵێن: (قسورە) بە زمانی فارسی (شیر) بە زمانی نەبتی (بالنبطية) (أوبا)[2] وە دەفەرموێت: ﴿بَلْ يُرِيدُ كُلُّ ٱمْرِئٍ مِّنْهُمْ أَن يُؤْتَىٰ صُحُفًا مُّنَشَّرَةً﴾ بەڵکو هەریەك لەوانە وایان گەرەك بوو نامەی کراوەی (بۆ بێنن) . واتە: بەڵکو هەر یەکێك لەو بت پەرستانە دەیویست نامەی بۆ ڕەوانە بکرێت وەك چۆن خودا قورئانی ناردووە بۆ پێغەمبەر(ﷺ) موجاهدو کەسانی تریش وایان وتووە.[3] وەك خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِذَا جَآءَتْهُمْ ءَايَةٌ قَالُوا۟ لَن نُّؤْمِنَ حَتَّىٰ نُؤْتَىٰ مِثْلَ مَآ أُوتِىَ رُسُلُ ٱللَّهِ ٱللَّهُ أَعْلَمُ حَيْثُ يَجْعَلُ رِسَالَتَهُۥ﴾[4] واتە: وە کاتێك ئایەتێکیان بۆ بێت دەڵێن ئێمە هەرگیز باوەڕ ناهێنین هەتا وێنەی ئەوەی بە پێغەمبەرانی خودا دراوە بە ئێمەش نەدرێت خودا چاك دەزانێت پەیام و فرستادەی خۆی لە کوێ دادەنێت و (کێ شیاوترە بۆ ئەو کارە). لە ڕیوایەتێکدا هاتووە لە قەتادەوە وتی: دەیانەوێت لێ بوردن وەرگرن بەبێ خۆماندوکردن و کارکردن.[5] خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿كَلَّا بَل لَّا يَخَافُونَ ٱلْءَاخِرَةَ﴾ نەخێر، بەڵکو لە ڕۆژی دوایی ناترسن. واتە: بێ دینی و باوەڕنەبونیان بە ڕۆژی دوایی خراپی کردون و لەناوی بردوون.

---

[1] الطبری (٤٢/٢٤)

[2] الطبری (٤٢/٢٤).

[3] القرطبی (٩٠/١٩).

[4] الانعام (١٢٤).

[5] الطبری (٤٣/٢٤).

**قورئان ئامۆژگاریه**

پاشان خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿كَلَّآ إِنَّهُۥ تَذْكِرَةٌ﴾ نەخێر، دیارە ئەم قورئانە وەبیرهێنەرە. واتە: نەخێر، بەڕاستی ئەم قورئانە دەرس‌و ئامۆژگاریە ﴿فَمَن شَآءَ ذَكَرَهُۥ﴾ کێ کەیفی لێبوو دەیخوێنێت. ﴿وَمَا يَذْكُرُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ ۚ هُوَ أَهْلُ ٱلتَّقْوَىٰ وَأَهْلُ ٱلْمَغْفِرَةِ﴾ هیچ کەسیش نایخوێنێتەوە مەگین خودا مەیلی لێ بێت خودا شیاوی لێ ترسانەو بۆ خەتایش لێبووردنی زۆرە. ﴿وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ﴾[1] واتە: وە ئێوە حەزناکەن (لە گرتنی ئەو ڕێیە) مەگەر کاتێك کە خودا بیەوێت (وە بە زۆر ناچارتان بکات). وە دەفەرموێت: ﴿هُوَ أَهْلُ ٱلتَّقْوَىٰ وَأَهْلُ ٱلْمَغْفِرَةِ﴾ قەتادە وتی: ئەو شیاوی لێ ترسانە وە هەر ئەویش خاوەنی لێبووردنە بۆ کەسێك پەشیمان بوبێتەوەو گەڕابێتەوە بۆلای[2].

## تەفسیری سورەتی (القيامه)

### لە مەککەدا هاتوەتەخوارەوە

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿لَآ أُقْسِمُ بِيَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ ﴿١﴾ وَلَآ أُقْسِمُ بِٱلنَّفْسِ ٱللَّوَّامَةِ ﴿٢﴾ أَيَحْسَبُ ٱلْإِنسَٰنُ أَلَّن نَّجْمَعَ عِظَامَهُۥ ﴿٣﴾ بَلَىٰ قَٰدِرِينَ عَلَىٰٓ أَن نُّسَوِّىَ بَنَانَهُۥ ﴿٤﴾ بَلْ يُرِيدُ ٱلْإِنسَٰنُ لِيَفْجُرَ أَمَامَهُۥ ﴿٥﴾ يَسْـَٔلُ أَيَّانَ يَوْمُ ٱلْقِيَٰمَةِ ﴿٦﴾ فَإِذَا بَرِقَ ٱلْبَصَرُ ﴿٧﴾ وَخَسَفَ ٱلْقَمَرُ ﴿٨﴾ وَجُمِعَ ٱلشَّمْسُ وَٱلْقَمَرُ ﴿٩﴾ يَقُولُ ٱلْإِنسَٰنُ يَوْمَئِذٍ أَيْنَ ٱلْمَفَرُّ ﴿١٠﴾ كَلَّا لَا وَزَرَ ﴿١١﴾ إِلَىٰ رَبِّكَ يَوْمَئِذٍ ٱلْمُسْتَقَرُّ ﴿١٢﴾ يُنَبَّؤُا۟ ٱلْإِنسَٰنُ يَوْمَئِذٍۭ بِمَا قَدَّمَ وَأَخَّرَ ﴿١٣﴾ بَلِ ٱلْإِنسَٰنُ عَلَىٰ نَفْسِهِۦ بَصِيرَةٌ ﴿١٤﴾ وَلَوْ أَلْقَىٰ مَعَاذِيرَهُۥ ﴿١٥﴾﴾

**سوێند لەسەر زیندووبونەوەی جارێکی تر لە ڕۆژی قیامەتداو وەڵامی فڕوفێڵی فەیلەسوفەکان**

خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿لَآ أُقْسِمُ بِيَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ﴾ سوێند بە ڕۆژی قیامەت. ﴿وَلَآ أُقْسِمُ بِٱلنَّفْسِ ٱللَّوَّامَةِ﴾ سوێندیش دەخۆم بە نەفسی ڕەخنەگر. زۆر جار لە پێشەوە باسی کراوە کە ئەو شتەی سوێندی لە سەر دەخورێت ئەگەر بەنەفی هات دروستە پیتی (لا) بخرێتە پێش سوێندەکە بۆ جەخت کردن لەسەر نەفیەکە سوێند لە سەر خوراویش لێرەدا بۆ سەلماندنی ڕۆژی قیامەت‌و زیندوو بوونەوەیەو وەڵام دانەوەی ئەو خودانەناسە نەفامانەیە کە باوەڕیان بە زیندوو بوونەوەی ئەندامەکانی

---

[1] الانسان (٣٠).

[2] الطبری (٢٤/٤٤).

لەش نیە پاشی مردنی. بۆیە خودا فەرموویەتی: ﴿لَآ أُقۡسِمُ بِيَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ ١ وَلَآ أُقۡسِمُ بِٱلنَّفۡسِ ٱللَّوَّامَةِ﴾ قەتادە وتی: سوێندە بە هەردووکیان بە ڕۆژی قیامەتو بەگیانیش.[1] ئەم ڕایە ڕیوایەت کراوە لە ئیبنو عەباسو سەعیدی کوڕی جوبەیریشەوە.[2] کە ڕۆژی قیامەت دیارە، بەڵام ویژدانی ڕەخنەگر ﴿بِٱلنَّفۡسِ ٱللَّوَّامَةِ﴾ قوڕەی (قرە) کوڕی خالد وتی لە حەسەنی بەسریەوە (حسن البصری) لەم ئایەتەدا: سوێند بە خودا خاوەن باوەڕ نابینین مەگین سەرزەنشتی خۆی دەکاتو دەڵێت: مەبەستم چی بوو لە قسەکەم؟ مەبەستم چی بوو بەو خواردنەم؟ مەبەستم چی بوو لەو داڵغەیەم؟ بەڵام بەدخوو گوێی لێ نیە هەر دەڕواتو بە بیریشیدا نایەت کە سەرزەنشتی خۆی بکات.[3] ئیبنو جەریر ڕیوایەتی کردووە لە سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە لەم دوو ئایەتەدا:﴿لَآ أُقۡسِمُ بِيَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ ١ وَلَآ أُقۡسِمُ بِٱلنَّفۡسِ ٱللَّوَّامَةِ﴾ وتی: سەرزەنشتی خۆی دەکات لەسەر چاکەو خراپە. عیکرەمەش هەر بەم شێوەی وتووە. وە علی کوڕی ئەبو نەجیحٌ (نجیح) لە موجاهدەوە وتی: پەشیمانە لەوەی کە ڕابووردوەو لە دەستی چووە خۆی سەرزەنشت دەکات.[4] وە فەرموویەتی: ﴿أَيَحۡسَبُ ٱلۡإِنسَٰنُ أَلَّن نَّجۡمَعَ عِظَامَهُۥ﴾ چۆن مرۆڤ وا خەیاڵ دەکات ئێمە هەرگیز ئێسکەکانی کۆناکەینەوە، واتە: وادەزنێت کە ڕۆژی قیامەت ئێمە ناتونین ئێسکەکانی کۆبکەینەوەو لە جێگاکانی خۆیان دایان بنێینەوە. ﴿بَلَىٰ قَٰدِرِينَ عَلَىٰٓ أَن نُّسَوِّيَ بَنَانَهُۥ﴾ بەڵکو توانابیمان هەیە سەری پەنجەکانیش ساز بکەین، واتە: ئاخۆ مرۆڤ وا تێ دەگات ئێمە ئێسکەکانی کۆناکەینەوەو نایخەینەوە یەك؟ بەڵێ بەمزوانە کۆی دەکەینەوەو دەتوانین سەر پەنجەکانیش سازبکەینەوە، واتە زۆر باش دەتوانین کۆی بکەینەوە، وە مەیلیشمان لێبێت چاکتر لە پێشوو زیندووی دەکەینەوەو جوانتر سەری پەنجەکانیش ڕێك دەخەینەوەو سازی دەکەین. وە فەرموویەتی: ﴿بَلۡ يُرِيدُ ٱلۡإِنسَٰنُ لِيَفۡجُرَ أَمَامَهُۥ﴾ نەخێر مرۆڤ هەر دەیەوێت تاوان بخاتە پێش خۆی. سعید لە ئیبنو عەباسەوە وتی: تاوان پێش خۆی دەخات، موجاهد وتی: سواری سەری خۆی بووەو هەر خەریکی تاوانە لە پێش خۆیەوە ڕەوانەی دەکات، علی کوڕی ئەبو تەلحە (طلحة) لە ئیبنو عەباسەوە وتی: بێ دینەو باوەڕی بە ڕۆژی هەژمرکردن نیە (الحساب)[5] ئیبنو زەیدیش هەر وای وتووە.[1] بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿يَسۡـَٔلُ أَيَّانَ يَوۡمُ ٱلۡقِيَٰمَةِ﴾

---

[1] الطبری (٢٤/٤٨).

[2] الدر المنثور (٨/٤٧) القرطبی (١٩/٩١).

[3] القرطبی (١٩/٩٣).

[4] الطبری (٢٤/٥٠).

[5] الطبری (٢٤/٥٤).

ئەو دپرسێت ڕۆژی قیامەت کەی دێت؟ واتە: دەڵێت کەی ڕۆژی قیامەت دادێت؟ وە ئەم پرسیارەش بەشێوەیەك دەكات كە باوەڕی بە ڕۆژی قیامەت نیەو بەتەمانیە ڕووبدات وەك خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿ وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا الْوَعْدُ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ ۝٢٩ قُل لَّكُم مِّيعَادُ يَوْمٍ لَّا تَسْتَأْخِرُونَ عَنْهُ سَاعَةً وَلَا تَسْتَقْدِمُونَ ﴾ وە خودای گەورە فەرموویەتی لێرەدا: ﴿فَإِذَا بَرِقَ الْبَصَرُ﴾ كاتێك چاو ئەبڵەق بوو. ئەبو عەمری کوڕی عەلا (العلاء) خوێندویەتیەوە بە ﴿بَرِقَ﴾ بەکەسری ڕا (الراء) واتە: بە مۆڵەق وەستا. ئەم ئایەتەی کە فەرمووی وەك ئەم ئایەتە وایە کە دەفەرموێت: ﴿لَا يَرْتَدُّ إِلَيْهِمْ طَرْفُهُمْ﴾[2]. واتە: بەڵكو لە ترساندا دەڕوانن بەم لاو بەولاداو هەر چاو دەگێڕنو چاویان لە سەر شتێك ناوەستێت. وە هەندێكی تر خوێندوویانەتەوە بە ﴿بَرَقَ﴾ بەفەتحی ڕاکە (الراء) ئەم مانایە گونجاوترە لە مانای یەکەم واتە چاوەکان ئەبڵەق دەبنو هەڵدەگەڕێنەوە لە ترسناکی ڕۆژی قیامەتو زەلیلیو داماویان پێوەدیارە لە گەورەیو گرانیو بینینی ئەو هەموو ناڕەحەتیە. وە دەفەرموێت: ﴿وَخَسَفَ الْقَمَرُ﴾ مانگیش گیرا. واتە: مانگیش ڕوناكی نامێنێت ﴿وَجُمِعَ الشَّمْسُ وَالْقَمَرُ﴾ خۆرو مانگیش لەیەكتری كۆكرانەوە. موجاهد وتی: تۆپەڵ كرا[3] ڕەش بوەوە. وە ئیبنو زەید لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا ﴿إِذَا الشَّمْسُ كُوِّرَتْ ۝١ وَإِذَا النُّجُومُ انكَدَرَتْ﴾ ی خوێندەوە. وە ڕیوایەت كراوە لە ئیبنو مەسعودەوە كە ئەم ئایەتەی خوێندوەتەوە: ﴿وَجُمِعَ الشَّمْسُ وَالْقَمَرُ﴾ بەفەتحی جیمەكە (الجيم) ﴿يَقُولُ الْإِنسَانُ يَوْمَئِذٍ أَيْنَ الْمَفَرُّ﴾ مرۆڤ ئەو ڕۆژە دەڵێت: ڕێگەی دەرەتانێت كوانێ؟ وەختێك مرۆڤ بە چاوی خۆی ئەم كارەساتەی ڕۆژی قیامەتی بینی دەیەوێت ڕابكات دەڵێت ئەی هاوار چی بكەم بۆ كوێ بڕۆم ئاخۆ پەنایەك شوێنێك نیە خۆمی تیادا حەشاردەم. خودای گەورەش دەفەرموێت: ﴿كَلَّا لَا وَزَرَ﴾ نەخێر هیچ پەناگایەك نیە. ئیبنو مەسعودو ئیبنو عەباسو سعیدی كوڕی جوبەیرو كەسانی تریش لە پێشینەكان (السلف) وتویانە: واتە ڕزگار بوون نیە. وە ئەم ئایەتە وەك ئەم ئایەتە وایە كە دەفەرموێت: ﴿مَا لَكُم مِّن مَّلْجَإٍ يَوْمَئِذٍ وَمَا لَكُم مِّن نَّكِيرٍ﴾[4].

---

[1] الطبری (٢٤/٥٤).

[2] ابراهيم (٤٣).

[3] الطبری (٢٤/٥٧).

[4] الشوری (٤٧).

واتە: ئەو ڕۆژە هیچ پەناتان دەست ناکەوێت‌و هیچ ئینکاریەکتان پێ ناکرێت. واتە هیچ شوێنێك نیە خۆتانی تێدا بشارنەوە وەك لێرەدا فەرموویەتی: ﴿لَا وَزَرَ﴾ واتە هیچ شوێنێك نیە پەنای پێ بەرن بۆیە خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِلَىٰ رَبِّكَ يَوْمَئِذٍ ٱلْمُسْتَقَرُّ﴾ لەو ڕۆژەدا ئارامگا هەر لای پەروەردگاری تۆیە. ئەو ڕۆژە پەنا هەر پەنای خودایە هەموو بۆ لای ئەو دەگەڕێنەوە.

## کردارەکانی مرۆڤ لە ڕۆژی قیامەتدا هەموو دەخرێتە بەر دەستی‌و ئاگادار دەکرێت لێی

پاشان خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿يُنَبَّؤُا۟ ٱلْإِنسَٰنُ يَوْمَئِذٍۭ بِمَا قَدَّمَ وَأَخَّرَ﴾ لەوڕۆژەدا مرۆڤ هەواڵی پێدەدرێت، چی پێشەکی بەڕێت کردووەو چیشی لە دوایی بەجێ ماوە. هەواڵی دەدرێتێ چی کردووە لە دونیادا لە گەورەو بچوك کۆن‌و تازە لە ئەوەڵی ژیانەوە تا کۆتایی ژیان وەك خۆی فەرموویەتی: ﴿وَوَجَدُوا۟ مَا عَمِلُوا۟ حَاضِرًا ۗ وَلَا يَظْلِمُ رَبُّكَ أَحَدًا﴾[1] واتە:هەر کردەوەیەکتان کردبێت (تیایدا) ئامادەیەو پەروەردگارت ستەم لە کەس ناکات. هەر بۆیە لێرەدا فەرموویەتی: ﴿بَلِ ٱلْإِنسَٰنُ عَلَىٰ نَفْسِهِۦ بَصِيرَةٌ﴾ نەخێر مرۆڤ بە ویژدانی خۆی دەزانێت. ﴿وَلَوْ أَلْقَىٰ مَعَاذِيرَهُۥ﴾[2] با گەلێکیش بڕوبیانو بێنێتەوە. واتە: شایەتە لەسەرخۆی دەزنێت چی کردووە با بڕوبیانوی زۆریش بێنێتەوەو ملەجەڕش بکات. وەك خودای گەورە دەفەرمووێت﴿ ٱقْرَأْ كِتَٰبَكَ كَفَىٰ بِنَفْسِكَ ٱلْيَوْمَ عَلَيْكَ حَسِيبًا﴾ واتە: (پێی دەوترێت) نامەکەت بخوێنەرەوە ئەمڕۆ خۆت بەسە بە حیسابکەر بەسەرخۆتەوە (ئەمڕۆ هەرخۆت موحاسەبەی خۆت بکە). علی کوڕی ئەبو تەلحە (طلحە) لە ئیبنو عەباسەوە وتی: ﴿بَلِ ٱلْإِنسَٰنُ عَلَىٰ نَفْسِهِۦ بَصِيرَةٌ﴾ دەڵێت: بە گوێی‌و بە چاوی‌و بە هەردوو دەستی‌و بە هەردوو قاچی‌و بە ئەندامەکانی تری لەشی دەزانێت.[3] قەتادە وتی: شایەتە لەسەر خۆی. وە لە ڕیوایەتێکی تردا وتی: بەخودا ئەگەر بتەوێت دەیبینیت زۆر شارەزایە بەکەم‌وکوڕی‌و تاوانی خەڵکی ئاگای لە خراپەو تاوانەکانی خۆی نیە. دەگێڕنەوە لە ئینجیلدا نوسراوە ئەی بەنیام (بنی ادم) تۆزو خۆڵ لە چاوی براکەتدا دەبینیت‌و درەختی گەورە لە چاوی خۆتدا نابینیت؟. موجاهد وتی: ﴿وَلَوْ أَلْقَىٰ مَعَاذِيرَهُۥ﴾ با مشت‌ومڕشیشی لەسەر بکات خۆی باش دەزنێت چی کردووە.[4] قەتادە وتی: ﴿وَلَوْ أَلْقَىٰ مَعَاذِيرَهُۥ﴾ با بڕوبیانوش بێنێتەوە بە درۆوە لەوڕۆژەدا لێی

---

[1] الكهف (٤٩).

[2] الاسراء (١٤).

[3] الطبرى (٦٢/٢٤).

[4] الطبرى (٦٤/٢٤).

وەرناگیرێت.[1] سودی وتی: ﴿وَلَوْ أَلْقَىٰ مَعَاذِيرَهُۥ﴾ با بەلگەش بێنێتەوە وەك خودا دەفەرموێت: ﴿ثُمَّ لَمْ تَكُن فِتْنَتُهُمْ إِلَّآ أَن قَالُوا۟ وَٱللَّهِ رَبِّنَا مَا كُنَّا مُشْرِكِينَ﴾[2] واتە: پاشان بەهانەیان هیچ نەبوو بێجگە لەوەی کە وتیان سوێند بەخودای پەروەردگارمان ئێمە بەهیچ جۆرێك هاوبەش دانەر نەبووین بۆ خودا. وە دەفەرموێت: ﴿يَوْمَ يَبْعَثُهُمُ ٱللَّهُ جَمِيعًا فَيَحْلِفُونَ لَهُۥ كَمَا يَحْلِفُونَ لَكُمْ ۖ وَيَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ عَلَىٰ شَىْءٍ ۚ أَلَآ إِنَّهُمْ هُمُ ٱلْكَٰذِبُونَ﴾[3] واتە: لە ڕۆژێکدا خودا هەمویان زیندوو دەکاتەوە ئەسا سوێندی بۆدەخۆن هەروەکو چۆن سوێندیان دەخورد بۆ ئێوە (لە دونیادا) وادەزانن شتێکیان بەدەستەوەیە با بزانن بەڕاستی هەر ئەوانن درۆزن. عەوفی لە ئیبنو عەباسەوە وتی: ﴿وَلَوْ أَلْقَىٰ مَعَاذِيرَهُۥ﴾ ئەوە بۆ بیانو هێنانەوەیە. ئاخۆ گوێیان لێ نەبووە کە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿لَا يَنفَعُ ٱلظَّٰلِمِينَ مَعْذِرَتُهُمْ﴾[4] واتە: پاکانەکردنی بێ باوەڕان سودیان پێناگەیەنێت. وە فەرموویەتی: ﴿وَأَلْقَوْا۟ إِلَى ٱللَّهِ يَوْمَئِذٍ ٱلسَّلَمَ﴾[5] واتە: وە لەو ڕۆژەدا گوێڕایەلی ملکەچی ئاڕاستە دەکەن بۆلای خودا. وە دەفەرموێت: ﴿فَأَلْقَوُا۟ ٱلسَّلَمَ مَا كُنَّا نَعْمَلُ مِن سُوٓءٍ﴾[6] واتە: جا لەوکاتەدا ملکەچی دەبن (و دەڵێن) ئێمە هیچ خراپەیەکمان نەکردووە. وە فەرموویەتی: ﴿وَٱللَّهِ رَبِّنَا مَا كُنَّا مُشْرِكِينَ﴾[7] واتە: سوێند بەخودای پەروەردگارمان ئێمە بەهیچ جۆرێك هاوبەشی دانەر نەبووین بۆ خودا.

﴿لَا تُحَرِّكْ بِهِۦ لِسَانَكَ لِتَعْجَلَ بِهِۦٓ ﴿١٦﴾ إِنَّ عَلَيْنَا جَمْعَهُۥ وَقُرْءَانَهُۥ ﴿١٧﴾ فَإِذَا قَرَأْنَٰهُ فَٱتَّبِعْ قُرْءَانَهُۥ ﴿١٨﴾ ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا بَيَانَهُۥ ﴿١٩﴾ كَلَّا بَلْ تُحِبُّونَ ٱلْعَاجِلَةَ ﴿٢٠﴾ وَتَذَرُونَ ٱلْءَاخِرَةَ ﴿٢١﴾ وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَّاضِرَةٌ ﴿٢٢﴾ إِلَىٰ رَبِّهَا نَاظِرَةٌ ﴿٢٣﴾ وَوُجُوهٌ يَوْمَئِذٍۭ بَاسِرَةٌ ﴿٢٤﴾ تَظُنُّ أَن يُفْعَلَ بِهَا فَاقِرَةٌ ﴿٢٥﴾﴾

---

[1] الطبری (٢٤/٦٥).

[2] الانعام (٢٣).

[3] المجادلة (١٨).

[4] غافر (٥٢).

[5] النحل (٨٧).

[6] النحل (٢٨).

[7] الانعام (٢٣).

### فێرکردنی وەرگرتنی نیگا (الوحی)

ئەمە ڕێنمایی خوای گەورەیە بۆ پێغەمبەرەکەی کەچۆنئەو نیگایە (الوحی ) وەربگرێت لەو فریشتەیەوە کە بۆی دێنێت. چونکە پێغەمبەر(ﷺ) پەلەی دەکردو هەوڵی دەدا پێشبڕکێی دەکرد لەگەڵ فریشتەی وەحی لە خوێندنەوەی قورئاندا. خودای گەورە فەرمانی دا بە پێغەمبەر(ﷺ) کاتێك کە فریشتە هاتەلای نیگای بۆی هێنا با گوێی لێ بگرێت وەخودا خۆی کۆی دەکاتەوەو دەیکاتە ناو دڵیەوە، وە بۆی ئاسان دەکات بەوشێوەیەی کە بۆینادرووە بەجێی بێنێت، وە بۆی ڕون دەکاتەوەو مانای فێردەکات یەکەمجار دەیخاتە ناو دڵیەوە دووەم جار فێری خوێندنی دەکاتو سێیەم جاریش ماناکەی بۆ ڕون دەکاتەوە بۆیە فەرموویەتی: ﴿لَا تُحَرِّكْ بِهِۦ لِسَانَكَ لِتَعْجَلَ بِهِۦٓ﴾ تۆ زمانی لێ مەخەگەڕ، تا بەپەلە بیخوێنیتەوە. واتە: قورئان بەپەلە مەخوێنێنەوە. وەك فەرموویەتی: ﴿وَلَا تَعْجَلْ بِٱلْقُرْءَانِ مِن قَبْلِ أَن يُقْضَىٰٓ إِلَيْكَ وَحْيُهُۥ ۖ وَقُل رَّبِّ زِدْنِى عِلْمًا﴾[1] واتە: پەلە مەکە لە (خوێندنی) قورئاندا لە پێش ئەوەی سروش کردنەکەی بۆت تەواوبێت وە بڵێ ئەی پەروەردگارم زانستو زانیاریم زیادبکە. پاشان فەرموویەتی: ﴿إِنَّ عَلَيْنَا جَمْعَهُۥ وَقُرْءَانَهُۥ﴾ چونکە ئەرکی کۆکردنو وە خوێندنی لەسەر ئێمەیە. ﴿فَإِذَا قَرَأْنَٰهُ فَٱتَّبِعْ قُرْءَانَهُۥ﴾ هەرکاتێك ئێمە خوێندمانەوە ئەوساکە تۆ لە دویی دا بیخوێنەوە. ﴿ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا بَيَانَهُۥ﴾ لەپاشانیش شیکردنەوەی لەسەر ئێمەیە. ﴿قُرْءَانَهُۥ﴾ کە دەشی خوێنیتەوە، ﴿فَإِذَا قَرَأْنَٰهُ﴾ وەختێك فریشتە بۆت دەخوێنێتەوە بە فەرمانی خودا، ﴿فَٱتَّبِعْ قُرْءَانَهُۥ﴾ واتە: گوێی لێ بگرە پاشان چۆن کە بۆت دەخوێنێت تۆش بیخوێنەوە. ﴿ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا بَيَانَهُۥ﴾ واتە: پاش لەبەرکردنو خویندنەوەی بۆت ڕون دەکەینەوەو ماناکەیت بۆ لێکدەدەینەوە فێرت دەکەین بەوشێوەیەی کە دەمانەوێتو بڕیارمانداوە. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەباسەوە وتی: پێغەمبەر(ﷺ) کە قورئانی بۆدەهاتە خوارەوە زۆر ناڕەحەت دەبوو هەردولێوی دەجولاند وتی: ئیبنوعەباس پێی وتم: منیش هەردوو لێوم دەجولێنم وەك چۆن پێغەمبەر(ﷺ) جولاندویەتی. وە سەعیدیش پێی وتم: منیش هەردوو لێوم دەجولێنم هەروەکو چۆن ئیبنو عەباس جولاندویەتی. خودای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە ﴿لَا تُحَرِّكْ بِهِۦ لِسَانَكَ لِتَعْجَلَ بِهِۦٓ ﴿١٦﴾ إِنَّ عَلَيْنَا جَمْعَهُۥ وَقُرْءَانَهُۥ﴾واتە:کۆی دەکەینەوە لەناودڵتداپاشان دەیخوێنینەوە. ﴿فَإِذَا قَرَأْنَٰهُ فَٱتَّبِعْ قُرْءَانَهُۥ﴾ واتە: گوێی لێ بگرەو بێ دەنگبە. ﴿ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا بَيَانَهُۥ﴾ پاشان

---

[1] طه (١١٤).

هەرکاتێك جوبرەئیل بهاتایە لای پێغەمبەر(ﷺ) بەو شێوەیە دەیخوێند کە جوبرەئیل بۆی دەیخوێند[1] بوخاریو مسلم ڕیوایەتیان کردووە. بوخاری بەم شێوەیە ڕیوایەتی کردووە وەختێك جوبرەئیل دەهاتە لای پێغەمبەر(ﷺ) بێ دەنگ دەبوو کاتێك دەڕۆیش دەیخوێندەوە بەو شێوەیەی کە خودای گەورە بەڵێنی پێ دابوو[2].

## هۆی باوەڕنەبوون بە ڕۆژی قیامەت خۆشەویستی دونیاو لە بیرچوونەوەی ڕۆژی دواییە

خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿كَلَّا بَلْ تُحِبُّونَ الْعَاجِلَةَ﴾ نەخێر ئێوە دیارە هەر دونیاتان خۆش دەوێت. ﴿وَتَذَرُونَ الْآخِرَةَ﴾ دواڕۆژیش وەلا دەنێی. واتە: لەبەرئەوە باوەڕ ناهێنن بە ڕۆژی دوایی وە دژایەتی ئەونیگا ڕاستەو ئەو قورئانە مەزنە دەکەن کە خودای گەورە ڕەوانەی کردووە بۆ پێغەمبەرەکەی (ﷺ) چونکە ئەوان هەر سەرقاڵن بەو ژیانە کەمو کۆتایی دونیاوە بێ ئاگانو هۆشیان بە دوا ڕۆژەوە نیە.

## بینینی خودای گەورە لە ڕۆژی دوایی دا

پاشان خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَّاضِرَةٌ﴾ ئەو ڕۆژە زۆر ڕوو هەن گەش دەبن. واتە: جوانەو دەدرەوشێتەوە پرشەی لێوە دێتو کەیف خۆشە. ﴿إِلَىٰ رَبِّهَا نَاظِرَةٌ﴾ چاو دەگێڕن بەرەو پەروەرندەی خۆیان. واتە: بە چاوی خۆیان دەبینن وەك بوخاری لە سەحیحەکەید ڕیویەتی کردووە (بەمزوانە پەروەرندەی خۆتان بە ئاشکرا بەچاوی خۆتان دەبینن)[3] لە فەرموودەی سەحیحدا هاتووە کە خاوەن باوەڕان لە ڕۆژی دوایی دا خودای گەورە دەبینن وە زانایانی فەرمودە لە زۆر ڕێگاوە ڕیوایەتیان کردووە کە بەرگری ناکرێتو ناتوانرێت بڕوای پێ نەکرێت وەك فەرمودەی ئەبو سەعیدو ئەبو هورەیرە کە ئەم فەرمودانە لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە کە هەندێك خەڵك وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئاخۆ پەروەرندەمان لە ڕۆژی قیامەتدا دەبینین؟ فەرمووی: ئایا خۆرو مانگ کە هەور بەری نەگرتبێت گومانتان هەیە لە بینینیان؟ وتیان: نەخێر، فەرمووی: (ئێوە وەك ئەوە خودای خۆتان دەبینن)[4] وە لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە لە جەریرەوە وتی: پێغەمبەری خودا ڕونی بۆ مانگ لە شەوی چواردەدا فەرمووی: (ئێوە پەروەرندەی خۆتان دەبینن وەك چۆن ئەم مانگە دەبینن)[5] وە لە سەحیحی موسلم دا هاتووە لە سوهەیبەوە (صهیب) ئەویش لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) کە

---

[1] احمد (٣٤٣/١) فەرموودەیەکی سەحیحە.

[2] فتح الباری (٣٩/١/٨/٥٤٧/٥٤٩، ٥٥٠، ٧٠٧/١٣/٥٠٨)، مسلم (٣٣٠/١).

[3] فتح الباری (٤٣٠/١٣).

[4] فتح الباری (٤٣٠/١٣/٤٣١)، مسلم (١٦٣/١/١٦٧).

[5] فتح الباری (٤٢٩/١٣)، مسلم (٤٣٩/١).

فەرموویەتی: (وەختێك خەڵکی بەهەشت ڕۆیشتنە بەهەشت فەرمووی: خودای گەورە دەفەرمووێت: شتێکتان دەوێت بۆتان زیاد بکەم؟ ئەوانیش دەڵێن ئایا ڕومانت سپی نەکردووە!وە ئایا نەت خستوینەتە بەهەشت! ڕزگارت نەکردوین لە ئاگر! فەرمووی: پەردە لادەدرێت هیچ شتێکیان پێ نەبەخشراوە خۆشەویشستربێت لایان لە ڕوانیان بۆ پەروەرندەیان ئەوە زیادکردنەکەبوو پاشان ئەم ئایەتەی خوێند: ﴿لِّلَّذِينَ أَحْسَنُوا۟ ٱلْحُسْنَىٰ وَزِيَادَةٌ﴾[1] )[2] واتە: بۆ ئەوانەی چاکەیان کردووە پاداشتی چاکتر (بەهەشت) و زیاتریان هەیە (کە بینینی خودایە). وە لە سەحیحی موسلم دا هاتووە لە جابرەوە لە فەرموودەیەکەیدا: خودا خۆی دەردەخات (خۆی نیشان دەدات) بۆ خاوەن باوەڕان پێ دەکەنێت[3] وتە لە گۆڕەپانی قیامەتدا. لەم فەرموودانەوە دەدەکەوێت کە خوداناسان دەڕوانن بۆ پەروەرندەیان لە گۆڕەپانی قیامەتداو لە باخەکانی بەهەشتدا. ئەگەر ترسی درێژە پێدانمان نەبوایە فەرموودەی ترمان دەهێنا لەم بارەیەوە بە هەمان وتە لە کتێبە سەحیحو سونەنو وسەنەدەکاندا، بەڵام بەجیا جیا لە هەندێك شوێندا لەم تەفسیرەدا باسمان کردووە، یارمەتیش هەر لە خوداوەیە. وە ئەم باسە سوپاس بۆ خودا کۆی زانایانی لەسەرە لە نێوان هاوەڵانی پێغەمبەرو (ﷺ) پەیڕەوانی ئەوانداو پێشینانی ئەم ئوممەتەدا (ڕەزای خوایان لێ بێت) هەروەها پێشەوایانی ئەممەتی ئیسلامی کە ڕێ نیشاندەری خەڵك بوون یەك ڕان لەسەری (متفق علیە).

## یاخیەکان لە ڕۆژی قیامەتدا ڕویان ڕەش دەبێت

خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَوُجُوهٌ يَوْمَئِذٍۭ بَاسِرَةٌ﴾ زۆر ڕوخساریش لەو ڕۆژەدا گرژو تاڵن. ﴿تَظُنُّ أَن يُفْعَلَ بِهَا فَاقِرَةٌ﴾ چاوەڕوانن جەزرەبەی کەمەر شکێنیان بەسەر بێنن. ئەمە ڕوی بەدکارانە لە ڕۆژی قیامەتدا بەدبەختو چارەڕەشن. قەتادە وتی: ﴿بَاسِرَةٌ﴾ واتە: ڕوترش‌وتاڵ.[4] سودی وتی: واتە ڕەنگ گۆڕاو.[5] ﴿تَظُنُّ﴾ واتە: باوەڕی وایە. ﴿أَن يُفْعَلَ بِهَا فَاقِرَةٌ﴾ موجاهد وتی: کارەساتی زۆر گران[6] قەتدە وتی: زۆر خراپ، سودی وتی: دەزانێت کە لەناودەچێت، ئیبنو زەید وتی: دەزانێت کە بەمزوانە دەچێتە ناو

---

[1] یونس (٢٦).
[2] مسلم (١٦٣/١).
[3] مسلم (١٧٨/١).
[4] الطبری(٧٤/٢٤).
[5] القرطبی (١١٠/١٩).
[6] الطبری(٧٤/٢٤).

ئاگر، وە ئەم شوێنە وەك ئەمە وایە كە خودای گەورەدەفەرمووێت: ﴿يَوْمَ تَبْيَضُّ وُجُوهٌ وَتَسْوَدُّ وُجُوهٌ﴾[1] واتە: ڕۆژێك دێت كە چەند ڕویەك سپی دەبن وە چەند ڕویەك ڕەش دەبن. وە وەك دەفەرمووێت: ﴿وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ مُّسْفِرَةٌ ﴿٣٨﴾ ضَاحِكَةٌ مُّسْتَبْشِرَةٌ ﴿٣٩﴾ وَوُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ عَلَيْهَا غَبَرَةٌ ﴿٤٠﴾ تَرْهَقُهَا قَتَرَةٌ ﴿٤١﴾ أُولَٰئِكَ هُمُ الْكَفَرَةُ الْفَجَرَةُ﴾[2] واتە: زۆر ڕوخسار لەوڕۆژەدا گەشو جوانن، دەم بە پێكەنینو شادومانن، وە زۆر ڕوخسار لەوڕۆژەدا تەپوتۆزیان بەسەرەوەیە، لە داماویدا ڕەش داگیرساون، ئەوانە ئەوانەن كە بێ باوەڕو گوناهكارو تاوانبارن. وە دەفەرمووێت: ﴿وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ خَاشِعَةٌ ﴿٢﴾ عَامِلَةٌ نَّاصِبَةٌ ﴿٣﴾ تَصْلَىٰ نَارًا حَامِيَةً ﴿٤﴾ تُسْقَىٰ مِنْ عَيْنٍ آنِيَةٍ ﴿٥﴾ لَّيْسَ لَهُمْ طَعَامٌ إِلَّا مِن ضَرِيعٍ ﴿٦﴾ لَّا يُسْمِنُ وَلَا يُغْنِي مِن جُوعٍ ﴿٧﴾ وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَّاعِمَةٌ ﴿٨﴾ لِّسَعْيِهَا رَاضِيَةٌ ﴿٩﴾ فِي جَنَّةٍ عَالِيَةٍ﴾[3] واتە: زۆر دەموچاو لەوڕۆژەدا ترسناكو ڕیسواو شەرمەزارن، هەوڵدەرێكی ڕەنجەڕۆن، دەچنە ناو ئاگری هەرە گەرمەوە، ئاو دەدرێن لە سەرچاوەی لە كوڵو هەرە گەرم، خۆراكیان هەر دڕكی حوشتر خۆر (ی ئاگرین)ە، نە قەڵەوی دەدات نە برسێتی لادەبات، زۆر ڕوخسار لەو ڕۆژەدا پاراوە (جوانو گەشن) ڕزین لە كۆششی خۆیان، وان لە بەهەشتی بەرزو بڵندان. لە وێنەی ئەم ئایەتانە زۆرن.

﴿كَلَّا إِذَا بَلَغَتِ التَّرَاقِيَ ﴿٢٦﴾ وَقِيلَ مَنْ ۜ رَاقٍ ﴿٢٧﴾ وَظَنَّ أَنَّهُ الْفِرَاقُ ﴿٢٨﴾ وَالْتَفَّتِ السَّاقُ بِالسَّاقِ ﴿٢٩﴾ إِلَىٰ رَبِّكَ يَوْمَئِذٍ الْمَسَاقُ ﴿٣٠﴾ فَلَا صَدَّقَ وَلَا صَلَّىٰ ﴿٣١﴾ وَلَٰكِن كَذَّبَ وَتَوَلَّىٰ ﴿٣٢﴾ ثُمَّ ذَهَبَ إِلَىٰ أَهْلِهِ يَتَمَطَّىٰ ﴿٣٣﴾ أَوْلَىٰ لَكَ فَأَوْلَىٰ ﴿٣٤﴾ ثُمَّ أَوْلَىٰ لَكَ فَأَوْلَىٰ ﴿٣٥﴾ أَيَحْسَبُ الْإِنسَانُ أَن يُتْرَكَ سُدًى ﴿٣٦﴾ أَلَمْ يَكُ نُطْفَةً مِّن مَّنِيٍّ يُمْنَىٰ ﴿٣٧﴾ ثُمَّ كَانَ عَلَقَةً فَخَلَقَ فَسَوَّىٰ ﴿٣٨﴾ فَجَعَلَ مِنْهُ الزَّوْجَيْنِ الذَّكَرَ وَالْأُنثَىٰ ﴿٣٩﴾ أَلَيْسَ ذَٰلِكَ بِقَادِرٍ عَلَىٰ أَن يُحْيِيَ الْمَوْتَىٰ ﴿٤٠﴾﴾.

### كاتی مردن (گیان كێشان) گومان نامێنێت

خودای گەورە هەواڵی كاتی گیان كێشانمان دەداتێت كە چەند گرنو پڕ ئێشو ئازارە خودای گەورە بمانهێڵێتەوە لەسەر وتەی (لا اله الا الله محمد رسول الله (ﷺ) فەرموویەتی: ﴿كَلَّا إِذَا بَلَغَتِ التَّرَاقِيَ﴾ نەخێر هەر بەخۆ نازانێت تا مەرگ بەربینگی دەگرێت. ئەگەر بە نەخێر ماناكەی بكەین واتە: ئەی وەچەی ئادەم لێرەدا ئیتر دەرفەتتان نیە باش دەزانیت ئەوەی كە هەواڵت پێدراوە ناتوانی باوەڕی پێ نەكەیت. وە ئەگەر ماناكەی بە (حقاً) بكەین واتە: بەڕاسی و ئاشكرا وەختێك مەرگ

---

[1] ال عمران (١٠٦).

[2] عبس (٣٨– ٤٢).

[3] الغاشية (٢– ١٠).

بەربینگت دەگرێت واتە: گیانت لە لەشت جیادەکاتەوە. ﴿ٱلتَّرَاقِيَ﴾ جەمعی تەرەقوەیە (ترقوة) ئەو پێشانەیە کە لە بەینی ژێر چەناگەو سەر شاندایە. وەك خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَلَوۡلَآ إِذَا بَلَغَتِ ٱلۡحُلۡقُومَ ﴿٨٣﴾ وَأَنتُمۡ حِينَئِذٖ تَنظُرُونَ ﴿٨٤﴾ وَنَحۡنُ أَقۡرَبُ إِلَيۡهِ مِنكُمۡ وَلَٰكِن لَّا تُبۡصِرُونَ ﴿٨٥﴾ فَلَوۡلَآ إِن كُنتُمۡ غَيۡرَ مَدِينِينَ ﴿٨٦﴾ تَرۡجِعُونَهَآ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ﴾[1] واتە: دەی بۆچی کاتێك گیان (ی نەخۆشەکەتان) دەگاتە گەرو وە ئێوە لەوکاتەدا تەماشادەکەن، لەو کاتەدا ئێمە لە ئێوە نزیکترین لەو (ئەوکەسەی لە سەرە مەرگدایە) بەڵام ئێوە ئێمە نابینن، ئەسا ئەگەر پێتانوایە ناکەونە بەرپرسینەوە، ڕوحی (مردوەکەتان) بگێڕنەوە ئەگەر ڕاست دەکەن. هەروەها لێرەدا فەرموویەتی: ﴿كَلَّآ إِذَا بَلَغَتِ ٱلتَّرَاقِيَ ﴿٢٦﴾ وَقِيلَ مَنۡۜ رَاقٖ﴾ وتراویشە کەسی فریارەس کێ یە؟ عیکرمە وتی: لە نوشتەکەرێك نوشتە بکات[2] هەربەمشێوەیە ئەبو قەلابە (قلابة) وتی: ﴿وَقِيلَ مَنۡۜ رَاقٖ﴾ لە پزیشکێك کە بێت بە هاواریەوە ڕزگاری بکات[3] وە هەروەها قەتادەو زەحاكو ئیبنو زەیدیش وتوویانە. وە دەفەرموێت: ﴿وَظَنَّ أَنَّهُ ٱلۡفِرَاقُ﴾ لێشی ڕونە کاتی جیابوونەوەیە.

﴿وَٱلۡتَفَّتِ ٱلسَّاقُ بِٱلسَّاقِ﴾ وە قاچو لول لاق بەیەکدا ئاڵا. علی کوڕی ئەبو تەلحە (طلحە) لە ئیبنو عەباسەوە وتی: کۆتا (دواین) ڕۆژی دونیاو یەکەم ڕۆژ لە ڕۆژی دوایی. واتە: ئێش‌وئازار دێت بەسەر ناڕەحەتیو ئێشو ئازاردا مەگەر کەسێك خودا بەزەیی خۆی بێتەوە پێیداو بیبەخشێت.[4] عیکرمە وتی: ﴿وَٱلۡتَفَّتِ ٱلسَّاقُ بِٱلسَّاقِ﴾ ڕوداوی گەورە گەیشت بە ڕوداوی گەورە. موجاهد وتی: تاقی کردنەوە دوای لەسەر تاقی تاقی کردنەوە. حەسەنی بەسری وتی: ﴿وَٱلۡتَفَّتِ ٱلسَّاقُ بِٱلسَّاقِ﴾ ئەو دوو لینگەی کە لێك دەپێچین[5] وە لە ڕیوایەتێکی تردا لە حەسەنی بەسریەوە وتی: هەردوو لاقی مردووەو بێ گیانەو هەڵی ناگرن وەختێکیش هەبوو دەهاتو دەچوو لەسەریان[6] خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِلَىٰ رَبِّكَ يَوۡمَئِذٍ ٱلۡمَسَاقُ﴾ ئەو ڕۆژە ڕاپێچکردن بەرەو پەروەرندەی تۆیە. گەڕانەوەو پاشەڕۆژ هەر بۆ لای خودایە. چونکە گیان بەرز دەبێتەوە بەرەو ئاسمانەکان خودای گەورەیش دەفەرموێت ئەو بەندەی منە

---

[1] الواقعة (٨٣_ ٨٧).

[2] الطبری (٧٥/٢٤).

[3] الطبری (٧٥/٢٤).

[4] الطبری (٧٦/٢٤).

[5] الطبری (٧٨/٢٤).

[6] القرطبی (١١٢/١٩).

بیگەڕێننەوە بۆ سەر زەمین. چونکە من لە زەمین وەدیم هێناون وە دەشیان گێڕمەوە بۆ ناو زەمین‌و وە جارێکی تریش دەیان هێنمە دەرەوە تێیدا. وەك لە فەرموودە درێژەکەی برادا (البراو) هاتووە.[1]

خودای گەورەش فەرموویەتی: ﴿وَهُوَ ٱلْقَاهِرُ فَوْقَ عِبَادِهِۦ ۖ وَيُرْسِلُ عَلَيْكُمْ حَفَظَةً حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَ أَحَدَكُمُ ٱلْمَوْتُ تَوَفَّتْهُ رُسُلُنَا وَهُمْ لَا يُفَرِّطُونَ ﴿٦١﴾ ثُمَّ رُدُّوٓا۟ إِلَى ٱللَّهِ مَوْلَىٰهُمُ ٱلْحَقِّ ۚ أَلَا لَهُ ٱلْحُكْمُ وَهُوَ أَسْرَعُ ٱلْحَٰسِبِينَ﴾[2] واتە: ئەو (خودا) زاڵ‌و دەسەلاتدارە بەسەر بەندەکانیداو فریشتانێکتان بۆ دەنێرێت (کە چاودێرو پارێزەرو نوسەری کردەوەکانتانن) تا کاتی مردن یەکێکتان دێت نێردراوەکانمان گیانی دەکێشن کە هیچ سستی‌و کەمتەرخەمیەك ناکەن (لە کارەکانیاندا)، پاشان دەگەڕێنەوەبۆلای خودا کەسەروەری ڕاستەقینەیانە، ئاگادارین فەرمانڕەوایی‌و بڕیار هەر بۆ ئەوە هەر خواشە لێ پرسینەوەی خێراترە لە هەموو.

## باسی ژیانی بێ باوەڕ

خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿فَلَا صَدَّقَ وَلَا صَلَّىٰ﴾ نەهەرگیز بڕوای هێناوە نە نوێژیشی کردووە. ئەمە باسی ئەوخودانەناسەیە کە لە ژیانی دونیادا باوەڕی لە دڵیدا بە خودا نەبووەو شتیشی کردووەتە هەمووکارێکی چاك‌و ڕوو لە خودا خێری تێدا نەبووە لە ئاشکراو پەنهانیدا. بۆیە خودا دەفەرمووێت: ﴿فَلَا صَدَّقَ وَلَا صَلَّىٰ ﴿٣١﴾ وَلَٰكِن كَذَّبَ وَتَوَلَّىٰ﴾ بەڵکو ئاینی بەدرۆ دەزانی‌و پشتی تێ دەکرد. ﴿ثُمَّ ذَهَبَ إِلَىٰٓ أَهْلِهِۦ يَتَمَطَّىٰٓ﴾ پاشان بە خۆبادانەوە چوو بۆ لای کەس‌وکارەکەی. واتە: بە کەیف خۆشی‌و دەست باوی‌و بێ کاری‌و بێ توانایی دەڕۆیی بۆلای کەس‌وکارەکەی. وەك خودای گەورە فەرموویی: ﴿وَإِذَا ٱنقَلَبُوٓا۟ إِلَىٰٓ أَهْلِهِمُ ٱنقَلَبُوا۟ فَكِهِينَ﴾[3] واتە: وە کاتێکیش بگەڕانایەتەوە بۆلای ماڵ‌و منداڵیان بە پێکەنین‌و گاڵتەپێکردن (بە موسڵمانان) دەگەڕانەوە. وە فەرموویەتی: ﴿إِنَّهُۥ كَانَ فِىٓ أَهْلِهِۦ مَسْرُورًا ﴿١٣﴾ إِنَّهُۥ ظَنَّ أَن لَّن يَحُورَ ﴿١٤﴾ بَلَىٰٓ إِنَّ رَبَّهُۥ كَانَ بِهِۦ بَصِيرًا﴾[4] واتە: (چونکە) بێگومان ئەو لەناو کەس‌وکاریدا دڵخۆش بووە، وە ئەو وای گومان دەبرد کە هەرگیز ناگەڕێتەوە (لای خودا)، نەخێر ونیە! چونکە بەڕاستی پەروەردگاری

---

[1] الطوال للطبرانی (٢٣٨).

[2] الانعام (٦١– ٦٢).

[3] المطففین (٣١).

[4] الانشقاق (١٣– ١٥).

ئەو ئاگاداربووە بەو. زەحاك لە ئیبنو عەباسەوە وتی: ﴿ثُمَّ ذَهَبَ إِلَىٰٓ أَهْلِهِۦ يَتَمَطَّىٰٓ﴾ واتە: بەفیزەوە.[1] قەتادەو زەیدی کوڕی ئەسلەم (اسلم) وتیان: واتە (خۆی با دەداو)[2] خۆی هەڵدەکێشا. خودای گەورە فەرمویەتی: ﴿أَوْلَىٰ لَكَ فَأَوْلَىٰ﴾ ئەمە بۆ تۆ شیاوترو لەبارترە. ﴿ثُمَّ أَوْلَىٰ لَكَ فَأَوْلَىٰٓ﴾ جارێکی تریش ئەمە بۆ تۆ شیاوترو لەبارترە. ئەمە هەڕەشەو بەڵێنێکی خودای گەورەیە بۆ ئەو بێ دینانەی کە باوەڕیان پێی نیەو بە فیزەوە دەڕۆن بەڕێدا، واتە: ئەمە بۆ تۆ شیاوترو لەبارترە کە بەو شێوەیە دەڕۆیت بە ڕێدا کە باوەڕت بە وەدیهێنەرت نیە. ئەم جۆرە قسانە بەکاردەهێنرێن لە شێوەی هەڕەشەو گاڵتەپێکردندا وەك خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿ذُقْ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْكَرِيمُ﴾[3] واتە: (پێی دەوترێت) بیچێژە چونکە بەڕاستی تۆ بەدەسەڵاتو بەڕێزی (گاڵتەی پێ دەکرێت). وە دەفەرموێت: ﴿كُلُوا۟ وَتَمَتَّعُوا۟ قَلِيلًا إِنَّكُم مُّجْرِمُونَ﴾[4] واتە: (ئەی کافران) بخۆنو بەهرەمەندبن ماوەیەکی کەم (لە دونیادا) بەڕاستی ئێوە تاوانبارن. وە دەفەرموێت: ﴿فَٱعْبُدُوا۟ مَا شِئْتُم مِّن دُونِهِۦ﴾[5] واتە: (بە بێ باوەڕان بڵێ) ئێوەش جگو لە خودا چیتان ویست بیپەرستن. وە دەفەرموێت: ﴿ٱعْمَلُوا۟ مَا شِئْتُمْ﴾[6] واتە: هەرچیتان ویست (حەزتان لێکرد) بیکەن. چەند ئایەتی تر لەم جۆرە عبدالرحمانی نەسائی ڕیوایەتی کردووە لە سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە وتی: (وتم بە ئیبنو عەباس) پرسیارم لێکرد لەبارەی ئەم ئایەتانەوە ﴿أَوْلَىٰ لَكَ فَأَوْلَىٰ ۝٣٤ ثُمَّ أَوْلَىٰ لَكَ فَأَوْلَىٰٓ﴾ وتی: پێغەمبەری خودا فەرموویەتی بە ئەبو جەهل دوای ئەوەی خودای گەورە ئەم ئایەتانەی ناردە خوارەوە: ﴿أَوْلَىٰ لَكَ فَأَوْلَىٰ ۝٣٤ ثُمَّ أَوْلَىٰ لَكَ فَأَوْلَىٰٓ﴾[7] ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە لە قەتادەوە لەم فەرموودەی خودا ﴿أَوْلَىٰ لَكَ فَأَوْلَىٰ ۝٣٤ ثُمَّ أَوْلَىٰ لَكَ فَأَوْلَىٰٓ﴾ وتی: هەڕەشەیە لە دوای هەڕەشە لەسەریەك گوێتان لێیەو دەیبیستن وە وتراوە پێغەمبەری خودا(ﷺ) دوژمنی خودا ئەبو جەهلی گرتووە (دەستی گرتووە یان جلەکانی) پاشان فەرموویەتی: ﴿أَوْلَىٰ لَكَ فَأَوْلَىٰ ۝٣٤ ثُمَّ أَوْلَىٰ لَكَ فَأَوْلَىٰٓ﴾ دوژمنی

---

[1] الدر المنثور (٣٦٣/٨).

[2] الطبری (٨١/٢٤).

[3] الدخان (٤٩).

[4] المرسلات (٤٦).

[5] الزمر (١٥).

[6] فصلت (٤٠).

[7] النسائي في الکبری (٥٠٤/٦) فەرموودەیەکی سەحیحە.

خودا ئەبو جەهلیش وتی: هەڕەشەم لێ دەکەی ئەی محمد؟ سوێند ەخودا نەتۆش‌و نە خوداکەشت ناتوانن هیچ شتێك بکەن وە من بەڕێزترین کەسی ئەم شێوەیەم لە نێون ئەم دوو کێوەدا.

**مرۆڤ بەخۆڕایی بەرەلا ناکرێت**

خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿أَيَحْسَبُ ٱلْإِنسَٰنُ أَن يُتْرَكَ سُدًى﴾ ئاخۆ مرۆڤ لای وایە بەخۆڕایی وێڵی دەکەن. سودی وتی: واتە زیندوو ناکرێتەوە، موجاهدو شافیعی‌و عبدالرحمانی کوڕی زەیدی کوڕی ئەسلەم (اسلم) وتی: واتە نە فەرمانی پێ دەکرێت بە چاکەو نە قەدەغەی خراپەشی لێ دەکرێت ئایەتەکە هەردوو ماناکە دەگەیەنێت، واتە: بەرەلا ناکرێت کە لێی نەپرسرێتەوە ب ئارەزوی خۆی لە دونیا هەرچی بیەوێت بیکات، وە لە گۆڕیشدا وازی لێ ناهێنرێت ئیتر زیندوو ناکرێتەوە بەڵکو بەرپرسیارە لە هەرشتێك لە دونیا دەیکات‌و زیندووش نەکرێتەوە لە ڕۆژی دوایی دا لەبەردەم خودای گەورەدا دەوەستێنرێت. بەمەست بەم ئایەتە لێرەدا ئەوەیە کە ڕۆژی قیامەت دێت‌و وەڵامە بۆ ئەوکەسە بێ دین‌و نەفامە سەرلێ شێواوانەی کە باوەڕیان بە ڕۆژی دوایی نیە دەیانخاتە بەرچاویان کە ئەوان چۆن دروستکراون لە نەبوونەوە هاتوونەتە ژیان دەفەرمووێت: ﴿أَلَمْ يَكُ نُطْفَةً مِّن مَّنِيٍّ يُمْنَىٰ﴾ ئاخۆ ئەو دڵۆپێك نەبوو کە دەڕژێتە ناو تولەوە؟ واتە: ئایا مرۆڤ دڵۆپێك ئاوی پیسی بێزراو نەبوو لە پشتی پیاوانەوە دەڕژایە ناو ڕەحمی ژنانەوە؟ ﴿ثُمَّ كَانَ عَلَقَةً فَخَلَقَ فَسَوَّىٰ﴾ پاشان بوو بە جەڵتەخوێن‌و دروستی کردو سازی دا؟ واتە: پاشان بوو بە جەڵتەخوێن‌و پاش ئەوەی بوو بو پارچە گۆشتێك پاشان وێنەی کێشراو فوو کرا بەگیانیدا (الروح) بو بە مرۆڤێکی ڕێك‌و تەواو لەش ساغ لە نێر یان لە مێ بە بڕیاری خودای گەورە. بۆیە خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿فَجَعَلَ مِنْهُ ٱلزَّوْجَيْنِ ٱلذَّكَرَ وَٱلْأُنثَىٰٓ﴾ ئەوسا هەر لە تنۆکەوە جووتەی نێرو مێی دروست کردووە. پاشان فەرمووی: ﴿أَلَيْسَ ذَٰلِكَ بِقَٰدِرٍ عَلَىٰٓ أَن يُحْـِۧيَ ٱلْمَوْتَىٰ﴾ ئاخۆ کەسێکی وا ناتونێت مردوو زیندوو بکاتەوە؟ واتە: ئایا ئەوکەسەی کە ئەم مرۆڤە ڕێك‌وپێکەی وەدی هێناوە لە تنۆکە ئاوێکی بێزراو ناتوانێت وەك چۆن یەکەمجار دروستی کردووە جارێکی تر چاکتر یان وەك یەکەمجار دروسی بکاتەوە؟ بۆ هەردوو ڕایەکە خودی گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِى يَبْدَؤُا۟ ٱلْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ وَهُوَ أَهْوَنُ عَلَيْهِ﴾[1] واتە: ئەو (خودا) زاتێکە بەدیهێنانی دەستپێکردوە لە پاشان (دوایی) دووبارە دروستی دەکاتەوە ئەم (دروست کردنەوەی دووەم) لای خودا ئاسانترە. ڕای یەکەم بەهێزترو دیارترە کە وەك لە پێشەوە لە سورەتی (الروم) دا باسی کراوەو ڕونکراوەتەوە.

[1] الروم (٢٧).

### پاڕانەوە لە کۆتایی ئەم سورەتەدا

ئەبو داود ڕیوایەتی کردووە لە موسای کوڕی ئەبو عائیشەوە وتی: پیاوێك نوێژی دەکرد لەسەر بانەکەی خۆی وەختێك ئەم ئایەتەی خوێند:﴿ أَلَيْسَ ذَٰلِكَ بِقَٰدِرٍ عَلَىٰٓ أَن يُحْـِۧىَ ٱلْمَوْتَىٰ﴾ وتی: سبحانك فبلى. پرسیاریان لێکرد لەوبارەیەوە وتی: بیستومە لە پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) وای فەرمووە[1] تەنها ئەبو داود ئەمە فەرموودەی هێناوە ناوی هاوەڵەکەی پێغەمبەر(ﷺ) نەهێنراوە، ئەو ناو نەهێنانە زیانی نییە.

## تەفسیری سورەتی (الانسان)

### لە مەککەدا هاتووەتەخوارەوە

### خوێندنی سورەتی (السجدة) و (الانسان) لە نوێژی بەیانیاندا لە ڕۆژی جومعەدا

لە پێشەوە باسکرا لە سحیحی موسلم دا لە ئیبنو عەباسەوە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە نوێژی بەیانیاندا لە ڕۆژی جومعەدا (الم ـ تنزيل) ی (السجدة) و (هل أتى على لالنسان) ی خوێندووە[2].

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿أَتَىٰ عَلَى ٱلْإِنسَٰنِ حِينٌ مِّنَ ٱلدَّهْرِ لَمْ يَكُن شَيْـًٔا مَّذْكُورًا ﴿١﴾ إِنَّا خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ مِن نُّطْفَةٍ أَمْشَاجٍ نَّبْتَلِيهِ فَجَعَلْنَٰهُ سَمِيعًۢا بَصِيرًا ﴿٢﴾ إِنَّا هَدَيْنَٰهُ ٱلسَّبِيلَ إِمَّا شَاكِرًا وَإِمَّا كَفُورًا ﴿٣﴾﴾

### خودای گەورە مرۆڤی وەدی هێنا دوای ئەوەی کە نەبوو

خودای گەورە باسی مرۆڤ دەکات کەوەدی هێناوە دوای ئەوەی کە ڕۆژگارێك بوو ئەو شتێك نەبوو باسی بکرێت لە لاوازیو نزمی خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿هَلْ أَتَىٰ عَلَى ٱلْإِنسَٰنِ حِينٌ مِّنَ ٱلدَّهْرِ لَمْ يَكُن شَيْـًٔا مَّذْكُورًا ﴾ بێگومان ماوەیەك لەم ڕۆژگارە بەسەر مرۆڤدا تێپەڕی و ئەو شتێك نەبوو باس بکرێت. پاشان ڕونی کردووەتەوە فەرموویەتی: ﴿إِنَّا خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ مِن نُّطْفَةٍ أَمْشَاجٍ نَّبْتَلِيهِ فَجَعَلْنَٰهُ سَمِيعًۢا بَصِيرًا﴾ ئێمە مرۆڤیمان لە تنۆکێکی وەدی هێنا تا تاقی بکەینەوە، گوێی بیستنو سۆمای دیتنیشمان پێدا. (أمشاج) ئاوێتە، (المشج والمشيج) شت ئاوێتە کردن بەناویەکدا. ئیبنوعەباس وتی: ﴿مِن نُّطْفَةٍ أَمْشَاجٍ ﴾ واتە: ئاوی پیاوو ئاوی ژن کاتێك کۆدەبنەوە و ئاوێتەدەبێت[3]. پاشان دەگۆڕێت لە بارێکەوە بۆ بارێکی ترو لە حاڵێکەوە بۆحاڵێکی ترو لە ڕەنگێکەوە بۆ ڕەنگێکی تر. عیکرمەو موجاهدو حسنو ڕەبیعی

---

[1] ئەبو داود (٥٤٩/١) فەرموودەیەکی سەحیحە

[2] مسلم (٩٩/٢).

[3] الطبرى (٨٩/٢٤).

کوڕی ئەنەسیش وتویانە: (الامشاج) ئاوێتە کردنی ئاوی پیاوە بە ئاوی ژن.[1] وە دەفەرمووێت: ﴿نَّبۡتَلِيهِ﴾ تاقی دەکەینەوە وەك فەرموویەتی: ﴿لِيَبۡلُوَكُمۡ أَيُّكُمۡ أَحۡسَنُ عَمَلٗا﴾[2] وە فەرموویەتی: ﴿فَجَعَلۡنَٰهُ سَمِيعَۢا بَصِيرًا﴾ گوێی‌و چاویشمان پێدا بۆ ئەوەی بە هۆی ئەو چاوو گوێ یەوە گوێڕایەڵی‌و بێ گوێڕایەڵی بکات.

**خودا ڕێگای نیشانداوە یان شوکرانە بژێرە یان پێ نەزان.**

خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِنَّا هَدَيۡنَٰهُ ٱلسَّبِيلَ إِمَّا شَاكِرٗا وَإِمَّا كَفُورًا﴾ خۆمان ڕێگەمان نیشاندا، جا یان شوکرانە بژێرە یان پێ نەزان. واتە: بۆمان ڕونکردووەتەوەو ئاشکرامان کردووە بۆی‌و نیشانمانداوە. وەك دەفەرمووێت: ﴿وَأَمَّا ثَمُودُ فَهَدَيۡنَٰهُمۡ فَٱسۡتَحَبُّواْ ٱلۡعَمَىٰ عَلَى ٱلۡهُدَىٰ﴾[3] واتە: وە هۆزی سەمودمان ڕێنمونی کرد بەڵام ئەوان زیاتر حەزیان لە کوێری کرد تا شارەزایی‌و ڕێنمونی. وە دەفەرمووێت: ﴿وَهَدَيۡنَٰهُ ٱلنَّجۡدَيۡنِ﴾[4] واتە: ڕێگەی چاکەو ڕێگەی خراپەمان نیشانداوە. ئەمەش قسەی عیکرمەو عەتیەو (عطية) ئیبنو زەیدو موجاهیدو کۆی زانایانە (الجمهور). وە خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿إِمَّا شَاكِرٗا وَإِمَّا كَفُورًا﴾ بڕیاری خودا لەوەدا یان شوکرانە بژێرو خۆشبەختە یان پێ نەزان‌و بەدبەختە. وەك لەو فەرموودەیەی کە موسلم ڕیوایەتی کردووە هاتووە لە ئەبو مالیکی ئەشعەریەوە (الاشعری) وتی: پێغەمبەری خودا فەرموویەتی: (هەموو مرۆڤ بەپەلە گیانی خۆی دەفرۆشێت یان خۆی لەنودەبات یان خۆی ئازاد دەکات)[5].

﴿إِنَّآ أَعۡتَدۡنَا لِلۡكَٰفِرِينَ سَلَٰسِلَاْ وَأَغۡلَٰلٗا وَسَعِيرًا ۝٤ إِنَّ ٱلۡأَبۡرَارَ يَشۡرَبُونَ مِن كَأۡسٖ كَانَ مِزَاجُهَا كَافُورًا ۝٥ عَيۡنٗا يَشۡرَبُ بِهَا عِبَادُ ٱللَّهِ يُفَجِّرُونَهَا تَفۡجِيرٗا ۝٦ يُوفُونَ بِٱلنَّذۡرِ وَيَخَافُونَ يَوۡمٗا كَانَ شَرُّهُۥ مُسۡتَطِيرٗا ۝٧ وَيُطۡعِمُونَ ٱلطَّعَامَ عَلَىٰ حُبِّهِۦ مِسۡكِينٗا وَيَتِيمٗا وَأَسِيرًا ۝٨ إِنَّمَا نُطۡعِمُكُمۡ لِوَجۡهِ ٱللَّهِ لَا نُرِيدُ مِنكُمۡ جَزَآءٗ وَلَا شُكُورًا ۝٩ إِنَّا نَخَافُ مِن رَّبِّنَا يَوۡمًا عَبُوسٗا قَمۡطَرِيرٗا ۝١٠ فَوَقَىٰهُمُ ٱللَّهُ شَرَّ ذَٰلِكَ ٱلۡيَوۡمِ وَلَقَّىٰهُمۡ نَضۡرَةٗ وَسُرُورٗا ۝١١ وَجَزَىٰهُم بِمَا صَبَرُواْ جَنَّةٗ وَحَرِيرٗا ۝١٢﴾

---

[1] الطبری (٢٤/٨٩/٩٠).

[2] الملك (٢).

[3] فصلت (١٧).

[4] البلد (١٠).

[5] مسلم (١/٢٠٣).

خودای گەورە دەفەرموویٽ: ﴿إِنَّآ أَعْتَدْنَا لِلْكَٰفِرِينَ سَلَٰسِلَاْ وَأَغْلَٰلًا وَسَعِيرًا﴾ ئێمە زنجیرو تۆقێکی گەلێك زۆرو ئاگری بڵێسەدارمان بۆ بێ دینەکان سازداوە.خودای گەورە بسی ئەو شتانە دەکات کە ئامادەی کردووە بۆ بەندە خراپەکانی لە زنجیرو تەوقو ئاگری بڵێسەدارئاگرێکە کە لەشی دەبرژێنێتو دەیسوتێنێت لەناو جەهەننەمەدا وەك دەفەرموویٽ: ﴿ إِذِ ٱلْأَغْلَٰلُ فِىٓ أَعْنَٰقِهِمْ وَٱلسَّلَٰسِلُ يُسْحَبُونَ ﴿٧١﴾ فِى ٱلْحَمِيمِ ثُمَّ فِى ٱلنَّارِ يُسْجَرُونَ ﴾[1]واتە: کاتێك باسی ئەو شتانەی کرد کە ئامادەی کردووە بۆ خودانەناسان ئاگری بڵێسەدار دوای ئەوە دەفەرموویٽ: ﴿ٱلْأَبْرَارَ يَشْرَبُونَ مِن كَأْسٍ كَانَ مِزَاجُهَا كَافُورًا﴾ ئاکارچاکان لە بادەیەك دەخۆنەوە، ئاوێتەکەی لەسەرچاوەی کافوورەوەیە. وە دیارو ئاشکرایە کە ئەو کافوورە چەند ساردو بۆنخۆشە وە ئەوشتە بەتامانەشی کە بۆی زاد دەکرێت لە بەهەشت دا. حسن وتی: ساردی کافوور لە ناو بۆنی زەنجەبیلدا (الزنجبيل) بۆیە فەرموویەتی: ﴿عَيْنًا يَشْرَبُ بِهَا عِبَادُ ٱللَّهِ يُفَجِّرُونَهَا تَفْجِيرًا﴾ کانییەکە عەبدانی خودا لەو دەنۆشن بە فیچقەش هەڵی دەقوڵێنن. واتە: ئەو شتەی کە ئاوێتە کراوە بۆ ئەو پیاوچاکانە لەو کافوورە ئەوە کانییەکە کە بەندە نزیکەکانی خودا لێی دەنۆشن.ئاوێتە نیەو سافە توێنێتی لێ دەشکێنن. بۆیە (يشرب) مانای (بووی) تێدیەو کردەوەیەتی بە موتەعەددیەوە وتەی ﴿عَيْنًا﴾ مەنسوب کراوە لەسەر تەمیز وە دەفەرموویٽ: ﴿يُفَجِّرُونَهَا تَفْجِيرًا﴾ واتە: دەیگێڕن تێیدا هەرکاتێك حەز بکەن بۆ هەر شوێنێك بیانەوێت لە کۆشكو تەلارەکانیانداو وە لە شوێنی دانیشتنو کۆبوونەوەیاندا (التفجير) واتە هەڵقوڵینی بەردەوامی. وەك خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿ وَقَالُوا۟ لَن نُّؤْمِنَ لَكَ حَتَّىٰ تَفْجُرَ لَنَا مِنَ ٱلْأَرْضِ يَنۢبُوعًا﴾[2] واتە: وتیان هەرگیز باوەڕت پێ ناهێنین هەتا لەم زەوی یەدا کانیاوێکمان بۆ هەڵنەقوڵێنیت. وە دەفەرموویٽ: ﴿وَفَجَّرْنَا خِلَٰلَهُمَا نَهَرًا﴾[3] واتە: وە لە نێوان ئەو دوو باخەدا کانیاوێکمان هەڵقوڵاندبوو (بۆ ئاوەدانیان) موجاهد وتی: ﴿يُفَجِّرُونَهَا تَفْجِيرًا﴾ واتە: دەیبەن بۆ هەر شوێنێك مەیلیان لێ بێت.[4] عیکرەمەو قەتادەش هەر وایان وتووە.[5] سەوری (الثوري) وتی: دەیگێڕن بە هەر شوێنێکدا حەزی لێ بکەن[1].

---

[1] غافر (٧٢– ٧٢).

[2] الاسراء (٩٠).

[3] كهف (٣٣).

[4] الطبري (٦٤/٢٤).

[5] الدر المنثور (٣٦٩/٨).

## کرداری ئەوانەی ئاکار چاکن

خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿يُوفُونَ بِٱلنَّذْرِ وَيَخَافُونَ يَوْمًا كَانَ شَرُّهُۥ مُسْتَطِيرًا﴾ هەرچی لە خۆ دەگرن (لە سەر خۆ پێویست دەکەن) دەیکەن، ترسیشیان لە ڕۆژێك هەیە کە بەڵاکەی بۆ گلا (گشت لا) دەتەنێتەوە. خودا پەرستی دەکەن بەو شێوەیەی کە خودا فەرمانیان پێ دەکات لە نوێژو ڕۆژو حەج عبادەتەکانی تر وە ئەو نەزرانەش کە لە سەری خۆیانی دادەنێن جێ بەجێی دەکەن. ئیمامی مالك وتی: لە تەلحەی (طلحة) کوڕی عبدالملکی ئەیلیەوە (الايلی) ئەویش لە قاسمی کوڕی مالکەوە قاسمیش لە عائیشەوە (ڕەزای خودای لێ بێت) کە پێغەمبەری خودا فەرموویەتی: کەسێك لە سەر خۆیی دانا (نەزری کرد) کە خودا پەرستیو گوێڕایەڵی خودا بکات با بیکات. وە کەسێك نەزری کرد کە بێ فەرمانی خودا بکات با بێ فەرمانیەکەی نەکات.[2] ئیمامی بوخاری لەو فەرموودەی مالیکەوە ڕیوایەتی کردووە.[3] واز دێنن لەو شتانەی کە خودا حەرامی کردووە لە ترسی ئەو ڕۆژەی کە بەڵاکەی هەموو لایەك دەگرێتەوە هیچ کەس ڕزگاری نابێت لێی دەبێت توش ببێت مەگەر کەسێك خودا ڕەحمی پێ بکاتو بەزەیی پێیدا بێتەوە. ئیبنو عەباس وتی: شەڕەکەی بڵاو دەبێتەوە، قەتادە وتی: بە هەموو لایەکدا دەڕوات سوێند بەخودا بەڵای ئەو ڕۆژە ئاسمانەکانو زەمین پڕ دەکات.[4] وە دەفەرمووێت: ﴿وَيُطْعِمُونَ ٱلطَّعَامَ عَلَىٰ حُبِّهِۦ مِسْكِينًا وَيَتِيمًا وَأَسِيرًا﴾ لەو خۆراکەی کە خۆیان حەزی لێدەکەن بە هەژارو بە هەتیوو بەدیلگیراوی دەبەخشن. گوتراوە لە بەر خاتری (خۆشەویستی) خودا دەبەخشن زەمیرەکەیان گەڕاندوەتەوە بۆ (الله) چونکە شێوازی ڕستەو ماناکەی ڕێکەو تەواوە. بەڵام گەڕانەوەی زەمیرەکە بۆ لای ﴿ٱلطَّعَامَ﴾ ڕون ترو ئاشکرا ترە واتە: ئەو خواردنەی کە خۆیان زۆر ئارەزوی دەکەنو حەزیان لێیەتی دەیبەخشن ئەمە قسەی موجاهدو موقاتلەو ئیبنو جەریریش هەر ئەم ڕایەی هەڵبژاردووە.[5] وەك خودا دەفەرمووێت: ﴿وَءَاتَى ٱلْمَالَ عَلَىٰ حُبِّهِۦ﴾ واتە: دارایی خۆی ببەخشێت لەگەڵ ئەوەی کە خۆشی دەوێت. وە دەفەرمووێت: ﴿لَن تَنَالُوا۟ ٱلْبِرَّ حَتَّىٰ تُنفِقُوا۟ مِمَّا تُحِبُّونَ﴾ واتە: ئێوە هەرگیز بەخێرو چاکە ناکەن (وە دەستگیرتان نابێت) تا بەختی نەکەن هەندێك لەو دارایی یەی کە خۆشتان دەوێت. لە فەرموودەی سەحیحدا هاتووە (چاکترین ماڵ بەخشین ئەو ماڵ بەخشینەیە کە تۆ لەش ساغ بیو

---

[1] الطبری (٩٥/٢٤).

[2] موطأ (٤٧٦/٢). فەرموودەیەکی سەحیحە

[3] فتح الباری (٥٨٩/١١).

[4] الطبری (٩٦/٢٤).

[5] الطبری (٩٦/٢٤).

هەوڵی وە دەست خستنی سامان بدەیو بە تەمای دەوڵەمەندی بێتو لە هەژاریش بترسێت)[1] واتە لەو وەختەی کە سامانت زۆر خۆش دەوێتو ئێجگار زۆر هەوڵی بۆ دەدەییو پێویستت پێیەتی. بۆیە خودا دەفەرموویێت: ﴿وَيُطْعِمُونَ الطَّعَامَ عَلَىٰ حُبِّهِ مِسْكِينًا وَيَتِيمًا وَأَسِيرًا﴾ هەتیوو هەژار لە پێشووە ڕون کرایەوە سیفەتەکانیسیان باس کران. بەڵام بەدیلگیراو سەعیدی کوڕی جوبەیرو حەسەن زەحاك وتیان مەبەست پێی ئەهلی قبیلەیە.[2] ئیبنو عەباس وتی: بەدیلی ئەوان لەو کاتەدا بت پەرستەکان بووە.[3] بەڵگەش دێنێتەوە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە ڕۆژی (بەدردا) فەرمانی دا بە هاوەڵەکانی کە ڕێزی دیلەکان بگرن. هاوەڵەکانی پێغەمبەر(ﷺ) خواردنیان دەدا بە دیلەکان پێش ئەوەی خۆیان بیخۆن. عیکرەمە وتی: مەبەست پێی کۆیلەکانە.[4] ئیبنو جەریر لەبەر گشتگیری ئایەتەکە وتی: موسڵمانو بت پەرستیش دەگرێتەوە.[5] سەعیدی کوڕی جوبەیرو عەتاو (عطاء) حەسەنو قەتادەیش هەر وایان وتووە. پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئامۆژگاری کردووە کە لەگەڵ دیلەکاندا بە چاکی ڕەفتار بکرێت چاکەیان لەگەڵ بکرێت. دواین شتێك کە وەسیەتی پێ دەکات دەفەرموویێت: (ئاگاداری نوێژو ئەو کەنیزانە بن کە لە ژێر دەستاندایە)[6] موجاهد وتی: واتە ئاگر پەرست (المجوس)[7] وە دەفەرموویێت: ﴿إِنَّمَا نُطْعِمُكُمْ لِوَجْهِ اللَّهِ لَا نُرِيدُ مِنكُمْ جَزَاءً وَلَا شُكُورًا﴾ (ئێمە هەر لە ڕاهی خودا) ئەم خۆراکەتان دەدەینێت نە پاداشتێکمان لێتان دەوێتو نە شوکرانەش. واتە: خۆراك دەدەن بەوانە کە خۆیان حەزی لێ دەکەن زۆر ئارەزویان لێیەتی بە زمانی حاڵ دەڵێن ﴿إِنَّمَا نُطْعِمُكُمْ لِوَجْهِ﴾ واتە: لەبەر خاترو ڕەزای خودا، ﴿لَا نُرِيدُ مِنكُمْ جَزَاءً وَلَا شُكُورًا﴾ واتە: هیچ پاداشتو شوکرانەبژێرێکمان ناوێت باسی بکەن لەلای خەڵکی. موجاهیدو سەعیدی کوڕی جوبەیر وتیان: ئەوسا سوێند بەخودا ئەمەیان بە زمانیان نەوتووە بەڵام خودای گەورە ئاگای لە دڵیان بووە وەسفیان دەکات لەسەر ئەو کارە چاکەیان بۆئەوەی ببێتە هاندەر بۆ ئەوکەسانەی کە حەز لەو کارە چاکانە دەکەن.[8] وە دەفەرموویێت: ﴿إِنَّا نَخَافُ مِن رَّبِّنَا يَوْمًا عَبُوسًا قَمْطَرِيرًا﴾ ئێمە ترسی پەروەرێنی خۆمان

---

[1] فتح الباري (٣/٣٣٤).

[2] الطبري (٢٤/٩٧).

[3] عبدالرزاق (٣/٣٣٧).

[4] القرطبي (١٩/١٢٩).

[5] الطبري (٢٤/٩٨).

[6] النسائي في الكبرى (٤/٢٥٨) فەرموودەیەکی سەحیحەو سەنەدەکانیشی سەحیحە.

[7] الطبري (٢٤/٩٨).

[8] الطبري (٢٤/٩٨).

هەيە لە ڕۆژێکدا کە زۆر توشو نەگبەتو پڕ مەترسی یە. واتە: ئێمە بۆیە ئەم کارە دەکەین بەڵکو خودا بەزەیی بێتەوە پێماندا بمانخاتە بەر سۆزو میهرەبانی خۆی لەو ڕۆژە ترسناکو توشو نەگبەتە. علی کوڕی ئەبو تەلحە (طلحة) لە ئیبنو عەباسەوە وتی: ڕۆژێکی توشو تەنگەلانو نگبەتو پڕ مەترسی دووررودرێژ.[1] عیکرەمەو کەسانی تریش وتویانە: ﴿يَوۡمًا عَبُوسًا قَمۡطَرِيرًا﴾ واتە: خودانەناس لەو ڕۆژەدا ناوچاوی دەچێتەیەك (چرچ دەبێت) لە نێوان هەردوو چاوی دا ئارەقێك دێتەخوار وەك چەسپ وایە.[2] موجاهد وتی: ﴿عَبُوسًا﴾ هەردوو لێو هەڵقرچاو ﴿قَمۡطَرِيرًا﴾ ناوچاو گرژو ڕەنگ گۆڕان. سەعیدی کوڕی جوبەیرو قەتادە وتیان: لە ترساندا ڕەنگ دەگۆڕێتو ناوچاو گرژ دەبێت بەینی هەردوو نێوچاوان دێتەوەیەك لەسامناکی ئەوڕۆژە. ئیبنوزەید وتی:(العبوس) واتە: شەڕ (قمطرير) واتە: گرانو نارەحەت.

**هەندێك بەدرێژی باسی ئاکار چاکان لە بەهەشتداو ئەو خۆش گوزەرانیەی کە لە بەهەشتدایە**

خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَوَقَىٰهُمُ ٱللَّهُ شَرَّ ذَٰلِكَ ٱلۡيَوۡمِ وَلَقَّىٰهُمۡ نَضۡرَةً وَسُرُورًا﴾ خودا لە بەڵای ئەو ڕۆژە پاراستنی توشی گەشەو خۆشی کردن. ئەمە لە بابی جیناس بەلیفە ﴿فَوَقَىٰهُمُ ٱللَّهُ شَرَّ ذَٰلِكَ ٱلۡيَوۡمِ﴾ واتە: پاراستنیلەوەی کە لێی دەترسان. ﴿وَلَقَّىٰهُمۡ نَضۡرَةً﴾ توشی ڕوگەشی و ﴿وَسُرُورًا﴾ دڵخۆش بوون ئەمە ڕای حەسەنی بەسریو قەتادەو ئەبو عالیەو ڕەبیعی کوڕی ئەنەسە.[3] ئەمە وەك ئەوە وایە کە خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿وُجُوهٞ يَوۡمَئِذٖ مُّسۡفِرَةٞ ﴿٣٨﴾ ضَاحِكَةٞ مُّسۡتَبۡشِرَةٞ﴾[4] واتە: زۆر ڕوخسار ەو ڕۆژەدا گەشو جوانن، دەم بە پێکەنینو شادومانن. چونکە وەختێك دڵخۆش بوو ڕوشی دەگەشێتەوە. کەعبی کوڕی مالك باسی کردووە لە فەرموودە درێژەکەیدا وتی: وەختێك پێغەمبەری خودا دڵی خۆش بووایە ڕووی پرشەی لێوە دەهات وەك پارچەیەك لە مانگ[5] وە عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێت) وتی: چوومە خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ) دڵی خۆش بوو دەموچاوی بریسکەی لێوە دەهات[6] وە خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَجَزَىٰهُم بِمَا صَبَرُواْ جَنَّةٗ وَحَرِيرٗا﴾ چونکە ئەوان خۆڕاگر بوون لە پاداشتدا بەهەشتو حەریری پێدان. واتە: بەهۆی ئارام گرتنیانەوە خودا بەهەشتی بۆ ئامادە کردنو پێی بەخشین. واتە

[1] الطبرى (٢٤/١٠٠).
[2] الطبرى (٢٤/٩٩).
[3] الطبرى (٢٤/١٠١).
[4] عبس (٣٨– ٣٩).
[5] فتح البارى (٦/٦٥٣).
[6] فتح البارى (٦/٦٥٣).

شوێنێکی زۆر فراوان‌و ژیانێکی زۆر خۆش‌و جل‌وبەرگی چاك‌و جوانی پێ بەخشین (ابن عەساكر) ڕیوایەتی کردووە لە ژیانی هیشامی کوڕی سلێمانی دارانی (الدرانی) وتی: سورەتی ﴿أَتَىٰ عَلَى ٱلْإِنسَٰنِ﴾ خوێندرایەوە بۆ ئەبو سلێمانی دارانی وەختێك قورئان خوێنەکە گەیشتە ئەو شوێنەی کە دەفەرمووێت: ﴿وَجَزَىٰهُم بِمَا صَبَرُواْ جَنَّةً وَحَرِيرًا﴾ وتی: چونکە خۆڕاگر بوون لەسەر وازهێنان لە ئارەزووەکانیان لە دونیادا.

﴿مُّتَّكِـِٔينَ فِيهَا عَلَى ٱلْأَرَآئِكِ لَا يَرَوْنَ فِيهَا شَمْسًا وَلَا زَمْهَرِيرًا ﴿١٣﴾ وَدَانِيَةً عَلَيْهِمْ ظِلَٰلُهَا وَذُلِّلَتْ قُطُوفُهَا تَذْلِيلًا ﴿١٤﴾ وَيُطَافُ عَلَيْهِم بِـَٔانِيَةٍ مِّن فِضَّةٍ وَأَكْوَابٍ كَانَتْ قَوَارِيرَا۠ ﴿١٥﴾ قَوَارِيرَاْ مِن فِضَّةٍ قَدَّرُوهَا تَقْدِيرًا ﴿١٦﴾ وَيُسْقَوْنَ فِيهَا كَأْسًا كَانَ مِزَاجُهَا زَنجَبِيلًا ﴿١٧﴾ عَيْنًا فِيهَا تُسَمَّىٰ سَلْسَبِيلًا ﴿١٨﴾ ۞ وَيَطُوفُ عَلَيْهِمْ وِلْدَٰنٌ مُّخَلَّدُونَ إِذَا رَأَيْتَهُمْ حَسِبْتَهُمْ لُؤْلُؤًا مَّنثُورًا ﴿١٩﴾ وَإِذَا رَأَيْتَ ثَمَّ رَأَيْتَ نَعِيمًا وَمُلْكًا كَبِيرًا ﴿٢٠﴾ عَٰلِيَهُمْ ثِيَابُ سُندُسٍ خُضْرٌ وَإِسْتَبْرَقٌ وَحُلُّوٓاْ أَسَاوِرَ مِن فِضَّةٍ وَسَقَىٰهُمْ رَبُّهُمْ شَرَابًا طَهُورًا ﴿٢١﴾ إِنَّ هَٰذَا كَانَ لَكُمْ جَزَآءً وَكَانَ سَعْيُكُم مَّشْكُورًا ﴿٢٢﴾﴾

### لەسەر قەنەفە دادەنیشن لە شوێنێکی فێنکدا (نە ساردەو نە گەرمە) لە بەهەشت دا

خودای گەورە باسی خەڵکی بەهەشتمان بۆ دەکات لەو خۆش گوزەرانیە بەردەوامەی کە تێیدان وە ئەم هەموو چاکە زۆرەی کە خودا لەگەڵی کردوون خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿مُّتَّكِـِٔينَ فِيهَا عَلَى ٱلْأَرَآئِكِ﴾ لە پێشەوە لە سورەتی (الصافات) دا لەو بارەیەوە قسەمان کردوو بۆچوونی جیاجیا باسکرا کە ئایا مەبەست بە (الاتکاء) پاکەوتنە یان چوارمشقیە یان شاندادانە یان دانیشتنە. وە ﴿ٱلْأَرَآئِكِ﴾ واتە: کورسی‌و قەنەفە لە شوێنی ئامادەکراوە خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿مُّتَّكِـِٔينَ فِيهَا عَلَى ٱلْأَرَآئِكِ لَا يَرَوْنَ فِيهَا شَمْسًا وَلَا زَمْهَرِيرًا﴾ لە بەهەشتدا لەسەر تەختدا پاڵ دەکەون‌و نە تینی خۆر دەبینن‌و نەسەرمایی. واتە: نە شوێنەکەیان گەرمە کە ناڕەحەت ببن‌و نە ساردیشە ئازاریان بدات بەڵکو یەك هەوایەو بەردەوام هەتا هەتایەو لێی دەرناچن.

### سێبەر بەسەریانەوەیەو میوە لەبەردەست

خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَدَانِيَةً عَلَيْهِمْ ظِلَٰلُهَا وَذُلِّلَتْ قُطُوفُهَا تَذْلِيلًا﴾ سێبەری درەختەکان بەسەریاندا شۆڕبوونەتەوەو میوەکەیان لەبەردەستە. واتە: لق‌و گەڵاکانی نزیکە لێیانەوەو کەی دەستی بۆ ببەن دێتە بەردەستیان کام لق‌و چڵەی کە زۆر بەرزە وەك فەرمان بەرێکی گوێگر وەك خودای

گەورە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿وَجَنَى ٱلْجَنَّتَيْنِ دَانٍ﴾[1] واتە: وە میوەلێکردنەوەی ئەو دوو باخە نزیکەدەستە. وە دەفەرمووێت: ﴿قُطُوفُهَا دَانِيَةٌ﴾ واتە: کە میوەی نزیکەدەستە. موجاهد وتی: ﴿وَذُلِّلَتْ قُطُوفُهَا تَذْلِيلًا﴾ واتە: هەرکاتێك هەڵسا ئەویش بەرز دەبێتەوە بە ئەندازەی ئەوکەسە وە هەرکاتێك دانیشت دێتەخوارەوە هەتا دەستی دەیگاتێ وە ئەگەر پاڵکەوت دێتە بەردەستی تا لێی بکاتەوە بە پاڵکەوتوویی بۆیە خودا دەفەرمووێت: ﴿تَذْلِيلًا﴾[2] قەتادە وتی: نە دوورەو نە دڕکی پێوەیە کە نەهێڵێت لێی بکەینەوە[3].

### دەفری زیوو چەندین پەرداخی جوان

خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَيُطَافُ عَلَيْهِم بِـَٔانِيَةٍ مِّن فِضَّةٍ وَأَكْوَابٍ كَانَتْ قَوَارِيرَا۠﴾ بە دەفری زیوو چەندین پەرداخی جوانەوە بەسەریانەوە دەگەڕێن ﴿قَوَارِيرَا۟ مِن فِضَّةٍ قَدَّرُوهَا تَقْدِيرًا﴾ شوشە لە زیو بەئەندزەی پێویست ئامادە کراون. واتە: خزمەتکار بەسەریانەوە دەگەڕێن بە دەفری (قاپو قاچاغی) خواردنو خواردنەوەوە کە لە زیوو چەندین پەردخی خوانەوە نەلارەو نە بە لێویش بەرزبووەتەوە. خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿قَوَارِيرَا۠﴾. ﴿قَوَارِيرَا۟ مِن فِضَّةٍ﴾ (قوارير) ی یەکەم مەنسوبە چونکە خەبەری (کان) یە. واتە: ﴿كَانَتْ قَوَارِيرَا۠﴾ دووهەم مەنسوبە یان لەسەر بەدەلیە یان لەسەر تەمیز چونکە ڕونی کردووەتەوە وەك دەفەرمووێت: ﴿قَوَارِيرَا۟ مِن فِضَّةٍ﴾ ئیبنو عەباسو موجاهدو حەسەنی بەسریو کەسانی تریش وتوویانە: سپیەتی زیو لەناو شوشەی پاکو ڕوندا[4] (قوارير) ش نابێت مەگین لە شوشەدا نەبێت وە ئەم پەرداخانە کە زیون لەگەڵ ئەوەشدا ئەوەندە ناسکو تەنکە ئەو شتەی لەناویدایە لە پشتیەوە دەبینرێت کە ئەمەش لە دونیادا وێنەی نیە. وە دەفەرمووێت: ﴿قَدَّرُوهَا تَقْدِيرًا﴾ واتە: لەسەر بڕیاری پەروەرندەیان بێ کەمو زیاد بەڵکو ئەو شتە ئامادەکراوە بۆئەوە بە پێی تێنو شکاندنی خاوەنەکەی. ئەمە مانای قسەکەی ئیبنو عەباسو موجاهدو سەعیدی کوڕی جوبەیرو ئەبو سالحو (صالح) قەتادەو

---

[1] الرحمان (٥٤).

[2] الطبری (١٠٣/٢٤).

[3] الطبری (١٠٣/٢٤).

[4] الطبری (١٠٦/١٠٥/٢٤).

ئیبنو ئەبزی (أبزی) عبدالله ی کوڕی عوبەیدی (عبید) کوڕی عومەیرو (عمیر) شەعبی‌و (شعبی) ئیبنو زەیدو ئیبنو جەریرو کەسانی تریش وتوویانە[1] ئەمە نیهایەتی حورمەت‌و ڕێزلێنانە.

**بادەی (عارەق) زەنجەبیل‌و سەلسەبیل (الزنجبیل والسلسبیل)**

خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَيُسْقَوْنَ فِيهَا كَأْسًا كَانَ مِزَاجُهَا زَنجَبِيلًا﴾ بەو پەرداخانە بادەییکان پێ دەنۆشن، ئاوێتەکەی زەنجەبیلە. واتە: ئاکارچاکان دووبارە لەو پەرداخانە دەینۆشن ﴿كَأْسًا﴾ بادەیەك، ﴿كَانَ مِزَاجُهَا زَنجَبِيلًا﴾ واتە: جارێك بادەو کافووری سارد ئاوێتە دەکرێت بۆیان. جارێکی تر بادەکە ئاوێتە دەکرێت بە زەنجەفیل (الزنجبیل) کە گەرمە. بۆئەوەی هەست بە خۆشی خواردنەوەکان بکەن. بەلأم نزیکەکان ئەوانە لە هەردووکیان دەنۆشن بە ئاوێتەیی‌و بەبێ ئاوێتەکردن. وەك قەتادەو کەسانی تریش وتوویانە.[2] خودای گەورە لە پێشەوە فەرمووی: ﴿عَيْنًا يَشْرَبُ بِهَا عِبَادُ اللَّهِ﴾ وە لێرەدا فەرموویەتی: ﴿عَيْنًا فِيهَا تُسَمَّىٰ سَلْسَبِيلًا﴾ کانییەکە بەناویدا ڕەوان دەبێت ناونراوە بە سەلسەبیل. واتە: زەنجەفیل (الزنجبیل) کانیەکە (سەرچاوەیەکە) لە بەهەشتدا پێی دەوترێت سەلسەبیل. عیکرمە وتی: ناوی سەرچاوەیەکە لە بەهەشتدا. موجاهد وتی: بۆیە ناونراوە سەلسەبیل چونکە ڕەوان‌و زۆر تیژە. واتە: بەپەلە دەڕوات[3].

**لاوان‌و خزمەتکار**

خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَيَطُوفُ عَلَيْهِمْ وِلْدَانٌ مُّخَلَّدُونَ إِذَا رَأَيْتَهُمْ حَسِبْتَهُمْ لُؤْلُؤًا مَّنثُورًا﴾ لاوانێك (کە هەر بەلاوی دەمێننەوە) بە سەریانەوە دەگەڕێن ئەگەر بیانبینیت وادەزانیت مرواری پرژێندراون. واتە: لاوانی بەهەشت دەگەڕێن بەسەر خەڵکی بەهەشتدا خزمەتیان دەکەن ﴿مُّخَلَّدُونَ﴾ هەر بەلاوی دەمێننەوە لە یەك تەمەندان زیاد ناکەن‌و ناگۆڕێن. ئەو کەس مانای وادەکات کە ئەوانە ئەڵقە لە گوێن. واتە: (ئەوەندە گوێگرن) بۆیە ئا بەو شێوەیە هێناوێتی. چونکە ئەو سیفەتە هەر شایەنی لاوە بۆ بەساڵاچوو ناشێت. وە خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿إِذَا رَأَيْتَهُمْ حَسِبْتَهُمْ لُؤْلُؤًا مَّنثُورًا﴾ واتە: ئەگەر چاوت پێیان بکەوێت کاتێك بڵاودەبنەوە بۆ جێبەجێکردنی پێویستی سەرۆکەکانیان‌و بە ژمارەیەکی زۆر بەنێو چاوانی جوان‌و شێوازی چاکی خۆیان‌و ڕەنگی جل‌وبەرگیان‌و ئەو خشڵانەی پێیانەوە وادەزانی کە مروارین پرژو بڵاوبوونەتەوە تەشبیهی لەمە جوانتر نیە وە هیچ وێنەیەك نیە جوانتر بێت لە مرواری

[1] الطبری (٢٤/١٠٦/١٠٧)، القرطبی (١٩/١٤١).

[2] الطبری (٢٤/١٠٧).

[3] الطبری (٢٤/١٠٨).

پڕشرژێندراو لە شوێنی چاکدا. خودای گەورە دەفەرموویێت: ﴿وَإِذَا رَأَيْتَ ثَمَّ رَأَيْتَ نَعِيمًا وَمُلْكًا كَبِيرًا﴾ گەورە دەبییتو، هەر خێرو خۆشی دەبینیتو قەڵەمڕەوێکی زۆر گوشاد. ﴿وَإِذَارَأَيْتَ﴾ واتە: وەختێك دەبینیت ئەی محمد (ﷺ) ﴿ثَمَّ﴾ واتە: لەوێ لەناو بەهەشتدا لەو هەموو خۆشیەی کە تێیدایەو وە چەند فراوانو بەرزو دڵکراوەیە تێیدا. ﴿رَأَيْتَ نَعِيمًا وَمُلْكًا كَبِيرًا﴾ واتە: دەسەلاتی خودا لەوێ زۆر گەورەیەو قەڵمڕەوێکی زۆر فراوان.لە فەرموودەی سەحیحدا هاتووە کە خودای گەورە دەفەرموویێت بە دواییترین خەڵکی ئەو ئاگر کە دێنەدەرەوە تێیدا وە دواترین خەڵکی بەهەشت کە دەچنە ناو بەهەشت بەئەندازەی دونیاو دە ئەوەندەی تری دونیا بۆ تۆ.[1] گەر ئەمە بەخششی خودا بێت بۆ کەسێك کە نزمترین پلەی هەبێت لە بەهەشتدا ئەی ڕات چۆنە کە بەرزترین پلەو گەورەترین پلەی هەبێت لەلای خودای گەورە؟

## جلوبەرگو خشڵو زێڕ

خودای گەورە دەفەرموویێت: ﴿عَٰلِيَهُمْ ثِيَابُ سُندُسٍ خُضْرٌ وَإِسْتَبْرَقٌ وَحُلُّوٓا۟ أَسَاوِرَ مِن فِضَّةٍ وَسَقَىٰهُمْ رَبُّهُمْ شَرَابًا طَهُورًا﴾ لەبەریاندایە بەرگی نەرمونۆڵی سەوزکارو پۆشاکی ئاوریشمین وە ڕازێنراوەتەوە بە بازنی زیوو وە پەروەردگاریان شەرابی پاكو تەمیزی پێ نۆشان. واتە: جلوبەرگی خەڵکی بەهەشت ئاوریشمی هەمەڕەنگە لەوانە سوندس کە چاکترین جۆری ئاوریشمە وەك کراسو پۆشاکی سەوزی درەوشاوە کە لەبەری دەکەن بەسەر کراسدا وەك چۆن ئێستا خەڵکی پۆشاك لەبەردەکەن. ﴿وَحُلُّوٓا۟ أَسَاوِرَ مِن فِضَّةٍ﴾ موچیشیان پڕە لە چاکترین زیوی جوان ئەمە تایبەتمەندیەکانی ئاکارَ چاکان بوو، بەلام نزیکەکان (المقربون) وەك خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿يُحَلَّوْنَ فِيهَا مِنْ أَسَاوِرَ مِن ذَهَبٍ وَلُؤْلُؤًا وَلِبَاسُهُمْ فِيهَا حَرِيرٌ﴾[2] واتە: لەوێدا بە بازنی ئاڵتونو مرواری دەڕازێندرێنەوەو پۆشاکیشیان تێیدا ئاوریشمە. کاتێك خودای گەورە باسی ڕزاندنەوەو جوانی دەرەوەی کرد بە ئاوریشمو زێڕی چاكو جوان دوای ئەوە دەفەرموویێت: ﴿وَسَقَىٰهُمْ رَبُّهُمْ شَرَابًا طَهُورًا﴾ واتە: بادەی پاکیان پێ دەنۆشێت دیوی ناوەوەیان پاکیان دەکاتەوە لە ڕقوکینەو ئیرەییو ئێشوئازارو هەموو خورەوشتێکی خراپ. وەك ڕیوایەت کراوە لە گەورەی موسڵمانانەوە علی کوڕی ئەبو تالب (ڕەزای خودای لێ بێت) کە فەرمووی: وەختێك خەڵکی بەهەشت گەیشتنە بەر دەرگای بەهەشت لەوێدا ڕێیان دەکەێت لە دوو سەرچاوە

---

[1] مسلم (١٧٣/١).

[2] فاطر (٣٣).

(كانی) وەك ئەوەی پێیان وترابێت لە سەرچاوەكەیان خواردەوە خودای گەورە هەرچی ئێش و ئازاری ناو سكیانە لای دەبات و نامێنێت پاشان خۆیان شۆرد لە سەرچاوەكەی تر هەست بەگەشەو خۆشی دەكەن، خودای گەورە باسی دەرون جوانی و خۆشی ژیانیان دەكات[1] دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ هَٰذَا كَانَ لَكُمْ جَزَآءً وَكَانَ سَعْيُكُم مَّشْكُورًا﴾ ئەمە پاداشتی ئێوەیەو تەقالاتان شایەنی ڕەزامەندیە. واتە: ئەمەیان پێ دەوترێت بۆ ڕێز لێنان و چاكە كردن لەگەڵیان. وەك خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿كُلُوا۟ وَٱشْرَبُوا۟ هَنِيٓـًٔا بِمَآ أَسْلَفْتُمْ فِى ٱلْأَيَّامِ ٱلْخَالِيَةِ﴾[2] واتە: (پێیان دەوترێت) بخۆن و بخۆنەوە نۆشتان بێت بەهۆی ئەو چاكانەوە كە لە ڕۆژانی ڕابوردوودا كردووتانە. وە دوفەرمووێت: ﴿وَنُودُوٓا۟ أَن تِلْكُمُ ٱلْجَنَّةُ أُورِثْتُمُوهَا بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾[3] واتە: وە بانگیان لێ دەكرێت ئەو بەهەشتەی پێتان دراوە پاداشتی كارێكە كەوا كردووتانە. وە دەفەرمووێت: ﴿وَكَانَ سَعْيُكُم مَّشْكُورًا﴾ واتە: خودای گەورە پاداشتی دانەوە لەسەر چاكەی كەم بە پاداشتی گەورە.

﴿إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا عَلَيْكَ ٱلْقُرْءَانَ تَنزِيلًا ﴿٢٣﴾ فَٱصْبِرْ لِحُكْمِ رَبِّكَ وَلَا تُطِعْ مِنْهُمْ ءَاثِمًا أَوْ كَفُورًا ﴿٢٤﴾ وَٱذْكُرِ ٱسْمَ رَبِّكَ بُكْرَةً وَأَصِيلًا ﴿٢٥﴾ وَمِنَ ٱلَّيْلِ فَٱسْجُدْ لَهُۥ وَسَبِّحْهُ لَيْلًا طَوِيلًا ﴿٢٦﴾ إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ يُحِبُّونَ ٱلْعَاجِلَةَ وَيَذَرُونَ وَرَآءَهُمْ يَوْمًا ثَقِيلًا ﴿٢٧﴾ نَّحْنُ خَلَقْنَٰهُمْ وَشَدَدْنَآ أَسْرَهُمْ ۖ وَإِذَا شِئْنَا بَدَّلْنَآ أَمْثَٰلَهُمْ تَبْدِيلًا ﴿٢٨﴾ إِنَّ هَٰذِهِۦ تَذْكِرَةٌ ۖ فَمَن شَآءَ ٱتَّخَذَ إِلَىٰ رَبِّهِۦ سَبِيلًا ﴿٢٩﴾ وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴿٣٠﴾ يُدْخِلُ مَن يَشَآءُ فِى رَحْمَتِهِۦ ۚ وَٱلظَّٰلِمِينَ أَعَدَّ لَهُمْ عَذَابًا أَلِيمًۢا ﴿٣١﴾﴾.

**باسی ناردنەخوارەوەی قورئان و فەرمان كردن بە ئارامگرتن و یادی خودا كردن**

خودای مەزن منەت دەكات بەسەر پێغەمبەرەكەیدا (ﷺ) بەو قورئانە گەورەو پیرۆزەی كە بۆی ڕەوانە كردووە دەفەرمووێت: ﴿إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا عَلَيْكَ ٱلْقُرْءَانَ تَنزِيلًا﴾ ئێمە ئەم قورئانەمان وردە وردەو بەش بەش بۆ تۆ ناردووە. وە دەفەرمووێت: ﴿فَٱصْبِرْ لِحُكْمِ رَبِّكَ وَلَا تُطِعْ مِنْهُمْ ءَاثِمًا أَوْ كَفُورًا﴾ سا خۆت بگرە بۆ فەرمانی پەروەرندەت، هەرگیز گوێ لەوانە مەگرە تاوانبار یان پێ نەزان. واتە: چۆن خودا ڕێزی لێتگرتن بەوەی كە قورئانی بۆ ناردی خۆڕاگربە لەسەر قەزاو قەدەری. وە بزانە كە خودا كارەكانت

---

[1] القرطبي (٩/٤٧).

[2] الحاقة (٢٤).

[3] الاعراف (٤٣).

بەمزوانە بەچاکی بۆ جێ بەجێ دەکات. ﴿وَلَا تُطِعۡ مِنۡهُمۡ ءَاثِمًا أَوۡ كَفُورًا ﴾ واتە: بە گوێی خودانەناس‌و دووڕووەکان مەکە کە گەرەکیان بوو ببنە لەمپەر لەبەر ئەو قورئانەی بۆت دێت، بەڵکو بەردەوامبە لەسەر گەیاندنی ئەو قورئانەی کە لەلایەن پەروەرندەتەوە بۆت دێت وە پشت بە خودا ببەستە بێگومان خودا دەتپارێزێت لە خەڵکی. (الاثم) تاوانبار. واتە: لەدین لادەر بەکردار. (الكفور) پێ نەزان واتە: ئەوەی کە بە دڵ بێ دینە. وە دەفەرموێت: ﴿وَٱذۡكُرِ ٱسۡمَ رَبِّكَ بُكۡرَةٗ وَأَصِيلٗا ﴾ هەر ناوی پەروەرندەی خۆت بەیاد بکە، هەموو بەرەبەیان‌و ئێوارانیش. واتە: یادی خودای خۆت بکە لە ئەوەلی ڕۆژەوەو لە کۆتاییەکەشیدا. ﴿وَمِنَ ٱلَّيۡلِ فَٱسۡجُدۡ لَهُۥ وَسَبِّحۡهُ لَيۡلٗا طَوِيلًا﴾ بەشەویش سەجدەی بۆ بەرەو بە درێژایی شەوگاریشدا هەر پەسەندی پاکی ئەو بدە. ئەم ئایەتە وایە کە دەفەرموێت: ﴿ وَمِنَ ٱلَّيۡلِ فَتَهَجَّدۡ بِهِۦ نَافِلَةٗ لَّكَ عَسَىٰٓ أَن يَبۡعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامٗا مَّحۡمُودٗا ﴾[1] واتە: (وە ئەی محمد - ﷺ -) لە بەشێکی شەوەدا هەستە شەونوێژ بکە بە قورئان خوێندن تیایدا ئەوە زیادە نوێژی تایبەت بە تۆیە ئومێد وایە پەروەردگارت بتگەیەنێتە پلەو جێگایەکە پەسندکراو. وەك ئەم ئایەتەش وایە کە دەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمُزَّمِّلُ ﴿١﴾ قُمِ ٱلَّيۡلَ إِلَّا قَلِيلٗا ﴿٢﴾ نِّصۡفَهُۥٓ أَوِ ٱنقُصۡ مِنۡهُ قَلِيلًا ﴿٣﴾ أَوۡ زِدۡ عَلَيۡهِ وَرَتِّلِ ٱلۡقُرۡءَانَ تَرۡتِيلًا﴾.[2] واتە: ئەی ئەوکەسەی خۆت داپۆشیوە، شەو هەستە (شەونوێژ بکە) مەگەر کەمێکی نەبێت، نیوەی یان کەمێك لە نیوەی کەم بکەرەوە، یانە کەمێك لێی زیاد بکە وە دەوری قورئان بکەرەوە بە لەسەرخۆیی (بەڕێك و پێکی).

**باسی خرا پی خۆشەویستی دونیاو ئاگادارکردنەوە لە ڕۆژی زیندوبوونەوە**

پاشان خودای گەورە نارەزایی‌و بێزاری دەردەبڕێت بەرامبەر خودانەناسان‌و ئەوکەسانەی وەك ئەوانن کە ڕۆژی دوییان پشت گوێ خستەوەو ڕویان کردووەتە دونیاو ئەوەندە خۆشەویست بووە لەبەرچاویان هەموو شتێکیان لەبیر نەماوە ئارەزوی دونیا نەبێت دەفەرموێت: ﴿ إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ يُحِبُّونَ ٱلۡعَاجِلَةَ وَيَذَرُونَ وَرَآءَهُمۡ يَوۡمٗا ثَقِيلٗا﴾ ئەوان هەر حەزیان لە دونیای بێ بەقایەو ڕۆژێکی گران دەخەنە پاش خۆیانەوە واتە ڕۆژی قیامەت. پاشان دەفەرموێت: ﴿نَّحۡنُ خَلَقۡنَٰهُمۡ وَشَدَدۡنَآ أَسۡرَهُمۡۖ وَإِذَا شِئۡنَا بَدَّلۡنَآ أَمۡثَٰلَهُمۡ تَبۡدِيلًا﴾ ئێمە وەدیمان هێناون‌و هەموو ئازای بەدەنیانماندا پێچاون هەر کاتێکیش حەز بکەین بە چینێکی وەك ئەوانیان دەگۆڕین. واتە: هەرکاتێك بمانەوێت لە ڕۆژی قیامەتدا زیندوویان

---

[1] الاسراء (٧٩).

[2] المزمل (١- ٤).

دەکەینەوە دەیان گۆڕین بە شێوەیەکی تر وەدییان دەهێنینەوە. ئەم دروست کردنەی یەکەم جارە نیشانەیە لەسە وەدی هێنانەوەیان جارێکی تر ﴿وَشَدَدْنَآ أَسْرَهُمْ﴾ ئیبنو عەباسو موجاهدو کەسانی تریش وتوویانە: واتە دروستی کردوونو توند بەستوونی بەیەکەوە.[1] ئیبنو زەیدو جەریرو وتوویانە لەم ئایەتەدا ﴿وَإِذَا شِئْنَا بَدَّلْنَآ أَمْثَـٰلَهُمْ تَبْدِيلًا﴾ واتە: گەر مەیلمان لێ بووایە خەڵکی ترمان دەهێنا غەیری ئەوان.[2] وەك خودا دەفەرموویت: ﴿إِن يَشَأْ يُذْهِبْكُمْ أَيُّهَا ٱلنَّاسُ وَيَأْتِ بِـَٔاخَرِينَ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ ذَٰلِكَ قَدِيرًا﴾[3] واتە: ئەگەر خودا بیەوێت ناتانهێڵێت ئەی خەڵکینە وە دەستەیەکی تر دەهێنێت وە خودا هەردەم بەسەر ئەوەدا بەتوانایە. وە دەفەرموێت: ﴿إِن يَشَأْ يُذْهِبْكُمْ وَيَأْتِ بِخَلْقٍ جَدِيدٍ ﴿١٦﴾ وَمَا ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ بِعَزِيزٍ﴾[4] واتە: ئەگەر (خودا) بیەوێت لەناوتان دەبات وە خەڵکی تازە دێنێت، وە ئەمەش بۆ خودا کارێکی گران نیە.

**قورئان وبیرهێنەرەوەیەو ڕێ نیشاندەرە بە یارمەتی خودا**

پاشان خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ هَـٰذِهِۦ تَذْكِرَةٌ ۖ فَمَن شَآءَ ٱتَّخَذَ إِلَىٰ رَبِّهِۦ سَبِيلًا﴾ ئەمانە وەبیرهێنەرێکن هەرکێ حەز بکات ڕێگە بەرەو پەروەرندەی بەدی دەکات. واتە: ئەم سورەتە وەبیرهێنەرە ﴿فَمَن شَآءَ ٱتَّخَذَ إِلَىٰ رَبِّهِۦ سَبِيلًا﴾ ڕێگەو شوێن وەدی دەکات. واتە: کەسێك حەزبکات شارەزا دەبێت بە قورئان وەك دەفەرموویت: ﴿وَمَاذَا عَلَيْهِمْ لَوْ ءَامَنُوا۟ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ﴾[5] واتە: وە ئەوانە چ زیانێکیان دەکەیتە سەر؟ ئەگەر باوەڕیان بهێنایە بەخودا وە بەڕۆژی دوایی. پاشان خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمًا﴾ حەزکردنیش بە ئارەزوی ئێوە نیە، جا مەگین خودا حەز بکات، زانای کارزان هەر خۆیەتی. واتە: هیچ کەسێك ناتوانێت خۆی شارەزا بکاتو باوەڕ بێنێتو سود بەخۆی بگەیەنێت. ﴿إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمًا﴾ خۆی زانایە بەوکەسەی کە شایەنی ڕێ پێشاندانە بۆی ئاسان دەکاتو هۆیەکانی بۆ فەراهەم دێنێت، وەکێش شایەنی سەرلێ شێوانە لەڕێگا دەیترازێنێتو لای دەدات لە ڕێگای ڕاست، کارزانو کاربەجێ هەر

[1] الطبری (١١٨/٢٤).
[2] الطبری (١١٩/١١٨//٢٤).
[3] النساء (١٣٣).
[4] فاطر (١٦– ١٧).
[5] النساء (٣٩).

خۆیەتی بۆیە خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمًا﴾ پاشن فەرموویەتی: ﴿يُدْخِلُ مَن يَشَآءُ فِى رَحْمَتِهِۦ ۚ وَٱلظَّـٰلِمِينَ أَعَدَّ لَهُمْ عَذَابًا أَلِيمًۢا﴾ هەرکێ حەز بکات وەبەر بەزەیی خۆی دەخات، وە بۆ ئەوانەش ناحەقن سزای بەژانی سازداوە. واتە: هەر کێ مەیلی لێ بێت شارەزای دەکاتو وە هەر کێش مەیلی لێ بێت سەری لێ دەشێوێنێت، هەرکەسێکیش ئەو رێی نیشاندا کەس ناتوانێت سەری لێ بشێوێنێت، وە هەرکەسێکیش ئەو سەری لێ بشێوێنێت کەس ناتوانێت رێگای نیشان بدات.

## تەفسیری سورەتی (المرسلات)

## لە مەککەدا هاتوەتەخوارەوە

### هاتنەخوارەوەی ئەم سورەتەو خوێندنی لە نوێژی مەغریب دا

بوخاری ریوایەتی کردووە لە عبدالله ی کوڕی مەسعودەوە وتی: وەختێك ئێمە لە خزمەتی پێغەمبەردا بووین (ﷺ) لە ئەشکەوتێکدا لە مینا لەوکاتەدا سورەتی(المرسلات) هاتەخوارەوە پێغەمبەر(ﷺ) دەیخوێندەوە منیش گوێم لێ دەگرت هەر دەمی بە قورئانەکەوە بوو دەیخوێند لەوکاتەدا مارێکمان لێ پەیدا بوو پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (ئەو مارە بکوژن) پەلامارماندا‌و رۆیشت، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (رزگاری بوو لە شەڕتان وەك چۆن ئێوە رزگارتان بوو لە شەڕی)[1] موسلم هێناویەتی لە رێگای ئەعمەشەوە (الاعمش)[2] ئیمامی ئەحمەد ریوایەتی کردووە لە ئیبنو عەباسەوە ئەویش لە دایکیەوە کە بیستویەتی لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) لە نوێژی مەغریبدا (المرسلات) ی دەخوێند.[3] مالك ریوایەتی کردووە لە ئیبنو عەباسەوە کە ئومول فەزل (أم الفضل) گوێی لێ بوو ئیبنو عەباس (المرسلات) ی دەخوێند وتی: ئەی کوڕی خۆم بە خوێندنی ئەم سورەتە یادت خستمەوە ئەمە دوایین سورەت بوو کە بیستم لە پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) لەنوێژی مەغریب دا دەیخوێند[4] لە هەردووسەحیحەکەدا هاتووە لە رێگای مالکەوە بەم شێوەیە[5].

﴿وَٱلْمُرْسَلَـٰتِ عُرْفًا ﴿١﴾ فَٱلْعَـٰصِفَـٰتِ عَصْفًا ﴿٢﴾ وَٱلنَّـٰشِرَٰتِ نَشْرًا ﴿٣﴾ فَٱلْفَـٰرِقَـٰتِ فَرْقًا ﴿٤﴾ فَٱلْمُلْقِيَـٰتِ ذِكْرًا ﴿٥﴾ عُذْرًا أَوْ نُذْرًا ﴿٦﴾ إِنَّمَا تُوعَدُونَ لَوَٰقِعٌ ﴿٧﴾ فَإِذَا ٱلنُّجُومُ طُمِسَتْ ﴿٨﴾ وَإِذَا ٱلسَّمَآءُ فُرِجَتْ ﴿٩﴾ وَإِذَا ٱلْجِبَالُ نُسِفَتْ ﴿١٠﴾ وَإِذَا ٱلرُّسُلُ أُقِّتَتْ ﴿١١﴾ لِأَىِّ يَوْمٍ أُجِّلَتْ ﴿١٢﴾ لِيَوْمِ ٱلْفَصْلِ ﴿١٣﴾ وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا يَوْمُ ٱلْفَصْلِ ﴿١٤﴾ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴿١٥﴾﴾

---

[1] فتح الباری (٤/٤٢).

[2] مسلم (٤/١٧٥٥).

[3] احمد (٦/٣٣٨). فەرمودەیەکی سەحیحە لەسەر مەرجی بوخاری و موسلم.

[4] موطأ (١/٧٨) فەرمودەیەکی سەحیحە.

[5] فتح الباری (٢/٢٨٧)، مسلم (١/٣٣٨).

## سوێند خواردنی خودا بە هەندێك لە دروستكراوەكانی لەسەر هاتنی ڕۆژی قیامەت

خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَٱلْمُرْسَلَٰتِ عُرْفًا﴾ سوێند بەوانەی (یەك لە دوای یەك) ناردراون. ئیبنو ئەبی حاتم لە ئەبو هورەیرەوە وتی: ﴿وَٱلْمُرْسَلَٰتِ عُرْفًا﴾ واتە: فریشتەكان. ڕیوایەت كراوە لە مەسروق‌و (مسروق) ئەبو زوحاو (الضحی) موجاهد لە یەكێك لە ڕیواتەكانیداو سودیو ڕەبیعی كوڕی ئەنەس هەر بەم شێوە. ڕیوایەت كراوە لە ئەبو سالحەوە (صالح) كە (والعاصفات والناشرات والفارقات والملقیات) مەبەست پێیان فریشتەكانە. سەوری (الثوری) وتی لە سەلەمەی (سلمة) كوڕی كەهیلەوە (كهیل) ئەویش لە موسلمی كوڕی بەتینەوە (بطین) موسلمیش لە ئەبیل عەبیدینەوە (أبی العبیدین) وتی: پرسیارم كرد لە ئیبنو مەسعود لە ﴿وَٱلْمُرْسَلَٰتِ عُرْفًا﴾ وتی: هەوا (با) وە هەر بەوشێوەیەش وتویانە لە ﴿فَٱلْعَٰصِفَٰتِ عَصْفًا ۝٢ وَٱلنَّٰشِرَٰتِ نَشْرًا﴾ واتە: هەوا.[1] ئیبنو عەباس‌و قەتادەش هەر وایان وتووە.[2] ئیبنو جەریر جیای كردووەتەوە وتوویەتی: ﴿فَٱلْعَٰصِفَٰتِ عَصْفًا﴾ واتە: هەوا وەك ئیبنو مەسعودو ئەوانەی لەسەر ڕای ئەون وتوویانە. وە لەسەر ﴿وَٱلنَّٰشِرَٰتِ نَشْرًا ﴾ وەستاوەو وتوویەتی: ئاخۆ فریشتەیە یان هەوایە (بایە) وەك لە پێشەوە باسكرا. وە لە ئەبو سالحەوە (صالح) وتی: ﴿وَٱلنَّٰشِرَٰتِ نَشْرًا﴾ واتە: باران. زاهیرەكەی (الظهر) ئەوەیە كە خودا فەرموویەتی: ﴿ٱلرِّيَٰحَ لَوَٰقِحَ﴾[3] واتە: وە بامان ناردووە (بەهۆی) پیتێزان (بۆ دارو درەخت‌و ڕوەك). وە دەفەرمووێت: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِى يُرْسِلُ ٱلرِّيَٰحَ بُشْرًۢا بَيْنَ يَدَىْ رَحْمَتِهِۦ﴾[4] واتە: وە ئەو (خودایە) زاتێكە بایەكان دەنێرێت بە موژدەدەریش پێش (بارانی) ڕەحمەتی پەروەردگار. وە هەر بەوشێوەیە (العاصفات) واتە: هەوا (با) وتراوە (عصفت الریاح) وەختێك هەڵكات‌و دەنگی لێوە بێت، هەروەها (الناشرات) ئەو بایەی كە هەور بڵاو دەكاتەوە لە كەنارەكانی ئاسماندت چۆن خودای گەورە مەیلی لیّ بێت. وە فەرموویەتی: ﴿فَٱلْعَٰصِفَٰتِ عَصْفًا﴾ بەو با توندانەش كە هەڵدەكەن بە هەڵكردن. ﴿وَٱلنَّٰشِرَٰتِ نَشْرًا﴾ بەوانەش كە دەپرژێنن. ﴿فَٱلْفَٰرِقَٰتِ فَرْقًا﴾ بەوانەش كە بەچاكی حەق لە ناحەق جیادەكەنەوە. ﴿فَٱلْمُلْقِيَٰتِ ذِكْرًا﴾ بەوانەش كە یادی خودا

---

[1] الطبری (٢٤/١٢٤/١٢٥).

[2] الطبری (٢٤/١٢٣/١٢٤/١٢٥).

[3] الحجر (٢٢).

[4] الاعراف (٥٧).

دەخەنەبەر دلانەوە. ﴿عُذۡرًا أَوۡ نُذۡرًا﴾ بۆ بەهانە نەهێشتن یان ترساندن. واتە: فریشتەکان. ئیبنو مەسعودو ئیبنو عەباس‌و مەسروق‌و موجاهدو قەتادەو ڕەبیعی کوڕی ئەنەس‌و سودی‌و سەوری‌و (الثوری) وتوویانە.[1] وە هیچ بۆچونێکی جیاواز نیە لێرەدا کە ئەمانە دێنە خوارەوە بە فەرمانی خودا بۆ سەر پێغەمبەرەکان بۆ جیاکردنەوەی هەق‌و ناهەق شارەزایی‌و سەر لێ شێوان‌و حەلاڵ و حەرام‌و هێنانی وەحی بۆ پێغەمبەرەکان (علیهم السلام) بۆ بەهانە نەهێشتن‌و ترساندنی خەڵکی لە تۆڵەو سزای خودا گەر سەرپێچی فەرمانەکانی بکەن. وە دەفەرموێت: ﴿إِنَّمَا تُوعَدُونَ لَوَٰقِعٌ﴾ کە هەرچی سۆزو (گفت) پێدەدرێت هەر دێتە جێ. ئەمە ئەو شتەیە کە سوێندی لەسەر خوراوە بەو سوێندانە. واتە: ئەوەی بەڵێنتان پێدان پێی لە هاتنی ڕۆژی قیامەت‌و فوکردن بە کەڵەشاخداو زیندوکردنەوەی بەدەنەکان‌و کۆکردنەوەی هەموو مرۆڤ لە ئەوەڵ کەسەوە تا دواین کەس لەیەك شوێندا وە پاداشت دانەوەی هەموو کەسێك بە کردەوەی خۆی ئەوەی چاکەی کردووە بە چاکەو ئەویش خراپەی کردووە بە خراپەی خۆی ئەمانە هەمووی دێتە جێ. واتە: هەر ڕو دەداو گومانی تێدا نیە.

## باسی هەندێك لەو شتانەی کە لە ڕۆژی قیامەتدا ڕودەدات

پاشان خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَإِذَا ٱلنُّجُومُ طُمِسَتۡ﴾ سا هەردەمێك ئەستێرەکان کوژانەوە واتە: ڕۆشناییان نەما. وەك خودا دەفەرموێت: ﴿وَإِذَا ٱلنُّجُومُ ٱنكَدَرَتۡ﴾[2] واتە: وە دەمێك ئەستێرەکان هەڵوەرین‌و کەوتنەخوارەوە (تاریك بوون). وە دەفەرموێت: ﴿وَإِذَا ٱلۡكَوَاكِبُ ٱنتَثَرَتۡ﴾[3] وە دەمێك کە ئەستێرەکان (کەوتنەخوارەوە) بە پەرشی‌و بلاوی. وە ﴿وَإِذَا ٱلسَّمَآءُ فُرِجَتۡ﴾ واتە: کاتێك ئەستێرەکان قڵەشان‌و وەرێندران‌و تەرەکیان بوو لە هەموو لایەکەوە ڕوخان‌و خراپ بوون. ﴿وَإِذَا ٱلسَّمَآءُ فُرِجَتۡ﴾ هەر کاتێکیش کەلێن کەوتە ئاسمانەوە. ﴿وَإِذَا ٱلۡجِبَالُ نُسِفَتۡ﴾ هەرکاتێکیش کە چیاکان هەژان‌و (ڕاتەکان) تێك ڕوخان. واتە: کاتێك کە چیاکان ڕۆیشتن‌و جولان هیچ پاشماوەو تاپۆیەکیان نەما. وەك خودا دەفەرموێت: ﴿وَيَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلۡجِبَالِ فَقُلۡ يَنسِفُهَا رَبِّي نَسۡفٗا﴾[4] واتە: (ئەی محمد ـ ﷺ ـ) پرسیارت لێ دەکەن سەبارەت بە شاخەکان، تۆش بڵێ پەروەردگار لە بێخیان دێنێت‌و وردو خاشیان دەکات

---

[1] الطبری (٢٤/١٢٨)، (١٢٩).

[2] تکویر (٢).

[3] الانفطار (٢).

[4] طه (١٠٥).

ئینجا با پرژوبلاویان دەكاتەوە. وە فەرموویەتی: ﴿ وَيَوْمَ نُسَيِّرُ ٱلْجِبَالَ وَتَرَى ٱلْأَرْضَ بَارِزَةً وَحَشَرْنَٰهُمْ فَلَمْ نُغَادِرْ مِنْهُمْ أَحَدًا ﴾[1] وە (یادیان بخەرەوە) ڕۆژێك كە شاخەكان دەیخەینە ڕێ‌و ڕووی زەوی بەڕوونی‌و تەختی دەبینیت هەموو (خەڵكی) كۆ دەكەینەوەو هیچ كەسیان بەجێ ناهێڵین. وە دەفەرمووێت: ﴿وَإِذَا ٱلرُّسُلُ أُقِّتَتْ﴾ هەركاتێكیش وادە بۆ پێغەمبەران داندرا. عەوفی (العوفی) وتی: كۆكرانەوە.[2] ئیبنو زەید وتی ئەم ئایەتە[3] وەك ئەم ئایەتە وایە كە خودا دەفەرمووێت: ﴿يَوْمَ يَجْمَعُ ٱللَّهُ ٱلرُّسُلَ﴾[4] واتە: لە ڕۆژێك (بترسن) خودا هەموو پێغەمبەران كۆدەكاتەوە. موجاهد وتی: ﴿أُقِّتَتْ﴾ واتە: ئاشكرابوونی ئەو ڕۆژە كەدێن شایەتی تیا دەدەن.[5] سەوری (الثوری) لە مەنسورەوە (منصور) ئەویش لە ئیبراهیمەوە وتی: ﴿أُقِّتَتْ﴾ بەڵێن درا (بڕیاردرا)[6] وەك ئەوەی ماناكەی لەگەڵ ئەم ئایەتە یەك بێت كە دەفەرمووێت: ﴿ وَأَشْرَقَتِ ٱلْأَرْضُ بِنُورِ رَبِّهَا وَوُضِعَ ٱلْكِتَٰبُ وَجِاْىٓءَ بِٱلنَّبِيِّۦنَ وَٱلشُّهَدَآءِ وَقُضِىَ بَيْنَهُم بِٱلْحَقِّ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴾[7] واتە: وە زەوی لەو ڕۆژەدا بە نوری پەروەردگاری ڕوناك دەبێتەوە وە نامەی كردەوە لەبەردەمیان دادەنرێت‌و پێغەمبەران‌و شایەتەكان دەهێنرێت وە لە نێوانیاندا بە هەق دادوەری دەكرێت وە ئەوان ستەمیان لێ ناكرێت. پاشان فەرموویەتی: ﴿لِأَيِّ يَوْمٍ أُجِّلَتْ﴾ بۆ كامە ڕۆژ دواخراوە؟ ﴿لِيَوْمِ ٱلْفَصْلِ﴾ بۆ ڕۆژی هەلاواردن. ﴿وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا يَوْمُ ٱلْفَصْلِ﴾ چۆن زانیوتە ڕۆژی هەلاواردن چیە؟ ﴿وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ﴾ ئەو ڕۆژە هاوارە لە بێ باوەڕان. خودای گەورە دەفەرمووێت بۆ چ ڕۆژێك دواخراون؟ پێغەمبەران (علیهم السلام) هەتا ڕۆژی قیامەت دێت. وەك خودا دەفەرمووێت: ﴿ فَلَا تَحْسَبَنَّ ٱللَّهَ مُخْلِفَ وَعْدِهِۦ رُسُلَهُۥٓ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ ذُو ٱنتِقَامٍ ﴿٤٧﴾ يَوْمَ تُبَدَّلُ ٱلْأَرْضُ غَيْرَ ٱلْأَرْضِ وَٱلسَّمَٰوَٰتُ وَبَرَزُوا۟ لِلَّهِ ٱلْوَٰحِدِ ٱلْقَهَّارِ ﴾[8] واتە: جا وا گومان مەبە خودا ئەو بەڵێنەی داوێتی بە پێغەمبەرانی بەدی

---

[1] كهف (٤٧).

[2] الطبری (١٢٩/٢٤).

[3] الطبری (١٣٠/٢٤).

[4] المائدة (١٠٩).

[5] الطبری (١٣٠/٢٤).

[6] الطبری (١٣٠/٢٤).

[7] الزمر (٦٩).

[8] ابراهیم (٤٧– ٤٨).

ئاهێنێت بەڕاستی خودا خاوەن دەسەڵاتی تۆڵەسێنە، لە ڕۆژێکدا کە ئەم زەویە دەگۆڕێت بە زەویەکی ترو ئاسمانەکانیش (دەگۆڕێن بە ئاسمانی تر) ئەوسا هەموو لە گۆڕەکانیان دێنە دەرەوە دەردەکەون بۆ خودای تەنیای بەسەر هەموو شتێکدا زاڵ. ئەو ڕۆژە ڕۆژی هەڵاواردنە (جیاکردنەوە) وەك خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿لِيَوۡمِ ٱلۡفَصۡلِ﴾ پاشان خودای گەورە باسی گەورەیی و سەختی ئەو جیاکردنەوە دەکات دەفەرمووێت: ﴿وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا يَوۡمُ ٱلۡفَصۡلِ ﴿١٤﴾ وَيۡلٞ يَوۡمَئِذٖ لِّلۡمُكَذِّبِينَ﴾ واتە: هاوارە لەو ڕۆژەدا بۆ بێ باوەڕان لە جەزرەبەو تۆڵەی خودا.

﴿أَلَمۡ نُهۡلِكِ ٱلۡأَوَّلِينَ ﴿١٦﴾ ثُمَّ نُتۡبِعُهُمُ ٱلۡأٓخِرِينَ ﴿١٧﴾ كَذَٰلِكَ نَفۡعَلُ بِٱلۡمُجۡرِمِينَ ﴿١٨﴾ وَيۡلٞ يَوۡمَئِذٖ لِّلۡمُكَذِّبِينَ ﴿١٩﴾ أَلَمۡ نَخۡلُقكُّم مِّن مَّآءٖ مَّهِينٖ ﴿٢٠﴾ فَجَعَلۡنَٰهُ فِي قَرَارٖ مَّكِينٍ ﴿٢١﴾ إِلَىٰ قَدَرٖ مَّعۡلُومٖ ﴿٢٢﴾ فَقَدَرۡنَا فَنِعۡمَ ٱلۡقَٰدِرُونَ ﴿٢٣﴾ وَيۡلٞ يَوۡمَئِذٖ لِّلۡمُكَذِّبِينَ ﴿٢٤﴾ أَلَمۡ نَجۡعَلِ ٱلۡأَرۡضَ كِفَاتًا ﴿٢٥﴾ أَحۡيَآءٗ وَأَمۡوَٰتٗا ﴿٢٦﴾ وَجَعَلۡنَا فِيهَا رَوَٰسِيَ شَٰمِخَٰتٖ وَأَسۡقَيۡنَٰكُم مَّآءٗ فُرَاتٗا ﴿٢٧﴾ وَيۡلٞ يَوۡمَئِذٖ لِّلۡمُكَذِّبِينَ ﴿٢٨﴾﴾

## بانگ کردن بۆ پەندو ئامۆژگاری وەرگرتن لەو تواناو دەسەڵاتی خودایە

خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿أَلَمۡ نُهۡلِكِ ٱلۡأَوَّلِينَ﴾ ئەی ئێمە پێشینەکانمان قڕ نەکرد؟ واتە: لەوانەی کە باوەڕیان نەبوو بە پێغەمبەران (علیهم السلام) دژایەتی ئەوپەیامەیان دەکرد کە بۆی هێنابوون. ﴿ثُمَّ نُتۡبِعُهُمُ ٱلۡأٓخِرِينَ﴾ هەر ئەوەشمان لەگەڵ پاشینەکانیان کرد. کە ئەمانەش وەك ئەوانەی پێشوو وابوون. بۆیە خودا فەرموویەتی: ﴿كَذَٰلِكَ نَفۡعَلُ بِٱلۡمُجۡرِمِينَ﴾ هەر ئەو کارەش بە تاوانبارەکان دەکەین. ﴿وَيۡلٞ يَوۡمَئِذٖ لِّلۡمُكَذِّبِينَ﴾ ئەو ڕۆژە هاوارە لە بێ باوەڕان. ئیبنو جەریر وتویەتی.[1]
پاشن خودای گەورە منەت دەکات بەسەر دروست کراوەکانیدا وەدی هێنانیان دەکاتە بەڵگە بۆ زیندوو کردنەوەیان جارێکی تر دەفەرمووێت: ﴿أَلَمۡ نَخۡلُقكُّم مِّن مَّآءٖ مَّهِينٖ﴾ ئاخۆ ئێوەمان لە ئاوێکی بێ بایەخ وەدی نەهێنا؟ واتە: ئاوێکی لاوازی بێزراو لە بەرامبەر تواناو دەسەڵاتی خودا وەك لە فەرموودەکەی بُسری کوڕی جیحاشدا (بُسر بن جحاش) هاتووە کە ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی کە خودای گەورە دەفەرمووێت: (ئەی نەوەی ئادەم چۆن من بەبێ دەسەڵات دەزانی من تۆم دروستکردووە لە وێنەی ئەمە)[2] لە تنۆکێك ئاو. ﴿فَجَعَلۡنَٰهُ فِي قَرَارٖ مَّكِينٍ﴾ لە جێیەکی بتەودا جێمان

---

[1] الطبری (١٣١/٢٤).

[2] احمد (٢١٠/٤).

نەکردەوە؟ واتە: لە ناو ڕەحمدا کۆمان کردووەتەوە کە شوێنو جێگای ئاوی پیاوو ژنە کە هەر بۆ ئەوە داندراوەو ئامادەکراوە چونکە هەڵی دەگرێتو دەیپارێزێت وە دەفەرمووێت: ﴿إِلَىٰ قَدَرٍ مَّعْلُومٍ﴾ تا ماوەیەکی دیاریکراو. واتە: بۆ کاتێکی دیاریکراو تا شەش مانگ یان هەتا نۆ مانگ. بۆیە خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿فَقَدَرْنَا فَنِعْمَ الْقَادِرُونَ﴾ خۆ توانیمان ئای کە چەندە چاکمان توانی. ﴿وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ﴾ ئەو ڕۆژە هاوارە لە بێ باوەڕان. پاشان دەفەرمووێت: ﴿أَلَمْ نَجْعَلِ الْأَرْضَ كِفَاتًا﴾ ئەدی زەمینمان نەکردە جێی کۆبوونەوە؟ ﴿أَحْيَاءً وَأَمْوَاتًا﴾ بۆ ژیانو بۆ نەمان؟ ئیبنو عەباس وتی: ئێمە کۆبووین لە زەمیندا.[1] موجاهد وتی: مردوو هەڵدەگرێت هیچ شوێنێکی دیارنامێنێتو نابیندرێت.[2] شەعبی(الشعبی) وتی:ناوەوەی زەمین بۆ مردووەکانتانو سەروەوەش (پشتی) بۆ زیندووەکان.[3] قەتادەو موجاهدیش هەر وایان وتووە.[4] ﴿وَجَعَلْنَا فِيهَا رَوَاسِيَ شَامِخَاتٍ وَأَسْقَيْنَاكُم مَّاءً فُرَاتًا﴾ هەر لەوێشدا چەند چیای بەرزمان دامەزراندو ئاوی خۆشمان پێ نۆشاند. واتە: کێوەکانمان داکوتاند لەناو زەمیندا بۆئەوەی نەڕاتو نەجوڵێت، ئاوی سازگارو خۆشمان پێ نۆشین لە هەورەکانەوە یان لەسەرچاوەی (کانیاوی) ناو زەمین. ﴿وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ﴾ ئەو ڕۆژە هاوارە لە بێ باوەڕان. واتە: هاوار بۆ ئەوکەسەی کە بیر لەم درستکراوانەی خودا دەکاتەوە کە هەمووی بەڵگەی گەورەیە لەسەر دەسەڵاتی خودای مەزن دوای ئەوە هەر لەسەر بێ باوەڕیو خودانەناسی خۆی هەر بەردەوامە.

﴿انطَلِقُوا إِلَىٰ مَا كُنتُم بِهِ تُكَذِّبُونَ ﴿٢٩﴾ انطَلِقُوا إِلَىٰ ظِلٍّ ذِي ثَلَاثِ شُعَبٍ ﴿٣٠﴾ لَّا ظَلِيلٍ وَلَا يُغْنِي مِنَ اللَّهَبِ ﴿٣١﴾ إِنَّهَا تَرْمِي بِشَرَرٍ كَالْقَصْرِ ﴿٣٢﴾ كَأَنَّهُ جِمَالَتٌ صُفْرٌ ﴿٣٣﴾ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴿٣٤﴾ هَٰذَا يَوْمُ لَا يَنطِقُونَ ﴿٣٥﴾ وَلَا يُؤْذَنُ لَهُمْ فَيَعْتَذِرُونَ ﴿٣٦﴾ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴿٣٧﴾ هَٰذَا يَوْمُ الْفَصْلِ جَمَعْنَاكُمْ وَالْأَوَّلِينَ ﴿٣٨﴾ فَإِن كَانَ لَكُمْ كَيْدٌ فَكِيدُونِ ﴿٣٩﴾ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴿٤٠﴾﴾

---

[1] الطبري (١٣٤/٢٤).

[2] الطبري (١٣٤/٢٤).

[3] الطبري (١٣٤/٢٤).

[4] الطبري (١٣٥/١٣٤/٢٤).

**ڕاپێچ کردنی (ڕەوانەکردنی) تاوانباران بۆ شوێنەکانیان لە ناو جەهەننەم دا وە هەندێك لەو سزایانەی کە تیایەتی**

خودای گەورە باسی ئەو خودانەناسو بێ باوەڕانەمان بۆ دەگێڕێتەوەو کە باوەڕیان نەبووە بە زیندوبوونەوەو پاداشتو بەهەشتو جەهەننەم کە لە ڕۆژی قیامەتدا پێیان دەوترێت: ﴿ٱنطَلِقُوٓاْ إِلَىٰ مَا كُنتُم بِهِۦ تُكَذِّبُونَ﴾ وەڕێ بکەون بە ڕەوشتێك کە بە درۆتان دەزانی. ﴿ٱنطَلِقُوٓاْ إِلَىٰ ظِلٍّ ذِي ثَلَٰثِ شُعَبٍ﴾ بەڕیوەبچن بەرەو سێبەرێکی دوکەڵێکی سێ چوکڵە. واتە: بڵێسەی ئاگرە وەختێك بەرزدەبێتەوە دەڕوات بە ئاسماندا بە دوکەڵێکی زۆرەوە کە بە گەورەیی و بە هێزی ئاگرەکە دوکەڵەکە دەبێت بە سێ بەشەوەو بڵاو دەبێتەوە. ﴿لَّا ظَلِيلٍ وَلَا يُغْنِي مِنَ ٱللَّهَبِ﴾ سێبەر نادات و مرۆڤیش لە گڕ وەلانادات. واتە: سێبەری دوکەڵ بەرامبەر بڵێسەی ئاگر لە ڕاستیدا خۆی سێبەر نیە بڵێسەی ئاگریش ناگێڕێتەوە، واتە: نایانپارێزێت لە بڵێسەی ئاگر. حودای گەورە دەفەرموێت: ﴿ تَرْمِي بِشَرَرٍ كَٱلْقَصْرِ﴾ بەڕاستی دۆزەخ پڕیشکەی وەها دەهاوێژێت کۆشك ئاسایی. واتە: پڕیشکەی ئەو ئاگرە دەفڕێتو دەڕوات بە ئاسماندا بە ئەندازەی کۆشك. ئیبنو مەسعود وتی: وەك کۆشکی داخراو.[1] ئیبنو عەباسو موجاهدو قەتادەو مالك لە زەیدی کوڕی ئەسلەمەوە (اسلم) کەسانی تریشەوە هێناویانە کە وتوویانە: واتە ڕیشکی دار.[2] ﴿كَأَنَّهُۥ جِمَٰلَتٌ صُفْرٌ﴾ بەرەودوا دەڕۆن دەڵێی وشتری زەردن. واتە: وەك وشتری ڕەش. موجاهدو حسنو قەتادەو زەحاك وتویانە، ئیبنو جەریرش هەمان ڕای هەیە.[3] ئیبنو عەباسو موجاهدو سەعیدی کوڕی جوبەیر وتیان: ﴿جِمَٰلَتٌ صُفْرٌ﴾ واتە: کورسی (حەبلی) کەشتیەکان بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەباسەوە (ڕەزای خودایان لێ بێت). ﴿إِنَّهَا تَرْمِي بِشَرَرٍ كَٱلْقَصْرِ﴾ وتی: ئێمە ستونمان (کۆڵەکە) بەرز دەکردەوە بە ئەندازەی سێ باڵ، زیاد لە سێ باڵ بۆ خانوو بەرز دەکردەوە ناومان دەبرد بە (القصر)، ﴿كَأَنَّهُۥ جِمَٰلَتٌ صُفْرٌ﴾ کورسی کەشتی کۆدەکرایەوە هەتا وەك (اوساط الرجال) ی لێ دەهات[4]. ﴿وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ﴾ ئەو ڕۆژە هاوارە لە بێ باوەڕان.

---

[1] الطبری (٢٤/١٦٣).

[2] الطبری (٢٤/١٣٨).

[3] الطبری (٢٤/١٣٩/١٤١).

[4] فتح الباری (٨/٥٥٦).

## تاوانباران توانای قسەکردن و ڕۆیشتنە پێشەوەو بیانو هێنانەوەیان نیە

پاشان خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿هَٰذَا يَوْمُ لَا يَنطِقُونَ﴾ ئەمڕۆ ڕۆژێکە بێ باوەڕان ناتونن قسەی تێدا بکەن. ﴿وَلَا يُؤْذَنُ لَهُمْ فَيَعْتَذِرُونَ﴾ ڕێگەی بڕوبیانوشیان نادەن. واتە: توانای قسەکردنیان نیەو، ڕێگاش نادرێن بڕوبیانو بێننەوە چونکە بڕیاری خودا هاتەجیّو ئەو کارەساتە هات بەسەریاندا بەهۆی ناهەقی کاری خۆیانەوە کە ناتوانن قسە بکەن وە گۆڕەپانی مەحشەر هەمەجۆرەیە، جارێك بەشێوەیەكو جارێکی تر بە شێوەیەکی ترەو خودای گەورە باسی ئەو هەموو گۆڕانکاریانە دەکات کە ڕودەدات ئەمەش نیشانەی زۆر گرانیو ناڕەتیو زەمین لەرزەو ترسناکی ئەو ڕۆژە دەگەیەنێت. بۆیە خودای گەورە هەموو باسێك لەم باسانە دەفەرموێت: ﴿وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ﴾ ئەو ڕۆژە هاوارە لە بێ باوەڕان. وە دەفەرموێت: ﴿هَٰذَا يَوْمُ الْفَصْلِ ۖ جَمَعْنَاكُمْ وَالْأَوَّلِينَ﴾ ئەمڕۆ ڕۆژی هەلاواردنە، ئێوەمان لەگەڵ پێشینان کۆکردەوە. ﴿فَإِن كَانَ لَكُمْ كَيْدٌ فَكِيدُونِ﴾ سا ئەگەر فێڵێکتان هەیە ئەنجامی بدەن. ئەمە قسەی خودای گەورەیە کە لەگەڵ بەندەکانی خۆیدا دەیکات دەفەرموێت: ﴿هَٰذَا يَوْمُ الْفَصْلِ ۖ جَمَعْنَاكُمْ وَالْأَوَّلِينَ﴾ واتە: خودای گەورە بە دەستەلاتی خۆی کۆیان دەکاتەوە لە شوێنێکدا بانگکەر پێیان دەگەیەنێتو دەبیندرێن. وە دەفەرموێت: ﴿فَإِن كَانَ لَكُمْ كَيْدٌ فَكِيدُونِ﴾ هەڕەشەیەکی توندەو بەڵێنێکی ڕاستە. واتە: ئەگەر توانیتان خۆتان ڕزگاربکەن لە دەستم لە فەرمانم دەرچن دەبڕۆن دەرچن بەلاّم ئێوە ئەوەتان لە دەست نایاتو ناتوانن وەك خۆی فەرموویەتی: ﴿يَا مَعْشَرَ الْجِنِّ وَالْإِنسِ إِنِ اسْتَطَعْتُمْ أَن تَنفُذُوا مِنْ أَقْطَارِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ فَانفُذُوا ۚ لَا تَنفُذُونَ إِلَّا بِسُلْطَانٍ﴾[1] واتە: ئەی کۆمەڵی جنۆکەو ئادەمی ئەگەر توانیتان دەربچن لە بەشەکانی ئاسمانو زەوی دەسا بچن ناشتوانن لێیان دەربچن مەگین بە دەسەلاتەوە. وە دەفەرموێت: ﴿وَلَا تَضُرُّونَهُ شَيْئًا﴾[2] واتە: ئێوەش هیچ زیانێك بە خودا ناگەیەنن. وە لە فەرموودەیەکدا هاتووە: (ئەی بەندەکانم ئێوە ناتوانن بگەن بەو ئاستەی سودم پێ ببخەشن وە ناتوانن بگەن بەو ئاستەی کە زەرەر لە من بدەن)[3]. ﴿وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ﴾ ئەو ڕۆژە هاوارە لە بێ باوەڕان.

---

[1] الرحمان (٣٣).

[2] هود (٥٧).

[3] مسلم (١٩٩٤/٤).

﴿إِنَّ الْمُتَّقِينَ فِي ظِلَالٍ وَعُيُونٍ ﴿٤١﴾ وَفَوَاكِهَ مِمَّا يَشْتَهُونَ ﴿٤٢﴾ كُلُوا وَاشْرَبُوا هَنِيئًا بِمَا كُنْتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٤٣﴾ إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجْزِي الْمُحْسِنِينَ ﴿٤٤﴾ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِلْمُكَذِّبِينَ ﴿٤٥﴾ كُلُوا وَتَمَتَّعُوا قَلِيلًا إِنَّكُمْ مُجْرِمُونَ ﴿٤٦﴾ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِلْمُكَذِّبِينَ ﴿٤٧﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ ارْكَعُوا لَا يَرْكَعُونَ ﴿٤٨﴾ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِلْمُكَذِّبِينَ ﴿٤٩﴾ فَبِأَيِّ حَدِيثٍ بَعْدَهُ يُؤْمِنُونَ ﴿٥٠﴾﴾

**پاشەڕۆژی لەخوداترسان ( المتقين )**

خودای گەورە دەفەرموویت: ﴿إِنَّ الْمُتَّقِينَ فِي ظِلَالٍ وَعُيُونٍ﴾ ئەوانەش کە لە خوداترسن لە نێوانی سێبەرانو کانیاون. خودا باسی بەندە لە خوداترسەکانی دەکات لە ڕۆژی قیامەتدا ئەوانەی فەرمانەکانی ئەویان بەجێ هێناوەو ئەوشتانەی کە خودا حەرامی کردووە لێی وە دوور بوون دەڕۆنە ناو باخاتێکەوە کە کانی زۆری تێدایە بە پێچەوانەی ئەوکەسانەی کە بەدبەختو چارەڕەشن وان لە سێبەری ڕەشی بۆگەن وە دەفەرموویت: ﴿وَفَوَاكِهَ مِمَّا يَشْتَهُونَ﴾ میوەهاتیش هەرچەندە حەزی لێ بکەن. واتە: لە جۆری میوەهات هەرکاتێك حەزی لێ بکەن لەبەردەستیاندایە. ﴿كُلُوا وَاشْرَبُوا هَنِيئًا بِمَا كُنْتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ ئەمەش پاداشتی ئاکارتان، سا بخۆنو بخۆنەوە، نۆشی گیانتان. واتە: خودا بۆ ڕێزو چاکەکرن لەگەڵیان ئەمە دەفەرموویت پاشان جارێکی تریش هەواڵیان دەداتیو دەفەرموویت: ﴿إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجْزِي الْمُحْسِنِينَ﴾ ئێمە ئاوا پاداشتی ئاکارچاکان دەدەین. واتە: ئەمە پاداشتی ئێمەیە بۆ ئەوکەسانەی ئاکارچاکن. ﴿وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِلْمُكَذِّبِينَ﴾ ئەو ڕۆژە هاوارە لە بێ باوەڕان.

**هەڕەشە لەوکەسانەی کە باوەڕیان بە ڕۆژی قیامەت نیە**

خودای مەزن دەفەرموویت: ﴿كُلُوا وَتَمَتَّعُوا قَلِيلًا إِنَّكُمْ مُجْرِمُونَ﴾ ئێوەش گرۆی تاوانباران! بخۆنو کەمێك ڕابوێرن. خودا ڕووی فەرمایشتی دەکاتە ئەوکەسانەی کە باوەڕیان بە ڕۆژی سزاو تۆڵە نیە هەڕەشەیان لێ دەکات بەو ڕۆژەی کە بەڵێنی پێ داون دەفەرموویت: ﴿كُلُوا وَتَمَتَّعُوا قَلِيلًا﴾ واتە: ماوەیەکی زۆر کەمو کورت بخۆنو ڕابوێرن. ﴿إِنَّكُمْ مُجْرِمُونَ﴾ واتە: ئێوەن تاوانباران پاشان ڕاپێچ (ڕەوانە) دەکرێن بۆناو ئەو جەهەننەمەی کە باسکرا. ﴿وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِلْمُكَذِّبِينَ﴾ ئەو ڕۆژە هاوارە لە بێ باوەڕان. وەك خودای گەورە دەفەرموویت: ﴿ نُمَتِّعُهُمْ قَلِيلًا ثُمَّ نَضْطَرُّهُمْ إِلَىٰ عَذَابٍ غَلِيظٍ ﴾[1] واتە: کەمێك نازونیعمەتیان پێ دەدەین (لە دونیا) لە پاشان ناچاریان دەکەین کە بڕۆنە ناو سزای

[1] لقمان (٢٤).

سەختەوە. وە دەفەرمووێت: ﴿قُلْ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَفْتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ لَا يُفْلِحُونَ ﴿٦٩﴾ مَتَٰعٌ فِى ٱلدُّنْيَا ثُمَّ إِلَيْنَا مَرْجِعُهُمْ ثُمَّ نُذِيقُهُمُ ٱلْعَذَابَ ٱلشَّدِيدَ بِمَا كَانُوا۟ يَكْفُرُونَ ﴾[1] واتە: (ئەی موحەممەد (ﷺ) بلێ بەڕاستی ئەوانەی کە درۆ هەڵدەبەستن بەناوی خوداوە (هەرگیز) ڕزگار نابن، (چونکە) بەهرەو ڕابواردنێکی کەم لە دونیادا (بەسەر دەبەن) پاشان بۆلای ئێمەیە گەڕانەوەیان ئینج پێیان دەچێژین سزای زۆر توند بەهۆی ئەوەی کە بڕوایان نەهێنا (تا مردن). وە دەفەرمووێت: ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ ٱرْكَعُوا۟ لَا يَرْكَعُونَ﴾ ئەگەر کەسێك پێیان بلێت: کڕنووش بەرن، کڕنووش نابەن. واتە: وەختێك فەرمان بکرایە بەو خودانەناسە نەفامانە کە نوێژ بکەنو کڕنووش بەرن بۆ خودا لەگەڵ موسڵمانانندا بەیەکەوە (بە جەماعەت) فیزیان دەکردو کڕشنووشیان نەدەبرد بۆیە خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ﴾ ئەوڕۆژە هاوارە لەبێباوەڕان. پاشان فەرموویەتی:﴿فَبِأَيِّ حَدِيثٍۭ بَعْدَهُۥ يُؤْمِنُونَ﴾ دەسا ئەوان پاش قورئان بە کام قسە بڕوا دەکەن؟ ئەگەر بەم قورئانە باوەڕ ناکەن بە چ قسەیەکی تر باوەڕ دەکەن. وەك خودا دەفەرمووێت: ﴿فَبِأَيِّ حَدِيثٍۭ بَعْدَهُۥ يُؤْمِنُونَ﴾.

## سورەتی (النباء)

### لەمەککەدا هاتووەتەخوارەوە

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿عَمَّ يَتَسَآءَلُونَ ﴿١﴾ عَنِ ٱلنَّبَإِ ٱلْعَظِيمِ ﴿٢﴾ ٱلَّذِى هُمْ فِيهِ مُخْتَلِفُونَ ﴿٣﴾ كَلَّا سَيَعْلَمُونَ ﴿٤﴾ ثُمَّ كَلَّا سَيَعْلَمُونَ﴾

وەڵامی ئەو بتپەرستانە ئەداتەوە کە باوەڕیان بە هاتنی ڕۆژی قیامەت نیە،خودای گەورە لەوەڵامی ئەو بتپەرستانەی کە لە یەکتریان دەپرسی لەبارەی ڕۆژی دوایی و باوەڕیان پێ ی نەبوو دەفەرموێت: ﴿عَمَّ يَتَسَآءَلُونَ﴾ واتە: ئەوەلەچی پرسیارلە لەیەکتری دەکەن! ئەو بێبڕوایانە ﴿عَنِ ٱلنَّبَإِ ٱلْعَظِيمِ﴾واتە: لەو دەنگ و باسە مەزنە پرسیار دەکەن ﴿ٱلَّذِى هُمْ فِيهِ مُخْتَلِفُونَ﴾ واتە: کە ئەوان تێیدا جیاوازن، یانی: خەڵکی لەسەری دوو ڕایان هەیە: یەکێکیان باوەڕی پێ ی هەیەو ئەوی تریان بڕوای پێی نیە، پاشان خودای گەورە هەڕەشە دەکات لەو کەسانەی باوەڕیان بە ڕۆژی قیامەت نیە و ئەفەرموێت:﴿كَلَّا سَيَعْلَمُونَ﴾واتە: نەء! باپەشیمان بنەوە، لەمەولا تێ دەگەن ﴿ثُمَّ كَلَّا سَيَعْلَمُونَ﴾ واتە: دووبارە دەڵێم: نەء! لەمەولا تێئەگەن.

[1] یونس (٦٩- ٧٠).

﴿أَلَمْ نَجْعَلِ الْأَرْضَ مِهَادًا ﴿٦﴾ وَالْجِبَالَ أَوْتَادًا ﴿٧﴾ وَخَلَقْنَاكُمْ أَزْوَاجًا ﴿٨﴾ وَجَعَلْنَا نَوْمَكُمْ سُبَاتًا ﴿٩﴾ وَجَعَلْنَا اللَّيْلَ لِبَاسًا ﴿١٠﴾ وَجَعَلْنَا النَّهَارَ مَعَاشًا ﴿١١﴾ وَبَنَيْنَا فَوْقَكُمْ سَبْعًا شِدَادًا ﴿١٢﴾ وَجَعَلْنَا سِرَاجًا وَهَّاجًا ﴿١٣﴾ وَأَنْزَلْنَا مِنَ الْمُعْصِرَاتِ مَاءً ثَجَّاجًا ﴿١٤﴾ لِنُخْرِجَ بِهِ حَبًّا وَنَبَاتًا ﴿١٥﴾ وَجَنَّاتٍ أَلْفَافًا ﴿١٦﴾﴾

باسی هەندێ لەدەسەڵاتی خودا وەك نیشانەیەك لەدەسەلات و توانای لەسەر زیندوو کردنەوەی پاش مردن.جارێکی تر خوای گەورە ئەو توانا گەورەی دەردەخات لە وەدیهێنانی ئەو شتە کەموێنە و سەرسورهێنەرانەی کە نیشانەیە لە توانایی و لەوەی کە مەیلی لێ بێت لەبارەی ڕۆژی دوایی.

ئەفەرموێت: ﴿أَلَمْ نَجْعَلِ الْأَرْضَ مِهَادًا﴾واتە: ئەدی ئێمە ئەم زەمینەمان نەکردوەتە ڕایەخ! یانی: ڕامان خستووە بۆ گیانلەبەران و ڕامان هێناوە و وەستاوە بۆیان، ﴿وَالْجِبَالَ أَوْتَادًا﴾ واتە: کەژو چیاکانیشمان کردوە بە مێخ، یانی کردومانە بەسینگێك چوە بەناو زەویدا دامان کوتاوە تا بوەستێ و نەلەرزێ بەو شتانەوە کەلەناویایەتی.

دیسان ئەفەرموێت: ﴿وَخَلَقْنَاكُمْ أَزْوَاجًا﴾واتە: ئێوەشمان جوت وەدی هێنا، یانی: بە نێرینەو مێینە تا ئارەزوتان لەیەك ببێ وە منداڵتان لێ پەیدا ببێ، وەك لە ئایەتێکی تردا ئەفەرموێت: ﴿ وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَ لَكُمْ مِنْ أَنْفُسِكُمْ أَزْوَاجًا لِتَسْكُنُوا إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُمْ مَوَدَّةً وَرَحْمَةً﴾ واتە: وە لە نیشانەکانی ئەوەیە کە بۆی دروست کردوون لە(ڕەگەزی) خۆتان هاوسەرێك بۆ ئەوەی ئارام بگرن لە لایدا وە خۆشەویستی و بەزەیی خستوەتە نێوانتان. وە ئەفەرموێت: ﴿وَجَعَلْنَا نَوْمَكُمْ سُبَاتًا﴾واتە: وەخەویشمان کردە هۆی حەسانەوەتان، یانی بۆ ئەوەی بوەستن و پشوو بدەن لەو هەمووە هاتوچۆو ماندوبوونە بە دوای بژێوی لە ڕۆژدا، وێنەی ئەم ئایەتە لە پێشەوە لەسورەتی فورقاندا هاتوە. ﴿وَجَعَلْنَا اللَّيْلَ لِبَاسًا﴾ واتە: وەشەویشمان دانا بۆ پۆشاك، یانی بەتاریکی و ڕەشیەکەی خەڵکی دادەپۆشێ، وەك ئەفەرموێت: ﴿وَاللَّيْلِ إِذَا يَغْشَىٰ﴾ واتە سوێند بەشەو کە خۆر دادەپۆشێ. قەتادە لەم ئایەتەدا کە خودا ئەفەرموێت: ﴿وَجَعَلْنَا اللَّيْلَ لِبَاسًا﴾ ئەڵێ: یانی هۆی حەسانەوە. وە پاشان خودای گەورەئەفەرموێتأَوْتَادًا ﴿وَجَعَلْنَا النَّهَارَ مَعَاشًا﴾ واتە: ڕۆژیشمان کردە هۆی ژیان، یانی ڕووناك و ڕۆشنکەرەوە بۆ ئەوەی خەڵکی بێن و بچن کاری خۆیان بەجێ بێنن لەبازرگانی و ئیشکردن و بژێوی وەدەستهێنان و هەرەشتێکی تر﴿وَبَنَيْنَا فَوْقَكُمْ سَبْعًا شِدَادًا﴾واتە: لەسەروشتانەوە حەوت ئاسمانی بەهێزمان دروست کردوە، کە فراوان و بەرزو ڕێکن و بەچەندەها ئەستێرەی وەستاوو گەڕۆك ڕازاوەتەوە﴿وَجَعَلْنَا سِرَاجًا وَهَّاجًا﴾ واتە: وە چرای زۆر

پرشنگدارمان وەدی هێنا، واتە خۆری ڕوناك كە ڕۆشنایەكەی ئەدات بەدانیشتوانی هەموو ئەم سەرزەمینە. وە ئەفەرموێت: ﴿وَأَنزَلْنَا مِنَ ٱلْمُعْصِرَٰتِ مَآءً ثَجَّاجًا﴾واتە: لەو هەورانەكەبارانیان پێوەیە ئاوی بەخوڕمان ناردۆتە خوارەوە(داڕژاند(عەلی كوڕی ئەبو تەلحە ئەڵێ: لە ئیبنو عەباسەوە ﴿مِنَ ٱلْمُعْصِرَٰتِ﴾ واتە: لەهەورەوە، عیكریمەو ئەبولعالیەو زەححاك و حەسەن ورەبیعی كوڕی ئەنەس و سەوریش هەر وایان وتوە. ئیبنو جەریریش ئەم ڕایەی هەڵبژاردوە. فەڕاء وتویەتی: ئەو هەورەی كە بارانی پێوەیە دەستی نەكردوە بەبارین. وەكو ئەمەی كە خودا ئەفەرموێت﴿ٱللَّهُ ٱلَّذِى يُرْسِلُ ٱلرِّيَٰحَ فَتُثِيرُ سَحَابًا فَيَبْسُطُهُۥ فِى ٱلسَّمَآءِ كَيْفَ يَشَآءُ وَيَجْعَلُهُۥ كِسَفًا فَتَرَى ٱلْوَدْقَ يَخْرُجُ مِنْ خِلَٰلِهِۦ﴾ واتە: خوا زاتێكە ئەو بایانە دەنێرێت بۆ ئەوەی هەورەكان بجوڵێنن و بگەڕێنن ئینجا ئەو هەورە خوا چۆن بیەوێ بڵاوی دەكاتەوە بە ئاسماندا وە ئەو(هەورە)دەكاتە پارچەیەك كۆیان دەكاتەوە لەسەر یەكتر ئینجا دەبینی قەترەی باران لە نێوانی هەورەكەوە دەبارێت. وە خودای گەورەئەفەرموێت: ﴿مَآءً ثَجَّاجًا﴾ موجاهیدو قەتادەو ڕەبیعی كوڕی ئەنەس ئەڵێن یانی: بەخوڕ داڕژان. سەوری ئەڵێت: واتە: بارین بەدوای یەكدا ئیبنو زەید ئەڵێت: واتە: بارانی زۆر. لەو فەرمودەیەی پێغەمبەر(ﷺ)كە فەرمووی بەو ژنەی كەتوشی نەخۆشی ژنانەهاتبوو بە لۆكە خۆت ببەستە یانی لۆكەی بۆ دابنێ، ئافرەتەكە ئەڵێت: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) خوێنم گەلێ زۆرە بەخوڕ دێت، ئەمە ئەوە ئەگەیەنێ كە بەكارهێنانی (الثج) بۆ ئاوی خوڕی بەردەوامی زۆربەكار دەهێنرێ (والله اعلم). وە پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿لِّنُخْرِجَ بِهِۦ حَبًّا وَنَبَاتًا﴾ واتە: بەسەوزی و تەڕی بخورێت ﴿وَجَنَّٰتٍ﴾واتە: دارستان و باغچە لە بەروبومی جۆراو جۆرو هەمە ڕەنگ بەتام و بۆنی جیاجیا با هەموو لە یەك شوێنیشدا بێت لەزەویدا، بۆ ئەمەیە فەرمویەتی دارستانی چڕوپڕ، ئیبنو عەباس ئەڵێت: چڕ و پڕ بەیەكەوە. ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە وایە كە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَفِى ٱلْأَرْضِ قِطَعٌ مُّتَجَٰوِرَٰتٌ وَجَنَّٰتٌ مِّنْ أَعْنَٰبٍ وَزَرْعٌ وَنَخِيلٌ صِنْوَانٌ وَغَيْرُ صِنْوَانٍ يُسْقَىٰ بِمَآءٍ وَٰحِدٍ وَنُفَضِّلُ بَعْضَهَا عَلَىٰ بَعْضٍ فِى ٱلْأُكُلِ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ﴾ واتە: وە لەزەویدا چەند پارچەی لەپاڵ یەكتریدا هەن هەروەها باخاتی ترێ و ڕەزو كشتوكاڵ و (باخاتی) دارخورمای دوو قەد(یەك بنج)و یەك قەد هەموویان بەیەك ئاو ئاو دەدرێن كەچی باوی هەندێكیانی داوە بەسەر هەندێكی تریاندا لە خواردندا بەڕاستی لەوانەدا چەند نیشانەی ڕوون هەیە بۆ ئەوانەی تێدەگەن و بیر دەكەنەوە.

﴿إِنَّ يَوْمَ ٱلْفَصْلِ كَانَ مِيقَـٰتًا ﴿١٧﴾ يَوْمَ يُنفَخُ فِى ٱلصُّورِ فَتَأْتُونَ أَفْوَاجًا ﴿١٨﴾ وَفُتِحَتِ ٱلسَّمَآءُ فَكَانَتْ أَبْوَٰبًا ﴿١٩﴾ وَسُيِّرَتِ ٱلْجِبَالُ فَكَانَتْ سَرَابًا ﴿٢٠﴾ إِنَّ جَهَنَّمَ كَانَتْ مِرْصَادًا ﴿٢١﴾ لِّلطَّـٰغِينَ مَـَٔابًا ﴿٢٢﴾ لَّـٰبِثِينَ فِيهَآ أَحْقَابًا ﴿٢٣﴾ لَّا يَذُوقُونَ فِيهَا بَرْدًا وَلَا شَرَابًا ﴿٢٤﴾ إِلَّا حَمِيمًا وَغَسَّاقًا ﴿٢٥﴾ جَزَآءً وِفَاقًا ﴿٢٦﴾ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ لَا يَرْجُونَ حِسَابًا ﴿٢٧﴾ وَكَذَّبُوا۟ بِـَٔايَـٰتِنَا كِذَّابًا ﴿٢٨﴾ وَكُلَّ شَىْءٍ أَحْصَيْنَـٰهُ كِتَـٰبًا ﴿٢٩﴾ فَذُوقُوا۟ فَلَن نَّزِيدَكُمْ إِلَّا عَذَابًا ﴿٣٠﴾﴾

## تەفسیری ڕۆژی هەڵاواردن و ڕووداوەکانی بەدرێژی

خودای گەورەئەفەرموێت: ﴿إِنَّ يَوْمَ ٱلْفَصْلِ كَانَ مِيقَـٰتًا﴾ واتە: بێگومان ڕۆژی هەڵاواردن کاتی بۆ دیاری کراوە﴿يَوْمَ يُنفَخُ فِى ٱلصُّورِ فَتَأْتُونَ أَفْوَاجًا﴾ واتە: ئەو ڕۆژەی فوو دەکری بە کەڵەشاخدا ئەوسا پۆل پۆل دێن و خودای گەورەهەواڵی ڕۆژی هەڵاواردنتان دەداتێ ئەو ڕۆژەیش ڕۆژی قیامەتە، کاتەکەی دیاریکراوە لێ ی زیادو کەم ناکرێت، خودا خۆی بەبێ هیچ کەسێ کاتەکەی ئەزانێ، وەك خۆی ئەفەرموێت: ﴿ وَمَا نُؤَخِّرُهُۥٓ إِلَّا لِأَجَلٍ مَّعْدُودٍ﴾واتە: وە ئێمە دوای ناخەین مەگەر بۆ کاتێکی دیارو بەرچاو.﴿يَوْمَ يُنفَخُ فِى ٱلصُّورِ فَتَأْتُونَ أَفْوَاجًا﴾موجاهید ئەڵێت: واتە کۆمەڵ کۆمەڵ، ئیبنو جەریرئەڵێت: واتە هەموو گەلێك لەگەڵ پێغەمبەرەکەیا دێت، وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ يَوْمَ نَدْعُوا۟ كُلَّ أُنَاسٍۭ بِإِمَـٰمِهِمْ﴾ واتە: بیریان بخەنەوە ئەو ڕۆژەی کە ئێمە هەموو ئادەمیەك بانگ دەکەین بەناوی پێغەمبەرەکەیانەوە(بەناوی پەیامەکەیانەوە). بوخاری ڕیوایەتی کردوە لە تەفسیری ئەم ئایەتە کە خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿يَوْمَ يُنفَخُ فِى ٱلصُّورِ فَتَأْتُونَ أَفْوَاجًا﴾ واتە: هەر ئەو ڕۆژەی کە فوو کرا بە کەڵەشاخدا، ئەوسا پۆل پۆل دێنن. ئەبو هورەیرە ئەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) ئەفەرموێت: نێوان هەردو فوەکە چلە وتیان: چل ڕۆژە؟ فەرموی: ناڵێم، وتیان: چل مانگە؟ فەرموی: ناڵێم، گوتیان چل ساڵە؟ فەرموی: ناڵێم؟ پاشان فەرموی: خودای گەورەلە ئاسمانەوە بارانێ ئەبارێنێ مرۆڤەکان سەوز ئەبنەوە وەك چۆن پاقلە سەوز ئەبێتەوە، هەموو شتێکی مرۆڤ ئەفەوتی ئێسکێك نەبێت کە ئەویش کلێنچکەیە(عجبُ الذَّنب) خەڵکی لەوە پێکدێتەوە لەڕۆژی پەسلانا ﴿وَفُتِحَتِ ٱلسَّمَآءُ فَكَانَتْ أَبْوَٰبًا﴾ واتە: وە ئاسمان (لەهەموو لایەکەوە) کرایەوەو بوویە دەرگا. یانی چەند ڕێگایە دەکرێتەوە بۆ دابەزینی فریشتەکان.﴿وَسُيِّرَتِ ٱلْجِبَالُ فَكَانَتْ سَرَابًا﴾ واتە: کەژەکانیش لە شوێنی خۆیان خزێنراون، وەك ئەم فەرمودەیەی خودا کە ئەفەرموێت: ﴿وَتَكُونُ ٱلْجِبَالُ كَٱلْعِهْنِ﴾ واتە: وە شاخەکان وەك خووری شیکراوەیان لێدێت. وە هەروەها لە ئایەتێکی تردا ئەفەرمویت: ﴿ وَتَرَى ٱلْجِبَالَ تَحْسَبُهَا جَامِدَةً وَهِىَ تَمُرُّ مَرَّ

ٱلسَّحَابِ﴾ واتە: وە ئەو کێوو چیایانە دەبینی وا دەزانی دامەزراون(لە شوێنی خۆیاندا) کاتێ فوو کرا بە کەڕەنادا چیاکان وەکو ڕۆشتنی هەور دەڕۆن. وە لێرەدا ئەفەرموێت: ﴿فَكَانَتْ سَرَابًا﴾واتە: ئەوەی ئەڕوانێ بۆی هەست دەکات شتێکە وەك ئاو، کەچی ئاویش نیە، پاشان نامێنێت. وەکو خودای گەورەئەفەرموێت: ﴿وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْجِبَالِ فَقُلْ يَنسِفُهَا رَبِّى نَسْفًا ﴿١٠٥﴾ فَيَذَرُهَا قَاعًا صَفْصَفًا ﴿١٠٦﴾ لَّا تَرَىٰ فِيهَا عِوَجًا وَلَآ أَمْتًا﴾واتە: (ئەی موحەممەد!(ﷺ)پرسیارت لێ دەکەن سەبارەت بە شاخەکان تۆش بڵێ پەروەردگار لە بێخیان دێنێ و وردوخاشیان دەکات، ئینجا پەرشو بڵاویان دەکاتەوە، ئینجا ڕێك و ساف بێئاو و گژوگیا دەیهێڵێتەوە، هیچ جۆرە لاری و بەرزی و نزمیەکی تێدا نابینی. وە ئەفەرموێت: ﴿وَيَوْمَ نُسَيِّرُ ٱلْجِبَالَ وَتَرَى ٱلْأَرْضَ بَارِزَةً﴾ واتە: وە یادیان خەرەوە ڕۆژێ کە شاخەکان دەخەینەڕێ و ڕووی زەوی بەڕوونی و تەختی دەبینی. وە پاشان ئەفەرموێت: ﴿إِنَّ جَهَنَّمَ كَانَتْ مِرْصَادًا﴾ واتە: بە ڕاستی دۆزەخ کەمینی بێ بڕوایانە، واتە بۆسەیە و ئامادەکراوە﴿لِّلطَّٰغِينَ مَـَٔابًا﴾ واتە: بۆسەر بزێوەکان جێی گەڕانەوەیە ﴿لَّٰبِثِينَ فِيهَآ أَحْقَابًا﴾واتە: تێیدا دەمێننەوە هەزاران ساڵ(ماوەیەکی زۆر) واتە لەوێدا ماوەیەکی زۆر گیردەخۆن.خالیدی کوڕی مەعدان ئەڵێت: ئەم ئایەتە وەك ئەو فەرمودەی خودایە کە ئەفەرموێت: ﴿إِلَّا مَا شَآءَ رَبُّكَ﴾واتە: مەگەر ئەو کەسەی پەروەردگارت بیەوێ بۆ کۆمەڵی یەکتاپەرستە ئیبنو جەریر ڕیوایەتی کردووە، ئیبنو جەریریش لەسالیمی وەرگرتوە، ئەڵێت: گوێم لە جەسەن بوو پرسیاری لێ کرا لەم فەرمودە خودای گەورە ﴿لَّٰبِثِينَ فِيهَآ أَحْقَابًا﴾ئەڵێت: (احقاب) بێجگە لە هەتا هەتایی لە ئاگر هیچی تر نیە. بەڵام گوتراوە (حُقُب) حەفتا ساڵەو هەموو ڕۆژێکی وەك هەزار ساڵە لەو ساڵانەی ئێرە کە ئەیژمێرن. سەعیدلە قەتادەوە ئەگوازێتەوە کە ووتوویەتی: خودا ئەفەرمووێ: ﴿لَّٰبِثِينَ فِيهَآ أَحْقَابًا﴾ئەمە کۆتایی نایەت هەر حوقبێك ڕابورد حوقبێکی تر بەدوایدا دێت وە ئەڵێن: حوقبێك هەشتا ساڵە. ڕەبیعی کوڕی ئەنەس ئەڵێت: ﴿لَّٰبِثِينَ فِيهَآ أَحْقَابًا﴾بێجگە لە خودا هیچ کەس ژمارەی ئەحقاب نازانێ، وە پێی وتوین: کە یەك (حقب) هەشتا ساڵە. وەساڵێك سێ سەدو شەست ڕۆژەو هەر ڕۆژێك هەزار ساڵە لەو ساڵانەی کە ئێمە ئەیژمێرین. ئیبنو جەریریش ڕیوایەتی کردوە. خودا دەفەرموێت: ﴿لَّا يَذُوقُونَ فِيهَا بَرْدًا وَلَا شَرَابًا﴾ واتە: لەوێدا نەفێنکی و ساردی دەچێژن نەخواردنەوە. واتە لە دۆزەخدا نەفێنکیان دەست ئەکەوێت و نەخواردنێکی خۆش دەخۆن، بۆیە خودا ئەفەرموێت: ﴿إِلَّا حَمِيمًا وَغَسَّاقًا﴾ واتە: مەگین ئاوەکوڵ و زوخاو. ئەبولعالیە ئەڵێت: ئاوەکوڵی لە فێنکی و خواردنەوەی

خۆشی لەزوخاو جیا کردوەتەوە (هەڵاوردوە) ڕەبیعی کوڕی ئەنەسیش هەروای وتوە. ئاوەکوڵ (حَمِيم) کۆتا ترین پلەی گەرمی و کوڵانە، وە زوخاویش (غَسَّاق) بریتی یە لە زوخاوو ئارەق و زام و فرمێسک کە ئەوەندە ساردو بۆنی پیسە کەس لە توانایدا نیە و بەرگەی ناگرێ (خودا بمان پارێزێ لێی بەڕەحمی خۆی)، وە پاشان ئەفەرموێت ﴿جَزَآءً وِفَاقًا﴾واتە: پاداشی دەدرێتەوە بە پێی کردەوەیان. یانی: ئەمەی کە پێی گەیشتن لەم سزایە بەرانبەری کردەوە ناشیرینەکانی خۆیانە کە لە دونیا ئەیان کردن. موجاهیدو قەتادەو کەسانی تر هەر وایان وتوە. پاشان خودا ئەفەرموێت: ﴿إِنَّهُمْ كَانُوا۟ لَا يَرْجُونَ حِسَابًا﴾ واتە: چونکە ئەوان بەتەما نەبون لێپرسینەوەیەک هەبێ، واتە: باوەڕیان نەبوو کە ڕۆژێك دێت لێپرسینەوەیان لەگەڵ دا دەکرێت و پاداشتی کردەوەکانیان وەردەگرن﴿وَكَذَّبُوا۟ بِـَٔايَـٰتِنَا كِذَّابًا﴾ واتە: ئایەتەکانی ئێمەیان بەدرۆدەزانی، واتە: بەڵگەو نیشانەکانی خوای گەورەیان بەدرۆ دەزانی کە ڕەوانەی کردبوو بۆ پێغەمبەر(ﷺ)وە ئەفەرموێت: ﴿وَكُلَّ شَىْءٍ أَحْصَيْنَـٰهُ كِتَـٰبًا﴾ واتە: لە کاتێکدا هەموو شتێکمان هەژمار کردووە لە سەریان(بەنوسین). واتە ئاگامان لە هەموو کردەوەکانیانەو نوسیوومانە لەسەریان، زوو پاداشتیان ئەدەینەوە ئەگەر چاك بوو بە چاکەو ئەگەر خراپیش بوو بە خراپە. وە پاشان ئەفەرموێت: ﴿فَذُوقُوا۟ فَلَن نَّزِيدَكُمْ إِلَّا عَذَابًا﴾ واتە: ئینجا بچەژن سزای خۆتان هیچتان بۆ زیاد ناکەین سزا نەبێت. یانی: بەدۆزەخیەکان دەوترێ: بچەژن ئەو ئاگرەی لەناویدان سزاشتان بۆ زیاد ئەکەین. قەتادە ریوایەتی کردووە لە ئەبو ئەیوبی ئەزدیەوە ئەویش لە عەبدولای کوڕی عومەرەوە کەئەڵێت: لەم ئایەتە توندتر دانەبەزیوەتە خوارەوە بۆ جەهەنەمیەکان﴿فَذُوقُوا۟ فَلَن نَّزِيدَكُمْ إِلَّا عَذَابًا﴾ ئەڵێت: ئەوانە هەتا هەتایە لە سزادان.

﴿إِنَّ لِلْمُتَّقِينَ مَفَازًا ﴿٣١﴾ حَدَآئِقَ وَأَعْنَـٰبًا ﴿٣٢﴾ وَكَوَاعِبَ أَتْرَابًا ﴿٣٣﴾ وَكَأْسًا دِهَاقًا ﴿٣٤﴾ لَّا يَسْمَعُونَ فِيهَا لَغْوًا وَلَا كِذَّٰبًا ﴿٣٥﴾ جَزَآءً مِّن رَّبِّكَ عَطَآءً حِسَابًا ﴿٣٦﴾﴾

## سەرکەوتنی گەورە بۆ پارێزگارانە(المتقين)

خودای گەورەباس و هەواڵی ئەو خۆشبەختانەمان بۆ دەکات وە ئەوەی بۆی ئامادە کردون لەڕێزوخۆشی بەردەوام، وەك ئەفەرموێت: ﴿إِنَّ لِلْمُتَّقِينَ مَفَازًا﴾واتە: بۆ پارێز گارانیش جێگەی بە ئاوات گەیشتن هەیە. ئیبنو عەباس و زەححاك ئەڵێن: باخی ڕازاوە قەتادەو موجاهیدئەڵێن: گەیشتن بە ئاوات و رزگاریان بوو لە ئاگر. دیارە لێرەدا قسەی ئیبنو عەباس بەجێ ترە، چونکە پاش ئەم ئایەتە فەرمویەتی: ﴿حَدَآئِقَ﴾ واتە: باخات، واتە: باخی خورما و غەیرەز خورما ﴿حَدَآئِقَ وَأَعْنَـٰبًا﴾ واتە: باخات وە هەموو جۆرە ترێ یەك﴿وَكَوَاعِبَ أَتْرَابًا﴾ واتە: وە کچانی تازە مەمك کردووی هاوتەمەن، واتە سپی

مەمك خڕ، ئیبنو عەباس و موجاهیدو کەسانی تریش وایان وتوە﴿وَكَوَاعِبَ﴾ واتە: مەمك خڕن، مەمکیان شۆڕ نەبوەتەوە، چونکە کیژن و خۆشەویست و هاوتەمەنن. وەکو لە پێشەوە باس کرا لە سورەتی واقیعە دا. وە ئەفەرموێت: ﴿وَكَأْسًا دِهَاقًا﴾ واتە: وە پەرداخی پڕلە شەراب. ئیبنو عەباس ئەڵێت: پڕی یەك لەدوای یەك، عیکریمەئەڵێت: ڕوون، موجاهیدوحەسەن و قەتادەو ئیبنو زەیدیش هەروایان وتوە﴿لَا يَسْمَعُونَ فِيهَا لَغْوًا وَلَا كِذَّابًا﴾ واتە: قسەی بێهودە و درۆی تێدا نابیستن. ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە وایە کە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿لَّا لَغْوٌ فِيهَا وَلَا تَأْثِيمٌ﴾واتە: نە قسەی پڕوپوچی تێدایەو نە گوناهکردن. وە پاشان ئەفەرموێت: ﴿جَزَاءً مِّن رَّبِّكَ عَطَاءً حِسَابًا﴾ واتە: پاداشی دەدرێتەوە بەپاداشتێکی تەواو لە لایەن پەروەردگاری تۆوە. یانی: ئەمەی کە باسمان کرد خودا پێی داون پاداشتی داونەتەوە بەچاکەو بەخشندەیی و بەزەیی خۆی بێبڕانەوە واتە بەتێرو تەواوی و زۆر بەزیادیشەوە، عەرەب دەڵێ: خەڵاتی کردم بە تەواوی، واتە: بەسمە(کفانی) وەك ئەمە(حَسْبِيَ اللهُ) واتە تەنیا خودام بەسە.

﴿رَّبِّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا الرَّحْمَٰنِ ۖ لَا يَمْلِكُونَ مِنْهُ خِطَابًا ﴿٣٧﴾ يَوْمَ يَقُومُ الرُّوحُ وَالْمَلَائِكَةُ صَفًّا ۖ لَّا يَتَكَلَّمُونَ إِلَّا مَنْ أَذِنَ لَهُ الرَّحْمَٰنُ وَقَالَ صَوَابًا ﴿٣٨﴾ ذَٰلِكَ الْيَوْمُ الْحَقُّ ۖ فَمَن شَاءَ اتَّخَذَ إِلَىٰ رَبِّهِ مَآبًا ﴿٣٩﴾ إِنَّا أَنذَرْنَاكُمْ عَذَابًا قَرِيبًا يَوْمَ يَنظُرُ الْمَرْءُ مَا قَدَّمَتْ يَدَاهُ وَيَقُولُ الْكَافِرُ يَا لَيْتَنِي كُنتُ تُرَابًا ﴿٤٠﴾﴾

## هیچ کەس ناتوانێ لەبەردەم خودای گەورەدا قسە بکات( بدوێ )هەتتا فریشتەکانیش مەگەر دوای مۆڵەت دان

خودای گەورەباسی گەورەیی و دەسەڵاتی خۆیمان بۆ ئەکات کە پەروەردگاری ئاسمانەکان و و زەمینەو ئەوەیشی کە لە نێوانیاندایە وە زۆر بە بەزەییەو بەزەییەکەی هەموو شتێکی گرتۆتەوە، وەك ئەفەرموێت: ﴿رَّبِّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا الرَّحْمَٰنِ ۖ لَا يَمْلِكُونَ مِنْهُ خِطَابًا﴾ واتە: کەس ناتوانێ بدوێ لە خزمەتیا ئەگەر خۆی مۆڵەتی نەدات، وەك خۆی ئەفەرموێت: ﴿مَن ذَا الَّذِي يَشْفَعُ عِندَهُ إِلَّا بِإِذْنِهِ﴾ واتە: کێیە ئەو کەسەی لەو ڕۆژە کە دێت هیچ کەس قسە ناکات مەگەر بەمۆڵەتی خوا. وە ئەفەرموێت: ﴿يَوْمَ يَقُومُ الرُّوحُ وَالْمَلَائِكَةُ صَفًّا ۖ لَّا يَتَكَلَّمُونَ إِلَّا مَنْ أَذِنَ لَهُ الرَّحْمَٰنُ وَقَالَ صَوَابًا﴾ واتە: ڕۆژێك کە جوبرەئیل و فریشتەکان هەموو بەڕیز ڕاوەستاون قسە ناکەن، مەگین کەسێ ئەوخودای بەخشندە ئیزنی پێ دابێت ئەویش قسەیەکی چاك بکات. مەبەست لێرەدا لە (روح) جوبرەئیلە، شەعبی و سەعیدی کوڕی جوبەیرو زەححاك وتویانە: وەك خودای گەورەئەفەرموێت: ﴿نَزَلَ بِهِ الرُّوحُ الْأَمِينُ ﴿١٩٣﴾ عَلَىٰ قَلْبِكَ لِتَكُونَ مِنَ الْمُنذِرِينَ﴾

واتە: جوبرەئیلی ئەمین هێنایە خوارەوە، بۆ سەردڵی تۆ بۆ ئەوەی لە ترسێنەران بی. موقاتیلی کوڕی حەییان ئەڵێت: جوبرەئیل بەڕێزترین ونزیکترین فریشتەیە لەلای خوداو خاوەنی تکایشە. وە ئەم فەرمودەیەی خودا: ﴿إِلَّا مَنْ أَذِنَ لَهُ الرَّحْمَٰنُ﴾ وەك ئەم فەرمودەیە وایە کە ئەفەرموێت: ﴿لَا تَكَلَّمُ نَفْسٌ إِلَّا بِإِذْنِهِ﴾واتە: هیچ کەسێ قسە ناکات مەگەر بە مۆڵەتی خودا. لەفەرمودەی سەحیحدا هاتوە کە پێغەمبەر(ﷺ) ئەفەرمویت: لەو ڕۆژەدا پێغەمبەران نەبێ کەس قسە ناکات ﴿وَقَالَ صَوَابًا﴾ واتە: هەقی وتبێ، وە (لا إله إلا الله) ئەو قسە هەقەیە، وەك ئەبو سالح و عیکریمە وتویانە. پاشان ئەفەرموێت: ﴿ذَٰلِكَ الْيَوْمُ الْحَقُّ فَمَن شَاءَ اتَّخَذَ إِلَىٰ رَبِّهِ مَآبًا﴾ واتە: ڕۆژێ دێت کە ڕۆژی ڕاستیە، سا هەر کەسێ کە پێ ی خۆشە بارێبازی گەڕانەوە بەرەو لای پەروەردگاری خۆی بگرێتە بەر و بیکاتە بەرنامەیە بۆ خۆی و لەسەری بڕوات.

**ڕۆژی سەلا(قیامەت)نزیکە**

خودای گەورەئەفەرموێت: ﴿إِنَّا أَنذَرْنَاكُمْ عَذَابًا قَرِيبًا يَوْمَ يَنظُرُ الْمَرْءُ مَا قَدَّمَتْ يَدَاهُ وَيَقُولُ الْكَافِرُ يَا لَيْتَنِي كُنتُ تُرَابًا﴾ واتە: بێگومان ئێمە ئێوەمان ئاگادار کرد لە سزایەکی نزیك لە ڕۆژێکی وادا کە مرۆڤ دەبینێ پاداشتی ئەو کردەوانەی کە پێشەکی بە دەستی خۆشی ناردوونی، وە بێبڕوا لەو ڕۆژەدا دەڵێ: کاشکای گڵێ بوومایەنەك مرۆڤ. ئەم فەرمودەیەی خودا کە ئەفەرموێت: ﴿إِنَّا أَنذَرْنَاكُمْ عَذَابًا قَرِيبًا﴾واتە: ڕۆژی سەلا بێگومان هاتنی نزیك بوەتەوە چونکە هەموو شتێ نزیك بێت دێت﴿يَوْمَ يَنظُرُ الْمَرْءُ مَا قَدَّمَتْ يَدَاهُ﴾ واتە: هەموو کردەوەکانی چاك و خراپ کۆن و تازە ئەخرێتە بەردەمی. وەك ئەم فەرمودانە: ﴿وَوَجَدُوا مَا عَمِلُوا حَاضِرًا﴾ واتە: هەر کردەوەیەکیان کردبێ تیایدائامادەیە. وە ئەفەرموێت: ﴿يُنَبَّأُ الْإِنسَانُ يَوْمَئِذٍ بِمَا قَدَّمَ وَأَخَّرَ﴾واتە: لەو ڕۆژەدا ئادەمی هەواڵی پێ دەدرێت لەوەی کە پێشی خستوە و دوای خستوە لە چاکەو خراپە ﴿وَيَقُولُ الْكَافِرُ يَا لَيْتَنِي كُنتُ تُرَابًا﴾ واتە: خوانەناس لەو ڕۆژەدا ئاوات دەخوازێ خاك بوایەك لەدنیادا لەدایك نەبوایە و لەدنیادا نەژیایە، کاتێ سزای خودا دەبینێ و سەیری کردەوە پیسەکانی خۆی دەکات، کە بەدەستی ڕاسپاردە گەلێ هەڵبژاردەی بەئەمەك نوسراوەتەوە. وتراوە: کاتێ خودای گەورە فەرمانی خۆی بەدی دێنێ لە نێوان زیندەوەران دا، بەدادپەروەری خۆی حەقی مەڕی کۆڵ بەسەرمەڕی شاخدارەوە نامێڵێ، کاتێ فرمانی خۆی بەجێ هێنا لە نێوانیاندا پێیان ئەفەرموێت: ببنەوە بەخاك! ئەبنەوە بەخاك، ئالەوێدا خوانەناس دەڵێ: ﴿يَا لَيْتَنِي كُنتُ تُرَابًا﴾ واتە:

خۆزگە زیندەوەر بومایەو بچومایەتەوە ناو خاك. ئەم مانایە هاتوە لە فەرمودەی کەڵەشاخداکە پێغەمبەر(ﷺ)باسی کردوە، وە ئەم مانایە لە ئەبو هورەیرەو عەبدوڵای کوڕی عەمرەوە هاتوە.

## سورەتی (النازعات)

## لەمەککەدا هاتووەتە خوارەوە

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿وَٱلنَّٰزِعَٰتِ غَرۡقٗا ١ وَٱلنَّٰشِطَٰتِ نَشۡطٗا ٢ وَٱلسَّٰبِحَٰتِ سَبۡحٗا ٣ فَٱلسَّٰبِقَٰتِ سَبۡقٗا ٤ فَٱلۡمُدَبِّرَٰتِ أَمۡرٗا ٥﴾

### سوێند بە پێنج باس لەسەر هاتنی ڕۆژی سەڵا

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَٱلنَّٰزِعَٰتِ غَرۡقٗا﴾ واتە: سوێند بەو فریشتانەی کە گیانی کافران (لەلەشیان) بەسەختی دەردەهێنن﴿وَٱلنَّٰشِطَٰتِ نَشۡطٗا﴾ واتە: سوێد بەو فریشتانەی کە گیانی باوەڕدارن بە ئاسانی دەردێنن.﴿وَٱلسَّٰبِحَٰتِ سَبۡحٗا﴾ واتە: وە سوێند بەو فریشتانەی کە خێرا فەرمانی خوا جێبەجێ دەکەن. ﴿فَٱلسَّٰبِقَٰتِ سَبۡقٗا﴾ واتە: وە سوێند بەو فریشتانەی کە پێشبڕکێ دەکەن لە بەجێهێنانی فەرماندا. ﴿فَٱلۡمُدَبِّرَٰتِ أَمۡرٗا﴾واتە: وە سوێند بەو فریشتانەی کە تەگبیری کاروبار دەکەن، واتە: سوێند بە مانە، ئەوەی بەڵێنتان پێدراوە دێتە دی. ئیبنو مەسعوودو ئیبنو عەباس و مەسروق و سەعیدی کوڕی جوبەیرو ئەبو سالح و ئەبو زوحا وسودی ئەڵێن: ﴿وَٱلنَّٰزِعَٰتِ غَرۡقٗا﴾ واتە: فریشتە کاتێ دەست بەگیان کێشانی نەوەی ئادەم دەکەن. هەندێکیان زۆر بە قورسی و گرانی گیان ئەکێشن، وە هەندێکی تریان زۆر بەسوك و ئاسانی گیان ئەکێشن وەك لە شوێنێکەوە بچێت بۆ شوێنێکی تر، وەك لەم ئایەتەدا ئەفەرموێت: ﴿وَٱلنَّٰشِطَٰتِ نَشۡطٗا﴾ ئیبنو عەباس یش هەروای وتوە. ئەم فەرمودەیەی خودا کە ئەفەرموێت: ﴿وَٱلسَّٰبِحَٰتِ سَبۡحٗا﴾ ئیبنو مەسعودئەڵێت: ئەوە فریشتەیە. وە لە علی وموجاهیدو سەعیدی کوڕی جوبەیرو ئەبو سالحەوە هەر وەك ئەو ڕیوایەت کراوە.وە ئەفەرموێت: ﴿فَٱلسَّٰبِقَٰتِ سَبۡقٗا﴾ لە عەلی و مەسروق و موجاهیدو ئەبو سالح وحەسەنی بەسریەوە ڕیوایەت کراوە یانی فریشتە. وە ئەفەرموێت. ﴿فَٱلۡمُدَبِّرَٰتِ أَمۡرٗا﴾ عەلی و موجاهیدو عەتاو ئەبو سالح و حەسەن و قەتادەو ڕەبیعی کوڕی ئەنەس و سودی ئەڵێن: یانی فریشتە. حەسەن ئەمەی خستوەتە سەر کە فریشتەکان کارەکان بەڕێوە دەبن لە ئاسمانەوە بۆ زەمین بەفەرمانی خودایان.

## شێوەی قیامەت و حاڵی خەڵكی و ووتووێژیان تیایدا

﴿يَوْمَ تَرْجُفُ ٱلرَّاجِفَةُ ﴿٦﴾ تَتْبَعُهَا ٱلرَّادِفَةُ ﴿٧﴾ قُلُوبٌ يَوْمَئِذٍ وَاجِفَةٌ ﴿٨﴾ أَبْصَٰرُهَا خَٰشِعَةٌ ﴿٩﴾ يَقُولُونَ أَءِنَّا لَمَرْدُودُونَ فِى ٱلْحَافِرَةِ ﴿١٠﴾ أَءِذَا كُنَّا عِظَٰمًا نَّخِرَةً ﴿١١﴾ قَالُوا۟ تِلْكَ إِذًا كَرَّةٌ خَاسِرَةٌ ﴿١٢﴾ فَإِنَّمَا هِىَ زَجْرَةٌ وَٰحِدَةٌ ﴿١٣﴾ فَإِذَا هُم بِٱلسَّاهِرَةِ ﴿١٤﴾﴾

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿يَوْمَ تَرْجُفُ ٱلرَّاجِفَةُ﴾ واتە: لە ڕۆژێكدا (فوو دەكرێ بەشەیپوردا) بومەلەرزە زەوی دەلەرزێنێ ﴿تَتْبَعُهَا ٱلرَّادِفَةُ﴾ واتە: دووبارە فوی پیا دەكرێتەوە بومەلەرزەیەكی تریشی بەدوادادێت (مردووان زیندوو دەبنەوە). خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿يَوْمَ تَرْجُفُ ٱلرَّاجِفَةُ ﴿٦﴾ تَتْبَعُهَا ٱلرَّادِفَةُ فَمَن﴾ ئیبنو عەباس ئەڵێت: ئەمە دووفوو پیاكردنەكەیە، فووی یەكەم و فووی دوهەم. موجاهیدو حەسەن و قەتادەو زەححاك و كەسانی تریش هەروایان وتوە. موجاهید ئەڵێت: یەكەمیان ﴿يَوْمَ تَرْجُفُ ٱلرَّاجِفَةُ﴾ وەك ئەم ئایەتە وایە: ﴿يَوْمَ تَرْجُفُ ٱلْأَرْضُ وَٱلْجِبَالُ﴾ واتە: لە ڕۆژێكدا كە زەوی و چیاكان دێنە لەرزە. لەرزینی دووهەمیان وەك ئەم ئایەتەیە: ﴿وَحُمِلَتِ ٱلْأَرْضُ وَٱلْجِبَالُ فَدُكَّتَا دَكَّةً وَٰحِدَةً﴾ واتە: وە زەوی و شاخەكان هەڵگیران بەجارێك دران بەیەكدا و تەخت كران ﴿قُلُوبٌ يَوْمَئِذٍ وَاجِفَةٌ﴾ واتە: زۆر دڵ لەو ڕۆژەدا دەلەرزێ﴿أَبْصَٰرُهَا خَٰشِعَةٌ﴾ یانی: چاوی خاوەنەكانیان، بۆیە دراونەتە پاڵ یەك لەبەر ئەوەی كە بەیەكەوەن یانی: بێنرخ و سەرشۆڕ بەهۆی ئەو هەموو ناخۆشیەوە كە توشیان بووە. ﴿يَقُولُونَ أَءِنَّا لَمَرْدُودُونَ فِى ٱلْحَافِرَةِ﴾ واتە: ئەڵێن: ئاخۆ دەمانگێڕنەوە سەرزەمین؟ یانی: بتپەرستانی قورەیش و ئەو كەسانەیش كە ئینكاری ڕۆژی قیامەت ئەكەن وەك ئەوان زیندوو بوونەوە بەدور ئەزانن دوای ڕۆیشتن بۆ ناوگۆڕ، (الحافرە) یانی: گۆڕستان، موجاهید وتیەتی. وە دوای پەلپەلبوونی لاشەیان و ڕزان و كلۆربونی پێشەیان. لەبەر ئەوە وتویانە: ﴿أَءِذَا كُنَّا عِظَٰمًا نَّخِرَةً﴾ واتە: ئایا كە بووین بە ئێسقانی ڕزیو چۆن زیندوو دەبینەوە. وەبە (ناخرة)یش خوێنراوەتەوە. ئیبو عەباس و موجاهیدو قەتادە وتویانە (ناخرە)یانی: (بالیة) و ئەویش یانی: كلۆر بوون. یبنو عەباس وتویەتی: ئێسقان كاتێ كلۆر بو هەوای تێ ئەچێت.﴿قَالُوا۟ تِلْكَ إِذًا كَرَّةٌ خَاسِرَةٌ﴾ واتە: ووتیان: ئا ئەوە ئەگەر وابێ گەڕانەوەیەكی بەزیانە. موحەممەدی كوڕی كەعب ئەڵێت: قوڕەیش وتویانە ئەگەر خودا دوای مردن زیندومان بكاتەوە دۆڕاندومانە.﴿فَإِنَّمَا هِىَ زَجْرَةٌ وَٰحِدَةٌ﴾ واتە: بێگومان ئەو زیندووبوونەوەیە هەر یەك نەعرەتەیە ﴿فَإِذَا هُم بِٱلسَّاهِرَةِ﴾ واتە: ئیتر كوتوپڕوان لەدەشتێكی سپی كاكی بەكاكیدا. خودافەرمان دەكات بە ئیسرافیل

فوو دەكات بە كەڵەشاخا ئەم فووە فووی زیندوو بوونەوەیە، ئەو سا پێشینان و ئەوانەیشی لە دوای هاتون هەموو ڕاست ئەبنەوە لەبەردەم پەروەردگاریاندا و بەچاوی خۆیان ئەبینن وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿يَدْعُوكُمْ فَتَسْتَجِيبُونَ بِحَمْدِهِ وَتَظُنُّونَ إِن لَّبِثْتُمْ إِلَّا قَلِيلًا﴾ واتە: ئەو ڕۆژەی كە بانگتان دەكەن (لەگۆڕەكانتانەوە) جائێوەش دەست بەجێ دێن بەدەم بانگكردنەكەوە بە سوپاس و سەنا كردنەوەو وادەزانن نەماونەتەوە(لە دنیا دا) ماوەیەكی كەم نەبێت. وە ئەفەرموێت: ﴿وَمَا أَمْرُنَا إِلَّا وَاحِدَةٌ كَلَمْحٍ بِالْبَصَرِ﴾ واتە: وە فەرمانی ئێمە تەنها یەك جارە وەك چاو تروكانێك(وایە لە خێراییدا). وە ئەفەرموێت: ﴿وَمَا أَمْرُ السَّاعَةِ إِلَّا كَلَمْحِ الْبَصَرِ أَوْ هُوَ أَقْرَبُ﴾واتە: وە هاتنی ڕۆژی دوایش بەلای خواوەهەروەكو چاوتروكاندنێك وایە یان نزیك تر لەوەش. وە ئەفەرموێت: ﴿فَإِذَا هُم بِالسَّاهِرَةِ﴾ ئیبنو عەباس ئەڵێت: ﴿السَّاهِرَةِ﴾ واتە: زەمین هەمووی، هەروەهاسەعیدی كوڕی جوبەیرو قەتادەو ئەبو ساڵح و حەسەن و زەحجاك و ئیبنو زەیدئەڵێن: ﴿السَّاهِرَةِ﴾ واتە: ڕووی زەمین. موجاهیدیش ئەڵێت: لە ژێری زەویدا بوون، هێنرانە سەر زەوی، دیسان ئەڵێت: ﴿بالسَّاهِرَةِ﴾ واتە: شوێنی تەخت. وە ڕەبیعی كوڕی ئەنەس ئەڵێت: ﴿فَإِذَا هُم بِالسَّاهِرَةِ﴾وەك ئەم ئایەتە وایە كە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ يَوْمَ تُبَدَّلُ الْأَرْضُ غَيْرَ الْأَرْضِ وَالسَّمَاوَاتُ وَبَرَزُوا لِلَّهِ الْوَاحِدِ الْقَهَّارِ﴾ واتە: لە ڕۆژێكدا كە ئەم زەویە دەگۆڕێ بە زەویەكی ترو ئاسمانەكانیش دەگۆڕێن بە ئاسمانی تر ئەوسا هەموو لەگۆڕەكانیان دێنە دەرەوە دەردەكەون بۆ خوای تەنیای زاڵ بەسەر هەموو شتێكدا وە ئەفەرموێت: ﴿وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الْجِبَالِ فَقُلْ يَنسِفُهَا رَبِّي نَسْفًا ﴿١٠٥﴾ فَيَذَرُهَا قَاعًا صَفْصَفًا ﴿١٠٦﴾ لَّا تَرَىٰ فِيهَا عِوَجًا وَلَا أَمْتًا﴾ واتە: ئەی موحەممەد(ﷺ)! پرسیارت لێ دەكەن سەبارەت بە شاخەكان تۆش بڵێ: پەروەردگار لە بێخیان دێنێ و وورد و خاشیان دەكات ئینجا با پرژو بڵاویان دەكاتەوە، ئینجا ڕێك و ساف بێ ئاووگژوگیا دەیهێڵێتەوە، نابینی تێیدا هیچ جۆرە لاری و بەرزی و نزمیەك. وە ئەفەرموێت: ﴿ وَيَوْمَ نُسَيِّرُ الْجِبَالَ وَتَرَى الْأَرْضَ بَارِزَةً﴾ واتە: وە یادیان خەرەوە ڕۆژێ كە شاخەكان دەخەینە ڕێ وڕووی زەوی بەڕوونی و تەختی دەبینی. ئەوزەمینەی كە كێوەكانی لەسەر دێتە بەر چاو، بەم زەمینە دانانرێ چونكە ئەو زەمینە تاوانی لەسەر نەكراوە و خوێنیشی لەسەر نەڕژاوە.

﴿هَلۡ أَتَىٰكَ حَدِيثُ مُوسَىٰٓ ﴿١٥﴾ إِذۡ نَادَىٰهُ رَبُّهُۥ بِٱلۡوَادِ ٱلۡمُقَدَّسِ طُوًى ﴿١٦﴾ ٱذۡهَبۡ إِلَىٰ فِرۡعَوۡنَ إِنَّهُۥ طَغَىٰ ﴿١٧﴾ فَقُلۡ هَل لَّكَ إِلَىٰٓ أَن تَزَكَّىٰ ﴿١٨﴾ وَأَهۡدِيَكَ إِلَىٰ رَبِّكَ فَتَخۡشَىٰ ﴿١٩﴾ فَأَرَىٰهُ ٱلۡأٓيَةَ ٱلۡكُبۡرَىٰ ﴿٢٠﴾ فَكَذَّبَ وَعَصَىٰ ﴿٢١﴾ ثُمَّ أَدۡبَرَ يَسۡعَىٰ ﴿٢٢﴾ فَحَشَرَ فَنَادَىٰ ﴿٢٣﴾ فَقَالَ أَنَا۠ رَبُّكُمُ ٱلۡأَعۡلَىٰ ﴿٢٤﴾ فَأَخَذَهُ ٱللَّهُ نَكَالَ ٱلۡأٓخِرَةِ وَٱلۡأُولَىٰٓ ﴿٢٥﴾ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَعِبۡرَةً لِّمَن يَخۡشَىٰٓ ﴿٢٦﴾﴾

**باسی بەسەرهاتی مووسا، پەند بۆ کەسێ کە لەخوا بترسێ**

خوای گەورە هەواڵ ئەدا بە پێغەمبەرەکەی موحەممەد(ﷺ) لەبارەی بەندەی خۆی مووسا(سەلامی خوای لێ بێت) کە ناردی بۆ لای فیرعەون و پشتگیری لێکرد بە موعجیزە، لەگەڵ ئەو هەموو موعجیزەشدا هەر لەسەر ئەو بتپەرستی و لاساریەی ڕۆیشت و کۆڵی نەدا تا خودا بە توندی تۆڵەی لێسەند و لەناوی برد. هەر بەم شێوەیە پاشەڕۆژی ئەوانەیش کە باوەڕ ناهێنن بەو قورئانەی کە تۆ هێناوتەوەو دژایەتیت دەکەن. بۆیە خودای گەورە لەکۆتایی باسەکەدا ئەفەرموێت: ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَعِبۡرَةً لِّمَن يَخۡشَىٰٓ﴾ واتە: بە ڕاستی لەم داستانەدا پەند هەیە بۆ کەسێك کە لەخوا بترسێ. خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿هَلۡ أَتَىٰكَ حَدِيثُ مُوسَىٰٓ﴾ واتە: ئایاداستانی موسات پێ گەیشتوە؟ ﴿إِذۡ نَادَىٰهُ رَبُّهُۥ﴾ واتە: بانگی کردو قسەی لەگەڵ کرد ﴿بِٱلۡوَادِ ٱلۡمُقَدَّسِ طُوًى﴾ واتە: کاتێ: کە پەروەردگاری بانگی کرد لە کێوی پیرۆزی طوواوە و فەرمووی: ﴿ٱذۡهَبۡ إِلَىٰ فِرۡعَوۡنَ إِنَّهُۥ طَغَىٰ﴾ واتە: برۆ بۆ سەر فیرعەون چونکە بەڕاستی یاخی بووە. یانی سەربزێو ولەئەندازە دەرچوو بێ گوێیە.﴿فَقُلۡ هَل لَّكَ إِلَىٰٓ أَن تَزَكَّىٰ﴾ واتە: وە پێی بڵێ: ئایا دەتەوێ پاك ببیتەوە لەگوناه؟ یانی پێی بڵێ: ئەتەوێت شێوازێك یا ڕێبازێك بگریتە بەر پێی پاك ببیتەوە و پارێزراو بیت وگوێت لێ بگیرێ ﴿وَأَهۡدِيَكَ إِلَىٰ رَبِّكَ فَتَخۡشَىٰ﴾ واتە: وەڕێت نیشاندەم بۆ (ناسینی)پەروەردگارت تا لێی بترسیت. ﴿وَأَهۡدِيَكَ إِلَىٰ رَبِّكَ﴾ یانی: ڕێگای خواناسیت پیشاندەم﴿فَتَخۡشَىٰ﴾واتە: تا دڵت وای لێ بێ بێتە لەرزە و گوێڕایەڵ بیت بۆ خوا دوای ئەوەی کە ڕەق و پیس و دوز بووە لەچاکە﴿فَأَرَىٰهُ ٱلۡأٓيَةَ ٱلۡكُبۡرَىٰ﴾ واتە: ئینجا نیشانە هەرە گەورەکەی نیشان دا. واتە: مووسا لەگەڵ ئەو بانگەوازە ڕاستەدا بەڵگەو نیشانەی بەهێزی پیشان دا لەسەر ڕاستی ئەو پەیامەی بۆی هاتووە لە لای خوداوە. ﴿فَكَذَّبَ وَعَصَىٰ﴾ واتە: کەچی بە درۆی زانی و سەرپێچی کرد. یانی: باوەڕی بە ڕاستی نەکردو ئەو فەرمانەیشی پێ کرا بوو دژایەتی کرد. سەر ئەنجام ئەوەبو باوەڕ لە دڵیدا نەبووە ڕوخسارو دەروونی دانەچڵەکا، وە ئەیزانی ئەوەی بۆ مووسا هاتوە ڕاستە بەڵام پێویست نییە ئەو باوەڕی پێی هەبێ. چونکە تێگەیشتن زانیاری دڵە، و باوەڕیش هەڵسانە پێی، ئەویش

گوێڕایەڵی و خۆبەدەستەوە دانە بۆی. ﴿ثُمَّ أَدْبَرَ يَسْعَىٰ﴾ واتە: لە پاشان پشتی هەڵکردو ڕۆی بەپەلە. یانی بۆ وەستان بەرانبەر بەڕاستی بە هەندێ شتی پڕو پوچ، ئەویش بە کۆکردنەوی جادوگەرەکان بەرانبەر ئەوەی کە مووسا بۆی هاتوە لەو هەموو موعجیزەیە. ﴿فَحَشَرَ فَنَادَىٰ﴾ واتە: ئینجا جادوگەرانی کۆکردەوە و بانگیکرد. واتە: لەناو دارو دەستەکەیا. ﴿فَقَالَ أَنَا رَبُّكُمُ الْأَعْلَىٰ﴾ واتە: ووتی: من پەروەردگاری هەرە گەورەتانم. ئیبنو عەباس و موجاهیدئەڵێن: ئەمە قسەی فیرعەونە، پاش ئەوە بوو کە ئەڵێت: گومان نابەم چل ساڵ ئەبێت بێجگە لەمن هیچ خوایەك بووبێ. خودای گەورەئەفەرموێت: ﴿فَأَخَذَهُ اللَّهُ نَكَالَ الْآخِرَةِ وَالْأُولَىٰ﴾ واتە: ئینجا خوا گرفتاری کرد بە سزای هەردوو جیهان. یانی: خودا تۆڵەی لێسەندەوە و کردیە پەندی زەمانە بۆ ئەو کەسانەی کە بەلەسەو یاخی دەبن لەدنیادا. ﴿يَقْدُمُ قَوْمَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فَأَوْرَدَهُمُ النَّارَ ۖ وَبِئْسَ الْوِرْدُ الْمَوْرُودُ﴾ واتە: فرعەون پێشی قەومەکەی ئەکەوێت لە ڕۆژی دوایشدا چەند خراپە ئەو بەخشراوەی پێیان بەخشراوە، وەك خودا ئەفەرموێت: ﴿وَجَعَلْنَاهُمْ أَئِمَّةً يَدْعُونَ إِلَى النَّارِ ۖ وَيَوْمَ الْقِيَامَةِ لَا يُنصَرُونَ﴾ واتە: ئەوانمان کردە پیشەوایانێك کە خەڵك بانگ دەکەن بۆ ئاگری دۆزەخ وە لە ڕۆژی دوایشدا یارمەتی نادرێن. وە پاشان ئەفەرموێت: ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَعِبْرَةً لِّمَن يَخْشَىٰ﴾ واتە: بە ڕاستی لەم داستانەدا پەند هەیە بۆ کەسێك کە لە خوا بترسێ. یانی بۆ کەسێ کە ئامۆژگاری و پەند وەرگرێ.

﴿أَأَنتُمْ أَشَدُّ خَلْقًا أَمِ السَّمَاءُ ۚ بَنَاهَا ﴿٢٧﴾ رَفَعَ سَمْكَهَا فَسَوَّاهَا ﴿٢٨﴾ وَأَغْطَشَ لَيْلَهَا وَأَخْرَجَ ضُحَاهَا ﴿٢٩﴾ وَالْأَرْضَ بَعْدَ ذَٰلِكَ دَحَاهَا ﴿٣٠﴾ أَخْرَجَ مِنْهَا مَاءَهَا وَمَرْعَاهَا ﴿٣١﴾ وَالْجِبَالَ أَرْسَاهَا ﴿٣٢﴾ مَتَاعًا لَّكُمْ وَلِأَنْعَامِكُمْ ﴿٣٣﴾﴾

## دروست کردنی ئاسمانەکان و زەمین گرانترە لەوەدی هێنانەوەی خەڵك

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿أَأَنتُمْ أَشَدُّ خَلْقًا أَمِ السَّمَاءُ ۚ بَنَاهَا﴾ ئایا وەدی هێنانی ئاسمان دژوارترە لەئێوە؟ وەك خودای گەورەئەفەرموێت: ﴿لَخَلْقُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ أَكْبَرُ مِنْ خَلْقِ النَّاسِ﴾ واتە: بەڕاستی بەدیهێنانی ئاسمانەکان و زەوی گەورەترە لەبەدیهێنانی خەڵکی. وە ئەفەرموێت: ﴿أَوَلَيْسَ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ بِقَادِرٍ عَلَىٰ أَن يَخْلُقَ مِثْلَهُم ۚ بَلَىٰ وَهُوَ الْخَلَّاقُ الْعَلِيمُ﴾ واتە: ئایا دەزانی ئەو کەسەی کە ئاسمانەکان و زەوی بەدیهێناوە ناتوانێ وێنەیان دروست بکات؟ بەڵێ دەتوانێ، هەر ئەویش دروستکەری زانایە. (بَنَاهَا) تەفسیری کردوە بەم ئایەتە﴿رَفَعَ سَمْكَهَا فَسَوَّاهَا﴾واتە: بالای بەرز

کردەوەو ڕێکی خست. واتە: قەوارەی بەرز کردەوەتەوەو درەنگتر لەناو ئەچێ، لەبار کراوەو ڕازاوەتەوە بەکۆمەڵە ئەستێرەیەك لەشەوی تاریکا. وە ئەفەرموێت: ﴿وَأَغْطَشَ لَيْلَهَا وَأَخْرَجَ ضُحَاهَا﴾واتە: وەشەوی تاریك کردو دەری خست ڕوناکی ڕۆژی. یانی: شەوی زۆر ڕەش و تاریك و ڕۆژیشی زۆر ڕۆشن و پرنگدار و جوان کرد ئیبنو عەباس ئەڵێت: ﴿وَأَغْطَشَ لَيْلَهَا﴾واتە: تاریکی کرد. وە هەروەها موجاهیدو عیکریمەو سەعیدی کوڕی جوبەیرو کۆمەڵێکی تریش هەر وایان وتوە. ﴿وَأَخْرَجَ ضُحَاهَا﴾واتە: ڕۆژەکەشی ڕووناك کردوەتەوە.﴿وَٱلْأَرْضَ بَعْدَ ذَٰلِكَ دَحَىٰهَآ﴾ واتە: لە پاشان زەوی ڕاخست. وە ئەم ئایەتە﴿وَٱلْأَرْضَ بَعْدَ ذَٰلِكَ دَحَىٰهَآ﴾ ئەم ئایەتەی تر ڕوونی کردوەتەوە ﴿أَخْرَجَ مِنْهَا مَآءَهَا وَمَرْعَىٰهَا﴾ واتە: ئاوی لێ هێنایە دەرو جێی لەوەڕی لێ پەیدا کرد.لە پێشەوە لە سورەتی سەجدەدا باسی کراوە کە زەمین وەدی هێنرا پێش وەدیهێنانی ئاسمان بەڵام دوای دروستبوونی ئاسمان بە تلدانەوە پان کرایەوە. بەو مانایە ئەوەی تێیدا بو هاتە دەر لە تواناوە(قوة) بۆ کردار وە ئەمە مانای قسەکەی ئیبنو عەباس و کەسانی تریشە، ئیبنو جەریریش ئەمەی هەڵبژاردوە. وە ئەفەرموێت: ﴿وَٱلْجِبَالَ أَرْسَىٰهَا﴾ واتە: وە شاخەکانی پتەو دامەزراند.یانی: دایمەزراند و جێگیری کرد بە پتەوی لە شوێنی خۆیا، هەر ئەو کاربەجێ و دڵسۆز و دلۆڤانە بۆ بەندەکانی، خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿مَتَٰعًا لَّكُمْ وَلِأَنْعَٰمِكُمْ﴾ واتە: بۆ بەهرەمەندی خۆتان و ئاژەڵتان. واتە زەمینی ڕاخست و ئاوی لەکانیاوەکان دەرهێناو شاراوەکانی دەرخست و جۆبارەکانی خستەڕێ و دارو درەخست و کشتوکاڵی ڕواند و کێوەکانی جێگیر کرد بۆ ئەوەی خەڵکەکەی بەئارامی بژین و خۆش گوزەران بن. وە ئەو شتانەی کە پێویستیانە لەو ئاژەڵانە بۆ خواردن و سواری بەکاریان بێنن، لەو ماوەیەی کە پێویستیانە لەم ژیانی دونیایەدا تا ئەو کاتەی بۆی دیاری کراوەو کۆتایی دێت.

﴿فَإِذَا جَآءَتِ ٱلطَّآمَّةُ ٱلْكُبْرَىٰ ﴿٣٤﴾ يَوْمَ يَتَذَكَّرُ ٱلْإِنسَٰنُ مَا سَعَىٰ ﴿٣٥﴾ وَبُرِّزَتِ ٱلْجَحِيمُ لِمَن يَرَىٰ ﴿٣٦﴾ فَأَمَّا مَن طَغَىٰ ﴿٣٧﴾ وَءَاثَرَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا ﴿٣٨﴾ فَإِنَّ ٱلْجَحِيمَ هِىَ ٱلْمَأْوَىٰ ﴿٣٩﴾ وَأَمَّا مَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِۦ وَنَهَى ٱلنَّفْسَ عَنِ ٱلْهَوَىٰ ﴿٤٠﴾ فَإِنَّ ٱلْجَنَّةَ هِىَ ٱلْمَأْوَىٰ ﴿٤١﴾ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلسَّاعَةِ أَيَّانَ مُرْسَىٰهَا ﴿٤٢﴾ فِيمَ أَنتَ مِن ذِكْرَىٰهَآ ﴿٤٣﴾ إِلَىٰ رَبِّكَ مُنتَهَىٰهَآ ﴿٤٤﴾ إِنَّمَآ أَنتَ مُنذِرُ مَن يَخْشَىٰهَا ﴿٤٥﴾ كَأَنَّهُمْ يَوْمَ يَرَوْنَهَا لَمْ يَلْبَثُوٓا۟ إِلَّا عَشِيَّةً أَوْ ضُحَىٰهَا ﴿٤٦﴾﴾

## ڕۆژی قیامەت و لەوەی کە ئایەیەتی لەخۆشی و ناخۆشی( کەکاتەکانی دیاری نەکراوە )

خودای گەورەئەفەرموێت: ﴿فَإِذَا جَآءَتِ ٱلطَّآمَّةُ ٱلْكُبْرَىٰ﴾ واتە: ئینجا کاتێك کە ڕووداو وبەلا گەورەکەهات کە ڕۆژی دواییە. ئیبنو عەباس ئەڵێت: بۆیە ناو براوە بە(طامە) بەلایەکی ئەوەندە

گەورەیە لەسەری هەموو بەڵاکانەوەیە. وەك خودا ئەفەرموێت: ﴿وَٱلسَّاعَةُ أَدْهَىٰ وَأَمَرُّ﴾ واتە: وەسزای ئەو ڕۆژە زۆر سەختتر وتاڵترە، وە ئەفەرموێت: ﴿يَوْمَ يَتَذَكَّرُ ٱلْإِنسَٰنُ مَا سَعَىٰ﴾واتە: ئەو ڕۆژەی کە مرۆڤ تێیدا کردەوەی خۆی بیر دەکەوێتەوە. یانی: لەو کاتەدا وەچەی ئادەم هەموو کردەوەکانی چاك و خراپی وەبیر دێتەوە، وەك خودا ئەفەرموێت: ﴿يَوْمَئِذٍ يَتَذَكَّرُ ٱلْإِنسَٰنُ وَأَنَّىٰ لَهُ ٱلذِّكْرَىٰ﴾ واتە: لەو ڕۆژەدا ئینسان کردەوەی خۆی بیردەکەوێتەوە بەڵام ئەوبیرکەوتنەوەیە چ سودێك بەو دەگەیەنێت؟ وە ئەفەرموێت: ﴿وَبُرِّزَتِ ٱلْجَحِيمُ لِمَن يَرَىٰ﴾ واتە: دۆزەخ پیشان درا بۆ هەر کەسێك کە بڕوانێ. یانی بە ئاشکرا خەڵکی جەهەنم ئەبینن دێنە بەرچاوتان. ﴿فَأَمَّا مَن طَغَىٰ﴾واتە: لەو ڕۆژەدا چاکەو خراپە بەپێی کردوە دابەش دەکرێ، ئینجا ئەو کەسەی سەرکەش بوبێ، واتە یاخی و خۆ بەزل زان بوبێ ﴿وَءَاثَرَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا﴾ واتە: وە ژیانی دونیای هەڵبژاردبێ. یانی: دونیای پێش فەرمانەکانی خوداو ڕۆژی دوایی(پەسلان)خستوە ﴿فَإِنَّ ٱلْجَحِيمَ هِيَ ٱلْمَأْوَىٰ﴾ واتە: ئەوە بێگومان دۆزەخ جێگایەتی. یانی: پاشەڕۆژیان بۆ ناو جەهەنمە و خواردنیان ژەقنەموتە و خواردنەوەیان ئاوەکوڵ. ﴿وَأَمَّا مَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِۦ وَنَهَى ٱلنَّفْسَ عَنِ ٱلْهَوَىٰ﴾واتە: ئەو کەسەی ترسابێ لەهەڵوێستگەی بەردەم پەروەردگاری و بەرگری نەفسی خۆی کردبێ لەئارەزوی خراپە. یانی: ترساوە لەوەستان لە بەردەستی خودای گەورە، وەترساوە لەو بڕیارەی خودا بۆی دەدا، وە وازی لە ئارەزوی خۆی هێناوە، وە گەڕاوەتەوە بۆ بەندایەتی گەورەی خۆی ﴿فَإِنَّ ٱلْجَنَّةَ هِيَ ٱلْمَأْوَىٰ﴾ واتە: ئەوە بێگومان بەهەشت جێگایەتی. یانی: مەنزڵ و شوێن و پاشەڕۆژی بەهەشتی بەرینە. پاشان خودا ئەفەرمووێت: ﴿يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلسَّاعَةِ أَيَّانَ مُرْسَىٰهَا﴾ واتە: پرسیارت لێ دەکەن دەربارەی ڕۆژی دوای کەی دەبێ؟ ﴿فِيمَ أَنتَ مِن ذِكْرَىٰهَآ﴾ واتە: تۆ چۆن لەم بارەوە دەدوێی؟ ﴿إِلَىٰ رَبِّكَ مُنتَهَىٰهَآ﴾واتە: زانینی ئەو هەر لای پەروەردگارتە، یانی: زانینی بەتۆو هیچ کەسێکی تریش نەدراوەو هەر خۆی کاتەکەی ئەزانێ و ئاگاداریەتی. ﴿ثَقُلَتْ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ لَا تَأْتِيكُمْ إِلَّا بَغْتَةً ۗ يَسْـَٔلُونَكَ كَأَنَّكَ حَفِىٌّ عَنْهَا ۖ قُلْ إِنَّمَا عِلْمُهَا عِندَ ٱللَّهِ﴾ واتە: هاتنی قیامەت بۆ ئاسمانەکان و زەویش گران و قورسە، نایەت بەسەرتاندا لەناکاو دا نەبێت، لە تۆ دەپرسن وەك ئەوەی کە تۆ لە هاتنی ڕۆژی دوایی ئاگادار بی! ئەی موحەممەد(ﷺ) بڵێ: بێگومان زانینی هاتنی ئەو ڕۆژە تەنها لای خوایە. وە لێرەدا ئەفەرمووێت: ﴿إِلَىٰ رَبِّكَ مُنتَهَىٰهَآ﴾ لەبەر ئەمەیە کاتێ جوبرەئیل پرسیاری لە

پێغەمبەر(ﷺ) کرد لەکاتی ڕۆژی قیامەت، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: پرسیار لێکراو زاناتر نیە لە پرسیارکەر لەو بارەیەوە. وە ئەفەرموێت: ﴿إِنَّمَآ أَنتَ مُنذِرُ مَن يَخۡشَىٰهَا﴾ واتە: بێگومان تۆ هەر ترسێنەری کەسێکیت کە لەو ڕۆژە بترسێ. یانی من تۆم ناردوە بۆ ئەوەی خەڵکی ئاگادارکەی و بیان ترسێنی لەتۆڵەو سزای خودا. کەسێ کە لەخوداو گەورەیی خوداو بەڵێنەکانی ترسا وە شوێنت کەوت ڕزگاری ئەبێت و سەرکەوتوو دەردەچێت. داماوی و ڕەنجە ڕۆیی بۆ ئەو کەسەی کە باوەڕت پێ ناکات و دژایەتیت ئەکات. وە پاشان ئەفەرموێت: ﴿كَأَنَّهُمۡ يَوۡمَ يَرَوۡنَهَا لَمۡ يَلۡبَثُوٓاْ إِلَّا عَشِيَّةً أَوۡ ضُحَىٰهَا﴾ واتە: بێبڕواکان کە ئەوڕۆژە دەبینن وادەزانن کە لە دونیادا نەماونەتەوە ئێوارەیەك یا چێشتەنگاوێکی نەبێ. یانی کاتێ هەڵسانەوە لەگۆڕەکانیان بۆ شوێنی کۆبونەوە، ژیانی دونیا زۆر بەکەم تێدەگەن تا وا دەزان زیاد لە ئێوارەی ڕۆژێك یاچێشتەنگایەك نەماونەتەوە! ئیبنوجوبەیر ئەڵێت: لەزەحەاکەوەو زەحەاکیش لە ئیبنو عەباسەوە: ﴿كَأَنَّهُمۡ يَوۡمَ يَرَوۡنَهَا لَمۡ يَلۡبَثُوٓاْ إِلَّا عَشِيَّةً أَوۡ ضُحَىٰهَا﴾ یانی: ئێوارەی ڕۆژێك لە نیوەڕۆوە تا خۆرئاوا ﴿أَوۡ ضُحَىٰهَا﴾ لە نێوان هەڵاتنی خۆر تا ناوەڕاستی ڕۆژ. قەتادە ئەڵێت: دونیا لەبەرچاوی ئەو خەڵکە کە ڕۆژی دواییان پیشان درا زۆر کەم ئەنوێنێت.

## تەفسیری سورەتی (عَبَسَ)

## لەمەککەدا هاتوەتەخوارەوە

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿عَبَسَ وَتَوَلَّىٰٓ ١ أَن جَآءَهُ ٱلۡأَعۡمَىٰ ٢ وَمَا يُدۡرِيكَ لَعَلَّهُۥ يَزَّكَّىٰٓ ٣ أَوۡ يَذَّكَّرُ فَتَنفَعَهُ ٱلذِّكۡرَىٰٓ ٤ أَمَّا مَنِ ٱسۡتَغۡنَىٰ ٥ فَأَنتَ لَهُۥ تَصَدَّىٰ ٦ وَمَا عَلَيۡكَ أَلَّا يَزَّكَّىٰ ٧ وَأَمَّا مَن جَآءَكَ يَسۡعَىٰ ٨ وَهُوَ يَخۡشَىٰ ٩ فَأَنتَ عَنۡهُ تَلَهَّىٰ ١٠ كَلَّآ إِنَّهَا تَذۡكِرَةٞ ١١ فَمَن شَآءَ ذَكَرَهُۥ ١٢ فِي صُحُفٖ مُّكَرَّمَةٖ ١٣ مَّرۡفُوعَةٖ مُّطَهَّرَةِۭ ١٤ بِأَيۡدِي سَفَرَةٖ ١٥ كِرَامِۭ بَرَرَةٖ ١٦﴾

### سەرزەنشتکردنی پێغەمبەر(ﷺ) لەسەر ناوچاو گرژکردنی لە ڕووی پیاوێکی کەم توانای نابینا (ابن ام مكتوم)

زۆرێك لەو کەسانەی کە تەفسیریان نوسیوە باسیان کردوە کە پێغەمبەر(ﷺ) ووتووێژی لەگەڵ هەندێ لە گەورە پیاوانی قورەیشا ئەکرد ئومێدی هەبو کە موسڵمان بن، لەو کاتەدا قسەی بۆئەکردن(ابن ام مكتوم) بوو هات کە یەکێ بوو لەو کەسانە کە لە کۆنەوە موسڵمان بووبوو. پرسیاری شتێکی لە پێغەبمەر(ﷺ) ئەکرد، کۆڵی نە ئەدا، وە پێغەمبەر(ﷺ) پێی خۆش بوو لەو کاتا وازی لێ بێنێت بۆ ئەوەی بتوانێ قسە لەگەڵ ئەو پیاوانەدا بکات حەزی ئەکردو هیوای وابو خودا هیدایەتیان بدات، ناوچاوی گرژ کرد لە ڕووی (ابن ام مكتوم) دا و ڕوشی وەرگێڕا و ڕوی کردە ئەوانی تر، خوای

گەورە ئەم ئایەتانەی نارده خوارەوە: ﴿عَبَسَ وَتَوَلَّىٰٓ﴾ واتە: پێغەمبەر(ﷺ) ڕووی گرژ کردو پشتی هەڵکرد. ﴿أَن جَآءَهُ ٱلۡأَعۡمَىٰ﴾واتە: کە کوێرەکە هاتە لای. ﴿وَمَا يُدۡرِيكَ لَعَلَّهُۥ يَزَّكَّىٰٓ﴾ واتە: تۆ چوزانیت؟ بەڵکو ئەو کوێرە بیەوێ پاك ببێتەوە. یانی ئەیویست بەهرە وەرگرێت و خۆی پاك بکاتەوە. ﴿أَوۡ يَذَّكَّرُ فَتَنفَعَهُ ٱلذِّكۡرَىٰٓ﴾ واتە: یا بیری بکەوێتەوە(ئەوەی کە لەبیری چۆتەوە) ئەنجا ئەو بیرکردنەوەیە سودی پی بگەیەنێت. یانی ئەیویست پەندو ئامۆژگاری وەرگرێ و خۆی بپارێزێ لە قەدەغەکان. ﴿أَمَّا مَنِ ٱسۡتَغۡنَىٰ﴾ واتە: کەچی ئەوەی کە خۆی بێنیاز دەزانێ ﴿فَأَنتَ لَهُۥ تَصَدَّىٰ﴾ واتە: تۆ ڕووی تێ دەکەیت. یانی ئەوەی دەوڵەمەندە خۆت بە ئەوە سەرقاڵ ئەکەی بەڵکو موسڵمان ببێ ﴿وَمَا عَلَيۡكَ أَلَّا يَزَّكَّىٰ﴾ واتە: وە هیچ لەسەر تۆ نیە کە ئەو بێبڕوایە خۆی پاك نەکاتەوە ﴿وَأَمَّا مَن جَآءَكَ يَسۡعَىٰ﴾ واتە: بەڵام ئەو کەسەی کە بەپەلە دێ بۆ لات. ﴿وَهُوَ يَخۡشَىٰ﴾ واتە: وە لە خودا دەترسێ. یانی کەسێك کەتۆی مەبەستەو دوات ئەکەوێت و بەقسەکانت ڕێگای ڕاست ئەگرێت ﴿فَأَنتَ عَنۡهُ تَلَهَّىٰ﴾ واتە: تۆ خۆتی لێ هەڵە دەکەیت. یانی: خۆت سەرقاڵ ئەکەی، ئالێرەدا خودا فەرمان دەکات بە پێغەمبەرەکەی کە ئاگادار کردنەوە نەبەستێ بە کەسێکی تایبەتیەوە بەڵکو ئەبێ یەکسانی و جیاوازی نەکات لە نێوان ناودارو بێ چارە و بەندە و ئاغاکەی و هەژار و بێنیازدا ژن و پیاوو گەورەو بچوکان ئەو سا خودا مەیلی لەهەر کەسێ ببێت ڕێگای ڕاستی نیشان ئەدات، ئەوخودایە کاربەجێیە و خاوەن دەسەڵاتە. ئەبویەعلاو ئیبنو جەریر لە عائیشەوە ڕیوایەتیان کردووە فەرمویەتی: ﴿عَبَسَ وَتَوَلَّىٰٓ﴾ لەسەر ئیبنو ئوم مەکتومی نابینا هاتە خوارەوە، ئەوە بوو هاتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ)هەر ئەیووت: ئامۆژگاریم بکە، لەو کاتەدا یەکێك لە پیاوە خوانەناسەکان لای بوو،عائیشە ئەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) ڕووی لێوەرگێڕاو ڕووی کردە کابراکەی تر!و پێی فەرموو: ئەمەی من ئەیڵێم هیچ نکوولییەکت لێی هەیە؟ئەویش ووتی: نەء لەسەر ئەم ڕوو نەدانە بەم کابرا نابینایە ﴿عَبَسَ وَتَوَلَّىٰٓ﴾ هاتە خوارەوە. تیرمیزی ئەم فەرمودەیەی ڕیوایەت کردوە و عائیشەی تێدا باس نەکردوە. هەر بەم شێوەیە لەموطای ئیمام مالیکدا هاتوە.

### تایبەتمەندیەکانی قورئان

خودا ئەفەرموێت: ﴿كَلَّآ إِنَّهَا تَذۡكِرَةٞ﴾ واتە: وا مەکە! بێگومان ئەو ڕێنمونیانەی کە بۆت هاتوە بێدارکەرەوەی ئادەمی یە. یانی: ئەم سورەتە یا ئەم ئامۆژگاریە بۆ سەیر کردنی خەڵکییە بەیەکچاو و گەیاندنی زانیاریە بە پیاوماقوڵان و هەژاران وەك یەك. قەتادەو سودی ئەڵێن: ﴿كَلَّآ إِنَّهَا تَذۡكِرَةٞ﴾ یانی:

قورئان. ﴿فَمَن شَآءَ ذَكَرَهُۥ﴾ واتە: ئینجا ئەو کەسەی بیەوێ یادی خوا دەکات. یانی: کێ ئارەزو بکات یادی خوا ئەکات لە هەموو کارو فەرمانێکیا. ئەگونجێ ئەو زەمیرە لە(ذَكَرَهُ) بگەڕێتەوە بۆ وەحی چونکە ئایەتەکە ئەمەیش ئەگەیەنێ. وە ئەفەرموێت: ﴿فِي صُحُفٍ مُّكَرَّمَةٍ﴾ واتە: کە ئەو ڕێنموونیانەش نوسراونەتەوە لەچەند پەڕەیەکی بەرێزدا﴿مَّرْفُوعَةٍ مُّطَهَّرَةٍ﴾ پایە بڵندی پاك. ئەم سورەتە و سوورەتەکانی تری قورئان پەیوەستن بەیەکەوە، چونکە هەموو قورئانیش ﴿فِي صُحُفٍ مُّكَرَّمَةٍ﴾ گەورەو بەرێزن ﴿مَّرْفُوعَةٍ﴾ یانی: بەرێزەوە هەڵگیراوە ﴿مُّطَهَّرَةٍ﴾ یانی: پاکژە لە عەیب و زیادو کەم و کوڕی. وە ئەفەرموێت: ﴿بِأَيْدِي سَفَرَةٍ﴾ واتە: کە بەدەست نوێنەرانە. یانی: بە دەستی ڕاسپاردەگەلێ. ئیبنو عەباس وموجاهیدو زەححاك و ئیبنو زەیدئەڵێن: یانی: فریشتە. بوخاریش ئەڵێت: ﴿سَفَرَةٍ﴾ یانی: فریشتە، (سفرتُ) یانی: ڕێکم خستن وە ئەو فریشتەیە کاتێ دائەبەزێ بەنیگای خودا جێبەجێی ئەکات، وەك ئەو نوێنەرە(السفیر) وایە هەڵئەستێ بەئاشتکردنەوەی خەڵکی. وە ئەفەرموێت: ﴿كِرَامٍ بَرَرَةٍ﴾ واتە: بەڕێزی خێرخوان. یانی: ڕەوشت بەرزو چاك و ئاکار چاك و بە ئەمەك و پاك و تەواون. ئالێرەدا پێویستە ئەوانەی کە هەڵگری پەیامی قورئانن قسەو کرداریان ڕێك و ەپەسەند بێ. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لەعائیشەوە(خودا لێی ڕازی بێ) ئەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: ئەوەی قورئان ئەخوێنێ وکارامەیە تێیدا لەگەڵ فریشتە بەڕێزو خێرخواکانە، ئەوەیش کە ئەیخوێنێ ولەسەری گرانە ئەوە دوو پاداشتی هەیە زانایانی تری فەرمودەش هێناویانە.

﴿قُتِلَ الْإِنسَانُ مَا أَكْفَرَهُ (١٧) مِنْ أَيِّ شَيْءٍ خَلَقَهُ (١٨) مِن نُّطْفَةٍ خَلَقَهُ فَقَدَّرَهُ (١٩) ثُمَّ السَّبِيلَ يَسَّرَهُ (٢٠) ثُمَّ أَمَاتَهُ فَأَقْبَرَهُ (٢١) ثُمَّ إِذَا شَاءَ أَنشَرَهُ (٢٢) كَلَّا لَمَّا يَقْضِ مَا أَمَرَهُ (٢٣) فَلْيَنظُرِ الْإِنسَانُ إِلَىٰ طَعَامِهِ (٢٤) أَنَّا صَبَبْنَا الْمَاءَ صَبًّا (٢٥) ثُمَّ شَقَقْنَا الْأَرْضَ شَقًّا (٢٦) فَأَنبَتْنَا فِيهَا حَبًّا (٢٧) وَعِنَبًا وَقَضْبًا (٢٨) وَزَيْتُونًا وَنَخْلًا (٢٩) وَحَدَائِقَ غُلْبًا (٣٠) وَفَاكِهَةً وَأَبًّا (٣١) مَّتَاعًا لَّكُمْ وَلِأَنْعَامِكُمْ (٣٢)﴾

## وەڵامی ئەوانەی کە بڕوایان بەزیندوبونەوە نیە دوای مردن

خودا باسی ئەو کەسانە ئەکات کە باوەڕیان بە زیندووبونەوە و کۆکردنەوە نیە لە نەوەی ئادەم﴿قُتِلَ الْإِنسَانُ مَا أَكْفَرَهُ﴾ واتە: بە کوشت چێ(خراپترین نەفرینی لێبێ) ئادەمی چەند پێنەزانە. زەححاك ئەڵێت: لەئیبنو عەباسەوە: ﴿قُتِلَ الْإِنسَانُ﴾ یانی: نەفرین کراوە لەو مرۆڤە. وە هەروەها ئەبو مالیکیش ئەڵێت: ئەمە بۆ خودی مرۆڤێکە کە حاشا دەکات، بەهۆی باوەڕنەکردنی، بێئەوەی

بەڵگەیەکی بە دەستەوە بێت بەهۆی نەفامی و نەزانی خۆیەوە ئیبنو جورەیج ئەڵێت: ﴿مَآ أَكۡفَرَهُۥ﴾ یانی: چەند بێدینە. قەتادە ئەڵێت: ﴿مَآ أَكۡفَرَهُۥ﴾ یانی: چەند بێبەشە، ئەوسا خودا باسی ئەوەی بۆ دەکات چۆن دروستی کرد لەو شتە بێنرخەوە ئەتوانێ بیهێنێتەوە، وەك لە پێشەوە هێنای. وە ئەفەرموێت: ﴿مِنۡ أَيِّ شَيۡءٍ خَلَقَهُۥ﴾ واتە: بیر ناکاتەوەو بزانێ کە خوا لە چی دروستی کردوە. ﴿مِن نُّطۡفَةٍ خَلَقَهُۥ فَقَدَّرَهُۥ﴾ واتە: لە دڵۆپێك ئاو دروستی کردوەو ڕێکی خستوە. یانی: ئەندازەی ژیان و ڕۆزی و کردارو بەدبەختی و خۆشبەختی بۆ داناوە. ﴿ثُمَّ ٱلسَّبِيلَ يَسَّرَهُۥ﴾ واتە: لە پاشان ڕێگای چاك و خراپی بۆ ئاسان کردوە. عەوفی ئەڵێت: لە ئیبنو عەباسەوە: پاشان ڕێگەی هاتنە دەرەوەی لە سکی دایکیەوە بۆ ئاسان کرد. وە هەروەها عیکریمەو زەحاك و ئەبو سالح و قەتادەو سوددی وتویانە، ئیبنو جەریریش ئەمەی هەڵبژاردووە. موجاهیدیش ئەڵێت: ئەمە وەك ئەو ئایەتە وایە کە خودا ئەفەرموێت: ﴿إِنَّا هَدَيۡنَٰهُ ٱلسَّبِيلَ إِمَّا شَاكِرٗا وَإِمَّا كَفُورًا﴾ واتە: بێگومان ئێمە ڕێنموێیمان کرد بۆ ڕاستە ڕێ، سایا سوپاس گوزارەوە یا ناسوپاس و سپڵە! یانی: بۆمان ڕوون کردووەتەوە و ئاشکرامان کردوە بۆی و کار ئاسانیمان بۆ کردووە. حەسەن و ئیبنو زەیدیش هەر وایان وتووە. ئەمە بەهێزترین قسەیە، خوایش لە هەمووومان زاناترە. وە ئەفەرموێت: ﴿ثُمَّ أَمَاتَهُۥ فَأَقۡبَرَهُۥ﴾ واتە: ئینجا دەیمرێنێ و ئەیخاتە گۆڕەوە، یانی: پاش دروستکردنی و مراندنی لە گۆڕی نان، یانی کردیە خاوەن گۆڕ. عەرەب ئەڵێت: خرایە ناو گۆڕ کاتێ لەبەر چاو نەماو بزر بوو وە خودا لەناوی دا. وە شاخی گاکە شکا، خودا شاخی شکاند، وە کلکی ووشترەکە بڕا، خوا کلکی بڕی، وە فلانە کەس دوورکەوتەوە لێم، خودا دووری خستەوە. وە ئەفەرموێت: ﴿ثُمَّ إِذَا شَآءَ أَنشَرَهُۥ﴾ واتە: لە پاشان کاتێ کە ویستی زیندوی دەکاتەوە یانی دوای مردن زیندوی کردەوە، ووتراوە: زیندووبونەوە و هەڵسانەوە ﴿ وَمِنۡ ءَايَٰتِهِۦٓ أَنۡ خَلَقَكُم مِّن تُرَابٖ ثُمَّ إِذَآ أَنتُم بَشَرٞ تَنتَشِرُونَ ﴾واتە: لە نیشانەکانی ئەو خودایە کە ئێوەی لە خاك دروست کردوە لەپاش ماوەیەك کتوپڕ ئێوە ئادەمین و بڵاو بونەتەوە لە زەویدا. ﴿وَٱنظُرۡ إِلَى ٱلۡعِظَامِ كَيۡفَ نُنشِزُهَا ثُمَّ نَكۡسُوهَا لَحۡمٗا﴾ واتە: وە تەماشای ئێسقانەکانی گوێدرێژەکەت بکە چۆن بەرزیان دەکەینەوە لە شوێنی خۆیان ویەکیان دەخەیت، پاشان گۆشتی بەسەردا دەهێنینەوە، بوخاری و موسلیم لە ئەعمەش ڕیوایەتی کردوە لە ئەبو سالحەوە ئەمیش لە ئەبو هورەیرەوە: هەموو لاشەی مرۆڤ ئەڕزێ و نامێنێ جگە لە کلێنچك(عجب الذنب) نەبێ کە مرۆڤ لەو دروست کراوە و لەویش پێك دەهێنرێتەوە، وە

ئەفەرموێت: ﴿كَلَّا لَمَّا يَقْضِ مَآ أَمَرَهُۥ﴾ واتە: بە ڕاستی ئەوەی کە خوا فەرمانی پێداوە هێشتائادەمی بەجێی نەهێناوە. ئیبنو جەریر ئەڵێت: خودای گەورە ئەفەرموێت: نەخێر بەو شێوەیە نیە کە ئەو مرۆڤە خوانەناسە ئەڵێت بەشی خودای داوە لەگیان و ماڵی! ﴿لَمَّا يَقْضِ مَآ أَمَرَهُۥ﴾ ئیبنو جەریر دوبارە ئەڵێت: ئەو فەرزانەی خودا لەسەری داناوەبەجێی نەهێناوە. ئەوەی لێی تێئەگەم لەم مانایە (خودا زاناترە) مانای ﴿ثُمَّ إِذَا شَآءَ أَنشَرَهُۥ﴾ واتە: زیندووی دەکاتەوە. ﴿كَلَّا لَمَّا يَقْضِ مَآ أَمَرَهُۥ﴾ واتە: خودا ئێستا نایکات تا ئەو ماوەیە تەواو نەبێ و هەرچی بۆ مرۆڤ دیاری کراوەو دانراوە نەیەتە دی و تا ئەوەی بڕیاری داوە دێتە ژیانەوەو ئەمرێت وە هەر شتێ خودا فەرمانی داوە ئەبێ بێتەجێ، هەر کاتێ ئەو ماوەیە لای خودا کۆتایی هات، ئەوا خودا هەمووی زیندوو ئەکاتەوە وەك چۆن بەدیهێناون بەو شێوەیەش ئەیان هێنێتەوە.

## سەوز بونی دانەوێڵەو حب هەر شتێکی تر نیشانەیە لەسەر ژیانەوەی دوای مردن

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿فَلْيَنظُرِ ٱلْإِنسَٰنُ إِلَىٰ طَعَامِهِۦٓ﴾ واتە: دەبا مرۆڤ سەیری خواردە مەنیەکەی بکات، یانی: خودا بەهەرەو نیشانەکانی دەسەڵاتی خۆی ئەنوێنێ بەزیندووکردنەوەی کشتوکاڵ و ڕوەك لەم زەمینە بێگیانە لەسەر زیندووکردنەوەی لاشە مردوەکان پاش ئەوەی بوو بە ئێسکی ڕزیو و خۆڵی پەرش و بڵاو بوو. ﴿أَنَّا صَبَبْنَا ٱلْمَآءَ صَبًّا﴾ واتە: بە ڕاستی ئێمە لەهەورەوە بارانمان داڕژاند چۆن داڕژاندنێك. یانی: لە ئاسمانەوە باراندوومانەتە سەر زەمین. ﴿ثُمَّ شَقَقْنَا ٱلْأَرْضَ شَقًّا﴾ واتە: لەپاشان زەویمان لەت لەت کردبەگیا چۆن لەت کردنێك. یانی: جێگیرمان کرد تیایدا و بڵاوبویەوو بەناویدا وە ئەو دانەوێڵە کە لەناویدا بوو هەڵی مژی و سەوز بوو بەرزبوەوە و دەرکەوت لەسەر ڕووی زەمین. ﴿فَأَنۢبَتْنَا فِيهَا حَبًّا﴾ واتە: ئینجا دانمان لەناویا ڕواند. ﴿وَعِنَبًا وَقَضْبًا﴾ واتە: وەترێ و سەوزە. دان یانی: هەموو ئەو شتانەی کە باسکران لە دانەوێڵە، ترێیش دیارە، ﴿وَقَضْبًا﴾ گیایەکە بەکار دێت بۆ ئالفی مەڕو ماڵات بەتەڕی، قەتیشی پێ ئەوترێ. ئیبنو عەباس و قەتادەو زەحعاك و سودیش وایان وتوە. حەسەنی بەسری ئەڵێت: القضب: یانی: ئالف. ﴿وَزَيْتُونًا وَنَخْلًا﴾ واتە: وە زەیتون و دارخورما. ﴿وَحَدَآئِقَ غُلْبًا﴾ واتە: وە باخاتی چڕوپڕ یانی: باختان. حەسەن و قەتادە ئەڵێن: ﴿غُلْبًا﴾ یانی: دارخورمای گەورەو چڕوپڕ. موجاهیدو ئیبنوعەباس ئەڵێن: هەر شتێ چڕ و پڕبێ و بەناویەکا بچێت. ﴿وَفَٰكِهَةً وَأَبًّا﴾ واتە: وە میوەو لەوەڕ. ﴿وَفَٰكِهَةً﴾ هەر شتێ کە لەزەتی هەبێ لەمیوە. ئیبنو عەباس ئەڵێت: هەر شتێ بە تەڕی

بخورێ. ﴿وَأَبًّا﴾ ئەوەی زەوی سەوزی ئەکات مەڕو ماڵات ئەیخوات و مرۆڤ نایخوات. دیسان ئەڵێت: پرسیار لە ئەبو بەکری صدیق کرا دەربارەی ئەم فەرمودەی خودا ﴿وَفَٰكِهَةً وَأَبًّا﴾ ئەڵێت: کام ئاسمان سێبەرم بۆ ئەکاو کام زەمین هەڵم ئەگری کە شتێ نازانم لە قورئاناو لە خۆمەوە بیڵێم. بەڵام ئەوەی کە ئیبنو جەریر لە ئەنەس ڕیوایەتی کردوە ئەڵێت: عومەری کوڕی خەتاب ﴿عَبَسَ وَتَوَلَّىٰٓ﴾ی خوێند کاتێ هاتەسەرئەم ئایەتە ﴿وَفَٰكِهَةً وَأَبًّا﴾ ئەڵێت: زانیمان (الفاکە) میوەیە، ئەی(أبّ) چی یە؟ پاشان ئەڵێت: بەخوا ئەی کوڕی خەتاب ئەمە زۆرلەخۆ کردنە. ئەمە سەنەدەکانی دروستە، چەند کەسی تریش ڕیوایەتیان کردوە لە ئەنەسەوە بەم شێوەیە، ئەمە ئەوە ئەگەیەنێت کە عومەر ویستویەتی شێوەو شکلێ و جۆری ئەو شتانە بزانێت، ئەگینا ئەویش و هەر کەسێ ئەم ئایەتەی خوێندبێتەوە دەزانێ کە (ابّ)لە ڕوەکی زەوییە، وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿فَأَنۢبَتۡنَا فِيهَا حَبّٗا ﴿٢٧﴾ وَعِنَبٗا وَقَضۡبٗا ﴿٢٨﴾ وَزَيۡتُونٗا وَنَخۡلٗا ﴿٢٩﴾ وَحَدَآئِقَ غُلۡبٗا ﴿٣٠﴾ وَفَٰكِهَةٗ وَأَبّٗا﴾ وە ئەفەرموێت: ﴿مَّتَٰعٗا لَّكُمۡ وَلِأَنۡعَٰمِكُمۡ﴾ واتە: بۆ ژیانی خۆتان ئاژەڵتان. یانی: ژیانێك بۆ ئێوەو ئاژەڵەکانتان لەم دنیا تا ڕۆژی قیامەت.

﴿فَإِذَا جَآءَتِ ٱلصَّآخَّةُ ﴿٣٣﴾ يَوۡمَ يَفِرُّ ٱلۡمَرۡءُ مِنۡ أَخِيهِ ﴿٣٤﴾ وَأُمِّهِۦ وَأَبِيهِ ﴿٣٥﴾ وَصَٰحِبَتِهِۦ وَبَنِيهِ ﴿٣٦﴾ لِكُلِّ ٱمۡرِيٕٖ مِّنۡهُمۡ يَوۡمَئِذٖ شَأۡنٞ يُغۡنِيهِ ﴿٣٧﴾ وُجُوهٞ يَوۡمَئِذٖ مُّسۡفِرَةٞ ﴿٣٨﴾ ضَاحِكَةٞ مُّسۡتَبۡشِرَةٞ ﴿٣٩﴾ وَوُجُوهٞ يَوۡمَئِذٍ عَلَيۡهَا غَبَرَةٞ ﴿٤٠﴾ تَرۡهَقُهَا قَتَرَةٌ ﴿٤١﴾ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَفَرَةُ ٱلۡفَجَرَةُ ﴿٤٢﴾﴾

### ڕۆژی قیامەت و ڕاکردنی مرۆڤ لەو ڕۆژەدا لە خزم و کەس و کار

ئیبنو عەباس ئەڵێت: گرمە﴿ٱلصَّآخَّةُ﴾ ناوێکە لەناوەکانی ڕۆژی قیامەت خودا زۆر بە گەورە ناوی بردوەو بەندەکانی لێ ترساندوە. ئیبنو جەریر ئەڵێت: شایەد ناوێك بێت بۆ فووکردن بەکەڵە شاخدا. بەغەوی ئەڵێت: گرمە﴿ٱلصَّآخَّةُ﴾یانی: نەعرەتەی ڕۆژی قیامەت ناوبراوە بە﴿ٱلصَّآخَّةُ﴾چونکە وای ئەبیسێ و ئەوەندە بەهێزە نزیکە کەڕی بکات.﴿فَإِذَا جَآءَتِ ٱلصَّآخَّةُ﴾ واتە: کاتێك کە شاخەو شریخەی ڕۆژی دوایی هات.﴿يَوۡمَ يَفِرُّ ٱلۡمَرۡءُ مِنۡ أَخِيهِ﴾ واتە: ئەو ڕۆژەی کە مرۆڤ ڕا دەکات لە برای﴿وَأُمِّهِۦ وَأَبِيهِ ﴿٣٥﴾ وَصَٰحِبَتِهِۦ وَبَنِيهِ﴾ قەتادە ئەڵێت: زۆر خۆشەویست لەزۆر خۆشەویست و زۆر نزیك لە زۆر نزیك لە سامناکی ئەو ڕۆژە لەیەك ڕا ئەکەن. وە ئەفەرموێت: ﴿لِكُلِّ ٱمۡرِيٕٖ مِّنۡهُمۡ يَوۡمَئِذٖ شَأۡنٞ يُغۡنِيهِ﴾ واتە: لەو ڕۆژەدا هەر کەسێ کاری خۆی هەیەو ناپەرژێتە سەر کەسی تر. یانی: هەر کەسەو سەرقاڵی کاری خۆیەتی ناپەرژێتە سەر کەسی تر. ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردوە لە ئیبنو عەباسەوە کە ئەڵێت:

پێغەمبەر(ﷺ) ئەفەرمووێت: زیندو ئەکرێنەوە بە پێی پەتی و بە ڕووت و قوتی هەنگاو ئەنێن خەتەنەش نەکراون ! ئەڵێت: خێزانی پێغەمبەر(ﷺ) ئەڵێت: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەڕوانین یا چاومان بەعەیبی یەکتری ئەکەوێت؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ﴿لِكُلِّ امْرِئٍ مِنْهُمْ يَوْمَئِذٍ شَأْنٌ يُغْنِيهِ﴾ یان فەرمویەتی: ئەوڕۆژە زۆر گەورەترە لەوەی کە خەڵك سەیری یەکتری بکات. ئیبنو عەباس لە پێغەمبەرەوە(ﷺ)ڕیوایەتی کردوە کە فەرمویەتی: زیندوو ئەکرێنەوە بە پێی پەتی و ڕوت و خەتەنە نەکراوی، ژنێك ئەڵێت: ئایا ئەڕوانین یا چاومان بە عەیبی یەکتری ئەکەوێ؟ فەرمووی ئەی فلانە کەس: ﴿لِكُلِّ امْرِئٍ مِنْهُمْ يَوْمَئِذٍ شَأْنٌ يُغْنِيهِ﴾ ئەم فەرمودەیە حەسەنەو سەحیحە.

## دەموچاووڕوخساری دانیشتوانی بەهەشت و دانیشتوانی جەهەنم لە ڕۆژی قیامەت دا

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ مُسْفِرَةٌ﴾ واتە: زۆر ڕوخسار لەو ڕۆژەدا گەش و جوانن﴿ضَاحِكَةٌ مُسْتَبْشِرَةٌ﴾ واتە: دەم بەپێکەنین وشادومانن. یانی خەڵکی لەوێ دوو دەستەن: یا دیمەنیان سوروسپی و جوانە و شادن و دڵخۆشن، ئەو شادیەی لە دڵیانایە لە نێو چاوانیاندا دەرکەوتوەو ئا ئەوانە خەڵکی بەهەشتن. ﴿وَوُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ عَلَيْهَا غَبَرَةٌ﴾ واتە: وە زۆر ڕوخسار لەو ڕۆژەدا تەپوتۆزیان بەسەرەوەیە.﴿تَرْهَقُهَا قَتَرَةٌ﴾ واتە: لە داماویدا ڕەش داگیرساون. یانی: تەپ و تۆز بەرزبوەتەوە بە ڕویاناو دای پۆشیوە ﴿قَتَرَةٌ﴾ یانی: ڕەشایی. ئیبنو عەباس ئەڵێت: ﴿تَرْهَقُهَا قَتَرَةٌ﴾ یانی: داپۆشیون و ڕویان ڕەشە. ﴿أُولَٰئِكَ هُمُ الْكَفَرَةُ الْفَجَرَةُ﴾ واتە: ئەوانە ئەوانەن کە بێباوەڕ و گوناهکارو تاوانبارن. یانی لە ناو دڵەوە خوانەناسن و بەکردەوەش لەدین لادەرن.

## تەفسیری سورەتی (التكوير)

## لەمەککەداهاتووەتەخوارەوە

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

﴿إِذَا الشَّمْسُ كُوِّرَتْ ﴿١﴾ وَإِذَا النُّجُومُ انْكَدَرَتْ ﴿٢﴾ وَإِذَا الْجِبَالُ سُيِّرَتْ ﴿٣﴾ وَإِذَا الْعِشَارُ عُطِّلَتْ ﴿٤﴾ وَإِذَا الْوُحُوشُ حُشِرَتْ ﴿٥﴾ وَإِذَا الْبِحَارُ سُجِّرَتْ ﴿٦﴾ وَإِذَا النُّفُوسُ زُوِّجَتْ ﴿٧﴾ وَإِذَا الْمَوْءُودَةُ سُئِلَتْ ﴿٨﴾ بِأَيِّ ذَنْبٍ قُتِلَتْ ﴿٩﴾ وَإِذَا الصُّحُفُ نُشِرَتْ ﴿١٠﴾ وَإِذَا السَّمَاءُ كُشِطَتْ ﴿١١﴾ وَإِذَا الْجَحِيمُ سُعِّرَتْ ﴿١٢﴾ وَإِذَا الْجَنَّةُ أُزْلِفَتْ ﴿١٣﴾ عَلِمَتْ نَفْسٌ مَا أَحْضَرَتْ ﴿١٤﴾﴾

**ئەوەی لەبارەی ئەم سورەتەوە هاتوە**

ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوەلە ئیبنو عومەرەوە ئەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) ئەفەرموێت: هەر کەسێ پێی خۆش بوو سەیری ڕۆژی قیامەت بکات وەك ئەوەی بەچاو ئیبینێ با﴿إِذَا ٱلشَّمۡسُ كُوِّرَتۡ –إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنشَقَّتۡ– إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنفَطَرَتۡ﴾ بخوێنێ. هەروەها تیرمیزیش ئەم فەرموودەیەی ڕیوایەت کردوە.

**ئەوەی ڕوو ئەدات لە ڕۆژی قیامەت، تۆ پەڵ بوون و ڕەش هەڵگەڕانی خۆرە**

عەلی کوڕی ئەبو تەلحە لەئیبنو عەباسەوە ڕیوایەتی کردوە﴿إِذَا ٱلشَّمۡسُ كُوِّرَتۡ﴾ یانی: تاریك بوو. عەوفی لە ئیبنو عەباسەوە ئەڵێت: یانی: ڕۆیشت. قەتادە ئەڵێت: کاتێ ڕۆشنایی ڕۆیشت. سەعیدی کوڕی جوبەیر ئەڵێت: ﴿كُوِّرَتۡ﴾ یانی: ڕۆچوو، ئەبو سالح ئەڵێت: هەرچی تێدابوو فرێیدا. تەکویر یانی: کۆکردنەوەی شت لەسەر یەك وەك کۆکردنەوەی مێزەرەو کۆکردنەوەی جل و بەرگ لەسەر یەك. خودا ئەفەرموێت: ﴿إِذَا ٱلشَّمۡسُ كُوِّرَتۡ﴾ واتە: کاتێك کە ڕۆژ پێچرایەوە و (ڕووناکی نەما) یانی کاتێ کە خۆر تۆپەڵ کراوڕەش هەڵگەڕا. خودا ئەفەرموێت: ﴿كُوِّرَتۡ﴾یانی: تۆپەڵ کراو پاشان هەرچی تێدا بوو فڕێ درا، هەرکاتێ ئەمەی بەسەر هات ڕۆشنایی نامێنێ، بوخاری ڕیوایەتی کردوە لە ئەبو هورەیرەوە ئەویش لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) کە خۆرو مانگ تۆپەڵ ئەکرێن لە ڕۆژی قیامەتدا. ئەم فەرموودەیە تەنیا بوخاری هێناویێتی و قسەی ئەوە.

**پارچە پارچە بوون و وەرینی ئەستێرەکان**

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَإِذَا ٱلنُّجُومُ ٱنكَدَرَتۡ﴾ واتە: وە کاتێ کە ئەستێرەکان هەڵوەرین و کەوتنە خوارەوە تاریك بوون. وەك خودا ئەفەرمووێت: ﴿وَإِذَا ٱلۡكَوَاكِبُ ٱنتَثَرَتۡ﴾ واتە: وە کاتێك کە ئەستێرەکان کەوتنە خوارەوە بەپەرش و بڵاوی. یانی وەرین یان پژان یا ڕژان، ڕەبیعی کوڕی ئەنەس ئەڵێت: لەئەبو عالیەوە ئەویش لە ئیبنو کەعبەوە ئەڵێت: شەش نیشانە پێش ڕۆژی قیامەت دێن: کاتێ خەڵکی لەناو بازاڕان خۆر ڕووناکی نامێنێ، کاتێ هەسارەکانیش وەرین و کێوەکانیش لەرزین و کەوتن و ڕۆیشتن بەسەر ڕووی زەمینداو تێکەڵاو بوون لەترسا، جنۆکە ڕا ئەکات بۆ لای مرۆڤ و مرۆڤیش ڕا ئەکات بۆ لای جنۆکە، ماڵات و باڵندەو جانەوەر تێکەڵاو بوون و چوون بەناویەکا.﴿وَإِذَا ٱلۡجِبَالُ سُيِّرَتۡ﴾ واتە: وە کاتێك کە کێوەکان خرانە ڕێ لە شوێن خۆیان خزێندران ﴿وَإِذَا ٱلۡعِشَارُ عُطِّلَتۡ﴾ موجاهیدو عیکریمە ئەڵێن: یانی: ووشتر. موجاهید ئەڵێت: ﴿عُطِّلَتۡ﴾ یان وازی لێ هێنرا و بەرەڵا کرا. ئوبەیی کوڕی کەعب و زەححاك ئەڵێن: خاوەنەکەی گوێی پێ نەدا. ڕەبیعی کوڕی خوسەیم ئەڵێت: ئەی دۆشی

و گوانیشی نەبەست تابەچکەی نەی مژێت، خاوەنەکانیان وازیان لێ هێنان. زەححاك ئەڵێت: وازیان لێ هێنرا بەبێ شوان مانەوە. مانای ئەمانە هەموو لەیەکەوە نزیکن. مەبەست لە(عیشار)ووشترێکە کە هەڵبژاردە و لەسەر زاین بێت، ئاوسەکانیان ئەوانەن کە ئاوسیەکەیان بگاتە (١٠)دە مانگ، موفرەدەکەی(عشراء)ە و بەوە ناو ئەبرێت تا ئەزێ. خەڵکی بۆی ناکرێ بەخێوی بکا یا بەهرەی لێ وەربگرێ، کە ئاوسا لە هەموو شتێ زیاتر حەزی لێ ئەکرا، بەهۆی ئەو ڕووداوە سامناکە گەورەی کە دابوی بەسەریانا کە ئەویش ڕوداوی ڕۆژی قیامەتەو هاتنی پێشەکی هۆکانیتی، وە ئەفەرموێت: ﴿وَإِذَا ٱلْوُحُوشُ حُشِرَتْ﴾ یانی: کۆکرانەوە، وەك خودا ئەفەرموێت: ﴿وَمَا مِن دَآبَّةٍ فِى ٱلْأَرْضِ وَلَا طَٰٓئِرٍ يَطِيرُ بِجَنَاحَيْهِ إِلَّآ أُمَمٌ أَمْثَالُكُم ۚ مَّا فَرَّطْنَا فِى ٱلْكِتَٰبِ مِن شَىْءٍ ۚ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّهِمْ يُحْشَرُونَ﴾ واتە: هیچ گەڕۆکێکی گیان لەبەر نییە لە زەویدا وە هیچ باڵندەیەك نییە کە دەفڕێ بە هەردو باڵەکەی مەگەر ئومەتانێك وەك ئێوەن هیچ شتێکمان فەرامۆش نەکردوە لەم کتێبەدا(لوح المحفوظ) یا قورئان(پاشان ئەوانە) لە ڕۆژی دواییدا لای پەروەردگاریان کۆدەکرێنەوە. ئیبنو عەباس ئەڵێت: هەمووشتێ کۆئەکرێتەوە تەنانەت مێشیش! ئیبنو ئەبوحاتەم ڕیوایەتی کردوە. خودائە فەرموێت: ﴿وَٱلطَّيْرَ مَحْشُورَةً﴾ یانی: باڵندەکان لەدەوری کۆدەکرێنەوە.

## هەڵچون و تێکەڵ بەیەك بونی دەریاکان

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَإِذَا ٱلْبِحَارُ سُجِّرَتْ﴾ واتە: وە کاتێك کە دەریاکان تێکەڵ کران. ئیبنو جەریر لەسەعیدی کوڕی موسەییبەوە ڕیوایەتی کردوەئەڵێت: عەلی (ڕەزای خوای لێ بێ) بە پیاوێکی جولەکە ئەڵێت: جەهەنم لە کوێ یە؟ ئەڵێت: لە دەریایە. عەلی ئەڵێت: ڕاستی نەبێ هیچی تیا نابینم: سوێند بەدەریای پڕ کراولە ئاگر، لە پێشەوە لەسەر ئەم باسە دواین لە ئایەتی﴿وَٱلْبَحْرِ ٱلْمَسْجُورِ﴾ واتە: سوێند بەدەریای پڕ کراو لە ئاگر....

## جووت بوونی گیانەکان

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَإِذَا ٱلنُّفُوسُ زُوِّجَتْ﴾ واتە: وە ساتێك کە هەموو گیانەکان جیا کراوەتەوەلە لاشەکانیان ئەو دەرەنانە جووت ئەکرێنەوە،یانی: کۆکردنەوەی هەموو هاووێنەکان بۆ لای یەکتری، وەك خودا ئەفەرمووێت: ﴿ٱحْشُرُوا۟ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ وَأَزْوَٰجَهُمْ﴾ واتە: خوا بە فریشتەکان ئەفەرموێ: ئەوانەی ستەمیان کرد کۆیان بکەنەوە لەگەڵ هاوڕێکانیان هاو وێنەکانیان، ئیبنو ئەبوحاتەم لە نیعمانی کوڕی بەشیرەوە ڕیوایەتی کردوە کەئەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ئەوانە هاوشێوەی یەکترن(هم الضرباء) ئەڵێت: (الضرباء) هەموو کەسێ لەگەڵ هەر تیرەیەکدا بووبێ کە ئەوانیش وەك ئەویان کرد

بێت. لەبەر ئەوە خوای گەورە ئەفەرمووێت: ﴿وَكُنتُمْ أَزْوَٰجًا ثَلَٰثَةً ﴿٧﴾ فَأَصْحَٰبُ ٱلْمَيْمَنَةِ مَآ أَصْحَٰبُ ٱلْمَيْمَنَةِ ﴿٨﴾ وَأَصْحَٰبُ ٱلْمَشْـَٔمَةِ مَآ أَصْحَٰبُ ٱلْمَشْـَٔمَةِ ﴿٩﴾ وَٱلسَّٰبِقُونَ ٱلسَّٰبِقُونَ﴾ واتە: وە ئێوە دەبنە سێ کۆمەڵ (لەدوا ڕۆژدا)، ئەنجا یارانی لای ڕاست، کام یارانی لای ڕاست؟ وە یارانی لای چەپ، کام یارانی لای چەپ؟ وە پێشکەوتوەکان هەر خۆیانن پێشکەوتوون.

## پرسیاری زیندە بە چاڵ

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَإِذَا ٱلْمَوْءُۥدَةُ سُئِلَتْ﴾ واتە: وە کاتێ پرسیار کرا لە کچانی زیندە بەچاڵ. ﴿بِأَىِّ ذَنۢبٍ قُتِلَتْ﴾ واتە: کە بە چ گوناهێك کوژران. جمهوریش بەم شێوەیە خوێندویانەتەوە﴿سُئِلَتْ﴾. (مەوئودە)ش: ئەو منداڵە بووە کە خەڵکی لە کاتی نەفامیا زیندە بەچاڵیان ئەکرد چونکە خۆشیان لە کچ نەئەهات، لە ڕۆژی قیامەت دا پرسیار لە زیندە بەچاڵەکان ئەکرێت لەسەر چ تاوانێك کوژراون، ئەمە ترساندن وهەڕەشەیە لەو کەسەی کە کوشتویەتی. ئەگەر کاتێ پرسیار کرا لە تاوان لێکراو، ئەی تاوانکار لەو کاتەدا چۆن گومان ئەبا؟ عەلی کوڕی ئەبو تەلحە ئەڵێت: لە ئیبنو عەباسەوە: یانی: (سأَلَتْ)، هەروەها ئەبو زوحا ئەڵێت: (سأَلَتْ) واتە: داوای خوێنی خۆی کرد. سەدی و قەتادەیش وایان وتوە. چەند فەرمودەیەك هاتوە پەیوەندی بە زیندەبەچاڵەوە هەیە، ئیمامی ئەحمەد لە عائیشەوە ئەویش لە جودامەی کچی وەهەبەوە(خوشکی عوکاشە)ئەڵێت: ئامادە بووم لەناو خەڵکێکا لە خزمەت پێغەمبەردا (ﷺ)ئەی فەرموو: (هات بەدڵم دا کەغیلەتان لێ قەدەغە بکەم، سەیری ڕۆم و فارسم کرد کە ژنەکانیان شیر بەمنداڵەکانیان ئەدەن لەکاتی سك پڕیا وە هیچ زیانێك لەمنداڵەکانیان نادات، غیلە: واتە: شیردانی دایك بە منداڵەکەی لەکاتی سك پڕیا. پاشان پرسیارمان لێ کرد لە عەزل، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەوە زیندە بەچاڵی نهێنیە، ئەوەیە کە لە کچی زیندە بەچاڵیش پرسیار ئەکرێ). موسلم و ئیبن ماجەو ئەبو داود و تیرمیزی و نەسائی ڕیوایەتیان کردوە. (العزل): ڕێگەگرتنە لە ڕژانی مەنی لە ڕەحمی ئافرەتا لەلایەن پیاوەوە.

## تۆڵەی تاوانی زیندە بەگۆڕکردنی کچان

عەبدو ڕەزاق ئەڵێت: ئیسرائیل هەواڵێ داینێ لە شاکی کوڕی حەربەوە ئەویش لە نیعمانی کوڕی بەشیرەوە ئەویش لە عومەری کوڕی خەتابەوە دوربارەی ئەم فەرمودیەی خوا: ﴿وَإِذَا ٱلْمَوْءُۥدَةُ سُئِلَتْ﴾ ئەڵێت: قەیسی کوڕی عاصم هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) وتی: ئەی پێغەمبەر! من کچانی خۆم لە کاتی نەفامیا زیندە بەچاڵ کردوە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرموی: لە جیاتی هەر یەکێك لەوانە کۆیلەیەك ئازاد بکە ئەڵێت: ئەی پێغەمبەری خودا ! من خاوەنی وشترم؟ فەرمووی: لە تۆڵەی تاوانی هەر یەکێ لەوانە بودنە یەك (وشترێ گەورەو قەڵەو) سەربڕە.

**کردنەوی نامەکان**

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَإِذَا ٱلصُّحُفُ نُشِرَتۡ﴾ واتە: وە کاتێك کە نامەی کردەوە بڵاو کرایەوە و دابەشکران. زەححاك ئەڵێت: هەر کەسێ نامەی خۆی پێدرا بەدەستی ڕاستی یان دەستی چەپی. قەتادە ئەڵێت: ئەی نەوەی ئادەم چیت وتوە لەنامەکەتدا نوسراوە پاشان پێچراوەتەوەو پاشان لە ڕۆژی قیامەت دا بۆت ئەکرێتەوە، باهەموو کەسێ سەیر بکات، چی وتوە لەنامەکەیدا لەسەری نوسراوە.

**لابردنی ئاسمان و گەرمکردن و وەکوڵ دانی جەهەنم و نزیك خستنەوەی بەهەشت**

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَإِذَا ٱلسَّمَآءُ كُشِطَتۡ﴾واتە: وە کاتێك کە ئاسمان داماڵێنراو پێچرایەوە. موجاهید ئەڵێت: هێنرا. سوددی ئەڵێت: وەدەر خرا. ﴿وَإِذَا ٱلۡجَحِيمُ سُعِّرَتۡ﴾ واتە: وە کاتێك کە دۆزەخ هەڵگیرسێنرا. سودی ئەڵێت: تاو دراوگەرم کرا ﴿وَإِذَا ٱلۡجَنَّةُ أُزۡلِفَتۡ﴾ واتە: وە کاتێك کە بەهەشت نزیك خرایەوە. زەححاك و ئەبو مالیك و قەتادەو ڕەبیعی کوڕی خوسەیم ئەڵێن: نزیك خرایەوە.

**هەموو کەسێ ئەزانێ چی ئامادە کردوە بۆ ڕۆژی قیامەت**

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿عَلِمَتۡ نَفۡسٞ مَّآ أَحۡضَرَتۡ﴾ واتە: ئەو کاتە هەموو کەسێ ئەزانێ کە چی ئامادە کردووەبۆ خۆی لە چاکەو خراپە ئەمە ئەو وەڵامەیە کە لە پێشەوە ووترا ئەگەر ئەوە بوو ئەگەر ئەوە بوو. یانی: کاتێ ئەم شتانە ڕوویدا ئەو کاتە هەموو کەسێ ئەزانێ چی کردوەو چی ئامادەکردوە بۆ ئەوێ. وەك خودای گەورە لە سورەتێکی تردا ئەفەرموێت: ﴿يَوۡمَ تَجِدُ كُلُّ نَفۡسٖ مَّا عَمِلَتۡ مِنۡ خَيۡرٖ مُّحۡضَرٗا وَمَا عَمِلَتۡ مِن سُوٓءٖ تَوَدُّ لَوۡ أَنَّ بَيۡنَهَا وَبَيۡنَهُۥٓ أَمَدَۢا بَعِيدٗا﴾ واتە: بترسن! لەو ڕۆژە هەمووکەسێ ئەبینێت هەر کاریك باشی کردبێت ئامادەیە وە هەر کارێکی خراپی کردبێت ئاوات دەخوازێ کە لە نێوان ئەو و کارە خراپەکەیدا ماوەیەکی زۆر دوور ببوایە. وە ئەفەرموێت: ﴿يُنَبَّؤُاْ ٱلۡإِنسَٰنُ يَوۡمَئِذِۢ بِمَا قَدَّمَ وَأَخَّرَ﴾ واتە: لەو ڕۆژەدا ئادەمی هەواڵێ پێئەدرێت لەوەی کە پێشی خستوەو دوای خستوە(لە چاکەو خراپە).

﴿فَلَآ أُقۡسِمُ بِٱلۡخُنَّسِ ﴿١٥﴾ ٱلۡجَوَارِ ٱلۡكُنَّسِ ﴿١٦﴾ وَٱلَّيۡلِ إِذَا عَسۡعَسَ ﴿١٧﴾ وَٱلصُّبۡحِ إِذَا تَنَفَّسَ ﴿١٨﴾ إِنَّهُۥ لَقَوۡلُ رَسُولٖ كَرِيمٖ ﴿١٩﴾ ذِي قُوَّةٍ عِندَ ذِي ٱلۡعَرۡشِ مَكِينٖ ﴿٢٠﴾ مُّطَاعٖ ثَمَّ أَمِينٖ ﴿٢١﴾ وَمَا صَاحِبُكُم بِمَجۡنُونٖ ﴿٢٢﴾ وَلَقَدۡ رَءَاهُ بِٱلۡأُفُقِ ٱلۡمُبِينِ ﴿٢٣﴾ وَمَا هُوَ عَلَى ٱلۡغَيۡبِ بِضَنِينٖ ﴿٢٤﴾ وَمَا هُوَ بِقَوۡلِ شَيۡطَٰنٖ رَّجِيمٖ ﴿٢٥﴾ فَأَيۡنَ تَذۡهَبُونَ ﴿٢٦﴾ إِنۡ هُوَ إِلَّا ذِكۡرٞ لِّلۡعَٰلَمِينَ ﴿٢٧﴾ لِمَن شَآءَ مِنكُمۡ أَن يَسۡتَقِيمَ ﴿٢٨﴾ وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٢٩﴾﴾

موسلیم لەسەحیحەکەیدا ڕیوایەتی کردوەو نەسائیش لەماناکردنی ئەم ئایەتەدا لە عەمری کوڕی حورەیسەوە ئەڵێت: نوێژم ئەکرد لە دوای پێغەمبەرەوە(ﷺ)لە نوێژێکی بەیانیدا، گوێم لێی بوو ئەم ئایەتانەی ئەخوێند: ﴿فَلَآ أُقۡسِمُ بِٱلۡخُنَّسِ﴾ واتە: سوێند بەو ئەستێرە گەڕۆکانەی دەگەڕێنەوە. ﴿ٱلۡجَوَارِ ٱلۡكُنَّسِ﴾واتە: سوڕاوە خۆشاراوەکان﴿وَٱلَّيۡلِ إِذَا عَسۡعَسَ﴾ واتە: وە بە شەو کە تاریك ئەبێت﴿وَٱلصُّبۡحِ إِذَا تَنَفَّسَ﴾ واتە: بەبەیانی کە هەناسە دەدات. ئیبنوجەریر ڕیوایەتی کردوە لە خالیدی کوڕی عەرعەرەوە ئەڵێت: گوێم لەعەلی بوو پرسیاریان لێ ئەکرد دەربارەی ﴿فَلَآ أُقۡسِمُ بِٱلۡخُنَّسِ ۝١٥ ٱلۡجَوَارِ ٱلۡكُنَّسِ﴾ئەڵێت: ئەو هەسارانەی وون ئەبن بە ڕۆژو بە شەو دەرئەکەون و دەگەڕێنەوە ناو لانە. وە ئەفەرموێت: ﴿وَٱلَّيۡلِ إِذَا عَسۡعَسَ﴾ دوو ڕا وبۆچوون هەیە: یەکەم: هاتنی بەتاریکیەکەیەوە. موجاهید ئەڵێت: تاریك بوو. سەعیدی کوڕی جوبەیر ئەڵێت: کاتێ پەیدا بوو. حەسەنی بەسری ئەڵێت: کاتێ خەڵکی داپۆشی. وە هەروەها عەتیەوعەوفیش وایان وتوە. عەلی کوڕی ئەبو تەلحەو عەوفی گوێیان لە ئیبنو عەباسەوە بووە: ﴿إِذَا عَسۡعَسَ﴾ کاتێ نەماو ڕۆیشت. موجاهید و قەتادەو زەحاکیش هەر وایان وتوە. زەیدی کوڕی ئەسلەم و کوڕەکەی عەبدوڕەحمان ئەڵێن: ﴿إِذَا عَسۡعَسَ﴾.واتە: کاتێ ڕۆشت و ون بوو. من لام وایە مەبەست بەم ئایەتە﴿إِذَا عَسۡعَسَ﴾ کاتێ دێت، هەر چەند ئەم وشەیە ئەتوانرێ بەکار بهێنرێ بۆ ڕۆشتنیش، بەڵام لێرەدا (دێت) چاکترە وەکو سوێندی خواردبێ بەشەوو تاریکیەکەی کاتێ دێت، وە سوێند بە بەرە بەیان و ڕوناکیەکەی کاتێ هەڵدێت، وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَٱلَّيۡلِ إِذَا يَغۡشَىٰ ۝١ وَٱلنَّهَارِ إِذَا تَجَلَّىٰ﴾ واتە: سوێند بە شەو کاتێ کە زەوی دادەپۆشێ، وە بەڕۆژ کاتێ کە ڕووناك ئەبێتەوە. وە ئەفەرموێت: ﴿وَٱلضُّحَىٰ ۝١ وَٱلَّيۡلِ إِذَا سَجَىٰ﴾ واتە: سوێند بە چێشتەنگاو، وە سوێند بە شەو کاتێ کە ئارام دەگرێ. وە ئەفەرموێت: ﴿فَالِقُ ٱلۡإِصۡبَاحِ وَجَعَلَ ٱلَّيۡلَ سَكَنًا﴾ واتە: خوا بەدیهێنەری شەبەق و ڕووناکی ڕۆژبوونەوەیە و شەوی کردوە بە کات و هۆی ئارامگرتن. وە چەندین ئایەتی تر. وە زۆر لە زانایانی ئوصول وتویانە: وتەی ﴿عَسۡعَسَ﴾ بۆ هاتن و ڕۆشتنیش لە ڕوی هاوبەشیەوە بەکار ئەهێنرێت، بۆیە ڕاستە بۆ هەردوکیان بەکار بێت، والله اعلم. وە ئەفەرموێت: ﴿وَٱلصُّبۡحِ إِذَا تَنَفَّسَ﴾واتە: وە بەرەبەیانێ کەهەناسە ئەدات. زەحاك ئەڵێت: کاتێ هەڵهات. قەتادە ئەڵێت: کاتێ ڕوناك بوەوەو هات.

**قورئان جوبرەئیل دای بەزاندومو نەتیجەی شێتی نییە**

خودا ئەفەرموێت: ﴿إِنَّهُۥ لَقَوۡلُ رَسُولٖ كَرِيمٖ﴾ واتە: بێگومان ئەو قورئانە گوفتاری ڕەوانە کراوێکی پایەبەرزە کە فریشتەی سرووشە. یانی: ئەم قورئانە ڕاسپێراوێکی زۆر بەڕێز گەیاندویەتی، یانی: فریشتەیەکی پایەبەرزی بەژن ڕێك و شێوە جوان کە ئەویش جوبرەئیلە (علیه الصلاة والسلام) ئیبنو عەباس و شەعبی و مەیونی کوڕی میهران و حەسەن و قەتادە و ڕەبیعی کوڕی ئەنەس وزەححاك و کەسانی تریش وتویانە. ﴿ذِي قُوَّةٍ عِندَ ذِي ٱلۡعَرۡشِ مَكِينٖ﴾ واتە: بەهێزە، لای خاوەنی عەرش(خوای گەورە)خاوەن پایەیە ﴿مُّطَاعٖ ثَمَّ أَمِينٖ﴾ واتە: قسە ڕەوایە لەناو فریشتەدان دەست پاکە.﴿ذِي قُوَّةٍ﴾وەك: ئەم فەرمودەیە وایە: ﴿عَلَّمَهُۥ شَدِيدُ ٱلۡقُوَىٰ ۝٥ ذُو مِرَّةٖ﴾ واتە: (جوبرەئیلی) زۆر بە توانا فێری کردوە، خاوەنی بیرو هۆشی بەهێزە، یانی: دروستکراوێکی زۆر بەهێزو بەهەڵمەت و بەکارە. ﴿عِندَ ذِي ٱلۡعَرۡشِ مَكِينٖ﴾ یانی: جێدارە و پایە بڵندە لای خودای گەورە. ﴿مُّطَاعٖ ثَمَّ﴾ یانی: پایەدارو قسەی دەڕوات لای خواو گوێی لێ دەگیرێ. قەتادە ئەڵێت: ﴿مُّطَاعٖ ثَمَّ﴾ یانی: لەناو ئاسمانەکان، یانی: لەناو فریشتەکانا لە فریشتە گەورەو بەڕێزەکانە و جێگەی متمانەیە و هەڵبژێردراوە بۆ ئەم سپاردە گەورەیە. خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿أَمِينٖ﴾ وەسف کردنی جوبرەئیلە بە متمانە پێکراو، ئەمە زۆر گەورەیە کە خودا تەزکیەی پاکانەی بۆ بەندەو ڕاسپێراوو فریشتەی خۆی جوبرەئیل کردووە، وەك چۆن تەزکیەی بەندە و پێغەمبەری ئادەمی خۆی موحەممەد(ﷺ)کرد بەم ئایەتە ﴿وَمَا صَاحِبُكُم بِمَجۡنُونٖ﴾ واتە: هاوڕێکەتان کە موحەممەدە(ﷺ) شێت نیە وەك ئێوە دەڵێن. شەعبی و مەیمونی کوڕی میهران و ئەبو ساڵح و ئەوانەیشی کە لە پێشەوە ناومان هێنان وتویانە کە مەبەست لەم ئایەتە ﴿وَمَا صَاحِبُكُم بِمَجۡنُونٖ﴾ موحەممەدە (ﷺ) وە ئەفەرموێت: ﴿وَلَقَدۡ رَءَاهُ بِٱلۡأُفُقِ ٱلۡمُبِينِ﴾ واتە: سوێند بە خوا بێگومان فریشتەی سروشی دیوە لە ئاسۆی ڕووندا. یانی: بێگومان موحەممەد(ﷺ) جوبرەئیلی بینی کە ئەهات بۆ لای بەو پەیامەوە، لە لایەن خواوە لەسەر ئەو وێنەیەی کە خودا وەدی هێناوە کە (٦٠٠) شەش سەد باڵی بووە ﴿بِٱلۡأُفُقِ ٱلۡمُبِينِ﴾ یانی: ئاشکرا، ئەوە بینینی یەکەم بوو لە(بطحاء) کە لەم ئایەتانەدا هاتوە﴿عَلَّمَهُۥ شَدِيدُ ٱلۡقُوَىٰ ۝٥ ذُو مِرَّةٖ فَٱسۡتَوَىٰ ۝٦ وَهُوَ بِٱلۡأُفُقِ ٱلۡأَعۡلَىٰ ۝٧ ثُمَّ دَنَا فَتَدَلَّىٰ ۝٨ فَكَانَ قَابَ قَوۡسَيۡنِ أَوۡ أَدۡنَىٰ ۝٩ فَأَوۡحَىٰٓ إِلَىٰ عَبۡدِهِۦ مَآ أَوۡحَىٰ﴾واتە: جوبرەئیلی زۆر بە توانا فێری کردووە، خاوەنی بیروهۆشی بەهێزە، جا لەسەر شێوەی خۆی ڕاوەستا، لەکاتێکدا ئەو بە ئاسۆی هەرە بەرزی ئاسمانەوە بوو، پاشان نزیك

بوویەوە لە موحەممەد(ﷺ) ئەنجا هاتە خوارەوە، جا بە ئەندازەی دوو کەوان یاکەمتری مەودا بوو لەگەڵ موحەممەددا(ﷺ) ئینجا خودا هەر مەبەستێ کەوا ویستی بە عەبدی خۆی ڕابگەیەنێ پێ ی ڕاگەیاند. وەك چۆن لە پێشەوە ئەم مانایەمان روون کردەوە، و بەڵگەیشە لەسەری کە مەبەست پێی جوبرەئیلە (علیه السلام)،والله أعلم. ئەم سورەتە پێش شەوی ئیسراء هاتە خوارەوە چونکە ئەم بینینە نەبێ باس نەکراوە ئەویش بینینی یەکەمە، بەڵام بینینی دوهەم ئەوەیە کە باس کراوە لەم ئایەتانەدا ﴿وَلَقَدْ رَءَاهُ نَزْلَةً أُخْرَىٰ ﴿١٣﴾ عِندَ سِدْرَةِ ٱلْمُنتَهَىٰ ﴿١٤﴾ عِندَهَا جَنَّةُ ٱلْمَأْوَىٰٓ ﴿١٥﴾ إِذْ يَغْشَى ٱلسِّدْرَةَ مَا يَغْشَىٰ﴾

واتە: سوێند بە خوا بێگومان جارێکی تر جوبرەئیلی بینیوە، لای درەختی﴿سِدْرَةِ ٱلْمُنتَهَىٰ يَرَىٰ﴾ کە بەهشتی نیشتەجێ بون لەوێدایە، کاتێ کە سیدرەی داپۆشیوە ئەوەی کە ئەبێ داپۆشێ, ئەمە درێژتر باس کراوە لە سورەتی نەجم دا، بێگومان دوای سورەتی ئیسراء هاتوەتە خوارەوە.

## پێغەمبەر( ﷺ )چاوچنۆك نەبو لەگەیاندنی نیگادا

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَمَا هُوَ عَلَى ٱلْغَيْبِ بِضَنِينٍ﴾ واتە: وە ئەو ڕژدو چروك نیە لە گەیاندنی سروشدا یانی: موحەممەد(ﷺ) لەوەی خودا بۆی ناردوە﴿بِضَنِينٍ﴾جێی گومان نەبوە. هەندێ لە زانایان خوێندویانەتەوە بە(ضاد) یانی: ڕژد، بەڵکو بەهەموو کەسێکی بەخشیوە. سوفیانی کوڕی عویەینە ئەڵێت: (ظَنِينٍ و ضَنِينٍ) وەك یەکن، یانی: نەدرۆزن و نە لەدین لادەر بووە (الظنِينٍ) گومان لێکراو(ضَنِينٍ) ڕژد. قەتادە ئەڵێت: قورئان نهێنی بوە، خودا دایبەزاندوە بۆ موحەممەد(ﷺ) هیچ چنۆکی پێ نەکردوە بۆ خەڵکی بەڵکو بڵاوی کردوەتەوەو گەیاندویەتی و داویەتی بەهەر کەسێ ویستبێتی. عیکریمەو ئیبنو زەیدو زۆر کەسی تریش وایان وتوە. ئیبنو جەریریش خوێندنەوەی(ضادی) هەڵبژاردوە. هەر دوکیان متواترن و ماناکانیان ڕاستە وەك لە پێشەوە باسمان کرد.

## ئەم قورئانە پەندە بۆ خەڵکی دونیا قسەو نیگای شەیتان نیە

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَمَا هُوَ بِقَوْلِ شَيْطَٰنٍ رَّجِيمٍ﴾ واتە: وە ئەو قورئانە قسەی شەیتانی دەرکراو لەبەزەیی خوا نیە وەك ئێوە دەڵێن، یانی: شەیتان توانای هەڵگرتنی نیەو بۆشی نیە. وەك ئەفەرموێت: ﴿وَمَا تَنَزَّلَتْ بِهِ ٱلشَّيَٰطِينُ ﴿٢١٠﴾ وَمَا يَنۢبَغِى لَهُمْ وَمَا يَسْتَطِيعُونَ ﴿٢١١﴾ إِنَّهُمْ عَنِ ٱلسَّمْعِ لَمَعْزُولُونَ﴾ واتە: شەیتانەکان ئەوقورئانە یان نەهێناوەتە خوارەوە، نەشیاوی ئەوەشن و نەدەشتوانن، بە ڕاستی شەیتانەکان لە گوێگرتنی هەواڵێ ئاسمان بەرگری کراون ﴿فَأَيْنَ تَذْهَبُونَ﴾ واتە: ئەوە بۆ کوێ دەڕۆن. یانی: عەقڵتان بۆ نەماوە بۆ باوەڕتان نیە بەم قورئانە کە بە ئاشکراو ڕونیەی دەرکەوتوە کە ڕاستەو لەلای خواوە هاتوە، وەك ئەبو بەکری صدیق(خوا لێ ی ڕازی بێ) بەشاندێکی بەنی حەنیفە ووت کاتێ

بەموسڵمانی هاتن، فەرمانی دا کە هەندێ لەو قورئانەی موسەیلەمەی کەزابی بۆ بخوێننەوە کە لە ئەوپەڕی ئاوەز لە دەستدان و ناتەواویدایە، پاشان ئەڵێت: خودا بتان گرێ، فامتان بۆ کوێ ڕۆیشتوە؟ سوێند بەخوا ئەم قسەیە قسەی خودا نی یە! قەتادە ئەڵێت: یانی: نە لە کتێبی خودا هەیە و نە فەرمانیشتی پێ کردوە، وە پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ لِّلْعَالَمِينَ﴾ واتە: ئەم قورئانە تەنها ئامۆژگاری یە بۆ هەموو جیهانیان. یانی: ئەم قورئانە پەندە بۆ هەر کەسێ پەندو ئامۆژگاری لێ وەربگرێت. ﴿لِمَن شَآءَ مِنكُمْ أَن يَسْتَقِيمَ﴾ ئەبو جەهل ئەڵێت: ئارەزوی خۆمانە ئەگەر ویستمان شوێن ڕێگەی ڕاست کەوین یانەکەوین. خودای گەورەئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: ﴿وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾.

## سورەتی (الإنفطار)

## لەمەککەدا هاتووەتەخوارە

### ڕێزی سورەتی ئینفیتار

نەسائی ڕیوایەتی کردوە لەجابرەوە ئەڵێت: مەعاز هەڵساو نوێژی خەوتنانی کردو درێژەی پێدا، پێغەمبەر(ﷺ) فەرموی: ئایا مەعاز تۆ ئەتەوێ ببی بە فیتنە بۆ خەڵکی؟ ئەی ئەوە﴿سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى - وَٱلضُّحَىٰ - إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنفَطَرَتْ﴾نییە؟ سەرچاوەی فەرموودەکە بوخاری و موسلیمە.بەڵام﴿إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنفَطَرَتْ﴾لە سونەنی نەسائیدا هاتووە (وەك لە پێشەوە باسمان کردووە) لە عەبدوڵای کوڕی عومەرەوە ڕیوایەت کراوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: هەرکەسێك پێی خۆشە سەیری ڕۆژی قیامەت بکات بە چاوی خۆی با ﴿إِذَا ٱلشَّمْسُ كُوِّرَتْ - إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنشَقَّتْ - إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنفَطَرَتْ﴾ بخوێنێ.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنفَطَرَتْ ﴿١﴾ وَإِذَا ٱلْكَوَاكِبُ ٱنتَثَرَتْ ﴿٢﴾ وَإِذَا ٱلْبِحَارُ فُجِّرَتْ ﴿٣﴾ وَإِذَا ٱلْقُبُورُ بُعْثِرَتْ ﴿٤﴾ عَلِمَتْ نَفْسٌ مَّا قَدَّمَتْ وَأَخَّرَتْ ﴿٥﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْإِنسَٰنُ مَا غَرَّكَ بِرَبِّكَ ٱلْكَرِيمِ ﴿٦﴾ ٱلَّذِى خَلَقَكَ فَسَوَّىٰكَ فَعَدَلَكَ ﴿٧﴾ فِىٓ أَىِّ صُورَةٍ مَّا شَآءَ رَكَّبَكَ ﴿٨﴾ كَلَّا بَلْ تُكَذِّبُونَ بِٱلدِّينِ ﴿٩﴾ وَإِنَّ عَلَيْكُمْ لَحَٰفِظِينَ ﴿١٠﴾ كِرَامًا كَٰتِبِينَ ﴿١١﴾ يَعْلَمُونَ مَا تَفْعَلُونَ ﴿١٢﴾﴾

**ئەوەی لە ڕۆژی قیامەتدا ڕوودەدات**

خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنفَطَرَتۡ﴾ واتە: کاتێك کە ئاسمان لەت بوو،یانی: درزی برد، وەك چۆن خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا ئەفەرموێت: ﴿ٱلسَّمَآءُ مُنفَطِرُۢ بِهِۦ﴾ واتە: ئاسمان لەت دەبێ بەهۆی سەختی ئەو ڕۆژەوە ﴿وَإِذَا ٱلۡكَوَاكِبُ ٱنتَثَرَتۡ﴾ واتە: وە کاتێك کە ئەستێرەکان کەوتنە خوارەوە بە پەرش و بڵاوی. یانی: وەرین و کەوتنە خوار. ﴿وَإِذَا ٱلۡبِحَارُ فُجِّرَتۡ﴾واتە: کاتێك کە دەریاکان تەقین و تێکەڵ کران.عەلی کوڕی ئەبو تەلحە لە ئیبنو عەباسەوە ئەڵێت: لەناویەکا خودا تەقاندیەوە. حەسەن ئەڵێت: خودا تەقاندیەوە لەناو یەکاو ئاوەکەی نەما. قەتادە ئەڵێت: شیرین و تاڵ سوێری تێکەڵاوی یەك بوون. ﴿وَإِذَا ٱلۡقُبُورُ بُعۡثِرَتۡ﴾ واتە: وە کاتێك کە گۆڕەکان ژێرەو ژوور کرانمردوەکان هاتنە دەرەوە، ئیبنو عەباس ئەڵێت: هەڵکەنرا. سودی ئەڵێت: ژێراو سەر بوو، لەرزی وئەوەی لەناویدایە هاتە دەرەوە. ﴿عَلِمَتۡ نَفۡسٞ مَّا قَدَّمَتۡ وَأَخَّرَتۡ﴾ واتە: ئەو کاتە هەموو کەسێك دەزانێت کەچی لە پێشەوە ناردووەچیشی دوا خستوە. یانی: کاتێ ئەمە بوو وە ئەمە ڕویدا.

**نابێت ئینسان خودای لەبیر بچێت**

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلۡإِنسَـٰنُ مَا غَرَّكَ بِرَبِّكَ ٱلۡكَرِيمِ﴾ واتە: ئەی ئینسان چی تۆی خەڵەتاندوە لە ڕووی پەروەردگاری گەورەوبەخشندەتدا. ئەمە هەڕەشەیە، نەوەك هەندێ کەس وا دەزانێ ئامۆژگاریە بۆ وەلامێك، لێرەدا خودای گەورە ئەفەرمووێت: ﴿ٱلۡكَرِيمِ﴾ تا یەکێك لە خۆیان ئەڵێ: بەخشندەیی بابیهەوای کردوە، بەلام ئەم مانایە لەم ئایەتەکەدا نییە، بەڵکو ئایەتەکە یانی: ئەی بەنی ئادەم !چی تۆی بابیهەوا کردوە لە پەروەردگاری بەخشندەت یان گەورەت؟ کە وا دەستت داوەتە گوناە کردن! وەلامت بەشتێك داوەتەوە کە شایەنی نیە. وەك لەم فەرمودەی پێغەمبەردا(ﷺ) هاتوە: خودای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا ئەفەرموێت: ئەی بەنی ئادەم! چی لە ئاستی مندا بابیهەوای کردی؟ ئەی بەنی ئادەم وەلامی پێغەمبەرانت چۆن داوەتەوە؟ وە پاشان ئەفەرموێت: ﴿ٱلَّذِي خَلَقَكَ فَسَوَّىٰكَ فَعَدَلَكَ﴾ واتە: ئەو پەروەردگارەی کە دروستی کردویت و ڕێکی خستویت و جیای کردویتەوەلە گیان لەبەرانی تر. یانی: چی تۆی لەبەرانبەر پەروەردگاری گەورە بابیهەوا کرد؟ ﴿ٱلَّذِي خَلَقَكَ فَسَوَّىٰكَ فَعَدَلَكَ﴾ یانی: ڕێك و ڕاست وەدیهێناوی وە لە بەژنێکی مامناوەندی کە جوانترین شێوەو شکڵی پێ بەخشیویت. ئیمامی ئەحمەد لە بوسری کوڕی جەماشی قورەیشەوە ڕیوایەتی کردوە کە پێغەمبەر(ﷺ) تۆزێ تفی کردە ناو لەپی و پەنجەی خستە سەری، پاشان فەرمووی: خودای گەورە

ئەفەرموێت: ئەی نەوەی ئادەم چۆن من بە بێ توانا ئەزانی کە تۆم لەوێنەی ئەمە یانی: مەنی دروست کردوە؟ کاتێ کە ڕێك و پێکیشم کردی وە بەدوو بێ هێزیدا تێپەڕیت و پاشەڕۆژیشت لە زەویدا ناو گۆڕەو کۆتکردوەتەوە و نەتبەخشیوە تا مەرگ بەر بینی گرتی ئەوجا ئەڵێی: ماڵ ئەبەخشم و چاکە ئەکەم، ئێستا کاتی ماڵ بەخشینە؟ هەر بەم شێوەیە ئیبنو ماجە ڕیوایەتی کردوە. وە ئەفەرموێت: ﴿فِيٓ أَيِّ صُورَةٖ مَّا شَآءَ رَكَّبَكَ﴾ واتە: لە هەر وێنەیەکدا کە خۆی ویستبێتی یەکی خستویت. موجاهید ئەڵێت: لەسەر هەر شێوەیەك باوك یا دایك یا خاڵ یا مام. لە هەردو سەحیحەکەدا هاتوە لە ئەبو هورەیرەوە پیاوێك ئەڵێت: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) خێزانەکەم منالێکی ڕەشی بووە، پێغەبمەریش(ﷺ) فەرموی: ووشترت هەیە؟ ئەڵێت: بەڵێ، فەرمووی: چەند ڕەنگن ووتی: سوون. فەرمووی: ڕەنگی بۆریان تێدایە؟ ووتی: بەڵێ. فەرمووی: ئەم ڕەنگانە لە کوێوە هاتن ووتی: لەوانەیە لە ووشترێکی پێشتر بچێت و ڕەنگەکەی لەو بکات، فەرمووی: ئەم کوڕەش لەوانەیە لە یەکێك لە باوباپیرانی پێش تۆ بچێت! ئەو پێست ڕەشییەی بچێتەوە سەر ئەو.

## هۆی لە خۆبایی بوون و ئاگاداری لەسەر تۆمارکردنی کردەوەکانی مرۆڤ لە لایەن فریشتەکانەوە

خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿كَلَّا بَلۡ تُكَذِّبُونَ بِٱلدِّينِ﴾ واتە: وا نییە کە تێگەیشتوون، بەڵکو ئێوە ڕۆژی پاداشت بەدرۆ ئەزانن، یانی: ئەوەی کە پاڵتان پێوە دەنێ ڕووبەڕووی خوای بەخشندە ببنەوە بەگوناهکردن بێباوەڕبوونتانە لە دڵەوە بە ڕۆژی دوایی و پاداشت و لێپرسینەوە! وە ئەفەرموێت: ﴿وَإِنَّ عَلَيۡكُمۡ لَحَٰفِظِينَ﴾ واتە: بێگومان چەند چاودێرێکتان بەسەرەوەیە ﴿كِرَامٗا كَٰتِبِينَ﴾ واتە: کە بەڕێزو نوسەرن. ﴿يَعۡلَمُونَ مَا تَفۡعَلُونَ﴾ واتە: هەر چی بکەن دەیزانن. یانی: فریشتەی بەڕێزی چاودێریکەرتان بەسەرەوەیە بەکردەوەی ناشیرن مەچن بەرەو ڕوویان، چونکە هەمووی ئەنوسن لەسەرتان.

﴿إِنَّ ٱلۡأَبۡرَارَ لَفِي نَعِيمٖ ﴿١٣﴾ وَإِنَّ ٱلۡفُجَّارَ لَفِي جَحِيمٖ ﴿١٤﴾ يَصۡلَوۡنَهَا يَوۡمَ ٱلدِّينِ ﴿١٥﴾ وَمَا هُمۡ عَنۡهَا بِغَآئِبِينَ ﴿١٦﴾ وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا يَوۡمُ ٱلدِّينِ ﴿١٧﴾ ثُمَّ مَآ أَدۡرَىٰكَ مَا يَوۡمُ ٱلدِّينِ ﴿١٨﴾ يَوۡمَ لَا تَمۡلِكُ نَفۡسٞ لِّنَفۡسٖ شَيۡـٔٗاۖ وَٱلۡأَمۡرُ يَوۡمَئِذٖ لِّلَّهِ ﴿١٩﴾﴾

## پاداشتی ئاکاری چاکان و بەدکاران

خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلۡأَبۡرَارَ لَفِي نَعِيمٖ﴾ واتە: بە ڕاستی چاکەکاران لەناو نازو نیعمەتدان، خودای گەورە هەواڵی ئاکارە چاکەکانمان ئەداتێ کە بەرەو چ خۆشیەك ئەچن، ئەو کەسانەی کە گوێڕایەڵی فەرمانی خودا بوون بە گوناە وەلامیان نەداوەتەوە، پاشان باسی بەدکارانمان بۆ دەکات کە بەرەو جەهەنم بەردەوام لە سزا دان. ﴿وَإِنَّ ٱلۡفُجَّارَ لَفِي جَحِيمٖ﴾ واتە: بێگومان بەدکاران لە دۆزەخدان. بۆیە

ئەفەرموێت: ﴿يَصۡلَوۡنَهَا يَوۡمَ ٱلدِّينِ﴾واتە: لە ڕۆژی پاداشتدا دەچنە ناویەوە. یانی ڕۆژی ژماردن و پاداشت و قیامەت.﴿وَمَا هُمۡ عَنۡهَا بِغَآئِبِينَ﴾ واتە: وە ئەوان لێی دەرناچن. یانی: یەك كاتژمێریش ناتوانن لەو سزایە خۆلادەن و سوكیش ناكرێ و وەلامیش نادرێنەوە كە داوا ئەكەن بمرن یا پشویەك بدەن با یەك ڕۆژیش بێت، وە ئەفەرموێت: ﴿وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا يَوۡمُ ٱلدِّينِ﴾ واتە: تۆ چوزانیت كەر ڕۆژی پاداشت چیە؟ئەم شێوازە لە دەربڕیندا بۆ زۆر بە گەورە سەیركردنی ڕۆژی قیامەتە، پاشان تەئكیدی ئەكاتەوەو ئەفەرموێت: ﴿ثُمَّ مَآ أَدۡرَىٰكَ مَا يَوۡمُ ٱلدِّينِ﴾ واتە: دووبارە چوزانیت ڕۆژی پاداشت چیە؟ دوبارە مانای كردوەتەوەو ئەفەرموێت: ﴿يَوۡمَ لَا تَمۡلِكُ نَفۡسٞ لِّنَفۡسٖ شَيۡـٔٗاۖ وَٱلۡأَمۡرُ يَوۡمَئِذٖ لِّلَّهِ﴾ واتە: ڕۆژێكە كە هیچ كەس هیچی بەدەست نیە بۆ هیچ كەس وە فەرمان لەو ڕۆژەدا هەر بۆ خوایە. یانی: كەس ناتوانێ كەلك بە كەسی تر بگەیەنێ وە رزگاری بكات لەو حاڵەی كە تێیدایە مەگەر خوا ڕێگا بدا بۆ كەسێ مەیلی ببێ و لێی ڕازی بێ. لە كۆتایی تەفسیری سورەتی شوعەراء لە پێشەوە باس كرا كە پێغەمبەر ئەفەرموێت: ئەی نەوەی هاشم! خۆتان ڕزگار كەن لە ئاگر ناتوانم لای خوا هیچ شتێكتان بۆ بكەم، بۆیە ئەفەرموێت: ﴿وَٱلۡأَمۡرُ يَوۡمَئِذٖ لِّلَّهِ﴾ وە ئەم ئایەتە وەك ئەم ئایەتانە وایە كە خوای گەورە، وە ئەفەرموێت: ﴿لِّمَنِ ٱلۡمُلۡكُ ٱلۡيَوۡمَۖ لِلَّهِ ٱلۡوَٰحِدِ ٱلۡقَهَّارِ﴾ واتە: خوا ئەفەرموێ: ئەمڕۆ پادشایەتی و دەسەلات بۆ كێ یە، وەلام نادرێتەوە، خۆی ئەفەرموێ: هەر بۆ خوای تاك و تەنیایە كە بەسەر هەموو شتێكدا زاڵە. وە ئەفەرموێت: ﴿ٱلۡمُلۡكُ يَوۡمَئِذٍ ٱلۡحَقُّ لِلرَّحۡمَٰنِ﴾واتە: لەو ڕۆژەدا فەرمانڕەوایەتی ڕاستەقینە تەنها بۆخوای میهرەبانە، وە ئەفەرموێت: ﴿مَٰلِكِ يَوۡمِ ٱلدِّينِ﴾ واتە: خاوەنی ڕۆژی سزاو پاداشتدانەوە. قەتادە ئەڵێت: ﴿يَوۡمَ لَا تَمۡلِكُ نَفۡسٞ لِّنَفۡسٖ شَيۡـٔٗاۖ وَٱلۡأَمۡرُ يَوۡمَئِذٖ لِّلَّهِ﴾ بەخوا قەسەم ئەمڕۆ فەرمان هەر بۆ خودایە، بەلام هیچ كەسێ ناتوانی قسە بكات.

## تەفسیری سورەتی (المطففين)

## لەمەدینەدا هاتووەتە خوارەوە

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿وَيۡلٞ لِّلۡمُطَفِّفِينَ ١ ٱلَّذِينَ إِذَا ٱكۡتَالُواْ عَلَى ٱلنَّاسِ يَسۡتَوۡفُونَ ٢ وَإِذَا كَالُوهُمۡ أَو وَّزَنُوهُمۡ يُخۡسِرُونَ ٣ أَلَا يَظُنُّ أُوْلَٰٓئِكَ أَنَّهُم مَّبۡعُوثُونَ ٤ لِيَوۡمٍ عَظِيمٖ ٥ يَوۡمَ يَقُومُ ٱلنَّاسُ لِرَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ٦﴾

**زیادو کەم لە کێشانەو پێوانەدا ئەبێتە هۆی هاوارو زەرەرمەندی**

نەسائی و ئیبنو ماجە ڕیوایەتیان کردوە لە ئیبنو عەباسەوە ئەڵێت: کاتێ پێغەمبەر(ﷺ) هاتە مەدینە خراپترین کەس بوون لە پێوانەدا، خودای گەورە ئەم ئایەتانەی ناردە خوارەوە: ﴿وَيْلٌ لِّلْمُطَفِّفِينَ﴾ واتە: هاوار بۆ تەرازوبازان. دوای ئەم ئایەتە پێوانەیان چاك کرد. مەبەست لە (تطفيف) لێرەدا: گزیکردنە لە کێشانەو پێوانەدا، واتە زیادە لێسەندن لە خەڵکی لەکاتی کڕیندا وە کەم پێدان لە کاتی فرۆشتنداندا، لە بەر ئەمە خودای گەورە حاڵی(الْمُطَفِّفِين)ی ڕوون کردوەتەوە و بەڵێنی پێداون بە لەناوچوون و زیانباری کە ئەویش وەیلە، وە ئەفەرموێت: ﴿الَّذِينَ إِذَا اكْتَالُوا عَلَى النَّاسِ يَسْتَوْفُونَ﴾ واتە: ئەوانەی کە پێوانە بکەن بۆ خۆیان لەسەرماڵی خەڵك بەتەواوی وەری دەگرن ﴿يَسْتَوْفُونَ﴾واتە: بەشی خۆیان وەردەگرن بەتەواوی و بەزیادەیشەوە. ﴿وَإِذَا كَالُوهُمْ أَو وَّزَنُوهُمْ يُخْسِرُونَ﴾ واتە: بەڵام کاتێ بۆیان پێوانە یا کێشانە بکەن کەمیان دەدەنێ، یانی: لێی کەم دەکەن. چاکتر وابو(کالُوا و وزَنُوا) بکرانایەتە متعدی و(هم) یش لە محەلی نەصبا بوایە، وە هەندێکیان (هم) یان کردوە بە زەمیری موئەکەد بۆ شاراوەیەك لەم فەرمودەی خوادا (کالوْ و وزَنُوا) مەفعولەکەی لادەبرێت لەبەر ئەوەی ڕستەکە ئەو مانایە هەڵ دەگرێت، هەردولێکدانەوەکە لەیەکەوە نزیکن. خوای گەورە فەرمانی داوە لەکێشانەو پێوانەدا ڕێك و چاك بین، ئەفەرموێت: ﴿وَأَوْفُوا الْكَيْلَ إِذَا كِلْتُمْ وَزِنُوا بِالْقِسْطَاسِ الْمُسْتَقِيمِ ذَٰلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلًا﴾ واتە: وە کاتێك کە پێوانە ئەکەن بۆ خەڵکی بە ڕێك و پێکی پێوانە بکەن و کێشانەش بە ترازووی ڕاست بکەن ئەمە بۆ ئێوە چاکترە و ئاکامیشی باشترە! وە ئەفەرموێت: ﴿وَأَوْفُوا الْكَيْلَ وَالْمِيزَانَ بِالْقِسْطِ لَا نُكَلِّفُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا﴾ واتە: وە پێوانەو کێشانە بێ زیادو کەم ئەنجامی بدەن بەدادگەری، داواو ئەرك لەکەس ناکەین مەگەر بە ئەندازەی توانای خۆی، وە ئەفەرموێت: ﴿وَأَقِيمُوا الْوَزْنَ بِالْقِسْطِ وَلَا تُخْسِرُوا الْمِيزَانَ﴾ واتە: وە کێشانەتان ڕێك و پێك بکێشن و لە تەرازوودا کەم و کوڕی مەکەن سوك مەیکێشن. خودا گەلی شوعەیبی تەفرو تونا کردو لەناوی بردن لەبەر ئەوەی لەکێشانەو پێوانەدا ئەگەر بۆ خۆیان بوایە بەزیادەوە وەریان ئەگرت بەڵام بەخەڵکیان بدایە کەمیان پێ ئەدان.

**ترساندنی تەرازو بازان لەوەستانیان لەبەردەم پەروەردگاری هەموو جیهان**

دەربارەی خودا هەڕەشەیان لێ ئەکات و ئەفەرموێت: ﴿أَلَا يَظُنُّ أُولَٰئِكَ أَنَّهُم مَّبْعُوثُونَ﴾ واتە: ئایا ئەوانە نازانن کە بێگومان زیندوو دەکرێنەوە. ﴿لِيَوْمٍ عَظِيمٍ﴾ واتە: لە ڕۆژێکی گەورەدا، یانی: ئەوانە

ناترسن لە زیندوبونەوەو وەستان لەبەردەستی کەسێك کە ئاگای لە هەموو شاراوەو پەنهانیەك هەیە، لە ڕۆژێ کە ترسەکەی گەورەیەو زۆر سامناکەو دڵ دێنێتە لەرزە، هەر کەس دەرنەچوو تێیدا ئەخرێتە ناو ئاگرێکی زۆر بڵێسەدار؟ وە ئەفەرموێت: ﴿يَوْمَ يَقُومُ ٱلنَّاسُ لِرَبِّ ٱلْعَـٰلَمِينَ﴾ واتە: ڕۆژێك کە خەڵك لەبەر بارەگای پەروەردگاری جیهانیان دەوەستن. یانی: ڕا ئەوەستن بە پێی پەتی بە ڕوتی و خەتەنە نەکراوی(غُرلا)، لەوێستگەیەکی تەنگی گرانی ناڕەحەتی زۆر ناخۆشی خراپ و تاوانباریدا، ترس دایگرتون لەفەرمانی خوا کە هەست و توانا دەستەوسانە ئیش ناکا. ئیمامی مالیك ڕیوایەتی کردوە لە نافیع ئەویش لە ئیبنو عومەرەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) ئەفەرمووێت: ڕۆژێ کە هەموو خەڵکی بۆ دیداری پەروەردگاری جیهان ڕادەوەستن، کەسی وایان هەیە تا ئەندازەی هەردو گوێی لە عارەقی خۆیا وون ئەبێ. ئەم فەرموودەیە بوخاری ڕیوایەتی کردوە لە فەرمودەی مالك و عەبدوڵای کوڕی عەونەوە و هەردوکیان لە نافیعەوە. ئیمامی موسلیم لە دوو ڕێگەکەوە هەر وا ڕیوایەتی کردوە. فەرمودەیەکی تر کە ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە میقداد لەئیبن ئەسوەدی کیندیەوە ئەڵێت: گوێم لە پێغەمبەر بوو(ﷺ)فەرمووی: کاتێ ڕۆژی قیامەت خۆر نزیك ئەکرێتەوە لە خەڵکی، تا ماوەی یەك میل یادو میل، فەرمووی: خۆر ئەیانتوێنێتەوە بە پێی کردوەکانیان لەناو ئارەقی خۆیان، هەیانە تا قوله پێی، هەیانە تا هەردو ئەژنۆی، هەیشە تا پڕۆێنگەی، هی واشی هەیە تا ناودەمی. موسلیم و تیرمیزی ڕیوایەتیان کردوە. لەسونەنی ئەبو داودا هاتوە کە پێغەمبەر(ﷺ)پەنای گرتوە بە خوا لە تەنگی وەستان بە پێوە لە ڕۆژی قیامەتدا. لە ئیبنو مەسعودەوە: چل ساڵ ڕوو بەرەو ئاسمان ڕائەوەستن هیچ کەسێ قسەیان لەگەڵ ناکات، چاك و خراپیان، ئارەق تا ناو دەمیان هاتوە. وە لە ئیبنو عومەرەوە: سەد ساڵ ڕا ئەوەستێن، هەردوو فەرموودەکە ئیبنو جەریر ڕیوایەتی کردوە. لە سونەنی ئەبو داودو نەسائی و ئیبنو ماجە دا هاتوە لە عائیشەوە: کە پێغەمبەر(ﷺ)پێشەکی شەونوێژی بەدەجار الله أكبر، و دەجار الحمد لله، و دەجار سبحان الله، و دەجاراستغفر الله، دەست پێ دەکرد وپاشان ئەیفەرموو: خوایە لێم خۆشبێ! ڕێگام نیشاندەی! بژێویم پێ بدەی !و لەش ساغیم پێ ببەخشی! وە پەنای ئەگرت لە تەنگی وەستان لە ڕۆژی قیامەتدا.

﴿ كَلَّآ إِنَّ كِتَـٰبَ ٱلْفُجَّارِ لَفِى سِجِّينٍ ﴿٧﴾ وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا سِجِّينٌ ﴿٨﴾ كِتَـٰبٌ مَّرْقُومٌ ﴿٩﴾ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴿١٠﴾ ٱلَّذِينَ يُكَذِّبُونَ بِيَوْمِ ٱلدِّينِ ﴿١١﴾ وَمَا يُكَذِّبُ بِهِۦٓ إِلَّا كُلُّ مُعْتَدٍ أَثِيمٍ ﴿١٢﴾ إِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِ ءَايَـٰتُنَا قَالَ أَسَـٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿١٣﴾ كَلَّا ۖ بَلْ ۜ رَانَ عَلَىٰ قُلُوبِهِم مَّا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ ﴿١٤﴾ كَلَّآ إِنَّهُمْ عَن رَّبِّهِمْ يَوْمَئِذٍ لَّمَحْجُوبُونَ ﴿١٥﴾ ثُمَّ إِنَّهُمْ لَصَالُوا۟ ٱلْجَحِيمِ ﴿١٦﴾ ثُمَّ يُقَالُ هَـٰذَا ٱلَّذِى كُنتُم بِهِۦ تُكَذِّبُونَ ﴿١٧﴾﴾

**باسی بەدفەڕان و هەندێ لە بەسەرهاتیان**

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿كَلَّآ إِنَّ كِتَٰبَ ٱلْفُجَّارِ لَفِى سِجِّينٍ﴾ واتە: با پەشیمان بنەوە، چونکە بە ڕاستی نامەی تاوانباران لەناو (دەفتەرێکی پەست)ی ڕەش دایە. یانی: پاشە ڕۆژو شوێنیان لە(سجین) بەندینخانەیە، شوێنی تەنگەلان، وەك چۆن ئەوترێ: فیسق، شریب، خمیر، سکیر، لەم بابەتە، چونکە کارەساتێکی گەورەو گرانە. بۆیە خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا سِجِّينٌ﴾ واتە: تۆ چوزانیت ﴿سِجِّينٌ﴾ چیە. یانی: ڕوداوێکی ئێجگار گەورەو بەندینخانەیەکی بێ کۆتاو سزای بەژان، هەندێ وتویانە: ﴿سِجِّينٌ﴾ لە ژێر زەمینی حەوتەمایە. وەك لە پێشەوە باس کراوە لەو فەرمودە درێژەی بەرای کوڕی عازبدا، خودای گەورە ئەفەرموێت لە بارەی ڕۆحی خوا نەناس: نامەکەی بنوسن لە ناوسجینا، سجینیش لە ژێر زەمینی حەوتەمە. لەبەر ئەوەی پاشەڕۆژی بەدکاران جەهەنمە کە نزمترین پلەیە، وەك خودا ئەفەرموێت: ﴿ثُمَّ رَدَدْنَٰهُ أَسْفَلَ سَٰفِلِينَ ۝٥ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾ واتە: لەپاشان ئەگەر بێباوەڕ بێ دەیکەین بە پەست ترینی هەموو پەستێك، مەگەر ئەوانەی کە بڕوایان هێناوەو کردەوە چاکەکانیان کردوە. ئالێرەدا ئەفەرموێت: ﴿كَلَّآ إِنَّ كِتَٰبَ ٱلْفُجَّارِ لَفِى سِجِّينٍ ۝٧ وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا سِجِّينٌ﴾خودا تەنگی و نزمی بە یەکەوە کۆ دەکاتەوە، وەك ئەفەرموێت: ﴿وَإِذَآ أُلْقُوا۟ مِنْهَا مَكَانًا ضَيِّقًا مُّقَرَّنِينَ دَعَوْا۟ هُنَالِكَ ثُبُورًا﴾ واتە: وە کاتێ فڕێ دەدرێتە جێگایەکی تەنگ لەدۆزەخدا بەکۆتکراوی دەست و قاچ و ملیان لە کۆت و زنجیردا یا لەشیان بە کۆت و زنجیر پێکەوە بەستراوە لەوێدا داوای تیاچون و مردن دەکەن. وە ئەفەرموێت: ﴿كِتَٰبٌ مَّرْقُومٌ﴾ واتە: دەفتەرێکی نوسراوە. ئەم دەستەواژەیە وەلامی ئەم ئایەتە نیە کە ئەفەرموێت: ﴿وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا سِجِّينٌ﴾بەلکو وەلامە بۆ ئەوەی لەسەریان نوسراوە لەو پاشەڕۆژەی کە بەندینخانەیە، یانی: نوسراوەو نیشانە دارە و لێبونەتەوە لێی، زیاد ناکاو لێشی کەم ناکات، موحەممەدی کوڕی کەعبی قورەزی ئەمەی وتوەپاشان خودا ئەفەرموێت: ﴿وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ﴾واتە: هاوار لەو ڕۆژەدا بۆبێبڕوایان. یانی: کاتێ ڕۆژی قیامەت ئەبرێن بۆ ئەو بەندینخانەو سزا ڕیسوا کەرەی کە خودا بەڵێنی پێداون. لە پێشەوە باسی﴿وَيْلٌ﴾ کرا و باس کردنەوەی پێویست ناکات، مەبەست لە(وَيْلٌ) لێرەدا یانی: نەمان و تیاچون وەك وتراوە: مردن بۆ فلان. وەك هاتوە لە موسنەدوسونەنەکاندا لە ڕیوایەتی بوهزی کوڕی حەکیم ی کوڕی مەعاویەی کوڕی حەیدەداو ئەمیش لە باوکیەوە ئەویش لە باپیریەوە ئەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) ئەفەرمووێت: مانای ﴿لِّلْمُكَذِّبِينَ﴾

بێباوەڕان،یانی: خوانەناسان و بەدکاران ﴿ٱلَّذِينَ يُكَذِّبُونَ بِيَوْمِ ٱلدِّينِ﴾ واتە: ئەوانەی کە بڕوا ناکەن بەڕۆژی پاداشت داناوە. یانی: ڕوودانی بەڕاست نازانن و باوەڕ بەبونی ناکەن و هاتنیشی بەدرۆ ئەزانن.خوداش ئەفەرموێت: ﴿وَمَا يُكَذِّبُ بِهِۦٓ إِلَّا كُلُّ مُعْتَدٍ أَثِيمٍ﴾واتە: کەسێك ئەو ڕۆژە بەدرۆ نازانێت مەگەر هەموو ستەمکارێکی گوناهبار.یانی: ملهوڕ لە کرداریدا، حەرامخۆر و زیادە ڕۆییکردن لە خواردنی حەلاڵدا، تاوانبار لە قسەیدا،ئەگەر قسەی کرد درۆ ئەکات، ئەگەر بەڵێنی دا نایباتە سەر، ئەگەر دەمەقاڵێی کرد بەدکارە و سنوور نافامێ! وە ئەفەرموێت: ﴿إِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِ ءَايَٰتُنَا قَالَ أَسَٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ﴾واتە: هەر کاتێ ئایەتەکانی ئێمەی بۆ بخوێنرێتەوە دەڵێ: ئەمانە ئەفسانەی پێشینانن. یانی: کاتێ گوێیان لە قورئان بوو لە پێغەمبەرەوە(ﷺ)باوەڕی پێ ناکەن، گومانی خراپی پێئەبەن و وا ئەزانن دروست کراوو کۆکراوەی کتێبە پێشینەکانە. وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُم مَّاذَآ أَنزَلَ رَبُّكُمْ ۙ قَالُوٓا۟ أَسَٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ﴾ واتە: وەکاتێ بەوانە بوترێ ئایا پەروەردگارتان چی ناردۆتە خوارەوە؟ دەڵێن: حیکایەتی پڕوپووچی پێشوەکان. وە ئەفەرموێت: ﴿كَلَّا ۖ بَلْ ۜ رَانَ عَلَىٰ قُلُوبِهِم مَّا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ﴾ واتە: نەخێر وانیە بەڵکو ژەنگی ئەوخراپانەی کە دەیانکرد پەردەی هێناوە بەسەر دڵیاندا. یانی: بەو شێوەیە نیە وەك ئەوان تێیدەگەن و ئەڵێن: ئەم قورئانە چیرۆکی پێشینانە بەڵکو قسەو نیگای دابەزێنراوی خودایە بۆ پێغەمبەرەکەی(ﷺ)بۆیە باوەڕی پێ ناهێنن چونکە دڵیان گیراوە بەهۆی ئەو ژەنگەی دڵی داپۆشیون لە زۆری گوناهو تاوان. بۆیە خودا ئەفەرموێت: ﴿كَلَّا ۖ بَلْ ۜ رَانَ عَلَىٰ قُلُوبِهِم مَّا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ﴾ ژەنگ: (الرین) دڵیخوانەناسان دلئەپۆشێ، ئیبنو جەریرو تیرمیزی و نەسائی وئیبنو ماجە ڕیوایەتیان کردوە لەچەندرێگاوە لە ئەبو هورەیرەوە ئەویش لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) ئەفەرمووێت: کاتێ بەندە هەڵئەسێت بە تاوانێك: خاڵێکی ڕەش لە دڵی پەیدا ئەبێ ئەگەر پەشیمان بوەوە دڵی پاك ئەبێتەوە بەلام ئەگەر تاوانی زۆری کرد ئەویش زۆر ئەبێ تا ئەمەیە کە خودا ئەفەرموێت: ﴿كَلَّا ۖ بَلْ ۜ رَانَ عَلَىٰ قُلُوبِهِم مَّا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ﴾ تیرمیزی ئەڵێت: فەرمودەیەکی حەسەن و صەحیحە. نەسائی ڕیوایەتی کردوە لە ئەبو هورەیرەوە بەم شێوەیە لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) کاتێ بەندە تاوانێکی کرد لە تاوانەکان خاڵێکی ڕەش لە سەر دڵی پەیدا ئەبێ، ئەگەر ئەو کەسە وازی هێناو داوای لێبوردنی کردو پەشیمان بووەوە دڵێ ساف ئەبێتەوە، ئەگەر گەڕایەوە بۆ گوناە ئەو ڕەشاییە زیاد ئەکات بەسەر دڵیەوەو بەرز ئەبێتەوە، ئەوە ئەو ژەنگەیە کە خودا ئەفەرموێت: ﴿كَلَّا ۖ بَلْ ۜ رَانَ عَلَىٰ قُلُوبِهِم مَّا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ﴾. وە ئەفەرموێت: ﴿ثُمَّ إِنَّهُمْ لَصَالُوا۟ ٱلْجَحِيمِ﴾ واتە: لە پاشان بێگومان ئەوان دەچنە دۆزەخەوە. یانی: دوای ئەم بێبەشبونەی خەڵکی دۆزەخ لە بینینی

خودا. ﴿ثُمَّ يُقَالُ هَٰذَا ٱلَّذِي كُنتُم بِهِۦ تُكَذِّبُونَ﴾ واتە: ئینجا پێیان دەوترێت ئەمە ئەوەیە کە بڕواتان پێ نەدەکرد. یانی: ئەوەیان پێئەڵێن بە شێوەی سەرزەنشت و دڵتەزاندن و کەم سەیرکردن و ڕیسواکردن.

﴿كَلَّآ إِنَّ كِتَٰبَ ٱلۡأَبۡرَارِ لَفِي عِلِّيِّينَ (١٨) وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا عِلِّيُّونَ (١٩) كِتَٰبٌ مَّرۡقُومٌ (٢٠) يَشۡهَدُهُ ٱلۡمُقَرَّبُونَ (٢١) إِنَّ ٱلۡأَبۡرَارَ لَفِي نَعِيمٍ (٢٢) عَلَى ٱلۡأَرَآئِكِ يَنظُرُونَ (٢٣) تَعۡرِفُ فِي وُجُوهِهِمۡ نَضۡرَةَ ٱلنَّعِيمِ (٢٤) يُسۡقَوۡنَ مِن رَّحِيقٍ مَّخۡتُومٍ (٢٥) خِتَٰمُهُۥ مِسۡكٌۚ وَفِي ذَٰلِكَ فَلۡيَتَنَافَسِ ٱلۡمُتَنَٰفِسُونَ (٢٦) وَمِزَاجُهُۥ مِن تَسۡنِيمٍ (٢٧) عَيۡنًا يَشۡرَبُ بِهَا ٱلۡمُقَرَّبُونَ (٢٨)﴾

## نامەی ئاکارە چاکەکان و پاداشتیان

خودای گەورەئەفەرموێت: ﴿كَلَّآ إِنَّ كِتَٰبَ ٱلۡأَبۡرَارِ لَفِي عِلِّيِّينَ﴾ واتە: بەڕاستی نامەی کرداری چاکان لە ناو دەفتەرێکی بەرزدایە. ﴿كَلَّآ إِنَّ كِتَٰبَ ٱلۡأَبۡرَارِ﴾ ئەمانە بە پێچەوانەی بەد کارانەوە ﴿لَفِي عِلِّيِّينَ﴾ یانی: پاشە ڕۆژیان﴿لَفِي عِلِّيِّينَ﴾ بە پێچەوانەی سجینە، لە هیلالی کوڕی یەسافەوە ئەڵێت: ئیبنو عەباس پرسیاری کرد لە کەعب دەبارەی سیجینەوە منیش لەوێ بووم وتی: زەمینی حەوتەمە کە گیانی خوانەناسان لەوێیە. وە پرسیاری﴿عِلِّيِّينَ﴾ی لێکرد، ئەڵێت: ئاسمانی حەوتەمەکە گیانی باوەڕداران لەوێیە، هەروەها زۆر کەسی تر وتویانە: ئاسمانی حەوتەمە. عەلی کوڕی ئەبو تەلحە ئەڵێت: لە ئیبنو عەباسەوە: خوا ئەفەرموێت: ﴿كَلَّآ إِنَّ كِتَٰبَ ٱلۡأَبۡرَارِ لَفِي عِلِّيِّينَ﴾ یانی: بەهەشت. جگە لە ئەویش وتویانە: (عیلیون) لە سدرە المنتهى دایە. ئاشکرایە کە (عیلیون) وەرگیراوە لە(العلو) کە بریتییە لە سەرکەوتن و بەرزبونەوە و گەورەبوون و فراوانبوونی شتێك، بۆیە خودای گەورە بەگەورەی و گرنگی باسی ئەکات و ئەفەرموێت: ﴿وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا عِلِّيُّونَ﴾ واتە: تۆ چوزانیت ئەو دەفتەرە چی یە؟ پاشان ئەفەرموێت بۆ پشتگیری لەسەر ئەوەی هەموو شتێکی بۆ نوسیوون ﴿كِتَٰبٌ مَّرۡقُومٌ﴾ واتە: دەفتەرێکی نوسراوی ئەمەندە بەفەڕە ﴿يَشۡهَدُهُ ٱلۡمُقَرَّبُونَ﴾واتە: نزیکانی خودا دەیبینن. قەتادە ئەڵێت: ئەوانە فریشتەکانن. عەوفی لە ئیبنو عەباسەوە ئەڵێت: فریشتە نزیکەکانی خودا لە هەموو ئاسمانەکان دەیبینن و لێی ئاگادارن. پاشان خودای گەورەئەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلۡأَبۡرَارَ لَفِي نَعِيمٍ﴾ واتە: بێگومان چاکان لە ناو نازو نیعمەتدان. یانی: ڕۆژی قیامەت ئەوان لە خۆشیەکی بەردەوامدان لە باخستانی بەهەشتدا، چاو ئەگێڕن بەناو ئەوەدا کە بەدەستیان هێناوە وخودا پێی داون لەو چاکەو بەهرە زۆرەی کە کۆتایی نایەو لەناو ناچێ. وتراوە: مانای﴿عَلَى ٱلۡأَرَآئِكِ يَنظُرُونَ﴾ دەڕوانن بۆ خودا. ئەمە بەرانبەر بەو وەسفەی کە بەدکارانی پێ کراوە ﴿كَلَّآ إِنَّهُمۡ عَن رَّبِّهِمۡ يَوۡمَئِذٖ لَّمَحۡجُوبُونَ﴾واتە: نەخێر بەڕاستی ئەوان لەو ڕۆژەدا بێ بەشن لە بینینی

پەروەردگاریان. وە باسی ئەوانەشی کرد کە ئەتوانن سەیری خوای گەورە بکەن لەسەر تەخت و فەرشەکانیان وە ئەفەرموێت: ﴿تَعۡرِفُ فِي وُجُوهِهِمۡ نَضۡرَةَ ٱلنَّعِيمِ﴾ واتە: لە ڕوخسارياندا جوانی و گەشاوەیی و خۆشگوزەرانی دەبینیت. یانی: ئەگەر سەیری نێو چاوانیان بکەی تەڕو تازەیی خۆشگوزەرانیان دەزانی، یانی: ئەو ڕابواردن و ڕێزو خۆشی و دەسەڵاتە تايبەتمەند و خۆشگوزەرانیە نەبڕاوەیە کە تیایدان ئەیبینی. وە ئەفەرموێت: ﴿يُسۡقَوۡنَ مِن رَّحِيقٖ مَّخۡتُومٍ﴾ واتە: شەرابی پاکی سەر بە مۆریان دەرخوارد دەدرێ. بادە(خمر)ی سەر مۆریان بۆ خواردنەوە ئەدەنێ(الرحيق)یەکێکە لە ناوەکانی عارەق، ئیبن مەسعودو ئیبنو عەباس و موجاهید و حەسەن و قەتادەو ئیبنو زەید وایان وتوە. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە ئەبو سەعیدی خودریەوە: وا دەزانم بەرزی کردوەتەوە بۆ پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: هەر خواناسێك ئاو بدا بە موسڵمانێك کە تینوی بێ خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا لە ڕەحیقی مەختوم (بادەی مۆرکراو) ئاوی دەداتێ، وە هەر باوەڕدارێك لە برسیەتی موسڵمانێك تێر بکات، خودا لە بەروبومی بەهەشت تێری ئەکات، وە هەر باوەڕدارێك موسڵمانێ بە جلوبەرگ دابپۆشی کە نەیبێ و ڕوت بێت، خودا جلوبەرگی بەهەشتی لە بەر دەکات) ئیبنو مەسعود ئەڵێت: لەم ئایەتەدا (خِتَٰمُهُۥ) یانی: تێکەڵە لە میسك. عەوفی ئەڵێت: لە ئیبنو عەباسەوە: خودا ئارەقیان بۆ چاك ئەکات دوایین شتێ تێیئەکرێ بۆیان میسکە و بە میسك مۆر ئەکرێت. قەتادەو زەحاکیش هەروایان وتوە. وە ئەفەرموێت: ﴿خِتَٰمُهُۥ مِسۡكٞۚ وَفِي ذَٰلِكَ فَلۡيَتَنَافَسِ ٱلۡمُتَنَٰفِسُونَ﴾ واتە: کە دوا قومی بۆنی میسکە بۆ ئەوە با پێشبڕکێ بکەن پێشبڕکێکەران. یانی: بابۆ ئەم کات و شوێنانە کێبەرکێ بکەن بەسەریەکا و خۆیان هەڵبڕن و شانازی پێوە بکەن و هەوڵ بدەن،وەك ئەفەرموێت: ﴿لِمِثۡلِ هَٰذَا فَلۡيَعۡمَلِ ٱلۡعَٰمِلُونَ﴾ واتە: بابۆ پاداشتی وەها خەبات بکەن، ئەو کەسانەی خەباتکارن.وە پاشان ئەفەرموێت: ﴿وَمِزَاجُهُۥ مِن تَسۡنِيمٍ﴾ واتە: تێکەڵکراوێ لە ئاوی تەسنیم یانی: ئاوێتەی ئەم ئارەقەیش کە باس کراوە لە تەسنیمە، واتە: لە خواردنەوەیەك پێی ئەوترێت تەسنیم، ئەوە چاکترین خواردنەوەی خەڵکی بەهەشتە لەسەروی هەموو خواردنەوەکانەوە، ئەمە ئەبو ساڵح وزەحاك وتویانە. بۆیە ئەفەرمووێت: ﴿عَيۡنٗا يَشۡرَبُ بِهَا ٱلۡمُقَرَّبُونَ﴾ واتە: کانییەك کە نزیککراوەکان لێی دەخۆنەوە. یانی: نزیککراوەکان لەم سەرچاوەیە دەخۆنەوە بەبێ تێکەڵکردن، بەڵام تیرەی دەستە ڕاست بۆیان تێکەڵ ئەکرێت، ئیبنو مەسعودو ئیبنو عەباس و مەسروق و قەتادەو جگە لەوانیش ئەم قسەیان وتوە.

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ أَجۡرَمُواْ كَانُواْ مِنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ يَضۡحَكُونَ ﴿٢٩﴾ وَإِذَا مَرُّواْ بِهِمۡ يَتَغَامَزُونَ ﴿٣٠﴾ وَإِذَا ٱنقَلَبُوٓاْ إِلَىٰٓ أَهۡلِهِمُ ٱنقَلَبُواْ فَكِهِينَ ﴿٣١﴾ وَإِذَا رَأَوۡهُمۡ قَالُوٓاْ إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ لَضَآلُّونَ ﴿٣٢﴾ وَمَآ أُرۡسِلُواْ عَلَيۡهِمۡ حَٰفِظِينَ ﴿٣٣﴾ فَٱلۡيَوۡمَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنَ ٱلۡكُفَّارِ يَضۡحَكُونَ ﴿٣٤﴾ عَلَى ٱلۡأَرَآئِكِ يَنظُرُونَ ﴿٣٥﴾ هَلۡ ثُوِّبَ ٱلۡكُفَّارُ مَا كَانُواْ يَفۡعَلُونَ ﴿٣٦﴾﴾

**خراپە کردن و گاڵتەبازی تاوانکارن بە خواناسان**

خودای گەورە هەواڵی ئەو تاوانبارانەمان بۆ باس ئەکات کە لە ژیانی دونیادا بە دینداران پێدەکەنین یانی گاڵتەو گەپیان پێ دەکردن و بەچاوی سوك سەیریان ئەکردن، کاتێ بەلایاندا ئەچون چاویان لەیەکتر دادەگرت، یانی: بۆ سوك سەیر کردنیان﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ أَجۡرَمُواْ كَانُواْ مِنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ يَضۡحَكُونَ﴾ واتە: بێگومان ئەوانەی کە بەدکاربون پێدەکەنین بەوانەی کە بڕوایان هێنا بوو. ﴿وَإِذَا مَرُّواْ بِهِمۡ يَتَغَامَزُونَ﴾ واتە: وە کاتێك بەلایاندا بڕۆشتنایە چاویان لێ دادەگرتن. ﴿وَإِذَا ٱنقَلَبُوٓاْ إِلَىٰٓ أَهۡلِهِمُ ٱنقَلَبُواْ فَكِهِينَ﴾ واتە: وە کاتێکیش بگەڕایانەوە بۆ لای ماڵ و منداڵیان بە پێکەنین و گاڵتەکردن بە موسڵمانانەوە دەگەڕانەوە. یانی: ئەو تاوانکارانە کاتێ بچونایە بۆ ناو ماڵەکانیان بە پێکەنینەوە ئەگەڕانەوە، یانی: هەر چەند داوایان بکردایەو هەوڵیان بدایە، لەگەڵ ئەوا سوپاسی ئەو بەهرەیان نەئەکرد کە خودا پێی دابون بەڵکو خۆیان سەر قاڵ ئەکرد بەو خەڵکە دیندارەوە وئیرەییان پێ ئەبردن و بەچاوی سوك بۆیان ئەڕوانین. ﴿وَإِذَا رَأَوۡهُمۡ قَالُوٓاْ إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ لَضَآلُّونَ﴾ واتە: وە کاتێکیش بیان دینیایە ئەیان ووت: ئەمانە گومڕان. یانی: لەبەر ئەوەی کە لەسەر ئاینی ئەوان نەبون. خودا ئەفەرموێت: ﴿وَمَآ أُرۡسِلُواْ عَلَيۡهِمۡ حَٰفِظِينَ﴾ واتە: لەکاتێکدا کە ئەوان بەچاودێری نەنێراون بۆ سەر موسڵمانەکان تا ئەم قسەیە بکەن.یانی: ئەو تاوانکارانە نەنێراون بۆ ئەوە ئاگاداری ئەو خواناسانە بن لەوەی کە پێی هەڵئەسن و ئەیڵێن وە پێیان نەسپێرابوو، باوەڕدارانیش هیچ گوێیان نە ئەدانێ ئەمەیان لەبەر چاو بوو وەك خودا ئەفەرموێت: ﴿قَالَ ٱخۡسَـُٔواْ فِيهَا وَلَا تُكَلِّمُونِ ﴿١٠٨﴾ إِنَّهُۥ كَانَ فَرِيقٞ مِّنۡ عِبَادِي يَقُولُونَ رَبَّنَآ ءَامَنَّا فَٱغۡفِرۡ لَنَا وَٱرۡحَمۡنَا وَأَنتَ خَيۡرُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴿١٠٩﴾ فَٱتَّخَذۡتُمُوهُمۡ سِخۡرِيًّا حَتَّىٰٓ أَنسَوۡكُمۡ ذِكۡرِي وَكُنتُم مِّنۡهُمۡ تَضۡحَكُونَ ﴿١١٠﴾ إِنِّي جَزَيۡتُهُمُ ٱلۡيَوۡمَ بِمَا صَبَرُوٓاْ أَنَّهُمۡ هُمُ ٱلۡفَآئِزُونَ﴾ واتە: وە خوا ئەفەرموێ: بەبێ نرخی و ڕیسوایی بمێننەوە لە دۆزەخدا و هیچ قسەیەکم لەگەڵدا مەکەن، إخسأ: بۆ سەگ بەکار دێ کاتێ دەری دەکەیت و پێ ی دەڵێیت: چخە، بێگومان لە دنیادا کۆمەڵێك لە بەندەکانی من دەیانووت: ئەی پەروەردگارمان! ئێمە باوەڕمان هێناوە دەی لێمان خۆشبەو ڕەحمان پێ بکە چونکە تۆ چاکترینی میهرەبانانی، کەچی ئێوە گاڵتەتان بەوان دەکرد تا ئەو گاڵتە کردنەتان بە ئەوان یادی منی لەبیر بردنەوە، وە ئێوە

هەمیشە بەوان پێ دەکەنین، بێگومان ئەمڕۆ پاداشتم داونەتەوە بەهۆی خۆگرییانەوە بە ڕاستی هەر ئەوانن سەرکەوتوو. لەبەر ئەمە لێرەدا ئەفەرموێت: ﴿فَٱلۡيَوۡمَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنَ ٱلۡكُفَّارِ يَضۡحَكُونَ﴾ واتە: ئەمڕۆ کە ڕۆژی دوایی یە ئەوانەی کە بڕواداربوون بە بێبڕواکان پێ دەکەنن. ﴿عَلَى ٱلۡأَرَآئِكِ يَنظُرُونَ﴾ واتە: لەسەر قەنەفەو کورسیەوە ئەڕوانن، یانی: بۆ خوای گەورە. لە جیاتی ئەوەی ئەوان خواناسەکانیان بەگومڕا دەزانی، خواناسان گومڕانەبون، بەڵکو لە دۆستە هەرە نزیکەکانی خودا بوون، چاویان دەگێڕا بۆ پەروەردگاری خۆیان لەو شوێنەی کە جێی ڕێزلێنانی خودایە. وە ئەفەرموێت: ﴿هَلۡ ثُوِّبَ ٱلۡكُفَّارُ مَا كَانُواْ يَفۡعَلُونَ﴾ واتە: تا بزانن تۆڵەی ئەو بێبڕوایانە دراوەتەوە لەسەر ئەو کردەوانەی کە دەیان کردلە دنیادا. یانی: ئایا خوانەناسەکان پاداشتی ئەوکاڵتە کردن و بە سوك سەیرکردنی ئەو خواناسانەیان وەرگرت یا نا؟ یانی: بەڵێ وەریان گرت بەتەواوی و بەزیادیشەوە.

## سورەتی (الانشقاق)

### لەمەککەدا هاتووەتەخوارەوە

### سوژدەی قورئان خوێندن لە سورەتی(الانشقاق)دا

لە ئەبو سەلەمەوە ئەگێڕنەوە: کە ئەبو هورەیرە ﴿إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنشَقَّتۡ﴾ی بۆ خوێندن، سوژدەی تیا بردوە، کاتێ کە لە نوێژ بوەتەوە پێی ڕاگەیاندوون کە پێغەمبەر(ﷺ) سوجدەی تێدا بردووە. ئیمامی موسلیم و نەسائی لە ڕێگای مالیکەوە ڕیوایەتیان کردوە. ئیمامی بوخاری لە ئەبو ڕافیعەوە ڕیوایەتی کردوە ئەڵێت: نوێژی خەوتنانم لەگەڵ ئەبو هورەیرەدا کرد ﴿إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنشَقَّتۡ﴾ی خوێند سوجدەی برد، پێم وت: ئەویش ئەڵێت: لەدوای ئەبولقاسمەوە(ﷺ) سوجدەم بردووە بەردەوام سوجدەی و منیش تا پێی ئەگەم سووجدە ئەبەم.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنشَقَّتۡ ﴿١﴾ وَأَذِنَتۡ لِرَبِّهَا وَحُقَّتۡ ﴿٢﴾ وَإِذَا ٱلۡأَرۡضُ مُدَّتۡ ﴿٣﴾ وَأَلۡقَتۡ مَا فِيهَا وَتَخَلَّتۡ ﴿٤﴾ وَأَذِنَتۡ لِرَبِّهَا وَحُقَّتۡ ﴿٥﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡإِنسَٰنُ إِنَّكَ كَادِحٌ إِلَىٰ رَبِّكَ كَدۡحٗا فَمُلَٰقِيهِ ﴿٦﴾ فَأَمَّا مَنۡ أُوتِيَ كِتَٰبَهُۥ بِيَمِينِهِۦ ﴿٧﴾ فَسَوۡفَ يُحَاسَبُ حِسَابٗا يَسِيرٗا ﴿٨﴾ وَيَنقَلِبُ إِلَىٰٓ أَهۡلِهِۦ مَسۡرُورٗا ﴿٩﴾ وَأَمَّا مَنۡ أُوتِيَ كِتَٰبَهُۥ وَرَآءَ ظَهۡرِهِۦ ﴿١٠﴾ فَسَوۡفَ يَدۡعُواْ ثُبُورٗا ﴿١١﴾ وَيَصۡلَىٰ سَعِيرًا ﴿١٢﴾ إِنَّهُۥ كَانَ فِيٓ أَهۡلِهِۦ مَسۡرُورًا ﴿١٣﴾ إِنَّهُۥ ظَنَّ أَن لَّن يَحُورَ ﴿١٤﴾ بَلَىٰٓۚ إِنَّ رَبَّهُۥ كَانَ بِهِۦ بَصِيرٗا ﴿١٥﴾﴾

**درزبردنی ئاسمان و ڕاخستنی زەمین لە ڕۆژی قیامەتدا**

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنشَقَّتۡ﴾ واتە: کاتێ کە ئاسمان لەت بوونەوەیش ڕۆژی قیامەتە. ﴿وَأَذِنَتۡ لِرَبِّهَا وَحُقَّتۡ﴾ واتە: وە ملکەچیی کرد بۆ پەروەردگاری و دەبێ واش بێ. ﴿وَأَذِنَتۡ لِرَبِّهَا﴾ یانی: گوێی لە ڕامێنەری گرت و فەرمانی بەجێهێناو ئەوەی کە پێی سپێردرا بوو جێبەجێی کردو لەتی برد.(وَحُقَّتۡ) یانی: دەبێ واش بێ و فەرمانی بەجێ بێنێت، چونکە زۆر گەورەو ڕێکرو بەرهەڵستکاری نیە، بەڵکو بەسەر هەموو شتێکدا زاڵەو هەموو شتێ سەری بۆنەوی ئەکات، پاشان ئەفەرموێت: ﴿وَإِذَا ٱلۡأَرۡضُ مُدَّتۡ﴾ واتە: وە کاتێك کە زەوی ڕاکێشراو پانکرایەوە ڕاخرا. یانی: تەخت بوو ڕاخراو فراوان بوو، وە ئەفەرموێت: ﴿وَأَلۡقَتۡ مَا فِيهَا وَتَخَلَّتۡ﴾ واتە: وە ئەوەی تێیدا بوو فڕێی داو هیچی لەناودا نەما. یانی: هەرچی لەناو سکیدا بوو فڕێی دا هیچی تێدا نەهێشت. موجاهید و سەعیدو قەتادە وایان وتوە. ﴿وَأَذِنَتۡ لِرَبِّهَا وَحُقَّتۡ﴾ وەك ئەو ئایەتەی پێشەوەیە.

**پاداشتی کردەوەکان حەقە**

خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلۡإِنسَـٰنُ إِنَّكَ كَادِحٌ إِلَىٰ رَبِّكَ كَدۡحٗا فَمُلَـٰقِيهِ﴾ واتە: ئەی مرۆڤ ! ڕەنجی زۆر ئەدەی بگەی بە پەروەردگاری خۆت ئەو سا پێی دەگەیت. یانی: زۆر هەوڵ ئەدەیت و خۆت ماندوو دەکەی ﴿فَمُلَـٰقِيهِ﴾ پاشان ئەوەی کردووتە لە چاکەو خراپە تووشی دێی، بەڵگەیش بۆ ئەوەی وتمان ئەم فەرمودەیەی پێغەمبەرە(ﷺ) کە ئەبو داودی تەیالیسی ڕیوایەتی کردوە لە جابرەوە کە ئەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) ئەفەرمووێت: جوبرەئیل فەرموویەتی: ئەی موحەممەد(ﷺ)! چەند ئەتوانی بژی بێگومان هەر دەمریت، چەند ئەتوانی شتت خۆشت بوێ، بێگومان لێی جیادەبیتەوە، چەند دەتوانی کاریکە هەوڵ بدە بێگومان تووشی دێیتەوە. هەندێ کەس ئەو ضمیرە ئەگێڕنەوە بۆ ﴿رَبِّكَ﴾ یانی: فملاق ربك یانی: پاداشتت ئەداتەوە بەهۆی کردەوە کانتەوە و بەخشیشت ئەداتێ لەسەر ئەو هەوڵە کە داوتە. بەم شێوەیە هەر دوو قسەکە یەك مانا ئەگەیەنێ. عەوفی لە ئیبنو عەباسەوە ئەڵێت: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلۡإِنسَـٰنُ إِنَّكَ كَادِحٌ إِلَىٰ رَبِّكَ كَدۡحٗا فَمُلَـٰقِيهِ﴾ ئەڵێت: هەر کاتێ بکەیت بەو کارەوە دەگەیت بەخودا چاك بێت یان خراپ.

**پیشاندان و گفتوگۆ بەدرێژی لە لێپرسینەوەدا**

دووبارە خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿فَأَمَّا مَنۡ أُوتِيَ كِتَـٰبَهُۥ بِيَمِينِهِۦ﴾ واتە: ئینجا ئەو کەسەی کەنامەی کردەوەی درایە دەستی ڕاستی ﴿فَسَوۡفَ يُحَاسَبُ حِسَابٗا يَسِيرٗا﴾ واتە: ئەوسا لێپرسینەوەیەکی سوك و

ئاسانی لەگەڵ دەکرێ. یانی ئاسانە و گران وقورس نابێ، یانی: هەموو کردارەکانی لێ ناپرسنەوە بەووردی، ئەگەر بەدرێژی و وردی لێی بپرسنەوە بێگومان تیا ئەچێ. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە عائیشەوە(خوای لێ ڕازی بێ) وتویەتی: پێغەمبەر(ﷺ) ئەفەرمووێت: هەر کەسێ بەووردی لێی بپرسرێتەوە سزا دەدرێ) وە فەرموویەتی: ئەمە ئەو لێپرسینەوە نیە، بەڵکو ئەمە پیشان دانە، هەر کەسێ بەدرێژی پرسیاری لێ بکرێ لە ڕۆژی قیامەتدا سزائەدرێ. هەروەها بوخاری و موسلیم و تیرمیزی و نەسائی و ئیبنو جەریر ئەم فەرموودەیان ڕیوایەت کردەوە. وە ئەفەرموێت: ﴿وَيَنقَلِبُ إِلَىٰٓ أَهۡلِهِۦ مَسۡرُورٗا﴾ واتە: وە بەدڵخۆشی دەگەڕێتەوە بۆ لای کەس و کاری. یانی: ئەگەڕێتەوە بۆ لای کەس و کاری لە بەهەشت. قەتادەو زەححاك ئەڵێن: (مَسۡرُورٗا) یانی: دڵخۆش و کامەرانن بەوەی خودای گەورەپێی بەخشیون. ﴿وَأَمَّا مَنۡ أُوتِيَ كِتَٰبَهُۥ وَرَآءَ ظَهۡرِهِۦ﴾ واتە: وە ئەو کەسەی نامەی لە پشتەوە درایە دەستی، یانی: بەلای چەپی لە دوای پشتیەوە، دەستی لار کاتەوە بچەمێنێتەوە بۆ دواوەو نوسراوەکەی بەو دەستەی پێی بدرێت بەو شێوەیە﴿فَسَوۡفَ يَدۡعُواْ ثُبُورٗا﴾ واتە: ئەوە بەزویی داوای مردنی خۆی دەکات. یانی: داوای مردن و لەناو چوونی خۆی دەکات. ﴿وَيَصۡلَىٰ سَعِيرًا﴾ واتە: وە دەچێتە دۆزەخەوە. ﴿إِنَّهُۥ كَانَ فِيٓ أَهۡلِهِۦ مَسۡرُورًا﴾ واتە: چونکە بێگومان ئەو لەناو کەس و کاریدا دڵخۆش بووە. یانی: کەیفی بوو، بیری لە پاشە ڕۆژ نە ئەکردەوەو نەئەترسا لەوەی کە لە پێشەوەیە، تا ئەو خۆشیە کەمە ئەو ناخۆشیە درێژو نەبڕاوەی بەدوادا هات. ﴿إِنَّهُۥ ظَنَّ أَن لَّن يَحُورَ﴾واتە: وە ئەو وا گومانی دەبرد کە هەرگیز ناگەڕێتەوە لای خوا، یانی: باوەڕی وابوو کە ناگەڕێتەوە بۆ لای خواو وە پاش مردن زیندووی ناکاتەوە! ئیبنو عەباس و قەتادە و جگە لە ئەمانیش ئەم تەفسیرەیان وتوە. (الحور) یانی: گەڕانەوە. وە ئەفەرموێت: ﴿بَلَىٰٓۚ إِنَّ رَبَّهُۥ كَانَ بِهِۦ بَصِيرٗا﴾ واتە: نەخێر وانیە ! چونکە بە ڕاستی پەروەردگاری ئەو ئاگادار بووە بەو، یانی: بەڵێ خودا ئەیهێنێتەوە وەك چۆن یەکەمجار هێنای وە پاداشتی ئەداتەوە لەسەر کردارەکانی جا چاك بێ یا خراپ بێ چونکە ئاگای لێی بووە، یانی: زاناو ئاگادار بووە.

﴿فَلَآ أُقۡسِمُ بِٱلشَّفَقِ ﴿١٦﴾ وَٱلَّيۡلِ وَمَا وَسَقَ ﴿١٧﴾ وَٱلۡقَمَرِ إِذَا ٱتَّسَقَ ﴿١٨﴾ لَتَرۡكَبُنَّ طَبَقًا عَن طَبَقٖ ﴿١٩﴾ فَمَا لَهُمۡ لَا يُؤۡمِنُونَ ﴿٢٠﴾ وَإِذَا قُرِئَ عَلَيۡهِمُ ٱلۡقُرۡءَانُ لَا يَسۡجُدُونَ ۩ ﴿٢١﴾ بَلِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يُكَذِّبُونَ ﴿٢٢﴾ وَٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِمَا يُوعُونَ ﴿٢٣﴾ فَبَشِّرۡهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٢٤﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَهُمۡ أَجۡرٌ غَيۡرُ مَمۡنُونِۭ ﴿٢٥﴾﴾

## سوێند خواردن بەوە کە ئینسان لە بارێکەوە دەچێت بۆ بارێکی تر

ڕیوایەت کراوە لە عەلی و ئیبنو عەباس و عوبادەی کوڕی سامتو ئەبو هورەیرەو شەدادی کوڕی ئەوس و ئیبنو عومەرو موحەممەدی کوڕی عەلی کوڕی حوسەین و مەکحول و بەکری کوڕی عەبدوڵای موزەنی و بوکەیری کوڕی ئیشعبی و مالك و ئیبنوئەبی زیئب و عەبدولعەزیزی کوڕی ئەبو سەلەمەی ماجیشون کە هەموویان ئەڵێن: الشفق یانی: سورایی دەوری ئاسۆ. ﴿فَلَآ أُقۡسِمُ بِٱلشَّفَقِ﴾ واتە: سوێند بە سوری کە ناری ئاسمان. عەبدوڕڕەزاق ڕیوایەتی کردوە لە ئەبو هورەیرەوە کە ئەڵێت: الشفق: یانی: سپیایی. الشفق: یانی: سورایی ئاسۆ یا پێش هەڵهاتنی خۆر، وەك موجاهید وتویەتی. یا دوای ئاوابونی وەك لەناو زانایانی زمانەوانیدا ناسراوە. خەلیلی کوڕی ئەحمەد ئەڵێت: الشفق ئەو سورایەیە لە ئاوابوونی خۆر تا کاتێ نوێژی عیشا کە کاتی نوێژەکەنامێنێ. ئەوترێت: غاب الشفق: یانی: سورایی ئاوابوو. جەوهەری ئەڵێت: الشفق یانی: پاشماوەی ڕوناکی خۆرو سورایی لە یەکەم کاتی شەو تانزیك نوێژی خەوتنان. عیکریمە یش هەروای وتوە، الشفق: ئەو سوراییەیە کە لە نێوان مەغریب و عیشادایە. لە سەحیحی موسلیمدا هاتوە لە عەبدوڵای کوڕی عەمرەوە ئەویش لە پێغەمبەرەوە(ﷺ)کە فەرمویەتی: کاتی مەغریب ئەوەیە کە سورایی ئاوا نەبوبێ. لە هەموو ئەمانەوە دەرئەکەوێ. شەفەق ئەوەیە کە جەوهەری و خەلیل وتویانە. ئیبنو عەباس و موجاهیدو حەسەن و قەتادە ئەڵێن: (وَمَا وَسَقَ) یانی: بەوەی کۆی دەکاتەوە. قەتادە ئەڵێت: بەوەی کۆی دەکاتەوە لە هەسارە و گیانلەبەر. عیکریمە ئەڵێت: ﴿وَٱلَّيۡلِ وَمَا وَسَقَ﴾ یانی: دایدەپۆشێ بەتاریکی، لەکاتی شەودا هەموو شتێك دەچێت بۆ شوێنی خۆی. ﴿وَٱلَّيۡلِ وَمَا وَسَقَ﴾ واتە: وە بەشەو و ئەو شتانەی کە کۆیان دەکاتەوە. ﴿وَٱلۡقَمَرِ إِذَا ٱتَّسَقَ﴾ واتە: وە بە مانگ کاتێ پڕ دەبێتەوە. ئیبنو عەباس ئەڵێت: کاتێ کۆبوەتەوە و ڕاوەستاوە. حەسەن ئەڵێت: کاتێ کۆبوەوە، یانی پڕ بوو. قەتادە ئەڵێت: کاتێ چەماوە. مانای قسەکانیان: کاتێ تەواو ڕۆشن بوو، بوو بەمانگی چواردە، کەوای لێ هات بەرانبەر شەوگارو تاریکی شەو وەستا. وە ئەفەرموێت: ﴿لَتَرۡكَبُنَّ طَبَقًا عَن طَبَقٖ﴾واتە: ئێوە تێئەپەڕن لە حاڵێکەوە بۆ حاڵێکی تر. بوخاری ڕیوایەتی کردوە لە موجاهیدەوە ئەڵێت: ئیبنو عەباس فەرمووی: ﴿لَتَرۡكَبُنَّ طَبَقًا عَن طَبَقٖ﴾ یانی: لە حاڵێکەوە بۆ حاڵێکی تر لە بارێکەوە بۆ بارێکی تر پێغەمبەرەکەتان (ﷺ) ئەمەی فەرمووە، ئیمامی بوخاری بەم لەفزە ڕیوایەتی کردوە، عیکریمە ئەڵێت: ﴿طَبَقًا عَن طَبَقٖ﴾ لە حاڵێکەوە بۆ حاڵێکی تر، پاش ئەوەی کە بچوك بوو گەورە بوو، پاش ئەوەی لاو بوو پیر بوو، حەسەنی بەصری ئەڵێت: ﴿طَبَقًا عَن طَبَقٖ﴾لە حاڵێکەوە بۆ حاڵێکی تر لە، لە توندیەوە بۆ خاوی، لەخاویەوە بۆ توندی، لە هەژاریەوە بۆ

دەوڵەمەندی، لە دەوڵەمەندیەوە بۆ هەژاری و لە تەندروستیەوە بۆنەخۆشی و لە نەخۆشیەوە بۆتەندروستی.

**دانپیانەنانی خوانەناسان نیشانەی بێباوەڕییە وە مژدەیان پێدراوە بەسزا، خۆشی و کامەرانیش بۆ خواناسانە**

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿فَمَا لَهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ﴾ واتە: ئیتر بۆچی بڕوا ناهێنن﴿وَإِذَا قُرِئَ عَلَيْهِمُ ٱلْقُرْءَانُ لَا يَسْجُدُونَ ۩﴾ واتە: وە کاتێك قورئانیان بۆ بخوێنرێتەوە سوژدە نابەن ملکەچی ناکەن، یانی: چی ناهێڵێ کە باوەڕ بە خوداو پێغەمبەرەکەی و(ﷺ) بە ڕۆژی دوایی بهێنن! ئەوە چیانە کاتێ نیشانەکان و فەرمودەی خودا کە ئەم قورئانەیە ئەخوێنی بەسەریاندا سوجدە نابەن بۆ مەزنی و ڕێزلێنان؟! وە ئەفەرموێت: ﴿بَلِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ يُكَذِّبُونَ﴾ واتە: بەڵام ئەوانەی کە بێبڕوان بەدرۆی ئەزانن. یانی: لە دەروون پیسانە ئەم باوەڕ نەکردن و دانپیانەنان و لاساریانە لە بەرانبەر ڕاستیدا. ﴿وَٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا يُوعُونَ﴾ واتە: وە خوا چاك ئاگادارو زانایە بەوەی کە لە دڵی دەگرن. موجاهیدو قەتادە ئەڵێن: ئەوەی لەناو دڵیاندا ئەیشارنەوە. ﴿فَبَشِّرْهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٍ﴾ واتە: کەواتەمژدەیان بدەرێ بەسزای سەخت. یانی: ئەی پێغەمبەر(ﷺ) هەواڵیان بدەرێ کە خودای گەورە ئازاری بەژانی بۆ ئامادە کردوون. وە ئەفەرموێت: ﴿إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَهُمْ أَجْرٌ غَيْرُ مَمْنُونٍۭ﴾ واتە: بەڵام ئەوانەی کە بڕوایان هێناوە و کردەوەی باشیان کردووە بۆ ئەوان هەیە پاداشتی بێبڕانەوە. ئەمە ئیستیسنای مونقەتیعە، واتە: بەڵام ئەوانەی خواناسن، یانی: لە دڵیانەوە ئاکار چاکن و بە ئەندامەکانی لەشیشیان کاری چاك ئەکەن(لَهُمْ أَجْرٌ)یانی: لە ڕۆژی دواییدا پاداشتیان ئەدرێتەوە(غَيْرُ مَمْنُونٍ) ئیبنو عەباس ئەڵێت: بێ کەموکوڕی. موجاهیدو زەحاك ئەڵێن: نازمێررێت.لە زۆریدا، کورتەی هەردوو قسەکە ئەوەیە کە دوایی نایەت، وەك خودا ئەفەرموێت: ﴿عَطَآءً غَيْرَ مَجْذُوذٍ﴾واتە: ئەوە بەخششێکە بێبڕانەوە. سوددی ئەڵێت: هەندێکیان وتویانە: (غَيْرُ مَمْنُونٍ) یانی: بێ کەم و کوڕی.

## سورەتی (البُرُوج)

### لەمەککەداهاتووەتەخوارەوە

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

﴿وَالسَّمَاءِ ذَاتِ الْبُرُوجِ (١) وَالْيَوْمِ الْمَوْعُودِ (٢) وَشَاهِدٍ وَمَشْهُودٍ (٣) قُتِلَ أَصْحَابُ الْأُخْدُودِ (٤) النَّارِ ذَاتِ الْوَقُودِ (٥) إِذْ هُمْ عَلَيْهَا قُعُودٌ (٦) وَهُمْ عَلَىٰ مَا يَفْعَلُونَ بِالْمُؤْمِنِينَ شُهُودٌ (٧) وَمَا نَقَمُوا مِنْهُمْ إِلَّا أَنْ يُؤْمِنُوا بِاللَّهِ الْعَزِيزِ الْحَمِيدِ (٨) الَّذِي لَهُ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ۚ وَاللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ (٩) إِنَّ الَّذِينَ فَتَنُوا الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ ثُمَّ لَمْ يَتُوبُوا فَلَهُمْ عَذَابُ جَهَنَّمَ وَلَهُمْ عَذَابُ الْحَرِيقِ (١٠)﴾

### تەفسیری بورجەکان

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَالسَّمَاءِ ذَاتِ الْبُرُوجِ﴾واتە: سوێند بە ئاسمانی خاوەن بورجەکان (کەلوەکان). خوا سوێند ئەخوات بە بورجی ئاسمان کە هەسارە گەورەکانە. وەك ئەفەرموێت: ﴿تَبَارَكَ الَّذِي جَعَلَ فِي السَّمَاءِ بُرُوجًا وَجَعَلَ فِيهَا سِرَاجًا وَقَمَرًا مُنِيرًا﴾ واتە: پاك و پیرۆزە ئەو خوایەی کە لە ئاسماندا چەند خولگەی دروست کردوە دایناوە لە ئاسماندا کە خۆرێکی پرشنگدارو مانگێکی ڕوناك کەرەوەیە بۆ زەوی. ئیبنو عەباس و موجاهیدو زەححاك وحەسەن و قەتادەو سوودی ئەڵێن: ﴿الْبُرُوجِ﴾ یانی: ئەستێرەکان. مەنهالی کوڕی عەمر ئەڵێت: ﴿وَالسَّمَاءِ ذَاتِ الْبُرُوجِ﴾ یانی: چاك و جوان دروست کراون. ئیبنو جەریر ئەڵێت: ﴿الْبُرُوجِ﴾ قۆناغەکانی خۆرو مانگە، ئەویش دوانزە(١٢) بورجە لەهەر بورجێکا خۆر مانگێك ئەڕوات مانگیش دوو ڕۆژ و سێیەکی ڕۆژێك ئەڕوات کە ئەکاتە بیست و هەشت(٢٨) ڕۆژوو دوو(٢) شەویش دەر ناکەوێ.

### تەفسیری ڕۆژە دیاریکراوەکە بە هەموو بینەر و بینراوێك(شایەت و شایەتی لەسەر دراو)

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَالْيَوْمِ الْمَوْعُودِ﴾ واتە: وە بەو ڕۆژەی کە بەڵێنی پێدراوە. ﴿وَشَاهِدٍ وَمَشْهُودٍ﴾ واتە: وە بە هەموو بینەرو بینراوێك، یا شایەت و شایەتی لە سەردراوێك یا ڕۆژی هەینی و ڕۆژی عەرەفە. ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردوە لەئەبو هورەیرەوە ئەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ)ئەفەرمووێت: ﴿وَالْيَوْمِ الْمَوْعُودِ﴾ ڕۆژی قیامەتە ﴿وَشَاهِدٍ﴾ ڕۆژی هەینی یە. خۆر هەڵنەهاتوە و ئاوانەبووە لەسەر ڕۆژێك چاکتر بێ لە ڕۆژی هەینی، کاتێکی تێدایە هەر بەندەیەکی موسڵمان ڕێی لەو کاتە بکەوێ هەر داوایەکی چاکەی تێدا بکات مەگین خودا ئەیداتێ، وە داوای خۆ

پاراستن بکات لەو کاتەدا لە هەر زیانێك خوا ئەیپارێزێ، ﴿وَمَشْهُودٍ﴾ ڕۆژی عەرەفەیە. بەم شێوەیە ئیبن خوزەیمەش ڕیوایەتی ئەم فەرمودەی کردوە، ڕیوایەتی کردوە بە مەوقوفی لەوەش ئەچێ وا بێت، وە لە ئەبو هورەیرەو ئیبنو عەباس و حەسەنی کوڕی عەلی و حەسەنی بەصری و سەعیدی کوڕی موسەییب و موجاهید و عیکریمەو زەححاکەوە هاتوە ئەڵێن: ﴿وَمَشْهُودٍ﴾یانی: ڕۆژی قیامەت. بە غەوی ئەڵێت: زۆرینە لە سەر ئەوەن کە ﴿ وَشَاهِدٍ ﴾ ڕۆژی هەینی یە﴿وَمَشْهُودٍ﴾ ڕۆژی قیامەتە.

**ناهەقیەکانی خەندەق لێدەرەکان( اصحاب الاخدود ) بەرانبەرموسڵمانان**

خودای گەورەئەفەرموێت: ﴿قُتِلَ أَصْحَٰبُ ٱلْأُخْدُودِ﴾ واتە: بە کوشت چن خاوەن چاڵەکان (لەغەمەکان). یانی: خەندەق لێدەران بێبەشن لەبەزەیی خوا ﴿ٱلْأُخْدُودِ﴾ جە معە کە ی (أخادید)ە یانی: خەندەق لێدان لەناو زەمیندا. ئەمە هەواڵێکە دەربارەی گەلی خوانەناسەوە کە ئەیانویست ئەو باوەڕدارانە کە لە ژێر دەسەڵاتیاندا بوون ئازاریان بدەن و زۆریان لێکردن لە ئایینەکەیان پەشیمان ببنەوە بە گوێیان نەکردن، خەندەقیان بۆ لێدان لەناو زەمیندا ئاگریان تێبەرداو پڕیان کرد لە سوتەمەنی بۆ تاودانی بۆ زۆر گەرمکردنی، زۆریان لێکردن واز بێنن بەڵام ئەوان بەگوێیان نەکردن، فڕێیان دانە ناو ئاگرەکە، بۆیە خودا ئەفەرموێت: ﴿قُتِلَ أَصْحَٰبُ ٱلْأُخْدُودِ﴾ واتە: بە کوشت چن خاوەن چاڵەکان ﴿ٱلنَّارِ ذَاتِ ٱلْوَقُودِ﴾ واتە: ئەو ئاگرەی خاوەن سوتەمەنی و بڵێسەیە ﴿إِذْ هُمْ عَلَيْهَا قُعُودٌ﴾ واتە: کاتێ کە ئەوان دانیشتبون بەدەوری ئاگرەکەدا. یانی: چاودێری ئەو کارە بوون کە بەخواناسانیان دەکرد. خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَمَا نَقَمُوا۟ مِنْهُمْ إِلَّآ أَن يُؤْمِنُوا۟ بِٱللَّهِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَمِيدِ﴾ واتە: وە ئەم سزایەشیان هەر لەبەر ئەوە دەدان کە بڕوایان هێنابوو بەخوای بەدەسەڵاتی سوپاسکراو. یان ئەوانە هیچ تاوانێکیان نەبو بێجگە لەوەی کە باوەڕیان بە خودای باڵا دەست هەبوو ئەو خودایەی هەر کەسێ پەنای بۆ ببات ناهەقی لێ ناکرێ، شایانی سوپاس و دەسەڵاتە لە هەموو بەرنامەو بڕیارو کردارێکیدا، هەر چەندە خودای گەورە بڕیاری وابو لەسەر ئەم بەندانەی کە ئەو ئازارەیان بەدەستی ئەم خوانەناسانە بەسەر هات، لەگەڵ ئەوەدا کە باڵا دەست و شایانی سوپاسە، ئەو چەندین هۆی هەیە هەر چەند ئەو هۆیانە لای زۆرینەی خەڵك نادیاریش بێ. پاشان ئەفەرموێت: ﴿ٱلَّذِى لَهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ﴾ واتە: ئەوەی کە موڵکی ئاسمان و زەوی هەر بۆ ئەوە وە خوا ئاگادارە بەسەر هەموو شتێکدا، یەکێك لە بەڵگەکانی کەماڵی سیفاتەکانی خوای گەورە ئەوەیەکە خاوەنی

هەموو ئاسمانەکان و زەمینە وئەوەی تێیان دایە ﴿وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ شَهِيدٌ﴾ واتە: هیچ شتێکی لێ وون نابێت لە ئاسمان و زەویداو لێشی ناشارێتەوە.

**چیرۆکی جادوگەرو قەشەو منداڵێك و ئەوانەی فڕێدرانە ناو ئاگر( چاڵەکە )**

ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە سوهەیبەوەکە پێغەمبەر(ﷺ)ئەفەرموێت: لەگەلەکانی پێش ئێوەدا پاشایەك بووە، جادوگەرێکی هەبووە، کە جادوگەرەکە چوو بە ساڵەوەپیر بوو بە پاشای وت: من پیر بووم و مردنم نزیك بوەتەوە منداڵێکم بدەرێ فێری جادوی بکەم، پاشایش منالێکی بۆ ناردوو فێری جادوی ئەکرد، لە نێوان جادوگەرو پاشادا قەشەیەك هەبو منداڵەکە ئەچووە لای گوێی لە قسەکانی ئەگرت، قەشە و قسەکانی قەشە زۆر سەرنجی ڕاکێشا، کاتێ ئەهات بۆ لای جادوگەرەکە لێی ئەدا و ئەیووت: بۆ درەنگ هاتی چی دوای خستی؟ کاتێکیش ئەچوەوە بۆ ناو کەس و کاری، لێیان ئەدا و ئەیان وت: بۆ درەنگ هاتیتەوە؟ ئەمەی بۆ قەشەکە گێڕایەوە، ئەویش ئەڵێت: کاتێ جادوگەرەکە ویستی لێت بدات، بڵێ: کە سوکارم دوایان خستم، کاتێکیش کەسوکارت لێیان دای بڵێ: جادوگەرەکە دوای خستم، کوڕەکە ئەڵێت: ڕۆژێك لەو ڕۆژانە هات بەسەر زیندەوەرێکی زۆر ترسناکی گەورەدا ڕێگاکەی لەخەڵکی گرتبوو نەیان ئەتوانی تێپەڕن و بڕۆن، ئەڵێت: ئەمڕۆ ئەڕوانم ئەم کارەی قەشەکە خۆشەویست ترە لای خودا یا کاری جادووگەرەکە! بەردێکی هەڵگرت و ووتی: ئەی خودایە ئەگەر کاری ئەم قەشەیە خۆشەویستترە لات و پێت خۆشترە لەکاری ئەم جادوگەرە ئەو ئەم زیندەوەرە بکوژە، تا ئەم خەڵکە تێبپەڕن و بڕۆن، بەردەکەی تێگرت و کوشتی و خەڵکەکە ڕۆشتن، ئەم هەواڵەی دا بەقەشەکە، ئەویش ووتی: بەڵێ کوڕەکەم، تۆ لەمن چاکتری و بەم زووانە توشی دەردی سەری(ئەزمون) دەبیت، ئەگەر تووشی ئەزمون بوویت کەس نەهێنیتە سەرم، ئەم منداڵە کوێری زکماك و بەڵەك و زۆرنەخۆشی تریشی چاك ئەکردەوە، یەکێك لە نزیکەکانی پاشا کوێر بوو هات بۆ لای منداڵەکە بە بەخششێکی زۆرەوە، ئەڵێت: چاکم بکەرەوە ئەوەی لێرەدایە هەمووی بۆ تۆ، منداڵەکە ئەڵێت: ئەمن هیچ کەس چاك ناکەمەوە خودای گەورە چاکی ئەکاتەوە، ئەگەر باوەڕی پێ بهێنی لێی ئەپاڕێمەوە چاکت ئەکاتەوە، باوەڕی هێناو پاڕایەوە لە خودا چاکی کردەوە، پاشان هات بۆ لای پاشا لەو شوێنەی کە لێی دائەنیشت، پاشا پێی گوت: ئەری فڵانەکەس کێ چاوی چاك کردیتەوە؟ ئەڵێت: پەروەردگارم، پاشا ئەڵێت: من ئەڵێیت؟ ئەڵێ: نەخێر، پەروەردگاری من و تۆش خودایە. پاشا ئەڵێت: بێجگە لە من پەروەردگارێکی ترت هەیە؟ ئەڵێت: بەڵێ، پەروەردگاری منیش و تۆش خودایە. بەردەوام سزای دەدا، تا منداڵەکەی پیشان دا، ناردی بەشوێنیا ئەڵێت: کوڕەکەم جادوگەریەکەت وای لێهاتوە کوێری زکماك و بەڵەك و ئەم جۆرە نەخۆشیانە چاك بکەیتەوە؟! منداڵەکە ئەڵێت: من کەس چاك ناکەمەوە، خوای گەورە چاکی ئەکاتەوە. پاشا ئەڵێت: من؟ ئەڵێت: نەخێر. ئەڵێت: بێجگە لە من

پەروەردگارێکی ترت هەیە؟ ئەڵێت: پەروەردگاری من و تۆش خودایە. دەستی کرد بەسزادانی بەبەردەوامی تا شوێنی قەشەکەی پیشان دا، قەشەکەی هێناو شتەکانی پێ وت: پاشان ووتی: پەشیمان بەرەوە لە ئاینەکەت، پەشیمان نەبوەوە، بە مشار لەناوەڕاستی سەریەوە دای هێنا تا دوو لەت بوو، ئەڵێ: بەکوێرەکەش: پەشیمان بەرەوە لە ئاینەکەت، ئەویش بە گوێی نەکرد، بە مشار لەتەوقی سەریەوە ئەویشی داهێنا هەردو لای کەوتە سەر زەمین. ئەڵێت: بە منداڵەکە: پەشیمان بەرەوە، ئەویش گوێی پێ نەدان بەچەند کەسێکا ناردیە ئەو کێوە(پاشا خۆی ئەیزانی کام کێوەیە) ئەڵێت: کاتێ گەیشتنە سەر لوتکەی کێوەکە ئەگەر پەشیمان بوەوە لە ئاینەکەی باشە ئەگەر پەشیمان نەبوەوە لە کێوەکەوە بیخەنە خوارەوە، کاتێ بردیانە سەر کێوەکە، منداڵەکە ئەڵێت: خودایە بە مەیلی خۆت ڕزگارم کە لەدەستیان. کێوەکە دەستی کردە جوڵە جووڵ وهەموویان کەوتنە خوارەوە، منداڵەکە هاتەوە ئەگەڕا تا ڕۆشتەوە لای پاشا. پاشا ووتی: هاوەڵەکانت چیان لێ هات؟ ئەڵێت: خودا ڕزگاری کردمْ لێیان. دووبارە لەگەڵ چەند کەسێکی تردا لەناو کەشتیەکدا ناردی، پێیان ئەڵێت: کاتێ بردتانە ناوەڕاستی دەریاکە ئەگەر پەشیمان بووەوە لە ئاینەکەی باشە، ئەگەر پەشیمان نەبووەوە بیخەنە ناو دەریاکە. بردیانە قوڵایی دەریاکە، منداڵەکە ئەڵێت: خودایە بە مەیلی خۆت ڕزگارم کە لە دەستیان، هەموویان ئەخنکێن. منداڵەکە یەتەوەو ئەڕواتە لای پاشا، پاشا ئەڵێت: هاوەڵەکانت چیان لێ هات؟ منداڵەکە ئەڵێت: خودای گەورە ڕزگاری کردم لەدەستیان. پاشان منداڵەکە ئەڵێت: بەپاشا: تۆ ناتوانی من بکوژی تا ئەوەی پێت ئەڵێم نەیکەیت، ئەگەر ئەوەی فەرمانت پێ ئەدەم پێی هەڵسیت، ئەتوانی بمکوژیت، ئەگەر وانەکەی هەرگیز ناتوانی بمکوژیت. پاشا ئەڵێت: ئەو شتە چیە؟ منداڵەکە ئەڵێت: لە شوێنێکا خەڵکی کۆ بکەرەوە، پاشان بمبەستنەوە بەدارێکەوە و تیرێك لەتیربەندەکەم هەلگرە، پاشان بڵێ: (باسم الله رب الغلام) بەناوی خوا، پەروەردگاری ئەم منداڵە، کاتێ تۆ ئەوەت کرد ئەو کاتە ئەمکوژی. پاشاش پێی هەڵسا، تیری خستە ناو تیرو کەوانەکەی منداڵەکە و پاشان تێی گرت و وتی: (بسم الله رب الغلام)، تیرەکەی دا لە نێوان چاوو گوێی منداڵەکە دەستی خستە سەر شوێنی تیرەکە و گیانی دەرچوو، خەڵکەکە وتیان: آمنا بربّ الغلام، یانی: باوەڕمان هێنا بە پەروەردگاری منداڵەکە، بەپاشا ووترا: ئایا ئەوەی لێی ئەترسای چاوت پێی کەوت؟ سوێند بە خوا ئەوەت لێ هاتۆتە دی هەموو خەڵکی باوەڕیان هێناوە، پاشا فەرمانی دا بچن لە شیوێکا لەسەرە ڕێگایەك خەندەق لێدەن و ئاگری تێ بەردەن، ئەڵێت: هەر کەسێ پەشیمان بووەوە وازی لێ بهێنن و پەشیمانیش نەبووەوە بیخەنە ناوی، ئەڵێت: ئەو خەڵکە دوور ئەکەوتنەوە لێی و پاڵ پاڵێن بوو، لەو کاتەدا ئافرەتێك بە منداڵە شیرەخۆرەکەیەوە هات، وەك ئەوەی خۆی بگرێ بۆ ئەوەی نەکەوێتە ناو ئاگرەکەوە، منداڵە ساواکە پێی گوت: دایکە ئارامت بێت تۆ لەسەر هەقی. بەم شێوەیە ئیمامی موسلیم ڕیوایەتی کردوە

لەکۆتایی سەحیحەکەیدا. موحەممەدی کوڕی ئیسحاقی کوڕی یەسار ئەم چیرۆکەی هێناوە لە سیرەتدا بە شێوەیەکی تر، هەندێ جیاوازی هەیە لەم چیرۆکەی پێشەوە، پاشان موحەممەدی کوڕی ئیسحاق ئەڵێت: دوای ئەوەی دەرکەوت خەڵکی نەجران پاش کوژرانی منداڵەکە لەسەر ئاینەکەی ماونەتەوە ئاینی مەسیحیەت ئەڵێت: زونەواس بەلەشکرەکەیەوە بۆیان هات، داوای لێی کردن ببنە جولەکە، خۆیان هەڵبژێرن یا جولەکەیەتی یا کوژران! ئەوان کوژرانیان هەڵبژارد، خەندەقی لێدا، بەئاگر سوتاندنی و بەشمشێر کوشتنی و لاشەکانی شێواندن، تا نزیکەی (٢٠) بیست هەزاری لێ کوشتن، لەسەر زونەواس و لەشکرەکەی خوای گەورە ئەم ئایەتانەی نارد بۆ پێغەمبەر(ﷺ)، ﴿قُتِلَ أَصْحَٰبُ ٱلْأُخْدُودِ ﴿٤﴾ ٱلنَّارِ ذَاتِ ٱلْوَقُودِ ﴿٥﴾ إِذْ هُمْ عَلَيْهَا قُعُودٌ ﴿٦﴾ وَهُمْ عَلَىٰ مَا يَفْعَلُونَ بِٱلْمُؤْمِنِينَ شُهُودٌ﴾ بەم شێوەیە موحەممەدی کوڕی ئیسحاق باسی کردوە لە سیرەتدا، ئەوەی خەڵکی خەندەقی کوشت زونەواس بوو کە ناوی زورعە بوو، لەکاتی فەرمانڕەوایەکەیدا ناوی یوسف بوو، کوڕی توبانی ئەسعەدی ئەبی کەریب بوو شوێنی ئەو کەسە کەوت کە مەدینەی داگیر کردو مەککەی بەرگ پۆشی کرد، دوو زانای جولەکەی لە مەدینە لەگەڵ خۆی هێناو ئەوەی بوو بە جولەکە لەسەر دەستی ئەم دوو زانایەدا بوو بە جولەکە، وەك ئیبنو ئیسحاق باسی کردوە بە درێژی، زو نەواس لەیەك ڕۆژدا(٢٠) بیست هەزاری لەخەندەقدا کوشت، یەك پیاو نەبێ کەس ڕزگاری نەبوو پێیان ئەوت: دەوسی زو سەعلەبان، بە سواری ڕایکرد نەیان توانی بیگرن چوو بۆ لای قەیسەرپاشای شام، قەیسەریش نامەی نوسی بۆنەجاشی پاشای حەبەشە، لەشکرێکی لەگاورەکانی حەبەشەی لەگەڵ نارد بەسەرۆکایەتی ئەریات و ئەبرەهە، یەمەنیان ڕزگار کرد لە چنگی جولەکەکان، زو نەواس ڕای کرد و زۆریان پێ هێنا و لە ناو دەریادا خنکا. دەسەڵاتی حەبەشە(٧٠) حەفتا ساڵ درێژەی کێشا بەدەست گاورەکانەوەپاشان سەیفی کوڕی زی یەزەنی حیمیەری ڕزگاری کردەوە و سەندیەوە لە دەست گاورەکان. داوای یارمەتی لە کیسرای پاشای فارس کرد، هەر چی لەبەندەینخانەدا بوو لەگەڵی نارد، (٧٠٠) حەوت سەد کەسێ ئەبون، یەمەنی پێ ئازاد کردن، لە دوایدا پاشا گەڕایەوە بۆ حیمیەر، (ان شا ءالله) هەندێ لەو بارەیەوە لە تەفسیری سورەتی﴿أَلَمْ تَرَ كَيْفَ فَعَلَ رَبُّكَ بِأَصْحَٰبِ ٱلْفِيلِ﴾ باس دەکەین.

**پاداشتی خاوەن خەندەقەکان**

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ فَتَنُوا۟ ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ ثُمَّ لَمْ يَتُوبُوا۟ فَلَهُمْ عَذَابُ جَهَنَّمَ وَلَهُمْ عَذَابُ ٱلْحَرِيقِ﴾ واتە: بە ڕاستی ئەوانەی کە ئازاری پیاوو ژنە بڕوادارەکانیان داو لە پاشاندا پەشیمان نەبوونەوە ئەوە بۆ ئەوان هەیە سزای دۆزەخ و سزای ئاگری سوتێنەر. ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ فَتَنُوا۟ ٱلْمُؤْمِنِينَ

﴿وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ﴾ یانی: بە سووتاندن. ئیبنو عەباس و موجاهید و قەتادەو زەححاك و ئیبن ئەبزا ئەڵێن: ﴿ثُمَّ لَمۡ يَتُوبُواْ﴾ یانی: وازیان نەهێناو پەشیمان نەبوونەوە لەو کارانەی لە پێشەوە کردیان﴿فَلَهُمۡ عَذَابُ جَهَنَّمَ وَلَهُمۡ عَذَابُ ٱلۡحَرِيقِ﴾ لەبەر ئەوەی پاداشت لە شێوەو جۆری کردەوەیە. حەسەنی بەصری ئەڵێت: سەیری ئەم ڕێزو بەخشندەیە، خواناس و دۆستەکانی ئەکوژن ئەویش بانگیان دەکات بۆ پەشیمان بوونەوەو لێبوردن.

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَهُمۡ جَنَّٰتٞ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُۚ ذَٰلِكَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡكَبِيرُ ﴿١١﴾ إِنَّ بَطۡشَ رَبِّكَ لَشَدِيدٌ ﴿١٢﴾ إِنَّهُۥ هُوَ يُبۡدِئُ وَيُعِيدُ ﴿١٣﴾ وَهُوَ ٱلۡغَفُورُ ٱلۡوَدُودُ ﴿١٤﴾ ذُو ٱلۡعَرۡشِ ٱلۡمَجِيدُ ﴿١٥﴾ فَعَّالٞ لِّمَا يُرِيدُ ﴿١٦﴾ هَلۡ أَتَىٰكَ حَدِيثُ ٱلۡجُنُودِ ﴿١٧﴾ فِرۡعَوۡنَ وَثَمُودَ ﴿١٨﴾ بَلِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فِي تَكۡذِيبٖ ﴿١٩﴾ وَٱللَّهُ مِن وَرَآئِهِم مُّحِيطُۢ ﴿٢٠﴾ بَلۡ هُوَ قُرۡءَانٞ مَّجِيدٞ ﴿٢١﴾ فِي لَوۡحٖ مَّحۡفُوظِۭ ﴿٢٢﴾﴾

## پاداشتی پیاو چاکان و تۆڵەی سەخت بۆ خوانەناسان و دوژمنانی خودا

خوای گەورە باسی بەندە خواناسەکانی ئەکات و ئەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَهُمۡ جَنَّٰتٞ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُۚ ذَٰلِكَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡكَبِيرُ﴾ واتە: بێگومان ئەوانەی بڕوایان هێناو کردەوە چاکەکانیان کرد بۆ ئەوان هەیە بەهەشتانێك کە جۆگە ئاوی زۆر دەڕوا بەژێریاندا، ئا ئەوەیە سەرکەوتنی گەورە بە پێچەوانەی ئەوەی کە بۆ دوژمنەکانی داناوە لە ئازاری جەهەننەم و تەواو سوتاندنیان، بۆیە بۆ ئەمان ئەفەرموێت: ﴿ذَٰلِكَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡكَبِيرُ﴾ واتە: ئا ئەوەیە سەرکەوتنی گەورە. پاشان ئەفەرموێت: ﴿إِنَّ بَطۡشَ رَبِّكَ لَشَدِيدٌ﴾ واتە: بە ڕاستی دەستوەشاندنی پەروەردگاری تۆ زۆر سەختە. یانی: تۆڵەو هەڵمەتی بۆ دوژمنەکانی، ئەوانەی کە پێغەمبەرەکانیان بەدرۆ ئەخستەوە زۆر گەورەو بەهێزە. خاوەنی توانایەکی بێ پایانە،هەر شتێکی ویست و چۆنی ویست ئەبێ لەچاو تروکانێك دا یاکەم تر، ئەو شتە ببێت! وە ئەفەرموێت: ﴿إِنَّهُۥ هُوَ يُبۡدِئُ وَيُعِيدُ﴾ واتە: بێگومان هەر ئەوە لەسەرەتاوە مرۆڤ دروست دەکات و (دوای مردن)زیندوی دەکاتەوە. یانی: لە هێزو توانای بێپایانیەتی خەڵکی وەدی ئەهێنێ دوبارەشی ئەکاتەوە، وەك چۆن وەدی هێنا بە بی هیچ کۆسپ و بەرگریەك. ﴿وَهُوَ ٱلۡغَفُورُ ٱلۡوَدُودُ﴾ واتە: وەهەر ئەوە لێخۆشبووی میهرەبان. یانی: هەر کەسێ بگەڕێتەوە بۆ لای و سەردانەوێنێ لێیخۆش ئەبێ با تاوانەکەشی هەرجۆرێ بێ.﴿ٱلۡوَدُودُ﴾ ئیبنو عەباس و بێجگە لە ئەویش وتویانە: ئەو خۆشەویستە. ﴿ذُو ٱلۡعَرۡشِ ٱلۡمَجِيدُ﴾ واتە: خاوەنی عەرشی بەرزو پایەدارە. یانی: خاوەنی

تەختی گەورەو بڵندە بەسەر هەموو دروستكراوەكانیەوە. ﴿الْمَجِيدُ﴾ دوو خوێندنەوەی هەیە، یەكەم: بەمەرفوعی لەبەر ئەوەی كە سیفەتە بۆ(ربّ)، دوهەم: بەمەجروری لەبەر ئەوەی سیفەتە بۆ عەرش، هەردوكیان لە مانادا تەواون ﴿فَعَّالٌ لِّمَا يُرِيدُ﴾ واتە: هەرچی بوێ دەیكات، یانی: هەرچی بوێت كردوویەتی و كەس ناتوانێ دەست بخاتە فەرمانی، هەرچی بكات پرسیاری لێ ناكرێ لەبەر گەورەیی دەسەڵات و كاربەجێی و دادپەروەریی، وەك ئەوەی ڕیوایەت كراوە لە ئەبو بەكری سدیقەوە كە لە نەخۆشی لەدونیا دەرچوینیدا پێیان ووت: ئایا پزیشك سەیری كردیت؟ وتی: بەڵێ. وتیان: چی پێ ووتی؟ وتی: فەرمووی پێم: ئەمن هەر چیەكم بوێت ئەیكەم. خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿هَلْ أَتَاكَ حَدِيثُ الْجُنُودِ﴾ واتە: ئایا پێت گەیشتوە باس و بەسەر هاتی لەشكرەكانی ﴿فِرْعَوْنَ وَثَمُودَ﴾ واتە: فیرعەون و سەموود. یانی: ئاخۆ هەواڵی ئەوانەت پێ گەیشت كە خوای گەورە چی بەسەر هێنان كە ناخۆشی و سزایەكی وەهای دان كەس نەیتوانی بێت بە هاواریانەوە؟ ئەمەیش وەك ئەم فەرمودەیە كە ئەفەرموێت: ﴿وَكَذَٰلِكَ أَخْذُ رَبِّكَ إِذَا أَخَذَ الْقُرَىٰ وَهِيَ ظَالِمَةٌ إِنَّ أَخْذَهُ أَلِيمٌ شَدِيدٌ﴾ یانی: بەو شێوەیە خوا شارە ستەمكارەكان ئەگرێت و لەناویان ئەبات، كاتێ ستەمكاری گرت گرتنەكەی زۆربە ئێش و ئازارە، گشت دەسەڵات بەدەست ئەوەو بەسەر هەموو شتدا زاڵە، وە ئەفەرموێت: ﴿بَلِ الَّذِينَ كَفَرُوا فِي تَكْذِيبٍ﴾ واتە: بەڵكو ئەوانەی بێبڕوا بون هەمیشە لە بە درۆزانینی قورئان دان، یانی: ئەوان لە گومان و دوودڵی و بێدینی و سەرپێچی دان. ﴿وَاللَّهُ مِن وَرَائِهِم مُّحِيطٌ﴾ واتە: وە خواش بەدەسەڵات و زانینی لە پشتیانەوە دەوری داون. یانی: زاڵ و بەدەسەڵاتە بەسەریانەوە و دەرباز نابن و لەدەستی دەرناچن. ﴿بَلْ هُوَ قُرْآنٌ مَّجِيدٌ﴾ واتە: بەڵكو ئەوەی كە بەدرۆی دەزانن قورئانێكی گەورەو بەڕێزە. یانی:زۆرگەورەیە و زۆربەڕێزە.﴿فِي لَوْحٍ مَّحْفُوظٍ﴾ واتە: لە لەوحێكی پارێزراودایە. یانی: ئەو لە مەلەئی ئەعلادا پارێزراوە لە زیادو كەمی و گۆڕین و جێگۆڕكێ پێكردنی.

## سورەتی ( الطّارق )

### لەمەككەدا هاتووەتە خوارەوە

### گەورەیی و ڕێزی سورەتی تاریق

نەسائی ڕیوایەتی كردوە لەجابیرەوە ئەڵێت: مەعازكە نوێژی بۆ خەڵك ئەكرد سورەتی بەقەرە و نیسائی ئەخوێند، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەرێ مەعاز تۆ ئەتەوێ ببی بە فیتنە بۆ خەڵكی؟! باشتر نییە كە﴿وَالسَّمَاءِ وَالطَّارِقِ – وَالشَّمْسِ وَضُحَاهَا﴾و لە شێوەی ئەم سورەتانە بخوێنی.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

﴿وَالسَّمَاءِ وَالطَّارِقِ (١) وَمَا أَدْرَاكَ مَا الطَّارِقُ (٢) النَّجْمُ الثَّاقِبُ (٣) إِن كُلُّ نَفْسٍ لَّمَّا عَلَيْهَا حَافِظٌ (٤) فَلْيَنظُرِ الْإِنسَانُ مِمَّ خُلِقَ (٥) خُلِقَ مِن مَّاءٍ دَافِقٍ (٦) يَخْرُجُ مِن بَيْنِ الصُّلْبِ وَالتَّرَائِبِ (٧) إِنَّهُ عَلَىٰ رَجْعِهِ لَقَادِرٌ (٨) يَوْمَ تُبْلَى السَّرَائِرُ (٩) فَمَا لَهُ مِن قُوَّةٍ وَلَا نَاصِرٍ (١٠)﴾

## خودا سوێند ئەخوات کە بونی مرۆڤ دەورە دراوە بە پرۆگرامی خوداوە

خودای گەورە سوێندئەخوات بەئاسمان و ئەوئەستێرە ڕوناکانەی تیایەتی، بۆیە ئەفەرموێت: ﴿وَالسَّمَاءِ وَالطَّارِقِ﴾واتە: سوێند بە ئاسمان و ئەوەی کە لە شەوا دەر دەکەوێت. ﴿وَمَا أَدْرَاكَ مَا الطَّارِقُ﴾ واتە: تۆ چو زانیت دەرکەوتوی شەو چی یە؟ پاشان مانای ئەکات و ئەفەرموێت: ﴿النَّجْمُ الثَّاقِبُ﴾ واتە: ئەستێرەی دُرەخشانی تاریکی کونکەرە، قەتادەو جگە لە ئەویش ئەڵێن: بۆیە ناو براوە بە ﴿النَّجْمُ الثَّاقِبُ﴾ چونکە بەشەو ئەبینرێ و بەڕۆژ وون ئەبێ. وەك ئەوەی لەم فەرمودە سەحیحەدا هاتوە کە پشتگیریی ئەم مانایە ئەکات کە حەرام کراوە پیاو لە ناکاو بەشەودا لەدەرگای ماڵەوەی بدات، یانی: بەشەو لەناکاو بڕواتە ماڵەوە. وە ئەفەرموێت: ﴿الثَّاقِبُ﴾ ئیبنو عەباس ئەڵێت: یانی: گەش. عیکریمە ئەڵێت: گەش و شەیتان سوتێن. وە ئەفەرموێت: ﴿إِن كُلُّ نَفْسٍ لَّمَّا عَلَيْهَا حَافِظٌ﴾ واتە: سوێند بەمانە کەس نییە کە چاودێرێکی بەسەرەوە نەبێت، یانی: هەموو کەسێ چاودێرێکی لەلای خوداوە لەسەرە پاسەوانێتی لەزیان لێکەوتن، وەك ئەفەرموێت ﴿لَهُ مُعَقِّبَاتٌ مِّن بَيْنِ يَدَيْهِ وَمِنْ خَلْفِهِ يَحْفَظُونَهُ مِنْ أَمْرِ اللَّهِ﴾ واتە: بۆ ئەوئادەمی هەیە فریشتانێ: کە بەدوای یەکدا دێن لە پێش و لە دوایەوە بەفەرمانی خودا دەیپارێزن لەزیان.

## چۆنیەتی وەدیهێنانی مرۆڤ نیشانەیە لەسەر توانای خودا کە جارێ تر بیهێنێتەوە

خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿فَلْيَنظُرِ الْإِنسَانُ مِمَّ خُلِقَ﴾ واتە: دەی بامرۆڤ سەرنج بدات کە لە چی دروست کراوە. ئاگاداریە کە بۆ مرۆڤ لەسەر لاوازی ئەو سەرچاوەی کە لێی وەدی هاتوە، ڕێنمونیە کە بۆی تا دان بنێ بە هێنانەوەیدا جارێکی تر پاش مردنی، چونکە کەسێ یەکەمجار توانی جارێکی تر چاکتر ئەتوانێ بیهێنێتەوە، وەك خودا ئەفەرموێت: ﴿وَهُوَ الَّذِي يَبْدَؤُا الْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُ وَهُوَ أَهْوَنُ عَلَيْهِ﴾ واتە: خودا خۆی ئەو خەڵکە وەدی دێنێ و دواجاریش دەیهێنێتەوە کە بۆ ئەو ئاسان تریشە وە ئەفەرموێت: ﴿خُلِقَ مِن مَّاءٍ دَافِقٍ﴾ واتە: دروست کراوە لە ئاوێکی فڕێدراو(هەڵقولاو). یانی: دڵۆپێك

ئاودەردەچێ و فڕكە دەكات لە پیاو و ژنەوە، لە هەردوكیان منداڵ پەیدا دەبێ بە ئیزنی خوای گەورە، بۆیە ئەفەرموێت: ﴿يَخْرُجُ مِنۢ بَيْنِ ٱلصُّلْبِ وَٱلتَّرَآئِبِ﴾ دەرئەچێت لە پشتی پیاو بەرملانی ژنەوە، زەرد و بێهێزە، منداڵ نابێ بەو دوو ئاوە نەبێ. وە ئەفەرموێت: ﴿إِنَّهُۥ عَلَىٰ رَجْعِهِۦ لَقَادِرٌ﴾ واتە: بە ڕاستی خودا بەدەسەلاتە لەسەر زیندووكردنەوەی. یانی: لە هێنانەوەی ئەم مرۆڤە كە دروست كراوە لە ئاوێك كە فڕكە دەكات، یانی: لە هێنانەوەو زیندووكردنەوەی بۆ ماڵی دوا ڕۆژ بەتواناترە، چونكە كەسێ توانی یەكەمجار دروستی بكات ئەشتوانێ بیهێنێتەوە. خوای گەورە ئەم نیشانەیەی باس كردووە لە زۆر شوێنی تری قورئاندا.

## ڕۆژی قیامەت مرۆڤ هیچ هێزێكی نیەو كەسیش نایەت بە هاواریەوە

خودای گەورەئەفەرموێت: ﴿يَوْمَ تُبْلَى ٱلسَّرَآئِرُ﴾ واتە: لە ڕۆژێكدا كە هەرچی نهێنی هەیە ئاشكرا دەكرێ. یانی: لە ڕۆژی قیامەت پەنهانیەكان دەردەكەون، ئاشكرا دەبن و ئەبینرێن، نهێنی نامێنێ و وون بووەكان ئەناسرێنەوە. لەهەر دوو سەحیحەكەدا هاتووە لە ئیبنو عومەرەوە كە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: هەموو ناپاكێ لەلای سەریدا ئاڵایەكی بۆ هەڵ ئەدرێ، ئەوترێ: ئەمە ئاڵای ناپاكیی فلانی كوڕی فلانە كەسە. وە ئەفەرموێت: ﴿فَمَا لَهُۥ مِن قُوَّةٍ وَلَا نَاصِرٍ﴾ واتە: ئەو نە هێزێك شك دەبات و نە پشتیوانێك. یانی: ناتوانێ خۆی ڕزگار كات لە سزای خوداو وە كەسیش ناتوانێ ڕزگاری بكات.

﴿وَٱلسَّمَآءِ ذَاتِ ٱلرَّجْعِ ﴿١١﴾ وَٱلْأَرْضِ ذَاتِ ٱلصَّدْعِ ﴿١٢﴾ إِنَّهُۥ لَقَوْلٌ فَصْلٌ ﴿١٣﴾ وَمَا هُوَ بِٱلْهَزْلِ ﴿١٤﴾ إِنَّهُمْ يَكِيدُونَ كَيْدًا ﴿١٥﴾ وَأَكِيدُ كَيْدًا ﴿١٦﴾ فَمَهِّلِ ٱلْكَٰفِرِينَ أَمْهِلْهُمْ رُوَيْدًۢا ﴿١٧﴾﴾

خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَٱلسَّمَآءِ ذَاتِ ٱلرَّجْعِ﴾ واتە: سوێند بە ئاسمانی خاوەن باران.ئیبنو عەباس ئەڵێت: ﴿ٱلرَّجْعِ إِنَّهُۥ﴾ بارانە، دووبارە ئیبنو عەباس ئەڵێت: ئەو هەورەی كەبارانی پێوەیە.جارێكی ئەڵێت: ببارێت پاشانیش ببارێتەوە.قەتادە ئەڵێت: ڕۆزی بژێوی بەندەكانی دێتەوە ئەگەر وا نەبوایە مرۆڤ قڕی دەكردو مەڕوماڵاتیشیان قڕی دەكرد. ﴿وَٱلْأَرْضِ ذَاتِ ٱلصَّدْعِ﴾ واتە: وەبە زەوی خاوەن درزو قڵیش. ئیبنو عەباس ئەڵێت: درز بردنی بۆ ڕووەك و گژوگیا. هەروەها سەعیدی كوڕی جوبەیر و عیكریمە و ئەبو مالك و زەحاك و حەسەن وقتادە و سوددی و كەسانی تریش وا دەڵێن. وە ئەفەرموێت: ﴿إِنَّهُۥ لَقَوْلٌ فَصْلٌ﴾ واتە: ئەم قورئانە وتەی ڕاست و جیاكەرەوەیە. ئیبنو عەباس ئەڵێت: هەق وڕاست، قەتادەش هەروای وتوە كە: دادپەروەرێكی ڕاستە.وە ئەفەرموێت: ﴿وَمَا هُوَ بِٱلْهَزْلِ﴾ واتە: وە گاڵتە نییە.یانی: بەڵكو زۆر ڕاستە. پاشان باسی خوانەناسان ئەكات كە باوەڕیان پێی نییە، وە ئەبنە لەمپەروكۆسپ لە ڕێگای

خوادا، وە ئەفەرموێت: ﴿إِنَّهُمْ يَكِيدُونَ كَيْدًا﴾ واتە: بێگومان بێبڕواکان فێڵ دەکەن چۆن فێڵ کردنێك. یانی: فێڵ دەکەن لەخەڵکی لە بانگکردنیان بۆ دژایەتی قورئان. وە ئەفەرموێت: ﴿وَأَكِيدُ كَيْدًا﴾ واتە: وە منیش نەخشە دەکێشم بۆ هەڵوەشاندنەوەی فێڵەکانیان چۆن نەخشە کێشانێك بە تۆڵە لێسەندنیان. پاشان ئەفەرموێت: ﴿فَمَهِّلِ الْكَافِرِينَ أَمْهِلْهُمْ رُوَيْدًا﴾ واتە: ئینجا مۆڵەتی بێبڕواکان بدەو کەمێك لێیان بوەستە ﴿فَمَهِّلِ الْكَافِرِينَ﴾ یانی: ماوەیان بدەو پەلەیان لێ مەکە ﴿أَمْهِلْهُمْ رُوَيْدًا﴾ یانی: کەمێك. واتە: بەم زووانە ئەبینی چیان بەسەر هاتوە لە جەزرەبەو سزاو لەناوچوون و ڕیسوابوون، وەك خودا ئەفەرموێت: ﴿ نُمَتِّعُهُمْ قَلِيلًا ثُمَّ نَضْطَرُّهُمْ إِلَىٰ عَذَابٍ غَلِيظٍ ﴾ واتە: کەمێ نازو نیعمەتیان پێ دەدەین لەدنیادا لە پاشان ناچاریان دەکەین کە بڕۆنە ناو سزای سەختەوە.

## تەفسیری سورەتی (الأعلی)

## لەمەککەدا هاتووەتەخوارەوە

### گەورەیی و ڕێزی سورەتی ئەعلا

ئەم سورەتە مەکییە و پێش کۆچکردنی پێغەمبەر(ﷺ) هاتۆتە خوارەوە، بەڵگەشمان بۆ ئەوە ئەوەیە کە ئیمامی بوخاری ڕیوایەتی کردوە لە بەرائی کوڕی عازیبەوەکە ئەڵێت: یەکەم کەسێ هات بۆ لامان لەهاوەڵەکانی پێغەمبەر(ﷺ)موسعەبی کوڕی عومەیرو ئیبنو ئوم مەکتوم بوو قورئانیان بۆ ئەخوێندین. پاشان عەممارو بیلال و سەعد هاتن پاشانیش عومەری کوڕی خەتتاب بە بیست(٢٠) نەفەرەوە هات. دوای ئەمانە پێغەمبەر(ﷺ) هات، هەرگیز خەڵکی مەدینەم نەدیوە ئەوەندە دڵخۆشبن بەهیچ شتێ ئەوەندەی ئەم خۆشیەیان بە هاتنی پێغەمبەر(ﷺ) تا ژنان و منداڵان ئەیان وت: ئەوە پێغەمبەرە(ﷺ)هات، کاتێ هات سورەتی ﴿سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الْأَعْلَى﴾وە هاوشێوەکانی ئەخوێند، لە دووسەحیحەکەدا هاتوە کە پێغەمبەر(ﷺ) بەموعازی فەرموو: بۆ نوێژت بە ﴿سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الْأَعْلَى - وَالشَّمْسِ وَضُحَاهَا - وَاللَّيْلِ إِذَا يَغْشَىٰ﴾ نەکردوە وە ئیمامی ئەحمەد لە نیعمانی کوڕی بەشیرەوە ڕیوایەتی کردوە کە پێغەمبەر(ﷺ) لەجەژنەکاندا﴿سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الْأَعْلَى و هَلْ أَتَاكَ حَدِيثُ الْغَاشِيَةِ﴾ی ئەخوێند، ئەگەر جەژنەکان ڕێکەوتی هەینیان بکردایە هەردوو سورەتەکەی تێدا ئەخوێندن. ئیمامی موسلیم لە سەحیحەکەیدا و ئەبو داودوتیرمیزی و نەسائی و ئیبنو ماجەو ئەهلی سونەنیش ڕیوایەتیان کردوە کە پێغەمبەر(ﷺ) لەجەژنەکان و ڕۆژی هەینیەکاندا﴿سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الْأَعْلَى و هَلْ أَتَاكَ حَدِيثُ الْغَاشِيَةِ﴾ی ئەخوێند وە ئەگەر بەیەکەوەش بونایە هەر ئەیخوێندن.ئیمامی ئەحمەدیش لە موسنەدەکەیدا لە

فەرمودەی ئوبەیی کوڕی کەعب و عەبدوڵای کوڕی عەباس و عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبزەی و عائیشەی دایکی موسڵمانان ڕیوایەتی کردوە کە پێغەمبەر(ﷺ) لە سوننەتی وەتردا ﴿سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى و قُلْ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلْكَـٰفِرُونَ و قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ﴾ی ئەخوێند وە عائیشەش(خوای لێ ڕازی بێت) مەعوزەتەینی بۆ زیاد کردوە، مەعوزەتەینیش واتە: ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلْفَلَقِ و قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ ﴾.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَـٰنِ ٱلرَّحِيمِ

سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى (١) ٱلَّذِى خَلَقَ فَسَوَّىٰ (٢) وَٱلَّذِى قَدَّرَ فَهَدَىٰ (٣) وَٱلَّذِىٓ أَخْرَجَ ٱلْمَرْعَىٰ (٤) فَجَعَلَهُۥ غُثَآءً أَحْوَىٰ (٥) سَنُقْرِئُكَ فَلَا تَنسَىٰٓ (٦) إِلَّا مَا شَآءَ ٱللَّهُ ۚ إِنَّهُۥ يَعْلَمُ ٱلْجَهْرَ وَمَا يَخْفَىٰ (٧) وَنُيَسِّرُكَ لِلْيُسْرَىٰ (٨) فَذَكِّرْ إِن نَّفَعَتِ ٱلذِّكْرَىٰ (٩) سَيَذَّكَّرُ مَن يَخْشَىٰ (١٠) وَيَتَجَنَّبُهَا ٱلْأَشْقَى (١١) ٱلَّذِى يَصْلَى ٱلنَّارَ ٱلْكُبْرَىٰ (١٢) ثُمَّ لَا يَمُوتُ فِيهَا وَلَا يَحْيَىٰ (١٣)

### فەرماندان بە پەسەنی (التسبيح)ی خوداو وەڵامدانەوەی

ئیمامی ئەحمەد ئەڵێت: ئەبو عەبدوڕەحمان بۆی گێڕاینەوە ئەویش ئەڵێت: موسا بۆی گێڕاینەوە یانی: ئەیوبی غافیقی کە ئەویش ئەڵێت: مامم ئەیاسی کوڕی عامر بۆی گێڕاینەوە ئەڵێت: گوێم لە عوقبەی کوڕی عامری جوهەنی بوو ئەڵێت: کاتی ئایەتی ﴿فَسَبِّحْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلْعَظِيمِ ﴾ هاتە خوارەوە، پێغەمبەر(ﷺ) ئەفەرمووێت: لە ڕکوعە کانتاندا با بێ، یانی: بیبخوێنن، ئەبوداود و ئیبنو ماجە ڕیوایەتیان کردوە. ئیبنو جەریریش ڕیوایەتی کردوە لە ئەبو ئیسحاقی هەمەدانیەوە کە ئیبنو عەباس کاتێ ﴿سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى ﴾ ی ئەخوێند، ئەیوت: (سُبْحَانَ رَبِّيَ الأعلى)، وەکاتێ﴿لَآ أُقْسِمُ بِيَوْمِ ٱلْقِيَـٰمَةِ﴾ ئەخوێند ئەگەیشتە کۆتایی سورەتەکە ﴿أَلَيْسَ ذَٰلِكَ بِقَـٰدِرٍ عَلَىٰٓ أَن يُحْـِۧىَ ٱلْمَوْتَىٰ﴾ واتە: ئایا ئەو زاتە تواناى نییە بەسەر ئەوەدا کە مردووان زیندوو بکاتەوە؟ ئەیفەرموو: سبحانك وبلى، یانی: بیگەردی بۆ تۆ، بەرەوەلاَ. قەتادە ئەڵێت: ئیبنوعەبباس بۆی باسکردین: کاتێ پێغەمبەر(ﷺ)﴿سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى﴾ ی خوێندووە فەرموویەتی: (سبحان ربى الاعلى)خودا ئەفەرموێت: ﴿سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى﴾واتە: بەپاکی یادی پەروەردگاری هەرە بڵندت بکە.

### دروست کردن و ئەندازە دانان و دەرهێنانی ڕووەك

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ٱلَّذِى خَلَقَ فَسَوَّىٰ﴾ واتە: ئەوەی هەموو شتێکی دروست کردوەو ڕێك و پێکی کردوە. یانی: دروست کراوەکانی وەدیهێناو هەمووی لە چاکترینی شێوەدا دروست کرد. وە ئەفەرموێت: ﴿وَٱلَّذِى قَدَّرَ فَهَدَىٰ﴾ واتە: ئەوەی کە نەخشەی کێشاوە بۆ هەموو شتێ ئینجا شارەزای

کردوه، موجاهید ئەڵێت: ڕێگای پیشانی مرۆڤ دا بۆ بەختەوەری یا بەدبەختی، ڕێی نیشانی گیانەوەرو مەڕو ماڵات داوە بۆ لەوەڕگای شوێنی پڕ لە گژوگیا. ئەم ئایەتە وەك ئەم ئایەتەی تر وایە کە باسی مووسا ئەکات کە بەفیرعەون ئەڵێت: ﴿رَبُّنَا ٱلَّذِىٓ أَعۡطَىٰ كُلَّ شَىۡءٍ خَلۡقَهُۥ ثُمَّ هَدَىٰ﴾ واتە: پەروەردگاری ئێمە ئەو زاتەیە دروستکردنێکی بە هەموو شتێك بەخشیوەپاشان ڕێنمونیشی کردوە بۆ کاری خۆی. وەك لە سەحیحی موسلیمدا هاتوە لە عەبدوڵای کوڕی عەمرەوە پێغەمبەر(ﷺ) ئەفەرمووێت: خودا ئەندازەی پێویست و دیاریکراوی بۆ دروستکراوەکانی داناوە(٥٠٠٠)پێنج هەزار ساڵ پێش ئەوەی ئاسمانەکان و زەمین وەدی بهێنێ و تەختی خوا(عرشە) لەسەر ئاوبوە. وە ئەفەرموێت: ﴿وَٱلَّذِىٓ أَخۡرَجَ ٱلۡمَرۡعَىٰ﴾ واتە: وە ئەوەی کە لەوەڕی دەرهێناوە. یانی: لە هەموو جۆرە ڕووەك و کشتوکاڵێك، ﴿فَجَعَلَهُۥ غُثَآءً أَحۡوَىٰ﴾ واتە: ئینجا دەیکات بە پووشی ڕەشداگەڕاو، ئیبنو عەباس ئەڵێت: پووشی ووشك و ووردکراو و ڕەنگگۆڕاو. موجاهید و قەتادەو ئیبنو زەیدو کەسانی تریش ئەم تەفسیرەیان وتووە.

## پێغەمبەر(ﷺ) نیگای لەبیر ناچێت

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿سَنُقۡرِئُكَ فَلَا تَنسَىٰٓ﴾ واتە: ئەی موحەممەد(ﷺ)! قورئانت بەسەردا دەخوێنینەوەو هەرگیز لە بیرت ناچێتەوە یانی: ئەمە هەواڵ و بەڵێنێکە لە خوداوە بۆ پێغەمبەر(ﷺ) کە خوێندنەوەیەکی پێدەخوێنێ کە لەبیری ناچێتەوە﴿إِلَّا مَا شَآءَ ٱللَّهُۚ إِنَّهُۥ يَعۡلَمُ ٱلۡجَهۡرَ وَمَا يَخۡفَىٰ﴾ واتە: مەگەر ئەوەی کە خوا بیەوێت بێگومان ئەو بەهەموو شتێکی ئاشکراو پەنهان ئاگادارە. قەتادە ئەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) هیچی لەبیر نەچوو مەگین خوا حەزی بکردایە. گوتراوە مەبەست لە ﴿فَلَا تَنسَىٰٓ﴾ داوا طلبە، مانای ئیستیسناش لێرەدا مەبەست پێی نەسخە، یانی: لە بیرت ناچێ ئەوەی پێت دەخوێنین مەگەر خوا مەیلی لێ بێ لە بیرت بچێت، ئەگەر وازی لێبێنی لەسەرت ناکەوێت وە ئەفەرموێت: ﴿إِنَّهُۥ يَعۡلَمُ ٱلۡجَهۡرَ وَمَا يَخۡفَىٰ﴾واتە: لەوەی بەندەکانی ئاشکرای دەکەن یا ئەیشارنەوە لە قسە کردن و هەڵسوکەوتیان ئاگادارەو هیچ شتێك لەوانە لای خودا لەبیر ناچێت، وە ئەفەرموێت: ﴿وَنُيَسِّرُكَ لِلۡيُسۡرَىٰ﴾واتە: وە یارمەتیت دەدەین بۆ ڕێی ئاسان. یانی: کاری چاك و قسەی باشت بۆ ئاسان ئەکەین و ڕێگای ئاسان و ڕێك و ڕاست و تەواوت بۆ پەیدا دەکەین، نەلاری و نە گلەیی و نە گرانی تێدا بێت.

## فەرمان بە ئامۆژگاری کردن

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿فَذَكِّرۡ إِن نَّفَعَتِ ٱلذِّكۡرَىٰ﴾ واتە: ئینجا تۆش هەردەم ئامۆژگاری بکە ئەگەر سودی گەیاند. یانی: نەسیحەت بکە هەر کاتێ نەسیحەتەکەت کەڵکی هەبوو. لێرەدا ئەبێ ڕێز لە بڵاو

کردنەوەی ئاین و زانیاری بگیرێ، لای خەڵکی خۆیدا نەبێ باس نەکرێ، وەك میری موسڵمانان عەلی کوڕی ئەبو تالیب (خوا لێی ڕازی بێت) فەرموویەتی: ئەگەر تۆ قسە بۆ هەر کۆمەڵێك بکەیت نەچێتە دڵیانەوە و تێ نەگەن سەرت لێ شێواندوون. دوبارە فەرمووی: چۆن خەڵکی تێ ئەگات بەو شێوەیە ئامۆژگاری بکەن، ئایا پێتان خۆشە خوداو پێغەمبەری خودا(ﷺ)باوەڕیان پێ نەکرێ؟ وە ئەفەرموێت: ﴿سَيَذَّكَّرُ مَن يَخْشَىٰ﴾ واتە: بێگومان ئەوەی لەخوا بترسێ پەندی لێ وەردەگرێ یانی: زۆر زوو ئەوەی بۆی باس ئەکەی وەری ئەگرێ، لە دڵیەوە لە خوا ئەترسێ ئەزانێ ئەڕواتە لای خوا، وە ئەفەرموێت: ﴿وَيَتَجَنَّبُهَا الْأَشْقَى﴾ واتە: وە ئەوەی زۆر خراپیش بێت خۆی لێ دوور دەخاتەوە ﴿الَّذِي يَصْلَى النَّارَ الْكُبْرَىٰ﴾ واتە: ئەوەی دەچێتە ناو ئاگری هەرە گەورەوە ﴿ثُمَّ لَا يَمُوتُ فِيهَا وَلَا يَحْيَىٰ﴾ واتە: لە پاشان نە ئەمرێ تێیدا تا ڕزگاری بێت وە نەدەژی تێیدا بەئاسانی. یانی: نامرێ تا بحەسێتەوەو ناژی بەژیانێکیش بەهرەی لێ وەرگرێ، بەڵکو بە زیانی تەواو ئەبێ، لەبەر ئەوەی کە نامرێت هەست ئەکات بەو ئازارو ئێش و ئازارەی کە ئەدرێت ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە ئەبو سەعیدەوە ئەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) ئەفەرموێت: بەڵام ئەوانەی خەڵکی دۆزەخ هەر ئەمێننەوە تێیدا نە دەمرن و نە زیندوشن بەڵام ئەوانەی خوابەزەیی دێتەوە پێیاندا لەناو ئەو ئاگرەدا ئەیان مرێنێ تکاکاران ئەچنە لایان هەر کەسەو دۆستی خۆی هەڵ ئەگرێ و ئەی نێژێ. یا فەرمووی: دەڕوێنەوە سەوز ئەبن لەناو ڕوباری ژیاندا، یان فەرمووی: (الحياه) یا فەرمووی: (الحيوان) یا فەرمووی: لەناو ڕووباری بەهەشت، ئەڕوێتەوە وەك دانەی دانەوێڵە کە لافاوی زۆر لەگەڵ خۆی ئەیهێنێ و ئەڕوێنێ ئەبو سەعید ئەڵێت: پاشان پێغەمبەر(ﷺ)فەرمووی: ئایا نابینن درەخت سەوز ئەبێت، پاشان زەرد ئەبێت، دووبارە سەوز ئەبێتەوە؟ ئەبو سەعید ئەڵێت: هەندێ کەس لەوێدا بون ووتیان: ئەڵێی پێغەمبەر(ﷺ)لەدەشتدا ژیاوە. ئیمامی ئەحمەد جارێکی تر لە ئەبو سەعیدی خودریەوە ڕیوایەتی کردوە کە وتویەتی: پێغەمبەر(ﷺ)فەرمووی: بەڵام ئەوانەی خەڵکی دۆزەخن هەر ئەمێننەوە تێیدا نەدەمرن و نەزیندوشن، یاوەك ئەفەرموێت: بەڵام کەسانێ بەهۆی تاوانەکانیانەوە تووشی ئاگر بوون، یا فەرمووی: بەهۆی هەڵەکانیانەوە ئەیان مرێنێ بەمردنێك، تا کاتێ ئەبن بە خەڵوز فەرمانی تکا کردن ئەدرێ، کۆمەڵ کۆمەڵ ئەیان هێنن، دابەشیان دەکەن بەسەر ڕووبارەکانی بەهەشتدا، ئەوترێ: ئەی خەڵکی بەهەشت! ئاو بکەن بەسەریاندا ئەڕوێنەوە وەك دانەی دانەوێڵە کە لافاوی زۆر دای ئەپێچێ و لەگەڵ خۆی ئەیهێنێ، ئەبو سەعید ئەڵێت: لەو کاتەدا پیاوێ لەو کۆمەڵە ئەڵێت: وەك ئەوەیە پێغەمبەر(ﷺ) لە دەشتدا ژیابێ موسلیمیش ڕیوایەتی کردووە.

قَدْ أَفْلَحَ مَن تَزَكَّىٰ ﴿١٤﴾ وَذَكَرَ ٱسْمَ رَبِّهِۦ فَصَلَّىٰ ﴿١٥﴾ بَلْ تُؤْثِرُونَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا ﴿١٦﴾ وَٱلْآخِرَةُ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰٓ ﴿١٧﴾ إِنَّ هَٰذَا لَفِى ٱلصُّحُفِ ٱلْأُولَىٰ ﴿١٨﴾ صُحُفِ إِبْرَٰهِيمَ وَمُوسَىٰ ﴿١٩﴾

**باسی كۆمەڵی سەرفراز**

خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿قَدْ أَفْلَحَ مَن تَزَكَّىٰ﴾ واتە: بە ڕاستی سەر فراز بوو ئەوەی كە خۆی پاك ڕاگرت. یانی: گیانی خۆی پاك كردەوە لە خوڕەوشتی ناشیرین، وە شوێنی ئەوەی كەخوا ناردی بۆ پێغەمبەر(ﷺ)كەوت.﴿وَذَكَرَ ٱسْمَ رَبِّهِۦ فَصَلَّىٰ﴾وەبیری پەروەردگاری خۆی كەوتەوەونوێژی كردبۆئەم ئایەتە﴿قَدْ أَفْلَحَ مَن تَزَكَّىٰ ﴿١٤﴾ وَذَكَرَ ٱسْمَ رَبِّهِۦ فَصَلَّىٰ﴾ قەتادە ئەڵێت: وە كاتی زەكاتی ماڵی خۆی داو خوای لە خۆی ڕازی كرد.

**دونیا هیچ نرخێكی نییە كە ڕۆژی دوایی لەدەست چوو**

پاشان خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿بَلْ تُؤْثِرُونَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا﴾ واتە: بەڵكو ئێوە ژیانی دونیا هەڵدەبژێرن، یانی: ئیشی دونیا پێش ئیشی ڕۆژی دوایی ئەخەن، وا ئەزانن قازانج و چاكەی لێ وەرئەگرن بۆ ژیانی دونیاو قیامەت ﴿وَٱلْآخِرَةُ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰٓ﴾ واتە: كەچی ژیانی دوا ڕۆژ باشترو پایە دارترە، یانی: پاداشتی خوا لەماڵی ئەو لا چاكترە لە دونیاو نەبڕاوەیە، چونكە دونیا بێنرخە و نامێنێت، ڕۆژی دوایی بەڕێزترە و ئەمێنێتەوە، چۆن خاوەن هۆش ئەوەی نامێنێ هەڵیدەبژێرێ بەسەر ئەوەی كە ئەمێنێتەوە؟! گرنگی ئەدات بەوەی كە جێی ئەهێڵێ و گرنگی نادات بە ماڵی ماوەو هەتاهەتایی؟! ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی كردوە لە عائیشەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) ئەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ)ئەفەرمووێت: دونیا شوێنی حەسانەوەیە بۆ كەسێ شوێنی نەبێ، داراییە بۆ كەسێ دارایی نەبێ، كۆی ئەكاتەوە بۆ دونیا كەسێ ئاوەز وعەقڵی نەبێ.

**نامەكانی ئیبراهیم و موسا**

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿إِنَّ هَٰذَا لَفِى ٱلصُّحُفِ ٱلْأُولَىٰ﴾ واتە: بێگومان ئەمەی باسكرا لەنامەی پێشوەكاندایە. ﴿صُحُفِ إِبْرَٰهِيمَ وَمُوسَىٰ﴾ واتە: نامەكانی ئیبراهیم و مووسا یانی: ئەم ئایەتە وەك ئەم ئایەتانە وایە لە سورەتی نەجمدا كە ئەفەرموێت﴿ أَمْ لَمْ يُنَبَّأْ بِمَا فِى صُحُفِ مُوسَىٰ ﴿٣٦﴾ وَإِبْرَٰهِيمَ ٱلَّذِى وَفَّىٰٓ ﴿٣٧﴾ أَلَّا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ ﴿٣٨﴾ وَأَن لَّيْسَ لِلْإِنسَٰنِ إِلَّا مَا سَعَىٰ ﴿٣٩﴾ وَأَنَّ سَعْيَهُۥ سَوْفَ يُرَىٰ ﴿٤٠﴾ ثُمَّ يُجْزَىٰهُ ٱلْجَزَآءَ ٱلْأَوْفَىٰ ﴿٤١﴾ وَأَنَّ إِلَىٰ رَبِّكَ ٱلْمُنتَهَىٰ﴾ واتە: وە بەوەی كەلە پەڕاوی موسادایە، وەئەو ئیبراهیمەی كە پەیامی خۆی بەچاكی بەجێ هێنا، لەو پەڕاوانەدا هاتوە، كە هیچ تاوانبارێك گوناهی تاوانبارێكی تر

هەڵناگرێت وە بێگومان ئادەمی جگە لە کۆششی خۆی خاوەنی هیچی تر نیە، بێگومان پاداشتی کۆششی خۆی لە داهاتوو وقیامەتدا دەبینێ، پاشان پاداشت دەدرێتەوە بەتێرو تەواوی، وە بە ڕاستی هەموو کارێك سەرەنجامەکەی بۆ لای پەروەردگارت دەگەڕێتەوە. ئەبولعالیە ئەڵێت: چیرۆکی ئەم سورەتە لە نوسراوە پێشینەکانیشدا هەیە. ئیبنو جەریر ئەمەی هەڵبژاردوەو ئەڵێ: مەبەست لەم ئایەتە: (إِنَّ هَٰذَا) ئیشارەتە بۆ ئەم ئایەتانە کە ئەفەرموێت: ﴿قَدْ أَفْلَحَ مَن تَزَكَّىٰ ﴿١٤﴾ وَذَكَرَ اسْمَ رَبِّهِ فَصَلَّىٰ ﴿١٥﴾ بَلْ تُؤْثِرُونَ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا ﴿١٦﴾ وَالْآخِرَةُ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰ ﴿١٧﴾ إِنَّ هَٰذَا لَفِي الصُّحُفِ الْأُولَىٰ ﴿١٨﴾ صُحُفِ إِبْرَاهِيمَ وَمُوسَىٰ﴾. ئا ئەمەی حەسەن هەڵیبژاردووە زۆر بەهێزە، ڕیوایەتیش کراوە لە قەتادەو ئیبنو زەیدو کەسانی تریشەوە کە هەمان رایان هەیە، والله أعلم.

## سورەتی (الغاشیە)

### لەمەککەدا هاتووەتەخوارەوە

### خوێندنی سورەتی ئەعلا و غاشیە لە نوێژی هەینیدا

لە پێشەوە باس کرا لە نوعمانی کوڕی بەشیرەوە: کە پێغەمبەر(ﷺ) ﴿سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الْأَعْلَى - هَلْ أَتَاكَ حَدِيثُ الْغَاشِيَةِ﴾ی لە نوێژی جەژن و هەینیدا ئەخوێند. ئیمامی مالیك ڕیوایەتی کردوە کە زەحاکی کوڕی قەیس پرسیاری کردوە لەنوعمانی کوڕی بەشیر ئاخۆ پێغەمبەر(ﷺ) چی خوێندوە لە ڕۆژی هەینیدا لەگەڵ سورەتی الجمعە دا؟ ئەڵێت: ﴿هَلْ أَتَاكَ حَدِيثُ الْغَاشِيَةِ﴾.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

﴿هَلْ أَتَاكَ حَدِيثُ الْغَاشِيَةِ ﴿١﴾ وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ خَاشِعَةٌ ﴿٢﴾ عَامِلَةٌ نَّاصِبَةٌ ﴿٣﴾ تَصْلَىٰ نَارًا حَامِيَةً ﴿٤﴾ تُسْقَىٰ مِنْ عَيْنٍ آنِيَةٍ ﴿٥﴾ لَّيْسَ لَهُمْ طَعَامٌ إِلَّا مِن ضَرِيعٍ ﴿٦﴾ لَّا يُسْمِنُ وَلَا يُغْنِي مِن جُوعٍ ﴿٧﴾﴾

خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿هَلْ أَتَاكَ حَدِيثُ الْغَاشِيَةِ﴾ واتە: ئایا پێت گەیشتوە باسی ڕۆژی دوایی، ﴿الْغَاشِيَةِ﴾یانی: داپۆشەر، ناوێکە لەناوەکانی ڕۆژی قیامەت. ئیبنو عەباس و قەتادە و ئیبنو زەید ئەڵێن: چونکە هەموو خەڵکی دادەپۆشێ وئەگرێتەوە. وە ئەفەرموێت: ﴿وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ خَاشِعَةٌ﴾ واتە: زۆر دەم و چاو لەو ڕۆژەدا زەلیل وریسواو شەرمەزارن. قەتادە ئەڵێت: یانی: داماوو سەرشۆڕن. ئیبنو عەباس ئەڵێت: بزرکاوەو کردەوەکانی بەکەڵکی نایەت. وە ئەفەرموێت: ﴿عَامِلَةٌ نَّاصِبَةٌ﴾ واتە: هەوڵدەرێکی ڕەنجە ڕۆن. یانی: کارێکی ئێجگار زۆریان کردوەو ماندوو بوون و چەوساونەتەوە و لە

قیامەتیشدا گرفتاری ئاگرێکی سوتێنەر دەبن. حافیزکە ئەبو بەکری بەرقانیە ڕیوایەتی کردوە لە ئەبا عیمرانی جەونیەوە ئەڵێت: عومەری کوڕی خەتتاب(خوا لێی ڕازی بێت) تێپەڕی بەلای پەرستگەی خواناسێکی گاوردا ئەڵێت: بانگی کرد، ئەی ڕاهیب! ئەی ڕاهیب! ئەویش لەسەرەوە سەیری کردن، ئەڵێت: عومەر سەیری ڕاهیبەکەی ئەکردو ئەگریا. پێی وترا: ئەی گەورەی موسڵمانان، بۆچی ئەمە ئەتگرێنێ؟ فەرمووی: بیری ئەم فەرمودەیەی خوام کردەوە لە قورئاندا کە ئەفەرموێ: ﴿عَامِلَةٌ نَّاصِبَةٌ ۝٣ تَصْلَىٰ نَارًا حَامِيَةً﴾ ئەمە ئەوە بوو گریاندمی. بوخاری ئەڵێت: ئیبنو عەباس ئەڵێت: ﴿عَامِلَةٌ نَّاصِبَةٌ﴾ یانی: گاور، عیکریمەو سوددی ئەڵێن: کارکردن لەدونیدا بە گوناهکردن، هۆی چەوسانەوە و سزاو تیاچوونە، لەناو ئاگردا وە ئەفەرموێت: ﴿تَصْلَىٰ نَارًا حَامِيَةً﴾ واتە: دەچنە ناو ئاگری هەرە گەرمەوە، ئیبنو عەباس و حەسەن و قەتادە ئەڵێن: یانی: گەرمایەکی گەرم ﴿تُسْقَىٰ مِنْ عَيْنٍ آنِيَةٍ﴾ واتە: ئاو دەدرێ لە سەرچاوەی لە کوڵ و هەرە گەرم. ئیبنو عەباس و موجاهیدو حەسەن و سوددی ئەڵێن: یانی: بەرزترین پلەی گەرماو کوڵان. وە ئەفەرموێت: ﴿لَّيْسَ لَهُمْ طَعَامٌ إِلَّا مِن ضَرِيعٍ﴾ واتە: خۆراکیان هەر دڕکی حوشتر خۆری ئاگرینە. عەلی کوڕی ئەبو تەلحە ئەڵێت: لە ئیبنو عەباسەوە: درەختێك لە ئاگر. ئیبنو عەباس و موجاهیدو عیکریمەو ئەبو جەوزاءو قەتادە وتویانە: ئەوە دڕکە شیلانە، قەتادە ئەڵێت: گیایەکە قوڕەیش لە بەهاردا پێی ئەڵێن (الشبرق)، وە لە هاویندا پێی ئەڵێن ووشتر خۆر (الضريع)، عیکریمە ئەڵێت: ئەوە درەختێکە دڕکاوی و لکاوە بەزەمیندا. بوخاری ئەڵێت: موجاهید ئەڵێت: (الضريع) سەوزبویەکە یا ڕوەکێکە پێی ئەوترێ (الشبرق)، خەڵکی حیجاز پێی ئەڵێن (الضريع) کاتێ ووشك ئەبێت کوشندەیە. عومەر لەقەتادەوە ئەڵێت: ﴿لَّيْسَ لَهُمْ طَعَامٌ إِلَّا مِن ضَرِيعٍ﴾ یانی: خراپترین و ناخۆشترین و پیسترین خواردن. وە ئەفەرموێت: ﴿لَّا يُسْمِنُ وَلَا يُغْنِي مِن جُوعٍ﴾ واتە: نە قەڵەوت دەکات و نەبرسێتی لا دەبات. یانی: هیچ سودێکی نیەو زیانیش ناگەڕەنێتەوە.

﴿وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَّاعِمَةٌ ۝٨ لِّسَعْيِهَا رَاضِيَةٌ ۝٩ فِي جَنَّةٍ عَالِيَةٍ ۝١٠ لَّا تَسْمَعُ فِيهَا لَاغِيَةً ۝١١ فِيهَا عَيْنٌ جَارِيَةٌ ۝١٢ فِيهَا سُرُرٌ مَّرْفُوعَةٌ ۝١٣ وَأَكْوَابٌ مَّوْضُوعَةٌ ۝١٤ وَنَمَارِقُ مَصْفُوفَةٌ ۝١٥ وَزَرَابِيُّ مَبْثُوثَةٌ ۝١٦﴾

### ژیانی خەڵکی بەهەشت لە ڕۆژی قیامەت دا

کاتێ خوا باسی ژیانی بەدبەختەکانی کرد، باس و ستایشی بەختەوەران ئەکاو ئەفەرموێت: ﴿وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَّاعِمَةٌ﴾ واتە: زۆر ڕوخسار لەو ڕۆژەدا پاراوەوجوان و گەشن. یانی: ڕۆژی قیامەت خۆشی پێوەدیارە، ئەمەیش بەهۆی کردەوەکانیەوەیە، وە ئەفەرموێت: ﴿لِّسَعْيِهَا رَاضِيَةٌ﴾واتە ڕازین لە کۆششی

خۆیان، سوفیان ئەڵێت: ﴿لِّسَعۡيِهَا رَاضِيَةٞ﴾ یانی: دڵخۆشە بە کردەوەکانی ﴿فِي جَنَّةٍ عَالِيَةٖ﴾ واتە: وان لە بەهەشتی بەرزو بڵنددا. یانی: بەهەشتی بەرزو ڕازاوە و چەندەها خانو لە ناو خانوی گەورەدا کە ئارام و بێترسن. ﴿لَّا تَسۡمَعُ فِيهَا لَٰغِيَةٗ﴾ واتە: قسەی هیچو پووچی تێدا نابیستن. یانی: لەو بەهەشتەی کە لە ناویدان هیچ قسەیەکی پڕوپووچ نابیستن. وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿لَّا يَسۡمَعُونَ فِيهَا لَغۡوًا إِلَّا سَلَٰمٗا﴾ واتە: بەهەشتیەکان لەبەهەشتدا هیچ ووتەو قسەیەکی بێ سود نابیستن تەنها سەلام کردن دەبیستن. وە ئەفەرموێت: ﴿لَّا لَغۡوٞ فِيهَا وَلَا تَأۡثِيمٞ﴾ واتە: نە قسەی پڕوپوچی تێدایەو نەگوناهکردن. وە ئەفەرموێت: ﴿لَا يَسۡمَعُونَ فِيهَا لَغۡوٗا وَلَا تَأۡثِيمًا ۝٢٥ إِلَّا قِيلٗا سَلَٰمٗا سَلَٰمٗا﴾ واتە: نابیستن لەو بەهەشتەدا نە قسەی بێهودە و نەتاوانبار کردن جگە لە ووتەی سڵاوو سەلام کردن لەیەکتری. وە ئەفەرموێت: ﴿فِيهَا عَيۡنٞ جَارِيَةٞ﴾ واتە: تێیدایە سەرچاوەی ڕوون و ڕەوان، ﴿جَارِيَةٞ﴾ یانی: زۆر ڕوون و ڕەوان. وە ئەمە نەکیرەیەو لە شێوەی ئیسپاتدایە، لێرەدا مەبەست بەیەك سەرچاوە وکانی نییە، بەڵکو جۆرەکانیەتی، یانی: سەرچاوەی زۆر ڕوون و ڕەوان. ڕیوایەت کراوە لە ئیبنو ئەبی حاتەمەوە لە ئەبو هورەیرەوە ئەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) ئەفەرمووێت: ڕووبارەکانی بەهەشت کە لە ژێر تەپۆڵکەکان وگردۆڵکەکان یا لەژێر کێوەکان هەڵ دەقوڵێ وفیچقە دەکات میسکن ﴿فِيهَا سُرُرٞ مَّرۡفُوعَةٞ﴾ واتە: تێیدایە زۆر قەنەفەو تەختی بەرز. یانی: لەسەر تەختی نەرم و پڕ فەرش و بەرزو ئەستوور کچی سپی جوانی چاو گەورەی لەسەرە. وتویانە: کاتێ دۆستێکی خودا ویستی لەسەر ئەو تەختە بەرزانە دابنیشێ هەموو ئەوانە لە خزمەتیاندان بە ڕێزەوە ﴿وَأَكۡوَابٞ مَّوۡضُوعَةٞ﴾ واتە: وە پەرداخی دانراو. یانی: پەرداخ و پیاڵە و ئەو شتانەی کە بۆ ئاو خواردنەوە بەکار دێن دانراون و ئامادە کراون بۆ ئەو کەسانەی ئارەزووی دەکەن. ﴿وَنَمَارِقُ مَصۡفُوفَةٞ﴾واتە: وە پشتی ڕیزکراو ئیبنو عەباس ئەڵێت: ﴿وَنَمَارِقُ﴾ یانی: پشتی یا پالگە. هەروەها عیکریمەو قەتادەو زەححاك و سوددی و سەوری و جگە لە ئەمانیش هەر وایان وتوە. وە ئەفەرموێت: ﴿وَزَرَابِيُّ مَبۡثُوثَةٌ﴾ واتە: وە قاڵی ڕاخراو لە هەموو لایەکەوە، ئیبنو عەباس ئەڵێت: (وَزَرَابِيُّ) یانی: ڕایەخ. زەححاك و کەسانی تریش هەر وایان وتوە. مانای (مَبۡثُوثَةٌ) یانی: لێرەو لەوی هەر کەسێ بیەوێ لەسەری دانیشێ ڕاخراوە.

﴿أَفَلَا يَنظُرُونَ إِلَى ٱلۡإِبِلِ كَيۡفَ خُلِقَتۡ (١٧) وَإِلَى ٱلسَّمَآءِ كَيۡفَ رُفِعَتۡ (١٨) وَإِلَى ٱلۡجِبَالِ كَيۡفَ نُصِبَتۡ (١٩) وَإِلَى ٱلۡأَرۡضِ كَيۡفَ سُطِحَتۡ (٢٠) فَذَكِّرۡ إِنَّمَآ أَنتَ مُذَكِّرٞ (٢١) لَّسۡتَ عَلَيۡهِم بِمُصَيۡطِرٍ (٢٢) إِلَّا مَن تَوَلَّىٰ وَكَفَرَ (٢٣) فَيُعَذِّبُهُ ٱللَّهُ ٱلۡعَذَابَ ٱلۡأَكۡبَرَ (٢٤) إِنَّ إِلَيۡنَآ إِيَابَهُمۡ (٢٥) ثُمَّ إِنَّ عَلَيۡنَا حِسَابَهُم (٢٦)﴾

**هاندان بۆ ڕامان لە وەدیهێنانی ووشترو ئاسمانەكان و كێوەكان و زەمین**

خودای گەورە فەرمان ئەكات بە بەندەكانی كە سەیری دروستكراوەكانی بكەن كە نیشانەیە لەسەر تواناو گەورەیی خۆی، ئەفەرموێت: ﴿أَفَلَا يَنظُرُونَ إِلَى ٱلۡإِبِلِ كَيۡفَ خُلِقَتۡ﴾ واتە: دەی بۆ وورد نابنەوە لە ووشتر كە چۆن دروستكراوە. بە ڕاستی دروست كراوێكی سەیرو پێكهاتەیەكی سەر سوڕهێنەری هەیە، زۆر بەهێزو بە توانایە، بەڵام نەرم و لەسەرخۆیە بۆ بارهەڵگرتن، كەسی لاوازو بێهێزیش هەڵی ئەسوڕێنێ و سواری ئەبێ، وە گۆشتەكەی ئەخورێ و تووكەكەی كەڵكی لێوەردەگیرێ و شیریشی ئەخورێتەوە. عەرەبەكان بەم شێوەیە ئاگادار كراونەتەوە چونكە زۆرینەیان ووشتریان بەكار هێناوە.

وە ئەفەرموێت: ﴿وَإِلَى ٱلسَّمَآءِ كَيۡفَ رُفِعَتۡ﴾ واتە: وە لە ئاسمان كە چۆن بەرز كراوەتەوە. شوریحی قازی وتویەتی: بمان بەنە دەرەوە تا سەیری ووشتر بكەین چۆن دروست كراوە و بڕوانینە ئاسمان كە چۆن بڵند كراوە؟ یانی: چۆن خوا بەرزی كردوەتەوە بەسەر زەمیندا بەو بەرزییە گەورەو فراوانە، وەك خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿أَفَلَمۡ يَنظُرُوٓاْ إِلَى ٱلسَّمَآءِ فَوۡقَهُمۡ كَيۡفَ بَنَيۡنَٰهَا وَزَيَّنَّٰهَا وَمَا لَهَا مِن فُرُوجٖ﴾ واتە: دەی ئایا سەرنجی ئەو ئاسمانەیان نەداوە كە لەسەریانەوەیە، چۆن دروستمان كردوەو ڕازاندومانەتەوە و هیچ درزو كەلێنێكی تێدا نییە. وە پاشان ئەفەرموێت: ﴿وَإِلَى ٱلۡجِبَالِ كَيۡفَ نُصِبَتۡ﴾واتە: وە لە شاخەكان كە چۆن داكوتراون و دامەزرێنراون. یانی: دامەزراوە و وەستاوەو چووە بەزەمیندا بۆ ئەوەی بەخەڵكەكەیەوە نەلەرزێت ونەڕوات، وە شتی بەكەڵك و كانزای تێدا داناوە. ﴿وَإِلَى ٱلۡأَرۡضِ كَيۡفَ سُطِحَتۡ﴾ واتە: وە لە زەوی كە چۆن ڕاخراوە. یانی: تەخت كراوە و ڕاخراوەو كراوە بە ڕایەخ؟ ئەمانە هەموو بۆ ئەوەیە تا دەشتەكان و ئەو شتانە كە ئەیبینن وەك ئەو ووشترانەی كە بۆ سواری بەكاری ئەهێنن و ئەو ئاسمانەی كە لە سەر سەریانەو ئەو كەژانەی كە بەرەو ڕووی ئەچن و ئەوزەمینەی كەلەژێریانایە، بیكەنە نیشانە لەسەر توانایی ئەو وەدیهێنەرو دروستكەرە، كە پەروەردگاری گەورەو وەدیهێنەرو پاشاو كاربەدەستە، وە هەر ئەو خودایە و هیچ كەس شایەنی پەرستن نییە ئەو نەبێت.

**چیرۆكی زەمامی كوڕی سەعلەبە**

ئاواو بەم شێوەیە زەمام سوێند ئەخوات لەو پرسیارەی كە لە پێغەمبەری كرد(ﷺ) كە ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی كردوە لەسابتەوە ئەویش لە ئەنەسەوە ئەڵێت: ئێمە قەدەغەكرا بوو لێمان كە

پرسیار لە پێغەمبەر(ﷺ) بکەین دەربارەی هیچ شتێك! بۆیە حەزمان ئەکرد پیاوێکی ژیر لە خەڵکی لادێنشینەوە دەشتەکی بێت و پرسیار لە پێغەمبەر(ﷺ) بکات و ئێمەش گوێی بۆ بگرین، پیاوێکی دەشتەکی هات و ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا بەڕاستی نێردراوێکی تۆ هاتە لامان پێی وتین: تۆ فەرمووتە کە خودا تۆی ناردووە؟ فەرمووی: ڕاستی وتوە، وتی: کێ ئاسمانی دروست کردوە؟ فەرمووی خودا. وتی: کێ ئەم کەژانەی دامەزراندوە و ئەو شتانەی تێدا داناوە؟ فەرمووی: خودا. وتی: تۆو ئەو خودایەی ئەم ئاسمان و زەمینەی دروستکردوە و ئەم کەژانەی دامەزراندوە، ئایا خوا تۆی ناردووە؟ فەرمووی: بەڵێ. وتی: ڕاسپێراوەکەت ئەڵێ: لە شەوو ڕۆژ مانا پێنج نوێژمان لەسەرە بیکەین؟ فەرمووی: ڕاست ئەڵێ. وتی: تۆو ئەو کەسەی تۆی ناردوە ئایا خوا فەرمانی پێداوی بەمە؟ فەرمووی: بەڵێ. وتی: ڕاسپێراوەکەت ئەڵێ: زەکاتی ماڵ و سامانتان لەسەرە، ئەبێ بیدەن؟ فەرمووی: (ڕاست ئەکات). وتی: سا توو ئەو خوایە کە تۆی ناردووە خوا فەرمانی ئەمەی پێداویت؟ فەرمووی: بەڵێ. وتی: ڕاسپێراوەکەت ئەڵێ: حەجی ماڵێ خوامان لەسەرە هەر کەسێ بیبێ بتوانێ بڕوات؟ فەرمووی: ڕاست ئەکات. ئەنەس ئەڵێت: پاشان ڕۆشت و ئەڵێت: سوێند بەو خوایەی تۆی ناردوە بە هەق نەهیچیان لێ زیاد ئەکەم نەهیچیان لێ کەم ئەکەم. پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەگەر ڕاست بکات ئەچێتە بەهەشت. ئیمامی بوخاری و موسلیم و ئەبو داود و تیرمیزی ونەسائی و ئیبنو ماجە ڕیوایەتیان کردوە.

**پێغەمبەر( ﷺ ) ئاگادار کردنەوە نەبێت هیچی تری لەسەر نیە**

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿فَذَكِّرۡ إِنَّمَآ أَنتَ مُذَكِّرٞ﴾ واتە: ساتۆ ئامۆژگاری بکە تۆ تەنها ئامۆژگاریکەری. ﴿لَّسۡتَ عَلَيۡهِم بِمُصَيۡطِرٍ﴾ واتە: تۆدەسەلاتدارنیت بەسەریاندا. یانی: ئەی موحەممەد(ﷺ) ئامۆژگاریان بکە بەوەی پێی نێرراوی بۆیان﴿فَإِنَّمَا عَلَيۡكَ ٱلۡبَلَٰغُ وَعَلَيۡنَا ٱلۡحِسَابُ﴾ واتە: بێگومان تۆ هەر ڕاگەیاندت لەسەرەو لێپرسینەوەش لەسەر ئێمەیە، بۆیە ئەفەرموێت: ﴿لَّسۡتَ عَلَيۡهِم بِمُصَيۡطِرٍ﴾ ئیبنو عەباس و موجاهیدو کەسانی تریش وتویانە: تۆ زۆردارێك نیت لەسەریان. یانی: تۆ ناتوانی باوەڕ لە دڵیاندا دروست بکەی، ئیبنو زەید ئەڵێت: تۆ نابێت ئەو کەسە بیت کە بەزۆر باوەڕیان پێ بێنی. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە جابیرەوە ئەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) ئەفەرمووێت: فەرمانم پێکراوە کە بجەنگم لەگەڵ خەڵکا تا ئەڵێن(لا إله إلا الله) کاتێ وتیان: خوێنیان و سامانیان پارێزراوە لە منەوە مەگین بەهەقی خۆی، لێپرسینەوە شیان لای خوای گەورە، پاشان فەرمووی: ﴿فَذَكِّرۡ إِنَّمَآ أَنتَ مُذَكِّرٞ ۝٢١ لَّسۡتَ عَلَيۡهِم بِمُصَيۡطِرٍ﴾ هەر بەم شێوەیە موسلیم لە کتێبی باوەڕداو(كتاب الايمان)

تیرمیزی و نەسائی لە کتێبی تەفسیری هەردوو سونەنەکەیاندا ڕیوایەتی کردووە. ئەم فەرموودەیە لە هەردوو سەحیحەکە (البخاری و مسلم) دا هاتووە.

**هەڕەشە لەو کەسەی ڕوو وەرئەگێڕێ لەهەق (ڕاستی)**

خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ إِلَّا مَن تَوَلَّىٰ وَكَفَرَ ﴾ واتە: بەلام ئەو کەسەی کە پشت هەلکاو بێبڕوا بێت. یانی: پشت هەلکاو ئیش ناکات بە پایەکانی ئیسلام و باوەڕی بەهەق نەبێ بەدڵ وزمان. ئەمە وەك ئەم فەرمودەیەی خودا وایە کە ئەفەرموێت: ﴿فَلَا صَدَّقَ وَلَا صَلَّىٰ ﴿٣١﴾ وَلَٰكِن كَذَّبَ وَتَوَلَّىٰ﴾ واتە: جاکافر نەبڕوای هێناو نە نوێژی کرد، بەلکو ئاینی بەدرۆ دەزانی و پشتی تێدەکرد، بۆیە فەرموویەتی: ﴿ فَيُعَذِّبُهُ اللَّهُ الْعَذَابَ الْأَكْبَرَ ﴾ واتە: ئەو کەسە خوا سزای دەدات بەسزای زۆر گەورە ﴿ إِنَّ إِلَيْنَا إِيَابَهُمْ ﴾ واتە: بێگومان هەر بۆلای ئێمەیە گەڕانەوەیان، یانی: دێنەوە و دەگەڕێنەوە﴿ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا حِسَابَهُم﴾ واتە: لە پاشان بە ڕاستی لەسەر ئێمەیە لێپرسینەوەیان. یانی: لەدواییدا خۆمان بەکاریان ڕادەگەین و لە کارەکانیان ئەپرسینەوەو پاداشتیان ئەدەینەوە، چاکە بە چاکەو خراپەیش بە خراپە.

**سورەتی (لفجر)**

**لەمەککەدا هاتووەتە خوارەوە**

**خوێندنی سورەی فەجر لە نوێژدا**

نەسائی ڕیوایەتی کردوە لە جابیرەوە وە ئەڵێت: موعاز نوێژێکی کرد، پیاوێك هات و نوێژی لەگەڵ کردن درێژەی دا بە نوێژەکەو پیاوەکەش نوێژەکەی بڕی، لەلایەکی مزگەوتەکەدا نوێژی خۆی کردو پاشان چووە دەرەوە، ئەمەیان بۆ موعاز گێڕایەوە موعاز وتی: کابرایەکی دووڕوە. ئەمەیان بۆ پێغەمبەر(ﷺ) باس کرد، پێغەمبەریش (ﷺ) پرسیاری لە پیاوەکە کرد، پیاوەکە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) هاتم نوێژ بکەم لە گەڵیدا درێژی کردەوە لەسەرم، منیش ڕۆشتم لەلایەکی مزگەوتەکەدا نوێژم کردو ئالفم دا بە وولاخەکەم. پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: تۆ سەر لەخەلك ئەشێوێنی ئەی موعاز؟ بۆ وادەکەی؟ ﴿سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الْأَعْلَى - وَالشَّمْسِ وَضُحَاهَا - وَاللَّيْلِ إِذَا يَغْشَىٰ﴾ بخوێنە، یانی: ئەم سورەتانە بخوێنە.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

﴿وَالْفَجْرِ ﴿١﴾ وَلَيَالٍ عَشْرٍ ﴿٢﴾ وَالشَّفْعِ وَالْوَتْرِ ﴿٣﴾ وَاللَّيْلِ إِذَا يَسْرِ ﴿٤﴾ هَلْ فِي ذَٰلِكَ قَسَمٌ لِّذِي حِجْرٍ ﴿٥﴾ أَلَمْ تَرَ كَيْفَ فَعَلَ رَبُّكَ بِعَادٍ ﴿٦﴾ إِرَمَ ذَاتِ الْعِمَادِ ﴿٧﴾ الَّتِي لَمْ يُخْلَقْ مِثْلُهَا فِي الْبِلَادِ ﴿٨﴾ وَثَمُودَ الَّذِينَ جَابُوا الصَّخْرَ بِالْوَادِ ﴿٩﴾ وَفِرْعَوْنَ

ذِى ٱلْأَوْتَادِ (١٠) ٱلَّذِينَ طَغَوْا۟ فِى ٱلْبِلَـٰدِ (١١) فَأَكْثَرُوا۟ فِيهَا ٱلْفَسَادَ (١٢) فَصَبَّ عَلَيْهِمْ رَبُّكَ سَوْطَ عَذَابٍ (١٣) إِنَّ رَبَّكَ لَبِٱلْمِرْصَادِ (١٤)﴾

خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَٱلْفَجْرِ﴾ واتە: سوێند بەبەرەبەیان. ﴿وَلَيَالٍ عَشْرٍ﴾ واتە: وە بە دەشەوەی ئەوەڵی مانگی قوربان. بەڵام فجر دیارە کە ئەویش بەرەبەیانە. عەلی و ئیبنو عەباس و عیکریمەو موجاهیدو سوددی ئەمە ئەڵێن. لە مەسروق و موحەممەدی کوڕی کەعبەوە گوازراوەتەوە کە ئەڵێن: مەبەست بە فجر ڕۆژی قوربانیە بە تایبەتی، کە ئەوەش کۆتایی شەوانی دەیە. مەبەستیش بە شەوانی دە، دەی زیلحەجەیە. وەك ئیبنو عەباس و ئیبنو زوبەیر و موجاهید وجگە لەمانیش پێشینان و ئەوانەی دوای ئەمانیش وایان وتوە. لەسەحیحی بوخاریدا هاتوە لە ئیبنو عەباسەوە بەرز بووەتەوە، هیچ ڕۆژێك نیە کردەوەی چاك خۆشەویستتر بێ تیایدا لەلای خودا لەم ڕۆژانە، یانی: دەی زیلحەجە وتیان: ئەتێکۆشانیش لە ڕێگای خوادا؟ فەرمووی: ئەتێکۆشانیش لە ڕێگای خوادا، مەگین پیاوێك بە خۆیی و سامانیەوە بڕوات و پاشان نەگەڕێتەوە بەهیچ شتێکەوە کە پێی بووە، ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لەجابیرەوە ئەویش لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرموویەتی: بێگومان ئەم دەیە دەی جەژنی قوربانە، تاکیش (الوتر) ڕۆژی عەرەفەیە، جوتیش(الشفع) ڕۆژی جەژن وقوربانیە، نەسائیش ڕیوایەتی کردووە. ئەم فەرمودەیە لە سەنەدەکەیدا کەسانی خراپ نین،لای من مەتنەکەی لەبەرز کردنەوەیدا نارێکی پێوە دیارە والله أعلم. وە ئەفەرموێت: ﴿وَٱلشَّفْعِ وَٱلْوَتْرِ﴾ وە بە جووت و تاك، لەم فەرموودەیەی پێشەوە باسکرا کە تاك ڕۆژی عەرەفەیە و جووتیش ڕۆژی قوربانییە لەبەر ئەوە دەهەمە. ئیبنو عەباس و عیکریمەو زەححاکیش هەر وایان وتوە. وە لە مانایانەدا تەفسیری تریش وتراوە.

خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَٱلَّيْلِ إِذَا يَسْرِ﴾واتە: وە سوێند بە شەوگار کاتێك تێئەپەڕێت عەوفی لە ئیبنو عەباسەوە ئەگێڕێتەوە کە ﴿يَسْرِ﴾یانی: کاتێ ڕۆیشت. عەبدوڵلای کوڕی زوبەیر ئەڵێت: ﴿وَٱلَّيْلِ إِذَا يَسْرِ﴾تا هەندێکی لا ئەبات، موجاهید و ئەبو عالیە وقەتادە و مالیك لە زەیدی کوڕی ئەسلەم وئیبنو زەیدەوە ڕیوایەت ئەکەن وئەڵێن: ﴿وَٱلَّيْلِ إِذَا يَسْرِ﴾یانی: کاتێ ڕۆیشت.وە ئەفەرموێت: ﴿هَلْ فِى ذَٰلِكَ قَسَمٌ لِّذِى حِجْرٍ﴾واتە: ئایا ئەمانەی سوێندیان پێ خورا شایستەی سوێند پێخواردن نین لای کەسی تێگەیشتوو؟ یانی: لای خاوەن بیر و هۆش و ئاوەز و خاوەن ئاین. بۆیە ئاوەز ناو نراوە دیوار(الحجر) چونکە مرۆڤ ئەگێڕێتەوە لە هەندێ کردارو گوفتار کە جوان نیە و ناشێ بۆی. وە بە دیواری خانوو ئەوترێ (حجر) چونکە هەرشتێ بە دەوریدا بڕوات و بیەوێت پیایدا سەرکەوێ ناتوانێ. لەبەر بەرزی و بەهێزی دیوارەکە. هەروەها ئەوترێت: دیواری یەمامەو وە بە قەدەغە خستنە سەر هەڵسوکەوتی

کەسێ لەلایەن داد وەرەوە ئەوترێت: (حجر الحاکم علی فلان) کاتێ نایەڵێ هیچ کارێ بکات لە خۆیەوە ﴿وَيَقُولُونَ حِجْرًا مَّحْجُورًا﴾ واتە: وە دەڵێن: پەنامان بدەن بە پەنا دانێکی پارێزراو، ئەمانە هەموو وەك یەکن. ماناکانیان نزیکە لە یەکەوە. وە ئەم سوێندانەی کە بە کاتەکانی خواناسی، وە بە عیبادەتەکە خۆی خوراوە وەك حەج و نوێژو هەر خواناسینێکی تر کە جۆرێکە لەو شتانەی کە بەندەکانی خوا بەهۆیەوە نزیك ئەبنەوە لە خوا ئەو بەندە پارێزگارو گوێڕایەڵانەی کە لێی ئەترسن و مل کەچ ئەکەن و سەر دائەنەوێنن لەبەر خاتری گەورەیی ئەو.

**باسی لەناو بردنی عاد**

کاتێ خوای گەورە باسی خواناسی و گوێڕایەڵی باوەڕدارانی کرد، پاشان ئەفەرموێت: ﴿أَلَمْ تَرَ كَيْفَ فَعَلَ رَبُّكَ بِعَادٍ﴾ واتە: ئایا نابینن کە پەروەردگاری تۆ چی کرد بە گەلی عاد. ئەوانەی کە یاخی و بێگوێ و زۆردار بوون و دەرچووبوون لە فەرمانی خواو پێغەمبەرەکانی درودی خوایان لەسەر بێت خودایان بە درۆ دائەنا و باوەڕیان بە نوسراوەکانی نەئەکرد. خودا خۆی باسی ئەکات چۆن قڕی کردن و تێکو پێکی شکاندن و کردنی بە پەند و ئامۆژگاری وەك ئەفەرموێت: ﴿أَلَمْ تَرَ كَيْفَ فَعَلَ رَبُّكَ بِعَادٍ ۝٦ إِرَمَ ذَاتِ الْعِمَادِ﴾ واتە: نابینی پەروەردگارت چی هێنا بەسەر عاددا؟ ئیرەم! خاوەنی پایە و دەسەلات. ئیرەم هۆزی عادە یەکەم بوون، منداڵی عادی کوڕی ئیرەمی کوڕی ئیرەمی عەوصی کوڕی سامی کوڕی نوح بوون(سەلات و سەلامی خوایان لێبێت) ئیبنو ئیسحاق ئەم قسەیە ئەکات. ئەمانە ئەوانە بوون کە خوای گەورە پێغەمبەر هودی(سەلامی خوای لێبێت) بۆ ڕەوانە کردن، بەڵام ئەوان باوەڕیان پێنەکرد و دژایەتیان کرد. خوای گەورەش هودو ئەوانەی باوەڕیان پێی بوو لە هۆزەکەی ڕزگاری کردن و ئەوانیشی قڕ کرد بە بایەکی سارد و بەهێز ﴿سَخَّرَهَا عَلَيْهِمْ سَبْعَ لَيَالٍ وَثَمَانِيَةَ أَيَّامٍ حُسُومًا فَتَرَى الْقَوْمَ فِيهَا صَرْعَىٰ كَأَنَّهُمْ أَعْجَازُ نَخْلٍ خَاوِيَةٍ ۝٧ فَهَلْ تَرَىٰ لَهُم مِّن بَاقِيَةٍ﴾ واتە: خوا بایەکی زاڵ کرد بەسەریاندا حەوت شەوو هەشت ڕۆژ بەبێ ووچان لەناوی بردن ئەو گەلەت دەبینی لەو ماوەیەدا بێگیان کەوتبوون وەك قەدی داری خورمای ناو ڕزیوو، ئایا کەس دەبینیت لەوان کە مابێتەوە؟ خودا چیرۆکی ئەمانەی لە قورئاندا بۆ باس کردوین لە چەند جێگە بۆ ئەوەی کە مسوڵمانان پەند لەو قڕ کردنەیان وەربگرن.وە ئەفەرموێت: ﴿إِرَمَ ذَاتِ الْعِمَادِ﴾ چونکە ئەوان لە ماڵێکدا دەژیان لە کوڵك و موو دروست کرابوو کە بە ئەستوونی گەورەو بەهێز بەرز ئەبوەوە. ئەمانیش لە بەهێز ترین و بە توانا ترین دەسەلات داری ئەو کاتەی خۆیان بوون، بۆیە هوود پێغەمبەر(سەلامی خوای لێبێت) باسی ئەو بەهرەیان بۆ ئەکات و ڕێنمونیان ئەکات کە ئەو بەهرانە لە خوا پەرستی ئەو خودایەدا کە دروستی کردوون بەکار بهێنن. وە

ئەفەرموێت: ﴿وَٱذْكُرُوٓاْ إِذْ جَعَلَكُمْ خُلَفَآءَ مِنۢ بَعْدِ قَوْمِ نُوحٍ وَزَادَكُمْ فِى ٱلْخَلْقِ بَصْۜطَةً فَٱذْكُرُوٓاْ ءَالَآءَ ٱللَّهِ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾واتە: وە بیری چاکەکانی خوا بکەنەوە کاتێ کە ئێوەی کرد بە جێنشین لە پاش گەلی نوح و لەش و قەلافەتی ئێوەی لەوان گەورەتر دروست کردووەو بیر لە بەهرەکانی خوا بکەنەوە بۆ ئەوەی ڕزگارتان ببێ﴿ فَأَمَّا عَادٌ فَٱسْتَكْبَرُواْ فِى ٱلْأَرْضِ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ وَقَالُواْ مَنْ أَشَدُّ مِنَّا قُوَّةً أَوَلَمْ يَرَوْاْ أَنَّ ٱللَّهَ ٱلَّذِى خَلَقَهُمْ هُوَ أَشَدُّ مِنْهُمْ قُوَّةً﴾ واتە: ئینجا گەلی عاد بە ناڕەوا خۆیان بە گەورە زانی لە زەویدا وە وتیان: کێ لە ئێمە بەهێزترە ؟ ئایا نەیان ئەزانی کە بێگومان ئەو خوایەی کە ئەوانی دروست کردووە ئەو لەوان بە هێزترە. وە لێرەدا ئەفەرموێت: ﴿ٱلَّتِى لَمْ يُخْلَقْ مِثْلُهَا فِى ٱلْبِلَـٰدِ﴾واتە: کە وێنەیان دروست نەکرابوو لە هەموو وڵاتدا، یانی: ئەو هۆزەی کە وێنەیان لەو شارانەدا نە هاتووە بۆ توانا و بە هێزی و گەورەیی بەژن و بالآیان. موجاهیدئەڵێت: ئیرەم هۆزێکی زۆر کۆنن یانی هۆزی عادی یەکەم،قەتادەی کوڕی دیعامە و سودیئەڵێن: ئیرەم: ماڵ و شوێنی هۆزی عادە. ئەمە قسەیەکی جوان و باش و بەهێزە. وە ئەفەرموێت: ﴿ٱلَّتِى لَمْ يُخْلَقْ مِثْلُهَا فِى ٱلْبِلَـٰدِ﴾ ئیبنو زەید زەمیری(ها)کەی گەڕاندۆتەوە بۆ ئەستونەکان لەبەر بەرزیان و ئەڵێن: ئەستونەکانیان لە دنیی ئەحقافدا دروست کرد کەوێنەیان لە شاراندا دروست نەکرابوو. بەلآم قەتادەو ئیبنو جەریر زەمیرەکە ئەگێڕنەوە بۆ هۆزەکە. یانی: لە وێنەی ئەم هۆزە لە شاراندا دروست نەکرابوو لەو کاتەدا. ئەم قسەیە زۆر ڕاستە. قسەکەی ئیبنو زەید و ئەوانەیشی کەلەسەر ڕای ئەون لاوازە چونکە ئەگەر مەبەست قسەکەی ئەوان بوایە ئەی فەرموو(لم یعمل)وێنەی نەکراوە لە شاراندا، کەچی ئەفەرموێت: ﴿لَمْ يُخْلَقْ مِثْلُهَا فِى ٱلْبِلَـٰدِ﴾وە ئەفەرموێت: ﴿وَثَمُودَ ٱلَّذِينَ جَابُواْ ٱلصَّخْرَ بِٱلْوَادِ﴾ واتە: وەچی کرد بە گەلی سەموود ئەوانەی کە شاخی بەردیان دەتاشی لە شیوو دۆڵەکاندا. یانی: بەردیان هەڵئەکەند لەو شیوو دۆڵانەدا. ئیبنو عەباس ئەڵێت: ئەیان تاشی و هەڵیان ئەکۆڵی. موجاهید و قەتادە و زەحاك و ئیبنو زەید یش هەروایان وتووە. ئەوەتا خوای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَتَنْحِتُونَ مِنَ ٱلْجِبَالِ بُيُوتًا فَٰرِهِينَ﴾ واتە: وە لە چیاکاندا خانوو دادەتاشن بە خۆشی و شادمانی.

### باسی فیرعەون

خوای گەورەئەفەرموێت: ﴿وَفِرْعَوْنَ ذِى ٱلْأَوْتَادِ﴾واتە: وە فیرعەونی خاوەن سنگی زۆر وەك ئەهرامەکان کە وەك مێخ و سنگ چون بە زەویدا. عەوفی لە ئیبنو عەباسەوە ئەیگێڕێتەوە کە وتوویەتی: ﴿ٱلْأَوْتَادِ﴾ یانی: ئەو لەشکرەی کە کارو بارەکانیان بۆ فیرعەون بە توندو تۆڵی بەجێ دەهێنا. وە ئەڵێن: ﴿ٱلْأَوْتَادِ﴾یانی: ئەو مێخە ئاسنینانەی کە فیرعەون دەست و قاچی خەڵکی

پێنەبەستەوەو هەڵی ئەواسین. هەروەهاموجاهیدیش ئەڵێت: خەڵکی ئەبەسترایەوە بەو مێخانەوە: سەعیدی کوڕی جوبەیروحەسەن وسودی یش هەروایان وتووە. پاشان ئەفەرموێت: ﴿ٱلَّذِينَ طَغَوْا۟ فِى ٱلْبِلَـٰدِ﴾ واتە: ئەوانەی کە یاخی بوون لە ولاتدا﴿فَأَكْثَرُوا۟ فِيهَا ٱلْفَسَادَ﴾ واتە: وە زۆریان خراپە تێدا کرد. یانی: یاخی و بێگوێ بوون و دەستیان دایە خراپە و بەدڕەوشتی و سزادانی خەڵکی لە زەمیندا﴿فَصَبَّ عَلَيْهِمْ رَبُّكَ سَوْطَ عَذَابٍ﴾ واتە: ئینجا پەروەردگاری تۆ دایگرتنەوە بەر قەمچی سزا. یانی: سزایەکیان بۆ ڕەوانە ئەکات لە ئاسمانەوەو سزا یەکیان ئەدات کە تاوان باران هەرگیز لێی دەرباز نابن.

## پەروەردگار لە کەمیندایە

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿إِنَّ رَبَّكَ لَبِٱلْمِرْصَادِ﴾واتە: بەڕاستی پەروەردگاری تۆ لە کەمیندایە بۆ ستەمکاران ئیبنو عەباس ئەڵێت: دەبیسێ و دەبینێ. یانی: ئەوەی وەدی هێنراوەکانی ئەیکەن خودا ئەیبینێ و پاداشتی هەمووی بە پێی تێکۆشانی لە دونیا و لە ڕۆژی دواییدا ئەداتەوە. ئەوەی کە خوا دروستی کردووە هەمووی ئامادە ئەکات بە داد پەروەری خۆی فەرمانیان بۆ دەر ئەکات و هەموو کەسێ شایەنی چی بێ وەری ئەگرێ و خودا پاکە و دورە لە ناهەقی و ستەم.

﴿فَأَمَّا ٱلْإِنسَـٰنُ إِذَا مَا ٱبْتَلَىٰهُ رَبُّهُۥ فَأَكْرَمَهُۥ وَنَعَّمَهُۥ فَيَقُولُ رَبِّىٓ أَكْرَمَنِ ﴿١٥﴾ وَأَمَّآ إِذَا مَا ٱبْتَلَىٰهُ فَقَدَرَ عَلَيْهِ رِزْقَهُۥ فَيَقُولُ رَبِّىٓ أَهَـٰنَنِ ﴿١٦﴾ كَلَّا ۖ بَل لَّا تُكْرِمُونَ ٱلْيَتِيمَ ﴿١٧﴾ وَلَا تَحَـٰٓضُّونَ عَلَىٰ طَعَامِ ٱلْمِسْكِينِ ﴿١٨﴾ وَتَأْكُلُونَ ٱلتُّرَاثَ أَكْلًا لَّمًّا ﴿١٩﴾ وَتُحِبُّونَ ٱلْمَالَ حُبًّا جَمًّا ﴿٢٠﴾﴾

دەوڵەمەندی و هەژاری تاقی کردنەوەیە و ڕێز یا بێڕێزی نیە لە خوداوە بۆ بەندە، خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿فَأَمَّا ٱلْإِنسَـٰنُ إِذَا مَا ٱبْتَلَىٰهُ رَبُّهُۥ فَأَكْرَمَهُۥ وَنَعَّمَهُۥ فَيَقُولُ رَبِّىٓ أَكْرَمَنِ﴾واتە: جا کاتێك کە خودا ئادەمی تاقی کردەوەو ڕێزی گرت و نازو نیعمەتی بەسەردا ڕشت ئەوە دەڵێ پەروەردگارم ڕێزی گرتووم ﴿وَأَمَّآ إِذَا مَا ٱبْتَلَىٰهُ فَقَدَرَ عَلَيْهِ رِزْقَهُۥ فَيَقُولُ رَبِّىٓ أَهَـٰنَنِ﴾واتە: وە ئەگەر تاقی کردەوەو ڕۆزی کەم پێدا ئەوسا ئەڵێ پەروەردگارم ڕیسوای کردووم. خوا ئینکاری ئەم جۆرە بیرو بۆچونەی مرۆڤ ئەکات و ڕازی نیە پێی، هەرکاتێ بژێوی فراوان کرد ئەو کەسە وادەزانێ کە خودا ڕێی گرتووە، نەخێر ئەمە وانیە، بەڵکو ئەوە تاقی کردنەوەیە و ئەیخاتە ئەزمونەوە. وەك ئەفەرموێت: ﴿ أَيَحْسَبُونَ أَنَّمَا نُمِدُّهُم بِهِۦ مِن مَّالٍ وَبَنِينَ ﴿٥٥﴾ نُسَارِعُ لَهُمْ فِى ٱلْخَيْرَٰتِ ۚ بَل لَّا يَشْعُرُونَ﴾وە هەروەها لەم لایشەوە کاتێ خودا ئەیخاتە ئەزمونەوە و تاقی ئەکاتەوەو بژێوی لێ کەم ئەکاتەوە وا تێدەگات ئەمە سوکایەتیە لەلایەن خوداوە پێی دەکرێ.

وەك خودا ئەفەرموێت﴿كَلَّا﴾واتە: نا وانیە، كە ئێوە بیری لێدەكەنەوە. یانی: بەو شێوەیەی كە تێئەگەن، نە بەم لاو نە بەو لادا، چونكە خودا سامان ئەدات بەوەی خۆشی ئەوێ و بەوەیشی خۆشی ناوێ، وە سامان كەم ئەكاتەوە لەوەی خۆشی ئەوێ و لەوەی كە خۆشی ناوێ،بەڵكو ئەم كارەی خودا دەوڵەمەندی كردن یان هەژار خستنی بەندەكانی بەدەوری یەك تەوەرەدا ئەسوڕێتەوە كە بە جێهێنانی فەرمانی خواو ڕەزامەندی ئەوە، بۆ ئەوەی كە كاتێ دەوڵەمەند بوو سوپاسی خوا بكات لەسەری و كاتێكیش هەژار بوو ئارام بگرێ.

## خراپ ترین شتێك كە بەندە ئەیكات بە هۆی ماڵ و سامانەوە

خودا ئەفەرموێت: ﴿كَلَّا بَل لَّا تُكْرِمُونَ الْيَتِيمَ﴾ واتە: نا وانیە كەئێوە بیری لێدەكەنەوە، بەڵكو ئێوە ڕێزی هەتیوان ناگرن. ئەبو داود لە سەهلەوەیانی: ئیبنو سەعید ئەیگێڕێتەوە كە وتویەتی: پێغەمبەر(ﷺ)فەرمویەتی(من و بەخێوكەری هەتیوو وەك ئەم دوو پەنجەیە واین لە بەهەشتا).دوو پەنجەی خستە پاڵ یەك: پەنجەی ناوەڕاست و ئەو پەنجەیەی لە دوای پەنجە گەورەوە دێت. پاشان خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَلَا تَحَاضُّونَ عَلَىٰ طَعَامِ الْمِسْكِينِ﴾ واتە: وە هانی یەكتری نادەن لەسەر خواردەمەنی دان وبەخێوكردنی هەژاران. یانی: فەرمان نادەن بە چاكە كردن بە هەژاران و نەداران، هانی یەكتری نادەن لەسەری﴿وَتَأْكُلُونَ التُّرَاثَ أَكْلًا لَّمًّا﴾واتە: بەڵكو سەرەڕای ئەمەش بەشە میراتی بەشداران هەمووی بە هەڵپە دەخۆن، یانی: لەهەر شوێنێكەوە میراتیان دەست بكەوێ حەڵاڵ بێ یان حەرام دەیخۆن،وە ئەفەرموێت: ﴿وَتُحِبُّونَ الْمَالَ حُبًّا جَمًّا﴾واتە: وە ماڵ و سامانتان خۆش دەوێ بە خۆشویستنێكی زۆر. هەندێك لە زانایان ئەڵێن ئێجگار زۆر.

﴿كَلَّا إِذَا دُكَّتِ الْأَرْضُ دَكًّا دَكًّا (٢١) وَجَاءَ رَبُّكَ وَالْمَلَكُ صَفًّا صَفًّا (٢٢) وَجِيءَ يَوْمَئِذٍ بِجَهَنَّمَ ۚ يَوْمَئِذٍ يَتَذَكَّرُ الْإِنسَانُ وَأَنَّىٰ لَهُ الذِّكْرَىٰ (٢٣) يَقُولُ يَا لَيْتَنِي قَدَّمْتُ لِحَيَاتِي (٢٤) فَيَوْمَئِذٍ لَّا يُعَذِّبُ عَذَابَهُ أَحَدٌ (٢٥) وَلَا يُوثِقُ وَثَاقَهُ أَحَدٌ (٢٦) يَا أَيَّتُهَا النَّفْسُ الْمُطْمَئِنَّةُ (٢٧) ارْجِعِي إِلَىٰ رَبِّكِ رَاضِيَةً مَّرْضِيَّةً (٢٨) فَادْخُلِي فِي عِبَادِي (٢٩) وَادْخُلِي جَنَّتِي (٣٠)﴾

## ڕۆژی قیامەت هەموو كەسێ ئەوەی كردویەتی لە چاكە و خراپە وەری ئەگرێت

خوای گەورە هەواڵمان ئەداتێ لەوەی ڕوو ئەدات لە ڕۆژی قیامەت لە كارەساتی سامناك و گەورە.وە ئەفەرموێت: ﴿كَلَّا إِذَا دُكَّتِ الْأَرْضُ دَكًّا دَكًّا﴾واتە: نابێ وا بكەن كاتێك كە زەوی بە توندی درا بە یەكدا و پارە پارە كرا. كاتێ زەمین ئامادە كرا و ڕاخرا و تەخت و ڕێك و یەكسان كرا لەگەڵ كێوەكاندا، هەموو خەڵكیش لە گۆڕەكانیان هەڵسانەوە بۆ لای پەروەردگاریان﴿وَجَاءَ رَبُّكَ وَالْمَلَكُ صَفًّا

صَفًّا﴾واتە: پەروەردگارت دێت و فریشتەکانیشی پۆل پۆل دێن. یانی: بۆ لێپرسینەوە لە نێوان بەندەکانیدا ئەمە دوای ئەوەی کە بەڕێزترین نەوەی ئادەم کە ئەویش حەزرەتی موحەمەدە (ﷺ) ئەکەنە تکا کاری خۆیان کە پێش ئەو داوا لە پێغەمبەرە لێبڕاوەکان (اولی العزم)یەك لە دوای یەك ئەکەن، هەمویان ئەفەرموون: من توانای ئەوەم نیە کە ئێوە داوای ئەکەن، تا لە دواییدا دێنە لای موحەمەد(ﷺ) ئەفەرموێت: من بۆ ئەوە ئامادەم، من بۆ ئەوە ئامادەم. ئەڕوات تکا ئەکات لەلای خوای گەورە کە بفەرموێت دادوەری لە نێوان بەندەکانیدا دەست پێبکات خودای گەورەش پاڕانەوەکەی لێ وەردەگرێ،ئەمەیش یەکەم پاڕانەوەیە کە ناوی (المقام المحمود)ە، وەك لە پێشەوە باس کرا لە سورەتی سبحان(الاسرا)کە خودای مەزن و پایە بەرز دێت بۆ دادوەری، چۆن خۆی حەز بکات، فریشتەکانیش لە خزمەتیدا پۆل پۆل ئەوەستن.وە ئەفەرموێت: ﴿وَجِاْىٓءَ يَوْمَئِذٍۭ بِجَهَنَّمَۚ يَوْمَئِذٍ يَتَذَكَّرُ ٱلْإِنسَٰنُ وَأَنَّىٰ لَهُ ٱلذِّكْرَىٰ﴾ واتە: وە لەو ڕۆژەدا دۆزەخ ئەهێنرێت بۆ ساحەی مەحشەر لەو ڕۆژەدا ئینسان کردەوەی خۆی بیر دەکەوێتەوە بەڵام ئەو بیرکەوتنەوەیە چ سودێك بە ئەو دەگەیەنێت؟ ئیمامی موسلیمی کوڕی حەجاج لە سەحیحەکەیدا لە عەبدوڵای کوڕی مەسعودەوە ڕیوایەتی کردوە ئەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: جەهەنەم ئەهێنرێ لەو ڕۆژەدا حەفتا هەزار لغاوی هەیە، هەر لغاوێکی حەفتا هەزار فریشتە ڕای ئەکێشێت. ترمزیش هەروا ڕیوایەتی کردوە. وە ئەفەرموێت: ﴿يَقُولُ يَٰلَيْتَنِى قَدَّمْتُ لِحَيَاتِى﴾ واتە: ئینجا بە پەشیمانی و داخەوە ئەڵێ: خۆزگە لە دونیادا کاری چاکەم پێش بخستایە بۆ ئەم ژیانەم. یانی: پەشیمانە لەو گوناهانەی کە کردویەتی ئەگەر گوناهبار بێت. وە ئەگەر خوا ناسیش بێت حەز ئەکات زیاتر خوا ناسی بکردایە. وەك ئەوەی ئیمامی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل لە موحەمەدی کوڕی ئەبی عومەیرەوە ڕیوایەتی کردوە کە یەکێك بووە لە هاوەڵەکانی پێغەمبەر(ﷺ): ئەگەر بەندەیەك لەو ڕۆژەوە لەدایك بووە تا بە پیری ئەمرێت بە دەموو چاودا بکەوێ بۆ خوا ناسی، هێشتا بەکەمی ئەزانێ لە ڕۆژی قیامەتدا، وە پێی خۆشە بگەڕێتەوە بۆ دونیا کەزیاتر خواناسی بکات تا زیاتر پاداشت وەربگرێت. وە ئەفەرموێت: ﴿فَيَوْمَئِذٍ لَّا يُعَذِّبُ عَذَابَهُۥٓ أَحَدٌ ﴿٢٥﴾ وَلَا يُوثِقُ وَثَاقَهُۥٓ أَحَدٌ﴾ واتە: وە کەس وەك ئەو بە زنجیر شەتەك نادرێت. یانی: هیچ کەسیش وەك دەرگەوانەکانی دۆزەخ(الزبانیە)بە توندی نایگرن و بە زنجیر شەتەکیان بدەن لەو کەسانەی کە باوەڕیان بە پەروەردگاریان نەبووە. ئەمە بۆ ئەوانەیە کە تاوانبار و ناهەقی کار بوون لە ناو خەڵکیدا، بەڵام ئەو گیان پاك و لەخەم ڕەخسیوانەی کە ئارام و ڕاوەستاو بوون و لەگەڵ ڕاستیدا گەڕاون پێیان ئەوترێ: ﴿يَٰٓأَيَّتُهَا ٱلنَّفْسُ ٱلْمُطْمَئِنَّةُ﴾ واتە: لەو ڕۆژەدا بە خواپەرست ئەوترێت: ئەی نەفسی بە ئارام! ﴿ٱرْجِعِىٓ إِلَىٰ رَبِّكِ رَاضِيَةً مَّرْضِيَّةً﴾ واتە: بگەڕێوە بۆ

لای پەروەردگاری خۆت بە دڵخۆشی، چونکە تۆ ئەوت لە خۆت ڕازی کردوە، یانی: بۆلای خودا و ئەو پاداشتەی کە ئەو دای ناوە بۆ بەندەکانی لە بەهەشتدا﴿رَاضِيَةً﴾ یانی: لە گیانی خۆی ﴿مَّرْضِيَّةً﴾ یانی: ئەو لە خودا ڕازیە و خودایش لە ئەو ڕازیە و دڵخۆشی کردووە.وە ئەفەرموێت: ﴿فَٱدْخُلِي فِي عِبَٰدِي﴾ واتە: ئینجا بچۆرە ناو بەندە چاکەکانی من و یانی: تۆش لەگەڵ بەندەکانی من بە﴿وَٱدْخُلِي جَنَّتِي﴾ واتە: بچۆرە ناو بەهەشتی منەوە. ئەمەی پێئەوترێ لە کاتی گیان دەرچووندا و لە ڕۆژی قیامەتیشدا فریشتەکان مژدە ئەدەن بە خوا ناسان لە کاتی مردندا، وە لەکاتی زیندو بوونەوە لە گۆڕا، ئەبو حاتەم ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەباسەوە کە خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيَّتُهَا ٱلنَّفْسُ ٱلْمُطْمَئِنَّةُ ﴿٢٧﴾ ٱرْجِعِيٓ إِلَىٰ رَبِّكِ رَاضِيَةً مَّرْضِيَّةً﴾ ئەڵێت: کە ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە ئەبوبەکر دانیشتبوو. فەرمووی ئەی پێغەمبەری خوا: ئەم مژدەیە چەندچاك و خۆشە؟پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی: بێگومان بەم زوانە ئەوەش بە تۆئەوترێ.

## سورەتی (البلد)

## لەمەککەدا هاتووەتە خوارەوە

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿لَآ أُقْسِمُ بِهَٰذَا ٱلْبَلَدِ ﴿١﴾ وَأَنتَ حِلٌّۢ بِهَٰذَا ٱلْبَلَدِ ﴿٢﴾ وَوَالِدٍ وَمَا وَلَدَ ﴿٣﴾ لَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ فِي كَبَدٍ ﴿٤﴾ أَيَحْسَبُ أَن لَّن يَقْدِرَ عَلَيْهِ أَحَدٌ ﴿٥﴾ يَقُولُ أَهْلَكْتُ مَالًا لُّبَدًا ﴿٦﴾ أَيَحْسَبُ أَن لَّمْ يَرَهُۥٓ أَحَدٌ ﴿٧﴾ أَلَمْ نَجْعَل لَّهُۥ عَيْنَيْنِ ﴿٨﴾ وَلِسَانًا وَشَفَتَيْنِ ﴿٩﴾ وَهَدَيْنَٰهُ ٱلنَّجْدَيْنِ ﴿١٠﴾﴾

سوێند بەمەککە کە دایکی شارەکانی ترە کە مرۆڤمان لەگەڵ خەم و خەفەت وەدی هێنائەمە سوێندێکە لە خوای گەورەوە بە مەککە ئەیخوات بەوەی هەرکەسێ لە ناویدا بێت ئازادە،بۆ ئاگاداری دان لەسەر گەورەیی و ڕێزی مەککە لە کاتێکدا خەڵکەکەی لە ئیحرامدان، ئەفەرموێت: ﴿لَآ أُقْسِمُ بِهَٰذَا ٱلْبَلَدِ﴾ واتە: سوێند بەم شارە مەککە، خوصەیف لە مەجاهیدەوە ئەڵێت: ﴿لَآ أُقْسِمُ بِهَٰذَا ٱلْبَلَدِ﴾، ﴿لَآ﴾ ڕەتکردنەوەی شتەکانی ئەوانە (شتی وا نیە)سوێند بێت بەم شارە. شەبیبی کوڕی بەشر ئەڵێت: لە عیکرەمەوە ئەویش لە ئیبنو عەباسەوە: ﴿لَآ أُقْسِمُ بِهَٰذَا ٱلْبَلَدِ﴾ یانی: مەککە. وە ئەفەرموێت: ﴿وَأَنتَ حِلٌّۢ بِهَٰذَا ٱلْبَلَدِ﴾ واتە: تۆ نیشتەجێی لەو شارەدا کە ئازاردانی تۆی تێیدا ڕوو دراوە. ووتی: تۆ ئەی موحەمەد(ﷺ) دروستە بۆت بجەنگی تیایدا بەم شێوەیە لە سەعیدی کوڕی جوبەیر و ئەبو صالح و عەتیە و زەحاك و قەتادە و سودی و ئیبنو زەیدەوە ڕیوایەت کراوە.حەسەنی بەصری ئەڵێت: خودا

کاتێکی لە ڕۆژدا بۆ حەڵاڵ کرد. ئەم مانایەی کە وتویانە لەهەر دوو سەحیحەکەدا هاتووە کە ئەفەرموێت: ئەم شارە خودا قەدەغەی کردووە لەو ڕۆژەی کە ئاسمانەکان و زەمینی دروست کردووە، هەر قەدەغەیە بە فەرمانی خودا تا ڕۆژی قیامەت،درەختی نابڕیێ خەڵکەکەی دەرناکرێ، بەلاّم ئێستا سەعاتێ بۆ من حەلاّڵ بوو لە ڕۆژێکدا و قەدەغە کرایەوەو ئەمڕۆ وەك دوێنێ وایە، با ئەو کەسەی ئێستا لێرەیە ئاگاداری ئەو کەسە بکات کە ئێستا لێرە نیە.لە وتەیەکی ترادا هاتووە: ئەگەر کەسێك ڕێگەی دا کە کوشتار بکرێ بە بەڵگەی ئەوەی کە پێغەمبەر(ﷺ) کوشتاری کردووە بڵێن: خودا ڕێگەی داوە بە پێغەمبەرەکەی(ﷺ) ڕێگەی بە ئێوەنەداوە. وە ئەفەرموێت: ﴿وَوَالِدٍ وَمَا وَلَدَ﴾ واتە: وە سوێند بە باوك و ئەوەی لێی کەوتوەتەوە، موجاهید و ئەبو صالح و قەتادە و زەححاك و سوفیانی سەوری و سەعیدی کوڕی جوبەیر و سوددی حەسەنی بەصری و خوصەیف و شەرحەبیلی کوڕی سەعد و جگە لەمانیش ئەڵێن: ﴿وَوَالِدٍ وَمَا وَلَدَ﴾ یانی: ئەوەی ئادەم. ئەمەی موجاهید و هاوەڵەکانی وتویانە چاك و بەهێزە، لەبەر ئەوەی کاتێ خودا سوێندی خوارد بە دایکی شارەکان کە مەککەیە سوێندیش ئەخوات بەو کەسانەی کە نیشتەجێن تێیدا. کە ئەویش ئادەم و نەوەکانیەتی. ئەمە ئیبنو جەریر و ئیبنو حاتەم ڕیوایەتیان کردوە. ئیبنو جەریر ئەمەی هەڵبژاردووە کە ئەم ئایەتە گشتیە و بۆ هەموو باب و نەوەیەکە. ئەم مانایەش هەڵدەگرێ.وە ئەفەرموێت: ﴿لَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنسَانَ فِي كَبَدٍ﴾ واتە: سوێند بە خودا بەڕاستی ئادەممان دروست کردووە لە ڕەنج و کێشە و ناڕەحەتیدایە. ئیبنو ئەبی نەجیح و جورەیج لە عەتاوەو ئەویش لە ئیبنو عەباسەوە ئەیگێڕنەوە کە ئەفەرموێ: ﴿فِي كَبَدٍ﴾ یانی: لە ناڕەحەتیدا وەدی هێنراوە، ئایا ئەمە بەچاو نابینن کە وایە، جا باسی لەدایك بوون و دروستبوونی ددانەکانی کرد بۆیان. موجاهید دەڵێت: ﴿فِي كَبَدٍ﴾ یانی: تنۆکێ ئاو پاشان لە پارچە خوێنێکی بەستوو پاشان پارچە گۆشتێ بەردەوام ڕەنج ئەدات، دوبارە موجاهید ئەڵێت: ئەوەیش وەك ئەو فەرمودەی خوا وایە کە ئەفەرموێت: ﴿حَمَلَتْهُ أُمُّهُ كُرْهًا وَوَضَعَتْهُ كُرْهًا﴾ واتە: دایکی بە ناڕەحەتی و ئازارەوە هەڵی گرتووە وە بەئازارو ناڕەحەتیش بویەتی.سەعیدی کوڕی جوبەیر ئەڵێت: ﴿لَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنسَانَ فِي كَبَدٍ﴾ واتە: لەناخۆشی و گەڕان بە دوای ژیاندا، عیکرەمە ئەڵێت: لە ناڕەحەتی و درێژەکێشانی. قەتادە ئەڵێت: لەناو ئێش و ئازاردا. وە حەسەن ئەڵێ: لەناو تەنگی دونیادا هەر زەجر ئەکێشێ و لەناو کۆسپ و ئێش و ئازاری ڕۆژی دوایشدا هەر زەجر ئەکێشێ.

## خودا ئاگای لە مرۆڤە و بە بەهرە کانیشی دەوری داوە

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿أَيَحۡسَبُ أَن لَّن يَقۡدِرَ عَلَيۡهِ أَحَدٌ﴾ واتە: ئایا وا دەزانێ کە کەس دەسەڵاتی بەسەردا نیە.حەسەنی بەصری ئەڵێت: ﴿أَيَحۡسَبُ أَن لَّن يَقۡدِرَ عَلَيۡهِ أَحَدٌ﴾ یانی: ئایا وادەزانێ کە کەس ناتوانێ سامانەکەی ببات،قەتادە ئەڵێ: ﴿أَيَحۡسَبُ أَن لَّن يَقۡدِرَ عَلَيۡهِ أَحَدٌ﴾ یانی: نەوەی ئادەم وادەزانێ پرسیاری لێناکرێ لەو سامانەی لە کوێوە بەدەستی هێناوە؟وە لە کوێیدا بەخشیویەتی و لە ناوی داوە؟وە ئەفەرموێت: ﴿يَقُولُ أَهۡلَكۡتُ مَالٗا لُّبَدًا﴾ واتە: بەفیزەوە دەڵێ: ماڵێ زۆرم لەناو داوەو بەخشیوە. یانی: نەوەی ئادەم دەڵێ سامانێکی زۆرم داوە، موجاهید و حەسەن و قەتادە و سوددی و کەسانی تریش ئەم تەفسیرەیان کردووە.پاشان ئەفەرموێت: ﴿أَيَحۡسَبُ أَن لَّمۡ يَرَهُۥٓ أَحَدٌ﴾ واتە: ئایا وا دەزانێ کەکەس نەی دەویست.موجاهید دەڵێت: یانی: وا خەیاڵ دەکات کە خودا ئەوی نەدیوە. کەسانی تریش لە پێشینان هەر وایان وتووە.وە ئەفەرموێت: ﴿أَلَمۡ نَجۡعَل لَّهُۥ عَيۡنَيۡنِ﴾ واتە: ئایا دوو چاومان نەداوەتێ. یانی: پێی ببینێ: ﴿وَلِسَانٗا وَشَفَتَيۡنِ﴾واتە: وە زمانێك و دوو لێومان پێنەداوە ؟ یانی: قسەی پێدەکا و ئەوەی کە لە دڵیایە دەری دەبڕێ و هەردوو لێویشی یارمەتی ئەدەن و جوانی دەبەخشن بە دەم و چاوو خواردنیشیان پێئەخورێ.

## جیاکردنەوەی چاکە و خراپە بەهرەیەکی خوایە

خوای گەورەئەفەرموێت: ﴿وَهَدَيۡنَٰهُ ٱلنَّجۡدَيۡنِ﴾واتە: ڕێی چاك و خراپمان نیشان نەداوە؟ ﴿وَهَدَيۡنَٰهُ ٱلنَّجۡدَيۡنِ﴾ یانی: هەردوو ڕێگەکە. سوفیانی سەوری ئەڵێت: لە عاصمەوە ئەویش لە زیڕوەو زیڕیش لە عەبدوڵای کوڕی مەسعودەوە کە فەرمویەتی: ﴿وَهَدَيۡنَٰهُ ٱلنَّجۡدَيۡنِ﴾ یانی: شارەزامان کردووە لە چاکە و خراپەدا هەروەها ڕیوایەت کراوە لە عەلی و ئیبنو عەباس و موجاهید و عیکرەمە و ئەبو وائیل و ئەبو صالح و موحەمەدی کوڕی کەعب وزەححاك و عەتای خۆراسانی: کە چاکە و خراپەیە. وێنەی ئەم ئایەتە ئەم فەرمودەی خودایە کە ئەفەرموێت: ﴿إِنَّا خَلَقۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ مِن نُّطۡفَةٍ أَمۡشَاجٖ نَّبۡتَلِيهِ فَجَعَلۡنَٰهُ سَمِيعَۢا بَصِيرًا ٢ إِنَّا هَدَيۡنَٰهُ ٱلسَّبِيلَ إِمَّا شَاكِرٗا وَإِمَّا كَفُورًا﴾ واتە: بە ڕاستی ئێمە ئادەمیزادمان دروست کرد لە دڵۆپێك ئاوی تێکەڵ تا تاقی بکەینەوە، ئینجا کردمان بە کەسێکی بیسەری بینەر، بێگومان ئێمە ڕێنمونیمان کرد بۆ ڕاستە ڕێ یا سوپاس گوزارە یا نا سوپاس و سپڵەیە.

﴿فَلَا اقْتَحَمَ الْعَقَبَةَ ﴿١١﴾ وَمَا أَدْرَاكَ مَا الْعَقَبَةُ ﴿١٢﴾ فَكُّ رَقَبَةٍ ﴿١٣﴾ أَوْ إِطْعَامٌ فِي يَوْمٍ ذِي مَسْغَبَةٍ ﴿١٤﴾ يَتِيمًا ذَا مَقْرَبَةٍ ﴿١٥﴾ أَوْ مِسْكِينًا ذَا مَتْرَبَةٍ ﴿١٦﴾ ثُمَّ كَانَ مِنَ الَّذِينَ آمَنُوا وَتَوَاصَوْا بِالصَّبْرِ وَتَوَاصَوْا بِالْمَرْحَمَةِ ﴿١٧﴾ أُولَئِكَ أَصْحَابُ الْمَيْمَنَةِ ﴿١٨﴾ وَالَّذِينَ كَفَرُوا بِآيَاتِنَا هُمْ أَصْحَابُ الْمَشْأَمَةِ ﴿١٩﴾ عَلَيْهِمْ نَارٌ مُؤْصَدَةٌ ﴿٢٠﴾﴾

## هاندان بۆ گرتنی ڕێگەی چاكە

خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿فَلَا اقْتَحَمَ الْعَقَبَةَ﴾ واتە: كەچی هێشتا زۆرێ لە خەڵكی پەلاماری پلەی سەختی نەداوە.ئیبنو زەید دەڵێت: یانی خۆزگە ئەو ڕێگایەی بگرتایە كە ڕێگەی چاكە و سەرفرازیە.پاشان ڕوونی ئەكاتەوەو ئەفەرموێت: ﴿وَمَا أَدْرَاكَ مَا الْعَقَبَةُ﴾ واتە: چوزانیت پلەی سەخت كامەیە.﴿فَكُّ رَقَبَةٍ﴾ واتە: ئازادكردنی كۆیلەیەكە.ئیمامی ئەحمەد لە سەعیدی كوڕی مەرجانەوە ڕیوایەتی كردووە كە گوێی لە ئەبو هورەیرە بوو ئەیفەرموو: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: هەركەسێ كۆیلەیەكی مسوڵمان ئازاد بكا،خوایش بە هەر ئەندامێكی ئەو كۆیلەیە ئەندامێكی لەشی ئەو كەسە ئازاد دەكات لە ئاگر،تا بەو شێوەیە دەستی لە جیاتی دەستی ئازاد دەكات و پێی لە جیاتی پێی و شەرمگەی لە باتی شەرمگەی ئەو ئازاد دەكات.عەلی كوڕی حسەین ئەڵێ: تۆ خۆت ئەمەت لە ئەبو هورەیرەوە بیستووە؟سەعید ئەڵێ: بەڵێ. عەلی كوڕی حوسەین بە خزمەت كارێكی خۆی ووت كە لە هەمویان زیرتر بوو بانگی موتەڕریف بكات، كاتێ لەبەر دەستیدا ئامادە بوو، پێی ووت: برۆ تۆ ئازادی لەبەر خاتری خوا. بوخاری و موسلیم و ترمزی ونەسائیش ڕیوایەتی ئەم فەرمودەیان كردووە بە چەند ڕێگای تر لە سەعیدی كوڕی مەرجانەوە. ئیمامی ئەحمەدیش ڕیوایەتی ئەكات لە ئەبی نومامەوە ئەویش لە عەمری كوڕی عەباسەوە، كە سەلەمی ووتم بە عەمر فەرمودەیەكمان بۆ باس بكە كە لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) بیستبێتت و وەهمو كەموو كوڕی تێدا نەبێت،عەمر فەرمووی: گوێم لە پێغەمبەر(ﷺ) بوو فەرمووی: هەركەسێك سێ منداڵی ببێت لە حاڵی مسوڵمانێتیدا و پێش ئەوەی باڵغ بێن بمرن، خوا لەبەر ئەو سۆزەی بۆ ئەو منداڵانە هەیەتی دایك و باوكیشیان ئەخاتە بەهەشتەوە، هەركەسێك مویەكی لە پێناوی خوا سپی بكات، بۆی ئەبێتە نورێك لە قیامەتدا، هەركەسێكیش تیرێك بگرێتە دوژمن ئیتر دوژمن بپێكێت یان نەیپێكێت خوا پاداشتی ئازادكردنی كۆیلەیەكی بۆ ئەنوسێت، هەركەسێكیش كۆیلەیەكی مسوڵمان ئازاد بكات خوا لەباتی هەر ئەندامێكی ئەو كۆیلەیە ئەندامێكی ئەم لە ئاگر ڕزگار دەكات، هەركەسیش دوانەیەك ببەخشێت لە ڕێگەی خوادا هەر هەشت دەرگای بەهەشتی بۆ ئەكرێتەوە لە كامەیانەوە بیەوێ ئەچێتە ژوورەوە. ئەحمەد ڕیوایەتی كردوە. هەروەها فەرمویەتی: كەسێ مزگەوتێ دروست بكات یادی خوای تێدا بكرێت خوداماڵێكی بۆ دروست ئەكات لە بەهەشتدا،وە

هەرکەسێ گیانی مسوڵمانێ ئازاد بکات ڕزگاربونیەتی لە جەهەنەم، وە هەرکەسێ مویەکی سپی بکات لە ئیسلاما ئەبێتە ڕۆشناییەك بۆی لە ڕۆژی قیامەتدا. لە چەند ڕێگای ترەوە ڕیوایەت کراوە کە پێغەمبەر(ﷺ)فەرمویەتی. وە ئەم سەنەدانەش باش و بەهێزن. سوپاس بۆ خودا. وە خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿أَوۡ إِطۡعَٰمٞ فِي يَوۡمٖ ذِي مَسۡغَبَةٖ﴾ واتە: وە ناندانە لەڕۆژی گرانی و برسێتیدا. ئیبنو عەباس ئەفەرموێ: لە ڕۆژی برسێتی و قات و قڕیدا. هەروەها عیکرەمەو موجاهید و زەححاك و قەتادە و کەسانی تریش هەروایان وتووە. (السغب)یانی: برسێتی. وە ئەفەرموێت: ﴿يَتِيمٗا ذَا مَقۡرَبَةٍ﴾ واتە: بە هەتیوی خزم. یانی: لەو ڕۆژەدا خواردنی دابێ بە هەتیوێکی نزیکی خۆی، ئیبنو عەباس و عیکرەمە و حەسەن و زەححاك و سوودی وایان فەرمووە، هەروەك چۆن لەم فەرمودەیەدا هاتووە کە ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە سەلمانی کوڕی عامرەوەئەڵێت: بیستم لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) دەیفەرموو: خێر کردن بەهەژار چاکەیەکە، بۆ خزم دووجار چاکەیە، خێریشە و خزمایەتیشە. نەسائی و ترمزیش ئەم فەرمودەیان ڕیوایەت کردووە و ئەم سەنەدەش سەنەدێکی سەحیحە پاشان ئەفەرموێت: ﴿أَوۡ مِسۡكِينٗا ذَا مَتۡرَبَةٖ﴾ یانی: یا بەهەژاری خاکە سەر، یانی: نەداری لێقەوماوو خاکە سەر، ڕازیە بەکەم، ئیبنو عەباس ئەڵێ: ﴿ذَا مَتۡرَبَةٖ﴾ یانی: ئەو کەسەی لەسەرە ڕێگا کەوتوەوماڵی نیە، شتێکی نیە لە ژێریدا تا نەهێڵێ خۆڵاوی ببێ. وە ئەفەرموێت: ﴿ثُمَّ كَانَ مِنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَتَوَاصَوۡاْ بِٱلصَّبۡرِ وَتَوَاصَوۡاْ بِٱلۡمَرۡحَمَةِ﴾ واتە: سەرەڕای ئەمانەش لەو کەسانە بێ بڕوای هێنابێ و ئامۆژگاری یەکتریان کردبێ لەسەر ئارامگرتن و ئامۆژگاری یەکتریان کردبێ لەسەر بەزەیی و میهرەبانی.یانی: لەگەڵ ئەو هەموو وەصفە جوان و پاکانە، خاوەن باوەڕیش بن بەدڵ و بەتەمای ئەو پاداشتە بن لای خوای گەورەوە بۆیان دانراوە وەك ئەفەرموێت: ﴿وَمَنۡ أَرَادَ ٱلۡأٓخِرَةَ وَسَعَىٰ لَهَا سَعۡيَهَا وَهُوَ مُؤۡمِنٞ فَأُوْلَٰٓئِكَ كَانَ سَعۡيُهُم مَّشۡكُورٗا﴾ واتە: هەرکەسێکیش مەبەستی ڕۆژی دوایی بوبێت وە هەوڵی بۆ بدات بەو جۆرەی شایستەی ئەوەو باوەڕداریش ببێ ئا ئەوانە کردەوەو تێکۆشانەکەیان وەرگیراوە.وە ئەفەرموێت: ﴿مَنۡ عَمِلَ صَٰلِحٗا مِّن ذَكَرٍ أَوۡ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤۡمِنٞ﴾ هەرکەسێ لە نێر یان مێ کردەوەی چاکی کردبێت و بڕواداریش بوبێت.وە پاشان ئەفەرموێت: ﴿وَتَوَاصَوۡاْ بِٱلصَّبۡرِ وَتَوَاصَوۡاْ بِٱلۡمَرۡحَمَةِ﴾ یانی: لەو خاوەنباوەڕو چاکانەن کە یەکتریان ڕاسپاردووە بۆ خۆگری لەئازاردانی خەڵکی و وە دلۆڤانی بۆیان، وەك لەم فەرمودە پیرۆزەدا هاتووە: دلۆڤانان خودای دلۆڤان بەزەیی دێتەوە پێیاندا، دلۆڤان بن بۆ ئەو کەسانەی لەسەرزەمینن، ئەوانەی لە ئاسمانن دلۆڤان ئەبن بۆ ئێوە. وە لەفەرمودەیەکی تردا هاتووە: خودا بەزەیی نایەتەوە بە کەسێکداکە بەزەیی نەیەتەوە بە خەڵکا. ئەبو داود لە عەبدوڵای کوڕی عەمرەوە ڕیوایەتی کردووە کە

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: کەرکەسێ بەزەیی بە منداڵەکانماندا نەیەتەو ڕێزی گەورەکانمان نەگرێت ئەوە لە ئێمە نیە. وە خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلۡمَيۡمَنَةِ﴾ واتە: ئەوانەهاوەڵانی دەستی ڕاستن.یانی: ئەوانەی ئەم ڕەوشتانەیان تێدایە بەختەوەرن و لە هاوەڵانی دەستی ڕاستن.

## حاڵی بەد بەختەکان و پاداشت و چارەنوسیان

پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِـَٔايَٰتِنَا هُمۡ أَصۡحَٰبُ ٱلۡمَشۡـَٔمَةِ﴾ واتە: وە ئەوانە بێ بروا بوون بە موعجیزەو نیشانەکانی ئێمە ئەوانە هاوەڵانی دەستی چەپن. وە ئەفەرموێت: ﴿عَلَيۡهِمۡ نَارٞ مُّؤۡصَدَةُۢ﴾ واتە: دایگرتوون ئاگری دەرگا داخراو، یانی: داخراوە لێیان ئاگرێکی زۆر بێدەرەتانەو ڕێگای دەرچونیشیان نیە تیایدا. ئەبو هورەیرەو ئیبنو عەباس و عیکرەمە و سەعیدی کوڕی جوبەیر و موجاهید و موحەمەدی کوڕی کەعبی قەرەزی و عەتیەی عەوفی و حەسەن و قەتادە و سوددی وتویانە: ﴿مُّؤۡصَدَةُۢ﴾ یانی: داخراوە لەسەریان ئیبنو عەباس ئەڵێت: دەرگاکانی داخراوە.زەحجاك ئەڵێ: ﴿مُّؤۡصَدَةُۢ﴾ یانی: دەورەی گیراوەو دەرگای نیە. قەتادە ئەڵێ: دەخراوەو ڕۆشنایی تێدا نیە و ڕزگاربوون و دەرچوون نیە تیایدا هەتا هەتایە

## سوورەتی (الشمس)

### لەمەککەداهاتووەتەخوارەوە

### خێری خوێندنی سوورەتی (الشمس) لە نوێژی خەوتناندا

ئەو فەرمودەیەی جابرمان لە پێشەوە باس کرد کە لەهەردوو سەحیحەکەدا هاتووە کە پێغەمبەر(ﷺ) ئەفەرموێ بە مەعاز: ئەوە بۆ نوێژیان بە﴿سَبِّحِ ٱسۡمَ رَبِّكَ ٱلۡأَعۡلَى - وَٱلشَّمۡسِ وَضُحَىٰهَا - وَٱلَّيۡلِ إِذَا يَغۡشَىٰ﴾ بۆ ناکەیت.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿وَٱلشَّمۡسِ وَضُحَىٰهَا ۝١ وَٱلۡقَمَرِ إِذَا تَلَىٰهَا ۝٢ وَٱلنَّهَارِ إِذَا جَلَّىٰهَا ۝٣ وَٱلَّيۡلِ إِذَا يَغۡشَىٰهَا ۝٤ وَٱلسَّمَآءِ وَمَا بَنَىٰهَا ۝٥ وَٱلۡأَرۡضِ وَمَا طَحَىٰهَا ۝٦ وَنَفۡسٖ وَمَا سَوَّىٰهَا ۝٧ فَأَلۡهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقۡوَىٰهَا ۝٨ قَدۡ أَفۡلَحَ مَن زَكَّىٰهَا ۝٩ وَقَدۡ خَابَ مَن دَسَّىٰهَا ۝١٠﴾

سوێندی خوا بە دروستکراوەکانی بەوەی هەرکەسێ دەرونی خۆی پاك ڕابگرێ سەردەکەوێ و هەرکەسیش دەرونی پیس بکات ئەوە ڕەنج بە خەسار دەبێت.خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَٱلشَّمۡسِ

وَضُحَىٰهَا﴾ واتە: سوێند بە خۆرو ڕوناکیەکەی. موجاهید ئەڵێ: ﴿وَٱلشَّمۡسِ وَضُحَىٰهَا﴾ یانی: ڕوناکی خۆر. قەتادە ئەڵێت: ﴿وَضُحَىٰهَا﴾ یانی: ڕۆژ هەمووی. ئیبنو جەریر ئەڵێت: ڕاست ئەوەیە کە بوترێ: خودا سوێندی خواردووە بە خۆر و ڕۆژەکەی چونکە ڕوناکی خۆر دەرکەوتنی ڕۆژە﴿وَٱلۡقَمَرِ إِذَا تَلَىٰهَا﴾ واتە: وە سوێند بە مانگ کە دوا بە دوای ئەو هەڵدێ. موجاهید ئەڵێت: دوای دەکەوێ، عەوفی دەڵێت: ئیبنو عەباس فەرمویەتی: ﴿وَٱلۡقَمَرِ إِذَا تَلَىٰهَا﴾یانی: بە دوای ڕۆژدا دێت. قەتادە ئەڵێت: کاتێ بە دوای مانگا شەوداهات. یانی: کاتێ خۆر دواکەوت مانگ ئەبینرێت. وە ئەفەرموێت: ﴿وَٱلنَّهَارِ إِذَا جَلَّىٰهَا﴾ واتە: وە سوێند بە ڕۆژ کاتێ کە خۆر دەردەخات. موجاهید ئەڵێ: تیشك دەداتەوە بۆیە موجاهید ئەڵێ: ﴿وَٱلنَّهَارِ إِذَا جَلَّىٰهَا﴾ وەك ئەم فەرمودە وایە﴿وَٱلنَّهَارِ إِذَا تَجَلَّىٰ﴾واتە: وە بە ڕۆژ کاتێ ڕوناك دەبێتەوە. وە ئەفەرموێت: ﴿وَٱلَّيۡلِ إِذَا يَغۡشَىٰهَا﴾ واتە: سوێند بەشەو کە خۆر دادەپۆشێ. ئەڵێن: ﴿وَٱلَّيۡلِ إِذَا يَغۡشَىٰهَا﴾ یانی: کاتێ گە خۆر دادەپۆشێ و خۆر ئەنیشێ و دونیا تاریك ئەبێت. وە ئەفەرموێت: ﴿وَٱلسَّمَآءِ وَمَا بَنَىٰهَا﴾ واتە: وە سوێند بە ئاسمان و سوێند بەوەی دروستی کردووە. ئەگونجێ ئەم (ما)یەی مەصدەریش بێت بەمانای بە ئاسمان و بە بەرزیەکەی. ئەمە قسەی قەتادەیە.ئەگونجێ بە مانای (من) یش بێت. یانی: سوێند بە ئاسمان و بەوەی ئەوی وەدی هێنا.ئەمە قسەی موجاهیدە، هەردوو ماناکە تەواوکەری یەکترن. بینا کردنیش یانی بەرز کردنەوە، وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَٱلسَّمَآءَ بَنَيۡنَٰهَا بِأَيۡيْدٍ﴾ واتە: وە ئاسمانمان زۆر بە هێز دروست کردووە﴿وَإِنَّا لَمُوسِعُونَ ﴿٤٧﴾ وَٱلۡأَرۡضَ فَرَشۡنَٰهَا فَنِعۡمَ ٱلۡمَٰهِدُونَ﴾ وە ئێمە فراوان کەری ئاسمانین، وە زەمینمان ڕاخستووە جا چ ڕاخەرێکی چاکین. وە هەمان ماناش ئەکرێ بۆ ئایەتی: ﴿وَٱلۡأَرۡضِ وَمَا طَحَىٰهَا﴾ واتە: وە سوێند بە زەوی و ئەوەی ڕای خستووە.موجاهید ئەڵێت: ﴿وَمَا طَحَىٰهَا﴾ یانی: پانی کردوەو ڕای خستووە.عەوفی لە ئیبنو عەباسەوە ئەیگێڕێتەوە کە فەرمویەتی: ﴿وَمَا طَحَىٰهَا﴾ یانی: شتەکانی وەدی هێناوە تیایدا عەلی کوڕی ئەبی تەلحە لە ئیبنو عەباسەوە ئەیگێڕێتەوە کە فەرمویەتی: ﴿طَحَىٰهَا﴾ یانی: ڕای خست.وە ئەفەرموێت: ﴿وَنَفۡسٍ وَمَا سَوَّىٰهَا﴾ واتە: وە سوێند بە نەفسی ئادەمی و ئەوەی ڕێك و پێك وەدی هێناوە.یانی: وەدی هێناوە بە ڕێك و ڕاستی و بە وەدیهێنانێکی تەواو.وە ئەفەرموێت: ﴿ فَأَقِمۡ وَجۡهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفٗاۚ فِطۡرَتَ ٱللَّهِ ٱلَّتِي فَطَرَ ٱلنَّاسَ عَلَيۡهَاۚ لَا تَبۡدِيلَ لِخَلۡقِ ٱللَّهِ ﴾ واتە: کەواتە ڕوی خۆت ڕێك بکەرە ئاینی ئیسلام پاك و ڕاست بۆ

خودا شوێنی ئاینی داهێنراوی خوا بکەوە کە خەڵکی لەسەر دروست کردووە داهێنراوی خوا بە هیچ جۆرێ گۆڕانی بۆ نیە.پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: هەموو منداڵێ لە دایك ئەبێت لەسەر فیترەتی ئیسلامەتی لە دایك ئەبێت، بەڵام باوك و دایکی دەیکەنە جولەکە یان گاور یا ئاگر پەرست. موسلیم لە ئەبو هورەیرەوە ئەم فەرمودەیان ڕیوایەت کردووە. لە سەحیحی موسلیما کە عەیازی کوڕی حماری موجاشعی ڕیوایەتی کردووە لە پێغەمبەر(ﷺ) کە فەرمویەتی: خودای گەورە فەرمویەتی: من بەندەکانم وەدی هێناوە کە بەرەو هەقیانەت بڕۆن شەیاتین هاتوون هەڵی خەڵەتاندون و لە ئاینەکەیان لای داون. وە ئەفەرموێت: ﴿فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَاهَا﴾ یانی: چاکە و خراپەی بۆ ڕون کردوەتەوە،موجاهید و قەتادە و زەحجاك و سوریش هەروایان وتووە. سەعیدی کوڕی جوبەیر ئەڵێ: چاکە و خراپەی تێگەیاندووە،ئیبنو زەید ئەڵێ: تاوان بارو پارێزگاری تێدا داناوە. ئیبنو جەریر لە ئەسوەدی دیلیەوە ڕیوایەتی کردووە ئەڵێت: عیمرانی کوڕی حوصەین پێی وتم: ئاخۆ تۆ ئەوەت دیوە کە خەڵکی خۆیانی تێدا ماندوو ئەکەن و ئەڕەنجێن،ئاخۆ ئەوانە قەدەر و قەزایەکن هاتوون و ڕابردوون بەسەریاندا یا چاوەڕوانی ئەوە ئەکەن کە پێغەمبەر(ﷺ) بۆی هێناون کە بوتە نیشانە بەسەریانەوە و دوای ئەوە لێپرسینەوەیان لەگەڵدا ئەکرێت؟ گوتم: بەڵکو شتێکەو بڕیاردراوە بەسەریاندا، وتی: ئاخۆ ئەوە ناهەقیە؟ ئەڵێ: زۆر ترسام وپێم ووت: هیچ شتێك نیە کە ئەو دروستی نەکردبێت و موڵکی خۆی نەبێت و خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿لَا يُسْأَلُ عَمَّا يَفْعَلُ وَهُمْ يُسْأَلُونَ﴾ واتە: پرسیاری لێناکرێت لەهەر کارێك کە دەیکات بەڵام ئەوان ئادەمیزادپرسیاریان لێدەکرێت.عیمران وتی: خودا ڕاوەستاوت بکات لە سەر ڕێگای ڕاست،ئەم پرسیارەم بۆیە لێکردی تا تاقیت بکەمەوە،کاتی خۆی پیاوێ هات بۆلای پێغەمبەر(ﷺ) لە هۆزی موزەینە یا لە هۆزی جوهەینە بوو گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئاخۆ تۆ ئەوەت دیوە کە خەڵکی خۆیانی تێدا ماندوو ئەکەن و خۆیان ئەڕەنجێنن،ئاخۆ ئەوانە قەدەرو قەزایەکن کە هاتون و ڕابردون بەسەریاندا یا چاوەڕوانی ئەوە ئەکەن کە پێغەمبەر(ﷺ) بۆی هێناون کە بوەتە بەڵگە بەسەریانەوە و دوای ئەوە لێپرسینەیان لەگەڵدا ئەکرێت،پێغەمبەر(ﷺ) فەرموی: بەڵکو شتێکە بڕیار دراوە بەسەریاندا،کابرا وتی: کەواتە لەبەر چی ئیتر خۆمان بڕەنجێنین؟ فەرموی: هەرکەسێ خوا دروستی کرد بۆ یەکێك لەو دوو پلەیە ئامادەشی ئەکات بۆی. بۆ پشتگیری ئەوەش خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَنَفْسٍ وَمَا سَوَّاهَا ۝٧ فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَاهَا﴾ ئیمامی ئەحمەد و موسلیم ڕیوایەتیان کردووە.وە ئەفەرموێت: ﴿قَدْ أَفْلَحَ مَن زَكَّاهَا﴾ واتە: سوێند بەهەموو ئەوانە بەڕاستی ڕزگاری بووە ئەو کەسەی کە نەفسی خۆی پاك دەکاتەوە: ﴿وَقَدْ خَابَ مَن دَسَّاهَا﴾ واتە: بێگومان نائومێد ئەبێ ئەو کەسەی کە نەفسی خۆی بە گوناە تاوانبار ئەکات، ئەگونجێ مانای ئەو کەسەی کە گیانی

خۆی خاوێن کردوەتەوە یانی: بە خوا پەرستی،وەك قەتادە ئەڵێ: خاوێنی کردوەتەوە لە ڕەوشتی نزم و ناپەسەند. وە ڕیوایەت کراوە لە موجاهید و عیکرەمەو سەعیدی کوڕی جوبەیر بەم شێوەیە: ﴿وَقَدْ خَابَ مَن دَسَّىٰهَا﴾ یانی: وازی لێهێناوە،پێچاویەتی بە گوناهەوەو پش گوێی خستوە، دوور کەوتوەتەوە لە ڕێگای ڕاست و لە خوا پەرستی. وە ئەم مانایەش هەڵئەگرێت. ڕزگارە ئەو کەسەی کە خوا گیانی خاوێن ئەکاتەوەو دۆڕاندویەتی ئەو کەسەی کە خودا گیانی پیس ئەکات بە هۆی کردەوە خراپەکانیەوە.ئەمە قسەی عەوفی و عەلی کوڕی ئەبو تەلحەیە لە ئیبنو عەباسەوە هێناویانە.تەبەرانیش ڕیوایەتی کردوە لە ئیبنو عەباسەوە کە ئەڵێ: هەرکاتێ پێغەمبەر(ﷺ) ئەم ئایەتەی بخوێندایە: ﴿وَنَفْسٍ وَمَا سَوَّىٰهَا ۝٧ فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَىٰهَا﴾ ئەوەستاو پاشان ئەیفەرموو: ئەی خودایە! پاکی ببەخشە بەدەرونم،تۆ یارمەتی دەرو پشتیوانی و چاکترین خاوێن کەرەوەیت بۆ دەرونم.فەرموودەیەکی تر: ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە زەیدی کوڕی ئەرقەمەوە کە ئەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) ئەی فەرموو: ئەی خودایە! من پەنات پێدەگرم لە ناتەوانی و وە لە پیری و ترسنۆکی وە لە سزای ناو گۆڕ، ئەی خودایە! پاکی بدە بە دەرونم وە خاوێنی بکە تۆ چاکترین خاوێن کەری و تۆیت یارمەتی دەرو پشتیوانی دەرونی من، ئەی خودایە! من پەنات پێدەگرم لە دڵێك کە داناچڵەکێ وە لە دەرونێ کە تێر نابێ وە لە زانیاریەك کە کەڵکی نابێ وە لە پاڕانەوەیەکیش کە وەڵام نادرێتەوە. زەید ئەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) ئێمەی فێری ئەم پاڕانەوەیە ئەکرد و ئێمەیش ئێوە فێر ئەکەین. موسلیم ئەم فەرمودەیەی ڕیوایەت کردووە.

﴿كَذَّبَتْ ثَمُودُ بِطَغْوَىٰهَآ ۝١١ إِذِ ٱنۢبَعَثَ أَشْقَىٰهَا ۝١٢ فَقَالَ لَهُمْ رَسُولُ ٱللَّهِ نَاقَةَ ٱللَّهِ وَسُقْيَٰهَا ۝١٣ فَكَذَّبُوهُ فَعَقَرُوهَا فَدَمْدَمَ عَلَيْهِمْ رَبُّهُم بِذَنۢبِهِمْ فَسَوَّىٰهَا ۝١٤ وَلَا يَخَافُ عُقْبَٰهَا ۝١٥﴾

**حاشاکردنی سەموود و لەناو دانیان لەلایەن خوداوە**

﴿كَذَّبَتْ ثَمُودُ بِطَغْوَىٰهَآ﴾یانی: سەمود بە هۆی توغیانی خۆیانەوە حاشایان کرد، خودای گەورە باسی سەمود ئەکات کە حاشایان ئەکرد لە پێغەمبەرەکەیان بەهۆی سەرکەشی و تاوان کردنیانەوە، قەتادە و موجاهید کەسانی تریش ئەمە ئەڵێن.بە دوای ئەمەدا دڵیشیان دەستی کردە حاشاکردن لەوەی کە پێغەمبەرەکەیان بۆی هێناون کە بەرنامەیەکە هیدایەت و یەقینی تێدایە: ﴿إِذِ ٱنۢبَعَثَ أَشْقَىٰهَا﴾ واتە: کاتێ کە خراپترینیان هەڵسایەوە بۆ سەربڕینی حوشترەکە، یانی: بەدبەخترینی هۆزەکە کە ناوی قوداری کوڕی سالف بوو دەست و پێی وشترەکەی بڕی، ئەوە بێئەقڵترین کەسی هۆزی سەمود بوو، ئەو کەسە بوو کە خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿فَنَادَوْا۟ صَاحِبَهُمْ فَتَعَاطَىٰ فَعَقَرَ﴾ واتە:

کەلەکەی لەم کارە بێزار بوون، جا بانگی هاوڕێ خراپەکەیان کرد قوداری کوڕی سەلف ئەویش دەستی دایە شمشێرو حوشترەکەی سەربڕی. ئەم پیاوە لەناو هۆزەکەیدا زۆر بەڕێزو بە قەدر بوو، لە بنەماڵەیەکی دیار بوو، گەورەیان بوو فەرمانیان بەجێ ئەهێنا. وەك ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە عەبدوڵای کوڕی زەمعەوە کە ئەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) ووتارێکی داو باسی وشترەکەی کرد، وە باسی ئەو کەسەی کرد کە کوشتی﴿إِذِ ٱنۢبَعَثَ أَشۡقَىٰهَا﴾یانی: کە خراپترینیان بۆ وشترەکە هەستایەوە کە ئەو کەسە پیاوێکی بەڕێزو بە دەسەڵات و بەتوانا بوو لەناو هۆزەکەی، وەك ئەبو زەمعە. بوخاری لە تەفسیرەکەیدا و موسلیم لە صفه النارداو ترمیزی و نەسائیش لە تەفسیردا و لەهەردوو سونەنەکەیاندا ئەم فەرمودەیان ڕیوایەت کردووە.

## چیرۆکی وشترەکەی صالح

خوادی گەورەئەفەرموێت: ﴿فَقَالَ لَهُمۡ رَسُولُ ٱللَّهِ نَاقَةَ ٱللَّهِ وَسُقۡيَٰهَا﴾ واتە: ئینجا پێغەمبەرەکەی خوا پێی وتن: واز بێنن لەم وشترەی خوا لە نۆرە ئاوەکەی﴿فَقَالَ لَهُمۡ رَسُولُ ٱللَّهِ﴾ یانی: صالح سەلامی خوای لێبێت ﴿نَاقَةَ ٱللَّهِ﴾ یانی: بترسن لەم وشترەی ئەگەر بە خراپی دەستی بۆ بەرن ﴿وَسُقۡيَٰهَا﴾ واتە: دەستدرێژیش مەکەنە سەر نۆرە ئاوەکەی، ڕۆژێك نۆرە ئاوی ئێوەیە ڕۆژێك نۆرە ئاوی ئەو وشترەیە، کەچی بڕوایان پێنەکرد و حوشترەکەیان سەربڕی ئینجا پەروەردگاری ئەوان سزای ڕشت بەسەریاندا بە هۆی گوناهەکانیانەوەو تەختی کردن ﴿فَكَذَّبُوهُ فَعَقَرُوهَا فَدَمۡدَمَ عَلَيۡهِمۡ رَبُّهُم بِذَنۢبِهِمۡ فَسَوَّىٰهَا﴾ یانی: باوەڕیان پێنەکرد بەوەی کە بۆی هێنابوون،بەدوای ئەوە دەست و پێی ئەو وشترەیان بڕی کە خودا بۆی دەرهێنان لەو بەردە تا ببێتە نیشانەو بەڵگە لە سەریان ﴿فَدَمۡدَمَ عَلَيۡهِمۡ رَبُّهُم بِذَنۢبِهِمۡ﴾ یانی: خودا توڕە بوو لێیان و بەڵایەکی ناردە سەریان ﴿فَسَوَّىٰهَا﴾ یانی: هەموویان بەڵایان بۆ دابەزی وەك یەك. قەتادە ئەڵێت: پێمان گەیشتووە کە ئەحیمیری هۆزی سەمود وشترەکەی نەکوشت تا گەورەو بچوك و نێرو مێ پەیمانیان دایە، کاتێ هەموو هۆزەکە هاوبەشیان کرد لە کوشتنی وشترەکەدا، خودا بەهۆی گوناهەکەیان بەڵایەکی ناردە سەریان و هەموویانی ڕێکی زەوی کرد.وە ئەفەرموێت: ﴿وَلَا يَخَافُ عُقۡبَٰهَا﴾ واتە: وە خوا ناترسێ لە پاشەڕۆژی ئەم تۆڵە لێسەندنەیان ﴿وَلَا يَخَافُ﴾ بە (فلا يخاف)یش خوێندراوەتەوە. ئیبنو عەباس ئەڵێت: خوا لەئاکامی ئەو کارەی ترسی لەکەس نیە. هەروەها موجاهید و حەسەن و بەکری کوڕی عەبدوڵای موزەنی و کەسانی تریش هەروایان وتووە.

## سورەتى ( الليل )

## لە مەككەداهاتووەتەخوارەوە

### خێرى خوێندنى ﴿وَٱلَّيۡلِ إِذَا يَغۡشَىٰ﴾ لە نوێژى خەوتناندا

فەرمودەى پێغەمبەر(ﷺ) لە پێشەوە لەبارەى مەعازەوە باس كرا: خۆزگە نوێژت بكردايە بە ﴿سَبِّحِ ٱسۡمَ رَبِّكَ ٱلۡأَعۡلَى - وَٱلشَّمۡسِ وَضُحَىٰهَا - وَٱلَّيۡلِ إِذَا يَغۡشَىٰ﴾.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿وَٱلَّيۡلِ إِذَا يَغۡشَىٰ (١) وَٱلنَّهَارِ إِذَا تَجَلَّىٰ (٢) وَمَا خَلَقَ ٱلذَّكَرَ وَٱلۡأُنثَىٰٓ (٣) إِنَّ سَعۡيَكُمۡ لَشَتَّىٰ (٤) فَأَمَّا مَنۡ أَعۡطَىٰ وَٱتَّقَىٰ (٥) وَصَدَّقَ بِٱلۡحُسۡنَىٰ (٦) فَسَنُيَسِّرُهُۥ لِلۡيُسۡرَىٰ (٧) وَأَمَّا مَنۢ بَخِلَ وَٱسۡتَغۡنَىٰ (٨) وَكَذَّبَ بِٱلۡحُسۡنَىٰ (٩) فَسَنُيَسِّرُهُۥ لِلۡعُسۡرَىٰ (١٠) وَمَا يُغۡنِي عَنۡهُ مَالُهُۥٓ إِذَا تَرَدَّىٰٓ (١١)﴾

### سوێند خواردن لەسەر جیاوازى خەڵكى لە تێكۆشاندا و ئاگاداریدانیش دەربارەى جیاوازى بەرهەمەكانى ئەو هەوڵانەش

خوداى گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَٱلَّيۡلِ إِذَا يَغۡشَىٰ﴾واتە: سوێندبەشەو كاتێك كە زەوى دادەپۆشێت. یانى: كاتێ كە هەموو شت دادەپۆشێ بە تاریكیەكەى،وە ئەفەرموێت: ﴿وَٱلنَّهَارِ إِذَا تَجَلَّىٰ﴾واتە: وە بەڕۆژ كاتێ كە ڕوناك ئەبێتەوە، وە ئەفەرموێت: ﴿وَمَا خَلَقَ ٱلذَّكَرَ وَٱلۡأُنثَىٰٓ﴾ واتە: وە بەو زاتەى كەنێرو مێى دروست كردووە. ئەم ئایەتە وەك ئەم ئایەتانە وایە ئەفەرموێت: ﴿وَخَلَقۡنَٰكُمۡ أَزۡوَٰجٗا﴾ واتە: وە ئێوەمان دروست كردووە بەجووت. وە ئەفەرموێت: ﴿وَمِن كُلِّ شَيۡءٍ خَلَقۡنَا زَوۡجَيۡنِ﴾ واتە: لەهەموو شتێ: جووت (نێرو مێ) مان دروست كردووە. كاتێ سوێند بەو شتانە خورا كە دژ بەیەك بوون سوێند لەسەر خوراوەكەش دووبارە دژ بەیەك بوون، بۆیە خوداى گەورە ئەفەرموێت: ﴿إِنَّ سَعۡيَكُمۡ لَشَتَّىٰ﴾ واتە: بەڕاستى هەوڵ و كۆششى ئێوە جۆراو جۆرە، یانى: كردارێ كە بەندەكانى پێى هەڵساون دژ بەیەكن و جیاوازن، هەیە هەستاوە بەچاكە و هەیشە هستاوە بە خراپە،وە ئەفەرموێت: ﴿فَأَمَّا مَنۡ أَعۡطَىٰ وَٱتَّقَىٰ﴾ واتە: ئینجا ئەو كەسەى ماڵ ببەخشێ و لە خوا بترسێت و پارێزگار بێت. یانى: ئەوەى فەرمانى پێدراوە كە ببەخشێ ئەیبەخشێت و وە لە خودا ئەترسێت لە كاروباریدا﴿وَصَدَّقَ بِٱلۡحُسۡنَىٰ﴾ واتە: وە بڕواى ببێ بەوەى كە زۆر چاكە. قەتادە ئەڵێ بڕوا، بە پاداشت دانەوە ئەكات لەسەر ئەوە،خوصەیف ئەڵێ: بەچاكە.وە ئەفەرموێت: ﴿فَسَنُيَسِّرُهُۥ لِلۡيُسۡرَىٰ﴾ واتە: ئەوە زوو یارمەتى ئەدەین بۆ ڕێى ئاسان كە چاكەیە. ئیبنو

عەباس ئەڵێت: یانی بۆ چاکە.بۆیە خودا ئەفەرموێت: ﴿وَأَمَّا مَنۢ بَخِلَ وَٱسۡتَغۡنَىٰ﴾ واتە: وە ئەو کەسەی ڕژدی بکات خۆی بێ نیاز بزانێت، یانی: بەوەی کە هەیەتی، عیکرەمەو ئیبنو عەباس ئەڵێن: یانی: ڕژد بوو لەسامانیدا و بێ نیازی خۆی لە پەروەردگاری دەربڕی. وە ئەفەرموێت: ﴿وَكَذَّبَ بِٱلۡحُسۡنَىٰ﴾ واتە: وە بڕوای نەبێ بە چاکە کە (لا إله إلا الله) یا بەهەشتە. ئیبنو حاتەم ڕیوایەتی کردووەو ئەفەرموێت: ﴿وَكَذَّبَ بِٱلۡحُسۡنَىٰ﴾ یانی: بە پاداشت لە ڕۆژی دوایی﴿فَسَنُيَسِّرُهُۥ لِلۡعُسۡرَىٰ﴾ واتە: ئەوە زوو ڕێی سەختی بۆئاسان دەکەین، یانی: ڕێگەی خراپەی بۆ ئاسان ئەکرێت. وەك خودا ئەفەرموێت: ﴿وَنُقَلِّبُ أَفۡـِٔدَتَهُمۡ وَأَبۡصَٰرَهُمۡ كَمَا لَمۡ يُؤۡمِنُواْ بِهِۦٓ أَوَّلَ مَرَّةٖ وَنَذَرُهُمۡ فِي طُغۡيَٰنِهِمۡ يَعۡمَهُونَ﴾ واتە: وە کاتی هاتنی موعجیزەکان دڵ و چاویان وەردەگێڕێت و لای دەدەین لە باوەڕ هێنان هەروەك لەسەرەتاوە بڕوایان بە قورئان نەهێناوە لێیان دەگەڕێن لەسەر کەشی خۆیاندا هەرسەرگەردان بن. ئایەت لەم مانایەدا زۆرە و بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە خوای گەورە پاداشتی ئەو کەسە ئەداتەوە کە نیەتی چاکەی هەیە بە تەوفیق بۆی و کار ئاسانی بۆ ئەکات، وە ئەو کەسەی نێتی خراپی هەیە بەد بەختی ئەکات، ئەو فەرمودانەی کە بەڵگەن لەسەر ئەم مانایە زۆر زۆرن.

**ڕیوایەتی ئەبوبەکری صدیق ( ڕەزای خوای لێبێت )**

ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو بەکری صدیقەوە فەرمویەتی: وتم بە پێغەمبەر(ﷺ) ئەی پێغەمبەری خودا ئایا کار بکەین لەسەر ئەوەی کە تەواو بوەو براوەتەوە یان هەر سەرەتایە هێشتا؟ فەرمووی: بەڵێ لەسەر شتێك کە تەواو بووەو لێ بوەتەوە. فەرموی: ئیتر کار بۆچی ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ)؟ فەرمووی: هەموو کەسێ ئاسان کاری بۆ کراوە لەبەرانبەر ئەوەدا بۆی وەدی هاتووە.

**ڕیوایەتی عەلی کوڕی ئەبو تالیب ( ڕەزای خوای لێبێت )**

بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە عەلی کوڕی ئەبو تالیبەوە(خوا لێی ڕازی بێت) فەرموویەتی: لەگەڵ پێغەمبەردا(ﷺ) بووین لە بەقیعی غەرقەدا جەنازەیەکمان پێبوو فەرمووی: هیچ کەسێ نیە لە ئێوە مەگین شوێنەکەی لە بەهەشتدا دیاری کراوە وە لە جەهەنەمدا شوێنەکەی دیاری کراوە. وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ)دەی ئەبێ پشتی پێنەبەستین ودەست لە کارو کردەوە هەڵبگرین؟ فەرمووی: ئیش بکەن هەموو کەسێ ئاسان کاری بۆ کراوە لەوەی بۆی وەدی هاتووە. پاشان ئەم ئایاتانەی خوێند: ﴿فَأَمَّا مَنۡ أَعۡطَىٰ وَٱتَّقَىٰ ۝٥ وَصَدَّقَ بِٱلۡحُسۡنَىٰ ۝٦ فَسَنُيَسِّرُهُۥ لِلۡيُسۡرَىٰ ۝٧ وَأَمَّا مَنۢ بَخِلَ وَٱسۡتَغۡنَىٰ ۝٨ وَكَذَّبَ بِٱلۡحُسۡنَىٰ ۝٩ فَسَنُيَسِّرُهُۥ لِلۡعُسۡرَىٰ﴾ خاوەنی کتێبەکانی تریش لە ئەم حەدیسەیان ڕیوایەت کردووە.

**ڕیوایەتی عەبدوڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خوای لێبێت)**

ئیمامی ئەحمەد لە ئیبنو عومەرەوە ڕیوایەتی کردووە کە ئەڵێت: عومەر ئەڵێت: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەرێ ئەوەی ئێمە ئەیکەین براوەتەوە یا دەست پێکراوە یا داهێنراوە؟ فەرمووی: شتێکە براوەتەوە، ئیش بکە ئەی کوڕی خەتاب چونکە هەموو کەسێ ئاسان کاری بۆ کراوە، ئەوەی لە کۆمەڵی بەختەوەرانە بێگومان ئیش ئەکات بۆ بەختەوەری، ئەوەیشی کۆمەڵی بەدبەختانە بێگومان ئیش ئەکات بۆ بەدبەختی. تیرمزی ڕیوایەتی کردووە لە باسی قەدەردا ئەڵێت: فەرمودەیەکی حەسەنی صەحیحە.

**فەرمودەیەکی تر کە جابر ڕیوایەتی کردووە (ڕەزای خوای لێ بێ)**

ئیبنو جەریر ڕیوایەتی کردووە لە جابری کوڕی عەبدلاوە کە ئەڵێ: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئایا ئیش بکەین بۆ شتێ کە تەواو بووە یان بۆ شتێ کە لەمەولا دەستی پێدەکەین؟ فەرمووی: لە شتێ تەواو بوە کاری بۆ بکەن. سوراقە ئەڵێت: جا ئیتر ئیش کردن بۆچی؟پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: هەموو ئیش کەرێ ئیشەکەی بۆ ئاسان کراوە. موسلیم ڕیوایەتی کردووە ئیبنو جەریر ڕیوایەتی کردووە لە عامری کوڕی عەبدولای کوڕی زوبەیرەوە کە ئەڵێ: کەسێ مسوڵمان ببوایە لە مەککە ئەبو بەکر(خوای لێ ڕازی بێ) ڕزگاری ئەکرد ئەوە بوو کەژن و پیرەژنی ئازاد ئەکرد کاتێ مسوڵمان ئەبوون، باوکی پێی ووت: کوڕم سەیر ئەکەم و ئەت بینم خەڵکێکی بێ دەسەڵات ئازاد ئەکەی ئەگەر تۆ پیاوانێکی بەهێز کە لەگەڵتا بن بتپارێزن و بەرگریت لێبکەن چاکترە؟ ئەبو بەکر ووتی: ئەی باوکە (ڕەوایە کە ئەڵێ وابزانم) من ئەوەم دەوێ کە لەلای خودایە. عامری کوڕی عەبدولای کوڕی زوبەیر ئەڵێت: هەندێ لە بنەماڵەی خۆمان بۆی گێڕامەوە کە ئەم ئایەتە لەسەر ئەو هاتۆتە خوارەوە: ﴿فَأَمَّا مَنْ أَعْطَىٰ وَاتَّقَىٰ ﴿٥﴾ وَصَدَّقَ بِالْحُسْنَىٰ ﴿٦﴾ فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْيُسْرَىٰ﴾پاشان ئەفەرموێت: ﴿وَمَا يُغْنِي عَنْهُ مَالُهُ إِذَا تَرَدَّىٰ﴾ واتە: وە سەروەت و سامانەکەی قازانجی پێناگەیەنێ کاتێك کە تیا دەچێ، موجاهید ئەڵێت: یانی: کاتێ مرد. ئەبو صالح و مالیك لە زەیدی کوڕی ئەسلەمەوە ئەڵێن: کاتێ خرایە ناو گۆڕ.

﴿إِنَّ عَلَيْنَا لَلْهُدَىٰ ﴿١٢﴾ وَإِنَّ لَنَا لَلْآخِرَةَ وَالْأُولَىٰ ﴿١٣﴾ فَأَنذَرْتُكُمْ نَارًا تَلَظَّىٰ ﴿١٤﴾ لَا يَصْلَاهَا إِلَّا الْأَشْقَى ﴿١٥﴾ الَّذِي كَذَّبَ وَتَوَلَّىٰ ﴿١٦﴾ وَسَيُجَنَّبُهَا الْأَتْقَى ﴿١٧﴾ الَّذِي يُؤْتِي مَالَهُ يَتَزَكَّىٰ ﴿١٨﴾ وَمَا لِأَحَدٍ عِندَهُ مِن نِّعْمَةٍ تُجْزَىٰ ﴿١٩﴾ إِلَّا ابْتِغَاءَ وَجْهِ رَبِّهِ الْأَعْلَىٰ ﴿٢٠﴾ وَلَسَوْفَ يَرْضَىٰ ﴿٢١﴾﴾

## ڕێنیشاندان و شتی تریش هەر بە دەستی خودایە

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿إِنَّ عَلَيْنَا لَلْهُدَىٰ﴾ واتە: بەڕاستی لەسەر ئێمەیە ڕێنمونی. قەتادە ئەڵێت: یانی حەلاڵ و حەرام ڕوون دەکەینەوە. کەسانی تریش ئەڵێن: هەرکەسێ ڕێگای ڕاستی گرتبێت گەیشتووە بە خودا. وەك خودا دەفەرموێت: ﴿وَعَلَى اللَّهِ قَصْدُ السَّبِيلِ﴾ واتە: ڕێگای ڕاست نیشان بە بەندەکان تەنها بۆ خودایە.ئیبنو جەریر ئەمەی گێڕاوەتەوە.وە ئەفەرموێت: ﴿وَإِنَّ لَنَا لَلْآخِرَةَ وَالْأُولَىٰ﴾ واتە: وە هەردوو جیهان هی ئێمەیە.یانی ئێمە خاوەنی هەموو شتێکین و هەڵسوڕاندنی بە دەستی ئێمەیە، وە ئەفەرموێت: ﴿فَأَنذَرْتُكُمْ نَارًا تَلَظَّىٰ﴾ واتە: من ئێوەم ترساند بە ئاگرێکی بڵێسە دار کەدۆزەخە.موجاهید ئەڵێ: بڵێسەدار. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە سەماکی کوڕی حەربەوە کە ئەڵێت: گوێم لە نەعمانی کوڕی بەشیر بوو وتاری ئەدا و ئەی ووت: بیستم لە پێغەمبەر(ﷺ) ووتاری ئەدا و ئەی فەرموو: ئێوەم ترساند لە ئاگر، ئێوەم ترساند لە ئاگر، تا ئەو کەسەش لە بازاڕ دایە ئەمەی من لێرەدا ئەیلێم ئەو گوێی لێیە، ڕاویەکە ئەڵێت: ئەوەندە ئەم فەرمایشتەی فەرموو ئەو جل و بەرگەی لەسەر شانی بوو کەوتە بە ر هەردوو پێی. ئیمامی ئەحمەدیش ڕیوایەتی کردووە لە ئەبوو ئیسحاقەوە کە ئەڵێت: گوێم لە نەعمامی کوڕی بەشیر بوو ئەیووت: بیستم لە پێغەمبەرەوە (ﷺ)ئەی فەرموو: ئاسان ترین سزای خەڵکی ناو ئاگر لە ڕۆژی قیامەتدا پیاوێکە دوو پشکۆی ئاگر دادەنرێ لە ژێر هەردوو پێیدا مێشکی ئەکوڵێ پێی. بوخاری ڕیوایەتی کردووە. موسلیمیش ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو ئیسحاقەوە ئەویش لە نیعمانی کوڕی بەشیرەوە کە ئەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: کەمترین سزای خەڵکی ناو ئاگر کەسێکە کە دوو نەعلی بە قەیتان بەستراوی لە ئاگر لە پێدایە مێشکی ئەکوڵێنن وەك چۆن قازانگ ئەکوڵێ، کەسیش نابینی لەو سزای سەخت تر بێت،وە ئەمە کەمترین سزای خەڵی ناو دۆزەخە. وە ئەفەرموێت: ﴿لَا يَصْلَاهَا إِلَّا الْأَشْقَى﴾ واتە: کەسێ ناچێتە دۆزەخەوە مەگین خراپترین کەس. یانی: ناچێتە ناوی کە ئاگر هەموو چوار دەوری بگرێ مەگین بەدبەخت. پاشان خوای گەورە مانای ئەو کەسە ئەکات و ئەفەرموێت: ﴿الَّذِي كَذَّبَ وَتَوَلَّىٰ﴾ واتە: ئەو کەسەی کە بڕوای نەبێت و پشتی هەڵکردبێ لە ئاینی ڕاست. ﴿الَّذِي كَذَّبَ﴾ یانی: بەدڵی ﴿وَتَوَلَّىٰ﴾ یانی: لەئیش کردن بە ئەندامەکانی پشت هەڵئەکات. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئەبوو هورەیرەوە فەرمویەتی: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: هەموو ئومەتی من ئەچێتە بەهەشت لە ڕۆژی قیامەتدا مەگین کەسێ خۆی نەیەوێ. وتیان ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) کێ نایەوێ ؟ فەرمووی: هەرکەسێ گوێڕایەڵی من بکات ئەچێتە بەهەشت، هەرکەسیش گوێڕایەڵی من نەکات ئەوە بەهەشتی ناوێ. بوخاری ڕیوایەتی کردووە.وە ئەفەرموێت:

﴿وَسَيُجَنَّبُهَا ٱلْأَتْقَى﴾ واتە: وە لێی دور دەخرێتەوە پارێزگارترین کەس. یانی: بەم زوانە دوور دەخرێتەوە لە ئاگر ئەو خواناس و پاك و زۆر خۆپارێزانە، پاشان خودای گەورە مانای ئەو کەسە ئەکات و ئەفەرموێت: ﴿ٱلَّذِى يُؤْتِى مَالَهُۥ يَتَزَكَّىٰ﴾ واتە: ئەوەی ماڵی خۆی دەبەخشێ تا دڵ و دەرونی پاك ببێتەوە. یانی: ماڵ ئەبەخشێ بۆ بەجێهێنانی فەرمانی پەروەردگاری بۆ ئەوەی گیان و سامانی پاك بکاتەوە و لەوەی خودا پێی بەخشیوە لە دین و دونیادا، وە ئەفەرموێت: ﴿وَمَا لِأَحَدٍ عِندَهُۥ مِن نِّعْمَةٍ تُجْزَىٰٓ﴾ واتە: لەکاتێکدا کەس چاکەیەکی وای بەسەریەوە نیە کە پاداشت بدرێتەوە. یانی: بەخشینی سامانەکەی بۆ ئەوە نەبووە کە کەسێك چاکەیەکی لەگەڵ کردبێ ئەمیش لە جیاتی ئەو چاکەدا پێی بەخشیبێ. بەڵکو ئەوەی پاڵی پێوە ناوە﴿إِلَّا ٱبْتِغَآءَ وَجْهِ رَبِّهِ ٱلْأَعْلَىٰ﴾ واتە: تەنها مەبەستی ڕەزامەندی پەروەردگاری بەرز و بڵندە. یانی: بەنیازی ئەوەی کە بینینی خودای خۆی بەدەست بهێنێ لە ڕۆژی دوایی و لە باغەکانی بەهەشتدا. وە ئەفەرموێت: ﴿وَلَسَوْفَ يَرْضَىٰ﴾ واتە: سوێند بە خوا ئەو کەسەی وا بێت لەمەولا ڕازی دەبێت بە پاداشتی دوا ڕۆژ. یانی: بەم زوانە ئەو کەسەی خۆی ڕازاندوەتەوە بەم ڕەوشتانە ڕازی ئەبێت.

**هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتانە و گەورەیی ئەبو بەکر (ڕەزای خوای لێ بێ)**

زیاد لە تەفسیر زانێك باسی ئەوەی کردووە کە ئەم ئایەتانە لە بارەی ئەبو بەکری صدیقەوە هاتۆتە خوارە (ڕەزای خوای لێ بێ).وە هەندێ وای دەگێڕنەوە کە کۆی زانایانی تەفسیری لەسەرە و هیچ گومان نیە کە ئەبو بەکر(ڕەزای خوای لێ بێ) ئەم ئایاتانە ئەیگرێتەوە و شایستە ترین کەسی ئەم ئومەتەیە کە بچێتە ناو ئەو کەسانەوە، چونکە ووتەی ئایەتەکە بۆ هەموانە. ئەوەتا خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَسَيُجَنَّبُهَا ٱلْأَتْقَى ﴿١٧﴾ ٱلَّذِى يُؤْتِى مَالَهُۥ يَتَزَكَّىٰ ﴿١٨﴾ وَمَا لِأَحَدٍ عِندَهُۥ مِن نِّعْمَةٍ تُجْزَىٰٓ﴾ دەی خۆ ئەبو بەکر(ڕەزای خوای لێ بێ)پێشەنگی ئەم ئومەتەیە و دەستپێشخەر بووە لە هەموو ئەم ڕەوشتانەدا و چەندین ڕەوشتی جوانی تر. چونکە ئەو زۆر ڕاستگۆ و خوا ناس و سەخی تەبیعەت و سامان بەخش بووە لەبەر خاتری خوای خۆیی و هاوکاری کردنی بۆ پێغەمبەر(ﷺ) زۆر پارەو پولی بەخشی لەبەر خاتری ڕەزامەندی پەروەردگاری، ئەبو بەکر کەسێ نەبووە کە خەڵك هەیبوبێت بەسەریەوە و ئەمیش لەبەر ئەوە پاداشتی دابێتەوە، بەڵکو چاکە و یارمەتی دانی زۆری بووە بەسەر دەسەلأت دارو سەرۆك هۆزەکانەوە، هەر لەبەر ئەوەیشە کە عوروەی کوڕی مەسعود کە سەرۆکی سەقیف بوو لە ڕۆژی ڕێکەوتنی حودەیبیە پێی ووت: بەڵام سوێند بە خوا ئەی ئەبو بەکر ئەگەر پیاوەتیت بەسەرمەوە نەبوایە لێم قبوڵ نەئەکردی و وەڵامم ئەدایتەوە. هۆکەی ئەوە بوو کە ئەبوبەکریش زۆر بەتوڕەیی

قسەی لەگەڵ کرد و ئەویش وای پێووت، ئەگەر ئەمە حاڵی بوبێ لەگەڵ دەسەلآت دارو سەرۆك هۆزەکانی عەرەب ئەی بۆ کەسانی تر ئەبێ چۆن بوبێ؟ بۆیە خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَمَا لِأَحَدٍ عِندَهُۥ مِن نِّعْمَةٍ تُجْزَىٰٓ ﴿١٩﴾ إِلَّا ٱبْتِغَآءَ وَجْهِ رَبِّهِ ٱلْأَعْلَىٰ ﴿٢٠﴾ وَلَسَوْفَ يَرْضَىٰ ﴾ لەهەردوو سەحیحەکەی بوخاری و موسلیمدا هاتووە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: هەرکەسێ دوو کەس ئازاد بکات دەرگەوانی بەهەشت بانگی ئەکەن: ئەی بەندەی خوا ئا ئەمەیە چاکە. ئەبو بەکر ئەڵێت: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) هەرکەسێ لەو دەرگایەوە بانگ بکرێت ئەوە پێویستی بە هیچ نابێت،ئاخۆ هیچ کەسێ هەیە لەو هەموو دەرگانەوە بانگی لێبکرێت؟ پێغەمبەر فەرمووی: بەڵێ من ئومێدەوارم تۆ لەوانە بیت.

## سورەتی ( الضحى )

## لەمەککەدا هاتووەتە خوارەوە

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿وَٱلضُّحَىٰ ﴿١﴾ وَٱلَّيْلِ إِذَا سَجَىٰ ﴿٢﴾ مَا وَدَّعَكَ رَبُّكَ وَمَا قَلَىٰ ﴿٣﴾ وَلَلْءَاخِرَةُ خَيْرٌ لَّكَ مِنَ ٱلْأُولَىٰ ﴿٤﴾ وَلَسَوْفَ يُعْطِيكَ رَبُّكَ فَتَرْضَىٰٓ ﴿٥﴾ أَلَمْ يَجِدْكَ يَتِيمًا فَـَٔاوَىٰ ﴿٦﴾ وَوَجَدَكَ ضَآلًّا فَهَدَىٰ ﴿٧﴾ وَوَجَدَكَ عَآئِلًا فَأَغْنَىٰ ﴿٨﴾ فَأَمَّا ٱلْيَتِيمَ فَلَا تَقْهَرْ ﴿٩﴾ وَأَمَّا ٱلسَّآئِلَ فَلَا تَنْهَرْ ﴿١٠﴾ وَأَمَّا بِنِعْمَةِ رَبِّكَ فَحَدِّثْ ﴿١١﴾﴾

### هۆی هاتنە خوارەوەی سورەتی ( الضحى )

ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە جوندەبەوە ئەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) ئێشی هەبوو شەوێ یا دوو شەو هەڵنەسا بۆ شەو نوێژ، ژنێك هات ووتی: ئەی موحەمەد وا بزانم شەیتانەکەت وازی لێهێناوی خوای گەورەش ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە ﴿وَٱلضُّحَىٰ﴾ واتە: سوێند بە چێشتەنگاو ﴿وَٱلَّيْلِ إِذَا سَجَىٰ﴾ واتە: وە سوێند بەشەو کاتێك کە ئارام دەگرێت ﴿مَا وَدَّعَكَ رَبُّكَ وَمَا قَلَىٰ﴾ واتە: پەروەردگارت وازی لێ نەهێناویت و لێت دلگیر نەبووە. ئیمامی بوخاری و موسلیم و تیرمیزی و نەسائی و ئیبنو ئەبی حاتەم و ئیبنو جەریر لە جوندەبەوە کە کوڕی عەبدوڵای بەجەلیە و پاشان عەلەقیە ئەم حەدیسەیان ڕیوایەت کردووە.وە لە ڕیوایەتێکی تردا لە ئەسوەدی کوڕی قەیسەوە کە گوێی لە جوندەب بووەوو تویەتی: جوبرەئیل درەنگ هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)بتپەرستەکان ئەیان ووت: پەروەردگاری موحەمەد وازی لە موحەمەد هێناوە. خودای گەورە ئەم ئایەتانەی ناردە خوارەوە: ﴿وَٱلضُّحَىٰ ﴿١﴾ وَٱلَّيْلِ إِذَا سَجَىٰ ﴿٢﴾ مَا وَدَّعَكَ رَبُّكَ وَمَا قَلَىٰ﴾ عەوفی ئەڵێت: لە ئیبنو عەباسەوە: کاتێ قورئان هاتە خوارەوە بۆ پێغەمبەر(ﷺ) چەند ڕۆژێك جوبرەئیل نەهات بۆ خزمەتی پێغەمبەر ناڕەحەتی پێوە دیار بوو بتپەرستەکان ئەیان

ووت: پەروەردگاری وازی لێهێناوەو لێی قەڵسە. خوداش ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: ﴿مَا وَدَّعَكَ رَبُّكَ وَمَا قَلَىٰ﴾ ئەمە سوێندێکە لە خوداوە بە چێشتەنگاو و بەو ڕوناکیەی کە تیایەتی ﴿وَٱلَّيۡلِ إِذَا سَجَىٰ﴾ یانی: بە ئارام گرتن و تەواو تاریك داهاتنی شەو. موجاهید و قەتادە و زەححاك و ئیبنو زەید و کەسانی تریش ئەمەیان وتووە.ئەوەیش بەڵگەیە لەسەر توانای وەدی هێنەری شەویش و ڕۆژیش وەك خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَٱلَّيۡلِ إِذَا يَغۡشَىٰ ۝١ وَٱلنَّهَارِ إِذَا تَجَلَّىٰ﴾ واتە: سوێند بە شەو کاتێك کە زەوی دادەپۆشێت، وە بەڕۆژ کاتێك کە ڕوناك دەبێتەوە وە ئەفەرموێت: ﴿فَالِقُ ٱلۡإِصۡبَاحِ وَجَعَلَ ٱلَّيۡلَ سَكَنٗا وَٱلشَّمۡسَ وَٱلۡقَمَرَ حُسۡبَانٗاۚ ذَٰلِكَ تَقۡدِيرُ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡعَلِيمِ﴾ واتە: خوا بەدی هێنەری شەبەق و ڕوناکی ڕۆژ بونەوەیە و شەوی کردووە بە کات و هۆی ئارامگرتن و خۆر و مانگی کردوەتە هۆی حساب دیاری کردن و زانینی کات ئەوەیشی ئەندازە گرتنی خوای بە دەسەڵاتی زانایە. وە ئەفەرموێت: ﴿مَا وَدَّعَكَ رَبُّكَ﴾ واتە: وازی لە تۆ نەهێناوە ﴿وَمَا قَلَىٰ﴾ واتە: لێت قەڵس نیە.

## دوا ڕۆژ لە دونیا چاکترە

خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَلَلۡأٓخِرَةُ خَيۡرٞ لَّكَ مِنَ ٱلۡأُولَىٰ﴾ واتە: وە پاداشتی دواڕۆژ بۆ تۆ چاکترە لە دونیا. هەر لەبەر ئەوەش بوو کە پێغەمبەر(ﷺ) زاهد ترین کەس بوو لە دونیادا. وە لە هەموو کەسێ زیاتر دونیای فڕێ دابوو وەك چۆن بە ڕوونی لە ژیاندا دەردەکەوێت، وە کاتێ کە سەرپشك کرا لە کۆتایی ژیاندا کە تا کۆتایی دونیا بمێنێتەوە پاشان بۆ بەهەشت، یان بگەڕێتەوە بۆ لای خوا، پێغەمبەر(ﷺ) ئەم دونیا بێنرخەی واز لێهێناو لای خوای هەڵبژارد. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە. عەبدوڵای کوڕی مەسعود ئەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) ڕاکشابوو لەسەر حەسیرێ، شوێنی حەسیرەکە لەملاو لای پشتیدا دیار بوو، کاتێ بەخەبەر هات منیش دەستم کرد بە سڕینی ئەملا و لای و گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) نەدەبوو بانگمان بکەی تا شتێ لەسەر حەسیرەکە ڕاخەین؟ پێغەمبەر(ﷺ)فەرمووی: من لە دونیام چی؟ وێنەی من و وێنەی دونیا وەك سوارێکە ماوەیەك لە ژێر درەختێکدا بێت و پاشان بڕوات و بەجێی بهێڵێت. تیرمزی و ئیبنو ماجە ڕیوایەتیان کردووە لەمەسعودییەوە. تیرمزی ئەڵێت: حەسەن و سەحیحە.

## بەهرە زۆرەکانی ڕۆژی دوایی لە چاوەڕوانی پێغەمبەردان(ﷺ)

خودای گەورەئەفەرموێت: ﴿وَلَسَوۡفَ يُعۡطِيكَ رَبُّكَ فَتَرۡضَىٰٓ﴾ واتە: سوێند بە خوا لەمەولا پەروەردگارت ئەوەندەت پێدەبەخشێ کە ڕازی ببیت.یانی: خوای گەورە لە ڕۆژی دوایدا ئەوەندە چاکە لەگەڵ ئومەتەکەتدا ئەکات تا ڕازی ئەکات،ئەوەندەش ڕێزی بۆ پاشەکەوت کردووە لە وێنەی ئەو ڕێزانە

ڕووباری کەوسەرە کە چوار دەورەکەی مرواری ناو بۆشە و قوڕو لیتەکەی میسکێکی تەواو بۆن خۆشە وەك لەمەودوا باس دەکرێ.ئیمامی ئەبو عەمری ئەوزاعی ڕیوایەتی کردووە لە عەبدوڵای کوڕی عەباسەوە کە ئەڵێ: هەموو ئەو گەنجینانەی کە خوا دەرگای ئەکاتەوە بۆئومەتی پێغەمبەر(ﷺ) پاش مردنی خۆی دانەدانە پێشانی پێغەمبەر(ﷺ) درا ئەویش زۆر دڵخۆش بوو پێی. خوای گەورە ئەم ئایەتەشی ناردە خوارەوە بۆی: ﴿وَلَسَوۡفَ يُعۡطِيكَ رَبُّكَ فَتَرۡضَىٰٓ﴾ یانی: لە دوایشدا ئەوەندەی ترت پێئەدەین تا ڕازیت ئەکەین. لە بەهەشتدا هەزار هەزار کۆشکی پێبەخشیوە، لەناو هەموو کۆشکێکدا چەند پێویستە لە خێزان و خزمەت چی پێی بەخشیوە. ئیبنو جەریر ئەم قسەیەی ڕیوایەت کردووەو ئیبنو ئەبی حاتەمیش بەهەمان شێوە لە ڕێگای خۆیەوە ڕیوایەتی کردووە.

**باسی هەندێ لەو بەهرانەی کە خوا بەخشیویەتی بە پێغەمبەر(ﷺ)**

پاشان خودای گەورە بەهرەکانی خۆی ئەژمێرێ کە داویەتی بە بەندە و پێغەمبەری خۆی موحەمەد(ﷺ) باسی ئەکات و ئەفەرموێت: ﴿أَلَمۡ يَجِدۡكَ يَتِيمٗا فَـَٔاوَىٰ﴾ واتە: ئایا تۆی نەدی بە هەتیوی حەوانیتیەوە. چونکە کاتێ باوکی مرد ئەو لەناو سکی دایکیدا بوو، پاشان کە دایکیشی مرد کە ئامینەی کچی وەهەب بوو تەمەنی شەش ساڵان بوو، پاشان لەلای باپیری عەبدولموتەلیب بوو تا مرد لەو کاتەدا تەمەنی هەشت ساڵان بوو، پاش ئەوەش مامی ئەبو تالیب بردیە لای خۆی. بەردەوام لە دەوری پێغەمبەر بووە(ﷺ)پشتگیری کردووە و بە ڕێزەوە بۆی ڕوانیوە و دڵی ڕاگرتووە هەرکاتێ هۆزەکەی بیان ویستایە ئازاری بدەن پارێزگاری لێدەکرد، دوای ئەوەی کە خودا لەتەمەنی چل ساڵیدا کردی بە پێغەمبەر(ﷺ) ئەمانە لە کاتێکیشدا بوو کە ئەبو تالیب هەر لەسەر ئاینی هۆزەکەی خۆی بوو کە بەندایەتی کردن بوو بۆ بت، ئەمانە هەمووی بە نەخشە و بڕیاری خوای گەورە بوو. ماوەیەکی کەم پێش کۆچکردنی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ مەدینە ئەبو تالیب مرد، بێ ئاوەز و نەفامەکانی قوڕەیش دەستیان کردە ئازاردانی و خودا ڕێگای کۆچ کردنی بۆ هەڵبژارد لەناو کەس و کاریدا بۆ شاری پشتیوانان لە هۆزی ئەوس و خەزرەج، بەو جۆرە خوای گەورە سونەتی خۆی بەجێ هێنا بە شێوەیەکی چاك و تەواو، کاتێ گەیشتە لایان پێشوازیان لێکردو یارمەتیان داو لەدەوری کۆبوونەوەو لە خزمەتیدا ئەجەنگان، ڕەزای خوا لەهەمویان بێت،ئەمانە هەمووی بەهۆی پاراستن و یارمەتی و ئاگاداری خوای مەزنەوە بووە بۆ پێغەمبەر(ﷺ)، پاشان خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَوَجَدَكَ ضَآلّٗا فَهَدَىٰ﴾ واتە: وە ئایا تۆی نەدی بە نەشارەزای و سەرلێشێواو ڕێنموونی کردیت. وەك ئەم فەرمودەیە: ﴿وَكَذَٰلِكَ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ رُوحٗا مِّنۡ أَمۡرِنَاۚ مَا كُنتَ تَدۡرِي مَا ٱلۡكِتَٰبُ وَلَا ٱلۡإِيمَٰنُ وَلَٰكِن جَعَلۡنَٰهُ نُورٗا نَّهۡدِي

بِهِۦ مَن نَّشَآءُ مِنْ عِبَادِنَا ﴾ واتە: هەربەو شێوە کە وەحی بۆ دێ قورئانمان بۆ تۆ نارد ئەی موحەمەد( ﷺ ) بە فەرمانی خۆمان کە تۆ نەتدەزانی کتێب و ئیمان چیە بەڵام ئێمە ئەوەمان کردە ڕوناکیەك ڕێنمونی هەرکەسێکی پێدەکەین لە بەندەکانمان کە بمان هەوێت،وە بەڕاستی تۆ خەڵك ڕێنمونی دەکەیت بۆ ڕێگای ڕاست.وە ئەفەرموێت: ﴿وَوَجَدَكَ عَآئِلًا فَأَغْنَىٰ﴾ واتە: وە تۆی نەدی بەهەژارو دەوڵەمەندی کردی، تۆ هەژارو خاوەن کوڵفەت(ژن و منداڵ) بویت، خوا بێنیازی کردی جگە لە خۆی، وە لەنێوان هەژارێکی ئارامگرو دەوڵەمەندێکی سوپاس گوزارا داینا و هێشتیەوە، صەلات و سەلامی خوای لەسەر بێت.لەهەردوو سەحیحەکەدا هاتووە لە ئەبو هورەیرەوە ئەڵێت: پێغەمبەر( ﷺ )فەرمووی: دەوڵەمەند بە زۆری سامان نیە، بەڵکو دەوڵەمەندی دەوڵەمەندی دڵە. وە لەسەحیحی موسلیمدا هاتووە لە عەبدوڵای کوڕی عەمرەوە ئەڵێت: پێغەمبەر( ﷺ ) فەرمویەتی: بێگومان ڕزگارە کەسێ مسوڵمان بوبێ و بەشی خۆی بژێوی پێدرابێ و خوا قەناعەتی پێ دابێ بەو بەشەی کە بۆی ناردووە.

## چۆن ڕێزی ئەم بەهرانە دەگرین

پاشان خوای گەورەئەفەرموێت: ﴿فَأَمَّا ٱلْيَتِيمَ فَلَا تَقْهَرْ﴾ واتە: کەواتە تۆش هەتیوو مەچەوسێنەرەوە یانی: وەك چۆن تۆ هەتیوو بووی خودا پەنای پێدای کەواتە تۆیش هەتیوو مەڕەنجێنە. یانی: بەسوك سەیری مەکە و مەیتارێنە و داماوی مەکە بەڵکو چاك بە بۆی و بەزەیت بێتەوە پێیدا. قەتادە ئەڵێ: وەك باوکی دلۆڤان وابە بۆ هەتیوو. وە ئەفەرموێت: ﴿وَأَمَّا ٱلسَّآئِلَ فَلَا تَنْهَرْ﴾ واتە: وە هەڵمەشاخێ بە پرسیارکەردا(هەژارو سواڵکەر)یانی: وەك تۆ چۆن ڕێگات وون کردبوو خوا ڕێگای نیشاندای تۆش سوڵکەر مەتارێنە، ئیبنو ئیسحاق ئەڵێت: ﴿وَأَمَّا ٱلسَّآئِلَ فَلَا تَنْهَرْ﴾ یانی: سا تۆش لووت بەرز و زۆردارو دڵڕەق و دەم پیس مەبە لەگەڵ بێدەسەڵاتانی ناو بەندەکای خوادا. قەتادە ئەڵێ: یانی: جواب کردنی هەژار بەنەرمی و دلۆڤانی. وە ئەفەرموێت: ﴿وَأَمَّا بِنِعْمَةِ رَبِّكَ فَحَدِّثْ﴾ واتە: وە نیعمەت و بەخششی پەروەردگارت دەربخە بەیارمەتی هەژاران. یانی: چۆن تۆ هەژارو نەدار بووی خودا بێنیازی کردی تۆش باسی چاکەی پەروەردگارت بکە. ئەبوداود ڕیوایەتی کردووە لەئەبو هورەیرەوە ئەویش لە پێغەمبەرەوە( ﷺ ) کە ئەفەرموێ: سوپاسی خوا ناکات کەسێ کە سوپاسی خەڵکی نەکات. ترمزی ڕیوایەتی کردووە و ئەڵێت: فەرمودەیەکی سەحیحە. ئەبو داودیش ڕیوایەتی کردووە لە جابرەوە ئەویش لە پێغەمبەرەوە( ﷺ ) ئەفەرموێ: هەرکەسێ توشی نازو نیعمەتێك بوو باسی کرد ئەوە سوپاسی خوای کردوە،وە هەرکەسێ دەری نەخست و شاردیەوە ئەوە بێنمەکی کردووە. تەنها ئەبوو داود هێناویەتی.

## سورەتی (الشرح)

## لە مەککەداهاتووەتەخوارەوە

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿أَلَمْ نَشْرَحْ لَكَ صَدْرَكَ ﴿١﴾ وَوَضَعْنَا عَنكَ وِزْرَكَ ﴿٢﴾ ٱلَّذِىٓ أَنقَضَ ظَهْرَكَ ﴿٣﴾ وَرَفَعْنَا لَكَ ذِكْرَكَ ﴿٤﴾ فَإِنَّ مَعَ ٱلْعُسْرِ يُسْرًا ﴿٥﴾ إِنَّ مَعَ ٱلْعُسْرِ يُسْرًا ﴿٦﴾ فَإِذَا فَرَغْتَ فَٱنصَبْ ﴿٧﴾ وَإِلَىٰ رَبِّكَ فَٱرْغَب ﴿٨﴾﴾

### مانای سینگە گوشا دی

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿أَلَمْ نَشْرَحْ لَكَ صَدْرَكَ﴾ واتە: ئایا سنگمان بۆ ئاسودەو گوشاد نەکردیت. یانی: ئاخۆ ئێمە سینەی تۆمان فراوان نەکرد؟ یانی: ڕووناکمان کردو زۆر گوشاد و فراوان و گەورەمانکرد. وەك خودا ئەفەرموێت: ﴿فَمَن يُرِدِ ٱللَّهُ أَن يَهْدِيَهُۥ يَشْرَحْ صَدْرَهُۥ لِلْإِسْلَٰمِ﴾ واتە: جا هەرکەسێ خوا بیەوێت ڕێنمونی بکات سنگی فراوان ئەکات بۆ ئیسلام و بڕوا هێنان. وەك چۆن خودا سنگی فراوان کرد بەرنامەکەیشی فراوان و گەورە کردووەوپڕی کردووە لە ئاسانی و لێبوردەیی هیچ لاری و تەنگی و گرانیەکی تێدا نیە.

### باسی چاکەکانی خودا بەسەر پێغەمبەرەکەیەوە( ﷺ )

خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَوَضَعْنَا عَنكَ وِزْرَكَ﴾ واتە: وە دامان گرت لێت ئەو بارە گرانە، ئەم ئایەتە یانی: ﴿ئایەت﴾ واتە: تا خودا خۆش بێت لە گوناهەکانی ڕابردوو داهاتووت. وە ئەفەرموێت: ﴿ٱلَّذِىٓ أَنقَضَ ظَهْرَكَ﴾ واتە: کە پشتی زۆر قورس کردبوویت. وە زۆر کەس لە پێشینەکان لەم ئایەتەدا کە ئەفەرموێت: ﴿ٱلَّذِىٓ أَنقَضَ ظَهْرَكَ﴾ ووتویانە: یانی: هەڵگرتنی ئەو بارە لات زۆر قورسە.

### مانای بەرز کردنەوەی یادی پێغەمبەر( ﷺ ) چۆنە؟

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَرَفَعْنَا لَكَ ذِكْرَكَ﴾ واتە: وەناوو ناوبانگتمان بۆ بەرز کردیتەوە. موجاهید ئەڵێت: یاد ناکرێم مەگین تۆش یاد دەکرێیت لەگەڵمدا. ئەوترێ: (أشهد أن لا إله إلا الله، و أشهد أن محمد رسول الله). قەتادە ئەڵێت: خوای گەورە ناوبانگی بەرز کردوەتەوە لە دونیاو لە ڕۆژی دوایدا، هیچ ووتار خوێنێك و شایەتمان هاوەرێك و نوێژکەرێك نیە مەگین هاوار ئەکەن و ئەڵێن: (أشهد أن لا إله إلا الله،و أشهد أن محمد رسول الله).

### خۆشی دوای ناخۆشی

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿فَإِنَّ مَعَ ٱلۡعُسۡرِ يُسۡرًا ۝٥ إِنَّ مَعَ ٱلۡعُسۡرِ يُسۡرًا﴾ واتە: بێگومان لە ڕاستیدا لەگەڵ هەموو تەنگانەیەکدا خۆشی و ئاسانی دێت. خوای گەورە هەواڵی داوە کە پاش ناخۆشی خۆشیش ئەبێت پاشان ئەم هەواڵەی دووپات کردوەتەوە.

### فەرمان بە پا ڕانەوە دوای ئیش و کا ر

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿فَإِذَا فَرَغۡتَ فَٱنصَبۡ﴾ واتە: ئینجا کەلە کارێك بویتەوە خۆت ماندوو بکە بە کارێکی ترەوە﴿وَإِلَىٰ رَبِّكَ فَٱرۡغَب﴾ واتە: وە هەر لە پەروەردگارت بپاڕێوە بۆ کارەکانت، یانی: کاتێ لە ئیش و کاری دونیا لێبوویتەوە ئەوسا هەڵسە بۆ لالآنەوە لە پەروەردگارو بە دڵێکی ساف و نیەتێکی پاکەوە بە زەوق و پەرۆشەوە. ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەر(ﷺ) هەروەك ئەم ئایەتە وایە. کە زانایان هاودەنگن لەسەر ڕاستی فەرمودەکە. ئەفەرموێت: کە خواردن ئامادە بوو نوێژ ناکرێت، نوێژ کردن نیە بۆ ئەو کەسەش کە دوو پیسیەکە زۆریان بۆ هێنابێ و تەنگە تاویان کردبێ. دیسان پێغەمبەر(ﷺ) ئەفەرموێت: کاتێ نوێژ دەستی پێکرد و خواردن ئامادە بوو دەست بکەن بە خواردنەکە. موجاهید لەبارەی ئەم ئایەتەوە ئەڵێت: کاتێك لە ئیش و کاری دونیا لێبویتەوەو هەستای بۆ نوێژ ئینجا لە پەروەردگارت بپاڕێرەوە.

## سورەتی ( التين )

## لەمەککەداهاتووەتە خوارەوە

### خوێندنی سورەتی ( التين ) لە نوێژو سەفەردا

مالیك و شوعبە لە عەدی کوڕی سابت و ئەویش لە بەرائی کوڕی عازیەوە ئەیگێڕنەوە کە ئەڵێن: پێغەمبەر(ﷺ) لەسەفەرێکدا و لەیەکێك لەدوو ڕکاتەکانی نوێژدا ﴿وَٱلتِّينِ وَٱلزَّيۡتُونِ﴾ ئەخوێند، گوێم لە کەسێك نەبووە ئەوەندە دەنگی خۆش بێت یا وەك ئەو خوێندبێتی. خاوەنی هەر شەش کتێبەکەی حەدیس لە کتێبەکانیاندا ئەم حەدیسەیان هێناوە.

﴿وَٱلتِّينِ وَٱلزَّيۡتُونِ ۝١ وَطُورِ سِينِينَ ۝٢ وَهَٰذَا ٱلۡبَلَدِ ٱلۡأَمِينِ ۝٣ لَقَدۡ خَلَقۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ فِيٓ أَحۡسَنِ تَقۡوِيمٖ ۝٤ ثُمَّ رَدَدۡنَٰهُ أَسۡفَلَ سَٰفِلِينَ ۝٥ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فَلَهُمۡ أَجۡرٌ غَيۡرُ مَمۡنُونٖ ۝٦ فَمَا يُكَذِّبُكَ بَعۡدُ بِٱلدِّينِ ۝٧ أَلَيۡسَ ٱللَّهُ بِأَحۡكَمِ ٱلۡحَٰكِمِينَ ۝٨﴾

## تەفسیری (التين) وئەوانەی دوایشی

مەبەست لە (تین) عەوفی ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەباسەوە کە مەبەست پێی مزگەوتی نوحە (سەلامی خوای لێبێت) کە بەسەر کێوی جودی یەوەیە. موجاهید ئەڵێت: مەبەست ئەم هەنجیرەی ئێوەیە کە ئەیزانن. خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَٱلتِّينِ وَٱلزَّيۡتُونِ﴾ واتە: سوێند بە هەنجیرو زەیتون، کەعبی ئەحبارو قەتادەو ئیبنو زەید و کەسانی تریش ئەڵێن: مەبەست لە زەیتون قودسی پیرۆزە. موجاهید و عیکرەمەئەڵێن: مەبەست ئەو زەیتونەیە کە ڕۆنی لێدەگرن. وە ئەفەرموێت: ﴿وَطُورِ سِينِينَ﴾ واتە: سوێند بە توری سینا، کەعبی ئەحبارو کەسانی تریش وتویانە ئەو کێوەیە کە خودا قسەی لەگەڵ موسادا کرد(سەلامی خوای لێبێت). وە ئەفەرموێت: ﴿وَهَٰذَا ٱلۡبَلَدِ ٱلۡأَمِينِ﴾ واتە: بەم شاری ئارامی و بێترسە کە مەکەیە ئیبنو عەباس و موجاهید و عیکرەمەو حەسەن و ئیبراهیمی نەخەعی و ئیبنو زەیدو کەعبەو ئەحبار وتویانە یانی: مەککە. هیچ جیاوازیەك نیە لە نێوان ئەم قسانەدا. هەندێك لە پێشەوایان ووتویانە: ئەمە سێ شوێنە و لەهەر سێکیاندا خودا پێغەمبەرێکی مورسیلی ناردووە لە (ئولول عزمەکان)واتە: لێبڕاوە نەبەزەکان کە خاوەنی بەرنامە و شەریعەتی گەورە گەورە بوون. یەکەم شوێنی تین و زەیتون قودسی پیرۆزە کە خوای گەورە عیسای کوڕی مەریەمی تێدا نارد(سەلامی خوای لێبێت)، دووەم توری سنین کە ئەویش توری سینایە کە خوای گەورە لەسەری قسەی لەگەڵ موسای کوڕی عیمراندا(سەلامی خوای لێبێت) کرد.سێیەم مەککەیە،ئەمیش ئەو شارەیە کە مەترسی تێدا نیە هەرکەسێك ڕۆشتە ناوی بێترسە. ئەو شوێنەیە کە پێغەمبەری(ﷺ) تێدا ناردووە، ئەڵێن: لە کۆتایی کتێبی تەوراتدا ئەم سێ شوێنە بەم شێوەیە باس کراوە: لە توری سیناوە خودا هاتن، یانی: ئەو شوێنەی کە خودا لەسەریدا قسەی لەگەڵ موسای کوڕی عیمراندا کرد. وە نوری زاتی خوا لە ساعیرەوە هەڵات. یانی: کێوی قودسی پیرۆز کە عیسای تێدا نارد و لە شاخەکانی فارانیشەوە ڕایگەیاند یانی: کێوەکانی مەککە کە خوای گەورە موحەمەدی(ﷺ) تیادا نارد، تەورات بە ڕێك و پێکی بە پێی هاتنی یەك لە دوای یەکی ئەو پێغەمبەرانە باسیان ئەکات، بۆیە خودا سوێند ئەخوات بە زۆر بەڕێز، پاشان بە زۆر بەڕێزتر لەو پاشانیش بە زۆر بەڕێز تر لەهەردووکیان.

### دابەزینی مرۆڤ بۆ نزمترین پلە لەگەڵ ئەوەدا کە بەجوانترین شێوە دروست کراوە سەرەنجامی ئەو دابەزینەش

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿خَلَقۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ فِيٓ أَحۡسَنِ تَقۡوِيمٖ﴾ واتە: سوێند بە خودائینسانمان دروستکرد لە جوانترین شێوە، ئەمە ئەوەیە کە سوێندی لەسەر خوراوە کە خوای گەورە مرۆڤی لە ڕێك ترین شێوە وەدی هێناوە، وە بەژن و باڵایەکی جوان و ئەندامێکی ڕێکی پێبەخشیوە، وە ئەفەرموێت:

﴿ ثُمَّ رَدَدْنَٰهُ أَسْفَلَ سَٰفِلِينَ ﴾ واتە: لەپاشان ئەگەر بێباوەڕ بێت دەیکەین بە پەسترینی هەموو پەستێك، یانی: ئەیگێڕینەوە بۆ ناو ئاگر، موجاهید و ئەبو لعالیە و حەسەن و ئیبنو زەید و کەسانی تریش وایان فەرمووە. پاشان دوای ئەم ڕێکی و جوانیە پاشەڕۆژیان بۆ ناو ئاگرە ئەگەر خوا پەرستیان نەکردبێ و شوێنی پێغەمبەران (سەلامی خوایان لێبێت) نەکەوتبن بۆیە ئەفەرموێت: ﴿إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فَلَهُمْ أَجْرٌ غَيْرُ مَمْنُونٍ﴾ واتە: مەگەر ئەوانەی کە بڕوایان هێناوەو کردەوەی چاکەیان کردووە، بۆ ئەوانە پاداشتی نەبڕاوە هەیە. وە هەندێك لە زانایان وتوویانە: ﴿ ثُمَّ رَدَدْنَٰهُ أَسْفَلَ سَٰفِلِينَ ﴾ یانی: ئەیگێڕنەوە بۆ پیری ئەوپەڕی. ئەمە ڕیوایەت کراوە لە ئیبنو عەباس و عیکرەمەوە. تەنانەت عیکرەمە ئەڵێت: ئەو کەسانەی کە قورئانیان لەبەر کرد وە ناگەڕێنەوە بۆ پلەی هەرە نزم. ئیبنی جەریریش ئەمەی هەڵبژاردووە. ئەگەر مەبەست پیری بوایە جیا کردنەوەی خاوەنباوەڕان باش نەبوو لێی، چونکە هەندێکیان پیر ئەبن بەڵکو مەبەست ئەوەیە کە باسمان کرد،وەك خودا ئەفەرموێت: ﴿وَٱلْعَصْرِ ۝١ إِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ لَفِى خُسْرٍ ۝٢ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ ﴾ واتە: سوێند بە کات، بێگومان هەمووکەس لە زیاندایە، مەگین ئەوانەی کە بڕوایان هێنابێت و کردەوە چاکەکانیان ئەنجام دابێت. وە ئەفەرموێت: ﴿فَلَهُمْ أَجْرٌ غَيْرُ مَمْنُونٍ﴾ یانی: نەبڕاوەو دوایی نایە وەك لە پێشەوە باسمان کرد. پاشان ئەفەرموێت: ﴿فَمَا يُكَذِّبُكَ بَعْدُ بِٱلدِّينِ ﴾ واتە: جا ئیتر چی بێبڕوات دەکات بە ئاین،﴿فَمَا يُكَذِّبُكَ ﴾ یانی: ئەی نەوەی ئادەم چی بێبڕوات دەکات ﴿بَعْدُ بِٱلدِّينِ﴾ یانی: بە پاداشت و ژیانەوە جارێکی تر، هاتنت لە بیرەو باش زانیوتە، ئەوەش ئاگاداری کە کەسێك توانای دروستکردنی ببێت ئەو کەسە چاکتر ئەتوانێ جارێکی تر دروستی بکاتەوە، چی وای لێکردووی کە ژیانەوەت پێ درۆیە کە ئەمەیش ئەزانیت؟ وە ئەفەرموێت: ﴿ أَلَيْسَ ٱللَّهُ بِأَحْكَمِ ٱلْحَٰكِمِينَ ﴾ واتە: ئایا خوا فەرمان ڕەواترینی هەموو فەرمان ڕەوایانێك نیە؟ واتە: بەڵکو ئەو لە هەموو فەرمان ڕەوایان باشترە و فەرمان ڕەواترە کە ستەم لە کەس ناکات، وە بەشێك لە دادپەروەرێتی ئەو خودایە ئەوەیە کە ڕۆژی دوایی داناوەو تۆڵەی ئەو ستەم لێکراوانە لە ستەمکاران دەسێنێت کە لە دونیادا کردویانە لە پێشەوە باسمان کرد لەو فەرمودەیەدا کە ئەبو هورەیرە گێڕاویەتیەوە بە مەرفوعی: کاتێ یەکێکتان ﴿وَٱلتِّينِ وَٱلزَّيْتُونِ﴾ خوێند و گەیشتە کۆتاییەکەی ﴿ أَلَيْسَ ٱللَّهُ بِأَحْكَمِ ٱلْحَٰكِمِينَ ﴾بابڵێت: (بلى وأنا على ذلك من الشاهدين)یانی: بەڵێ منیش شایەتی ئەوە ئەدەم.

## سورەتی ( العلق )

## لەمەککەدا هاتووەتە خوارەوە

## یەکەم سورەت بوو کە هاتە خوارەوە لە قورئان

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿ٱقْرَأْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلَّذِى خَلَقَ ﴿١﴾ خَلَقَ ٱلْإِنسَٰنَ مِنْ عَلَقٍ ﴿٢﴾ ٱقْرَأْ وَرَبُّكَ ٱلْأَكْرَمُ ﴿٣﴾ ٱلَّذِى عَلَّمَ بِٱلْقَلَمِ ﴿٤﴾ عَلَّمَ ٱلْإِنسَٰنَ مَا لَمْ يَعْلَمْ ﴿٥﴾﴾

### دەستپێکردنی پێغەمبەرێتی موحەمەد(ﷺ) وە یەکەم شتێ کە لە قورئان هاتە خوارەوە

ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە عائیشەوە کە ئەڵێ: یەکەم نیگایەك کە دەست کراوە بە ناردنی بۆپێغەمبەر(ﷺ) خەوی ڕاست بینین بوو لە کاتی خەوتندا. پێغەمبەر(ﷺ) هیچ خەونێکی نەدەبینی مەگین وەك سپێدەی بەیانی ئەهاتە دی. پاشان تەنهایی لا شیرین کرا. ئەچوە ئەشکەوتی حرا خواناسی تێدا ئەکرد، چەند شەوێك ئەمایەوە بۆ ئەو مانەوەیە تێشوی پێویستی ئەبرد تا ئەو کاتەی نیگای بۆ هات ئەو هەر لە ئەشکەوتی حرادا بوو، جوبرەئیل هاتە لای و ووتی بخوێنە! پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: پێم ووت من خوێندەوار نیم. فەرمووی: گرتمی و گوشیمی بە خۆیەوە تا زۆر ناڕەحەت بووم و پاشان بەری دام و ووتی: بخوێنە! ووتم خوێندەوار نیم، دووبارە گرتمی و گوشیمی تا ناڕەحەت بووم، پاشان بەری دام و ووتی بخوێنە! ووتم خوێندەوار نیم، جاری سێیەم گرتمی و گوشیمی تا بێتاقەت بووم، لە دوایدا بەری دام و ووتی: ﴿ٱقْرَأْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلَّذِى خَلَقَ﴾ واتە: ئەی موحەمەد(ﷺ)بخوێنە بەناوی پەروەردگارتەوە کە هەموو شتێکی دروستکردووە ﴿خَلَقَ ٱلْإِنسَٰنَ مِنْ عَلَقٍ﴾ واتە: مرۆڤی دروست کردووە لە خوێنێکی بەستوو تا گەیشتە ﴿عَلَّمَ ٱلْإِنسَٰنَ مَا لَمْ يَعْلَمْ﴾ بەو شێوەیە گەڕایەوە بۆ ماڵەوە و ئەلەرزی تا چووە لای خەدیجە و فەرمووی: دام پۆشن دام پۆشن. دایان پۆشی، تا ترسەکەی ڕەویەوە فەرموی: ووتی: ئەی خەدیجە چیم بەسەر هاتووە؟ جا ئەوەی ڕووی دابوو بۆ خەدیجەی گێڕایەوە و فەرمووی: لە خۆم ترساوم. خەدیجە پێی ووت: نەخێر مژدە بێت، خودا هیچ کاتێك تۆ داماو سەرشۆڕ ناکات، چونکە تۆ خزمایەتی بە جێدێنی و قسەت ڕاستە و بارو ئیشی گرانی خەڵکی هەڵ ئەگری و ڕێز لە میوان ئەگری و یارمەتی ئەوانە ئەدەیت کە لەسەر ڕاستی و ڕێگەی ڕاست تووشی فەلاکەت و ناڕەحەتی بوون یان ئەبن، پاشان خەدیجە بردی بۆ لای وەرەقەی کوڕی نەوفلی کوڕی ئەسەدی کوڕی عەبدواعوزای کوڕی قوصەی کە ئامۆزای خەدیجە بوو باوکی خەدیجە برای باوکی

وەرەقە بوو، پیاوێك بوو لەسەردەمی نەفامیا چووبوە سەر ئاینی گاورێتی بە عەرەبی شتی ئەنوسی ئەوەندەی خوا مەیلی لێ بوبێت بە عەرەبی لە ئینجیلی نوسیەوە وە پیاوێکی بەساڵا چوو وە کوێریش بوو بوو، خەدیجە پێی ووت: ئامۆزا گوێ بگرە لە برازای خۆت. وەرەقە بە پێغەمبەری(ﷺ) ووت: ئەی کوڕی برا چیت دیووە؟ پێغەمبەر(ﷺ) ئەوەی دیبوی بۆی گێڕایەوە، وەرەقە ووتی: ئەوە ناموسی ئەکبەرە یانی: جوبرەئیل کە خوا ناردیە سەر موسا(سەلامی خوای لەسەربێت) خۆزگە منیش لەم کاتەدا گەنج بومایە و خۆزگە لەو کاتەشدا گەلەکەت دەرت دەکەن زیندوو بومایە. پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئاخۆ ئەوان من دەرئەکەن. وەرەقە ووتی: بەڵێ هیچ کەسێ نەهاتووە بەوەی کە تۆ بۆی هاتووی مەگین دوژمنایەتی لەگەڵ کراوە، ئەگەر مام و نەمردم لەو ڕۆژەدا یارمەتیەکی باشت ئەدەم. دوای ئەوە زۆری پێنەچوو وەرەقە مرد. ماوەیەك نیگا وەستا تا پێغەمبەر(ﷺ) زۆر دڵگران بوو، وەك پێمان گەیشتووە وای لێهات کە زۆر جار ئەیویست لەسەر لوتکەی کێوێك خۆی فڕێ داتە خوارەوە. هەرکاتێ ئەچووە سەرکێوێك خۆی فڕێ بداتە خوارەوە، جوبرەئیل خۆی نیشان ئەدا و ئەیووت: ئەی موحەمەد بەڕاستی تۆ پێغەمبەری خوایت، بەوە دڵی ئارام ئەبوەوەو دڵی ئارام ئەبویەوەو ئەگەڕایەوە. کاتێك کە ماوەیەك کە نیگا نەئەهات و درێژەی ئەکێشا دووبارە ئەچووەوە سەر لووتکەی کێوەکە، جوبرەئیل خۆی پێنیشان ئەدا و دوبارە ئەوەی پێئەوتەوە. مانای ئەم فەرمودەیە لەهەردوو سەحیحەکەدا هاتووە لەو فەرمودەیەی کە زوهری هێناویەتی. لەسەر ئەم فەرمودەیە قسەمان کرد لە ڕووی سەنەد و مەتن و ماناکەیەوە لە کاتی دەستپێکردنمان بە ڕاڤەکردنی کتێبی بوخاری هەرکەسێك ئەیهەوێت با لەوێدا سەیری بکات، سوپاس و ستایش بۆ خودا، یەکەم شتێك لە قورئاندا هاتە خوارەوە ئەم ئایەتە گەورە و پیرۆزانە بوو، وە ئەم ئایەتانە بەزەییەکی خودا بوو کە دای بە بەندەکانی بەهرەیەك بوو لە بەهرەکانی کە پێی بەخشین.

## سەربڵندی و ڕێزی مرۆڤ بە زانیا ریەوە

لەم ئایاتانەدا ئاگاداری دراوە دەربارەی یەکەم وەدی هاتنی مرۆڤ لە خوێنێکی بەستوو (علقە). پاشان ئاگاداری دراوە بەوەی کە خودا ڕێزی لە مرۆڤ ناوەو ڕای هێناوە لەسەر شتانێك کە زووتر پێی نەزانیوە وە ڕێزی لێناوە بە زانیاری فێرکردن وە ئەو ڕێزەی کە خودا باوکی مرۆڤەکانی پێ جیا کردوەتەوە لە فریشتەکان، وە زانیاریش جاری وا هەیە لە دڵ و لە مێشکدایە، جاری واش هەیە لە زماندایە، جاری واش هەیە لە نوسینەوەدایە بە دەست و پەنجە،جا ئیتر ئەو زانستە زەینی بێت یان زمانی بێت یان نوسین بێت، جا ئەگەر زانستی ناو نوسین بوو ئەوە دوانەکەی تریشی تێدایە، بەڵام بە پێچەوانەوە ڕاست دەرناچێ، لەبەر ئەمەیە کە خوا فەرمویەتی: ﴿ٱقۡرَأۡ وَرَبُّكَ ٱلۡأَكۡرَمُ﴾ واتە: بخوێنە

پەروەردگاری تۆ لە هەموو کەس بەخشندە ترە﴿ٱلَّذِى عَلَّمَ بِٱلْقَلَمِ﴾ واتە: ئەوەی کە مرۆڤی فێری نوسین کردووە بە قەلەم﴿عَلَّمَ ٱلْإِنسَٰنَ مَا لَمْ يَعْلَمْ﴾ مرۆڤی شارەزا کردووە بەو شتانەی کە نەیدەزانی لە ئەسەردا هاتووە کە ئەفەرموێ: زانیاری پێوەند بکەن بە نوسینەوە. هەروەها هاتووە کە: هەرکەسێ کار بکات بەوەی کە ئەیزانێ خودا زانیاریەکی وای فێر دەکات کە نەیزانیوە.

﴿ كَلَّآ إِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ لَيَطْغَىٰٓ ﴿٦﴾ أَن رَّءَاهُ ٱسْتَغْنَىٰٓ ﴿٧﴾ إِنَّ إِلَىٰ رَبِّكَ ٱلرُّجْعَىٰٓ ﴿٨﴾ أَرَءَيْتَ ٱلَّذِى يَنْهَىٰ ﴿٩﴾ عَبْدًا إِذَا صَلَّىٰٓ ﴿١٠﴾ أَرَءَيْتَ إِن كَانَ عَلَى ٱلْهُدَىٰٓ ﴿١١﴾ أَوْ أَمَرَ بِٱلتَّقْوَىٰٓ ﴿١٢﴾ أَرَءَيْتَ إِن كَذَّبَ وَتَوَلَّىٰٓ ﴿١٣﴾ أَلَمْ يَعْلَم بِأَنَّ ٱللَّهَ يَرَىٰ ﴿١٤﴾ كَلَّا لَئِن لَّمْ يَنتَهِ لَنَسْفَعًۢا بِٱلنَّاصِيَةِ ﴿١٥﴾ نَاصِيَةٍ كَٰذِبَةٍ خَاطِئَةٍ ﴿١٦﴾ فَلْيَدْعُ نَادِيَهُۥ ﴿١٧﴾ سَنَدْعُ ٱلزَّبَانِيَةَ ﴿١٨﴾ كَلَّا لَا تُطِعْهُ وَٱسْجُدْ وَٱقْتَرِب ۩ ﴿١٩﴾ ﴾

### هەڕەشە لەسەرکەشی و یاخی بوونی مرۆڤ لە پێناوی ساماندا

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ كَلَّآ إِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ لَيَطْغَىٰٓ﴾ واتە: بەڕاستی مرۆڤ یاخی دەبێ: ﴿أَن رَّءَاهُ ٱسْتَغْنَىٰٓ﴾ کاتێ کە خۆی بنینی وا دەولەمەند بووە. خودا هەواڵی مرۆڤمان دەداتێ کاتێ خۆی بە بێنیاز دەزانێ کە سامانی زۆر دەبێ، خۆی هەڵئەبرێ و سەرکەشی ئەکا و کەسی بە خەیاڵدا نایەت و کەیف و خۆشی دەرئەبڕێ. دوای ئەوە خوای مەزن ئەیترسێنێ و هەڕەشەی لێئەکات و ئامۆژگاریشی ئەکات و ئەفەرموێت: ﴿إِنَّ إِلَىٰ رَبِّكَ ٱلرُّجْعَىٰٓ﴾ واتە: بێگومان هەر بۆلای پەروەردگاری تۆیە گەڕانەوە. یانی: پاشە ڕۆژ و گەڕانەوە بۆ لای ئەوەو بەم زوانە لێت ئەپرسێتەوە دەربارەی ئەو سامانەت کە لە کوێوە کۆت کردوەتەوە لە پێناوی چیدا سەرفت کردوەو لە ناوت داوە.

### باسی خراپی ئەبو جەهل و هەڕەشە کردن بە سزادانی

دووبارە خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿أَرَءَيْتَ ٱلَّذِى يَنْهَىٰ﴾ واتە: ئایا بینیت ئەو کەسەی ڕێگری ئەکات ﴿عَبْدًا إِذَا صَلَّىٰٓ﴾ واتە: لە بەندەیەك کە نوێژ بکات؟ ئەم ئایەتانە لەسەر ئەبو جەهل هاتنە خوارەوە لەعنەتی خوای لێبێ، هەڕەشەی کرد لە پێغەمبەر(ﷺ) لەسەر نوێژ کردنی لەناو حەرەمدا خودای گەورە یەکەم جار ئامۆژگاری کرد بە شێوەیەکی چاك و فەرمووی: ﴿ أَرَءَيْتَ إِن كَانَ عَلَى ٱلْهُدَىٰٓ﴾ واتە: ئایا پێم بڵێ ئەگەر ئەو کەسە لەسەر ڕێی ڕاست بوایە﴿أَوْ أَمَرَ بِٱلتَّقْوَىٰٓ﴾ واتە: یا فەرمانی بدایە بە پارێزگاری باشتر نەدەبوو، بۆیە فەرمویەتی: ﴿ أَرَءَيْتَ إِن كَذَّبَ وَتَوَلَّىٰٓ ﴾واتە: ئەگەر ئەو کەسەی بڕوای نەهێناو پشتی هەڵکرد ناترسێ لەوە، بۆیە فەرمویەتی: ﴿أَلَمْ يَعْلَم بِأَنَّ ٱللَّهَ يَرَىٰ﴾ واتە: ئایا نەیزانیوە کە خوا دەیبینێ. یانی: ئاخۆ ئەو کەسەی کە ڕێگرە لەو کەسەی کە ڕێ نیشاندەرەو ئەزانێ کە خوا ئەیبینێ و گوێی لە قسەکانیەتی

و بەم زوانە سزایەکی سەختی ئەدا لەسەر ئەو کارەی کە ئەیکات. پاشان خوای گەورە ترساندی و هەڕەشەی لێکرد و فەرمووی: ﴿كَلَّا لَئِن لَّمْ يَنتَهِ لَنَسْفَعًا بِالنَّاصِيَةِ﴾ واتە: وا نیە کە بیری لێئەکاتەوە بەڕاستی ئەگەر واز نەهێنێ ڕای دەکێشین بە قژی ناوچەوانی، یانی: ئەگەر نەگەڕێتەوە لەوەی کردویەتی لەو پیاو خراپی و بێگوێی و عینادیە ﴿لَنَسْفَعًا بِالنَّاصِيَةِ﴾ لەپێشەسەری دەنەوین لە ڕۆژی قیامەتدا. پاشان فەرمووی: ﴿نَاصِيَةٍ كَاذِبَةٍ خَاطِئَةٍ﴾ واتە: پێشەسەرێکی درۆزنی بەهەڵەدا چوو. یانی: پێشەسەری ئەبو جەهل لە قسەکردندا درۆزنە و لەکرداریشدا خەتاکارە﴿ فَلْيَدْعُ نَادِيَهُ﴾ واتە: ئینجابائەو بانگی هاوڕێکانی خۆی بکات. یانی: گەل و هۆزەکەی، یانی: هاواریان لێبکات و داوای یارمەتیان لێبکات ﴿سَنَدْعُ الزَّبَانِيَةَ﴾ واتە: ئێمەش بانگی فریشتەی زەبر بەدەست دەکەین. کە فریشتەکانی سزا دانن، تا بزانن کێ سەرکەوتووە! کۆمەڵی ئێمە یا کۆمەڵی ئەو؟ بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە یبنو عەباسەوە ئەڵێت: ئەبو جەهل ووتی: ئەگەر موحەمەدم بینی نوێژی کرد لە کەعبەدا پێدەخەمە سەر ملی. ئەو هەواڵە گەیشتە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەگەر وا بکات فریشتەکان ئەیگرن و ئەیبەن. هەروەها ئیبنو جەریریش ڕیوایەتی کردووە ئەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) نوێژی ئەکرد لە مەقامدا، ئەبو جەهل تێپەڕی بە لایدا و ووتی: ئەی موحەمەد پێم نەوتی واز بێنە لەم نوێژە؟ هەڕەشەی لێکرد. پێغەمبەر(ﷺ) ڕقی لێی هەڵساو تورەبوو لێی، ئەبو جەهل ووتی: ئەی موحەمەد بە چ شتێ تۆ هەڕەشە لە من دەکەی؟ سوێند بە خوا پڕی ئەو شیوە هۆز و بەرەم هەیە، خودا ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: ﴿ فَلْيَدْعُ نَادِيَهُ ﴿١٧﴾ سَنَدْعُ الزَّبَانِيَةَ﴾ ئیبنو عەباس ئەڵێت: ئەگەر ئەبو جەهل بانگی هاوڕێکانی بکردایە فریشتەی سزادان لەو کاتەدا ئەیان گرت سزایان ئەدا. تیرمزی ئەڵێت: ئەم فەرمودەیە چاك و صەحیحە. ئیبنو جەریر ڕیوایەتی کردوە لە ئەبو هورەیرەوە ئەڵێت: ئەبو جەهل ووتی: ئاخۆ موحەمەد لەناو ئێوەدا ناوچاوی دا بە خۆڵەوە؟ مەبەستی نوێژکردنی پێغەمبەر بوو(ﷺ) لە کەعبەدا،ئەڵێن: بەڵێ. ئەبو هورەیرە ئەڵێت: ئەبو جەهل سوێندی خوارد بە لات و عوزا، ئەگەر جارێکی تر ببینم نوێژ بکات پێ ئەخەمە سەر ملی و دەم و چاوی پڕ ئەکەم لە خۆڵ، هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) کە پێبخاتە سەر ملی، ئەبو هورەیرە ئەڵێت: ئەوەی کە چاوەڕوانیان نەدەکرد لە ئەبو جەهل ئەوە بوو پاشەو پاش ئەگەڕایەوە بەرەو دواو دەستی ئەدایە بەردەمی خۆی. ئەبو هورەیرە ئەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەگەر نزیك ببوایەتەوە لێم فریشتەکان ئەیان برد بە پارچە پارچە کراوی. ئەڵێت: ئەوەبوو خودا ئەم ئایەتانەی ناردە خوارەوە، جا ئیتر نازانم لە فەرمودەکەی ئەبو هورەیرەوە دایە یان نا: ﴿كَلَّا إِنَّ الْإِنسَانَ لَيَطْغَىٰ﴾ تا

کۆتایی سورەتەکە. ئەحمەدی کوڕی حەنبەل و نەسائی و ئیبنو ئەبی حاتەم فەرمودەکەیان ڕیوایەت کردووە.

**دڵدانەوەیەك بۆ پێغەمبەر(ﷺ)**

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿كَلَّا لَا تُطِعْهُ وَاسْجُدْ وَاقْتَرِب﴾ واتە: نەخێریەگوێ ی ئەو کەسانە مەکە، وە کوڕنوش بەرەو لە خوانزیك بکەوەرەوە. یانی: ئەی موحەمەد(ﷺ) بە گوێی مەکە لەسەر ئەوەی کە ناهێڵێ بەردەوام بیت لەسەر خواناسی زیاتر کردن، نوێژ بکە لەهەر شوێنێ پێت خۆشە گوێی مەدەرێ چونکە خوا پارێزەرو یارمەتی دەرتە وە هەر ئەو ئەتپارێزێ لە خەڵکی﴿وَاسْجُدْ وَاقْتَرِب﴾ وەك ئەوەی لە صەحیحی موسلیمدا نوسراوە لە ئەبو صالحەوە ئەویش لە ئەبو هورەیرەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: نزیك ترینی بەندە لە پەروەردگاریەوە ئەو کاتەیە کەسوژدە ئەبات، کەوایە زۆر بلالێنەوە.هەروەها لە پێشەوە باس کرا کە پێغەمبەر(ﷺ) سوجدەی ئەبر لە کاتی خوێندنی سورەتی: ﴿إِذَا السَّمَاءُ انشَقَّتْ- اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ﴾.

## سورەتی (القدر)

### لە مەککەدا هاتووەتەخوارەوە

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

﴿إِنَّا أَنزَلْنَاهُ فِي لَيْلَةِ الْقَدْرِ ﴿١﴾ وَمَا أَدْرَاكَ مَا لَيْلَةُ الْقَدْرِ ﴿٢﴾ لَيْلَةُ الْقَدْرِ خَيْرٌ مِّنْ أَلْفِ شَهْرٍ ﴿٣﴾ تَنَزَّلُ الْمَلَائِكَةُ وَالرُّوحُ فِيهَا بِإِذْنِ رَبِّهِم مِّن كُلِّ أَمْرٍ ﴿٤﴾ سَلَامٌ هِيَ حَتَّىٰ مَطْلَعِ الْفَجْرِ ﴿٥﴾﴾

**ڕێزو چاکەی شەوی هەرە بەڕێز (ليله القدر)**

فەرموویەتی کە قورئانی لە شەوی هەرە بەڕێزدا ناردوەتە خوارەوە کە شەوێکی زۆر پیرۆزە و خوای گەورە لە بارەیەوە ئەفەرموێت: ﴿إِنَّا أَنزَلْنَاهُ فِي لَيْلَةِ الْقَدْرِ﴾ واتە: بەڕاستی ئێمە ئەم قورئانەمان لە شەوێکی پیرۆزدا ناردوەتە خوارەوە. ئەویش شەوی قەدرە لە مانگی ڕەمەزاندا بووە،وەك لە شوێنی تردا فەرمویەتی: ﴿شَهْرُ رَمَضَانَ الَّذِي أُنزِلَ فِيهِ الْقُرْآنُ﴾ واتە: مانگی ڕەمەزان مانگێکە قورئانی تێدا نێردراوەتە خوارەوە، ئیبنو عەباس و کەسانی تریش وتویانە: خودا قورئانی ناردە خوار لە لەوحالمحفوزەوە بۆ بەیت العزە لە ئاسمانی دونیا، دوای ئەوە بە پێی ڕوداوەکان بەش بەش هاتە خوارەوە لە ماوەی بیست و سێ ساڵدا بۆ پێغەمبەر(ﷺ) خودای گەورەئەفەرموێت: ﴿إِنَّا أَنزَلْنَاهُ فِي لَيْلَةِ الْقَدْرِ﴾ واتە: بێگومان ئێمە قورئانمان ناردە خوارەوە لە شەوێکی بەفەڕ و بەڕێزدا، پاشان خوای

گەورە زۆر بە گرنگ باسی شەوی قەدر ئەکات، وە تایبەتمەندی ئەکات بە هاتنە خوارەوەی قورئان تیایدا،وەك ئەفەرموێت: ﴿وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا لَيۡلَةُ ٱلۡقَدۡرِ﴾ واتە: تۆ چوزانیت کە شەوی بەفەڕو ڕێز چییە﴿لَيۡلَةُ ٱلۡقَدۡرِ خَيۡرٞ مِّنۡ أَلۡفِ شَهۡرٖ﴾ واتە: شەوی بەفەڕو ڕێز چاکترە لە هەزار مانگ.ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو هورەیرەوە ئەڵێت: کاتێ ڕەمەزان هات پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: مانگی ڕەمەزانتان بۆ هات،مانگێکی زۆر پیرۆزە،خودا ڕۆژوەکەی فەرز کردووە لەسەرتان، دەرگاکانی بەهەشتی تێدا کراوەتەوە، دەرگاکانی دۆزەخی تێدا داخراوەو شەیتانەکانی تێدا زنجیر کراوە، شەوێکی تیایە چاکترە لە هەزار مانگ، هەرکەسێ لە چاکەی بێبەش بێت بەڕاستی بێبەشە. نەسائیش ڕیوایەتی کردووە. لەبەر ئەوەی شەوی قەدر خوا پەرستی تیایدا بە ئەندازەی هەزار مانگ خوا پەرستیە. لەهەردوو سەحیحەکەدا هاتووە لە ئەبو هورەیرەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: هەرکەسێ شەوی قەدر هەستێ زیندوی بکاتەوە بە باوەڕەوەو بەتەمای پاداشت بێت لەسەری، خوا لە هەموو تاوانەکانی پێشتری خۆش ئەبێت.

### دابەزینی فریشتەکان و بڕیار دان لەسەر هەموو چاکەیەك لە شەوی قەدردا

خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿تَنَزَّلُ ٱلۡمَلَـٰٓئِكَةُ وَٱلرُّوحُ فِيهَا بِإِذۡنِ رَبِّهِم مِّن كُلِّ أَمۡرٖ﴾ واتە: لەو شەوەدا فریشتە و جوبرەئیلیش لە ناویاندا دێنە خوارەوە بە فەرمانی پەروەردگاریان لە هەموو کارو بارێکدا. یانی: دابەزینی فریشتەکان زۆر ئەبێت لەو شەوەدا لەبەر چاکە و بەرەکەتی ئەو شەوە، فریشتەکان دادەبەزن لەگەڵ دابەزینی ئەو بەرەکەت و بەزەییانەی خوادا و وە هەروەها لەگەڵ خوێندنی قورئاندا و دەوری ئەو ئەڵقانەش ئەدەن کە یادی خوا ئەکەن، فریشتەکان باڵیان ڕائەخەن بۆ ئەو کەسانەی کە زانست ئەخوێنن و بەدڵ بەدوایدا ئەگەڕێن و ڕێزی لێ ئەگرن. بەڵام لەمانا کردنی(روح)دا وتراوە: مەبەست پێی لێرەدا جوبرەئیلە (علیه سلام)ئەمەیش عەتفی تایبەتە بۆسەر عەتفی گشتی. خوا ئەفەرموێت: ﴿مِّن كُلِّ أَمۡرٖ﴾ موجاهید ئەڵێت: ئەو شەوە هەموو کارو بارێك بێ زیان تەواو ئەبێت، سەعیدی کوڕی مەنصوریش ئەڵێت: عیسی ی کوڕی یونس لە ئەعمەشەوە و ئەویش لە موجاهیدەوە ئەیگوازێتەوە کە فەرمویەتی: ﴿سَلَـٰمٌ هِيَ﴾ یانی: ئەو شەوە پڕە لە سەلامەتی و شەیتان ناتوانێت کاری خراپی تێدا ئەنجام بدات یان خراپە و ئازار بخولقێنێ، قەتادە و جگە لە ئەویش ئەڵێن: بڕیار لەسەر کارو بترەکان ئەدرێت و ڕزق و ئەجەلەکانی تێدادیاری ئەکرێت وەك خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿فِيهَا يُفۡرَقُ كُلُّ أَمۡرٍ حَكِيمٍ﴾ یانی: لەو شەوەدا هەموو کارو بارە پڕدانایییەکان لە یەکتری جیا ئەکرێنەوە. وە ئەفەرموێت: ﴿سَلَـٰمٌ هِيَ حَتَّىٰ مَطۡلَعِ ٱلۡفَجۡرِ﴾ سەعیدی کوڕی مەنصور ئەڵێت: هەشیمی کوڕی ئیسحاق لە

شەعبیەوە ئەگێڕێتەوە لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا ئەڵێت: سەلام کردنی فریشتەکانە بۆ خەڵکی ناو مزگەوتەکان لەشەوی قەدردا تا سپێدەی بەیانی. قەتادە و ئیبنو زەید ئەڵێن: ﴿سَلَٰمٌ هِيَ﴾یانی: ئەو شەوە هەمووی چاکە و ئاژاوەی تیا نیە تا سپێدەی بەیانی.

**دیاری کردنی شەوی قەدرو نیشانەکانی**

ئەو فەرمودەیەی کە ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە پشتگیری دیاری کردنی شەوی قەدر ئەکات لە عوبادەی کوڕی صامتەوە ئەیگێڕێتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: شەوی قەدر لە دەڕۆژی دواییدایە، هەرکەسێ بە نیازی عیبادەت کردنەوە زیندوی بکاتەوە خودا لەتاوانی پێشوو پاشیشی خۆش دەبێت، ئەو شەوە شەوێکی تاکە نۆیە یا حەوتە یا پێنجە یا سێیە یا کۆتا شەوە، هەروەها پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: نیشانەی شەوی قەدر شەوێکی پاك و ڕوناکە، وەك ئەوەی کە مانگی چواردەی تیا بێ، پاك و ڕوناك و ئارامە، نە ساردە و نە گەرمە، هیچ ئەستێرەیەك بۆی نیە تا بەیانی شەیتانەکان ڕاو بنێن. وە لە نیشانەی ئەو شەوە خۆر بەیانیەکەی ڕێك دێتە دەرەوە و تیشکی نیە وەك مانگی شەوی چواردە وایە و شەیتان بۆی نیە لەو کاتەدا لەگەڵ خۆر بێتە دەر. وە ئەم فەرمودەیە ئیسنادەکەی چاکە، بەڵام لە مەتنەکەیا غەرابەتێ هەیە، وە لە هەندێ دەستە واژەیدا نەکارەت هەیە. ئەبو داود لە سونەنەکەیدا سەر باسێکی هێناوە کە دەڵێت: (بیان ان لیلة فی کل رمضان)، یانی: شەوی قەرد لەناو هەموو ڕەمەزاندایە. پاشان ڕیوایەتی کردووە لە عەبدڵای کوڕی عومەرەوە کە ئەڵێ: پرسیار کرا لە پێغەمبەر(ﷺ) لەبارەی شەوی قەدرەوەمنیش گوێم لێبو فەرموی: شەوی قەدر لەهەموو ڕەمەزانێکدایە. ئەم فەرمودەیە پیاوانی ناو سەنەدەکەی هەموو جێی بڕوان، ئەوە نەبێ ئەبو داود ئەڵێت: شوعبە و سوفیان ڕیوایەتیان کردووە لە ئەبو ئیسحاقەوە و هەردوکیان بە مەوقوفی هێناویانە. لە ئەبو سەعیدی خودریشەوە ڕیوایەت کراوە کە ئەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ)ئیعتیکافی کرد لە دەیەمی یەکەمی ڕەمەزاندا و ئێمەش ئیعتیکافمان کرد،جوبرەئیل هاتە لای و فەرمووی: ئەوەی تۆ بە شوێنیا دەگەڕێی لە پێشەوەیە. پێغەمبەر(ﷺ) لە پاشاندا دەیەمی ناوەڕاست ئیعتیکافی کرد ئێمەش هەر لەخزمەتیدا بووین، دووبارە جوبرەئیل هاتە لای و فەرمووی: ئەوەی تۆ بە شوێنیدا دەگەڕێی لە پێشتەوەیە، پاشان پێغەمبەر(ﷺ) بەیانی بیستەم ڕۆژ هەڵسا و ووتارێکی داو فەرمووی: هەرکەسێ لەگەڵ من ئیعتیکافی کردبوو با بگەڕێتەوە،من شەوی قەدرم بینی، یانی: لە خودا، لە بیرم برایەوە، ئەوشەوە لە دەیەمی کۆتایی ڕەمەزاندایە لە تاکە کانیدا، وام ئەبینی کە سوژدە لەناو قوڕو ئاودا ئەبەم. سەربانی مزگەوتەکە ئەوکاتە بە پوشی دارخوما سەری گیرابوو، هیچمان لە ئاسماندا نەئەبینی، لە پڕ پارچە هەورێکی بچوك هات و باران دەستی پێکرد، پێغەمبەر(ﷺ) نوێژی پێکردین، لە نێوچاوانی پێغەمبەر(ﷺ) شوێنی قوڕو ئاوم بینی وەك تەسدیقێك بۆ خەو بینینەکەی. لە ووتەیەکی

تردا ئەفەرموێ: ئەمە لە بەیانی بیست و یەکی ڕەمەزاندا بوو. وە لەهەردوو سەحیحەکەدا ئەم فەرمودەیان هێناوە. ئیمام شافیعی ئەڵێت: ئەم فەرمودەیە ڕاسترین ڕیوایەتە. هەندێکیش وتویانە: شەوی قەدر لە بیست و سێی ڕەمەزاندایە بە بەڵگەی ئەو فەرمودەیەی عەبدوڵای کوڕی ئونەیس کە لە سەحیحی مەسلیمدا هاتووە.وە وتراوە: لە شەوی بیست و پێنجایە.بە بەڵگەی ئەو حەدیسەی کە بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە عەبدوڵای کوڕی عەباسەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: بگەڕێن بە شوێنیدا لە دەهەمی کۆتایی ڕەمەزاندا لەو بیست و نۆیەی کە ماوە، لە بیست و حەوتەی کە ماوە، لە بیست و پێنجەی کە ماوە.زۆر کەس لە زانایان بە شەوە تاکەکان مانایان کردووە، ئەمەش دیارترو بەناو بانگ ترە.وە دیسان ووتراوە: ئەو شەوە شەوی بیست و حەوتە.لەبەر ئەوەی کە موسلیم ڕیوایەتی کردووە لە سەحیحە کەیا لە ئوبەی کوڕی کەعبەوە ئەویش لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) ئەو شەوە شەوی بیست و حەوتە وە ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە زیڕەوە کە ئەڵێ: پرسیارم کرد لە ئوبەی کوڕی کەعب ووتم: ئەی ئەبو مونزیر ئیبنو مەسعودی برات ئەڵێت: هەرکەسێك بە درێژایی ساڵێك هەڵسێ بۆ شەو نوێژ شەوی قەدری دەست ئەکەوێ، ئوبەی فەرمووی: ڕەحمەتی خوا لە عەبدوڵای کوڕی مەسعود باشە خۆ ئەزانێ شەوی قەدر لە ڕەمەزاندایە و لە شەوی بیست و حەوتیشدایە، پاشان سوێندی خوارد لەسەر ئەو مەسەلەیە: منیش وتم ئەوە چۆن ئەزانن؟ ووتی: بە نیشانە یان بەو بەڵگەیەدا کە هەواڵمان پێدراوە، ئەو ڕۆژە کە هەڵدێ تیشکی نیە مەبەستی خۆرە، موسلیم ڕیوایەتی کردووە.وە هەروەها وتویانە: ئەم شەوی قەدرە لە شەوی بیست و نۆدایە، ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە عوبادەی کوڕی سامتەوە:کەپرسیاری کردولەپێغەمبەر(ﷺ) دەربارەی شەوی قەدر، پێغەمبەریش(ﷺ) فەرموویەتی: لە ڕەمەزاندایە لە دە ڕۆژی دوایدا بۆی بگەڕێن، ئەو شەوە لە شەوە تاکەکانی بیست و یەك یا بیست و سێ یا بیست و پێنج یا بیست و حەوت یا کۆتا ترین شەودایە.وە دیسان ئیمامی ئەحکەد ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو هورەیرەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی لەبارەی شەوی قەدرەوە: شەوی قەدر یا لەشەوی بیت و حەوتە یا لە شەوی بیست و نۆدایە، وە ژمارەی فریشتەکان لەو شەوەدا لەسەر زەمیندا زیاترن لە زیخ و چەوی دونیا. ئەم حەدیسە تەنیا ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە وە سەنەدەکەشی خراپ نیە. ترمزیش لە ئەبی قەلادەوە ڕیوایەتی کردووە کە(لیلە القدر)بە ناو شەوەکانی دەیەمی کۆتایدا دێت و دەچێت، ئەم قسەیە بە دەق مالیك و سەوری و ئەحمەدی کوڕی حەنبەل و ئیسحاقی کوڕی ڕاهویە و ئەبو سەورو موزنی و ئەبو بەکری کوڕی خوزەیمە و کەسانی تریش دانیان پیا ناوەو فەرمویانە. وە لە شافعیشەوە ئەم قسەیە ڕیوایەت کراوە و قازی لێی وەرگرتووە، ئەمەش پێدەچێت وا بێت. خودایش باشتر ئەزانێ.

**نزاکانی ناو شەوی قەدر**

پاڕانەوەی زۆر لە هەموو کاتێکدا سونەت و چاکە،لە مانگی ڕەمەزاندا زیاترو زیاتر، وە لە دەهەمی کۆتایی ڕەمەزاندا زۆر زیاتر و لە شەوە تاکەکاندا لە هەمووی باشترە وە چاکترە.ئەوەیە ئەم پاڕانەوەیە بکرێت: (اللهم إنك عفو تحب العفو فاعف عنى)، واتە: ئەی خودایە تۆ لێبوردەیت و لێبوردنت پێخۆشە،لێم ببورە.ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە عائیشەوە ئەڵێت: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەگەر ڕێکەوتی شەوی قەدرم کردچۆن بپاڕێمەوە؟ فەرمووی بڵێ: (اللهم إنك عفو تحب العفو فاعف عنى)، یانی: ئەی خوای خۆشەویست تۆ لێبوردەیت و خۆشت لە لێبوردن دێت، دەی لێم ببورە. تیرمزی و نەسائی و ئیبنو ماجە ڕیوایەتیان کردووە.تیرمزی ئەڵێت: ئەمە فەرمودەیەکی حەسەن و صەحیحە حاکم لە موستەدرەکەکەیدا هێناویەتی ئەڵێت: ئەمە لەسەر شەرتی شەیخەین فەرمودەیەکی صەحیحە. هەروەها نەسائیش ڕیوایەتی کردووە.

**سورەتی (البینه)**

**لەمەدینەداهاتووەتەخوارەوە**

**پێغەمبەری خوا (ﷺ) چارێکیان ئەم سورەتەی خوێندەوە بەسەر ئوبەی کوڕی کەعبدا**

ئیمامی ئەحمەد لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕیوایەتی کردووە ئەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی بە ئوبەی کوڕی کەعب: (خودا فەرمانی پێداوم ﴿لَمْ يَكُنِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ﴾ بەسەرتا بخوێنم، کەعب وتی: لای تۆ ناوی بردم؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: بەڵێ، ئوبەی دەستی کرد بە گریان! بوخاری و موسلیم و تیرمیزی و نەسائی لە فەرمودەی شوعەبیەوە بەم شێوەیە ڕیوایەتیان کردووە.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿لَمْ يَكُنِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ وَٱلْمُشْرِكِينَ مُنفَكِّينَ حَتَّىٰ تَأْتِيَهُمُ ٱلْبَيِّنَةُ ﴿١﴾ رَسُولٌ مِّنَ ٱللَّهِ يَتْلُوا۟ صُحُفًا مُّطَهَّرَةً ﴿٢﴾ فِيهَا كُتُبٌ قَيِّمَةٌ ﴿٣﴾ وَمَا تَفَرَّقَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ إِلَّا مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَتْهُمُ ٱلْبَيِّنَةُ ﴿٤﴾ وَمَآ أُمِرُوٓا۟ إِلَّا لِيَعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ حُنَفَآءَ وَيُقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤْتُوا۟ ٱلزَّكَوٰةَ ۚ وَذَٰلِكَ دِينُ ٱلْقَيِّمَةِ ﴿٥﴾﴾

**باسی حاڵی خوا نەناسان چ خاوەن کتێبەکان و چ بتپەرستەکان**

خاوەن کتێبەکان بریتین لە گاورو جولەکە. بتپەرستانیش بریتین لە دارو بەرد پەرستو ئاگر پەرست لە عەرەبو فارسەکان. خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿لَمْ يَكُنِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ وَٱلْمُشْرِكِينَ مُنفَكِّينَ حَتَّىٰ تَأْتِيَهُمُ ٱلْبَيِّنَةُ﴾ واتە: ئەوانەی کە بێبڕوا بوون لە خاوەن نامەو بتپەرستان دەستیان هەڵنەگرت لەو بێبڕواییە تا نیشانە ڕونەکەیان بۆ هات. موجاهید ئەڵێ: ﴿مُنفَكِّينَ﴾ واتە:

وازیان نەهێنا تا ڕاستیان بۆ ڕون بوەوە، قەتادەش هەروا ئەڵێت ﴿حَتَّىٰ تَأْتِيَهُمُ ٱلْبَيِّنَةُ﴾ یانی: ئەم قورئانە، بۆیە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿لَمْ يَكُنِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَـٰبِ وَٱلْمُشْرِكِينَ مُنفَكِّينَ حَتَّىٰ تَأْتِيَهُمُ ٱلْبَيِّنَةُ﴾ پاشان مانای ﴿ٱلْبَيِّنَةُ﴾ ی بەم ئایەتە ڕون کردەوە ﴿رَسُولٌ مِّنَ ٱللَّهِ يَتْلُوا۟ صُحُفًا مُّطَهَّرَةً﴾ واتە: کە ئەویش پێغەمبەرێکە لە لایەن خواوە پەیامێکی پاکیان بەسەردا دەخوێنێتەوە. یانی: موحەمەد (ﷺ) ئەوەی دەیخوێنێتەوە لە قورئانی پیرۆز ئەوەیە کە نوسراوەتەوە لە مەلەئی ئەعلاداو لە چەند پەڕەیەکی پاکژدایە، وەك خودای گەورە لە سورەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿فِى صُحُفٍ مُّكَرَّمَةٍ ﴿١٣﴾ مَّرْفُوعَةٍ مُّطَهَّرَةٍۭ ﴿١٤﴾ بِأَيْدِى سَفَرَةٍ﴾ واتە: کە ئەو ڕێنمونیانەش نوسراونەتەوە لە چەند پەڕەیەکی هێژای پایە بڵندی پاك، کە بەدەست نوێنەرانی بەڕێزی خێر خواوەن. وە ئەفەرموێت: ﴿فِيهَا كُتُبٌ قَيِّمَةٌ﴾ واتە: کە تیایانایە چەند نوسراو(سورەت) ێکی بەنرخ. ئیبنو جەریر ئەڵێت: یانی: لە نوسراوە پاکژەکاندا لە لایەن خودای مەزنەوە نوسراوەو زۆر بەنرخە، ڕێكو ڕاستو هیچ هەڵەیەکی تیا نییە، چونکە لە لایەن خوای گەورەوە هاتووە.

**ناکۆکی دوای هاتنی بەڵگەی روون و زانیاری ڕویدا**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَا تَفَرَّقَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَـٰبَ إِلَّا مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَتْهُمُ ٱلْبَيِّنَةُ﴾ واتە: وە جیانەبوونەوە ئەوانەی کە پەیامیان بۆ هاتبوو دوای ئەوە نەبێ کە نیشانە روونەکەیان بۆهات، کە پێغەمبەری ئیسلامە ئەم ئایەتە وەك ئەم فەرمودەیە کە دەفەرموێت: ﴿وَلَا تَكُونُوا۟ كَٱلَّذِينَ تَفَرَّقُوا۟ وَٱخْتَلَفُوا۟ مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَهُمُ ٱلْبَيِّنَـٰتُ ۚ وَأُو۟لَـٰٓئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ﴾ واتە: بە وێنەی ئەوانە مەبن کە بەش بەش و جیاواز بون لەپاش ئەو بەڵگانەی بۆیان هات، وە ئەوانە سزایەکی گەورەیان بۆ هەیە. وەك لەم فەرمودەیەدا ڕیوایەت کراوە لەچەند ڕێگایەکەوە: جولەکەکان ناکۆك بونو بوونە حەفتاو یەك کۆمەڵ، گاورەکان ناکۆك بوونو بوونە حەفتاو دوو کۆمەڵ، وە بەم زوانە ئەم ئوممەتەش ئەبن بە حەفتاو سێ کۆمەڵ، هەرهەمویان لە ئاگردان تەنها یەکێکیان نەبێت، وتیان: ئەوانە کێن ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)؟ فەرمووی: ئەوەی منو هاوەڵەکانم لە سەرینی.

**فەرمانی خودا ئەوە بووە کە دڵپاكو دڵسۆز بن بەرانبەر بە دینی ئەو**

خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿وَمَآ أُمِرُوٓا۟ إِلَّا لِيَعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ حُنَفَآءَ وَيُقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤْتُوا۟ ٱلزَّكَوٰةَ ۚ وَذَٰلِكَ دِينُ ٱلْقَيِّمَةِ﴾ واتە: لەگەڵ ئەوەشدا کە فەرمانیان پێ نەدرابوو مەگەر ئەوەی پەرستشی خودا بکەن بە دڵسۆزی و ملکەچی بۆ بکەن و خۆیان بەدور بگرن لە هەموو بیرو باوەڕێکی خوارو خێچ

وە نوێژ بکەن‌و زەکات بدەن، ئەمەیە ئاینی راست. ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتەیە کە ئەفەرموێت: ﴿ وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولًا أَنِ اعْبُدُوا اللَّهَ وَاجْتَنِبُوا الطَّاغُوتَ ﴾ واتە: سوێند بەخوا لە ناو هەموو گەل‌و ئوممەتێکدا پێغەمبەرێکمان ناردووە بۆئەوەی تەنها خوا بپەرستن‌و دورکەونەوە لە پەرستنی هەر پەرستراوێکی تر. لە پێشەوە بە درێژی باسی (الحنيف) کراوە لە سورەتی ئەنعامدا لێرەدا دووبارە کردنەوەی زیادەو پێویست ناکات ﴿وَيُقِيمُوا الصَّلَاةَ﴾ نوێژیش بکەن کە بەرێزترین خواپەرستیە بە لەش بکرێت، ﴿وَيُؤْتُوا الزَّكَاةَ﴾ زەکاتیش بدەن کە ئەویش چاکە کردنە لەگەڵ هەژارو نەداراندا، ﴿وَذَٰلِكَ دِينُ الْقَيِّمَةِ﴾ کە ئەمە دینی ڕاست‌و دروستە یا ئوممەتێکی ڕێك‌و مامناوەندییە.

﴿إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ وَالْمُشْرِكِينَ فِي نَارِ جَهَنَّمَ خَالِدِينَ فِيهَا ۚ أُولَٰئِكَ هُمْ شَرُّ الْبَرِيَّةِ ﴿٦﴾ إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ أُولَٰئِكَ هُمْ خَيْرُ الْبَرِيَّةِ ﴿٧﴾ جَزَاؤُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ جَنَّاتُ عَدْنٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا أَبَدًا ۖ رَّضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا عَنْهُ ۚ ذَٰلِكَ لِمَنْ خَشِيَ رَبَّهُ ﴿٨﴾﴾

**باسی خراپترین کەس‌و چاکترین کەس‌و باسی پاداشتەکانیان**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ وَالْمُشْرِكِينَ فِي نَارِ جَهَنَّمَ خَالِدِينَ فِيهَا ۚ أُولَٰئِكَ هُمْ شَرُّ الْبَرِيَّةِ﴾ واتە: بێگومان ئەوانەی کە بێبڕوابوون لە خاوەن پەیام‌و بتپەرستەکان لە ئاگری دۆزەخدان تێیدا دەمێننەوە بە ئێجگاری، ئا ئەوانە خراپترینی هەموو دروستکراوێکن، خودا باسی پاشەڕۆژی ئەو بەدفەڕانە دەکات لە خوا نەناسانی ئەهلی کتێب‌و بتپەرستان کە دژایەتی ئەو کتێبانەی خودا دەکەن کە دابەزێنراوەو ئەو پێغەمبەرانەی کە نێرراون، ئەوانە لە ڕۆژی قیامەتدا لە ناو ئاگری جەهەننەمدان تا هەتایە، یانی تێیدا دەمێننەوەو دەرناچن تێیداو لەناو ناچن، ﴿أُولَٰئِكَ هُمْ شَرُّ الْبَرِيَّةِ﴾ یانی: خراپترین کەسن کە وەدیهێنراون، دوای ئەمە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ أُولَٰئِكَ هُمْ خَيْرُ الْبَرِيَّةِ﴾ واتە: بەڕاستی ئەوانەی کە بڕوایان هێناو کردەوە چاکەکان ئەکەن ئا ئەوانە چاکترینی هەموو دروستکراوێکن. دوای ئەوە خودا باسی پیاو چاکێکمان بۆ دەکات ئەوانەی کە بەدڵ خاوەنباوەڕن‌و بە ئەندامەکانی لەشیان ڕەوشت باشن، ئەوانە باشترینی کەسن. ئەبو هورەیرەو دەستەیەك لە زانایان ئەم ئایەتە ئەکەنە بەڵگە لە سەر بەڕێزی خاوەنباوەڕانی ناو مرۆڤ لەچاو فریشتەکاندا. وەك خواگەورە دەفەرموێت: ﴿جَزَاؤُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ جَنَّاتُ عَدْنٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا أَبَدًا ۖ رَّضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا عَنْهُ ۚ ذَٰلِكَ لِمَنْ خَشِيَ رَبَّهُ﴾ واتە: پاداشتی ئەوانە لای پەروەردگاریان

بەهەشتانیکە جێی دانیشتنو مانەوەی هەمیشەییە، ڕوبارەکان بە ژێریاندا دەڕوات، دەمێننەوە تێیدا بە ئێجگاری، خوا لێیان ڕازی بووە، ئەوان لە خوا ڕازی بوون، ئەمە بۆ کەسێکە لە خوا بترسێ ﴿جَزَآؤُهُمۡ عِندَ رَبِّهِمۡ﴾ یانی: پاداشتیان لە ڕۆژی قیامەت دا بریتی یە لە ﴿جَنَّٰتُ عَدۡنٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدٗاۖ﴾ یانی: بێکەمو کوڕیو کۆتایی هاتن پێوە سەرگەرمن ﴿رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهُمۡ وَرَضُواْ عَنۡهُۚ﴾ خوا لەوان ڕازیەو ئەوانیش لە خوا ڕازین، یانی: پلەی ڕەزامەندی خودا لای ئەوان بەرزترو گەورەترە لەوەی پێی داون لەو خۆشیە نەبڕاوەیە ﴿وَرَضُواْ عَنۡهُۚ﴾ لەوەی کە پێی بەخشیون لەو هەموو ڕێزە زۆرە، وە ئەفەرموێت: ﴿ذَٰلِكَ لِمَنۡ خَشِيَ رَبَّهُۥ﴾ واتە: ئەم پاداشتە دانراوە بۆ کەسێك لە خوا ترساوە بە ڕاستیو پەرستویەتی، و بەندایەتی کردووە، وەك ئەوەی ئەیبینێو زانیویەتی ئەو خودا نابینێ بەڵام خودا ئەو دەبینێ. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو هورەیرەوە ئەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ئایا هەواڵتان پێ بدەم کێ چاکترین کەسە؟ وتیان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ)! فەرمووی: پیاوێکە ڕەشمەی ئەسپەکی دەگرێ لە ڕێگای خوادا و هەرکاتێ هاوار کرا سواری ئەسپەکەی دەبێت بۆ غەزا، ئایا هەواڵتان بدەمێ کێ دوای ئەو باشترین کەسە؟ وتیان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ)! فەرمووی: پیاوێکە هەندێ مەڕو ماڵاتی هەیەو نوێژی خۆی ئەکاتو زەکاتی خۆی ئەدات، ئایا هەواڵتان بدەمێ خراپترین کەس کێیە؟ وتیان: بەڵێ، فەرمووی: ئەو کەسەیە کە بەناوی خواوە داوای شتی لێ ئەکرێ، کەچی ئەو لەبەر ناوی خوا نایبەخشێ.

## سورەتی (الزلزلە)

## لە مەککەدا هاتووەتە خوارەوە

### ڕێزی سورەتی (الزلزلە)

ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە عەبدوڵای کوڕی عەمرەوە ئەڵێت: پیاوێك هاتە لای پێغەمبەر(ﷺ) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆم دیاری بکە قورئان چۆن بخوێنم؟ فەرمووی پێی: سێ سورەت لەوانە بخوێنە کە بە (الر) دەست پێدەکەن، پیاوەکە بە پێغەمبەری (ﷺ) ووت: من ڕۆشتوم بەساڵاو توانای دڵم نەماوەو زمانیشم ئەستوور بووە) فەرمووی: (کەواتە فەخاوەن حامیمەکان بخوێنە) پیاوەکە قسەکەی یەکەمجاری دوبارە کردەوە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: سیان لە موسەبیحات، ئەوانەی بە (یسبح یان سبح لله) دەست پێدەکەن. کابرا چی وتبوو دیسان ووتیەوە، پیاوەکە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) سورەتێکم بۆ دیاری بکە کە هەمووی تێدا بێت، پێغەمبەر(ﷺ) ﴿إِذَا زُلۡزِلَتِ ٱلۡأَرۡضُ زِلۡزَالَهَا﴾ی پێ خوێند تا تەواوی کرد، پیاوەکە وتی: سوێند بەو کەسەی تۆی ناردووە بە پێغەمبەرێتی بەڕاستی ئیتر هیچی لێ زیاد ناکەم، دوای ئەوە پیاوەکە ڕۆیشت

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: سەرفراز بوو ئەو پیاوە بچکۆلە سەرفرازبوو ئەو پیاوە بچکۆلە، پیاوەکەم بۆ بانگ بکەنەوە، کە هێنایانەوە پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو: فەرمانی ئەوەشم پێکراوە کە ڕۆژی قوربان گەورە ڕابگرم و خواش کردویەتی بە جەژنی ئەم ئوممەتە. پیاوەکە وتی: ئەی پێغەمبەر(ﷺ) ئایا ئەگەر جگە لە ئاژەڵێکی شیردەر هیچی تر شک نەبەم ئەتوانم بیکەمە قوربانی؟پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: نەخێر، بەڵام لەو ڕۆژەدا لە مووی سەرت لابەو لە نینۆکەکانت بکەو سمێڵت کورت بکەرەوە و توکی عانەت بتاشە، ئەگەر وا بکەی قوربانیەکی تەواوە بۆت لەلای خوا. ئەبو داودو نەسائی هێناویانە.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

﴿إِذَا زُلْزِلَتِ الْأَرْضُ زِلْزَالَهَا ﴿١﴾ وَأَخْرَجَتِ الْأَرْضُ أَثْقَالَهَا ﴿٢﴾ وَقَالَ الْإِنْسَانُ مَا لَهَا ﴿٣﴾ يَوْمَئِذٍ تُحَدِّثُ أَخْبَارَهَا ﴿٤﴾ بِأَنَّ رَبَّكَ أَوْحَىٰ لَهَا ﴿٥﴾ يَوْمَئِذٍ يَصْدُرُ النَّاسُ أَشْتَاتًا لِيُرَوْا أَعْمَالَهُمْ ﴿٦﴾ فَمَنْ يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُ ﴿٧﴾ وَمَنْ يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُ ﴿٨﴾﴾

**ڕۆژی قیامەت و حاڵی زەمین و خەڵکی لەو ڕۆژەدا**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِذَا زُلْزِلَتِ الْأَرْضُ زِلْزَالَهَا﴾ واتە: کاتێك زەوی هاتە لەرزە بەلەرزینی خۆی. ئیبن و عەباس ئەڵێت: زەوی لەبنەوە دەستی کرد بە جوڵان﴿وَأَخْرَجَتِ الْأَرْضُ أَثْقَالَهَا﴾ واتە: وە زەوی هەرچی شتی قورس و گرانی ناوی هەیە هەمووی فڕێدایە دەرەوە. یانی: هەرچی مردووی تێدا بوو دەری خست. زۆر کەس لە پێشینانی ئەم ئوومەتە ووتویانە: ئەمە وەك ئەم فەرمودەیەی خودا وایە کە ئەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمْ إِنَّ زَلْزَلَةَ السَّاعَةِ شَيْءٌ عَظِيمٌ﴾ واتە: ئەی خەڵکینە ! بترسن لە سزای پەروەردگارتان چونکە بەڕاستی بومە لەرزەی قیامەت شتێکی زۆر گەورە وکارەساتێکی سامناکە. وە هەروەها ئەم ئایەتەیی تریش وایە کە ئەفەرموێ: ﴿وَإِذَا الْأَرْضُ مُدَّتْ ﴿٣﴾ وَأَلْقَتْ مَا فِيهَا وَتَخَلَّتْ﴾ واتە: وە ساتێك کە زەوی پان کرایەوە و ڕاخرا، وە ئەوەی تیا بوو فڕێی داوو هیچی لەناودا نەما. موسلیم لە صەحیحەکەدا و لە ئەبو هورەیرەوە ڕیوایەتی کردوە و ئەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: زەمین هەر چی تێدایە لە ئاڵتون و زیو و شتی بەنرخ هەمووی هەڵئەهێنێتەوە لە شێوەی عەمودا. کەسی پیاو کوژ دێت و ئەڵێت: لەسەر ئەمە من خەڵکم ئەکوشت. کەسی بڕەحمیش کە وازی لە پەیوەندی خزمایەتی هێناوە دێت و ئەڵێت: من لەسەر ئەمە وازم لە خزمایەتی هێنا بوو، دز دێت و ئەڵێت: لەسەر ئەمە من دەستم بڕا، پاشان هەموو جێیدەهێڵن و هیچی

لێ هەڵ ناگرن. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَقَالَ ٱلْإِنسَـٰنُ مَا لَهَا﴾ واتە: وە ئینسان لەو ڕۆژەدا دەڵێت: ئەوە زەوی چی یەتی؟ یانی: سەری سوڕ ئەمێنێ و ناڕەحەتە، چونکە ئەم زەمینە کاتی خۆی کیشوەرێکی بە ئارام و وەستاو بووە، ئەو لەسەری نشتەجێ بووە، یانی: دونیاکە گۆڕاوە، واتە: زەمین ئەجوڵێ و هاتۆتە لەرزە، فەرمانی خودای بۆ هاتوەو، ئەوەی بۆی لە بڕیار دراوە بوومەلەرزە توندەکە دەبێت ڕوو بدات لێی، پاشان ئەوەی لەسکی دایە لەمردوو لە پێشینەکانەوە تا دواین کەس فڕێی ئەدات، لەو کاتەدایە مرۆڤ ئەحەپەسێت لەوەی قەوماوە و زەوی ئەگۆڕێت بۆ زەمینێکی تر و ئاسمانەکانیش بە هەمان شێوە، ئەوسا هەموو دێنە بەر بارەگای خودای تاك و تەنهاو زاڵ بەسەر هەموو شتێك دا.خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَوْمَئِذٍ تُحَدِّثُ أَخْبَارَهَا﴾ واتە: لەو ڕۆژەدا زەوی دەنگ و باسی خۆی دەگێڕێتەوە، یانی: باسی ئەو شتانە ئەگێڕێتەوە کە مرۆڤ لەسەری ئەنجامی داون ئیمامی ئەحمەد و ترمیزی و ئەبو عبدالرحمنی نەسائی ڕیوایەتیان کردوە لە ئەبو هورەیرەوە کە ئەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) ئەم ئایەتەی خوێند: ﴿يَوْمَئِذٍ تُحَدِّثُ أَخْبَارَهَا﴾ فەرمووی: ئایا ئەزانن کامەیە بەسەر هاتەکەی؟ ووتیان: خوداو پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەزانێت. فەرمووی: بەسەر هاتەکەی ئەوەیە شایەتی ئەدات لەسەر هەموو بەندەکان پیاو بێت یان ژن کەچی ئەنجامداوە لەسەری، ئەڵێت ئەوە و ئەوەی کرد لە فلانە ڕۆژو لە فلانە ڕۆژدا، ئا ئەوە بەسەر هاتەکەیەتی. پاشان تیرمیزی ئەڵێت: ئەمە فەرموودەیەکی صەحیح و غەریبە. وە پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿بِأَنَّ رَبَّكَ أَوْحَىٰ لَهَا﴾ واتە: کە پەروەردگاری تۆ سروشتی بۆ کردووە. بوخاری ئەڵێ: (أوحى لها و أوحى اليها، ووحى لها، ووحى اليها) هەمووی یەك مانایە یەعنی: فەرمانی داوەتێ و بەجێی هێناوە، ئیبن عەباسیش ئەڵێت: ﴿أَوْحَىٰ لَهَا﴾ یانی: أوحى اليها. زاهیرەکەی ئەوەیە یانی ڕێی پێدا. شەبیبی کوڕی بەشیر ئەڵێت: لەعیکریمەوە ئەویش لە ئیبن و عەباسەوە: ﴿يَوْمَئِذٍ تُحَدِّثُ أَخْبَارَهَا﴾ یانی: پەروەردگاری پێی ووت: وا بڵێ، ئەویش ئەو قسەیەی ووتەوە ئەڵێت: ﴿أَوْحَىٰ لَهَا﴾ یانی: فەرمانی پێکرد. قورەزی ئەڵێت: فەرمانی دا بەزەمین لەت ببێت و لێیان جیاببێتەوە وە پاشان خوا ئەفەرموێت: ﴿يَوْمَئِذٍ يَصْدُرُ ٱلنَّاسُ أَشْتَاتًا لِّيُرَوْا۟ أَعْمَـٰلَهُمْ﴾ واتە: لەو ڕۆژەدا خەڵکی دەردەچن بە پەڕاگەندەو پەشێوی تا پاداشتی کردەوەی خۆیان نیشان بدرێ. یانی: ئەگەڕێنەوە بە پەرش و بڵاوی لەو ڕۆژەدا، یانی: هەر یەکی و بەجۆرێك، یەکێ بەختەوەرە و بەرەو بەهەشت ئەکەوێتە ڕێ و یەکێکی تر بەد بەختەو بەرەو جەهەنەم بەڕێئەکرێت، سوددی ئەڵێت: ﴿أَشْتَاتًا﴾ یانی: دەستە دەستەو کۆمەڵ کۆمەڵ. وە خودای گەورە ئەفەرموێت:

﴿لِّيُرَوْاْ أَعْمَـٰلَهُمْ﴾واتە: تا پاداشتی کردەوەی خۆیان نیشان بدرێ. یانی: بۆ ئەوەی بزانن و پاداشتی کردەوەکانی دونیایان وەرگرن لە چاکەو لەخراپە.

**پاداشت لەسەر گەردیلە گەردیلەی هەموو کردەوەیەك**

خودای گەورەئەفەرموێت: ﴿فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُۥ﴾ واتە: ئینجا هەرکەسێ بە ئەندازەی هەرە ووردیلەیەك چاکەی کردبێ دەی بینێتەوە ﴿وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُۥ﴾ واتە: وە هەر کەسێك بە ئەندازەی هەرە وردیلەیەك خراپەی کردبێ دەی بینێتەوە. بوخاری ڕیوایەتی کردوە لە ئەبو هورەیرەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: وولاغی سواری بۆ سێ شتە: بۆ پیاوێ ئەبێتە پاداشت، بۆ پیاوێك ئەبێتە پۆشاك، بۆ یاوێك ئەبێتە تاوان، بۆ ئەو کەسەی کە پاداشتە بۆی، پیاوێکە ئامادەی ئەکات بۆ جیهاد لە ڕێی خودادا، پەتی بەستنەوەکەی بۆ درێژ دەکات لە لەوەڕگایەکا یان لە باخچەیەکا، هەرچی توش هات لەو بەستنەوەیەدا لەو لەوەڕگاو باخچەدا خێرەکەی بۆ ئەوە. خۆ ئەگەر گوریسەکەی بڕی و هاتو چۆی کرد بەناو لەوەڕگاکەدا پاشەڕۆو جێ سمەکانی هەموو خێرو بێرە بۆی، وە ئەگەر بەلای ڕوبارێکا تێپەڕی لە ئاوەکەی خواردەوە مەبەستیشی نەبوو ئاوی بدات ئەوەیش هەر خێرو بێرە بۆی، ئەوە بۆ ئەو پیاوە هەر پاداشتە، وە پیاوێ ئەو وولاخەی ئامادە کردوە بۆ ئەوەی دەری بخات بێنیازە لەخەڵکی یان داوا لەخەڵك نەکات، بەشی خوایشی لەبیر ناچێت وەك سوار بوون یان سەربڕین، ئەوە بۆ ئەو کەسە ئەبێتە پۆشاك، پیاوێکیش ڕای گرتوە بۆ فیز کردن و ڕیابازی و دژیایەتی کردن، ئەوا بۆی ئەبێتە بار گرانی و تاوان. پاشان پرسیار کرا لە پێغەمبەری(ﷺ) لە بارەی گوێدرێژەوە فەرمووی: خودا هیچی لەو بارەیەوە نەناردوە تەنها ئەم ئایەتە نەبێت هەموو شتێکی تێدا کۆبۆتەوە﴿فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُۥ ﴿٧﴾ وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُۥ﴾ موسلیم ڕیوایەتی کردوە. لە صەحیحی بوخاریدا لە عەدیەوە بەمەرفوعی ڕیوایەت کراوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: خۆ بپارێزن لە ئاگر با بە لەتە خورمایەکیش بێت، یا بە قسەیەکی چاکەش بێت. وە دوبارە لە عەدیەوە موسلیم ڕیوایەتی کردوە: هیچ چاکەیەك بەسوك سەیر مەکەن بەکەمی مەزانن با دۆڵچە ئاوێکیش بێت بیکەیتە ناو دەفری کەسێکەوە کە ئاوی پێویستە، یا بە ڕویەکی خۆشەوە بەرەو ڕوی برایەکت بڕۆیت. وە هەر لەصەحیحی موسلیمدا ئەفەرموێت: ئەی کۆمەڵی ئافرەتانی موسڵمان! با هیچ دراوسێیەك بە کەمی نەزانێ کە یارمەتی دراوسێ کەی بدات ئەو شتە سمی مەڕێ یا بزنیش بێ. یانی: سمی قاچی ئاژەڵەکە. وە لە فەرمودەیەکی تردا هاتوە: بەشی ئەو کەسە بدەن کە داوا ئەکات با سمی سوتاویش بێت. ڕیوایەت کراوە لە عائیشەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) کە دەنکە ترێیەکی بەخشی و فەرمووی: چەندین مسقاڵە زەڕەی تێدایە. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی

کردوە لە عەوفی کوڕی حارسی کوڕی توفەیل، کە عائیشە هەواڵی داوەتێ کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ئەی عائیشە! بترسە لە تاوانە بچووکەکان چونکە پرسیارت لێ ئەکرێ لەسەری لە لایەن خواوە. نەسائی و ئیبنو ماجە ڕیوایەتیان کردوە. وە ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە عەبداللە کوڕی مەسعودەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: بترسن لە تاوانە بچوکەکان چونکە ئەو گوناهە بچوکانە کۆ دەبنەوە لەسەر پیاو تا لەناوی ئەبەن.

## سورەتی (العادیات)

## لە مەککەدا هاتووەتە خوارەوە

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿وَٱلۡعَٰدِيَٰتِ ضَبۡحٗا ١ فَٱلۡمُورِيَٰتِ قَدۡحٗا ٢ فَٱلۡمُغِيرَٰتِ صُبۡحٗا ٣ فَأَثَرۡنَ بِهِۦ نَقۡعٗا ٤ فَوَسَطۡنَ بِهِۦ جَمۡعًا ٥ إِنَّ ٱلۡإِنسَٰنَ لِرَبِّهِۦ لَكَنُودٞ ٦ وَإِنَّهُۥ عَلَىٰ ذَٰلِكَ لَشَهِيدٞ ٧ وَإِنَّهُۥ لِحُبِّ ٱلۡخَيۡرِ لَشَدِيدٌ ٨ ۞ أَفَلَا يَعۡلَمُ إِذَا بُعۡثِرَ مَا فِي ٱلۡقُبُورِ ٩ وَحُصِّلَ مَا فِي ٱلصُّدُورِ ١٠ إِنَّ رَبَّهُم بِهِمۡ يَوۡمَئِذٖ لَّخَبِيرُۢ ١١﴾

### سوێند خواردن بۆ ئەسپی جەنگی لەسەر سپڵەیی و چاو چنۆکی مرۆڤ

خودای گەورە سوێند دەخوات بە ئەسپ کاتێ لەڕێگای خوا تاو ئەداو ئەپرمێنێ، (ضبحت) بریتییە لەو دەنگەی ئەبیسترێ لە ئەسپەوە کاتێ تاو ئەدرێت، وە ئەفەرموێت: ﴿وَٱلۡعَٰدِيَٰتِ ضَبۡحٗا﴾ واتە: سوێند بە ئەسپانی تاودەرکە ئەپرمێنێن چۆن پرمەیەك﴿فَٱلۡمُورِيَٰتِ قَدۡحٗا﴾واتە: وە سوێند بەئاگر هەڵگیر سێنەران لەبەرد بەناڵی سمیان. یانی: ژێری پێیان کە لەبەرد دەدا ئاگر دەپرژێنێ ﴿فَٱلۡمُغِيرَٰتِ صُبۡحٗا﴾ واتە: وە سوێند بە ئاسپانی هێرش بەر لە بەیانایاندا.یانی: هێرش بردن لەکاتی بەیانیاندا، وەك پێغەمبەر(ﷺ) لەکاتی غەزاکردندا چاوەڕوانی بانگی بەیانی ئەکرد ئەگەر گوێی لەبانگ بوایە لەو شوێنەدا ئەوا هێرشی نەئەبرد وە ئەگەر گوێی لێ نەبوایە هێرشی ئەبردە سەر دوژمن. وە ئەفەرموێت: ﴿فَأَثَرۡنَ بِهِۦ نَقۡعٗا﴾ واتە: کە بەوە تەپو تۆز هەڵدەستێنن. یانی: تۆز هەڵدەستێ لەکاتی ڕوبەڕوبونەوەی ئەسپەکاندا ﴿فَوَسَطۡنَ بِهِۦ جَمۡعًا﴾ وە بەو تەپو تۆزەوە خۆیان دەکەن بەناوەڕاستی دوژمندا. ئیبن و عەباس و موجاهید و قەتادە ئەڵێن: ﴿فَٱلۡمُغِيرَٰتِ صُبۡحٗا﴾یانی: هێرشبردنی ئەسپ لە ڕێی خودا لەبەری بەیاندا ﴿فَأَثَرۡنَ بِهِۦ نَقۡعٗا﴾ یانی: ئەو شوێنەی کە چۆتە ناوی و تۆزی لێ هەڵساوە، عەوفی ئەڵێت لە ئیبن و عەباس و عەتاو عیکرەمەو قەتادەو زەححاکەوە کە وتویانە: ﴿فَوَسَطۡنَ بِهِۦ جَمۡعًا﴾ یانی: کۆمەڵی خودا

نەناسان لە دوژمن. وە ئەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلْإِنسَـٰنَ لِرَبِّهِۦ لَكَنُودٌ﴾ واتە: بەڕاستی ئینسان بۆ پەروەردگاری سپڵەو نا سوپاسە. ئەمە ئەوە کە سوێنی لەسەر خوراوە، یانی: خەڵکی لەو بەهرانەی خودا پێی بەخشیون پێنەزانن و دانی پێدا نانێن ئیبن عەباس و موجاهید و ئیبراهیمی نەخەعی و ئبو جەوزاو ئەبولعالیەو ئەبو زوحاو سەعیدی کوڕی جوبەیر و موحەمەدی کوڕی قەیس و زەححاك و حەسەن و قەتادەو ڕەبیعی کوڕی ئەنەس و ئیبن و زەید ئەڵێن: الكنود یانی: پێنەزان. حەسەن ئەڵێت: الكنود ئەو کەسەیە کە بەسەر هاتە ناخۆشەکان ئەژمێرێ و کەچی هەموو چاکەکانی خودای لەبیرنەچێتەوە ﴿وَإِنَّهُۥ عَلَىٰ ذَٰلِكَ لَشَهِيدٌ﴾ واتە: وە بێگومان خۆشی لەسەرئەم ناسوپاسی یە شایاتە! قەتادەو سوفیانی سەوری ئەڵێن: خودا باش ئەوە دەزانێ. وە ئەگونجی ئەو زەمیرە بگەڕێتەوە بۆ ئینسان، موحەمەدی کوڕی کەعبی قورەیزی وتویەتی و وای داناوە کە خەڵك هەرچەندە پێنەزانە دەری ناخات بەڵام لەکردارو گوفتار و هەڵسان و دانیشتنیاندا دەر ئەکەوێت، وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿مَا كَانَ لِلْمُشْرِكِينَ أَن يَعْمُرُوا مَسَـٰجِدَ ٱللَّهِ شَـٰهِدِينَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِم بِٱلْكُفْرِ﴾ واتە: شایستە نیە بۆ موشریکەکان کە مزگەوتەکانی خوا ئاوەدان بکەنەو سەر پەرشتیان بکەن لە کاتێکدا شایەتن لەسەر بێبڕوایی خۆیان وە ئەفەرموێت: ﴿وَإِنَّهُۥ لِحُبِّ ٱلْخَيْرِ لَشَدِيدٌ﴾ واتە: وە بەڕاستی ئینسان بۆ خۆشەویستیماڵی دونیا زۆر گیرو ڕژدە یانی: بێگومان ئەو بۆ خۆشە ویستی شتی چاك کە بریتیە لە ماڵی دونیا زۆر بە پەرۆشە. ئەمە دوو بۆ چوونی تێدایە، یەکەم: بێگومان ماڵی دونیای زۆر خۆش دەوێت، دووەم: زۆر بە پەرۆشەو ڕژدە لە خۆشەویستی سامانا. هەردوو بۆ چونەکە هەر ڕاستن.

### ترساندن لەڕۆژی زیندوو بوونەوە

خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿أَفَلَا يَعْلَمُ إِذَا بُعْثِرَ مَا فِى ٱلْقُبُورِ﴾ واتە: دەی ئایا نازانیت کاتێك کە مردووی ناو گۆڕەکان زندوو کرانەوەو هێنرانە دەرەوە، پاش ئەوەی خوای گەورە مەردوم هەڵدەنێ کە زۆر بەتەنگ دنیاوە نەبێ و خەمی ڕۆژی دوایی بخوات و هەوڵی بۆ بدات و ئاگاداری ئەکاتەوە بەوەی کە دوای ئەم ژیانە چی ڕوو ئەدات و بەم زووانە مرۆڤ ڕووبەڕووی چ نارەحەتیەك ئەبێتەوە: ﴿أَفَلَا يَعْلَمُ إِذَا بُعْثِرَ مَا فِى ٱلْقُبُورِ﴾ ئەرێ نازانی چی ڕوو ئەدات کاتێك کە شتی ناو قەبرەکان پەرش و بڵاو ئەکرێنەوە یانی: فڕێی ئەدا ئەوەی تیایەتی لە مردو ﴿وَحُصِّلَ مَا فِى ٱلصُّدُورِ﴾ واتە: وە ئاشکرا بوو هەرچی ناو دڵانە. ئیبنو عەباس و کەسانی تریش وتویانە، یانی: وە دەرخران. ئەوەی لەناو سینەیاندا شارابویانەوەدەرکەوت﴿إِنَّ رَبَّهُم بِهِمْ يَوْمَئِذٍ لَّخَبِيرٌۢ﴾ واتە: بێگومان لەو ڕۆژەدا پەروەردگاریان ئاگادارە

بە کردەوەکانیان. یانی: ئاگادارە بە هەموو ئەو شتانەی کە پێی هەڵدەستن و دەیکەن وە پاداشتیان ئەداتەوە بە تەواوی وە بە ئەندازەی مسقاڵە زەرەیەك ناهەقی ناکات.

## سورەتی (القارعه)

### لەمەککەدا هاتووەتەخوارەوە

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

﴿ٱلْقَارِعَةُ ﴿١﴾ مَا ٱلْقَارِعَةُ ﴿٢﴾ وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا ٱلْقَارِعَةُ ﴿٣﴾ يَوْمَ يَكُونُ ٱلنَّاسُ كَٱلْفَرَاشِ ٱلْمَبْثُوثِ ﴿٤﴾ وَتَكُونُ ٱلْجِبَالُ كَٱلْعِهْنِ ٱلْمَنفُوشِ ﴿٥﴾ فَأَمَّا مَن ثَقُلَتْ مَوَٰزِينُهُۥ ﴿٦﴾ فَهُوَ فِى عِيشَةٍ رَّاضِيَةٍ ﴿٧﴾ وَأَمَّا مَنْ خَفَّتْ مَوَٰزِينُهُۥ ﴿٨﴾ فَأُمُّهُۥ هَاوِيَةٌ ﴿٩﴾ وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا هِيَهْ ﴿١٠﴾ نَارٌ حَامِيَةٌۢ ﴿١١﴾﴾

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ٱلْقَارِعَةُ﴾ واتە: ڕۆژی دا چڵەکینەر (ناوە بۆ ڕۆژی قیامەت) ﴿مَا ٱلْقَارِعَةُ أَلْهَىٰكُمُ﴾ واتە: ئاخۆ چۆن بێت ئەو ڕۆژە؟ ﴿ٱلْقَارِعَةُ﴾ یەکێکە لە ناوەکانی ڕۆژی قیامەت وەك حاقە و طامە و صاخە و غاشیە، جگە لەم ناوانە ناوی تریشی هەیە. پاشان خوای گەورە زۆر بە گەورە باسی سامناکی ئەو ڕۆژە ئەکات و ئەفەرموێت: ﴿وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا ٱلْقَارِعَةُ﴾ واتە: تۆ چوزانیت ئەو ڕۆژە چی یە. پاشان مانای ئەکات و ئەفەرموێت: ﴿يَوْمَ يَكُونُ ٱلنَّاسُ كَٱلْفَرَاشِ ٱلْمَبْثُوثِ﴾ واتە: ڕۆژێکە خەڵکی وەك پەپولەی پەراگەندە بڵاو دەبنەوە. یانی: لەپەرژو بڵاوبونەوە و هاتو چۆیان و لەو سەرلێ شێواویەی کە تێی کەوتون وەك پەپوولەی پەراگەندەیان لێهاتوە.وەك خوای گەورە لە ئایەتێکی تردائەفەرموێت: ﴿كَأَنَّهُمْ جَرَادٌ مُّنتَشِرٌ﴾ واتە: ئەڵێی کوللەی پەرش و بڵاون.وەئەفەرموێت: ﴿وَتَكُونُ ٱلْجِبَالُ كَٱلْعِهْنِ ٱلْمَنفُوشِ﴾ واتە: وە شاخەکان وە خوری شیکراوەیان لێ دێت. یانی: وای لێ دێت وە خوری شیکراوە ئەڕوا بەڕوی زەمیناداو بڵاو ئەبێتەوە. موجاهید و عیکریمەو سەعیدی کوڕی جوبەیر و حەسەن و قەتادەو عەتای خۆراسانی و زەححاك و سودی ئەڵێن: ﴿كَٱلْعِهْنِ﴾ یانی: خوری. پاشان خودا باسی کردەوەی خەڵکی دەکات و وە هەر کەسە بەپێی قورسی و سووکی کردەوەی مامەڵەی لەگەڵ ئەکرێ و ڕێزی لێ ئەگیرێ یا ڕیسوا ئەکرێ، وە ئەفەرموێت: ﴿فَأَمَّا مَن ثَقُلَتْ مَوَٰزِينُهُۥ﴾ واتە: ئینجا ئەوەی کێشی چاکەکانی قورس و گران بێ. یانی: چاکەی زیاتر بوو لە خراپەی ﴿فَهُوَ فِى عِيشَةٍ رَّاضِيَةٍ﴾ ئەوە ئەو کەسە کە گوزەرانێکی

پەسەند دەبێ. یانی لەناو بەهەشتا ﴿وَأَمَّا مَنْ خَفَّتْ مَوَٰزِينُهُۥ﴾ واتە: وە ئەوەی کێشی چاکەکانی سووك بێت. یانی: خراپەی زیاتر بوو لە چاکەی ﴿فَأُمُّهُۥ هَاوِيَةٌ﴾ واتە: ئەوە جێی ئەو هاویە یە. وتراوە: یانی: ئەکەوێتە خوارەوە بەسەر سەریا بۆ ناو ئاگری جەهەنەم. ناوی بردووە بە﴿هَاوِيَةٌ﴾ یانی: ئەو شوێنەی کە ئەگەڕێتەوە بۆ لای و لە پاشەڕۆژدا ئەڕواتە باوەشی ﴿هَاوِيَةٌ﴾ ناوێکە لە ناوەکانی ئاگر. ئیبنو جەریر ئەڵێت: بۆیە بە هاویە وتراوە: ﴿فَأُمُّهُۥ﴾ یانی: دایکی، چونکە شوێنێکی تری نیە تێی بڕوات ئەوێ نەبێ. ئیبنو زەید ئەڵێت: ﴿هَاوِيَةٌ﴾ ئاگرە، شوێنیەتی و ئەگەڕێتەوە ناوی و ئەو ئەبێتە ئارامگاو دایکێتی جا ئەم ئایەتە ﴿وَمَأْوَىٰهُمُ ٱلنَّارُ﴾ی خوێند. ئیبنو ئەبی حاتەم ئەڵێت: ڕیوایەت کراوە لە قەتادەوە کە ئەڵێت: ﴿هَاوِيَةٌ﴾ یانی: ئاگر وە هەر ئەویش شوێنیانە. وە هەر لەبەر ئەوە خودا مانای ﴿هَاوِيَةٌ﴾ ئەکات و ئەفەرمووێت: ﴿وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا هِيَهْ﴾ واتە: تۆ چوزانی هاویە چییە! ﴿نَارٌ حَامِيَةٌۢ﴾ واتە: ئاگرێکی هەڵگیرساوە. یانی: ئاگرێکی زۆر گەرم و بە کەڵپە و بەتەوژم. لە ئەبو هورەیرەوە ڕیوایەت کراوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ئەو ئاگرەی کە بەنی ئادەم دەیکاتەوە بەشێکە لە حەفتا بەشی ئاگری جەهەنم، ئەڵێن: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەم ئاگرە بەس نەبوو ؟ فەرمووی: ئەو ئاگرەی جەهەنم بەشەست و نۆ(٦٩) جار لە ئاگری دنیا زیاد کراوە، بوخاری و موسلیم ڕیوایەتیان کردووە. وە لە هەندێ فەرموودەدا هاتوە: ئەو ئاگرە بە ئەندازەی شەست و نۆ جار لە ئاگری دنیایە، هەر شەسث و نۆکەی وەك ئاگری دنیا گەرمە. لەفەرمودەیەکدا کە لای ئیمامی ئەحمەدەوە هاتووە لە ئەبو هورەیرەوە ئەویش لە پێغەمبەرەوە(ﷺ)کە فەرموویەتی: سوکترین سزای خەڵکی جەهەنم کەسێکە کە دوو نەعلی لە پێدایە لەو دوو نەعلەوە مێشکی دەکوڵێ. لەهەردوو سەحیحەکەدا هاتووە کە پێغەمبەر(ﷺ)فەرموویەتی: ئاگر سکاڵا ئەکات لای پەروەردگار و ئەڵێت: ئەی پەروەردگارم ! هەندێکم هەندێکمی خوارد، بۆیە خوای گەورە ڕێگای دا کە دوو هەناسە بدات: هەناسەیەك لەزستانداو هەناسەیەك لە هاویندا. ساردترین هەناسەی ئەوەیە لەزستاندا ئەو سەرمایەیی کە دەی بینین و گەرم ترین هەناسەشی ئەوەیە لە هاوینا ئەو گەرمایە کە دەی بینین. وە لە دوو سەحیحەکەدا هاتوە: ئەگەر گەرما تینی سەند نوێژەکان بخەنە کاتی فێنکی، تینی گەرما لە دۆزەخەوەیە.

## سورەتی (التكاثر)

## لەمەککەدا هاتووەتە خوارەوە

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

﴿أَلْهَىٰكُمُ ٱلتَّكَاثُرُ ﴿١﴾ حَتَّىٰ زُرْتُمُ ٱلْمَقَابِرَ ﴿٢﴾ كَلَّا سَوْفَ تَعْلَمُونَ ﴿٣﴾ ثُمَّ كَلَّا سَوْفَ تَعْلَمُونَ ﴿٤﴾ كَلَّا لَوْ تَعْلَمُونَ عِلْمَ ٱلْيَقِينِ ﴿٥﴾ لَتَرَوُنَّ ٱلْجَحِيمَ ﴿٦﴾ ثُمَّ لَتَرَوُنَّهَا عَيْنَ ٱلْيَقِينِ ﴿٧﴾ ثُمَّ لَتُسْـَٔلُنَّ يَوْمَئِذٍ عَنِ ٱلنَّعِيمِ ﴿٨﴾﴾

### ئە نجامی خۆشەویستی دونیا بێئاگابونە لە ڕۆژی دوایی

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَلْهَىٰكُمُ ٱلتَّكَاثُرُ﴾ واتە: ئێوەی بێئاگا کردوە شانازیکردنتان بەزۆری سەروەت و سامانەوە، یانی: خۆشەویستی و بەهرەو جوانی دونیا ئێوەی خەلافاندوە لەوەی کە هەوڵ بدەن بۆ ڕۆژی دوایی و وە دەستی بێنن، بە غافلکردن تا مردن یەخەی گرتن و ڕۆشتن بۆ ناو گۆڕستان و بوون بەخەڵکی گۆڕستان. لەسەحیحی بوخاریا و لە ئەلرەقاقدا ڕیوایەت کراوە لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ئەویش لە ئوبەیی کوڕی کەعبەوە ئەڵێت: ئێمە ئەم فەرمودەمان لە قورئانا بەدی ئەکرد تا ئەو ئایەتە هاتە خوارەوە ﴿أَلْهَىٰكُمُ ٱلتَّكَاثُرُ﴾ یانی: ئەو فەرمودەیەی کە ئەڵێت: ئەگەر بەنی ئادەم شیوێ ئاڵتونی ببوایە ئاواتی بۆ شیوێکی تریش ئەخواست. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوەلە عەبدوڵای کوڕی شەخیرەوەئەڵێت: گەیشتمە حزمەت پێغەمبەر(ﷺ)کە ئەی فەرموو: ﴿أَلْهَىٰكُمُ ٱلتَّكَاثُرُ﴾ بەنی ئادەم ئەڵێ: سامانەکەم سامانەکەم. ئاخۆ تۆ بێجگە لەوەی خواردوتەوّ نەماوە، یا پۆشیوتە و دڕاوە، یا بەخشیوتەو بۆت هەڵگیراوە شتێکی ترت هەیە؟ مسلیم و تیرمیزی و نەسائیش ئەم حەدیسەیان ڕیوایەت کردوە. موسلیم ڕیوایەتی کردوە لە سەحیحەکەیدا لەئەبوهورەیرەوە ئەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: بەندە ئەڵێت: سامانەکەم سامانەکەم! لە کاتێکدا لە سامانەکەیدا تەنها سێ شتی هی ئەوە: ئەوەی خواردوویەتی و نەماوە یا پۆشیویەتی و دڕاوە یا بەخشیویەتی و مۆری کردوە جگە لەمانە ڕۆیشتوە و بۆ خەڵکی بەجێ هێشتوە. تەنها موسلیم ڕیوایەتی کردوە. بوخاریش ڕیوایەتی کردوە لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە کە ئەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: سێ شت شوێنی مردوو ئەکەوێ، دوانیان ئەگەڕێتەوە یەکێکیان لەگەڵی ئەمێنێتەوە: سامان و کەس و کارو کردەوەی شوێنی ئەکەون، سامان و کەس وکاری ئەگەڕێتەوە و کردەوەکەی ئەمێنێتەوە لەگەڵی. وە هەر بەم شێوەیە موسلیم و تیرمیزی و نەسائی ڕیوایەتیان کردوە. ئیمامی ئەحمەدیش ڕیوایەتی کردوە لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: بەنی ئادەم پیر ئەبێت و دوو شتی تێدا پیر

نابێت: خۆشەویستی سامان و هیوا بون بەژیان. لەهەردو سەحیحەکەدا ئەم حەدیسەهێنراوە. وە پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿حَتَّىٰ زُرْتُمُ ٱلْمَقَابِرَ﴾ واتە: تا دەمرن و دەچن بۆ گۆڕستان.

## ترسان بە پیشاندانی جەهەنم و پرسینەوە لە ڕۆژی و بەهرەکان

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿كَلَّا سَوْفَ تَعْلَمُونَ﴾واتە: دوبارە وا مەکەن لە مەولا دەزانن، حەسەنی بەسری ئەڵێت: ئەمە هەڕەشەیە دوای هەڕەشە. زەححاك ئەڵێت: ﴿كَلَّا سَوْفَ تَعْلَمُونَ﴾ یانی: ئەی خوا نەناسان!﴿ثُمَّ كَلَّاسَوْفَ تَعْلَمُونَ﴾یانی: ئەی خاوەنباوەڕان! وە پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿كَلَّا لَوْ تَعْلَمُونَ عِلْمَ ٱلْيَقِينِ﴾ واتە: وانیە وەك خۆتان دەیزانن ئەگەر ئەنجامی خۆتان بزانیایە بە دڵنیایی یەوە کە ڕۆژی دواییان بیرباتەوە، تا ڕێکەوتن بەرەو گۆڕستان.پاشان ئەفەرموێت: ﴿لَتَرَوُنَّ ٱلْجَحِيمَ﴾ واتە: سوێند بە خوا بێگومان دۆزەخ دەبینن﴿ثُمَّ لَتَرَوُنَّهَا عَيْنَ ٱلْيَقِينِ﴾ واتە: دوبارە سوێند بەخوا دڵنیا بن بە چاوی ڕاستەقینەدەی بینن. ئەمەمانای ئەو هەرەشەیەی پێشەوەیە کە فەرموویەتی: ﴿كَلَّا سَوْفَ تَعْلَمُونَ ۝٣ ثُمَّ كَلَّا سَوْفَ تَعْلَمُونَ﴾ هەڕەشەیان لێدەکات بەم ڕوداوو کارەساتە، کەبینینی ئەو ئاگرەیە کاتێ کە هەناسە ئەداو دەنگی لێوە دێ هەرچی فریشتە نزیکەکان و پێغەمبەرە مورسەلەکانە ئەکەون بەسەر ئەژنۆدا لە ترس و گەورەیی ئەو دەنگە و بینینی ئەو کارەساتە سامناکانە بەپێی ئەسەرێك کە لەو بارەیەوە باسی کراوە. وە ئەفەرموێت: ﴿ثُمَّ لَتُسْـَٔلُنَّ يَوْمَئِذٍ عَنِ ٱلنَّعِيمِ﴾ واتە: لە پاشان سوێند بەخوا لەو ڕۆژەدا پرسیاری هەموو بەهرەیەکتان لێ دەکرێ. یانی: لەو ڕۆژەدا لەبارەی خۆشی دونیاوە کە بریتی یە لە لەش ساغی و بێترسی و بژێوی و زۆر بەهرەی تر، لێت ئەپرسن کە ئایا شوکرانە بژێری بوی و بەندایەتیت کردوە یانا؟ ئیبنو جەریر ڕیوایەتی کردوە ئەڵێت: حەسەنی کوڕی سەدانی بۆی گێڕامەوە کە ئەڵێت: وەلیدی کوڕی قاسم بۆی گێڕاینەوە لەیەزیدی کوڕی کەیسان ئەویش لە ئەبو حازمەوە ئەویش لەئەبو هورەیرەوە کە فەرموویەتی: جارێکیان ئەبو بەکرو عومەر دانیشتبون لەو کاتەدا پێغەمبەر(ﷺ) هات بۆ لایان فەرمووی: چییە لەوێدا دانیشتون؟ ووتیان: بەو کەسەی تۆی ناردوە بەهەق برسیتی نەبێ هیچ شتێ لەماڵمان وەدەری نەناوین! پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: بەو کەسەی منی ناردوە بەهەق منیش برسێتی نەبێ هیچی تر وەدەری نەناوم! ئیتر ڕۆیشتن تا گەیشتنە ماڵی پیاوێك لە ئەنصاریەکان ژنێك پێشوازی لێکردن، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: فڵانە کەس لە کوێیە؟ ژنەکە ووتی: ڕۆیشت ئاوی خۆشمان بۆ بێنێ. هاوەڵەکەیان هاتەوەو جەوەنەیەك ئاوی هەڵگرتبوو ووتی: سەلامتان لێبێ، هیچ کەسێك سەردان نەکراوە بەشتێك بەڕێزتر بێ لە پێغەمبەرێك وا ئەمڕۆ سەردانی منی کردوە! جەوەنەکەی بەدار

خورمایەکا هەڵواسی و ڕۆیشت بۆشکێ خورمای بۆ هێنان، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئایا نەدەبوو خورماکەی لێ بکەیتەوە؟ ووتی: پێم خۆشبوو ئێوە خۆتان لێی هەڵبژێرن بە ئارەزووی خۆتان. پاشان کێردەکەی هەلگرت و پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو: نەکەی شیر دەر سەربڕی؟ کابرای ئەنصاری ئەو ڕۆژە حەیوانێکی بۆ سەربڕین و تێرو پڕیان لێ خوارد و پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: پرسیارتان لێئەکرێ لە ئەمە لە ڕۆژی قیامەتدا، ئێوە برسێتی دەری کردن لە ماڵەکانتان و نەگەڕانەوە تا ئەمەتان بوو بە نسیب و ئەمەش لەچاکەو بەهرەکانی خودایە و لێپرسینەوەی لەسەر ئەکرێت موسلیم ڕیوایەتی کردوە.

لەسەحیحی بوخاری و سونەنی تیرمیزی و نەسائی و ئیبنو ماجەدا هاتوە لە ئیبنو عەباسەوە ئەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: دوو بەهرە هەیە زۆر کەس تیایاندا زیانبار ئەبن لەش ساغی بەتاڵی، مانای ئەوەیە کە ئەو کەسانەی تاوانبارن کە سوپاسگوزاری ئەم دوو نیعمەتە ناکەن و هەڵناستن بەو ئەرکانەی لەسەر شانەوە هەر کەسێکیش هەڵنەسێت بەو هەقەی لەسەریەتی ئەو کەسە زەرەرمەندە ئیمامی ئەحمەدیش ڕیوایەتی کردوە لە ئەبو هورەیرەوە ئەویش لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) کە فەرموویەتی: خوای گەورە ئەفەرموێت: عفان ئەڵێت: یانی: لە ڕۆژی قیامەتدا، ئەی بەنی ئادەم ! تۆم ڕاگرتوە لەسەر ئەسپ و ووشتر و ژنم پێداوی و خۆشگوزەران و خاوەندەسەڵاتم کردوی، کوا سوپاسگوزاری ئەو نیعمەتانە؟ تەنها ئیمامی ئەحمەد بەم شێوەیە هێناویەتی.

## سورەتی ( العصر )

### لەمەککەدا هاتووەتە خوارەوە

عەمری کوڕی عاص موعجیزەی قورئانی بەم سورەتەدا بۆ دەرکەوت، دەگێڕنەوە کە عەمری کوڕی عاص نێررا بۆ لای موسەیلەمەی درۆزن پاش هاتنی پێغەمبەر(ﷺ)پێش ئەوەی عەمر موسڵمان بێت، موسەیلەمە پێی ووت: چی هاتوەتەخوارەوە بۆ هاوەڵەکەتان لەم ماوەیەدا؟ عەمر ووتی: بەڕاستی سورەتێکی کورت و زۆر پڕ مانای بۆ هاتوەتە خوارەوە. ووتی کامەیە؟ عەمر ووتی: ﴿وَالْعَصْرِ ۝١ إِنَّ الْإِنسَانَ لَفِي خُسْرٍ ۝٢ إِلَّا الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ وَتَوَاصَوْا بِالْحَقِّ وَتَوَاصَوْا بِالصَّبْرِ﴾ موسەیلەمە کەمێ فکری کردەوە و پاشان ووتی: وەك ئەوەیش بۆ منیش هاتوەتە خوارەوە عەمر پێی ووت کامەیە؟ موسەیلەمە ووتی: یاوَبْر، یاوَبْر، إنما أنت أُذنانِ وصَدْر، وسائرك حَفَر نَقَر ! پاشان ووتی بە عەمر چۆنە بە لاتەوە؟ عەمر ووتی: سوێند بەخوا تۆ چاك ئەزانی کە من دەزانم تۆ درۆ دەکەی. لە کتێبی (مساوئ الاخلاق) ئەبو بەکری خەرایتی داو لە جوزئی دوهەمیدا، بینیومە هەندێ شتی لەم بابەتەی موسەیلەمەی بەسەنەد باس کردووە، الوبر زیندەوەرێکە لە پشیلە دەچێ، گوێچکەو سنگی لەهەموو ئەندامەکانی لەشی گەورەترەو ئەندامەکانی تری ناشرین و بچووکە موسەیلمە ویستی بەم

ورێنه کردنه دژایەتی قورئان بکات، کەچی ئەم قسەیەش لە لای بتپەرستێکی ئەو زەمانەشدا ڕەواجی نەبوو ! تەبەرانیش ڕیوایەتی کردوە لە عوبەیدوڵای کوڕی حیصن کە ئەبو مەدینە ئەگێڕنەوە کە وتویەتی: هاوەڵەکانی پێغەمبەر(ﷺ) کاتی دوکەسیان بەیەك بگەیشتایە لەیەك جیانەئەبونەوە هەتا هەر یەکەیان هەموو سورەتی عەصری لەبۆ ئەوی تریان نەخوێندایە پاشان سڵاویان لەیەکتری ئەکرد و جیا ئەبونەوە ئیمامی شافیعیش ئەفەرموێ: ئەگەر خەڵکی بیر لەم سورەتە بکەنەوەو لێی وورد ببنەوە کیفایەتیان ئەکات.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

﴿وَالْعَصْرِ ① إِنَّ الْإِنسَانَ لَفِي خُسْرٍ ② إِلَّا الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ وَتَوَاصَوْا بِالْحَقِّ وَتَوَاصَوْا بِالصَّبْرِ ③﴾

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَالْعَصْرِ﴾ واتە: سوێند بەکات. یانی: ئەو کاتانەی کە خەڵکی کاری چاك و خراپی تێدا دەکات. مالیك لەزەیدی کوڕی ئەسلەمەوە ڕیوایەت ئەکات کە ووتویەتی: العصر یانی: بە ئێوارە. بەڵام ڕای یەکەم بەناوبانگترە ﴿إِنَّ الْإِنسَانَ لَفِي خُسْرٍ﴾ واتە: بێگومان هەموو خەڵکی لەزیاندایە. خودا سوێندی خواردوە بە ئێوارە کە خەڵکی زیانبارە، یانی: لەزیان و تیاچوندایە ﴿إِلَّا الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ﴾ واتە: مەگەر ئەوانەی کە بڕوایان هێنابێ و کردەوە چاکەکانیان کردبێ وە ئامۆژگاری یەکتریان کردبێ بە ئایینی ڕاست وە ئامۆژگاری یەکتریان کردبێ بە ئارام گرتن. لەگرۆی ئادەمیدا ئەوانەی خاوەنباوەڕ بوون بەدڵیان وئاکارچاك بون بەئەندامەکانی لەشیان لەزیانباران جیاکراونەتەوە﴿وَتَوَاصَوْا بِالْحَقِّ﴾ ئامۆژگاری یەکیان کردوە بەبەجێهێنانی خواپەرستی و وازهێنان لە قەدەغەکراوەکان ﴿وَتَوَاصَوْا بِالصَّبْرِ﴾ ئامۆژگاری یەکتریانکردوە بە خۆ ڕاگری لەسەر بەڵاو کارەسات و ئەو ئێش و ئازارەی کە توشیان دێت لەلایەن ئەوانەی کە ئەمان فەرمانیان پێئەکەن بەچاکەو ڕێگریان لێئەکەن لە خراپە.

## سورەتی (الهمزە)

## لەمەککەدا هاتووەتەخوارەوە

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

﴿وَيْلٌ لِّكُلِّ هُمَزَةٍ لُّمَزَةٍ ﴿١﴾ الَّذِي جَمَعَ مَالًا وَعَدَّدَهُ ﴿٢﴾ يَحْسَبُ أَنَّ مَالَهُ أَخْلَدَهُ ﴿٣﴾ كَلَّا لَيُنبَذَنَّ فِي الْحُطَمَةِ ﴿٤﴾ وَمَا أَدْرَاكَ مَا الْحُطَمَةُ ﴿٥﴾ نَارُ اللَّهِ الْمُوقَدَةُ ﴿٦﴾ الَّتِي تَطَّلِعُ عَلَى الْأَفْئِدَةِ ﴿٧﴾ إِنَّهَا عَلَيْهِم مُّؤْصَدَةٌ ﴿٨﴾ فِي عَمَدٍ مُّمَدَّدَةٍ ﴿٩﴾﴾

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَيْلٌ لِّكُلِّ هُمَزَةٍ لُّمَزَةٍ﴾واتە: سزاو لەناو چون بۆ هەموو نەنگرێکی تانەدەر، (الهمان) کەسێکە بە قسە تەشەر بدات، (اللمان) کەسێکە بەکرداری ئازاری مەردم بدات، یانی: خەڵکی بەسووك سەیر بکات و بگەڕێ بە شوێن کەم و کورپیاندا لە پێشەوە باس کرا لەو ئایەتەدا کە ئەفەرموێت: ﴿هَمَّازٍ مَّشَّاءٍ بِنَمِيمٍ وَالْقَلَمِ﴾واتە: پیتکە گری ئامشۆکەر بۆ قسە هێنان و بردن. ئیبنو عەباس ئەڵێت: ﴿هُمَزَةٍ لُّمَزَةٍ﴾یانی: تانەو تەشەردەرو گەڕاو بەشوێن کەمو کورِی خەڵکا. وە موجاهید ئەڵێ: (الهمزة) یانی: بەدەست و بە چاو تانە لەخەڵك بدات. (اللُمَزَة) بەزمان. وە ئەفەرموێت: ﴿الَّذِي جَمَعَ مَالًا وَعَدَّدَهُ﴾ واتە: ئەوەی کە هەر ماڵ و سامان کۆدەکاتەوە و ئەیژمێرێ. یانی: کۆی کردۆتەوەو لەسەر یەك داینـاوە و ئەژمێرێ، وە خـوای گـەورە ئەفـەرموێت: ﴿وَجَمَعَ فَأَوْعَىٰ﴾ واتـە: وەسامانی کۆ کردبێتەوە و هەڵی گرتبێ، سودی و ئیبنو جەریر ئەمەیان ووتـوە. موحەمـەدی کـوڕی کـەعب لـەم ئایەتەدا: ﴿جَمَعَ مَالًا وَعَدَّدَهُ﴾ ئەڵێ: سامانەکەی بەڕۆژ خەڵەفاندوویەتی و سەرگەرمی کـردوە بـە ئـەم وئەوەوە، کاتێکیش شەو ئەخەوێت وەك لاکێکی بۆن کـردو وایە. وە ئەفـەرموێت: ﴿يَحْسَبُ أَنَّ مَالَهُ أَخْلَدَهُ﴾ واتـە: وا دەزانـێ کـە ماڵەکـەی هـەر دەیهێڵێتـەوە. یـانی: وا دەزانـێ کۆکۆدنـەوەی سـامان و سەرژمێری کردنی لە مردن ڕزگاری ئەکات ﴿كَلَّا لَيُنبَذَنَّ فِي الْحُطَمَةِ﴾ واتە: نەخێر وانیە، بێگومان فـڕێ دەدرێتە ناو ئاگرێکی تێکشکێنەرەوە، یانی: بەو شێوە نیە ئـەو خـەیاڵی دەکاو وای دادەنـێ، پاشـان خـودای مـەزن ئەفـەرموێت: ﴿لَيُنبَذَنَّ فِي الْحُطَمَةِ﴾ یـانی: بێگومـان ئـەوەی سـامان کۆدەکاتـەوە و دەیژمێرێ فڕێ دەدرێتە ناو حوتەمەوە، کە ناوێکی تایبەتمەندە لە ناوەکانی ئاگر، چونکە ئـەوەی کـە لەناویایە تێکی ئەشکێنێ و ئەی سوتێنێ، بۆیـە خـودای گـەورە ئەفـەرموێت: ﴿وَمَا أَدْرَاكَ مَا الْحُطَمَةُ﴾

واتە: تۆ چوزانیت ئەو ئاگرە چییە؟ ﴿نَارُ ٱللَّهِ ٱلْمُوقَدَةُ مُّمَدَّدَةٍ﴾ واتە: ئاگرێکی تاودراوی خوای یە ﴿ٱلَّتِي تَطَّلِعُ عَلَى ٱلْأَفْـِٔدَةِ﴾ واتە: کە دێ بەسەر دڵاندا هوروژم دەباتە سەر دڵان، سابتی بونانی ئەڵێت: ئاگر ئەیان سوتێنێ تا ئەگاتە ناو دڵیان زیندوشن، پاشان ووتی: بەڕاستی خەڵکی ئاگر بەتەواوی سزائەخۆن، جا سابت دەستی کردە گریان! موحەمەدی کوڕی کەعب ئەڵێت: ئاگر هەموو لەشی دەخوات، تا کاتێ ئاگرەکە دەگاتە دڵی و نزیکی گەروی دەبێتەوە سەر لەنوێ دەگەڕێتەوە جێگای خۆی و دەست بەسوتاندنی دەکاتەوە. وە ئەفەرموێت: ﴿إِنَّهَا عَلَيْهِم مُّؤْصَدَةٌ﴾ واتە: بێگومان ئەو ئاگرە داخراوە لەسەریان و دەرچونیان نییە، یانی: داخراوە وەك لە پێشەوە لە سورەتی البلددا مانامان کرد، وە ئەفەرموێت: ﴿فِي عَمَدٍ مُّمَدَّدَةٍ﴾ واتە: زنجیر کراون لەناو چەند کۆتێکی ڕاکشاودان و بەستراونەتەوە بەچەند ستونێکی بەرزو بڵندەوە، عەتیەی عەوفی ئەڵێت: ئەستونی لە ئاسن دروستکراو. سوودی ئەڵێت: ئەستونی لە ئاگر. عەوفی ئەڵێت: لە ئیبن و عەباسەوە: ئەخرێتە ناو ئەستون گەلێکی بەرزو بڵندو بەو ئەستونانەی کە بەسەریانەوەیەو زنجیر لە ملیاندایە دەرگاکانی پێ دادەخرێ.

## سورەتی ( الفیل )

### لەمەککەدا هاتووەتە خوارەوە

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿أَلَمْ تَرَ كَيْفَ فَعَلَ رَبُّكَ بِأَصْحَٰبِ ٱلْفِيلِ ﴿١﴾ أَلَمْ يَجْعَلْ كَيْدَهُمْ فِي تَضْلِيلٍ ﴿٢﴾ وَأَرْسَلَ عَلَيْهِمْ طَيْرًا أَبَابِيلَ ﴿٣﴾ تَرْمِيهِم بِحِجَارَةٍ مِّن سِجِّيلٍ ﴿٤﴾ فَجَعَلَهُمْ كَعَصْفٍ مَّأْكُولٍ ﴿٥﴾﴾

ئەمە یەکێکە لەو هەموو چاکەو بەهرانەی کە خودای مەزن داویەتی بە قورەیش، کە لایدان و ڕزگاری کردن لە خاوەن فیلەکان ئەو کاتەی ویستیان کەعبەی پیرۆز بروخێنن و شوێنەواری لەسەر زەمیندا بسڕنەوەو نەیهێڵن، خوای گەورە قڕی تێخستن و لوتی دان بە زەمیندا و ئاواتەکانیانی پێ بردنە گۆڕو کارەکانی لێتێکدان و بەبێ هیوایی و سەر شۆڕی تەفرو تونای کردن. ئەوانە نەسرانی بوون، ئایینی ئەمان لەو کاتەدا باشتر بوو لەو بتپەرستیەی کە قورەیشیەکان پێیهەڵدەسان، بەڵام ئەم ڕوداوە شتێکی چاك و ڕێکەوتێکی باش بوو بۆ هاتنی پێغەمبەر(ﷺ) چونکە پێغەمبەر لەو ساڵەدا لە دایك بوو وەك لە مەشهورترین ڕیوایەتەکاندا هاتوە وە زمان حاڵی قەدەر ئەڵێت: ئەی قورەیش! لەبەر ئەوە یارمەتیم نەدان کە ئێوە چاکترن لە حەبەشییەکان بەڵکو ئەوە بۆ پاراستنی کەعبەی پیرۆز بوو، کە بەم زووانە ڕێزی لێ دەنێین و گەورەو بڵند ڕای دەگرین بەناردنی ئەو پێغەمبەرە نەخوێندەوارە کە موحەمەدە (ﷺ).

## چیرۆکی خاوەن فیلەکان بەکورتی

ئەمە چیرۆکی خاوەن فیلەکانە زۆر بەکورتی و کاکڵەی ڕوداوەکە ئەمەیە: لەپێشەوە لە چیرۆکی خاوەن خەندەقەکان دا باس کرا کاتێ زونەوواس دواین پاشای حیمیەریەکان بوو، کە بتپەرست بوون، هەموو ئەو خەڵکەی لە خەندەقەکانا سوتاندو کوشت کە گاور بوون، نزیکی بیست هەزار کەس ئەبوون، هیچ کەس ڕزگاری نەبوو جگە لە دەوسی زو سەعلەبان، دەوس ڕای کردو هاواری برد بۆ قەیسەری پاشای شام کە ئەویش نصرانی بوو، بۆ نەجاشی پاشای حەبەشەی نوسی، چونکە یەمەن لە ئەوانەوە نزیکتر بوو ئەویش دوو فەرماندەی نارد لە گەڵی بە سوپایەکی ئیجگار زۆرەوە: کە دوو فەرماندەکە یەکێکیان ناوی ئەریات و ئەوی تریان ناوی ئەبرەهەی کوڕی سەباحی ئەبو یەکسوم بوو، دایان بەسەر ئەو وولاتەدا، دەسەلاتیان لە حیمیەریەکان سەندەوە، زونەواسیش ڕای کردو لەدەریا خنکاو لەناو چوو، حەبەشەییەکان بوونە فەرمان ڕەوای یەمەن بەسەر پەرشتی ئەم دوو فەرماندەیە: ئەریات و ئەبرەهە، پاش ماوەیەك ناکۆکی کەوتە نێوانیان و بوو بە شەڕیان، زۆر پەلاماری یەکتریان داو لەشکری زۆریان لەیەکتری کۆ کردەوە، تا ڕۆژێك یەکێکیان ووتی بە ئەوی تریان: پێویست ناکات هەموو کاتێك ئەم سوپایە لەیەکتری کۆکەینەوە وەرە با من و تۆ شەڕ بکەین هەر کەسێکمان ئەوی تری کوشت دەسەلات بگرێتە دەست، هەردوکیان بەمە ڕازی بوون، ڕووبەڕوی یەکتر وەستان و (ئەریان) پەلاماری (ئەبرەهەی) داو شمشێرێکی لێداو لوتو دەمی هەڵدڕی و ناوچاوی قلیشاند، لەو کاتەدا (عەتەودە) کە خزمەتکارێکی ئەبرەهە بوو پەلاماری (ئەریانی) داو کوشتی، ئەبرەهە بە بریندار گەڕایەوە و برینەکەیان تەداوی کردو چاك بوەوە و بوو بە فەرماندەی ئەو سوپایەی حەبەشە لە یەمەن، نەجاشی نامەیەکی بۆ نووسی و زۆر سەرزەنیشتی کرد، هەڕەشەی لێ کردو سوێندی خوارد کە دێت بۆ یەمەن و پێئەنێت بەسەر خاکی ئەو وڵاتەداو سەری ئەبرەهەش ئەتاشێ، ئەبرەهە نێردراوێکی خۆی نارد بۆ لای نەجاشی تا دڵی بداتەوە و بەخششێکی زۆریشی بۆ نارد، کیسەیەك خۆڵی یەمەنی بۆ نارد لەگەڵ هەندێك توکی سەریا، نامەیەکیشی نوسی بۆی و تێیدا ئەڵێت: با پاشا پێ بنێتە سەر ئەم خۆڵەو سوێندەکەی نەکەوێ وە ئەوەش توکی سەرمە تاشیومە بۆی. پاشا کە ئەم خەبەرەی پێ گەیشت و ئەم شتانەی بینی سەرنجی ڕاکێشاو زۆر خۆشحاڵ بوو، لێی بوراو لەسەر ئیشەکەی هێشتیەوە. ئەبرەهە ناردی بۆ لای نەجاشی و پێی ووت: بەم زووانە کڵێسایەکت بۆ درووست ئەکەم لەسەر زەمینی یەمەن کە بێوێنە بێت، دەستی کرد بەدروست کردنی کڵێسایەکی گەورە لە سەنعا دا زۆر بەرزوو ڕازاوەو پڕ لە درەختی بەرزو جوان بوو، کە عەرەب ناویان نابوو (قولەیس) لەبەر زۆر بەرزی چونکە ئەگەر کەسێك سەیری بکردایە لە وانە بو کڵاوەکەی لەسەری داکەوێ، لەبەر کڵێساکە. ئەبرەهەی لوت بڕاو ویستی حەجی عەرەبەکان بگۆڕێ بۆ ئەوێ لەبری ئەوەی حەج ئەکەن بۆ کەعبە و

ئەچن بۆ مەککە، بانگەوازێکی بۆ ئەم مەبەستە لە وولاتەکەیدا بلاوکردەوە عەرەبە عەدنانی و قەحتانیەکان ئەمەیان زۆر پێناخۆش بوو، قورەیشیەکان زۆر دلگران بوون و ڕقیان هەستاو چەند کەسێك بە پەنهانی بەشەو چونە ناو کلێساکەوەو پیسایان تێدا کردو بەپەلە گەڕانەوە، کاتێ حزمەتچی کلێساکە ئەم ڕووداوەی بینی، هەواڵی گەیاند بە ئەبرەهە و پێی ووت: کە چەند کەسێکی قورەیشی ئەو کارەیان کردوە لە ڕقی ئەوەی کە تۆ ئەتەوێت وەك کەعبەی ئەوان خەڵکی بێن بۆ حەجکردن و واز لە کەعبەی خۆیان بێنن. ئەبرەهە سوێندی خوارد کە ئەڕوات بۆ مەککەو ئەو کەعبەیە ئەڕوخێنێ و بەردی بەسەر بەردیەوە ناهێڵێ، موقاتیلی کوڕی سولەیمان ئەڵێت: کۆمەڵێ لاوی قورەیشی ڕۆیشتونەتە ناوی و ئاگریان تێ بەرداوەو ئەو ڕۆژەش ڕەشابا بوە کلێساکە سوتاوەو کەوتۆتە سەر زەمین. ئەبرەهە خۆی ئامادە کرد بە لەشکرێکی زۆر گەورەوە بەرەو مەککە کەوتە ڕێ و کەس نەتوانێ لە ڕێگایا بوەستێ‌و فیلێکی زۆر گەورەی لەگەڵ خۆی برد کە کەس تا ئەو کاتە فیلی وا گەورەی نەدیبوو، پێیان ئەووت: مەحمود، نەجاشی پاشای حەبەشە ئەو فیلەی بۆ ناردبوو هەر بۆ ئەو مەبەستە، وە ئەڵێن: کە هەشت فیلی تری لەگەڵ بوە وە ئەشوترێت دوانزە فیلی لەگەڵ بوە جگە لە فیلی مەحمود، خودا باشتر دەزانێ ئەبرەهە ئەم فیلانەی هێنابوو بۆ ڕوخاندنی کەعبە یانی: زنجیر ببەستێ لە پایەکانی و بیخاتە ملی فیلەکان و هاواریان لێ بکات بۆ ئەوەی دیوارەکان بەیەك جار بکەون و بڕوخێن. کاتێ عەرەبەکان بەهاتنی ئەبرەهەیان زانی زۆر بەلایانەوە گران بوو باوەڕیشیان وا بوو کە پاراستنی کەعبە ئەرکی ئەوانە و پێویستە بەرگری لە کەعبە بکەن، بۆیە پیاوێ لە پاشاو ناودارەکانی یەمەن کە ناوی زونەفەر بوو ڕاپەڕی لە ئەبرەهەو بانگی هۆزەکەی کردو عەرەبی ئەو شوێنانەی کرد بەگژی ئەبرەهەدا، بۆپاراستنی کەعبەکە ئەیەوێت کاولی بکات و بیڕوخێنێ خەڵکەکە هاتن بەدەم بانگەوازەکەیەوە و چون بەگژ ئەبرەهەدا، بەلام ئەبرەهە سوپاکەی شکاندن خوا ئەمەی کرد بۆ ئەوەی لەپاشاندا ڕێزی خۆی بۆ کەعبە پیشانی خەڵك بدات، ئەوە بوو زونەفەر بەدیل گیراو ئەبرەهە لەگەڵ خۆی هێنای، پاشان کەوتە ڕێ بەرەو مەککە، کاتێ لەسەر زەمینی خەسعەم بوو نوفەیلی کوڕی حەبیبی خەسعەمی خۆی و هۆزەکەی کە پێك هاتبوون لە هۆزی شەهران و ناهیس ڕێگایان گرت لە سوپاکەو شەڕیان لەگەڵ کردن و ئەبرەهە ئەوانیشی شکاند و نوفەیلی کوڕی حەبیبی بە دیل گرت و ویستی بیکوژێ پاشان لێی خۆش بوو لەگەڵ خۆی هێنای بۆ ئەوەی ڕێگای حیجازی پێ نیشان بدات. کاتێ نزیکی سەر زەمینی تائیف بووەوە خەڵکەکە ڕۆیشتن بە دەمیەوە و ڕیابازییەکی زۆریان بۆ کرد لە ترسی ئەوەی نەوەك ئەو خانوەی کە ناویان ئەبرد بەلات بیڕوخێنێ زۆر ڕێزیان لێ گرت و ئەبو ڕیغالیشیان لەگەڵ نارد بۆ چاو ساغیکردنی، کاتێ ئەبرەهە گەیشتە موغەمەس کە شوێنێکە لەنزیك مەککە لەوێ مایەوەو سوپاکەی دای بەسەر مۆلگەی ووشترو مەڕو مالاتی مەککەداو هەموویان تالان کرد دوو سەد ووشتریان هی مالی

عەبدوموتەلیب بوو، ئەوەی کە ووشترەکانی بەتالآن برد بەفەرمانی ئەبرەهە سەرۆکی سوپاکە بوو لە پێشەوە کە ناوی ئەسوەدی کوڕی مەقصود بوو، کە عەرەبەکان هەجووی زۆریان کردوە وەك ئەبو ئیسحاق باسی ئەکات، ئەبرەهە حوناتەی حمیری نارد بۆ مەککە، فەرمانی پێدا کە ناودارترینی قورەیشی بۆ بهێنێ وە هەواڵیشی بداتێ کە پاشا نەهاتوە شەڕیان لەگەڵ بکات مەگەر نەهێڵن کەعبە بروخێ، حوناتە هاتە ناو مەککەو هەواڵی گەورەی قورەیشی پرسی، خەڵکی عەبدولمتەلیبی کوڕی هاشمیان نیشاندا، ئەویش پەیامەکەی ئەبرەهەی پێگەیاند، عەبدولمتەلیب ووتی: بەخودا ئێمە نامانەوێ شەڕی لەگەڵ بکەین و توانای ئەو شەڕەیشمان نییە، ئەویش ماڵی خودایەو ماڵی ئیبراهیمی خلیلی خودایە، ئەگەر خوا ئەیپارێزێ و بەرگری لێئەکات ئەوە ماڵی خۆیەتی و حەرەمی خۆیەتی، ئەگەر خواش وازی لێ دێنێ بۆ ئەبرەهە ئەوە ئێمە توانای بەرگریمان نی یە لێی. حوناتە پێی ووت: با بڕۆین بۆ لای ئەبرەهە عەبدولمتەلیب لەگەڵی ڕۆیشت، کاتێ ئەبرەهە چاوی پێی کەوت ڕێزی زۆری لێی گرت، چونکە عەبدولمتەلیب پیاوێکی کەڵەگەتی چوار شانەی جوانخاس بوو، ئەبرەهە لە شوێنەکەی خۆی دابەزی و هات لەسەر ئەو فەرشەی کە عەبدولمتەلیبی لەسەر دانیشتبو لە تەنیشتیدا دانیشت، ووتی بە تەرجومانەکە: ئەمەوێ پاشا ئەو دوو سەد ووشترە براوەم بۆ بگەڕێنێتەوە ئەبرەهە ووتی: بەتەرجومانەکەی: پێی بڵێ: کاتێك چاوم پێت کەوت سەرنجت ڕاکێشام پاشان کاتێك قسەت لەگەڵ کردم ئەو بۆچونەم نەماو گۆڕا، ئایا تۆ قسەم لەگەڵ ئەکەی بۆ دوو سەد ووشتر کە بردومە، واز لە ماڵێك دێنی کە ئاینی خۆت و بابو باپیرانت بوەو هاتوم بۆ تێکدانی باسی ناکەی لەگەڵم؟! عەبدولموتەلیب پێی ووت: من خاوەنی ئەو ووشترانەم، ئەو ماڵەیش خاوەنێکی هەیە دەیپارێزێ. ئەبرەهە ووتی: کەس نیە ڕێگام لێ بگرێت! عەبدولموتەلیب ووتی: کەواتە ئەوە تۆو ئەوە خاوەنی ئەو ماڵە. ئەڵێن: هەندێك لە پیاوماقولانی عەرەب لەگەڵ عەبدولموتەلیب ڕۆیشتن بۆ لای ئەبرەهە، سێ یەکی سامانی(تیهامە) یان دایە کە واز لە کەعبە بێنێ قەبوڵی نەکردو ووشترەکانی عەبدولموتەلیبی دایەوە، عەبدولموتەلیب گەڕایەوە بۆ ناو قوڕەیش داوای لێ کردن کە مەککە بەجێ بهێڵن و بڕۆنە سەر کێوەکان، لەترسی ئەوەی نەوەك سوپای ئەبرەهە دەستدرێژی بکەنە سەریان، پاشان عەبدولموتەلیب هەڵساو ئەڵقە زێڕی دەرگای کەعبەی گرت و لەگەڵ هەندێك لە پیاوانی قوڕەیش ئەپاڕانەوە لە خوداو داوای یارمەتیان لێدەکرد کە تۆڵە لە ئەبرەهەو سوپاکەی بسێنێ، عەبدولموتەلیب ئەڵقە زێڕی دەرگای کەعبەی گرتبوو ئەی ووت:

لاهُمَّ إن الْمَرْءُ يَمْنَعُ رَحْلَهُ فَمَنَعْ حِلالَك

لا يغْلِبَنَّ صَلِيبُهُمْ ومِحالُهُمْ غَدْواً مِحالَك

ئیبنو ئیسحاق ئەڵێت: دوای ئەوەی عەبدولموتەلیب ئەڵقەی زنجیرەکەی بەرداو پاشان ڕۆیشتن بۆ سەرکێوەکان. موقاتیلی کوڕی سەلمان باسی ئەکات لەلای بەیت سەد وشتری موقەلەدەیان[1] بەجێ هێشت، تا سوپای ئەبەرهە بەناهەق دەستیان بۆ ببەن بەڵکو خودا تۆڵەیان لێ بسێنێ، کاتێك ئەبرەهە بەیانی هەڵسا خۆی ئامادە کرد بۆ چوونە ناو مەککە، فیلەکەیشی ئامادە کرد کە ناوی مەحمود بوو سوپاکەی ڕێکخست و فیلەکەی بەرەو ڕووی مەککە برد، نوفەیلی کوڕی حەبیب چوە پێشەوە تا چوە تەنیشت فیلەکەو پاشان گوێی فیلەکەی گرت و ووتی: مەحمود بوەستەو چۆك دادە وا چاکە لە کوێوە هاتوی بگەڕێتەوە بۆ ئەوێ، چونکە تۆ لەماڵی خودای کە (بلد الله الحرام)ە. پاشان گوێی بەرداو فیل مەحمود وەستاو چۆکی دادا نوفەیل دەرچوو ڕای کرد تا گەیشتە سەر کێوەکە. دایان لە فیلەکە کە هەڵسێ، هەڵنەسا بەتەورزین دایان بەسەریاو هەرچەند لێیان نەوی و بەرزیان کردەوە هەڵنەسا، ڕویان ئەکردە یەمەن هەڵئەستاو ڕای ئەکرد. بەرەو شامیشیان ئەبرد دیسان ڕای ئەکرد، بەرەو ڕۆژهەڵاتیش هەروەها، بەڵام بەرەو مەککە ئەیان برد ئەوەستا و چۆکی دادەدا، خودا باڵندەیەکی لەدەریاوە باڵ درێژو قاچ کورت وە شەمشەمەکوێرەو پەرەسێلکە هەموو باڵندەیەك لەو باڵندانە سێ بەردی هەڵدەگرت، بەردێك بەدەنوکی، دوبەردیش بە قاچەکانی لە وێنەی نیسك و نۆك، ئەو بەردانە بەر هەر کەسێك بکەوتایە لەناوی ئەدا، هەموویان ئەو بەردەیان بەرنەکەوت. هەریەکێ بەلایەکا ڕای ئەکرد و هەواڵی نوفەیلیان ئەپرسی بۆ ئەوەی ڕێگایان نیشان بداو دەرباز بن. نوفەیلیش لەگەڵ قورەیشیەکان و عەرەبەکانی حیجاز سەیریان ئەکرد کە خودا چی بەلایەکی ناردوە بۆ خاوەن فیلەکان، نوفەیل ئەم شیعرانەی ئەووت:

أين المفر؟ والأله الطالب    والإشرم المغلوب غير الغالب

ئیبنو ئیسحاق ئەڵێت: نوفەیل ئەم شعرانەشی ووتوە:

الا حيِّيت عنايا ردينا    نعمناكم مع الاصباح عينا

ردينة، لو رأيت – ولا تريه–    لدى جنب المحصب ما رأينا

إ ذا لعزرتى وحمدت أمرى    ولم تأسى على مافات بينا

حمدت الله إذ أبصرت طيرا    وخفتُ حجازة تلقى علينا

فكل القوم تسأل عن نفيل    كأن عليَّ للحبشان دينا

عەتای کوڕی یەساروو کەسانی تریش ئەڵێن: هەموویان لەو کاتەدا سزانەدراون و تیانەچوون، بەڵکو هەندێکیان لەو کاتەدا تیا چون وە هەندێکی تریان گول بوون و لاشەیان داڕزاو پارچە پارچە گۆشتی

---

[1] کاتی خۆی هەر وشترێکیان دابنایە بۆ ئەوەی بیکەن قوربانی شتێکیان ئەکردە ملی و نیشانیان ئەکرد هەموو کەس ئەیزانی ئەوە کراوەتە (هدى) بۆ کەعبە و دانراوە بۆ هەژاران (وەرگێڕ).

لیٚ دەکەوتە خوارەوە، یەکیٚ لەوانە پارچە پارچە لەشی دادەڕزاو دەکەوتە خوارەوە ئەبرەهە بوو، تا لە ولآتی خەسعەم مرد و لەناو چوو. ئیبنو ئیسحاق ئەڵێت: ڕایان کردو ملی هەموو ڕێگایەکیان گرت و لەڕێگادا ئەمردن، ئەبرەهەیش لەشی پێکراو لەگەڵ خۆیان هەڵیان گرت، پارچە پارچە گۆشتی لەشی ئەکەوتە خوارەوە تا گەیاندیانە سەنعاء وەك زەرنەقوتەی لێهات، گیانی دەر نەچوو تا سنگی لەت بوو دڵی هاتە دەرەوە وەك هەندێك ئەڵێن: ئیبنو ئیسحاق ئەڵێت: کاتێ خودا پێغەمبەری(ﷺ) نارد یەکێك لەو چاکەو بەهرانەی خودا داویەتی بە قورەیش و لەسەریان تۆمار کراوە ئەوەیە کە حەبەشەکانی لە کۆڵ کردنەوە بۆ مانەوەیان و درێژەدانیان بە ژیان، وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿أَلَمْ تَرَ كَيْفَ فَعَلَ رَبُّكَ بِأَصْحَٰبِ ٱلْفِيلِ ۝١ أَلَمْ يَجْعَلْ كَيْدَهُمْ فِى تَضْلِيلٍ ۝٢ وَأَرْسَلَ عَلَيْهِمْ طَيْرًا أَبَابِيلَ ۝٣ تَرْمِيهِم بِحِجَارَةٍ مِّن سِجِّيلٍ ۝٤ فَجَعَلَهُمْ كَعَصْفٍ مَّأْكُولٍۭ﴾، ﴿لِإِيلَٰفِ قُرَيْشٍ ۝١ إِۦلَٰفِهِمْ رِحْلَةَ ٱلشِّتَآءِ وَٱلصَّيْفِ ۝٢ فَلْيَعْبُدُوا۟ رَبَّ هَٰذَا ٱلْبَيْتِ ۝٣ ٱلَّذِىٓ أَطْعَمَهُم مِّن جُوعٍ وَءَامَنَهُم مِّنْ خَوْفٍۭ﴾ لەشکری ئەبرەهەی لەناوبرد لە بەر هۆگری قورەیش، هۆگریان بەهاتوچۆی زستان و هاوینانەوە تالێیان تێك نەچێت، دەبا خاوەنی ئەم خانە (کەعبە)یە بپەرستێن ئەو زاتەی کە لە برسێتی دا ڕزگاری کردن و خواردەمەنی بۆ ناردن وە لە ترس و بیم پاراستنی و دڵنیای کردن. بۆیە داوای پەرستنی خوای ئەو خانەیان لێدەکات یانی بۆ ئەوەی هیچ شتێ لە حاڵ و وەزعیان نەگۆڕێت، لەوەی کە خودا پێی داون لە چاکە ئەگەر ئەم ئاینە قبوڵ بکەن خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿أَلَمْ تَرَ كَيْفَ فَعَلَ رَبُّكَ بِأَصْحَٰبِ ٱلْفِيلِ﴾ واتە: ئایا نەت بینی کە پەروەردگارت چی کرد بە خاوەن فیلەکان؟ ﴿أَلَمْ يَجْعَلْ كَيْدَهُمْ فِى تَضْلِيلٍ﴾ واتە: ئایا فرو فێڵەکەیانی پوچەڵ نەکردەوە ﴿وَأَرْسَلَ عَلَيْهِمْ طَيْرًا أَبَابِيلَ﴾ واتە: وە ناردیە سەریان باڵندەی زۆر، پۆل پۆل. ئیبنو هیشام ئەڵێت: ﴿أَبَابِيلَ﴾ یانی: کۆمەڵ کۆمەڵ، عەرەبەکان بەتاك بەکاریان نەهێناوە واتە: موفرەدی نیە، بەڵام ﴿سِجِّيلٍ﴾ یونسی نەحوی و ئەبو عوبەیدە هەواڵیان پێ داوم کە ﴿سِجِّيلٍ﴾ لەزمانی عەرەبیدا یانی: زۆر ڕەق. وە هەندێ لە موفەسیرین باسیان کردوە ووتویانە: دوو ووشەی فارسیەو عەرەبەکان کردویانە بەیەك ووشە، کە بریتین لە(سنج) و(جل)، مەبەست لە (سنج)[1] بەرد بوە وە لە (جل) قوڕبووە، ئەڵێن: (الحجارە) لەم دوو جۆرە جنسە بووە: قوڕو بەرد. هەروەها ئیبنو هیشام ئەڵێت: ﴿كَعَصْفٍ﴾ کشتوکاڵێکە کە نەڕنابێتەوە، تاکەکەی (عصفە) کۆتایی قسەکانی ئیبنو هیشام

---

[1] سنج، وادیارە (سەنگ) بێت، چونکە لەزمانی عەرەبیدا تیپی (گ) نی یە و لەباتیدا یان (ج) یان (غ) بەکار دێنن وەك ئەڵێن: (پیشمەرغە) لەباتی پێشمەرگە (وەرگێڕ).

هات. حەمادی کوڕی سەلەمە لە عاسمەوە ئەویش لە زوڕەوە ئەویش لە عەبدڵلا و ئەبو سەلەمەی کوڕی عەبدوڕەحمانەوە هێناویانە کە ئەڵێت: ﴿طَيْرًا أَبَابِيلَ﴾ یانی: کۆمەڵ کۆمەڵ، ئیبنو عەباس وزەحاك ئەڵێن: ﴿أَبَابِيلَ﴾ یانی: کۆمەڵ کۆمەڵ شوێنی یەك بکەون. موجاهید ئەڵێت: باڵندەی هەمە جۆر شوێنی یەك بکەون. موجاهید ئەڵێت: باڵندەی هەمە جۆر شوێنی یەك بکەون کۆمەڵ کۆمەڵ. حەسەنی بەسری و قەتادە ئەڵێن: ﴿أَبَابِيلَ﴾ یانی: باڵندەی زۆر. ئیبنو زەید ئەڵێت: باڵندەی هەمە جۆر لەهەموو لایەکەوە بێت، لەهەموو لایەکەوە بۆیان هاتن. کەسائی ئەڵێت: گوێم لێ بوو هەندێ لە نەحوزانەکان ئەیان ووت: تاکی ئەبابیل (إبیل)ە ئیبنو جەریر ڕیوایەتی کردوە لە ئیسحاقی کوڕی عەبدولای کوڕی حارسی نەوفەلەوە کە لە مانای ئەم ئایاتەدا: ﴿وَأَرْسَلَ عَلَيْهِمْ طَيْرًا أَبَابِيلَ﴾ ئەڵێت: کۆمەڵە کۆمەڵە، وەك کۆمەڵێ ووشتری زۆر لەسەر زەمینێ بڵاو بێتەوە. ئیبنو عەباس ئەڵێت: دەنوکیان بوە وەك دەنوکی باڵدارو ناو دەستیشیان وەك ناو دەستی سەگ وابوە، یانی: قاچیان وەك ناو دەستی سەگ وابوە،وەرگێڕ، عەکریمە ئەڵێت: ﴿طَيْرًا أَبَابِيلَ﴾ باڵندەیەکی سەوز بون لە دەریاوە هاتون سەریان وەك سەری دڕندەکان وابوە، (دڕندە یانی: حەیوانی گۆشت خۆر، وەرگێڕ) عوبەیدی کوڕی عومەیر ئەڵێت: ﴿طَيْرًا أَبَابِيلَ﴾ باڵندەیەکی ڕەش بون، بەرد بە دەنوکو نینۆکەکانیانەوە بووە لە دەریاوە هاتون. ئەم سەنەدانەیش صەحیح و ڕاستن. عوبەیدی کوڕی عومەیر ئەڵێت: کاتێ خوا ویستی خاوەن فیلەکان لەناو بەرێ، باڵندەیەکی بۆ وەدی هێنان لە دەریاوە وەك پەڕە سێلکە وابون باڵندەیەك کە قاچی کورتەو باڵی درێژە، هەموو باڵندەیەك سێ بەردی هەڵگرتبوو: دوو بەردیان بە قاچی و بەردێك بە دەنوکی، ئەڵێت: هاتن و وەستان بەسەریانەوە چریکاندیان و ئەو بەردانەی بە دەنوك و قاچیانەوە بوو بەریان دایەوە بۆیان، هەر بەردێك کە ئەیدا بەسەری هەر کەسێکا لە ژێری یەوە دەچوە دەرەوە، وە بەر هەر لایەکی لەشیان بکەوتایە لەلایەکەی تری یەوە ئەچوە دەرەوە لەو کاتەشدا خوا بایەکی بەهێزی نارد کاتێ کە بەردەکەیان فڕێ ئەدا بەهێزتری ئەکرد بەو جۆرە هەموویان لەناو چوون، خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿تَرْمِيهِم بِحِجَارَةٍ مِّن سِجِّيلٍ﴾ واتە: بەردبارانیان دەکردن بەوورده زیخی گڵین، وە ئەفەرموێت: ﴿فَجَعَلَهُمْ كَعَصْفٍ مَّأْكُولٍ﴾واتە: سەر ئەنجام وەك کای خوراوی لێکرد. سەعیدی کوڕی جوبەیر ئەڵێت: یانی: کا لە زمانی عەوامدا پێی ئەڵێن هەبور وە لەڕیوایەتێکی تری سەعیدا هاتوە یانی: گەڵای گەنم. وە دوبارە لە سەعیدەوە گێڕدراوەتەوە کە ئەڵێت: (العصف)یانی: کا و (المأکول) یانی: ئەو قەرسیلەی بەسەوزی ئەبڕێت بۆ مەڕو ماڵات. حەسەنی بەسریش هەروای ووتوە: ئیبنو عەباس ئەڵێت: (العصف)ئەو توێکڵەیە کە بەدانەوێڵەوەیە،

وەك ئەو توێکڵەی کە بە گەنمەوەیە. ئیبنو زەید ووتی: (العصف)گەڵای کشتوکاڵو گەڵای پاقلەیە، کاتێ مەڕو ماڵات ئەیخوات و فڕێی ئەدات و ئەبێتە پاشەڕۆ. یانی: خودای مەزن لەناوی بردن و قڕی کردن و چی فێڵ و کینەیان هەبوو بەتاڵی کردەوە و بەسەر شۆڕی گەڕاندنیەوە و هیچیان دەست نەکەوت و هەموویان تیا چوون و کەسیان دەرنەچوو مەگین بەزامداری نەبێ، وەك ئەبرەهە بەزامداری گەڕایەوە بۆ سەنعاء دڵی پچڕاو سینەشی لەت بوو، ئەوەی بەسەریان هاتبوو هەمووی بۆ گێڕانەوەو گیانی دەرچوو! دوای ئەبرەهە کوڕەکەی کە ناوی یەکسوم بو چووە شوێنەکەی، دوای یەکسومیش براکەی کە ناوی مەسروتی کوڕی ئەبرەهە بو چوە شوێنی. پاشان سەیفی کوڕی زەیدی حتمیەی ڕۆیشت بۆ لای کیسرا بۆ داوای یارمەتی لەدژی حەبەشەییەکان، کیسراش سوپایەکی لەگەڵ ناردو شەڕیان دژی حەبەشیەکان بەرپاکردو سەرکەوتن و خودا دەسەلاتەکەی پێدانەوە کە لە باب و باپیرانیانەوە بۆیان مابوەوە، عەرەبەکانیش دەستە دەستە دەهاتن بۆ لایی و پیرۆزباییان لێدەکرد. لە پێشەوە باسمان کرد لە تەفسیری سورەتی فەتحدا کاتێ پێغەمبەر(ﷺ) نزیك بوەوە لە سەنیە ڕۆژی حودەیبیە کە دائەبەزی بۆ قوڕەیشیەکان ئەسپەکەی چۆکی داداو بەچۆکا خۆی خستە سەر زەوی. تێی خوڕی هەڵنەساو نەڕۆیشت ووتیان: قەسوا (ناوی ئەسپەکەی پێغەمبەر(ﷺ) بوو، وەرگێڕ) مانی گرتوە. یانی: ناڕواو بێگوێ یە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: قەسواء مانی نەگرتوە، ئەم خوەشی نەبوە، بەڵکو ئەو کەسە بەندی کردوە کە فیلەکەی بەند کرد. پاشان فەرمووی: سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە ئەمڕۆ قوڕەیش داوای شتێکم لێ ناکەن کە ڕێزی حورومەتەکانی خودای تێدا بێ مەگین بەدەمیانەوە ئەچم لەو شتەدا. پاشان تێی خوڕی ئەسپەکە هەڵسا. ئەم فەرموودەیە تەنها بوخاری هێناویێتی. لەهەردو سەحیحەکەدا هاتوە کە پێغەمبەر(ﷺ) ڕۆژی فەتحی مەککە فەرمووی: خودا فیلی بەند کرد کە بڕواتە ناو مەککە، ڕێگای پێغەمبەرەکەی و خاوەن باوەڕانی داو باڵا دەستی کردن تیایدا، وە ئەمڕۆ ئەو حورمەتەی بۆ گەڕایەوە وەك حورمەتەکەی دوێنێ، ئەوسا ئەوەی لێرەیە با ئەو کەسانە ئاگادار بکات کە لێرە نین.

## سورەتی (قریش)

## لەمەککەدا هاتووەتەخوارەوە

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

﴿لِإِيلَافِ قُرَيْشٍ ﴿١﴾ إِيلَافِهِمْ رِحْلَةَ الشِّتَاءِ وَالصَّيْفِ ﴿٢﴾ فَلْيَعْبُدُوا رَبَّ هَٰذَا الْبَيْتِ ﴿٣﴾ الَّذِي أَطْعَمَهُم مِّن جُوعٍ وَآمَنَهُم مِّنْ خَوْفٍ ﴿٤﴾﴾

ئەم سورەتە جیابوەتەوە لە سورەتەکەی پێش خۆی. یانی: سورەی الفیل لە موسحەفی ئیمامی عوسماندا(ڕەزای خوای لێ بێت) (بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ) هەیە لەنێوان هەردوو سورەتەکەدا، هەرچەندە ئەم سورەتە ماناکانی پەیوەندی بەسورەتەکەی پێشیەوە هەیە، وەك موحەممەدی کوڕی ئیسحاق و عەبدوڕەحمانی کوڕی زەیدی کوڕی ئەسلەم ووتویانە، چونکە مانای هەردو سورەتەکە ئەوەیە: کە کاتێ فیلەکەمان بەند کرد نەمان هێشت بڕواتە ناو مەککەوە خەڵکەکەیمان قڕ کردو لەناومان بردن لەبەر یەکڕیزی و پێکەوە بوونی قورەیش یانی: بۆ کۆکردنەوە و پێکەوەمانی قورەیش لە شارەکەیانا بە بێمەترسی، ووتراوە: مەبەست پێی ئەو پێکەوە بونە بوە کە ڕاهاتبون لەسەری لە زستانا کۆچیان ئەکرد بۆ یەمەن و لە هاوینیشا بۆ شام بۆ بازرگانی و شتی تریش، پاشان ئەگەڕانەوە بۆ شارەکەیان بەبێمەترسی لە هیچ شتێك لە هاتو چۆیاندا، لەبەر بەڕێزیان لای خەڵکی و دیسان لەبەر ئەوەی کە خەڵکی حەرەمی خودان (حرم الله) هەر کەسێ ڕۆیشتبێتە لایان و لەگەڵیان بوبێ بەهۆی ئەوانەوە پارێزراو بوە، ئەمە ژیان و گوزەرانیان بوە لەهاتو چۆو کۆچ کردنیانا لە زستان و هاوینا، بەڵام لەکاتی مانەوەیان لە مەککەدا وەك خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿لِإِيلَٰفِ قُرَيْشٍ﴾ واتە: ئایانەیان زانیوە و سەرنجیان نەداوە کە ئێمە مەککەمان کردۆتە جێگایەکی ڕیزگیراوی بێترس و بیم لە کاتێکدا لە دەورو بەری ئەوان خەڵك دەفڕێنرێ؟ بۆیە خودا ئەفەرموێت: ﴿إِۦلَٰفِهِمْ رِحْلَةَ ٱلشِّتَآءِ وَٱلصَّيْفِ﴾ واتە: لەشکری ئەبرەهەی لەناوبردلەبەرهۆگری قورەیش ﴿إِۦلَٰفِهِمْ﴾ بەدەلی (إِیلَف) ی یەکەمەو ڕون کەرەوەیە بۆی. بۆیە فەرموویەتی: ﴿رِحْلَةَ ٱلشِّتَآءِ وَٱلصَّيْفِ﴾ واتە: هۆگریان بە هاتو چۆی زستان و هاوینانەوە تا لێیان تێك نەچێ، ئیبنو جەریر ئەڵێت: ڕاست وایە کە ئەو(لامە) لامی تەعەجوبە، وەك ئەوەیە کە بفەرموێت: (اعجبوا لایلاف قریش) یانی: سەرتان سوڕ بمێنێ لە پێکەوەمانی قورەیش و ئەو بەهرەو چاکانەی من هەمە بەسەریانەوە لەو هاتوچۆ کردنانەیاندا وە ئەڵێ: ئەمەش بۆیە ئەوترێ چونکە موسڵمانان هاو دەنگن لەسەر ئەوەی کە ئەم دوو سورەتە جیان لە یەکتری و هەر یەکە سورەتێکی سەربەخۆیە لە سورەتەکەی پێشەوەی پاشان ئامۆژگاریان ئەکات بۆ سوپاس گوزاری ئەم بەهرە چاك و گەورەیە فەرموویەتی: ﴿فَلْيَعْبُدُوا۟ رَبَّ هَٰذَا ٱلْبَيْتِ﴾ واتە: دەبا خاوەنی ئەم خاکە(کەعبە) یە بپەرستن. یانی: با هەر تەنها خودا بپەرستن، کە چۆن حەرەمێکی بێمەترسی و خانویەکی موحەرەمی فەراهەم هێناوە.وەك ئەفەرموێت: ﴿إِنَّمَآ أُمِرْتُ أَنْ أَعْبُدَ رَبَّ هَٰذِهِ ٱلْبَلْدَةِ ٱلَّذِى حَرَّمَهَا وَلَهُۥ كُلُّ شَىْءٍ ۖ وَأُمِرْتُ أَنْ أَكُونَ مِنَ ٱلْمُسْلِمِينَ﴾ واتە: ئەی موحەممەد(ﷺ) بڵێ: بێگومان من فەرمانم پێدراوە کە تەنها پەروەردگاری ئەم شارە مەککە بپەرستم ئەو خوایەی ڕێز شکاندنی ئەم

شارەی حەرام کردوەو هەموو شتێك تەنها هی ئەو خوایە، وە فەرمانم پێدراوە لە موسڵمانان بم. وە فەرموویەتی: ﴿ ٱلَّذِىٓ أَطْعَمَهُم مِّن جُوعٍ وَءَامَنَهُم مِّنْ خَوْفٍۭ ﴾ واتە: ئەوزاتەی کە لە برسێتی دا ڕزگاری کردن و خواردەمەنی بۆ ناردن وە لەترسی و بیم پاراستنی و دڵنیایی کردن. یانی: پەروەردگار ئەو خانوە ڕزگاری کردن لە برسێتی و ڕۆزی دان ﴿وَءَامَنَهُم مِّنْ خَوْفٍۭ﴾ یانی: مۆڵەتی دان و دڵنیای کردن لە مەترسی، کە وابو با بە تەنها ئەو بپەرستن و هاوەڵی بۆ دانەنێن، با جگە لەو هیچ شتێك نەپەرستن لە دارو بەردو وێنەو هەیکەلی داتاشراو. لەبەر ئەمە هەر کەسێ وەڵامی ئەم فەرمانەی خودا بداتەوە خودا دڵنیایان ئەکات کە نەترسن، وە هەر کەسێ سەرپێچی فەرمانی بکات ئەو دڵنیایەی لێ دەسێنێتەوە بە ترس و نارەحەتی بەسەری ئەبا، وەك خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا قَرْيَةً كَانَتْ ءَامِنَةً مُّطْمَئِنَّةً يَأْتِيهَا رِزْقُهَا رَغَدًا مِّن كُلِّ مَكَانٍ فَكَفَرَتْ بِأَنْعُمِ ٱللَّهِ فَأَذَٰقَهَا ٱللَّهُ لِبَاسَ ٱلْجُوعِ وَٱلْخَوْفِ بِمَا كَانُوا۟ يَصْنَعُونَ ﴿١١٢﴾ وَلَقَدْ جَآءَهُمْ رَسُولٌ مِّنْهُمْ فَكَذَّبُوهُ فَأَخَذَهُمُ ٱلْعَذَابُ وَهُمْ ظَٰلِمُونَ ﴾ واتە: خوا نمونەی هێناوەتەوە بە خەڵکی شارێك کە هێمن و دڵنیا بون ڕزق و ڕۆزی بۆ دەهات لەهەموو شوێنێکەوە کەچی بەرامبەر چاکەو بەهرەکانی خوا نا سوپاس و سپڵە بوون، جا خوا بەو هۆیەوە پۆشاکی برسێتی و ترسی کردە کاڵای باڵایان لەبەر ئەو کردەوانەی کە دەیانکرد، سوێند بەخوا بەڕاستی پێغەمبەرێکیان لەخۆیان بۆ هات کەچی باوەڕیان پێنەهێنا، بۆیە سزا گرتنی لە کاتێکدا ستەم کاربون.

## سورەتی (الماعون)

### لەمەکەدا هاتووەتەخوارەوە

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿أَرَءَيْتَ ٱلَّذِى يُكَذِّبُ بِٱلدِّينِ ﴿١﴾ فَذَٰلِكَ ٱلَّذِى يَدُعُّ ٱلْيَتِيمَ ﴿٢﴾ وَلَا يَحُضُّ عَلَىٰ طَعَامِ ٱلْمِسْكِينِ ﴿٣﴾ فَوَيْلٌ لِّلْمُصَلِّينَ ﴿٤﴾ ٱلَّذِينَ هُمْ عَن صَلَاتِهِمْ سَاهُونَ ﴿٥﴾ ٱلَّذِينَ هُمْ يُرَآءُونَ ﴿٦﴾ وَيَمْنَعُونَ ٱلْمَاعُونَ ﴿٧﴾﴾

نیشانەی ئەو کەسانەی کەڕۆژی قیامەتیان لا درۆیەو بەڕاستی نازانن خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿أَرَءَيْتَ ٱلَّذِى يُكَذِّبُ بِٱلدِّينِ ﴾ واتە: ئاخۆ دیت ئەو کەسەی کە بڕوای نیەبە ڕۆژی پاداشت دانەوە ؟ ئایا تۆ ئەی موحەممەد ئەو کەسەت دی کە ڕۆژی جەزای بەدرۆ دەزانی کە ڕۆژی قیامەتە و ڕۆژی تۆڵەو پاداشتە﴿فَذَٰلِكَ ٱلَّذِى يَدُعُّ ٱلْيَتِيمَ ﴾ واتە: ئەوە کەسێکە کە پاڵ بە هەتیوەوە دەنێ، هەر ئەو

کەسە بوو هەتیو دەڕەنجێنێ و ناهەقی پێدەکات و بەشی ناداو خواردنی پێناداو بەچاکی لەگەڵی ناجوڵێتەوە ﴿وَلَا يَحُضُّ عَلَىٰ طَعَامِ ٱلْمِسْكِينِ﴾ واتە: وە هانی خەڵك نادات بۆ خواردەمەنیدان بە هەژاران، وەك خودا ئەفەرموێت: ﴿كَلَّا ۖ بَل لَّا تُكْرِمُونَ ٱلْيَتِيمَ ﴿١٧﴾ وَلَا تَحَٰٓضُّونَ عَلَىٰ طَعَامِ ٱلْمِسْكِينِ﴾ واتە: نەء وانیە! کە ئێوە بیری لێ ئەکەنەوە بەڵکو ئێوە ڕێزی هەتیوان ناگرن، وە هانی یەکتری نادەن لەسەر خواردەمەنیدان و بەخێوکردنی هەژاران. یانی: ئەو هەژارەی کە شتێکی نیە باری گرانی سوك بکات یا بێنیازی بکات. پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿فَوَيْلٌ لِّلْمُصَلِّينَ﴾ واتە: ئینجا وای بۆ نوێژکەران﴿ٱلَّذِينَ هُمْ عَن صَلَاتِهِمْ سَاهُونَ﴾ واتە: ئەوانەی لەنوێژەکەیان بێئاگان. ئیبنو عەباس و کەسانی تریش ئەڵێن: مەبەست دوڕووەکانە. ئەوانەی بەئاشکرا نوێژ دەکەن و لە پەنهانیا نوێژ ناکەن، بۆیە ئەفەرموێت: ﴿لِّلْمُصَلِّينَ﴾ ئەوانەی کە نوێژ کەرن و دەیشیکەن، بەڵام هۆش و گوێ بە نوێژەکانیان نادەن، یا هەر نایکەن بەتەواوی، وەك ئیبنو عەباس ووتویەتی، یا لەکاتی دیاری کراوی خۆیدا کە شەرع بۆی داناون نایکەن تا کاتەی ئەڕوا بەتەواوی، وەك مەسروق و ئەبو زوحا ووتویانە.

عەتای کوڕی دینار ئەڵێت: سوپاس بۆ ئەو خودایەی کە فەرموویەتی: ﴿عَن صَلَاتِهِمْ سَاهُونَ﴾ نەی فەرمووە: (في صلاتهم ساهون) جا ئەوکەسانە یا کاتی یەکەمی نوێژەکانیان دوا ئەخەن تا نزیکی نەمانی کاتی نوێژەکە ئیتر هەموو کاتێ وابکەن یا لەزۆربەی کاتدا وا بکەن، یا لە پایەکانی نوێژو مەرجەکانیدا، یا کەمتەرخەمی ئەکەن لە خوشوعدا کەمتەرخەمەو بەهۆشەوە نوێژەکانی ناکاو بیر لەماناکەی ناکاتەوە، ئەم کەلیمەی ﴿عَن صَلَاتِهِمْ﴾ هەموو ئەم مانایانە ئەبەخشێت، هەر کەسێشتێکی لەم سیفاتانە تێدا بێ، بەشێکی بەر ئەکەوێ لەم ئایەتە. وە هەر کەسێکیش هەمووی تێدا بێ ئایەتەکە بەتەواوی ئەیگرێتەوە، ئەو کەسە دو ڕووی تەواوە دو ڕووی کرداری تێدا دێتە جێ، واتە لەهەردوو سەحیحەکەدا هاتوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ئەو نوێژە نوێژی دو ڕووە، ئەو نوێژە نوێژی دو ڕووە، ئەو نوێژە نوێژی دو ڕووە، دادەنیشێ چاودێری خۆر دەکات تا وەختێ گەیشتە نێوان دو شاخی شەیتان هەڵدەستێ و چوار جار دەنووك ئەدا بە زەمیناو یادی خودای تێدا ناکات کەمێ نەبێ. مەبەست لە ئەم نوێژەیش لێرەدا نوێژی عەسرە کە پێی ئەوترێ (صلاة الوسطى) وەك چۆن بەدەق هاتوە کە کابرا دوایئەخات و تا کۆتایی کاتەکەی کە ئەو کاتەیش نوێژ تێیدا کەراهەتی هەیە، جا ئەو کاتە هەڵئەسێ و چوار جار وەك قەلەڕەش دەنووك ئەدا بە زەمینا، ئارام لە نوێژەکەیدا نیە و خشوعیشی تێدا نی یە. بۆیە حەدیسەکە فەرموویەتی: یادی خودای تێدا ناکات کەمێ نەبێ. وە لەوانەیە لەبەر ئەوە هەڵسێ نوێژ بکات کە خەڵکی چاویان پێی بکەوێ نەك لەبەر ڕەزامەندی خوا، ئەمە وەك ئەوە

وایە کە هەر نوێژ نەکات. خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ يُخَٰدِعُونَ ٱللَّهَ وَهُوَ خَٰدِعُهُمْ وَإِذَا قَامُوٓاْ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ قَامُواْ كُسَالَىٰ يُرَآءُونَ ٱلنَّاسَ وَلَا يَذْكُرُونَ ٱللَّهَ إِلَّا قَلِيلًا﴾ واتە: بەڕاستی دو ڕووەکان دەیانەوێت خوا بخەڵەتێنن کەچی خوا خەڵەتێنەری ئەوانە هەر کاتێکیش هەستن بۆ نوێژ بەتەمەڵی و سستی هەڵدەستن ڕوپامایی بۆ خەڵکی دەکەن وە یادی خوا ناکەن کەمێك نەبێت.وە لێرەدا ئەفەرموێت: ﴿ٱلَّذِينَ هُمْ يُرَآءُونَ﴾ واتە: ئەوانەی کە ڕوپامایی دەکەن. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە عەمری کوڕی موڕەوە ئەڵێت: لای ئەبو عوبەیدە دانیشتبوون باسی ڕوپامای کرا، پیاوێ کە کونیەکەی ئەبو زەید بوو ووتی: بیستم لە عەبدوڵای کوڕی عەمرەوە ئەی ووت: پێغەمبەر(ﷺ)فەرموویەتی: هەر کەسێ هەرچی کرد لەناو خەڵکا بڵاوی کاتەوە بۆ ڕیایی کردن، خودا خەڵکی ئاگادار ئەکات لە کردەوەکانی و سوك و ڕیسوای ئەکات لەناو خەڵکا.ئەوەی پەیوەندی هەیە بەم ئایەتەوە کە خودا ئەفەرموێت: ﴿ٱلَّذِينَ هُمْ يُرَآءُونَ﴾ کەسێك کارێکی چاك بکات لەبەر ڕەزای خوا خەڵکی پێی بزانن ئەویش پێی خۆشحاڵ بێ بەو کارەی ئەمە بە ڕیا دانانرێ. وە ئەفەرموێت: ﴿وَيَمْنَعُونَ ٱلْمَاعُونَ﴾ واتە: وە یارمەتی خەڵك نادەن. یانی: نەبە چاکی خودا پەرستی پەروەردگاریان دەکەن و نە لەگەڵ خەڵکیش چاکە ئەکەن، تەنانەت بە ئەمانەتیش شتیان نەداوە بە خەڵکی تا کەڵکی لێ وەربگرن و پاشان بۆیان بگێڕنەوە، ئەو کەسانە بۆ زەکاتدان ئاوەها بن، ئەوا دیارە بۆ خێر کردن زیاترو زیاتر دەست قوچاو ئەبن. مەسعود لە سەلەمەی کوڕی کوهەیلەوە ئەویش لە ئەبو عوبەیدینەوە ئەگێڕێتەوە کە ووتویەتی: پرسیار لە ئیبنو مەسعود کراوە لە بارەی﴿ٱلْمَاعُونَ﴾ەوە ئەویش ووتویەتی: ئەو شتانەیە کە خەڵك ئەیدەن بەیەکتری، وەك قازانگ و تەورو تەورزێن و سەتڵ و لەم بابەتانە.

## سورەتی (الكوثر)

**لە مەدینەدا هاتووەتەخوارەوە وئەشڵێن لەمەککەدا هاتووەتەخوارەوە**

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿إِنَّآ أَعْطَيْنَٰكَ ٱلْكَوْثَرَ ﴿١﴾ فَصَلِّ لِرَبِّكَ وَٱنْحَرْ ﴿٢﴾ إِنَّ شَانِئَكَ هُوَ ٱلْأَبْتَرُ ﴿٣﴾﴾

موسلیم و ئەبو داودو نەسائی ڕیوایەتیان کردوە لە ئەنەسەوە دەستەواژەکە هی موسلیمە کە ئەڵێت: جارێکیان پێغەمبەر(ﷺ) لە مزگەوت لەناوماندا بوو، هەموو دانیشتبوین لەناکاو خەوە نوچکەیەك بردیەوە پاشان سەری بەرز کردەوەو زەردەخەنەیەکی کرد ووتمان: بۆچی پێ ئەکەنی ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ)! فەرمووی: ئێستا سورەتێکم بۆ هاتە خوارەوە و دەستی کرد بە خوێندنی:

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ ﴿إِنَّا أَعْطَيْنَاكَ الْكَوْثَرَ ① فَصَلِّ لِرَبِّكَ وَانْحَرْ ② إِنَّ شَانِئَكَ هُوَ الْأَبْتَرُ﴾ پاشان پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئایا ئەوانن کەوسەر چی یە؟ ووتمان: خواو پێغەمبەری خوا ئەزانن، فەرمووی: ڕووبارێکە پەروەردگارم بەڵێنی پێداوم زۆر شتی چاکی تێدایە، حەوزێکە ئومەتەکەم دێنە سەری لەڕۆژی قیامەتدا، پیاڵەو پەرداخەکانی بە ئەندازەی ژمارەی ئەستێرەکانی ئاسمانە، هەندێ کەسیان دەر ئەکرێن، منیش ئەڵێم: پەروەردگارم! ئەوە لە ئومەتی منە، ئەفەرموێت: تۆ نازانی دوای تۆ چیان کردوە! ئەم حەدیسە ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە موحەمەدی کوڕی فوزەیلەوە و ئەویش لە موختاری کوڕی فولفولەوە ئەویش لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە. وە ئیمامی ئەحمەد دیسانەوە لە ئەنەسەوە ڕیوایەتی کردوە و ئەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: چومە بەهەشت لەسەر ڕووبارێك بوم لە لێوارەکانیدا مرواری تێدا بوو، دەستم کرد بەو شوێنەی ئاوەکەی پێدا ئەڕۆیشت، بۆنی میسکێکی زۆر خۆشی لێدەهات، ووتم: ئەی جوبرەئیل ئەمە چییە؟ ووتی ئەمە ئەو کەوسەرەیە کە خوای مەزن بە تۆی بەخشیوە. بوخاریش لە سەحیحەکەیا ڕیوایەتی کردووەو موسلیمیش لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە کە ئەڵێت: کاتێ پێغەمبەر(ﷺ) بەرز کرایەوە بۆ ئاسمان فەرمووی: چومە سەر ڕوبارێك هەردو لاکەی پڕ بوو لە گومەزی مرواری ناو پۆش، ووتم: ئەمە چی یە ئەی جوبرەئیل؟ ووتی ئەمە کەوسەرە. ئەمە ووتەی بوخاری یە، ڕەحمەتی خوای لێ بێ. ئیمامی ئەحمەدیش ڕیوایەتی کردوە لە ئەنەسەوە پیاوێك ووتی: ئەی پێغەمبەری خودا! کەوسەر چی یە؟ فەرمووی: ئەوە ڕووبارێکە لە بەهەشتا پەروەردگارم پێی بەخشیوم، ئەو کەوسەرە لە شیر سپی ترەو لە هەنگوینیش شیرین ترەو باڵندەی تێدایە ملیان وەك ملی ئەو مەڕو ماڵاتانەیە کە سەر ئەبڕێن و گۆشتیان ئەخورێ، عومەر ووتی: ئەی پێغەمبەری خودا! باڵندەیەکی ناسکە؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەوەی ئەیخوات ناسك ترە لە باڵندەکە ئەی عومەر ! بوخاری ڕیوایەتی کردوە لە سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە ئەویش لە ئیبنو عەباسەوە (خوا لێی ڕازی بێ) ئەڵێت: کەوسەر یانی: ئەو شتە زۆرانەی کە خودا پێی بەخشیوە. ئەبو بیشر ئەڵێت: ووتم بەسەعدی کوڕی جوبەیر هەندێ خەڵك ئەڵێن کەوسەر ڕوبارێکە لەبەهەشتا؟ سەعید ووتی: ئەو ڕوبارەی کە لەبەهەشتایە کە خودا بەخشیویەتی بە پێغەمبەر(ﷺ). وەدیسانەوە بوخاری ڕیوایەتی کردوە لەسەعیدی کوڕی جوبەیر ئەویش ئیبنو عەباسەوە ئەڵێت: کەوسەر: یانی شتی زۆر. ئەم مانایە ڕوباریش و شتی تریش ئەگرێتەوە، چونکە ﴿الْكَوْثَرَ﴾ لە (الکثرة)وە هاتوە یانی: شتی زۆر، یەکێ لەو شتانە ڕوبارە، ئیمامی ئەحمەدیش ڕیوایەتی کردوە لە ئیبنو عومەرەوە ئەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: کەوسەر ڕوبارێکە لە بەهەشتا تەنیشتەکانی لە ئاڵتونەو ئاوەکەی بەناو مرواریدا تێدەپەڕێ و ئاوەکەی لەشیر سپی ترەو لە

هەنگوین شیرینترە. تیرمیزی و ئیبنو ماجە و ئیبنو ئەبی حاتەم و ئیبنو جەریر هەر بەو شێوەیە ڕیوایەتیان کردوە، تیرمیزی ئەڵێت: حەدیسەکە حسن صحیحە، خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَصَلِّ لِرَبِّكَ وَٱنْحَرْ﴾ واتە: دەی کەواتە نوێژ بکە بۆ پەروەردگارت وە قوربانی سەر ببڕە، یانی: وەك چۆن ئێمە شتی زۆرمان داوە بەتۆ لە دونیاو ڕۆژی دواییدا، تۆش زۆر بە دڵسۆزی یەوە نوێژە فەرزەکان و سونەتەکان بکە بۆ پەروەردگارت و قوربانیش تەنها بۆ ئەو بکە وە هەر ئەو بپەرستە بەتەنها کە هاوەڵی نی یە و تەنها بەناوی ئەوەوە قوربانی بکە کە بێهاوەڵە. وەك خودا دەفەرموێت: ﴿قُلْ إِنَّ صَلَاتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَالَمِينَ ﴿١٦٢﴾ لَا شَرِيكَ لَهُۥ وَبِذَٰلِكَ أُمِرْتُ وَأَنَا۠ أَوَّلُ ٱلْمُسْلِمِينَ﴾ واتە: ئەی موحەمەد (ﷺ)! بڵێ: بێگومان نوێژو بەندایەتی و ژیان و مردنم هەر بۆ خوای پەروەردگاری هەموو جیهانیانە، هیچ هاوبەشێکی نی یە و هەر بەوە فەرمانم پێدراوە وە من یەکەمی هەموو فەرمانبەرانم بۆ خوا، ئیبنو عەباس و عەتاو مووجاهیدو عیکریمەو حەسەن ئەڵێن: یانی: بەو شێوەیە ووشترو مەڕو ملاتیش دەکرێت بە قوربانی. قەتادەو موحەممەدی کوڕی کەعبی قورەزی و زەححاك و ڕەبیع و عەتای خۆراسانی و حەکەم و ئیسماعیلی کوڕی ئەبو خالیدو کەسانی تریش لە پێشینەکان هەر وایان ووتوە. ئەمە بە پێچەوانەی بتپەرستەکان کە پێی هەڵساون کڕنوشیان بۆ جگە لە خوا بردوە و مەڕو ماڵات و ووشترو شتی تریان سەر بڕیوە بۆ بێجگە لە خوا، وەك خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَلَا تَأْكُلُوا۟ مِمَّا لَمْ يُذْكَرِ ٱسْمُ ٱللَّهِ عَلَيْهِ وَإِنَّهُۥ لَفِسْقٌ﴾ واتە: لەو سەربڕاوە مەخۆن کەناوی خاوی لەسەر نەهێنراوە کاتێ سەربڕین بێگومان خواردنی ئەوە تاوان و لەسنور دەرچونە.

### وەجاخکوێر دوژمنانی پێغەمبەرن(ﷺ) نەك پێغەمبەر(ﷺ)

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿إِنَّ شَانِئَكَ هُوَ ٱلْأَبْتَرُ﴾ واتە: بێگومان هەر ناحەزی تۆ دوا براوە. یانی: ئەوەی کینەی لە تۆیە و بە ناتۆرەیە لە وەی کە بۆت هاتوە لەو ڕاستی و ڕێگانیشاندان و نیشانە ڕونانە، ئەوە ئەو کەسە وەجاخ کوێرو دوا براوو سەر شۆڕەو باسی براوەتەوە. ئیبنو عەباس و موجاهید و سەعیدی کوڕی جوبەیر و قەتادە ئەڵێن: ئەم ئایەتانە لەسەر عاصی کوڕی وائیل هاتونەتە خوارەوە. موحەممەدی کوڕی ئیسحاق لەیەزیدی کوڕی ڕوممانەوە ئەڵێت: کاتێ باسی پێغەمبەر(ﷺ) بکرایە عاسی کوڕی وائیل ئەی ووت: باسی مەکەن وەجاخکوێرە و کەسی نیە، هەر کە تیا چوو باسی نامێنێو ئەکوژێتەوە، خودای مەزنیش ئەم سورەتەی نارده خوارەوە. شمر کوڕی عەتیە ئەڵێت: ئەم ئایەتە لەسەر عوقبەی کوڕی ئەبو موعیت هاتە خوارەوە. ئیبنو عەباس و عیکرەمە ئەڵێن: لەسەر کەعبی کوڕی ئەشرەف و کۆمەڵێ لە خودا نەناسەکانی قوڕەیش هاتۆتە خوارەوە. بەزار ڕیوایەتی

کردوه لە ئیبنو عەباسەوە ئەڵێت: کەعبی کوڕی ئەشرەف هات بۆ مەککە، قورەیشییەکان پێیان ووت: تۆ گەورەی ئەو خەڵکەی سەیری ئەم وەجاخکوێرە بێدەسەڵاتە لاوازە ناکەی لەناو هۆزەکەیا؟ وا دەزانێ لە ئێمە باشترو چاکترە، لە کاتێکدا ئێمە دۆستی حاجییان و خزمەتکارو ئاوگێڕانی مەککەین. کەعب ووتی: ئێوە لەو چاکترن. ئیبنو عەباس ئەڵێت: ﴿إِنَّ شَانِئَكَ هُوَ ٱلۡأَبۡتَرُ﴾ دەربارەی هاتە خوارەوە هەر بەو شێوەیە بەزار ڕیوایەتی کردوە، سەنەدەکانی صەحیحن. عەتا ئەڵێت: لەسەر ئەبو لەهەب هاتوەتە خوارەوە، کاتێك کوڕێکی پێغەمبەر(ﷺ) کۆچی دوایی کرد ئەبو لەهەب ڕۆیشت بۆ ناو بتپەرستەکانی قورەیش و ووتی: ئەمشەو موحەممەد (ﷺ) وەجاخی کوێر بوویەوە، خودا ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: ﴿إِنَّ شَانِئَكَ هُوَ ٱلۡأَبۡتَرُ﴾ سوودی ئەڵێت: کاتێ منداڵی نێرینەی کەسێك بمردایە ئەیان ووت: کابرا وەجاخکوێر بوو. کاتێ مناڵەکانی پێغەمبەر(ﷺ) کۆچی دواییان کرد ووتیان: موحەممەد وەجاخکوێر بوو. خودا ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: ﴿إِنَّ شَانِئَكَ هُوَ ٱلۡأَبۡتَرُ﴾ بەهۆی ئەو نەفامیەیانەوە وایان گومان ئەبرد ئەگەر پێغەمبەر(ﷺ) کوڕەکانی کۆچی دوایی بکەن ئیتر باسی نامێنێ و ئەبڕێتەوە، نەخێر ئەمە نەك هەر وانیە بەڵکو خودا ناوی پێغەمبەری (ﷺ) هێشتەوە هەتا هەتاشە هەر ئەمێنێتەوە، پەیام و شەرعەکەشی خستۆتە سەر شانی بەندەکانی تا بەڕێوەی بەرن تا دونیا کۆتایی دێت و ڕۆژی قیامەت و زندو بونەوە دێت، سەلات و سەلامی خوای مەزن لەسەر پێغەمبەر(ﷺ) بێت بە بەردەوام هەتا ڕۆژی قیامەت.

## سورەتی (الكافرون)

### لە مەککەداهاتووەتەخوارەوە

### خوێندنی ئەم سورەتە لە نوێژە سوننەتەکانا

لەسەحیحی موسلیمدا هاتوە لە جابیرەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) لەدوو ڕکاتی نوێژی سوننەتی تەوافدا ئەم سورەتەو سورەتی﴿قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ﴾ی ئەخوێند. لەسەحیحی موسلیمدا لەو فەرموودەی ئەبو هورەیرەدا هاتوە کە پێغەمبەر(ﷺ) ئەم دوو سورەتەی لە ڕکاتی بەیانیاندا ئەخوێند. ئیمامی ئەحمەدیش ڕیوایەتی کردوە لە ئیبنو عومەرەوە کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەدوو ڕکاتی پێش نوێژی بەیانی و دوو ڕکاتی دوای مەغریبا بیست و چوار تا بیست و پێنج جار یا دە تا پانزە جار سورەتی ﴿قُلۡ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾ و﴿قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ﴾ی خوێندوە. وە دوبارە ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە ئیبنو عومەرەوە ئەڵێت: چاودێری پێغەمبەرم (ﷺ) ئەکرد بیست و چوار تا بیست و پێنج جار لەدوو ڕکاتی پێش نوێژی بەیانی و دوو ڕکاتی دوای نوێژی مەغریب ﴿قُلۡ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾

و﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ﴾ی ئەخوێند. وە ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەی کردوە لە ئیبنو عومەرەوە کە ئەڵێت: بۆ ماوەی یەك مانگ چاودێری پێغەمبەرم (ﷺ) کرد لەدوو ڕکاتی پێشش نوێژی بەیانیدا ﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ﴾ و﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ﴾ی ئەخوێند. وە هەر بەم شێوەیە تیرمیزی و ئیبنو ماجەش ڕیوایەتیان کردوە و نەسائیش هێناویەتی، تیرمیزی ئەڵێت: ئەمە فەرموودەیەکی حەسەنە. وە لەفەرموودەیەکا لە پێشەوە باسمان کرد کە ئەم سورەتە بەرامبەری چواریەکی قورئانەو ﴿إِذَا زُلْزِلَتِ ٱلْأَرْضُ زِلْزَالَهَا﴾ یش بە ئەندازەی چوار یەکی قورئانە.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ ﴿١﴾ لَآ أَعْبُدُ مَا تَعْبُدُونَ ﴿٢﴾ وَلَآ أَنتُمْ عَٰبِدُونَ مَآ أَعْبُدُ ﴿٣﴾ وَلَآ أَنَا۠ عَابِدٌ مَّا عَبَدتُّمْ ﴿٤﴾ وَلَآ أَنتُمْ عَٰبِدُونَ مَآ أَعْبُدُ ﴿٥﴾ لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِىَ دِينِ ﴿٦﴾﴾

## حاشا کردن لە بتپەرستی

ئەم سورەتە سورەتی: ڕاگەیاندنی بەرائەتە لەو کردارانەی کە بتپەرستەکان پێی هەڵدەسن، وە فەرمان دەدات بە دڵسۆزی تەواو لە خواناسیداو ئەفەرموێت: ﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ﴾ واتە بڵێ: ئەی بێبڕوایینە! ئەمەش هەموو خوانەناسێ دەگرێتەوە لەسەر زەمیندا، بەڵام ئەوەی ئەم ووتارە ڕووی تێدەکات خوانەناسەکانی قوڕەیشە. ئەڵێن: ئەوانە لەبەر نەفامی خۆیان پێغەمبەریان (ﷺ) بانگ ئەکرد بۆ ئەوەی ئەو ساڵێك بەندایەتی بتەکانیان بکات و ئەوانیش ساڵێك خوای ئەو بپەرستن خوای گەورەش ئەم سورەتەی ناردە خوارەوە و فەرمانی دا بە پێغەمبەرەکەی(ﷺ) کە حاشا بکات لە ئایینەکەی ئەوان بە تەواوی، فەرمووی: ﴿لَآ أَعْبُدُ مَا تَعْبُدُونَ﴾ واتە: من ئەو بتانە ناپەرستم کە ئێوە ئەی پەرستن﴿وَلَآ أَنتُمْ عَٰبِدُونَ مَآ أَعْبُدُ﴾ واتە: وە ئێوەش ئەو خوایە ناپەرستن کە من ئەیپەرستم. کە ئەویش خودای تاك و تەنهایە و هاوەڵی نیە. ئەو (مَا) یە لێرەدا بەمانای (من) دێت، پاشان ئەفەرموێ: ﴿وَلَآ أَنَا۠ عَابِدٌ مَّا عَبَدتُّمْ﴾ واتە: وە من ئەو خواپەرستی یە ناکەم کە ئێوە ئەیکەن ﴿وَلَآ أَنتُمْ عَٰبِدُونَ مَآ أَعْبُدُ﴾ واتە: ئێوەش ئەو خوا پەرستی یە ناکەن کە من دەیکەم. یانی: من بەو شێوەیەی ئێوە خواپەرستی ناکەم، یانی: شوێن ئەو بتپەرستیەی ئێوە ناکەوم و دانیشی پێدا نانێم، بەڵکو من بەو شێوەیەی خودا پێی خۆشەو لێی ڕازی یە خوا پەرستی دەکەم بۆیە فەرموویەتی: ﴿وَلَآ أَنتُمْ عَٰبِدُونَ مَآ أَعْبُدُ﴾ یانی: ئێوە گوێڕایەڵی فەرمانەکانی خوداو شەرعی خودا ناکەن لە پەرستنیدا، بەڵکو شتێکتان

به ئارەزوی خۆتان دروست کردوەو ئەپەرستن، وەك فەرموویەتی: ﴿إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّ وَمَا تَهْوَى ٱلْأَنفُسُ ۖ وَلَقَدْ جَآءَهُم مِّن رَّبِّهِمُ ٱلْهُدَىٰٓ﴾ واتە: تەنها شوێنی گومان و ئەو شتە دەکەون کە نەفسی خۆیان حەزی لێیەتی لەکاتێکدا کە بەڕاستی لەلایەن پەروەردگاریانەوە هیدایەتیان بۆ هاتوە. حاشای لێکردن لەهەموو ئەو شتانەی ئەیان کرد، چونکە هەموو کەسێ خودایەکی ببێ بیپەرستێ و ڕێبازێکی ببێ لە عیبادەتکردن ئەوە خودایە پێغەمبەر(ﷺ) و شوێن کەوتوەکانیشی بەپێی فەرمان و شەرعی خوا خودا دەپەرستن بۆیە (لا إله إلا الله، محمد رسول الله) کورتەی پەیامی ئیسلام بووە بە هەمیشەی، یانی: پەرستراو ی ڕاستەقینە نیە جگە لە خوا، وە هیچ ڕێگایەك نیە بڕوات بۆلای ئەو خودایە جگە لەو ڕێگایە نەبێ کە پێغەمبەر(ﷺ) هێناویەتی، بتپەرستان شتی تر ئەپەرستن بێجگە لە خودابە شێوەیەك کە خودا ڕێگەی پێنەداوە. بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرمون: وەك خودای گەورە ئەفەرموێ: ﴿لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِيَ دِينِ﴾ واتە: ئایینی خۆتان بۆ خۆتان و ئاینی خۆم بۆ خۆم. وەك خودا فەرموویەتی: ﴿وَإِن كَذَّبُوكَ فَقُل لِّي عَمَلِي وَلَكُمْ عَمَلُكُمْ ۖ أَنتُم بَرِيٓـُٔونَ مِمَّآ أَعْمَلُ وَأَنَا۠ بَرِىٓءٌ مِّمَّا تَعْمَلُونَ﴾ واتە: ئەگەر بڕوایان پێ نەهێنای ئەوا پێیان بڵێ: پاداشتی کردەوەی خۆم بۆ خۆم و پاداشتی کردەوەی خۆتان بۆ خۆتان ئێوە بەرین و بەرپرسیار نین لەوەی من دەیکەم منیش بەریم وبەرپرسیار نیم لەوەی ئێوە دەیکەن. وەفەرموویەتی: ﴿وَلَنَآ أَعْمَـٰلُنَا وَلَكُمْ أَعْمَـٰلُكُمْ﴾ واتە: ئەنجامی کردەوەکانمان بۆ خۆمانەو ئەنجامی کردەوەکانی ئێوەش بۆ خۆتانە. بوخاری ئەڵێت: ﴿لَكُمْ دِينُكُمْ﴾ یانی: بێدینی و خوانەناسی﴿وَلِيَ دِينِ﴾ یانی: ئیسلام، نەی فەرمووە (دینی) چونکە ئایەتەکان هەموو بەنون کۆتاییان هاتوە ئەویش یاکەی حەزف کراوە، وەك: ﴿فَهُوَ يَهْدِينِ﴾ و ﴿فَهُوَ يَشْفِينِ﴾.

## سورەتی (النصر)

### لە مەدینە داهاتووەتەخوارەوە

#### فەزڵ و ڕێزی سورەتی (نەصر)

لەپێشەوە باس کرا کە سورەتی نەسر بەرامبەری چواریەکی قورئانە وە﴿إِذَا زُلْزِلَتِ﴾یش بەرامبەری چوار یەکی قورئانە، نەسائی ڕیوایەتی کردوە لە عوبەیدوڵای کوڕی عەبدوڵای کوڕی عوتبەوە کە ئەڵێت: ئیبنو عەباس پێی ووتم: ئەی کوڕی عوتبە ئایا ئەزانی دواترین سورەت لە قورئانا کامەیە هاتوەتە خوارەوە؟ ووتم: بەڵێ: ﴿إِذَا جَآءَ نَصْرُ ٱللَّهِ وَٱلْفَتْحُ﴾ە ووتی: ڕاست دەکەی.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

﴿إِذَا جَاءَ نَصْرُ اللَّهِ وَالْفَتْحُ ۝١ وَرَأَيْتَ النَّاسَ يَدْخُلُونَ فِي دِينِ اللَّهِ أَفْوَاجًا ۝٢ فَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ وَاسْتَغْفِرْهُ إِنَّهُ كَانَ تَوَّابًا ۝٣﴾

ئەم سورەتە هەواڵی کۆچی دوایی پێغەمبەر(ﷺ) دەگەیەنێت، بوخاری ڕیوایەتی کردوە لە ئیبنو عەباسەوە ئەڵێت: عومەر لەگەڵ هەندێ لە پیاوەگەورەکانی بەدر بردمیە مەجلیسەکانی خۆی، هەندێکیان وەك شتێ لەدڵیاندا بێ وتیان: عومەر بۆچی ئەمەی لەگەڵمان هێناوە ژوورەوە ئێمەش کوڕی وەك ئەممان هەیە؟ عومەر فەرموی: ئەوە یەکێکە لەو کەسانەی کە باش ئەیناسن، ڕۆژێك بانگی کردن و ئەو منیشی لەگەڵیان بانگ کرد، ئیبنو عەباس ئەڵێ: هەستم کرد تەنها منی بۆ ئەوە بانگ کردوە بەهرەو توانای پێیان پیشان بدات و تێیانبگەیەنێ، عومەر فەرمووی: چی ئەڵێن لەبارەی ئەم فەرموودەی خوداوە کە ئەفەرموێ: ﴿إِذَا جَاءَ نَصْرُ اللَّهِ وَالْفَتْحُ﴾ هەندێکیان وتیان: فەرمانمان پێکراوە سوپاسی خودا بکەین و داوای لێبوردنی لێ بکەین کاتێ یارمەتی داین و سەری خستین. هەندێکی تریان بێدەنگ بون و هیچیان نەوت، بە منیشی فەرموو: ئایا تۆش وا ئەڵێی ئەی ئیبنو عەباس؟ وتم: نەخێر. وتی: ئەی چی ئەڵێی؟ وتم: ئەوە دیاری کردنی کاتی کۆچی دوای پێغەمبەرە(ﷺ)، بەو فەرموودەیە تێیئەگەیەنێت ئەجەلی نزیك بووەتەوە کە فەرموویەتی: ﴿إِذَا جَاءَ نَصْرُ اللَّهِ وَالْفَتْحُ﴾ واتە: کاتێ کە یارمەتی و کۆمەکی خواهات لەگەڵ سەرکەوتن شاری مەککە ئازاد کرا ئەوە نیشانەی کۆچی دواییە! ﴿وَرَأَيْتَ النَّاسَ يَدْخُلُونَ فِي دِينِ اللَّهِ أَفْوَاجًا﴾ واتە: وە خەڵکت دی کە پۆل پۆل دێنە ناو ئایینی خواوە ﴿فَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ وَاسْتَغْفِرْهُ إِنَّهُ كَانَ تَوَّابًا﴾ واتە: ئەوسا ئیتر پەروەردگارت بەپاك ڕابگرە بەهۆی ستایشی ئەوەوە داوای لێبوردنی لێ بکە چونکە بێگومان ئەو زۆر گێراکەری پەشێمانی یە. عومەری کوڕی خەتاب فەرمووی: منیش بێجگە لەمەی تۆ ئەیڵێی هیچی تری لێ نازانم: تەنیا بوخاری ئەم حەدیسەی هێناوە. ئیمامی ئەحمەدیش ڕیوایەتی کردوە لە ئیبنو عەباسەوە ئەڵێت: کاتێ ﴿إِذَا جَاءَ نَصْرُ اللَّهِ وَالْفَتْحُ ۝١ وَرَأَيْتَ النَّاسَ يَدْخُلُونَ فِي دِينِ اللَّهِ أَفْوَاجًا ۝٢ فَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ وَاسْتَغْفِرْهُ إِنَّهُ كَانَ تَوَّابًا﴾ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: سەرەخۆشی خۆمم لێدەکرێ، بەدڵنیاییەوە هەر ئەمساڵم بە دنیاوە ماوە، تەنها ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە. بوخاریشی ڕیوایەتی کردوە لە حەزرەتی عائیشەوە (ﷺ) کە ئەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) زۆر جار لە سوجدەو ڕکوعەکانیدا ئەیفەرموو: سبحانك اللهم، ربنا وبحمدك، اللهم اغفرلي، جگە لەتیرمیزی هەموو

خاوەن کتێبەکانی حەدیس ڕیوایەتیان کردووە. ئیمامی ئەحمەدیش لە مەسروقەوە ڕیوایەتی کردووە کە ئەڵێت: عائیشە ئەفەرموێت: پێغەمبەر(ﷺ)لە کۆتاییەکانی ژیانیدا زۆر (سبحان الله وبحمده، أستغفرالله واتوب إليه) ئەکرد، ئەیفەرموو: پەروەردگارم تێیگەیاندووم کە نیشانەیەك هەیە لە ئومەتەکەمدا ئەیبینم، فەرمانیشی پێکردووم هەر کات ئەو نیشانەیەم بینی (سبحان الله وبحمده، أستغفرالله)ی زۆر بکەم و بگەڕێمەوە بۆ لای خوا، ئەوەتا نیشانەکەم بینی کە بریتی یە لە ﴿إِذَا جَآءَ نَصۡرُ ٱللَّهِ وَٱلۡفَتۡحُ ۝١ وَرَأَيۡتَ ٱلنَّاسَ يَدۡخُلُونَ فِي دِينِ ٱللَّهِ أَفۡوَاجٗا ۝٢ فَسَبِّحۡ بِحَمۡدِ رَبِّكَ وَٱسۡتَغۡفِرۡهُۚ إِنَّهُۥ كَانَ تَوَّابَۢا﴾ موسلیم ئەم حەدیسەی ڕیوایەت کردووە. مەبەست لێرەدا لەم فەتح و سەرکەوتنە سەرکەوتنی مەککەیەو هەموو زانایانیش یەك ڕان لەسەر ئەمە. ناوچەکانی تری عەرەب هەموو چاوەڕوانی فەتحی مەککەیان ئەکرد و موسڵمان نەئەبون، ئەیان ووت: ئەگەرمحمد سەرکەوت بەسەر هۆزەکەی خۆیدا ئەوە پێغەمبەرە. ئەوە بوو کاتێ خودا مەککەی بۆ فەتح کرد، خەڵکی پۆل پۆل ئەهاتنە ناو ئاینی خوداوە، دوو ساڵی پێ نەچوو دورگەی عەرەب هەموو بونە خاوەنباوەڕ، وە لەناو هۆزەکانی تری عرەبیشدا بێجگە لە ئیسلامەتی هیچ شتێکی تر نەما، سوپاس و ستایش بۆ خودای گەورە، بوخاری ڕیوایەتی کردوە لە عەمری کوڕی سەلەمەوە لە سەحیحەکەیدا ئەڵێت: کاتێ فەتحی مەککە کرا هەموو هۆزێك پێش دەستی ئەکرد بۆ حزمەت پێغەمبەر(ﷺ) کە پێشتر چاوەڕوانیان ئەکرد و خۆیان دوا ئەخست و موسڵمان نەئەبون و بەتەمای فەتحی مەککە بون، ئەیان ووت: واز لەخۆی و هۆزەکەی بێنن ئەگەر سەرکەوت بەسەریانا ئەوە پێغەمبەرە. ئیبنو کەسیر ئەڵێت: باسی غەزای فەتحمان کردوە لە کتێبەکەماندا (السيرة)، هەر کەسێ ئەیەوێت باسەیری بکات لەوێ، سوپاس و ستایش بۆ خودای گەورە، ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە ئەبو عەمارەوە و ئەڵێت: دراوسێیەکی جابری کوڕی عەبدولا بۆی گێڕامەوەو ووتی: لەسەفەر گەڕامەوە جابری کوڕی عەبدولا هات بۆ لام سڵاوی لێ کردم، منیش باسی ناکۆکی خەڵك و ئەو شتانەم کە بۆ کرد کە دایانهێناوە، جابر دەستی کرد بە گریان و پاشان ووتی: بیستم لە پێغەمبەرم (ﷺ) بیستووە کە ئەیفەرموو: خەڵك کۆمەڵ کۆمەڵ هاتنە ناو ئاینی خوداوە، وە بەو زوانە کۆمەڵ کۆمەڵ لێی دەچنە دەرەوە.

## سورەتی ( المسد )

### لە مەککەدا هاتووەتە خوارەوە

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

﴿تَبَّتْ يَدَآ أَبِى لَهَبٍ وَتَبَّ ﴿١﴾ مَآ أَغْنَىٰ عَنْهُ مَالُهُۥ وَمَا كَسَبَ ﴿٢﴾ سَيَصْلَىٰ نَارًا ذَاتَ لَهَبٍ ﴿٣﴾ وَٱمْرَأَتُهُۥ حَمَّالَةَ ٱلْحَطَبِ ﴿٤﴾ فِى جِيدِهَا حَبْلٌ مِّن مَّسَدٍۭ ﴿٥﴾﴾

هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم سورەتە و لاساری ئەبو لەهەب لەگەڵ پێغەمبەردا(ﷺ)بوخاری ڕیوایەتی کردوە لە ئیبنو عەباسەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) ڕۆیشت بۆ بەتحاء و چووە سەر کێوەکە و بانگی کردوو فەرمووی: (یاصباحاه)! قوڕەیشیەکان لێی کۆبونەوە، فەرمووی: ئەگەر بینیتان و پێم ووتن دوژمن بەیانی یا ئێوارە پەلامارتان ئەدات ئایا باوەڕم پێ ئەکەن؟ ووتیان: بەڵێ: فەرمووی: بەڕاستی من ترسێنەرم بۆ ئێوە لە بەردەم سزایەکی زۆر بەهێزدا، ئەبو لەهەب ووتی: بۆ ئەمە کۆت کردوینەتەوە؟ عەمرت نەمێنێ! خودا ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: ﴿تَبَّتْ يَدَآ أَبِى لَهَبٍ وَتَبَّ﴾ لە ﴿تَبَّتْ﴾ی یەکەمدا نزاو هەڕەشە هەیە، لە دووهەمدا هەواڵ هەیە لەبارەی ئەبو لەهەبەوە. ئەم ئەبو لەهەبە یەکێك بوو لە مامەکانی پێغەمبەر(ﷺ) ناوی عەبدولعوزای کوڕی عەبدولمتەلیب بوو، کونیەکەی ئەبو عوتیبە بوو، بۆیە ناو نرابو ئەبولەهەب لەبەر پرشەی دەم و چاوی، زۆر ئازاری پێغەمبەری(ﷺ) ئەداو ڕقی لێی بوو، تانەو تەشەری لێدەداو بەسوکی ناوی ئایینەکەی ئەبرد. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە ئەبو زینادەوە ئەڵێت: پیاوێك هەواڵی دامێ پێیان ئەووت ڕەبیعەی کوڕی عەباد، لە عەشرەتی بەنی دیل بوو لەسەردەمی جاهلیەتدا پاشان موسڵمان بوو ووتی: پێغەمبەرم(ﷺ) بینی لەکاتی نەفامیدا لەبازاڕی زیلمەجاز دا ئەیفەرموو: یا ایها الناس! قولوا: لا اله إلا الله، تفلحوا، واتە: ئەی خەڵکینە بڵێن: لا اله إلا الله، ڕزگار دەبن، خەڵکەکە کۆبونەوە لێی، پیاوێکی سوری خێل کە دوو پەلکەی هەبوو دوای کەوتبو ئەی ووت: ئەوە هەڵ گەڕاوەیە لە ئایینەکەی و درۆزنە، بۆ هەر شوێنێك بڕۆشتایە دوای ئەکەوت، پرسیم ئەوە کێیە؟ ووتیان: ئەبو لەهەبی مامیەتی. هەر ئەم حەدیسەی ڕیوایەت کردوە لە سورەیجەوە ئەویش لە کوڕی ئەبو زینادەوە ئەویش لە باوکیەوە، پاشان ئەبو زیناد ئەڵێت: ووتم بە ڕەبیعە: تۆ ئەو کاتە منداڵ بویت؟ ووتی: سوێند بەخوا ئەو ڕۆژە ئاقڵ بوم و کونە ئاوم بە پشت هەڵدەگرت. تەنها ئەحمەد ئەم حەدیسەی هێناوە، خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿مَآ أَغْنَىٰ عَنْهُ مَالُهُۥ وَمَا كَسَبَ﴾ واتە: سودی پێنەگەیاند داراییەکەی و ئەوەی کە کردی لە دوژمنایەتی پێغەمبەردا(ﷺ) ئیبنو عەباس و کەسانی تریش ئەڵێن: ﴿وَمَا كَسَبَ﴾یانی: منداڵەکەی. هەمان

مانا ڕیوایەت کراوە لە عائیشەو موجاهید و عەتاو حەسەن و ئیبنو سیرینەوە لە ئیبنو مەسعودەوە گوازراوەتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) کاتێ بانگی قەومەکەی کرد بۆ باوەڕ هێنان بە خودا، ئەبو لەهەب ووتی: ئەگەر ئەوەی ئەم برازامە ئەیڵێ ڕاست بوو من لە ڕۆژی قیامەتدا خۆم و ماڵ و منداڵ ئەبەخشم لە پێناوی ئەو سزا گران و سەختەدا. خودای مەزنیش ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە: ﴿مَآ أَغۡنَىٰ عَنۡهُ مَالُهُۥ وَمَا كَسَبَ﴾ وە پاشان ئەفەرموێت: ﴿سَيَصۡلَىٰ نَارٗا ذَاتَ لَهَبٖ﴾ واتە: بێگومان لەمەو لا دەچێتە ناو ئاگری بڵێسەدار، یانی: ئاگری بەگڕو زۆر تیژ.

**باسی پاشەڕۆژی ئوموجەمیل (خێزانی ئەبو لەهەب)**

خودای گەورەئەفەرموێت: ﴿وَٱمۡرَأَتُهُۥ حَمَّالَةَ ٱلۡحَطَبِ﴾ واتە: لەگەڵ ژنەکەیدان کە هەڵگری دارو چیلکەیە، خێزانی ئەبو لەهەب لە ژنە ئەشرافەکانی قورەیش بوو، کە ئومو جەمیلیان پێئەوت، ناوی ئەروای کچی حەربی کوڕی ئومەییەیە و خوشکی ئەبو سوفیانە، پشتیوانی مێردەکەی زۆر ئەکرد لەسەر خوانەناسی و بێباوەڕی و دژایەتیکردن بۆیە لە ڕۆژی قیامەتیشدا یارمەتیدەریەتی لە سزادانی لەناو ئاگری جەهەنمدا لەبەر ئەمەشە خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿فِي جِيدِهَا حَبۡلٞ مِّن مَّسَدِۢ﴾ واتە: هەمیشە گوریسێکی بادراو لەپەلی خورمای ئاگرین وا لە گەردنیدا. یانی: دەستە چیلکە بەکۆمەڵ هەڵدەگرێ و ئەیدات بەسەرمێردەکەیدا بۆ ئەوەی زیاتر سزا بدرێ، چونکە ئەو ژنە ئامادەیە بۆ ئەو کارەو یەك و دووی لێ ناکات ﴿فِي جِيدِهَا حَبۡلٞ مِّن مَّسَدِۢ﴾ موجاهیدو عوروە ئەڵێن: گوریسی سیرمەی دوجار بادراو لە ئاگر. عەوفی ئەڵێت: لەئیبنو عەباس و عەتیەی جەدەلی و زەحاك وئیبنو زەیدەوە ئەڵێن: دڕکی دادەنا لەڕێگای پێغەمبەردا(ﷺ)، جەوهەری ئەڵێت: (المسد) یانی: ڕیشاڵ، هەروەها (المسد) یانی: گوریسی بادراو لە موی ووشتر یا چەرمی ووشتر کاتێ زۆر چاك بادرابێ. موجاهید ئەڵێت: ﴿فِي جِيدِهَا حَبۡلٞ مِّن مَّسَدِۢ﴾ یانی: ملوانکەیەك لە ئاسن، نابینی عەرەبەکان ناوی بەکرە دەبەن بە (مسد).

**باسی هەندی لەو ئازارانەی کە خێزانی ئەبو لەهەب ئەیهێنایە ڕێگەی پێغەمبەر(ﷺ)**

ئیبنو ئەبی حاتەم ئەڵێت: باوکم و ئەبو زورعە بۆیان گێڕاینەوە و ووتیان: عەبدوڵای کوڕی زوبەیری حومەیدی بۆی گێڕاینەوە و ئەیوت: سۆفیان بۆی گێڕاینەوە کە وەلیدی کوڕی کەسیر بۆی گێڕاینەوە ئەڵێت: لەئەبو تەدریسەوە ئەویش لە ئەسمای کچی ئەبو بەکرەوە ئەڵێت: کاتێ: ﴿تَبَّتۡ يَدَآ أَبِي لَهَبٖ﴾ هاتە خوارەوە، ئوم جەمیلی بەدخوی کچی حەرب هات و بەردێکی پڕە مشتی بەدەستەوە بوو

هاواری ئەکرد ئەی ووت: مذمما أبينا، ودينه قلينا، وأمره عصينا، واتە: ئەم زەمکراوەمان[1] ناویّ و بێزاریشین لە ئایینەکەی و دژی فەرمانەکانیشی وەستاوین، لەو کاتەدا پێغەمبەر(ﷺ) لە مزگەوت دانیشتبوو ئەبوبەکری لەگەڵ بوو کاتیّ ئەبوبەکر چاوی پێکەوت ووتی: ئەی پێغەمبەری خودا وا ئەم ژنە هات من زۆر ئەترسم کە تۆ ببینیّ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: نا ئەو من نابینیّ، و دەستی کردە قورئان خوێندن و پشتی قایم بوو پێی، وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَإِذَا قَرَأْتَ ٱلْقُرْءَانَ جَعَلْنَا بَيْنَكَ وَبَيْنَ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْءَاخِرَةِ حِجَابًا مَّسْتُورًا﴾ واتە: ئەی موحەممەد(ﷺ) کاتیّ قورئان دەخوێنیت بەسەریاندا پەردەیەکی داپۆشەر دادەنێین لە نێوان تۆو ئەوانەدا کە باوەڕیان بەرۆژی دوایی نیە، ئوم جەمیل هات و لەبەردەم ئەبوبەکردا وەستاو پێغەمبەر(ﷺ)ی نەبینی ووتی: ئەی ئەبوبەکر هەواڵیان داومەتیّ کە هاوەڵەکەت باسی خراپی منی کردوە؟ ئەبو بەکر ووتی: نەخێر بە پەروەردگاری ئەم کەعبە بەخراپی باسی نەکردووی، ئوم جەمیل ڕۆیشت و ئەمەی وت: ئەریّ ! هەموو قورەیشیەکان ئەزانن کە من کچی گەورە پیاوی ئەوانم ئەڵێت: وەلید یا یەکیّ تر لە حەدیسەکەدا ووتویەتی: ئومو جەمیل تەوافی کەعبەی ئەکرد لەپڕ قاچی گیرا لەکراسەکەی و هەڵکەوت و ووتی: لەناو چیّ موزەممەم! ئومو حەکیمی کچی عەبدو لموتەلیب ووتی: من دەمم گیراوە قسە ناکەم، ئاگام لێیە و تێناگەم، وە من و تۆ هەردووکمان ئامۆزای یەکترین، قورەیش ئەمە باش ئەزانن.

## سورەتی (الإخلاص)

### لە مەککەداهاتووەتەخوارەوە

### باسی هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم سورەتە و گەورەیی ئەم سورەتە

ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە ئوبەی کوڕی کەعبەوە: کە بتپەرستەکان وتیان بە پێغەمبەر(ﷺ) ئەی موحەممەد باسی پەروەردگاری خۆتمان بۆ بکە. خودای گەورەش ئەم سورەتەی نارده خوارەوە: ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ۝١ ٱللَّهُ ٱلصَّمَدُ ۝٢ لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ ۝٣ وَلَمْ يَكُن لَّهُۥ كُفُوًا أَحَدٌ﴾ هەر بەم شێوەیە تیرمیزی و ئیبنو جەریر ڕیوایەتیان کردوە. ئیبنو جەریرو تیرمیزی ئەمەشیان بۆ حەدیسەکە زیاد کردوە ئەڵێت: ﴿ٱلصَّمَدُ﴾ کەس لەو نەبوە ئەویش لەکەس نەبوە، هیچ شتێك نیە لەدایك ببیّ و نەمریّ وە کەسێکیش نیە کە مرد سامانەکەی دابەش نەکرێت بەسەر کەس و کاریدا، خودای گەورە نامرێو ئیرسیشی لیّ نابریّ ﴿وَلَمْ يَكُن لَّهُۥ كُفُوًا أَحَدٌ﴾ وێنەو هاوتای

[1] زەمکراو مەبەستی پێغەمبەر (ﷺ)، چونکە (محمد) یانی مەدحکراو کەچی ئەو ئەی ووت: (مذمم).

نەبوە و نابێت. ئەمەشیان هەر ئیبنو ئەبی حاتەم و تیرمیزی ڕیوایەتیان کردوە، وتویانە ئەم فەرمودە مورسەلە پاشان تیرمیزی ئەڵێت: ئەمە زۆر ڕاستە.

**فەرموودەیەکی تر دەربارەی گەورەیی ئەم سوورەتە**

بوخاری ڕیوایەتی کردوە لەعەمرەی کچی عەبدورەحمان کە لەسایەی عائیشەی خێزانی پێغەمبەرا بوو(ﷺ) ئەویش لە عائیشەوە(ڕەزای خوای لێبێت)ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) پیاوێکی لەمەفرەزەیەکدا کردە لێپرسراو و ناردی کە لە نوێژا قورئانی دەخوێند بۆ هاوەڵەکانی، کۆتایی خوێندنەکەی بە﴿قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ﴾ ئەهێنا، کاتێك گەڕانەوە هاوەڵەکانی ئەمەیان بۆ پێغەمبەر(ﷺ) گێڕایەوە، فەرمووی: پرسیاری لێ بکەن بۆچی ئەم کارەی کردوە؟ پرسیاریان لێ کرد، وتی: لەبەر ئەوەی ئەم سورەتە سیفەتی ڕەحمانی تێدایە و منیش پێم خۆشە بیخوێنم، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: هەواڵی بدەنێ خوای مەزنیش ئەوی خۆش ئەوێ. بەم شێوەیە لە (كتاب التوحيد) دا ڕیوایەتی کردوە، موسلیم و نەسائیش ڕیوایەتیان کردوە. ئیمامی بوخاری لە (كتاب الصلاة)دا لەئەنەسەوە ڕەزای خوای لێ بێت ئەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: کابرایەکی ئەنصاری پێشنوێژی بۆ ئەکردین لەمزگەوتی قوبادا هەر کاتێك دەستی بکردایە بەخوێندنی سورەتێ سەرەتا دەستی ئەکرد بەخوێندنی سورەتی﴿قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ﴾ لەو نوێژەدا تا تەواوی کرد، پاشان سورەتێکی تری لەگەڵ ئەخوێند، بەم شێوەیەی ئەکرد لە هەموو ڕکاتێکدا. هاوەڵەکانی قسەیان لەگەڵ کرد وتیان: ئەم سورەتە ئەخوێنی وا ئەزانی ئەم سورەتە بەس نی یە تا سورەتێکی تر نەخوێنی، جا یان ئەم سورەتە بخوێنە و بەسە یا وازی لێ بێنە و سورەتێکی تر بخوێنە، وتی: من وازی لێ ناهێنم، پێتان خۆشە بەم شێوەیە پێشنوێژیتان بۆ دەکەم پێشتان ناخۆشە پێشنوێژیتان بۆ ناکەم.

هاوەڵەکانی بەلایانەوە وا بوو کە ئەو پیاوە لە هەموویان چاکترە، بۆ پێشنوێژیکرن پێیان ناخۆش بو کەسێکی تر جگە لەو پێش نوێژیان بۆ بکات. کاتێ پێغەمبەر(ﷺ) هات بۆ لایان ئەم هەواڵەیان بۆ گێڕایەوە فەرمووی: ئەی فلانە کەس! ڕێگر چییە ئەوەی کە هاوەڵەکانت پێت دەڵێن نایکەی؟ وە بۆچی هەر گرتوتە بەم سورەتەوە لە هەموو ڕکاتێکدا؟ وتی: ئەم سورەتەم خۆش ئەوێ. پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: خۆشەویستیت بۆ ئەم سورەتە ئەتخاتە بەهەشتەوە. هەر بەم شێوەیە بوخاری ڕیوایەتی کردوە بە تعلیقی دانیپێدا ناوە. فەرموودەیەك کە ﴿قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ﴾ بەهاوتای سێ یەکی قورئان دا ئەنێت بوخاری ڕیوایەتی کردوە لە ئەبو سەعیدەوە کە پیاوێك گوێی لە پیاوێکی تر بوو ﴿قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ﴾ی ئەخوێند و دووبارەی ئەکردەوە، کاتێ ڕۆژی لێبوەوە هات بۆ حزمەت پێغەمبەر(ﷺ)ئەوەی بۆ گێڕایەوە وا دیار بوو کە ئەم پیاوە ئەم سورەتەی بە کەم ئەزانی پێغەمبەر

(ﷺ) سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە ئەم سورەتە هاوتای سێیەکی قورئانە، ئەبو داودو نەسائیش ڕیوایەتیان کردوە.

فەرموودەیەکی تر: بوخاری ڕیوایەتی کردوە لە ئەبو سەعیدەوە ئەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی بە هاوەڵەکانی: ئاخۆ کەسێکتان ناتوانێت سێیەکی قورئان بخوێنێت لە شەوێکا؟ زۆر ئەوەیان بەلاوە گران بوو وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) کێمان ئەوەی لێدێو ئەتوانێت؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (الله الواحد الصمد ثلث القرآن) یانی: ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَـدٌ﴾ سێیەکی قورئانە تەنها بوخاری ئەم حەدیسەی هێناوە.

فەرموودەیەکی تر: کە دەربدەخات خوێندنی﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَـدٌ﴾مایەی دەست خستنی بەهەشتە، ئیمامی مالیکی کوڕی ئەنەس ڕیوایەتی کردوە لە عوبەیدی کوڕی حونەینەوە وتی: بیستم لە ئەبو هورەیرەوە ئەی ووت: لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ)هاتم گوێی لە پیاوێك بوو ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَـدٌ﴾ئەخوێند، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: حەلاڵی کردبۆ خۆی[1]، ووتم: چی حەلاڵ کرد بۆ خۆی؟ فەرمووی: بەهەشت، تیرمیزی و نەسائی ڕیوایەتیان کردوە لە فەرموودەکەی مالیکدا، تیرمیزی ئەڵێ: فەرمودەیەکی حەسەنی صەحیحی غەریبە و لەم فەرمودەی مالیکدا نەبێ ئەمەیان نەدیوە. بەلام لە پێشەوە فەرمودەی (حبك إياها أدخلك الجنة)مان باسکرد.

**فەرموودەیەك دەربارەی چەند بارە کردنەوەی خوێندنی ئەم سورەتە**

عەبدولای کوڕی ئیمام ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە موعازی کوڕی عەبدولای کوڕی خوبەیبەوە،ئەویش لەباوکیەوەووتی:زۆرتینومان بووتاریکیش بوو،چاوەڕوانی پێغەمبەرمان(ﷺ) ئەکرد نوێژمان بۆ بکات، تا هاتە دەرەوەو دەستی گرتم و فەرمووی: ﴿قُلْ﴾ بێدەنگ بووم، پاشان فەرمووی: ﴿قُلْ﴾ ووتم چی بڵێم؟ فەرمووی: ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَـدٌ﴾ و مەعوزەتەین یانی: ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلْفَلَقِ﴾ و ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ﴾ کاتی بەیانیان و کاتی ئێواران سێ جار بیخوێنە، هەموو ڕۆژێ دوجار بیخوێنە بەسە بۆت. تیرمیزی و ئەبو داود و نەسائیش ڕیوایەتیان کردوە، تیرمیزی ئەڵێت: حەسەن صەحیح و غەریبە. نەسائیش ڕیوایەتی کردوە لە ڕێگای ترەوە بەم شێوەیە: جێگەی هەموو شتێکت بۆ ئەگرێ.

فەرمودەیەکی تر: بەکاردێ بۆ دوعاکردن پێی لەبەر ئەوەی ناوەکانی خوای تێدایە: نەسائی ڕیوایەتی کردوە لە عەبدولای کوڕی بورەیدەوە ئەویش لە باوکیەوە: کە لەگەڵ پێغەمبەردا(ﷺ)

---

[1] ووشەی (حەلالی کرد) مان بۆ (وَجَبَتْ) بەکاربردووە (وەرگێڕ).

ڕۆیشتنە مزگەوتەوە، لەو کاتەدا پیاوێکیان بینی نوێژی ئەکردو ئەپاڕایەوە و ئەی ووت: (اللهم إنی أسألك بأنی أشهد أن لا إله إلا أنت، الاحد الصمد، الذي لم يلد ولم يولد، ولم يكن له كفواً أحد)، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە بەناوەگەورەکانی خودا داوای کرد، هەر کاتێ بەو ناوەوە داوای لێ بکرێت ئەبەخشێت و هەر کاتێ بەو ناوەوە لێی بپاڕێیتەوە قەبوڵی دەکات. خاوەن سونەتەکان ئەم حەدیسەیان هێناوە، تیرمیزی ئەڵێت: فەرموودەیەکی حەسەنی غەریبە.

فەرمودەیەکی تر دەربارەی خوێندنی ﴿قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ﴾ ومەعوزەتەین بۆ شفا: بوخاری ڕیوایەتی کردوە لە عائیشەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) کاتێ ئەڕۆیشتە ناو جێگای خەوتن هەموو شەوێك هەردوو دەستی ئەگرت بەیەکەوە فووی پێدا دەکردنو ﴿قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ﴾ و ﴿قُلۡ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلۡفَلَقِ﴾ و ﴿قُلۡ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ﴾ لەناو دەستیدا ئەخوێند. پاشان دەستی دەهێنا بەپێی توانا بە لاشەیا، لەسەرُ و دەم و چاویەوە دەستی پێدەکردو دەیهێنا بەپێشی لەشیشیدا، سێ جار ئەوەی ئەکرد. وە هەر بەم شێوەیە خاوەن سونەنەکان ڕیوایەتیان کردوە.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ۝١ ٱللَّهُ ٱلصَّمَدُ ۝٢ لَمۡ يَلِدۡ وَلَمۡ يُولَدۡ ۝٣ وَلَمۡ يَكُن لَّهُۥ كُفُوًا أَحَدُۢ ۝٤﴾

لەپێشەوە باسی هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم سورەتەمانْ کرد، عیکریمەئەڵێت: کاتێ جولەکەکان ووتیان: ئێمە عوزەیر دەپەرستین کوڕی خوایە. گاورەکان ووتیان: ئێمە مەسیح دەپەرستین کە کوڕی خوایە. ئاگر پەرستەکان ووتیان: ئێمە خۆرو مانگ دەپەرستین. بتپەرستەکانیش ووتیان: ئێمەیش بتدەپەرستین. خودا ﴿قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ﴾ی نارد بۆ پێغەمبەر(ﷺ) یانی: خودا تاك و تەنهایە و بێوێنەیە، هاوتاو بریکارو هاوشێوەی نیە، وە ئەم ووتەیە بەکار ناهێنرێ بۆ هیچ کەسێ بۆ خودا نەبێ لەئیسباتا، چونکە خودا لەهەموو سیفات و کردارێکدا تەواوە. وەك خۆی ئەفەرموێت: ﴿قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ﴾ واتە: بلێ: ئەوە خوای تاك و تەنیایە ﴿ٱللَّهُ ٱلصَّمَدُ﴾ واتە: ئەو خوایەی بێنیازو جێی نیازو ئومێدە. عیکرمە ئەڵێ لە ئیبنو عەباسەوە: یانی: ئەو کەسەی کە جێی نیاز و پەنایە بۆ هەموو دروستکراوەکانی لەهەموو پێویستی و داوایەکیاندا. عەلی کوڕی ئەبو تەلحە ئەڵێت: لە ئیبنو عەباسەوە: ئەو مەزنەی کە زۆر تەواوە لە گەورەییەکەیدا و ئەو لەسەر خۆیەی کە زۆر تەواوە لە لەسەرخۆییەکەیدا و ئەو زانایەی کە زۆر تەواوە لە زانایەکەیدا و ئەو کارزانەی کە زۆر تەواوە لەکارزانیەکەیدا و وە هەر ئەوە کە زۆر تەواوە لەمەزنی و بەهێزیدا ئەو خودایەی ئەمە سیفاتەکانی

بێت، ئەم سیفاتانە بۆ ئەو نەبێت بۆ کەسێکی تر نابێ، هاوتای نیەو کەسیش وەك ئەو نیە خودا پاك و بێعەیب و تاك و تەنهاو تۆڵەسێنە. ئەعمەش ئەڵێت: لەشەقیقەوە ئەویش لە ئەبو وائیلەوە: ﴿ٱلصَّمَدُ﴾ یانی: ئەو گەورەی کە لەو گەورەتر نیە. خودا پاك و بێگەردە و دورە لەوەی کە منالی هەبێت یان باوکو ژن و هاوتای هەبێت، خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ﴾ واتە: کەسی لێ نەبووەو لەکەس نەبوە ﴿وَلَمْ يَكُن لَّهُۥ كُفُوًا أَحَدٌۢ﴾ کەس نیە هاوتای بێت،یانی: نەکوڕو نەباوك و نەژنی نیە، موجاهید ئەڵێت: ﴿وَلَمْ يَكُن لَّهُۥ كُفُوًا أَحَدٌۢ﴾ یانی: خێزانی نەبوە، وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿بَدِيعُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ أَنَّىٰ يَكُونُ لَهُۥ وَلَدٌ وَلَمْ تَكُن لَّهُۥ صَٰحِبَةٌ وَخَلَقَ كُلَّ شَىْءٍ﴾ واتە: خودا داهێنەری ئاسمانەکان و زەوی یە لەنەبوون، چۆن منداڵی دەبێت کە ژن و هاوسەری نەبوە خۆی هەموو شتێکی دروست کردوە و ئەو بەهەموو شتێ زاناو بەئاگایە، یانی: ئەو خاوەن و وەدیهێنەری هەموو شتێکە و چۆن دەبێ لە شێوەی وەدیهێنراوەکانی خۆی وێنەو هاودەمی هەبێت، زۆر بڵندو پیرۆزو پاکە لەهەموو عەیبێ خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَقَالُوا۟ ٱتَّخَذَ ٱلرَّحْمَٰنُ وَلَدًا ﴿٨٨﴾ لَّقَدْ جِئْتُمْ شَيْـًٔا إِدًّا ﴿٨٩﴾ تَكَادُ ٱلسَّمَٰوَٰتُ يَتَفَطَّرْنَ مِنْهُ وَتَنشَقُّ ٱلْأَرْضُ وَتَخِرُّ ٱلْجِبَالُ هَدًّا ﴿٩٠﴾ أَن دَعَوْا۟ لِلرَّحْمَٰنِ وَلَدًا ﴿٩١﴾ وَمَا يَنۢبَغِى لِلرَّحْمَٰنِ أَن يَتَّخِذَ وَلَدًا ﴿٩٢﴾ إِن كُلُّ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ إِلَّآ ءَاتِى ٱلرَّحْمَٰنِ عَبْدًا ﴿٩٣﴾ لَّقَدْ أَحْصَىٰهُمْ وَعَدَّهُمْ عَدًّا ﴿٩٤﴾ وَكُلُّهُمْ ءَاتِيهِ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ فَرْدًا﴾ واتە: گاورو جولەکەکان ئەیان ووت: خوا منداڵی بۆ خۆی داناوە، سوێند بەخوا بەڕاستی شتێکی زۆر نابەجێو سەیر دەڵێن، نزیکە ئاسمانەکان لەت لەت و پارە پارە ببن لەبەر ئەو قسەیە و نزیکە زەویش شەق بەرێت و بقڵیشێو نزیکە شاخ و چیاکان بەیەك جار بروخێن، لەبەر ئەوەی بێباوەڕان منداڵ دەدەنە پاڵ خوا، بۆ خوای میهرەبان شیاو نی یە کە منداڵی هەبێ، هەموو ئەوانەی لە ئاسمانەکان و زەویدان بەبەندەیی دێنە لای خوای میهرەبان هیچ کەسێ لەوانە نییە کە بەندەی خوای میهرەبان نەبێت، سوێند بەخوا بەڕاستی هەموویانی سەرژمێری کردووە بە ژماردن، هەر هەموویان بەتاك و تەنها دێنەوە بۆ لای خوا لە ڕۆژی قیامەتدا. وەئەفەرموێت: ﴿وَقَالُوا۟ ٱتَّخَذَ ٱلرَّحْمَٰنُ وَلَدًا ۗ سُبْحَٰنَهُۥ ۚ بَلْ عِبَادٌ مُّكْرَمُونَ ﴿٢٦﴾ لَا يَسْبِقُونَهُۥ بِٱلْقَوْلِ وَهُم بِأَمْرِهِۦ يَعْمَلُونَ﴾ واتە: وە بێباوەڕان ووتیان خوای میهرەبان منالی بۆ خۆی بڕیار داوە کە فریشتەکانن، پاك و بێگەردە خوا لەم شتانە بەڵکو ئەوانە فریشتە بەندەی ڕێزگیراوی خوان، لە خوا پێش ناکەون بەقسەو ووتەو ئەوان بەفەرمانی خوا کار دەکەن. وە ئەفەرموێت: ﴿وَجَعَلُوا۟ بَيْنَهُۥ

وَبَيْنَ ٱلْجِنَّةِ نَسَبًا ۚ وَلَقَدْ عَلِمَتِ ٱلْجِنَّةُ إِنَّهُمْ لَمُحْضَرُونَ ﴿١٥٨﴾ سُبْحَٰنَ ٱللَّهِ عَمَّا يَصِفُونَ﴾ واتە: سوێند بەخوا بێگومان جنۆکەکان دەیانزانی کە بەڕاستی ئەوان ئامادە دەکرێن لەڕۆژی دواییدا پاك و بێگەردە خوا لەوەی ئەو بێباوەڕانە دەیلێن، لە سەحیحی بوخاریدا هاتوە: هیچ کەسێك لەخودا بەئارام تر نیە لەسەر ئازاریَ کە گوێی لێبێ، خەڵکی منداڵی بۆ بڕیار ئەدەن، کەچی ئەو ڕۆزیشیان ئەداو لەش ساغیشیان ئەکات! دیسان بوخاری ڕیوایەتی کردوە لە ئەبو هورەیرەوە ئەویش لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) کە فەرموویەتی: خوای گەورە فەرموویەتی: بەدرۆیان خستمەوە بەنی ئادەم بۆ ئەوان نەبوو وا بکەن، قسەم پێدەڵێن و مافی ئەوەشیان نیە، سەبارەت بەوەی بەدرۆی ئەزانێ کە من زیندوی ئەکەمەوە ئەڵێت: چۆن سەر لەنوێ زیندم ئەکاتەوە وەك یەکەمجار، باشە دوبارەکردنەوە ئاسانتر نیە لە دروستکردنی یەکەمجار، قسە وتنەکەشیان ئەوەیە کە بە من ئەڵێن: خوا کوڕی بۆ خۆی بڕیار داوە، بەڵام من تاکە خوای بێنیازم لەخەڵکی ئەو خوایەی کە کەسی لێ نەبوە و کەسی نەبوەو کەسیش هاوتای نیە.

## سورەتی ( الفلق و الناس ) مەعوزەتەین

## لەمەدینەداهاتونەتەخوارەوە

### هەڵوێست و ڕای ئیبنو مەسعود لە سورەتی ( الفلق و الناس )

ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە زیری کوڕی حوبەیشەوە ئەڵێت: ووتم بە ئوبەیی کوڕی کەعب، کەئیبنو مەسعود سورەی فەلەق و ناس نانوسێ لە پەڕاوەکەیدا؟ کەعب ووتی: شایەتی ئەدەم کە پێغەمبەر(ﷺ) هەواڵی دامێ کە جوبرەئیل (علیه سلام) ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلْفَلَقِ﴾ی پێوتوە، منیش ووتومە، وە ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ﴾ی پێ ووتوە منیش ووتومە وە ئێمەش ئەوە ئەڵێین کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی.

### ڕێزو چاکەی سورەتی فەلەق و ناس

موسلیم ڕیوایەتی کردوە لە سەحیحەکەیدا لە عوقبەی کوڕی عامیرەوە کە ئەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئایا نەتزانیوە کە چەند ئایەتێك ئەمشەو هاتە خوارەوە وێنەیان نەبینراوە تا ئێستا کە ئەمیش: ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلْفَلَقِ﴾ و﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ﴾ ئەحمەد و تیرمیزی و نەسائی ڕیوایەتیان کردوە. تیرمیزی ئەڵێت: حسن وصحیحه.

ڕێگایەکی تر: ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە عوقبەی کوڕی عامیرەوە کە ئەڵێت: کاتێ من رەشۆی ووڵاغەکەی پێغەمبەرم(ﷺ) بەدەستەوە بوو لەسەفەرێ لەسەفەرەکانی پێغەمبەردا(ﷺ) پێی ووتم: ئەرێ عوقبە تۆش سوار نابی؟ عوقبەی ووتی: ترسام گوناه بێ ئەگەر سوار نەبم، جا ئەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) دابەزی لە ووڵاغەکەو کەمێ سوار بوم، پاشان پێغەمبەر(ﷺ) سوار بووەو ئینجا

فەرمووی: ئەی عوقبە! ئایا فێری دوو سورەتت بکەم کە چاکترین سورەتێکن کە خەڵکی خوێندبێتی؟ووتم: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ڕۆشتە پێشەوەو سورەتی﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلْفَلَقِ ﴾ و ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ ﴾ی خوێند، پاشان بەلاماتێ پەڕی و فەرمووی: بەلاتەوە چۆن بوو ئەی عوقبە! هەر کاتێ خەوتی و هەر کاتێ هەڵسای بیان خوێنە. نەسائی و ئەبو داود ڕیوایەتیان کردوە.

ڕێگایەکی تر: نەسائی ڕیوایەتی کردوە لە عوقبەی کوڕی عامیرەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: خەڵکی هێشتا خۆیان نەپاراستوە بەچەکێك بەهێزتر بێت لە ئەم دوو سورەتە: ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلْفَلَقِ مِن و﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ ﴾.

ڕێگایەکیتر: نەسائی ڕیوایەتی کردوە لە عوقبەی کوڕی عامیرەوە ئەڵێت: لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) ئەڕۆیشتم فەرمووی: ئەی عوقبە! بیڵێ، ووتم: چی بڵێم؟ پاشان هەندێك لێم وەستاو، فەرمووی بیڵێ، ووتم: چی بڵێم ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)! فەرمووی: ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلْفَلَقِ ﴾ منیش خوێندم تا کۆتاییەکەی، پاشان فەرمووی: بڵێ! ووتم: چی بڵێم ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)! فەرمووی: ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ ﴾ منیش خوێندم تا کۆتاییەکەی پاشان پێغەمبەر(ﷺ) دوای هەموو ئەمانە فەرمووی: هیچ کەسێك تا ئێستا بەم شێوەیە داوای نەکردوە و بەم شێوەیەش خۆی نەپاراستوە.

فەرموودەیەکی تر: نەسائی ڕیوایەتی کردوە لەئیبنو عابیسی جوهەنیەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) پێی ووتەوە: ئەی یبنو عابیس! ئایا نیشانت بدەم یا هەواڵت بدەمێ دەربارەی چاکترین شتێ کە خۆپارێزان خۆیانی پێدەپارێزن؟ ووتی: بەڵێ، ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: ئەم دوو سورەتە: ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلْفَلَقِ ﴾ و ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ ﴾ ئیمامی مالیکیش ڕیوایەتی کردوە لە عائیشەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) کاتێ ئازارێکی ببوایە ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلْفَلَقِ ﴾ و ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ ﴾ی ئەخوێند بەسەر خۆیاو فوی پیا ئەکرد هەر کاتێ ئازاری زۆر ببوایە من پیاما ئەخوێند و هەردو دەستی خۆیم پیا ئەهێنا بە هیوای بەرەکەتی.بوخاری و ئەبوداود و نەسائی و ئیبنوماجە ڕیوایەتیان کردوە. وە لە ئەبو سەعیدیشەوە ڕیوایەت کراوە کە ئەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) پەنای دەگرت بەخوا لە چاوەپیسەکانی جنۆکەو چاوەپیسەکانی مرۆڤ، بەلام کە ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلْفَلَقِ ﴾ و ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ ﴾ هاتنە خوارەوە، خۆی بەم دوو سورەتە ئە پاراستن و وازی لەشتی تر هێنا، تیرمیزی و نەسائی و ئیبنو ماجە ڕیوایەتیان کردوە. تیرمیزی ئەڵێت: فەرموودەیەکی حسن صحیحە.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلْفَلَقِ ﴿١﴾ مِن شَرِّ مَا خَلَقَ ﴿٢﴾ وَمِن شَرِّ غَاسِقٍ إِذَا وَقَبَ ﴿٣﴾ وَمِن شَرِّ ٱلنَّفَّـٰثَـٰتِ فِى ٱلْعُقَدِ ﴿٤﴾ وَمِن شَرِّ حَاسِدٍ إِذَا حَسَدَ ﴿٥﴾﴾

ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردوە لە جابیرەوە ئەڵێت: ﴿ٱلْفَلَقِ﴾ سپێدەی بەرەبەیانە. وە عەوفی ئەڵێت: لە ئیبنو عەباسەوە﴿ٱلْفَلَقِ﴾ یانی: سپێدەی بەرەبەیان. ڕیوایەت کراوە لە موجاهیدو سەعیدی کوڕی جوبەیرو عەبدوڵای کوڕی موحەممەدی کوڕی عەقیل و حەسەن و قەتادەو موحەممەدی کوڕی کەعبی قورەزی و ئیبنو زەیدو مالیکەوە لە زەیدی کوڕی ئەسلەمەوە هەر بەو مانایە، یانی: ﴿ٱلْفَلَقِ﴾ مانای سپێدەی بەرەبەیانە. قورەیزی و ئیبنو زەیدو ئیبنو جەریر ووتویانە: ئەم ئاییەتە وەك ئەم فەرموودەی خودا وایە: ﴿فَالِقُ ٱلْإِصْبَاحِ﴾ واتە: خوا بەدیهێنەری شەبەق و ڕوناکی ڕۆژ بونەوەیە. خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿مِن شَرِّ مَا خَلَقَ﴾ واتە: ئەی موحەممەد(ﷺ)! بڵێ: پەنا دەگرم بە دروستکەری بونەوەر بەرەبەیان ﴿مِن شَرِّ مَا خَلَقَ﴾ واتە: لەزیانی ئەوەی کە دروستی کردوە، یانی: لەزیانی گشت وەدیهێنەرەکانی. سابتی بونانی و حەسەنی بەسری ئەڵێن: یانی: دۆزەخ و شەیتان و گشت وەچەکانی، وە ئەفەرموێت: ﴿وَمِن شَرِّ غَاسِقٍ إِذَا وَقَبَ﴾ واتە: لەزیانی تاریکی کاتێ کەدابێ، موجاهید ئەڵێت: زۆر تاریکی شەو، کاتێ کە خۆر ئاوا ئەبێ و تاریك ئەکات. بوخاری ئەم وتەی گێڕاویەتییەوە لێی. هەروەها ئیبنو ئەبو نوجەیحیش ڕیوایەتی کردوە لێیەوە. ئیبنو عەباس و موحەممەدی کوڕی کەعبی قورەزی و زەححاك و خەسیف و حەسەن و قەتادە ئەڵێن: شەوە کاتێ تاریکاییدا. زوهری ئەڵێت: ﴿وَمِن شَرِّ غَاسِقٍ إِذَا وَقَبَ﴾ خۆر کاتێ ئاوا دەبێ. ئەبو مهزیم ئەڵێت: لە ئەبو هورەیرەوە ﴿وَمِن شَرِّ غَاسِقٍ إِذَا وَقَبَ﴾ یانی: ئەستێرە. ئیبنو زەید ئەڵێت: عەرەبەکان ووتویانە: ﴿غَاسِقٍ﴾ یانی: نەمان و ئاوابونی ئەستێرەی سورەیا لەو کاتەدا نەخۆشی و دەردو بەڵا و تاعون بڵاو ئەبێتەوە کە دادەکەوێ، وە دەردو بەڵاو نەخۆشی نامێنێ کاتێ هەڵدێ. ئیبنو جەریرو کەسانی تریش ووتویانە: مانگە. منیش ئەڵێم: زۆرینەی ئەو کەسانەیش کە ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی لێیانەوە ووتویانە: لەحاریسی کوڕی ئەبوسەلەمەوە ئەڵێت: عائیشە خودا لێی ڕازی بێ، ئەفەرموێ: پێغەمبەر(ﷺ) دەستی گرتم و مانگی نیشان دام کاتێ هەڵهات، فەرمووی: خۆت بپارێزە بەخودا لەزیانی ئا ئەو ﴿غَاسِقٍ﴾ە کاتێ ئاوا دەبێ. تیرمیزی و نەسائی ڕیوایەتیان کردوە لەهەردوو

سونەتەکەیاندا. وە ئەفەرموێت: ﴿ وَمِن شَرِّ ٱلنَّفَّٰثَٰتِ فِي ٱلۡعُقَدِ ﴾ واتە: وە لەزیانی فوکەران (جادوگەران) گرێکاندا، موجاهیدو عیکریمەو حەسەن و قەتادەو زەحاك ووتویانە: یانی: جادوگەران. موجاهید ئەڵێت: کاتێ: جادو گەران شتی خراپ ئەڵێن فوو ئەکەن بەچەند گرێیەکدا. وە لەفەرموودەیەکی تردا هاتوە کە جوبرەئیل هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئازارت هەیە ئەی موحەممەد(ﷺ)؟ پێغەمبەریش فەرمووی: بەڵێ جوبرەئیل فەرمووی: بەناوی خودا داوات بۆ ئەکەم و ئەپارێمەوە، لەهەموو نەخۆشیەك کە ئازارت ئەدات وە لەزیانی هەموو حەسودێك و چاوپیسێك بتپارێزێ و خوا شیفات بدات.

## باسی جادوکردن لە پێغەمبەر(ﷺ)

بوخاری ڕیوایەتی کردوە لە (کتاب الطب) دا لە عائیشەوە کە ئەفەرموێ: پێغەمبەر(ﷺ) جادوی لێکرا، وایئەزانی چوەتە لای خێزانی نەچوبوە لاشیان، سوفیان ئەڵێت: ئەمە گرانترین و قورسترین شێوەی جادو کردن بوە، هەر کاتێ بەم شێوەیە بوبێ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەی عائیشە ! ئایا دەزانی خودا ئاگاداری کردم لەوەی کە داوام ئەکرد ئاگادارم بکات؟ دوو پیاو هاتنە لام یەکێکیان لای سەرمەوە دانیشت، ئەوی تریان لای پامەوە، ئەوەی لەلای سەرمەوە دانیشتبوو ووتی بەوەی کە لای قاچمەوە دانیشتبوو: ئەم پیاوە چی لێهاتوە؟ ئەویش ووتی: جادوی لێکراوە. ووتی: کێ جادوی لێکردووە؟ ووتی: لەبیدی کوڕی ئەعصەم، پیاوێکە لە خێڵی بەنی زورەیق کە هاوپەیمانی جولەکەکان بوو، پیاوێکی دوو ڕووش بوو، ووتی: لەناو چیدا؟ ووتی: لەناو شانەو موی شانەدا[1] ووتی: لەکوێ؟ ووتی: لەناو توێکڵی پەلەدار خورمایەکی نێرەدا کە لەژێر بەردێکایە لەبیری زەرواندا، عائیشە ئەفەرمووێ: پێغەمبەر(ﷺ) ڕۆیشت و جادوەکەی دەرهێناو جا فەرمووی: ئەم بیرەی کە پیشانم درا ئاوەکەی وەك ڕەنگی خەنە زەردو سور هەڵگەڕا بوو، دارخورماکەیشی وەك سەری شەیتانەکان وابوو. ئەڵێ: دەریان هێنا ووتم: ئایا ئاشکرای ناکەی فەرمووی: خودا شیفای منی داوەو پێم خۆش نیەخراپە بدەمە پاڵ هیچ کەسێ.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿قُلۡ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ ﴿١﴾ مَلِكِ ٱلنَّاسِ ﴿٢﴾ إِلَٰهِ ٱلنَّاسِ ﴿٣﴾ مِن شَرِّ ٱلۡوَسۡوَاسِ ٱلۡخَنَّاسِ ﴿٤﴾ ٱلَّذِي يُوَسۡوِسُ فِي صُدُورِ ٱلنَّاسِ ﴿٥﴾ مِنَ ٱلۡجِنَّةِ وَٱلنَّاسِ ﴿٦﴾﴾

---

[1] قژێ بەهۆی شانەکردنەوە دەکەوێتە خوارەوە.

ئەمانە سێ سیفەتن لە سیفەتەکانی خوای گەورە: پەروەردگاریی و فەرمانڕەوایی و پەرستراوی. خوای گەورە پەروەردگاری هەموو شتێکە و خاوەنیشیەتی و پەرستراویشیەتی، هەموو شتێك وەدیهێنراوو بەندەی ژێر دەسەڵاتی ئەون، خودا فەرمانی داوە بەو کەسانەی کە خۆ دەپارێزن خۆ بپارێزن بە هۆی ئەو کەسەی کە ئەم سیفەتانەی تێدایە، لەزیانی وەسوەسە پەیداکەری خۆپەنهانکەر، ئەویش ئەو شەیتانەیە کە لەگەڵ مرۆڤدایە، چونکە هیچ مرۆڤێك نیە مەگین هاوەڵێکی شەیتانی هەیە بەدڕەوشتی لەلا جوان و ڕازاوە دەکات، دەستکۆتا ناکاو واز ناهێنێ لەسەر لێتێکدانی. وە پارێزراویش کەسێکە خوا پاراستبێتی. لەفەرمودەی سەحیحدا هاتوە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: هیچ کەسێك نییە لە ئێوە مەگین هاوەڵێکی لەگەڵەو ئەو کەسەی پێسپێراوە، ووتیان: تۆش ئەی پێغەمبەری خوا ؟ فەرمووی: بەڵێ، بەڵام خوا منی سەرخستوە بەسەریاو ئەو موسڵمان بوە، بەچاکە نەبێ فەرمانم پێ ناکات. وە لەهەردوو سەحیحەکەدا هاتوە لەئەنەسەوە لەباسی سەردانی سەفیە بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) کەلە ئیعتیکافدا بوو، وە ڕۆیشتنی پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵی بۆ ئەوەی بیباتەوە بۆماڵەوە، دوو پیاوی ئەنساری لەرێگادا پێ گەیشت، کاتێ پێغەمبەر(ﷺ) بینی پەلەیان کرد لەڕۆیشتندا، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: هێواش برۆن و پەلە مەکەن ئەمە سەفیەی کچی حویەیە، ووتیان: سبحان الله ئەی پێغەمبەری خوا! فەرمووی: دڵنیا بن شەیتان ئەڕوات بەو شوێنەی کە خوێنی پێدا ئەڕوات لەبەنی ئادەما، وە من ترسام لەوەی کە شەیتان شتێك بخاتە دڵتانەوە، یان فەرمووی: خراپەیەك بخاتە دڵتانەوە.

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ﴾ واتە: ئەی موحەممەد(ﷺ)! بڵێ: پەنا دەگرم بە پەروەردگاری خەڵکی﴿ مَلِكِ ٱلنَّاسِ ﴾ واتە: پاشای خەڵکی﴿ إِلَٰهِ ٱلنَّاسِ ﴾ واتە: پەرستراوی خەڵکی ﴿ مِن شَرِّ ٱلْوَسْوَاسِ ٱلْخَنَّاسِ﴾ واتە: لەزیانی وەسوەسە پەیداکەری خۆپەنهانکەر. سەعیدی کوڕی جوبەیر ئەڵێت: لە ئیبنو عەباسەوە کە ووتویەتی: ﴿ٱلْوَسْوَاسِ ٱلْخَنَّاسِ﴾ یانی: ئەو شەیتانەی خۆی ئەدات بەسەر دڵی خەڵکیا کاتێ ئاگای لەخۆی نییە و سەهو دەکاو دڵی کرمێن دەکات و بەڵام کاتێ کە یادی خودا دەکات شەیتانەکە خۆی دەشارێتەوە. موجاهیدو قەتادەش هەر وایان ووتوە. موعتەمیری کوڕی سولەیمان لە باوکیەوە ئەگێڕێتەوە کە بۆی باسکردوە: شەیتانی وەسواس فو دەکات بەدڵی مرۆڤدا لەکاتی دڵگرانی و لەکاتی خۆشیدا، کاتێ یادی خودای کرد خۆی ئەشارێتەوە. عەوفی ئەڵێت: لە ئیبنو عەباسەوە کە ووتویەتی: ﴿ٱلْوَسْوَاسِ﴾ یانی: ئەوشەیتانەی فەرمان دەدا، کاتێ بەگوێیکرا خۆی دەشارێتەوە. خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿ٱلَّذِى يُوَسْوِسُ فِى صُدُورِ

ٱلنَّاسِ ﴾ کە وەسوەسە دەخاتە دڵی مرۆڤەوە، لێرەدا پرسیارێك هەیە: ئایا ئەم وەسوەسە دروستکردنە تایبەتە بەمرۆڤەکانەوە وەك دیارە، یان مرۆڤ و پەریش ئەگرێتەوە؟ دوو ڕای لەسەر هەیە: کورتەکەی ئەمەیە: پەریەکانیش بە (تەغلیب) دێنە ناو مرۆڤەکان و وەسوەسە بۆ ئەوانیش دروست ئەبێت، ئیبنو جەریریش ئەڵێت: (رجال من الجن) یش بۆ پەریەکان بەکار براوە، لەبەر ئەوە سەیر نیە کە بەناوی مرۆڤەوە ئەوانیش بدوێنرێن، کاتێك خوای گەورەش ئەفەرموێ: ﴿مِنَ ٱلْجِنَّةِ وَٱلنَّاسِ ﴾ ئەمە درێژە دانێکە بەئایەتەکەی پێشوو کە ئەفەرموێ: ﴿ٱلَّذِى يُوَسْوِسُ فِى صُدُورِ ٱلنَّاسِ ﴾ پاشان ڕونی کردۆتەوە و ئەفەرموێت: ﴿مِنَ ٱلْجِنَّةِ وَٱلنَّاسِ ﴾ چ لەناو مرۆڤدا بێت یان لەناو پەریدا بێت، ئەمە ڕاو بۆچونی دوهەم بەهێز دەکات. ووتراوە: ﴿مِنَ ٱلْجِنَّةِ وَٱلنَّاسِ ﴾ واتە: مانایە بۆ ئەوەی کە وەسوەسە دەخاتە دڵی خەڵکیەوە، لەشەیتانەکانی ناو مرۆڤ و ناو جنۆکە، وەك خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَا لِكُلِّ نَبِىٍّ عَدُوًّا شَيَٰطِينَ ٱلْإِنسِ وَٱلْجِنِّ يُوحِى بَعْضُهُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ زُخْرُفَ ٱلْقَوْلِ غُرُورًا ﴾ واتە: هەر بەو شێوەیە بۆ هەموو پێغەمبەرێك دوژمنێکمان داناوە لەشەیتانەکانی مرۆڤ و جنۆکە بەنهێنی ووتەی ڕازاوەو بریقەدار بۆ یەکتری ڕادەگەیەنن بۆ فریودانیان. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لەئیبنو عەباسەوە ئەڵێت: پیاوێك هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا! من هەندێك شت دێت بەدڵما بکەومە خوارەوە لە ئاسمان ئەوەم پێخۆشترە لەوەی کە بیڵێم، ئەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (الله أكبر الله أكبر) سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە هەموو پیلانێکی شەیتانی سنوردار کردووە لە وەسوەسەدا. ئەبو داود و نەسائیش ڕیوایەتیان کردوە.

# پێـــڕســـت